

الدار العربية للعلوم ناشرون
Arab Scientific Publishers, Inc.

# به ده‌م ڕێگاوه گوڵچنین



## مێژووی سیاسی

نه‌وشیروان مسته‌فا ئه‌مین

کتێبی سێ یه‌م
به‌رگی یه‌که‌م

# ناوەڕۆک

## بەشی یەکەم
## میرایەتی بابان لە نێوان
## بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا

## بەشی دووەم
## لەپەراوێزی مێژووەکانی ئەردەڵان دا

## بەشی سێ یەم
## حکومەتی کوردستان: کورد لە گەمەی سۆڤیێتیدا

# پێشەکی

## -1-

ساڵی 1988، بۆ ئێمەی کورد لە کوردستانی عێراق دا، ساڵێکی پڕ کارەسات و مەینەتی بـو. جەیشـی ئیحتیلالی بەعسی لە زنجیرەیەک لەشکرکێشیی دڕندانـەدا، بـە نـاوی "عەمـەلیاتی ئـەنفالی 1 و 2 و 3 و 4 و ..." هەمو ناوچە ئازادەکانی کوردستانی عێراقی داگیر کرد. مەرگ و وێرانیی بـە سـەر کوردسـتاندا بارانـد. ئێمەش ئیتر هێلانەمان لێ تێک چو. بارەگاکانمان گواستەوە سنورەکان. من لە شـوێنێک جێگیـر بـوم نـاوی "قاسمە ڕەش" بو. "قاسمە ڕەش" لەنێوان گوندی "شێنێ" ی عێراقـی و "کـانی زەرد" ی ئێرانـی دا بـو. چـۆن هەمو مەیدان و شەقام و ڕێگا و کۆڵانی شارەکان ناویان لێ نـراوە، ئاوەهـاش، هـەمو شـاخ و دۆڵ و شـیو و گرد و، زۆری ئەرز و کێڵگە و لـەوەڕگاکانی کوردسـتان، نـاوی ناوچـەییان هەیـە. "قاسـمەڕەش" تەختاییـەکی تەسک بو کەوت بوە ناوچەیەکی شاخاوی سەختەوە. پشتی دابو بە چیایـەکی پـڕ دار و دەوەنـەوە، چـەمێکی خوڕی ڕون بـە بـەردەمی دا تـەڕۆیی، لـە دو زنجیرەچیـای سـەختی ئـەم لاو ئـەو لای دای بـڕی بـو. چەنـد کانییەکیشی لێ بو، ناویان"کانی بۆگەنە" و"کانی بۆق" بو.

ناوەکانی تریش هەر لەم بابەتە بون. پێم سەیر بو ئەو جـۆرە ناوانـە لـەم شـوێنانە نـرا بـو. چونکـە دیمەنی سروشتیی قاسمەڕەش و دەوروبەری لە جوانیی دا وێنەی کەم و، ئـاو و هەوایشـی تـابڵێی خـۆش و سازگار بو. نالی شاعیر، لە بوارێکی وەهادا، بۆ بیانو هێنانەوە وتویەتی:

شارێکە عەدل و گەرمە، لە جێگێکە خۆش و نەرم،

بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن: شاری شارەزور

ڕەنگە بۆ "دەفعی چاوەزار" ئەم ناوە ناخۆشانەیان لەم شوێنە خۆشـانە نابێ‌انـەگینا شایسـتەی نـاوی خۆشتر بون.

چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ، کە بۆ ئیشوکار بەملاو ئەولادا ئەچوم، ئەوی تری:

چەند مانگی ساڵی 88 و هەمو مانگەکانی ساڵی 89 و 90 م لە وێ بە سەر بـرد. ناوچەکـە شـتێکی تێ دا نەبو پیاو خۆی پێوە خەریک بکا، جگە لەوانەی کاریان لەوێ بـو. تـەنیا ئـاوەدانیـش بریتـی بـو لـە: هەندێ ڕەبییەی ئێرانی و عێراقی بە شاخەکانی ئەم بەر و ئەو بەرەوە و، ڕێگایەکی کـاروانی قاچـاخی نێـوان عێراق- ئێران.

ئەو ماوەیە، ئەگەرچی، زۆری کاتی ڕۆژانەی من بە کاری سیاسییەوە ئەڕۆیشـت، بـەڵام لـەو ڕۆژگـارە سەختەدا، "مستەفا بەگی کوردی" گوتەنی: کە لە "زێـد و یـار و مەسـکەن بـێ نسـیب" بـوم، تـەنیا "سـەبوری بەخشی عومری ناشەکیبم" خوێندنەوە و نوسین بو. کەرەستەی چەند باسی مێـژوی سیاسـی و جوگرافیـای بەشەڕیەم کۆکردەوە. ئەو سـەرچاوانەی بـۆ لێکۆڵینـەوەی باسـەکانم پێویسـتم بـون، هاوڕێکـانم لـە تـاران و کرماشان و ورمێ و شام و بێروت و سلێمانی و بەغداد، بۆیان پەیدا ئەکردم و، بۆیان ئەناردم.

کەرەستەی خاوی ئەم کتێبەم لەو ماوەیە دا کۆکردەوە.

## -2-

## "مێژو بۆچی ئەنوسرێتەوە؟"

ئەم پرسیارە ئەگونجێ بە باسی جۆراوجۆر وەڵام بدرێتەوە، بەڵام لە هەمویان سادەتر:

"بۆ ئەوەی پەند لە ڕوداوەکانی وەربگیرێ!"

ڕابردوی کورد پڕێتی لەخۆخۆری. ئەم دەردە، بەدرێژایی مێژو،ماڵوێرانییەکی گەورەی بەسەر هێنـاوە، کەچی لە سەرانسـەری کوردسـتان دا و، لـە هـەمو قۆناغـەکان دا، دوبـارە و چەنـدبارە بۆتـەوە. 4 کـەس لـە بیرکەرەوەکانی کورد: ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی، ئەحمەدی خانی، حاجی قادری کۆیی، ئەمین زەکی بـەگ، لـە 4 قۆنـاغی جیـاوازی ژیـانی سیاسـی کـوردا، باسـیان کـردوە و، بـە هـۆی ئێشـکان وکەساسـی و دیلـی و دەسبەسەرییان داناوە.

شـەرەفخان (1543 - 1604)، بلیمـەت و شـارەزای مێـژوی کـورد و، ڕوداوەکـانی کوردسـتان، لـە گێڕانەوەی مێژوەکەی دا لە چەندین شوێن دا ئیشارەت بە خۆخۆری و براکوژی و یەکترکوشتن ئـەکا، بـەڵام هیچ هۆیەکی"مەنتیقی" بۆ ئەدۆزراوەتەوە.

شەرەفخان بە چاوێکی ورد سەیری ڕوداوەکـانی مێـژوی کـورد و میرایەتییـەکانی کـردوە. بـە وردی تاووتوێی کـردون و لێیـان کۆڵیوەتـەوە. هۆکـانی سـەرنەکەوتنی کـورد و مانـەوەی بـە ژێردەسـتەیی ڕون کردۆتەوە. یەکێ لەو دەردانەی لە ناو هەمو بنەماڵـە دەسـەڵاتدارەکانی کوردسـتان دا دوبـارە بۆتـەوە: دەردی خۆخۆری بوە. شەرەفخان بەداخێکی قوڵەوە باسی ئەکا. لە پێشەکی کتێبەکەی دا نوسیویتی:

"کورد زاووزێ زۆر ئەکات و منداڵیان زۆر لێ ئەکەوێتـەوە ئەگـەر یـەکتریان ئەکوشـتایە ئەوەنـدە زۆر ئەبون قات وقڕییان ئەک ئەخستە مەملەکەتی ئێرانەوە بەڵکو هەمو دنیاوە.

ویفعل الله مایشاء ویحکم مایرید"

دیارە شەرەفخان خۆی ئەی توانیوە هۆیەکی ژیرانە و بەجێ بۆ ئـەم دەردە بدۆزێتـەوە، لـە بـەر ئـەوە پەنای بردۆتە بەر ئەفسانەی هەڵبەستراو. شەرەفخان لـە زمـان "خواجـا سـەعدەدین" ی مێژونوسـی تورکـەوە ئەگێڕێتەوە: "لە سەرەتای دەعوەتی ئیسلامی دا تاقمێ کورد ئەچن بۆ لای پێغەمەر تا لە سـەر دەسـتی ئـەودا موسوڵمان ببن. سەروسەکوت و قەڵافەتیان ئەوەندە دزێو و سامناک ئەبێ پێغەمەر سامیان لێ ئەکا، کەئـەڕۆن پێغەمەر ئەپرسێ: ئەمانە چ قەومێ بون؟ ئەڵێن: کورد. پێغەمەریش دوعایان لێ ئەکا هەرگیز یـەک نـەگرن و هەمیشە لە ناو خۆیان دا ناکۆک بن، چونکە ئەگەر یەک بگرن هەمو دنیا ئەخەنە ژاڵە!"

هەژاری موکریانی ئەم مێژوە بەنرخەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانە تایبەتیەکەی خۆی. دوجاریش چاپی کردوە:

جاری یەکەم، ساڵی 1973 لە گەرمەی هەراوهوریای 11 ی ئازاردا لە نەجەف.

جاری دوەم، ساڵی 1981 لە جەنگەی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران دا لە تاران.

بەڵام ئەم سەرگروشتەیەی لێ دەرهێناوە، گوایە بەراستی نەزانیوە.

هەژار کوردی ئێرانە. دوای ڕوخانی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد ڕوی کردۆتە عێراق. بەشی زۆری ساڵانی ژیانی لە عێراق بە سەر بردوە. هەژار دوای ئەوەی لە ئێرانەوە هاتە عێراق هەمو ژیانی و، شیعرەکانی و، نوسینەکانی و، قسەکانی و، زمان لێدانی... تەرخان کرد بۆ قوڵکردنەوەی برینەکان و ناکۆکی ناوخۆ و، خۆشکردنی ئاگری شەڕی خۆبەخۆی کوردی عێراق. تەنانەت شاکارە نەمرەکەی شەرەفخانیشی، وەکو دیوانەکانی خۆی بەتێ ترنجاندنی جنێو پیس کردوە، "پێشەکی" و"پاشەکی" یەکی خستۆتە سەر، بێ ئەوەی هیچ پێوەندییەکیان بە شەرەفنامەوە هەبێ، پڕە لە سەرگوزشتەی سیاسی هەڵبەستراو و، جنێوی ناشیرین و، درۆی بێ بناغە.

ئەگەر تەفسیرە ئەفسانەییەکەی شەرەفخان ڕاست نەبێ، نەبێ بۆ هەژاری شاعیر و ئەدیب و نوسەر و زمانزان لە باتی بانگەشەی "یەکێتی و تەبایی نەتەوەی کورد" پرۆپاگەندە بۆ "شەڕی براکوژی" بکا و، هەتا مرد، لە پاش مردن ڕەحمەت چاکە، وازی لە ڕێبازی هاندانی شەڕی براکوژی نەهێنا؟ دەوی باوەڕ ناکا با لەم ڕوانگەیەوە سەرلەنوێ بە پێشەکی و پاشەکییەکەی شەرەفنامە و، بە دیوانەکان و نوسینەکانی هەژاردا بچێتەوە.

ئەحمەدی خانی (1650 - 1707) دانەری "مەم و زین" یش سکاڵا لە دەس هەمان دەرد ئەکا و، ئەڵێ: ئەگەر ئێمە لەناو خۆمان دا "ئیتیفاق" مان هەبوایە، دین و دەوڵەت مان تەکمیل ئەکرد و، عیلم و مەعریفەت مان تەحصیل ئەکرد و، لەباتی ئەوەی وڵاتەکەی ئێمە ببێتە بەرزەخ لە نێوان لەشکرەکانی ڕۆم و عەجەم دا لە گۆمی خوێن دا نقوم ببێ، هەمو ئەوانە نۆکەرییان بۆ ئێمە ئەکرد. بەڵام ئەویش سەری لە "حیکمەتی خودێ" سوڕ ماوە، لە ناو هەمو گەلانی دنیادا بۆچی کوردی وەها لێ کردوە.

حاجی قادری کۆیی (1825 - 1897) لە خانیی تێ ئەپەڕێنێ و، ئەڵێ: تا گەلی کورد لە گەڵ یەک ڕێک نەکەون، وڵاتەکەیان هەروا "خەرابە ئاباد" ئەبێ و، "هەتاوەک ئاگری بن کا" بن "لە گەڵ یەک" ئەگەر "تۆفانە لەشکر"یان "بە پوشەک" و، بەهۆی ئەو دەردەوە لە "ژێری... بون بەدۆشەک".

ئەمین زەکی بەگ (1880 - 1948) پاش تاووتوێ کردنی سەراپای مێژی کورد، نوسیویتی: "ئەم قیامانەی کە باسمان کرد... بە سورەتی عومومی بۆ عەینی مەقسەد و هەدەف بو، بەڵام هیچیان سەری نەگرت و بێجگە لەمەش زەرەرێکی زۆری بۆ ماڵ و ڕۆحی کورد بو. ئەگەر تۆزێک باش لەم قیامانە و لە دەوری دەوام و کوژانەوەیان تێ بفکرین، ئەبینین کە ئەسبابی موەفەق نەبونیان لە خاریجی زیاتر لە داخیلی خۆیان دا بوە و هێشتا بۆ ئەم تەرحە ئیشانە پێ نەگەیشتون و لە وەزعیەتی سیاسییەی دەوروپشتیان ئەوەندە ئاگادار نەبون...

... خولاسە ئەم حەرەکاتی مونفەریدەیە یەکە یەکە عەقیم مایەوە، وە سەبەبی ئەسڵیشی نیفاق و حەسەد بو!"

ئەمین زەکی، هۆی سەرەکی تێکشکانی هەمو ئەو شەڕ و بزوتنەوانە، ئەگێڕێتەوە بۆ "نیفاق" و"تەفرەقە" و"حەسادەت" و"رقەبەری" و"غەرەز" ی ناوخۆ. ئەنجامگیریی مێژوەکەشی بەم جۆرە ئەکا:

"بەڕاستی تاریخ ئاوێنەیەکی عیبرەتە، وە ئینسان و ئەقوام ئەبێ دائیمەن ئیستیفادەی لێ بکەن، وە لە سەبەبی سەرنەگرتنی بەعزێ ئیش و قیام باش ورد ببنەوە و توشی عەینی نەتیجە و فەلاکەت نەبن. لە

سەرەوە گوتمان کە سەبەبی هەرە ئەساسیی سەرنەگرتنی حەرەکاتی کورد پێی نەگەیشتنێتی. دوێنێ وابو ئیمڕۆش وایە.

"بۆ پێکەوەنانی ئیدارەیەکی سەربەخۆ - باخوسوس لەم دەورەدا- لە پێشی هەمودا دو شت زۆر پێویستە: عیلم و سەروەت. هەر قەومێک کە لەم دو خەزێنەیە مەحروم بێ، سەربەخۆیی چنگ ناکەوێ، وە هەر هەوڵێکی کە بۆی ئەدا بەبا ئەچێ و زەرەری ماڵ و ڕۆحی بۆی ئەبێ. شایەد سیاسەتی عومومیە موساعەدەی بکا و بە مەقسەدیش بگا، لەغایەکەی خێر نابینێ و ناحەسێتەوە بە ئەوعێکی تر ئەسیر ئەبێ، بۆ ئیسباتی ڕاستیەتیی ئەم قاعیدەیە میسال زۆرە"

مێژوی پاشایەتی بابان نمونەیەکی دیاری دەردی خۆخۆری کوردە. سەیر ئەوەیە، ئەوان ئەوسا، کەسیان کەڵکی لە تەجروبەی ئەوی پێش خۆی وەرنەگرتوە و، هەمان بەزمی دوبارە کردۆتەوە. لەوەش سەیرتر ئەوەیە: کورد و حیزبە سیاسیەکانی، هەتا ئێستاش تەجروبەیان لە ڕابردو وەرنەگرتوە. هەمان بەزم و ڕەزم بە جۆرێکی کوشندەتر دوبارە ئەکەنەوە. من ئەم باسەم بە دەستی ئەنقەست هەڵبژاردوە بەشکو ئەوەی تازەپێگەیشتوی کورد پەندی لێ وەربگرن.

## -3-

بۆ نوسینەوەی لێکۆڵینەوەی لەم بابەتە، وەکو ئەزانرێ، پێرەوی چەند مەنهەجێک ئەکرێ لەوانە:

- نوسینەوەی بەشێوەی "حولیات" هەر ساڵەو ڕوداوەکانی بنوسرێ.
- نوسینەوەی سەردەمی میرەکان یەک لە دوای یەک.
- لێکۆڵینەوەی هەمو ماوەکە بەسەریەکەوە، بەڵام لێدوانی لایەنە سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابوری، جەنگی، فەرهەنگیەکانی هەریەکەی لە بەشێکی جیاوازدا.

من هیچ کام لەم ڕێگایانەم نەگرتوە. بەڵکو هەوڵم داوە لەهەر ماوەیەک دا ڕوداوێکی سیاسی گرنگ وەربگرم و، قارەمانەکانی ئەو ماوەیە لە گەڵ ڕوداوەکەدا باس بکەم و، هەمو لایەنە جیاوازەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و جەنگی و فەرهەنگی بە تێکەلاوی باس بکەم و، زۆرتر لایەنی سیاسی باسەکان بگرم.

سەرەتای باسەکەم بەهەڵسەنگاندنی یەک بە یەکی ئەو سەرچاوانە دەس پێ کردوە کە باسی ڕوداوەکانی میرایەتی بابانیان کردوە. هەوڵم داوە ئەوانەی جێگەی باوەڕن لەوانە جیا بکەمەوە کەمتر جێگای باوەڕن.

باسەکەش هەموی کراوەتە 10 بەش:

8 بەشی بۆ گێڕانەوەی ڕوداوەکانی بابان و، قارەمانەکانی تەرخان کراوە. بەشی 9 هەمی هۆکانی ڕوخانی میرایەتی بابان باس ئەکا لە زەمانی شایەتەکانی سەردەمەوە و، بەشی 10 هەمی باسی سالم و شیعرەکانی ئەکا کە هەلومەرجی ناوچەی بابان باس ئەکا دوای داگیرکرانی لەلایەن تورکەوە.

لێکۆڵینەوەکە 3 پاشکۆی هەیە:

پاشکۆی یەکەم بریتیە لە 5 ڕێککەوتننامە کە پێوەندیان بە باسەکانەوە هەیە.

پاشکۆی دوەم بریتیە لە 6 چیرۆک و بەیت کە پێوەندیان بە ڕوداوەکانی بابانەوە هەیە. گێڕانەوەی دەماودەمی مێژو، نرخێکی تایبەتی هەیە. دۆڕینی خەڵک دەربڕ ئەخا لە ڕوداوەکان و قارەمانەکانی. بێژەر حەزی ئەکرد قارەمانەکان بەو جۆرە بونایە کە باسیان ئەکا. بەیت و چیرۆکەکان پێویستیان بەلێکۆڵینەوە و بەراورد کردن و، لێدوان و لێکدانەوەی وشەکانی هەیە. بەڵام ئێرەجێگای ئەوە نیە.

پاشکۆی سێیەم بریتیە لە لیستی هەندێ بەڵگەی ڕەسمی، کە پێوەندیان بەمیرایەتی بابانەوە هەیە. بۆ یەکێ بیەوێ لێکۆڵینەوەی زیاتر بکا ئەتوانێ لەو سەرچاوانەدا بیان دۆزێتەوە.

—4—

ساڵەکانی ناو باسەکە زۆری، یان هەموی، بەهیجری قەمەری نوسرابون. زۆری سەرچاوەکانیش ئەو تەقویمەیان بەکار هێناوە. گۆرینی بۆ ساڵی میلادی، ئەگەر خۆم بمکردایە، هەندێ هەڵەی لێ پەیدا ئەبو. چونکە روداوەکان هەندێکیان ساڵەکانیان دیار بو، بەڵام زۆریان رۆژ و مانگەکانیان دیاری نەکرابون. لەبەر ئەوە من هەمویانم بەهیجری قەمەری نوسی بو. دۆستی بەرێزم کەمال رەئوف محەمەد ئەرکێکی زۆری کێشا، هەمویانی گۆری بۆ میلادی، زۆر سەرنجی بەکەڵک و تێبینی بەنرخی لە سەر تێکرای باسەکان دەربری و، هەندێ سەرچاوەی بەنرخی پیشان دام. لێرەدا بەپێویستی ئەزانم پڕ بە دڵ سپاسی بکەم.

هیوادارم بەم کارەم توانی بێتم خزمەتێکی بچوکی گەلەکەم بکەم.

لەندن، 19 ی مایسی 1996

1 ی موحەڕڕەمی 1417

ئەوشیران

ئەم کتێبە لە کوردستان لە ژێر چاپ دا بو، کەهێرشی هاوبەشی هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و حەرەسی جمهوریی عێراق لە بەیانیی 31 ی ئابی 1996 دا بۆ سەر هەولێر دەستی پێ کرد. بەهۆی ئەو روداوانەوە ئەمیش، وەکو زۆر شتی تر، چاپ و بڵاو کردنەوەی پەکی کەوت.

لەم ماوەیەدا هیچ سەرچاوەیەکی تازەم بەرچاو نەکەوتوە، کەباسەکان دەوڵەمەندتر بکا، تا پێویست بکا پێیان دا بچمەوە، بۆیە ئەوسا چۆنم نوسی بو، هەروەکو خۆی بێ دەسکاری بڵاوی ئەکەمەوە. حەزم ئەکرد یەکەم جار لە کوردستان بڵاو ببوایەتەوە، بەڵام وەکو ئێرانی ئەڵێن:

تەگبیر لە گەڵ تەقدیر هەمو جارێ یەک ناگرێتەوە.

## پێداچونەوەیەکی رەخنەگرانە بە سەرچاوەکاندا

ریچ لە بیرەوەرییەکانی رۆژی 7 ی تشرینی یەکەمی 1820 دا نوسیویەتی:

"ئەمرۆ لە گەڵ میردا - مەبەستی مەحمود پاشایە - کە باسی مێژوی کوردستانمان کرد، پێم دا بە جەرگی خۆم دا و، سەرسامیی خۆمم بۆ باس کرد، کە بۆچی ئاگاداری تەواوی مێژوی بنەماڵەکەیان نیە! ئەویش بە ئەزاکەت و سەنگینیەوە پێی وتم: ئەو مێژوە شایستەی نوسینەوە نیە، چونکە مێژوی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار نیە، بەڵکو مێژوی خێڵێکی سادەیە. منیش پێم وت: بەڵام بنەماڵەکەیان مێژویەکی دوریان هەیە و شارەفمەندن. وتی: بنەماڵەکەیان زۆر کۆن نیە و، ئەندامانی بنەماڵەکەشیان تەنیا سەدەیەک ئەبێ بونەتە میر و سەردار... دوای ئەوەش وتی: جگە لە مێژوی پێغەمبەران و، پیاوچاکان، ئەوەندەی بتوانم لە رۆژگار و گوزەرانیان بزانم. ئیتر زۆر تامەزرۆی مێژو نیم. لە شانامە زیاتر، شتێکی لێ ناخوێنمەوە."

ئەمە شایەتیەکی گرنگە، لە زمانی پاشایەکی بابانەوە، کە مێژوی میرایەتی بابان تا ئەو سەردەمە نەنوسراوەتەوە. هۆی نەنوسینەوەی چی بوە؟ رەنگە هەر کەسە بە جۆرێ لێکی بداتەوە.

مێژویەکی سەربەخۆ کە روداوەکانی میرایەتی بابان لە سەرەتای دامەزرانیەوە تا کۆتایی بگێرێتەوە لە سەردەمی خۆی دا نەنوسراوە، بەڵام لە زۆر سەرچاوەی ئەو سەردەمە و، لە هی دوێ دا و، هەواڵەکانیان و، دەنگوباسیان هەیە:

## 1. سەرچاوەکانی دەستی یەکەم

### 1. 1. بە زمانی فارسی

#### 1. 1. 1. شرف خان بدلیسی "شرفنامە"

ئەمیر شەرەف خانی بتلیسی ساڵی 1005 ه ق لە نوسینی "شەرەفنامە" بۆتەوە.
شەرەفنامە بە فارسی 3 جار بڵاو کراوەتەوە:
یەکەمین جار ساڵی (1276 / 1860 ز) لە لایەن "ولادمیر ولیامینوف زرنوف" لە پێتەربورگ.
دوەمین جار ساڵی 1930 لە لایەن "فرج الله ذکی الکردی" لە قاهیرە.
جاری سێهەم ساڵی 1343 ه ش لە لایەن "محمدی عباسی" هەمان چاپی قاهیرە بە ئۆفسێت لە تاران.

"شەرەفنامە" لە ریزی میرایەتییەکانی کوردا، بەشێکی تەرخان کردوە بۆ میرایەتی بابان. ئەمە یەکەمین سەرچاوەیە باسی میرایەتی بابان ئەکا تا ساڵی تەواو بونی کتێبەکە.

"شەرەفنامە" لەلایەن دو نوسەری شارەزای مێژی کوردەوە بە جیا کراوە بە عەرەبی: محمد جمیل بندی الروژبیانی و، محمد علی عونی. هەردوکیان پێشەکی و پەراوێزی بە نرخیان بۆ نوسیوە. هی یەکەمیان ساڵی 1953 لە بەغداد و، هی دوەمیان ساڵی 1958 لە قاهیرە چاپ کراوە.

"شەرەفنامە" کراوە بە تورکی و، بە هەندێ لە زمانە ئەوروپییەکان لەوانە ئەڵمانی و روسی.

مەلا مەحمودی بایەزیدی لە نیوەی دوەمی چەرخی رابردودا کردویەتی بە کوردی و، هەندێ بەشی تری بۆ زیاد کردوە.

حەفتەنامەی "پێشکەوتن" ی سلێمانی لە ژمارەی 24 ی 7 ی ئۆکتۆبەری 1920 ەوە بە زنجیرە چەند بەشێکی لە "شەرەفنامە" وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و لە ژێر ناونیشانی "نەسەبی تەوائیفی کوردان و رەوشتیان" دا بڵاوی کردۆتەوە.

سەرەتاکەی بەم جۆرە دەس پێ کردوە: "نەسەب و تەوائیفی کوردان و رەوشتیان خوا چاکتری دەزانێ بەڵام شەرەف خان کوری شەمسەدینی بدلیسی 332 ساڵ لە مەوپێش لە شەرەفنامەدا وای فەرموە:..."

هەژار کردویەتی بە موکریانی و، دو کەرەت: جارێک لە نەجەف و جارێک لە تاران چاپ و بڵاوی کردۆتەوە.

باوکی شەرەفخان و بنەماڵەکەیان و ئێلەکەیان بە هۆی هەلومەرجی ئاڵۆزی کوردستانەوە ماوەیەک ئاوارەی ئێران بون. باوکی شەرەفخان میرێکی ناسراوی سەردەمی خۆی و، پایەبەرز و بەرێز بوە لای شا تەهماسبی صەفەوی. شەرەفخان بە منداڵی لە گەڵ شازادە و ئەمیرەکانی ئێران بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندن براوەتە دەرباری صەفەوی. دیارە شەرەفخان خۆشی پیاوێکی لێهاتو و زیرەک و کارامە بوە. کە گەورەش بوە ماوەیەک لە دەرباری صەفەویدا سەرپەرشتی کاروباری میرایەتییە کوردییەکانیان پێ سپاردوە. شەرەفخان ئاگاداری و زانیارییەکی زۆری لەسەر کورد و نیشتمانەکەی و میر و دەسەڵاتدارەکانی کۆکردۆتەوە. هەروەها ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی مێژویی خوێندۆتەوە. شەرەفنامە یەکەمین مێژوی گشتی کوردە.

### 1. 1. 2. قاضی ملا محمد شریف سنندجی: "زبده التواریخ"

ساڵی 1214 ه ق (1799 ز) بە فارسی نوسیویتی.

هێشتا دەسنوسە و چاپ نەکراوە. تەنیا دەسنوسی زانراوی لە زانستگای کامبریجی بەریتانیایە. فیلمێکی بە ژمارە /5769 لە "کتابخانەی مرکزی دانشگاه تهران" هەیە.

هەمو مێژونوسەکانی ئەردەڵان کەڵکیان لە "زبدە" وەرگرتوە. هەروەها "لورنس لکهارت" بۆ نوسینی "انقراض سلسله صفویه".

### 1. 1. 3. خسرو بن محمد بن منوچهر اردلان: "لب التواریخ"

ساڵی 1249 ه ق (1833 ز) بە فارسی نوسیویتی.

ساڵی 1356 ه ش لە تاران چاپ کراوە. وێنەی دەسخەتی ئەم کتێبە لە گەڵ لێکۆڵینەوەیەک بە ڕوسی لە یەکێتی سۆڤێتی جاران چاپ کراوە.

### 1. 1. 4. ماه شرف خانم (مستوره): "تاریخ اردلان"

ساڵی 1263 ه ق (1847 ز) بە فارسی نوسیویتی.

ساڵی 1343 ه ش لە سنه بە اهتمام "ناصر ازادپور" چاپ کراوە.

د. حەسەن جاف و شکور مستەفا "تاریخ اردلان" یان کردوە بە کوردی. لە بەغدا چاپ کراوە.

### 1. 1. 5. عبد القادر ابن رستم بابانی: "تاریخ وجغرافیای کردستان، موسوم بە: سیر الاکراد"

ساڵی 1268 ه ق(1851 ز) بە فارسی نوسیویتی.

ساڵی 1366 ه ش لە تاران بە اهتمام "محمد رئوف توکلی" چاپ کراوە.

ئەم کتێبە جگە لە مێژوی ئەردەڵان. بەشێکی بۆ مێژوی بابان و سۆران و موکریان تەرخان کردوە.

ئەوەندەی پەیوەندی بە مێژوی بابانەوە هەبێ:

1. پێ ئەچێ نوسەر پشتی بە گێڕانەوەی دەماودەمی ڕوداوەکانی مێژوی بابان بەست بێ. نەک بە کتێبی نوسراو و. تۆماری حوکمڕانەکان. بۆیە:
2. ساڵەکانی تێکەڵاو کردوە. بە دەگمەن ساڵێکی بە دروستی نوسیوە. لەبەر ئەوە هیچ کام لەساڵەکانی جێگای باوەڕ نین بۆ دیاریکردنی ڕوداوەکانی مێژوی بابان.
3. زنجیرەی حوکمڕانەکانی تێکەڵاو کردوە. پاش و پێشی کردون. هەندێ لە حوکمڕانەکانی کردوە بە کوڕی هەندێکی تر و. هەندێکی کردوە بە برا و باوکی یەکتری، کە لە ڕاستی‌دا وانیە. لە بەر ئەوە بۆ ئەمەش جێگای باوەڕ و پشت پێ بەستن نیە.
4. هەندێ لە گێڕانەوەکانی بەشێوەی سەرگروشتە و ئەفسانە نوسیوە. نرخی مێژویی و زانستی‌یان نیە.
5. زانیاری‌یەکانی لە سەر دوا ساڵەکانی تەمەنی میرایەتی بابان هەندێ باسی بەکەڵکیان تێ دایە. بە تایبەتی پاش تاووتوێ و بەراورد کردن. دەربارەی ڕوداوەکانی سەردەمی: مەحمود پاشا. ئەحمەد پاشا، سلێمان پاشا، عەبدوڵا پاشا و عەزیز بەگی بابان.
6. دەربارەی بنەماڵەی صاحێبقڕان. کە نوسەر خۆی یەکێ بوە لەوان. هەندێ بابەتی تازەی تێ دایە بەتایبەتی دەربارەی مەحمود بەگ، کە باوکی مستەفا بەگی کوردی بوە. بە پێی گێڕانەوەی ڕوداوەکان

ئەبێ نوسەر ئامۆزای سالم و کوردی بێ. هەروەها هاوزەمانی ئەوانیش بوە. کەچی سەیر ئەوەیە ناوی ئەم دو شاعیرە نابات. تۆ بڵێی ناوی نەبیست بێ یا لە سەر دەمی نوسینەکەی ئەودا هێشتا نەناسراو بوبێ؟

بڵاو کردنەوەی ئەم کتێبە لە لایەن کاک "محمد رئوف توکلی" یەوە ڕەنجێکی باش و کارێکی بە کەڵکە بۆ مێژوی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد. جێگەی سوپاس و شایانی ئافەرینە. بەڵام ئەبوایە بایەخێکی زیاتری بدایە بەساغکردنەوەی زانیاریی‌یەکانی و. ڕاستکردنەوەی چەوتی‌یەکانی. بۆ ئەوەی بابەتی دروستکراو و ناڕاست بە سەر خوێنەردا تێ پەڕی نەکردایە، بەتایبەتی سەرچاوەی باوەڕپێکراو لەم بارەیەوە کەم نین.

### 1. 1. 6. علی اکبر وقائع نگار کردستانی: "حدیقەی ناصری در جغرافیا وتاریخ کردستان"

ساڵی 1309 ه ق (1891 ز) بە فارسی نوسیویێتی.

ساڵی 1364 ه ش لە تاران بە اهتمام "محمد رئوف توکلی" چاپ کراوە.

عەلی ئەکبەر لە ناو کتێبەکەی دا چەند جارێ باسی کتێبێکی خۆی ئەکات بە ناونیشانی "تاریخ الاکراد". تائێستا ئەم کتێبە لە هیچ لایەک دەنگوباسی نیە. ڕەنگە دۆزینەوەی هەندێ لایەنی تاریکی ناوچەکە ڕون بکاتەوە.

عەلی ئەکبەر ئامۆزای مەستورە بوە.

### 1. 1. 7. میرزا شکرالله سنندجی (فخر الکتاب): "تحفەی ناصری در تاریخ وجغرافیای کردستان"

ساڵی 1319 ه ق (1901 ز) بە فارسی نوسیویێتی.

ساڵی 1366 ه ش لە تاران بەاهتمام "دکتر حشمت الله طبیبی" لە لایەن "انتشارات امیر کبیر" چاپ کراوە.

### 1. 1. 8. شێخ محمد مردوخ کردستانی: "تاریخ مردوخ"

لە دو بەرگ دا لە چاپخانەی ئەرتەش لەتاران چاپ کراوە. ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە سەر نەنوسراوە. جارێکی تریش لەلایەن "کتابفروشی غریقی" لە سنە بڵاو کراوەتەوە. ئەمە تازەترینی هەمو مێژوەکانە.

ئەم مێژوانەی سەنەندوجی، خەسرەوی ئەردەڵان، مەستورە، فەخرولکوتتاب، وەقائیع نیگاری کوردستانی، مەردوخ:

1. هەمویان نوسینەکانی پێش خۆیان دوبارە کردۆتەوە. زۆر کەم باس و بابەتی تازەیان تێ دایە مەگەر ئەوەی لە سەردەمی نوسەر خۆی دا ڕوی دابێ.
2. لە گێڕانەوەی ڕوداوەکان دا زۆر جار بێلایەنیی لە دەست ئەدەن. لە ناکۆکی ڕۆم و عەجەم دا لایەنی ئێران ئەگرن و. لە ناکۆکی نێوان بابان و ئەردەڵان دا بە لای ئەردەڵان دا ئەشکێنن.
3. هەواڵەکانی بابان لە پەیوەندی لە گەڵ ڕوداوەکانی ئەردەڵان دا ئەگێڕنەوە. هەرچەندە کەم و کورتن بەڵام گرنگ و بە نرخن.

### 1 . 1 . 9. رەنجوری:

شاعیرێکی گەورەی کورد و ئەستێرەوانێکی شارەزا بوە. چەندین کتێبی زانستی نوسیوە و نوسیوەتەوە. لە پەنای یەکێک لە کتێبەکانی‌دا چەند هەواڵنامەیەکی کورتی نوسیوە. یەکێکیان "تاریخ والیهای کوردستان" ە تا ئەورەحمان پاشا گەیشتوە. رەنجوری چونکە نزیک بوە لە داوودەزگای بابانەوە، هەواڵەکانی ورد و جێگەی باوەڕن.

ئەم تەقویمە بەنرخە لە لایەن کاک عەبدولرەقیب یوسف دۆزراوەتەوە و، پاش ساغ کردنەوە و لێکۆلینەوەی لە گۆڤاری "رۆشنبیری نوێ - 1985" دا بڵاوی کردۆتەوە.

### 1 . 1 . 10. ابو الحسن بن محمد امين گلستانه: "مجمل التواريخ"

ئەم کتێبە ساڵی 1196 نوسراوە و چەند جارێ چاپ کراوە. دوایینیان بە اهتمامی مدرس رضوی لە تاران ساڵی 2536 شاهنشاهی لە لایەن "دانشگاه تهران" ەوە بڵاو کراوەتەوە.

گولستانە هاوزەمانی نادر شا و کەریم خانی زەند بوە. لە سەردەمی نادر شا دا مامی نوسەر قەڵاداری قەڵایەک بوە لە کرماشان کە نادر کردویەتی بە دەبۆی هەڵگرتنی چەکی پێویست بۆ لەشکرکێشی بۆ سەر عێراق. نوسەریش لە کرماشان دانیشتوە. لە کاتی لەشکرکێشی کەریم خانی زەندا بۆ سەر کرماشان و سنە، ئەو لە کرماشان بوە و چۆتە سەردانی کەریم خان. نوسەر و بنەماڵەکەی ناحەزی کەریم خان بون. پاش ماوەیەک چوە بۆ پیرۆزگاکانی نەجەف و کەربەلا و لەوێوە هەڵاتوە بۆ هندستان.

ئەم کتێبە روداوەکانی ئێران بە درێژایی 35 ساڵ لە کوژرانی نادر شاوە دەگێرێتەوە و باسی سەردەمی حوکمڕانیی کەریم خان دەکا. گەلێ هەواڵی بەنرخی لە سەر کورد تێ دایە، لەوانە لە سەر سەلیم پاشای بابان و حەسەنعەلی خانی ئەردەڵان.

### 1 . 1 . 11. ميرزا محمد صادق موسوى نامى اصفهانى: "تاريخ گيتى گشا در تاريخ زند"

نامی هاوزەمانی کەریم خان و حوکمڕانەکانی زەند بوە. روداوەکانی بەشێوەی "حوليات" و بە کورتی نوسیوە. لە بەر ئەوەی لە دەزگای حوکمڕانی‌یەوە نزیک بوە گێرانەوەکانی جێگای باوەڕن.

سعید نفیسی، ئەم کتێبەی ساغ کردۆتەوە و، پێشەکی بۆ نوسیوە و، لە تاران چاپ کراوە.

### 1 . 1 . 12. عبدالرزاق دنبلى: "ماثر سلطانية"

ئەم کتێبە: "ماثر سلطانية" لە لایەن "عبدالرزاق دنبلی"ەوە بە زمانی فارسی، لە سەر داوای عەباس میرزا نائیبولسەلتەنەی ئێران، نوسراوە.

روداوەکانی ئێران لە (1214 ە ق تا 1241 ە ق/ 1799 - 1825 ز) دەگێرێتەوە. مەرگ مۆڵەتی نەداوە لەوە زیاتر درێژەی پێ بدا.

عەبدورەزاق بەگی دونبولی (1167- 1242 ک/ 1753 - 1826 ز) مێژونوس و، ئەدیب و شاعیر، کوڕی نەجەفقولی کوڕی شابازخانی دونبولی‌یە. ئێلی دونبولی کوردی یەزیدی بون. بە تێپەڕینی زەمان بون بە شیعە و، لە ناو کۆمەڵی نازەری دا لە تەورێز و نازەربایجان دا جێگای خۆیان کردۆتەوە. داوباپیری عەبدورەزاق لە زەمانی صەفەوی‌یەکانەوە لە دەزگا حکومەتی‌یەکانی ئێران دا پلەی بەرزیان هەبوە. باوکی عەبدورەزاق سەردەمی بەگلەربەگی نازەربایجان بوە. بەڵام عەبدورەزاق لە

سەردەمی کەریم خانی زەند دا 14 ساڵ بە بارمتە لە شیراز گل دراوەتەوە. ماوەی گلدانەوەی خۆی بە خوێندنەوە خەریک کردوە. کە دەسەڵاتی زەند ئەما گەڕایەوە تەوریز لە دیوانی عەباس میرزا دا بو بە "مونشی: سکرتێر".

چەندین کتێبی نوسیوە لە وانە "تاریخ دنابلە: مێژووی دونبولی‌یەکان" و، بە نازناوی مەفتون شیعری زۆری داناوە.

"ماثر سلطانیة" باسەکانی تەرخان کراوە بۆ ڕوداوەکانی ئێران لە سەردەمی دامەزرێنەری سەڵتەنەتی قاجار: ئاغا محەمەد خان و، دوای ئەو فەتح عەلی شاە دا. شەڕەکانی ئێران و ڕوس و، هاتوچۆ و گفتوگۆ دیپلۆماسیەکانی نوێنەری ئێران، تورکیا، ڕوسیا، فەرەنسا، بە دریژی ئەگێڕێتەوە. تێکستی فارسی ڕێککەوتننامەی یەکەمی ئەرزڕومی تێ دایە.

بابەتەکانی ئەم کتێبە ساڵ لە دوای ساڵ ڕێک خراوە بە شێوەی "حولیات".

"ماثر سلطانیة" لە چەندین جێگادا هەواڵ و دەنگوباسی کوردی نوسیوە.

هەواڵەکانی ئەگونجێ بە دو جۆر دابەش بکرێن:

یەکێکیان هەواڵی پچڕپچڕی بڵباس، شکاک، حەیدەرانلو و ئێلەکانی تری ئازەربایجان و، هەکاری‌یە.

ئەوی تریان هەواڵی ڕێکوپێکی ململانێی دەسەڵاتە لە نێوان ئەوڕەحمان پاشای بابان لە لایەک و، والی‌یەکانی بەغداد و، شازادە محەمەد عەلی میرزای قاجار لە لایەکی ترەوە. دوای ئەویش ناکۆکی نێوان هەردو پاشای بابان: مەحمود و عەبدوڵڵا و، ململانێی مەحمود پاشا لە لایەک و، والیەکانی بەغدا و شازادە محەمەد عەلی میرزا و شازادە عەباس میرزای قاجار لە لایەکی ترەوە. لەم لایەنەوە بۆ لێکدانەوەی مێژوی بابان سەرچاوەیەکی بە کەڵکە.

نوسەر چونکە لە دەزگای دەسەڵاتدارەوە نزیک بوە، ئاگاداری ڕوداوەکان بوە. بەڵگە گرنگەکانی دیوە. ساڵی ڕوداوەکانی بەوردی دیاری کردوە. بەڵام هەواڵەکانی لە باری سەرنجی ڕەسمیی کاربەدەستانی ئێرانەوە نوسیوە. لە گێڕانەوەدا پارێزگاری بێلایەنی نەکردوە. بەئاشکرا هەمیشە بەلای عەجەم دا دائەشکێنێ و، هیچ هاودەردی‌یەک لە گەڵ کورد دەرنابڕێ. بگرە چەند جارێ بە "اکراد بدنژاد: کوردانی بەدرەسەن" ناویان ئەبا.

ئەم کتێبە ساڵی 1241 ە ق (1825) بۆ جاری یەکەم لە تەوریز چاپی سربی، واتە بەقورقوشم، چاپ کراوە. بە خەتێکی جوان نوسراوەتەوە. بەم پێیە یەکێکە لە کتێبە چاپکراوە کۆنەکان. جاری دوەم ساڵی 1329 ش لە سەر هەمان چاپی یەکەم بە ئۆفسێت بە "اهتمام: غلام حسین صدری افشار" لە تاران چاپ کراوەتەوە.

### 1. 2. بە زمانی تورکی

### 1. 2. 1. نظمی زادە، مرتضی افندی: "گلشن خلفا"

"گولشەن" بە کورتی باسی مێژوی مرۆڤ ئەکا و، دێتە سەر خەلیفەکانی ئەمەوی و عەباسی و، سوڵتانەکانی عوسمانی. لە دوا لاپەڕەکانی دا باسی میر سلێمان و میر بەکر ئەکا. ئەو هەڕەشەنامەیەی بۆ میر سلێمان نوسراوە، بە قەڵەمی نوسەری گوڵشەن نوسراوە و، لەم کتێبەدا تۆمار کراوە.

موسی کاظم نورس، "گوڵشەنی خولەفا" ی لە تورکی‌یەوە کردوە بە عەرەبی و بڵاوی کردۆتەوە.

### 1. 2. 2. الشیخ رسول حاوی الکرکوکلی: "دوحه الوزراء فی تاریخ وقائع بغداد الزوراء"

رەسول حاوی کەرکوکی، کوڕی مەلا یەعقوبی ماهونی، نوسەر و شاعیر بوە. نوسینەکانی بە تورکین. لە کەرکوک ژیاوە و خوێندویەتی و گەورە بوە. وەکو "عەباس عەزاوی" لە زمانی "هیجری دەدە" وە ئەگێڕێتەوە، ئەبێ لە گەڵ بنەماڵەی ئەوان خزم بوبێ. بەو پێیە ئەبێ کورد بێ. حاوی پاشان چۆتە بەغداد و، لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی دا بۆتە موچەخۆری دەوڵەت.

نوسەر خۆی ئەڵێ، ئەم مێژوەی بۆ تەواو کردنی مێژوی "گوڵشەنی خولەفا" نوسیوە. روداوەکانی لە (1132/ 1719 ز) ەوە دەس پێ ئەکا و، لە ساڵی (1237/ 1821 ز) دا ئەیبڕێتەوە. حاوی ساڵی 1242 ک (1826 ز) مردوە. پێ ئەچێ نەخۆشیی یا کۆسپی تر ڕێگەیان نەدابێ مێژوەکەی تا ئەوسا درێژە پێ بدا.

ئەم کتێبە بەڵگەی بە نرخ و، هەواڵ و دەنگوباسی زۆری تێ دایە، بۆ لێکۆڵینەی مێژوی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناوچەکە و، بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی میرایەتی بابان، سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی دەوڵەمەندە.

1. نوسەر لە ناکۆکییەکانی نێوان ئێران و عوسمانی دا پشتیوانی لە عوسمانی ئەکا و، روداوەکان لە باری سەرنجی ئەوانەوە ئەگێڕێتەوە.
2. نوسەر لە ناکۆکییەکانی نێوان والییەکانی بەغداد و میرەکانی بابان دا پشتیوانی لە والییەکانی بەغداد ئەکا.
3. ئەگەرچی نوسەر، لە سەر داوای داود پاشا، ئەم مێژوەی نوسیوە، بەڵام لە گێڕانەوەی روداوەکان دا بێ ویژدانی ناکا.
4. لە بەر ئەوەی توانیویەتی بەڵگەکانی حکومەت ببینێ و، نزیکی کاربەدەستان بوە، بە وردی چۆتە بنجوبناوانی روداوەکان و، تا ئەندازەیەکی باش لە دیاری کردنی ساڵەکانی دا ورد بوە.
5. جگە لە باسی بابان، هەندێ باسی گرنگی تری تێ دایە دەربارەی ئێلی بلباس.

"دوحە" ساڵی 1246 ک (1835 ز) بە سەرپەرشتی محمد باقر التفلیسی لە چاپخانەی "دار السلام" چاپ کراوە.

"دوحە" لە لایەن "موسی کاظم نورس" کراوە بەزمانی عەرەبی و، دوجار بڵاوکراوەتەوە: جاری یەکەم لە بێروت - لوبنان و، جاری دوەم ساڵی 1413 ە ق هەمان چاپی بێروت بە ئۆفسێت لە قوم - ئێران لە لایەن "منشورات الشریف الرضی" سەرلەنوێ بڵاو کراوەتەوە.

### 1. 2. 3. سلیمان فائق بگ: "تاریخ الممالیک الکولمند فی بغداد"

نوسەر: سلێمان فایەق بەگ کوڕی حاجی تالیب کەهیای داود پاشا بوە.

کتێبەکەی بە ناوی نهێنی "ثابت" لە ساڵی 1875 ز لە ئەستەموڵ چاپ کردوە.

روداوەکانی ساڵانی 1749 - 1836 ز بە کورتی ئەگێڕێتەوە. هەندێ هەواڵ و دەنگوباسی بابانیشی تێ دایە، بەڵام بە هۆی ڕیشەی بنەماڵەکەیەوە، بەلای عوسمانییەکان دا، دای شکاندوە. لە گەڵ ئەوەش دا باسەکانی بە نرخ و جێگەی باوەڕن. محمد نجیب ارمناوی کردویەتی بە عەرەبی.

### 1. 3. بە زمانی عەرەبی

### 1. 3. 1. عثمان بن سند الوائلي البصري: "مطالع السعود"،

تحقيق: الدكتور عماد عبدالسلام رووف وسهيله عبدالمجيد القيسي، (موصل 1991).

عثمان بن سند، لە یەکێ لە جزیرەکانی خلیج لە دایک بوە، سەرەتەی لە لای مەلا عەبدوڵای بیتوشی خوێندویەتی. دوایی لە بەصرا نیشتەجێ بوە و، چەند جارێ سەردانی بەغدای کردوە. نوسەر کتێبەکەی لە سەر داوای داود پاشا نوسیوە. لە بەرئەوە بەڵگە ڕەسمییەکانی لە بەردەس دا بوە. مێژوەکەی لە ساڵی لە دایک بونی داود پاشاوە دەس پێ ئەکا، پێش لابردن و گیرانی داود پاشا بە چوار ساڵ کۆتایی بە باسەکانی هێناوە. ڕەنگە مردن مۆڵەتی درێژەپێدانی نەدابێ.

هەواڵ و دەنگوباسی میرەکانی بابان لە ناو باسەکانی "مطالع السعود" دا زۆرە. نوسەر سوننییەکی توندڕەو بوە، لەم ڕوانگەیەوە لە ناکۆکییەکانی نێوان ئێران و عوسمانی دا بە توندی پشتیوانی لە دەوڵەتی عوسمانی ئەکا و، لە ناکۆکییەکانی نێوان میرەکانی بابان و والییەکانی بەغدادا، بە توندی پشتیوانی لە کاربەدەستانی عوسمانی ئەکا، بەڵام بە ڕێزەوە ناوی کورد ئەبا. کە ئەوڕەحمان پاشای بابان لە گەڵ والیی بەغدا بو بە شەڕی، بن سند هێرشی کردۆتە سەری، کەچی شیعرێکی درێژی لە ستایشی دا نوسیوە بە بۆنەی بەرپەرچدانەوەی هێرشەکەی محەمەد عەلی میرزاوە لە کۆیە. ئەو شیعرەی ئەخستۆتە ناو ئەم کتێبەوە.

بن سند، مێژوەکەی بە زمانێکی گران و، بە"سەجع" ێکی سەخت نوسیوە، ژمارەیەکی زۆری شیعرەکانی خۆی تێ هەڵکێش کردوە. زۆری شیعرەکانی پێوەندییەکی ئەوتۆیان لە گەڵ باسەکان نیە.

"امین الحلواني" ئەم مێژوە کە ناوی: "مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داود" ە، کورت کردۆتەوە و شیعرەکانی لێ دەرهێناوە و، هەندێ هەواڵی زیادی خستۆتە سەری بە ناوی "مختصر مطالع السعود" ەوە. "مختصر" لە پێش "مطالع" دا دوجار چاپ کراوە: جارێک لە بەمبەی و جارێک لە قاهیرە.

ئەو کاتەی م. خالیدی نەقشبەندی کەوتۆتە بەر هێرشی توندوتیژی ناحەزەکانی، عثمان بن سند، بۆ دیفاع لە م. خالید کتێبێکی درێژی لە ژێر ناوی:

"اصفى الموارد فى سلسال احوال الامام خالد" دا نوسیوە.

### 1. 3. 2. ياسين العمري: "غرائب الاثر، في حوادث ربع القرن الثالث عشر"

نشره: محمد صديق الجليلي، الموصل 1940.

العمري، وەکو خۆی نوسیوێتی، مێژوەکەی ڕوداوەکانی چارەکە سەدەیەکی گرتۆتە خۆی. ئەو باسە سەیر و سەمەرانەی بیستویەتی، کە هەندێکی ڕەنگە خورافیات و هەڵبەستی سەرزار بێ، هەموی تۆمار کردوە. بەڵام بایەخێکی تایبەتی داوە بە ڕوداوە سیاسییەکان. لە دەزگای حوکمڕانیی ئال جەلیلی نزیک بوە و، ئاگاداری ڕوداوەکان بوە.

لە "غرائب" دا دەنگوباسی میرەکانی بابان و بادینان هەیە. بەڵام شتێکی ئەوتۆی زیاتر نیە لە گەڵ دەنگوباسەکانی ناو "دوحە" و"مطالع".

"ئەلعومەری" نوسەرێکی بە برشت بوە. گەلێ کتێبی مێژوویی تری نوسیوە.

لە ناو هەندێکیان دا بە کورتی هەواڵی کورد هەیە. لەوانە:

"زبده الاثار الجليه". حققه: عماد عبدالسلام رووف، النجف 1974.

### 1. 3. 3. شیخ عبدالرحمن السویدی: "حدیقه الوزراء"

بەشی یەکەمی لە بەغداد چاپ کراوە. بەڵام بەشەکانی تری هێشتا دەستنوسن. لە بەشی یەکەمیدا شتێکی ئەوتۆی دەربارەی بابان تێ دا نیە. بەڵام وەکو لە سەرچاوەکان دا نیشارەتی پێ کراوە، لەم کتێبە دا، چەندین شیعری سیاسی و مێژویی هەیە سەبارەت بە سەرکەوتنی والیەکانی بەغداد بە سەر میرەکانی بابان دا، لەوانە: شەڕی قەمچوغە و سرۆچک (1164/ 1750)، شەڕی کۆشکی زەنگی (1176/ 1762 ز). ئەم شیعرانە نرخی مێژوییان هەیە. من دەستم نەکەوتن.

### 1. 4. بە زمانە ئەوروپی‌یەکان

#### 1. 4. 1. گەشتی ریچ

CLAUDIUS JAMES ,RICH:
NARRATIVE OF A RESIDANCE IN KOORDISTAN,
LONDO 1836

کلۆدیۆس جەیمس ریچ، 1820 گەشتێکی بۆ کوردستانی بابان و ئەردەڵان کردوە. میر و مەزنەکانی کوردی دیوە و، بە دریژی گفتوگۆی لە گەڵ کردون. سەرنجەکانی خۆی بە وردی لە سەر هەلومەرجی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابوری، جوگرافی... رۆژانە تۆمار کردوە. هەندێ نیگاری جوانی مەزنێکی سلێمانی و، کابرایەکی خێڵەکی جاف و، دو سەربازی ئەردەڵان و، ژن و پیاوێکی نەستوری و، ژن و پیاوێکی یەزیدی و، شایی و زەماوەنی سلێمانی، کێشاوە. زنجیرەی حوکمڕانەکانی بابانی لە پاشکۆی کتێبەکەی دا نوسیوە. سەرچاوەیەکی نایاب و بە نرخە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو قۆناغەی ژیانی میرایەتی بابان.

بۆ یەکەمین جار حەفتەنامەی "پێشکەوتن" لە ژمارەی 19 ی 2 ی سێپتەمبەری 1920 ەوە بە زنجیرە چەند بەشێکی گرنگی یاداشتەکانی ریچی لە ژێر ناوی "صەد ساڵ لەمەوپێش" بەم پێشەکی‌یەوە بلاوکردۆتەوە: "صەد ساڵ لە مەوپێش قونسولوسێکی ئینگلیس لە بەغداد ناوی میستەر ریچ بو. لە بەر ئەمە کە ئەختێک ناخۆشی بو، سەفەرکردنی کوێستانی بە باش زانی بە قسەی هەنێ لە مەئمورەکانی بەغداد لە بەر ئەوەی هەتا ئەو رۆژە هیچ کەس لە مەئموری ئینگلیس بە خزمەت پاشاکانی سلێمانی نەگەیشت بو، سەفەری سلێمانی بەچاک دی. لەپاشا سەفەرنامەیەکی نوسیوە کە لێرەدا دەینوسینەوە."

ناجی عەباس یش چەند بەشێکی لێ وەرگێڕاوە و، لە ژێر ناوی: "گەشتی کلودیۆس ریچ لەکوردستان" لە گۆڤاری "گەلاوێژ" دا لە مانگەکانی ئاب و تشرینی دوەمی 1947 دا، بلاوی کردۆتەوە.

بهاء الدین نوری، ئەم گەشتەی کردۆتە عەرەبی و لە ژێر ناوی "رحله ریچ" دا ساڵی 1951 لە بەغداد چاپی کردوە.

محەمەد حەمە باقی، گەشتەکەی لە عەرەبی‌یەوە کردوە بە کوردی و، لە ژێر ناوی: "گەشتەکەی ریچ بۆ کوردستان 1820" دا، ساڵی 1992 لە تەورێز چاپی کردوە.

**1. 4. 2. گەشتی فرەیزەر**

:FRASER, J. B

TRAVELS IN KOORDSTAN. MESOPOTAMIA, etc

LONDON 1840

جیمس بیلی فرەیزەر ساڵی 1835 گەشتێکی کردوە بە کوردستانی موکریان و بابان دا. ماوەیەکی کورت لە سلێمانی ماوەتەوە. پاشای بابانی دیوە. سەرنجەکانی خۆی بە نامە نوسیوە. باس و بابەتی گرنگیان تێ دایە لە سەر میرایەتی سۆران و بابان و. هەلومەرجی ئەو سەردەمە.

ئەمین زەکی"لە تاریخی سلێمانی" دا کەڵکی لەم سەرچاوەیە وەرگرتوە.

فلامورز (ڕەشید نەجیب) لە سەرەتای چلەکان دا هەندێ بەشی لەم گەشتە کردۆتە کوردی و. لە ژێر ناوی "گەشتێک لە کوردستان دا" بە زنجیرە لە ژمارەکانی کانونی یەکەمی 1939 تا نیسانی 1941 ی "گەلاوێژ" دا بڵاوی کردۆتەوە.

ئەو بەشانەی پەیوەندییان بە عیراقەوە هەیە لە ژێر ناوی: "رحلە فریزر الی بغداد 1834" کراوە بە عەرەبی و. لە بەغدا ساڵی 1964 بڵاو کراوەتەوە.

**1. 5. بە زمانی کوردی**

**1. 5. 1. دیوانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی**

**1. 5. 2. دیوانی نالی**

**1. 5. 3. دیوانی سالم**

**1. 5. 4. دیوانی ڕەنجوری**

**1. 5. 5. دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی**

**1. 5. 6. دیوانی حاجی قادری کۆیی**

## 2. سەرچاوەکانی دەستی دووەم

### 2. 1. بە زمانی کوردی

#### 2. 1. 1. محەمەد ئەمین زەکی:

**"خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان"**

"تاریخی سلێمانی و وڵاتی"

"ناودارانی کورد"

"خولاصەیەکی تاریخی.." لە سییەکان دا بە 3 جزم لە بەغداد، هەروەها "تاریخی سلێمانی" چاپ و بڵاو کراوەتەوە. سەیدیان، هەر 3 جزمەکەی "تاریخی کورد و کوردستان" بە یەکەوە، بە ئۆفسێت سەرلەنوێ لە ئێران چاپ کردۆتەوە.

محمد علی عونی، هەر 3 بەرگی "خولاصەیەکی تاریخی.." لە ژێر ناوی "خلاصە تاریخ الکرد و کردستان" و"تاریخ الدول و الامارات الکردیە" دا وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لێدوان و پەراوێزی بۆ نوسیوە و، یەکەمیانی ساڵی 1939 لە قاهیرە چاپ کردوە و، ساڵی 1961 سەر لە نوێ لە بەغداد چاپ کراوەتەوە. دوەمیشیان لە ساڵی 1945 دا لە قاهیرە چاپ و بڵاو کردۆتەوە.

محمد جمیل بندی الروژبیانی، "تاریخی سلێمانی" لە ژێر ناوی "تاریخ السلیمانیە وانحاءها" کردۆتە عەرەبی و، ساڵی 1951 لە بەغداد چاپی کردوە.

سانیحەی کچی ئەمین زەکی یش "ناودارانی کوردی" کردۆتە عەرەبی و ساڵی 1945 لە بەغداد چاپی کردوە.

ئەمین زەکی بەگ زانایەکی گەورە بوە. شارەزاییەکی زۆری لە زانستە جەنگییەکان، هەروەها لە مێژوی کورد و ناوچەکەدا هەبوە. چەندین زمانی رۆژهەڵاتی و ئەوروپایی زانیوە. زۆر کتێبخانەی گەورەی ئەوروپا گەڕاوە. سیاسییەکی کوردپەروەر و دڵسۆز بوە.

دوای "شەرەفخانی بتلیسی" ئەمین زەکی بەگ گەورەترین مێژونوسی کوردە.

نوسینەکانی زانستی و هێژان. سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی کورد.

لە هەمو کتێبە مێژوییەکانی دا باسی میرایەتی و میرەکانی بابانی کردوە. لە "تاریخی سلێمانی" دا بە درێژی لە سەری نوسیون. کەڵکی لە زۆر سەرچاوەی دەستی یەکەم وەرگرتوە. نوسینەکەی بایەخێکی زۆری هەیە.

#### 2. 1. 2. حسێن حوزنی:

حوزنی رۆژنامەوان و ئەدیب و نوسەرێکی گەورەی کوردە. زۆر بابەتی مێژویی نوسیوە، لەوانە: "تاریخی حوکمرانی بابان لە شارەزور و ئەردەڵان" کە ساڵی 1931 لە رەواندز چاپی کردوە و، "مێژوی میرایەتی سۆران" کە بۆ جاری دوەم لە سەرەتای شەستەکان دا لە هەولێر چاپ کراوەتەوە.

حوزنی، نەتەوەکەی خۆی زۆر خۆش ویستوە. حەزی کردوە وەکو نەتەوەیەکی خاوەن رابردوی پرشنگدار و سەروەریی پیشان بدا. لە ناو نوسینەکانی دا ئاگاداری و دەنگوباسی مێژویی زۆری تێ دایە. بەڵام هەندێ باس و بابەتی تێ دایە بە هیچ سەرچاوەیەک پشت ئەستور نین. لەبەرئەوە ئەبێ بە وریاییەوە پاش تاووتوێ کردن باسەکانی لێ وەربگیرێ.

### 2. 1. 3. حسێن نازم ڕۆژنامەوانێکی سەرەتای بیستەکانە.

چەند جارێ نوسەر و سەرنوسەری ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحمود بوە لەوانە دواژمارەکانی حەفتەنامەی "ئومێدی ئیستیقلال". ڕۆشنبیرێکی شارەزای مێژووی کورد و، کاروباری سیاسی بوە. تورکی و فارسی باش زانیوە. بە هەر 3 زمان وتاری نوسیوە.

ئەمین زەکی لە نوسینەکانی دا، دەربارەی بابان، زۆرجار پشت بە دەفتەرەکەی حسێن نازم ئەبەستێ وەکو سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو. دەفتەرەکە بەزمانی تورکی نوسراوە. ئەم دەفتەرە کاتی خۆی بڵاو نەکراوەتەوە، دەستنوسەکەشی ئێستا دیار نیە.

جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی یەک دو لاپەرەی، پاش ئەوەی وەریگێڕا بو بۆ کوردی، لە ژمارەی 4 ی ساڵی یەکەمی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" دا بڵاو کردەوە، بەڵام پێ ئەچێ کەشمەکەشی ڕۆژگار ماوەی نەدابێ تەواوی بکا.

### 2. 1. 4. تۆفیق قەفتان: "مێژووی حوکمداری بابان"

بەغداد 1969

ئەم نامیلکەیە ساغ نەبۆتەوە لە نوسینی تۆفیق قەفتان خۆیەتی، یان وەرگێڕاوە لە زمانێکی ترەوە. باسی بەنرخ و خۆشی تێ دایە. بەڵام ئیشارەتی بۆ هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی تێ دا نیە.

### 2. 1. 5. د. کاوس قەفتان:

د. قەفتان ئەگەرچی خۆی مامۆستای مێژو بوە. بەڵام لە نوسینەکانی دا زۆرتر خەریکی بابەتی ئەدەبی و، وەرگێڕانی بابەتی مێژووی کورد بوە لە ڕوسییەوە.

لەم بوارەدا چەند کتێبێکی بەنرخی جەلیلی جەلیل: "کوردەکانی ئیمپراتورییەتی عوسمانی" و"ڕاپەڕینی 1880" و، هی لازاریف: "کێشەی کورد" ی بڵاو کردۆتەوە. دەربارەی مێژووی کوردیش خۆی چەند وتارێکی لە ژێر ناوی: "چەند لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی میرنشینی بابان، سۆران، بۆتان" ساڵی 1985 لە بەغداد بڵاو کردۆتەوە. ئەم لێکۆڵینەوانە، بە تایبەتی ئەوانەی لە سەر بابان نوسراون، زۆر کەم ئاگاداریی مێژوی بە دەستەوە ئەدەن و، زیاتر بیروبۆچون و هەڵسەنگاندنەکانی خۆی تێ دا باس کردون.

### 2. 1. 6. علاء الدین سجادی:

عەلائەدین سەجادی، ڕۆژنامەوان، مێژونوس، ئەدیب و نوسەر چەندین کتێبی نوسیوە. لە ناو هەندێکیان دا باس و بابەتی لە سەر بابان تێ دایە لەوانە: "مێژووی ئەدەبی کوردی" و"دو چامەکەی نالی و سالم". لە ناو "ڕشتەی مرواری" یش دا هەندێ سەرگروشتەی بابانەکانی گێڕاوەتەوە.

لە "مێژووی ئەدەبی کوردی" دا "دو چامەکەی نالی و سالم" ئەگێڕێتەوە بۆ سییەکانی سەدەی نۆزدە. هەندێ لە مێژوناسەکانی کورد ئەمەیان بە لاوە ڕاست نەبو. چونکە شیعرەکان هی پەنجاکانی سەدەی نۆزدە و، هی دوای ڕوخانی میرایەتی بابانە. سەجادی بۆ سەلماندنی باری سەرنجی خۆی سەرلەنوێ "دو چامەکەی نالی و سالم" ی بڵاو کردەوە و، وشە گرانەکانی لێک دایەوە و، لە لێدوانەکەی دا سورە لە سەر بۆچونەکانی خۆی. بەڵام فاتیحی مەلا کەریم لە پێشەکی "دیوانی نالی" دا مەسەلەکەی بە جۆرێکی بنەڕەتی و بە بەڵگەی مێژوویی بە لادا خستوە.

## 2. 1. 7. جەمال بابان:

لەم ساڵانەی، دوایی‌دا، چەند لێکۆڵینەوە و کتێبی بە کوردی و عەرەبی لە سەر مێژوی بابان نوسیوە. لە نوسینەکانی دا پشتی بە ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی مێژویی باوەڕ پێکراو بەستوە. هێشتا هەموی بڵاو نەکراونەتەوە.

## 2. 2. بە زمانی عەرەبی

### 2. 2. 1. محمد القزلجی:

مەلا محەمەدی قزلجی، ئایینناسێکی شارەزا بوە. سەردەمێ هاوکاری لە گەڵ سمکۆ کردوە و، ئەم یەکێ بوە لەوانەی خەریکی چاپ و بڵاوکردنەوەی جەریدەی فارسی - کوردی: "کورد" بوە لە ورمێ. پاشان ڕوی کردۆتە قاهیرە بۆ خوێندن و، دوای شکانی جوڵانەوەکەی سمکۆ لە عێراق ماوەتەوە و، لە بەغداد نامەزراوە. ساڵی 1938 لە بەغداد بە زمانی عەرەبی نامیلکەیەکی لە ژێر ناوی: "التعریف بمساجد السلیمانیە ومدارسها الدینیە" دا بڵاو کردۆتەوە. ئەگەرچی نامیلکەکە بە قەوارە بچوکە، بەڵام لە زانیاری و هەواڵی میرایەتی بابان و میر و مزگەوتەکانی دا دەوڵەمەند و جێگای باوەڕە. پێ ئەچێ ژمارەیەکی زۆر لە دەستنوسەکانی مزگەوتی گەورەی سلێمانی دی بێ.

### 2. 2. 2. الشیخ محمد الخال:

شێخ محەمەدی خاڵ، زانایەکی ئایینناس و نوسەرێکی گەورە و پڕ بەرهەمی کوردی و عەرەبیە. جگە لە "فەرهەنگی خاڵ" و"تەفسیری قورئان" و"پەندی پێشینان"، چەندین کتێب و وتاری بە زمانی عەرەبی نوسیوە، لەوانە: "الشیخ معروف النودهی البرزنجی" کە ساڵی 1958 و، "البیتوشی" کە ساڵی 1961 لە بەغداد چاپی کردون. لە ناو هەردو کتێبەکەدا باس و بابەتی گرنگیان تێ دایە لەسەر بابان. نوسینەکانی شێخی خاڵ نرخدار و جێگای باوەڕن و، ئەنجامی لێکۆڵینەوە و تاوتوێ کردنی سەدان کتێبی دەستنوس و نامە و بەڵگەی مێژوییە، کە هەندێکیان ئەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی میرەکانی بابان.

### 2. 2. 3. عبدالکریم محمد المدرس:

مەلا کەریمی مودەڕیس، زانایەکی ئایینناس و نوسەرێکی گەورە و پڕ بەرهەمی کوردی و عەرەبیە. چەندین کتێبی لە سەر شەریعەتی ئیسلام و تەفسیری قورئان نوسیوە. دیوانی هەندێ لە شاعیرەکانی ساغ کردۆتەوە، ژیاننامەی هەندێ لە زاناکانی کوردی نوسیوەتەوە. لە ناو "دیوانی نالی" و"دیوانی مەولەوی" و"یادی مەردان" دا و، لە کتێبی: "علمائنا فی خدمة العلم والدین" کە ساڵی 1983 لە بەغداد بڵاو کراوەتەوە، هەندێ باس و بابەتی بابانەکانی تێ دایە.

### 2. 2. 4. المحامی عباس العزاوی:

"تاریخ العراق بین احتلالین"

ئەم کتێبە 8 بەرگە: ج1 /1935. ج2 /1936. ج3 و 4 / 1945. ج5 / 1953. ج6 /1954. ج7 /1955. ج8 /1956 لە بەغداد چاپ کراوە.

عەباس عەزاوی مێژونوسێکی عەرەبی عێراقیە. زمانی تورکی و فارسی زانیوە. ژمارەیەکی زۆر دەستنوس و بەڵگەی کۆنی لە لا بوە. سەردانی کتێبخانە گرنگەکانی ئەستەمبوڵی کردوە. چەندین کتێبی

مێژوویی لە سەر لایەنی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، فەرهەنگی، ئەدەبیی، دینیی... عێراق و دانیشتوانی نوسیوە.

"تاریخ العراق بین احتلالین" ی لە سەر شێوەی "حولیات" نوسیوە. لە داگیرکردنی بەغدادەوە لە لایەن مەغولەوە تا داگیرکردنەوەی بەغداد لە لایەن هێزەکانی بەریتانیاوە. گەنجینەیەکی گرانبەهایە بۆ مێژووی ناوچەکە. زۆری هەواڵ و دەنگوباس و ئاگاداری و زانیاری لە سەر کورد تێ دایە. لە بەرگەکانی 5 و 6 و 7 دا زۆری ڕوداوەکانی بابانی نوسیوە. هەواڵەکانی لە سەرچاوەی دەستی یەکەم و باوەڕپێکراو وەرگرتوە. زۆر کەم لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و باری سەرنجی خۆی تیا دەربڕیوە. بە زۆری ڕوداوەکانی گێڕاوەتەوە. بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی میرایەتی بابان سەرچاوەیەکی بەنرخە.

عەزاوی جگە لەم کتێبە زلە، چەندین کتێبی تری نوسیوە. لە ناو کتێبەکانی دا، زۆر باسی کوردی کردوە. بە تایبەتی: 4 بەرگی "عشائر العراق" کە باسی هەمو ئێل و هۆزە کوردەکانی عێراقی تێ دایە. "الکاکائیة فی تاریخ" و. "تاریخ الیزیدیة واصل معتقدهم" چاپ کراون. هەروەها "تاریخ شهرزور - السلیمانیة" و"تاریخ اربیل" ی نوسیوە بەڵام هێشتا بڵاو نەکراونەتەوە.

هەمو بەرگەکانی "تاریخ العراق بین احتلالین" بە ئۆفسێت لە لایەن "انتشارات الشریف الرضی - قم" لە ئێران پێکەوە ساڵی 1410 ھ ق چاپ کراوەتەوە.

### 2. 2. 5. الدکتور سلیمان عبدالعزیز نوار:

د. نەووار، مامۆستایەکی میصرییە. چەند کتێبێکی نوسیوە دەربارەی مێژووی عێراق لە وانە: "داود باشا والی بغداد" و"تاریخ العراق الحدیث". هەردو کتێبی لە قاهیرە چاپ کردوتەوە، یەکەمیان لە 1967 و دومیان لە 1968 دا.

د. نەووار کتێبی یەکەمی ساڵی 1958 وەکو نامەی ماجستێر و. کتێبی دومەی ساڵی 1963 وەکو نامەی دکتۆرا لە زانستی مێژودا بۆ "زانکۆی عەین شەمس" لە قاهیرە ئامادە کردوە. دوای ئەوەی ماوەی 3 ساڵ لە "زانکۆی بەغداد" دەرسی مێژووی وتۆتەوە، ئینجا نامەکانی، بێگومان پاش دەسکاری، بەو جۆرەی لەم دو کتێبەدا دارێژراونەتەوە لە قاهیرە بڵاو کردۆتەوە.

لە هەردو کتێبدا چەند بەشێکی بۆ میرایەتی بابان تەرخان کردوە. لە گێڕانەوەی باسەکانیدا جگە لە سەرچاوە زانراوەکان، بۆ یەکەمین جار ئەم کەڵکی لە ڕاپۆرتی دیپلۆماتەکانی ئەو سەردەمەی ناو ئارشیفی بەریتانی وەرگرتوە، بە تایبەتی هی دوا ساڵەکانی ژیانی میرایەتی بابان.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە جەنگەی هەراوهوریای "وەحدەی عەرەبی" نەتەوەپەرستەکانی سەردەمی عەبدولناصردا نوسراوە. شوێنەواری ئەو کەشە سیاسییەی پێوەیە:

1. لێکۆڵینەوەکە زیاتر لەوەی بۆ مەبەستی زانستی کرابێ، بۆ مەبەستی سیاسی بوە. مامۆستای سەرپەرشتیاری هەردو نامەی ماجستێر و دکتۆرای نەووار، د. احمد عزت عبدالکریم لەو پێشەکییەدا کە بۆ کتێبی "داود پاشا" ی نوسیوە بە ڕاشکاوی دەڵێ:

"والحق ان اتجاه الدکتور نوار الی دراسه تاریخ العراق الحدیث انما یمثل الاتجاه العام الذی اتجهت الیه مدرسة التاریخ الحدیث بجامعة عین شمس منذ سنوات، کما یتضح فی الوسائل العملیة التی انتجها تلامیذ هذه المدرسة، والدکتور نوار احد طلائعها الممتازین وبفضل جهودهم اصبحت بین ایدینا - لاول مرة فی تاریخ الجامعات العربیة - دراسات علمیة رصینة لجوانب هامه من التاریخ العربی الحدیث في العراق، والخلیج العربي، وسوریة والسودان، والمغرب والیمن، والجزیرة العربیة، وغیرها من اقطار العرب شرقا وغربا.

ونرجـو بـذلك ان نكـون حققنـا هـدفنا الـذي هـدفنا اليـه وهـو "دعـم الاتجـاه القـومي العربـي بالدراسـة التاريخيـة الرصـينة". ولـيس اقـوى مـن التـاريخ عامـل فعـال فـي فهـم الحاضـر وبنـاء المستقبل."

نوسـینەوەی سـەر لـەنوێی مێـژوی ناوچەکـە، بـە مەبەسـتی سـەلماندنی بۆچونـە سیاسیە پێشـەکی ئامادەکراوەکانی جوڵانەوە و حیزب و حکومەتە نەتەوەییەکانی عەرەب، دەمێکە بۆتە بەشێ لە بەرنامەی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب.

ئەم کتێبەش لەم چوارچێوەیەدا نوسراوە.

2. نوسەر وەکو زۆر لە نوسەرانی ئیسلام پێڕەوی ڕێبازی "لێکدانـەوەی مێـژو لـە سـەر بنچینـەی تیـۆری پیلانگێران" ی کردوە. بۆیـە سەرانسـەری لێکۆڵینـەوەکانی پـڕە لـە باسـی "مونامـەرە". هـۆی زۆر لـە ڕوداوەکان، بێ خۆمانـدو کردنێکـی زۆر، ئەگێڕێتـەوە بـۆ مونامـەرە: مونامـەرەی نـاوخۆی مـەمالیک، مونامەرەی ئێران لە عێراق، مونامەرەی ئینگلیز لە والی بەغدا، مونامەرەی کورد لەیەکتری. ئـەم جـۆرە پرۆگرامی لێکۆڵینەوەیە لە زانستی مێژودا باوی نەماوە.

3. نەووار وەکو زۆر لە نوسەرە نەتەوەپەرستەکانی نەتەوە دەسەڵاتدارەکان: گەشانەوەی هۆشی نەتـەوەیی کورد و هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی ئەگێڕێتەوە بۆ هانـدانی بێگانـە بـە تایبـەتی بـۆ ئینگلیـز و ئێـران، تەنانەت گەشتەکەی ڕیچیش بە یەکێ لەم هەوڵانە لە قەڵەم ئەدا.

ئەوەی بیەوێ کەڵک لەم سـەرچاوەیە وەربگـرێ، پێویسـتە زۆر بـە وریـایی لـە جـۆری گێڕانـەوە، شیکردنەوەی ڕوداوەکان و، ئەنجامگیری و بۆچونەکانی ورد بێتەوە و، تاووتوێیـان بکـا ئینجـا بـەکاری بهێنێ، چونکە بۆ مەبەسـتێکی سیاسـی دیـاریکراو نوسـراوە، نـەک بـۆ گێڕانـەوەی مێـژوی ڕاسـتەقینەی ناوچەکە.

## 2. 2. 6. سەرلەنوێ مێژوی

لە عێراق صەدام حسێن فەرمانی دا بە مامۆسـتاکانی زانسـتگاکانی عێـراق سـەرلەنوێ مێـژوی عێـراق بنوسنەوە. چەندین کتێب بە پێی ئەم فەرمانە و لەو چوارچێوەیەدا کە صـەدام دیـاری کردبـو، چـاپ و بـڵاو کراوەتەوە.

لەوانە:

"الحدود الشرقية للوطن العربي"

بغداد 1981

"العراق في التاريخ"

بغداد 1983

"الصراع العراقي - الفارسي"

بغداد 1983

هەروەها چەند کتێبێکی تر.

لەمانە و لە چەند جێگایەک دا باسی بابـان دێ. ئـەم کتێبانـە ئەگـەرچی سـەرچاوەی زۆریـان ڕیـز کردوە و ناوی قەبەی مامۆستاکانی زانکۆکانی عێراقیان لە سەر دانراوە، بـەڵام بـۆ ئـەوە ناشـێن بکرێنـە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی زانستی. چونکە لە گێڕانەوە و ئەنجامگیری ڕوداوەکانی ناوچەکە دا بێلایەنییان لە دەس داوە.

### 2. 2. 7. د. جابر الراوي: "مشكلة الحدود العراقية – الايرانية"

بغداد 1973

نوسەر بەشێکی کتێبەکەی تەرخان کردوە بۆ باسێکی تیۆریی سنور و، جۆری دیاری کردن و کێشانی. لەبەشێکی تری دا، باسی کێشەی سنور ئەکا لە نێوان عێراق و ئێران دا. پێشینەی مێژوویی کێشەکە ڕون ئەکاتەوە و، لە ڕوانگەی قانونی ناودەوڵەتانەوە، لە ڕێککەوتنەکانی: ئاماسیە، زەهاو، ئەرزەڕوم و، ڕێککەوتنەکانی نێوان حکومەتەکانی عێراق و ئێران، ئەکۆڵێتەوە.

کتێبەکە لە بنەڕەتدا دکتۆرانامەی نوسەرە، پێشکەشی کردوە بە زانستگای قاهیرە، ئەگەرچی زانیاری زۆر و بە نرخی تێ دایە دەربارەی ڕێککەوتنەکان و کێشەکانی سنور، بەڵام هەموی بۆ دیفاعە لە باری سەرنجی ڕەسمیی حکومەتی عێراق.

### 2. 3. بە زمانە ئەوروپییەکان

هەندێ لە ئەوروپییەکان بایەخیان بە مێژوی کورد داوە. تەنانەت سەرچاوەی زۆر لە نوسینی کوردەکان سەرچاوە ئەوروپییەکانە. لەم ڕووەوە ئێدمۆندز، کە دێتە سەر باسی بابان، ئەڵێ: "سەرچاوە کوردییەکان کە لەم بارەیەوە لە بەردەس دان بایەخ و نرخێکی ئەوتۆیان نیە. چونکە مێژونوسانی خۆجێیی و هاوچەرخ زۆرتر پشت بە نوسینەکانی ڕیچ و نوسەرانی تری ئەوروپایی ئەبەستن نەک بە ئاگاداری و هەواڵی پێشینەی خۆیان..."

قسەکەشی تا ئەندازەیەکی زۆر ڕاستە. لەم باسەدا من هەوڵم داوە، ئەو توانجەی ئێدمۆندز لە نوسەرانی کوردی گرتوە، بە پێی توانا چارەسەر بکەم. لە ناو مێژونوسانی هاوچەرخ دا کە بە زمانە ئەوروپییەکان بابەتیان لە سەر بابان نوسیوە گرنگترینیان ئەمانەن:

### 2. 3. 1. لۆنگریگ، ستیڤن هیمسلی: "چوار سەدە لە مێژوی نوێی عێراق"

وەرگێرانی عەرەبی:

"اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث"

ترجمة: جعفر الخياط

بغداد 1968

لۆنگریک پشتی بە سەرچاوە کۆنەکانی دەستی یەکەم بە تورکی، عەرەبی، فارسی، هەروەها بە نوسینی ئەوروپییەکان بەستوە. باسی بابانی تێکەڵاوی ڕوداوەکانی عێراق کردوە. بەڵام لە زۆر گۆشە و کەنار دا بە درێژی باسیان ئەکا.

پێش یەکەمین جەنگی جیهانیی، عێراق 3 ولایەت بو: بەغدا، بەصرا، موصڵ. ئەم ولایەتانە، وەکو هەمو ولایەتەکانی تر، ڕاستەوخۆ بەسترابون بە بابی عالیەوە. عێراق بەو تێگەیشتنەی بەریتانیا مەبەستی بو بە درێژایی مێژو نەبوە. بەریتانیا دروستکەری دەوڵەتی عێراق بو. عێراق وڵاتێکی فرە نەتەوەی فرە مەزهەب و دین بو. ئەیویست لە عێراق دەوڵەت و دەوڵەت نەتەوە دروست بکا. لۆنگریک پشکنەری بە ڕێوەبەرایەتی حکومەتی عێراق بوە. ئەم کتێبە لەچوارچێوەی ئەو سیاسەتەدا نوسراوە. هەوڵ ئەدا مێژوی عێراق بە یەکگرتویی بگێڕێتەوە. نوسەر ڕەنجێکی زۆری داوە. کتێبەکەی سەرچاوەیەکی بە نرخە بۆ لێکۆڵینەی ڕوداوەکانی ناوچەکە، لە ناو ئەوەدا، ڕوداوەکانی میرایەتی بابان.

### 2. 3. 2. ئیدمۆندز:

:G .C .EDMONDS
.TURKS AND ARABS .KURDS
LONDO 1957

ئیدمۆندز ماوەیەکی درێژ لە دەزگاکانی حکومەتی عێراق دا کاری کردوە. ئەویش لە سەر هەمان بۆچونی لۆنگریک بوە سەبارەت بەدروست کردنی عێراق. لە سەرکوتکردنی بزوتنەوەی کوردا بەشدار بوە. شارەزاییەکی زۆری لە کاروباری کوردا هەبوە. زمان و ئەدەب و مێژوی کورد شارەزا بوە. زۆر وتاری لە سەر زمان و ئەدەبی کوردی و، شوێنەوارە کۆنەکانی بە ئینگلیزی نوسیوە. بە هاوکاری لە گەڵ تۆفیق وەهبی "فەرهەنگی کوردی - ئینگلیزی" یان داناوە. ئەم فەرهەنگە یەکێکە لە باشترین فەرهەنگەکانی زمانی کوردی.

ئیدمۆندز. بەشێکی کتێبەکەی: "کورد، تورک و، عەرەب" ی بۆ باسی بابان تەرخان کردوە. بەڵام باسەکەی دەربارەی بابان، هیچ بابەتێکی گرنگ و تازەی تێ دا نیە.

لە کۆتایی پەنجاکان دا "عەبدوڵا شاڵی" هەندێ بەشی لەم کتێبە کردوە بە کوردی لە ڕۆژنامەی "ژین" و گۆڤاری "بڵێسە" دا بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام بە کتێبی سەربەخۆ بڵاو نەکراوەتەوە.

جرجیس فتح الله، ئەم کتێبەی لە ژێر ناوی "کرد وترک وعرب" کردوە بە عەرەبی و، لە بەغداد چاپی کردوە.

### 2. 3. 3. جەلیلی جەلیل: "کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی"

جەلیل لە کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتی جارانە. زۆر کتێب و وتاری بە نرخی سەبارەت بە مێژوی کورد بە زمانی روسی نوسیوە. ئەمەش یەکێکیانە. بەشێکی ئەم کتێبە لە سەر بابانە.

نوسینەکانی جەلیل بە گشتی لێکۆڵینەی زانستی و بە نرخن.

د. کاوس قەفتان لە ڕوسی‌یەوە کردویەتی بە کوردی، ساڵی 1978 لە بەغدا چاپی کردوە.

### 2. 4. بە زمانی فارسی

### 2. 4. 1. سعید نفیسی: "تاریخ اجتماعی و سیاسی ایران در دوره معاصر"

2 جلد، انتشارات بنیاد، چاپ ششم، تهران 1366

نەفیسی یەکێکە لە نوسەرە بە ناوبانگەکانی ئێران. لەم کتێبەدا، دامەزرانی زنجیرەی شاهەکانی قاجار و، پێوەندی‌یە سیاسی و بازرگانی‌یەکانی ئێران لە گەڵ دەوڵەتانی عوسمانی، بەریتانی، روسی و فەرەنسی باس ئەکا. لە قۆناغە جیاجیاکانی جەنگی ئێران - روسیا و، ئێران - عوسمانی ئەدوێ. چەندین بەڵگەی مێژویی بەنرخی تێ دایە، لەوانە: مەتنی ڕێککەوتنەکانی ئێران لە گەڵ بەریتانیا، روسیا، فەرەنسا و تورکیا. هەروەها دو نامەی عەباس میرزا سەبارەت بە کاروباری ئەمارەتی بابان و، نامەکانی جەنەراڵ گاردان بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی فەرەنسا سەبارەت بە هەلومەرجی ئێران. گاردان لە دو نامەی دا باسی ئەورەحمان پاشا ئەکا.

### 2. 4. 2. دکتر غلامرضا ورهرام: "تاریخ سیاسی واجتماعی ایران در عصر زند"

انتشارات معین، تهران 1366

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی ئاکادیمی کورتی سەردەمی زەندە. لە باسی ناکۆکی عوسمانی - ئێرانی و، کێشەی بابان دا پشتی بە کتێبەکەی نامی: "تاریخ گیتی گشا" بەستوە و، شتێکی زیاتری نەخستۆتە سەر.

### 2. 4. 3. دکتر محمد رضا نصیری: "اسناد ومکاتبات تاریخی ایرانی (قاجاریه)"

جلد اول از 1209 تا 1338 ه ق. انتشارات کیهان، تهران، 1366 ه ش.

جلد دوم از 1239 تا 1263 ه ق. اتشارات کیهان، تهران، 1368 ه ش

ئەم کتێبە چەند بەرگێکە. بەرگی یەکەم و دوەمی پێوەندییان بەم باسەوە هەیە.

هەر بەرگێکی پێک هاتوە لە دو بەش: پێشەکی بەرگی یەکەمی تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوەی "پێوەندییەکانی ئێران و عوسمانی لە سەرەتای سەردەمی قاجارەوە تا پەیماننامەی یەکەمی ئەرزڕوم". لێرەدا بە درێژی باسی دەوری ئەورەحمان پاشا ئەکات لەم ڕوداوانەدا. بەشی دوەمی بریتییە لە بەڵگەی مێژویی کە لە ئارشیفەکانی تورکیا دەری هێناون. بەڵگەکانی ساغ کردۆتەوە و، بە ڕێنوسی فارسی تازە نوسیویتیەوەو، پەراوێزی ورد و بە کەڵکی بۆ نوسیون. وێنەی بەڵگەکانیشی بڵاو کردۆتەوە.

لە ناو ئەم بەڵگانەدا نامەیەکی ئەورەحمان پاشا و چەند نامەیەکی مەحمود پاشا و، چەندین نامەی شا و وەلیعەهد و صەدری ئەعزەم و کاربەدەستانی گەورەی ئێران و عوسمانیان، سەبارەت بە کاروباری کوردستان، تێ دایە. ئەمانە کەرەستەی هێژان بۆ لێکۆڵینەوەی ڕوداوەکانی ئەو زەمانە، بە تایبەتی هی بابان.

بەرگی دوەمیشی لە سەر هەمان شێوە ڕێکخراوە. پێشەکییەکەی تەرخان کردوە بۆ "پێوەندییەکانی ئێران و عوسمانی لە 1239، واتە دوای بەستنی پەیمانی یەکەمی ئەرزڕوم تا 1263، واتە تا بەستنی پەیمانی دوەمی ئەرزڕوم". لێرەش دا دەیان بەڵگەی مێژویی سەبارەت بە کورد تێ دایە.

### 2. 4. 4. دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی وابسته به وزارت امور خارجه جمهوری اسلامی ایران: "گزیده اسناد سیاسی ایران وعثمانی: دوره قاجاریه"

واحد نشر اسناد، 6 جلد، (تهران 1369)

وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران بەشێکی دامەزراندوە بۆ هەڵبژاردن و ساخکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەڵگەکانی لە سەردەمی قاجارەوە تا ئێستا 6 بەرگی لێ بڵاو کراوەتەوە.

هەرچەندە لە بەر هۆی سیاسی ڕەنگە هەمو بەڵگەیەکیان بڵاو نەکردبێتەوە و، وەکو خۆیان ناویان لێ ناوە هەڵبژاردەیە، بەڵام کارێکی گەورە و بەنرخە. هەمو بەرگێکی پێشەکییەکی مێژویی چڕوپڕی بۆ نوسراوە. بەڵگەکان زانیاری گرنگ و بە نرخیان تێ دایە. چەندین بەڵگەی تێ دایە دەربارەی کورد. بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی تازەی کورد سەرچاوەیەکی هێژایە. سەبارەت بە میرایەتی بابان چەند بەڵگەی تێ دایە کە گرنگەکانیان لێرەدا باس کراون. سەرەڕای ئەوەش بە درێژی هەواڵی گفتوگۆی یەکەم و دوەمی نوێنەرانی ئێران و تورکی تێ دایە کە ڕێککەوتنی یەکەم و دوەمی ئەرزڕومی تیا ئیمزا کرا.

بەڵگە تورکییەکان وێنەکانیان بڵاوکراوەتەوە. بەڵام تەرجومە نەکراون بۆ فارسی و، بە چاپ نەنوسراونەتەوە، لە بەر ئەوە کەڵکێکی ئەوتۆیان لێ وەرناگیرێ.

# 1. قۆناغی یەکەمی میرایەتی بابان

-1-

## سەرەتای دامەزراندنی ئەمارەتی بابان ڕون نیە.

بابان، وەکو یەکێتیی ئێلگەل (کونفیدراسیۆنی عەشایەر) و، وەکو ئەمارەت و، وەکو بنەماڵەیەکی ناسراو، لە پێش سەدەی دەیەمی هیجریدا باسی لە ناو سەرچاوە مێژوییەکانی ناوچەکەدا نیە. لە سەردەمی دەسەڵاتی قەرە قۆینلو و ئاق قۆینلودا ناوی نەهاتوە. ئەگەرچی هەمو شوێنەکانی ژیانی ئەمان لە ناو سنوری دەسەڵاتی ئەم دو بنەماڵەیەدا بوە. تەنانەت ئەسکەندەرمیرزای کوڕی قەرایوسف کاتێ لە ترسی سزادانی باوکی هەڵهات بو، لە ناوچەکانی کەرکوک - دوز، واتە لە ناوچەی ژیانی ئەم ئێلانەدا تەراتێنی ئەکرد، کەچی ناوی ئەم ئەمارەتە لە ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەدا باسی نیە. ڕەنگە هۆی ئەوەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەو سەردەمەدا ئاواییەکانی ئەم ناوچەیە هەموی گوند و لادێ و، زۆرایەتی خەڵکەکەی هۆزی ڕەوەند بوبن. نە شارێکی گەورەی دەوڵەمەن و نە هیچ قەڵا و بنکەیەکی ستراتیجی لێ نەبوبێ، تا ببێتە جێگای چاوتێبڕینی ئەمیرەکانی ئاق قۆینلو و قەرە قۆینلو. بەڵام لە گەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی صەفەوی دا (907 ک/ 1501 ز) و، وەرچەرخانی دەوڵەتی عوسمانی بە لای فراوانخوازی دا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دوای جەنگی چاڵدێران (914 ک/ 1520 ز) ئیتر ئەم ناوچەیەش وەکو هەمو شوێنەکانی تری کوردستان لە ستراتیجی گشتی هەردو هێزی گەورەدا بایەخی پەیدا کرد. ناوی بابانیش تێکەڵاوی ڕوداوەکانی ناوچەکە بو.

وشەی بابان لە سەدەی دەیەمی کۆچیەوە هەم وەکو ناوی ئێل بۆ هەندێ لەو تیرە و هۆزانەی لە ناوچەکانی نێوان زێی بچوک و ڕوباری سیروان دا ئەژیان و، هەم وەکو ناوی شوێن بۆ هەندێ لەو شوێنانەی کەوت بوە ئەم ناوچەیەوە وەکو: پشدەر، مەرگە، سوربداش، سەرچنار، شاربازێڕ، شارەزور، قەرەداغ، بەکار هێنراوە.

## -2-

یەکەمین سەرچاوە کە باسی میرایەتی بابان ئەکا شەرەفنامەیە. شەرەفخان لە سەردەمی پەیدابونی شا ئیسماعیلەوە (907 - 930 ک/ 1501 - 1523 ز) ئەکەوێتە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی بابان و ئەڵێ:
"... حاکمانی بابان لە ناو حاکمەکانی کوردستان دا بە زۆریی هۆز و فرەیی لایەنگر و نۆکەر ناوبانگی تەواویان هەبو. بەڵام کە حکومەتی ئەو زنجیرەیە، وەکو باسی ئەکرێ، بە پیر بوداقی بەبەیی، کە بابان ئەگرێتەوە. وە بە براکەی گەیشت و ئەوانیش بە وەجاخ کوێری مردن، ئیتر حکومەتی ئەو بنماڵەیە کەوتە دەس نۆکەرەکانیان. کەسێک کە بۆ کاروباری حکومەت و سەرۆکایەتی لێوەشاوە بێ لە ناو ئەو بنماڵەیەدا نەما"(1)
بنەماڵەی دەسەڵاتداری بابان بە هۆی وەجاخ کوێری و کوژران و لێخران، یاخود لە سۆنگەی هۆی نەزانراوی ترەوە، چەند جار گۆڕاوە و نوێ بۆتەوە.

## -3-

لەکاتی سەرهەڵدانی دەسەڵاتی صەفەوی‌دا مەزنی بابان میر بوداقی کوڕی میر ئەبداڵ بو. قەڵەمڕەوەکەی لە کەرکوکەوە تا شاربازێڕی ئەگرتەوە. لاجانی لە ئێلی زەرزا و، سێویی لە ئەمارەتی سۆران و، شاربازێڕی لە ئەمارەتی ئەردەڵان و، سندوسیی لە قزلباش، سەندەوە. چەن کەسی لە دەوروبەری خۆی بە میر سنجاغ داناوە.(2)
بنکەی سەرەکی ئەمارەتی ئەردەڵان لەو سەردەمەدا لە قەڵای زەڵم بو کە ئەڕوانێ بە سەر دەشتی شارەزوردا. لەو کاتەدا شارەزور، شاربازێڕ، سرۆچک، قەرەداغ، ئالان، شەمیران، هەورامان، لە ژێر دەسەڵاتی کوڕەکانی حاکمی ئەردەڵان مەئمون بەگی یەکەم: بێگە بەگ، سورخاب بەگ، محەمەد بەگ (901 - 942 ک/ 1496 - 1535 ز) دابو.(3)
ڕۆستەم بەگ لە گەڵ میر بوداقی برای لە سەر دەسەڵاتداریتی تێک چو.
بوداق، ڕۆستەمی برای خۆی کوشت. خۆیشی لە تێکهەڵچونێک دا لە گەڵ میرەکانی سۆران بە وەجاخ کوێری کوژرا.(4) بوداقی کوڕی ڕۆستەم جێگەی گرتەوە. بەڵام ئەمیش کە مرد نەوەی لێ نەکەوتەوە. لە بەر ئەوە ئەم بنەماڵەیە کوێر بوەوە.

## -4-

لە جێگەی ئەوان پیرنەزەری کوڕی بەیرام دەسەڵاتی گرتە دەست. پیر نەزەر بە زۆر مەڵبەندی کفریی لە "دارولسەلام" ی بەغداد دابڕی و خستیە سەر ویلایەتی بابان. لە پاش ئەو ناوچەکە بوە بە دو بەشەوە. دو کەس بە ناوی سلێمان و ئیبراهیم هەریەکەیان دەستی بەسەر بەشێکی دا گرت. بەڵام ئەمانیش لە سەر دەسەڵاتداریتی لە ناو خۆیان دا تێکچون. سلێمان، ئیبراهیمی کوشت.(5)
سلێمان لە دوای کوشتنی ئیبراهیم 15 ساڵ مەزنایەتی کرد.
سلێمان لە پاش مردنی 4 کوڕی لێ بە جێ ما: حسێن، ڕۆستەم، محەمەد، سلێمان.
ئیبراهیمیش لە پاش کوژرانی 3 کوڕی لێ بە جێ ما بو: حاجی شێخ، میرە، میر سلێمان.(6)
حاجی شێخ لە دوای کوشتنی باوکی پەنای بۆ دەرباری شا تەهماسبی صەفەوی برد بو. لەبەر ئەوە لەوێ گوێی پێ نەدرا بو بە نائومێدی گەڕابوەوە وڵاتی خۆی(7) و چاوەڕوانی هەلی ئەکرد. کە سلێمان مرد ئەم توانی دەس بە سەر ناوچەکەدا بگرێ. ئەمجارەیان کوڕەکانی سلێمان پەنایان بۆ شا تەهماسب برد. ئەو

کاتــە گەرمــەی جــەنگی 20 ســاڵەی رۆم و عەجــەم (940 - 962 ک/ 1523 - 1554 ز) بــو. تەهماســب ویستی کەڵک لەم دەرفەتە وەربگرێ بۆ داگیر کردنی ناوچەکە. بەرێبـەری و چاوسـاغی حسـێن و رۆسـتەم و محەمەد کوڕانی سلێمان 3 جار هێزی نارده سەر موڵکی بابان:

جاری یەکەم، بە سەرکردایەتی چراغ سوڵتان ئیستاجلوی والی دینەوەر، بەڵام هـیچ سـەرکەوتنێکی بـە دەس نەهێنا.

جـاری دوەم، بـە سـەرکردایەتی کۆکچـە سـوڵتانی قاجـار والـی هەمـەدان. ئـەویش لـە هێرشـەکەی دا سەرنەکەوت.

جاری سێیەم، لەشکرێکی گەورەی بە سەرکردایەتی عەبدولاخانی ئیسـتاجلو نـارد. لـەم هێرشـەدا میـر شەمسەدینی بتلیسی، باوکی نوسەری شـەرەفنامە و، هەنـدێ لـە جـەنگاوەرانی هـۆزی رۆژکـی کـە ئەوسـا لـە خزمەتی شا تەهماسب دا بون، بە شدار بون. میر حسێن رێبەری ئەم لە شکرەی ئەکرد. بەڵام لە شاخی گەڵاڵە کەوتنە بۆسەی لەشکری بەبەوە 2 تا 3 کەسیان لێ کوژرا. بە تێکشکاوی گەڕانەوە. شا تەهماسب لە سەر ئەم رێبەرییە خراپە حسێن و براکانی تـری: محەمـەد و رۆسـتەمی هاویشـتە زیندانـەوە.(8) لـە دوای بـەربونیان هەڵهاتن بۆ لای سوڵتان سلێمان. ئەویش دوری خستنەوە، لە رۆم ئێلی کارێکی پێ سپاردن.(9)

لە کاتێک دا سوڵتان سلێمان دوای گرتنی تەورێز بۆ بـە سـەربردنی زسـتانی سـەختی ئـەو سـاڵە لـە هەمەدانەوە بە ناو کوردستان دا چو بۆ بەغداد، لە وێ خەریکی رێکخستنی کاروباری شـوێنە گیراوەکـان بـو (941 ک/ 1542 ز) حاجی شێخ لە گەڵ براکـانی بـۆ دەربڕینـی گوێڕایـەڵـی و دڵسـۆزی بـۆ سـوڵتان لـە مەرگەوە بۆ بەغدا بەرێ کەوت. بەڵام لە مەرگە پەلامار دران و هـەمویان کـوژران.(10) ئـەم روداوە لـە لایـەن کەسێکی نەناسراوەوە کراوەتە بەیتی "کاکە شێخ و کاکە میر" لەم بەیتەدا هۆی کوژرانی حـاجی شـێخ و کاکـە میر و براکانی تری، کە بە پـێی چیرۆکەکـە، ئـەبێ 12 بـرا بـو بـن، ئەدرێتـە پـاڵ ئـەو زوڵـم و زۆرە بـێ ئەندازەیەی لە خەڵکی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان کردوە.(11)

سوڵتان سلێمان لە رێکخسـتنەوەی کاروبـاری کوردسـتان دا ناوچـە کوردنشـینەکانی بـە سـەر چەنـد "سنجەق" دا دابەش کرد بو. هەندێکی بە ولایەتی شـارەزور، کـە ناوەندەکـەی کـەرکوک و، هەندێکیشـی بـە ولایەتی بەغدا و، هەندێکیشی بە ولایەتی موسڵەوە بەست. بەڵام بە پێی نەریتی پێشـوی سـوڵتان سـەلیم لـە دوای جەنگی چالدێران (920 ک/ 1514 ز) لە ناوچە گیراوەکان دا دەسەڵاتی سپاردەوە بـە دەسـەڵاتـدارە خۆجێییەکان، کە مەزنایەتی ناوچەکانی خۆیان لە باوباپیرانەوە بە میرات بۆ ما بوەوە. لەبەرئەوە کە بیسـتی حاجی شێخ کوژراوە پاشایەتی ئیالەتی بابانی دایەوە بە بوداقی کوڕی.(12)

سوڵتان سلێمان هێزێکی لە شارەزورەوە نارده سەر قەڵای زەڵم، بنکەی ئەمارەتی ئەردەڵان، کە مـەئمون بـەگی دوەم (942 - 944ک/ 1535 - 1537ز) فـەرمانڕەوای بـو. لەشـکری رۆم و ئـەردەڵان لـە دەشـتی شـارەزوردا لـە رۆژی 8 ی زیلقەعیـدەی 944 دا بـە گـژ یـەک دا چـون. مـەئمون بـەگ بـە تێشـکاوی بـۆ خۆقایمکردن کشایەوە ناو قەڵای زەڵم، لە پاش دابڵۆقەدانێکی درێژ بە ناچاری خۆی بە دەستەوە دا.(13) بـە گیراوی رەوانەی بەغداد کرا.

سورخاب بەگی مامی (945 - 975ک/ 1538 - 1567ز) بنکەی ئەمارەتی لە قەڵای زەڵمـەوە گوێزایەوە بۆ قەڵای مەریوان. هەوڵی دا ناوچەکانی کە پێشوتر لە ژێر دەستی مەئمون بەگی برازای بە دیل گیراوی دا بون بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بەڵام دیتـر ناوچـەکانی هـەولێر، کۆیـە، رەوانـدز، قەرەداغ، شارباژێر، سرۆچک، لە ژێر دەسـەڵاتـی ئـەردەڵان دەرهـات. نفـوز و دەسـەڵاتـی مەزنـەکانی ئەردەڵان کشایەوە پشتی زنجیرە چیاکانی سورێن و هەورامان و لێواری رۆژهەڵاتی ڕوباری سـیروان.

زۆری ئەو شوێنانەی پێشتر لە بەر فەرمانی ئەوان دابو، ئیتر کەوتە ناو موڵکی بابان و ژێر دەسەلاتی عوسمانی‌یەوە.

سورخاب بەگ هەوڵێکی بێ سودی تری دا بۆ سەندنەوەی شارەزور. ڕۆستەم پاشا بە ئۆردوی ڕۆمەوە چوە سەری. پاش تێکهەڵچونێکی خوێناوی ڕەجەبی (947ک/ 1547ز) دا سورخاب بە تێشکاوی کشایەوە قەڵای زەڵم و لەوێ دا ئابڵوقەی درا. سورخاب داوای یارمەتی لە شا تەهماسب کرد. ئەویش پاش دو ساڵ ئینجا هێزێکی بۆ شکاندنی ئابڵوقەکە نارد. بنکەی ئەمارەتی ئەردەڵان ئیتر بە یەکجاری لە قەڵای زەڵم هەڵکەندرا و بۆ ئەوەی لە مەترسی هێرشی ڕۆم دور بکەوێتەوە برایە قەڵای مەریوان.(14) لەو کاتەوە ئەمارەتی ئەردەڵان ئیتر بە یەکجاری کەوتە ژێر فەرمانی دەوڵەتی صەفەوی‌یەوە.

سوڵتان سلێمانی قانونی پاش ماوەیەک ڕێگەی دا بە حسێنی کوڕی سلێمان لە ڕۆم ئێلی‌یەوە بگەڕێتەوە بۆ موڵکی بابان و، فەرمانی دا بە سوڵتان حسێنی میری بادینان کە لەشکری مەزنەکانی کورد کۆ بکاتەوە، بچێ بۆ لابردنی بوداقی کوڕی حاجی شێخ و جێگیرکردنی حسێن. بوداق بە خۆی دا ڕانەپەرمو بەرەنگاری ئەم هێزە بکا. لە بەری هەڵات بۆ ئێران. حسێنی کوڕی سلێمان بو بە مەزنی بابان. بوداق و حسێن ماوەیەک ململانێ‌یان بو لە سەر میرایەتی بابان. سەرەنجام حسێن بە تەواوی دەستی بە سەر ناوچەکەدا گرت.

بوداق لە سەر سوڵتان حسێنی میری بادینان لە لایەن سلێمانی قانونی‌یەوە سنجاقی "عەینتاب" ی لە باتی ئیالەتی بابان درایە.(15) لە کاتێک دا ناکۆکی نێوان کوڕەکانی سوڵتان سلێمان: سەلیم و بایەزید لە قۆنیە تەقیەوە، بوداق بۆ لایەنگرتنی بایەزید چو بۆ کوتاهیە. سلێمانی قانونی ڕقی هەستا بو لە وانەی لوتیان ژەند بوە ئەم ناکۆکی‌یەی ناوخێزانەکەیانەوە. بایەزید بۆ ئەوەی دڵی باوکی بهێنێتەوە جێ، لە سەر خواستی ئەو، سەری بوداقی بڕی و بۆی نارد.(16)

—5—

جەنگی 20 ساڵەی ڕۆم و عەجەم بێ ئەوەی بە ئەنجامێکی کاریگەر بگا دوایی هات. قوڵبونەوەی گیروگرفتی ناوخۆی ناو هەردو دەوڵەت، هەڕەشەی دەرەکی لە هەردوکیان: هەڕەشەی ئوزبەک لە ڕۆژهەڵاتی ئێران و هەڕەشەی ئەوروپی لە عوسمانی، سەرەنجام شا تەهماسب و سوڵتان سلێمانی ناچار کرد پێک بێن. لە ئەنجامی ئاڵوگۆری چەن نامەیەک دا لە نێوان تەهماسب و سلێمان دا پاش ناکۆکی‌یەکی 50 ساڵە لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم (907 - 926ک/ 1512 - 1519ز) و شا ئیسماعیلی یەکەم (907 - 930ک/ 1501 - 1523ز) وە بەردەوام بو، بۆ یەکەمین جار گەیشتنە "ڕێککەوتنی ئاشتی ئاماسیا 963ک/ 1555ز".(17)

ڕێککەوتنی ئاماسیا لە بەڵگەیەکی سەربەخۆدا نەنوسراوەتەوە، بەڵکو لە چەند نامەیەکی ئاڵوگۆڕکراوی نێوان شا تەهماسب و سوڵتان سلێمان و، گەورە کاربەدەستەکانیان دا باس کراوە.

بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتنە: دەوڵەتی عوسمانی دانی بە هەبونی دەوڵەتی ئێرانی صەفەوی دا ناو، هەردولا ڕێک کەوتن لە سەر لابەلا کردنی هەندێ لەو کێشە قوڵانەی مایەی ناکۆکی هەردو لایان بو، وەکو کێشەکانی سنور و دین و دالدەدانی ڕاکردوانی یەکتری.

گورجستان، ئەرمەنستان، کوردستان، بەشێکی عەرەبستان، کە بوبونە "ناوچەی لەمپەر" ی نێوان ئەم دوهێزە گەورەیەی ئەو سەردەمە، دابەش کران. لە ئەنجامی ئەمەش دا شارەزور و شارباژێر و قەرەداغ کە مەڵبەندی دامەزراندنی ئەمارەتی بابان بو، کەوتە ژێر دەستی ڕۆم و، هەورامان و مەریوان و بانە و سەقز و سنەیش کە مەڵبەندی دامەزرانی ئەمارەتی ئەردەڵان بو کەوتە ژێر دەستی عەجەم.

"ڕێککەوتنی صوڵحی ئاماسیە" سنوری نێوان هەردو دەوڵەتی لە سەربنچینەی کێشانی هێڵی دیار و ئاشکرا دیاری نەکردبو. تا بزانرێ سنوری دەسەڵاتی هەر دەوڵەتە لە کوێ دا تەواو ئەبێ. بەڵکو ناوچەی فراوان بە سنور دانرا بو، کە ئەبون بەهۆی دروست بونی کێشە و ناکۆکی.

بۆ جیاکردنەوەی سنوری دەسەڵاتی ئەم دو دەوڵەتە گوێ نەدرابوە هێڵی نەتەوەیی، ڕەگەز، زمان، دین و مەزهەب، تەنانەت گوێ نەدرابوە هێڵی عەشیرەتی. هەروەها گوێ نەدرا بوە دیاریکردنی کۆسپی سروشتی بۆ جیا کردنەوەی سنوری هەردو دەوڵەت لە یەکتری. بەڵکو مانەو بونی هەردولا لە جەنگ و گیروگرفتی ناوخۆ و هەڕەشەی دەرەکی ناچاری پێکهاتنی کردبون و. تەرازوی هێزەکانی هەردولاش بەو جۆرە سنورەکانی دارشت بو. لە بەر ئەوە هەمو هۆ ڕاستەقینەکانی تەقینەوەی ناکۆکیەکان و هەڵگیرسانەوەی شەڕ مابون.

سەرەڕای ئەوەش گیروگرفتی دابەشکردنی ئەرزی نەتەوە ژێردەستەکان و. مانەوەی کێشەی جیاوازیی سوننی و شیعی و دابەشبونیان بەسەر هەردو دەوڵەت دا، هەمیشە ئەیان توانی ئاگری ناکۆکی شەڕ لە نێوان هەردو دەوڵەت دا خۆشتر بکەن.

ڕێکەوتنی ئاماسیا 4 ئەمارەتی کوردی: ئەردەڵان، موکریان، بابان، سۆرانی لە یەک دابڕی بو، کە لە ڕەگەز و زمان و دین و مەزهەب دا لەیەک ئەچون و، دەسکەوتی ئابوری هەموویانی پێکەوە ئەبەست و، لە ناوچەیەکی جوگرافی پێکەوە بەستراو دا بون، کە ئەیانتوانی لە سەر دەمی ململانێی ڕۆم و عەجەم دا خۆیان ببنە ناوکی پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی بەهێز. هەروەها سەروی کوردستانیشی لەت کرد و، بە دەردی ئەمانی برد.

## -6-

بۆ ڕاگرتنی ئەم پەیمانە کاتێک شا تەهماسب لە ژێر گوشاری سوڵتان سلێمان دا، بەرامبەر 4 سەد هەزار سکەی زێڕ، بایەزید و کوڕەکانی کە لە ئێران دالدە درابون، دایەوە دەس نێردراوەکانی سوڵتان بۆ کوشتن (969ک/ 1561ز). کوڕەکانی بوداقی بەبەیش کە لە خزمەتی ئەودا بون لەو کەینوبەینەدا کوژران.(18)

حسێن مەزنی بابان لە شەڕی ناوخۆدا کوژرا.(19) خزر بەگی کوریشی کە ناوچەی مەرگەی بە دەستەوە بولە لایەن ڕۆمەوە لێخرا، ناوچەکەی درا بە میرە بەگی موکری. دوای ئەم ڕوداوانە ماوەیەک موڵکی بابان بێ سەرگەورە بو.

شەرەفخان لەم بارەیەوە نوسیویەتی: "ئێستە ئێلی بابان بێ حاکمە. بەڵام بەرامبەر 4 هەزار پیاوی ئەسپ سواری پڕ چەک لە ناو ئەو قەومەدا هەیە و سەر بۆ کەس دانانەوێنن... هەر ئاغایەک لە ئاغایانی هۆزەکان، ناوچەیەکی ئەو وڵاتەی گرتۆتە دەس. هەمو ساڵێک 4 خەروار زێڕ لە ناوخۆیان دا کۆ ئەکەنەوە ئەی دەن بە خەزانەی شارەزور، ویلایەتی بابان لە خەواصی هومایون - واتە مڵکی تایبەتی سوڵتانە - زۆرایەتی ئەمین و عامیلەکان - کاربەدەستانی عوسمانی - بە ئەرمی و دڵدانەوە ڕەفتاریان لە گەڵ ئەکەن. هەمو ساڵێک چەردەیەک ئەختینە و شتومەکیان پێ ئەبڕێ. ئەگینا بە زۆر و دەستدرێژی فلسێکی سور بە میری میران و دەفتەردان و ئەمین و عامیلەکانی تر نادەن. تا ئەمڕۆ کە ساڵی 1005 ی کۆچییە (1596ز) هەلومەرجی ئەو ولایەتە بەم جۆرەیە."(20)

هەلومەجی بابان بەم جۆرە مایەوە تا لە سەرەتای سەدەی دوانزەهەمی هیجری دا فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە هەڵکەوت و، زنجیرەیەکی نوێی میرەکانی بابانی دامەزراندەوە.

## -7-

ڕێککەوتنی ئاماسیە تا مەرگی سلێمان (974ک/ 1566ز) و، تا مەرگی تەهماسب (984ک/ 1576) لە لایەن هەردولاوە پارێزگاری کرا. بەڵام لە ناوچەکانی سنوردا شەڕی ناوچەیی هەر ئەقەوما. دەسەڵاتدارانی سنور هەوڵیان ئەدا قەڵەمڕەوەکانی خۆیان فراوانتر بکەن. ئەمیرە خۆجێییەکان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیان و بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان ئەمبەر و ئەوبەریان ئەکرد. بە ئاسانی دڵسۆزیی خۆیان لە ئەمەوە بۆ ئەو ئەگۆڕی و بەگژ یەکتری دا ئەچون. کاربەدەستانی هەردو دەوڵەت دەستیان وەرئەدایە کاروباری ناوخۆی بنەماڵە گەورەکانی کوردەوە، برایان ئەکرد بەگژ برادا و، کوڕیان لەباوک هەڵئەگێڕایەوە و، تۆوی دوبەرەکیان تێ دا ئەچاندن.

## -8-

هەڵکەوتی جیۆپۆلیتیکی موڵکی بابان بو بە هۆی ئەوەی بەشی ئەمارەتی بابان لە ململانێی ڕۆم - عەجەم دا لە چاو هەندێ ئەمارەتی کوردی تردا زیاتر بێ. بە تایبەتی چونکە کەوت بوە سەر ڕێگەی شارە گەورە و پیرۆزگەکانی عێراق: بەغداد، موسڵ، نەجەف، کەربەلا، سامەڕا، کازمیە. لە هەمان کات دا ناوچەکە خۆی دەوڵەتێکی بەهێز و یەکگرتو، بەڵکو بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری تەدا و یەکگرتوی تێ دا نەبو تا بتوانێ خۆی لە بەر ئەو هێرشانەدا ڕابگرێ کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە ئەهات، یاخود بۆ سودی خۆی کەڵک لە ناکۆکی ئەم دو هێزە وەربگرێ.

میرەکانی ئەردەڵان، کەڵکیان لە بۆشایی دەسەڵات وەرئەگرت. بە تایبەتی لە سەردەمی هەڵۆخان (996 - 1014ک/ 1588 - 1605ز) و خان ئەحمەد خانی کوڕی دا (1026 - 1048ک / 1617 - 1631ز) هەندێ لە ناوچەکانی خواروی کوردستانیان خستە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیان. بەڵام ئەمارەتی ئەردەڵانیش کە هەڵکەوتێکی جیۆپۆلیتیکی هاوتای ئەمارەتی بابانی هەبو نەیتوانی دەوڵەتی سەربەخۆ دابمەزرێنێ. هەر لە ئەنجامی ئەوەدا کە وڵاتەکەیان بو بو بە مەیدانی زۆرانبازی خوێناوی ناچار بون لە ماوەی سەدە و نیوێک دا 4 جار پایتەختی خۆیان بگوێزنەوە. بنکەی ئەمارەتەکەیان لە قەڵای زەڵمەوە گوێزرایەوە بۆ قەڵای مەریوان، ئینجا بۆ قەڵای پڵنگان، دوای ئەویش بۆ حەسەن ئاوا، سەرەنجام بۆ سنە (1046ک/ 1636ز) تاوەکو لە مەترسی ڕۆم دوری بخەنەوە.

## -9-

جیاوازیی مەزهەبی شیعە - سوننە هەمیشە یەکێک لە هۆ، یاخود لە بەهانە، گرنگەکانی هەڵگیرسانی جەنگ بو. چەوساندنەوەی مەزهەبی دانیشتوانی ولایەتەکانی بەغداد و شارەزور یەکێک بو لە هاندەرەکانی لەشکرکێشییەکانی سەردەمی سوڵتان موراد چوارەم بە ناو کوردستان دا بۆ سەندنەوەی بەغداد لە عەجەم. تا لە دوایین لەشکرکێشیدا (1048ک/ 1638ز) سوڵتان موراد خۆی بەغدادی بە یەکجاری لە دەس عەجەم دەرهێنا و، ئەمەش بو بە هۆی بەستنی پەیمانی ئاشتی زەهاو (1049ک/ 1639ز).

ڕێککەوتنی زەهاو سنوری نێوان هەردو دەوڵەتی لە قافقاسەوە تا سەروی خەلیج: لە ئاخسقە، قارس، وان، شارەزور، بەغدا، بەصرا، دیاری کرد.

مەریوان و قەڵای هەورامان و دەرتەنگ لە گەڵ هۆزەکانی پیرە و زەردویی بەر ئێران کەوت.

بەدرە، جەسسان، مەندەلی، سەرمیل، درنە، قەڵای زەڵم، قزڵجە، سەرچاوەی چەمی چەقان، لە گەڵ هۆزەکانی زیائەدین و هارونی ئێلی جاف بەر عوسمانی کەوتن.(21)

رێککەوتنی زەهاو دەسەڵاتی عەجەمی لە رۆژئاوای چیاکانی زاگرۆزدا نەهێشت و لە دیوی رۆژهـەڵاتـی دا رای گرت و ئەم سنورە لەم ناوچەیەدا بە کردەوە بو بە سنوری نێوان ئەمارەتی ئەردەڵان و ئەمارەتی بابان کە تازە خەریکی بوژانەوە و گەشە کردن بون. هەروەها قەڵەمرەوی دەسەڵاتی حاکمانی بەبەش کە دواییتر لـە ئەدەبی کوردی دا بە "موڵکی بابان" و"دارلموکی بابان" ناوبراوە بەپێ ی خورتیی و لاوازیی مەزنەکانی بابان و، گۆڕانی تەرازوی هێزی نێوان ئەمان و ئەمارەتە دراوسێکانی: ئـەردەڵان و سـۆران و موکریـان و، گـۆڕانی تەرازوی هێزی نێوان دەوڵەتەکانی عوسمانی و ئێران، تەنگ یا فراوان بوە. هەنـدێ جـار لـە لای سـەرویەوە گەیشتۆتە موکریان و، لە لای خوارویەوە گەیشتۆتە زەنگاباد، زەهـاو، جەبـەل حـەمرین، جەسسـان، بـەدرە و مەندەلی و، لە لای رۆژهەڵاتیەوە مەریوان، بانە، سەقز و سنە و، لە لای رۆژئاوایـەوە گـەیشـتۆتە کۆیـە، رانیـە، هەریر، ئاڵتون کۆپری و هەولێر.

**پەراوێزەکان**

1. بدلیسی: 362.
2. بدلیسی: 363.
3. فخرالکتاب: 95 - 94.
4. بدلیسی: 364.
5. بدلیسی: 365.
6. بدلیسی: 366.
7. بدلیسی: 366.
8. بدلیسی: 370.
9. بدلیسی: 371.
10. بدلیسی: 367.
11. ئوسکارمان: 685 -689.
12. بدلیسی: 367.
13. فخرالکتاب: 96.
14. فخرالکتاب: 98.
15. بدلیسی: 369.
16. بدلیسی: 369.
17. دەربارەی ڕێککەوتنی ئاماسیە بڕوانە: پورگشتال: 1222، پارسادوست: 26 - 27.
18. بدلیسی: 369.
19. بدلیسی: 371.
20. بدلیسی: 370 - 371.
21. الراوی: 211 - 216، پارسادوست: 45.

# 2. میر سلێمان:
# یەکەمین تەقەللای سەربەخۆیی لە بەینی بەرداش دا

**-1-**

قۆناغی نوێی بوژانەوەی ئەمارەتی بابان لە نیوەی دوەمـی سـەدەی یانزەهـەمی کۆچیـیەوە دەس پـێ ئەکاتەوە، کاتێک فەقێ ئەحمەدی خەڵکی دارەشمانە لە ئێلی نورەدینی لە ناوچەی پشدەر - ناوچـەی قـەڵادزەی ئێستا - بنەماڵەی دەسەڵاتداری بابانی دامەزراند.

سەرگروشتەی فەقێ ئەحمەد و هاوسەرە ئەوروپاییەکەی، کە ئەبێ لە غەزایەکی ئەوروپادا بە دیلـی گـرت بێ، ئەگەرچی لە چیرۆکێکی خەیاڵی ئەچێ، بەڵام لە هـەمان کـات دا دەری ئـەخا کـە فـەقێ ئەحمـەد ئـەبێ لـە ئۆردوی عوسمانی دا سپایی بـوبێ و لـە هێرشـێکی عوسـمانیەکان دا بـۆ سـەر وڵاتـانی مەسـیحیی ئـەوروپا بەشداری کردبێ.

ڕیچ لە سەردانەکەی دا بۆ شاری سلێمانی (1235 ک/ 1820 ز) لە زمانی مەحمود پاشای بابانەوە مێژوی ئەم بنەماڵەیە وەها ئەگێڕێتەوە: "ناوی هۆزەکەی لە ئەژادا (کرمانج) ە. بەڵام وشەی بەبـە نازنـاوی بنەماڵەکەیانە و ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە سەرداری پشتاو پشتی ئەو خێڵەن، لەبەر ئەوە ئێسـتا هـەمو ئـەو ناوچانەی تیایدا دانیشتون و دانیشتوانی ناوچەکەش پێکەوە. بە حکومەتی "بەبە" یان "بابان" ناو ئەبرێ، هۆزەکەش لەبنەچەدا لە پشدەر، لە شاخەکانی باکوری نزیک (سێ کەنە) ی سـەر سـنوری ئێـران دروسـت بوە." مەحمود پاشا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێ: "لە کاتی شەڕی نێوان عوسمانی و ئێرانییەکان دا، یـەکێک لـە باپیرەکانی، خزمەتێکی باشی سوڵتانێکی عوسمانی کردوە، لە بەرامبەر ئەم چاکەیەدا بەوە خەڵات کراوە کە فەرمانداریێتی هەمو ئەو ناوچانە بکات کە بەشەڕ لە ئێرانی داگیر کرد بو. بـەم جـۆرە ورده ورده خـۆی و ئەوانەی دوای خۆی هاتن، توانیویانە دەس بە سەر ئەو ناوچانەدا بگرن کە ئێستا بە دەستیانەوەیە. ئـەو ناوچانەش کە لەو ساوە لە ئێرانیـەکانی سـەندۆتەوە، ئیتـر هـەمو ئـەو ناوچانـەش کەوتنـە ژێـر دەسـتی بابانەکان، یان بەبە و، بە فەرمانداریێتی شارەزوریان سپارد، کە پایتەختەکەی کەرکوک بوە. بەڵام میر لـەم

گێرانەوەیەی دا نەیتوانی مێژووی هیچ ڕوداوێکیانم بۆ دەس نیشان بکا، هەر ئەوەندە نەبێ وتی باپیرانی ئەم، ماوەیەکی دورودرێژ سەرداری وڵات بون و، نزیک سەد ساڵێک لەمەو بەر فەرمانداریتی ئو ناوچەیان درایە."(1)

سلێمان بەبە، یان بابا سلێمان لە دوا چارەکی سەدەی 11 هەمی کۆچیدا کەوتە چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی و دەسگرتنەوە بە سەر موڵکی بابان دا. ئیتر لەو کاتەوە کوڕ و نەوەکانی میرایەتی بابانیان گرتە دەست.

بنکەی قەڵەمرەوی بابان لە سەرەتادا "دارەشمانە" بو کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی قەڵادزە - سەردەشتی ئێستەوە. وەکو دەڵێن دەبێ ماوەیەکیش لە "ماوەت" و ئینجا لە "قەڵاچوالان" بو بێ.

## -2-

ساڵی (1099ک/ 1687ز) وشکە ساڵ بو، کارەساتێکی سروشتی گەورەی بەدوا دا هات. گرانی و قاتوقڕی و برسێتی بڵاو بوەوە. ژمارەیەکی زۆری کورد و عەرەب ڕژانە ناو کۆڵانەکانی بەغدادەوە داوای خواردنیان ئەکرد. بە دوی ئەوەدا نەخۆشی تاعون بڵاو بوەوە. لە ماوەی 3 مانگ دا تەنیا لە بەغداد 100 هەزار کەس زیاتری کوشت. ساڵی دوای ئەوەش دیسان تاعون بڵاو بوەوە لە جاری یەکەم کوشندەتر بو. هەمو ڕۆژێ زیاتر لە هەزار کەسی ئەکوشت. تاعون شیرازەی کاروباری وڵاتی تێک دا. خەڵکی نەیانئەتوانی باجی سەرانە بدەن.

لەم هەلومەرجە ئاڵۆزەدا میر سلێمان و میر حەسەن بە لەشکری بابانەوە چونە سەر کەرکوکی ناوەندی ئیالەتی شارەزور. دەستیان بەسەر کەرکوک دا گرت و لەم شەڕەدا دلاوەر پاشای "موتەصەریف" ی کەرکوک کوژرا (1101ک/ 1689ز).

حەسەن پاشا وەزیری بەغداد، لە جێگەی دلاوەر، حسێن پاشای دانا بە موتەصەریفی کەرکوک و، هێز و دەسەڵاتی دایە بۆ لە ناو بردنی میر سلێمان. هەروەها ئەم هەڕەشە نامەیەشی بۆ نارد:

"ئێوە کە لە دانیشتوانی ناوچەکانی سەر بە شارەزورن و، لە ڕەعیەتەکانی دەوڵەتی بەرزی سەرکەوتون، واتان لێ چاوەڕوان ئەکرا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن. بەڵام ئەوە چەند ساڵێکە دوژمنایەتی والی کەرکوک ئەکەن و، لە ڕێگای گوێڕایەڵی دەرچون و، دەستتان درێژکردوە بۆ سەر شوێنانی تر کە موڵکی سوڵتانن لەوانە شارەزور و دەوروبەری.

"کە موتەسەریفی کەرکوک هەوڵی دا بتانهێنێتەوە هۆش خۆتان و بتانگێڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست، چونەوە بەگژی دا و پرکێشیتان کردو کوشتتان و، کەلوپەل و شتومەک و سەربازەکانیتان تاڵان کرد. شەیتان چوە بن کلێشەتانەوە شارۆچکەی شارەزور و دەروپشتیتان داگیرکرد، لە کاتێک دا کە ئەتانزانی لە کۆنەوە و تائێستا ئەوانە موڵکی دەوڵەتی بەرزن. نەمانزانی هۆکانی ئەم کارانە چی بون و، بە درێژی ناگادارمان بکەن چی پاڵی پێوەنان ئەم جوڵانەوانە بکەن. ئەبێ بە پەلە شارۆچکەی شارەزور چۆڵ بکەن و کاروباری ئەوێ بدەنە دەس ئەو "موتەسەللیمە" ی فەرمانی دانانی دەرچوە، هەروەها ئەبێ هەمو کەلوپەل و شتومەک و چەکی کە لە پاشای خوالێخۆشبوتان گرتوە بدەنەوە بە موتەسەللیمی نوێ.

"ئەوەش بزانن ئەگەر گوێ لەم ئامۆژگارییانە نەگرن و نەگەڕێنەوە ژێر باری فەرمانبەریی ئەکەونە بەر تورەبونی کاربەدەستانی بەرز، ئەوسا هەزاران لەشکرتان ئەنێرنە سەر. بێگومان ئێوەش توانای بەرامبەریتان نیە و ناتوانن لە ڕوی سەربازە سەرکەوتوەکان دا ڕابوەستن و، چارەنوستان ئەبێ بە پەند بۆ هەمو ئەوانەی ڕێ ئەدەن بە خۆیان ئەم جۆرە کارانە بکەن. بۆیە پێش ئەوەی دەنگوباستان بگاتە دەوڵەتی سەرکەوتو ئەبێ

چارەسەر بکرێ، ئەگینا بەڵا بە سەر خۆتان و دانیشتوانی بەسزمانی بێتاوان دا ئەهێنن، لەبەرئـەوە پێویسـتە بگەڕێنەوە بۆ ناو ڕیزی موسوڵمانانی یەکتاپەرسـت و ملکـەچی شـەریعەتی ئیسـلامی بـن بـە پـێ ی ئایـەتی کەریمەی: "یا ایها الذین امنوا اطیعوا الله واطیعوا الرسول واولی الامر منکم" ئەگینا لـە ڕیـزی "بـاغی" یـان دا دائەنرێن کە بە پێی شەرع ئەبێ شەڕتان لە گەڵ بکرێ.

"وەرنەوە هۆش خۆتان و داوای لێبوردنی گوناهەکانتان بکەن و، شار و دەور و پشتەکەی بدەنـە دەس حاکمی نوێ و، ئەوەی لە پاشای خوا لێخۆشبو تاڵان کراوە بگێڕنـەوە و، لـەوە ئاگادارمـان بکـەن بـۆ ئـەوەی لاپەڕەی ڕابردو هەڵ بدەینەوە و لاپەڕەیەکی تازە بکەینەوە.

منیش لە لای خۆمەوەبەڵێنتان ئەدەمێ داوا لە دەوڵەتی بەرز بکەم لێتان خۆش بێ. ئەگینا واوەیـلا لـەو چارەنوسەی چاوەڕێتان ئەکا.

"ئەوەش بزانن کەشیری دەوڵەت بڕندەیە و، حسابی شەوکەتی ڕۆشـنە، ئەگـەر گومانتـان لـەوە هـەیـە لەوانە بپرسن کە لە ئێوە بەساڵاچوترن و، لە خاوەن تەجروبەکان بپرس.

ئەگـەر عـەقڵتان هـەبێ گـوێ لـە ئامۆژگاریيـەکانم ئـەگرن وئـەی ئـرخێنن. (وان کـل مغـرور مغلـوب والسلام)"(2)

لەشکرەکەی والی بەغداد و، حسێن پاشای تـازە موتەصـەڕیفـی کـەرکوک دو مانـگ لـەو دەوروبـەرەدا سوڕایەوە هیچی پێ نەکرا. بە سەرنەکەوتویی گەڕایەوە (1102ک/ 1593ز).(3)

هەلومەرجی بەغداد تێک چوبو. بەصرا لە لایەن ئێلەکانی عەرەبەوە پەلامار ئەدرا. والیيـەکان یـەک لە دوای یەک ئەگۆڕان. بەڵام ئـەیـان ئـەتوانی کاروبـاری وڵات ڕێـک بخەنـەوە و، بـاجی حکومـەتی کـۆ بکەنەوە.

## -3-

دەسەڵاتی سەربەخۆی سلێمان بەبە تا ئەهات زیادی ئەکرد. بەقسەی مەستورە: "لـە سـەردەمی جلوسـی شا سوڵتان حسێن دا کاروباری ئەمارەتی کوردستان (ئەردەڵان) لە ئەستۆی محەمـەد خـانی کـوڕی خەسـرەو خانی ئەردەڵان دا بو. لە کاتی ئیالەتی ئەو دا، سلێمان پاشای بابان لە بەر زۆریی سپا و لەشکر و، فرەیی زیو و زێڕ بایی بو. لەشکرێکی لە ژمارەی ئەستێرەی زۆرتری سازدا. لە هەمو مەملەکـەتی ڕۆم و ئێـران دا کەوتـە تاڵانی ڕاووڕوت و، بانگی سەربەخۆیی و یاخیبونی دا بـە گـوێی دانیشـتوانی هـەردو وڵات دا. سـەرەتا بـە سپایەکی ژمارە زۆرەوە بەرەنگاری وەزیری بەغداد بو، دوای ئەوەی لە بەگژدا چونی وەزیردا بـە تێکشـکاوی هەڵات، ئەو سپا گـەورەیـەی بـەنیازی گرتنـی کوردسـتانی ئـەردەڵان جوڵانـد و، دەسـتی گرتنـی بـۆ ناوچـە سنورییەکانی ئەوێ درێژ کرد و دەرگاکانی فیتنە و فەسادی کردەوە. لە یەکەم کات دا هەورامان و مەریوان و سەقزیان گرت و، تەمر خان بەگی کوڕی زۆراب سوڵتانی کوڕی کەلب عەلی خانی والیی کە لە سەقز و سـیاکۆ بو، هەروەها ئیبراهیم بەگی میـر ئەسـکەندەریی دەسـەڵاتـداری مـەریوانیان کوشـت. سـەرەنجام کـە هـەواڵی هەڵگەڕانەوە و ڕاپەڕینی سلێمان پاشا گەیشتە شا سوڵتان حسێن، پەژارەی ئەو ڕوداوە دایگرت. عەباس قولی خانی قاجاری بە سەرداری سپایەکی گەورەی زۆری لـە ژمـارە بـەدەر دانـا و، ئـاردی بـۆ بەربەسـتی فیتنـەی سلێمان پاشا و، یارمەتی دانی سپای ئەردەڵان."(4)

شـا سـوڵتان حسـێن (1105 - 1135ک/ 1693 - 1722ز) بـۆ ڕێگـابڕین لـە تەقـەلا فراوانخوازییەکانی سلێمان پاشا هەم ڕێگەی دیپلۆماسی و هەم ڕێگەی جەنگیی گرت.

## -4-

سنوری دەسەڵاتی سلێمان فراوان بو بو لە کەرکوکەوە تا ئەردەڵانی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەم ناوچەیە لە ڕوی جوگرافیای بەشەری و سروشتییەوە پێکەوە بە ستراو بو. لە ڕوی ڕەگەز و زمان و فەرهەنگەوە لە یەک ئەچو. لە ڕوی دین و مەزهەبەوە هەمویان سوننی شافیعی بون. لە گەڵ مەزهەبی ڕەسمیی دەوڵەتی صەفەوی و، مەزهەبی والییەکانی ئەردەڵان جیاواز بو. هۆی یەککرتن و یەککەوتنیان زۆرتر تێ دا بو لەوەی بەشێ لە دەوڵەتی صەفەوی یا عوسمانی بن.

## -5-

لە سەردەمی شا سوڵتان حسێن دا دو ڕوداو قەوما نەیانتوانی سەرلەنوێ بین بە هۆی هەڵوەشانەوەی پەیمانی زەهاو و، هەوڵگیرسانەوەی شەڕ لە بەینی هەردو دەوڵەت دا.

یەکەمیان، لەشکرکێشی بەبە سلێمان بۆ سەر ناوچەکانی ئەردەڵان کە بە پێی پەیمانی زەهاو (1049ک/ 1639ز) بەشێک بون لە قەڵەمڕەوی صەوفەوی.

دوەمیان، داگیرکردنی بەصرا لە لایەن ئەمیری حوێزەوە کە بە پێی هەمان پەیمان بەشێ بو لە دەوڵەتی عوسمانی.

بەڵام لاوازی هەردو دەوڵەت و گیرخواردنیان بە گیروگرفتی گەورەترەوە: عوسمانی بە شەڕی دەوڵەتانی ئەوروپاوە و، صەفەوی بە گیروگرفتی ناوخۆوە، هەردولای وا لێ کرد بیر لە شەڕ نەکەنەوە. ڕێگای گفتوگۆی سیاسییان گرت.

شای ئێران دو جار نامە و نوێنەری بۆ لای سوڵتانی عوسمانی نارد:

- نامەی یەکەمیان ساڵی (1109ک/ 1697ز) لە گەڵ کلیلی شاری بەصرا و دیاریی هێژا و بە نرخ دا ڕۆستەم خان دا نارد بۆ لای بابی عالی.

ڕۆستەم خان لە پێش دا سەدری ئەعزەم و شێخولئیسلامی بینی، ئینجا سوڵتان. بە گەرمی پێشوازییان لێ کرد.

شا لەم نامەیەدا، پاش پێشەکییەکی درێژی پڕ لە چاپلوسی و، بیرهێنانەوەی پێویستی ڕاگرتنی مەرجەکانی ئاشتی، باسی گیروگرفتەکانی سنوری هەردو دەوڵەت ئەکا. بەصرا بە موڵکی سوڵتان ئەزانێ. هەر لە بەر ئەوە کلیلی شارەکەی بۆ ناردوتەوە. لە هەمان کات دا سکاڵا لە دەس بەبە سلێمان دەر ئەبڕێ کە "... ماوەیەکی درێژە هەمو ڕۆژێ شەڕ ئەفرۆشێ بە حاکمەکانی سەر سنور و ئێل و هۆزەکانی کوردی ئەم لایەنە... دەستی گرتوە بە سەر هەندێ لە ناوچەکانی حاکمەکانی ئەم سنورە و، ڕەفتاری نابەجێ ئەکا لە گەڵ پارێزەرانێ کە لەو سنورە مەئموری موراعاتی شەرایتی صولح ومیساقن..."

هەروەها گازندە لە پاشاکانی بەغداد ئەکا چونکە "... چەندین جار کردەوەی ناشایستەی ئەو کابرایە" یان پێ ڕاگەیانراوە بەڵام "... هەمو جارێ ئەوان بەڵێنی تەمێ کردنی ئەو و چارەسەرکردنی ئەم کارەیان داوە... بەڵێنەکانیان نەهێناوەتە دی. کەرکوک و ئەو شوێنانەی لە پاشا و سنجەق بەگەکانی گرت بو لە دەستی ئەودا هێڵراونەتەوە.." لە کۆتایی نامەکەی دا داوا لە سوڵتان ئەکا فەرمان دەربکا بۆ لە ناو بردنی سلێمان بەبە و، ئەمە دائەنێ بە هۆی پتەوبونی بناغەی پێوەندی دۆستانەی هەردولا. هەر بۆ ئەو مەبەستە هەندێ ڕاسپاردەی بە ڕۆستەم خان وتوە کە بە زار بۆ سوڵتانی ڕون بکاتەوە.(5)

- نامەی دوەمیان ساڵی (1112ک/ 1700ز) لە گەڵ کلیلی شاری بەصرا بە هەمان ناوەڕۆک بە ئەبولمەعصوم خان دا ناردەوە بۆ سوڵتان. ئەمجارەیان سوڵتان فەرمانی گرتنەوەی بەصرای دا.

ئەتوانرێ لە ناوەرۆکی ئەم نامانە چەند ئەنجامگیرییەک بکرێ:

(1) هەوڵدانی دەرباری صەفەوی بۆ پاراستنی پێوەندی دۆستانەی نێوان هەردو دەوڵەت لە سەر بنچینەی پەیمانەکانی رابردو. ئەوەش لە لایەکەوە ئەگەرایەوە بۆ لاوازی و دارزانی دەوڵەتی ئێران کە ئیتر وزەی جەنگینی تێ دا نەمابو، وەکو دواییتر، هێرشی ئەفغانییەکان دەریان خست، وە لە لایەکی ترەوە خەریکیی شا و دەرباریانی صەفەوی بە رابواردنی رۆژانەوە.

(2) هەوڵدانی دەرباری صەفەوی بۆ یەکخستنی تەقەلای هەردو دەوڵەت لە بواری دامرکاندنەوە و سەرکوت کردنی بزوتنەوەی سەربەخۆیی‌خوازی میری بابان و ئاڵۆزانی ناوچە سنورییەکان.

(3) رقی ئەستور و قینی قوڵی دەرباری ئێرانی لە کورد و مەزنەکانی.

## -6-

شا سوڵتان حسێن لە پاڵ تەقەلای دیپلۆماسی دا بۆ ئەوەی بابیعالی بۆ هاوکاری و تەقەلای یەکگرتو رابکێشێ دژی میر سلێمان، لەشکرکێشی گەورەی قزڵباشی بە سەرکردایەتی یەکێ لە سەرانی ناسراوی قزڵباش ناردە سەر کوردستان. بۆ ئەوەی بەری پێشرەوی لەشکری کورد بگرێ و بیان گێرێتەوە دواوە. لە هەمان کات دا ئەو کوردانەش تەمێ بکا کە هاوکارییان لە گەڵ لەشکری بابان کردوە. یا نەرمییان لە گەڵ نواند بون. مەستورە، لەم بارەیەوە نوسیویەتی: "کە مەوکیبی سپای قزڵباش و قوشونی ئەردەڵان گەیشتنە مەڵبەندی مەریوان. سلێمان پاشا پێی ئازایەتی و مەردایەتی بردە پێش و بو بە شەڕ، لە بەیانی 9 ی موحەڕەمەلحەرامی 1110 تا ئێوارێ ئێزەی جەنگ بریسکەی تیغ و زرمەی ڕم گەرم بو، لە بەیانییەوە تا ئێوارێ نێزەی دلێران لە یەکتری کاریگەر و شمشێری دلاوەران گیانی ئەکوشت و سەری ئەبرێ، هیچ لایەکیان کارێکیان بۆ پێشەوە نەبرد.

بەیانی رۆژی داهاتو کە 10 هەمی مانگی ناوبراو بو، دوبارە تەپڵی شەڕ لە هەردو لاوە لێ درا، هەردولا بۆ شەڕ ریزیان بەست، وەکو نەرەشێر هەڵیان ئەکوتایە سەر لە شکری یەکتری. سلێمان پاشا بۆیان دابەزییە ناو مەیدان ومەردانە و دلێرانە روی لە شەڕگە کرد و ئازایەتی نواند. سەری چەندین سواری ناوداری بەزەبری بازو بەردایەوە سەر ئەرز.

لە دوایی دا، لەبەرئەوەی فەتح و زەفەر بەندە بەتەقدیرەوە نەک بە زەبری بازوی دلێرانی رۆستەم ئاسا و هێزی شمشێری شێرانی پڕ هونەر. شەماڵی سەرکەوتن بە سەر ئاڵای دەوڵەتی عەباس قولی خان دا هەڵی کرد و، سلێمان پاشا و لەشکرەکەی ژێر کەوتن و تێکشکان. زۆری سەرکردەکانیان کوژران و گیران و بەشێکیشان بریندار و بەدیل گیران.

ئەوەی لە شمشێر رزگاری بو بە هەزار دەردەسەر و کێشە گیانی خۆی قوتار کرد. خێوەت و بارەگا و کەلوپەلی خۆیان بە جێ هێشت. بەرەو لای رۆم و قوستەنتین هەڵاتن"(6)

## -7-

قاسم سوڵتانی هەورامی لای سەرکردەی لەشکری عەجەم زمانی لە مەزنەکانی ئەردەڵان دابو. تاوانباری کردبون بەوەی ئەوان بە "هۆی دراوسێیەتی و هاومەزەبی و هاوسێیەتی و دور بیرکردنەوە" دەستکێشیی لەشکری بابانیان کردوە بۆ داگیرکردنی ناوچەکە. لەسەرئەوە عەباس قولی خانی قاجار 1200 کەسی لە کوردەکانی ئەردەڵان سەربڕی. بۆ چاو ترساندن و تەمێ کردنیشیان گرێکی لە کەللەی سەریان دروست کرد. کە بە "کولێن کو" ناسراوە. قاسم سوڵتان کە دوزمانی کرد بو، ئەویش لە سزا رزگاری نەبو، سەری ئەویشی بە براوی لە سەر لوتکەی گردەکە دانا.(7)

شێخ ئەحمەد، شاعیرێکی ئەو سەردەمە، شیعرێکی فارسی بەم بۆنەیەوە داناوە. شیعرەکەی پڕ مەعنایە و توانجێکی کوشندە لە کورد خۆی ئەگرێ. ساڵی ڕوداوەکەشی باس کردوە. لە شیعرەکەدا ئەڵێ:

اگر چه او منارەکلەها ساخت
ولی باوی سلیمان نردها باخت
بسال سیزده خان قزلباش
نحوست های مخفی کرد او فاش
نحوست ها زکس نبود، که از ماست
از ان گفتند کز ماست انچه برماست

## -8-

چیرۆکی دوانزە سوارەی مەریوان، کە لە ناو کوردا وەکو ئەفسانەیەکی نەتەوەیی لێ هاتوە و، پیرەمێرد بە شێوەیەکی ئەدەبیی داپڕشتۆتەوە، ئەبێ لە سەردەمی میر سلێمان دا ڕوی دابێ. گوایە 12 سواری بابان لە شەبەیخونێکی کتوپڕدا ئەدەن بە سەر چەند هەزار سەربازی ئێرانی دا کە لە کەناری گۆمی زرێبار لە مەریوان بارگەیان خست بو. هێزی ئێرانییەکان ئەشکێن و پێش ئەوەی هێرشەکەیان بۆ بکرێ پاشەکشێ ئەکەن.(8)

## -9-

تاعون بەصرای بە جۆرێ پەرێشان کرد بو خەڵکی نەیانئەتوانی تەرمی مردوەکانیان ببەن بۆ گۆرستان بیاننێژن. هەرکەس ئەمرد لاشەکەی یا لە ماڵەکەی خۆی دا ئەشاردرایەوە یان بە جێ ئەما. خەڵک باج و سەرانەیان پێ نەئەدرا. لە سەر وەرگرتنی باج و سەرانە بو بە شەڕ لە بەینی والی و خەڵک دا. ئێلەکانی عەرەب یاخی بوبون. سەرپێچییان لە فەرمانەکانی دەوڵەت و دانی باج و سەرانە ئەکرد. والی لە شەڕدا لە گەڵ ئێلی مونتەفیک کوژرا (1102ک/ 1690ز). بەصرا و دەوروپشتی پشێوی تێ کەوت بو. شێخی مونتەفیک "مانیع" دەستی بە سەر بەصرادا گرت بو. والییەکانی بەغداد دەسەڵاتیان بە سەری دا ئەما بو. چەند جارێ هێز لە بەغداوە کۆکرایەوە و لەشکرکێشییان کرد بۆ گێڕانەی دەسەڵات بە سەر بەصرادا بەڵام هیچکام لە هێرشەکان سەرکەوتو نەبو. بابی عالی خەریکی شەڕ بو لە مەیدانەکانی ئەوروپا دەینەپەرژایە سەر بەصرا. والییەکانی بەغداد نائومێد بون لەوەی خۆیان بتوانن دەس بگرنەوە بە سەر بەصرادا. ئەمیری حوێزە بە ڕەزامەندی والی بەغداد بە فێڵ بەصرای لە دەس مانیع شێخی ئێلەکانی مونتەفیک دەرهێنا. مانیعی دەرکرد. بەصرا کەوتە دەس ئەمیری حوێزە. ئەمیری حوێزە شای ئێرانی، شا سوڵتان حسێن، لە گرتنی بەصرا ئاگادار کرد. شا نەیئەویست شەڕ و دوژمنایەتی لە گەڵ دەوڵەتی عوسمانی تازە ببێتەوە. ڕازی نەبو بە گرتنی بەصرا. یەکێکی نارد بەصرا وەربگرێ تا تەسلیمی عوسمانییەکان ئەکرێتەوە.

ساڵی (1112ک/ 1700ز) ئیتر بابی عالی دەستی بەتاڵ بو فەرمانی دەرکرد بۆ والییەکانی دیاربەکر، سێواس، قەرمان، پیرەجیک، ئاناسیە، عەینتاب، مەرعەش، حەڵەب، شارەزور و میرەکانی بەدرە، باجەلان، بەیات و سوارەی کورد بۆ ڕزگارکردنی بەصرا. هەروەها ژمارەیەکی زۆریش کەشتییان ئامادە کرد.

هێزی عوسمانی بە ڕێ کەوت بەرەو بە صرا. داودخان، حاکمی ئێرانیی بەصرا، شاری بە بێ شەڕ بەدەستەوە دان (1112ک/ 1700ز). بە درێژایی ساڵانی 1102ک (1690ز) تا 1112ک (1700ز) بەصرا لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دا نەبو.

## -10-

ناردنی دوجار سەفیر و نامە لە لایەن شاوە بۆ لای سوڵتان و. ناردنی نامەی والـی‌ی بەغـدا، بـەڵگـەی ئەوەن جوڵانەوەکەی سلێمان بەبە مەترسی‌یەکی زلی بۆ سەر دەسەڵاتـی صـەفەوی و بـۆ سـەر هـی عوسـمانی دروست کردوە لە ناوچەکەدا.

هەروەها دەوڵەت کەوتنە هاوکاری بۆ لە ناوبردنی. دوای ئەم ڕوداوە لـە لایـەنی عوسـمانی‌یەوە حەسـەن پاشای وەزیری بەغداد کەوتە سەرکوتکردنی کوردەکـانی سـنجار و. سۆران و. عەرەبـەکانی لای بەصـرا. لـە لایەنی عەجەمیشەوە حسێن خانی لوڕ نێردرایە سەر شارەزور و کەوتە تاڵان و کوشتنی خەڵک. ئێلی بڵباسـی ڕاونا بۆ ناوچەی ئاکۆ و قەندیل.(9)

سەبارەت بە چارەنوسی بەبە سلێمان قسەی جیاواز هەیە:

لۆنگریک ئەڵێ: "دوای تێشکانی لە هێزی ئێرانی پەنای بۆ ئەستەموڵ بـرد. بـە خۆشـی‌یەکی زۆرەوە پێشوازی لێ کرا. سنجەقی بابانی درایە کە بە ڕەسمی خرایە سەر پاشایەتی کەرکوک".

ئەمین زەکی بەگیش هەواڵەکانی لۆنگریکی دوبارە کردۆتەوە و. لە سەرچاوەیەکی تورکیەوە ئەگێڕێتەوە کە سنجەقی ئەدرنەی دراوەتێ. لابەلا باسی هاوکاری هێزەکانی ڕۆم و عەجەم ئەکەن دژی سلێمان. بەڵام هامەر پورگشتال، مێژونوسی ڕەسمی تورک، چارەنوسی میرسلێمانی ڕون کردۆتەوە و. نوسیوێتی: "لە ئاسـیا، بەبـە سلێمان سەرۆکی یاخی‌یانی کـوردی شـارەزور لـە زەمـانی حکومـەتی حەسـەن پاشـادا، کـە بـەر لـە دالتابـان حوکمڕانی بەغداد بو، بە یارمەتی پاشاکانی حەڵەب و دیاربەکر شکێنرا و. لە گەڵ حەقدە بەگی کـوردا، کـە لـە یاران و یاوەرانی ئەو بون، کوژرا... "(10)

ڕەنگە هەواڵەکەی هامەر لە هەمویان زیاتر جێگای باوەڕ بێ.

بەمجۆرە یەکەم هەوڵدانی بەبە سلێمان بۆ یەکخستنی کوردستانی بابـان و کوردسـتانی ئـەردەڵان و. دامەزراندی دەسەڵاتی سەربەخۆی کـورد لـە نێـوان بەرباشـی ڕۆم و هێـزی عەجـەم دا وردوخـاش بـو. دوای سلێمان پاشا موڵکی بابان لە نێوان کوڕەکانی و ئێلەکانی تردا بە تایبەتی زەنگەنە دابەش بوە.

## پەراوێزەکان

1. ڕیچ: 102.
2. ئەزمی زادە: 296 - 297.
3. العزاوی: 119/5.
4. مستورە: 59 - 61.

بۆ ئاگاداری زۆرتر لە هێرشی میر سلێمان بۆ سەر ئەردەڵان و، شکاندنی میرسلێمان لە لایەن لەشکری ئێرانەوە بڕوانە: لونگریک: 105. امین زکی، "تـاریخ السـلیمانیە": 62. فخـر الکتـاب: 127. وقـائع نگار کردستانی: 141. ئەم دو سەرچاوەیە ڕوداوەکە ئەبەنەوە بۆ سەردەمی خان ئەحمەد خانی کوڕی کەلبعەلیخان (1099 - 1107ک/ 1687 - 1695ز) لە سەردەمی شاە سـلێمانی صـەفەوی دا، بـەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە مەستورە نوسیویتی، نامەکانیش شا سوڵتان حسێن نوسیونی.

5. نوائی: "اسناد..." 129 - 130.
6. مستورە: 61 - 62.
7. مستورە: 62. فخرالکتاب: 172 و 483. امین زکی، "کورد... ": 406.

مێژونوسەکانی ئەردەڵان ئەگەرچی هەمویان هاوبیرن لە گێڕانەوەی شەڕەکەدا و لە کوشتنی بە کۆمەڵـی مەزنەکانی ئەردەڵان دا، بەڵام لە دیاریکردنی مێژوی ڕوداوەکە دا هاوبیر نین.

شیعرەکەی شێخ ئەحمەد ئەڵێ: 1113 ک بوە.

مەستورە ئەڵێ: ساڵی 1110ک (1698ز) بـوە. تۆمـارە کۆنـەکانیش لەوانـە تۆمارەکـەی ڕەنجـوری: "شکستی میرسلێمان ساڵی 1110" ئەم ساڵەیان بە ساڵی تێشکان و کۆتایی حوکمڕانی سلێمان پاشـا داناوە.

8. لۆنگریک: ص 106. پیرەمێرد لە: "چیرۆکی دوانزە سوارەی مەریوان" دا ڕوداوەکـە ئەگێڕێتـەوە بـۆ سەردەمی ئەحمەد پاشا.
9. پورگشتال: 3010. مستورە: 62.
10. لۆنگریک: 106. امین زکی: "تاریخ السلیمانیە" 63 - 64. پورگشتال: 1883/4.

## 3. خانە پاشا:
## کورد لە شەڕی ئەفغان و تورک دا

-1-

بڵاوبونەوەی قاتوقڕی و تاعون. گۆڕینی یەک لە دوای یەکی والییەکانی بەغداد، هەلومەرجی بەغداد و ناوچەکەی پەرێشان و شپرزە کرد بو. لە ماوەی 16 ساڵ دا زیاتر لە 10 والی بۆ وەزارەتی بەغداد دانران و لێخران. بابی عالی لە شەڕدا بو لە گەڵ هەندێ لە دەوڵەتانی ئەوروپی نەیئەپەرژایە سەر ئاوڕدانەوە لە بەغداد و بەصرا. دەسەڵاتی بەغداد بە سەر ناوچەکانی دەوروپشتی دا کز بوبو لە هەندێ جێگادا هەر نەمابو.(1)

ساڵی 1116ک (1704ز) جەدید حەسەن پاشا بو بە والی بەغداد. ماوەی 20 ساڵ کاروباری بەغداد و ولایەتەکانی شارەزور و بەصرای لە دەس دا مایەوە. وەزارەتی حەسەن پاشا سەرەتای قۆناغێکی نوێ بو لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی عێراق دا. حوکمی مەمالیک (کۆلەمەن) لە عێراق دا لە سەر دەستی ئەمدا دامەزرا و، لە سەر دەستی ئەحمەد پاشای کوڕی دا چەسپی. تا ئێستاش گەڕەکێکی بەغداد و یەکێ لە مزگەوتەکانی بە ناوی ئەمەوەیە.

حەسەن پاشا لە ماوەی وەزارەتەکەی دا لەشکرکێشی، بۆ سەر ئێلەکانی عەرەب و کورد، کرد بو بە بەرنامەی کاری. سوارەی کوردی لە دژی ئێلەکانی عەرەب و سوارەی عەرەبی لە دژی ئێلەکانی کورد بەکار ئەهێنا. بەمەش دەسەڵات و شکۆی هێزە خۆجێییەکانی شکاند. سامان و داراییشی بە تاڵان ئەبردن. چەندین لەشکرکێشیی کرد بۆ سەر ئێلە عەرەبەکانی بەنی لام، شەممەر، زوبێدات، عوبێد، خەزاعیل، مونتەفیک، غزیە... و، چەندین جار پەلاماری ئێلە کوردەکانی شوان، بڵباس، یەزیدی، جاف و بابان... ی دا.

پردی ئاڵتون کۆپری چاک کردەوە و، پردی لە سەر چەمی ئارین و چیمەن دروست کرد. ئەمەش هاتوچۆی بازرگانی و لەشکرکێشی ئاسان ئەکرد.

## -2-

دوای تێشکانی میر سلێمان سەرچاوەکان ئاگاداریییەکی ڕون لە سەر موڵکی بابان و میرەکانی و ڕوداوەکانی بە دەستەوە نادەن.

تۆمارەکەی ڕیچ دوای میر سلێمان باسی کەسێ ئەکا کە ناوی تەمەر یان تەیمورخان بەگە ئەبێ سالی 1110ک (1698ز) تا 1115ک (1703ز) و. دوای ئەویش بەکر بەگ تا سالی 1128ک (1715ز) میری بابان بوبن.

دەربارەی تەیمورخان بەگ ئاگاداریییەک بە دەستەوە نیە. تەیمورخان بەگ نەوەی فەقێ ئەحمەد یا لە بنەماڵەی میرەکانی سۆران بوە لە کۆیە، دیار نیە.

میر بەکر کەڵکی لە لاوازی دەسەڵاتی بەغداد و پەشێوی هەلومەرجی عێراق وەرگرت. بە سەربەخۆیی کاروباری بەڕێوە ئەبرد. چاوی بری بوە کەرکوک بیگرێ. میر بەکر وەکو ئەڵێن گردی بەکراوای شارەزوری کردوە بە مەڵبەندی حوکمڕانی و. جۆگای بەکرەجۆش ئەو ڕێکی خستوە.

نێوانی بەکر و پاشای کەرکوک تێکچو. والی بە بیانوی سەرپێچییەوە سالی 1126ک (1714ز) لەشکری بردە سەر میر بەکر. میر بەکری شکاند. یەکێکی تری لە جێگای دانا. بەلام نەیتوانی خۆی دەسگیر بکا. دوای 2 سال میر بەکر بە خۆگۆڕین و لە بەرگێکی کەدا چو بۆ بەغداد. پیاوەکانی وەزیر ناسیبیانەوە. گرتیان و بە فەرمانی وەزیر کوشتیان (1128ک/ 1715ز). سەرچاوەکان هەندێکیان ئەڵێن: شێت بوە بۆیە چۆتە بەغداد و. هەندێکی تر ئەڵێن: بۆ "دەخالەت" و داوای لێبوردن چوە. بەلام پێش ئەوەی "دەخالەت" بکا گرتویانە و کوشتویانە.

دوای کوشتنی بەکر چەند سالێ "موتەسەللیم" ی تورک ڕاستەوخۆ موڵکی بابانیان بەڕێوە بردوە.(2)

## -3-

سالی 1128ک (1715ز) حەسەن پاشا 500 سوارەی کوردی لە گەڵ عەبدوڕەحمان پاشای کەهیای خۆی دا نارد بۆ بەشداری لە جەنگی نەمسادا. بەرامبەر بەوە دەرامەتی شارەزوریان پێ بەخشی.(3)

## -4-

ئەفغانییەکان لە قەندەهار شۆڕشیان دژی زوڵم و زۆری دەسەڵاتی صەفەوی بەرپاکرد. حوکمی شاهەکانی صەفەوی گەیشت بوە دوا قۆناغی گەندەڵی و. لە ڕوخان نزیک کەوت بوەوە. ئەفغان قەندەهاریان گرت (1131ک/ 1718ز).

لێشاوی ئێلە ڕاپەڕیوەکانی ئەفغان بەرەو ئێران کشا. کرمان و مەشهەد و گونابادی گرت و. گەمارۆی ئەصفەهانی دا. پاش ئابلۆقەدانێکی درێژ شا سوڵتان حسێنی صەفەوی خۆی و پایتەختی بە دەستەوە دا (1135ک/ 1722ز).

والیی بەغداد حەسەن پاشا. یەکێ لە باوەڕپێکراوە ژیرەکانی خۆی بە نامەیەکی پیرۆزبایییەوە نارد بۆ لای مەحمودی میروەیس. گەورەی ئەفغانییەکان. حەسەن پاشا لەمە نیازی کۆکردنەوەی زانیاری و هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی ئێران بو دوای هێرشی ئەفغان. نێردراوەکەی حەسەن پاشا. دوای بەجێهێنانی ئەرکەکەی گەڕایەوە. لای وابو ئێران وەکو پارویەکی نەرم بە ئاسانی قوت ئەدرێ. والی بابی عالی ئاگادار کردەوە لە هەلومەرجی ئێران و دەوڵەتەکەی خۆی هان دا بۆ گرتنی.

پێشتریش والیی ئەرزڕۆم بابی عالی لە شێوانی هەلومەرجی ئێران ئاگادار کرد بو.

لە نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی دا پەیمانی زەهاو هەبو. بەڵام پشێوی بارودۆخی ئێران هەلێکی باشی بۆ تورکیا و روسیا هەڵخست تا پەیمانە کۆنەکان پشت گوێ بخەن و تەگبیری دابەشکردنی کەلاکی کەوتو بکەن.

بابی عالی بڕیاری دا ئەو شوێنانە بگرێ کە هێشتا دەستی ئەفغان نەیان گەیشتبویە. بۆ ئەمەش پێویستی بەوە بو زەمینەی سیاسی داگیرکردنی ئێران و. بیروڕای خەڵک بۆ لەشکرکێشیەکەی و. لە لایەکی ترەوە کەوتە گفتوگۆ لە گەڵ ڕوسیا بۆ دڵنیا کردنی.

شێخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی فتوای دا: عەجەم ددان دانێن بە "خەلافەت" ی ئەبوبەکر و عوسمان و عومەردا، بەڵکو زۆری صەحابەکانی پێغەمەر. جگە لە ئیمامی عەلی، بە "کافر" و"مورتەدد" و"مونافیق" دا ئەنێن. سوکایەتی بە عائیشە ئەکەن. زۆری ئایەتەکانی بە پێی ویستی خۆیان لێک ئەدەنەوە. کوشتنی "ئەهلی سوننە" بە "جائیز" ئەزانن و "ئیباحە" ی سامان و دارایيان ئەکەن و ژنەکانیان کە ئەگرن دەس لە گەڵ تێکەڵ کردنیان بەبێ "عەقد" بە حەڵاڵ دائەنێن و وەکو "سەبایا" ی ناموسولّمان رەفتاریان لە گەڵ ئەکەن... موفتی ئێرانییەکانی بە "مورتەدد" دانا کە ئەبێ ئەحکامی "ئەهلی ڕەددە" یان بە سەرا بسەپێنرێ و وڵاتەکەیان بە "دارولحەرب" دابنرێ.

بابی عالی لە گەڵ ڕوسیا ڕێککەوتننامەیەکیان ئیمزا کرد بۆ دابەشکردنی سەر زەمینی ئێران (1721).

بە پێی مادەی سێهەمی ئەم ڕێککەوتنە: ئەبو سنوری عوسمانی و ئێران لە شوێنی تەواو بونی سنوری روسیا و تورکیاوە لە دواوانی کور و ئاراسەوە بە لای رۆژئاوای شاری ئەردەبیلدا دەس پێ بکا بە هێڵێکی ڕاست بکشێ بۆ هەمەدان و کرماشان. ئەگەر ئەمە سەری بگرتایە ئەو دابەشبونەی کوردستان کە بە کردەوە دوای شەڕی چاڵدێران بو بو، وە لە پەیماننامەکانی ئاماسیە و زەهاو دا شێوەی قانونی بە خۆیەوە گرت بو هەڵئەوەشایەوە. هەمو ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەستی ئێران ئەکەوتە ژێر دەستی عوسمانیەوە.(4)

فەرمانی سوڵتان، کە پشت ئەستور بو بە فتوای شێخولئیسلام و. تێکگەیشتنی روسی، دەرچو بۆ والیەکانی سنور بۆ "فەتح" ی ئەو ناوچانەی کە هێشتا دەستی ئەفغانیان نەگەیشت بویە. حەسەن پاشای والیی بەغداد و. عەبدوڵا پاشای کوپریلی والیی وان و. ئیبراهیم پاشای سیلاحدار والیی ئەرزڕۆم، هەریەکەیان کرا بە فەرمانـدەی قۆڵی خۆی بۆ بەجێهێنانی فەرمانی سوڵتان و فتواکەی شێخولئیسلام (1135ک/ 1722ز).(5)

**-5-**

حەسەن پاشا، وەزیری بەغداد بۆ بەجێهێنانی فەرمانی سوڵتان دەربارەی گرتنی ئەو شوێنانەی هێشتا دەستی ئەفغانیان نەگەیشتبویە سپایەکی گەورەی سازدا. ژمارەیەکی زۆر لە ئێلەکانی عەرەب و کورد بە شدار بون. لەو کاتەدا گەورەی بابان خانە محەمەد بەگ بو.

سپای رۆم بە سەرکردایەتی حەسەن پاشا بەرەو کرماشان بە رێکەوت. گەورەپیاوەکانی کرماشان پێشوازیيان کردن و بە بێ شەڕ شاریان بە دەستەوە دا. لە هەمان کات دا وەزیر هێزی ناردە سەر لوڕستان و نزیک هەمەدان. لوڕستان هاتە بەر فەرمان و جافی جوانرۆ هاتنە ژێر ئاڵای عوسمانیەوە.

خانە محەمەد بەگی بابان لە چوارچێوەی ئەم ستراتیجە گشتیەی عوسمانی دا بەرەو ناوچەی ئەردەڵان کشا. گەورەکانی مەریوان و هەورامان بەرەو پیری هاتن. بە بێ شەڕ بونە هاوکاری. خانە پاشا بەرەو سنە چو. سنە پایتەختی میرایەتی ئەردەڵان بو. والیی ئەردەڵان بە بێ شەڕ سنەی چۆڵ کرد. گەورەپیاوانی سنە پێشوازیيان لە حاکمی نوێ کرد. ئەو ئاواتەی میر سلێمان لە گەڵ خۆی برد بویە ژێر گڵ

ئەم هێنایە دی. دانیشتوانی شاری سنە و قەڵەمڕەوی ئەردەڵان سوننە بون، بەڵام بنەماڵەی والیەکانی ئەردەڵان بۆ مەبەستی سیاسی بوبون بە شیعە. لەبەر ئەوە شتێکی ئاسایی بو بەخۆشیەوە پێشوازی دەسەڵاتی عوسمانی و خانە بکەن. هەمو موڵکی ئەردەڵان کەوتە ژێر دەستی خانە بەگ (1136ک/ 1723ز). خانە پلەی پاشایەتی درایە و بوبو بەمیری میران و. خالید بەگی براشی لە قەڵاچوالان بو بو بە پاشای بابان. سنوری دەسەڵاتی بابان لە هەمو کات فراوانتر بو بو. لە کەرکوکەوە تا نزیک هەمەدانی ئەگرتەوە.(6)

مێژونوسانی ئەردەڵان بە ستایشەوە لە خانە پاشا ئەدوێن. بە پیاوێکی ژیر و شارەزا و دادپەروەر و بە ویژدانی دائەنێن کە هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ڕازی کردنی دڵی خەڵک و، جێگیرکردنی ئارام و ئاسایش و ئاوەدانی. مزگەوت و مەدرەسەیەکی گەورەی لە سنە بە تەنیشت "دارولحکومە" وە بنیاد نا (1138ک/ 1725ز). دو منارەی بەرز لە مزگەوتەکەدا بوە. تا سەدەیەک ئاوەدان بو. ئەمانوڵڵا خان بۆ ئەوەی شوێنەواری بابان لە سنە بسڕێتەوە. تێکی دا و شوێنەکەی کرد بە "باخی فیردەوس".

## -6-

حەسەن پاشا لە کاتێک دا چاوەڕوانی گەیشتنی وەرزی بەهار بو، بێ ئەوەی فریا بکەوێ لەشکر بباتە سەر هەمەدان. لە کرماشان مرد (1136ک/ 1723ز). تەرمەکەیان بردەوە بەغداد. ئەحمەد پاشای کوڕی، لەو کاتەدا، والیی بەصرا بو. فەرماندەکانی حەسەن پاشا داوایان لە دەوڵەت کرد ئەحمەد پاشا لە جێگای باوکی بکەن بە والیی بەغداد و سەرکردەی سپا. داواکەیان زو وەڵام درایەوە. ئەحمەد پاشا بۆ پرسەی باوکی چەند ڕۆژێکی کەم لە بەغدا مایەوە یەکسەر بەڕێ کەوت بەرەو کرماشان. خانە پاشای میری ئەردەڵان و حسێن پاشای جەلیلی والیی موسڵ و ژمارەیەکی زۆر سەرانی ئێلی عەرەب و کوردی لە گەڵ بو.

حەسەن پاشا داوای لە خەڵکی هەمەدان کرد بە بێ شەڕخۆیان بە دەستەوە بدەن. بەڵام ئەوان خۆیان قایم کرد و بەرەنگارییان کرد. سپای ڕۆم گەمارۆی دان. پاش ماوەیەک گەمارۆدان و شەڕی خوێناوی دیواری دەوری شارەکەیان هەڵتەکاند و ڕژانە ناو هەمەدانەوە. کوشتن و تاڵان و دیلکردن 3 ڕۆژ بەردەوام بو. خەڵکەکە داوای "ئەمان" یان کرد و وەزیریش "ئەمان" ی دان. میری ئەردەڵان خانە پاشا و میری درنە ئەحمەد بەگ لەم شەڕەدا بەشدار بون.(7)

ئەم شەڕانە 3 ساڵ درێژەیان کێشا بو. وەزیر گەڕایەوە بەغداد (137ک/ 1724ز) هەندێ لە ئێلەکانی عەرەب یاخی بوبون، جەردەیی و ڕێگرییان ئەکرد. ئەوەی کرد بە بیانوی پەلاماردان و تاڵانکردنیان.

## -7-

ئەو دەمەی ئەشرەف خانی ئەفغانی تاجی شاهێتی ئێرانی لە سەر نا بەشێکی فراوانی ئەرزی ئێران لە لایەن سپای عوسمانی و ڕوسەوە داگیرکرا بو. ئەشرەف گومانی ئەکرد سپای عوسمانی بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئێران بکشێ و ئەصفەهانیش بگرێ. کەوتە هەوڵی بەلاداخستنی کێشەکە بە ئاشتی.

دوای جلوس (دانیشتن لە سەر تەختی شاهێتی) بە ماوەیەکی کورت عەبدولعەزیز خانی بە سەفیری خۆی نارد بۆ لای بابی عالی لە ئەستەموڵ.

عەبدولعەزیز خان 3 نامەی پێ بو:

نامەیەک لە ئەشرەفەوە بۆ سوڵتانی عوسمانی.

نامەیەک لە ئیعتیمادولدەولەی ئەشرەفەوە بۆ صەدری ئەعزەم.

نامەیەک بە ئیمزای 19 مەلای ئەفغانی بۆ موفتی و زانا ئایینناسەکانی تری مەملەکەتی عوسمانی.

عەبدولعەزیزخان گەیشتە ئەستەموڵ. صەدری ئەعزەم پێشوازی لێ کرد. لە کۆڕێ گەورەدا کە بەم بۆنەیەوە کۆببونەوە عەبدولعەزیز نامەی ئیعتمادولدەولەی دا بە سەدری ئەعزەم و بە دەنگی بەرز خوێندرایەوە هەروەها نامەی مەلاکانی ئەفغانی دانێ و ئەویش خوێندرایەوە. بەڵام ویستی نامەکەی ئەشرەف کە بۆ سوڵتانی نوسی بو لای خۆی هەڵبگرێ بۆ ئەوەی خۆی بیدا بە سوڵتان. ئەوان نامەکەیان بە زۆر لێ سەند.

مەلاکانی ئەفغان لە نامەکەیان دا ئەوەیان ڕون کرد بوەوە کە چۆن سوڵتان مافی هەیە لە لایەن "ئوممەت" ی خۆیەوە بە "ئیمام" دابنرێ، هەروەها ئەشرەفیش مافی ئەوەی هەیە لە قەڵەمڕەوەکەی خۆی دا لە لایەن میللەتەکەی خۆیەوە بە "ئیمام" بناسرێ. لە بەر ئەوەی ئەشرەف لە لایەن خەڵکی ئێرانەوە بە "فاتیح" دانراوە ئەو هەقە بە خۆی ئەدا وەکو شاهی قانونیی ئێران هەمو ئەو شارانە داوا بکاتەوە کە تورک و روس گرتویانە.

کاربەدەستانی عوسمانی و موفتی و قازی و زانا ئایینناسە ناسراوەکانی عوسمانی زنجیرەیەک کۆبونەوەیان کرد بۆ لێدوان لە داواکانی ئەشرەف. ئەحمەد پاشای وەزیری بەغدایش ئاگاداری کرد بون کە ئەفغان جەنگی پڕۆپاگەندەیان لە ناو هێزەکانی دا دەس پێ کردوە دەربارەی "ناشەرعی" بونی شەڕ لە گەڵ هاومەزهەبە سوننی‌یەکانیان دا.

لە کۆڕێکی گەورەدا بۆ دیاری کردنی هەڵوێست لە ئەشرەف دو پرسیار لە موفتی کرا.

یەکەمیان، ئاخۆ باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەتوانن لە یەک کات دا پێڕەوی لە دو ئیمام بکەن؟

دوەمیان، موسوڵمانان سوڵتانیان بە ئیمامی خۆیان داناوە. بەرامبەر کەسێکی کە بە زۆر و ناڕەوا ئەصفەهان و دەوروبەری گرتوە زات ئەکا داوای سەرزەمینێ بکا کە لە دەسەڵاتی ئێرانی‌یانی "رافزی" ڕزگار کراوە و، خۆی بە ئیمام دائەنێ ئەبێ چی لە گەڵ بکرێ؟

موفتی هەردو کێشەکەی بە لادا خست.

دەربارەی پرسیاری یەکەم وتی: دو ئیمام لە یەک کات دا ناتوانن سەڵتەنەت بکەن مەگەر کۆسپێکی گەورەی وەکو ئۆقیانوسی هیندیان لە بەین دا بێ. بۆ ئەمەش "حەدیس" ێکیان ئەکرد بە بەڵگە: "اذا بویع لخلیفتین فاقتلوا الثانی منهما".

لە وەڵامی پرسیاری دوەم دا وتی: ئەو کابرایە یاخی‌یە ئەبێ داوای گوێڕایەڵی لێ بکرێ. ئەگەر سەری بۆ سێبەری خوا لە سەر ئەرز دانەواند ئەوا کێشەی نامێنێ. ئەگەر نافەرمانی کرد بە پێی قورئان حوکمی بریتی‌یە لە: "فان بغت احدهما علی الاخری فقاتلوا التی تبغی حتی تفیٔ الی الله".

وەڵام بۆ ئەشرەف نوسرایەوە. فتواکانی موفتی‌یشی لە گەڵ نێردرا.(8)

دانانی ئەشرەف بە "یاخی" وەکو ڕاگەیاندنی رەسمیی جەنگ بو دژی. عەبدولعەزیز خان گەڕایەوە لای ئەشرەف (1138ک/ 1726ز).

لە پایزی (1138ک/ 1726ز) دا ئەحمەد پاشای والی‌ی بەغداد بە هێزێکی گەورەوە لە خورەمئابادەوە بەرەو هەمەدان بە ڕێ کەوت. ئەشرەف کە بەمەی زانی ئەویش خۆی ساز دا بە هێزێکەوە بە ڕێ کەوت.

سپاکەی ئەشرەف لە 17 هەزار ئەفغانی و دەرگەزێنی و ئێرانی تێ نەئەپەڕی. ژمارەیەکی کەم "زەمبورەک" یان هەبو.

سپاکەی ئەحمەد پاشا 70 تا 80 هەزار کەس ئەبو. تێکەڵاو بو لە تورک و عەرەب و کورد... توپخانەیەکی گەورەشی لە گەڵ بو.(9)

هێزی کورد لە ناو سپاکەی ئەحمەد پاشادا نزیکەی 20 هەزار کەس ئەبو. لە لایەن 20 میری کوردەوە سەرکردایەتی ئەکران لەوانە: حاکمی ئامێدی، میری درنە و دەرەتەنگ ئەحمەد بەگ، میری باجەڵان عەلی بەگ، میری کۆیە عەلی بەگ، میری جاف صەفی قولی بەگ، میری گەروس حەسەن بەگ، میری حەریر مستەفا بەگ، میری سەعداباد سوبحان ویردی بەگ، میری کەڵهوڕ ڕەزا قولی بەگ، میری زەنگنە محەمەد بەگ، میری سەرتاس حەسەن بەگ، میری ئاڵتون کۆپری ئەحمەد بەگ، میری قزڵجە فەرهاد بەگ زادە، میری شارباژێڕ فەرهاد بەگ، میری سرۆچک حەسەن بەگ... ئەمانیش هەمویان لە لایەن خانە محەمەد پاشای بابانەوە سەرکردایەتی ئەکران.(10)

ئەحمەد پاشا دوای ئەوەی هەمەدانی بە جێ هێشت پەیامێکی پڕ لە سوکایەتی بۆ ئەشرەف نارد: ئەفغانی بە گەلێکی بێ سەروبەر دانا بو، کە بە ناڕەوا شای قانونییان لە سەڵتەنەت لابردوە. گوایە ئەم هاتوە شای قانونیی بخاتەوە سەر تەختی سەڵتەنەت. ئەشرەف لەم پەیامە ئەوەندە تورە بو ناردی شا سوڵتان حسێنی صەفەوییان سەر بڕی و کەللە سەرەکەی بە هەڕەشەوە نارد بۆ ئەحمەد پاشا.

سپای تورک 80 میل لە هەمەدان دور کەوتبوەوە. لە نێوان ئەوان و سپاکەی ئەشرەف دا 12 میلیان بەین بو. هەردولا بار و بارگەیان خست.

هەردو سپا چەند ڕۆژێ لە بارەگاکانی خۆیان دا مانەوە. ئەشرەف کەڵکی لەم چەند ڕۆژ ئارامییە وەرگرت. چەند کەسێکی لە باوەڕپێکراوەکانی خۆی ناردە ناو ئۆردوی عوسمانییەوە بە تایبەتی بۆ ناو کوردەکان. مێژونوسە ڕەسمییەکان ئەڵێن گوایە ئەمانە بەرتیلێکی زۆریان داوە بە میرەکانی کورد و بەڵێنی پلە و پایەی "خان" ێتییان پێ داون.

لە کاتێک دا نۆکەرەکانی ئەفغان خەریکی تێکدانی ڕیزەکانی سپای تورک بون لەناوەوە. ئەحمەد پاشا 6 هەزار کەسی نارد تا ئاگاداریی لە سەر شوێن و بارو دۆخی دوژمن کۆ بکەنەوە. چاوساغەکانیان لە کوێرەڕێیەکی وەهادا عاسییان کردن، ئەفغانییەکان تێیان بەربون، تەفروتونایان.

کتوپڕ چوار مەلای ئەفغانی بە سیمایەکی نورانییەوە بەرامبەر ئەحمەد پاشا لە ناوجەرگەی ئۆردوگاکەی دا دەرکەوتن. ئەوی لە هەمویان پیرتر بو ئاگاداری ئەحمەد پاشای کرد کە ئەوان لە لایەن خۆیانەوە نێردراون تا وا لە تورک بکەن دەس لە شەڕی هاومەزهەبەکانی خۆیان هەڵبگرن و، لە گەڵ ئەوان "جیهاد" ی ئێرانییە ڕافزییەکان بکەن. ئەشرەف سەری سوڕماوە لەوەی تورک لە گەڵ دەوڵەتێکی عیسایی ڕێک کەوتوە بۆ زەوتکردنی سەڵتەنەتی ئەو. کابرای مەلا قسەکانی بەوە تەواو کرد کە ئەگەر ئەحمەد پاشا هەر سور بێ لە سەر پەلاماردانی ئەشرەف، ئەوا ئەشرەف بە ناخە بۆ ڕشتنی خوێنی هاومەزهەبە سوننییەکانی.

ئەم قسانە کاری لە هەمو ئەوانە کرد کە گوێیان لێ بو.

لە کاتێک دا ئەحمەد پاشا خەریکی گفتوگۆ بو لە گەڵ مەلاکانی ئەفغانی، دەنگی بانگ بەرز بوەوە. مەلاکانی ئەفغان هەستان لە ڕیزی تورکەکان دا بۆ نوێژکردن ڕیزیان بەست. بەم جۆرە دیسان هاومەزهەبیی خۆیان سەلماند. دوای تەواو بونی نوێژ سەرلەنوێ مەلاکان داوایان لێ کردەوە کە خوێنی موسوڵمانان نەڕژێ و، گەڕانەوە بارەگاکەی خۆیان.

بە کارهێنانی ئایین بۆ مەبەستی سیاسی تیغێکی دودەمە. سوڵتان دیسان بە کاری ئەهێنا بۆ یەکخستنی ڕیزەکانی سپاکەی و ئەشرەفیش بۆ هەڵوەشاندنی.

ئەم پڕو پاگەندە زیرەکانەیەی ئەشرەف کاری خۆی ئەکرد. ئەحمەد پاشا بۆ ئەوەی زیاتر ڕیزی سپاکەی هەڵنەوەشێ دەسبەجێ فەرمانی هێرشی دا. بەڵام زۆری سپاکەی نەک هەر بە قسەیان نەکرد، بەڵکو باڵی ڕاستی سپاکەی کە هێزی میرەکانی کورد بو بە سەرکردایەتی خانە پاشا بە جێیان هێشت. هەرچەند

هەوڵی دا باڵی ڕاستی سپاکەی ڕیک بخاتەوە و. دو جار هێرشی پێ کردن بێ سود بو. ئەحمەد پاشا کە زانی هێرشەکەی سەرکەوتو نەبو بە ناڕێکوپێکی کشایەوە. 12 هەزار کوژراوی لە مەیدانی شەڕدا بە جێ هێشت و بارگە و بنە و تۆپخانەکەی بە دەستی ئەففانی و کورد بە تالآن چو.(11)

وەزیر بە شکاوی کشایەوە بۆ کرماشان (1139ک/ 1726ز).

زۆر لە مێژونوسەکان هۆی دەسهەڵگرتنی کوردەکان لەو شەڕەدا دەگێڕنەوە بۆ فروفێڵی ئەشرەف کە گوایە پەیمانی پلە و پایەی بەرزی پێ داون و. بەرتیلی زۆری بۆ ناردون. ڕەسوڵ حاوی کەرکوکلی لەمەش تێ ئەپەڕێ: ئەیگێڕێتەوە بۆ کاری جادوگەرانی ئەففانی.(12)

ئەمە ئەگەر وابێ یا وا نەبێ ئەبێ دو مەسەلەی گرنگ بهێنرێتە بەر لێکدانەوە:

یەکەمیان. کورد وەکو گەلێکی دیندار تاڕادەیەکی زۆر گوێڕایەڵی قسەی مەلاکان بوە. تەنانەت وا باوە بە فتوایەکی مەلای خەتێ کە وتویەتی: "هەرکەسێ شەڕ لە گەڵ لەشکری خەلیفە بکا تەڵاقی ئەکەوێ" لەشکرە گەورەکەی میر محەمەدی سۆران بڵاوەی کرد و هەڵوەشا. لێرەش دا قسەی مەلاکانی ئەففان ئەبێ کاریگەر بوبێ.

دوەمیان. چەند ساڵێ پێش ئەو ڕوداوە بو والیەکانی بەغداد میر سلێمانی بابان و 17 میری کوردیان کوشت بو و. میر بەکریشیان لە بەغداد هەڵواسی بو. ڕەنگە ئەمەش تۆڵەی ئەوە بوبێ.

کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی هۆی ئەم تێشکانەیان گێڕایەوە بۆ ئەوەی وەزیر ڕاوێژی بە وەزیرەکان و سەرکردەکانی نەکردوە و بە هەڵەدا چوە. فەرمانی بۆ دەرچو جارێکی تریش خۆی نامادە بکاتەوە بۆ شەڕ. وەزیر جارێکی تر لەشکری لە کرماشانەوە بەرەو ئەصفەهان جوڵان. ئەففان داوای ئاشتیان کرد. عوسمانی موافەقەتی کرد. گفتوگۆی - عوسمانی بە پەیماننامەیەکی ئاشتی 12 مادەیی تەواو بو کە لوڕستان، حوێزە، کرماشان، کوردستان، ئازەربایجان، شیروان، ئەرمەنستان، گورجستان لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دا بمێنێتەوە. سوڵتان ئەشرەفی بە شای ئێران ناسی. ئەویش سوڵتانی بە پێشەوای جیهانی ئیسلامی ناسی (1140ک/ 1726ز).(13)

بەڵام نە شاهێتی ئەشرەف تا سەر بڕی کرد و نە ئەم ڕێککەوتنەش سەری گرت. چونکە ئەستێرەی کابرایەکی نەناسراوی ئێلی تورکمانی ئەفشار هەڵهات. کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەففان هێنا و. بە شەڕ هەمو ئەو ئەرزانەی وەرگرتەوە کە تورک بە شەڕ لە ئێرانی گرت بو.

لەم ماوەیەدا شای تازەی صەفەوی و. ناووناوبانگی سەربارە شەڕکەرەکەی بە هەمو ئێران دا بڵاو بوبوەوە.

خانە پاشا، دوای 4 ساڵ حوکمڕانی، سنەی پایتەختی ئەردەڵانی بە بێ شەڕ بە جێ هێشت (1140ک/ 1726ز) و گەڕایەوە موڵکی بابان. والی پێشوی سنە بە فەرمانی نادر گەڕایەوە سنە.

**-8-**

کاتی گەمارۆدانی ئەصفەهان. تەهماسبی کوڕی شا حسێنی صەفەوی دەرباز بوبو. لە خوراسان خەریکی کۆکردنەوەی هێز بو. کابرایەکی نەناسراوی ئێلی ئەفشار بە ناوی نادرخان پەیدا بو. لە ماوەیەکی کورت دا بە هۆی ئازایەتی و لێوەشاوەییەوە ناوی دەرکرد و بو بە سەرداری هێزەکانی تەهماسب.

نادر کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەففان هێنا لە ئەصفەهان (1142ک/ 1729ز). هێزی ئێرانیی کتوپڕ هێرشی هێنایە سەر هەمەدان و کرماشان. هێزەکانی عوسمانی تەفروتونا کرد. وڵاتی لێ سەندنەوە (1143). ئەحمەد پاشا دیسانەوە خۆی نامادە کردەوە بۆ شەڕ. هێزێکی گەورەی کۆکردەوە 3 مانگ لە شارەزور مایەوە

ئینجا ڕووی کردە کرماشان بە بێ شەڕ کەوتەوە ژێر دەستی. تەهماسب لە نزیک هەمەدان خۆی بۆ شەڕ ساز کرد بو. لە زنجیرە پێکادانێکی یەک لە دوای یەک دا هێزی ئێرانی شکا و بەرەو قەزوین هەڵات (1144ک/ 1731ز). لەم شەڕانەدا والی‌یەکانی دیاربەکر، سێواس و میرەکانی مەرعەش و ئاماسیە وموسڵ بەشدار بون. بەڵام پێشەنگی هێزەکانی عوسمانی ئێلاتی کورد بون.(14) هەمەدان کەوتەوە دەس عوسمانی. تەهماسب دوای ئەو شکانە قورسە داوای لە عوسمانی‌یەکان کرد ئاشتی بکەن و نوێنەری دەسەڵاتداری خۆی بۆ ئەم مەبەستە نارد. هەردولا پەیمانێکیان مۆر کرد. ئەو شوێنانەی عوسمانی بە شەڕ گرتبونی ئەبوایە بە دەس عوسمانی‌یەوە بمێنێتەوە.

نادرخان خۆی لە بیانو بو لە تەهماسب. ئەم ڕێککەوتنەی ڕەت کردەوە. هێزێکی گەورەی ئامادە کرد بۆ پەلاماردانی بەغداد.

هێزەکانی نارد بە ناو کوردستان دا هێرشیا دەس پێ کرد. خۆی لە قۆڵی کرماشانەوە بۆ درنە و خانەقین و. هێزێکی تریشی بە لای قەڵاچوالان و سورداش دا بۆ لای کەرکوک. گەمارۆی بەغدادیان دا (1145ک/ 1732ز). لەم ساڵەدا خانە پاشا کوژراوە. بەڵام کێ کوشتویەتی و، لە سەرچی و لە کوێ کوژراوە؟ سەرچاوەکان هیچ ئاگاداری‌یەکی ڕون بە دەستەوە نادەن.(15)

## پەراوێزەکان

1. العزاوی: 5 / 133 - 160.
2. العزاوی: 5 /191. امین زکی: "کورد و..." 407. هەروەها: "تاریخ السلیمانیه.." 64 - 66. ریچ: 427. لۆنگریک: 157.

بە گوێرەی گێڕانەوەی نوسەری "سیر الاکراد": "بەکر بەگ کوری فەرهاد بەگ و ساڵی 1017 لە جێگای باوکی دانیشتوە. لە هەڵسوکەوت دا لاسایی شاهەکانی کردۆتەوە. "دارولحکومە" ی لە "دارەشمانە" وە گوێزاوەتەوە "ماوەت" ئینجا بۆ گردی "بەکراوا" لە دەشتی شارەزور. هێزێکی لە خەڵکی دەرەوەی ناوچەکە پێک هێناوە پێیان وتون "چەکمەزەرد". ئێلەکانی رەواندوز و کۆیە و هەریر و بلباس شۆرشیان لێ کردوە، پەلاماریان داوە و شکاندویانە. بەکر بەگ رای کردوە بۆ شاخەکان. جارێکی تر هێزێکی لە خەڵکی بابان رێک خستۆتەوە چۆتە سەریان لە سەر زێی کۆیە شکاندونی". بابانی: 112- 114.

ئەم گێڕانەوەیە جێگای باوەڕ نیە. ناوی باوکی و ساڵی حوکمڕانی بە هەڵە تۆمار کردوە. لە هیچ سەرچاوەیەکی تریش دا پشتیوانی لەم ئاگاداری‌یانە نەکراوە.

3. نظمی زادە: 193.
4. لکهارت: 269.
5. العزاوی: 5 /205 - 206.
6. العزاوی: 5 /206 - 207. فخر الکتاب: 136 - 137.
7. العزاوی: 5 /213.
8. لکهارت: 328.
9. پورگشتال: 3122/4.
10. العزاوی: 219/5.
11. الکرکوکلی: 22. لکهارت: 333 - 334. پورگشتال: 4/ 3123. لۆنگریک: 166. امین زکی. "کورد..." 200.
12. الکرکوکلی: 23. لکهارت: 332. پورگشتال: 3122/4. لۆنگریک: 166.
13. العزاوی: 222/5. لکهارت: 335 - 336.
14. العزاوی: 5/ 226.
15. حوزنی موکریانی لەم بارەیەوە نوسیوێتی: "هەروەکو بێژرا کە نادر هەڵات سەلیم بەگی بابان گەڕایەوە کوردستان ئەحمەد پاشای والی بەغدا لە مێژ بو داخ لە دڵی خانک پاشا بو ئەویش دەترسا چونکە پیاوێکی ناودار و حوکمدارێکی پاڵەوان بو. لە شەڕی تەهماسبی صەفەوی و گرتنی هەمەدان و مامڵەت کردنی لە گەڵ نادر شا و گەلێک بزوتنەوەی دیکەشی لێ لە دڵ گرت بو. هاتنی عوسمان پاشا تۆپاڵی بە کەلێن ژمارد و شکستەی نادری بە غەنیمەت زانی بە فێڵ خانک پاشای خواستە بەغدا کە هێندێک مەسایل هەن لێی دەدوێن. خانک پاشا لەوە دوربونگ بو وای بە چاک زانی کە خالید پاشا بنێرێتە لای تۆپاڵ پاشا بەخێرهاتنی بکات و بناغەی مەوەدەت دابمەزرێنێتەوە.

کە خالید پاشای خستە رێ و گەیشتە کەرکوک تۆپاڵ پاشا گەلێکی حورمەت گرت و نەوازش و ئیکرامێکی بێ ژماری نیشان دا و بۆ حوکمداری بابان نامزەدی کرد بەڵام پێی نەگوت لە دڵی دا رایگرت

نادریە دوی خانک پاشاش کە بۆ شەڕی نادر شا و مەسئەلەی تخوب مەشورەتێک بکەن بە هەزار درۆ و فێڵ خانک پاشا خەڵەتاندرا و لە ڕێ دەرخرا. خانک بۆ بەخێرهاتن کردنی تۆپاڵ پاشا بە هەزار سوارە کوردەوە چوە کەرکوک و سەلیم بێگی کردە وەکیلی خۆی و لە قەڵاچوالانی دانا کە خانک پاشا گەیشتە کەرکوک عوسمان پاشا لە پاش میوانداری و ئیحتیرام گرتنی بە خۆشی خۆی ناردیە بەغدا. ئەحمەد پاشا چێتێکی لە خەودا چاوی پێ نەدەکەوت بە ئاشکرا دیتی. شەوێ لە خەودا خنکاندی سبەینە پازدەی ڕەبیع جەنازەکەی ناردەوە کوردستان". حوزنی موکریانی: 104 - 105.

حوزنی لە گێڕانەوەی ئەم هەواڵەدا ئیشارەت بە هیچ سەرچاوەیەک ناکا. ڕەنجوری نوسیویتی: "کوشتنی خانە پاشا 1143". سەرچاوەکانی تر ساڵی (1145ک/ 1732ز) یان نوسیوە.

قلعه من اصله لانه تعذيب وكراهته في كلام الشافعي المراد بها التحريم وقد يحمل على ما لا
تعذيب فيه ان تصور وما لا روح له كقناة ودار لا تجب عمارتهما على مالكهما الرشيد
لانهما تنمية للمال وهي لا تجب نعم يكره تركها الى ان تخرب لغير عذر كتركه سقي زرع
وشجر دون ترك زراعة الارض وغرسها ولا ينافي ما هنا من عدم تحريم اضاعة المال
تصريحهم في مواضع بحرمته لان محل الحرمة حيث كان سببها فعلا كالقاء مال في بحر
والكراهة حيث كان سببها تركا كهذه الصور لمشقة العمل اما غير رشيد فيلزم وليه
عمارة داره وارضه وحفظ ثمره وزرعه وكذا وكيل وناظر وقف واما ذو الروح المحترم
فيلزم مالكه رعاية مصالحه ومنها ابقاء عسل النحل في الكوارة ان تعين لغذائها وعلف
دود القز من ورق التوت وتباع فيه ماله كالبهيمة فاذا استكمل جاز تجفيفه بالشمس
وان اهلكه لحصول فائدته كذبح المأكول ولا تكره عمارة لحاجة وان طالت والاخبار
الدالة على منع ما زاد على سبعة اذرع وان فيه الوعيد الشديد محمولة على من فعل
ذلك للخيلاء والتفاخر على الناس وتكره الزيادة عليها اي لغير حاجة وصح ان الرجل
ليوجر في نفقته كلها الا في هذا التراب اي ما لم يقصد بالانفاق في البناء به مقصدا صالحا
كما هو معلوم والله اعلم

تم وكمل في يوم الجمعة من شهر ربيع الاول سنة الف ومائتين واثنين واربعين بعد
الهجرة النبوية على مهاجرها افضل الصلاة وازكى السلام بقلم الفقير الى المولى المقر
بالذنب والتقصير [illegible] غفر الله له ولوالديه وللمسلمين [illegible] من [illegible]
[illegible] الشريعة القويمة والطريقة المستقيمة اعني به اميرنا
[illegible] سليمان [illegible] امر الله [illegible]
[illegible] المرحوم المغفور [illegible] عبد الرحمن
[illegible] غفر الله [illegible] امين
برحمتك يا ارحم الراحمين سبحان ربك رب
العزة عما يصفون وسلام على
المرسلين والحمد لله رب
العالمين
١٢٤٢

# 4. سەلیم پاشا: تێکچونی هاوسەنگیی سیاسی

## -1-

شا تەهماسبی دوەم لە بەردەمی ئەشرەف خانی ئەفغانی دا شکا. بە تێشکاوی روی کردە مازندەران و، بە سەرگەردانی لەوێ ئەسوڕایەوە. ئێران ببو بە مەیدانی تەراتێنی هێزەکانی ئەفغان، عوسمانی و روس. نادرقولی بەگ، یەکێ لە سەرانی هۆزی قرخلوی ئێلی ئەفشار، بە پێنج هەزار شەڕکەری تورکمانی ئەفشار و کوردی قوچانەوە چوە لای تەهماسب. سەرۆکی ئێلی قاجاریش بە 3 هەزار کەسەوە دایە پاڵی. کۆبونەوەی ئەم هێزانە جوڵانەوەیەکی تازەی دروست کرد.

نادر، تەهماسبی قانیع کرد، لە پێش دا پەلاماری خوراسان و، دوای ئەوە پەلاماری ئەصفەهان بدەن. نادر بە پیلانێک لە کاتی شەڕدا خانی قاجاری کوشت و، خۆی بو بە سەرکردەی گشتی هێزەکانی شا.

هێرش بۆ سەر خوراسان تەواو بو. پاش چەندین ساڵ لەشکری ئێران سەرکەوتنێکی جەنگیی بە دەس هێنا. مەشهەد و هیرات گیران (1140ک/ 1726ز). سەرەتای کۆتایی دەسەڵاتی ئەفغان دەستی پێ کرد.(1)

لە زنجیرەیەک شەڕدا نادر لەشکری ئەفغانی شکان. ئەصفەهان، پاش ئەوەی 7 ساڵ بو بە دەس ئەفغانەوە بو، گیرایەوە. ئەشرەف بەرەو قەندەهار هەڵات بەڵام لە ڕێگا کوژرا. بەمجۆرە دەسەڵاتی ئەفغان بڕایەوە.(2)

نادر لە مەراسیمی تاجگوزاری شا تەهماسب دا بەشدار بو. لە پاداشتی خزمەتەکانی دا بو بە سپاسالاری ئێران و، حاکمی خوراسان و سیستان و مازندەران. بەڵام نادر خۆی لەوە بە زلتر دائەنا بەم پایەیە ڕازی بێ.

شای ئێران، بەرخوردارخانی ناردە لای سوڵتانی عوسمانی و، داوای گێڕانەوەی ولایەتەکانی ئێرانی لێ کرد. بابی عالی گوێی نەدایە داواکەی. نادر ئەم هەوڵە دیپلۆماسیەی شای پێ خۆش نەبو. لای وابو عوسمانی تەنیا لە زمانی زۆر تێ ئەگەن.

نادر هێزێکی گەورەی سازدا. لە ماوەیەکی کورت دا هەمەدان، لورستان، کوردستان، کرماشان و، بەشێکی ئازەربایجانی لە تورک پاک کردەوە. چوە سەر قەڵای ئێرەوان و گەمارۆی دا. نادر نەیتوانی درێژە بە شەڕ بدا دژی عوسمانی چونکە ئەبدالەکان لە هیرات شۆڕشیان کرد. نادر بەرەو هیرات بۆ دامرکاندنەوەی شۆرشەکەیان بەڕێ کەوت.

شکانی هێزەکانی تورک لە ئەستەموڵ دەنگێکی خراپی دایەوە. یەنیچەری سوڵتان ئەحمەدی سێیەمیان لابرد و، سوڵتان مەحمودی یەکەمیان لە جێ دانا. هێزی عوسمانی پەلاماری ئێرانی دایەوە. بێ شەڕ کرماشانی گرتەوە. کەوتە پێشرەوی بەرەو هەمەدان. هاوزەمان لە گەڵ ئەم لەشکرکێشیەدا خالید پاشای بابان هەڵی کوتایە سەر سنە و گرتی (1144ک/ 1731ز). والیی ئەردەلان هەڵات.

بەڵام پاش ساڵێک کە نادر کەوتە هێرش بۆ سەر هێزی عوسمانی، خالید پاشا سنەی بەجێ هێشت و، والیی لە ئەردەلان دانایەوە (1145ک/ 1732ز).

شا ویستی خۆی سەرکردایەتی شەڕی بەرەنگاریی تورک بکا. بەڵام بە سەختی شکا و، هەمو ئەو شوێنانەی نادر ئازادی کردبون لە ماوەیەکی کەم دا کەوتەوە دەس تورک. شا هەڵات بۆ ئەصفەهان. صەفی قولی خانی شاملوی بە نوێنەرایەتی خۆی نارد بۆ گفتوگۆ لە گەڵ ئەحمەد پاشای والیی بەغداد. صەفی و ئەحمەد ڕێککەتنێکیان ئیمزا کرد. نوێنەری شا دەستی لەو ناوچانە هەڵگرت بو کە تورک بە شەڕ گرتبونی.

نادر بەم ڕێککەوتنە ڕازی نەبو. خۆی لە شا بە بەهانە بو. کەوتە قسە دژی. تێشکانی جەنگیی و، ڕێککەوتنی زەلیلانەی کرد بە بیانوی لێخستنی. نامەی بۆ والی و حاکمەکانی ئێران نارد کە ڕێککەوتنەکەی بەغداد هیچ نرخێکی نیە و، بە ئەبوی دابنێن. صەفی قولی خانی نارد بۆ ئەستەموڵ کە ئاگاداری سوڵتان مەحمود بکا ڕێککەوتنەکەی بەغداد هەڵوەشێنراوەتەوە. دەوڵەتی عوسمانی ئەگەر بە ئاشتی ولایەتەکانی ئێران چۆڵ ناکا، دا خۆی بۆ جەنگ ئامادە بکا.(3)

نادر هێزێکی گەورەی لە گەڵ خۆی برد بۆ ئەصفەهان. تەهماسبی لە شاهێتی خست. کۆرپەیەکی چەند مانگەی لە جێگای ئەو داناو، خۆی کرد بە "وکیلولدەولە".

هاوزەمان لە گەڵ خۆ سازدان بۆ پەلاماردانی تورک، هەوڵی ڕێککەوتن و ئاشتی ئەدا لە گەڵ ڕوسیا. دوای مردنی پێتەری گەورە، لە ماوەی 5 ساڵ دا 3 قەیسەر گۆڕا بو. ڕوسیا بە وردی چاودێری گۆڕانەکانی ناو ئێرانی ئەکرد و، سەرکەوتنەکانی نادر وای لێ کرد بون چاو بە هەڵوێستی خۆیان دا بگێڕنەوە. بەتایبەتی بەو پەیمانەدا کە لە گەڵ عوسمانی دا بۆ دابەشکردنی ئێران ئیمزایان کرد بو.

نادر نوێنەرەکانی دوای زنجیرەیەک گفتوگۆ و هاتو چۆ لە گەڵ ڕوسیا، چەند ڕێککەوتنێکیان ئیمزا کرد و، زۆری ئەو ناوچانە کاتی خۆی پێتەر گرت بونی، بە ئاشتی چۆڵیان کرد نادر پەژارەی هێرشی ڕوسی نەما بو.(4)

## -2-

نادر لەشکرێکی گەورەی سازدا و بەرەو هەمەدان کەوتە ڕێ (1145ک/ 1732ز) ئەحمەد پاشا کە هەوالی جوڵانی لەشکری عەجەمی بیست کەوتە قایمکردنی ناوچە سنورییەکانی درنە، مەندەلی، بەدرە، جەسسان، بە هێزی کورد، بە تایبەتی هێزی ئەمارەتی بابان. بەڵام نادر کتوپڕ هەڵیکوتایە سەریان تەفروتونای کردن و، لە بەهرز لە ناوی سیروان پەڕیەوە.(5)

نادر هێزەکەی کردە دوبەش. بەشێکیانی بە سەر کردایەتی نێرگز خان ناردە سەر کەرکوک، وەکو ئەمین زەکی ئەڵێ: "ئەم قوڵە بە سەر توزخورماتودا ڕۆیی و، هەر وڵاتێکی هاتە پێش وێران و تاڵانی کرد و زوڵم و شەناعەتی ئەم نێرگز خانە لە حەد بەدەر بو. ژن و منداڵیشی لە دەست ئەجات نەدە بو. ئەترافی

کەرکوکیشی بەم دەردە برد و لە دوایی دا ڕوی کردە موسڵ لە دوای موحاصەرە و تەزیقاتێکی کەم هیچی پێ نەکرا و گەڕایەوە". لە شەڕی بەرەنگاریی هێرشی عەجەم دا دو کەس لە سەرکردەکانی کورد کوژران: ئەحمەد بەگی میری درنە و باجەڵان و، ئەحمەد پاشای کۆیە.(6)

بەشی سەرەکی هێزەکەی، لە ژێر فەرمانی خۆی دا لە بەهرز لە ناوی سیروان پەڕییەوە بۆ سەر بەغداد. نادر گەمارۆی ناو شاری بەغدای دا.

سوڵتان، تۆپاڵ عوسمان پاشای بۆ سەرکردایەتی ئۆردوی رۆم بۆ بەرەنگاری نارد. هێزی یارمەتی کورد گەیشتە تۆپاڵ عوسمان پاشا. بەرەو بارەگای نادر کەوتە ڕێگا. نادر کەبەهاتنی ئەو هێزەی زانی 12 هەزار کەسی بۆ دریژە پێدانی گەمارۆی بەغداد گل دایەوە. پاشماوەی هێزەکەی لە گەڵ خۆی برد بۆ بەرەنگاری لەشکری ڕۆم. هەردو لەشکر لە کەناری ڕوباری دیجلە لە "دوجەیل" ڕوبەڕوی یەکتر بون. عەجەم شکا. 10 هەزاری لێ کوژرا. نادر خۆی بە تێشکاوی هەڵات (1146ک/ 1733ز) بەڵام نادر لە ماوەی 3 مانگ دا سەرلەنوێ لەشکری ئێرانی ڕێکخستەوە و ڕوی کردە عێراق، لەو کاتەدا تۆپاڵ عوسمان پاشا لە گەڵ هێزەکەی دا لە نزیک کەرکوک بون. ئەم دو هێزە دیسانەوە لە "لەیلان" نزیک کەرکوک بەرەنگاری یەک بون و، لە گەرمەی جەنگ دا تۆپاڵ عوسمان کوژرا و هێزەکەی شکا و، نادر سەرکەوت (1733ز).(7)

نادر هەوڵی دا کەڵک لەم سەرکەوتنە وەربگرێ بۆ پێکهاتن لە گەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بەتایبەتی و بۆ بە دەس هێنانی دانپیانانی ڕەسمیی بە مەزهەبی شیعەدا بەڵام هەڵگیرسانی شۆرشێکی ناوخۆ لە فارس دیسانەوە نادری ناچار کرد، کە بێ ئەوەی بگاتە ئەنجام، بە خۆی و هێزەکەیەوە بکشێتەوە بۆ سەرکوت کردنی یاخیبونەکەی فارس.

لە ئەنجامی هێرشەکانی نادر دا ناوچەی ئەردەڵان لە دەس پاشاکانی بابان دەرچو. ناوچەی بابان توشی زەرەری ماددی و گیانیی قورس بو.

## -3-

نادر هەمو گەورە پیاوەکانی ئێرانی بانگ کرد بۆ کۆبونەوە لە دەشتی موغان.

سەفیرەکانی ڕوس و عوسمانیش بانگ کرا بون. نادر پەیامێکی بۆ ئەم کۆڕە نارد. تێی دا نوسی بوی دوای ئەوەی هەمو خاکی ئێران لە دوژمن ئازاد کراوە، ئیتر ئەو گەرەکێتی بگەڕێتەوە قەڵای کەلات. پاشماوەی ژیانی بە هێمنی بە سەر ببات. داوای لێ کرد بون کە یەکێکی شایستە بە "شا" ی ئێران هەڵبژێرن. بەشدارانی کۆڕەکە نادریان هەڵبژارد (1148ک/ 1735ز). بەڵام نادر بۆ ئەوەی ئەم هەڵبژاردنە قوبوڵ بکا 3 مەرجی بۆ دانان:

1. نابێ هیچ کەس پشتیوانی لە هێنانەوەی بنەماڵەی صەفەوی بکات.
2. نابێ ئیتر لە عنەتی 3 خەلیفەکەی ئیسلام و، عایشەی هاوسەری محەمەد و ئەو کەسانە بکرێ کە لای سوننە بەڕێزن.
3. هەمو سوێند بخۆن کە دڵسۆزی نادر و ئەوەکانی و بنەماڵەی ئەفشار ئەبن.

کۆڕەکە مەرجەکانی پەسەند کرد. بەڵگەنامەیەکیان ئیمزا کرد. نادر تاجگوزاری کرد. بو بە شای ئێران (1148ک/ 1735ز).

بۆ گەیاندنی ئەم هەواڵە بە بابی عالی و، بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکی شیعە و سوننە و، دانانی بناغەی ئاشتی لە نێوان ئێران و عوسمانی دا نادر دەستەیەکی سەفارەتی بە سەرۆکایەتی عەبدولباقی خانی زەنگەنە بە دیاری و پێشکەشی هێژا و زۆرەوە بۆ ئەستەموڵ نارد.

سەفیری ئێران 5 پێشنیاری پێ بو:

1. لە بەر ئەوەی خەڵکی ئێران وازیان هێناوە لە لەعنەت کردنی سوننە، دەوڵەتی عوسمانی مەزهبی جەعفەری بە مەزهبی پێنجەمی ئیسلام بناسێ.
2. لە کەعبە گۆشەیەک بۆ ئەم مەزهبە تەرخان بکرێ، وەکو چۆن مەزهبەکانی تر هەریەکەیان گۆشەی تایبەتی خۆی هەیە.
3. ئێران میرحەجی خۆی دابنێ و، دەسەڵاتدارانی تورک وەکو میرحەجەکانی شام و میصر رەفتاریان لە گەڵ بکەن.
4. پەیمان لە بەینی هەردو دەوڵەت دا ببەسترێ و، دیلەکانی هەردولا بەر بدرێت.
5. هەردولا لە پایتەختی یەکتری دا سەفیریان هەبێ.

عوسمانی‌یەکان ئامادە بون بۆ بەستنی پەیمان و، ڕێککەوتن لە سەر مەسەلە سیاسی‌یەکان، بەڵام بە هیچ جۆرێ ئامادە نەبون ئەو پێشنیارانەی لایەنی دینی‌یان هەبو بسەلمێنن.

پەیمانێکی سەرەتاییان ئیمزا کرد دەربارەی سنوری هەندێ لە ناوچەکان و، رەفتار لە گەڵ زائیرەکانی ئێران و، کاروباری بازرگانی و گومرگ (1149ک/ 1736ز). بەڵام کێشەی سەرەکی کە ناسینی ڕەسمیی مەزهبی شیعە بو بە چارەسەر نەکراوی مایەوە.(8)

ئەوەش وەکو گرێکوێرەی ناکۆکی‌یەکانی نێوان هەردو دەوڵەت مایەوە.

لە پاش لەشکرکێشی بۆ سەر هیند، نادر سەفیرێکی بۆ ڕاگەیاندنی ئەم سەرکەوتنە ناردە ڕوسیا، هەروەها سەفارەتێکی سەرلەنوێ بە سەرۆکایەتی محەمەد ڕەزا خان ناردە لای بابی عالی (1153ک/ 1740ز) ئەم سەفارەتەش نەیتوانی پێکهاتنی شیعە و سوننە ئەنجام بدا.(9)

—4—

هێزی عەجەم هێرشێکیان هێنایە سەر مەندەلی و شارەزور (1154ک/ 1741ز)، بەڵام هێرشی گەورەی عەجەم بۆ دەسگرتن بە سەر عێراق دا ساڵی (1156ک/ 1743ز) دەستی پێ کرد، کە دیسان نادر خۆی سەرکردایەتی ئەکرد.

هێزی عەجەم بە 170 هەزار کەس تەقدیر ئەکرا لە شارەزور و مەندەلیەوە کەوتە هێرش بردن. لە دوای تاڵانکردنی شارەزور گەیشتە کەرکوک و پاش هەفتەیەک گەمارۆدان گرتی و، لە زێی کۆیە پەڕییەوە بۆ سەر هەولێر. ئەویشی داگیرکرد و، بارەگای خۆی لە یارمجە دامەزراند و کەوتە دابڵۆقەدانی شاری موسڵ (1156ک/ 1743ز).

ئەحمەد پاشا لە نامەیەکی دا بۆ بابی عالی لە باسی ئەم هێرشەدا نوسیویێتی: "... عوسمان ئاغا لە کرماشانەوە ئاگاداری کردین کە دوژمن بە تەمای پەلاماردانی بەغدایە... خۆمان و هێزەکانی سنورمان ئامادەکرد... بەڵام کتوپڕ بەیانی 26 ی جیمادی دوەم پەلاماری درنەی دا و بۆ ئێوارە گەیشتە خانەقین...

هێزەکانی ئازەربایجان بە سەرکردایەتی خانی تەورێز لە لای قەڵاچوالانەوە ڕویان کردۆتە کەرکوک... هیوام بە هێزەکانی کورد بو، بەڵام ئەوانیش خەریکی خۆیان و خێزانەکانیان بون، ناتوانن بگەنە لامان و، هیوامان لێ بڕیون..."

ئینجا باسی کەمیی هێزەکانی خۆی و داوای یارمەتی ئەکا و، بۆ ئەوەی بابی عالی بترسێنێ ئەڵێ: "ئەگەر ئێرە بشکێ تا ئەنادۆڵ ڕێگا کراوە ئەبێ". لە سەر ڕەفتاری لەشکرەکەی نادر نوسیویێتی: "دوژمنەکەمان ڕەفتارێکی نواندوە لاسایی هۆلاکۆ و تەیموری کردۆتەوە، خۆی بە یەکێ لەوان دائەنێ."(10)

هاوزەمان لە گەڵ گەمارۆدانی موسڵ دا هێزەێکی 40 هەزار کەسی تر گەمارۆی شاری بەغدادی دابو. ئەحمەد پاشای والیی بەغداد، بۆ تەفرەدانی نادر شا وەکو ئەڵێن "ناگرە سوری لە من دوریێ!" بەڵێنی دابویە کە ئەگەر موسڵ بگریێ، ئەویش بەغدادی بە دەستەوە بدا. بەڵام خەڵکی موسڵ بە سەرکردایەتی حسێن پاشای جەلیلی بەرەنگاری‌یەکی قارەمانانەیان کرد و، شارەکەیان بەدەست نادرەوە نەدا.

**-5-**

نوسەری "جیهانگوشای نادری" لە روداوەکانی سالی 1156ک (1743ز) دا کە هێرشی فراوانی نادر شارەزوری لە گەڵ خۆی راماڵی بو ئەڵێ: "... خالید پاشای حاکمی بابان و شارەزور و سەلیم بەگی ئامۆزای لە گەڵ مەزن و سەرۆکەکانی کورد واریدی دەرباری خەلافەت مەدار" بون و "بە نازناوی خانی و ئیالەت سەربڵند و، گشت ئەو مەرزوبومەی کوردستانی رۆم" کەوتە ناو "حەوزەی ئیتاعەتەوە".(11)

ئەم هەواڵە هەموی راست نیە کوردەکانی ناوچەی بابان بەدەگمەن هاوکاری‌یان لە گەڵ نادر کردوە. لە کاتی هێرشەکەی نادردا خالید پاشا میری بابان بوە، کە ئۆردوی نادر گەیشتە کوردستان خالید پاشا لە سەردەشت رێگای پێ گرت.(12) بەڵام هێرشی عەجەم ئەوەندە گەورە و خێرا بو لە توانای هێزێکی بچوکی وەکو لەشکری بابان دا نەبو بەری بگریێ. لە ماوەیەکی کورت دا ناوچەکەی گرت و، کەرکوک و هەولێری داگیرکرد و، گەمارۆی موسڵ و بەغدادی دا. خالید پاشا بە خاووخێزان و دەسوپێوەندەکانیەوە روی کردۆتە موسڵ. دانەری "نورجوزە"ی "ملحمە الموصل" نوسیویتی:

اذ جاء فوج زمر الاكراد
بالمال والعيال والاولاد
فقيل: من هنا؟ فقالوا: "خالد"
حامي قرەچوالان دا المعاند
وسار يبغي امد والعسكرا
وانە منذعر مما جرى
من بعد ان ضر قوي النافكر
وسار يطوي سبيا مع قفر
من بعده جاءنا "قوچ" وقد
ادخل للموصل في الدور رقد
من بعد ان ادى شروط الخدمة
في نادي والينا كثير النعمة(13)

لەم سەفەرەدا خالید پاشا نەخۆشی‌یەکی گرانی گرت. شێخ صادق، یەکێ لە هاوسەفەرەکانی، "موناجات" ێکی درێژی پڕ سۆزی بە کوردی هۆنیوەتەوە داوا لە خوا ئەکا شیفای خالید پاشا بدات. ئەوەی زانراوە تا ئێستە ئەمە یەکەمین شیعرە بە زاراوی بابان هۆنرابێتەوە. خالید پاشا بەم نەخۆشی‌یە لە ئورفا مرد (1156ک/ 1743ز).

وەکو دانەری "ئورجوزە" کە ئەڵێ: قۆچ پاشا و هێزەکەی هاوبەشی بەرگریی موسڵ بون و، بەشێ لە هێزەکانی بابانیش لە ناو شاری بەغداد بون هاوبەشی بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی ئۆردوی نادر بون. کاتێ تۆپاڵ عوسمانی سەرکردەی ئۆردوی رۆمیش گەیشتە ناوچەکە، وەکو هامەر نوسیویتی، هێزەکانی کورد دایانە پاڵی. لە ناو میرەکانی بابان دا تەنیا سەلیم بەگی کوری بەکر بەگ خۆی لە گەڵ نادر شا سازاندوە و، ئەویش دوای ئەوەی نائومێد بو لە بەرهەڵستی ئۆردوەکەی نادر شا.

لەو سەردەمەدا یەکێ لە پیاوە بە ناوبانگەکانی ناوچەکە شێخ حەسەنی گڵەزەردە (1677 - 1762ز) بوە. شێخ حەسەن مەلایەکی ناسراو و شێخی تەریقەتی قادری بوە. ئەستێرەوانێکی شارەزاش بوە. تا ئێستاش حسابی گڵەزەردە لە ناو خەڵک دا ماوە.

نادر شا، وەکو هەندێ سەرچاوە ئەگێڕێتەوە، نامەیەکی بۆ شێخ حەسەن ناردوە داوای لێ ئەکا بچێ بۆ لای و، هەڕەشەی لێ ئەکا کە ئەگەر نەچێ ڕق و تورەبونی خۆی بە سەردا ئەبارێنێ. بەلام شێخ حەسەن پیری و کەنەفتی خۆی کردوە بە بیانو. وەلامێکی ئازایانەی داوەتەوە و نەچۆتە سەردانی.(14)

کوردەکانی ناوچەی بابان بە گشتی هاوکارییان لە گەڵ نادر شا نەکردوە. بۆ ئەمەش دو هۆی سەرەکی هەبوە: یەکەمیان، هۆی مەزهەبیی. ئەوان شیعە بون و کوردی بابان سوننە بون. دومیان، ڕەفتاری خراپی لەشکرەکەی نادر لە گەڵ دانیشتوانی ناوچەکە. ئەمین زەکی ئەڵێ: "موعامەلەی نادر دەرحەق بە کورد زۆر خراپ بو و کوردەکان ئەیان بوغزاند. حەتتا دانیر بە شەڕی لە گەڵ توپاڵ عوسمان پاشادا، بە لەهجەی گۆران هەجویەکیان بۆ هەڵبەست بو. سەبەبی ئەم نەفرەتەش زوڵم و خراپەی نادر شا بو... "(15)

## -6-

مەزەبی سوننە بنچینەی ئایدیۆلۆجی دامەزران و چەسپین و مانی دەوڵەتی عوسمانی و، مەزهەبی شیعە هی صەفەوی بو. جیاوازیی مەزەب ماوەیەکی درێژ هۆی ناکۆکی خوێناوی ئەم دو وڵاتەی توشی کارەساتی گەورە کرد بو.

نادر شا، لە سەردەمی حوکمڕانی خۆی دا، هەوڵێکی زۆری دا بۆ نزیک خستنەوەی شیعە و سوننە لە یەکتری و، تەنانەت لە کاتی تاجگوزاری دا لە دەشتی موغان، یەکێ لە مەرجەکانی بۆ قبوڵ کردنی تاجی شاهێتی ئێران ئەوە بو کە ئیتر زاناکانی شیعە دەس هەڵبگرن لە جنێودان بە سوننە و خەلیفەکانیان. لە هەمو ئەو گفتوگۆیانەدا کە لە نێوان نوێنەرانی ئێران و تورک دا ئەکرا بۆ ئاشتی، یەکێ لە داواکانی نوێنەرەکانی نادر ئەوە بو: دەوڵەتی عوسمانی شیعە وەکو مەزەبی پێنجەمی ئیسلام بسەلمێنێ و، لە کەعبە گۆشەیەک بۆ ئەمان، وەکو مەزەبەکانی تر، تەرخان بکرێ. بابی عالی هەرگیز ئەم داوایەی بۆ نەسەلماندن.

پاش ئەوەی نادر نائومێد بو لە گرتنی موسڵ و بەغداد، سەرلەنوێ هەوڵێکی تری دا بۆ نزیک کردنەوەی هەردو مەزەب لە یەکتری. داوای لە والیی بەغداد کرد یەکێ لە زانا هەڵکەوتوەکانی سوننە بنێرێ بۆ پێلەبازی لە گەڵ زاناکانی شیعە. ئەحمەد پاشا، شێخ عەبدوڵای ئال سویدی نارد. سویدی لەو زەمانەدا یەکێ لە زانا گەورەکانی سوننە بو.

سویدی کە ئەگاتە لای نادر شا لە حیللە. شا لێی ئەپرسێ: ئەزانی تۆیان بۆچی ناردوە و، من بە تایبەتی بۆچی تۆم ویستوە؟

شێخ ئەڵێ: نازانم.

شا ئەڵێ: مەملەکەتەکەم دو فیرقەی تێ دایە: ئەفغان و تورکستان لە لایەک و، ئێرانییەکان لە لایەکی تر. هەر لایە "تەکفیر" ی ئەوی تر ئەکا. لە گەڵ ئەوەی کە "تەکفیر" شتێکی ناشیرینە. ویستم ئەوەیان لە بەین دا نەهێلم تۆم کردوە بە وەکیلی خۆم و بە شایەت بە سەر ئەوانەوە.(16)

شا فەرمانی دا بە ڕێکخستنی کۆڕەکە. کۆڕێکی گەورە لە ژێر گومەزی ئارامگای ئیمام دا بە ئامادە بونی 70 مەلا لە زاناکانی شیعە و سوننەی ئێران و ئەفغانستان و ئەودیو ڕوبار بەسترا. بۆ تێگەیشتن لە جۆری بیرکردنەوەی مەزهەبی و، تێگەیشتن لە بنچینەکانی ناکۆکییەکە لێرەدا لە زمانی شێخ عەبدوڵای سویدییەوە، هەندێ لە وتووێژەکان ئەگێڕمەوە:

"مەلاباشی رووی کردە بەحرلعیلم وتی: نەزانن ئەمە کێیە، دەستی بۆ من راکێشا، ئەمە لە گەورەزاناکانی سوننەیە، شا داوای لە ئەحمەد پاشا کردوە بینێرێ بۆ ئەوەی لە بەینی ئێمەدا حەکەم بێ و، وەکیلی شـا بـێ و، شایەتی ئەوەش بێ کە لە سەری رێک ئەکەوین.

یەکەم پرسیاری کردی: ئەو هۆیانەمان بۆ روون بکەنەوە کە وای لێ کردون ئێمـە بـە کـافر دابنـێن بـۆ ئەوەی بە بەرچاوی ئەمەوە بەرپەرچی بدەینەوە، بێگومان ئێمە کافر نین، لە کتێبی "جامع الاصول" دا هاتوە کە ئیسلام پێنج مەزەبە و، مەزەبی پێنجەم ئیمامیە، هەروەکو لە کتێبـی "الفقـه الاکبـر" ی ئـەبو حەنیفـەدا وتـراوە: ئەهلی قبیلە تەکفیر مەکەن. وە لە کتێبی "شـرح الهدایـە" دا وتـراوە: راسـتە ئیمامیـە لـە فیرقـەکانی ئیسـلامە. زاناکانی ئێمەش وەها باسی ئێوەیان کردوە، بەڵام توندرەوە نەزانەکانی ئێوە ئێمەیان بە کافر داناوە، ئەوەش نەزانەکانی ئێمەیان وا لێ کردوە بە هەمان شێوە رووبەڕووتان ببێتەوە و بە کافرتان دابنێن. راستیەکەشـی نـە ئێمە کافرین و، نە ئێوەش کافرن، با باسی ئەمە بکەین بۆ ئەوەی خراپ لە یەک گەیشتن لە ناوا نەمێنێ.

خواجە هادی وتی: ئەوەی لە سەر ئێوەمان هەیە ئێـوە صـەحابەکان بـە گـومڕا دائـەنێن و تـەکفیریان ئەکەن.

مەلاباشی وتی: صەحابەکان (خ. ر) هەموویان عدولن.

خواجە هادی وتی: ئێوە ئەڵێن "میتعە" حەڵاڵە.

مەلاباشی وەڵامی دایەوە: "میتعە" لای ئێمە حەرامە، تەنیا سەفیهەکانی ئێمە باسی ئەکەن.

بەحرلعیلم هادی خواجە وتی: ئێوە فەزلی عەلی ئەدەن بە سەر ئەبوبەکردا و، ئەڵێن دوای پێغەمبـەر ئـەو خەلیفەی بە حەق بوە.

مەلاباشی وەڵامی دایەوە: باشترین خەڵق لە دوای پێغەمبەر ئەبوبەکری کـوڕی ئـەبو قەحافەیـە، ئینجـا عومەر، ئینجا عوسمان، ئینجا عەلی خوایان لێ رازی بێ و، خەلافەتیشیان بەو جۆرە بەڕێز بوە.

بەحرلعیلم لێی پرسی: ئایا ئەمانە لە بنچینەکانی باوەڕتانە؟

مەلاباشی وەڵامی دایەوە: بنچینەکانی باوەڕی ئێمە پێڕەوی بنچینەکانی باوەڕی ئەبولحەسەن ئەلئەشعەری ئەکا.

بەحرلعیلم وتی: مەرجێکم هەیە، زەروریاتی دینیی کە ئیجماعی لە سەرە نـابێ حەڵاڵـەکانی بگـۆڕن بـە حەرام و، حەرامەکان بکەن بە حەڵاڵ.

مەلاباشی وتی: ئەم مەرجەمان قبوڵە.

بەحرولعیلم وتی: مەرجێکی تر، ئەبێ خۆتان لابدەن لەو شـتانەی کـە چـوار ئیمامەکـە رێکـن لـە سـەر حورمەت گرتنی.

مەلاباشی ئەمەشی قوبوڵ کرد. ئینجا مەلاباشی رووی کـردە بـەحرولعیلم وتـی: ئێمـە هـەمو ئەوانـەمان قوبوڵ کرد کە داستان کرد، ئاخۆ لێرە بە دواوە لە فیرقەکانی ئیسلام دامان ئەنێن؟

بەحرولعیلم ماوەیەک مات بو ئینجا وتی: جنێودان بە دو شێخەکە کفرە.

مەلاباشی وەڵامی دایەوە: جنێودانمان بە هەردو شێخ هەڵگرتوە، مەرجەکانی پێشەوەی ئێوەمان قوبـوڵ کردوە، ئایا لە ڕیزی فیرقەکانی ئیسلام دا دامان ئەنێن یان هێشتا بە باوەڕی ئێوە ئێمە کافرین؟

بەحرولعیلم دیسان مات بو ئەوەی دوبارە کردەوە کە جنێودان بە هەردو شێخ کفرە.

مەلاباشی وتی: ئەی جنێودانمان هەڵنەگرت؟

موفتی ئەفغان مەلا حەمزە کەوتە دوان: ئەی بەحرولعیلم ئایا ئەوانە پێش ئەم کۆڕە جنێویان بە هـەردو شێخ داوە؟

بەحرولعیلم وەڵامی دایەوە: نەخێر.

مەلا حەمزە وتی: کەواتە بۆچی لە ڕیزی فیرقەکانی ئیسلام دا دایان نەنێین دوای دەربڕینی ئیلتیزام بە جنێونەدان بە هەردو شێخ لە پاشەڕۆژدا. "وعفا الله عما سلف؟"

ئەوسا بەحرولعیلم وتی: بەڵێ ئەوانە موسوڵمانن "لهم ما لنا وعليهم ما علينا".

هەمویان هەڵسان و دەستی یەکتریان گوشی و هەرکەسەیان بە وی تریانی ئەوت برا مەرحەبا."(17)

ئەم ڕێککەوتنە لە لایەن هەمو بەشدارەکانەوە ئیمزا ئەکرێ. نـادر شـا ئەمـە بـە سـەرکەوتنێکی گـەورە دائەنێ بۆ خۆی نوێژی هەینی لە مزگەوتی کوفەدا ئەکەن و، ئەم پەیمانەش ئەخوێننەوە. دوای ئـەوە نـادر شـا گەڕایەوە ئێران و، هێزەکانی لە عێراق کێشایەوە و، کەوتـە هەوڵـدانی ڕێککـەوتنی ئاشـتی لـە گـەڵ دەوڵـەتی عوسمانی.

## -7-

نادر چەند جارێ پەیامی بۆ بابی عالی ئەنارد بۆ پێکهاتنی ئاشتی.

بابی عالی ئامادە نەبو داخوازییە دینییەکانی نادر بسەلمێنێ و، شیعەی جەعفەری بە مـەزهەبی پێنجـەم بناسێ. نادریش دەستی لەم داوایانە هەڵگرت. سەرەنجام حەسەنعەلی خان بەنوێنەرایـەتی نادرشـا و ئەحمـەد پاشا بە نوێنەرایـەتی سـوڵتان مـەحمود خـانی یەکـەم "عەهدنامـە" یـەکیان مـۆر کـرد (1159ک/ 1746ز). پەیماننامەی زەهاو (1049ک/ 1639ز) کرایـەوە بـە بنچینـە بـۆ دیـاری کردنـی سـنوری هـەردو دەوڵـەت. هەردولا ئەو سنورەیان سـەلماندەوە. بـەم پێیـە هـەمان سـنوری پەیماننامـەی زەهـاو بـوەوە سـنوری نێـوان ئەمارەتەکانی بابان و ئەردەڵان.

## -8-

ڕێککەوتنەکە لە هەردو لا پەسەندکرا. بەڵام نادر شا لەو ماوەیەدا کوژرا (1160ک / 1747ز).

سەلیم بە درێژایی خەریکبونی هێزەکانی عێراق بە پەلاماری نادرەوە، بە سـەربەخۆیی کـاری نـەکرد و، گوێی نەئەدایە فەرمانەکانی والیی بەغدا. ئەم بەشەی کوردستان بە کردەوە لـە دەسـەڵاتی تـورک دابـڕا بـو. ئەحمەد پاشا دەرفەتی ڕێککەوتنی ئاشتبونەوەی هەردو دەوڵەت و، کوژرانی نادرشـای بـە هـەل زانـی حسـاب لەگەڵ سەلیم پاشا تەواو بکا و، ناوچەی بابان بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

والیی بە بیانوی ئەوەی سەلیم دەستی لە گەڵ ئێران تێکەڵاو کردەوە لەشکری بـردە سـەری. لەشـکری عوسمانی بە سەرکردایەتی وەزیر ئەحمەد پاشا و بە هاوکاری مورتەزا پاشای والیی کـەرکوک بـەڕێ کـەوت. سەلیم خۆی لە قەڵای سرۆچک و شێربەگی برای لە قەمچوغە دا قایم کرد بو. ئەحمەد پاشا بە ڕێگای حەسـەن تەپە ئینجا تابین دا گەیشتە سەر قەمچوغە و پەلاماریان دا و گرتیان.

ئەحمەد پاشا و هێزەکەی بە ڕێ کەوتن بۆ گێچینە، سوسێ، تەپەرەش، سەرچنار، تەپەکەل، بێستانسور، لەوێوە بە ناو دەشـتی شـارەزوردا بـەرەو سـرۆچک. لـە سـرۆچک سـەلیم پاشـایان گـەمارۆ دا. ناووهـەوای شارەزور لە هاوین دا ناسازە. نەخۆشی مەلاریای تێ دا بڵاوە. زۆری لەشـکر توشـی لـەرزوتا بـون. ئەحمـەد پاشاش نەخۆش کەوت.

سەرچاوە ڕەسمییەکانی ئەحمەد پاشا ئەڵێن: سەلیم پاشا بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵی کوڕەکەی بە بارمتـە نارد و، هەندێکی تریش ئەڵێن دایکی لای پاشا کردۆتە تکاکار. بەڵام پێ ناچێ ئەو هەواڵانە ڕاسـت بـن. ئـەم قسانەیان کردۆتە بەهانەی گەڕانەوەی هێزەکەی والی بە سەرنەکەوتویی.

ئەخۆشی هێزەکە و ئەحمەد پاشای شپرزە کرد. لەوێوە بە پەلە گەڕانەوە سەرای سەید صادق، کە پاشاکانی بابان بو ڕاو و شکار دروستیان کرد بو. ئەحمەد پاشا لە سەید صادقەوە بۆ بێستانسور و ئینجا گوێز قەڵا. والی کەوتە لابردن و دانانی حاکمەکانی ناوچەکە: سلێمانی کوڕی خالید پاشا بۆ بابان و، عوسمان پاشای بۆ کۆیە و، قۆچ پاشای بۆ هەولێر و، محەمەد بەگی بۆ قەرەداغ و، عەبدوڵڵا بەگی بۆ دربە دانا. سلێمان لە بنەماڵەی بابان و عوسمان و قۆچ لە بنەماڵەی میرەکانی سۆران و عەبدوڵڵا لە بنەماڵەی میرەکانی باجەلان، واتە لە 3 بنەماڵەی جیاواز بون.

والی بە ئەخۆشی گەڕایەوە بۆ زانەشت و عەباسان. بە ڕێگای زەنگاباد و قەرەتەپە و نارین دا گەیشتە دەلی عەباس. والی، پاش نزیکەی 30 ساڵ حوکمڕانی 4 ساڵی لە بەصرا و، 24 ساڵی لە بەغداد، لە دەلی عەباس مرد وجەنازەکەیان بردەوە بۆ بەغداد (1160ک /1747ز).(18)

## -9-

دوای مردنی ئەحمەد پاشا بابی عالی ئەیویست دەسەڵاتی ناوەندی لە بەغداد دامەزرێنێتەوە. دو والیان یەک لە دوای یەک دانا توشی شەڕ و بەربەرەکانی بون لە گەڵ یەنیچەری. کوێخاکانی ئەحمەد پاشا، لە ناو ئەوانەدا سلێمان پاشا، خۆی بە شایستەی وەزارەت دادەنا. خەریکی پیلانگێران بون دژی والییەکانی لە ئەستەمۆڵەوە دائەنران. سلێمان پاشا کۆیلەیەکی ئازادکراوی ئەحمەد پاشا بو. هەروەها مێردی عادلە خانمی کچی بو. لەو کاتەدا ولایەتی بەصرای پێ سپێردرا بو. کێشەی ململانێی دەسەڵات دو ساڵ زیاتری خایاند تا سەرەنجام بە قازانجی سلێمان پاشا بە لادا کەوت. بابی عالی فەرمانی وەزارەتی بەغدادی بۆ دەرکرد.

ئەگەرچی ئەحمەد پاشا، پێش ئەوەی بمرێ، سەلیم پاشای لە میرایەتی بابان خست بو. سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشای لە جێگا دانا بو، بەڵام سەلیم کەڵکی لە بۆشایی دەسەڵاتی بەغداد وەرگرتبو. هەر لە کوردستان مابوەوە لە ململانێ دا بو لە گەڵ سلێمان. وەزیری تازەی بەغداد سەر لە نوێ سەلیمی دانایەوە بە میری بابان (1163ک/ 1749ز). سلێمان پاشا بە خۆشی ملی نەدا بەرەنگاریی کرد. بەڵام شکاو کشایەوە بۆ ئێران. بە یارمەتی والیی ئەردەلان جارێکی تر هێرشی هێنایەوە سەر سەلیم. دیسان سەرکەوتو نەبو.(19)

## -10-

نوسەری "دوحە" نوسیویێتی: "هەڵسوکەوتی سەلیم پاشا لە زەمانی نادر شاوە جێگەی گومان بو. لە ئێرانییەکان نزیک ئەکەوتەوە و، لە گەڵیان ڕێک ئەکەوت. لە وەزیر یاخی ئەبو و هەڵئەگەڕایەوە و، گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی نەئەکرد. لەو ماوەیەی دواییش دا لە گەڵ حاکمی کۆیە عوسمان پاشا پێک هات بو و، جیابونەوە و سەربەخۆیی ڕاگەیاندبو. هەردوکیان کەوت بونە گەڕان و سوڕان بە ناوچەی کوردەکان دا، بەرەبەرە دەستیان بە سەردا ئەگرت. ئیتر وەزیر نەیئەتوانی لێیان بێدەنگ بێ، لەشکری کردە سەریان و، خۆی سەرکردایەتی لەشکرەکەی کرد"(20)

والی لە مانگی شەعبانی 1164 ک (1750ز) دا لەشکری کێشایە سەر سەلیم پاشا. والی گەیشتە دەلی عەباس، نارین، قەرەتەپە، گۆکتەپە، چیمەن، ئەسکی کفری، توزخورماتو. کوردەکان بەرگەیان نەگرت و شکان.

سەلیم پاشا بە تێشکاوی هەڵات بۆ ئێران. پاشای دربە و باجەلانیش ڕایکرد بۆ ئێران. عوسمان پاشا و قۆچ پاشا لە بەرپەرچدانەوەی هێرشی لە شکری ئێران دا، شەڕی زۆریان لە گەڵ ئێران کرد بو. نەیانوێرا پەنا بۆ ئێران بەن. عوسمان پاشا لە کۆیە نەیئەتوانی بەرەنگاریی بکا، هێزەکانی خۆی سازدا و کشایەوە شاخی ناوەگرد لەوێ دامەزرا. قۆچ پاشای برایشی لە قەڵای هەولێر دامەزرا.

وەزیر لە نزیک کەرکوک چاوەڕێی ئەکردن. هێزێکی ناردە سەر ناوەگرد. قەڵا و سەنگەرەکانی گەمارۆدان. ڕێگاکانی لێ گرتن و، ئاوی خواردنەوەی لێ بڕین ئینجا هێرشێکی قورسیان کردە سەر. قەڵا و سەنگەرەکانیان هەڵتەکاندن و گرتیان. "ئەگەر چی ئازایەتی و بەرهەنگارییەکی بێ وێنەیان نواند" بەڵام وەکو نوسەری "دوحە" ئەڵێ: سەرەنجام شکان و خەڵکێکی زۆریان لێ کوژرا و، پاش ماوەکەشیا ڕاونان. عوسمان پاشا و براکانی: ئیبراهیم بەگ و سلێمان بەگ و، کوڕەکەی: حەسەن بەگ بەدیل گیران. کەلوپەل و ئازوقە و تفاقەکانیان کەوتە دەس تورک.

وەزیر خۆیشی لە کەرکوکەوە بە ڕێگای گۆک تەپە، ئاڵتون کۆپری، بوستان (بێستانە)، دەربەند (ی گۆمەسپان) دا چوە سەر هەولێر. نامەیەکی بۆ مەلا و گەورە پیاوەکانی هەولێر نوسی قۆچ پاشای حاکمی هەولێری تەسلیم بکەن. بەقسەیان نەکرد. لە 16 ی شەوال دا تورک هێرشیان کردە سەری. لە هەمو لاوە گەمارۆیان دا. پاش 9 ڕۆژ قەڵای هەولێریان گرت. قۆچ پاشا و لایەنگرەکانی و عوسمان پاشا و ئیبراهیم و سلێمانی برای و حەسەن بەگی کوری لە ڕۆژی جەژنی قوربان دا بە فەرمانی وەزیر لە گەردنیان درا و کەللە سەرەکانیان ناردن بۆ ئەستەموڵ. سلێمان پاشای ئامۆزای سەلیم پاشا جێگیر بو.(21)

## -11-

ململانێی دەسەڵات لە سەر تاج و تەختی ئێران هێشتا بە لادا نەکەوت بو. کەریم خانی زەند، عەلیمرادخانی بەختیاری، محەمەد حەسەنخانی قاجار، ئازادخانی ئەفغانی... هەریەکەیان لە لایەک و بە جۆرێک خەریکی چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی بو و، هەوڵی شاهێتییان ئەدا. ئازادخان یەکێ بو لە سەرکردەکانی نادر شا. لە گەڵ میرەکانی بابان دا تێکەڵاو بو. یەکێ لە ژنەکانی کچی خالید پاشای بابان بو. هەر بەو بۆنەیەوە ماوەیەک ئازادخان کە شکا و، خۆی لە کەریخانی زەند شاردەوە، لە شارەزور خۆی حەشار دابو.(22)

سەلیم پاشا دوای تێشکانی لە بەردەم ئۆردوی بەغدادا ماوەیەک لە سنورەکانی ئێران دا مایەوە. حەسەنعەلی خانی والیی ئەردەڵان لەو کاتەدا بە لەشکرکێشییەوە خەریک بو. ماوەیەک خەریکی شەڕ بو لە گەڵ ئیمامقولی خانی زەنگنە کە کرماشانی گرت بو. دوای شکاندنی ئیمامقولی چو بۆ یارمەتیدانی میهر عەلی خانی تکەلوی حاکمی هەمەدان کە لە لایەن کەریم خانی زەندەوە گەمارۆ درا بو. کەریم خان و هێزەکەی دەسیان لە گەمارۆ هەڵگرت و گەڕانەوە ناوچەکەی خۆیان لە پەری و کەمازان لە مەلایەر. بەڵام حەسەنعەلی خان لە کۆڵیان نەبوەوە لەشکری کوردستانی بردە سەریان. کەریم خان ڕوبەڕویان نەبوەوە. خێزانەکانی ناردە پەنایەکی ئەمین و خۆی کەوتە شەڕی پارتیزانی لە گەڵیان. حەسەنعەلی 45 ڕۆژ مایەوە هیچی بەهیچ نەکرد، بەڵکو چەندین جار هێرشی ناکاوی ئەکرایە سەر و خەڵکی لێ ئەکوژرا و وڵاخ و کەلوپەلی لێ بە تاڵان ئەبرا. لەم ماوەیەدا حەسەنعەلی بیستی، کە سەلیم پاشای بابان بەهێزێکی گەورەوە بە هاوکاری هەندێ لە گەورە و ڕیش سپییەکانی ناوچەی ئەردەڵان، بە تایبەتی محەمەد عەلی سوڵتانی حاکمی بانە و هەورامان، کە ماوەیەک لەوەوبەر، حەسەنعەلی چاوی دەرهێنا بو، کەوتۆتە ڕێ بۆ گرتنی سنە. حەسەنعەلی خان وازی لە ڕاونانی کەریم خان هێنا و بە پەلە گەڕایەوە کوردستان. لە نزیک سنە لەشکرەکانی حەسەنعەلی خان و سەلیم پاشا دایان بە یەک دا. حەسەن عەلی شکا و بە تێشکاوی هەڵات. سەلیم پاشا چوە ناو سنەوە.(23)

وەکو سەرچاوەکانی ئەردەڵان ئەگێڕنەوە حەسەنعەلی پەنای بۆ ئازادخانی ئەفغانی بردوە. بەڵام ئازادخان بەرامبەر چەردەیەک پارەی زۆر کە لە سەلیم پاشای وەرگرتوە، حەسەنعەلی خانی بەگیراوی تەسلیم پاشای بابان کردوە. ئەویش دوای 6 مانگ گیراوی کوشتویەتی (1164ک / 1750ز). بنەماڵەی والیی ئەردەڵان لە سەرەتاوە لە گەڵ کەریمخان ناکۆک بون. محەمەد حەسەن خانی قاجار، یەکێ بو لەوانەی دوای

تاج و تەختی ئێرانی ئەکرد و، گەورەترین مینملّی کەریمخان بو. خەسرەو خانی ئەردەلآن، بەیارمەتی محەمەد خانی قاجار، سەلیم پاشا. پاش ئەوەی چەند ساڵێ حوکمرانی کرد. لە ئەردەلآن دەرکرد (1170ک/ 1756ز).(24)

## -12-

سەلیم پاشا لە ناوچەی بابان هەڵکەنرا بو. سلێمان پاشای بابان لە قەلآچوالان دا جێگیر بوبو. لە ئەردەلآنیش دا هەڵکەنرابو. خەسرەوخان حوکمی گرتبوە دەست. سەلیم جێیەکی بەدەستەوە نەمابو. والی ی بەغداد، سلێمان پاشا، بە قسەی خۆش سەلیمی هەڵفریواند بچێ بۆ بەغداد. بۆ زیاتر دڵنیاکردنی عادلە خانمیش دەسەسرێکی ئاوریشمی بە دیاری بۆ نارد. عادلە خانمی کچی ئەحمەد پاشا، کە هاوسەری والی بو، رقی لە سەلیم بو. رەنگە هەر هی ئەوە بوبێ کە باوکی لە لەشکرکێشی دا بۆ سەر سەلیم نەخۆش کەوت و لە رێگا مرد. عادلە خانم دەستی بەسەر مێردەکەی دا ئەرۆیشت. والی هان دا بۆ کوشتنی. والی سەلیم پاشای کوشت (1171ک/ 1757ز).(25)

سەلیم پاشا کە ماوەیەکی درێژ هەوڵی دا هاوسەنگیی لە نێوان رۆم و عەجەم دا رابگرێ و، کەڵک لە ناکۆکی هەردولا وەربگرێ بۆ چەسپاندنی دەسەلآتێکی سەربەخۆ. سەرەنجام چارەنوسی ئەمیش، وەکو هی باوکی، لە زیندانێکی بەغداد بە هەڵواسین تەواو بو.

## پەراوێزەکان

1. مهدوی: 152.
2. مهدوی: 153.
3. مهدوی: 155.
4. مهدوی: 152 - 155. پورگشتال: 3177/4 و3187. امین زکی: "کورد..." 203.
5. پورگشتال: 3187/4.
6. العزاوی: 235/5. امین زکی: "کورد" 204.
7. پورگشتال: 1391. امین زکی: "کورد" 205.
8. مهدوی: 162 - 164. پورگشتال: 3218/4.
9. مهدوی: 169.
10. العزاوی: 5/ 235.
11. مهدی خان: 384.
12. امین زکی: "تاریخ السلیمانیه.." 73.
13. الموصلی: 10.
14. چەند سەرچاوەیەکی نوێ باسی ئەم دو نامەیە ئەکەن لەوانە: ئەمین زەکی بەگ ئیشارەت بۆ "دەفتەرەکەی حسێن نازم" ئەکا. هەروەها شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبەکەی دا: "الشیخ معروف النودهی البرزنجی" و، مەلا کەریمی مودەریس لە "علماؤنا فی خدمه العلم والدین". بەڵام لە سەرچاوە کۆنەکان دا باسی بەرچاو ناکەوێ. ئەمەش هەردو نامەکەیە کە لە "خاڵ" وەرگیراوە:

نامەکەی نادر شا:

بسم الله الرحمن الرحیم

مني الی الحبر النبیل، والشریف الفطریف الاصیل، ذي المآثر والمناقب والمنن، السید حسن، نسمات التسلیمات، ونفحات التحیات،

وبعد: فان اجل مطالبي واول مأربي ترویج منهب جدکم جعفر الصادق رضي الله عنه الامام الهمام، منبع العلوم والحقائق، وان حبي لاجدادکم الاماجد لمعلوم، وان مجیئکم الینا لزم اشد اللزوم. فبوصول امري الیکم ائتنا لنتبرک بکم وبمن لدیکم. والا فستنزل نار غضبي علیکم والسلام.

وەڵامەکەی شێخ حسەن:

"الحمد الله رب العالمین، والعاقبه للمتقین. ولا عدوان الا علی الظالمین، والصلاة والسلام علی سیدنا محمد وعلی اله واصحابه اجمعین.

وبعد فقد اخذت کتابکم، اما دعوی حب اجدادي، فلا اعلم اهذا الحب مشوب ببغض الاصحاب ام لا؟ فان کان مشوبا ببغضهم فلا ینفعک یوم الحساب، بل یکون سببا للحساب والعذاب!

واما قولکم: ان قصدی ترویج منهب جعفر الصادق رضي الله عنه فهو، وان کان من اجل التابعین، واکمل المجتهدین، لکن لانقراض اصحابه ماصار منهبه مدونا، ولو علمنا تدوینه لاتبعناه لکوننا من نریته، واما انا مکاسف الحال علیل البال، لاأقدر علی المجئ، لکن اوصیک بوصایا ان عملت بها فنجوت، منها: ان لا تحارب مع السلاطین العثمانیه، اذ قد اطلع اهل الکشف علی بقائهم الی اقرب قیام الساعه ممتازین بخصائص لا توجد فی غیرهم. ومنها ان ما اضمرت من تخریب الموصل والحرب مع اهلها، فلا تفعله، لان ذلک سببا لهلاک جندک.

ومنها ان تجعل فی التوبة والاستغفار قبل ان یفاجئک الحمام والبوار، فان بعض من اقاربک اراد قتلک، والسلام علی من اتبع الهدی.". الخال: "الشیخ معروف.." 75-76.

15. امین زکی: "کورد.." 207.

بەشێ لە لەشکرەکەی نادر شا کورد بون، بەتایبەتی لە کوردەکانی خوراسان بون. هەندێ لە سەرکردەکانی لەشکرەکەشی کورد بوە.

شەڕی نادر لە گەڵ عوسمان تۆپاڵ کراوە بە داستانێکی هۆنراوەیی بە زاراوی هەورامی لە ژێر ناوی "نادر و تۆپاڵ" دا. ئەم داستانە لایەنگری عوسمانی و دژی نادرە. بەڵام لە هەمان کات دا "میرزا ئەلماس خانی کەنولەیی" کە سەرهەنگ بوە لە هێزەکەی نادر شادا شەڕەکانی نادری بە ستایشەوە بە هەڵبەست لە "نادرنامە" دا بەزاراوی گۆران هۆنیوەتەوە.

16. الکرکوکلی: 54.
17. الکرکوکلی: 55 - 57.
18. الکرکوکلی: 93 - 094 العزاوی: 5 /279 - 281. امین زکی: "تاریخی سلیمانی.." 73 - 74.

عبدالله الشاوی هەواڵنامەی ئەم سەرکەوتنەی بۆ خەڵکی بەغداد نوسی. عبدالرحمن السویدی بەم بۆنەوەیە قەصیدەیەکی داناوە لە "حدیقە الزوراء" دا نوسراوە.

19. العزاوی: 6 /19 و 22.
20. الکرکوکلی: 117.
21. الکرکوکلی: 116 - 118. العزاوی: 6 /24 - 27. امین زکی: "تاریخی سلێمانی.." 74 - 75.

بەم بۆنەیەوە عبدالرحمن السویدی و عبدالله السویدی سەرو قەصیدەیان داناوە، لە "حدیقە الزوراء" دا نوسراون.

22. ورهرام: 50.
23. گلستانە: 165 - 167.
24. مستورە: 10.
25. لۆنگریک: 203 و 215.

# 5. پێنج براو 37 ساڵ براکوژی!

**-1-**

پەیمانی ئاشتی رۆم و عەجەم لە هەردولاوە پەسەند کرا (1159ک/ 1746ز). بەڵام نادر شا پێی رانەگەیشت کەڵکی لێ وەربگرێ کوژرا (1160ک/ 1747ز). ئەحمەد پاشای وەزیر ئەمەی بە هەل زانی سەلیم پاشا لێ بخات و، مولکی بابان بهێنێتەوە ژێر رکێفی دەسەڵاتی بەغداد. لەشکرێکی گەورەی کۆکردەوە. میرەکانی بابان و کۆیە و باجەلان و هێزەکانیان بەشداری ئەم لەشکرکێشییە بون. وەزیر ئەیویست سلێمان پاشای کوری خالید پاشا لە جێگای سەلیم دابنێ. لە ساڵانی شەری رۆم و عەجەم دا خالید پاشا بە دڵسۆزی مابوەوە بۆ عوسمانی. بەڵام سەلیم لە گەڵ ئێرانییەکان دەستی تێکەڵاو کردبو. خالید پاشا لە ئورفا مردبو. چەند کورێکی لە دوا بە جێ مابون لە وانە: سلێمان، ئەحمەد، محەمەد، مەحمود، عومەر.

لەشکرکێشییەکە بە هۆی ئەخۆش کەوتنی زۆری سپا و سەرکردەکەیانەوە بە تەواوی بە ئامانج نەگەیشت. ئەگەرچی ئەحمەد پاشا سلێمانی بە پلەی پاشا بە میری بابان دانا (1160ک/ 1747ز) بەڵام سەلیمی بۆ نەگیرا. سەلیم لە ناوچەکەدا مایەوە.(1)

مردنی ئەحمەد پاشا و پەشێوانی هەلومەرجی بەغداد تا وەزارەت بە سلێمان پاشای (ئەبو لەیلە) گەیشت وای کرد بو سلێمان بە تەواوی جێگیر نەبێ. سەلیم لە ناوچەکەدا مابوەوە. پێ ئەچێ دەسەڵاتیشی بوبێ. ئەبو لەیلە سەلیمی دانایەوە بە میری بابان و، سلێمان هەڵات بۆ ئەردەڵان (1164). سلێمان گیروگرفتی گەورەی بۆ سەلیم و بۆ وەزیر دروست کردبو. وەزیر سەلیمی لابردەوە و، لەشکرکێشییەکی گەورەی کردە سەری. سلێمانی دانایەوە.

سلێمان یەکێ لە میرە لێهاتوەکانی بابان بو. لە ماوەیەکی کورت دا خۆی جێگیرکرد. سنوری دەسەڵاتی گەیشتبوە کۆیە، هەریر، هەولێر، بەدرە، جەسسان، مەندەلی، زەنگاباد، قەرەحەسەن، ئاڵتون کۆپری، هەروەها سنە.

## -2-

سلێمان پاشای بابان بایەخێکی زۆری دابو بەمزگەوت و مەدرەسە و کتێبخانە. لە سەر دەمی ئەم دا مەدرەسەکانی قەڵاچوالان پڕبون لە مەلای گەورە و قوتابی و فەقێ. لەو وەقفنامەیـەدا کـە سـاڵی 1174ک (1760ز) نوسیویێتی ئەڵێ "وبعد فقد وقفت جميـع عقـاراتي مـن البسـاتين والرحـى والخانـات والاراضـى والقنوات والدكاكين والتيمارات التـى تملكـت بالشـراء والاحيـاء والاحـداث فـى شـهرزور وتوابعـه و فـى كويسنجق ولواحقه وفى اربيل ومضافاته وفى كركوك ومـا يليـه وفـى مريـوان وقـراه. علـى مـدارس قلعـه چوالان ومدرسيه وطلابه وجوامعه والجسر فيه وفى شهرزور. وعلى الايتام المتعلمـين بقلعـه چـوالان وعلـى المعتكفين فى شهر اخر رمضان والايام المعدودات وعلى دار الضيافه والوعاظ والمترجمين والمصـنفين فيهـا؛ وعلى مدرسه گولعنبر ومدرسيه وطلابه وجامعه وعلى مدارس وطلاب ومدرسـى قصـبه كـوى؛ وعلـى مدرسـه اربيل ومدرسيه؛ وعلى المدرستين اللتين بنيناهما بكركوك؛ وعلى الطـلاب والمدرسـين بالتفصـيل كتـب فـى الحجج على حده"

وەکو شێخ محەمەدی خاڵ نوسیویێتی ژمارەیەکی زۆر لە زانا دینیە ناسراوەکانی ئـەو سـەردەمە، ئـەم "وەقفنامە" یەیان مۆرکردوە. (2)

ئەم وەقفنامەیە جگە لەوەی سنوری دەسەڵات و نفوزی سـلێمان پیشـان ئـەدا نیشـانەی بایـەخ دانێکـی گەورەیە بە خوێندن خوێندەواری.

وەکو تۆمارەکەی ریچ باس ئەکا: سلێمان پاشا لە زەنگابادیش دا مزگەوت و حـەمام و خـانی دروسـت کردوە. کاتی خۆی دروست کردنی حەمامیش بە "کاری خێر" دانراوە.

## -3-

سلێمان پاشا بایەخێکی زۆری بـە پیشـە و پیشەسـازی داوە. مێژونوسـەکانی تـورک ئـەڵـێن: کـە لـە قەڵاچوالان کشاوەتەوە لە گەڵ خۆی پیشەکارەکانی بردوە بۆ ناوچەی سنە. کە ماوەیەک مەڵبەندی حـوکمڕانی ئەم بوە. مێژونوسەکانی ئەردەلانیش ئەڵێن: کە سنەی بـەجێ هێشـتوە هەنـدێ لـە پیشـەکار و بازرگانـەکانی ئەوێی لە گەڵ خۆی بردوە بۆ شارەزور.

یەکێ لەو پیشەسازییانەی سلێمان پاشا خەریکی دامەزراندنی بوە، دروستکردنی باروت بوە. بێگومان باروت کەرەستەیەکی گرنگی شەڕ بوە. پێ ئەچێ لەو سەردەمەدا لە ناو مەلاکان دا مشتومڕ هەبوبێ سـەبارەت بە "پاکیی" و"گڵاویی" ماددەکانی دروستکردنی باروت. بۆ بەلاداخستنی ئەم کێشەیە سلێمان پاشا مەسـەلەکەی بەرەو ڕوی یەکێ لە زاناکانی ئەو سەردەمە کردۆتەوە. سەید عەبدوللەتیفی بەرزنجی، زانای دینیـی وشـاعیر و نوسەر، بەمجۆرە کێشەکەی یەکالا کردۆتەوە:

"كثر التردد والتشاجر في حجر البارود اهو طاهر او نجس؟

وغالب ما يشاهد فيه انه يتكون فى المزابل ونحو مرج الاغنام بعد كنسها. فاشار لنا الـوالي اي سـليمان پاشا الكردى. بتحقيق الجواب ولم نراه فى كتاب فبادرت للامتثال والله اعلم بحقيقه الحال..."

بەمجۆرە کۆتایی بە فتواکەی دێنێ:

"ولنا وجه ان الاستحالة تطهر الاعيان النجسة فعلى هذا يكون طاهر العين وان تحقـق تولـده مـن عـين النجاسة نظير النوشادر... على اننا قلنا بالوجه القائل بطهارة الـدخان مـن النجاسـة او بـأن الاسـتحالة تطهـر الاعيان النجسة" (3)

## -4-

سلێمان پاشای وەزیر مرد (1175ک/ 1761ز). کوێخاکانی هەریەکەیان خۆی بە شایستەی وەزارەت ئەزانی و، هەمویان داوایان کرد کە دەوڵەت یەکێکیان دابنێ. لە ناو ئەوانەدا عەلی پاشا دانرا بە وەزیر. عەلی پاشا گێچەڵی بە سلێمان پاشای بابان ئەکرد.

سلێمان پاشای ئەبو لەیلە کاتی خۆی سلێمان پاشای بابانی لە هەندێ باج بەخشی بو. بۆ ئەوەی ئەو دەرامەتە تەرخان بکا بۆ سازدانی لەشکر و ژیاندن و چەکدار کردنیان. عەلی پاشای تازە وەزیر، سلێمان پاشای هەڵپێچا بۆ بژاردنی باجی کەڵەکە بوی دوانزە ساڵی رابردو. چەندی هەوڵی دا لە وەزیری تازەی بگەیەنێ کە وەزیری کۆچکردو، کاتی خۆی، لەم باجە بەخشیویتی، کەڵکی نەبو.(4)

عەلی پاشا لەشکرێکی گەورەی بۆ سەر سلێمان سازدا. سلێمان کە بەمەی زانی ئەویش لە قەڵاچوالانەوە بە رێ کەوت و، هێزەکانی خۆی کۆ کردەوە. پێنج شەش هەزار سوارە و، حەوت تا هەشت هەزار پیادەی کۆ کردەوە. تۆپ و کەرەستەی تەواوی جەنگیی ئامادە کرد، لە جەبەل حەمرین دامەزرا و لە دامێنی هەردەکانی "صقال توتان" سەنگەری لێ دا. رێگای هاتوچۆی بڕی.

لەشکری وەزیر گەیشتە دەلی عەباس، لەشکری بابان خۆی پێ نەگیرا بە چەمی ناریندا بەرەو دواوە کشایەوە. وەزیر کەوتە دویان. هێزی بابان چوە کفری لە نێوان کفری و دوانزە ئیمامدا لە شوێنێک دا بە ناوی "کۆشکی زەنگی" هەردو لەشکر لێکیاندا. لەشکری بابان شکا. زۆری گیرا و کوژرا. سلێمان بە زەحمەت خۆی دەرباز کرد. بارگە و بنە و خێوەت و تۆپەکانی کەوتە دەست لەشکری مەمالیکی رۆم.

لەم لەشکرکێشی‌یەدا ئەحمەد بەگی برای سلێمان پاشا هاورێی سەفەری وەزیر و میوانداری هێزەکەی بو. وەزیر "خەلعەت" ی میرایەتی کردە بەر ئەحمەد و بە پلەی پاشا لە جێگای سلێمانی برای دابنا (1176ک/ 1762ز).(5)

## -5-

وەکو نوسەری "تاریخ زندیە" لە رووداوەکانی ساڵی 1173 دا نوسیویتی ئەڵێ: "سلێمان پاشا، پاشای کوردستانی بابانیش بەندایەتی راگەیاند و، دڵسۆزیی و نۆکەرایەتی و فەرمانبەیی خۆی دەربڕی."(6)

سلێمان هەڵات بۆ ئێران. والی ئەردەڵان کاتی خۆی بە یارمەتی حەسەنعەلیخانی قاجار گەڕابوەوە سنە. حەسەنعەلیخان یەکێ بو لە دوژمنە سەرسەختەکانی کەریمخان.

وەزیری بەغدا لەشکری سازدابو بۆ شەڕی نێلی کەعب. هێزی بابانی بە سەرکردایەتی ئەحمەد پاشا لە گەڵ خۆی بردبو. محەمەد پاشای بە هێزێکی کەمەوە لە قەڵاچوالان دانا بو. سلێمان ئەمەی بە هەل زانی پەلاماری قەڵاچوالانی دا گرتیەوە. بەڵام وەزیر کە شەڕی کەعبی تەواو کرد رێگای بە ئەحمەد پاشا دا بگەڕێتەوە بۆ قەڵاچوالان. هێزێکی گەورەشی بۆ یارمەتیدانی لە گەڵ نارد. سلێمان خۆی پێ نەگیرا. زستانێکی سەخت بو. قەڵاچوالانی بە جێ هێشت بەڵام لە گەڵ خۆی هەمو وەستا و سنعەتکارەکانی برد بۆ سنە.(7)

## -6-

مێمڵەکانی عەلی پاشا خەریکی پیلانگێران بون بۆ لە ناوبردنی. عەلی پاشا کوژرا. عومەر پاشا، کە یەکێکی تر بو لە کوێخاکانی سلێمان پاشای ئەبولەیلە، لە جێگای ئەو بو بە وەزیر. عومەر پاشا حەزی لە چارەی ئەحمەد پاشا نەئەکرد. دۆستایەتی کۆنی لە گەڵ سلێمان پاشا هەبو ئەحمەد پاشای لێ خست. "خەلعەت" ی بۆ سلێمان نارد بۆ سنە.

ئەحمەد بەرەنگاریی نەکرد بەڵام دەستوپێوەندەکانی بردە ئامێدی خۆی چوە موسڵ لە وێ دانیشت. عومەر پاشا ئەحمەدی بردە بەغداد لەوێ داینا.(8)

## -7-

هەندێ لەنوسەرانی ئەو سەردەمە بە ستایشێکی زۆرەوە باسی سلێمان پاشایان کردوە.

نوسەری "دوحە" نوسیویێتی: "... لەو پیاوە صالحانە بو کە تەقوای یەزدانیان کردبو بە شیعاری خۆیان و، لەو گوێڕایەڵانە بو کە ئەم ئایەتە کەریمەیان جێ بەجێ کردبو "واطیعوا الله والرسول واولی الامر منکم". حاکمی ناوچەکانی بابان و کۆیە و هەریر و هەولێر و کۆپری و قەرەحەسەن و زەنگاباد و جەسسان بو. ماوەی دوانزە ساڵ کاروبارەکانی بەجۆرێ بەڕێوە ئەبرد کە خوا و پێغەمبەر و دەوڵەتی بەرزی لێ ڕازی بون. لەو ماوەیەدا کەسێ نەبو شکاتی لێ بکا یا بەربەرەکانی بکا یا لێی یاخی بێ...

بەڵام لە ماوەی دوایی دا کەوتە کۆکردنەوە ی ڕەسم و باج لەو ناوچانەدا و، وا ڕەفتاری ئەکرد کە وەکو مڵکی خۆی بن. بەم جۆرە سامان و دارایی‌ەکی زۆری کۆکردەوە، ئەوسا کەوتە بیری هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەت و هەندێ کەسیشی لێ کۆبوەوە.."(9)

نوسەرێکی تریش نوسیویێتی: "خۆی موتەدەیین و، بەمەزەب شافیعی بو. خۆی لە کەموکوڕی لاندا و زاهید و خاوەن صەڵاح بو."(10)

ڕاستی‌یەکەی ئەوە بو، وەکو پێشتر باس کرا، گێچەڵی پارەیان پێ ئەکرد.

## -8-

سلێمان پاشا لە سنەوە تا کەرکوکی لە بەردەست دا بو. بەڵام تەنیا یەک ساڵ وەها مایەوە. لە کاتێک دا لە ماڵەکەی خۆی دا لە قەڵاچوالان لە ناوجێگادا نوست بو فەقێ ئیبراهیم بە خەنجەر کوشتی.

مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی، ئەم ڕوداوەی بە چەند دێڕێ لە پەراوێزی یەکێ لە کتێبەکانی دا بەم جۆرە تۆماری کردوە:

"مێژوی مردنی سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشا:

شەوی هەینی مانگی زیلحیجەی 1178 لە ماڵەکەی خۆی دا کوژرا. کابرایەکی خەڵکی شارۆچکەی کۆیە ناوی فەقێ ئیبراهیم بو بە شەو چوە ناو حەرەمەکەیەوە خەنجەرێکی لێ دا لە کاتێک دا لە سەر جێگاکەی نوست بو. بەو خەنجەرە پاش چەند ڕۆژێکی کەم مرد. خوای گەورە ڕەحمی پێ بکا"(11)

سلێمان پاشا لە قەڵاچوالان بە خاک سپێردرا و، لە سەر کێلی گۆڕەکەیان نوسی بو:

مفسدی نیمه شبی با خنجر

جوهر جسم گرامیش بسمید (12)

ئێستا شوێنەواری گۆڕ و کێلەکەی نەماوە.

لە سەر هۆی کوژرانی سلێمان پاشا قسەی جۆرا وجۆر هەیە:

نیبور، کەساڵانی (1765 - 1766) هاتۆتە عیراق، هەواڵی کوژرانی سلێمان پاشا و باسی قەڵاچوالان بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

"ژمارەیەکی زۆری ئەم بنەماڵەیە بۆ بە دەسهێنانی پلەی پاشایەتی لە ناو خۆیان دا ڕقەبەری لە گەڵ یەکتری ئەکەن. لەبەر ئەوە پاشای بەغداد هەمیشە پاشایەک لەم بنەماڵەیە دائەنێ. بەڵام ئەوەیان دائەنێ کە لەوانی تر پارەی زۆر تر بدا.

پیاو نەتوانێ پەی بەوە بیات کە ئەم رەعیەتە بەسەزمانانە چۆن بە دەس چەوسانەوەی هەردولایەنـەوە گیریان خواردوە: لە لایەک حوکمی زۆرداری تورکە زاڵمەکان و، لە لایـەکی تـرەوە حـوکمی تۆقێنـەر کـە ئـەم بنەماڵەیە سەپاندویانە بە سەر کوردەکانی قەڵاچوالان و ناوچەکەدا. بۆیە لەم ناوچەیەدا شار و شارۆچکەی تێ دا نیە. قەڵاچوالانیش گوندێکی بچوکی هەژارە.

ئەگەر بمانەوێ نمونە لە سەر رەوشتی گەلێک بهێنینەوە، کە سیفەتێکی لە یەکچوی دیاریان هەبێ، ئـەوە بە سەر کوردا جێبەجێ ئەبێ: گەلێکن حەز لە تۆڵە ئەکەن و خۆیان لە پێناوی سەندنەوەی تۆڵـەدا بـە کوشـت ئەدەن. پێش ئەوەی بگەمە موسڵ بە ماوەیەکی کەم، مەلایەک شەو لە قەڵاچوالان هەڵی کوتاوەتە سەر پاشـا لـە ناوجێگاکەی دا کوشتویەتی، چونکە براکەی ئیعدام کردوە."(13)

نوسەری "سیر الاکراد" ئەڵێ: "لـە نێـوان بنەماڵـەی فـەقێ بـرایم و مـاڵێکی تـردا لـە سـەر ئاشـێ یـا کێڵگەیەک ناکۆکی هەبوە. سلێمان پاشا داوەری کردون. ئاشەکەی داوە بە ناحەزەکانی ماڵی فەقێ برایم. فەقێ برایم بەم داوەرییە رازی نەبوە. لە تۆڵەی ئەوەدا کوشتویەتی."(14)

- نوسەرانی مێژوی ئەردەڵان رقیان لە سلێمان پاشا بوە. هۆی کوشتنی ئەگێڕنـەوە بـۆ هەنـدێ هـۆی تر.(15)

## -9-

کە هەواڵی کوژرانی سلێمان پاشا بە عومەر پاشای وەزیری بەغداد گەیشت، لەو کاتە دا ئەحمەد پاشا لە بەغداد بو، محەمەدی برایان کە لە سلێمان بچوکتر و لە ئەحمەد گەورەتر بو لە کوردستان بـو. نـەوەکو یـاخی بێ و کێشە ساز بکا "خەلعەت" ی پاشایەتی بابانی بۆ محەمەد پاشا نارد.

عومەر پاشا هێرشی بە دەستەوە بو بۆ سەر ئێلەکانی عەرەب. داوای لە محەمەد پاشا کرد بەشدار بـێ. 2 هەزار کەسی لە گەڵ خۆی هێنا. ئەرکی خۆی بە باشی بە جـێ هێنـا. لـەم سـەفەرەدا عومـەر پاشـا هەنـدێ تەکلیفی قورسی لە محەمەد کرد بو، دڵی رەنجاند بو، لە دڵی خۆی دا بڕیاری دابو کە گەڕایـەوە وڵاتـی خـۆی جارێکی تر نەیەتەوە بۆ لای ئەم وەزیرە.

ئەحمەد پاشای برای لە بەغداد فەرامۆش کرابـو. بـەزەیـی پـێ دا هاتـەوە. نـاردی بـە دوی دا ئاشـتی کردەوە و، ناوچەکانی کۆیە و قەرەداخی پێ سپارد. عومەر پاشا ویستی هەڵی بگێڕێتەوە لە براکەی. پایەیەکی بەرزتری پێ ببەخشێ. ئەم قوبوڵی نەکرد.

چەند ساڵێ هەردو برا رێک بون. بەڵام دوایـی تێکچـون. ئەحمـەد بـە خـۆی و دەسـوپێوەندەکانیەوە گواستیەوە بۆ زەنگاباد. وەزیری بەغداد بۆ ئەوەی ناکۆکییەکەیان گەرمتر بکا بەدرە و جەسسـان و مەنـدەلی پێ بەخشی.

لەم ماوەیەدا تاعون بڵاو بوبوەوە. شیرازەی کاروباری وڵات تێک چوبو. محەمەد پاشا بۆ رێکخسـتنی هەندێ کار چو بو بۆ لای کۆیە. ئەحمەد پاشا بە هەلی زانی کە ژمارەیەکی کەم هێزی لە گـەڵـە بـە نیـازی لـە ناوبردنی ئەمیش چو بۆ ناوچەی کۆیە. لە سەر ئاوی زێ لای ئاڵتون کۆپری هەر یەکەیان لـە بـەرێکی زێ دا بون. خەریک بو ببێ بە شەڕێکی قورس. ناوبژیکەر بە "قورئان" هوە کەوتنە بەینیانـەوە رێکیـان خسـتنەوە. ئەمجارەش کۆیە و قەرەداغ درایەوە بە ئەحمەد پاشا و محەمەد پاشا گەڕایەوە بۆ قەڵاچوالان.(16)

دوای ساڵێ دیسان تێکچونەوە. ئەحمەد پاشای بانگ کرد بـۆ قزڵجـە و گرتـی. هێزێکـی نـاردە سـەر مەحمودی برای لە قەرەداغ ئەویش بگرێ. بەڵام مەحمود زو پێی زانی هەڵات بۆ بەغـداد. وەزیـر بـە گـەرمی پێشوازی لێ کرد و ناوچەی قزرابات (سەعدییە) ی بۆ تەرخان کرد.

## -10-

محەمەد پاشا بە هۆی بڵاوبونەوەی تاعونەوە نەیتوانی داواکانی وەزیر جێبەجێ بکا. لە هەمان کـات دا دۆستایەتی لە گەڵ کەریمخانی زەند دامەزراند بو. وەزیر لەشکرێکی سازدا لە 50 بەیرەق لەوەند و سـپایی و لەوەندەکانی کەرکوک و هەندێ لە (دوجاقلو) هکانی خـۆی بـە سـەرکردایەتی حـاجی سـلێمان ئاغـا بـۆ سـەر محەمەد پاشا. وەزیر محەمەد پاشای لێ خست بو. مەحمودی برای لە جێگا دانا بو. هێشتا هێزەکە بە ڕێگـاوە بو مەحمود پاشا گەیشتە لایان. "خەلعەت" ی میرایەتی‌یان لە بەر کرد.

محەمەد پاشا بەرەنگاریی پێ نەنەکرا بە بێ شەڕ کشایەوە بۆ ئێران. هێزی ڕۆم و مـەحمود پاشـا بـە بێ بەرهەڵستی چونە قەڵاچوالانەوە. ئەحمەد پاشایان لە زیندان دەر هێنا. مەحمود پاشـا بـە ئـارەزوی خـۆی دەستی لە میرایەتی هەڵگرت بۆ ئەحمەد پاشای کاکی. ئەحمەد پاشا بو بە میری بابان.

ڕەنگە ئەمە یەکەمین جار و دوایین جار بوبێ میرێکی بابان بە ئارەزوی خـۆی دەسـتی لـە پاشـایەتی هەڵگرتبێ بۆ براکەی.

## -11-

عومەر پاشا والیی بەغداد بە هۆی ڕەفتاری خراپەوە لە گەڵ ئێرانی‌یـەکان نێـوانی لـە گـەڵ کـەریمخان تێکچو.

نوسەری ڕەسمیی "تاریخ گیتی گشا" هۆکانی تێکچونی نێوان هەردو دەوڵـەت و، لەشکرکێشـیی ئێـران بۆ سەر بەصرا بەمجۆرە ڕون ئەکاتەوە: تاعون لە عێـراق بـڵاو بـوەوە. هەنـدێ لـەو ئێرانی‌یانـەی لـە نزیـک پیرۆزگەکانی شیعە نیشتەجێ بون یا بۆ زیارەت و کار و بازرگانی لەوێ بون، بەم نەخۆشی‌یە مـردن. عومـەر پاشا کەلەپوری مردوەکانی زەوت کرد بو نەیئەدایـەوە بـە میراتگرەکـان. کەسـوکاری مردوەکـان پـەنایان بـۆ کەریمخان برد. کـەریمخان نوێنـەرێکی خـۆی نـاردە بەغـداد بـۆ لای عومـەر پاشـا. داوای دانـەوەی میراتـی مردوەکانی لێ کرد. عومەر پاشا داواکەی کەریمخانی پشت گوێ خست.

عومەر پاشا کۆسپی ئەهێنایە ڕێگای حاجییانی ئێرانەوە. بە پێچەوانەی ڕێوشوێنی والی‌یـەکانی پـێش خۆی هەندێ باج و سەرانەی تازەی داهێنا بو لەو حاجی‌یانەی ئەسەند کە لە ئێرانەوە بە ناو عێراق دا ئەچون بۆ حەج. بۆ ئەمەش، کەریمخان، داوای لە عومەر پاشا کرد کە دەس لەم کارە هەڵبگـرێ. عومـەر پاشـا گـوێی نەدایە.

لە کاتی لەشکرکێشیی زەکی خان دا بۆ سەر عەرەبەکانی عومـان، کـە ئێرانی‌یـەکان بـە خـەواریجیان دائەنان، داوایان لێ کرد ڕێگا بە لەشکری ئێران بدا لە بەصراوە تێ بپەڕن. عومـەر پاشـا ڕێگـای نـەدان. بـە پێچەوانەوە کارناسانی بۆ "خەواریج" کرد خواردەمەنی لە بەصراوە ببەن.

عومەر پاشا، محەمەد پاشای بابانی لابرد و، ئەحمەد پاشای لە جێگە دانا.

محەمەد پاشا پەنای بۆ کەریمخان برد. کەریمخان وا تێ گەیەنرا بو محەمەد پاشا بۆیە لابراوە چونکـە سەر بە دەسەڵاتی زەندە. کەریمخان تکای لە عومەر پاشا کرد بیکاتەوە بە میری بابان. عومـەر پاشـا گـوێی نەدایە داواکەی کەریمخان.

کەریم خان چەند جارێ داوای لە عومەر پاشا کرد ڕەفتاری دۆستانە لە گەڵ ئێران بنوێنێ کەڵکی نەبو. هەروەها داوای گۆڕینی کرد گوێیان نەدایە. بۆ تەمێ کردنی عومەر پاشا کەوتە سازدانی هێزێکی گـەورە بـۆ پەلاماردانی عێراق لە لای سەروی و ناوەڕاست و خوارویەوە. بۆ گرتنی "دومولبیلادی بەصـرا و دارولسـەلامی بەغداد و ویلایەتەکانی تری تابیعی."(18)

## -12-

کەریمخان هێزێکی 10 هەزار کەسی بە سەرکردایەتی عەلیمورادخان ئامادە کرد لە گەڵ محەمەد پاشا پەلاماری ناوچەی بابان بدا و. محەمەد پاشا لە جێگەی خۆی دابنێتەوە. لەشکری زەند لە پێش دا هێزی رۆمیان شکاند. بەڵام سلێمان ئاغا و ئەحمەد پاشا خۆیان رێکخستەوە لە چیای سەرسیر بۆ دوژمن دامەزران. هێزی ئێرانیان شکاند چوار تا پێنج سەد کەسیان لێ کوشتن و عەلیمورادخان بە دیل گیرا (1188). سەرچاوە ئێرانییەکان ئەڵێن عەلیموراد بە سەرخۆشی و تاکە سوارە خۆی کردوە بە ئۆردوگای دوژمن دا. عەلیمورادیان نارد بۆ بەغداد. پاش ماوەیەک عومەر پاشا بە رێزەوە ئازاد و رەوانەی لای کەریمخانی کردەوە.(19)

عومەر پاشا بۆ ئەوەی دوژمنایەتی لە گەڵ ئێران بخەوێنێ. ئەحمەد پاشای لە میرایەتی خست و محەمەد پاشای دانایەوە بە میری بابان و هەولێر و ئالتون کۆپری. مەحمود پاشای برای و تەیمور پاشای کۆیە بەخۆیان و پیاوەکانیانەوە چون بۆ کەرکوک لەوێ دانیشتن. ئەمە ئێرانییەکانی شێتگیرتر کرد.(20)

کەریمخان ئەم جارە لەشکرێکی بە سەرکردایەتی نەزەرعەلیخان لە کرماشانەوە بۆ سەر درنە و لەوێوە بۆ دەشتی کەرکوک و. لەشکرێکی تری بە سەرکردایەتی شەفیع خان لە سنەوە بۆ سەر شارەزور و سلێمانی نارد.(21)

هەروەها لەشکرێکی گەورەی بەسەرکردایەتی صادق خانی برای بۆ سەر بەصرا بەرێ خست (1189). صادق خان پاش گەمارۆدانێکی درێژ بەصرای گرت.

## -13-

لەم سەردەمەدا لەهجەی بابان وەکو زمانی نوسینی شیعر، لە لایەن دو لە زاناکانی کوردەوە، بە کارهێنراوە: مەلا محەمەدی ئیبنولحاج و مەلا محەمەدی سنوچی.

ئیبنولحاج ناوی محەمەدی کوری حاجی حەسەنی ئالانی بوە. زانایەکی پایەبەرز بوە لە زانستەکانی دین و رێزمانی عەرەبی دا. چەندین کتێب و شەرح و پەراوێزی نوسیوە کە تا ئێستاش لە ناو مەلاکان دا برەوی هەیە و، وەکو سەرچاوەیەکی باوەرپێکراو کەڵکی لێ وەرئەگرن. ئیبنولحاج بە شانازیەوە باسی کوردایەتی خۆی ئەکا. لە کۆتایی یەکێ لە مەنزومەکانی دا ئەڵێ:

ابیاته تضئ کعضب بارق
وهو بهذا العصر من خوارق
لاسیمامن عبد سؤ ابق
کردي طبع نشأة من شاهق
وربنا لما یشا فعال
و من له في فعله مقال
موهبة لحاضر وبادي
یلحق بالعربا من الاکراد

مزگەوت و مەدرەسەکەی لە گوندی هەزارمێردی خواروی سلێمانی بو. ئەوسا سلێمانی هێشتا بنیات نەنرابو. چەندین مەلای پایەبەرز لە لای ئەو خوێندویانە. لەوانە: مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی و شێخ مارفی نۆدێ.

ئیبنولحاج بەهۆی "شۆرشی عەجەم" ەوە لە ناوچەی بابانەوە کۆچی کردوە بۆ ناوچەی بادینان و، لە گوندی "زەنتە" ی نزیک گەلی زەنتە لە مەڵبەندی ئاکرێ کۆچی دوایی کردوە (1189).(22)

نیبنولحاج هەڵبەستێکی دینیی دریژی بەزمانی کوردی بەناوی "مەهدی نامـە" هوە دانـاوە. پێکهـاتوە لـە 157 چوارینە. قافیەکانی نیوە بەیتی یەکەم و دوەم و سێهەمی هەمو هەڵبەستەکە وەکو یەکە و قافیەکانی نیوە بەیتی چوارەمیشی وەکو یەکە. هەڵبەستەکە باسی هەندێ بیروباوەڕی دینیی ئیسلام ئەکا و. ئەیـەوێ بـەزمانی سادەی نزیک بەزمانی خەڵک، بۆیان ڕون بکاتەوە.(23)

زانایەکی تری ئەم سەردەمە "مەلامحەمەدی سـێوچی" ە، کەخـەڵکی هـەمان ناوچـەیـە. سـێوچی سـاڵی 1192 کۆچی دوایی کردوە.

سێوچی هەڵبەستێکی دینیی دریژی بەزمانی کوردی بەناوی "تـنکرە العـوام" هوە دانـاوە. پێکهـاتوە لـە 127 بەند. هەر بەندێکی 3 بەیتە. نیوەی یەکەم و سێهەم و پێنجەمی بەندەکان یەک قافیەیان هەیە و. نیـوەی دوەم و چوارەم و شەشەمیشیان یەک قافیە.

هەرچەندە سێوچی ناوی ناوە "تنکرة العوام" گوایە بەزمانێکی سادەی وەها هەڵی بەستوە کە عەوام بـە ئاسانیی تێی بگەن، بەڵام ڕاستییەکەی پارچەیەکی ئەدەبیی بەرز و پاراوە. پڕە لەزاراوی دینیی.(24)

"موناجات" هکەی شێخ صادق (کەئەبێ ساڵی 1156 هەڵی بەست بێ)، لە گەڵ "مەهدی نامە" کەی مـەلا محەمەدی نیبنولحاج (1189) و. "تنکرە العوام" هکەی مەلا محەمەدی سێوچی (1192) سـەرەتای هۆنینـەوەی شیعرن بە لەهجەی بابان، کە دواییتر لە لایەن نالی، سالم و کوردییەوە گەشەی پێ درا.

زانایەکی تری هەڵکەوتوی ئەم سـەردەمە مـەلا عەبـدوڵای بێتوشـیـیە (1135 - 1210 ک). گونـدی بێتوش لـە ناوچـەی ئالانـە، نزیـک بـوە لـە قـەڵاچـوالان. بێتوشـی لای نیبنولحـاج، ئینجـا لـە مـاوەران لای حەیدەرییەکان و، دواییتر لە بەغداد خوێندویەتی. مەلا عەبـدوڵا و مـەلا مـەحمودی بـرای هـەردوکیان ڕویـان کردۆتە بەصرا، ئینجا کوێت و، لە ئەحسا نیشتەجێ بون. بێتوشی 3 جار سـەردانی کوردسـتانی کردۆتـەوە. کەچی لە کوردستان نەماوەتەوە و لە ئەحسا گیرساوەتەوە. بەشی زۆری ژیانی لەوێ بەسەر بـردوە. لەبەصـرا مردوە. بێتوشی دەیان کتێبی بەنرخی لە زانستەکانی دین و ڕێزمانی عەرەبی دا داناوە. ڕەنگە ئەویش هەر بە هۆی ناارامی و نارەزاییەوە کوردستانی بـەجێ هێشـت بـێ. ئـەگینا بـۆ مەلایـەکی پایەبـەرزی کـورد ئـەبێ ئەحسای ئەوسا بۆچی لە کوردستان خۆشتر بوبێ.

بێتوشی لە یەکێ لە مەنزومەکانی دا ئەڵێ:

وان تجد شینا خلاف الادب

فالطبع کردی و هنا عربی

لە کاتی گەمارۆدانی بەصرادا لە لایەن هێزەکانی صادق خانی زەندەوە بێتوشی لە وێ بـوە. لـە مـاوەی گەمارۆکەدا یەکێ لە مەنزومە بە ناوبانگەکانی داناوە. هەروەها لە کاتی گیرانی دا لـەوێ بـوە. بـەم بۆنـەیـەوە نامەیەکی بە سۆزی بۆ سلێمان شاوی نوسیوە، هـانی ئـەدا بـە هـاواری خـەڵکی بەصـراوە بچـن و ڕزگـاری بکەن.(25)

## —14—

لە بەر ئەوەی عومەر پاشا بە مایەی تێکچونی پەیوەندی نێران و عوسـمانی ئـەزانرا، پـاش 13 سـاڵ وەزارەت، لە وەزیری خرا (1190). بەغداد دیسان پشێوی تـێ کەوتـەوە. عومـەر پاشـا کـوژرا. بـابی عـالی ئەیویست دەستی مەمالیک لە بەغداد ببڕێ بەڵام نەیتوانی. سەرەنجام عەبدوڵا کەهیە کرا بـەوەزیری بەغـداد و کەرکوک درا بە حەسەن پاشا، کەهیەیەکی تری سلێمان پاشا. داوای لێ کردن خەریکی ڕزگـار کردنـی بەصـرا بن. حەسەن پاشا کەوتە هەوڵدان بۆ سازدانی هێز بـۆ پـەلاماردانی نێـران. محەمـەد پاشـای مێـری بابـان و

ئەحمەد پاشای میری کۆیە و هەریری سازدا. ئەبوایە محەمەد لە قەڵاچوالانەوە بەرەو سنە و ئەحمەد لە زەهاوەوە بەرەو کرماشان بکشێن و، بۆ هەریەکەیان چەرنەیەک پارە و هەندێ سەربازی ڕۆمی بۆ ئامادەکردن.

ئەحمەد، لەحەسەن پاشا بێزار بو ماوەیەک لای دسکەرەی زەهاو هەڵی دا و چوە پاڵ لەشکری ئێران. بەڵام محەمەد پاشا هەڵی کوتایە سەر خاکی ئەردەڵان. خەسرەوخان 12 هەزار کەسی لە گەڵ بو. هێزی بابان و ئەردەڵان لە مەریوان لە یەکیان دا خەسرەوخان شکا. محەمەد دیلەکانی ئەردەڵانی بەرێزەوە ئازاد کرد.(26)

کەریمخان هێزێکی تری بەسەرکردایەتی کەلبعەلی خان رێکخست بۆ پەلاماردانی دوبارەی کوردستان. ئەحمەد پاشای بابان چوبوە پاڵ ئەم هێزە. میرەکانی بابان دڵسوزی و جێگەیان گۆڕی بوەوە. ئەمجارەیان محەمەد لە گەڵ عەجەم و ئەحمەد لە گەڵ ڕۆم بو.

محەمەد پاشا بەخۆی دا ڕانەپەرمو بەرەنگاری بکا کشایەوە کۆیە بۆ لای تەیمور پاشا. داوای یارمەتی‌یان لە والی کرد کەسی بۆ نەناردن. هێزی عەجەم هیچ هێزێکی لە بەردەم دا نەبو بەرهەڵستی بکا ناوچەکەی ڕاماڵی (1191 ک/ 1777 ز). ئەحمەد پاشا قەڵاچوالانی گرت و لێی دانیشت. هێزی عەجەم بە هۆی بەفر و سەرمای زستانەوە کشایەوە.(27)

عەبدوڵا پاشای وەزیر بە نەخۆشی سیل مرد (1192 ک/ 1778 ز). کەهیەکانی لە ناو خۆیان دا کەوتنە شەڕ و پیلانگێران بۆ ئەوەی یەکێکیان ببێ بە وەزیر. محەمەد پاشا ئاڵۆزانی هەلومەرجی بەغداد و کشانەوەی هێزی عەجەمی بە دەرفەت زانی قەڵاچوالان بگرێتەوە.

هێزی خۆی کۆکردەوە بۆ سەر قەڵاچوالان. ئەحمەد بەمەی زانی. ئەویش هێزی خۆی سازدا. لە جێشانە هەردو لەشکر بەیەک گەیشتن. هێزی ئەحمەد چواریەکی هێزی محەمەد بو. ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە ناسراوەکانی هێزەکەی محەمەد کوژرا لەوانە تەیمور پاشای میری کۆیە. محەمەدیش گیراو، بە دیلی ڕەوانەی قەڵای سرۆچک کرا (1192 ک/ 1778 ز).(28)

ئەحمەد مەسەلەکەی بۆ حەسەن پاشای وەزیر نوسی. لە باتی ئەوەی لۆمەی بکا، جگە لە ملکی بابان، کۆیە و هەریری لە گەڵ "خەلعەت" ێکی نایاب دا پێ بەخشی.(29)

چەند کەسێ لەکەهیەکانی وەزیری پێشو یاخی بون. هێزێکی گەورەیان لێ کۆبوەوە. وەزیر و بەغدادیان خست بوە مەترسی‌یەوە. وەزیر محەمەد بەگی شاوی نارد بۆ قەڵاچوالان هێزی بابان بهێنێ بۆ کوژاندنەوەی یاخی بونەکە. ئەحمەد پاشا خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی لە گەڵ شاوی بەرەو بەغداد بەرێ بکەوێ. محەمەدی برای هێشتا لە زیندان دا بو لە ترسی ئەوەی ئەوەکو کێشەیەکی بۆ دروست بکا، ناردی چاویان دەرهێنا. ئەحمەد کەوتە ڕێ بەرەو بەغداد. لە ئەزمڕ نەخۆش کەوت. کە گەیشتە قەرەداخ، بە هۆی توند بونی نەخۆشی‌یەوە دواکەوت و، لە سەگرمە مرد (1192 ک/ 1778 ز). تەرمەکەیان بردەوە بۆ قەڵاچوالان لەوێ ناشتیان. لە سەر کێلی گۆڕەکەی نوسی بویان:

شاه غازی احمدی لشکر شکن

انکه تیغش قلب اعدا میبرید(30)

ئێستا شوێنەواری کێل و گۆڕەکەی نەماوە.

–15–

کە هەواڵی مەرگی ئەحمەد پاشایان دا بە وەزیر لە جێگەی ئەو مەحمود پاشای برای دانا بە حاکمی بابان و کۆیە و هەریر. نامە و خەلعەتی بۆ ناردو، داوای لێ کرد بە پەلە بگاتە لای.

مەحمود پاشا هێزی بابانی سازدا. لە گەڵ سوارەی عوبێد بە سەرکردایەتی حاجی سلێمان بەگی شاوی و، هێزەکانی وەزیر بە سەرکردایەتی عوسمان کەهیە لە (ام تل) یەکیان گرتەوە. لە پێکادانێک دا لە لای خالص و لە پێکادانێکی ترا لە (سبع رحی) لای مەندەلی هێزی یاخییەکانیان تەفروتونا کرد. وەزیر جێگیر بو.(31)

بەڵام دەسەڵاتی وەزیر نزیکەی 18 مانگ درێژەی کێشا. خەڵکی بەغداد لێی هەڵگەڕانەوە و دەریان کرد. بابی عالی سلێمان پاشای کرد بە وەزیری بەغداد. سلێمان پاشا لە پێش گرتنی بەصرا دا موتەسەللیمی بەصرا بو. دوای داگیرکردنی بەصرا ئەویش بە دیلی نێردرا بو بۆ شیراز دوای مردنی کەریمخان و چۆڵکردنی بەصرا ئەویش ئازاد کرابو. بە یارمەتی شێخی مونتەفیک گەڕابوەوە بەصرا. لە مێژوی مەمالیک دا بە سلێمان پاشای گەورە "بیوک سلێمان" ناوی ئەبەن. کە گەیشتە بەغدا تەنیا یەک شەوی تێ دا مایەوە. هێزەکانی کۆکردەوە بۆ پەلاماردانی یاخییەکانی کە دیالەیان کردبو بە مەڵبەندی خۆیان.

لە سەر داوای وەزیر مەحمود پاشا، عوسمانی کوڕی لە گەڵ پێنج سەد سوار نارد بۆ بەشداری لەم لەشکرکێشییەدا (1194 ک/ 1780 ز).(32) عوسمان بەگی بابان لەم شەڕانەدا ئەرکی خۆی وەکو پێویست بە جێ هێنا. سەبارەت بەو ئازایەتییەی نواند بوی بە قسەی نوسەری "مطالع السعود" والی پێ ی وتوە: "انما انت یا عثمان، من سلیمان کالعین او الانسان". بە قسەی نوسەری "دوحە" ش پلەی پاشایاتی دراوەتێ.(33)

## –16–

چەند گەورەپیاوێکی ئەردەلان لەوانە: محەمەد ڕەشید بەگی وەکیل و، کەهزاد خانی کوڕی سوبحانویردیخانی والی پێشوی ئەردەلان. لە خەسرەوخانی والی ئەرەنجێن پەنا ئەبەنە بەر مەحمود پاشای بابان. لە هامان کات دا محەمەد پاشا و عومەر بەگی برای مەحمود پاشا هەڵدێن و پەنا ئەبەنە بەر والی ئەردەلان.

خەسرەوخان و مەحمود پاشا سەودایەک ئەکەن. ڕێک ئەکەون لەسەر گۆڕینەوەیان. مەحمود پاشا کەهزاد و محەمەد ڕەشید ئەنێرێتەوە بۆ سنە. خەسرەویش محەمەد و عومەر ئەنێرێتەوە بۆ قەڵاچوالان. مەحمود پاشا هەردوکیانی لەژێر دارە گەورەکەی قەڵاچوالان دا کوشت (1194 ک/ 1780 ز). (34)

## –17–

سلێمان پاشا، عوسمان کەهیەی وەزیری پێشو، کە کەهیەی بەغداد بو ویستی لە خۆی نزیک بخاتەوە موتەسەللیمی کەرکوکی پێ بەخشی. بەمە ڕازی نەبو ئەیویست بیبێتەوە بە کەهیای بەغدا. دڵی ڕەنجا بو ویستی لە گەڵ عوسمان پاشای کۆیە و مەحمود پاشای بابان دا قسە یەک بخەن و، کارێک لە دژی وەزیر بکەن. وەزیر دەمێ بو لە بەهانە بو لە مەحمود پاشا ئەیویست بچێتە سەری.

وەزیر بە لە شکرەوە ڕوی کردە کەرکوک. لە کەناری شار خێوەتگای دامەزران. مەحمود پاشا و عوسمان پاشا و، عوسمان کەهیە پێنج تا شەش هەزار سوار و پیادەیان کۆکردەوە لە "دەربەندی بازیان" دامەزران. وەزیریش بارەگاکەی گوێزایەوە بۆ "خان کێشە"ی نزیک دەربەند.

وەزیر بۆ ئەوەی ڕیزەکانیان تێک بدا و، بنەماڵەی بابان بکا بە گژ یەک دا، بۆ یەکێ ئەگەڕا لە باتی مەحمود پاشای دابنێ. حەسەن بەگی کوڕی خالید پاشای کوڕی سلێمان پاشا ڕیزی لەشکری بابانی بە جێ هێشت و چوە ناو ڕیزی هێزەکانی وەزیرەوە.(35) هەروەها مەحمود پاشای کوڕی تەیمور پاشای چوە لا. حەسەنی لە باتی مەحمود و، مەحمودی لە باتی عوسمان دانا. مەحمود پاشا بەمە زۆر تێک چو. مەلا و

پیاوچاکانی کرد بە تکاکار، ئەگەر لە جێگەی خۆی بمێنێتەوە هەمو مەرجەکانی والی قوبوڵ بکا. حاجی سلێمان بەگی شاوی بە نوێنەرایەتی وەزیر چو بۆلای بۆ ڕێککەوتن. داوایان لێ کرد: عوسمان کەهیە دوربخاتەوە. دەس لە کۆیەو هەریر هەڵبگرێ. سێ سەد کیسە دراو بدا. یەکێ لە کوڕەکانی بەبارمتە دابنێ لای وەزیر.

والی گەڕایەوە بەغداد. مەحمود پاشا مەرجەکانی پێ جێبەجێ نەکرا. هێزێکی ناردە سەر مەحمود پاشای تەیمور پاشا لە کۆیە. بەڵام والیش هێزێکی ناردە سەر ئەم. سەرەنجام وا ڕێک کەوتن کۆیە نەبۆ مەحمودی تەیمور پاشا بێ و نە بۆ عوسمانی مەحمود پاشا. بە ڵکو بدرێ بە ئیبراهیم بەگی کوڕی ئەحمەد پاشا (1196 ک/ 1781 ز).

والی لە ژێرەوە لە گەڵ ئیبراهیم بەگ ڕێک کەوت بو. ئەو واز لە مەحمود پاشا بهێنێ، ئەمیش لە جێگەی ئەو بیکا بە میری بابان.

والی سەرلەنوێ لەشکرێکی گەورەی سازدا بەرەو کەرکوک. مەحمود پاشا و عوسمان بەگی کوڕی لە دەربەندی بازیان دامەزران.

وەزیر ناردی بە دوی ئیبراهیم بەگ دا. ئیبراهیم لە گەڵ هەمو براکانی گەیشتنە والی. هەروەها حەسەن بەگی کوڕی شێر بەگ و، هەندێ لە میر و گەورەکانی تر. والی خۆی چوە سەر دەربەند. پلەی پاشایەتی بە ئیبراهیم بەخشی و، لە جێگەی مەحمود پاشا کردی بە میری بابان و کۆیە و هەریر.

ریزی هێزەکانی مەحمود پاشا تێکچو. هێزێکی ئەوتۆی بە دەورەوە نەما بەرەنگاری بکا. خۆی و دەسو پێوەندەکانی ڕۆیشتن بۆ ئێران. ئیبراهیم پاشا چوە قەڵاچوالان.(36)

## -18-

دوای مردنی کەریمخان (1193 ک/ 1779 ز) ئێران شێوا بو.

میراتگرەکانی کەریمخان لە ناو خۆیان دا لە سەر تاج و تەخت خەریکی شەڕی یەکتری بون. دەسەڵاتی بنەماڵەی زەند کزبوبو.

مەحمود پاشا لە ئاوایی باخچەی نزیک سنە جێگیر بو. عوسمانی کوڕی بە دیارییەوە نارد بۆ لای عەلیمورادخانی زەند، کە لەو کاتەدا ئیدیعای شایەتی ئێرانی ئەکرد. عەلیمورادخان دەستی بە سەر هەمو ئێران دا نەئەڕۆیشت بە تایبەتی ئازەربایجان. لەو کاتەدا ئەحمەدخانی موقەددەم قەتڵوعامی ئێلی بڵباسی کرد بو. هەزار پیاوی بۆ میوانداری دەعوەت کرد بو بۆ مەراغە و شەو لە خەودا هەمویانی کوشت بو. ئێلی بڵباس هاواریان بۆ مەحمود پاشا هێنا بو. وا گومان ئەکرا بوداقخانی موکری لەم پیلانەدا دەستی هەبوبێ.

هەندێ سەرچاوە ئەڵێن: عەلی موراد خان پەشیمان بۆتەوە لە دانانی مەحمود پاشا بە حاکمی موکریان. نامەیەکی نهێنیی بۆ فەرماندەکەی خۆی و، حاکمەکانی ناوچەکە نوسیوە، کە مەحمود پاشا بکوژن. بەڵام نامەکە پێش ئەوەی بگاتە دەستی خاوەنەکانی، دەست ئەورەحمان پاشا کەوتوە. مەحمود پاشا لە "ئێلتیمور" کەوتە بۆسەی هێزی عەجەمەوە گوللەیەک پێکای و کوژرا (1198 ک/ 1783 ز). کوڕەکانی مەحمود: عوسمان بەگ و ئەورەحمان بەگ بەنارەحەتی کشانەوە بۆ سەقز. حاکمی سەقز عەباسقولیخان لەم پیلانەدا دەستی هەبو. عەباسقولییان کوشت و سەقزیان تاڵان کرد. بە یارمەتی ئێلی بڵباس کشانەوە ڕەواندز.(37)

بەم جۆرە ڕۆژگاری پڕ شەڕوشۆڕ و برا کوژی و خۆخۆری ئەم 5 برایە کۆتایی هات.

## پەراوێزەکان

1. الكركوكلي: 94.
2. الخال: "الشيخ معرف..." 18. القزلجي: 26 -27.
3. محمد: "شاعر باباني"، كاروان، ژ. 5، ل 159.
4. امين زكي: "تاريخي سليماني.." 72.
5. الكركوكلي: 137. العزاوي: 6/ 34 - 35.

عبدالرحمن السويدي ئەم ڕوداوەی بە شیعر هۆنیوەتەوە لە "حديقه الزوراء" دا نوسراوە.

6. نامي اصفهاني: 95.
7. الكركوكلي: 146. العزاوي: 6/ 44 - 45.
8. الكركوكلي: 146.
9. الكركوكلي: 135 - 136.
10. العزاوي: 6/ 34.
11. نوسینەکەی بێتوشی بە عەرەبی بەم جۆرەیە: "تاريخ وفات سليمان پاشا ابن خالد پاشا: ليله الجمعه من ذى الحجه سنه 1178 قتل فى بيته داخل الحرم دخل عليه ليلا رجلا من قصبه كوى اسمه فقه ابراهيم فضربه خنجرا وهو نايم على فراشه فمات من تلك الضربه بايام قلايل. رحمه الله تعالى"

کتێبەکەیش ناوی: "البهجه المرضيه فى شرح الالفيه" لە مەکتەبەی ئەوقافی سلێمانیە بە ژمارە (2315).

ڕەنجوریش نوسیویتی: "کوشتنی سلێمان پاشای بابان ساڵی 1178" گۆڕەکەی لە قەڵاچوالان بوە و، لە سەر کێلەکەی چەند شیعرێکی فارسی نوسراوە. عەبدولعەزیز یامڵکی ساڵی 1916 چۆتە قەڵاچوالان و سەردانی گۆڕی سلێمان پاشای کردوە. دوایی تر لە وتارێک دا بە زمانی تورکی لە سەری نوسیوە و، بەشێ لە شیعر و نوسینەکانی سەر کێلەکەی نوسیوەتەوە و لە "ژین"، ع 18، ئەستەموڵ، بڵاوی کردۆتەوە.

12. امين زكي: "تاريخي سليماني" 57. ئەمیش لە دەفتەرەکەی حسێن نازمی وەرگرتوە.
13. نيبور: 74.
14. البابانى: 121.
15. بۆ نمونە بڕوانە: مردوخ كردستاني: 2/ 132.

هەندێ سەرچاوەی کوردی ڕوداوەکە بە جۆرێکی تر ئەگێڕنەوە:

حوزنی نوسیویتی: "ساڵی 1176 محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشا کە سوپەهدار بو بە نارەزوی حوکمداریی لە ژێرحوکمی سلێمان دەرچو و بە لەشکرەوە چوە سەر قەڵاچوالان. سلێمان پاشا چوە بەرابەری لە "تارن" دەست بە شەڕ کرا سلێمان پاشا شکا و هەڵات، محەمەد پاشا گەلێکی تاڵان و دیل دەس خست. ساڵی 1178 محەمەد پاشا هێزی زیاد بو لنگی دا سەر سلێمان پاشا لە مەیدانی شەڕدا سلێمان گیرا و کوژرا و لە شکرەکەی بڵاو کراوە." حوزنی موکریانی: 128.

هیچ سەرچاوەیەک پشتیوانی لەم گێڕانەوەیەی حوزنی ناکات و، خۆیشی نیشارەتی بۆ هیچ سەرچاوەیەک نەکردوە.

مەحمود ئەحمەد محەمەدیش "بەڵگەنامەیەکی کۆن!" ی بڵاو کردۆتەوە تێی دانوسراوە:

"باباسلێمان دوای کوشتنی دلاوەری موتەصەرریفی کەرکوک نیتر ناتوانێ لە دارەشمانە دانیشێ ئەچێتە قەلاچوالان. داوا لە سەید عومەر ئاغا ئەکا ماڵەکەی خۆی بۆ چۆڵ بکا. ئەویش خانوەکەی خۆی ئاداتێ. شەو سلێمان ئەدا بە سەریان دا سەید عومەر و منالەکانی و هەندێ لە دانیشتوانی گوند ئەکوژێ و ماڵەکەی لێ زەوت ئەکا. یەکێ لە کورەکانی سەید عومەر بە ناوی سەید عەلی هەڵدێ بۆ گوندی قاینەجە لە شارەزور. سەید عەلی کورێکی ئەبێ بە ناوی سەید ئیبراهیم. سەید ئیبراهیم بۆ تۆڵە کردنەوەی باپیری لە قەلاچوالان ئەبێ بە فەقێ. شەوێک هەلی بۆ هەڵ ئەکەوێ لە کاتی نوستن دا سلێمان پاشا ئەکوژێ لە تۆڵەی ئەوەی باپیری سلێمان پاشا باپیری برایمی کوشت بو." محەمەد: "کاروان". ژ 36. ل 138 - 150.

ئەم بەڵگەیە، ئەگەرچی هەندێ لە ئاگاداریەکانی بەوردی رێکخراوە. بەلام بەڵگەکە هەموی لە هەڵبەستراو ئەچێ و، پێ ئەچێ لەم ساڵانەی دوایی دا بۆ مەبەستێکی تایبەتی نوسرابێ. لە بەر ئەوە پشتی پێ نابەسترێ. "شەجەرە" و"بەڵگە" ی دروستکراو زۆرە.

16. الکرکوکلی: 148.
17. الکرکوکلی: 148 - 149. العزاوی: 6/ 47 - 49.
18. نامی اصفهانی: 180 - 183. ورهرام: 71 - 72.
19. الکرکوکلی: 149. نامی اصفهانی: 178 - 179. رەنجوری: "شکستی عەلی مەردان خان و محەمەد پاشا ساڵی 1188".
20. الکرکوکلی: 151. العزاوی: 6 /50.
21. رەنجوری: "هاتنی شەفی خان ساڵی 1189"
22. السلفی: "کاروان". ژ 19، ص 150 - 151.
23. ابن الحاج: "مەهدی نامە"، 1975.
24. مەلا محەمەدی سیوچی: "تذکرە العوام یا بەیتی ئەوەل و ئاخر"، 1979.
25. شێخ محەمەدی خاڵ بە زمانی عەرەبی لە سەر ژیان و بەرهەمەکانی کتێبێکی بە ناوی "البیتوشی" نوسیوە و ساڵی 1958 لە بەغداد چاپ کراوە.
26. الکرکوکلی: 158. رەنجوری: "شکستی خەسرەوخان لە زرێبار ساڵی 1191"
27. الکرکوکلی: 158. فخر الکتاب: 152. العزاوی: 6/ 66 - 67.
28. رەنجوری: "کوشتنی تەیمور پاشای کۆیە 25 ی صەفەری ساڵی 1192". بنەماڵەی پاشاکانی کۆیە ئەچنەوە سەرمیرەکانی سۆران.
29. الکرکوکلی: 164. العزاوی: 6/ 75.
30. الکرکوکلی: 165 - 166. العزاوی: 6/ 78. رەنجوری: "وەفاتی ئەحمەد پاشای بابان 27 ی جیمادی دومی ساڵی 1192"
31. الکرکوکلی: 166. العزاوی: 78/6.
32. الکرکوکلی: 172. العزاوی: 85/6.
33. البصری: 172.
34. ریچ: 432. فخر الکتاب: 155 - 157. رەنجوری: "کوشتنی محەمەد پاشا و عومەر پاشا رەمەزانی ساڵی 1194"
35. حەسەن بەگ کوری خالید پاشای سلێمان پاشا بو. خالید لە لایەن ئێرانەوە بە حاکمی مەندەلی دانرا

بو. خەڵکی مەندەلی لێی هەڵگەڕانەوە و کوشتیان. سەریان بڕی کەللەسەریان بە دیاری بـرد بـۆ والـی بەغداد (1190). العزاوي: 6/ 68.

36. الكركوكلي: 177. البصري: 156 - 157.

37. الكركـوكلي: 178. العـزاوي: 6/ 90 - 93. اديـب الشـعرا: 189 - 191. ڕەنجـوری: "کـوژرانی مەحمود پاشای بابان لە مەحاڵی سابلاخ و یەلتیمور ڕۆژی یەکشەمە 6 ی جیمادی یەکەمی 1198".

# 6. ئیبراهیم پاشا:
# بنیاتنانی شاری سلێمانی

-1-

سلێمان پاشای گەورە، وەکو وەزیرەکانی پێش خۆی، نەیئەهێشت هیچ کام لە گەورە پیاوەکانی عەرەب یان کورد ماوەی درێژ لە شوێنەکانی خۆیان دا بمێننەوە. زو زو ئەیگۆڕین بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان جێگیر نەبێ و، لە ناو خێزانەکانی خۆیان دا مڵۆزمی بۆ نەدۆزینەوە. ویستی مەحمود پاشا لا بدات. چەند جارێ گێچەڵی پێ کرد. دواجار تەنیا بابانی لە دەس دا هێشتەوە. کۆیە وهەریری سپاردە ئیبراهیم بەگ.

ئیبراهیم بەگ کوڕی ئەحمەد پاشای برا گەورەی مەحمود پاشا بو. ئەحمەد پاشا دوای مردنی: ئیبراهیم بەگ، عەبدولعەزیز بەگ و خالید بەگی لە پاش بە جێ ما بو. ئەمانە هەریەکەیان بە جۆرێ لە روداوەکانی ناوچەکەدا دەوریان بینی.

سلێمان پاشا لەشکری کۆکردەوە بۆ سەر مەحمود پاشا. مەحمود پاشا لە دەربەندی بازیان دامەزرا. سلێمان پاشا ژێربەژێر لە گەڵ ئیبراهیم پێکهات بو. لە جێگەی مەحمود پاشا، بیکا بە میری بابان. ئیبراهیم و براکانی و چەند کەسی تر لە بەگزادەکانی بابان گەیشتنە دۆردوی وەزیر. بە یارمەتی ئەمان مەحمود پاشای شکان. مەحمود هەڵات بۆ ئێران. ئیبراهیم بە پلەی پاشا بو بە میری بابان و کۆیە و هەریر (1197ک/ 1782 ز).

-2-

کە مەحمود پاشا لە ئیلتیمور کوژرا (1198 ک / 1783 ز) کوڕەکانی ماوەیەک سەرگەردان بون. مەحمود پاشا لە دوای خۆی چەند کوڕێکی بەجێ هێشت بو: عوسمان بەگ، ئەورەحمان بەگ، سەلیم بەگ، عەبدوڵڵا بەگ، خالید بەگ... عوسمان بەگی کوڕە گەورەی مەحمود پاشا باروبنەی لە سەقز پێچایەوە، لە گەڵ

خێزان و دەسوپێوەندەکانی بەیارمەتی ئێلی بلباس ڕۆیشتە ڕەواندز. کەسوکار و خزمەکانی لەوێ دانا و خۆی چوە ناو ئێلی بلباس، دواییتر چوە ئامێدی، لە ناوکر دانیشت.(1) لەوێوە پێوەندی لە گەڵ وەزیری بەغداد، سلێمان پاشای گەورە، کرد. وەزیر بە هۆی مستەفا ئاغای سیلاحدارەوە "ئەمان" ی بۆ نارد. عوسمان پاشا ڕوی کردە بەغداد. وەزیر دڵنەوایی کرد. دوای ماوەیەک ناوچەکانی قزلرەبات، خانەقین و عەلیاوای پێ بەخشی.(2)

ئەمین زەکی لە بارەی ڕەنجاندن و دڵنەوایی میرەکانی بابانەوە نوسیویتی:

"ئەم تەوجیە و دڵنەواییەی سلێمان پاشا، کە خیلافی تەبعی بو جارجارێ ڕوی ئەکردە بەعزێ ئومەرای بەبە، لە حسسێکی ئینسانی زیاتر بە مەقسەدێکی سیاسی بو. ئەیویست دانیمەن بەرامبەر بە حاکمێکی بەبە ئەمیرێکی بەبەی بە دەستەوە بێ. لە لایەکەوە حاکمێکی بەبەی پێ بترسێنێ و لە لایەکی تریشەوە ئەگەر بێ ئەمریی کرد دەسبەجێ ئەم ڕەقیبە بنێرێتە جێگەی. خولاسەی مەقسەد ئیبقای فیتنە و نیفاق لە بەینی ئومەرای بەبەدا بو." (3)

## -3-

ماوەیەک بو میرەکانی بابان بیریان لەوە کرد بوەوە لە قەڵاچوالان بگوێزنەوە. سەرانسەری قەڵەمرەوی بابان شارێکی تێ دا نەبو. قەڵاچوالان، سورداش، بازیان، قەرەداغ... کە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی هەندێ لە ناوچەکان بون، ئەمانە گوندی گەورە بون. مەحمود پاشا لە نزیک گوندی مەڵکەندی سەرایەکی دروست کرد بو بە تەما بو بیکاتە مەڵبەندی حوکمڕانی. بەڵام فریا نەکەوت تەواوی بکا لایان برد. ئیبراهیم پاشا درێژەی بەم پرۆژەیە دا. بازاڕ و خان و مزگەوت و چەند خانویەکی لێ دروست کرد و بنکەی حوکمڕانی لە قەڵاچوالانەوە گوێزایەوە بۆ شوێنی تازە کە ناویان نا: سلێمانی (1199). بۆ دروست کردنی شاری نوێ، خانوەکانی قەڵاچوالانیان ڕوخاند و، دارو پەردوەکەیان لە دروست کردنی خانوەکانی سلێمانی دا بەکار هێناوە.(4)

لە سەر ناونانی شارەکە بۆ چونی جیاواز هەیە.

هەندێک ئەڵێن: ئیبراهیم پاشا بە ناوی سلێمان پاشای والیی ئەوسای بەغدادەوە ناوی ناوە.

هەندێکی تر ئەڵێن: بە ناوی بابا سلێمانی دامەزرێنەری بنەماڵەی بابانەوە بوە. تا سەردەمی ئیبراهیم دو لە میرە گەورە و لێهاتوەکانی بابان ناویان سلێمان بوە. سلێمانی یەکەم باپیرە گەورەی ئیبراهیم و، سلێمانی دوەم مامی ئیبراهیم. جگە لەوان، یەکێ لەکوڕەکانیشی ناوی سلێمان بو.

هەر چەندە بۆ لێکدانەوەی هۆی دروستکردنی سلێمانی زۆر باس و بابەت ئەگێڕنەوە، بەڵام ڕەنگە هۆی سیاسی و جەنگی گرنگترین هۆی دروسکردنی بوبێ.(5)

سلێمانی بو بە ناوەندێکی گرنگی جوڵانەوەی سیاسی و فەرهەنگی و ئەدەبی لە مێژی نوێی کوردا.

## -4-

یەکێ لەو بینایانە لە گەڵ دروستکردنی سلێمانی دا بنیات نراوە مزگەوتێک بوە کە ناونراوە "مزگەوتی گەورە". ئەمە تەنیا مزگەوتی سلێمانی بوە نوێژی هەینیانی تێدا کراوە. ئەگەر مزگەوتەکانی کوردستان لە گەڵ مزگەوتەکانی بەغداد و کەربەلا و نەجەف یان ئەسفەهان و شیراز و تاران بەراورد بکرێن، زۆر هەژارانە دروست کراوە. هیچ هونەرێکی ئەندازە و بەناسازیان تێدا بەدی ناکرێ. بە خشتی کاڵ و قوڕ و دار دروست کراوە. مزگەوتی گەورەش هەروا بوە. بەڵام ئەم مزگەوتە کتێبخانەیەکی دەوڵەمەن و گەورەی تێ دا بوە. مامۆستای زانا و تێگەیشتو دەرسیان تێ دا وتوتەوە. سەدان مەلای زانا و لێوەشاوەی تێ دا پێگەیشتوە.

یەکێ لەو مەلایانەی لە سەرەتای بنیاتنانی سلێمانیەوە لە مزگەوتی گەورە دامەزراوە شێخ مارفی نۆدێ (1175 - 1254) بوە. شێخ مارف لە گوندی نۆدێ لە شارباژێر لە دایک بوە. لە ساداتی بەرزنجەیە. بە منالّی لە لای باوکی چۆتە بەر خوێندن. ئینجا براوەتە مەدرەسەکەی قەڵاچوالان لەوێ ماوەتەوە تا کۆچی سلێمان پاشا. بە هۆی ئەم ڕوداوە ماوەیەک فەقێکان پەرەوازە بون ئەویش چۆتە لای مەلا محەممەدی ئیبنولحاج لە هەزار مێرد. 4 ساڵیش لەوێ خوێندویەتی. هەر ئەو کاتە مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی بە سەردان لە کوردستان ئەبێ و ماوەیەک لە هەزار مێرد لای ئیبنولحاج ئەبێ. مەلا مارف لە لای ئەویش ئەخوێنێ، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ قەڵاچوالان و لەوێ ئیجازە وەرئەگرێ.

لە مەزهەب دا سوننی و شافیعی و، لە تەریقەت دا قادری بوە. بە هۆی بیروڕای ئاینیەوە لە ناکۆکی ئێران و عوسمانی دا هەمیشە لە گەڵ عوسمانی بوە و، لە ناکۆکی نێوان پاشاکانی بابان و والی دا، هەمیشە لە گەڵ والی بەغداد بوە.

ژمارەیەکی زۆر کتێبی بە پەخشان و هۆنراوە لە زانستەکانی دینی ئیسلام دا، هەروەها لە ڕێزمانی عەرەبی و، بەلاغەت دا بە عەرەبی نوسیوە.

دوای ئەحمەدی خانی، شێخ مارف یەکەمین کەسە فەرهەنگی "ئەحمەدی" عەرەبی - کوردی، بە ناوی "کاک ئەحمەد" ی کوڕیەوە، بە هۆنراوەی کوردی داناوە 1475 وشەی عەرەبی گرتۆتەوە.

لە گەڵ دروستکردنی سلێمانی ئەویش بانگ کراوەتە سلێمانی. لە مزگەوتی گەورە دامەزراوە. خەریکی دەرس وتنەوە و، نوسین بوە و، سەرپەرشتی کتێبخانەکەی کردوە.(6)

## -5-

سلێمان پاشا هەوڵێکی زۆری ئەدا بۆ دامەزراندنی کۆلەمەن (مەمالیک) و دورخستنەوەی گەورە پیاوانی خۆجێیی عەرەب و کورد لە کاروباری حکومەت. سلێمان بەگی شاوی، یەکێ لە سەرۆکەکانی ئێلی عەرەبی عوبێد، دژی ئەم سیاسەتەی والی بو. لە دانیشتن و کۆڕەکانی دا توانجی لە وەزیر ئەگرت و کاڵتەی بە ئەسڵ و فەسڵی ئەکرد. لە هەمان کات دا دژی ئەحمەد ئاغای موهردار بو.

ئەحمەد ئاغا یەکە پیاوی وەزیر و خاوەن نوفوزێکی زۆر بو لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی دا، دوایی بو بە کەهیەی وەزیر. بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی دەسەلاتدار بو و، زۆری خزمەتی دەوڵەت کرد بو، والی نەیئەتوانی بە ئاسانی سزای بدا. والی، شاوی لە بەغداد دور خستەوە. شاوی لە شوێنێکی نزیک بەغداد هەڵی دا. پیاوەکانی ئێلەکەی خۆی لێ کۆبونەوە.

وەزیر هێزی کۆکردەوە بینێرێتە سەری. ئەحمەد ئاغا و لەشکری بەغدادی ساز

دا. ناردی ئیبراهیم پاشا و لەشکری بابانیش بێن. هێزەکە خرایە ژێر سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشا. سلێمان بەگ بە خۆی دا ڕانەپەرمو بەرەنگاریی بکا. هەڵات بۆ تکریت. لەوێش چونە سەری. باروبنەی بەجێ هێشت و خۆی کشایەوە بۆ دەوروبەری خابور. کەلوپەلەکەی تالان کراو لەشکر گەڕایەوە بەغدا (1200ک/ 1785 ز).(7)

## -6-

ساڵی 1200 ک (1785 ز) وشکە ساڵ بو. گرانی و قاتوقڕی بڵاو بوەوە.

خەڵکی برسی لە بەغداد وروژان و هێرشیان کردە سەر سەرای حکومەت. لێیان دان هەندێکیان کوشتن و، هەندێکیان گرتن و هەڵیان واسین.(8)

## -7-

سلێمان بەگی شاوی هێزی لە خۆی کۆکردەوە و، لە عانە دانیشت. والی دیسان هێزێکی ناردە سەری. بەشێکی ئەم هێزە دیسان کورد بو. لە نزیک فەللوجە هەردو هێز پێکا هەڵپژان. هێزی شاوی لەشکری والی شکاند. لەم شەڕەدا بەکر پاشای کۆیی کوژرا و، سەرکردەی لەشکرەکە و، مەحمود پاشای تەیمور پاشای کۆیە بە دیل گیران. بەڵام سلێمان بەگ مەحمودی بەردا و ئەسپ و کەلوپەلەکانیشی دایەوە.

دوای ئەم شەڕە بە مانگێ سلێمان بەگ هەڵی کوتایە سەر بەغداد. گەیشتە ناو کەرخ. بەڵام هێزەکانی والی هێزەکانی شاوییان شکاند. شاوی دیسان کشایەوە.

شاوی لە گەڵ سوەینی شێخی مونتەفیک و حەمەد ئال حەمود شێخی خەزاعیل پەیمانی بەست و بون بە هاودەنگ. یەککرتنی ئەم 3 هێزە مەترسییەکی گەورەی بۆ سەر والی دروست کرد. دەسەڵاتی مەمالیکی خست بوە مەترسییەوە.

وەزیر ناردی بە دوای ئیبراهیم پاشای بابان و عبدولفەتاح پاشای درنە و باجەڵان. کە بەخۆیان و هێزەکانیانەوە ئامادە بن بۆ شەڕ. هەردوکیان بە هێزەکانیانەوە هاتن بەڵام وەزیر بیانوی ئەوەی پێ گرتن، کە هێزەکانیان وەکو پێویست پۆشتە و تەیار نین. هەردوکیانی لێ خست. عوسمانی مەحمود پاشای لە جێگەی ئیبراهیم و، عەبدولقادری لە جێگەی عبدولفتاح دانا (1201ک/ 1786 ز). بەڵام هێزەکانی هەمویانی برد بۆ شەڕەکە. عوسمان، ئەورەحمانی برای بە پەلە ناردەوە بۆ کوردستان بۆ سازدان و کۆکردنەوەی هێز. زۆری پێ نەچو بە 2 هەزار کەسەوە گەڕایەوە بۆ بەغداد. وەزیر دەستی خست بوە ناو شێخەکانی مونتەفیک و خەزاعیلەوە. حەمود بن سامیر لە مونتەفیک و موحسین ئال حەمەدی لە خەزاعیل هەڵ گێرا بوەوە.

لەشکری وەزیر چوە سەر ئێلەکانی عەرەب. سلێمان بەگ و سوەینی و حەمەد نزیکەی 20 هەزار سوار و پیادەیان کۆ کردبوەوە وخۆیان بۆ شەڕێکی گەورە ئامادە کرد بو. لە شوێنێک دا بە ناوی (أم الحنطه) هەردو هێز لێکیان دا. عوسمان پاشای بابان سەرکردایەتی باڵی چەپ و ئیبراهیم پاشای بابان سەرکردایەتی باڵی ڕاستی ئەکرد و، وەزیر خۆیشی لە ناوەڕاست دا بو. شەڕێکی قورس قەوما. ئێلەکانی عەرەب 3 هەزار سوارو پیادەیەکی زۆریان لێ کوژرا. 3 منارەیان لە کەللە سەری کوژراوەکانیان دروست کرد. شۆڕشەکەیان شکا وسەرکردەکانیان بڵاوەیان لێ کرد (سەرەتای موحەڕڕەمی 1202 ک/ 1787 ز).(9)

عوسمان پاشا چوە سلێمانی و، ئیبراهیم پاشا لە بەغداد دانیشت.

## -8-

مستەفا ئاغای کوردی "موتەسللیم" ی بەصرا ڕقی لە وەزیر بو. بە نهێنی کەوتە پێوەندی لەگەڵ عوسمان پاشا. دۆستایەتی کۆنیان لە بەین دا هەبو. پێوەندی لە گەڵ سوەینی شێخی مونتەفیک کرد. هەروەها زۆر گەورە پیاوی تری کرد بو بە هاودەنگی خۆی. وەزیر ویستی لەشکرکێشیی بکا بۆ سەر مستەفا ئاغا لە بەصرا. عوسمان پاشای ئاگادار کرد هێزەکانی کۆبکاتەوە بۆ بەشداری لەم لەشکرکێشییەدا.

سلێمان بەگی شاوی ویستی تۆڵەی کۆنیان لێ بکاتەوە و دڵی وەزیر لە خۆی پاک بکاتەوە. ئاگاداری وەزیری کرد کە ئەوانە شتێکیان لە بەین دا هەیە. داوای لە وەزیر کرد باوەڕپێکراوێکی خۆی بنێری نهێنییەکانی پێ بڵێ. وەزیر باوەڕپێکراوێکی ناردە لای. سلێمان بەگی شاوی کابرای باوەڕپێکراوی لە کەینوبەینی مستەفا ئاغای موتەسەللیمی بەصرا و عوسمان پاشا ئاگادار کرد. نامەکانی عوسمان پاشای دایە.

وەزیر بۆ ئەوەی عوسمان پاشا فریو بدا بانگی کرد بۆ بەغدا. خوازبێنی خوشکەکەی لێ کرد بۆ عەبدوڵڵا بەگی برای ئەحمەد کەهیە و. رێگەی دا بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. بەو مەرجەی لە بەهاردا بە خۆی و لەشکر بابانەوە بێت بۆ بەغداد بۆ هاوبەشی لە لەشکرکێشی دا بۆ سەر بەصرا.

بەهار عوسمان پاشا ئامادە بو. لەشکرکێشی بۆ سەر بەصرا دەستی پێ کرد. مستەفا ئاغا و سوەینی هەلاتن. بێ شەڕ بەصرا گیرا. والی گەڕایەوە بەغاد. لە نزیک بەغداد خێوەتی هەڵ دا. والی عوسمان پاشای لە گەڵ خۆی سواری کەشتی کرد و بردیە بەغداد.

لە کۆڕێکی گشتی دا وەزیر بەرەو ڕوی عوسمان پاشا بوەوە. تاوانباری کرد بە "خیانەت". وەکو بەڵگەی ئەم خیانەتە. نامەکانی عوسمان پاشای بۆ سلێمان بەگی شاوی نارد بو. ئاشکرا کرد. عوسمان پاشا گیرا و خرایە زیندانەوە. لە هەمان کۆڕدا قاوەیەکی ژەهراویان دەرخوارد دا. عوسمان پاشا لە زیندان دا نەخۆش کەوت. نەخۆشییەکەی سەختتر بو. لە زیندانەوە گوێزرایانەوە ماڵی یەکێ لە گەورەپیاوەکانی بەغداد: مخەمەد سەعیدی دەفتەردار. پزیشک تەرخان کرا بۆ چارەسەرکردنی. سودی نەبو. ئینجا گوێزرایانەوە بۆ ماڵی دایکی محەمەد سەعید. دوای چەند ڕۆژێ لەوێ دا مرد (1203ک/ 1787 ز). گەورەپیاوەکانی بەغداد. لەوانە ئەحمەد کەهیە. لە پشت تەرمەکەیەوە ڕۆیشتن. وا باو بو ئەم "ئەحمەد" ە دەرمانخواردی کردوە. تەرمەکەی لە گۆڕستانی ئیمام ئەعزەم بە خاک سپێردرا.(10)

ئیبراهیم پاشا لە بەغداد دانیشت بو. والی لە جێگەی عوسمان پاشا کردییەوە بە حاکمی بابان (1203ک/ 1787 ز) و کۆیەو هەریری سپاردەوە بە مەحمود پاشای کوڕی تەیمور پاشا. بەڵام لەم ماوەیەدا مەحمود پاشاش مرد. کۆیە و هەریریشی سپارد بە ئیبراهیم پاشا.

## -9-

عوسمان پاشا کە بانگ کرا بو بۆ بەغداد. ئەوڕەحمان بەگی برای لە جێگەی خۆی لە سلێمانی دانا بو. ئەوڕەحمان بەگ کە بەگیران و مردنی عوسمان پاشای برای و. دانانی ئیبراهیم پاشای زانی. خۆی و کەسوکار و دەسوپێوەندەکانی کۆ کردەوە سلێمانی بە جێ هێشت و ڕوی کردە ئێران. نامەیەکیشی بۆ والی نوسی ئاگاداری کرد بو کە بڕیاری داوە ئەم وڵاتە بە جێ بهێڵێ و سەری خۆی هەڵبگرێ بۆ ئێران.

سلێمان پاشای وەزیر بۆ سەیران و ڕاو چوبو بۆ نزیک مەندەلی. ئەوڕەحمان بەگ نامەی بە هەل زانی نامەیەکی تری بۆ نوسی داوای لێبوردنی لێ کرد. والی لە پەنابردنی گەورەکانی کورد بۆ ئێران ئەسڵەمییەوە. هەوڵی ئەدا زو چارەی بکا. ناردی بە دوی ئەوڕەحمان بەگ دا و"ئەماننامە" ی بۆ نارد کە بە دڵنیایی بگەڕێتەوە.

ئەوڕەحمان بەگ خۆی و دەسوپێوەندەکانی چونە بەغداد و لەوێ نیشتەجێ بون. والیەکانی بەغداد هەرگیز نەیانئەهێشت پاشاکانی بابان ماوەی درێژ لە شوێنەکانی خۆیان دا بە ئاسودەیی بمێننەوە. زو زو ئەیانگۆڕین و. مێمڵ و ملۆزمیان لە ناو بنەماڵەکانی خۆیان دا بۆ ئەدۆزینەوە. والی بێ ئەوەی هیچ بیانویەکی بەجێی بە دەستەوە بێ دیسانەوە ئیبراهیم پاشای لێ خست و. ئەوڕەحمان بەگی بە پلەی پاشا لە جێگە دانا. ناوچەکانی بابان و کۆیە و هەریری پێ سپارد (1204 ک/ 1789 ز).

میرەکانی بابان لە ناوخۆیان دا. لە گەڵ یەکتری. زۆر خراپ بون. کە یەکێکیان لا ئەبرا و یەکێکی کە لە جێگەی دائەنرا. دەسوپێوەندەکانی پاشای پێشویان ئازار ئەدا و ئەیان ڕوتاندنەوە. تەنانەت هەندێ جار خێزانەکانیشیان. کەبە زۆری خزمی خۆیان بون. لەم تەنگ پێهەڵچنینە دەرباز نەئەبون. لەبەر ئەوە ئیبراهیم

پاشا کە بیستی لابراوە و، ئەورەحمان پاشا لە جێگەی دانراوە، خێزان و بار و بنەی پێچایەوە لە سلێمانییەوە ڕەوانەی بەغدایان بکا. عەبدولعەزیز بەگی برای لە گەڵ ناردن.

ئەورەحمان پاشا لە پێش خۆی دا سەلیم بەگی برای نارد کاروباری سلێمانی بگرێتە دەست. سەلیم بەگ لە گڵەزەردە توشی کاروانەکەی عەزیز بەگ بو. بو بە شەڕیان. عەزیز بەگ لە کاتی شەڕدا لە وڵاخەکەی گلاو بە بریندار بە دیل گیرا.

ئیبراهیم پاشا کە زانی ڕێگەی بەغدادی لێ گیراوە ڕوی کردە ئێران. ئەورەحمان پاشا عەزیز بەگی بە گیراوی نارد بۆ بەغداد. والی زانی ئیبراهیم پاشا بە ناچاری ڕوی لە ئێران کردوە. عەزیز بەگی بەردا و، محەمەد بەگی شاوی نارد بۆ ئێران بە دوی ئیبراهیم پاشا دا. ئیبراهیم پاشا گەڕایەوە بەغداد. والی بە ڕێزەوە لە بەغداد دایناو، ناوچەکانی قزلرەبات، قولە، خانەقین، عەلیاوا، دیهاتەکانی بەشیر و تازە خورماتوی بۆ تەرخان کرد (1205 ک/ 1790 ز).(11)

## -10-

لەوکاتەوە کە ئیبراهیم پاشا لێخرابو (1204ک/ 1789 ز) بە گۆشەگیری لە بەغداد دانیشت بو. والی ویستی دڵخۆشی بداتەوە. ئەورەحمان پاشای بانگ کرد بۆ بەغداد. دەسبەسەر گلی دایەوە. ناوچەکانی بابانی لێ سەندەوە و، دیسانەوە سپاردی بە ئیبراهیم پاشا، کۆیە و هەریر بە دەس ئەورەحمان پاشاوە مایەوە، سەلیم بەگی برای سەرپەرشتی ئەکرد.(12)

## -11-

سلێمان پاشای والی مرد (1217 ک/ 1802 ز). عەلی پاشا بو بە والی.

والی نوێ کارەکانی بە تاڵانکردنی ئێلاتی کورد دەس پێ کرد. ئێلی بڵباس لە گەڵ کاربەدەستانی ئێران تێکچوبون. حکومەتی ئێران داوای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد بو ئەویش تەمێ یان بکات. ئێلی بڵباس بۆ لەوەڕخۆری تانزیک کۆیە و هەولێر ئەهاتن. والی ئەمەی بە هەل زانی. لەشکری کۆکردەوە بۆ سەر بڵباس. ئەورەحمان پاشای بابان و محەمەد پاشای کۆیە و عەبدولفەتاح پاشای باجەڵان لە گەڵ هێزەکەی خۆی بو. فەرمانی دا بە ئیبراهیم پاشا، ئەویش بە لەشکری بابانەوە لەلای خۆیەوە بچێ بۆ سەرکوتکردنی بڵباس. لەشکری والی بەغداد بەڕێکەوت بەرەو ئاڵتون کۆپری و لەوێوە بۆ هەولێر. ئیبراهیم پاشا نیشتە سەر بڵباس و، دەسکەوت وتاڵانی لە گەڵ خۆی برد و، لە هەولێر لە گەڵ والی یەکیان گرتەوە (1217 ک/ 1802 ز).

ئەو تاڵانییەی گەیشتە هەولێر، جگە لە وەی لە ڕێگە مردار بوبوەوە یان خورا بو: شەست هەزار سەر ئاژەڵ و، دو هەزار سەر مانگا و، زیاتر لە هەزار ئێستر بو.(13)

## -12-

والی هەر لە هەولێرەوە ئەو لەشکرەی کۆی کردبوەوە سازی دا بۆ سەر یەزیدییەکانی سنجار. بەرەو موسڵ ڕۆیشتن و، هەڵیان کوتایە سەر سنجار و ئاواییەکانی یەزیدییەکان. ئەم شەڕەیان خستبوە قاڵبی شەڕی دینیی ئیسلام و کافرەوە. نوسەری "دوحە" ڕەوتی شەڕەکە بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"دەوری یاخییەکانیان گرت و، بە توندی ئاگربارانیان کردن بە جۆرێک کە ناچار بون ماڵ و خانوەکانیان بەجێ بهێڵن و، بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆیان ڕایان کرد بۆ لوتکەی چیاکان. هێزەکە ماڵ و گوندەکانی ئاگیر کردن و، هەرچی کەلوپەل و ئازوقەیان تێ دابو بردیان، ڕەزو باخەکانیان وێران کردن...

... هێرشەکە تەنگی بە یەزیدییەکان هەڵچنی و لە هەمو لایەکەوە دەوریان دان. زۆریان بون بە نیشانەی گوللەی تفەنگچیەکان کوژران و بریندار بون. کە رێگە درا بەوخێڵانەی لە گەڵ لەشکرکێشییەکە بون: عوبێد و ئال جەبار و هیتر، پەلاماریان بدەن. ئەوانیش کەوتنە راونان و راوکردنیان. خەریک بو بە تەواوی لە ناوبچن. ئەوانەیان بە زیندویەتی مابون خۆیان بە دەستەوە دا و، گوێڕایەڵی و سەردانەواندنیان راگەیاند."(14)

ئیبراهیم لە کاتی ئەم شەڕەدا نەخۆشییەکی گرانی گرت. سەرکردایەتی لەشکری بابانی بە خالید بەگی برای سپارد. ئیبراهیم پاشایان لە ناو تەختەڕەوان دا بردەوە بۆ موسڵ. لەوێ مرد و، لە "نەبی یونس" نێژرا (1217 ک / 1802 ز".(15)

## -13-

ئیبراهیم پاشا پیاوێکی تێگەیشتوی هەڵکەوتو بوە. لە کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەت دا شارەزا بوە. رێزی لە زاناکان گرتوە. وا باوە، لە ژیانی رۆژانەدا و، لە هەڵسوکەوتی دا لە گەڵ خەڵک وەکو شازادەیەکی ئەریستۆکراتی رەفتاری کردوە. گرنگترین کاری بنیاتنانی شاری سلێمانی بو، بەڵام بە هۆی نائارامی سیاسی و، ناکۆکیی ناوخۆی میرەکانی بابانەوە، نەیتوانی لەم شارەدا کە خۆی دروستی کرد بو، بە ئاسودەیی بژی، تەنانەت جێگە گۆڕێکیشی بە نسیب نەبو. چەند کەسێ لە زانا ناسراوەکانی ئەو زەمانە ستایشیان کردوە. لەوانە: سەید عەبدوللەتیفی بەرزنجی، بە عەرەبی و، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، بە فارسی، چەند شیعرێکیان لە ستایشی دا داناوە.(16)

## پەراوێزەکان

1. ناوکر: ناوچەیەکە لە نێوان ڕووبارەکانی کومل و خازرا دا لە قەزای شێخان.
2. العزاوي: 6 / 93.
3. امین زکی. "تاریخی سلێمانی..": 97.
4. ڕەنجوری: "ئاواکردنەوەی سلێمانی و ڕوخاندنی قەڵاچوالان ساڵی 1199"
5. امین زکی. "تاریخی سلێمانی..": 89 - 90؛ خورشید: "کاروان". ژ 54. ل 150-159.
6. شێخ محەممەدی خاڵ لە سەر ژیان و بەرهەمەکانی شێخ مارف کتێبێکی بە عەرەبی لە ژێر ناوی: "الشيخ معروف النودهي البرزنجي" نوسیوە. ساڵی 1961 لە بەغداد چاپ کراوە. لەم ساڵانەی دوایـیش دا بەشێکی بەرهەمەکانی چاپ کراوە.
7. الكركوكلي: 182؛ البصري: 169.
8. الكركوكلي: 182؛ البصري: 169.
9. الكركوكلي: 184 - 187؛ البصري: 172 - 177.
10. الكركوكلي: 188 - 191؛ البصري: 179 - 183. العزاوي: 6 /103 - 106.

لە ساڵ و ڕۆژی مردنی عوسمان پاشا دا سەرچاوەکان جیاوازن. "مطالع السعود" ئەڵێ: "لە کۆتایی ڕەمەزانی 1203" دا بوە. نوسەری "دوحه" یش هەمان ساڵی نوسیوە. بەڵام ڕەنجوری ئەڵێ: "وەفاتی عوسمان پاشا لە بەغداد 9 ی جیمادی یەکەمی 1204" لە بەر ئەوەی ڕەنجوری خۆی لە ڕوداوەکان و داوودەزگای بابانەوە نزیک بوە ڕەنگە دیاریکردنەکەی ئەم لە هەمویان زیاتر جێگەی باوەڕ بێ.

11. الكركوكلي: 193؛ البصري: 201 - 202؛ العزاوي: 6 / 107 - 108.
12. الكركوكلي: 203؛ البصري: 211؛ العمري: 47؛ العزاوي: 6 /

120؛ ڕەنجوری: "دانانی ئیبراهیم پاشا لە سەر سلێمانی بە تەنیا ساڵی 1212 لە 16 ی زولقەعیدەدا"

13. الكركوكلي: 222 - 223؛ البصري: 247؛ العمري: 62.
14. الكركوكلي: 223.
15. الكركوكلي: 223؛ البصري: 247 - 248؛ العزاوي: 6 / 155.
16. یەکێ لە شیعرەکانی مەولانا خالید ئەم قەصیدەیە بە فارسی:

از پس حمد ملک ذو الجلال
بعد درود مه برج کمال
به که اوصاف شه دانگر
خامه کنم رشک ده نیشکر
ان شه دریا دل والا تبار
داور دارا سیرجم و قار
کوه شرف، کان سخا و هنر
هرکه شود از کرمش بهرەور
رتبه (ی) عالیش بدانسان شود
تاج سرش صیقل کیوان شود

کشتی تن در یم احسان او
خرد کند موجه (ی) توفان او
خصم خجل گشته (ی) شمشیر او
چرخ سراسیمه (ی) تدبیر او
خواست برد سر به دراز امر او
خورد دو سیلی زکف قهر او
اینکه بر او چشمه (ی) شمس و قمر
مانده نشان بسته ز جوزا کمر
شاهد اقبال در اغوش او
صد جم و کی غاشیه بر دوش او
عالم و رغبت ده ارباب شرع
ارض و سمائی است به اصل و به فرع
گشت ز همنامی او پیش ازین
اتش نمرود چو خلد برین
تا زده ان مهر عدالت علم
رخت برون برده ز عالم الم
باز به گنجشک دهد دانه‌را
شمع نسوزد پر پروانه‌را
الغرض از غایت امن و امان
داغ نهد بر دل نوشیروان
مهدی اگر گردد ازین باخبر
"یحسبه سنه خیر البشر"
بانی این بلده (ی) جنت نهاد
رشک ده روضه (ی) "ذات العماد"
بس که فرح می دهد ان گلستان
حافظ شیراز بلاغت نشان
بیند اگر یک نفس جای خویش
نسخ کند نعت مصلای خویش
کرد خرد ختم سخن اینچنین
"انک فیها لمن الخالدین"
معتمدی: 329 - 330.

سەرەتا و کۆتایی عەقیدەنامەکەی مەولانا خالید

هذا کتاب عقیدە نامە کردیە

بسم الله الرحمن الرحیم وبه نستعین

اگر کسی و پرسیت اسلام چیە اسلام پنج رکن هیە

لسر هموو مسلمانی عاقل بالغ بی واجبە بزانیت عملی پی

پی بکا اول اوتە اشهد بدل دزانم بیقین بزبان

ولیم باختیار ان لا اله هیچ معبودی بحق نیە

لایق بە پرستن بی الا الله الا او زاتە نە بیت

واجبە بونی بی شکە همو صفتی کمالی هیە هیچ نقص نیە

اسانە حسابیان لگل بکن سیئمین بو اوه یە گناهکارن

نادینە جهنمی خلاصیان بکن لعذاب چوارمین نواویە

دوری یە — کە جهنمیان بینە دروە لپاش اوانە پنجمین نواویە

مرتبە چاکو عالی پایە بلند پاین بدنی لبهشتی

تمت کتاب عقیدە کردیە از

مصنفات حضرت مولانا خالد

رحمه الله از دست [illegible]

[illegible]

[illegible]

[illegible]

# 7. ئەوڕەحمان پاشا: خولیای سەربەخۆیی

-1-

ئەوڕەحمان پاشا لە 1204 ک (1789 ز) ەوە حوکمڕانی بەردەوام بـو تـا 1212 ک (1797 ز). لـەو ماوەیەدا وڵات بەرەو بوژانەوە چو. ئاسایش چەسپی بو. کاروباری وڵاتی بە ڕێکوپێکی بەڕێوە نـەبرد. والـی بـە پێی نەریتی والییەکانی پێش خۆی نـەی ئەویسـت میـری بابـان مـاوەیـەکی وا درێـژ بمێنێتـەوە جێگیـر بـێ و بنەماڵەکەیان یەک بخات. ماوەیەکی درێژ بو ئیبراهیم پاشا بە گۆشەگیری دور لە کاروباری سیاسی لە بەغداد بو. والی ویستی ئاورێکی لێ بداتەوە. ناردی بەدوای ئەوڕەحمان پاشادا بۆ بەغداد. نەخۆش بو لـە نـاو تەختـەڕەوان دا هێنایان بۆ بەغداد. بەڵام لە گەڵ خۆی دیاری ی زۆری هێنابو. لەوانە چل دەس جل و، فـەرش و، پـارە. والـی ئەوڕەحمان پاشای لە بەغدادا گل دایەوە. بە بیانوی نەخۆشییەوە کە گوایـە کاروبـاری وڵاتـی پـێ بـەڕێوەنـابرێ ناوچەی بابانی لێ سەندەوە دای بە ئیبراهیم و، تەنیا کۆیە و هەریری لـە دەس دا هێشـتەوە. ئـەویش سـپێرا بـە سەلیم بەگی برای. دەسوپێوەندەکانی ئەوڕەحمان پاشا چونە کۆیە (1212 ک / 1797 ز).(1)

چوار ساڵ ئەوڕەحمان پاشا بە دەسبەسەری لە بەغداد مایەوە. سەلیم بەگ سەرپەرشتی کۆیـەی نـەکرد. لە گەڵ مستەفا بـەگی حـاکمی ڕەوانـدز بـو بـە شـەڕیـان (1216 ک / 1801 ز). یـەکێ لـە سـەرکردەکانی هێزەکەی سەلیم بەگ کوژرا.

مستەفا لای والیی بەغداد شکاتی لە سەلیم کرد. والی داوای لە سەلیم کرد لـە گـەڵ مسـتەفا پێـک بـێ. بەڵام سەلیم فرسەتی لە مستەفا بەگ هێنا نزیک ئاڵتون کۆپری کوشتی. والی لەمە تـوڕە بـو. فـەرمانی دا کـە ئیبراهیم پاشا، سەلیم بگرێ و، ڕەوانەی بەغدادی بکات. سەلیم لە پێش دا هەڵات بۆ کەرکوک و، دوایـی خـۆی چوە بەغداد.

والی خۆی لە بەهانە بو لە ئەوڕەحمان پاشا. گوایە "یاخی ئەبو لـەو فەرمانانـەی لـە بەغـدادەوە پـێ ی ئەکرا" ئەمەی کردە بیانو. کۆیە و هـەریری لـێ سـەندەوە و، دای بـە محەمـەد بـەگی مـەحمود پاشـای کۆیـە. ئەوڕەحمان و سەلیمی گرت و، بە گیراوی ڕەوانەی زیندانی حیللەی کردن (1216 ک / 1801 ز).(2)

ئەورەحمان، قینی لە محەمەد پاشا هەڵگرت. پاشان تۆڵەی ئەمەی لێ کردەوە. دوای گیرانی ئەورەحمان پاشا و سەلیم بەگ، براکانی: خالید بەگ، ئەحمەد بەگ، عەبدوڵڵا بەگ، ئامۆزاکانی بە چوار سەد سوارەوە پەنایان بۆ موسڵ برد. محەمەد پاشای ئال جەلیلی دالدای دان و، دای مەزرانەدن و، موچەی مانگانەی بۆ برینەوە. لای والی بەغدائیش "شفاعەت" ی بۆ کردن. والی لێ یان خۆش بو.(3)

**-2-**

لەم ماوەیەدا تاعون لە بەغدا بڵاو بوەوە. هەروەها وەهابییەکان هەڵیان کوتایە سەر کەربەلا و تالانیان کرد و نزیکەی هەزار کەسیان کوشت.

والی فەرمانی بۆ عەلی پاشا دەرکرد بچێ بۆ دەرکردنی وەهابییەکان و، خۆیشی لە ترسی نەخۆشی بە ماڵەوە چو بۆ خالص.

وەزیر سلێمان پاشای گەورە مرد (1217 ک / 1802 ز). نزیکەی 24 ساڵ حوکمی بەغدادی کرد بو. وەزیر 3 کوڕ و 4 کچی هەبو. کوڕەکانی: سەعید، صالح، صادق. بچوک بون. کچەکانیان درا بون بە شو: یەکێکیان هاوسەری عەلی پاشای کەهیە و، ئەوی تریان ژنی سەلیم ئاغای موتەسەڕیفی بەسرا بو. دو کچەکەی تری: یەکێکیان مارە بڕی داود ئاغا (دوایی داود پاشا) و، ئەوی تریان مارەبڕی نەصیف ئاغا بو. وەزیر بەر لە مردنی وەسیەتی کرد عەلی پاشا، کە یەکێ لە کۆیلە ئازادکراوەکانی خۆی و زاوایشی بو، جێگەی بگرێتەوە و، داوای لەوانی تر کرد هەمویان گوێڕایەڵی و پشتگیری بکەن. ئاژاوەیەکی گەورە دژی عەلی پاشا دەستی پێ کرد. سەرۆکی یەنیچەری و سەلیم ئاغا لە پشتی ئاژاوەکەوە بون. بۆ ئەوەی ئاژاوەکە بخەوێنن، ویستیان سەعید بەگی کوڕی سلێمان پاشای گەورە لە جێگەی والی دابنێن. سەلیم بۆ بە هێزکردنی خۆی، ناردی ئەورەحمان پاشا و سەلیم بەگی برایان لە حلە هێنایەوە بەغداد و ئازادی کردن. ئاژاوە درێژەی کێشا. سەرەنجام عەلی پاشا ئاژاوەکەی دامرکاندەوە. ئەورەحمان پاشا هەڵات بەڵام لە ئەعزەمییە گیرایەوە. سەلیم بەگی برای دەرباز بو بۆ موصڵ. ئەورەحمان پاشا خەریک بو لەم هەرایەدا سەری تێ دا بچێ. محەمەد پاشای ئال جەلیلی و، چەند پیاوماقوڵێکی والی بۆی تێکەوتن لە مردن ڕزگاریان کردن. عەلی پاشا لە ئەستەمولەوە دانرا بە وەزیری بەغداد (1217 ک / 1802 ز).(14)

ئەورەحمان پاشا لە بەغداد نیشتە جێ بو. وەزیر ئەیویست لە خۆی نزیک بخاتەوە.

**-3-**

لەو لەشکرکێشییەدا کە عەلی پاشا بۆ بڵباس و یەزیدییەکانی سنجاری کرد، داوای لە ئەورەحمان پاشا کرد ئەویش بەشدار بێ. ئەویش ناردی بە شوێن سەلیم بەگ و براکانی دا، کە لە کاتی پشێوییەکەی بەغداد دا رایان کرد بوە موسڵ و ئال جەلیلی دالدەی دابون، هاتن و هەمویان لە بەغدادا کۆبونەوە.

والی، ئەورەحمان پاشا و، محەمەد پاشای تەیمور پاشای کۆیە و، عەبدولفەتاح پاشای باجەلانی خستە پاڵ خۆی. فەرمانیشی دا بو، ئیبراهیم پاشای بابانیش، لە لای خۆیەوە، پەلاماری بڵباس بدا. بڵباس سەرکوت و تالان کرا. لەشکر ڕوی کردە سنجار. لە بەختی ئەورەحمان پاشا دا، ئیبراهیم پاشا لە موسڵ دا مرد و، بەمەش ملۆزمێکی بەهێزی لە کۆڵ بوەبوە (1217 ک / 1802 ز).

عەلی پاشا ویستی خالید پاشای ئەحمەد پاشا لە جێگەی ئیبراهیم پاشای برایدا دابنێ. گەورەپیاوەکانی بابان، ئەورەحمان پاشایان پەسەند کرد. والی لە سەر داخوازی ئەوان ئەورەحمان پاشای دانایەوە بە حاکمی بابان (1218 ک /1803 ز). (5)

## -4-

وەهابیەکان ڕووەو بەصرا کشا بوون. دەوڵەتی عوسمانییان خست بووە غایلەوە. سوڵتان فەرمانی دەرکرد بۆ والیی بەغداد، تەمێیان بکات. ئەویش کەوتە خۆی و بە لەشکرەوە ڕووی کردە حیللە. ئەورەحمان پاشای بابان و، محەمەد پاشای کۆیەش بانگ کران. دوای چەند ڕۆژێ پاشای بابان گەیشتە بارەگای وەزیر.

وەزیر سلێمان بەگی کەهیەی خوشکەزای و، ئەورەحمان پاشای ناردە سەر بەصرا. لەشکرەکە "زوبێر" ی بڕی و ڕووی کردە "ئەحسا" و، بە چەند پەلامارێ وەهابییەکانیان دەرپەڕاند و، زۆریان لێ کوشتن و، بە سەریان دا سەرکەوتن. لەم لەشکرکێشییەدا بە هۆی گەرمای بیابانەوە، سەدان کەسی بابان مردن. ئەورەحمان پاشا هاتەوە حیللە.

لەم هەلەدا شێخی خەزاعیل سەرکێشی کرد بو. وەزیر خۆی و، ئەورەحمان پاشا و، محەمەد پاشای کۆیەی بردنە سەر. دوای سەرکەوتن گەڕانەوە. وەزیر ئەورەحمان پاشا و محەمەد پاشای کۆیەی لە حیللە دا هێشتەوە تا ماوەیەک ئاسایش و ئارامیی ناوچەکە ڕابگرن و ئەوجا بگەڕێنەوە کوردستان. خۆیشی (22 ی زیلحەججەی 1219 ک / 20 ی مارتی 1805 ز) گەڕایەوە بەغداد. (6)

دوای مانگ و نیوێ، خالید کەهیەی سەرۆکی ئاغاکانی والی لە حیللەوەگەڕایەوە بەغداد. دوای 8 ڕۆژی تر. ئەورەحمان پاشا و محەممەد پاشای کۆیەش ئیزنی گەڕانەوەیان پێ درا. چەند ڕۆژێکی کەمی خایاند هەواڵ گەیشتە والی کە کۆکردنەوەی هێزەکانی خێڵی عوبێد.

والی، نیسان داوای لە ئەورەحمان پاشا و محەمەد پاشا کرد هێزەکانیان کۆ بکەنەوە و، بە ئەورەحمانی ڕاگەیاند لە کەرکوک دا چاوەڕێ بێ و، داوای لە محەمەدیش کرد بە هێزەکەیەوە بکاتە لای ئەورەحمان و، پێکەوە ڕووەو خابور بڕۆن.

وەکو نوسەری "دوحە" باس ئەکا: وەزیر ڕقی لە هەردوکیان بوە، چونکە "یەکەمیان بە هەمو ڕێگەیەک لە پایەی وەزیری کەم ئەکردەوە... و دوەمیشیان لەو سنورەی بۆی دیاری کرا بو دەرچو بو... وەزیر ئەیویست بە هەرچی چۆنێ بێ لە کۆڵ خۆیانی بکاتەوە" (7)

لە جێگەیەک بە ناوی "بەت" (8) هوە هەردوکیان بە یەک گەیشتن. ئەورەحمان ڕقی کۆنی لە محەممەد هەڵگرت بو. هەلی بە دەرفەت زانی و کوشتی. زۆریشیی لە هێزەکانی کوشت و دیل و پەرتەوازە کرد. والییشی، بە داوای لێبوردنەوە، ئاگادار کرد و، چو بۆ کەرکوک. (9) والی لەو کاتەدا نەیئەتوانی شتێ بەرامبەری بکا. هەندێ گلەیی لێ کرد و، ئامۆژگاری کرد جارێکی تر شتی وەها دوبارە نەکاتەوە. بۆ ئەوەی زیاتریش دڵنیای بکا مولکی کوژراوی بە بکوژ بەخشی. کۆیە و هەریری پێ سپارد و فەرمانی بۆ نارد.

## -5-

موتەسەریفی کەرکوک، وەزیری ئاگادارکرد کە گوایە هێزەکەی ئەورەحمان پاشا، لە ڕێگەی گەڕانەوەی دا. زیانی لە کشتوکاڵی خەڵکی داوە و، تاڵان و بڕۆی کردوە و، خەڵکی کوشتوە. لە لایەکی تریشەوە، وەزیر گومانی پەیدا کرد بو کە خالید ئاغای کەهیە و عەبدوڵڵا ئاغای "موتەسەللیم" ی پێشوی بەصرا، بە نهێنی لە گەڵ ئەورەحمان پاشا ڕێک کەوت بن و دەنگوباسی بۆ بنێرن. هەروەها نوسەری دیوانی وەزیر، محەمەد فەیزی لوتفوڵلایشی لەم باسەدا تاوانبار کرد. وەزیر، لە پێش دا ئەو دوانەی گرت و، بەندی کردن. سێیەمیشی لابرد. ئینجا کەوتە هەڵگێڕانەوەی بابانەکان. بابانی بڕییەوە بۆ خالید بەگی کوڕی ئەحمەد پاشا، کە چەند مانگێ بو ڕەوانەی نامێدی کرا بو بۆ یارمەتیدانی قوباد پاشا. کۆیە و هەریریشی بڕییەوە بۆ سلێمان بەگی کوڕی ئیبراهیم پاشا و فەرمانی پاشایەتی و خەلعەتی بۆ ناردن.

وەزیر لە مانەوەی خالید کەهیە و عەبدولڵا ئاغای بەندکراو ئەسڵەمییەوە. یەکەمیانی کوشت و، دوەمیشیانی بە بەندیی نەفی کرد بۆ بەصرا. هێنجا لە 5 ی رەبیعی یەکەمی 1220 ک (4 ی حوزەیرانی 1805ز) دا رووی کردە کوردستان بۆ پەلاماردانی ئەورەحمان کە زانی والی لە کۆڵی نابێتەوە، دەستپێشخەری کرد، ویستی بە خۆشیی رازی بکا، کەڵکی نەبو. ناچار کەوتە خۆی. لە لایەکەوە شێخی عوبێد: زامن ئال حەمەد و، شێخی غرێر: حەمەد ئال حەسەنی بانگ کرد بۆ هاوکاری و، لە قەرەحەسەن دا جێگیری کردن. لە لایەکی ترەوە، بۆ بەرگرتن لە عبدولفەتاح پاشای درنە و باجەڵان و زەهاو، سەلیم بەگی برای بە 5 سەد سوارەوە ناردە سەر و، راوی نا و ناوچەکەی گرت. خۆیشی بۆ بەرهەڵستی خالید بەگی ئامۆزای ساز دا، کە لە موسڵ و هەولێر دا لەشکری خڕ کردەوە.

والی موسڵ زیاتر لە هەزار کەسی بۆ وەزیر نارد. حاجی قاسم ئاغای "موتەسەللیم" ی هەولێریش لە گەڵ خالید بەگی بابان هەزار کەسێکیان کۆکردەوە.

ئەم هێزانە یەکیان گرتەوە و بەرەو ئاڵتون کۆپری کشان. ئەورەحمان پاشا وەڵامی بۆ عەبدوڵڵا بەگی قەرەمستەفازادەی سەرکردەی هێزەکەی لە موسڵ نارد لە ئاڵتون کۆپری نەپەڕێتەوە. ئەو گوێی نەدایە و خەریکی هەڵدانی خێوەت و، رێکخستنی خێوەتگا بو. ئەورەحمان پاشا هێزێکی ناردە سەریان. خالید بەگ و حاجی قاسم ئاغا بە زەحمەت لە مردن دەرباز بون. زۆری هێزەکە خۆی هاویشتە ئاوی "زێ"وە.

لە هێزەکەی موسڵ 50 کەس لە سەرکردەکانیان و 200 سەرباز و 200 یەنیچەری لە ئاودا خنکان. لە هێزەکەی هەولێریش 100 کەس خنکا و 100 کەسیش بە زیندویەتی بە دیل گیران و روت کرانەوە. لەشکری بابانیش 250 خێوەت و ژمارەیەکی زۆر چەک و وڵاخ و ئازوقەی دەس کەوت (10 ی رەبیعی دوەمی 1220 ک /9 ی حوزەیرانی 1805 ز)(10).

عەزیز بەگی برای خالید بەگ، خۆی لەم شەڕە دەرباز کرد. لە رێگەی دوزخورماتو و بەیاتەوە خۆی گەیاندە وەزیر و رەوتی شەڕەکەی بۆگێڕایەوە.

ئەورەحمان پاشا کشایەوە قەرەحەسەن. وەزیر لەشکرکەی گەیشتە کەرکوک و ئەورەحمان ئاگادار نەبو. ناچار کشایەوە دواوە بەرەو دەربەندی بازیان. شێخی عوبێد و شێخی غرێر هەڵاتن و رویان کردە سنجار بەرەو خابور و لەوێوە بۆ شامییە. بەڵام لە رێگەدا کەوتنە بۆسەی شەرکەرانی ئێلی شەممەرەوە کوژران. ئەورەحمان پاشا لە دەربەندی بازیان دا سەنگەری قایم کرد و، دەمی دەربەندی گرت. لەشکری وەزیر گەیشتە شیوەسور. خالید و سلێمان و دەستوپێوەندەکانیشیان لە گەڵ بو. وەزیر بۆ رێگەیەکی ئاسان ئەگەڕا کە پشت لە هێزەکانی بابان بگرێ. خالید و سلێمان رێگەیەکیان دۆزییەوە ئەورەحمان پاشا نەیگرت بو. پشتی هێزەکانی ئەورەحمان پاشا گیرا. شەڕێکی قورس قەوما 300 کەس لە لەشکری بابان کوژرا. ئەورەحمان پاشا شکا. عەلی پاشای وەزیر فەرمانی دا سەری دیل و کوژراوەکانی بابان ببڕن. 6 سنوقی لێ پڕ کرد و بە دیاری ناردی بۆ دەوڵەت. ئەورەحمان پاشا ناچار بو رو بکاتە وڵاتی ئەردەڵان (1220 ک / 1805 ز). بۆ بنکەی میرایەتی خۆیان. خالید بۆ سلێمانی و سلێمان بۆ کۆیە. (11)

**-6-**

ئەورەحمان پاشا پەنای بۆ ئەمانوڵڵاخانی والی ئەردەڵان برد.(12) لە سەقز نیشتەجێ کرا. وەزیر دەستی بەسەر سلێمانی دا گرت. ئەمانوڵڵاخانی ئەردەڵان کێشەی ئەورەحمان پاشای گەیاندە فەتحعەلی شای قاجار. رۆیشتنی ئەورحمان بۆ ئێران تەنگوچەڵەمەیەکی دیپلۆماسی لە پەیوەندییەکانی هەردو دەوڵەت دا دروست کرد. والیی بەغداد ئەحمەد چەلەبی لە گفتوگۆکانی دا لە گەڵ کاربەدەستانی ئێران بە ئەنجامی ویستراوی نەگەیشت..

فەتحعەلی شا نامەیەکی ئۆستانەی بۆ والیی بەغداد نوسی بە میرزا محەمەد صادق خانی وەقائیع نیگاردا ناردی (1220 ک / 1805 ز). لە نامەکەی دا داوای لە والی کردبو لە ئەورەحمان پاشا ببورێ و، بیگێڕێتەوە سەر جێگە و ڕێگەی خۆی. (13)

والی گوێی نەدایە تکای شا. سلێمان بەگی فەخری بۆ دوبارەکردنەوەی خواستەکانی ناردەوە بۆ دەرباری شا. لە کاتێک دا سلێمان بەگ خەریکی گفتوگۆ بو لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی ئەورەحمان پاشا گەیشتە تاران و سەردانی فەتحعەلیشای کرد و، داینایەوە بە حاکمی بابان. فەتحعەلی شا ڕێزی زۆری لە ئەورەحمان پاشا گرت. نیگاری ئەورەحمان پاشا لە ریزی پیاوەگەورەکانی ئەو سەردەمەدا لە سەر دیواری "کاخی نیگارستان" لە تاران کێشراوە. شا فەرمانی دا بە محەمەد عەلی میرزا، کە ئەورەحمان پاشا بباتەوە سلێمانی.(14)

عەلی پاشا گوێی نەدایە داواکانی شا. لە باتی ئەوە خۆی بۆ هێرشێکی گەورە ئامادە کرد. محەمەد ئەمین ئاغا، یەکێ لە سەرکردەکانی، لە گەڵ چەند تیپ سوارە نارد بۆ یارمەتی خالید پاشا. خۆیشی لە بەغداوە بەرێ کەوت لە سیروان پەڕییەوە گەیشتە شارەبان. خالید پاشای حاکمی بابان و، عەبدولفەتاح پاشای موتەسەڕیفی درنە و باجەلان و، حەسەن خانی فەیلی گەیشتنە لای. ئەمانە ڕەئیان وابو: پیش ئەوەی هەنگاو بنێن پرس بە بابی عالی بکرێ. بەڵام وەزیر پێی لە سەر ڕەئی خۆی داگرت.

وەزیر، "زەهاو" ی کرد بە بنکەی خۆی. بەرایی هێزەکانی گەیشتە "پای تاق" و"ماهیدەشت". کەوتنە ڕاووڕوت و تاڵان. خەڵکی کرماشان ترسان هەندێکیان چون بۆ هەمەدان. ئەم هەواڵانە گەیشتەوە شا. شا فەرمانی دا بە محەمەد عەلی میرزا پارێزگاری سنور بکا و، ئەگەر هاتنە ناو ئەرزی ئێرانەوە دەریان بکەن. هەروەها فەرمانی دا بە فەرەجوڵلاخان بچێ بۆ یارمەتی دانی ئەمانوڵلاخان و ئەورەحمان پاشا.

وەزیر هێزێکی 3 تا 4 هەزار کەسیی لە چەکدارەکانی کۆیە و هەریر و کەرکوک بە سەرکردایەتی سلێمان کەهیە نارد بۆ یارمەتی خالید پاشا.

بابی عالی فەرمانی دابو بە عەلی پاشا ڕێزی پەیماننامە کۆنەکان بگرێ و، هیچ لەشکرکێشییەک بۆ سەر ئێران نەکا. کاتێ ئەم فەرمانە هات ئۆردوی والی سنوریان بەزاند بو.

سلێمان کەهیە کابرایەکی هەڵەشە بو. لە پای تاقەوە بەرەو شارەزور کشا بو.

لە گەڵ هێزەکەی خالید یەکی گرت بووەوە. خالید ویست بوی قانیعی بکا ماوەیەک پشو بە لەشکرەکەی بدا بۆ حەسانەوە. گوێی لێ نەگرت بو. لە سنور تێپەڕی بو گەیشت بوە زرێبار. لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەم دا ڕێگەیەکی شاخاوی سەختی بڕی بو. لەشکرەکەی و وڵاخەکانیان ماندو بون. ئەورەحمان پاشا نەیهێشت پشو بدەن پەلاماری دان. لە ماوەیەکی زۆر کورت دا. زیاتر لە هەزار کەسی لێ کوشتن. زۆریشیان گیران لە وانە سلێمان کەهیە. خالید پاشا بە زەحمەت دەرباز بو. ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ ئەورەحمان پاشا (جیمادی دوەمی 1221 ک / 1806 ز).

کاتێ ئەم هەواڵە بە وەزیر گەیشت خۆی لە شێروانە بو. محەمەد عەلی میرزا ئەم دەستدرێژییەی ڕۆمی کرد بە بیانوی ڕاووڕوت. هێزێکی نارد سنوریان بەزاند هەتا قزراباتیان تاڵان کرد و گەڕانەوە ئێران (15)

ئێرانیەکان، محەمەد عەلی میرزا لە لایەک و، ئەمانوڵلاخان لە لایەکی ترەوە ئەم سەرکەوتنە بە هی خۆیان ئەزانن. بەڵام وەکو ریچ ئەیگێڕێتەوە: هێزەکەی ئێران نەکەوتونەتە شەڕەوە. ئەوەی شەڕەکەی کردوە و هێزەکەی ڕۆمی شکاندوە، ئەورەحمان پاشا و ئەو هێزەی بابان بوە کە لە گەڵی بون. لەم شەڕەدا سەلیم بەگی برای ئەورەحمان پاشا کوژرا. سەلیم بەگ لە فەرماندە ئازاکانی ئەورەحمان پاشا بو. (16)

-7-

میرزا شەفیع صەدری ئەعزەمی ئێران لە نامەیەکی درێژدا بۆ ئیبراهیم پاشای صەدری ئەعزەمی عوسمانی نوسی بوی کە رەفتاری خراپی عەلی پاشای والیی بەغداد وای لە ئەورەحمان پاشای بابان و ئێلەکانی عەرەب کردوە بێزار بن و رو بکەنە ئێران. کاربەدەستانی دەوڵەت ئامۆژگارییان کردوە کە ئەوانە ئاشت بکاتەوە بەڵام لە بەر نەزانی بە قسەی نەکردون. خۆی بە هێزێکی عەرەب و وەهابییەوە روی کردە کرند لە کرماشان و، سلێمان کەهیە و خالید پاشای لە

سلێمانی و شارەزوزەوە نارده کوردستان. شازادە محەمەد عەلی میرزا... ئەگەر شارەزایەک بنێرن بۆ لێکۆڵینەوە ئەزانن لاشەی کوژراوەکان لە ئەرزی کام مەملەکەتدا کەوتوە و کام یەک لەم دو سپایە پەی ناوەتە سنوری ئەوی ترەوە. (17)

والی کشایەوە بەغداد. شێخ جەعفەری خەزاعی، کە لە نەجەف دانەنیشت. بۆ شەفاعەت ناردە لای محەمەد عەلی میرزا و لە وێوە چو بۆ تاران. یوسف زیای والیی ئەرزروم، فەیزی مەحمود ئەفەندی بۆ لای عەبباس میرزا نارد بو شەفاعەت بۆ سلێمان کەهیە بکەن. فەتحعەلی شا، سلێمان کەهیەی ئازاد کرد و لە گەڵ میرزا صادق خانی وەقائیع نیگاردا ناردییەوە بۆ بەغداد. (18)

ئەم شەڕە لە کاتێک دا روی دا فەرەنسە ئەیویست هاوپەیمانێتییەکی دوقوڵی لە نێوان عەجەم و رۆم دا رێک بخات. ناپلیۆن بۆ ئەو مەبەستە دەستەیەکی نوێنەرایەتی تێکەڵاوی لە گەورەئەفسەران و شارەزایان، بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ گاردان، نارد بو بۆ ئێران.

شێخولئیسلام ئاقا ئیبراهیم، کە بە سەفارەت نێردرا بو بۆ ئەستەموڵ لە گەڵ محەممەد رەفیع ئەفەندی دا گەڕایەوە بۆ باسی یەککرتنی 3 قوڵی. رەفیع لە گفتوگۆکانی دا لە گەڵ عەبباس میرزا و میرزا عیسای قایمقام بە هیچ ئەنجامێکی سەرکەوتوانە نەگەیشت لە بەرئەوە گەڕایەوە ئەستەموڵ (1222 ک /1807 ز). (19)

-8-

دوای ئەم شەڕە ئەورەحمان پاشا گەڕایەوە سلێمانی. والی بە ناچاری خالید پاشای لابرد و ئەورەحمان پاشای دانایەوە بە حاکمی بابان. جەنەراڵ گاردان لە یەکێ لە راپۆرتەکانی دا بۆ شامپانی، وەزیری دەرەوەی ناپلیۆن، لەم بارەیەوە هەڵسەنگاندنی خۆی نوسیوە: "لەم دواییەدا راستیی ئەم هەواڵەم پێ گەیشتوە کە خەلعەتی پاشایەتی شارەزوریان بە ئەورەحمان پاشا داوە، لە گەڵ هەمو ئەوەش دا وا دەرئەکەوێ ئاشتی نێوان سلێمان پاشا و ئەم سەرکردەیەی کورد، دیسان شتێکی رواڵەت بێ." (20)

-9-

تاقمێک لە کاربەدەستەکانی بەغداد پیلانێکیان لە عەلی پاشای وەزیر گێڕا. بە خەنجەر کوشتیان (1222 ک / 1807 ز). سلێمان کەهیە بە مۆقەت بو بە قایمقام. بابی عالی یوسف زیا پاشا، صەدری پێشو و والیی ئەرزرۆمی، دیاری

کرد ببێ بە وەزیر لە بەغدا. والی تازە پێش ئەوەی بگاتە بەغداد، خەلعەت و بیورلدی بۆ ئەورەحمان پاشا ناردوە. پێ ئەچێ ئەورەحمان پاشا لەو کاتەدا نومێدی بە کاربەدەستانی عوسمانی نەبوبێ و، زۆرتر بە هیوای پشتیوانی ئێران بوبێ.

ئەمەی کردوە بە هۆیەکی تری خۆنزیکخستنەوە و باوەڕ بە دەستهێنانی ئێران.

بیورلدی و خەلعەتەکەی ناردەوە بۆ شازادە محەممەد عەلی میـرزا. لـە نامەکـەی دا نوسـیویتی: "... بـە پێی فەرمانی شاهنشاهی ئەگەر دوژمنێ بۆ سەرکار لە لایەکەوە

پەیدا بێ، دوژمنی ئـەو دوژمنـە ئـەبم... والـی ئـەرزڕۆم بـە پیـاوێکی مـاقوڵ دا بیورلـدی و کـورکی ناردوە... هیچ بایەخێک بە خەلعەت وبیورلدی باسکراو نەدراوە... هیچ ڕێزێکی ئێلچییەکەش نـەگیراوە... بـۆ ئەوەی بیورلدی بکەوێتە بەرچاوی کاربەدەسـتانی حکومـەتـی شاهنسـاهی بیورلـدی لـە ئێلچـی وەرگیـراوە و نێردراوە بۆ دارولسەلتەنەی تاران و تا هاتنەوەی وەڵام ئێلچی لێرە گل دراوەتەوە..."(21)

مەمالیک نەیان هێشت یوسف زیا کاروبار بگرێتە دەست. ئەوڕەحمان پاشا ویستی کەڵک لەم پشێوییە وەربگرێ کۆیە وهەریر و کفری بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بەڵام سەرکەوتو نەبو. (22)

## -10-

سلێمان پاشا و ئەوڕەحمان پاشا هەر زو ناکۆکییان کەوتە بەینەوە. سلێمان ڕقی تێشکانی زرێبـاری لـە دڵ دا بو. ئێران کە هەردوکیانی بە "دەسنێژی خۆی ئـەزانی، چونکـە ئـەوڕەحمان پاشـا بـە یارمـەتی ئـەمان حوکمڕانیی بابانی کوت بوەوە دەس و، سلێمانیش بە دیلی کەوت بوە دەس ئێران و، ئازادیان کـرد بـو. پـێ ئەچێ ئێران هەوڵێکی دابێ بۆ ڕێک خستنیان. گاردان لە نامەیەکی دا بۆ وەزیری دەرەوەی

فەرەنسا، لـەم بـارەیـەوە نوسـیویتی: "شـازادە عـەبباس میـرزا... فـەرمانی داوە هـەمو هێزەکـانی لـە لەشکرگاکەی خۆی دا لە خـۆی کۆببنـەوە. فەرەجوڵڵاخانیشـی بـە سـوار نیزامەکانیـەوە ئامـادە کـردوە. ئـەم سـەرتیپە... دوای ئـەوەی چـوە مناوچـە سـنورییەکانی کوردسـتان ئـەیتـوانی بـو لـەوێ بمێنێتـەوە و، ئـەو ناکۆکییانەی لە کۆنەوە لە نێوان سلێمان پاشـا و ئـەوڕەحمان پاشـا دا بـوە لابـەلا بکـا. ولـە قـەڵاچوالانـەوە گەڕاوەتەوە لای شازادە..."(23)

بە ڕواڵەت وا دەرئەکەوێ کە دەوری ئەوڕەحمان پاشا لە تیژکردنی ناکۆکییەکانی ئێران و عوسـمانی دا کاریگەر بوبێ. بەڵام ڕاستییەکەی دەوری ئەو لاوەکی بوە و، ناکۆکییەکانی ئەم دوهێزە زۆر لەوە قووڵتر بـوە.. ئێران ئامانجی تایبەتی خۆی هەبوە لە کوردستان و لە عێراق دا. گاردان لە نامەیەکی تـردا نوسـیویتی: "پایـە بەرز گەرەکێتی پیوەندی دوستانەی خۆی لە گەڵ بابی عالی دابمەزرێنێ. بۆ ئەوەی پێوەندی لە گـەڵ فەرەنسـا، لە ڕێگای ئەستەموڵەوە، ئاسان بکا. بەڵام بە

هیچ جۆرێ ئەو ڕەفارەی ئەگۆڕیوە کە بەرامبەر ولایەتە تورکییەکانی دراوسـێی ئێـران هـەیبـو. وەکـو جاران دەس وەرئاتە ئەو ناکۆکییانەوە کە لەنێوان پاشای بەغداد و سلێمانی دا هەیـە. لەشـکرییانی ئێـران لـە جوڵان دان بەرەو

کوردستان. ئەتوانرێ پێش بینی بکرێ، سـەرەڕای هـەمو ئـەو دڵنیاکردنـە گرنەبڕانـەی وەزیـر دەری بڕیون، ئەچنە ناو قەڵەمڕەوی عوسمانییەوە. پایە بەرز دەستی هەڵ ئەگرتوە لە داواکانی سەبارەت بـە عێراقـی عەرەب و قەڵەمڕەوی بەغداد و بەصرا. یەک لە دوای یەک دان بەوەدا ئەنێ کە چاوەڕوانی هـەلی لـە بـارە بـۆ ئەوەی بیانگرێ. بەڵام دیارە پێویستە سلێمان پاشا بە تەواوەتی پێڕەوی ئێران بکا، ئەگەر چی دیار نیە کە پایە بەرز دەستی هەبوبێ لە داناني ئەو دا بەحوکمڕنی بەغدا. لای وایە لەم کارەدا یارمەتی ئەوی داوە، کە سلێمان لە شەڕی عەلی پاشا لە گەڵ ئەوڕەحمان پاشا دا بە دیل گیرا، ئەو ئازادی کرد. پاشای بەغداد ڕیعایەتی ئینگلستان و ئێران ئەکا: ڕیعایەتی ئینگلستان ئەکا بە هۆی بەصرا و بازرگانیی لەوێوە لە گەڵ هێند. ڕیعایەتی ئێـرانیش ئەکا چونکە ئاگاداری ویستەکانی فەتح عەلی شایە و، ترسی هەیە لە دەستێوەردانی ئەو هەمیشـە بـە قـەزانجی ئەوڕەحمانی یاخی. بەڵام ئەفرەتێکی توندی بەرامبەر هەرشتێ هەیە کە ناوی ئێرانیی پێوە بێ."(24)

## -11-

سلێمان کەهیە کە بە سلێمان پاشای بچوک (کوچک سلێمان) ناسراوە بو بە وەزیر. بناغەی دۆستایەتی لە گەڵ شای ئێران دامەزراند بو. ئەورەحمان پاشاش گوێی نە ئەدایە وەزیری بەغداد بە سەربەخۆیی کاری ئەکرد. وەزیر لەشکری ساز دا بۆ سەری. سلێمان تێشکانەکەی زرێباری لە چاوی خالید پاشا ئەناسی. خالیدی فەرامۆش کرد بو. بەڵام محەمەد پاشای کوڕی خالیدپاشا و سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشای کردبو بە هاودەنگی خۆی. ئەورەحمان پاشا بە خۆ کەوت. چوار تا پێنج هەزار کەسی ئامادەکرد. ئەم جارەش لە دەربەندی بازیان دامەزرا. (25)

والی، وەکو جاری پێشو، ئەمیش ویستی پشت لە هێزەکانی ئەورەحمان پاشا بگرێ. لە لای راستی دەربەندەوە، تفەنگچییەکانی کەرکوک و هەولێر و هەندێ بابان بە سەرکردایەتی محەمەد بەگی کەهیەی وەزیر و. چاوساغی محەمەد بەگی کوڕی خالید پاشا و. لە لای چەپەوە سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشا، بە شەو لە هەردو لاوە سەرکەوتن و شوێنەکانی خۆیان گرت. کە رۆژ بوەوە قۆڵەکانی سەر شاخ لە لای خۆیانەوە و. وەزیریش روبەرو لە دەربەندەوە هێرشیان

کردە سەر سەنگەرەکانی لەشکری بابان. ئەورەحمان پاشا بەرگەی نەگرت. بەشکاوی کشایەوە. محەمەد و سلێمان تا قزلّجە بە دوی کەوتن (جیمادی یەکەمی 1223). وەزیر سلێمان پاشای بە حاکمی بابان و. محەمەد بەگی بە موتەسەریفی کۆیە دانا. خەلعەتی لەبەر کردن. (26)

خالید پاشا لە مێژ بو فەرامۆش کرا بو بێ موچە و بێ کار لە کەرکوک دانیشت بو. پێنج تا شەش سەد سواری کۆکردەوە لە بەینی کفری و قەرەتەپەوە چو بۆ زەهاو و لە وێوە چو بۆ لای ئەورەحمان پاشا بۆ مەریوان. وەزیر بۆ ئەوەی کێشەکە گەورە نەبی سلێمان پاشای لە سلێمانی کێشایەوە بەغداد. مەندەلی و خانەقین و عەلیاوای پێ بەخشی. موڵکی بابانی دایەوە بە ئەورەحمان پاشا (1223). (27)

## -12-

سکاڵاو گازاندە لە سلێمان پاشای وەزیر زۆر گەیشت بوە بابی عالی. دەستدرێژی کردبوە سەر سنوری هەندێ لە ولایەتەکانی دراوسێی. پێش ئەوەی ببێ بە وەزیر بەڵێنی دابو قەرزەکانی والییەکانی پێش خۆی بداتەوە. بابی عالی ئەیویست کۆتایی بە دەسەڵاتی مەمالیک بهێنێ و. بەغداد راستەوخۆ بخاتەوە

ژێر دەستی ئەستەمولّ. لە ئەستەمولّەوە حالەت محەمەد سەعید، سەرۆکی دیوانی هومایونی، هاتە بەغداد. دەسەڵاتی تەواوی گۆڕینی وەزیر و دانانی وەزیرێکی تازەی درا بویە.

تەنانەت فەرمانی وەزارەتی هێنا بو تەنیا جێگەی ناوەکەی بە بۆشی هێڵرابوەوە، بۆ ئەوەی خۆی کێ ی بەپەسەند زانی بینوسێ.

حالەت داوای لە سلێمان کرد: یان بە رێک و پێکی دەرامەتی دەوڵەت بنێرێ، یان واز لە پایەی وەزیری بهێنێ. (28)

حالەت ماوەیەک لە بەغداد مایەوە هیچی پێ نەکرا. نەیتوانی خواستەکانی دەوڵەت بهێنێتە دی. نەقەرزەکانی پێ وەرگیرایەوە و نە وەزیریشی پێ لابرا. لەبەر دەسەڵاتی زۆری وەزیر نەیوێرا نیازی راستەقینەی خۆی بدرکێنێ. بە دەستی بەتاڵ بەغدادی بە جێ هێشت و چوە موسڵ چاوەڕوانی رەنی دەوڵەت بێ. بەڵام حالەت کۆڵی نەدا. بۆ ئەو مەبەستە، پێوەندی لە گەڵ والی ی موسڵ کرد. والی موسڵ رەزامەندی بۆ بە جێهێنانی فەرمانەکانی دەربڕی. هەروەها پێوەندی لەگەڵ ئەورەحمان پاشای بابان کرد، ئەویش رەزامەندی دەربڕی.

هەردوکیان ڕقیان لە وەزیر بو.

حالەت، مەحمود پاشای والیی موسڵ و شێخی تەی و میری شەمامک سوارەکان لە گەڵ خۆی هێناو لە کەرکوک کۆبونەوە. ئەورەحمان پاشا زیاتر لە 10 هەزار سوارو پیادەی لە گەڵ خۆی هێنا بو. لە ناو ئەوانەدا سوارەی جاف بە سەرکردایەتی قادر بەگ و کەیخوسرەو بەگ. ئێلەکانی عوبێد و غرێر و بەیاتیشیان گەیشتن. سلێمان پاشا خۆی ئامادە کرد بۆ بەرگری. (29)

حالەت بە نهێنی خەڵکی بەغداد و کاربەدەست و دەستوپێوەندەکانی وەزیری ئاگادار کرد کە فەرمانی لێخرانی دەرچوە. ئەمەش پشێوی خستە ناو ڕیزەکانیانەوە. لە ناو خۆیان دا هەندێ وردە شەڕ قەوما. هەندێ لە هێزەکانی وەزیر لە وەزیر تەکینەوە.

هێزەکەی حالەت بەرەو بەغدا کشا. وەزیر بەرەنگاریی کردن. شەڕێکی قورس ڕوی دا. لە بەلادا خستنی شەڕەکەدا لەشکری ئەورەحمان پاشا دەورێکی کاریگەری هەبو. لە پەلاماردانی شەوێکیان دا نزیکەی 80 کەس لە سوارەکانی کوژران، یەکێکیان عەبدولعەزیز بەگی کوڕی ئەحمەد پاشا بو، کە ئامۆزای ئەورەحمان پاشا و زاواشی بو. هەروەها 150 کەسی لێ بریندار بو. سلێمان پاشا هەڵات بۆ ناو ئێلەکانی عەرەب. کابرایەکی عەرەبی خێڵەکی بە هەلی زانی کوشتی و کەللەکەی هێنایەوە بۆ ئەورەحمان پاشا (1225). لەو ڕۆژانەدا یەکەمین دەسەڵاتداری بەغدا ئەورەحمان پاشا بو. (30)

بەغدا بێ وەزیر بو.

## -13-

هێشتا ململانێ ی دەسەڵات لە بەغداد بە لادا نەکەوت بو. دو کەس لەو ئێرانییانەی سەروکاریان لە گەڵ کاروباری عێراق هەبو چەند نامەیەکیان دەربارەی باروئۆخی عێراق بۆ دەربارەی ئێرانی نوسیوە. محەمەد حسێن خان، کە ماوەیەک "کارگوزاری ئێرانی بوە لای وەزیری بەغداد لە نامەیەک دا بۆ عەبباس میرزا، نائیبوسەلتەنەی ئێران، نوسیوێتی:

"پێش ئەوەی ئەورەحمان پاشا ببێتە باعیسی ئەم فیتنە و فەسادە و جوڵانی لە شارەزورەوە تا قەومانی شەڕەکە و چۆنیەتیکوژرانی وەزیر، ڕۆژ بە ڕۆژ و مو بە مو، بە خاکی پێی موبارەکی شەهریاری گەیەنراوە.. سلێمان پاشای بابان ئێستا

بریندارە و گیراوە لەوانەیە بیکوژن.. خەڵک لە خۆیانەوە ڕویان لە وەزیر وەرگێڕا و لێ ی تەکینەوە.. وەزیریش کە بەوەی زانی لە گەڵ چەند کەسێ هەڵات، لە کەناری ڕوباری دیالە بە دەستی عەرەب کوژرا.. دوای ئەوە فە یزوڵڵا ئاغای کەهیە خەزانەدار و مەسرەفیشی کوشت و داراییەکی زۆری لەوان و لە زۆری ئەعیانی بەغداد زەوت کردوە.. ئەڵێن پارەیەکی زۆری لە محەممەد سەعید بەگی دەفتەردار

سەندوە و کوشتویەتی.. کوشتنی ئەو کەسانە و سەندنی ئەو هەمو پارەیە لە خەڵک، هەموی ئەورەحمان پاشا ئەیکات. ڕەئیس ئەفەندی وەکو میوانێکی ئەناسراو لەوێ دانیشتوە و خۆی لە هیچ ناگەیەنێ. هەرکەسێ ئەورەحمان پاشا

بیکوژێ یا لایەرێ یا دابنێ، ئەو یا کەسێکی تر دەسەڵاتی نیە..... یەکەمجار کارگوزارانی دەربار... ئاگادار کران کە ئەگەر بیروڕای کاربەدەستانی دەوڵەت.. بێتە سەرگرتنی عێراقی عەرەب هەلی لەمە باشتر هەڵناکەوێ... دوای ئەوەش دوبارە ئاگادارکران کە ئەگەر دوسێ هەزار کەس و.. چەند توغرا و فەرمان دەربکرێ.. هەمو عێراقی عەرەب بە ئاسانی ئەکەوێتە دەس کاربەدەستانی ئەم دەوڵەتە مەزنە.. ئەوەش نەکرا. ئێستا کار بە ئێرە گەیشت ئەختێ بو بە هۆی بەدناوی ئەم لایەنە. ئەورەحمان پاشا کە لە سەرەتاوە بێ ئەقڵ

و شێت بو ئێستا کە مەملەکەتێکی وەکو عێراقی عەرەبی گرتوە و، چەند کرور سامانی کەوتۆتە دەس، هەڵبەتـە مێشکی تێک ئەچێ. هەندێ جولانەوەی نالەباری لێ ئەوەشێتەوە. لەو

لایەوە هەمو رۆژێ لە گەڵ والی ی کوردستان و لـەم لایـەوە لـە گـەڵ ئـەهالی ئـەم سەرسـنورانە هـەرا دروست ئەکا و سەرەنجام ئێخەی ئەولیای دەولەت.. ئەگرێ، ئەوسا سەرکوتکردن و تەمێ کردنی لـە دژواریـی و ئیشکال خالی نابێ. بەلام ئێستا

چارەکردنی ئاسانە. هەرکاتێ.. ئەم... هێشـتا کاروبـاری عێراقـی عـەرەب رێـک نـەخراوە و وەزیـرێ دانەنراوە و پشێویی تەواو لەو ناوچەیەدایە، بۆ نمونە لەم ماوانەدا لە چوار فرسەخی نەجەفی ئەشرەف حەوت سەد تا هەشت سەد زائیری ئێرانی روت کراونەتەوە وصەدوپەنجا کەسیان لێ کوشتون و، لە نێـوان قەسـر و خانەقینیش دا پەنجا شەست

کەس روت کراونەتەوە و پێنج شەش کەسیان کوشتوە و، لە نێـوان کازمـەیـن و بەغـدایش دا تـاقمێ تالان کراون و شەش حەوت کەسیان کوشتوە و، ئاژاوەیەکی زۆر لە کاروباری ئەوێ دا هـەیـە. بـە ئەنـدازەی دوانزەهەزار سوارە و تفەنگچی... مەئمورو، دانیشتوانی ئـەم دوسـێ ویلایەتـەی دراوسـێ ی ئاگـادار بکـەن، ئینشائەڵلا بکەونە دەفعی فەسادی ئەورەحمان پاشا، بە ئاسانترین شـێوە کـار بـۆ پێشـەوە ئـەروا... چونکـە مەبەستی ئەولیای دەولەت، یەککگرتنی هەردو دەولەتە،... ئەم موفسیدە سەرەنجام نێوانی هەردو دەولەت تێـک ئەدا.."(31)

محەممەد صادق خان، کە پێ ئەچێ لەو کاتەدا خۆی لە بەغداد بوبێ، لە نامەیـەک دا بـۆ میـرزا شـەفیع، صەدری ئەعزەمی ئێران، نوسیویێتی:

"... دوای کوژرانی وەزیر و، دەس بـە سـەردا گرتنـی داروسـەلام لـە لایـەن ئەورەحمانـەوە، هـەرچی کەلوپەلی دیار هەبو لە شتنی فروشتەنی و ولاخ و چەک و کەرەسەی جەنگ و تۆپ و زەنبورەک بـە تایەفـەی بابانی بەخشی، لەوانەدا شەش

هەزار سەر ئێستر کەهی وەزیرەکانی بەغداد بو درا بە تایەفەی بابان.. هەرچی دراو بو لە ئەشرەفی و شتی تر لە دارایی سلێمان پاشا و عەلی پاشا و ئەم وەزیرە کوژراوە

هەموی بردوە.. کەهیەی کوشتو هەرچی هەبو زەوتی کرد.. باش ئاغا و خەزینـەدار و حیشـمەت ئاغـا سی وتاقمێکی تر لـە ئـەعیانی بەغـداد کوشـتوە و، هـەمو کەلوپـەل و دارایـی بـێ دەنـگ و دەنگـداری زەوت کردون.. دەفتەر دارو کورەکەی گرتوە، دو

تەغاری ئەستەمولیی زێر کە ئەکاتە 1200 مـەنی تـەوریزی، لـێ سـەندون.. سـەرەرای ئـەوەی هـەمو ئەوانەی بردوە هێشتا داوای پارە لە بازرگانەکانی بەغدا- خۆمالی و بێگانـە ئـەکا.. سـەد هـەزار قرۆشـی لـە کلیلدارو متەوەللی کازمەین سەندوە.. بۆ گوێزانەوەی کەلوپەل، ولاخەکانی وەزیر بەشی نەکردوە، لە سلێمانی و دەوروبەریەوە ولاخیان هێناوە.. پیاوێکی ناسراوی لە بەغدادا نەهێشتوە. سلێمان پاشای کوری ئیبراهیم پاشا، کە لە ناو تایەفەی بابان دا ناوو نیشانێکی هەبو و، خەڵکی بابان لایەنگیری بون، گرتوە و کوشتوە.. ئێسـتا دنیا بە ئارەزوی ئەم پیاوە شێتە پڕ هەوایە ئەگەرێ.. عەبدوڵلا پاشای خەزینـەداری عـەلی پاشـا، کـە نۆکـەری ئەورەحمان بو، کردویەتی بە قائیمقام.. وەکو بیستراوە نامەیەکی نوسیوە بۆ

کاربەدەستانی رۆم، بەڵێنی داوە چەرمەیەکی زۆر پارە بدا ئەگەر وەزارەتی بـدەنێ.. ئەگـەر وەزارەتـی ئەم قبوڵ نەکەن، وەزیرێ بۆ بەغداد ئەدۆزێتەوە، کە نۆکەری خۆی بێ.. زەهاو، خانەقین، بەعقوبە، مەندەلی بـە فەتاح پاشای زەهاو داوە، بەو مەرجەی کە سالی دو هەزار سوار ئامادە بکا.. دوای جەژنی رەمـەزان خـەیـالی گەرانەوەی هەیە بۆ سلێمانی.. رەئیس ئەفەندی میوانێکە لە گۆشەدا کەوتوە.. لـە دەوری بەغـداد و سـەرکرد و

ناوشــار وقزرابــات و خانــەقین و قەســرنا ســێ چــوار زائیــر کــوژران و، دە دوانــزە هــەزاریش ڕووت کراونەتەوە.."(32)

لەم دو ڕاپۆرتە ئەگونجێ چەند ئەنجامگیرییەک بکرێت:

1. پێش ئەوەی وەزیر لێ بخرێ و هەڵێ و بکوژرێ، داوایان لـە دەربـاری ئێرانـی کـردوە، پشـتیوانی لـە وەزیر بکا بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، بەڵام دەرباری ئێرانی ئەم پێشنیارەی جێبەجێ نـەکردوە، ئیتـر لەبـەر ئەوە بوە ڕوداوەکانی ئەوەندە بەخێرایی هاتون ئێران فریای یارمەتیـدانی وەزیـر نەکـەوتوە، یـان بـە چاکی نەزانیوە خۆی لەو کێشەیە هەڵ بقورتێنێ، ئەمە باسێکی جیاوازە.
2. لە کاتی پەشێوانی هەلومەرجی بەغدادا، بە تایبەتی دوای کوژرانی وەزیر، پێشنیاریان کردوە ئێران هێز بنێرێ بۆ گرتنی ناوچەکە و، ئەو کاتەیان لە هەمو کاتێ پێ لە بارتر بوە، بۆ لەشکرکێشییەکی وەها.
3. لە بەر ئەوەی مەترسی ئەوەیان هەبوە، ئەورەحمان پاشا دوای ئەم تەنگوچەڵەمەیە بەهێز بێ، دەربـاری ئێرانییان هان داوە هەر لە سەرەتاوە چاری بکەن و، نەهێڵن بەهێزو دەسەڵاتدار بـێ. گومـانی تـێ دا نیە، هەردو کاربە دەستی ئێرانی بە گیانێکی دوژمنانەوە، ڕوداوەکانیان زلتر کردوە لـەوەی هـەبوە بـۆ ئـەوەی کاربەدەسـتانی ئێرانـی دژی ئـەورەحمان پاشـا بـوروژێنن. چەنـدین هـەواڵ و دەنگوباسـی ناڕاستیشیان تێ دایە. ئەگینا دوای ئەم ڕوداوە بە چەند سـاڵێک داود پاشـا پـەنای بـۆ میـری بابـان نەئەبردو، جارێکی تریش لەشکری بابان نەیئەتوانی داود پاشا بباتەوە بەغداد.

عوسمان پاشای بابان کاتی خۆی لە بەغداد دەرمانخوارد کرابـو. هەنـدێ لـە گـەورەپیاوەکانی بەغـداد دەستیان لەم پیلانەدا هەبو. ئەورەحمان پاشا ئەو قینەی لە دڵ دا مابو. ئەم هەلەی بۆ هەڵ کەوت و، بە کوشتن یان بە تاڵانکردن، تۆڵەی لەوانە کردەوە، کە دەستیان لە کوشتنی کاکی دا هەبو. (33)

سەرەڕای ئەمەش، لەشکری بابان، بە سەرکردایەتی ئەورەحمان پاشا، دەوری کاریگەری هەبوە لە بەلادا خستنی شەڕەکەدا و، زۆری کوژراوەکانی لەوانە بوە، لە بەر ئەوەی بە هەقی خۆیـان زانیـوە لـە بـاتی خـوێنی کوژراوەکانیان تاڵان و بڕۆ بکەن. لە داوتاڵانیەکەدا تۆپ و خێوەت وقورسایی بوە. ئەورەحمان پاشـا دوانـزە تۆپی ناردۆتەوە بۆ سلێمانی. لە کەرکوک هێزی یەنیچەری ڕێگەیان بە کاروانەکە گرتوە. ویسـتویانە نـەهێڵن بیگوێزنـەوە بـۆ سـلێمانی. وتویانـە: "ئەمـە خیانـەتێکی گـەورەیـە تـۆپ لـە گرنگتـرین شـوێنی مەملەکـەتی عوسمانییەوە ببرێ و بنێردرێ بۆ دێیەک" (34)

یەنیچەری سەرەنجام ڕێگەیان بە کاروانەکە دا تێ بپەڕێ و، نەیانتوانی گلی بدەنەوە.

## —14—

والی ی بەغداد عەبدوڵڵا ئاغای خازن و تاهیر ئاغای نەفی کرد بۆ بەصرا. پـاش چەنـد مـانگێ لێیـان بورد و داوای لێ کردن بگەڕێنەوە بەغداد. ترسان بۆ کوشتن بانگ کرا بن. نەیانوێرا بگەڕێنەوە بۆ بەغـداد. کە گەیشتنە قوڕنە لە ڕێگەی حوێزەوە هەڵاتن بۆ لوڕستان. لەوێوە هاتنە سلێمانی. لە گـەڵ ئـەورەحمان پاشـا ناسیاویی کۆنیان هەبو. ئەورەحمان پاشا بە گەرمی میوانداری کردن و ڕێزی لێ نان.

عەبدوڵڵا ئاغا لە کۆیلە ئازادکراوەکانی سلێمان پاشای گەورە بو. حالەت لە جوڵانەکەی دا بەرەو بەغداد ئەمیشی لە گەڵ خۆی هێنا و کردی بە قایمقام. حالەت لە دڵی خۆی دا حەزی لە چارەی مەمالیک نەئـەکرد. بـە نهێنی کەوتە ئاژاوەنانەوە بـۆ ئـەوەی بـە بـەکترییان بهـاڕێ. وای بڵاوکـردەوە کـە عبـدوڵڵا ئاغـا، لـە لایـەن ئەورەحمان پاشاوە دانراوە، ئەویش سەر بە ئێرانە. هانی دان ئەورەحمان پاشا دەربکـەن و سـەعیدی کـوڕی سلێمانی گەورە دابنێن. ئەمە شەڕێکی نـاوخۆی هـەڵگیرسـاند. خـەریک بـو حالـەت تـێ دا بکـوژرێ. بـەڵام

ئاژاوەکە کوژێنرایەوە. حالەت ناچار بو فەرمانەکەی بۆ عبدوڵلا ئاغا پڕ کردەوە. عبدوڵلا پاشا بو بە وەزیری بەغدا (1225ک / 1810ز). (35)

## -15-

ئەو کاتەی حالەت ئەفەندی بۆ یەکێ ئەگەڕا دای بنێ بە والی، ئەوڕەحمان پاشا، لە ناو گەورەپیاوەکانی عێراق دا، لە هەمویان بە دەسەڵاتتر و، بە ناوبانگتر، ڕەنگە لێوەشاوەتریش بوبێ.

سەرچاوەکوردییەکان، وەکو ریچ ئەگێڕێتەوە: حالەت "... داوای لە ئەوڕەحمان پاشا کردبو، کە لە جێ ی سلێمان پاشا ببێتە والی ی بەغداد، کەچی ئەوڕەحمان پاشا زۆر مەردانەو بە توندی داواکەی ڕەت کردبوەوە و وتبوی: ڕاستەمن بەوە، پلەی یەکەمی وەزیرم ئەدرێتێ، بەڵام قومێک لە ئاوی چیاکانی کوردستان، بە هەمو تەخت و بەختی دەوڵەتی عوسمانی ناگۆڕمەوە، ڕەنگە چونیشم بۆ بەغداد، گوزەرانیشم زۆر خۆشتر بکات، بەڵام ئەنجامەکەی ئەبێتە هۆی لە ناو چونی بنەماڵەی بابان."(36)

نوسەری "سیر الاکراد ئەڵێ: "... ئەوسا تاقمێ لە سەرانی وڵاتی داواکراو بۆ ڕاوێژکردن لە سەر دانانی وەزیر. بە کۆمەڵ وتیان: "ئێمە لە حکومەتی ئێوە خۆشحاڵین و، جگە لە تۆ کەسی تر بۆ سەرۆکایەتی عێراق دانانێین. گەورەکانی بابان وتیان: "پاشا نەریتی کوردی و خێڵایەتی لە دەس مەدە و، دەس لە وڵاتی خۆت هەڵ مەگرە ژیان لە عێراق - تکلیفی مالایگاقە - ئەم چرایە ئەوەندە ڕۆشن نابێ. بە نان و دۆی خۆمان هەڵ ئەکەین و خەریکی شتێ نەبین."(37)

بەڵام سەرچاوە عوسمانییەکان ئەڵێن: ئەوڕەحمان پاشا زۆری هەوڵ داوە، تەنانەت ئامادەیی دەربڕیوە کە باجی ساڵانەی ولایەتی بەغداد پێنج قات بە زیادەوە پێشکەش بە بابی عالی بکا. بەڵام حالەت ڕازی نەبوە. بابی عالی هەرگیز ڕازی نەبوە گەورە پیاوێکی عەرەب یا کورد بە والی ی بەغداد دابنرێ. چونکە ئەترساعێراق بەرەو جیابونەوە و سەربەخۆیی ببەن، بە تایبەتی لە گەورەکانی بابان کە پەیوەندییان لە گەڵ ئێران هەبوە. (38)

بەڵام ئەوەی گومانی تێ دا نیە ئەوڕەحمان پاشا هەوڵێکی زۆری داوە لە باتی ئەوەی بیەسترێ بە والی ی بەغدادەوە، ڕاستەوخۆ سەربە بابی عالی بێ. لە بەرامبەر ئەوە دا ئامادە بوە باجی ساڵانە زید بکا. (39)

## -16-

ئێران سلێمان پاشای بە دەسنێژی خۆی دانەنا. ئەم گۆڕینەیان پێ ناخۆش بو جگە لەوەش عبدولفەتاح پاشای موتەصەرڕیفی درنە و باجەلان لە گەڵ ئەوڕەحمان پاشا هات بو بۆ یارمەتیدانی حالەت، بەڵام کەمتەرخەمی کردبو. سەرەڕای ئەوەش چەند جارێ لە لەشکرکێشی ڕۆم دا بۆ سەر ئەوڕەحمان پاشا بەشداری کردبو. وەزیر لە سەر دجاوای ئەوڕەحمان پاشا عبدولفەتاحی لابرد و خالید پاشای ئامۆزای دانا محەمەد عەلی میرزا داوای لە وەزیر کرد بیخاتەوە جێگەی خۆی. وەزیر لە ژێر گوشاری ئەوڕەحمان پاشادا داواکەی بۆ جێ بەجێ نەکرا. سەرەنجام عبدولفەتاح و عەبدولعەزیزی کوری لە گەڵ پیاوەکانیان پەنایان برد بۆ شازادە لە کرماشان. 2 جاری تر شازادە داواکەی دوبارە کردەوە، هەردو جار ئەوڕەحمان پاشا لاساری کرد و، نەیهێشت عەبدولفەتاح پایەی پێشوی پێ بدرێتەوە. بۆ تەنگاوکردنی ئەوڕەحمان پاشا ئێران بوداق خانی میری سابڵاخی بە لەشکرێکەوە نارد بۆ گرتنی سەردەشت. سەردەشت لەو کاتەدا بەشێ بو لە موڵکی بابان. ئەوڕەحمان ئیزنی لە وەزیر خواست بگەڕێتەوە کوردستان. وەزیر ڕێگەی دا (11 ی صەفەری 1226 ک / 5 ی مارتی 1811ز).

ئەورەحمان گوێ ی نەئەدایە وەزیر. هەروەها گوێ ی نەئەدایـە شـازادە. سـاردی کەوتـە بـەینیانـەوە. هەردولایان ڕێک کەوتن ئەورەحمان پاشا تەمێ بکەن. خالیدپاشا لەو کاتە دا لە زەهاو بـو. وەزیـر موافقـەتی کرد لە جێگەی ئەورەحمان بیێتە میری بابان. ئەورەحمان وای ئەزانی خالید پاشا لە گەڵ ئەوە. نـەینـەزانی لـە ژێرەوە لە گەڵ دوژمنەکانی ڕێک کەوتوە. ئەورەحمان خۆی ئامادەکرد بـۆ بـەرەنگاری و. سلێمانی نـارد بـۆ بەرهەڵستی وەزیر.

محەممەد عەلی میرزا هێزێکی 60 هەزار کەسی بۆ سەر ئەورەحمان ئامادە کرد. ئـەورەحمان لای وابـو هێزەکەی خۆی و هێزی خالید پاشا بەسن بۆ بەرگری دژی شازادە. بـەڵام کەشـازادە گـەیشـتە زەهـاو خالیـد پاشا، لە سەر داوای وەزیر، چو بـە پیریـەوە و کەوتـە گـەڵ هێزەکـەی. ئـەورەحمان بـە خـۆی دا ڕانەپـەرمو بەرەنگاری بکاخۆی و خێزانەکەی و هەندێ لە پیاوەکانی کشانەوە کۆیە. کۆیەی قایم کـرد دژی گـەمارۆدان و هێرشی لەشکری عەجەم. وەزیر خەلعەت و بیورلدی میرایەتی بابان و کۆیە و هەریری بۆ خالیـد پاشـا نـارد. ئەمە جاری دوەم بو خالید پاشا جێگەی ئەورەحمان پاشا بگرێ. شازادەش دەوری کۆیـە ی گـرت وەزیـر لـە هاوکاری شازادە پەشیمان بوەوە. ترسا کوردستان بە تایبەتی کەرکوکی لـە دەس دەربچـێ. شـازادە 15 ڕۆژ ئەورەحمان پاشای گەمارۆ دا. ئەورەحمان پاشا حەفتا تا هەشتا شەرکەری بابانی لـە گـەڵ بـو. ئازایەتییـەکی زۆریان نواند. (40) شازادە نائومێد بو لە گرتنی لە گەڵی ڕێک کەوت: بابان بۆ خالید پاشـا بـێ و، کۆیـە و هەریریش بۆ ئەو (1226ک /1811ز). ساڵانە هەندێ دیاری بۆ بنێرێ. (41)

پاش 3 مانگ ئەورەحمان پاشا بە ناوی ڕاوەوە چوە شوێنێکی نزیکسلێمانی. خالیـد پاشـا هێزێکـی کەمی هەبو ترسا. سلێمانی بە جێ هێشت. چـو بـۆ زەهـاو و لـەوێوە بـۆ مەنـدەلی. ئـەورەحمان پاشـا چـوە سەرچنار. ئاگاداری وەزیری کرد. بە هۆی هاتنی وەرزی زستانەوە وەزیر لەشکرکێشی بە باش نەزانی. گـوێ ی خۆی لەم ڕوداوانە خەواند و سلێمانی بە ئەورەحمان سپارد و خالیدی بانگ کردەوە بۆ بەغـداد و مەنـدەلی بۆ تەرخان کرد (1227). (42)

## –17–

لـە (1226ک / 1811ز) دا ڕوسـیا و تورکیـا ڕێککەوتننامـەی "بوخارسـت" یـان ئیمـزا ڕکـد. لـەم ڕێککەتنەدا بە هیچ جۆرێ ناوی ئێران نەهات بو. ئێران وای دانەنا لە پشتەوە خەنجەری لێ دراوە. ئێـران لـە ڕێگەی سەفیری بەریتانیاوە. نارەزایی خۆی بە بابی عالی گەیاند. صەدری ئەعزەمی عوسمانی لـە وەڵام دا وت بوی: لە

کاتێـک دا دەوڵـەتی عوسـمانی لـە جـەنگ دا بـو دژی ڕوسـیا، ئێـران نـەک هـیچ وەڵامێکـی باشـی عبدولوەهاب ئەفەندی نەدایەوە، بەڵکو پشتیوانی لە یاخی بونی ئەورەحمان پاشا کرد و، پەلاماری ولایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانییان دا. ئەبێ چاوەڕوانی چ دۆستایەتییەک لە ئێران بکەیـن؟ شـا لـە هـەڵوێستی بابی عالی سەبارەت بە پێکهاتن لە گەڵ ڕوسیا بێ ئاگاداری ئێـران دڵگـران بـو. چـاوەڕوانـی هـەلێ بـو ئـەم داخەیان پێ بڕێژێ. (43)

## –18–

سەرلەنوێ وەزیر کەوتەوە گێچەڵ بە ئەورەحمان پاشا. بۆجـاری سـێیەم خالیـدی لـە جێگـە دانایـەوە. هێزێکی گەورەی بردە سەر ئەورەحمان پاشا. ئەورەحمانخۆی بـۆ ئامـادە کـرد. لـە شـوێنێکی نزیـک کفـری لەشکری بابان و، ڕۆم لێکیان دا.

سەرەتا لەشکری وەزیر شکا و بەشێکی هێزەکەی لە مەیدانی شەڕ هەڵاتن. هێزەکەی خۆی و، تفەنگچییەکانی عوقەیل و، هەندێ شەرکەری بابان و، تۆپخانەکەی مایەوە. ئەمانە بە سەرکردایەتی داود ئەفەندی (دوایی داود پاشا) لە شەڕەکەدا

خۆیان ڕاگرت و شکستیان بە لەشکری ئەوڕەحمان پاشا دا. لەم شەڕەدا خالید بەگی برای ئەوڕەحمان پاشا و زۆر کەسی تر کوژران (1227ک / 1812ز). منارەیەکیان لە سەری کوژراوەکانی کورد دروست کرد. ڕۆم بارەگا و کەلوپەلی بارەگاکەی ئەوڕەحمان پاشایان تاڵان کرد. (44)

وەزیر بە ڕێ کەوت بۆ کەرکوک. موتەسەللیم و قازی و میرئالای کەرکوک و ئاغای بەغداد و 3 کەس لە گەورەپیاوەکانی شەممەری تاوانبارکرد بە دەستێکەڵاو

کردن لە گەڵچ ئەوڕەحمان پاشا و سزای دان. والی ی موسڵیش بە هەمان توهمەت تاوانبار بو. بەڵام بە دیاری و پاڕانەوە خۆی پەڕاندەوە.

ئەوڕەحمان پاشا دیسان پەنای بۆ ئێران برد. شا ئەمەی بە هەل زانی. فەرمانی دا بە محەممەد عەلی میرزا یارمەتی ئەوڕەحمان پاشا بدا. (45)

شازادە دالَدەی دا و، داوای لە وەزیر کرد بیگێڕێتەوە سەر میرایەتی بابان. وەزیر داواکەی جێبەجێ نەکرد. شازادە ڕوی کردە قزرباتو تاڵانی کرد و، خەڵکەکەی هەڵاتن. وەزیر خۆی سازدا بۆ بەربەرەکانی. لەم کاتەدا سەعیدی کوڕی سلێمان پاشای گەورە، لە ترسی گیانی خۆی، هەڵات بۆ ناو مونتەفیک. عەبدوڵڵا لەمە کەوتە پەژارەوە. ترسا بە فیتی دەوڵەت ئەمەی کرد بێ. وازی لە شازادە هێنا و، داواکانی جێبەجێ کرد. خالید و سلێمانی لە بابان و کۆیە و هەریر لادا و، ئەوڕەحمانی بۆ گێڕایەوە (1227ک /1812ز). بەڵێنی دا خەرجی لەشکرکێشییەکەی شازادەش بدا. بۆ ئەوەی دەستی بۆ سەعید بەگ واڵا بێ. (46)

ئێران و ڕوسیا پەیمانی گولستانیان ئیمزاکرد (1228ک / 1813ز). بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتنە ئێران، ناوچەکانی تەفلیس، قەرەباغ، شیروان، شەکی، دەربەند، باکوی لە دەس دا. تورک لای وابو ئێران بە داگیرکردنی ئەرزی عوسمانی ئەیەوێ بێتەوە مایە و، زەرەرەکانی پڕ بکاتەوە. بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لە لەشکرکێشی ئێران بۆ سەر ئەرزی عوسمانی، بابی عالی جەلالەددین محەممەد ئەفەندی لە ڕێگەی بەغدادەوە نارد بۆ تاران (1228ک/ 1813ز) جەلالەددین لە گفتوگۆکانیدا پێی لە سەر خۆتێ هەڵنەقورتاندنی ئێران لە کاروباری ناوخۆی عوسمانی و، گێڕانەوەی ئەو تاڵانییانەی دانەگرت کە لە دوا لەشکرکێشی دا بردبویان. ئێرانیش لە بەرامبەر ئەوەدا داوای گێڕانەوەی کەلوپەلی تاڵانکراوی زائیرانی ئەکرد. ئەم سەفارەتەش بە ئەنجام نەگەیشت. بەڵام هەمو هاتوچۆیەک زیاتر ڕێگەی لە یەککەیشتنی نزیک ئەکردەوە..

**-19-**

ئەگەرچی سەردەمی ئەوڕەحمان پاشا زۆر نائارام بوە. شەڕوشۆڕی زۆری تێ دا قەوماوە. لە ماوەی 24 ساڵ دا ئەوڕەحمان پاشا پێنج جار لابراوە. لە گەڵ ئەوەش دا ئەوڕەحمان پاشا هەروەکو سەرکردەیەکی هەڵکەوتوی مەیدانی جەنگ بوە، هەروەها پێشەنگێکی مەیدانی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بوە. بێ مەڵامەت نیە ڕەنجوری بە بۆنەی گیرانەکەیەوە شیعرێکی پڕ ستایشی بۆ ئەنێرێ بۆ زیندانی حیلە و، م. خالیدی نەقشبەندی ستایشی ئازایەتی و دادپەروەری ئەکا و، لە شەڕی ئەم و والیی بەغدادا، کە لایکیان لەشکری خەلیفەی ئیسلام و لایەکەی تری شۆڕشگێڕێکی یاخی کوردە، پشتیوانی لە شۆڕشگێڕەکە ئەکا و، شیوەن بۆ کوژراوەکانی ئەکا. یان عەلی بەردەشانی شەڕەکانی بە "بەیت" ی درێژ ئەهۆنێتەوە و، ئەکەوێتە سەر زمانی شایەر و گۆرانیبێژ و کۆڕ و دانیشتوانی پێ گەرم ئەکەن. ئەوڕەحمان پاشا لە بواری هاندانی خوێندەواری دا چەند کاری گرنگی کردوە:

1. دروستکردنی مزگەوت و مەدرەسەی نوێ.
2. هێنانی مەلا ناودارەکان بۆ قەڵەمڕەوەکەی خۆی و، دابینکردنی پێویستیەکانی ژیان و خوێندن و دەرس وتنەوە.
3. کڕین و نوسینەوەی سەرچاوە گرنگەکانی خوێندنی مەلایەتی و، وەقف کردنی لە سەر مزگەوت و مەلاکان.

گرنگی دانی ئەم میرە مەزنە بە خوێندەواری لەوەدا دەرئەکەوێ، سەرەڕای کەشمەکێشی ئەو ڕۆژگارەی ئەوی تێ دا ژیاوە، وەکو ئەگێڕنەوە خویشی هەندێ جار دەرسی بە فەقێ و قوتابی مزگەوتەکان وتۆتەوە. (47)

## -20-

عەبدوڵڵاپاشای وەزیر لەشکرێکی گەورەی سازدا بۆ سەر موتەفیک کە دالَدەی سەعیدیان دابو. لەم لەشکرکێشییەدازۆری هێزەکەی وەزیر لە وەزیر هەڵگەڕانەوە. وەزیر بە دیل گیرا و کوژرا (1228ک /1813ز). سەعید بو بەوەزیری بەغدا لەم ماوەیەدا ئەورەحمان پاشا نەخۆش کەوت و. (شەوی 17 ی ڕەبیعی دوەمی 1228ک / 2 یمارتی 1813) مرد. لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی بە خاک سپێردراوە. وەکو ڕیچ ئەگێڕێتەوە ئەورەحمتن پاشا لە سەرەمەرگا وروژاوە چونکە بە کەساسی لە جێگەدا ئەمرێ لە کاتێک دا لەو هەمو شەڕانەدا نەکوژراوە. عینایەت بەگ، یەکێ لە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە، لە شیوەنی ئەورەحمان پاشادا شیعرێکی فارسی داناوە لە دوا بەیتی دا ئەڵێ:

چو بود او ظل رحمن در حقیقت
از ان شد سال فوتش (ظل رحمن: 1228) (48)

## پەراوێزەکان

1. الکرکوکی: 203؛ العمری: 47. العزاوی: 6/ 120 - 121؛ ڕەنجوری: "ڕۆیشتنی ئەوڕەحمان پاشا بۆ بەغداد دوای کوشتنی ئەحمەد کەهیە خەربەندەئۆغلی و لێخرانی لە حکومەتی سلێمانی سەرەتای ڕەمەزانی 1212"
2. الکرکوکی: 216؛ العمری: 60؛ العزاوی: 6/ 143. ڕەنجوری بەم بۆنەیەوە شیعرێکی داناوە ناردویەتی بۆ "پاشای کوردستان" ئەوڕەحمان پاشا لە زیندانی حیللە. ئەمە چەند بەیتێکیتی:
   ڕەوان بە ڕاهی چون بەرق ڕەهوار
   مدارا مەکەر تا وە "بەغدا" شار
   نە بارگەی خاصان بوازە هیممەت
   روکەر نە ماوای قەیس پڕ بەینەت
   دەور بدەر نە موڵک "بابل" بێ ئەندێش
   بشۆ وە جایێ "حیللە" ماچان پێش
   شەهزادێ جە ئەسڵ بەگزادەی بابان
   جە نەوەی ئوجاغ مالیک ڕیقابان
   والی ویلایەت گشت کوردستانەن
   ئیسم شەریفش عەبدوڕەحمانەن
   ستارەی بەختش قیران نەحسەن
   جە "حیلە" ی دنیا نە "حیللە" حەبسەن
   دیوانی ڕەنجوری: 205 - 207. بڵاوکەرەوەی دیوانەکە ئەڵێ کە شیعرەکە ناتەواوە و، بەشێکی فەوتاوە.
3. العمری: 61 - 62.
4. الکرکوکی: 221؛ العمری: 6/ 151.
5. 
6. الکرکوکی: 227 - 228؛ زکی، "تاریخی سلێمانی: 106؛ العزاوی: 6/ 162 - 163".
7. الکرکوکی: 228.
8. عباس العزاوی لە "رحلە المنشی البغدادی" دا ئەڵێ: "بەت" ڕوباری "عوزێم" ە.
9. العمری: 68؛ لونگریک: 279. پێ ئەچێ دوای کوژرانی محەممەد پاشا. نەوەکانی تەیمور پاشای کۆیە ئیتر دەورێکی ئەوتۆیان لە ڕوداوەکانی ناوچەکەدا نەمابێ.
10. العمری: 68 - 70.
11. الکرکوکی: 228 - 231؛ العمری: 68 - 70؛ لۆنگریک: 179؛ العزاوی: ج 6، ص 164 - 167.
12. دنبلی: 166. دونبلی ئەڵێ: نزیکەی 5 هەزار ماڵی لە کەڵ بو. ڕەنگە ئەم ژمارە زۆرە ڕاست نەبێ.
13. نصیری: 1/ 51.
14. نصیری: 1/مقدمە/ 21 -22؛ العزاوی: 6/ 172؛ الکرکوکی: 134؛ بابانی: 130؛ دنبلی: 166.
15. الکرکوکی: 134 - 237؛ لۆنگریک: 279 - 280؛ العزاوی: 6/ 171 - 177؛ دنبلی: 167 - 169.

16. العمری: 71 - 72. مەولانا خالیدی نەقشبەندی دو "مەرسیە" ی جیاوازی بۆ سەلیم بەگ و یەکێکی تر لە میرەکانی بابان بە ناوی میرعوسمان نوسیوە. ئەبێ میـر عوسـمانیش لـەو ڕوداوانـەدا کـوژرا بـێ. ساڵی کوژرانی بە حسابی ئەبجەد دیاری کردون.

**"مەرسیە" ی یەکەم:**

هزبر بیشەی مردی سلیم بن محمود انکە
بە نوک نیزەاش بس عقدەی واناشدە. واشد
زکینش رزمگە شد دشت چین از بس تن بی جان
تو می گونی زجبهەش قابض الارواح هویدا شد
تمنا داشت پیش شیر شیران داور اعظم
کشد خودرا و اخر عمر او دراین تمنا شد
بسوی اشیان قدس در پرواز شد جانش
روانش طوطی نزهتگە فردوس اعلی شد
بە ماتم داریش اشفتەشد شاهنشە ایران
بە چشمش روز روشن چون شب تاریک یلدا شد
زمرگ او بسی اە و دریغا در جهان افتاد
همین تاریخ سال مرگ او "اە" و"دریغا" شد: (1221)

**"مەرسیە" ی دوەم:**

داد ازین گردون دون، فریاد ازین
دسیت جز مردان حق را در کمین
بحر احسان، کوە عرفان، کان جود،
فخر دوران، ناصب اعلام دین
میرعثمان انکە رای روشنش
بود نظم ملک را حبل المتین
گشت جانش تیر قدرت را هدف
باد بروی رحمت از جان افرین
ماە ذالحجە بد و بیست و یکم
رخش همت کرد در یکشنبە زین
رخت بیرون برد ازین دنیای دون
خیمە برافراشت در خلد برین
شد زصهبای شهادت جرعەنوش
گشت با همنام پیشینش قرین
خاک بر فرق فقیران کرد و رفت
خاطر خوشنود عالم شد حزین
بسکە گرد غم بجنبید از جهان
کس نداند اسمان را از زمین

زاریش را شب همه شب تا سحر
دیدەها بگشاده چرخ هشتمین
از پی تاریخ سالش گفت دل
"باد صد باره به مرگش افرین": (1221)
معتمدی: 301، 317 - 318.

17. نصیری: 1/ 57 - 59.
18. دنبلی: 168.
19. نصیری: 1/ مقدمه 22.
20. نفیسی: 1/ 147.
21. نصیری: 1/ 210.
22. العزاوی: 6/ 191.
23. نفیسی: 1/ 141.
24. نفیسی: 1/ 136.
25. پێ ئەچێ م. خالیدی نەقشبەندی بە بۆنـەی ئـەم خۆئامادەکردنـەوە ئـەم چەنـد بـەیتـەی لـە ستایشـی ئەورەحمان پاشادا هۆنی بێتەوە:

عبد رحمن، شیر میدان، شاه گردون، جاودان
با عموم شهرتش، مهر است مانند سها
توپ اژدروار را چون بر عرادە تکیه داد
پارەشد خمپارەوش قلب عدو زین اعتنا
حسب حال خصم ملهم گشت تاریخش بدل
"دشمن بد چون رهد از شیر یا از اژدها": (1223)
معتمدی: 321.

26. العزاوی: 6/ 184 - 185؛ الکرکوکی: 242 - 243.
27. الکرکوکی: 244؛ العزاوی: 6/ 186.
28. لۆنگریک: 273.
29. بابانی: 143.
30. العزاوی: 6/ 195 - 201؛ دنبلی: 242 - 243؛ بابانی: 135؛ نصیری: 1/ 119 و 214.
31. نصیری: 1/ 119.
32. نصیری: 1/ 214.
33. فائق بک: 41.
34. العمری: 121.
35. العزاوی. 6/ 206 - 207. 36. ریچ: 115.
36. ریچ: 115.
37. بابانی: 137.
38. نوار. "داود پاشا": 50؛ "تاریخ العراق": 113؛ لۆنگریک: 273. 39. ریچ: 115.

40. ڕەنگە ئەو قەصیدە درێژەی مێژونوس، عثمان بن سند، کە بە هۆی صەبغەتوڵڵا حەیدەرییەوە ناردویەتی بۆ ئەورەحمان پاشا و، وەکو ئەیشڵێ، وەڵامی وەرنەگرتۆتەوە، بە بۆنەی ئەم شەڕەی کۆیەوە بێ کە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتاییەکەی ئەمەیە:
الیه تحیات حساب تواترت
فاهدت من المدح الغریض له اللبا
تحیات صب لم یزل نا حشاشة
مقرحة من حب من قطن اللبا
*
وکیف وبیض الکرد تجزم للعلی
فثورتها کسرا وتمنعها نصبا
قفت "عابد الرحمن والفارسي الذی
له صدرت قحطان فی وردها الحربا
*
فدونکها حسناء ترفل بالثنا
منی انشدت فی الرکب اطربت الرکبا
فخذها فان السعد من ختمها هبا
البصري، "اصفی الموارد.. ": 75 - 77.
وەکو ئەڵێن تا ئێستاش لە کۆیە، لە نزیک "ڕەمزی شۆخێ" شوێنەواری گۆڕستانی "شەهیدی عەجەمان" ماوە، کە کوژراوەکانی ئەو شەڕەیان تێ نا نێژراوە..
41. الکرکوکی: 252 - 253؛ دنبلی: 261 - 262؛ العزاوی: 209/6 و 211.
42. الکرکوکی: 255.
43. نصری: 1/ مقدمه/ 25.
44. الکرکوکی: 256 - 257؛ لۆنگریک: 274 و 281.
45. نصیری: 1/ مقدمه /25.
46. الکرکوکی: 257 - 258؛ دنبلی: 280 - 281؛ لۆنگریک: 275؛ العزاوی: 6/ 212 - 214.
47. القزلجی: 37؛ الخال، "الشیخ معروف": 26.
48. الکرکوکی: 261؛ ریچ: 321؛ العزاوی: 6/ 220؛ الخال، "الشیخ معروف": 25؛ ڕۆژی نوێ: ژ 1، 1961.

# 8. مەحمود پاشا:
# هەڵتەکاندنی بنچینەی ئەمارەتی بابان

-1-

ئەورەحمان پاشای کوڕی مەحمود پاشا دوای 24 ساڵ میرایەتی پچڕ پچڕی پڕ شەڕوشۆڕ و دەربەدەری و حوکمڕانی لە ساڵی (1228ک/ 1813ز) دا بە نەخۆشی لە سەر جێگە مرد. لە پێش مردنی دا "هەمو بەگ و ئاغا و شێخ و سەید و عالم و سەرانی عەشایەر و کوێخای گوندەکان" کۆبونەوە مەحمود بەگی کوڕیان لە جێگەی ئەورەحمان پاشا بە میری خۆیان هەڵبژارد.

ئەورەحمان پاشا دوای مردنی خۆی 3 برا: عەبدوڵا بەگ، ئەحمەد بەگ، عومەر بەگ و، چەند کوڕێکی لە وانە: مەحمود بەگ، عوسمان بەگ، سلێمان بەگ، حەسەن بەگ، عەزیز بەگی... بە جێ هێشت بو. والی ی بەغداد سەعید پاشا، "خەلعەت" و"بیورلدی" بۆ مەحمود بەگ ڕەوانە کرد و بە پلەی "پاشایەتی" لیواکانی بابان و کۆیە و هەریری پێ سپارد. دوای ماوەیەکی کورت مامەکانی: عەبدوڵا بەگ، ئەحمەدبەگ، عومەر بەگ، خۆیان و دەستوپێوەندەکانیان مەحمود پاشایان بە جێ هێشت. بە کۆمەڵ ڕویان کردە بەغداد.(1)

پێشتریش خالید پاشای ئەحمەد پاشا و محەمەد بەگی کوڕی چوبونە بەغدا. والی بەغداد ئەمانەی لای خۆی گل دابوەوە و، بۆ دابین کردنی ژیانی خۆیان و سوارەکانیان داهاتی ناوچەکانی مەندەلی و خانەقین و عەلیاوا و زەنگاباد و ئاڵتون کۆپری... بۆ بڕی بونەوە. لە بەرامبەر ئەمەدا خۆیان و سوارەکانیانی بەکار ئەهێنا: بۆ پاراستنی خۆی لە ملۆزمەکانی و، بۆ سەرکوتکردن و تاڵانکردنی عەشیرەتەکانی عەرەب و، بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی میری بابان و، بۆ لێخستن و گۆڕینی میرەکان..

-2-

نوسەری کتێبی "داود پاشا"، لە هەڵسەنگاندنی سیاسەتی سەعید پاشا و، هۆی سەرنەکەوتنی لە درێژەپێدانی وەزارەت دا ئەڵێ: "سەعید لە سیاسەتەکەی دا بە شێوەیەکی بنچینەیی پشتی بە عەرەب ئەبەست،

بەم جۆرە سەعید بە هێزی مەمالیک حوکمی نەئەکرد، بەڵکو بە هی عەرەب بە تایبەتی هی مونتەفیک و عوبێد حوکمی ئەکرد. ڕۆژگاری سەعید بۆ عەرەب بو لە کاتێک دا ڕۆژگاری عەبدوڵا بۆ کورد. هەردولا - مەبەستی کورد و عەرەبە - شەرەفی دانانی والیان پێ برا بو."(2) ئەم لێکدانەوەیە دروست نیە چونکە:

یەکەم، مەمالیک بێگانە بون بە کورد و عەرەب لە عێراق دا. کۆمەڵەکانی کورد و عەرەب لەو سەردەمەدا کۆمەڵی خاوەن ڕێکخراوی خێڵەکی بون. ڕێچەڵەک و بنچ و بناوانیان بە لاوە گرنگ بوە، مەمالیک لە ناو عێراق دا ڕەگیان نەبوە. ئێل و عەشیرەت و بنەماڵە و، هەستی نەتەوەیی کوردی یا عەرەبیشیان نەبوە. بە منالی بە پارە لە بازاڕەکانی قافقاس دا کڕدرابون و کرابون بە کۆیلە. بە کۆیلەیی هێنرابون بۆ بەغداد و پەروەردەیان کرد بون بۆ کاروباری حکومەتی.

دوەم، ئەگەرچی عەبدوڵا بە یارمەتی کورد حوکمی گرتە دەست، بەڵام هەر وەکو لەشکرکێشی بۆ سەر ئێلاتی عەرەب ئەکرد، کە خۆی قایم کرد چوە سەر پاشای کوردستانیش. لە کاتێک دا ئەو هێزی سەرەکی بو لە دانانی دا.

سێیەم، ئەگەرچی سەعیدیش بە یارمەتی ئێلەکانی عەرەب کاروباری گرتە دەست، بەڵام هەروەکو لەشکری ئەناردە سەر کورد ئاوەهاش ئەیناردە سەر عەرەب. ڕۆژگاری عەبدوڵا هی کورد و، ڕۆژگاری سەعید هی عەرەب نەبو، وەکو مێژونوسی میصری ئەڵێ، بەڵکو ڕۆژگاری هەردوکیان هی مەمالیک بو. ئێلەکانی کورد و عەرەبیان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان بەکار ئەهێنا. هەر لەو ماوەیەدا داودیش بە یارمەتی کورد بو بە والی. ئەویش پێڕەوی هەمان ڕێبازی حوکمڕانی کرد.

سەعید پاشا گەنجێکی بێ تەجروبە بو. گەنجێکی جوانیش بوبو بە هاوڕێ و هاودەمی ناوی حەمادی ئەبو عەقلەین بو. سەعید لە قسەی حەمادی دەرنەئەچو. ئەویش تەگبیری خراپی بۆ ئەکرد. سەعید چەند جارێ سلێمان پاشا و خالید پاشای لە جێگەی یەکتری لە کۆیە و هەریر دائەناو لائەبرد. حەمادی زۆری لە سەعید کرد مەحمود پاشا لێ بخاو عەبدوڵا پاشای مامی مەحمود لە جێگەی دابنێ. سەعید فەرمانی لابردنی مەحمود پاشا و دانانی عەبدوڵا پاشای دەرکرد (1231ک/ 1815ز). عەبدوڵا پاشا لە گەڵ هێزی ڕۆم دا بە ڕێ کەوت بەرەو کەرکوک لە "قزل دەگرمان" خێوەتی هەڵدا. مەحمود پاشا بڕیاری دا بەرەنگاری بکا. هێزی بابانی بە سەرکردایەتی عوسمان بەگی برای نارد بۆ دەربەندی بازیان.(3)

مەحمود پاشا داوای لە ئێران کرد هێز بۆ یارمەتی دانی بنێرن. لە هەمان کات دا نامەیەکی هەڕەشەی بۆ کاربەدەست و گەورەکانی کەرکوک نارد داوای لێ کردن عەبدوڵا پاشا لە کەرکوک دەربکەن.(4)

## -3-

سەعید پاشا جێگەی لەق و، ناحەزی زۆر بو بو. داود پاشا زاوای سەعید بو. لە خۆی ترسا بیکوژن، لە بەر ئەوە بە ناوی ڕاووشکارەوە لە بەغداد دەرچو، بەرەو کوردستان هەڵات و، چو بۆ سلێمانی. مەحمود پاشا خۆی بە پێشوازییەوە هات بو بۆ کەناری شار.(5)

سەعید بە ڕاکردنی داود شپرزە بو. هەوالی بۆ شێخی مونتەفیک حمود ئال سامیر نارد بە خۆی و هێزەکانیەوە بچن بۆ بەغداد. هەروەها عەبدوڵا پاشاش لەکەرکوکەوە گەڕایەوە بۆ بەغداد. مەحمود پاشا مەترسی هێرشی عەبدوڵای نەما. داود پاشا چل ڕۆژێ لە سلێمانی مایەوە. لەو ماوەیەدا ئەوانەی هەڵات بون بۆ ئێران هاتنە لای داود. سلێمان پاشای ئیبراهیم پاشای حاکمی پێشوی کۆیە و هەریر، خەلیل ئاغای (موتەسەللیم) ی کەرکوک، ڕۆستەم ئاغای (موتەسەللیم) ی بەصرا، سەید علێوی ئاغای پێشوی یەنیچەری بەغداد، ئەمانە لە داود کۆبونەوە. مەحمود پاشاش هێزەکانی خۆی سازدا.(6)

داود پاشا نامە و مەزبەتەی بە تەتەری تایبەتی دا بۆ بابی عالی نارد. داوای لێخستنی سەعید و دانانی خۆی کردبو. داود بە پشتیوانی هێزەکانی مەحمود پاشا و سلێمان پاشا بەرەو کەرکوک بە ڕێ کەوت. خالید پاشا لەو کاتەدا حاکمی کۆیە بو گوێی نەدایە داود پاشا. عەبدوڵا پاشاش هەروەها. داود لە گوندی تەقماقلو بو نزیک کەرکوک کە فەرمانی لێخرانی سەعید و دانانی خۆی بە والیی بەغداد لە بابی عالیەوە پێی گەیشت. داود وێنەی فەرمانەکانی نارد بۆ گەورەپیاوەکانی بەغداد. سەعید گوێی نەدایە ئەم فەرمانە بڕیاری دا بەرەنگاری بکا بەڵام ناو ڕیزەکانی دەوروپشتی پشێوییان تێ کەوت و. کەوتنە هەڵاتن بۆ لای داود پاشا. سەعید بۆ ئەوەی سەر لە مەحمود پاشا تێک بدا. کە لەو کاتەدا لە گەڵ داود بو. عەبدوڵا پاشای بە هێزێکەوە ناردە سەر سلێمانی و. داوای لە خالید پاشاش کرد یارمەتی عەبدوڵا بدا. عەبدوڵا پەلاماری سلێمانی دا بەڵام حەسەن بەگی برای مەحمود پاشا چەند ڕۆژێ بەرەنگاریی کردن تاهێرشەکەی شکاندن.

داود پاشا بە هێواشی ئەجولا ئەیویست هەلومەرجی ناو بەغداد ئامادە بێ. چوە توزخورماتو و جەبیدە پاش ماوەیەک چوە نزیک بەغداد و. پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا. سەعید خۆی قایم کرد بو بەڵام پەلاماریان دا و کوشتیان (1232ک/ 1816ز). عەبدوڵا پاشا و خالید پاشا بە پەشیمانی "دەخالەت" یان کرد. داود لێیان خۆش بو. داود پاشا بو بە وەزیر.(7)

نوسەری "داود پاشا" لێرەش دا لێکدانەوەیەکی خۆکردی هێناوەتە ناو باسەکەوە. هۆی هەڵگەڕانەوەی داود پاشا لە سەعید ئەگێڕێتەوە بۆ هەستی نیشتمانپەروەریی عێراقیتی. گوایە داود بۆیە شۆڕشی کردوە بۆ ئەوەی بەری پەرەسەندنی نفوزی ئێرانی بگرێ چونکە ترساوە ئێران بەغداد داگیر بکا و. ڕیچ. واتە ئینگلیز. نفوز و دەسەڵاتی زیاد بکا.(8)

هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی بە دەستەوە نیە بۆ سەلماندنی ئەم بۆچونە. ڕاستییەکەی وەکو هەمو سەرچاوەکانی دەستی یەکەم ئەیگێڕنەوە ئەوەیە: سەعیدئەترسا داود پیلانی لێ بگێڕێ و جێگەکەی داگیر بکا. لەبەر ئەوە ڕێوشوێنی لەناوبردنی دانا. داودیش بەمەی زانی لە ترسی گیانی خۆی هەڵات بۆ کوردستان. کەوتە هەوڵی لادانی سەعید و. بەدەستهێنانی وەزارەتی بەغداد. بە ئامانجەکەشی گەیشت.

نوسەری "داودپاشا" کە لە تێکڕای کتێبەکەی دا بە ستایشەوە لە داود ئەدوێ. بەمجۆرە باسی سیاسەتی داود پاشا ئەکا بەرامبەر بنەماڵەی بابان:

"هێزی کورد لەو کاتەدا مەترسییەکی گەورە بو لە سەر داود لە کاتێک دا هێشتا جێگەی پێی خۆی قایم نەکرد بو. ئەم مەترسییە بە تەنیا لە هێزی جەنگیی بابان دا نەبو. بگرە لەو هاوکارییە کوردی - ئێرانییەدا بو کە لە پایەی پاشای مەملوکی لای بابی عالی ئەهێنایە خوارێ. بەوەی کە ناتوانێ دڵسۆزی کورد بۆسوڵتان دابین بکا. داود لە توانای دا نەبو لەو هەلوێستە زوەی حوکمڕانییەکەی دا جگە لە پێڕەوی ڕێبازی کۆن لە بەرامبەر یاخیبونی کوردا کاتێ ویستی دێنۆکی مەحمود بکا بە دو ڕێگە داومکە ئەویش:

أ. دەس تانە بینی بۆ دەس بە سەردا گرتنی هەندێ ناوچەی ستراتیجی گرنگی کورد.

ب. ڕاکێشانی یەکێ لە میرەکانی بابان.

هەردو پیلانی جەنگی و سیاسی بەجێهێنانیان ئاسانە لە سەرەتاوە. لە بەرئەوەی هێزی پاشای کوردستان چەندە زۆر بێ. هەمیشە دو هەڕەشەی لە سەرە:

أ. لەشکری مەمالیکی بەغداد.

ب. خیانەتی یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەی پاشای دەسەڵاتداری بابان.

بەم جۆرە زەمینە لە بار بو بۆ داڕشتنی پیلان دژی مەحمود پاشا و. بۆ ئەوەی داود هاوپەیمانی بەهێز لە ناو خودی ئەندامانی بنەماڵەی بابان دا بدۆزێتەوە. عەبدوڵا پاشای داواکاری حوکمی سلێمانی هاوپەیمانێتی

کرد. هەروەها حەسەن بەگ - برای مەحمود پاشا - کە بە ڕێگەوە بو بچن ببن بە بارمتە لای شازادە لەکرماشان."(9)

داود لە دەوری ساڵی (1188ک/ 1774ز) لە تفلیس لە خێزانێکی گورجیی مەسیحی لە دایک بوبو. بە منالّی بە کرین لە بازاڕی تفلیس یان بە فڕاندن هێنرا بویانە بەغداد. لە پێش دا کابرایەک بە ناوی مستەفا بەگ کڕی بوی و، دوایی فرۆشت بویەوە بە سلێمان پاشای گەورە. سلێمان پاشا خستیە فێرگای تایبەتییەوە کە بۆ پەروەردە کردنی "مەمالیک" دایمەزراند بو. داود کوڕێکی قۆز و زیرەک بو. لای زانا گەورەکانی عێراق زانستەکانی دینی خوێند و شارەزای ئەدەبی عەرەبی، فارسی و تورکی بو. لە شەریعەت و حەدیس دا شارەزاییەکی زۆری پەیدا کردو. لە چەند بابەتی گرنگ دا ئیجازەی لە مەلا بە ناوبانگەکانی ئەو سەردەمە وەرگرت. سلێمان پاشا ئازادی کرد و کردی بە "خەزنەدار" ی خۆی و، یەکێ لە کچەکانیشی لێ مارە کرد. سەردەمی وەزارەتی داود پاشا (1232 -1247ک/ 1816 - 1831ز) کوردستان ئارام و ئاسایشی لێ بڕا و، بو بە مەیدانی ململانێی لەشکرەکانی تورک و عەجەم و، مەیدانی زۆرانبازی خوێناوی و وێرانکەری میرەکانی بابان. ئاژاوە و پشێویی و هەژاری و شەڕوشۆڕێکی بێ بڕانەوەی تێ خست.

## -4-

مەحمود پاشا لە سەردەمی باوکی دا ماوەیەکی درێژ وەکو بارمتە لە ئێران گل درابووەوە. ناسیاوی پێوەندی لە گەڵ زۆر لە کاربەدەستانی ئێران بە تایبەتی شازادە محەمەد عەلی میرزای حاکمی کرماشان هەبو. ئەوانە هەر لە ئێران مابونەوە. داود پاشا لە سەر نەریتی حاکمەکانی پێش خۆی بۆ ئەوەی نەهێڵێ هیچ میرێکی بابان جێگیر بێ و، بە ناسودەیی میرایەتی بکا کەوتە پیلانگێڕان لە مەحمود پاشا. حەسەن پاشای برای تەفرە دا. لە گەڵ 500 کەس هەڵات بۆ بەغداد (1233ک/ 1817ز). داود، عینایەتوڵا ئاغای موهرداری بە نوێنەرایەتی خۆی نارد بۆ لای مەحمود پاشا گوایە ئامۆژگاری بکا پێوەندی لە گەڵ ئێران ببڕێ. کۆیە و هەریری لێ سەندەوە. عوسمان بەگی لێ لابرد و، حەسەن بەگی لێ دانا (1233ک/ 1817ز).

مەحمود پاشا لە خۆی ترسا داوای لە ئێران کرد هێزێک بنێرن بۆ پشتیوانی.

محەمەد عەلی میرزا، بۆ هەل نەگەڕا دەس بخاتە ناو کاروباری عێراقەوە، هێزێکی بە سەرکردایەتی محەمەد عەلی خانی شامبەیاتی و، هێزێکی تری بە سەرکردایەتی حەسەن خانی فەیلی لەگەڵ لەشکری لوڕ بۆ سەر مەندەلی و، هێزی عەلی خانی کەلوڕ و کەلبعەلیخانی گەڕوس بۆ سەر بەدرە و جەسسان، نارد.

داود پاشا بە خۆ کەوت هێزی نارد بۆ پاراستنی مەندەلی و بەدرە و جەسسان و هێزێکیشی نارد ڕێگەی پێوەندی نێوان هێزەکانی ئێران و مەحمود پاشا ببڕێ. خۆشی هێزێکی زلی ساز دا بەرەو کەرکوک لە وێوە بچێ بۆ سەر مەحمود پاشا.

لەم کاتەدا داود پاشا توشی گیروگرفتی ناوخۆ بو. صادق بەگی برای سەعید پاشا هەڵات بۆ ناو ئێلەکانی زوبێد و قاسم بەگی شاوی هەڵات بۆ ناو خەزاعیل داود پاشا وازی لە سەفەری کەرکوک هێنا بۆ ئەوەی خەریکی کوژاندنەوەی شۆڕشەکەی ئەمان بێ. بەڵام عەبدوڵا پاشا و محەمەد پاشای خالید پاشای بە هێزێکی گەورەوە نارد بۆ کەرکوک و، ئاگاداری ئێلەکانی دزەیی و شەمامکی کرد ئەوانیش بچنە کەرکوک و هەمویان لە عینایەتوڵا ئاغا کۆبینەوە.

شازادە بنکەی سەرکردایەتی لە پای تاق دانا بو. خۆی و هێزێکی گەورە لەوێ هەڵیان دابو.

هێزی ئێران گەیشتە کوردستان. هەندێ وردە شەڕیان کرد بەڵام هیچ جێگەیەکی گرنگیان پێ نەگیرا. چەند جارێ سەفیر لە نێوان داود پاشا و شازادەدا هاتوچۆی کرد بۆ بەلادا خستنی کێشەکە. ئێران ئەیویست

بەهۆی پاشاکانی بابانەوە نفوزی خۆی لە کوردستان دا بە هێز بکا. داود پاشا، سەری بـۆ گوشـاری شـازادە دانەواند، حەسەن بەگی لە کۆیە کێشایەوە. سلێمان پاشا لە زەنگابـاد و، عـەزیز بـەگ لـە دربنـە و باجـەلان و، عەبدوڵا پاشا لە کۆیە و هەریر و، مەحمود پاشا لە سلێمانی دانرانەوە. هێزەکانی هەردولا کشانەوە شوێنەکانی خۆیان (1233ک/ 1817ز).(10)

—5—

کلۆدیۆس جەیمس ریچ، نوێنەری کۆمپانیای هیندی رۆژهەلات لە بەغداد، نفـوز و دەسـەلاتێکی زۆری هەبو. نەخۆش کەوت. بۆ گۆرینی ئاووهەوا بریاری دا لەگەڵ هاوسەرەکەی و، دەسوپێوەندەکانی دا گەشـتێکی چەند مانگە بە کوردستان دا بکا. بۆ ئەمەش ئیزنی لە داود پاشا وەرگرت. تەنانەت داود نامـەی بـۆ مـەحمود پاشا نوسی، کە رێزی ریچ بگرێ و، گەشتەکەی بۆ ئاسان بکا و، هۆکـانی حەسـانەوەی بـۆدابین بکـا. بـەلام داود پاشا، گومانی لە ریچ ئەکرد و، حەزی بە گەشتەکەی نەئەکرد و، لـێی دڵنیـا نـەبو. لای وابـو پیلانـی لـێ ئەگێرێ و پاشاکانی بابانی لێ هان ئەدا. سەیر ئەوەیە نوسەرەکانی عـەرەب هـەتا ئێسـتاش لـە سـەر هـەمان بیروران.

ریچ لە گەشتەکەی دا بۆ سلێمانی چەند مانگێ مایەوە و، سەردانی بانـە و سنەشـی کـرد. بـە درێژایـی گەشتەکەی سەرنجی ورد و زیرەکانـەی لـە سـەر بـاری سیاسـی و، هـەلو مـەرجی کۆمەلایـەتی و ئـابوری و، جوگرافیـای سروشـتی و مرۆیـی ناوچەکـە تۆمـار کـردوە. بیرەوەرییـەکانی کـە رۆژانـە نوسـیوێتی بـە سەرچاوەیەکی بە نرخ دائەنرێ بۆ لێکۆلینەوەی ئەو سەردەمە.

—6—

ئەورەحان پاشا تا مابو، خالید پاشا یـەکێ بـو لـە ملۆزمـە لاسـارەکانی. دوای مردنـی ئـەویش ئـارام دانەئەنیشت، کورەکانی لە کەرکوک دائەنیشتن. پیاوەکانی لە دێهاتەکانی دەوروپشـت جـەردەیی و رێگرییـان ئەکرد. چەند جارێ ئاگاداری محەمەد پاشای کوریان کرد نەهێڵێ پیاوەکانی کاری وەها بکـەن، کـەڵکی نـەبو. محەمەد پاشا خرایە زیندانەوە. بەلام پیاوەکانی هەڵیان کوتایە سەر زیندانەکە و محەمـەدیان رزگـار کـرد. لـە باتی ئەو خالید پاشای باوکیان گرت. محەمەد چوە ناو شوان ماوەیەک لەوێ کەوتـە گفتوگـۆ. وەزیـر لـێیـان خۆش بو. راکردوەکان گەرانەوە و گیراوەکان بەردران (1135).(11)

محەمەد پاشا دوای ماوەیەک پیاوەکانی خۆی کۆکردەوە هەلات بۆ کرماشان. سلێمان پاشا تاوانبـارکرا بە وەی لە گەڵ ناحەزانی داود پاشا پێوەندی هەیە ئەویش هەلات. عەبدوڵا پاشا، ماوەیەک لە سلێمانی گیرا لـە سـەر ئـەوەی گومانیـان لـێ کـرد بـو نامـەی لـە شـازادەوە بـۆ هـاتبێ. دوای بـەربونی ئـەویش هـەلات (1236ک/1820ز). ئەمانە هەمو لە کرماشان کۆبونەوە.(12)

—7—

مەولانا خالید (1193 - 1242ک) کوری ئەحمەد کوری حسێن لە تیرەی مکایەڵی جاف لە ناوچـەی قەرەداخ لە دایک بوە. بە منداڵی چۆتە بەر خوێندن. لای مەلا گـەورەکانی ئـەو سـەردەمە خوێندویـەتی و، لـە سنە لای شێخ قەسیمی مەردۆخەیی ئیجازەی وەرگرتوە. ساڵی 1213 کە مامۆستاکەی: سـەید عەبدولکـەریمی بەرزنجی بە تاعون ئەمرێ، ئەورەحمان پاشا ئەم لە جێگەکەی ئەو لە مزگەوتەکەی دا، کە خـۆی دروسـتی کـرد بو، دائەنێ. ئەمەش بەڵگەی لێهاتویی بوە بەو گەنجیە لە جێگەی زانایەکی وا گەورە دابنـرێ. سـاڵی 1220

بە ڕێگەی موسڵ، دیاربەکر، حەڵەب، دیمەشق.. دا ئەچێ بۆ حەج. دیسان ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. ساڵی 1225 ئەکاتە دەهلی لە هیندستان. تەریقەت لە شێخ عەبدوڵای دەهلەوی وەرئەگرێ و، ئەگەڕێتەوە ماوەیەک لە بەغداد جێگیر ئەبێ ئینجا دێتەوە بۆ سلێمانی.

مەلا خالید ئیتر ئەبێ بە مەولانا خالید. ناوبانگێکی زۆر دەرئەکات و، هەزاران مورید و مەنسوب و خەلیفە پەیدا ئەکات. وەک مەلا عەبدولکەریم نوسیویتی: "... بەشی زۆری مەنسوبەکانی مەولانا لە زانا ئایینناسە پایەبەرزەکان بون و، کەسی تر لە ناو پیرانی تەریقەت دا هەڵئەکەوتوە ئەو هەمو مەنسوبەی لە ڕیزی مەلا پایەبەرزەکان دا بێ"

ئەم ماوەیە هاوزەمان بو لە گەڵ ناکۆکی ئەورەحمان پاشا و والی بەغداد لە لایەک و، ناکۆکیی ئەورەحمان پاشا و سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشا لە لایەکی ترەوە. هەروەکو پێشتریش شایەتی ناکۆکی ئیبراهیم پاشا و عوسمان پاشا و، دواییتر ئەورەحمان پاشا و، ئینجا خالید پاشا و ئەورەحمان پاشا و، ئەورەحمان پاشا و والی بەغداد بو.

تەریقەتی نوێ کراوەی "نەقشبەندی" لە ماوەیەکی کورت دا پەرەی سەند. تا ئەوسا تەریقەتی "قادری" باوی بو. شێخانی تەریقەتی قادری لەم تەریقەتە نوێیە نارەحەت بون و چونەوە بەگژی دا. زانای پایە بەرز و گەورەی ساداتی بەرزنجە: شێخ مارفی نۆدێ، سەرکردایەتی ئەم بەگژدا چونەی ئەکرد. کەوتە هاندانی والی بەغداد و مەلاکانی عێراق و میرەکانی بابان دژی م. خالید دواییەکەشی ئاشت بونەوە.

م. خالید سلێمانی بە جێ هێشت (1228) و چو لە بەغداد دریژەی بە ئیرشاد و دەرس وتنەوە دا. لەوێش لە ماوەیەکی کورت دا، جێگەی خۆی کردەوە و، ئەستێرەی کەوتە درەوشانەوە.

کاتێ کە سەعید پاشای والی بەغداد کوژرا و، داود پاشا بە یارمەتی هێزەکانی مەحمود پاشای بابان شاری بەغدادی گرت و، بو بە والی بەغداد و شارەزور و بەصرا. مەحمود پاشا بینی م. خالید پایەیەکی زۆر بەرزی لە بەغداد هەیە، تکای لێ کرد بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. م. خالید گەڕایەوە. بۆ ڕێزلێ نانی م خالید، مەحمود پاشا مزگەوت و خانەقایەکی بۆ بنیات نا و، تا ئێستاش بە ناوی"خانەقای مەولانا خالید" هوە ناسراوە.

م. خالید زانایەکی گەورەی ئایینناس و، ڕابەری تەریقەتی نەقشبەندی، لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا هەزاران مورید و مەنسوب و خەلیفەی هەبوە. بە فارسی و عەرەبی و کوردی: بە هەردو زاراوەی گۆران و بابان. شیعری داناوە. دیوانەکەی چەند جارێ چاپ کراوە. چەندین کتێب و پەراوێزی لە زانستەکانی دین و ڕێوشوێنی تەریقەت دا نوسیوە.

م. خالید ڕەنگە یەکەم کەس بێ کە بناغەی نوسینی پەخشانی کوردی بە زاراوەی بابان دانابێ. "عەقیدەنامەی کوردی - لوبێی عەقائید" ی بە پەخشان نوسیوە. دوای ئەویش شێخ حسێنی قازی (1225 - 1292) "مەولونامە" ی بە پەخشانی کوردی نوسیوە. بە چاولێکەری ئەم دو نامیلکە کوردییە، مەلاکانی کورد چەندین "عەقائید" و"مەولودنامە" ی تریان بە زمانی کوردی نوسیوە.

م. خالید پێش ئەوەی ببێ بە مورشیدی تەریقەت، چەندین شیعری لە ستایشی میرەکانی بابان دا داناوە بە تایبەتی لە ستایشی ئیبراهیم پاشای بنیاتنەری شاری سلێمانی و، ئەورەحمان پاشای بابان دا. هەروەها بۆ "سوکواری" میرە کوژراوەکانی بابان چەندین شیعری هۆنیوەتەوە، بە تایبەتی بۆ سەلیم بەگی کوڕی مەحمود پاشا کە لە زرێبار لە شەڕی والی بەغداد کوژرا و، بۆ میرعوسمان کە ئەویش هەر لە یەکێ لەم شەڕانەدا وەکو م. خالید ئەڵێ: وەکو هاوناوی پێشوی ئەمیش قومی لە "صەهبای شەهادەت" داوە.

م. خالید هەوڵی داوە یەکێتی لە ناو میرەکانی بابان دا پێک بهێنێ: مەحمود پاشا و عوسمان بەگی برای و عەبدوڵا پاشای مامیان ڕێک بخات و پەیمانێکیان پێ ببەستێ. ئەمانە هەرسێکیان لە بەردەمی م. خالید

دا سوێند بە قورئان و تەڵاق و خەنجەر نەخۆن. کە خیانەت لە یەکتری نەکەن و. هەرکاتێ نامە لە حاکمی کرماشان یا والی بەغدادەوە بۆ یەکێکیان بێ، لە یەکتری نەشارنەوە و. لە بەردەمی م. خالید دا بیکەنەوە. پێ ناچێ م. خالید باوەڕی بە پەیمانەکەیان و نومێدی بە ڕێککەوتنەکەیان هەبوبێ، وەکو خۆی لە نامەیەک دا بۆ داود پاشای نوسیوە.

ساڵی (1236ک/ 1820ز) بە هۆی نائارامی سیاسی و. ناکۆکی ناوخۆی میرەکانی بابانەوە، بە یەکجاری سلێمانی بە جێ هێشت و. سەری خۆی هەڵگرت بۆ بەغداد.

م. خالید دوای ئەوەی بوە بە شێخی تەریقەت هیچ شیعرێکی بۆ ستایشی هیچکام لە میرەکانی بابان دانەناوە، هۆی ئەمەش بێگومان ئەوەیە کە ئیتر ئەو بە تەمای هیچ دەسکەوتێکی دنیایی نەماوە. جگە لەوە رەنگە کەسیشیانی بە شایستەی ستایش کردن نەزانی بێ. بە پێچەوانەوە نامەکانی کە بۆ مەحمود پاشای نوسیوە پڕێتی لە گلەیی، ئامۆژگاری، تەنانەت کە مەحمود پاشا داوای گەڕانەوەی لێ کردوە بۆ سلێمانی. بێ پێچوپەنا، داواکەی رەت کردۆتەوە و. داوێتیە بەر لۆمە و پلار. کاتێکیش کە بۆ بە سەر بردنی هاوین رو ئەکاتە گوندێکی ناوچەی سلێمانی و. مەحمود پاشا پێ ئەزانێ و ئەیەوێ بۆ ئاشتکردنەوە و دڵنەوایی کردنی، قازی سلێمانی بنێرێتە لای. م. خالید بێ ڕاوەستان دور ئەکەوێتەوە بۆ یەکێ لە گوندەکانی هەورامان لە کوردستانی ئێران و. لەوێوە ئەگەڕێتەوە بۆ بەغداد.

پێ ئەچێ داود پاشا و. دەسەڵاتدارانی عوسمانی‌یش مانەوەی ئەمیان لە بەغداد پێ خۆش نەبوبێ، بۆیە لەوێش نەمایەوە و. چو بۆ شام.

م. خالید ساڵی 1238ک (1822ز) لە بەغدادەوە چوە شام و لەوێ جێگیر بو. سەرەنجام بە نەخۆشیی تاعون لە دەربەدەری و لە تەمەنی 51 ساڵی دا لە 11 ی زیلقەعیدەی 1242 (7 ی حوزەیرانی 1827ز) دا مرد و. لە شاخی قاسیۆن ناشتیان.(13)

## -8-

ئێران بە تەمای لەشکرکێشی‌یەکی فراوان بو بۆ سەر خاکی رۆم. شازادە عەباس میرزا لە تەورێزەوە بۆ لای ئەرزڕۆم و شازادە محەمەد عەلی میرزا لە کرماشانەوە بۆ کوردستان و بەغداد.

داواکانی شازادە زۆر و قورس بون، بە تایبەتی پارەی زۆر و دیاری داوا ئەکرد. بە مەحمود پاشا هەڵ نەئەسوڕا. شازادە ویستی مەحمود پاشا لابدات و عەبدوڵا پاشا لە جێگەی دابنێ.

مەحمود پاشا داوای لە وەزیر کرد هێزی یارمەتی بۆ بنێرێ. وەزیر هێزێکی کەمی بۆ نارد بە سەرکردایەتی کابرایەک بە ناوی "محەمەد کەهیە". محەمەد لە بەغدادەوە بە رێ کەوت ماوەیەک لە کۆکس لای زەنگاباد و زیاتر لە مانگێ لە شیروانە مایەوە.

شازادە هێزێکی بۆ عەبدوڵا پاشا ئامادە کرد بو گەیشتە خواجایی.

کەیخوسرەو بەگی جاف کە ئەبو یارمەتی مەحمود پاشا بدا لێی هەڵگەڕایەوە دایە پاڵ عەبدوڵا پاشا.

هێزی محەمەد کەهیە هاتە باریکە لە نزیک تانجەرۆ هەڵی دا، بەڵام نەخۆشی لە هێزەکەدا بڵاو بوەوە. هەمو رۆژێ چەند کەسێکی لێ ئەمرد و. ئەوی تریشی لە بەر نەخۆشی و. لاوازی نەیئەتوانی ئەرکەکانی خۆی بە جێ بهێنێ. عەبدوڵا پاشا کە بەمەی زانی لە خواجاییەوە بەرێ کەوت بەرەو گۆرەقەڵا و زەردەلیکاو لە دەربەند دامەزرا.

شازادە لە پای تاقەوە بەرێ کەوت بۆ زەهاو. لە سیروان پەڕییەوە قەرەئولوسی لە زەنگاباد تاڵان کرد.

محەمەد کەهیە هێزە نەخۆشەکەی لە باریکەوە برد بۆ بێستان سور و ئینجا قەرەگۆل.

ئێرانییەکان بۆ دریژە پێدان تا گەیشتنی هێزەکەی شازادە بە ناوی عەبدولا پاشاوە کەوتنە گفتوگۆ.

هێزی هەردولا پێکا هەڵپڕژان. هێزەکانی بەغداد و بابان شکان.

مێژونوسەکانی داود پاشا ئەم شکستە ئەدەنە پاڵ خیانەتی کەهیە. کەهیەش پاش چەند رۆژێ لەم شکانە خۆی و براکانی و خزمەکانی هەڵاتن بۆ لای شازادە.

عەبدولا پاشا چوە ناو شاری سلێمانی. شازادەش رۆژانی موحەرەمی لەوێ بە سەر برد. شازادە بەرەو کەرکوک چو. وەزیر بەغدای قایم ئەکرد ترسی هەبو پەلاماری بەغداد بدا. محەمەد کەهیەش بوبو بە هاوسەفەری شازادە.

نەخۆشی کولێرا لە هیندستانەوە داکەوت بو. گەیشت بوە بەصرا و بەغداد و کوردستان. ئەم نەخۆشییە کەوت بوە ناو ئۆردوی ئێرانیشەوە. شازادە ئەیویست بە پەلە ڕێک بکەوێ. بە هۆی یەکێ لە ئاخوندە ناودارەکانی شیعەوە گفتوگۆ دەستی پێ کرا. شازادە داوای ئەکرد: عەبدولا پاشا لە سلێمانی و محەمەد پاشا لە کۆیە دابنرێن و، ئەوانەی کە پەنایان بۆ ئێران هێناوە چاوپۆشییان لێ بکرێ لەشکری ئێران ناوچەکانی داقوق، توزخورماتو، کفری، قەرەتەپە و دەلی عەباسیان تاڵان و وێران کرد بو. شازادەش توشی نەخۆشی کولێرا بوبو. لە نزیک قزرابات مرد تەرمەکەیان بردەوە بۆ ئێران (1237). مردنی شازادە کۆتایی بەم لەشکرکێشییە هێنا و داود پاشا لە یەکێ لە دوژمنە گەورەکانی ڕزگاری بو.(14)

ئێرانییەکان کشانەوە بەڵام بۆ پشتیوانی لە عەبدولا پاشا هێزێکیان لە سلێمانی دانا بو. مەحمود پاشا چوە سەریان هێزەکەی ڕاونا و عەبدولا پاشای دەرکرد. بەڵام مەحمود پاشا بە هۆی بڵاو بونەوەی نەخۆشییەوە لە سلێمانی نەمایەوە. عەبدولا پاشا فرسەتی هێنا سلێمانی گرتەوە. بەمجۆرە چەند جارێ دەستاودەستی کرد.(15)

## -9-

دوای مردنی محەمەد عەلی میرزا، شا کورەکەی: محەمەد حسێن میرزای لە جێگە دانا. بەڵام ئەم وەکو باوکی پێ نەئەکرا. فەتح عەلی شا کاروباری کوردستان و عێراقی عەرەبی بە عەباس میرزا سپارد. عەباس و محەمەد عەلی حەزیان لە چارەی یەکتری نەبو. لە شەڕی ڕوس دا محەمەد عەلی یارمەتییەکی ئەوتۆی عەباسی نەدا بو.

عەباس میرزا، یەکێ لە پیاوە ژیر و ناودارەکانی خۆی بە ناوی محەمەد حسێن خانی ئیشک ئاقاسی بە نامەیەکەوە نارد بۆ لای مەحمود پاشا. نێردراوی عەباس میرزا لە کەرکوک مەحمود پاشای بینی و نامەکەی دایە. پێ ئەچێ مەحمود پاشا بێ ئومێد بوبێ لە داود پاشا، یارمەتی جەنگیی ڕۆم. عوسمان بەگی برای لە گەڵ محەمەد حسێن نارد بۆ تەورێز بۆ بینینی عەباس میرزا. لەم ماوەیەدا عەبدولا پاشا دیسان لە گەڵ داود پاشا سازا بو گوێی نەئەدایە ئێران. ئێرانیش خەریکی گفتوگۆی ئاشتی بو لە گەڵ عوسمانی. بۆ سەودای ناو ئەو گفتوگۆیە پێویستی بە پاشاکانی بابان بو. عەباس میرزا فەرمانی دا بە ئیبراهیم خانی سەرتیپی باکۆیی دو فەوجی تەورێز و مەراغە لەگەڵ عوسمان بەگ بچنە سەر عەبدولا پاشا لە سلێمانی و، مەحمود پاشا دابنێنەوە.

ئیبراهیم خان، مەحمود پاشای لە جێگەی عەبدولا پاشا لە سلێمانی و عوسمان بەگی لە جێگەی محەمەد پاشا لە کۆیە دانا و گەڕایەوە ئێران. مەحمود پاشا لە دوای ئەم لەشکرکێشییە خۆیشی چو بۆ تەورێز بۆ بینینی عەباس میرزا (1237ک/ 1827ز).(16)

## -10-

لەو کاتەوە کە میر محەمەد کاروباری میرایەتی سۆرانی گرتە دەست، میرایەتی سۆران چوە قۆناغێکی نوێی پێشکەوتن و بەهێزییەوە. بە هەر چوار لای خۆی دا کەوتە پەلهاویشتن و پەرەسەندن. پاشایەتی بابان بە هۆی ململانێی دەسەڵاتەوە لە نێوان مەحمود پاشا و مام و ئامۆزا و براکانیەوە و، بە هۆی دەستێوەردان و لەشکرکێشی ئێرانەوە کز و لاواز بوبو. میری سۆران ئەم هەلەی بە دەرفەت زانی لە قەڵەمڕەوی بابان دا کەوتە پێشڕەوی لای ڕۆژئاوای زێی بچوکی هەمو گرت و، دەسەڵاتی گەیشتە قەمچوغە و سورداش و، لە قەشقۆڵی بنکەیەکی جەنگی دامەزراند (1237).

مەحمود پاشای بابان بە هۆی ناکۆکی ناوخۆوە هێزێکی ئەوتۆی بە دەستەوە نەما بو ڕێگە لە میری سۆران بگرێ. شکاتی ئەبردە بەر عەباس میرزا، ناوچەکەی بۆ بپارێزێ. میری سۆران لە موکریانیش پێشڕەوی کرد بو، شنۆ و سەردەشتی هێنابوە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. عەباس میرزا لە دەس میری سۆران بە تەنگ هات بو، سکاڵای بردۆتە بەر کۆنسوڵی ئینگلیز و، کاربەدەستانی عوسمانی و، داوای لێ کردون پێکەوە لەشکرکێشیەکی هاوبەش بکەن دژی میری ڕەواندز.(17)

## -11-

لەو کاتەدا هێشتا حاڵەتی ئەجەنگ و ئەئاشتی بە سەر پێوەندی ئێرانی - عوسمانی دا زاڵ بو. هەردولا خۆیان کۆئەکردەوە بۆ خولێکی تری شەڕ و، لە هەمان کات دا لە هەوڵی گفتوگۆی ئاشتی دا بون. عەباس بۆ ئەوەی بە چاکترین شێوە کەڵک لە کارتی بابان وەربگرێ سیاسەتی دەرباری قاجاری بەرامبەر مەسەلەی کورد، بە تایبەتی بەرامبەر ناوچەکانی بابان و پاشاکانی، بەم جۆرە داڕشتوە کە لە دو نامەدا بۆ فەتح عەلی شاە ڕونی کردۆتەوە.

### نامەی یەکەم:

"من بە خاکی پێی فەلەک فەرسای هومایون سوێند ئەخۆم و دوژمنی خوێنی دا محەکی شاهنشاهی بم، ئەگەر هەرگیز لە بارەی پێ سپاردنی خزمەتی شارەزور و بابان، خەیاڵی ئەوەم هەبوبێ، بۆ ئارەزوی ئەفس تەماعێکم لە وێ دا هەبوبێ، ویستبێتم سنوری دەسەڵاتی خۆم فراوان بکەم ئەم بوە و نیمە. ئەم خۆ تێ هەڵقورتاندن و پرکێشیەشم سەبارەت بە نۆکەرایەتی و بەندایەتی هەرگیز نەئەکرد و بە جائیزم نەئەزانی کە بە بێ پرس و بێ ئیشارەت فەرمون لە خۆمەوە دەسپێشکەری عەرز کردنی ئەم جۆرە باسانە بکەم، خوا ئەیزانێ کە هیچ شتێ نەبوە بە هۆی ئەم عەرز و جەسارەتە، جگە لەوەی کە لەم دو ساڵەدا کە جەنگی دەوڵەتی عوسمانی لە گۆڕێ بو، هەر جارێ کە من بۆ خزمەت و سەفەر ئەڕۆیشتم لە کوێستانەکان و کوردستانەکانی سنوری ورمێ و ساباڵغ دا دەستدرێژی زۆر ئەکرایە سەر ڕەعیەت و ولایەتەکانی شاهنشاهی، ئەمساڵ بەهار وێرانیەکی زۆر توشی ئاوایی و بەروبومی هەندێ لە ئێلات و ناوچەکان بو، کە منی ناچار کرد و، وای لێ کردم کە بۆ ڕێگە نەدانی وێرانبونی ئەم وێلایەتە بە عەرزی خاکی پێی پیرۆز جەسارەت بکەم و، بۆ ڕێکخستنی کاروباری سولەیمانیە و بابان بە خۆ کەوین، بۆ ئەوەی هەر کاتێ لە لای ئەرزڕۆم و موش و قارسەوە بکەوینە ڕێ و خزمەتێ بکرێ، لەم پشتەوە سەری دڵنیایی و فەراغەتی تەواو لە تصدقی فرقی شاهنشاهی بۆ نۆکەرێک کە لەو ولایەتەوە ئەچێ بۆ سەفەر و خزمەت. ئێستەش کە قیبلەی عالەم - روح العالمین فداە - خزمەتی ڕێکخستنی ئەو لایەی کە بە من سپاردوە. ئەو مەسەلەیە دیارە کە ئەو جۆرە کارانە لە من کە گرفتار و خەریکی چەندین کارم، ئەتوانم بۆ پێشەوە ببەم یان شتێکی ترە، کە خزمەتی گەورەی هەمان یەک کار بێ"(18)

## نامەی دووەم:

"عەرزی نوابی نائیبولسەلتەنە، دام ایام اجلالە، ئەمەیە کە: لە بەر ئەوەی هەمو دەوڵەتانی کافر لەم سەردەمەدا خەریکی ئاشتی و سازانن. منیش هەمیشە هەوڵ و تەقەللامە و، تەلاش و ڕەنجم لەو بوارەدا بۆ ئەوە بوە، کە ناکۆکی لە نێوان دەوڵەتانی ئیسلام دا نەمێنێ. تا ساڵی پار، کار لە ئاشتی و پێکهاتن ترازا و، ماوەی سازان نەما. دوای پێشڕەوی موش و بایەزید و ئەرجیش کە گەڕاینەوە تەورێز لە لای خۆمەوە قایمقامم بە نیازی سازان نارد. ئەوان وەڵامی ڕاستیان نەدایەوە. چەند جار لە گۆشە و کەنارەوە لە دەرگای ئاشتی‌مان دا، بەڵام بە هیچ جێگەیەک نەگەیشتین، تا ئەمساڵ بە خواستی خوا و بەختی شاهنشا، گیانی هەمومانی بە قوربان بێ، توشی ئەو تێشکانە بون. دوای ئەوە دەسبەجێ خەڵکمان نارد و لە لای خۆمانەوە بە ئاشکرا داوای ڕێککەوتنمان کرد و، دواییتر میرزا تەقی مان نارد و ئەو خزمەتە پیرۆزەمان پێ سپارد، ئەویان ناردەوە و بەڵێنیشیان دابویە لە ماوەی چل ڕۆژدا وەڵام بدەنەوە، بەڵام بەجێیان نەهێنا، سەرەڕای ئەوەش دیسان چەند جارێ لە ڕێگەی ئینگلیزەکانەوە، بە هۆی ئێلچی‌یانەوە لە ئەستەموڵ ئەوەمان دەربڕیوە، بەڵام تا ئێستەش بە هیچ جۆرێ وەڵامی ئەوان نەگەیشتوە، بەڵکو لە هەمو لایەکەوە بە گەرمی خەریکی خۆسازدانن بۆ جەنگ و هیچ نیشانەیەکی ئاشتی و سازین دیار نیە. لە گەڵ زانینی ئەمەدا، هەر کات ئێمەش کە نۆکەرانی ئەم دەوڵەتە و سنورداری ئەم مەملەکەتەین، ئەگەر بە هیوای ئاشتی پاڵی لێ بدەینەوە، خۆسازدان پشت گوێ بخەین، ئەوە پێچەوانەی بەرژەوەندی دەوڵەتی قاهیرەیە، بۆیە لە ڕوی شارەزایی و دڵسۆزی‌یەوە بە ئاشکرا ئەم مەسەلەیە عەرزئەکەم:

ئەگەر لە لایەن ئێمەوە پێش دەستی نەکرێ و، مانگی دوەمی بەهار دەچینە ناو خاکی دوژمنەوە، ئەوەندە دوا بکەوین تا جەوزا و سەرەتان بگا و قشون و تۆپخانە و هێز و خواردەمەنی ڕۆمی لە هەمو لایەکەوە کۆبکرێتەوە و، کوردەکان خێزان و ڕان و ڕەوە و کەلوپەلەکانی خۆیان لە کوێستانەکان و هەوارەکان دابمەزرێنن و، سوارە و سپایی‌یان لە هەمو لاوە وەکو مێرولە و کوللە هێرش بهێنن، ئەوسا ئەگەر بمانەوێ جەنگ بکەین یاخود بمانەوێ ئاشتی بکەین کارەکە گران و، چارە دژوار ئەبێ، لوتبەرزی و لە خۆبایی بونی ڕۆمی لە ئاشتی دا و، هێزو توانایان لە جەنگ دا زۆر زۆر زیاد ئەبێ. بەڵام هەر کات ئێمە لێرەوە زو بجوڵێین، تا کوێستانەکان بەفری لێ دەچۆتەوە و ئەوان ناتوانن لە کەلێنەکانی دا بحەوێنەوە، بچینە ناو خاکی دوژمنەوە و لە پێش ئەوەدا قشونی عوسمانی کۆببێتەوە شەرارەتی ئەشراری کورد، کە مایەی هەمو شەڕ و فەسادێک هەر ئەوانن، بە فەزڵ و کەرەمی ئیلاهی و تالیعی سەرکەوتوی شاهنشاهی لە بەر یەک هەڵ بوەشێنین و، بە ویستی خوا لە موش بەرەو خوار ڕاویان بنێین، ئەوسا ئەگەر بمانەوێ جەنگ یا ئاشتی بکەین، بە یارمەتی خوای گەورە، ئاسان ئەبێ و بە سوکی مەیسەر ئەبێ، لوتبەرزی و بابیبونی ڕۆمی ئەگۆڕێ بە خۆشڕویی و زەبروزۆریشیان ئەبێ بە کزی و ناتەوانی.

لەبەر ئەو هۆیانە ئەگەر بیری شاهنشاهی هاتە سەر ئەوەی کە پێشدەستی بکرێ، قشونی سوارە، کە مەئمور و تەرخان ئەکرێن، ئەبێ کاتێ لەوێوە بجوڵێن کە لە کۆتایی حەمل دا یا ئەگەر زۆر دوا بکەون لە سەرەتای سەوردا بگەنە تەورێز، تا قشونی ئێرەش دوا نەکەوێ، بە بێ چاوەڕوانی بەو پەڕی پشت ئەستوری‌یەوە، ئینشائەڵڵا، هەر لەو کاتەدا بکەونە خزمەت، لەم حاڵەتە دا کە ئەگەر لە سەرەتای سەورەوە دەس بە کاری ئەم بکرێ ئومێدەوارین تا سەرەتای میزان، بە ئاشتی بێ یا بە جەنگ، بتوانرێ لەم لایەوە دڵنیایی بە دەس بێ.

کاتی لەشکرکێشی بۆ سەر بەغدایش هەر لەو دەمانە دایە، کام نیعمەت باشتر و بەرزترە لەوەی کە لەم عەزیمەتی شاهانەیەدا پەروانەی ئیحزاری ئێمە بگات. لەم سەفەرەدا مولازیمی ڕیکابی فەلەک فەرسا بم و،

گیانبەختکەرانە لە حوزوری میرا دەر بکەوین. لەبارەی جولانی مەوکیبی جیهانگرەوە فەرمان فەرمانی ئەشرەفی هومایونە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕوی کەمالی عاتفیەتەوە لە ئێمە پرسیارتان فەرمو بو، بە پێی فەرمانی باڵایان عەرز ئەکرێ کە مەوکیبی پیرۆز هەرچی زوتر لە سوڵتانیەوە بکەوێتە ڕێ بۆ سازدانی سوپا و کۆکردنەوەی سەربازانی سەرکەوتو، پەنا بۆ ئیحتسابی ڕوس و ڕۆم و دڵنیایی ولایەتەکانی سنور باشترو خۆشترە، بەڵام بە دیارە لە پاش مانگی شەووال دا زۆر زوە و، ئەو کاتانە زۆر زۆر پیرۆزە و لە هیچ جێگەیەکەوە کۆسپ و گرفتاری نابێ. بگرە پێشکەوتنی هەمو کارەکان بە جۆرێ کە چەندین جار تەجروبە کراوە تالعی هومایونی لە زیاد بونی شاهنشاهیە کە بە فەزل و تەئیید و تەوفیقی ئیلاهی تیشکی چاودێری سوڵتانی لە هەر کەس بدات و، ڕوی جولانی پیرۆزی بکاتە هەر لایەک، هەر کاتێک بێتە پێشەوە بێ زەحمەت و پەشۆکان بۆ پێشەوە ئەڕوا. لەبەر ئەوەی قەول وایە هەر بڕیارێک دەربارەی ئەو لایە بدرێ بە درێژی عەرزی خاکی پێی پیرۆز بکرێ، ئەوەندە ئەخرێتە بەر چاو، کە حکومەتی شارەزور و بابان و دەوروپشتەکانی بە گوێرەی ڕێگە پێدانی پیرۆز دراوەتە محەمەد پاشا (مەبەستی مەحمود پاشای کوڕی ئەوڕەحمان پاشایە) دڵنیایی لە ڕاستی ی باوەڕ و خزمەتگوزاری ئەو کە ئەبێ ئێستە و پاشەڕۆژ بە دی بێت، بە چەند شتێک ئەهێنرێتەوە کەوا یەکە عەرز ئەکرێ:

یەکەم: گلدانەوەی بارمتە، لەبەر ئەوەی کوڕە باشەکانی ئەو و، ئەو و عوسمان بەگ، کە هەردوکیان لە کرماشان بون، لەگەڵ ئەوەش دا ئەم سەرپێچیەیان لە یەک دوو ساڵ دا کرد. گلدانەوەی ئەم جۆرە بارمتەیەم بە مایەی دڵنیایی ئەزانی و بڕیاری ئەوەم دا لە کاتی سەفەری خەیر ئەسەردا، عوسمان بەگ خۆی لە گەڵ هەزار سوار یا زیاتر لە ئەعیان و گەورە و گەورەزادەکانی بابان ئینشائەڵڵا و تەعالا لە گەڵ بخا و لە پێشڕەوی سپای سەرکەوتودا، بە ڕاشکاوی و ئاشکرا دژی سپا و سەرعەسکەری عوسمانی بجەنگن

دووەم: بە ئاموشۆی محەمەد پاشا و عوسمان بەگی برای کە ماوەیەک بەر لە ئێستا عوسمان هات، مانگێک لە تەورێز مایەوە و، شەوی جەژن پاشا خۆی تکای کردوە، ئینشائەڵڵا و تەعالا دێت و، ئەو کە ڕۆیشت دیسان عوسمان بە فەزڵی خوا دێتەوە و، بەو شەرتەی بمێنم لە گەڕانەوەدا بە هەمان ڕێوشوێن ناهێڵم دیسان لە هاتوچۆ سارد بێنەوە.

سێیەم: سەرەڕای هەبونی قشون و سپا و ئیستیعدادی دەوڵەتی قاهیرە لە ویلایەتی بابان کە تا ئێستە ئیبراهیم خانی سەرتیپ، کە چەن جار لە تاقم و سپای بابان زۆرتر و زاڵترە و، لەو شوێنانە بوە. لە ڕۆژانی سەفەریش دا، باوەڕ پێکراوێک لە وێ دائێنم و ئەوەندەی قشون کە لە غازییانی سەرباز و سوارەی ڕیکابی بە ساخلو لەوێ دابنێم. لە باتی ئەوان لە سوارەی بابان و بڵباس و هی تر ئەبەم بۆ سەفەر و، لە ڕاستی دا خەڵکی کوردستان و ئەردەڵان و سابڵاخی موکری هەمویان پشتگیر و بارمەتیدەرئەبن و، ئەگەر بە قازانجی دەوڵەتی بزانن ئیشارەتی خدێوییانە سەبارەت بە بارمەتی دا لە کاتی پێویست دا ئەفەرمون.

چوارەم: هۆی سەرەکی پەژارەیەک کە کەسانی وەکو محەمەد پاشا هەیانە لەوەیە کە باری سەنگینی دراو و کەلوپەل و تەماع و تەووەقوع بخرێتە سەر شانیان و، لە عۆدەی نەیەن و، بەڵێن و گفتێک بدەن و دوایی بۆیان جێبەجێ نەکرێ و لە هەردولاوە بێتە هۆی ترس. ئێمەش ئەلحەمدولیللا دەبارێکمان خستۆتە سەر شانی ئەو و، نە تەماع و تەوەققوعێکمان هەیە. ئاسان ئاسان پێشکەشی سەرکاری پیرۆزی کە لە حەزرەتی هومایون دا دەختینەمان گرتۆتە خۆ ئینشائەڵڵا تەعالا ئەیدەین. بۆ ئیبراهیم خانمان نوسیوە لەو مەڕو گا و قاتر و یابو ئەو جۆرە شتانەمان لێ وەربگرێ و، بە قشونی فەرمان پێ دراوی بدات و فەزڵی خوا حسابی ئەوەش. بریتییەکەی هەرچۆنێک بێ لە کەلوپەلی بێ کەڵک و دراوی بێ بەرەو تا خۆمان بۆ سەفەر ئەڕۆیشتوین ئەی دەین. بێگومان ئەوانە کە بریتییەکەی دا و خزمەتی باشی کرد. بێ هودە ئەم خزمەتە لە دەس نادا و، پاش دانی پارەکە پێچەوانەی ڕێوشوێنێک ناجوڵێتەوە کەببێتە هۆی ناڕەحەتی هومایون.

پێنجەم: ولایەتی شارەزور و کۆیە و حەریر لە سێ لاوە بە سابڵاغ و ئەردەڵان و سنورەکانی کوردستان و کرماشانەوە بەستراوە. کە مەملەکەتی پارێزراوی سەرکاری شاهنشاهی‌یە و. لایەکیشی بە شوێنی دەسەڵاتی وەزیری بەغدادەوە بەسراوە. لە هەر ڕێیەکەوە ئاژاوە و فەسادێک لەو ولایەتە و ئەم تایەفەیەوە بگات. تەنیا لەو لایەوەو بەس. ئەو لایەش لەم کاتەدا کە ئیبراهیم خانی سەرتیپ و محەمەد پاشا تا موصڵ ڕۆیشتون و کەرکوک و هەولێر و پردی سور غاشیەی دڵسۆز و گوێڕایەڵی‌یان دەربڕیوە. وەزیری بەغدادیش بەجۆرێ خزمەت و سازدانی پیشان داوە کە ئائێستا دو سێ جار پیاوی ئەو هاتونەتە لای سەرتیپ و محەمەد پاشا و. بە پێی نامەیەک کە نوسی بویان بە گشتی کارەکانی ئەوێ ئەڕوا. ئەگەر لە پێش چونی ئێمەدا بۆ سەفەر ئینشائەڵلا تەعالا. بە شێوەیەک کە مەبەستی ئەولیای دەوڵەتی قاهیرەیە. کاری بەغداد و وەزیر بۆ پێشەوە چو. لەو لایەشەوە دڵنیا ئەبین و ئەوێش لە حوکمی ولایاتی مەحروسەی شاهنشاهی دا ئەبێ. هەر کاتێ پێشکەوتنێ پێک هات. عەزمێک کە لە کاری بەغدادا مەبەستی هیمەتی بەرزی سوڵتانی لەو بەهار و هاوینەدا کاروباری ئەوێ بەلادا ئەخات و ئەگەر ناتەواوی‌یەک بمێنێ لە فەسڵی پایزدا. ئەگەر بژی. لە کاتی گەڕانەوەی ئێمەدا. ئینشائەڵلا ئەتوانین زستان لە گەرمیانی عێراقی عەرەب دا بە سەربەرین و. بەغداد ئێستا لە سایەی سەری هومایونەوە ئەو توانایەی نەماوە بەرگەی هەڵمەتی لەشکری جیهانناشوبی شاهنشاهی بگرێ.

شەشەم: عەبدوڵا پاشا کە گەورەترین و بەساڵاچوترین پاشایانی بابانە. لە گەڵ هەزار ماڵی ئێلی بابان. کە زۆریان لە پیاوی ناسراو و ئاغا و گەورەکانیانن. لێرەن. بەوپەڕی ڕێز و بەرزییەوە گلمان داونەوە و بە تەما هەین لەم ڕۆژانەدا لە دەوروبەری سابڵاغ بەش و تیولی بدەینێ. ئەم ڕێگەیەش ترسی مەحمود پاشا ئەبێ.

بە پێی ئەم ڕێوشوێن و شێوەیە کە بە درێژایی خرایە بەرچاو. ئومێدم وایە لە کاتی لێرە نەبونی ئێمەدا لە کاروباری ئەم لایەدا هیچ چەوتی و کەموکوڕی‌یەک ڕو نەدا. بە فەزلی خودا باتنی ئیمامە پاکەکان متەوەکیلین و. بە ئیمدادی تالعی ئەقدەسی هومایون متەوەسیلین. ئەو تەگبیرەی بە بیری ئێمەدا هاتوە بەم درێژی‌یە ڕونمان کردۆتەوە و ڕونی ئەکەینەوە. ئینشائەڵلا لە گەڵ تەقدیر موافیق ئەبێ و. تکام وایە کە هەر یەکێ لەو برگانە بگاتە بەر خاتری عەرش مەزاهیری وەحی و تەنزیل بە ئیرشادو هیدایەتی بفەرمون و. نامەی پیرۆز زوتر بگات کە هیچ کارێ بێ ئیجازە و عەرزی شەهریاری نەکرێ"(19)

## -12-

ئێران و عوسمانی لە شەڕی یەکتری ماندو بوبون. ڕوسیا بوبوە هەڕەشەیەکی بەردەوام بە سەر هەردوکیانەوە. نوێنەرانی ڕۆم و عەجەم لە ئەرزڕۆم کۆبونەوە.

هەردولا گەیشتنە ڕێککەوتنی یەکەمی ئەرزڕۆم (1238ک/ 1822ز). لەم ڕێککەوتنەدا کێشەکان باس کران و چارەی سەرەتایی‌یان بۆ دانرا: کێشەکانی سنور. بازرگانی. حەج و زیارەتی پیرۆزگاکانی عێراق. دیاریکردنی ڕێوشوێنی کۆچی گەرمیان و کوێستان. ڕەفتار لە گەڵ ڕاکردوانی یەکتری.

مادەی یەکەمی ئەم ڕێککەوتنە دەربارەی بابان بو:

"هەر دو دەوڵەتی بەرز ئەبێ دەس وەرنەدەنە کاروباری ناوخۆی یەکترییەوە. لێرە بە دواوە خۆ تێ هەڵقورتان لە لای بەغداد و کوردستانەوە نەشیاوە. لەوانە مەڵبەندەکانی سەر بە سەنجەقەکانی کوردستان. بە هیچ بەهانە و لە هیچ ڕویەکەوە دەوڵەتی بەرزی ئێران نابێ ڕێ بە خۆ تێ هەڵقورتان و. دەستدرێژی و. پەلامار بدا و. دانەی موتەصەڕڕیفەکانی پێشو و لەمەودوایان بدات لەو شوێنانەدا ناو براون. لە بابەت ڕەسمی ئاسایی گەرمیان و کوێستان و. هەر دەعوایەکی تر. بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ناخۆشی نێوان هەردو دەوڵەت. ئەبێ لە لایەن ئەمیر و وەلیعەهدی دەوڵەتی ئێران و وەزیری بەغدادەوە بەلادا بخرێ."

گفتوگۆکانی ئێران و عوسمانی و، پێکهاتنیان لە ئەرزرۆم، لەناو لایەنگرانی رۆم و عەجەم دا لە بابان دا، بە دو جۆری جیاواز دەنگی داوەتەوە شێخ مارفی نۆدێ لە نامەیەک دا، کە دور نیە بۆ مەحمود پاشای بابانی نوسی بێ، ئەڵێ:

"ادعو لجناب الباشا بالعافية وسلامة الايمان، وهما اعظم مهمات الانسان، وادعو له بالرجوع الى هذا المكان، سالكا مسالك العدل والاحسان!

قد ذكر عندنا ان الروم والعجم تصالحوا على رد هذه البلاد الى الروم، لكن هذا الامر مجهول عندنا غير معلوم، فان صح هذا القول فبشرنا حتى نخبر الناس، فتطمئن القلوب وتنفرج الكروب، ولك الثواب الجزيل والاجر الجميل، وان كان هذا القول كاذبا، فخبرنا حتى ندبر للخروج الى بلاد الاسلام.

والدعاء لله كلام ختام الداعي(20)

شێخ مارف، لای خۆیەوە، گرەدبڕ کێشەکەی بەلادا خستوە کە ئەگەر لەو ڕێککەوتنەدا بابان درابێتەوە بە ڕۆم ئەوا مژدەی بدەنێ بۆ ئەوەی ئەمیش بە خەڵک بڵێ، خۆ ئەگەر وانەبێ وا ئاگاداری بکەن بۆ ئەوەی وڵاتەکە بە جێ بهێڵێ و ڕو بکاتە وڵاتی ئیسلام، مەبەستی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عەسمانی بوە.

چەندین ساڵ بو دەرباری ئێران بە هۆی پاشاکانی بابانەوە نفوزیان لە کوردستان دا جێگیر بوبو. ئەم ڕێککەوتنە نفوزی ئێرانی لە کوردستان دا نەئەهێشت. پێ ئەچێ پاشا و میرەکانی بابان، ئەوانی سەر بەئێران بون، لەم ڕێککەوتنە ترسابن و، هانایان بردبێتە بەر فەتحعەلی شا کە ئێران دەستی لێ هەڵگرتون.

فەتحعەلیشا لە نامەیەک دا بۆ عەباس میرزای کوڕی، نائیبولسەڵتەنەی خۆی، کە لەباتی ئێران لایەن بو لەم ڕێککەوتنەدا، نوسیوێتی:

"... وێنەی هەمو بەندەکانی موعاهەدنامەیەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی خرایە بە رچاو..

ئەگەرچی زۆری مادەکانی بە پێی ویست و داواکاریەکانی دەوڵەتی عوسمانی داڕێژرا و، قازانجی ئێران لە هەندێ مادەی دا ڕەزاو نەکراوە بەڵام چونکە جێگیری هومایونی ئێران ئارەزوی لە ئارامیی وڵات و خەڵک و، نەمانی خوێنڕێژی و فەسادە و، ئەو ڕۆڵەیەمان بۆ ئەم موعاهەدە و موصالەحەیە دەسەڵات و ڕێگە دابو وەکالەتی تەواومان دابویە هەمو ئەرک و مەرجەکانی لە بەڵگەی نێردراو دا نوسرابو قبوڵ و ئیمزامان کرد، لە بنچینەی ڕێککەوتن و ئاشتبونەوەی هەردو دەوڵەتی ئیسلام ئەوپەڕی خۆشی دەرئەبڕین. لە بابەت هیچ مادەیەکیانەوە قسەی نیە "مەگەر لە بابەتی ئێلی بابانەوە کە ساڵەهای ساڵە ڕوی تەوەککولیان کردۆتە ئەم دەوڵەتە و، دەستی تەوەسسولیان بە داوێنی خانیمانی دەرگای ئێمەوە گرتوە و، هەر کات ئەوان حوکمەن و حەتمەن بە وەزیری بەغداد بسپێرین... شکانی شانە بۆ دەوڵەت و پێچەوانەی غیرەت و سەڵتەنەتە. لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆڵەیە تکای دەوڵەتی عوسمانی سەبارەت بە ئێلاتی حەیدەرانلو و سیپکی کە لە زەمانی زوەوە سەر بە دەوڵەتی ئێران بون و، دانیشتوی خوی ئێرەوان بون جێبەجێ کردوە لە گەڵ ئەوەی دەربارەی ئەم دوهۆزە بە هیچ جۆرێ ڕێگەی قسەی ئەوان نەبو تەنیا بۆ ئەوان شکانی شانی ئەو دەوڵەتەی تیا نەبێ. توشی عوسر و حەرەج نەبن سەختگیری و ئیستادەگی نەکراوە و قازانج و چاکەی پێکهاتنی نێوان موسڵمانان بۆ میهامی دەوڵەت و دین لەم شتە بچوکانە ڕەزاوکراوە... ئەبێ لە بابەت ئێلی بابانەوە گفتوگۆیەکی مەصڵەحەت ئامێز و مەوەددەت ئەنگێز تاوەکو چۆن لەو لاوە دەوڵەت و غیرەتی سەڵتەنەت ڕەزاو کراوە بۆ ئەم لایەش ڕەزاو بکرێ... "(21)

عەباس میرزا، لە نامەیەک دا بۆ محەمەد ڕەئوف پاشا والی ئەرزرۆم ئەم داوایەی کردوە کەوەکو چۆن ئێران دەستی هەڵگرتوە لە داوای گێڕانەوەی ئێلەکان سیپکی حەیدەرانلو، عوسمانیش دەس لە داوای گێڕانەوەی ئێلی بابان هەڵبگرێ..."(22)

عوسمانی داوای گێڕاندنەوەی ئێلی بابانی نەکردبو، بەڵکو داوای لە ئێران کردبو دەستهەڵبگرێ لە دەستێوەردان و خۆ تێهەڵقورتاندن. ئەمە دو بابەتی جیاواز بون.

لە نامەیەکی تردا عەباس میرزا کە دیسان بۆ ڕەئوف پاشای نوسیوە دەربارەی هەمان مەسەلە ئاگاداری کردوە، کە حسێن خان و بێگلەربێگی ئەریوان ڕاسپێردراوە بە دوی ئەم مەسەلەیە بکەوێ و، ئەنجام وەربگرێ.(23)

محەمەد حسێن خان سەرداری ئەریوان چەند نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی عوسمانی سەبارەت بەم مەسەلەیە نوسیوە. نامەیەکیان بۆ ڕەئوف پاشای والیی ئەرزڕۆم. لەم نامەیەدا نوسیویەتی: "بەڵام لە بابەتی ئێلی بابان و هەندێ برگەی جوزئیەوە کە شایانی شانی دەوڵەتی قاهیرە نیە ڕەخنەیەکی پاشایانە بە وەلیعەهد کراوە چونکە عەلیانی ئێلی بابان ئیستیدعا و داخوازییان لە شاهنشا کردوە، کە سپاردنەوەی ئێمە بە دەستی بەسراو بە دەوڵەتی عوسمانی لە مروەت دور و پێچەوانەی غیرەتی شاهانەیە"(24)

بە هەمان ناوەرۆک نامەیەکی تری بۆ والیی قارس نوسیوە. حسێن خان لە نامەیەکی تردا هەوڵیدا ئەمانیش بکاتە هاودەنگی بۆ ئەوەی بابی عالی ڕازی بکەن دەسکاری ئەو ماددەیە بکەن سەبارەت بە ئێلی بابان.(25)

ئەم نامانە هەموی 1239 واتە یەک ساڵ دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتنەکە نوسراون. بابی عالی پێی داگرت لە سەر مانەوەی هەمو ماددەکانی پەیمانەکە و، بە هیچ جۆرێ ملی ئەدا بۆ هیچ گۆڕین و دەسکارییەک. سەرەنجام ئێرانیش، بێ ئەوەی گوێ بداتە گلەیی پاشاکانی بابان، وەکو هەبو قوبوڵی کرد.

## –13–

پێ ئەچێ مەحمود پاشا نائومێد بوبێ لەوەی دەرباری ئێرانی بیەوێ یا بتوانێ هیچ گۆڕینێ بە سەر ڕێککەوتنەکەی ئەرزڕۆم دا بهێنێ. دیارە لە چارەنوسی خۆی و، پاشە ڕۆژی مانەوەی لە ئێران دڵنیا نەبو. مەحمود پاشا نامەیەکی پڕ لە پاڕانەوەی بۆ داود پاشا نوسیوە و، "خالید بەگی ئامۆزای لە باتی خۆی بۆ دەخالەت ڕەوانەی دەرگای لێبوردن و بەخشینی بێ پایانی حەزرەتی وەلی نیعمەت" کردوە. لە نامەکەی دا بەیتێکی پڕ ماعنای مەولەوی ڕۆمی نوسیوە کە ئەڵێ:

لە دەس پێکردنی سەردەمی ئادەمەوە تا زەمانی پادشا

لە گەورەکان لێبوردن بوە و، لە ژێر دەستەکانیش گوناح. (1240ک/ 1824ز).(26)

پێ ناچێ مەحمود پاشا بەخشرابێ، یاوەکو بەو جۆرەی ویستبێتی بەخشرابێ، چونکە دوای ئەوەش پێوەندی لە گەڵ ئێران، بە تایبەتی لە گەڵ عەباس میرزا، هەر بەهێز بوە.

## –14–

عەباس لە نامەیەک دا کە بۆ مەحمود پاشا "حاکمی سلێمانی و شارەزور و کۆیە و هەریر"ی ناردوە (1242ک/ 1826ز) گلەیی لێ ئەکا کە وەکو بەڵێنی دابو سوارەی بابان لە کاتی دیاریکراودا نەگەیشتون بۆ هاوبەشی لە شەڕی ڕوس دا داواکەی لێ دوبارە ئەکاتەوە و، بیری ئەخاتەوە کە ئەمە قازانجی دین و دنیای تێ دایە.(27)

سوارەی بابان ئەبێ لەم شەڕەدا بەشدار بوبن. چونکە هەر ڕاستەوخۆ هەمان شەوی مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی تورکمانچای (1243ک/ 1827ز) عەباس میرزا نامەیەکی بۆ مەحمود پاشا نوسیوە ئاگاداری ئەکا لە ڕێککەوتنە کە و، داوای لێ ئەکا هەواڵەکە بە خەڵک ڕابگەیەنێ. (28)

مەحمود پاشا لە نامەیەکی تایبەتی دا ئەم هەواڵە و، هەندێ لە ناوەرۆکی ڕێککەوتنەکەی بۆ سەید مەحمود نوسیوە کە ئاگاداری کاربەدەستانی بەغدا بکا.(29)

## -15-

لە کاتێک دا مەحمود پاشا هێزی سازدا بو بچێ بۆ گرتنەوەی هەریر هێشتا لە نزیک کۆیە بو. سلێمان بەگی برای تاقمێکی زۆری کرد بو بە هاودەنگی خۆی و. لە مەحمود پاشا هەڵگەڕایەوە. سلێمان چوە گڵەزەردە دامەزرا و. دوای ئەوە چوە کفری. نۆکەرەکانی لەوێ دانا و خۆی چوە بەغداد. داود پاشا ڕقی لە مەحمود پاشا بو. ئەم هەلەی قۆستەوە. مەحمود پاشای لێ خست و. سلێمانی بە پلەی پاشا کرد بە حاکمی بابان و. هێزی دا بە سلێمان بچێ بۆ گرتنی سلێمانی.

هەردو برا بە خۆیان و هێزەکانیانەوە لە "قەرەگۆل" تێک هەڵچون. مەحمود پاشا شکا (1243ک/ 1827ز). سلێمان پاشا چوە سلێمانی و مەحمود پاشا کشایەوە بۆ بانە.

مەحمود پاشا لەشکری هۆزەکانی بانە، سەردەشت، پشدەر و مەرگەی کۆکردەوە و. دیسانەوە چوەوە سەر سلێمانی. سلێمان پاشا لە "گردەگرۆێ" بەرەنگاری لەشکرەکەی مەحمود پاشا بو شکانی (1244ک/ 1828ز).

مەحمود پاشا کۆڵی نەدا و چوە تەورێز ئەمجارە لەشکری عەجەمی هێنا و. قەهرەمان میرزای کوڕی عەباس میرزاشی لە گەڵ خۆی هێنا بو بۆ سلێمانی (1246ک/ 1830ز). بە تەما بو کچێکی خۆی بدا بە قەهرەمان میرزا و. کچێکی عەباس میرزایش بۆ یەکێ لە کوڕەکانی بهێنێ. سلێمان پاشا، سلێمانی بە جێ هێشت کشایەوە زەنگاباد. هێزی لە بەغداد داوا کرد. هێزیان بۆ نارد و چوە سەر سلێمانی. مەحمود پاشای دەرکرد. بەڵام مەحمود پاشا لەشکری ئێرانی لە گەڵ خۆی هێنایەوە. هەردو لەشکر دیسان لە داڵپارێز تێکهەڵچون. سلێمان لەم شەڕەدا بریندار بو. بە برینداری هەڵات (1247ک/ 1831ز). مەحمود پاشا چوە سلێمانیەوە بەڵام سلێمان پاشا دیسان خۆی سازدایەوە و. یارمەتی هێزی لە بەغداد داوا کرد مەحمود پاشای دەرکرد و خۆی گەڕایەوە سلێمانی.(30)

## -16-

بە هۆی ناکۆکیی ئەم دوبرایەوە: مەحمود پاشا و سلێمان پاشا. ناوچەکە کارەساتێکی گەورەی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، فەرهەنگی، بەسەر هاتوە.

- ناوچەکە بوە بە ژێر پێ ی لەشکرەکانی ئێران و تورکیاوە. چەند جارێ لە بەینی ئەم دو هێزەدا دەستاو دەستی کرد. دەستێوەردانی ئێرانی لە جاران زیاتر بو. تەنانەت وای لێ هات، ئێرانیەکان "پادگان" ێکی هەمیشەییان لە سلێمانی دانا. هەمیشە چەند سەد سەربازێکی ئێرانی تێ دا بو. ئەمانە ببون بەبارێکی قورس بە سەر ورگی دانیشتوانی ناوچەکەوە.

- لە ئەنجامی شەڕ و شۆڕشی بەردەوام دا وڵاتەکە کاول و. دانیشتوانی کەم بۆتەوە. تاعونیش بوەتە سەرباری ئەگبەتیەکە. فرەیزەر کە لە سەردەشتەوە بەرەو سلێمانی بەڕێ ئەکەوێ، بەدرێژایی ڕێگەکە گوندێکی ئاوەدان بە دی ناکا تەنانەت کە ئەگاتە سلێمانی بە ناو کەلاوەی خانوی روخاودا ئەی بەن بۆ ئەو خانوە داتەپیوەی تەرخان کرابو بۆ ئەم و. بەرەیەک نابێ بۆی ڕابخەن. سلێمان پاشاش لە کەناری شار دا لە ناو خێوەتێکی هەژارانەدا، بێ هیچ دەبدەبەیەکی پاشایانە، پێشوازی لەم میوانە ئەکا.

زۆری پیشەکار و بازرگان و جوتیارەکان هەڵاتن بۆ رەواندز و کەرکوک و موسڵ. دانیشتوانی سلێمانی لەو کاتەدا لە پێنج هەزار کەس کەمتر بۆتەوە.

- خەڵک ئەوەندە هەژار و ئەدار ئەبن. کاتێ سەرکردەی هێزە ئێرانیەکە ئەکاتە سەر پاشای بابان 200 تمەنیان بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی ژیانیان بۆ پەیدا بکا. سلێمان پاشا. بە خۆی و هەمو

دەوڵەمەندەکانی سلێمانی، ئەو چەردە کەمەی پێ هەڵناسوڕێ. محەمەد فەیزی زەهاوی کە دوای بوو بە ئەستێرەیەکی زانستی پرشنگداری ئاسمانی عێراق و، بو بە موفتی هەمو عێراق، لەو کاتەدا مەلای مزگەوتی ئەورەحمان پاشا ئەبێ. هاوسەرەکەی منالی ئەبێ. زەهاوی، لە باتی ئەوەی بەم ئەوزانە دڵخۆش بێ، پەژارە دای ئەگرێ، چونکە ئەوەندە پارەی پێ نابێ خۆراک بۆ ژنە زەیستانەکەی یا جلوبەرگ بۆ کۆرپە ساواکەی بکڕێ. لە کاتێک دا مەلا گوزەرانی بەو جۆرە بوبێ، ئەبێ خەڵکی سادە چۆن ژیا بن.(31)

- باری خوێندەواری ئەوەندە بۆ دواوە چوە، شێخ مارف نۆدێ لە نامەیەک دا کە بۆ والی بەغدای نوسیوە ئەڵێ لەوەتەی شای عەجەم ئەم وڵاتەی داگیر کردوە، شیرازەی دین و دنیا تێک چوە. ئاواییەکان وێران بون و نوێژی جەماعەتیان تێ دا ناکرێ، مەدرەسەکان چۆڵ بون لە قوتابی... مەدرەسەکەی ئەو پێشتر 70 قوتابی تێی دا خوێندویەتی بەڵام لەو سەردەمەدا کەم بونەتەوە بۆ 10 کەس.(32)

- نائارامی بە جۆرێ وڵات دائەگرێ کە فرەیزەر ئەیەوێ بچێ بۆ سەیری شوێنەوارەکانی عەربەت، پاشا ڕێگەی نادا لە ترسی ئەوەی ئەوەکو ڕوتی بکەنەوە. عەربەت چەند کیلۆمەترێ لە سلێمانیەوە دور بوە.

ئەم کارەساتە بێ گومان کاری کردۆتە سەر پاشەڕۆژی ناوچەکە و، زەمینەی لاوازبون و ڕوخانی میرایەتیەکەشی خۆش کردوە.

## -17-

بابی عالی ئەیویست ولایەتەکانی عێراق بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ. پێشتر چەندجارێ هەڵی دابو. والی لە ئەستەموڵەوە دائەنرا. بەڵام هەمو جارێ لە ئەنجامی پیلان گێڕانی مەمالیک دا سەری نەئەگرت و، سەرەنجام والییەک لە "مەمالیک" دائەنرا و، بابی عالی بە ناچاری قوبوڵی ئەکرد.

داود پاشا بەهێز بوبو. هەوڵی ئەدا سەربەخۆ بێ. بابی عالی بڕیاری دابو کۆتایی بە دەسەڵاتی مەمالیک بهێنێ. بۆ ئەم مەبەستە عەلی ڕەزا پاشا ئامادەیی خۆی دەربڕی.

عەلی رەزا والی حەڵەب و، شارەزای کاروباری عێراق بو. بۆ ئەوەی لەم ئەرکەدا سەرکەوتو بێ، سەرەڕای حەڵەب، سوڵتان ولایەتەکانی بەغداد و موسڵ و دیاربەکریشی پێ سپارد.

عەلی رەزا هێزی سازدا بۆ سەر بەغداد. داود پاشا ویستی بەرهەڵستیی بکات. پاش ماوەیەک جەنگی ڕەوانی و پروپاگەندە و هەندێ وردەشەڕ، هێزەکانی عەلی رەزا لە ڕەبیعی دوەمی 1247ک/ ئەیلولی 1831ز چونە بەغداوە. داود پاشا خۆی بە دەستەوە دا. عەلی رەزا بە گیراوی ڕەوانەی ئەستەموڵی کرد. لە کۆبونەوەیەکیش دا کە ئەبو فەرمانەکەی سوڵتانی تێ دا بخوێنرێتەوە عەلی رەزا مەمالیکی قەتڵوعام کرد. بەمجۆرە کۆتایی بە دەسەڵاتی مەمالیک هات.

## -18-

لابردنی داود پاشا (1249ک/ 1833ز) و، پاش ئەمەش بە ماوەیەک مردنی عەباس میرزا (1249ک/ 1833ز)، کاری لە ڕوداوەکانی سلێمانی کرد.

عەباس چاوی تەماعی بڕی بوە کوردستان. بۆ ئەو مەبەستە پشتیوانی لە مەحمود پاشا ئەکرد. بە مردنی عەباس، مەحمود پاشا پشتیوانێکی بە هێزی لە دەس دا. بە لێخڕان و گیرانی داود پاشاش، لە دوژمنێکی سەرسەخت و خوێنەخۆێ ڕزگاری بو. بەو هیوایەی سەرلەنوێ بگەڕێتەوە سەر تەختەکەی خۆی گەڕایەوە سلێمانی و، بە ڕواڵەت لە گەڵ سلێمان پاشای برای دا ئاشت بوەوە، ژیانێکی گۆشەگیری بۆ خۆی هەڵبژارد. بەڵام زۆری نەخایان دیسان کەڵکەڵەی حوکمڕانی لەکەللەی دا .

لە کاتێک دا سلێمان پاشا چو بو بۆ لەشکرکێشی بۆ سەر رەواندز، مەحمود پاشا هەڵات بۆ کەرکوک. عەلی رەزا پاشا بانگی کرد بۆ بەغداد و، بە ناوی یارمەتی دانی والی موسڵەوە ناردی بۆ موسڵ. لەوێ خۆی دەسبەسەر رەوانەی ئەستەموڵ کراو بڵاوەشیان بە نۆکەرەکانی کرد (1250ک/ 1834ز)(33)

## -19-

کە مەحمود پاشا لە کوردستان دور خرایەوە سلێمان پاشا ئیتر هیچ ملۆزمێکی نەما بەربەرەکانی لە گەڵ بکا. بە داخەوە بەرێوەبردنی کاروباری وڵات بەڵام زۆر نەمایەوە مرد (1254). لە گردی سەیوان لە سلێمانی ناشتیان. ئەحمەد بەگی کوری لە جێگەی ئەو بو بە پاشای بابان. "نالی" بەم بۆنەیەوە شیعرێکی هۆنیوەتەوە ستایشی هەردوکیانی کردوە و، شیوەنە بۆ مردنی سلێمان پاشا و ستایشە بۆ ئەحمەد پاشا، ساڵی مردنیشی بە حسابی ئەبجەدی دیاری کردوە.(34)

## -20-

شێخ مارفی نۆدێ یەکێ بوە لە پیاوە بە تەمەنەکانی سلێمانی لە قەڵاچوالانەوە تا دروستکردنی سلێمانی و، دوای ئەوەش پەنجا ساڵ زیاتر هاوزەمانی پاشا و میرەکانی بابان و، شایەتی روداوەکانی ناوچەکە بوە. شێخ مارف بەرهەمێکی زۆری بە جێ هێشتوە، بەڵام توخنی روداوەکانی ناوچەکە نەکەوتوە و، هیچی لە سەر نەنوسیوە. چەند نامەیەکی لە دوا بەجێ ماوە، ئەمانە نرخی مێژوییان هەیە.

شێخ مارف زۆر بێزار بوە لە لەشکرکێشیەکانی ئێران و، لە ململانێ و ناکۆکیی ناوخۆی میرەکانی بابان. لەو نامانەدا بە جێ ماون بە لایەنی کەمەوە 3 جار و لە 3 سەردەمی جیاوازدا ویستویەتی سلێمانی بە جێ بهێڵێ:

- جاری یەکەم نامەیەکی شیعری دورودرێژی بۆ سوڵتانی عوسمانی نوسیوە سکاڵای لە دەس هەلومەرجی نائارامی ناوچەکە و، بەرێوەبەرانی خراپ ئەکا و، داوای لێ ئەکا شوێنێکی تری بۆ دیاری بکا کۆچی بۆ بکا.
- جاری دوەم نامەیەکی بۆ داود پاشا نوسیوە لەوێش دا هەمان داوای دوبارە کردۆتەوە.
- جاری سێیەم نامەیەکی بۆ عەلی رەزا پاشا نوسیوە، داوای لێ ئەکا بە خاوخێزانەوە بیگوێزێتەوە بۆ کەرکوک و، پێویستیەکانی ژیانی لە داهاتی بەشیر و ئەو ناوچانە بۆ دابین بکا، وەکو لە سەردەمی داود پاشادا بەڵێنی پێ دراوە.

ویستەکەی شێخ مارف نەهاتۆتە دی، جا خۆی دواجار وازی لە کۆچکردن هێناوە یا داواکەیان جێبەجێ نەکردوە، یا قازانجی دەوڵەت و والیەکان لە مانەوەی شێخ دا بوە لە سلێمانی، دیار نیە. شێخ مارف ساڵی 1254ک (1838ز)، کە هەمان ساڵی کۆچی سلێمان پاشای ئەورەحمان پاشایە، مردوە و، لە گردی سەیوان بە خاک سپێدراوە (35)

## -21-

ئەحمەد پاشای کوری سلێمان پاشا، پیاوێکی هەڵکەوتوی رۆشنبیر و شارەزای کاروباری بەرێوەبردنی دەوڵەت بوە. لەو ماوە کورتەی حوکمڕانی دا دەستی کردوە بە ئەنجامدانی چەند کاری گرنگ لەوانە:

- هەوڵێکی زۆری داوە بۆ رێکخستنەوەی هێزی چەکدار "نیزام" لە سەر شێوەی سپا نوێیەکانی دنیا. چوار تیپی هەزار کەسیی رێک خستوە. پلەی سپایی بۆ دیاری کردون و، مەشق و جلوبەرگ و موچە و چەکی بۆ دابین کردون.(36)

- بایەخێکی زۆری داوە بەخوێندن و خوێندەواری. مزگەوتی تازەی دروست کردوە و، ڕێزی مەلاکانی گرتوە و، ژیان و پێداویستییەکانی دابین کردون. گوندی لە سەر وەقف کردون و، کتێبخانەکەی مزگەوتی گەورەی ناوەدان کردۆتەوە. ژمارەیەکی زۆری کتێبی بۆ کڕیون یا بە نوسینەوەی داوە. تەنانەت دوای دورخرانەوەشی لە کوردستان بەردەوام کتێبی بەنرخ و نایابی بۆ ئەم کتێبخانەیە ناردۆتەوە. دوای ئەو هەمو کارەساتەی بە سەر سلێمانی و کتێبخانەکەدا هاتوە تا ئێستاش دەیان کتێبی بەنرخ کە ئەحمەد پاشا وەقفی کردوە هێشتا لە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی دا ماوە.

هەر لەم سەردەمەدا شیعر بە لەهجەی بابان گەشەی کرد و، "قوتابخانەی شیعری بابان" لە لایەن 3 کوچکەی هەڵکەوتو: نالی، سالم و کوردییەوە، دامەزرێنرا.

- هەوڵێکی زۆری داوە بۆ چەسپاندنی ئاسایشی سەر و سامانی خەڵکی و، سزادانی جەردە و ڕێگر و چەتە. هانی کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازی داوە.

## -22-

چەند ساڵێ بو مەحمود پاشا دور خرا بوەوە بۆ تورکیا. سەرەنجام دەوڵەت بەخشی و، ڕێگەیان دابگەڕێتەوە بۆ کوردستان. والی بەغداد، عەلی ڕەزا پاشا، دایناییەوە بە پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کێشایەوە بەغداد (1256ک1840ز). مەحمود پاشا نزیکەی ساڵێ حوکمی سلێمانی کرد. عەلی ڕەزا ئەمی لادا و، ئەحمەد پاشای لە جێگەی دانایەوە. مەحمود پاشا بە خۆی و خێزان و دەسوپێوەندەکانیەوە دیسانەوە هەڵات بۆ ئێران (1257ک/ 1841ز).

## -23-

لە ئەنجامی گفتوگۆکانی ئەرزڕۆم دا، لیژنەیەکی چوار قۆڵی ئێرانی، تورکی، ڕوسی، ئینگلیزی، خەریکی دیاریکردنی هێڵەکانی سنوری ئێران - عوسمانی بون. هەردو دەوڵەت لە ناوچەکانی سنوردا کێشە و گیروگرفتیان بۆ یەکتری دروست ئەکرد و، زۆریان لە دانیشتوانی سەر سنورەکان ئەکرد بۆ ئەوەی خۆیان بە هاووڵاتی ئەو دەوڵەتە ساغ بکەنەوە. ئەحمەد پاشاش هەوڵێکی زۆری دا لە ناوچە سنورییەکانی خۆی دا بۆ ئەوەی بە لای عوسمانی دا ڕایان بکێشێ کاربەدەستانی ئێرانی لێی داخ لە دڵ بون. چەند جارێ گازاندەیان لێ ئەکرد و، داوای دورخستنەوەیان لە کاربەدەستانی عوسمانی ئەکرد.

ئەحمەد پاشا ئەیویست ئاسایش لە ناوچەکەی خۆی دا بپارێزێ. لە سنوری ئێرانەوە چەند جارێ دەستدرێژی ئەکرایە سەر ناوچەی بابان و، تاڵانی ئەکرا و، ئەگەڕانەوە هەورامان. ئەحمەد پاشا، بۆ تەمێ کردنیان، هەڵی کوتایە سەریان و زەرەرێکی زۆری لێ دان. ئێران ئەمەی کرد بە بیانو دیسان شکاتی لە ئەحمەد پاشا کردەوە. کاربەدەستانی عوسمانی ئیتر بە تەما بون دەسەڵاتی میرایەتییەکان ئەهێڵن والی بەغداد بۆ هەلێ ئەگەڕا بۆ دورخستنەوەی میرەکانی بابان و، هەڵتەکاندنی بناغەی دەسەڵاتیان. شکاتی ئێرانییەکانی کرد بە بیانو، ئەحمەد پاشای بانگ کردە بەغداد و، بە بیانوی ئەوەی دەستدرێژی کردۆتە سەر ناوچەیەک کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا نیە، لە بەغدا گلی دایەوە (مارتی 1842ز). عەبدوڵا بەگی برای بۆ سەرپەرشتی ناوچەکە دانرا.(37)

## -24-

مەحمود پاشا لە سلێمانی کە هەڵات پەنای بۆ ڕەزاقولی خانی والیی ئەردەڵان برد (سەرەتای 1257ک/ 1841ز).(38)

رەزاقولی خانی کوری خەسرەو خانی ناکام بو. دایکی کچی فەتحەعلی شا و توباخانمی هاوسەری کچی عەباس میرزا و خوشکی محەمەد شا بو. لەم ڕێگەیەوە نزیک بو لە دەربار. پاش ئەوەی ماوەیەک مەحمود پاشا بە پەنابەری لای والی مایەوە، رەزاقولی خان و توبا خانم بردیان بۆ تاران بۆ سەردانی شا. شا لە دوای بینینیان خەلعەتی بەنرخی دانێ و ڕێگەی دان بگەڕێنەوە کوردستان. فەرمانی بە رەزاقولی دابو کە دوای گەڕانەوەیان پرس و ڕاوێژ بە وەزیر و گەورە پیاوەکانی ئەردەڵان بکەن، ئەگەر بە چاکیان زانی مەحمود پاشا بگێڕنەوە سەر کاری خۆی لە سلێمانی و ملّوزمەکەی دەربکەن.

والی لە گەڕانەوەدا بۆ کوردستان پێش ئەوەی بچێتەوە ناو شاری سنە لە باخێکی کەناری شاردا خێوەتی هەڵدا و، کەوتە سازدان و کۆکردنەوەی هێز. بە نیازی دانانەوەی مەحمود پاشا بە حاکمی موڵکی بابان. لەشکرێکی زۆر پۆشتەی ئامادە کرد. هێزەکەیان کرد بە دو بەشەوە:

- بەشێکیان بە سەرکردایەتی ئەمانوڵا بەگی وەکیل لە گەڵ مەحمود پاشا نارد بۆ سلێمانی.

- بەشەکەی تریان لە گەڵ والی لە مەریوان بارگەیان خست. مەحمود پاشا و لەشکرەکەی هێنا بوی بەبێ شەڕ گەیشتە نزیک سلێمانی.(39)

لەو کاتەدا دوامیری بابان ئەحمەد پاشا دەستی لە کارکێشابوەوە بە دەسبەسەری لە بەغداد دەژیا. کاروباری بابان بە عەبدوڵا پاشای برای سپێردرا بو دەوڵەتی عوسمانی خەریکی تەواو کردنی ڕێوشوێنی لە ناوبردنی میرایەتی بابان بو.

عەبدوڵا پاشا لە نامەیەک دا، کە لە رۆژی 5 ی جیمادی الاخری 1258/ 14 ی تەمموزی 1842 دا بە بۆنەی ئەم شەڕەوە نوسیوێتی، لە ڕێگەی ئەحمەد پاشای برایەوە ناردویەتی بۆ کاربەدەستانی عوسمانی. ئەحمەد پاشاش نامەکەی بۆ سەرعەسکەری ڕۆم لە ئەرزرۆم ناردوە، رەوتی ڕوداوەکان بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"لە هاتنی والی سنە و مەحمود پاشا بۆ سەر سنوری ولایەتی شارەزور و، لە دەستدرێژیانم ئاگادار کرابون. درێژیی باسەکە بەم جۆرەیە: رەزاقولی خان والی سنە بو دانانی مەحمود پاشا لە سلێمانی بە هێزێکی زۆرەوە لە سنەوە بەڕێ کەوت تا گەیشتە سەر سنوری شارەزور. لە هەمو لایەکەوە ئاژاوە و پشێوییان دایەوە. لەشکری هەورامانیان نارد مەحاڵەکانی گوڵعەنبەر و هەڵەبجەیان داگیر کرد. لە لایەکی ترەوە مەحاڵەکانی قزڵجە و تەرەتوڵ و ئالان و سیوەیلیان گرت و، پیاوی خۆیان بۆ حوکمرانی لە سەر دانا. لەبەر ئەوەی کار بەم رادەیە گەیشت و پێی بێگانە داخڵی موڵکی مەحروسەی شاهانە بو، غوڵام ناچار بە لە شاری سلێمانییەوە بۆ پاراستنی سنورەکان چومە شارەزور. حسێن ئاغای ئەندەرونی و حاجی محەمەد ئاغای میرئاخوری پێشوم نارده لای والی ناوبراو کە ئەم جۆرە جوڵان و رەفتارانەی بەرامبەر مەمالیکی مەحروسەی شاهانەی ئەنوێنێ، بە تەواوی پێچەوانەی مەرجەکان و قانونەکانی نێوان هەردو دەوڵەتە. ئەگەر هەر کاتێ لای کاربەدەستانی دەوڵەتی خۆیان بەهانەیەکیان بە دەستەوە بێ، پێشانی بدەن بۆ ئەوەی ئێمەش هەوڵی چارەسەرکردنی بدەین. ئەگینا دەس لەم کارانە هەڵبگرن و، ناوچە داگیرکراوەکان بەجێ بهێڵن و بگەڕێنەوە. والی ناوبراو قسەی حسابیی قوبوڵ نەکرد، بە زۆریی لەشکرەکەی مەغرور و بەقسەی ئەوان وایان زانی بو لە زۆری لەشکرەکەیان ئەترسم. دو مەنزڵی تر هاتنە پێشەوە تا گەیشتنە پێنجوێن لەوێ خێوەتیان هەڵدا. لەوە بێ ئاگا بون کە من لە لێپرسینەوەی شەهریار و گلەیی داوەر سڵ ئەکەم نە لە ترسی زۆریی ئەوان من بۆ دوربینیی هێواش هێواش مەنزڵێکم ئەکرد بە دوان و سێیان تا گەیشتینە لای قزڵجە بۆ ئەوەی دەستی دستدرێژی بۆ سەر موڵکی پارێزراوی شاهانە کورت بکەینەوە و، شوێنە گیراوەکان بەجێ بهێڵن و بگەڕێنەوە. کەڵکی نەبو و بە هیچ جۆرێک کەگەیشت. ئەو رۆژەی من گەیشتمە قزڵجە، ئەو شەوە والی هەزار کەس سواری بە سەرکردایەتی ئەمانوڵا خان (ڕاستەکەی میرزا هیدایەتوڵایە)، کوڕەزای محەمەد

ڕەشید بەگ، کە لە بنەماڵەگەورەکانی کوردستانە، بۆ دانانی مـەحمود پاشا لـە سلێمانی نـارد بـو و، 7 سـەد تفەنگچی بە سەرکردایەتی قوباد بەگی فەراشباشی لە ڕێگەی شاخەوە نارد بۆ دەربەند، کە لە پشـتی دۆربەوی منەوە بو بۆ ئەوەی ڕێگە لە من بگرن. چونکە ئەوە ڕێگەی هاتوچۆی ئێمە بـو، ئێمەشـیان بـە تـاقمێکی کـەم دەزانی. خۆیشی لە گەڵ پێنج شەش هەزار سوارە و تابورێک نیـزام هاتـە سـەر دۆربەوەکـەی مـن.. شـەڕ بـە ناچاری ئێخەی گرتم پشت بە خوا کەوتینە بەرەنگاری. لە نزیک دۆربەوەکەی ئێمـەوە هـەردولا لـە یـەکیان دا پاش نیو سەعات سێ چارەک بە پێ ی ئایەتی: "کم من فئە قلیلة غلبت فئة کثیرە باذن اللە" سـەرەڕای کـەمیی ئێمە و زۆریی ئەوان توانای بەرهەڵستی‌یان نەما و مەیدانیان بەجێ هێشـت و شـکان. نزیکـەی نیـو سـەعات دوایان کەوتین و گەڕاینەوە ئەگەرچی مەیدانی شەڕەکە ئەرزی عێراق بو، بەڵام لە نیـو سـەعات زیـاتر دوایـان نەکەوتین ئەوەکو لە سنور تێ بپەڕین. لە پێش شەڕەکەش دا هەمو عەسکەرەکانمان تێ گەیاند بو کـە لـە هـیچ جۆرێ لە سنور تێ نەپەڕن ئەو شەوە لە شوێنی شەڕەکەدا ماینـەوە، بـەیانی زو بـۆ سـەندنەوەی سلێمانی لـە دەس ئەمانوڵاخان و مەحمود پاشا ڕومان کردە سلێمانی. قوباد بەگ کە سەر ڕێگـەی لـە ئێمـە گـرت بـو، بـە بیستنی شکانی والی هەڵات و، مەحمود پاشا و ئـەمانوڵا خـانیش کـە چوبونـە سـەر سـلێمانی. بـە بیسـتنی گەڕانەوەی من و هەواڵی تێشکانی والی، شار و ئاواییەکانی نزیکیان تاڵان کرد بـو. چەنـد کەسێکیشـیان بـە نارەوا کوشتوە. کەلوپەلی تاڵانکراویان بە وڵاخی ئاغایان و نۆکەرەکانیان و قەتارچی‌یەکان گواسـتۆتەوە. بـۆ سەندنەوەی ئەم تاڵانی‌یە دوایان نەکەوتین چونکە دەبو بچینە ناو سنوری ئەوانـەوە. ئـەوەش بـێ فـەرمان و ویستی ئاصـەفانە نەئـەکرا دەسـتمان لـە هـەمو ئـەو کەلوپـەل و ئێسـتر و مـاین و ڕەوە و گەلەیـە هـەڵگرت ناوچەکانی شارەزور کە داگیریان کرد بو هەمویان تاڵان کـردوە. چەنـد ژن و پیاویـان کوشـتوە. سـێ سـەد خێزانیان بۆ لای بانە ڕاگواستوە من کە گەیشـتمەوە سـلێمانی مەملەکـەت وێـران و تـاڵان کـرا بـو. زەرەر و زیانێ کە ئەم جارە بە هۆی ڕەزاقولی خانی والی سنەوە بـە سـلێمانی و ناوچـەکانی شـارەزور گەیشـتوە، لـە حساب نایەت"(40)

عەبدوڵا پاشا زۆر لە سەر تێشکانی والی و، ئەو زەرەرە گیانییەی لە هێزەکەی گـەورەپیاوانی ئـەردەڵان و، ناووناوبانگی والی کەوتوە، ئەدواوە.

مێژونوسەکانی ئەردەڵان هۆی ئەم تێشکانە ئەدەنە پاڵ خیانەتی میرزا هیدایەتوڵای وەزیـری والـی. وا ئەگێڕنەوە کاتێ والی لە تاران بوە لە کۆڕێکی تایبەتی خـۆی دا هەڕەشـەی کوشـتنی لـە میـرزا هیدایـەتوڵا و میرزا جەعفەری کوڕی کرد بو. میرزا هیدایەتوڵا ترسی ئـەوەی ئـەبێ کـە ئەگـەر والـی بـە سـەرکەوتویی لـە سەفەرەکەی بگەڕێتەوە ئەم لە ناو ببات. لەبەر ئەوە گوایە: هەم تەگبیرێکی خراپی بـۆ دابەشـکردنی هێزەکـانی والی کردوە و، هەم بە دزێنی پێوەندی لە گەڵ عەبدوڵا پاشادا هـەبوە. لـە جموجـوڵی لەشـکرەکەیان ئاگـاداری کردوە.(41)

ڕەنگە ئەمە بیانو بێ بۆ ئەو شکستە قورسەی بە سەر والی دا هاتوە. ئەگینا هیچ بەڵگەیەک ئەئەوسـاو نە ئێستا بە دەستەوە نیە پشتیوانی لەم قسەیەی مێژونوسەکانی ئەردەڵان بکا. مێژونوسەکانیش یەک لە دوای یەک قسەکانی ئەوانەی پێش خۆیان دوبارە کردۆتەوە.

دوای ئەم ڕوداوە والی لە کارخرا.

ئەم تێشکانە، ئەوی ڕاستی بێ، تێشکانی مەحمود پاشا و پاشایەتی بابان بو. زیـاتر پـاڵی بـە هـەردو دەو ڵەتەوە نا هەوڵی بەلاداخستنی کێشەکانی سنور و، دانانی سنورێ بۆ ئەم جۆرە گیروگرفتانە دابنێن.

دوای ئەم سەرکەوتنە والـی ڕێگـەی بـە ئەحمـەد پاشـا دا بگەڕێتـەوە کوردسـتان. کۆیـە و هـەریریش خرایەوە ژێر دەسەڵاتی ئەم.

## -25-

ڕێککـەوتنی یەکـەمی ئـەرزڕۆم (1238ک / 1822ز) چـارەی بـۆ زۆر لـە کێشـەکانی نێـوان هـەردو دەوڵەت دیاری کردبو، بەڵام کۆتایی بـە ناکۆکیـیەکانیان نـەهێنا. گفتوگـۆ و، کێشـمەکێش لـە نێـوان هـەردو دەوڵەت دا بەردەوام بو. ڕوسیا و بەریتانیا کەوتبونە بەینەوە بۆ نزیک کردنەوەی باری سەرنجی هـەردولا لـە یـەکتری ئـەوانیش لـە کۆبونـەوەکانیان دا بەشـداریان ئـەکرد و، بیروبۆچـونی خۆیـان لـە سـەر مەسـەلەکان دەربـڕی. سـەرەنجام هـەردولا گەیشـتنە یـەک، ڕێککـەوتنی دوەمـی ئـەرزڕۆمیان ئیمـزا کـرد (1263ک /1847ز).

لەم ڕێککەوتنەدا، پێیان لە سەر بەنـدە گرنگـەکانی ڕێککـەوتنی یەکـەم داگرتـەوە و، هەنـدێ کێشـەی گرنگی تریان بەلادا خست. لە مەسەلەی کوردستانیش دا سەودایەکیان کرد و ڕێـک کـەوتن. مـاددەی دوەمـی ڕێککەوتنەکە بۆ ئەمە تەرخان کرا بو، ئەڵێ:

"دەوڵەتی ئێران بەڵێن ئەدا کە دەس لە هەمو ئەرزە دەشتاییەکانی ولایەتی زەهاو، واتە ئـەرزەکانی لای ڕۆژئاوای، بۆ دەوڵەتی عوسمانی هـەڵ بگـرێ. دەوڵـەتی عوسـمانیـیش بـەڵێن ئـەدا دەس لـە لای ڕۆژهـەڵاتی ویلایەتی زەهاو، واتە هەمو ئەرزە شاخاوییەکانی ئەوێ لە گەڵ دەرەوەی کرند بۆ دەوڵەتی ئێران هەڵ بگرێ.

دەو ڵەتی ئێران بە توندی بەڵێن ئەدا کە واز بهێنێ لە هەمو خواسـتەکانی خـۆی لـە شـار و ویلایـەتی سلێمانی دا. هیچ کاتێ دەس وەرنەداتە مافی خاوەنێتیی دەوڵەتی عوسمانی کە لە ویلایەتی ناوبراودا هەیەتی.

دەوڵەتی عوسمانیش، بە توندی بەڵێن ئەدا کـە شـار و بەنـدەری موحەمـەرە و جزیـرەی ئـە لخـزر و لەنگەرگا و ئەرزەکانی لێواری خۆرهەڵات و، واتـە لای چـەپی شـەتولعەرەب کـە بـە دەس ئێلـە ناسـراوەکانی ئێرانەوەیە، بە موڵکایەتی لە دەس دەوڵەتی نێـران دا بـێ. سـەرەرای ئـەوەش، مـافی ئـەوەی ئـەبێ کەشـتیی ئێرانی بە ئازادی تەواو لەو شوێنەوە کە ئەڕژێتە دەریاوە تا شوێنی یەکانگیری سنوری هـەردولا لـە ڕوبـاری ناوبراو هاتوچۆ بکا."

ئەم ڕێککەوتنە بناغەی سیاسی هاوبەشی هەردو دەوڵەتی بەرامبـەر میرایەتیـیـە کوردیـیـەکان و مەسـەلەی کورد دارشت و، کۆتایی بە حوکمی بنەماڵە خۆجێییەکان هێنا لە هەردو بەشی کوردستانی عوسمانی و ئێرانی دا

## -26-

عەبدولا بەگ کەڵکەڵەی میرایەتی لە سەری دابـو. شـەوێک لـە گـەڵ نۆکـەرەکانی هـەڵات بـۆ بەغـداد. نەجیب پاشا بە خۆشییەوە پێشوازی کرد. نەجیب پاشـا ئەیویسـت دەسـەڵاتی ئـەم بنەماڵـە خۆجێییانـە لـە بنەڕەتەوە هەڵتەکێنێ. پێی خۆش بو میرەکانی بابان لە ناو خۆیـان دا نـاکۆک بـن ئـەجیب پاشـا لەشـکری سازدا بۆ سەر ئەحمەد پاشا لە نزیک کۆیە بارەگای خست. هێزەکەی نزیکەی 3 هەزار کـەس ئـەبو عەبـدولا بەگ چاوساغی لەشکر بو. ئەحمەد پاشا هێزەکانی خۆی سازدا. فەوجەکان و سـوارەی ئێلـەکانی کـوردی کـۆ کردەوە. ئەویش لە نزیک کۆیە بەرامبەر ئۆردوی تورک بارەگای دانا.

شەوێک ئەبێ بە تۆفان و گێژەڵوکە و ڕەشەبا. چەند سەعاتێ درێژە ئەکێشێ تۆفانێکی بێ وێنە ئەبێ. تفەنگێک بە هۆی گێژەڵۆکەوە بەر ئەبێتەوە سەر ئەرز گوللەیـەکی لـێ دەرئـەچێ. لەشکری بابـان وا ئـەزانن شەبەیخونی تورکە. ئەمانیش هەر کەسە لە ئاستی خۆیەوە دەس ئەکا بە تەقە. ئەحمەد پاشـا زۆر هـەوڵ ئـەدا ئارامیان بکاتەوە و تەقە ڕابگرن. کەڵکی نابێ. لەشکر بڵاوەی لێ ئەکەن. ئەحمەد پاشا بـە نائومێـدی سـواری وڵاخەکەی ئەبێ و ئەگەڕێتەوە سلێمانی. لەشکری بۆ کۆ ناکرێتەوە. نەجیب پاشا هێزێکی 2 هەزار کەسیی لـە گەڵ عەبدولا بەگ ئەنێرێ بۆ ڕاونانی. ئەحمەد پاشا هەر ئەوەندە فریا ئەکـەوێ خێـزان و دەسـوپێوەندەکەی

دەرباز بکا و. ڕو دەکاتە مەریوان. عەبدولا بە پلەی پاشا لە لایەن نەجیب پاشاوە بە قایمقامی سلێمانی دادەنرێ (1264ک/ 1848ز).(42)

## -27-

هەروەکو کاروباری میرایەتی بابان بەرەو تێکچون دەرۆیشت، کاروباری میرایەتی ئەردەڵانیش بەرەو نەمان خلۆر دەبوەوە. پشێوی و ئاژاوە و پاشاگەردانی تێ کەوت بو. خەسرەو خان کە مرد (1250) کوڕەکانی: ڕەزاقولی خان و غولامشا خان، هێشتا منداڵ بون. ڕەزاقولی خانی کوڕە گەورەی تەمەنی یانزە ساڵ بو. لە جێگەی باکی بو بە والیی ئەردەڵان. لە باتی خۆی دایکی کاروباری بەڕێوە دەبرد ناکۆکی نێوان ڕەزاقولی و غولامشا و. پیلانگێڕانی ژنانی سەر بە دەربار نێوانی کوڕ و دایک و. برا و برای تێک دا. ناکۆکییەکانیان وەها قوڵ بوەوە و درێژەی کێشا سەرەنجام دەربارەی قاجار بیری لەوە کردەوە کە کۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەردەڵان بهێنێ. کەسانێ لە دەرەوەی ئەم بنەماڵەیە بکاتە حاکمی کوردستان هەلومەرجی ئەردەڵان بە تەواوی شێوا. لە ئەنجامی ئەم ناارامییە سیاسییە دا زۆر لە کەسایەتییە ناسراو و دەسەڵاتدارەکانی ئەردەڵان ئاوارەی ئەملاوئەولا بون. لە ناو ئەوانەدا دو لە کەسایەتییە ڕۆشنبیرە هەڵکەوتوەکانی ئەردەڵان: شاعیر و مێژونوس، مەستورە و. شاعیر و سیاسی، حسەینقولی خانی کوڕی ئامانولا خانی ئەردەڵان، ئاوارەی سلێمانی بون و. هەردوکیان بە ناکامی لەوێ مردون.

مەستورە، ماهشەرەف خانمی کچی ئەبولحەسەن بەگی قادری، کاتی خۆی وەکو بەشێ لە نرخی ئاشتبونەوەی بنەماڵەکەی ئەوان و والیی ئەردەڵان دا درا بو بە خسرەو خان مەستورە، نوسەری "تاریخ اردلان" یەکێکە لە ژنە هەڵکەوتوەکانی کورد. سەرەڕای ئەوەی مێژوی ئەردەڵانی نوسیوەتەوە بەشێکی گرنگی هەواڵەکانی میرایەتی بابانیشی لە ناو مێژوە بە نرخەکەی دا تۆمار کردوە. مێژوی بابان تا ڕادەیەکی زۆر قەرزاری ئەم ژنە بلیمەتەیە.

حسەینقولی خان، بە شیعرە سیاسییەکانی هەندێ لە ڕوداوەکانی سەردەمی خۆی، لەوانە شەڕەکەی 1258ک/1842ز. بە بیرێکی ورد و هەستێکی بەسۆز تۆمار کردوە و. شیوەنی بۆ قوربانییەکانی کردوە.

مەستورە خۆی کۆچی ناچاریی خۆیان لە سنەوە بۆ سلێمانی و. مردنی ناوەختی حسەینقولی خانی پورزای و. ئینجا نەخۆش کەوتنی خۆی، کە ئیتر لە تەمەنی 44 ساڵی دا بە سەری دا مردوە، بەمجۆرە دەگێڕێتەوە:

"لە بەرەوەتر باسمان کرد، کاتێ کە خەسرەو خانی گورجی (ئەرمەنی) گەیشتە ناوچەی کوردستان و بە بەڵێن و سوێندی فراوان ڕەزاقولیخانی هەڵفریواند و بە لای خۆی دا ڕاکێشا، محەمەد سوڵتان خان و سەرلەبەری پیاوماقوڵانی ولایەتی ئەردەڵان ماڵ و ژن و منداڵی والی و زۆربەی خەڵکی ئەردەڵانیان بەرەو هەورامان کۆچ دا و لەو کاتەدا من. نوسیاری ئەم دێڕانە یەکێ لەو کۆچ کردوانە بوم هەر کە گەیشتنە شوێنێ کە ناوی هۆشبارانیە. حەسەن سوڵتانی هەورامی بە پیری کۆچکردوانەوە هات و بە شێوەیەک کە شایانی پلە و پایەیان بێ ڕێ و ڕەسمی پێشوازی لێ کردنیانی بە جێ هێنا.

لەو دەمەدا خان ئەحمەد خان کە لە گەڵ والی دا دوری نێو یەک قەپیلک و ئەستێرەی یەک بورج بون. فەرمانڕەوای مەریوان بو. سەبارەت بەوەی کە والی لە گەڵی دا نێوانیان خۆش نەبو. ئەمەی بە هەل زانی و. بەرەو ناوچەی هەورامان هات و مرخی لە گرتنی کۆچ کردوەکان خۆش کرد بو. بەڵام هەر کە دیتی خەڵکەکە بە جارێ دەستیان لە گیانی خۆیان شوشتوە و هەروا بە ئاسانی خۆیان بە دەستەوە نادەن. لەو کارە کشایەوە.

ئەو شەوە کۆچ کردوەکان کە هەزار کەس زیاتر بون، لە گوندی هۆشبارانیان بە سەر برد. بۆ سبەینێ کە هێشتا ڕۆژ هەڵ نەهات بو بنە و باریان ڕادا و لە ڕێگەیەکی ناهەموار و سەختەوە، کە هەڵۆی بەسەردا فڕیدا پەڕی دەوەری و مانگی پێ سوکی ئاسمانی لێوە تێ پەڕی بدا دەکەوتە خواری بۆ نێو کەندەڵان و هەڵدێری پەستی و هەپرون بە هەپرون دەبو. تێ پەڕین و بە گوندێ لە گوندەکانی شارەزور گەیشتن. کە نێوی سەرگەتە و لەوێ لێی گیرسانەوە. ئینجا لەوێوە محەمەد سوڵتان و میرزا عەبدوڵای مونشی باشی چون بۆ سلێمانی و بە خزمەت عەبدوڵا پاشای بابان گەیشتن و ڕێ و ڕەسمی پێشوازی لێ کردنیان بە جێ گەیاند و پیاوماقوڵێکی لە تەکیان دا نارد بۆ ناوچەی شارەزور، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بە سەر گوندەکانی شارەزوردا بەشرێنەوە و دابین بکرێن.

لە باسی خونچەی باخی خەسرەوانی، نوێباوەی بێستانی کامەرانی، ئەمانوڵڵاخانی سانی دا لە بیرمان کرد لەوە بدوێین کە لەو کاتانەدا دڵسۆزانی گیان فیدای ئەو زاتە هەر دەستەیەکیان کەوتنە وڵاتێکەوە و هەر برێکیان لە بنارێک دا گیرسانەوە. حوسەین قولیخانی مامی ئەمانوڵڵاخان کە پورزای من، نوسیاری ئەم کتێبەش بو، ڕوی لە سلێمانی کرد و بەو پەڕی ڕێزەوە لەوێ پێشوازی لێ کرا و گیرسایەوە و کاتێکیش هەوالی کۆچی ئێمەی بیستەوە خەڵکێکی زۆر بە ئەسپ و هێسترەوە نارد، سەد کەسێ لە بنماڵەی ئێمە بگوێزنەوە و لە لایەن خۆیشیەوە جێگەی هێورین و گوزەرانی بۆ ئامادە کرین و هەر یەکەی بە پێی پێداویستی خۆی کۆمەک و یارمەتی دەدا و لە خزمەتی دا کاتمان بە خۆشی بەسەر دەبرد، بەڵام پاش چەنانێ، چارەنووسی خودا لە خۆش گوزەرانی ئێمە ڕازی نەبو، ئەوەبو لە ڕۆژی 14 ی مانگی زیلحجەی 1263ک (1846/11/23ز) دا جەنابی حوسەین قولی خان نەخۆشی بە سەری دا زاڵ بو، لە ماوەی شەو و ڕۆژێک دا گیانی بە بەهەشتی بەرین شاد بو و لە پرسەکەی دا هەزاران سینەی بۆ هەڵ دران و منی مەستورەی سەر لێ شێواو و دەربەدەریش لە دوری لێک دابڕانی ئەو گیانە نازیزەم دوسێ ڕۆژێکە لەش و ڕۆحم بە بەڵای تای نەخۆشیەوە دەتلێتەوە. بزانین خودا چیمان بەسەر دێنێ و ئارەزوی بە چیە."(43)

مەستورە بەم نەخۆشیە کۆچی دوایی کردوە. بەمجۆرە ئەم دو کەسە هەڵکەوتوە لە سلێمانی کۆتایی بە ژیانیان هات. "سالم" کە بە دەربەدەریی گەیشتۆتە "حیلە" وتویەتی:

ئاخ وداخ دڵ غافڵە نازانێ قیسمەت چی دەکا
ئەمڕۆ وا لێرەم بەڵام ئاخۆ بەیانی کوێم دەبا
شاتری تەقدیر کە پێشکەوت، ڕاتدەکێشێ و تۆ دەڕۆی
کاتێ دەیزانی کەوا خستویتیە ناو دامی بەڵا

**-28-**

ئەحمەد پاشا، پاش ئەوەی لە بەرەدەم نەجیب پاشادا شکا، سەردانێکی والیی ئەردەڵانی کرد بە موەقەت لە ڕەوانسەر جێگیر بو. هەندێ لە گەورەکانی بابان بەڵێنیان پێ دا هاوکاری بکەن. جارێکی تریش هەندێ هێزی کۆکردەوە، بەڵام لە کەناری ڕوباری سیروان عەبدولا پاشا چوە سەریان و ڕاوی نان. دوای چەند مانگێ مانەوە لە ڕەوانسەر بە لای کرماشان دا بەرەو شەمزینان بە ڕێ کەوت. چەند مانگێ لە لای سەید تەهای شەمزینان مایەوە. لەوێوە چوە موسڵ خۆی بە دەستەوە دا. یەکسەر ڕەوانەی ئەستەموڵیان کرد. ئەحمەد پاشا لە ئەستەموڵ ماوەیەک دەس بەسەر بوە. ئیزنی لە دەوڵەت خواستوە و چوە بۆ پاریس. دو ساڵێ لەوێ ماوەتەوە. دوای گەڕانەوەی بۆ ئەستەموڵ لە بەر لێهاتویی چەند جارێ کراوە بە والی لە حیجاز، یەمەن، وان، ئەرزڕۆم، پاشماوەی ژیانی لە ئەستەموڵ بە سەر بردوە.(44)

## -29-

دوای ئەم ڕوداوە ڕەزاقولی خان لێ خرا. تەنانەت یەکێ لە پیاوماقوڵەکانی سنەی نارد بو بۆ تاران بـۆ ڕونکردنەوەی هۆی تێشکانی، لەوێ گرتیان و کوشتیان. مەحمود پاشا ماوەیەک سەرگەردان بو، بانگ کرا بۆ دەربار. خۆی چو بۆ تاران و دەستوپێوەندەکانیشی لە سنە و بلوکەکانی نیشتەجێ کران. ساڵی 8 هەزار تمەن موچەیان لە "مالیات" ی کوردستان بـۆ بڕییـەوە. 5 سـاڵ لـە ئێـران مایـەوە تـا محەمـەد شـاهی قاجـار مـرد (1264ک/ 1848ز). مەحمود پاشا، محەمەد ئەمین بەگی کوڕی عوسمان بـەگ، کـە بـرازای بـو نـاردیۆ لای ناصرەدین شا بڕیاری چارەنوسی بدا. وا بڕیار درا مەحمود پاشا و ئەوانی لە گەڵین لە سەردەشت نیشتەجێ بکرێن. هاوڕێکانی مەحمود پاشا جێگیر بونیان لە سەردەشت پەسەند نەکرد. زۆریان بڕیاریان دا بگەڕێنـەوە وڵاتی خۆیان. مەحمود پاشا خۆی و چەند کەسێ مایەوە. ئەویش بڕیاری دا خۆی بە دەست عوسمانییەکانەوە بدا. خێزانەکەی ناردەوە بۆ سـلێمانی و، خـۆی لـە ڕێگـەی شـارەزوورەوە لـە گـەڵ کوڕەکـانی: ئـەوڕەحمان و حەمەساڵح و عەبدوڵا، بێ ئەوەی لا بداتە سلێمانی بەرەو بەغدا بە ڕێ کەوت. نەجیب پاشا بەڕێزەوە پێشوازی کرد. پاش ماوەیەک بەڕێ کرا بۆ ئەستەموڵ. تا مرد جارێکی تر ڕێگەیان نەدا بگەڕێتەوە کوردستان.(45)

## -30-

عەبدوڵا پاشا لە سلێمانی بە قایمقام دانرا.

نەجیب پاشا لابرا (1265ک/ 1849ز) عەبدولکەریم نادر کرا بـە والـی ئـەمیش 18 مانـگ مایـەوە. ئەویش لێخرا محەمەد وەجیە پاشـا دانـرا. پـاش 10 مانـگ ئـەویش لابـرا نـامیق پاشـا دانـرا (1266ک/ 1849). نامیق پاشا، عەبدوڵای بانگ کرد بۆ بەغداد و گلی دایەوە. لە جێگەی ئەو ئیسماعیل پاشای دانا بـە موتەصەڕڕیفی سلێمانی. بەمە کۆتایی هات بە میرایەتی بابان.

دوای ئەوەی عەبدوڵا پاشا ماوەیەک لە بەغداد دەسبەسەر مایەوە ڕەوانەی ئەستەموڵ کرا. ڕێگەیان نەدا بگەڕێتەوە کوردستان. لـە کـاتی شـەڕی قـرم دا هاتـەوە بەغـداد بـۆ ئـەوەی بگەڕێتـەوە بـۆ کوردسـتان بـۆ کۆکردنەوەی لەشکر. ڕەشید پاشای گوێزلگلی ڕێگەی نەدا.(46)

## -31-

لەو سەردەمەدا کە میرەکانی بابان بە دەسبەسەری لە ئەستەموڵ دەبن. جارێکیان دیواخانەکەی ئەحمـەد پاشا پڕ ئەبێ لە میوان. عەبدوڵا پاشای براشـی هـەر لـە کۆڕەکـەدا ئـەبێ. قاوەچییەکـەی ئەحمـەد پاشـا قـاوە ئەگێڕێ. چەند جارێ بەڕێز بە ناو میوانەکان دا دێ و ئەچێ هەمو جار عەبدوڵا پاشا ڕونەکاتـە قاوەچییەکـە و دەس ئەبا بۆ دەمی خۆی. ئەم کارە چەند جارێ دوبارە ئەکاتەوە بە جۆرێ کە سەرنجی زۆر لە میوانـەکانیش ڕائەکێشێ. میوان بڵاوەی لێ ئەکەن. ئەحمەد پاشا و عەبدوڵا پاشا ئەمێننەوە.

ئەحمەد پاشا ڕو ئەکاتە عەبدوڵا پاشا و لێ ی ئەپرسێ: "عەبە ئەوە بۆچی وات ئەکرد؟" عەبـدوڵا پاشـا ئەڵێ: "زۆرم تێنو بو ئەم ویست ئاوی خواردنەوەم بۆ بهێنێ."

ئەحمەد پاشا ئەپرسێ: "لە باتی ئەوەی ئەو ئیشارەتە ناشیرینە بکەی بۆچی داوای ئاوت لێ نەکرد؟"

عەبدوڵا پاشا ئەڵێ: "قوربان لە حوزوری جەنابت دا شەرمم کرد لە ناو ئەو هەمو میوانە دا قسە بکەم."

ئەحمەد پاشا ئەڵێ: "عەبە! تا لە وڵاتی خۆمان بوین و لەوێ حـاکم بـوم و دەسـەڵاتم هـەبو و، خـەڵک ڕێزی لێ ئەگرتم. چوی لەشکری تورکت هێنایە سەرم. ئێستاش لێرە کە بە کەساسی کەوتوین لە حوزوری مـن دا شەرم ئەکەی داوای ئاو لە قاوەچییەکەم بکەی؟ بە خۆمت بوتایە ئەحەی... هەڵسە ئاوم بۆ بێنە!"(47)

## پەراوێزەکان

1. الكركولي: 262 - 263. العزاوي: 6/ 220 - 222.
2. نوار، "داود باشا": 61
3. الكركوكلي: 269 - 270. العزاوي: 6/ 230.
4. نصيري: 1/ 206.
5. الكركوكلي: 272. العزاوي: 6/ 232.
6. الكركوكلي: 273.
7. الكركوكلي: 273 - 276. العزاوي: 6/ 233 -24.
8. نوار، "داود باشا": 66.
9. نوار، "داود باشا": 123-124.
10. الكركوكلي: 282-286. العزاوي: 6/ 251-255.
11. الكركوكلي: 292.
12. الكركوكلي:294.
13. بۆ ئاگاداری زیاتر لە سەر مەولاناخالیدی نەقشبەندی و خەلیفەکانی، بڕوانە: عبدالكريم مدرس: "یادی مەردان"، 2 بەرگ، چاپی بەغداد. د. مهيندخت معتمدي: "مولاناخالید نقشبندی و پيروان طريقت او"، انتشارات پاژنگ، (تهران 1368)
14. الكركوكلي: 295-300. دنبلي: 270-281.
15. دنبلي: 371.
16. دنبلي: 371-374.
17. ميرزا صالح: 2/ 144 - 146.
18. نفيسي: 2/ 207.
19. نفيسي: 2/ 207-21.
20. ئەم نامەیە و گەلێ نامەی تر، کاک کەمال ڕەئوف محەمەد ساغی کردنەتەوە و، پەراوێزی بۆ نوسیون. لە کتێبێکی تایبەتی دا لە سەر "ئەدەبی نامە نوسینی کوردی" نامانەی کردوە. هێشتا نەنسوسە.
21. نصيري: 2/ 42 22. نصيري: 2/ 49.
23. نصيري: 2/ 51.
24. نصيري: 2/ 52.
25. نصيري: 2/ 54.
26. نصيري: 2/ 66.
27. نصيري: 2/ 86.
28. نصيري: 2/ 96.
29. نصيري: 2/ 98.
30. باباني: 148. امين زكي، "تاريخ السليمانيه": 155.
31. المدرس: 566.

شیخ مارفی نۆدێ، لەم بارەیەوە، نامەیەکی بۆ کەسێکی نزیکی، کە ڕەنگە کاک ئەحمەدی کوڕی بێ نوسیوە، لێرەدا دەقاودەق وەکو خۆی ئەینوسمەوە:

"اسلم علی الولد العزیز وادعو له ولاولاده بطول البقاء والعافیة فی الدنیا و یوم اللقاء.

کلمت علی بک بباب دارنا فی رفع الذخیرة عن قرانا، فلم یسمع کلامي، وبعثت الی والده ارجو ان یرفع الذخیرة عنها، فلم یسمع رجائي. ویطلب مني عشرین حقة من الخبز ولیس عندنا من الدقیق ما یکفي حقتین، واخاف ان یأتي علی من العجم مني ذلک ولا اجده، فیؤذینی بمقالة وفعالة، وانا ضعیف عن ذلک، فعلیک عن تدعو لي ولنفسک واهل بیتک بالحفظ من شر العجم، لازلتم سالمین محب معروف"

کەمال ڕەئوف: هەمان سەرچاوەی دەسنوس

32. المدرس: 577.
33. بابانی: 151.
34. ئەمە شیعرەکەی "نالی" ە:

تا فەلەک دەورەی نەدا - صەد کەوکەبی ئاوا نەبو
کەوکەبەی میهری موبارەک گەلەتی پەیدا نەبو
تا نەگریا ئاسمان و، تەم وڵاتی دانەگرت،
گوڵچەمەن ئارا نەبو، هەم لێوی غونچە وا نەبو
تا چەمەن پیرا لە سەر، ئەصڵی درەختی لانەدا،
فەرعی تازە، خوڕڕەم و بەرز و بوڵند باڵا نەبو
تا "سولەیمانان" نەبونە صەدری تەحتی ئاخیرەت،
"ئەحمەد موختار" ی ئێمە شاهی تەخت ئارا نەبو
قیصە بێ پەردەو کینایەت خۆشە: شاهی من کەوا
عائیلێ بو قەت عەدیلی ئەو لە دنیادا نەبو
بۆ نشینگەی مورغی ڕۆحی ئەو کە عالی فیکرەتە
جێگەیی خۆشترە لە ڕەوچەی "جنة الماوی" نەبو
وەک قیاسێکی کە موپیهت بێ، نەتیجەی بێتەجێ
حەمدولیللا شەە کە عالیجا بو، خالی جا نەبو
شاهی جەمجا، نالیا "تاریخ جم" تەدریخیە
دا نەڵێن لەم عەصرەدا ئەسکەندەری جەمجا نەبو

"تاریخ جم" بە حسابی ئەبجەدی ئەکاتە 1254ک (1838ز) کە ساڵی مردنی سلێمان پاشا و، هاتنە سەر کاری ئەحمەد پاشایە. دیوانی نالی: 370 -374 35.

35. شێخ مارف نامەیەکی بۆ عەلی ڕەزا پاشای والیی بەغداد(1831- 1842) نوسیوە، لێرەدا دەقاودەق ئەینوسمەوە:

"حضرة والی مدینة السلام، بان ینتظم امور دولته علی احسن نظام، عاملا لایام حیاته بوظائف دین الاسلام، وبان تکون وفاته علی الایمان عند حلول الحمام، وبان یعصم من هول المطلع وعذاب البرزخ وعذاب دار الانتقام، وبان یفوز فی زمن الابرار بخلود دار السلام، وکل واحدة من هذه الدعوات احب من طلاء الارض ذهبا الی من کان مت ذوی الاحلام وبعد: فسادة برزنجة لهم فی مملکه بابان منذ قرون اکثر من خمسمائة عام قری کثیرة متوطنین بها فی أرغد عیش وأهنا حال، متمکنین من اقامة أمورهم

على ما أمر به الشرع ومنذ استولى شاه العجم وعساكر الارفاض من جنود الشيعية على هذه الممالك، اخلت امور الدنيا والدين. فلم يبق من القرن اقامة الجماعات والجمع. وكانت القرى كلها عامرة، واليوم اكثرها غامرة، وتعطلت مدارس البلدان والتدريس ولم يبق فيها من المحصلين الا شرنمة قليلون. وكان بمدرستنا اكثر من سبعين طالبا واليوم بها اقل من عشرة، وخربت حجرات مدرستنا وحجر اكثر المدارس، ومن ثم عزمنا معاشر سادة برزنجة، عزمنا على الرحيل بأهلينا وجميع من يتعلق من الخدام والاحياء الى مملكه افندينا. وقد اعطانا فى سابق الزمان داود باشا بشير، ولم يقدر لنا الانتقال اليها، فوائق الرجاء من جناب حضرة افندينا ان يعطينا للجوت والزرع بشيرا، او غيرها من القرى التي تناسب احوالنا وتكفينا لامور معاشنا، ويعطينا بكركوك دارا واسعة نسكنها، ومدرسة ندرس بها، ووظيفة للمدرسة ووظيفة لنا، لقضاء حوائجنا بالبلد واطعام ضيوفنا واكله طعامنا لندعو نحن واولادنا بالليالي والايام والدعاء لله كلام ختام.

في الحديث اربعة انابهم شفيع يوم القيمة: المكرم لذريتي، والقضى لهم حوائجهم، والساعي لهم فى امورهم انا اضطروا اليه، والمحب لهم بقلبه ولسانه. فانا قضى جناب الوزير على باشا الحاجة التى عرضناها عليه كان مستوجبا للشفاعة يوم القيمة على ما نطق به هناالحديث. وفى هنا الباب احاديث كثيرة رواها شيخ مشايخنا ابن حجر عليه الرحمة والسلام. الداعي الملهوف: محمد الشهير بالمعروف

کەمال ڕەئوف: هەمان سەرچاوەی پەسنوس.

36. "نالی" ئەم شیعرەی لە ستایشی ئەم هێزەدا داناوە:

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاصصەیی شاهن
ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن
صەف صەف کە دەوەستن بە نەزەر خەتی شوعەن
حەلقە کە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن
نەرگس نیگە و ساق سامەن، کورتە بەنەفشەن
مو سونبول و، ڕومەت گوڵ و، هەم لالە کولاهن
گوڵزاری دەر و دەشتن و غیلمانی بەهەشتن
ئاهو صەف و، ئاتەش بە کەف و، تیز نیگاهن
صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و، مەزهەری ئەلتافی ئیلاهن
گەه تاوس و، گەه کەبکن و، گەه بوقەلەمونن
گەه ئاتەش و، گەه شوعلە، گەهێ دودی سیاهن
لالەن بە بەدەن، ئەتلەسی ئەخزەر کە لە بەرکەن
نەورەستە گوڵن، بەستە لە گەڵ دەستە گیاهن
تەنهاییسەمەن بەرگی بەنەوشە کە لە بەر کەن
وەک نوری دڵی موئمین و زوڵماتی گوناهن
بۆ سەیری خەرامیدەنی ئەم سەرو قەدانە
صۆفی لە تەلەبدان و، هەمو سالیکی ڕاهن
بۆ زولف و ڕوخ و ئەبرۆی چون زولفی سیاتان
عالەم وەکو "نالی" هەمو با ناڵە و ئاهن

نالی" بە خودا حەیفە دەرەنجێنی دڵی خۆت
ئەم تاقمە مەخصوصە هەمو صاحیبی جاهن
دیوانی نالی: 340 - 345.

37. نوار، "تاریخ العراق": 116.

38. سەرچاوەکان لە ژمارەی هاوسەفەرەکانی مەحمود پاشادا جیاوازن:
فخر الکتاب: 218، ئەڵێ: مەحمود پاشا لە گەڵ 100 سوار پەنای بۆ ڕەزاقولی خان هێناو پاش یەک ساڵ چو بۆ دیدەنی شا بۆ تاران.
بابانی: 74، ئەڵێ: لە گەڵ هەزار خێزان لە گەورەو مەزنەکانی بابان.
وقائع نگار کردستانی: 181، ئەڵێ: لە گەڵ هەزار خێزان لە گەورە و مەزنەکانی ئەو وڵاتە و پاش دو مانگ چو بۆ بینینی شا.

39. فخر الکتاب: 218 - 224. وقائع نگار کردستانی: 181 - 183.

40. نصیری: 2/ 184 - 186.

41. شاعیرێکی سنەیی، حسەینقولی خانی کوڕی ئەمانوڵڵاخانی ئەردەڵان مامی ڕەزاقولی خان، ئەم ڕوداوەی بە فارسی کردوە بە شیعر، ئەڵێ:
نطع بازی تا قضا در تختە (ی) کیهان گشاد مهرە (ی) بدنامی اندر طاس کردستان فتاد
حیف کردستان کە تا نامی بدهر از رشد وغی غی او مهرنمایان چون سها پنهان رشاد
معذرت بس مدعا گویم کە از بابان زمین کهنە پاشای مفتن رخ بە کردستان نهاد
کوە پرشد از سوار ودشت سنگین شد زخلق کهنە پاشا بر کهن یابونی امد در طراد
لشگر اندر جنبش امد میر ان لشگر کە بود طفلک غازی طلب بر بادە (ی) تازی نژاد
جیش را شرط است اول یکدلی وین مشت خلق ان باین اندر لجاج واین بان اندر عناد
شرط دوم هر سپهسالاررا استادگی است حرب را رکنی دگر رای وزیر اوخ وزیر با موالف در عداوت با عدو در اتحاد
نامەای بنوشت زی دشمن کە اسب کین بتاز میر درسکر است ومن در فکر فردا بامداد
اندر ان ساعت کە دستور معظم گفتە بود بیخبر والی نظر بر چهرە (ی) دشمن گشاد
روز نامد بود ورنە اردلان خالی نبود مردرا نامرد نامد میکند نامد مباد فخر الکتاب: 512.
شێخ ڕەزای تاڵەبانی چەند ساڵێ دوای لە ناوچونی میرایەتی بابان یادی مانی ئەکاتەوە باسی شەڕی والیی سنە و قایمقامی سلێمانی ئەکا ئەڵێ:
لە بیرم دێ سولەیمانی کە دارولمولکی بابان بو
نە مەحکومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بو
لە بەر قاپی سەرا، صەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهید،
مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بو
لە بەر تابوری عەسکەر ڕێ نەبو بۆ مەجلیسی پاشا
صەدای مۆزیقەو نەققارە هەتا ئەیوانی کەیوان بو
دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەصرە، ئەو ڕۆژە،
کە مەیدانی جریدبازی لە دەشتی کانی ئاسکان بو
بە زەربی حەملەیە بەغدای تەسخیرکرد و تێی هەڵدا

سولەیمانی زەمان، ڕاستت ئەوێ، باوکی سولەیمان بو
عەرەب! ئینکاری فەزلی ئێوە ناکەم، ئەفزەلن، ئەمما
صەلاحین کە بنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بو
قبوری پڕ لە نوری نالی بابان پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان وەک هەوری نیسان بو
کە عەبدوڵا پاشا لەشکری والی سنەی شڕ کرد
ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنج و شەش، تیفلی دەبوستان بو

42. بڕوانە چیروکی "مامەیارە" لە نوسینی مەحمود جەودەت

43. مستورە، "وەرگێڕاوی کوردی": 236 - 238.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە ستایشی ئەحمەد پاشای باباندا ئەڵێ:
یەعنی هەم نامی نەبی حەزرەتی ئەحمەد پاشا
فەخری دین، کانی حەیا، بەحری کەرەم، کوهی ویقار
مەدحی ئیحسانی بکەم، عیلمی بکەم، فەزڵی بکەم
بە خودا خاریجە ئەوصافی حەمیدەی لە شمار
کەفی زەڕبەخشی کەوا مەنبەعی دوڕ و گەوهەرە
میسلی بەحرێکە نە ساحیلی بێت و نە کەنار
تەبعی جەواد و کەریمی هەروەکو قاانی دەڵێ:
"زر بە قنطار همی بخشد واشتر بە قطار"
تاوەکو دەورە بکات و بگەڕێ چەرخ و فەلەک
تاوەکو بێت و دەچێ، بێت و بچێ لەیل و نەهار
بە موڕادی بگەڕێ شەمس و قەمەر، چەرخ و فەلەک
زەفەر و فەتحی قەرین، بەختی موعین، تالعی یار
ڕەئیی ئەو باعیسی تەنزیمی نوموراتە وەلێ
بۆ کورەیی عالەم ئیمکان بومتە قوتبی مەدار.

45. بابانی: 156 - 159.

46. نوار، "تاریخ العراق": 120.

47. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە کۆڕێکی میوانداری دا ئەم سەرگروشتەیەی گێڕایەوە.

# 9. له زمانی گەورەپیاوەکانی کوردەوە: هۆکانی ڕوخانی میرایەتی بابان

**-1-**

ساڵی 1829 کلۆدیۆس جەیمس ڕیچ نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات لە بەغداد، گەشتێکی چەند مانگەی بە کوردستان دا کرد. لە گەشتەکەی دا بۆ کوردستانی عوسمانی سەربانی میرایەتی بابان و، بۆ کوردستانی قاجاری سەربانی میرایەتی ئەردەڵانی کرد. لەو کاتەدا مەحمود پاشا میری بابان و ئەمانوڵاخان والی ئەردەڵان و، داود پاشا والی بەغداد و، شازادە محەمەد عەلی میرزا سنورداری کرماشان بو.

ڕیچ، لەو چەند مانگەدا چەندین جار گفتوگۆی قوڵی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی... لە گەڵ میر و مەزن و دەسەڵاتدار و گەورەپیاوەکانی کورد کردوە. سەرنجەکانی خۆی بە وردی تۆمار کردوە. لە زمانی ئەوانەوە هۆکانی لاوازیی و ڕوخانی میرایەتی بابان و لە ناوچونی ئەم بنەماڵەیە و دەسەڵاتیان پێش بینی ئەکا.

میر و پیاوە تێگەیشتوەکانی کورد، بە ڕاشکاوی و بێ ترس، بیر و بۆچونەکانی خۆیان سەبارەت بە: خراپی هەلومەرجی ناوچەکەیان، نەبونی ئارام و ئاسایش، دواکەوتنی کشتوکاڵ، خراپیی خانوبەرە و شوێنی ژیانیان، خۆخۆری و ناکۆکی ناوخۆی بنەماڵەی بابان، دەستێوەردانی بەغداد و کرماشان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتەکە و ژیانی ناوخۆی بنەماڵەی بابان دا دەردەبڕن. لێرەدا چەند نمونەیەکی وەکو خۆی ئەگێڕینەوە:

- یەکەمین ڕۆژ کە ڕیچ ئەگاتە سلێمانی، مەحمود پاشا ئەچێ بۆ بەخێرهاتنی لە ناو قسەکانی دا: "پۆزشی بۆ باری وڵاتەکەی هێنایەوە... و کەوتە سکاڵا دەربرین سەبارەت بە گوزەرانی میرنشینەکەی و ئەو گیروگرفتانەی کە میرنشینەکەی ئەیکێشێ بە دەس ئەوەوە کە کەوتۆتە سەر سنوری دو دەسەڵاتی دژ بە یەک. چونکە یەکەمیان کە (ئێران) ە، بە ناوی داواکردنی باج و سەرانەوە، دەستبەرداری چەوساندنەوەی نابێ، دوەمیشیان کە دەسەڵاتدارێتیی (تورکەکان) ە و، میرنشینەکەی ئەم

پابەندیتی. بە بیانوی ئەوەی کە خزمەتی ئێران ئەکات و باجیان ئەداتێ. زۆر سەر ئەکەنە سەری.. کەچی کە شازادەی کرماشان دەستدرێژیی کردە سەری و، ئەوەی مەبەستی بو. بە تۆپزی هێنایە دێ، تورکەکان نە بەرگرییان پێکرا و، نە مەبەستیشیان بو بەرگری بکەن. چونکە ئەمیشیان خۆش نەئەویست. بۆیە بە سنگ فراوانی و لێزانییەوە، باسی ئەنجامە ناهەموارەکانی ئەم بەڕێوەبردنە دوفاقیەی کرد، کە چەند زیان ئەبەخشن بە سامان و گەشەکردنی میرنشینەکەی..."

- لە کاتی سەردانی ریچ دا بۆ ماڵی میر. مەحمود پاشا ئەڵێ: "خوالێخۆشبوی باوکم ئەم ژورەی دروست کردوە، بەڵام پێویستی بە دەست پێداهێنانەوەیەک هەیە" پاشان لە سەر قسەکەی ڕۆیشت و وتی: "کێ جێگەیەک چاک ئەکاتەوە، ئەگەر بزانێت تێی دا ناحەسێتەوە؟ هاکا تورکەکان، یان ئێرانییەکان چەند ڕۆژێکی تر وێرانی ئەکەنەوە".
- محەمەد ئاغا یەکێ لە ناسیاوەکانی تری ریچ لە گفتوگۆیەک دا وتویەتی: "هۆی سەرەکی کاول بونی ئەم وڵاتە، نەبونی ئاسایشە لە هەمو ناوچەکەمان دا. چونکە ئێمەی خێڵەکیی، ئەگەر دڵنیا نەبین لەوەی ئەو ناوچانە هی خۆمانە، ئەوسا خۆشمان تەرخان ناکەین بۆ کشتوکاڵ تێ دا کردنی و، بەم ڕەنگە وڵاتەکەش گەشە ناکات و پێش ناکەوێ. بۆ وێنە: من ئەگەر بزانم سەرۆکەکەم جڵەوی فەرمانڕەوایی بە دەستەوە نامێنێ و، خۆشم تا وەرزی هەڵگرتنی خەلە و خەرمان، زەوییەکەم بە دەستەوە نامێنێ، یەک تەغار تۆو ناکەم. لەبەر ئەوە لە جیاتی ئەوەی خۆم زەوییەکەم تۆو بکەم، ئەیدەمە دەست لادێییەکان. خۆیان چۆنی ئەکەن با بیکەن و، من بەشی خۆمیان بە شێوەی زەکات، یان دەیەک یان هەر لێ ئەسێنم. سەرباری ئەمەش بە هەر شێوە و پەڵپ و بیانویەک بێ، شتێکی تریان لێ ئەسێنم"
- لە کۆڕێکی تریش دا عوسمان بەگ ئەڵێ: "وڵاتەکەمان لە بارێکی زۆر ناهەموارداییە، چونکە ئەگەر خزمەتی تورکەکان ئەکەیت بە سوک سەیرت ئەکەن و، هەر کاتێ ئارەزویان کرد لات ئەبەن. ئەگەر خزمەتی ئێرانییەکانیش ئەکەیت، هەمیشە بە داواکردنی پارە بێزارت ئەکەن".

میرەکانی بابان لە ناو خۆیان دا زۆر ناکوک بون، برا لە گەڵ برا و ئامۆزا لە گەڵ ئامۆزا و، مام لە گەڵ برازا ناڕێک بون. لە پێناوی دەسەڵات و پارەدا پیلانیان لە یەکتری گێڕاوە و، هێزی بێگانەیان هێناوەتە سەر یەکتری و، یەکترییان کوشتوە. دور نیە لە سۆنگەی ئەم خۆخۆرییەوە بێ کەس بە شانازی نەزانی بێ مێژوی میرایەتی بابان بنوسێتەوە، کەچی چەندین کەس مێژوی ئەردەڵانیان نوسیوە.

لە ماوەی میرایەتی مەحمود پاشادا مەولانا خالیدی نەقشبەندی ماوەیەک لە سلێمانی بوە. هەر ئەویش خانەقاکەی بۆ دروست کردوە. وەکو ریچ ئەیگێڕێتەوە مەحمود پاشا و براکانی و مامەکانی پێکەوە لە بەردەمی مەولانا خالیدا بە "قورئان و تەڵاق و شمشێر" سوێند ئەخۆن، پشتیوانی مەحمود پاشا بن و، هەرکەسێکیان نامەیەکی لە لایەن کاربەدەستانی ئێران یا عوسمانییەوە پێ بگا، لە بەردەمی مەولانا و بە ئامادە بونی چەند کەسێ کە خۆیان لە سەری ڕێک بکەون نامەکە بکەنەوە. سەرەڕای ئەم پەیمانە پیرۆزەی لە گەڵ یەکتری بەست بویان کە: خیانەت لە یەکتری ئەکەن، کەچی هەر لەو ماوە کورتەدا کە ریچ لە سلێمانی بوە 3 ڕوداوی پەیمانشکێنییان لێ ڕو ئەدات:

- هەر لەو ماوەیەدا عەبدوڵا پاشا ئەگیرێ لە سەر ئەوەی نامەی شازادە محەمەد عەلی میرزای لە کرماشانەوە بۆ هات بو، بەڵام ئاشکرای نەکرد بو، وەکو لە سەری ڕێک کەوت بون.
- لە سەر ئەوەی عوسمان بەگ فەرمانی مەحمود پاشای براگەورەی بە جێ ناهێنێ سەرپەرشتی کۆیە و هەریر بکا، مەحمود پاشا هەمو دەسەڵات و موڵک و ماڵی لێ ئەسێنێتەوە.

- حەسەن بەگ کە پێشتر بە فیتی والـی بەغـداد هـەڵات بـو بـۆ بەغـداد، لەلایـەن والـی بەغداوە بـە کەساسی ئەدرێتەوە دەس مەحمود پاشای برای. ساڵی پێشوتریش عەبدوڵا پاشای مـامی بـە دەسـتەوە دابو.

ریچ دیسان ئەگێڕێتەوە:

لە گفتوگۆیەک دا دەربارەی بنەماڵە گەورەکانی کورد، یەکێک لە دانیشـتوان وتـی: "شـورەیی نیـە بـۆ سەرۆکەکانمان رازی بین بە بەغداد، لەوێ مل کەچ بکەن بۆ تورکێک، کە هەر پـێش ماوەیـەک، وەک وڵاخ، بـە چەند سەد قروشێک فرۆشراوە. لەهەر کامێکیشمان تـورە بێـت، پێمـان ئـەڵێ: کـوردی کـەر! یـەکێکی تـر لـە دانیشتوان هەڵی دایە، وتی: "رقەبەریی نێوان میرەکانمان خۆیان، خۆیان لە ناو ئەبات، چونکە نە تورک و، نە ئێرانی، نـاتوانن بـە سـەرمان دا زاڵ بـن، ئەگـەر دوبـەرەکی و نـاکۆکی نێـوان بنەماڵـەکانی سـەرۆکەکانمان ئەقۆزنەوە، ئێمە ئەمە باش ئەزانین. بە سەرمان دا زاڵ بن، بە راستیش ئێمەی کورد درەنگ تێ ئەگەین".

کاتێ باسی روخاویی و پیسیی ئەو خانوەشم کرد کە تیایدام، هەر هەمان پیاو وتی: "راسـت ئەکـەیت، خانوەکەت پیس و روخاوە، بەڵام بۆچی خانوی چاک دروست بکـەین و هـەمو دەمێکـیش چـاکی بکەینـەوە، ئەگەر دڵنیا نەبین لە ژیـانی خۆمـان و لـە وەی تـا دوا هەناسـەمان تیـای دا ئەحەوێینـەوە؟ جـا چ جـای بـۆ نەوەکانمان ئەم پاشایە ئەروا و، یەکێکی تر لە هـەمان بنەماڵـە، بـە خـۆی و دۆسـت و خزمەکانیـەوە دێـت و هەمومان لە ماڵ و حاڵ و زەوی و زارمان دەرئەپـەرێنێ و ئەیـدات بـەوان. هـۆی سـەرەکی کـاول بـونی ئـەم نیشتمانەش ئەوەیە کە ئاسایشـی تیـا نیـەو، میرەکـانیش فەرمانڕەوایـەتییان زۆر ناخایـەنێ. فـەرمانڕەواش هەرچۆنێ ئەبێ بابێ، بەڵام ئەگەر دڵنیا بێ لەوەی تا دوایی ژیانی حوکم ئەکات، کەڵکی لێ وەرئەگرێ".

ناکۆکی خۆبەخۆی ناو بەگزادەکانی بابان بە رادەیەک مـەحمود پاشـای دانومێـدکردبو. هـەر ریـچ لـە میانەی قسەکانی دا ئەگێڕێتەوە:

سەرنجم دا هەر مشتومڕێکی لە گەڵ ئەکرد: رەقیی نیشان ئەدا. تا لـە دوایـی دا بـە گاڵتـەوە پـێم وت: "ئەگەر بە هیوایـە هـەمو کارامـەیی خـۆی بـۆ دۆزینـەوەی کۆسـپ و تەگـەرە بـەکار بهێنـێ، بـۆ چـاککردنی میرنشینەکەی، ئەوا هەموی کردوە و هیچ نەماوە بیکات، سەرەرای ئەوەش لە خوا ئەپاڕێمـەوە خێروخۆشـی و توانا بدات بە بنەماڵەکە و میرنشینەکەی". لە وەڵامدا وتی: "مادەم بنەماڵەکە، ئەم هـەمو فرەکوێخایـەی تیـابێ، ئەو رۆژە هەر نایەت کە میرنشین و بنەماڵەکەی بەهێز بێن". منـیش سـور بـوم لـە سـەر رای خـۆم و، وتـم: "رەنگە ئەو رۆژە هەر بێت". ئەویش وتی: "رەنگە ئەو رۆژە بێت، ئەگەر خوا بەڵایەکمان بۆ بنێرێ لە یـەکێک زیاتر کەسمانی لێ دەر ئەچێ" منیش دوبارە پێم وتەوە: "بەبێ ئەمانەش رەنگە هەر بێ، چونکـە خـوا هـەمو شتێکی لە دەس دێت" وتی: "بێگومان خوا ئەتوانێ ئاگری دۆزەخیش بکوژێنێتەوە، بەڵام نایکوژێنێتەوە..."

## -2-

کێشەکەی دیاریکردنی سنوری ئێران و تورکیا و، وەرگرتنی باجی زۆر و نارەوا لە حاجی و زائیرانی ئێرانی و ئازاردانی بەردەوامیان و، دروستبونی گیروگرفتی هاتوچۆی ئێلەکانی سنور و پـەنادانی دوژمنـان و راکردوانی یەکتری... بەچارەنەکراوی مابونەوە، ئەبون بە هۆی گرژیی نێوانی هەردو دەوڵەت. ئێران بەتـەمای داگیرکردنی هەندێ لە ئەرزەکانی عوسمانی بو. عەباس میرزا لە تەوریز و محەمـەد عـەلی میـرزا لـە کرماشـان خۆیان بۆ ئەم لەشکرکێشییە ئامادە ئەکرد.

هێشتا ماوەیەکی زۆر بە سەر گفتوگۆکانی ریچ و گەورەپیاوەکانی کورد دا تێ نەپـەڕی بـو، کـە چەنـد کەس لە پاشا و بەگەکانی بابان بە هەڵاتویی لە کرماشان کۆبوبونەوە. خۆیان و سوارە و دەسوپێوەندەکانیان

خستبوە ژێر فەرمانی شازادەوە. ماوەیەک بو سلێمان پاشای ئیبراهیم پاشا پەنای برد بو بۆ شازادە لە کرماشان. دوای ئەویش عەبدوڵا پاشا. ئینجا محەمەد پاشای خالید پاشا.

محەمەد عەلی میرزا لەشکرەکەی لە چەند لاوە ناردە سەر کوردستان. قۆڵێکی بەرەو جەسسان و مەندەلی و کفری و قزرابادی هەتا قەرەتەپە و کفری گرت و تالانی کرد. قۆڵێکی تریشیان کە عەبدوڵا پاشا سەرکردایەتی ئەکرد لە شارەزوورەوە کشا مەحمود پاشای ڕاونا و دەستی بە سەر سلێمانی دا گرت. شازادە ڕۆژانی عاشورای لە سلێمانی دا بە سەر برد.

بەڵام نەخۆشییەکی کوشندە لە ناو هێزەکەی دا بڵاو بوەوە. ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. شازادەش بە سەختی نەخۆش کەوت. نەیتوانی بەری ئەم سەرکەوتنە بخوا و بیکا بە سەرەتای سەرکەوتنی گەورەتر. بە سەری دا مرد. تەرمەکەیان بردەوە بۆ ئێران.

هەرچەندە دوای کشانەوەی هێزی ئێرانی مەحمود پاشا سلێمانی گرتەوە و عەبدوڵا پاشای دەرکرد، ئیتر میرایەتییەکەی مەحمود پاشا خۆی نەگرتەوە.

مەحمود پاشا کە ڕیچ لە چەند بۆنەدا ستایشی زۆری ئەکا بو بە مڵۆزمێکی لاسار و کەللەڕەقی هەمو ئەوانەی لە دوای ئەو بە میری بابان دائەنران. زۆری پێ نەچو عەبدوڵا پاشای مامی لە کرماشان و، عوسمان بەگی برای لە کۆیە و حەسەن بەگی برای لە سلێمانی بە نەخۆشی مردن. تەنیا سلێمان بەگی برای مابو. میرایەتی بابان بەو سپێردرا. مەحمود پاشا ڕوی کردە ئێران. ماوەیەک لە تەورێز و ماوەیەک لە سنە بو. ماوەیەکیش لە بەغداد و ئەستەموڵ. ئەبێ سالم لە دەربەدەری و کۆچ ‌و ڕەوەی ئێران دا هاوسەفەری مەحمود پاشا بوبێ و، ئیلهامی شیعرەکانی: "ئەلوبیعاع ئەی موڵکی بابان" و"ئەی قیبلەی مورادم" و"لە گەڵ دڵ شەرتە" و"تەخمیسی شیعرەکەی مەولانا" ی لەم ڕوداوانە وەرگرتبێ.

مەحمود پاشا چەندین جار بە یارمەتی لەشکری ئێران هاتە سەر سلێمان پاشای برای لە سلێمانی. وەکو، عەبدولقادر بابانی، شایەتێکی ئەو سەردەمە ئەیگێڕێتەوە، لە ماوەی 4 ساڵ دا 6 جار سلێمانی، مەڵبەندی دەسەڵاتی بابان، بەشەڕ لە بەینی ئەم دو برایەدا: مەحمود پاشا بە یارمەتی عەجەم و سلێمان پاشا بەیارمەتی ڕۆم، دەستاودەستی کردوە. ئەبێ چ وێرانییەک بە سەر ئەم ناوچە ئەگبەتەدا هاتبێ.

جەیمس بیلی فریزەر (1783 - 1856) گەڕیدەیەکی سکۆتلاندی، ساڵی 1834 واتە دوای ڕیچ بە 14 ساڵ، بە کارێکی دیپلۆماسی گەشتێکی درێژ لە ئەستەموڵەوە بۆ ئێران ئەکا. لە تەورێزەوە دەس ئەکا بە تۆمارکردنی سەرنج و گفتوگۆکانی و، لە شێوەی نامەدا ڕەوانەی ئەکات بۆ هاوسەرەکەی. پاشان بە دو بەرگ بڵاوی کردۆتەوە. لە نامەکانی دا باسی کوردستانی موکریان، ئەردەڵان، سۆران و، بابان ئەکا. لە ڕێگەی سەردەشتەوە چۆتە سلێمانی و، چەند ڕۆژێکی کەمی لێ ماوەتەوە. سلێمان پاشای بابانی بینیوە و، لە سەگرمەوە چوە بۆ کفری و لەوێوە بۆ بەغداد.

لە نامەیەکی دا کە ڕۆژی 1 ی تشرینی دوەمی 1834 لە سلێمانییەوە نوسیوێتی، ئەڵێ:

"وا ئیمرۆ گەیشتینە شوێنێک لە لای ڕاستمانەوە ڕیزە شاخێکی سەرکەش هەبو کە لە وڵاتی پاشای ڕەواندزدا بو، لە بەردەمیشمان دا ملەیەک هەبو کە هەولێر و کەرکوک ئەودیوی کەوت بون. لە دوریشەوە بە لای چەپ دا ڕێگەی بەغدادمان لە پێشەوە بو بە گردێکی ڕوتەن دا هاتینە خوارێ. نیو سەعات پێش ڕۆژئاوا گەیشتینە قۆناغ. بێ ئەوەی لەو ساکەوە لە سەردەشت دەرچوین توشی ئاواییەک بوبین. هەرچەندە چۆڵیی ڕێگەوبان دڵی پیاوی تەنگ نەکرد. بەڵام نزیک کەوتنەوەمان لە شاریش وەهەبێ دڵی ڕون کردبینەوە، هەرگیز کۆمەڵە کوختە و وێرانەی وا داماو و هەژارم بە بیردا نەئەهات. بەرەو بارەگای پاشا بە ناو سەرەنوێلک دا تێ پەڕین. جگە لە قوژبنێ کە خێزانی پاشای تێ دا بو، هەموی وێران و چۆڵ بو. پاشا خۆی لە خێوەتێک دا

بو لە دەری شار. لە پێشەوە پیاوێکم نارد کە جێگەیەکمان بۆ پەیدا بکات. لە پاش کەمێک کابرا هاتەوە، بە ناو کەلاوەیەک دا بردینی بۆ ئەو جێگەیەی بۆمان دانرا بو. شوێنەکەمان خانوی پیاوێکی گەورەی خزمی پاشا بو. خۆی چو بو بۆ تەورێز و خانوەکەی بەجێ هێشت بو. خانویەکی لە قوڕ دروست کراو بو. دەستەیە ژوری سەر بەرەڵلای تێ دا بو. کە کاتی خۆی دیارە هۆدەی تەواو بون. لە ناوەڕاستی دا شتێکی چوارگۆشەی تێ دابو کە لای خۆی حەوز و فوارە بو. من یەکێک لە ژورەکانم بۆ خۆم هەڵبژارد کە لە هەمو لایەکەوە با دەیگرتەوە."

پاشای بابان باوەڕپێکراوێکی خۆی بە ناوی عەول خدر ئاغاوە بۆ چاوساغی و ڕێبەریی لە گەڵ فرەیزەر دەنێرێ، بۆ ئەوەی لە سلێمانییەوە بە سەلامەتی بیگەیەنێتە کفری.

دەمەو بەیانی بۆ تاشتی دەگەنە گوندی "جامڕێز" بۆ لای سەلیم ئاغای سەرۆکی خێڵی دەلۆ. دەبینن ئەسپ زین کراوە و، تولە و تانجی و باز ئامادە کراوە. ئاغا و نۆکەرەکانی خۆیان سازداوە بۆ ڕاو. لە بەر ئەمان بەرنامەکەی تێک ئەدا و دەمێنێتەوە. نانی بەیانی بۆ میوانەکان دەهێنن.

سەلیم ئاغا لە میانەی قسەدا داخی خۆی دەربڕی چونکە کەرەسەی تەواوی حەواندنەوەیانی نیەو، خواردنەکەشی باش نیە بە جۆرێ شەرم ئەکا بەم جۆرە میوانداری‌یان بکا. ئینجا ئەڵێ: "ئێمەی کورد کەسانێکی ڕەقین لە دەشت و چیادا دەژین. هیچ کاتێ هیچمان نەبوە شانازی پێوە بکەین. ئێستاش ئەو کەمەی هەمان بو ئەمان ماوە. ئێمەمانان لە میرەوە تا پاشا بە تەمای کولێرەیەکین". دەستی برد بۆ پارچەیەک نانی ڕەش کە لە گەڵ دەختێ ماست لە سەر سینی‌یەک بۆ ئێمەیان دانا بو، وتی: "بڕوانە چی دەخۆین؟ ئێمەو وڵاخەکانمان هەمان شت ئەخۆین. کاتی خۆی دەمانتوانی نانی گەنم پێشکەش بە میوان بکەین. بەڵام ئەو زەمانە تێ پەڕی و، دەبێ ئێستا بە شتی هەرزان قەناعەت بکەین". سەلیم ئاغا لە سەر قسەکانی دەڕوا و ئەڵێ: "ئێمەی کورد لە سەر دەمێک دا سەربازی بەهێز بوین. تەنیا بیرمان لە سواریی و مەشقی شەڕەشیر و شەڕەرم و ڕاو و شکار و، یاری لەو بابەتانە دەکردەوە. چونکە ئەوسا بەشی گوزەرانی خۆمان هەبو. جوتیارەکانمان دەرزیان بۆ دەکێڵاین. بەڵام ئێستا هەمومان ناچارین شیر و ڕم دابنێین و خەریکی جوت بین. گەورەم! سەرباز چ کەڵکێکی دەمێنێ کە دەستی دایە گاسن؟ داواکاری‌یەکانی ئێرانی‌یەکان و پاشا تەواو نابن. ئەنجامی ئەوەش چی دەبێ؟ جوتیار هیچی بۆ نامێنێتەوە ڕاکردن نەبێ بۆ ڕەواندز و کرماشان و موسڵ یا هەر شوێنێکی تر لە باتی ئەوەی لێرە بمێنێتەوە. لەبەر ئەوە وەکو ئەبینی وڵات لە دانیشتوان چۆڵ بوە".

فرەیزەر و عەولی ڕێبەری بە درێژایی ڕێگە دەمە تەقێ دەکەن لە سەر نائەمینیی ڕێگەوبان و، بڵاو بونەوەی جەردە و ڕێگر و، تاڵان کردنی کاروان. لەوانە کاروانی زائیرانی ئێرانی و، تەنانەت ڕوت کردنەوەی ژنان. دەربارەی یەکێ لەم جەردانە فرێزەر لە عەول دەپرسێ: "ئەی پاشا لە سەر ئەمانە چی ئەڵێ؟ ئاخۆ ئەم ئاغایە لە نۆکەرانی پایەبەرزی نیە؟"

عەول وەڵامی دایەوە: "بێگومان. ئەگەر شتی وا بکا پاشا بابی دەسوتێنێ. بەڵام گەورەم! چی بڵێم پاشا لە وڵاتەکەی خۆی دا گیروگرفتی زۆرە. هیچ حاکمێکی ئێمە ماوەیەکی ئەوەندە درێژ نامێنێتەوە تا ئەوەندە بەهێز بێ بتوانێ پارێزگاری هێمنیی گشتی و ئارامی بکا.." هەر عەول لە میانەی قسەکانی دا ئەڵێ: "... بەڵام ئەمە لە سەردەمی ئەوڕەحمان پاشای باوکی سلێمان پاشا و مەحمود پاشادا وەها نەبو. لە سەردەمی ئەودا کاری لەم بابەتانە ڕوی نەئەدا. لەوپەڕی قەڵەمڕەوی پاشایەتی‌یەوە تا ئەمپەڕی، لە سەردەشتەوە تا کفری و، لە کۆیەوە تا بانە، گەوهەرت بە سەرەوە بوایە و زێڕت بە دەستەوە بوایە، ئەتتوانی بڕۆی بێ ئەوەی هیچ کەس هیچت لێ پرسێ. دنیای ئێرە سەلامونعەلەیک و عەلیکومسەلام بو. بەڵام ناکۆکی نێوان هەردو برا وڵاتی وێران کرد و بەڵای بە سەردا هێنا. جارێک مەحمود و جارێک سلێمان، بێ ئەوەی هیچیان لە 3 ساڵ

زیاتر بمێننەوە. دوای ئەوەش عەجەم خۆیان لە بەلاداخستنی کێشەکەدا هەڵقورتان. وڵاتەکەیان بۆ خۆیان برد و، ئەوان و نۆردووەکەیان وڵاتەکەیان خوارد. بە دوی ئەوەش دا تـاعون و برسـێتی هـات. ئەمانەخـەڵکیان لـە ڕەگوڕیشە دەرهێنا، هەر دوژمنەکان مانەوە. حـاڵ وای لـێ هـاتوە: کـە دزی نـەکرێ، هـەر لایـەک لاکـەی تـر تاوانبار ئەکا. نۆکەرەکانی سلێمان ئەیدەنە پاڵ نۆکەرانی مـەحمود و، نۆکـەرەکانی مـەحمودیش ئەیدەنـە پـاڵ نۆکەرانی سلێمان! ڕاستییەکەیشی ئەوەیە: پاشا هێـزی پێویسـتی بـە دەسـتەوە نـەماوە سـزای تاوانکـار و گوناهبار بدات و، ڕێگە لەوانە بگرێ خراپە ئەکەن. چونکە ئێرانییەکان هەرچییـەکیان بکەوێتـە بـەر دەسـت هەڵی ئەلوشن. لە بەر ئەوە پیاوە پاکەکان ناچارن ڕابکەن و، دزەکان لە وڵات دا ئەمێننەوە".

دوای مردنـی سـلێمان پاشـا (1254 / 1838) ئەحمـەد پاشـای کـوڕی جێگـەی گرتـەوە. مملانـێی دەسەڵات لە نێوان مەحمود پاشا و ئەحمەد پاشادا درێژەی کێشا هەتا هەموویانی پێکەوە هاڕی. دوایین پێکادان ئەوەیە کە عەبدوڵا پاشای برای ئەحمەد پاشا، وەکو شێخ ڕەزا ئەڵێ: "لەشکری والی سنەی شڕ کرد"و مەحمود پاشا بە یەکجاری شکا. شاعیرێکی سنەیی بە ناوی حسەینقولی خانی ئـەردەڵان کـە ئـەم ڕوداوەی بـە شـیعر هۆنیوەتەوە، مەحمود پاشا "بە کۆنەپاشایەکی فیتنەگێڕ" ناو ئەبا. نـاکۆکی نـاوخۆ، میرەکـانی بابـانی لـە لای کاربەدەستانی ئێران و عوسمانی سوک کرد بو، وەکو مایەی فیتنەی نێوان دو دەوڵەت باسـیان ئەکـەن و، بـە سوک و بێ نرخ تەماشایان ئەکەن.

محەمەد عەلی میرزا لە نامەیەک دا، بۆ والیی موسڵ، نوسیوێتی:

"... چند سال قبل کە عبدالرحمن پاشای بابان از علی پاشای وزیر سابق وحشتی حاصل نمـودە روی نیاز بە استان.. شهنشاه.. اوردە، علی پاشای مزبور.. جمعیتی فراهم اوردە، روی بـە سـرحدات ایـران اوردە. از ان تاریخ الی حال هر یـک از جماعـت گرجیـە کـە در بغـداد بـر مسـند وزارت نشسـتە در حـین حیـات عبدالرحمن مفسد بە اغوا و افساد او، بعد از فوت او اولاد او، فرصت غنیمت یافتە، گـاهی خـود را بـە وزاری بغداد منسوب و باعـث فسـادی شـدند، گـاهی بـە ایـن دولـت علیـەخود را محسـوب نمـودە، موجـب غبـاری گردیدند..."

عەباس میرزا لە نامەیەک دا، بۆ ئێلچی ئینگلیزی لای بابی عالی، نوسیوێتی:

"... اوضاعی کە دراین دو سال فی ما بین این دو دولت.. اتفاق افتـادە وباعـث حصـول فتنـە و نفـاق شدە است.. سبب وقوع این جنگ و دعوی و اشوب وغوغا کە بین الملکتین رو دادە.. رفتار و کرداری کە هر بار در وقتی کە ما ارادە صلح کردەایم، از جانب اکراد بدنهاد و سرحد نشینان ان طرف برای گرمی هنگامـە فساد ظاهر شدە."

قائیممەقام لە نامەیەک دا، بۆ ئێلچی ئینگلیزی لای دەرباری قاجار، نوسیوێتی: "امری کە باعث حـدوث فتنە و فساد مابین دو مملکت گردید این بود کەجماعت اکراد از دو جانب بنای اشوب کناشتند."

تەنانەت ئەم ئاڵۆزی و پشێوییەی میرەکانی بابان دروسـتیان کـرد بـو، کـاری کـردە سـەر پێوەنـدی سیاسی هەردو دەوڵەتی ئێران و تورکیاو، یەکێ بو لەو هۆیانەی پاڵی بە هەردو لاوە دا زوتر ڕێککەوتننامـەی یەکەمی ئەرزڕۆم لە 1238 / 1822 دا و هی دوەم لە 1263 / 1847 دا مۆر بکەن، کە ئیتـر بـە یـەکجاری کۆتایی بە دەسەڵاتی میرایەتییەکانی کورد هێنا، لەوانە میرایەتی بابان. مادەی یەکـەمی ڕێککـەوتنی ئـەرزڕۆم بۆ بە لادا خستنی کێشەی بابان تەرخان کرابو.

مـەحمود پاشـاش سـەرەنجام نائومێـد بـو. خـۆی دایـە دەس عوسـمانی. عوسـمانییەکان هـەمو گەورەپیاوەکانی بابانیان لـە کوردسـتان دورخسـتەوە. هـەتا مـردن نـەیان هێشـت جـارێکی تـر بگەڕێنـەوە کوردستان.

## -3-

لێکۆڵینەوەی دەمەتەقێ و گفتوگۆکانی ریچ و فرەیزەر و گەورە پیاوەکانی کورد و خەڵکی تر وای دەرئەخەن، هۆکانی روخانی میرایەتی بابان لە دەوری دو تەوەرەی سەرەکی بخولێنەوە،

یەکەمیان: هەڵکەوتی نالەباری جیۆپۆلیتیکی کوردستان.

کوردستان کەوت بوە نێوان دو دەسەڵاتی لە خۆی بەهێزترەوە. بوبوە مەیدانی ململانێ و ناوچەی لەمپەری ئەو دو هێزە ناکۆکە. هەردولا چاویان تێ بڕی بو. دەستیان تێ وەرئەدا و تەراتێنیان تێ دا ئەکرد. پیاوە دەسەڵاتدارەکانیان ئەکرد بە گژ یەکتری دا. داهاتی ئابوریان هەڵئەلوشی. لە ئەنجام دا ئاسایشی تایبەتی سەر و سامانی هاوڵاتی و ئاسایشی گشتی وڵات و سامانی نیشتمانیی تێکچو بو، کە یەکەمین مەرجی پێویستی گەشەکردنی ئابوری و ئاواکردنەوەی وڵات بو.

دوەمیان: ناکۆکی ناوخۆ

کاربەدەستانی هەردو دەوڵەت دەستیان وەرئەدایە کاروباری ناوخۆی وڵات و ناو خێزانی کاربەدەستەوە. بۆ تەماعی دەسەڵات و پارە دژی یەکتری بەکاریان ئەهێنان و ئەیانکردن بەگژ یەکتری دا. لە ئەنجام دا وڵاتەکە تاڵان و وێران و خەڵکەکەی هەژار و نابوت و بنەماڵەی دەسەڵاتداریش کز و کەساس ئەبون.

بێگومان جوگرافیا و پیلانگێڕانی بێگانە کارێکی خراپیان کردۆتە سەر چارەنوسی میرایەتی بابان، بەڵام لێرەدا پرسیارێکی بەجێ دێتە پێشەوە:

- ئەگەر لە ناو خودی بەگزادە و پاشاکانی بابان دا ئامادەیی ئەبوایە بۆ خۆخۆری و پیلانگێڕان لە یەکتری و دەسکێشی لەشکری بێگانە، ئاخۆ شازادەکانی ئێران لە کرماشان و تەورێز یا والییەکانی تورک لە بەغداد وا بە ئاسانی ئەیانتوانی خۆیان لە کاروباری کوردستان هەڵ بقورتێنن؟

## پەراوێزەکان

بابانی: 148.

ڕیچ: 93 - 94، 101، 109 -110، 115، 120، 148، 163، 323، 324.

العزاوی: 6/ 220، 225، 229، 232، 271.

فریزەر: 49-51.

میرزا صالح: 247، 249.

نصیری: 1/ 254.

# 10. سالم: قارەمانی وشەی کوردی

–1–

باسی میرایەتی بابان و تێکچونی بە بێ باسی سالم ناتەواوە.

سالم (1805 - 1869) نـاوی ئـەورەحمان بـەگ و، کـوڕی محەمـەد بـەگی قەرەجەهەننـەمی کـوڕی ئەحمەد بەگە و، لە بنەماڵەی ساحێبقڕانە. بنەماڵەی ساحێبقڕان لە بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی سەردەمی بابان بوە و، هاوکاری میرەکانی بابان بون، وەکو ئەڵێن بۆیە ناو نراون ساحێبقڕان، چونکە سەرگەورەی ئەم بنەماڵەیـە یەکێ بوە لە سەرکردە جەنگییەکانی لەشکری بابان و، ڕوی کردوتە هەر مەیدانێکی شەڕ دوژمنی شـکاندوە و، بە سەرکەوتویی گەڕاوەتەوە. ساحێبقڕان واتە: "خاوەن بەختی باش". ڕەنگە ئەم نازناوە خۆشـەیان هـەڵبژارد بێ بۆ لە بیر بردنەوەی نازناوەکەی تریان: "قەرەجەهەننەم" واتە: "دۆزەخی ڕەش".

نوسەری "سیر الاکراد" خۆی وا بە ناسین ئەدا کە نـاوی عەبـدولقادرە و کـوڕی ڕۆسـتەم بەگـە و، لـە بنەماڵەی ساحێبقڕانە. ڕۆستەم بەگ ئەبێ برای مەحمود بەگ و محەممەد بەگی کوڕی ئەحمەد بەگ بێ. لە نـاو باسەکانی کتێبەکەی دا چەند جارێ نیشارەت بۆ باووباپیری و مامەکانی ئەکا.

بە پێی گێڕانەوەی ئەم: مەحمود بەگ لە شەڕی "کۆشک ئەسپان" دا، کـە لـە نێـوان لەشـکری مـەحمود پاشـا بـە یارمـەتی داود پاشا و، لەشـکری محەمـەد عـەلی میـرزا بـە یارمـەتی عەبـدوڵڵا پاشـا دا ڕوی داوە، سەرکردەی لەشکری بابان بوە. لەو شەڕەدا ئەبێ مەحمود بـەگ خـۆی بـە سـەختی بریـندار و، فـەتاح بـەگی برابچوکیشی کوژرا بێ.

دوای ئەوەی مەحمود پاشا دور ئەخرێتەوە بـۆ ئەسـتەموڵ، سلێمان پاشـا لـە سلێمانی ئـەبێت بـە دەسەڵاتداری بێ ملۆزم. مەحمود بەگ لەو کاتەدا یـەکێ لـە پیـاوە دەسڕۆیشـتو و لـە پێشـەکانی دەزگـای سلێمان پاشا بوە. بەڵام چەند کەسێ لە گـەورەپیاوەکانی سـلێمانی نامـاده نـابن سـەر بـۆ سـلێمان پاشـا دانەوێنن. لەوانە: ڕۆستەم بەگ و، حاجی بەگی مەسرەف کە خاڵۆی ڕۆستەم و ژنبرای مەحمود پاشا بوە. ئەمانە کۆچ ئەکەن بۆ کەرکوک و، لەوێ جێگیر ئەبن. سلێمان پاشا ئەیەوێ نـەیارەکانی ئاشـت بکاتـەوە.

ئەحمەد بەگ (دوایی ئەحمەد پاشا) ی کوڕی ئەنێرێتە لایان. مەحمود بەگیش دڵنیایان ئەکا لە نیازپاکی پاشا.

ئەیارەکانی پاشا ئەگەڕێنەوە سلێمانی. بەڵام پاش ماوەیەکی کورت لێیان ئەکەوێتە گومان و بیانو. هەمویان ئەگرێ و، زۆریان ئازار ئەدا و، پارەیەکی زۆریشیان لێ ئەسێنێ. ئینجا بە کەفالەتی گران ئازادیان ئەکا. لە سەر ئەمە زیز ئەبن و بە کۆمەڵ کۆچ ئەکەنەوە بۆ کەرکوک. ئەمجارە مەحمود بەگیش بە خاووخێزانەوە، لە داخی پەیمانشکێنی پاشا، لە گەڵیان کۆچ ئەکا. مەحمود بەگ پیاوێکی بە دەسەڵات و ئازا بوە. سلێمان پاشا هێزێکی ناردۆتە سەریان، ڕێگایان پێ بگرن، بەڵام هێزەکەیان شکاندوە و، دریژەیان داوە بە کۆچەکەیان. لە کەرکوک جێگیربون.

دیارە ئەمانە بە ئارامی لە کەرکوک دانەنیشتون. بۆ تێکدانی دەسەڵاتی سلێمان پاشا ئاژاوەیان ناوەتەوە و، پیاوەکانیان ڕاووڕوت و جەردەییان کردوە. عەلی ڕەزا پاشا (1247 - 1258ک / 1831 - 1842ز) لە بەغدادەوە هێزێکی ناردۆتە سەریان. بە فێڵ مەحمود بەگیان گرتوە و، خنکاندویانە.

بە هۆی ئەم ڕوداوەوە، خزم و دەسوپێوەندەکانی مەحمود بەگ، لەوانە ڕۆستەم بەگ، تۆراون و بە دڵی شکاوەوە ڕویان کردۆتە ئێران. لە ڕێگا هەمەوەند هەڵیان کوتاوەتە سەریان و، ڕوتیان کردونەتەوە. بەڵام خۆیان گەیاندۆتە ئێران و لەوێ نیشتەجێ بون.(1)

بە گوێرەی گێڕانەوەی هەمو ئەوانەی ژیاننامەی کوردی و سالمیان نوسیوە، مەحمود بەگ باوکی مستەفا بەگی کوردی و، مامی ئەورەحمان بەگی سالم بوە. ئەوەی گومان ئەخاتە ناو هەواڵەکانی نوسەرەوە ئەوەیە: لەو شەجەرەیەدا کەسەجادی باسی ئەکا، ڕۆستەم بەگی تێ دا نیە. سەرەڕای ئەمەش کتێبەکەی لە ساڵی 1286ک / 1869ز دا نوسیوە، لەو سەردەمەدا سالم و کوردی دو شاعیری بە ناوبانگ بون لە ناوچەکە دا و، ئەبێ هەردوکیان ئامۆزای نوسەر بوبن و، لەو کاتەدا هەردوکیشیان لە ژیان دا نەماون، کەچی ئەم لە کتێبەکەی دا بە هیچ جۆرێ ناویان نادا.(2)

## -2-

لە ململانێ ی دەسەڵات دا، مەحمود پاشا پشتی بە عەجەم و، سلێمان پاشای برای و، ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشای ئامۆزای پشتیان بە ڕۆم بەستوە. کە مەحمود پاشا لێ ی قەوماوە، لایەنگرەکانی ڕویان کردۆتە ئێران، لە سنە و میاندواو و تەورێز بڵاو بونەتەوە. کە سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشا لێ یان قەوماوە، لایەنگرەکانیان لە کەرکوک و کفری و بەغدا بڵاو بونەتەوە. پێ ئەچێ بنەماڵەی ساحێبقڕان لە گەڵ مەحمود پاشا بوبن.

لە سەردەمی ژیانی سالم دا دو ڕوداوی گرنگ ڕویان داوە، هەردوکیان، کاریان لە ژیانی تایبەتی ئەو کردوە و، بە شیعرەکانیەوە دیارن:

یەکەمیان، نائارامی بەردەوامی هەلومەرجی سیاسی سلێمانی و، لەئەنجامی ئەوەش دا چەند جارێ دەربەدەربون و گەڕانەوە و دیسان دەربەدەربون.

دوەمیان، ڕێککەوتنی هەردو دەوڵەت: ڕۆم و عەجەم لە ئەرزڕۆم. جارێ یەکەم لە ساڵی 1238ک / 1822ز دا و، جاری دوەم لە ساڵی 1263ک /1847ز دا. لە ئەنجامی ئەوەش دا ڕوخان و نەمانی میرایەتی بابان.

سالم هاوچەرخی مەحمود پاشا، سلێمان پاشا، ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشا بوە. بەڵام وا پێ ئەچێ هاوسەفەری کۆچوڕەوی مەحمود پاشا بوبێ. پێ ئەچێ بەشداربونەکەشی، لەم کۆچوڕەوەدا، بە ئارەزوی خۆی

نەبوبێت. خۆی ئەڵێ: "بۆ بیلادی رافیزی... روبەروی مەشریق... بۆ موڵکی رەی... وەک ئەسیری تورکومان دەمبەن بە زۆر". بەڵکو بە هۆی "ئیلتیزامی" بنەماڵە و خێزانەکەیانەوە بە ناچاری بوبێ.

پێ ئەچێ ماوەیەک لە ئێران زیندانی کرابێ. لەم روەوە ئەڵێ:

شۆرەزاری خاکی رەی ئەمجارە دامەنگیرمە

رو لە هەر وادی دەکەم خاری وەکو زنجیرمە

ئیبتیدا بۆ رەی کە هاتم فیکری عەقڵیم لێ نەکرد

حەپسی تارانم گوناهی کاری بێ تەدبیرمە

*

بە عەقڵ ئەمرۆژە پێم زانی دەفەوتێ

کە سالم عازمی موڵکی عەجەم بو

*

ماوەیەکیش لە سنە بوە بەڵام دیارە لە وێش نەحەساوەتەوە. ئەڵێ:

چ بلێم؟ حاڵەتی دڵ چۆنە لە هیجرا سالم؟

صەحنی گوڵزاری سەنەندوج وەکو زیندانی منە

*

بە بێ روی تۆ فەزای باغی سەنەندوج

لە ناو دڵما وەکو ناری سەقەر بو

*

دەڵێی فیردەوسە گوڵزاری سەنەندوج

وەلێ بێ تۆ لە لای من وەک دەرەک بو

*

سالم لە سلێمانی دا لە دایک بوە و، هەر لەوێش دا گەورە بوە. شارەکەی و وڵاتەکەی خۆی تا رادەی پەرستن خۆش ویستوە. بەجێ هێشتنی و لێ دورکەوتنەوەی نازارێکی گەورەی لە لا دروست کردوە. ئەمە لە شیعری "ئەلویداع" دا بە ئاشکرا دەردەبڕێ. شیعرەکانی سالم ئەوی لە ئێران دایناون هەموی نارەزایی و دەردەدڵ وە گلەییە لە ئێران و دەزگای بەڕێوەبەرایەتیەکەی. تەنانەت شیعرێکی تەرخان کردوە بۆ هەجوی رافیزی و شیعە. سەرەرای ئەوەش "لە گەڵ دڵ" ی خۆی "شەرت" ی کردوە کە "بەهەشت گەر بێتە دەشتی رەی" هێشتا ئەو بە "ئێران" دا گوزەر ناکات. ئەمە ئەو قسەیە پوچ ئەکاتەوە کە گوایە مەیلی ئێرانی هەبوە.

سالم خوێندەوارێکی رۆشنبیر و زمانزان بوە. لە بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار و ناسراویش بوە. دور نیە مەحمود پاشا کەڵکی لێ وەرگرتبێ، ئەمیشی خستبێتە دەستەی نوێنەرایەتی خۆیەوە بۆ گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی. هەر بەو بۆنەیەوە چوبێتە تاران و، لەوێ رەفتاری نالەباری ئێرانییەکانی دی بێ.

سالم چەندین شیعری هەیە لە کاتی دەربەدەریدا لە ئێران هەڵی بەستون. گلەیی لە زەمان ئەکاو، نارەزایی دەردەبڕێ لە هەلومەرجی ژیانی ناخۆشیی خۆی، بە تایبەتی لە تاران. ئەمانەی لێرەدا نوسراونەتەوە چەند نمونەیەکین:

—3—

1 ئەلویداع! ئەی موڵكی بابان ئەلویداع
ئەلویداع! ئەی جانی جانان ئەلویداع!
2 موستەعیدەم بو بیلادی رافیزیی
ئەلویداع. ئەی ئەهلی ئیمان ئەلویداع!
3 وەک ئەسیری تورکومان دەمبەن بە زۆر
ئەلویداع. ئەی شاهی خوبان ئەلویداع!
4 دەشتی هیجرەت تارە وەک دەریایی قیر
ئەلویداع. ئەی میهری رەخشان ئەلویداع!
5 روبەرۆی مەشریق دەچم بۆ موڵکی رەی
ئەلویداع. ئەی قیبلەیی جان ئەلویداع!
6 ئەشکی دیدەم رەنگی گوڵناری هەیە
ئەلویداع. ئەی ناری بوستان ئەلویداع!
7 صیححەتی دا وەصڵی تۆ. هیجرەت مەرەز.
ئەلویداع. ئەی دەرد و دەرمان ئەلویداع!
8 دڵ بەرامبەر زولفی تۆ وازیح دەڵێ:
ئەلویداع. ئەی سونبولستان ئەلویداع!
9 زەخمی دڵ. بۆ ئابی پەیکان، تەشنە ما
ئەلویداع. ئەی تیری موژگان ئەلویداع!
10 گەرچی بۆ ئەحواڵی سالم بێ غەمی
ئەلویداع. ئەی ناموسوڵمان ئەلویداع! (3)

—4—

1 ئەی قیبلەیی مرادم! ئاخۆ بە رۆژگاران
جارێ ئەپرسی لە کەس: حاڵی غەریبی تاران؟
2 بەو سوێندەکەی کە خواردم من هەر ئەوەم کە دیوتم
حاشا بکەم فەرامۆش میساق و عەهدی جاران
3 تا نەقشی خاترم بێ خورپەم بەهاری حوسنت
دەتکێ لە هەوری چاوم ئەشکم بە میسلی باران
4 شەو تا سەحەر لە هیجرت بۆ من حەرامە خەوتن
هەر دێ صەدایی گریەم وەک رەعدی ئەو بەهاران
5 لاکین لە ئەصڵی کارا ئاسیومە حاڵەتی تۆ
سەنگینە گوێ ی سەماعت بۆ نادی ناد - ناران
6 تۆ هەر ئەوەی کە چاوت جەرگی برییم بە ئیما،
من هەر ئەوەم کە عەشقت کردومی وێڵی شاران

7 سالم لە جەوری دولبەر، کۆتاکە شەرحی دەفتەر،
تۆ بێ خەبەر لە تاو ئەو، ئەو بێ خەبەر لە یاران! (4)

**-5-**

1 خۆزگە دەمزانی لە تارانا ئەجاتم کەی دەبێ
کویی یارە مەشهەدم، یا مەدفەنم هەر رەی دەبێ
2 تەیی ئەرزم بۆ ئەکات گەر شاهی نەقشبەند،
کەی بە پێی پڕ ئابلەم وادی فیراقت تەی دەبێ؟
3 هەر کەسێ زانی لە سۆزی نالە، حالی دەردی دڵ،
مەتلەبی ناوی هەمو حالێی لە فەحوای نەی دەبێ
4 نێشی حەییەی زولفی لەیلا ڕاستە مەجنونکوژ بوە
خۆ گەزیدەی ماری وا قەد نامرێ، هەر حەی دەبێ
5 عەیشی وەصڵم بردە سەر، ئەندوهی هیجریش سەر دەچێ
مەوسیمی ئوردی بەهەشتم دی، دەمێکیش دەی دەبێ
6 گەر بەحوججەت بێ ڕوخم سابیت دەکا صیدقی دڵم
مایلی سێبی ڕوخت ڕەنگی بە میسلی بەی دەبێ
7 من لە نەشئەی جامی لەعلت تا حەشر نائێمە هۆش
جامی وا سالم لە دەورا قیسمەتی جەم کە دبێ؟ (5)

**-6-**

1 بە من بێ، سینەیی سەختم بە قەڵغانی نەزەر ناکەم
نیشانەی تیری خوێنرێژت بە جوز لەختی جگەر ناکەم
2 دەمی نازت، بە ڕوسەختی کەتابی تیری غەمزەم بو،
لە ڕوی تیغی جەفاتا بەعەدەزین جەوشەن لەبەر ناکەم
3 لە ناوشانت لە چینی زوڵفتا دڵ حەلقەهای لێ نا
خوا گەر وا بدات قودرەت بە من کەس دەربەدەر ناکەم
4 لە فەردی وەصفی یارا عارە ناوی مودەعی بردن
لە رشتەی فیکرما خەرموهرە هەمسلکی گوهەر ناکەم
5 لە یاقوتی لەبت، یەک بوسە مایەم بێ، دەمی ئاخر
تەلەف کەم، گەر سەرو ماڵم، لە سەوداتا زەرەر ناکەم
6 ئەگەر پایانی بێ هیجرت، لە دەرگاتا هەتا ئەمرم،
بە مەحزی جەوری حاجیب یەک وەجەب مەیلی سەفەر ناکەم
7 لە ڕەشکا گەر سەراسەر نوتقی توتی بێتە سەر هەجووم
لە مەدحی لێوی شیرینت ئیتر مەیلی شەکەر ناکەم
8 لە گەڵ دڵ شەرتە سالم گەر ئەجاتم بێ لە تارانا
بەهەشت گەر بێتە دەشتی ڕەی بە نێرانا گوزەر ناکەم (6)

## -7-

"تەخمیس" لە سەر شیعری مەولانا خالید

سالم ئەم شیعرەی م. خالیدی نەقشبەندی (1193-1242ک) بەبێ مەلامەت هەڵنەبژاردوە. م. خالید ئەم شیعرەی لە دەربەدەری دا هۆنیوەتەوە لە کاتێک دا لە سەفەری هیندستان دا بو. جا لە چون دا بوە یا لە گەڕانەوە دا. لە هەر کامێکیان دا بێ هەستێکی مرۆڤانەی پاک سەبارەت بە دوری لە "یار و دیار" دەر ئەبڕێ و. باسی سەیرانگاکانی سلێمانی دێنێتەوە بیری.

م. خالید لە ناو تێگەیشتوانی کورد دا، بە تایبەتی هی سلێمانی، وەکو قوربانیی چەوساندنەوەی بیر و باوەڕ و، ململانێی ناجوامێرانە و، ڕەمزی ئاوارەیی و غوربەت تەماشای کراوە. حاجی قادری کۆیی لە باسی ئاوارەیی م. خالیدا ئەڵێ:

قوتبی زەمانە خالید، وەک من بوە ئاوارە

بێ قەدر و قیمەت و شان، بێ خانمان و بێ نان.

بێگومان م. خالید "بێ قەدر و قیمەت و شان" نەبوە، وەکو حاجی وتویەتی، لە زەمانی خۆی دا لە ناو خەڵک دا پایەیەکی بەرز و بەڕێزی هەبوە. هەر حاجی لەو شیعرە درێژەدا کە بۆ باسی شاعیر و زاناکانی کوردستانی تەرخان کردوە، بەمجۆرە ستایشی م. خالید ئەکا:

"مەعدەنی عیلم وعالیم و عامیل

قوتبی دەوران و مورشیدی کامیل

هەر لە ئەووەڵ جەنابی مەولانا

نەقشبەندی ڕەواقی الا الله"

سالم دەربەدەری خۆی و مەولانا تێکەڵاو ئەکاو ئەڵێ:

1. دڵ لە میحنەت کەیلە ڕێم کەن با لەغەم دەرچم لە شار

ئەمڕۆ ڕۆژێکە لە جەمعی مەردومان بگرم کەنار

دەستە ئەژنۆ دانیشم بۆ حاڵی خۆم بگریم بە زار

"موسم عیداست و مانومید از دیدار یار

عالمی درعیش و نوش و ماو دو چشم اشکبار" (1)

*

2. ئەم جیهانە خولدە بۆ مەردوم، وەلێ بۆ من سەقەر

عومری شیرینم بە تاڵیی چو لە بەر تولی سەفەر

قەت لە مودەی عومری خۆم دا هەفتەیێ نەم دی حەزەر

"سینە سوزان، دل فروزان، کوچە کوچە دربدر

کس مبادا همچو من اوارە از یار و دیار" (2)

*

3. دێتە گوێم دایم بەزاری ناڵەیی مەحزونی دڵ

بێ قەراری و ئیزتیرابە ساڵ ومەە قانونی دڵ

داتەپی کۆشکی موراد و. تێکشکا ئەستونی دڵ

"بکرەجوئی شد زهر چشمم روان از خون دل

عاقبت کردم دوا داغ فراق سرچنار"

4. کەس نەبێ سالم لە دنیادا وەکو من توشی دەرد
بێ نەوا کەوتومە غوربەت ناتەوان و رەنگی زەرد
شیعری مەولانا ئەخوێنم هەڵئەکێشم ئاهی سەرد
"خالدا گرنیستی دیوانه و صحرانورد
تو کجا و کابل و غزنین و خاک قندهار" (7)

## -8-

تێکچونی پاشایەتی بابان، یان راستتر نەمانی دەسەڵاتی کوردی، کارێکی قوڵی لە دڵ و دەرونـی سـالم کردوە. سالم بەم بۆنەیەوە چەند قەصیدەیەکی سیاسی دڕێژی هەڵبەستوە. قەصـیدەکان، ئەگـەر چـی لـە کـاتی جیاواز و بە بۆ نەی جیا جیاوە دانراون. بەڵام هەمویان پێکەوە بەستراون. هەمویان یەک بابەت پێک ئەهێنن و. لە دەوری ئەو مەینەتیە نەتەوایەتیـە ئەخولێنـەوە کـە دوای هـاتنی دەسـەڵاتی راسـتەوخۆی تـورک توشـی ناوچەکە بوە. رەنگە ئەو لە هـەمو کـەس باشـتر هەلومـەرجی ناوچـەی سـلێمانی لـە ژێـر دەسـەڵاتی تـورکی داگیرکەردا گێڕا بێتەوە. خوێندنەوەی سەرلەنوێی ئەم شیعرانە پێکەوە وێنەیەکی گشتی ژیانی پڕ چەوسانەوە و. کوێرەوەری ئەوسامان بۆ ڕون ئەکاتەوە.

قەصیدەکان ئەمانەن:

1. باسی پەرێشانی نۆکەرانی بابان دوای نەمانی دەسەڵاتی خۆجێیی
2. ستایشی عەزیز بەگ
3. شەڕی عەزیز بەگ لە گەڵ لەشکری تورک
4. مژدەی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشا
5. قەصیدەکەی نالی و. وەڵامەکەی سالم

رەنگە هەندێ شیعری تریشی دانابێ، فەوتا بێ، یا هێشتا نەدۆزرابێتەوە.

## -9-

1 بەدە ئەحواڵی ئەشخاصێ کە خاصی موڵکی بابانن
لە بینایی فەلەک هەر یەک سەراسیمە و هەراسانن
2 جەوانانی سەهی قەد بەسکە داماون لە بێ چیزی
لە ژێر باری غەما هەریەک لە خەمدا میسلی چەوگانن
3 لە بابانا گرفتارن پەرێشان خاتر و بێ کەس
بە جەمعییەت سیەهبەختان وەک گێسویی خوبانن
4 گەدان و بو گەدا دەرگانە واناکەن لە بێ چیزی
وەکو ئەرڕابی دانا هەر لە فیکری خانەبەندانن
5 لە زوڵمی چەرخی دونپەروەر سەخی تەبعانی حاتەم دڵ
بە ڕاهی کویی دونانا لە هەرسو کاسەگەردانن
6 بە دەستی کەشمەکەش هەرسو دڕا بەرگی خوێنارانی
قەبایی نۆکەر و ئاغا هەمو بێ چاک و دامانن
7 لە بابانا ئەمیستە چونکە قاوەی نۆکەری دوغە

لە حەلقەی ئەهلی حەسرەتدا هەمو کەموڵە فنجانن
8 ئەوانەی تورمە پۆش و شەهدنۆش و نازپەروەر بون
ئەمیستە خانەبەریۆش و نەخۆش و زار و عوریانن
9 ئەوانەی جێ نشیمەنیان لە گۆشەی تەختی حاکم بو
بە دەشتی شەهرەزورا جوملە وەک غولی بیابانن
10 دەلەرزن هەوری ئەو گەر بێتە ڕوی گەردون لە پایزدا
بە ڕوتی کۆنە خەزپۆشان لە فیکری بەرگی زستانن
11 صەفی پاشانی بابنوغلی لە دێی کۆستە و دەباشانا
بە دەوری گەڵەدا چوماغ دەرکەف جوملە چوبانن
12 موریدی خانەقا زۆرن لە عەهدی عەدلی ڕۆمی دا
لە ئاغایانی بێ بەش حوجرەها جێی تۆبەکارانن
13 ئەگەرچی تاعەتی جەبرە وەلێ عیللەت بە بێکاری
وەکو قاری یەکایەک حافیزی سی جزمی قورئانن
14 لە تولی ڕۆژگارانا لە هەرلا خادم و مەخدوم
وەکو ئەصحابی پێغەمبەر عومەن ڕوژەدارنن
15 سیەهبەختانی بێ دەوڵەت، لە بەر بێ ماڵی و عوسرەت
گەهێ حەممالی ماڵانن، گەهێ عەللافی مەیدانن
16............. لە فەوجی لەشکری ئیسلام
لە خەوفا تیفلی مەردوم وەک عەیالی ئەهلی زەنگانن
17 صەفی مەقروزی قەرزی ئیلتیزامی حاصڵی ڕۆمی
لە ناو هەورامی و کوردا هەمو تەبدیل و پەنهانن
18 لە فیکری ئیلتیزاما شەو دەکەن شورا لە بەر عوسرەت
سەحەر بۆ هەوڵی قوتی شەو لە ناو شارا پەرێشانن
19 ئەوانەی بەرشکستی ئیلتیزامی حاصڵی ڕۆمن
لە تاو بێنە و نیە گاگەل چەرێنی میری جافانن
20 زەرەرکردەی ئیجارەی پادشاهی چۆتە دەروێشی
فەقیری موڵکی هەوشار و غەریبی شاری تارانن
21 بە دیهقانی بڵاو بون دایەرەی بێ کەس بە قۆپی دا
لە بەڵخە و نۆکەرۆ و نەوتی و دەلوجە و سەید سێنانن
22 بە کەوبازی خەریکن دەستەی مەعزولی بێ ئاغا
موقیمی قەهرەمان و مێوڵی و تیمار و باخانن
23 حەیادارانی بێ حورمەت لە تاو بێ ماڵی و عوسرەت
فەقیری دێی فەقیرە و تەکیە و ئەستێڵ و تافانن
24 گروهی چەمچەتاش هەروەکو ئوستادی خونساری
لە دێ ی تەنگی... و تیمار و دۆڵانن

25 نەریمانی قەدیمی موستەعیدن بۆ خەرەک باری
بە یادی توربە و، کا و ئەفسار و پالانن
26 قەدیم تەن پەروەری نازن بە بازارا غوبار ئالود
ئەگەر گا باری کا ئاوەر وەگەر هێزم فرۆشانن
27 لە بیمی تازیانەی مەردی ڕۆمی سەیید و صۆفی
بە ئومێدی گەزۆ و مازو لە بن داری مەریوانن
28 هونەرمەندانی شێراوژەن، قەوی دەستانی پیل ئەفگەن،
لە ڕوی غەوواصی ئەتراکا وەکو ڕوبە گورێزانن
29 کوهەن سەوداگەری شاری لە شورا مەصلەحەت بێنن
وەلێ نۆکەر بە بەقاڵی تەرازوبازی دوکانن
30 کرێکارانێ ناکەس بۆ بناغەی کولبەی دیهقان
لە خانەی کاولی نۆکەر پەیاپەی خشت کێشانن
31 بە ڕێ ی بیم خەتەردا یەک بە یەک بۆ قاصیدی چاکن
بە بێ تەکلیفی ڕەهزەن، خود بێ چیز و عوریانن
32 صەفی مەقروزی بێ تەوسەن لە سەهمی سەت سەتی ئەتراک
وەکو عاشق لە هیجرانا یەکایەک ئەشک ڕێزانن
33 گەهێ قەلبولئەسەد بەسکە بە بێ سایەن لە وادی دا
وەکو مەجنونی سەحرایی لە بن خاری موغەیلانن
34 کزە و دوی کەباب دەردێ لە مەتبەخهای بێ دونا
بە یادی قوتی شامی شەو جگەرها بەسکە بریانن
35 تەلەب ناکا گەدا قەد سوی سفرەی صاحیبی نیعمەت
لە تاو ئەحواڵی بێ نانی لە هەرجا خانە میهمانن
36 بە زاهیر خورەم و شادن لە ڕوی تورکی ئەرۆمی دا
لە دڵ دا گەرچی دیگ ئاسا بە مەخفی جوملە جۆشانن
37 بە ئەحواڵی ملوکانی گەداپەروەر دڵم سوتا
لە بابانا ئەمیستە موستەحەقی خێر و ئیحسانن
38 لە جەوری چەرخی گەردون بەسکە حەیرانن بە ناچاری
بە لەب خەندان و شادانن بە دڵ غەمگین و گریانن
39 بە نامەردی سەراسەر میسلی گورگینن لە لای ڕۆمی
ئەگەر ڕوبینتەنی عەهدن وەگەر سامی نەریمانن
40 نیزامانی مولازم مەنصەبی مازی بیحەمدیللا
لە لادێ دا بە دو شایی هەمو جۆچێنی دیهقانن
41 خەیانەت پیشەکانی فەوجی برنجی لە برسانا
بە ناچاری لە دێی صوفیلەرا وەرزێری دۆمانن
42 مەلەخ تەبعن لە هێشوی دەغڵی دیهقان بە هەر لادا
لە ناو جاڕی گەنم هەریەک وەکو داهۆڵی خەرمانن

43 دریغا بۆ سوارەی خاصی پایتەختی سلێمانی
لە قرگە و قزلەر و قورخ بە ڕوتی جومله گاوانن
44 بەسێ سەگمەرگ و بێ عار و گرانجان و سوبوک عەقڵن
ئەوانەی ئەهلی بابانن بە دڵ لەم عەهدە خەندانن
45 لە ئەوزاعی سلێمانی ئەوانەی شاد و ناسودەن
لە فەرعا نوتفەی حەیزن لە ئەصلا جنسی شەیتانن
46 لە ئەصلا بانیی ئەم کارە کاسبهای شەهری بون
لە ئەمری فیتنە ئەنگێزا سەراسەر میسلی مەربانن
47 گەهێ هەمدەردی ئەتراکن، گەهێ هەمعەیشی ئەکرادن
لە یەکلا مادەری بەڕڕەن، لە یەکلا یاری گورگانن
48 لە زوڵمی چەرخی چەپگەردش، دریغا حەسرەتا دەردا
بە میسلی سالمی بێکەس گەلێ کەس وێڵی شارانن. (8)

هەروەکو بە سەرناوەکەی دا دەرئەکەوێ: "لە وەصفی پەرێشانی نۆکەرانی بابان دا دوای ڕۆیشتنی عەبدوڵڵا پاشا بۆ قوستەنتین". سالم ئەم قەصیدەیەی لە دوای لێخرانی عەبدوڵڵا پاشا و، کێشانەوەی بۆ بەغداد و، دورخستنەوەی بۆ ئەستەموڵ، هۆنیوەتەوە. والیی بەغداد ئیسماعیل پاشای بە موتەسەڕیفی سلێمانی داناوە.

ئیسماعیل پاشا نۆردوی تورکی هێناوە، بنکە و بارەگای لە سلێمانی داناوە، بۆ ئەوەی شوێنەواری دەسەڵاتی بابان نەهێڵێ، داودەزگای پێشوی گۆڕیوە و، هی تازەی لە جێگا داناون. زۆر کەس لەوانەی لە سەردەمی دەسەڵاتی بابان دا خاوەن پلە و پایە و دەسەڵات و ئیمتیاز بون لابراون و لێ یان قەوماوە. ئەمەش کاری کردۆتە سەر باری ژیانیان.

سالم لەم قەصیدەیەدا باسی چەند شتێ ئەکا:

1. خراپی باری ژیان و هەلومەرجی گوزەرانی "هەڵبژاردە" ی دانیشتوانی سلێمانی: بنەماڵەی میرەکان و، کاربەدەست و موچەخۆرەکانی دەزگای بابان... ئەمانە بە جۆرێ لە ناز و نیعمەت کەوتون، کەوتونەتە سواڵ و، ناچار بون شوانی، گاوانی، حەماڵی و عەللافی... بکەن.
2. هەندێکی تریش لە ترسی زوڵموزۆری دەسەڵاتی تورک لە شاردا خۆیان گۆشەگیر کردوە خویان داوەتە خانەقا و مزگەوت و خۆیان بە نوێژ و خوێندنی قورئانەوە خەریک کردوە و، هەندێکی تریش لە دێهاتی دەوروبەری سلێمانی دا خۆیان حەشار داوە و، هەندێکیش ئاوارە و دەربەدەری شوێنان بون.
3. لەو سەردەمەش دا، وەکو هەمو سەردەمێک، تاقمێکی قازانجپەرست و دورو خۆیان لە دەسەڵاتی داگیرکەر نزیک خستۆتەوە بونەتە هاوکار و چاوساغیان، لە گەڵ "دایکی بەرخ" شیوەنیان کردوە و، لە گەڵ "گورگ" گۆشتیان خواردوە. سالم جنێوی قورس بەمانە ئەدا کە لە "ئەوزاعی" ئەو سای سلێمانی "شادان و ناسودە" بون.
4. "کاسبەکانی شار" کە لە نائارامیی درێژخایانی سەردەمی دەسەڵاتی بابان و، نەمانی ئاسایشی گشتی و تایبەتی، دیارە ئەوەندە بێزار و هەراسان بون، هاوکارییان لە گەڵ دەسەڵاتی داگیرکەر کردوە. سالم ئەمان بە "بانی ئەم کارە"، واتە ئۆباڵی ئەو مەینەتییە لە گەردنی ئەوان توند ئەکا. ڕاستییەکەی ئەمان بەرپرسی ئەو ڕوداوە نەبون، چونکە ئەمە ئەنجامی سیاسەتی ناوەندیی دەوڵەتی عوسمانی بوە، نەک پیلانی "کاسبەکانی شار".

5. هەندێ بیر و بۆچونی سالم سەبارەت بە "رەعییەت" و"کاسب" و"پیشەکار" لەم شیعرەدا و لە شیعرەکانی تریشی دا هەیە، لە گەڵ تێگەیشتنی ئەم زەمانەدا ناگونجێ. بەڵام هەمو بیر و بۆچونێ ئەبێ ببرێتەوە زەمان و زەمینی خۆی و، بە سەنگ و تەرازوی ئەو سەردەمە و، لە چوارچێوەی هەلومەرجی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، فەرهەنگی... ئەوساکەدا بکێشرێن، نەک بە هی ئێستا و، لە هەلومەرجی ئێستا دا.

**-10-**

ستایشی عەزیز بەگی بابان

سالم قەصیدەیەکی درێژی تەرخان کردوە بۆ ستایشی عەزیز بەگی بابان.

عەزیز بەگ کوڕی ئەورەحمان پاشا و، برای مەحمود پاشا و سلێمان پاشا و، مامی ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشا بوە. کە تورک دەستی بەسەر سلێمانی دا گرتوە، عەزیز بەگ سەری بۆ دانەنەواندون. بەربەرەکانی کردون و، خەریکی ڕێکخستنی بەرگری بوە. سەرەتای قەصیدەکە بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

دەکا دنیایێ پڕ شۆڕش بە دایم فیتنەها پەیدا

بە ئەیرەنگ و فسون هەر دەم لە هەر مویێ وەغا پەیدا

تا ئەڵێ:

پەناهم شەهسوارێکە گوزەرکا گەر بە ئەلبولزا

دەکا نوکی سمی ئەسپی لە خارا توتیا پەیدا

بە حوجەت نێزە گەر لێ دا، سوپەر وەک کاغەزی قەندە

بە هەر زەربێ لە گەڵ بازویی ئەو، حوکمی قەزا پەیدا

*

لە سەهمی حەملەیی ئەو، بۆ عەدو هەرجا حەزەر لازم

لە دەس ئەو بو، کراسی ڕۆمیان شێوەی قەبا پەیدا

*

لە دەریای مەعرەکەی تیغی ئەهەنگی گەر نمایان بێ

لە ناو ئۆردوی تورکانا دەبێ شین و صەدا پەیدا

سالم، سەرەتای ستایشەکەی وەکو لە سەرەوە نوسراوە، بە "موبالەغە" دەس پێ ئەکا و، لە سەرانسەری قەصیدەکە دا ئەوەندە بە ئازایەتی و لێوەشاوەیی و سوارچاکیی عەزیز بەگ دا هەڵ ئەدا ئەگاتە رادەی هەڵنانێکی بێ تام. بەڵام بێگومان ئەم هەڵوێستەی سالم، هەڵوێستێکی سیاسی بوە و، جێگای ڕێز لێ نانە. سالم بە تەمای هیچ پاداشتێکی مادی نەبوە لە عەزیز بەگ. عەزیز بەگ لەو کاتەدا نەک هەر دەسەڵاتدار نەبوە، بەڵکو شۆڕشگێڕێکی یاخی بوە لە دەسەڵاتی زاڵی تورک و، دواییتر لە هی ئێرانیش. سالم باسی عەزیز بەگ ئەکا وەکو قارەمانی نەتەوەیی کورد لە بەرامبەر تورکی داگیرکەر دا. لەو ڕۆژەدا ئازایەتییەکی بێ وێنە بوە کە سێ زات بکا، بە چەک یا بە قەڵەم، بچێ بە گژ دەزگای حوکمڕانی عوسمانی دا. ئەمە لە دو لاوە غەزەبی بە سەر ئەو کەسەدا باراندوە: یەکەمیان، غەزەبی دەسەڵاتی داگیرکەر، کە ئەبو بەهۆی گیران و دەربەدەری و بێ بەشی لە هەمو ئیمتیازەکانی نزیکایەتی لە حوکم. دوەمیان، غەزەبی دژایەتی "خەلیفەی موسوڵمانان"، کە لەو سەردەمە دا لە بەر چاوی زۆر کەس، بە تایبەتی پێشەوایانی دینیی، "ئیتاعەت" ی "واجب" و"فەرز" بوە.

دوای دورخستنەوەی میرەکانی بابان "بۆشایی سەرکردایەتی" دروست بوە. سالم لە شیعرەکەی دا بە ئاشکرا باسی ئەمە ئەکا و، لە خوا ئەپاڕێتەوە عەزیز بەگ ڕزگار بکا یا بیگێڕێتەوە بۆ ئەوەی سەرکردایەتی موڵکی بابان بگرێتە دەس و، لە دەس تورک دەری بهێنێ و، ڕەواجی بۆ پەیدا بکا.

عەزیزم وا لە ناو چاها خوداوەندا نەجاتی دەی
لە چیهرەی ئەو بکا یەعقوبی دڵ ڕەمزی صەفا پەیدا
خودایا موڵکی بابان بێ ڕەواج و قەڵبە، سا لوتفێ!
بە ئیکسیری وجودی ئەو بکا، وەک مسک، بەها پەیدا.

## -11-

شەڕی سوارەی بابان و ئۆردوی ڕۆم

ساڵی 1263 / 1847 ڕێککەوتنی دوەمی ئەرزڕۆم لە نێوان دەوڵەتی ئێران و تورکیای عوسمانی دا بە چاودێری دەوڵەتە گەورەکانی: بەریتانیا و ڕوسیا، ئیمزا کرا و هەردو دەوڵەت پەسەندیان کرد. ئەمەش بناغەی سیاسەتی هاوبەشی هەردو دەوڵەتی بەرامبەر مەسەلەی کورد و میرایەتیە کوردیەکان دارشت. پاشاکانی بابان ئیتر بواری مناوەرە و، ئەمبەر و ئەوبەریان ناما.

ساڵی 1264 / 1848 نەجیب پاشای والیی بەغدا، ئەحمەد پاشای بابانی بە یەکجاری لێ خست و، عەبدوڵڵا پاشای برای لە جێگای ئەو دانا بە قایمقامی سلێمانی.

دوای نەجیب پاشا، عەبدی پاشا بو بە والیی عێراق. محەممەد بەگی برای عەبدوڵڵا پاشا، بەو هیوایەی ئەو لە جێگای عەبدوڵڵای برای بکەن بە قایمقام، هەڵات بۆ بەغدا. لە بەغدا گلیان دایەوە.

ساڵی 1266 / 1849 نامیق پاشای والیی بەغدا، عەبدوڵڵا پاشای بانگ کرد بۆ بەغدا. لەوێ گلی دایەوە. ئیسماعیل پاشای دانا بە قایمقامی سلێمانی و، هێزێکی 2 هەزار کەسیی لە گەڵ نارد. نامیق پاشا لە پێش دا محەممەد بەگ و، دوای ئەو بە چەند ڕۆژێ عەبدوڵڵا پاشای بە گیراوی ڕەوانەی ئەستەموڵ کرد. ئەرکی ئیسماعیل پاشا لە سلێمانی دا ئەوە بو: شوێنەواری دەسەڵاتی بابان نەهێڵێ و، دەسەڵاتی ناوەندیی تورکی تێ دا دابمەزرێنێ. ئیسماعیل پاشا یەکەمین حاکمی بێگانە بو لە سلێمانی.

عەزیز بەگی ئەورەحمان پاشا سەری دانەنەواند و، کەوتە خۆ ئامادە کردن بۆ بەرهەڵستی و، دەرکردنی ئۆردوی تورک. حسێن بەگی برای و، محەممەد ئەمین بەگی کوڕی عوسمان بەگی برازای و، هەندێ لە بەگزادەکانی تری بابان و، هەندێ لە سوارەی هەمەوەند و هۆزەکانی تر بون بە هاودەنگی. عەزیز بەگ و سوارەکانی هەمو ڕۆژێ لە دەوروبەری سلێمانی دا پەلاماری سەربازەکانی تورکیان ئەدا. هێزەکانی تورکیان شپرزە کرد بو. ئیسماعیل پاشا تەنگاو بو. موشیر نامیق پاشا هێزی زیاد و هەندێ تۆپی نارد بۆ بەهێزکردنی ئۆردوەکەی سلێمانی. بەڵام عەزیز بەگ بەردەوام بو لە سەر شاڵاوەکانی. عەزیز بەگ بە نیازی گرتنەوەی سلێمانی خۆی سازدا. لەمەش دا محەمەدئەمین بەگ و، کوڕەکانی سلێمان پاشا: قادر بەگ و حەسەن بەگ و، چەندکەسێکی کە لە بەگزادەکانی بابان هاودەنگ و هاوکاری بون. پێ ئەچێ هەندێ لە بابانەکان لە ناو هێزی "نیزام" دا بوبن و بۆ "فێڵ" بەڵێنی هاوکاریان پێ دابێ. بەڵام لە کاتی شەڕەکە دا بەڵێنەکەیان بە جێ نەهێنا بێ. هێزی عەزیز بەگی بابان بە کۆمەڵ هێرشیان بۆ ناو شار کرد. ئیسماعیل پاشای تورک بەرپەرچی دانەوە. بە توندی تۆپبارانی کردن و، سەربازەکانی تورک ناو کۆڵانەکانیان لێ گرتن. شەڕێکی قورس قەوما. سوارەی بابان لە ئاگری تۆپ و تفەنگی تورک زەرەرێکی زۆریان پێ گەیشت و، شپرزە و پەرێشان بون. ژمارەیەکی زۆر کوژران. محەممەد ئەمین بەگ بە گوللە بریندار بو. بە زەحمەتێکی

زۆر لە شار دەرباز بو. خۆی گەیاندە ئاوایییەکی دوری شار بەڵام چونکە برینەکەی کاریگەر بـو پـاش 3 رۆژ مرد. ژمارەیەکی زۆریش گیران. براکانی ئەحمەد پاشا: قادر بەگ و حەسەن بەگ و، سلێمان بەگی هەڵەبجەیی بە دیل گیران و، بە گیراوی رەوانەی ئەستەموڵ کـران. پیرەمێـرد، لـە کورتـە باسـێکی ئـەم شـەرەدا، وەکـو شەرەکەی خستۆتە مانگی ناوجەژنانی 1266 / 1850 دوە، ماوەی گـەمارۆدانی لەشـکری تـورک و، باسـی فێڵەکەشی کردوە ئەڵێ: "عەزیز بەگی مامی ئەحمەد پاشا عوسیانی کرد و، پەنجاویـەک رۆژ دەورەی سـلێمانی بەست. ئاخری بە فێڵ و، بە ناوی عەسکەری ئەحمـەد پاشـا وە - کاغـەزیان بـۆ نوسـی: وەرە ئێمـە تەسـلیم ئەبین! ئەویش بە دڵپاکی و بێ باکیی هاتە سەر قشڵە و تۆپخانـە، لـە پـڕ دەسـترێژی تـۆپ و تفـەنگیان لـێ کردن. زۆریان لێ کوشتن. هەمزەی مەسرەفی باپیرم لەو شەرەدا یانزە برازاو کەسوکاری کوژرا. خۆیشـی بـە برینداری گیرا. لە چوخمەکەی حەساری ماڵی کاک ئەحمەدی شێخ حـەپس بـون. شـەو پەنجـەرەی شـکان و رایان کرد."

ئیسماعیل پاشای قایمقامی سلێمانی و ئەفسەرە داگیرکـەرەکانی لەشـکری تـورک، لـە 29 ی رەجـەبی 1266 / 12 ی حوزەیرانی 1850 دا، بۆ "پاکانە کردن و ئافەرین" ی محەمەد بەگی کـوڕی خالیـد بـەگ و کوڕەکانی: عەبدوڵڵا، عەبدورەحمان و، حسێن، کە ماوەی چل رۆژ، بە 300 سوارەوە لـە سـەنگەری تـورک دا دژی عەزیز بەگ جەنگیون، شەهادەتنامەیەکیان نوسیوە. هـەر ئەمانـەش فێڵیـان لـێ کـردوە. لـە بـەر نرخـی مێژوویی ئەم بەڵگەنامەیە لێرەدا دەقاودەق وەکو خۆی دەینوسمەوە:

"لە بەگزادە و خانەدانە قەدرگرانـەکانی سـلێمانی: محەمـەد بـەگی کـوڕی خالیـد بـەگ، کـە دڵسـۆز و گیانبەخشی سەڵتەنەتی سامدارتانە و گەیشتۆتە تەمەنی تەواو و، لە لایـەن هەموانـەوە و، بـە تایبـەتی لـە نـاو عەشیرەتەکەی دا پەسەند کراوە و، راستگۆیی و خزمەتگوزاری شایستەی پەسەندی شـاهانەتان بـوە، لـە گـەڵ گەیشتنی عیزەت مەئاب ئیسماعیل پاشای دانراو بە قایمقامی سلێمانی، میری ناوبراو لە ناوچـەی قزڵجـەدا لـە کاتی یاخی بونی بەگزادە و نۆکـەرەکان دا، چالاکانـە کـاری کـرد بـۆ راکێشـانیان و پیـاوی تایبـەتی نـاردە سەریان و، بە هەمو جۆرە ئامۆژگاریی و دڵدانەوەیەک لە گەڵیان خەریک بو. بـە بۆنـەی ئـەو کـارە چـاک و راستانەی خۆیەوە کە بە کاری برد و یاخییەکان و موخالیفەکان لێیان نەبیست و گوێڕایەڵی نـەبون، هـەروەها لەو ساتەی کە رێگاوبانی هاتوچونیش بەسترا بو، ئەو لە ناوچەی قزڵجەوە پتر لە 300 سوار وپیادەی خـۆی هێنا بۆ سلێمانی و لە لایـەن پاشـای نـاوبراو رێنمـایی کـرا و دامـەزرا و، خـۆی مـاڵ و کەسـوکار و، رۆڵـە گیانبەخشەکانی شـەو و رۆژ لـە قشـڵەدا پێشـخزمەتی پاشـای نـاوبراو بـون و، تـا بـە سـەر چـونی ترسـی یاخییەکان، ماوەی 40 رۆژ ئەگەڕایەوە ناو خێزانەکەی. لە رۆژانی شەڕیش دا، لە لایەکەوە خۆی و کوڕەکانی: عەبدوڵڵا بەگ و عەبدورەحمان و حسێن بەگ، هاوکاری ئەو سوارە و پیادانەی ژێر فەرمانی بون و، خـەریکی بەرهەڵستی کاری ترسناکی ئالەبارەکان بون، کە بەغیرەت و دڵسۆزییەوە، خۆیان لە رویان دا توند راگرت. لـە لایەکی ترەوە، ئێمە لە دڵپاکیی و راستگۆیی و بە جێهێنانی ئەرکیان دڵنیا بوین لە کۆتایی دا، لە بارەی غیرەت و دڵسۆزیی بینراوی میری ناوبراو و کوڕ و بەگەکانی کە باس و تاریفیان تـەواو نـابێ و بـەراوردی وێنـەی بەگزادەکانی تر ناکرێن، لە هەمو رویەکەوە شایستەی لێبوردن و مەرحەمەتی گـەورەی پایەبەرزیتانـە. لـە بـەر ئەمانـە، ئێمـە ئـەم شـەهادەتنامەیەمان بـۆ بارەگـای بـەرزتان نوسـی و پێشکەشـمان کـرد. فـەرمان فـەرمانی حەزرەتتانە. لە 29 ی رەجەبی ساڵی 1266 دا

بەندە میرئالای پیادە حەسەن

بەندە میرئالای ئەندامی ئەنجومەن ئیسماعیل راتب

بەندە میر لیوا قایمقامی سلێمانی ئیسماعیل

بەندە بێکباشی پیادە تاهیر
بەندە بێکباشی سواری محەمەد شەفیق
بەندە کاتب لیوای سواری سەعید
بەندە قوڵئاغاسی پیادە حسێن
بەندە قوڵئاغاسی سوارە عومەر
بەندە یوزباشی پیادە حسێن
بەندە مولازمی پیادە محەمەد

*

ئەمە دوایین شەڕی بابان بو لە گەڵ دەوڵەتی عوسمانی دا.

عەزیز بەگ لە گەڵ ژمارەیەکی کەم دەرباز بو. ماوەیەک وێڵ و سەرگەردان لە ناوچەکانی سنوری ڕۆم و عەجەم دا سوڕایەوە. حکومەتی عوسمانی داوای لە ئێران کرد، حاکمی کرماشان، عەزیز بەگ دەر بکا. عەزیز بەگ لە هیچ لایەکەوە هیوای نەمابو. سەرئەنجام بەتەنیا ڕێگای ئەستەمبوڵی گرت و خۆی بە دەستەوە دا لە جێگایەکی دور لە کوردستان دەس بەسەر دایان ناو موچەیەکی مانگانەیان بۆ بڕییەوە.

میرەکانی بابان لە کوردستان دورخرانەوە. ئەگەرچی زۆریان پلەو پایەی دەوڵەتییان پێ بەخشین، بەڵام هەتا مردن ئەیان هێشت جارێکی کە پێ بنێنەوە سەر خاکی کوردستان. (9)

سالم ئەم شەڕەی بە هەڵبەستێکی درێژ هۆنیوەتەوە. دیمەنی شەڕەکە وەکو شەڕێکی نەتەوەیی دژی دەسەڵاتی داگیر کەر و، عەزیز بەگ وەکو قارەمانێکی نەتەوەیی شەڕی بەرەنگاری بێگانە باس ئەکا.

1 لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم، دەستەوئەژنۆ، کەف زەنان
گێژەڵوکەی بای ئەدامەت تاری کرد صەفحەی جیهان
2 شارەزور بەحر و، سلێمانی لەسەر ئەو گەمیە ڕەنگ
بۆ شکستی وەک ئەهەنگ بۆ فیتنەی ئاخر زەمان
3 کێ دوعای کردبێ بەسۆز ئەمساڵ لە کشتی شەهرەزور
دابیارێنێ لە تەنخوای تەرزە، ڕۆمی ئاسمان؟
4 ڕاستە گەردون چاپوکە بۆ ڕەنگی بەد ڕێتن، وەلێ
نارژێنێ ڕەنگێ بەم ڕەنگە بە مودەی صەد قیران
5 بەزمی صەیدی ئێمە صەیادی فەلەک کارێکی کرد
ڕەنگە باڵای تیر قەددان بێتە تەرکیبی کەمان
6 زیعفی تالیع جازبە وەک کەهرەبا بۆ خوێن و دەم
سەیری چیهرەی بەختی من کەن بۆ بە ڕەنگی زەعفەران
7 ئەو بەهاری من خەزانە و فێنکیی صوبحم تەموز
پرتەوی ماهە غەم وچاکی دەرونم وەک کەتان
8 ئاگری ئەگبەت لە خەرمەنهای تالیع کەوتوە
شەمعی دەوڵەت هەر تەرەف دەگرا هەمو خامۆش کران
9 حەلقەدەین یاران بلا ئاشۆفتەبەخت و تیرەڕۆژ
ڕۆژگار دنیای لە ئێمە کردە گێسوی دولبەران

10 هەوری بەدبەختی کە هاتە رووی فەلەک وەک رەنگی قیر
کەوکەبەی ماهی موراتی ئەهلی بابان بو نیهان

11 صاعیقە و بەرقی نەدامەت زولمەتی دا شەرق و غەرب
بارنەبارانە بە مەخصوصی لە سەرمولکی بەبان

12 چاوی عیبرەت هەڵبرە ئەی دڵ لە وەزعی دەهری دون
سەیرکە سا تورکی فەلەک چی کرد بە زومرەی کوردزوبان

13 چارەسەرکەن ئەهلی دەروێش نانی مونعیمتان برا
لولە بۆ سفرە و نواڵە، ون کراوە زەرف و خوان

14 ئەهلی سادات و مەلاو حاجی بلا شین کەن بە سۆز
دەفتەری ئەهلی وەزایف دیم عومەن حەک کران

15 عەرصەیی مەیدانی چەرخە ئێستە جەولانگاهی بوم
بو بەلانەی زاغی بەدخو ئاشیانەی باڵەبان

16 دڵ لە میحنەت کەیلە تابی سەیری ناو شارم نیە
عەینی چاوم خوێنی تێ زاوە لە داغی مەردومان

17 بێ زبان، کوکوزەنان، هەر خانەدان، تێ دەفکرم
عەنکەبوت خواجانشینەو جوقتە جوغدن دیدەبان

18 حاکمە رۆمی لەسەر تەختی سولەیمانی دریغ
کەوتە دەستی دێوی دون موهری سولەیمان ئەلئەمان

19 مەجلیسێ وابێ موشەخخەص دودی گۆگرد عودە بۆی
دەروێش ئاغا بو، لە جێی مستۆ هەمو شەو نەغمەخوان

20 عەزل ونەصبی کرد بە تەدبیری کەیا مەنصوبی رۆم
قاوەچی ئەولای قاپی بێت و، سوران پاڵەوان

21 کێ دەکا تەقسیمی مەنصەب وا موقابیل شەئنی شەخص
بۆ عەزیز سەروازی کەوم و حاجی قادر ئاشەوان

22 ئاڵوگۆری مەنصەبی دو شەخصی عالیجاە کرا
مەحمودئاغای زل حەکیم باشی، حەمامچی بابەجان

23 کۆڵ بەدۆش، با خەرقە پۆش بن، تاج و کەشکۆڵ هەڵگرن
روبکەنە ئەملاکی (...) بچنە شاری خامۆشان

24 ئەسکەمل بێنن قەراریان دەن لە جێ ی ئاغالەران
مەجلیسی شورا ئەمێستە خاصە بۆ ئەصنافەکان

25 وا کەریم ئاغای ئەنێ تەدبیری هەستەی جاف دەکا
خاڵ هۆمەر دارۆغەی شارە و مودیری حاجی ئەحان

26 کەس ئەچێتە پێشەوە حاجی غەنی تەدبیرییە
مەئموری سەبتی نفوسە و شاغیلی باجی دوکان

27 حاجی میرزا کەوتە ناو کار و تەرازوی شاردەوە

مەصرەف ئاسا حاسییە بۆ خاصەجاتی مالوان
28 میری خولمار و دەڵێن ئەمساڵ مەزەننە صالحە
باز بە جەباریان سپارد باقڵ ئوموری دۆمەکان
29 ئاغەتاها مەشوەرەتجویە لە گەڵ سەرکاتبی
وادەزانم وەرگرێ حوکمی چیاسەوزو شوان
30 بۆ گەڕانی دەوری شار ئەمشەو مەلا یونس دەچێ
مشتەکەی گورز و، کەمەندی کشتەک و، دەرزی سینان
31 حامید و، وەستا حسێنی کۆڵ لە شارا گەزمەچین
هەردو بۆ خوێن ڕیتنی دز کوبەکو توشنەن بەجان
32 شیری قەیچی، تیری دەرزی، زەرگی نیوگەز، زەرعی ڕم
ئەخ کەمەند، ئەسپەر وتو، جەوشەن پەتی، بەن ئەردەوان
33 غەڵبەغەڵبی هەی بکوژ هەڵسا لەدەشتی چوارباخ
قادری دەڵلاکە هەرشەو تا سەحەرگەه پاسەبان
34 سەتڵی سەرج و، سینیی تەپڵ و، ئەسپی قاپقاپی حەمام
لۆنگی جەوشەن، شیری گزلک، تۆپزی گازی ددان
35 وا موسەللەح بون بەئەسباب، یەلی ئەجاری شار
بۆ کەمینگاهی گوزەر وەک شێری بەندی بەردران
36 ئاخج و تیر و کەمان و زەرگ و دەشنە دەهرە بو
ئەسکەنە و تێشە و مشار و لێسک مەنگەنە و کەوان
37 چاکی کرد میرزا سلێمان پاسی دەککەی زیندرو
سەنگەر دەستگایە بۆ شەڕ، شەو هەتا وەختی بەیان
38 مشتەیی ئایە هەمانە و دەیوەشێنێ میسلی گورز
کازنی تیژی ئەخەج، زوبین دەرەفش، ئەسپەر هەسان
39 مونیسی خاص و ئەدەب ئاموز پاشایە بزە
بۆ ئەدیمی چون دزەش بێنن لە تیمار و کچان
40 باشخەیاتی خەرقەیی کەهیا ئالەی کۆپاندرو
ئەحمەد ئاغای دەرزیباشی بۆ بە قاترچی خەران
41 هەی پەنا بە خودا لە دەس ئێلی غەوارەی دەوری شار
کافرۆشی و چنگنی و چوچانی و جافی تەلان
42 عەزمی هەرکارێ بکا فەرزەن ئەگەر کاک ئەحمەدە
وای دەماڵن سێ کەرەت تا دێتە کانی ئاسکان
43 بۆ ئەجیبانی ولایەت بونە ئافەت ئانەجیب
جامەیی شەهری لە دەست صەحرانشین بەس، دادران
44 بالەنی و ئەولا سوتەڵ هەردو شەریکی قیسمەتن
سەبتی توغرا بون بەحوکمی ماوەت و سەمتی قەشان

45 لوتفی رۆمی پرتەوی رۆژە لە نیک و بەد بەدا
لەقلەق و نێریش دەچن بۆ زابیتی ئەهری موان
46 کەس نەڵێ رۆمی لە تەسخیری مەمالیک چاپوکن
سستیی بەختی عەشیرەت بو بەچالاکی ئەوان
47 وەرنە رۆستەم وەک ئەمان کەی دێتە دەست بۆ چاپوکی
وا بەجورئەت، وابەغیرەت، وا یەل و صاحێب سینان
48 وەختی حەملەی رۆژی مەیدان موئدەعی وا پێ دەکەن
دێتە لەغزش پێی رێکاب و، سست دەبێ دەستی عەنان
49 شێری بێشەی موڵکی بابان، مەردی مەیدان. زاهیرە
گەر کەسێ بێنێتە خاتر دەستوبردی گەرمیان
50 مەرگی تورکانی جەفاجو صەد قەدەم پێش گوللە کەوت
تا پەلە ئەنگوشتی بۆسی، ئەو گەیشتە سەر نێشان
51 ئیختیراعی تورک لە دڵ دا مەشقجوی شێوە شوغال
یەککە تازەی کورد لە دونبالی وەکو شێری ژیان
52 خۆ لە بیمی تیغی جان فەرسای میر ئەو رۆژە تورک
میسلی کەوباری هەڵۆبین شەش جیهەت لێک هەڵوەشان
53 هەر کە شوعلەی ماهیچەی تیغی بورەهنە بو زهور
وەک قوڵنگی شەو چرابین تێکەڵاو بون رۆمیان
54 گوللە تۆپ وەک تۆپی قایش بو لە ئاقار غیرەتی
تەبعی جۆیای بەزمی شللیک بو لەجێ ی سینەکەمان
55 بۆ غیماری مەعرەکە تیغی بە روتی نابرێ
بۆ جەلای جەوهەر لە خوێنی موئدەعی وەردەگرێ قان
56 شۆری مەخفی رۆمیان زانیوتە بۆ زاهیر دەبو
نۆکی ئەی دەیخوێند لە دڵیانا هەمو رازی نیهان
57 ئیسمی قابیز بو لە جێ ی جەوهەر لە حەربە رەزمی ئەو
وەک چەپەر پۆستەی ئەجەل هات و بەتورکی دا نیشان
58 وەختە بو تای پیرەهەن کفنی حەیات کەن بۆ مەمات
هەر لە ناکاوا نیزام دایان لە ریزی باڵەبان
59 ئاهی ئەم حاکمانە تەحقیقە ئەگەر نەگرێ نیزام
قەومی نوحیش دەچنە جەننەت بێ شک و شوبهە و گومان
60 صەرفی ئەقدی رۆحی شیرین بو هەتا پەروەردە بون
بەچە گورگ ناسا لە ئاخر کەوتنە کۆزی دونەمان
61 فەرقی فەخری میرئالا گەییە بەهرام و ئەسەد
کەوتە قەعری چاهی غەم لەو حاڵە میری بازیان
62 باز وەکو بازی تەوار دەورێکی کرد و هاتەوە

دەوری کەهیا و شاری دا دیسان بە ڕارای نۆکەران
63 ئاغەلەر وەک گورچکی گا هەریەکێ فیکرێ لە دڵ
خۆ نیزامیش میسلی سوسن جوملە خودرو و دوزبان
64 هاتە ژێر پاساری تەنگ لەشکر ڕیکاب ئەندەر ڕیکاب
کەوتە سەر کوڵان و بێ ڕێگە عەنان ئەندەر عەنان
65 بو بەجێ ی بەبر و غەزەنفەر کوچە کوچە و ناوسوقان
سەرمەحەللە ڕەنگی بێشەی گرت لە نێزەی جان ستان
66 ڕەنگی صەحرای مەحشەری بو شیوەکەی لای پیرمەسور
گرمەگرمی تۆپی ڕۆمی، هەوهەوەی سوارەی بەبان
67 پەیکی تەقدیر بو بەسەقا ڕاوییەی زوڵمی بە دۆش
ئاوی ئەڵماسی بەتیژی ڕێتە حەلقی تەڕدلان
68 ئارەقێ، ئابێ، ئەبو غەیرەز شەرەنگ مینایی تیغ
بێخودی نەشئەی خەمۆشی تا حەشر بو بۆ یەلان
69 بو بەجاروبی محەللە هەر تەرەف پەنجەی پەڕیو
پێکراو بێ پێ لە مەیدان، پەهلەوان وەک پاڵەوان
70 سەن سەنی سوارە نیزام و، گێل ئۆلانی تورک ئۆچاخ
بگرەبگرەی کورد زەبان و، ئاخ ئاخی تورکمان
71 قەهرناک و سەربورەهنە، ئاتەش ئەفشان، حەملەوەر
جەنگجو بون، یەک بە یەک، هەر سو وەکو بەبری بەیان
72 هەی خودا ڕۆ لەو دەمە چی کرد غەوای تۆپ و تفەنگ
سەرزەمین تاریک و، دنیا توز و، کەڕ گوێی ئاسمان
73 ماهی تالیع ڕێی مەحاق و ڕۆژی ئەگبەت جیلوەگەر
خەرمەنی شادی لەبەر با، بەرقی غەم ئاتەش فشان
74 لاغیری تالیع شکاندی حەسرەتا بازوی قەوی
ئەختەری بورجی موزەفەر خۆی لە ئێمە کرد نیهان
75 گەرچی پێشاپێش بە هەیبەت چون و ئازا کەوتنە ماڵ
حەسرەتا باز هەم ئەیان زانی نیزام وا بێ حەیان
76 سێ بلوک لای پشتی گرت و، سونگی دەوران هاتنە پێش،
فیرقەیێ لای پیرمەسور و نیوەی کۆڵانی ئەحان
77 پیش دەمیان تۆغڵەمەی تۆپ، پشتی سەر ئەو ئاگرە،
گەیبە چەرخی هەفتەمین، لەو حینەدا، ئاه و فوغان
78 غەیری تیغی تەڕ گەروی لەب توشنەگان ئاوی ئەدی
کوشتەگانی کوردزەبان دەتوت شەهیدی کەربەلان
79 گوێی فەلەک کەڕ بو لەبەر ناڵە و نەفیری ئەهلی شار
لامەکانی گرت صەدای ناڵە و فوغان و ئەلئەمان

80 موددەعی کوێر بێ! نیزام ئیفلیج! مەکان ژێروزەبەر!
میری سوورداش و، ئەمینەی پیاوی، هەردو ئەنگوان
81 گەر عەشیرەت گریە کەن هەریەک هەتا دەمرن کەمە
کوشتنی ئەو، بای موخالیف بو لە شەمعی دودمان
82 ڕۆژی قەتل ئەمڕۆیە ئەلحەق "وا حوسەین" ی پێ دەوێ
بۆ ئەدایی قەزییە سەراسەر نیلگونە ئاسمان
83 یادگاری حاکمان و، جانشینی سیلسیلە
نامورادو ئەورەس و، مەقصەد نەدیوو نەوجەوان
84 سا فەلەک کەیخوسرەویی خوێنی سیاوەش گوم مەکە
ڕۆستەمی سانی عەزیزە و، موددەعی تورانییان
85 قادری قودرەتنوما تۆ قودرەتی خۆت کردە کار
قادری ئێمەت موسەلسیل خستە بەندی ڕۆمیان
86 وەرنە قادر تۆ دەزانی قەت کەسێ قادر نەبو،
وا بە مەقهوری، بکا قادر ئەسیری ڕۆمیان
87 گوللە وەک تەرزە دەباری ئەهلی لەشکر کەوتنە یاڵ
پای ڕیکابیان قورص لەنگەر بو، سوبوک دەستی عەنان
88 هاتنە ناو کۆزیلکەوە، چەندێک سەلامەت چونە دەر،
بەعزێ کوژران، جوملە گیران و، چەندێ ڕوت کران
89 ئەم لەغەم دا هاتە جۆش، ئەو سێر و، ئەمیان بو غەنی
سەگ لە لاک، عەسکەر لە ماڵ و، دڵ لە تیغی قاتلان
90 دەرپەڕین باز مەیلی ئیقنامیان نەبو لەو بیدعەتە
حەسرەتا یەک دڵ نەگەینە شیوەکەی گردی گولان
91 گەر محاللی گریە بو ئەو وەختە من زۆر پێکەنیم
پورە ماتان ئەحمەد ئاغای بردە شکڵی بۆمەکان
92 گەرچی میصرە شارەزور ئەمما خرابە بێ عەزیز
ڕو دەدا لەم لەم خەڵقە ئاخر حاڵەتی کەنعانییان
93 شێری بێشەی موڵکی بابان بو عەزیز، ئەمما دریغ،
وەک گرێی ناموسکی، بێ ئەو، قەومەکەی زو هەڵوەشان
94 دیدە نابینایە وەک یەعقوب لەهیجرانی عەزیز
تۆی خودا صاحێب مەکان و تۆی خودایا لامەکان
95 کەوکەبەی بەختی عەزیزم وا لە چاها بێنە دەر
شەعشەعەی ئەمری مونەووەر کا زەمین و ئاسمان
96 چنگڵی شەهبازی بازی بازیانیی باز ئەدی
فش هەڵات کەهیا لەسەر بەیزەی تەمەع وەک ماکیان
97 بۆ مەداری نانی عوشرەت، قەت مەدارێکی نەبو

ناشەکەی تەبعی بەناوی کەیدی ڕۆمی هاتە دان
98 بەختی سوتی، سا لەڕێ ی حەق "حەق" حەقی لێ وەرگرێ
بەدنەمەک گیری نەمەک بێ، وەک ئەوانی دا بەمان (10)

ئەم قەصیدەیە چەند بابەتێکی گرنگی تێ دا کۆکراوەتەوە. من لەلایەنی ئەدەبی نادوێم. ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە لایەنی مێژویی و، ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی هۆنراوەکەیە. لێرەدا چەند گۆشەیەکی ڕون ئەکەمەوە:

### 1. گلەیی لەڕۆژگار

سالم سەرەتای قەصیدەکەی بە سکاڵا دەس پێ ئەکا. چەن جارێ وشەی: فەلەک، گەردون، ڕۆژگار، ئاسمان، دەهری دون، دوبارە ئەکاتەوە. ئەوەی بەسەر کورد هاتوە ئەبەستێتەوە بەبڕیاری فەلەکەوە. پێ ئەچێ سالم باوەڕی بە "قەدەر" هەبوبێ.

### 2. تەشکیلاتی داوودەزگای حکومەتی

دوای نەمانی دەسەڵاتی بابان و، هاتنی دەسەڵاتی تورک، وەکو بەشێ لە سیاسەتی چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەندی تورک کاربەدەستانی داوودەزگای بابانیان لابردوە و، هی تازەیان لە جێ داناون. هەرچەندە هەندێ لەمانە کورد بون، سالم دژی ڕاوەستاوە. بەگاڵتە پێ کردنەوە باسیان ئەکا. چونکە فەرمانبەری تورک و هاوکاری ئەوان بون.

### 3. شەڕی نابەرامبەری کورد و تورک

سالم باسی ئەم شەڕە ئەکا وەکو شەڕێکی نەتەوایەتی کورد لە دژی تورکی داگیرکەر. بەڵام بەداخەوە باسی نابەرمبەریی ئەم دوهێزە ئەکا لە چەک و ژمارەدا. شەڕی تەنبەتەنی ناو شار. لە ناو شارێکی وەکو ئەوسای سلێمانی دا، لە نێوان تاقمێکی شۆڕشگێڕ و، هێزێکی گەورەی وەکو ئۆردوی عوسمانی دا، بێگومان هەر نابەرامبەر ئەبێ. سالم بەشانازیەوە باسی ئازایەتی سوارەی بابان ئەکاو، بە ستایشەوە لە هەڵمەتی شێرانەیان ئەدوێ.

### 4. ستایشی قارەمانەکانی شەڕەکە

ئەم شەڕ دۆڕاو بوە. پاداشتێکی ماددی پاڵی بەسالمەوە نەناوە بۆ دانانی قەصیدەیەکی وەها، ئەوەی پاڵی پێوەناوە هەستی نەتەوایەتی و، خۆشەویستی قارەمانەکانی شەڕەکە بوە. ئەگینا ستایشی عەزیز بەگی یاخی لە دەسەڵاتی تورک و، ستایشی میری سورداش و پیاوەکەی کە هەردو لە شەڕەکەدا کوژراون و، ستایشی قادربەگ کە بەدیلی کەوتۆتە دەس هێزی داگیرکەر ئەبێ چ قازانجێکی بەسالم گەیاندبێ جگە لەڕق و سزای کاربەدەستانی عوسمانی.

سالم زۆری بە ئازایەتی عەزیز بەگ دا هەڵداوە، بەڵام بێگومان، سالم ئەگەر لە عەزیز بەگ ئازاتر نەبوبێ، ئازایەتی ئەم لەو کەمتر نەبوە. پێوانەی ئازایەتی تەنیا شەڕە تفەنگ نیە. ئازایەتی لە دەربڕینی هەڵوێستی سیاسی، فیکری، کۆمەڵایەتی دا وەکو ئازایەتی مەیدانی جەنگ یابگرە زیاترە. پیاوێک لەو ڕۆژگارە تاریکەدا، کە زوڵم و زۆرداری تورک گەیشتۆتە ئەو پەڕی، ستایشی قارەمانەکانی شۆڕش دژی دەسەڵاتداران بکاو، بە ئاشکرا هێرش بباتە سەر تورک و، بە ناو جنێو بەو کوردانە بدا کە هاوکاری داگیرکەریان کردوە. ئەمە سەرەڕای دوژمنایەتی کاربەدەستانی حکومەت، دوژمنایەتی لە گەڵ زۆر پیاوی دەسەڵاتدارو بنەماڵەی کاربەدەستی سلێمانی بۆ دروست کردوە.

### 5. گاڵتە کردن بە "ئەصناف"

خاوەن پیشە و دوکانداری بازاڕ هەمیشە و، لەهەمو شوێنێ، ئاسایش و ئارامییان ئەوێ. دیارە نائارامی سیاسی و، ململانێی نا جوامێرانەی نێوان میرەکانی بابان دانیشتوانی شاری سلێمانی و ناوچەکەی بە

جۆرێکی وا زۆر بێزار و هەراسان کردوە، کە دەسەڵاتی تورک گەیشتوتە سلێمانی دوکانـدار و پیشـەکارەکان و، هەندێ لە ئاغاکان... هاوکاریان لە گەڵ دەسەڵاتی تورک کردوە. بە تایبەتی بۆ پارێزگاری ئاسایشی شار لە دزو جەردە.

**-12-**

مژدەی گەڕنەوەی عەبدوڵا پاشا:

عەبدوڵا پاشا دوایین حاکمی بابان بو لە سلێمانی. پێش ئەوەی بە یەکجاری لێ بخرێ و دوربخرێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ، ماوەیەک لەلایەن والی بەغداوە بە "قایمقام" ی سلێمانی دانراوە. لە سەر ئەمە زۆر کەس پـلاری لە عەبدوڵا پاشا گرتوە و بە "موچە خۆری تورک" لە قەڵەمیان داوە.

دەوڵەتی عوسمانی لاواز بوبو. دەوڵـەتانی ئـەوروپی تـا ئـەهات نفوزیـان زیـادی ئـەکرد و، تـەماعیان ئەکردە کەلاکەکەی. لە شەڕەکاندا ئەدۆڕا و، ڕێککەوتنی قورس و گرانبەهایان بە سەر دا ئەسەپاند.

بابی عالی لە شەڕدا لە گەڵ دەوڵەتانی ئەوروپی، بەناوی "جیهـاد" دوە هێـزی عەشـائیری سـاز ئـەدا و، ئەیناردن بۆ بەشداری شەڕ. لەشەڕی قرم (کریمە) دا ڕوسیا بالادەس بو. تـورک بـاری گـلا بـو. بـابی عـالی ئەترسا ئێران ئەم هەلە بقۆزێتەوە بۆ پەلاماردانی تورکیا. عەبدوڵا پاشا ویسـتی کـەڵک لـەم هەلـە وەربگـرێ. بابی عالی ڕێگایان دا بگەڕێتەوە کوردستان "موجاهیدین" ی بابان کۆبکاتەوە بۆ هاوبەشی لەشەڕی ڕوسـیادا، یان وەکو هەندێ سەرچاوەی تر ئەڵێن: بۆ پاراستنی سنوری عوسمانی لە دەستدرێژی ئێران.

پێ نـەچێ عەبـدوڵا پاشـا هـەواڵی گەڕانـەوەی خـۆی گەیاندبێتـە کوردسـتان. سـالم دیـارە ئاگـاداری گەڕانەوەی بوە. ئەو شیعرەی بەم بۆنەیەوە، هۆنیوەتەوە. عەبدوڵا پاشا گەیشتە بەغداد. والـی بەغـداد، ڕەشـید پاشای گوێزلگلی (عەینەک لە چاو) ڕێگای نەدا بگەڕێتەوە کوردستان. لە بەغداد گلی دایەوە. لە مەش دا ڕەشید پاشا دو شتی کردبو بە بیانو:

یەکەمیان. گێڕانەوەی میرێکـی بابـان بـۆ ناوچەکـە وا ئەگەیـەنێ دەسـەڵاتی تـورک لـە بـەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکەدا سەرکەوتو نەبوە. بۆیە کابرای کوردیان هێناوەتەوە.

دومیان. مەترسی ئەوەی، لەو کاتە ناسکەدا کە دەوڵەتی عوسمانی توشی کێشەیەکی گەورە بوە لەوانەیە ڕێگادان بە گەڕانەوەی میرێکی کورد بۆ ناوچەکە، ببێتە هاندەری گەورەکانی کورد ئەم هەلە بە دەرفەت بزانن، لە دەوڵەت هەڵبگەڕێنەوە و شۆڕش بەرپا بکەن. (11)

والی، عەبدوڵا پاشای ڕوانەی ئەستەمبوڵ کردەوە. نەیهێشت بگەڕێتەوە سەر "موڵکی مەورروسـی بابـان" هیوا گەورەکەی سالمیش نەهاتە دی. دیارە تا ئێستا ناهـەقی دەربـارەی ئـەم پیـاوە کـراوە، پـلاری قـورس و توانجی سوکیان تێ گرتوە. ئەگینا کەسێکی کوردپـەروەری وەکـو سـالم بـەمجۆرە ستایشـی نەئـەکرد و، بـە تانوپۆی دا نەئەهات.

1 تیروەش دێمە گوزەشت و عەهدی نیسان هاتەوە
بولبولی بێدڵ لە دەوری گوڵ بە ئەفغان هاتەوە.
2 سەختگیری کرد ئەگەر سەرما وەکو ئەفراسیاب
بادی ئەورۆزی بە میسلی پوری دەستان هاتەوە
3 لە شکری گوڵ جوملە خەندان دەڵێن سەرما شکا
تا سلێمانی صەبا بۆ دێوی زستان هاتەوە
4 باخە پەژموردەی خەزان و خورەمی ئەوقاتی حوت

ماهی نەورۆزی بە عەکسی ماهی نابان هاتەوە
5 بای شەماڵ هێنایە جونبوش قامەتی سەروی سەهی
بۆ خیابانی چەمەن قومری بە ناڵان هاتەوە
6 سارە بلّبلانەی شکۆفەی شاخساری تەرفی باغ
بێخود و ڕەققاص و سەرمەست و غەزەلخوان هاتەوە
7 بۆ شکۆفەی تیفل واری یەکشەبەی شاخی درەخت
ڕەحمەتی ئیززەد لە گەڵ هەر قەترە باران هاتەوە
8 ڕوبەڕوی تیفلی نەباتاتی چەمەن موشتاق وار
دایەی ئەبری بەهاری ئەشک ڕێزان هاتەوە
9 دەنگی سەد ڕەنگی کولنگ و قاز و سۆنە و بۆرچین
سازوەش هەرسو لە گوێ سەبزە شەتاوان هاتەوە
10 سەیری گولشەن کەن لە چیهرەی گوڵ شەوی ئۆردی بەهەشت
هەر تەرەف بۆ مەجلیسی بولبول چراغان هاتەوە
11 سەبزە وەک مەخمەڵ لە هەرجا فەرشە بۆ صەنحی چەمەن
مەوسیمی عەیش و تەرەب بۆ مەی پەرستان هاتەوە
12 بۆ دەماغم عەهدی گوڵ ئەفسوردەگی سەردی نەما
تا لە گوڵشەن دا بەسەرما بۆیی ڕەیحانە هاتەوە
13 پێ ی وتم دوێ شەو لە کونجی میحنەتا وازیح سروش
وا چراغی دودمانی ئەهلی بابان هاتەوە
14 چیهرەیی مەقسەد هوەیدا بو لە هەرجا صوبح وار
موژدە ئەی یەعقوبی دڵ. یوسف بە کەنعان هاتەوە
15 ئاشکارا هەر تەرەف هوئدهود لە پەروازا دەڵێ:
ڕوبەڕوی موڵکی سەبا تەختی سولەیمان هاتەوە
16 بەرق وەش بۆ موڵکی مەوروسی لە قوستەنتینەوە
حاکمی مەنفی بە ئەمری صەدر و سوڵتان هاتەوە
17 ئاصەفی سانی مورەخخەص بو بە ئەمری پادیشا
بۆ نیزامی موڵکی بەینی ڕۆم و ئێران هاتەوە
18 من وتم: چۆن بو لە ئاغدنگز ئەجاتی؟ دڵ وتی:
شاە کەیخوسرەو بە جەیحونا بە ئێران هاتەوە
19 فیتنەخێزە ڕاهی قوستەنتین بەمیسلی هەفتخوان
ئەم بە هەر خوانێ وەکو ڕۆبین تەن ئاسان هاتەوە
20 نۆکەرانی بێ ڕەمەق کرد خیسسەتی تەبعی مونیب
بۆ تەنی موردەی خەلایق یەک بە یەک جان هاتەوە
21 شەهد و تەڵخە لوتف و قەهری بۆ قەراری نیک و بەد
شاە ئەحل ئاسا بە یادی نۆش و نێشان هاتەوە

22 خۆش نوما شمشێری ئەو بو وەک هیلالی شامی عید
ماهی ئەو دەرکەوت و عیدی روزداران هاتەوە
23 بۆ قیصاصی موستەحەق و قەبز و بەستی موددەعی
شێری مەردی گوردی پیل ئەفگەن لە مەیدان هاتەوە
24 خۆشە ئەمجا بۆ تەرەددود بازیان و شەهرەزور
عاییلی نادروەش بۆ جانی دوزدان هاتەوە
25 بێن بە هەم با دەنگی گریەی مولحید و خەندەی مورید
بۆ ئەمانی کفر و زولمەت بەدری ئیمان هاتەوە
26 شەب نشینانی خەفەت با زەرەناسا بێنە رەقص
وا لە بورجی دەولەتا خورشیدی درەخشان هاتەوە
27 چونکە دیهقان نۆکەر و، بەگ چەرچیە و، ئاغا بەقاڵ
بۆنیزامی نۆکەر و بەقاڵ و دیهقان هاتەوە
28 بچنە سەر صنعاتی ئەووەڵ کەفشدۆز و پینەچی
حاکمی مەرکەزشوناسی ئەهلی دیوان هاتەوە
29 دیم لە بابانا رەعییەت زاڵم و نۆکەر فەقیر
مونعەکیس بو قەزییە وا بابی فەقیران هاتەوە
30 شەق وەشێن ئامادەبن بۆ کاسبی شورانشین
پشتی لەشکر، صەدری مەجلیس، میری میران هاتەوە
31 گریە کا تا دەنگی دەردێ با کەریم ئاغای ئەنێ
حاکمی مەعزول کردەی ئەو بە شادان هاتەوە
32 تەپڵی بدرێنێ، عەلەم وێ کا، جەنابی کاک ئەمین
قابیلی بەیداخ و تەپڵ و لەشکر و سان هاتەوە
33 خۆی بە پەت ئەمجا بتاسێنێ مودیری پەت لە مل
صاحێبی چەتر و لیوا و تەوق و فەرمان هاتەوە
34 خرس خو کەهیای مازی بو لە دەشتی شەهرەزور
پێ ی بڵێن: خۆی راگرێ، وا شێری غەرِان هاتەوە
35 چونکە شێوەی زاغی بو سەرکاری کەهیا موددەتێ
بۆ شکاری ئەو لە سەردا بازی تەرلان هاتەوە
36 سەنگەری عەهدی عەزیز بەگ کەڵکی کەهیا ناگرێ
صاحێبی شمشێر و درع و خود و خەفتان هاتەوە
37 رەنگە ئەمجا بێتە کاران سەرحەدی موڵکی سنە
رم وەشێنی مەعرەکەی دەشتی مەریوان هاتەوە
38 کەر و فەر با کەم بکا والی بە فەوجی چێشکەرۆ
پشتبەندی لە شکری وەندات و جافان هاتەوە
39 تایری دەوڵەت بیحەمدیللا بە ئەمری شەهرەزور

موستەعید و خوڕەم و یاران و تازان هاتەوە
40 کەوتە ناو کەففی کەرەم دوبارە خەرجی شەهرەزور
تالعی دەرویش و موفلیس بو، کە قانان هاتەوە
41 من بە شک دەموت نەجاتی کەی دەبێ پاشا لە ڕۆم؟
دڵ وتی: سالم یەقینت بێ بە قورئان هاتەوە
42 ئەهلی دانش حاتەمی بەخشش بە ئەبجەد کەن حساب
با نەڵێن: کانی کەرەم کەی بو بەبابان هاتەوە؟(12)

## -13-

شیعرنامەکەی نالی و.
وەڵامنامەکەی سالم:
1 قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور!
ئەی پەیکی شارەزا بە هەمو شاری شارەزور!
2 ئەی لوتفەکەت خەفی هەواخواه و هەمدەمە!
وەی سروەکەت بەشارەتی سەرگۆشەیی حوزور!
3 ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان:
توفانی دیدە و شەرەری قەلبی وەک تەنور
4 گاهێ دەبی بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دڵ!
گاهێ دەبی بە دەم دەدەمێنی دەمی غورور
5 مەحوی قەبوڵی عاترشەمیمتە
گەردی شیمال و گێژی جەنوب و کزەی دەبور
6 سوتا ڕەواقی خانەی صەبرم، دڵ و دەرون
نەیماوە غەیری گۆشەیی زیکرێکی یا صەبور
7 هەم هەم عەنانی ئاهم و، هەم هەم ڕیکابی ئەشک
ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە، هەستە بێ قسور
8 وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کویی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی شیوەسور
9 بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کدوراتی سەرزەمین
شاد بێ بە وەصڵی یەکدی: کە تۆی تاهیر، ئەو تەهور
10 ئەمجا مەوەستە تا دەگەیە عەینی سەرچنار
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنور
11 چەشمێکە میسلی خۆر کە لە صەد جێ، بە ڕۆشنی
فەورانی، نوری صافە لە سەر بەردی وەک بلور
12 یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەک شەهابی نور

13 یا چەشمەسازی خاتری پڕ فەیزی عاریفە
یەنبوعی نورە دابڕژێنێ لە کێوی تور
14 دەم وت دوچاوی خۆمە ئەگەر بەکرەجۆیی ئەشک
نەبوایە تیژ و بێ سەمەر و گەرم و سوێر و سور
15 داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی خاک و خۆڵ
هەتا نەکەی بە خاکی سولەیمانی یا عوبور
یەعنی ریازی ڕەوزە کە تێدا بە چەن دەمی
موشکین بە کاکۆڵی غیلمان و زوڵفی حور
17 خاکی میزاجی عەنبەر و، داری ڕەواجی عود،
بەردی خەراجی گەوهەر و، جۆباری عەینی نور
18 شامی هەمو نەهار و، فوصوڵی هەمو بەهار،
تۆزی هەمو عەبیر و، بوخاری هەمو بوخور،
19شارێکە عەدل و گەرمە، لە جێگێکە خۆش و نەرم،
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزور
20 ئەهلێکی وای هەیە کە هەمو ئەهلی دانشن
هەم نازیمی عوقودن و، هەم نازیری ئومور
21 سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەڵلەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیش و خواروژور
22 داخۆ دەرونی شەق نەبوە پردی سەرشەقام؟
پیر و فوتادە تەن نەبوە داری پیرمەسور؟
23 ئێستەش بە بەرگ و بارە عەلەم دارە شێخ هەباس،
یا بێ نەواو و بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عور؟
24 ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری کانی با،
یاخو بوە بە تەفریقەیی شۆڕش و نشور؟
25 سەیوان نەزیری گونبەدی کەیوانە سەبز و صاف،
یاخو بوە بە دائیرەیی ئەنجومی قوبور؟
26 ئێستەش مەکانی ناسکەیە کانیی ناسکان،
یاخو بوە بە مەلعەبەیی گورگ و لورهلور؟
27 ئێستەش سوروشکی عیشقی هەیە شێوی ناودار،
یاخو بوە بە صوفیی وشکی لە حەق بە دور
28 داخۆ دەرونی صافە، گورەی ماوە تانجەرۆ
یاخو ئەسیری خاکە بە لێڵی دەکا عوبور؟
29 سەیرێکی خۆش لە چیمەنی خانەقا بکە
ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یا چایری ستور؟
30 سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە وەک خەتی ڕویی یار

یا پوشی وشک و زورە وەکو ریشی کاکەسور؟
31 قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنین،
یا وەک سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهور؟
32 دەس بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن،
یا حەلقەیانە صوفیی مل خوار و مەندەبور؟
33 مەیلێ بکە لە سەبزە دڕەختانی مەدرەسە:
ئەوراقیا موقەددیمەیی شینە یا نە سور؟
34 حەوزی پڕی کە نائیبی دیدەی منە لەوێ،
لێلاوی دانەهاتووە وەک سەیلی شیوەسور
35 ئێستەش کەناری حەوشەکە جێ ی باز و کەوشەکە،
یاریی تیایە، یا بووەتە مەعرەزی نوفور؟
36 چاوێ بخە لە سەبزەوو سێرابی دائیرە
جێ جیلوەگاهی چاوەکەمە تەرمە یا نە زور؟
37 تو خوا فەزایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش
مەحشەر میساڵە یا بوەتە چۆڵی سەلم و تور؟
38 واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم
چیی ماوە، چیی نەماوە، لە هەیوان وتاق و ژور؟
39 ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە، یا نە خۆ
هەر غاری یارە، یا بوەتە غاری مار و مور؟
40 زارم وەکو هیلال و، ئەحیفم وەکو خەیاڵ!
ئایا دەکەومە خەیاڵ و بە دڵنیا دەکەم خوتور؟
41 لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە،
دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبور!
42 ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە،
یا مەصڵەحەت تەوەققوفە تا یەومێ ئەفخی صور؟
43 حاڵی بکە بە خوفیە: کە ئەی یاری سەنگ دڵ
"نالی" لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دور(13)
وەلامنامەکەی سالم:
1 جانم فیدای سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر!
ئەی پەیکی موستەعید لە هەمو ڕاهی پڕ خەتەر!
2 ئەی میروەحەی جەمالی مەهاسای دولبەران!
وەی شانەزەن بە کاکۆڵی تورکانی سیم بەر!
3 جاڕوکەشی مەنازیلی جانان لە خەڵوەتا!
فەڕاشی فەرشی بەهاران لە دەشت و دەر!
4 ماڵش دەدەی بەدەم لە دەمی خوابی صوبحدەم

هەم زولفی قیرەگۆنەوو هەم چیهرەیی قەمەر
5 بارێ بە سروەکەت بە شنەی نەنگەبینی گەز
گرتویە جونبوشت بە هەم ئاغۆشی نەیشەکەر
6 وەقتی تەوافی عاریزی دولبەر شنۆیی تۆ
لە غزش دەخا بە توررە لە سەرتا بە پێ کەمەر
7 کەی دێتە خەندە خونچە، دەمی. بێ وەزیدەنت؟
گەر تۆ نەبی دەرەختی چەمەن ناگرێ سەمەر
8 ئیحیاکونی جەمیعی نەباتاتی عالەمی
ڕەعنا گوشا لە تەربییەتی قامەتت شەجەر
9 نابی حەیات و ئاشی نەفسوردەیە دەمت
تەحریکی تۆیە گڕ لە تەنورا کەدێتە دەر
10 میحنەت ئەوەندە زۆرە، دڵم هێندە تەنگ بوە،
دوری هەناسەکەی سەحەرم هەوری گرتە بەر
11 هیممەت کە چاپوکانە بە ئیجرایی مەتلەبم
12 بۆ موڵکی شامە نامەی من. سویی نالی یە
هەر حەرفێ. ئەو لە وەزعی ویلایەت دەدا خەبەر
13 پرسیویە زاهیرەن لە ڕەفیقانی یەک جیهەت
ئەحواڵی ئەهلی شەهر و ڕەفیقانی سەر بە سەر
14 لەو سایەوە کە حاکمی بابان بە دەر کران
نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر
15 تا بو بە جایی مەتلەعی خورشیدی بەختی ڕۆم
سوتا گیاە و، تەشنەوو خوشکیدە بو سەمەر
16 ناکەن هەوایی هیچ کەبابێ زەلیلی شەهر
بوریانە بەس لە ناری غەما پارەی جگەر
17 جوز گاە گاهی ئاە و ناڵە لە ئەیامی ڕۆمیان
نەمدیوە وا بیێ لە عەدالەت لەبی بەشەر
18 سەیوان پڕە لە شەخصی ستەمدیدە خواروژور
هەر قەبری پڕە غەمانە لە هەر لا دەکەم نەزەر
19 جێ ی تورکەکانی ڕۆمە دەر و ژوری خانەقا
غافڵ هەمو. لە جای موریدانی باخەبەر
20 ئەو حەوزە پڕ دەبو کە وەکو چاوەکانی تۆ
تەغییرە ناوی وەک دڵی مەردانی پڕ کەدەر
21 سوتا دڵم بەحاڵەتی جۆباری سەرچنار
لێڵاوە چەشمەساری وەکو چاوی بێ بەصەر
22 ئەو دەشتە جایی یاریی یارانی حوجرە بو

یەکسەر مەقامی ڕۆمییە هەر وەک تەهی سەقەر
23 زستانی ئەوەڵین بو درا بەرگی شێخ هەباس
ڕۆمی ئەوەندە شومە لە شەخصیش دەخەن زەرەر
24 وەک پیری ساڵخوردە، خەمە، داری پیرمەسور
مەشغوڵی لەغزشە هەمەجا، پایی تا بە سەر!
25 ئەو بەردەکانی ناوی نرا قسنی شەخسەکە
دایان بە شاخی دارەکەیا تورکی بێ هونەر
26 وەک چاوی بێ غەمانە هەمو شیوی ناودار
بەس موشکیلە لە چەشمەیی ئەو قەترە بێتە دەر
27 ئەوسا مەکانی ئاسکە بو کانی ئاسکان
ئێستە لە دەنگ و ڕەنگی ڕۆمی پڕە لە کار
28 تا دوزدی وەقتی نیمەشەبن تورکی بێ نیزام
دوزدن هەمو لە خەرمەنی مونعیم وەکو شەرەر
29 شارێکە پڕ لە زولم و، مەکانێکە پڕ لە شین،
جائێکە پڕ لە شور و، وڵاتێکە پڕ لە شەڕ
30 ئەمڕۆ فەزایی بازیگەهی جایی ڕەهزەنە
لەو دەشتە دێ لە غەیبەوە ئاوازی ئەلحەزەر
31 سەربانی پڕ لە کەژدوم و، دیواری پڕ لە مار،
کۆڵانی پڕ لە ڕەهزەن و، صەحرایی پڕ خەتەر
32 دڵ نایەڵێ بڵێم چییە سامانی حوجرەکەت
هەر تاری عەنکەبوتە حیجابی بیرون و دەر
33 نایێ صەدا لە پەنجەرەکەی جوز فوغانی جوغد
غەیرەز شەقامی مور نییە شوێنی پێ گوزەر
34 تو خودا بڵێ بە حەزرەتی نالی: دەخیلی بم
بەم ئەوعە قەت نەکا بە سولەیمانییا گوزەر
35 "سالم" صیفەت لە بێ کەسییان یا نەبێ هیلاک
من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر
36 ئەم موڵکە ئەزمی نابێ بە بێ زەبتی واریسێ
بێ ئەو بە قەصدی ئەم تەرەفە یا نەکا سەفەر (14)

## پەراوێزەکان

1. بابانی: 150 - 152.
2. بۆ ژیان و شیعرەکانی سالم و کوردی بڕوانە:
دیوانی سالم، بڵاوکردنەوەی: کوردی - مەریونی، بەغداد، 1933
دیوانی سالم: بڵاوکردنەوەی: گیوی موکریانی، هەولێر، 1972
علاء الدین سجادی: "مێژوی ئەدەبی کوردی"، بەغداد، 1952، ل 228 - 246، 296 - 308
د. مارف خەزنەدار: "لە بابەت مێژوی ئەدەبی کوردیەوە"، بەغداد، 1984، ل 201 - 320، 204 - 206، 235 - 252
دیوانی کوردی، بڵاوکردنەوەی: کوردی - مەریوانی، بەغداد، 1931
دیوانی کوردی، بڵاوکردنەوەی: گیوی موکریانی، هەولێر، 1961
3. وشە گرانەکانی شیعرەکە:
3 - 1. ئەلویداع: خواحافیز. جای جانان: جێگای گیانەکان، مەبەستی شوێنی خۆشەویستەکانە.
3 - 2. موستەعید: ئامادە. بیلادی رافیزی: وڵاتی رافیزیەکان. مەبەستی ئێرانە کە دانیشتوانی لە سەر مەزەبی شیعەن. لەو سەردەمەدا کە حکومەتەکانی ئێران و عوسمانی ناکۆکیی مـەزەبیی نێـوان شیعە و سوننەیان تیژ کردبو، بە شیعەیان وتـوە رافیـزی و، لـە ریـزی موسـڵمانان دا دایـان نەناون.
3 - 3. شاهی خوبان: شای باشەکان یا جوانەکان.
3 - 4. هیجرەت: کۆچکردن، دورکەوتنەوە. تار: تاریک، رەش. میهری رەخشان: رۆژی روناک.
3 - 5. مەشریق: رۆژهەڵات. مەبەستی وڵاتی ئێرانە کە کەوتۆتـە رۆژهـەڵاتی مـوڵکی بابانـەوە. رەی: تاران و بەشێکی ئێران پێی وتراوە رەی. نیوە بەیتی دوەم ئەگونجێ لـەباتی قیبلـەیی جـان، قیبلەیی جیهان بێ..
3 - 6. ئەشکی دیدە: فرمێسکی چاو. گوڵنار: دارێکە لە بابەتی دارهەنار، بەر ناگرێ، بـەڵام گـوڵێکی سوری گەورە و جوان ئەگرێ. ناری بوستان: هەناری باخ.
3 - 7. صیحەت: لەش ساغی. وەصل: بەیەک گەیشـتنی دو خۆشەویسـت. هیجـر: بـەجێ هێشـتن، دورکەوتنەوە. مەرەز: نەخۆشی.
3 - 8: وازیح: ئاشکرا. سونبول: گوڵێکی بۆنخۆشی جوانە.
3 - 9: زەخم: زام، برین. ئاب: ئاو. پەیکان: تیغێکی تیژە لەئاسن دروست کراوە، کردویانە بە نوکی تیر و نێزەوە. تەشنە: تینو. موژگان: برژانگ، برژۆڵ.
4. وشە گرانەکانی شیعرەکە:
4 - 1. فەرامۆش: پشت گوێ خستن، لە بیر خۆبردنەوە. میساق: پەیمان. عەهد: بەڵێن.
4 - 2. خاتر: بیر، خەیاڵ. خورەم: خۆش. حوسن: جوانیی. میسل: وەکو.
4 - 3. سەحەر: بەیانی زو. صەدا: دەنگدانەوە. رەعد: هەورەگرمە.
4 - 4. لاکـین: بـەڵام. سـەنگین: گـران، قـورس. سـەماع: بیسـتن. داد: شـکات، سـکاڵا. داددار: شکاتکەر.
4 - 5. ئیما: ئیشارەت. وێڵ: ئاوارە، سەرگەردان.

4 - 6. جەور: زوڵم. کۆتا کە: بیبڕینەرەوە. بێ خەبەر: یەکەمیان مەبەستی"بێ هۆش" و دوەمیان"بـی ئاگا"یە.

5. وشە گرانەکانی شیعرەکە:

5 - 1. کویی یاری: بەردەرگای ماڵی یار. مەشهەد: شوێنی کۆبونـەوەی خـەڵک، شـوێنی کـوژران یـا شەهید بون. مەدفەن: گۆڕ، شوێنی ناشتنی مردو.

5 - 2. تەی کردن: پێوانی ڕێگە. ئابلە: ئاوڵە. وادی فیراق: دۆڵی لە یەک جیابونەوە.

5 - 3. مەتلەب: مەبەست. نای: نەی، شمشاڵ. حاڵی: تێگەیشتن. فەحوا: ناوەڕۆک.

5 - 4. نێش: پێوەدان. گەزینی مار. حەیە: مار. گەزیدە: مارانگاز، مارپێوە داو. حەی: زیندو.

5 - 5. عەیشی وەصل: ژیانی خۆشیی بە یەک گەیشتن. ئەندوهی هیجر: خەمی دوری و لە یەک جیا بونەوە. مەوسیم: وەرز، کات. ئوردی بەهەشت: دومین مانگی سـاڵنامەی ئێرانیـە، لـە نێـوان مانگەکانی فەروەردین و خورداد دایە، خۆشترین مانگی وەرزی بەهارە. دەی: دەهەمین مانگی ساڵنامەی ئێرانیە. سەختترین مانگی وەرزی زستانە.

5 - 6. حوججەت: بەڵگە و بیانوی سەلماندن. ڕوخ: ڕو. صیدق: ڕاستگۆیی. مایل: ئارەزوکەر. سێب: سێو. بەی: بەهێ. لای شاعیرانی ئەو سەردەمە سێو نیشانەی ڕەنگسوری و. بـەهێ نیشـانەی ڕەنگزەردی بوە.

5 - 7. لەعل: بـەردێکی بەنرخـە لـە خشـڵ دا بـەکاری ئـەهێنن. دەمیـان بـۆ جـوانی و ڕەنگـی ئـاڵ شوبهاندوە بە لەعل. دەور: مەبەستی ڕیزی دانیشتنی مەیئۆشەکانە کە ساقی بـە ڕیـز جامیـان ئەداتێ. قیسمەت: بەش. جەم: جەمشید، یەکێ لـە شـاهە گـەورەکانی ئێرانـە جـامێکی هـەبوە وەکو ئاوێنە هەمو دنیا تێ دا دیوە.

6. وشە گرانەکانی شیعرەکە:

6 - 1. سینە: سنگ. سەخت: ڕەق. نەزەر: تەماشاکردن. جوز: جگە. لەختێ جگەر: پارچەی جگەر.

6 - 2. ڕوسەختی: ڕوقایمی. تاب: تاو، توانا. غەمزە: نیگاکردن. بەعـەدەزین: دوای ئەمـە. جەوشـەن: زرێ، کراسێک بوە لە زریزەی ئاسن دروستکراوە کاتی شەڕ پۆشیویانە.

6 - 3. فەرد: یەک بەیت شیعر. عار: شورەیی. ڕشتە: ملوانکـە، زنجیـرە. خـەرموهرە: مورومەکرانـە، کوژەکە کەرانە. هەم سلک: لە ڕیزی یەک دا دانان. گوهەر: گەوهەر. وڵاخی بـار هـەڵگرتن لـە بەر خۆشەویستی و بۆ ڕازاندنەوەی دەنکە موروی گەورەیان ئەکرد بە سەر کەڵلەی دا.

6 - 4. لەب: لێو. بوسە: ماچ. مایە: سەرمایە. دەمی ئـاخیر: کـاتی دواهەناسـە، سـەرەمەرگ. تەلـەف: فەوتان و. لە ناوبردن. سەودا: موعامەڵەی بازرگانی.

6 - 5. پایان: کۆتایی، تەواوبون. مەحز: لێرەدا لە باتی سەرەڕای بەکاری هێناوە. حاجیب: پـەردەدار، دەرگاوان. وەجەب: بست.

6 - 6. ڕەشک: حەسودی. نوتق: قسەکردن. هەجو: پێچەوانەی مەدح.

6 - 7. گوزەر: تێپەڕین.

7. شیعرەکانی حاجی لە چاپی هەولێری دیوانەکەی حاجی قادری کۆیی وەرگیراوە و، شیعرەکانی سالم لـە بەر دەستنوسێکی مامۆستا نەجمەدین مەلا نوسراوەتەوەو، شیعرەکانی م. خالیدیش لە بەر چاپی تارانی دیوانەکەی م. خالید ڕاست کراوەتەوە.

وشە گرانەکانی شیعرەکە.

7 - 1. کەیل: پڕ. جەمعی مەردومان: کۆمەڵانی خەڵک. کەنارگرتن: گۆشەگیری. پیرەمێرد لە سەر هەمان کێش و قافیە شیعرەکەی م. خالیدی کردوە بە کوردی. ئەم بەیتەی وەها وەرگێڕاوە:
ڕۆژی جەژنە من تەریک و بێ بەشی دیداری یار
خەڵکی خورڕەم، من بە خوڕڕەم ئاو لە چاوم دێتە خوار
7 - 2. خولد: بەهەشت. مەردوم: خەڵک. سەقەر: دۆزەخ. تولی سەفەر: درێژەکێشانی سەفەر. حەزەر: ئاوەدانی. پیرەمێرد ئەم بەیتەی وەها وەرگێڕاوە:
دڵ سوتاو و جەرگبڕاو، کۆڵان بە کۆڵان دەربەدەر
کەس بە دەردی من نەچێ دورکەوتەیی یار و دیار
7 - 3. بێ قەرار: ئائارام. ئیزتیراب: شڵەژان، پەشۆکان. ئەستون: کۆڵەکەی ڕاگرتنی رەشماڵ. بەکرەجۆ: گوند و چەمێکی نزیک سلێمانیە. سەرچنار: سەرچاوەی ئاو و سەیرانگایەکی نزیک سلێمانیە.
7 - 4. بێ نەوا: داماو. غوربەت: ئاوارەیی و دەربەدەری. ناتەوان: بێ توانا. کابول و غەزنەین و قەندەهار: ناوی شوێن و جێگان لە ئەفغانستان. پیرەمێرد ئەم بەیتەی وەها وەرگێڕاوە:
پێم بڵێ خالید ئەگەر تۆ شێت نەبی و، سەحرانەوەرد
تۆ لە کوێ و، غەزنەین و کابول، خاکی هیند و قەندەهار

8. بۆ یەکەمین جار د. کەمال فواد، ئەم قەصیدەیەی لە ژمارە (35) ی 12 ی ئاغستۆسی 1971 ی ڕۆژنامەی "ژین" ی سلێمانی دا بڵاوکردۆتەوە. سەرناوی شیعرەکە بە فارسی بەمجۆرەیە "در وصف پریشانی نوکران بابان بعد از رفتن عبداللە پاشا بقسطنطین". گیوی موکریانی لە چاپی دوەمی "دیوانی سالم" دا جارێکی تر بڵاوی کردۆتەوە.
وشە گرانەکانی شیعرەکە:
8 - 1. بەد: خراپ. خاص: هەڵبژاردە. بێدادی: زوڵم و بێ عەدالەتی. سەراسیمە: سەرلێشێواو. هەراسان: بێزار و وەڕس.
8 - 2. جەوان: لاو. سەهی قەد: بەژن و باڵا ڕێک و ڕەوان. بەسکە: ئەوەندە. چیز: شت. بێچیزی: نەبونی، بێ شتی. خەم: چەماوە، کۆماوە. چەوگان: گۆچان.
8 - 3. پەرێشان خاتر: پەشێواو بیر. جەمعییەت: کۆمەڵ. سیەهبەخت: بەختڕەش. گێسوی خوبان: ئەگریجەی ئافرەتانی جوان، مەبەستی ڕەشییە، یان ئاڵۆسکانە بە هۆی باوە.
8 - 4. گەدا: سواڵکەر. دەرگانە واناکەن: دەرگا ناکەنەوە. نەرراد: تاوڵەچی، لە یاری (نەرد: تاوڵە)ەوە وەرگیراوە. خانەبەندان: خانە گرتن وەکو لە تاوڵەدا هەر یاریکەرێک هەڵئەدا خانە لەوی تر بگرێ. مەبەستی داخستنی دەرگای ماڵە لە دەرۆزەکەر بە هۆی نەبونیەوە.
8 - 5. سەخی تەبع: ئەوانەی تەبیعەتیان بەخشندە و دەسبڵاون. حاتەم: حاتەمی تەی یەکێکە لە بەخشندە بە ناوبانگەکانی عەرەب. راهـ: ڕێگە. کۆی دونان: بەر دەرگای ماڵی کەسانی نزم و سوک. هەرسو: هەرلا. کاسەگەردان: کاسە گێران، هەژارەکان ئێواران کاسەیان گرتوە بە دەستەوە لە دەرگای ماڵانیان داوە خواردنیان بۆ تێ بکەن.
8 - 6. کەشمەکەش: کەشمەکێش، بگرەوبەردە. خوددارائی: خۆڕازاندنەوە. قەبا: کەوا. چاک: ئێخە دامان: داوێن.
8 - 7. ئەمێستە: ئێستا. دوغ: دۆ. کەموڵە: کاسەیەکە لە دار تاشراوە تایبەتە بۆ تێکردنی دۆ. کەموڵە دۆ و، فنجان قاوەی تێ کراوە.

8 - 8. تورمە: جۆرێک بوە لە قوماشی بەنرخ. شەهد: شیرینی، هەنگوین. خانەبەردۆش: خانوەکەی بە کۆڵی خۆیەوەتی. عوریان: ڕوت.

8 - 9. جێ نشیمەن: شوێنی دانیشتن. جوملە: هەمو. غول: شتێکی ئەفسانەییە، وەکو دێـو و درنـج، لاشەیەکی گەورە و ترسناکی هەیە، لە چۆڵ و بیاباندا ئەژی.

8 - 10. خەز: ئاوریشم. فیکر: بیر.

8 - 11. کۆستە و دەباشان: دو گوندی بچـوک بـون لەسـەروی سـلێمانی. گەلـە: ڕانەمـەڕ. چۆمـاق دەرکەفـ: کوتەک بە دەستەوە. چۆپان: شوان.

8 - 12. مورید: لایەنگری دڵسۆز، بە تایبەتی هی شێخی تەریقـەت. عەهـد: سـەردەم. عـەتلی ڕۆمـی: دانپەروەری تورکی عوسمانی. حوجرەها: ژورەکان. تۆبەکار: ئەوەی تۆبەی کردوە.

8 - 13. تاعەت: گوێڕایەڵی و سەر بۆ دانەواندن. جەبر: مەبەستی ئەرکی دینییە. عیللەت بە بێکـاری: بە هۆی بێکارییەوە. قاری: ئەوەی قورئان ئەخوێنێ. حافز: ئەوەی قورئانی لەبەر کردوە.

8 - 14. تولی ڕۆژگاران: بە درێژایی ڕۆژگار. خادیم و مەخـدوم: خزمـەتکار و ئاغـا. عوموەـن: بـە گشتی. ڕوزەدار: بە ڕۆژ. ڕۆژوەوان.

8 - 15. بێ دەوڵەت: هەژار، بێ سامان. ماڵ: دارایی. عوسرەت: دەستەنگی. گـەە: دەمێـک. حـەماڵ: کۆڵهەڵگر. عەلافـ: ئەوی دانەوێڵە ئەکڕێ و ئەفرۆشێ.

8 - 16. ئیلتیزام: جۆرێک بوە لە بە کرێگرتنی زەویوزار لـە حکومـەت. شـورا: کۆبونـەوە و پـرس کردن بە یەکتری. سەحەر: بەیانی زو. قوت: خواردن.

8 - 17. ئیجارە: بەکرێگرتن. هەوشار: ناوچەیەکە لە سەقز.

8 - 18. کەوباز: جۆرێکە لە سەرگەرمی کەو ڕاگرتن و شەڕە کەوی پـێ ئەکـەن. مـەعزول: لێخـراو. قارەمان، مینوڵی، تیمار، باخان: چوار گوندن لە قەرەداغ.

8 - 19. بیم: ترس. تازیانە: قامچی. مەرد: پیاو.

8 - 20. شێراوژەن: شێرشکێن، ئەوەی شێر لە ئەرز ئەدا، ئازا. قەوی: بەهێز. پیـل ئەفکـەن: ئـەوەی فیل لە ئەرز ئەدا. غەوواص: ئەو مەلەوانەی ئەچێتە ژێر دەریاوە بۆ دەرهێنانی مرواری. ئەبێ لەگەڵ وشەی"قەوواس: کەواندار" لێ ی تێکەڵاو بوبێ. روبە: ڕێـوی. گـورێزان: لـە ڕاکـردن دان.

8 - 21. قاصید: نێردراو، ئەوەی نامە یا پەیام لـە یەکێکـەوە ئـەبا بـۆ یـەکێکی تـر. تـەکلیفـ: داوا. ڕەهزەن: ڕێگر، جەردەی ڕێگەوبان. خودبە خود: خۆ بە خۆ.

8 - 22. دود: دوکەڵ. مەتبەخها: چێشـتخانەکان. شـام: شـێو، نـانی ئێـوارە. جگـەرها: جەرگـەکان. بوریان: برژاو.

8 - 23. سو: لا. هەرجا: هەرجێ. میهمان: میوان.

8 - 24. ملوکان: لە (ملوک) شاهەکان.

8 - 25. لەب: لێو. خەندان: دەم بە پێکەنین. شادان: خۆشحاڵ.

8 - 26. گورگین، ڕوبینتەن، سامی نەریمان: پاڵەوانی ئەفسانەکانی ئێرانن.

8 - 27. مەلەخ: کوللە. مەلەخ تەبع: تەبیعەتی وەکو کوللە وایە. دەغڵ: پەڵەی گەنم و جۆ. جاڕی گـەنم: ئەو پارچە زەوییەی گەنمی تێدا چێنراوە. داهۆڵ: شتێکە بە پەڕۆ لە شێوەی مرۆڤدا دروسـت ئەکرێ بۆ ئەوەی مەل لێ ی بترسێ و لێ ی بڕەوێتەوە.

8 - 28. قرگە، قزلەر، قۆرخ: گوندن لە نزیک سلێمانی.
8 - 29. سوبوک عەقڵ: عەقڵ سوک، گەوج.
8 - 30. نوتفە: تۆوی مرۆڤ. حەیز (بە هەڵە "حیظ" نوسرابو): دەورەی خوێنی ئافرەت. ئەمە جنێوێکی زۆر قورسە، سالم بەوانەی داوە کە بە داگیرکردنی ئەو کاتەی سلێمانی لە لایەن تورکەوە" شاد و ناسودە" بون.
8 - 31. بانی: دامەزرێنەر. کاسبهای شەهری: کاسبەکانی شار. ئەمر: کاروبار. فیتنە ئەنگێز: هەڵگیرسێنەری فیتنە.
8 - 32. هەم دەرد: هاودەرد. هەم عەیش: هاوژیان. مادەری بەرە: دایکی بەرخ. یاری گورگ: دۆستی گورگ.

9. بابانی: 169 - 171؛ أمین زکی. "تاریخ السلمانیە": 74 - 275؛ العزاوی: 91/7 - 92؛ نوار. "تاریخ العراق": 120؛ حەفتەنامەی "ژین" ژ 877 و 894.

ئەمین زەکی لە "تاریخی سلێمانی" دا لە باسی عەزیز بەگ دا ئەڵێ: لە شەڕێکدا لەگەڵ ئۆردوی تورک لە بانی مقان کوژراوە. بەڵام بەڵگە زۆرە کە ئەم هەواڵە ڕاست نیە.

ئەم بەڵگەنامەیە لە ئارشیفی کاک عەبدالرەقیب یوسف وەرگیراوە. مامۆستا ئەحمەد خواجە مەتنە تورکیەکەی نوسیوەتەوە و کردویەتی بە کوردی. کاک کەمال ڕەئوف محەمەد دای ڕشتۆتەوە.

10. ئەم شیعرە لە چاپی یەکەمی "دیوانی سالم" دا بڵاونەکراوەتەوە. ڕەنگە ئەوسا لە بەر هۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی فەرامۆشیان کرد بێ. بەڵام لە بەر گرنگیی ناوەرۆکی سیاسیی ئەم شیعرە چەند جارێ بەشی زۆری یا هەندێکی لێ بڵاوکراوەتەوە:

یەکەم جار گۆڤاری "گەلاوێژ" وەکو دیارییەک بۆ خوێنەوارەکانی لە دامیلکەیەکی جیاوازا بە بۆنەی تێپەڕینی ساڵی یەکەمی دەرچونیەوە بڵاوی کردۆتەوە.

- علاء الدین سجادی لە مێژوی ئەدەبی کوردی دا لە باسی سالم دا چەند بەیتێکی بە لێدوانەوە لێ هەڵبژاردوە.
- ڕەفیق حلمی لە بەرگی دوەمی "شیعرو ئەدەبیاتی کوردی" دا لە باسی سالم دا ئەویش چەند بەیتێکی بە لێدوانەوە لێ هەڵبژاردوە.
- کۆتایی شەستەکان کە دەستمان کرد بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری "ڕزگاری" تکامان لە محەمەد مستەفا کوردی کرد شیعرەکەمان بۆ ساغ بکاتەوە و مەعنای وشە قورسەکان و بەیتەکانمان بۆ لێک بداتەوە. مامۆستا کوردی، کوردینوسێکی کەم وێنە و شارەزاییەکی زۆری لە ئەدەبیی کلاسیکدا هەبو. چەندی تەقەللامان دا تەواوی شیعرەکەمان دەس نەکەوت. ئەوەندی پەیدا کرا مامۆستا کوردی ساغی کردەوە بە زنجیرە بڵاوکرایەوە.
- گیوی موکریانی لە چاپی دوەمی دیوانی سالم دا ئەم چەند بەیتەی لە "ڕزگاری" دا بڵاوکرابوە، خستۆتە دیوانەکەوە.
- بەشێکی زۆری ئەم شیعرە، بە بۆنەی تێپەڕینی 200 ساڵەوە بە سەر دامەزرانـدنی سلێمانی دا، لە لایەن دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانەوە بڵاوکراوەتەوە.
- کاکەی فەلاح ڕەنجێکی زۆری داوە بۆ ساخکردنەوەی ئەم شیعرە و لە گۆڤاری "کاروان" دا بە لێدوان و لێکدانەوەی وشە گرانەکانیەوە، بڵاوی کردۆتەوە. لە ناو تێکستە بڵاوکراوەکانی ئەم شیعرەدا ئەوەی ئەم لە هەمویان درێژترە، بەڵام کارەکەی چەند ناتەواوییەکی تێ دایە:

1. هەموو قەصیدەکەی دەس نەکەوتوە.
2. هەندێ لە وشەکانی بۆ ساغ نەکراوەتەوە. یان لەو کەشکۆڵەدا کە ئەم لێی وەرگرتوە، بە هەڵە نوسراوەتەوە و ئەمیش بە هەڵە گواستویەتییەوە. یان بە دروستی بۆی نەخوێنراوەتەوە.

جەمال بابان لە کتێبەکەی دا لە سەر سلێمانی بەشێکی ئەم شیعرەی بڵاوکردۆتەوە..
من دیارییەکەی گەلاوێژم نەدیوە. لێرەدا تێکرای شیعرەکەم جارێکی تر نوسیوەتەوە پشت ئەستور بە دو دەسنوسی کۆن:
یەکەمیان، فۆتۆکۆپی ئەم قەصیدەیە کە لە دیوانێکی دەسنوس وەرگیراوە. د. کەمال فوئاد لە نامەخانەی پروسیادا دۆزیویتیەوە. دیوانەکە ساڵی 1278 / 1861 لەسەر داوای سالم بە خەتێکی خۆش نوسراوەتەوە. کۆتایی دیوانەکە بەمجۆرە هاتوە:
"بدرجه اتمان رسید شب یک شنبه بیست و دوم شهر شعبان المعظم 1278 حسب الخواهش مخدوم مکرم عبدالرحمن بیگ الکردی که الحق در فن شعرسازی سحربازی مینماید اللهم اغفر له ولکاتبه ولسائر جمیع المسلمین بحرمه محمد خاتم النبیین امین امین امین"
دوەمیان، فۆتۆکۆپی کەشکۆڵێکی دەسخەت کە ساڵی 1387 / 1870 لە "مەنزڵی تۆراخ تەپە" نوسراوەتەوە. ئەم کەشکۆڵە هی مەحمودی یارەویس بوە. مەحمودی یارەویس ئەدیب و شاعیر و دۆستێکی نزیک و خۆشەویستی مەولەوی بوە. کۆپیەکانی ئەم کەشکۆڵە بە باشی نەخوێنرایەوە.
سەرناوی قەصیدەکە لە دەسنوسی یەکەم دا بەمجۆرەیە:
"رزم عزیزبیگ بابان با اسماعیل پاشای رومی"
لە هی دوەهەم دا بەمجۆرە نوسراوە:
"ذکر محاربه میرجلیل الشأن عزیزبیگ بابان با طائفه رومی سنه 1266 (1849) و تسخیر ولایت بابان بدست رومی و اسمعیل پاشا".
پێ ئەچێ ئەم شیعرە چەند جارێ دەسکاری کرابێ و ئاڵوگۆڕ لە هەندێ وشەو بەیتی دا کرابێ. "تسلسل" لە بابەتەکانی دا نەماوە. ڕەنگە سالم لە بەر هۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی ئاڵوگۆڕی تێدا کردبێ. چونکە لەم دیوانەش دا ئاڵوزان بە شیعرەکەوە دیارە. هەندێ لەو بەیتانەی کاکەی فەلاح بڵاوی کردۆتەوە و پێش ئەویش عەلائەدین سەجادی و ڕەفیق حیلمی لە سەریان نوسیوە لەم مەتنەدا نیە. جا یان سالم خۆی وازی لێ هێناون. بۆیە لەم دو دەسنوسە کۆنەدا نین. یا دوایی یەکێکی تر بۆی زیاد کردوە.
وشە گرانەکانی قەصیدەکە:

10 - 1. کەف زەمان: لە پێ دەست بە یەکدا دان لە داخ و خەفەت دا. نەدامەت (ندامە): پەشیمانی. لە فارسی دا نەگبەتی و مەینەتی. تار: تاریک. صەفحەی جیهان: ڕوی دنیا.

10 - 2. شارەزور، یا شەهرەزور: لە سەردەمی عوسمانی دا "ولایەتێک" بوە هەمو ناوچەکانی کەرکوک و سلێمانی و هەولێری گرتۆتەوە. ناوەندەکەی شاری کەرکوک بوە. ئێستا بەو دەشتە بە پیتە ئەڵێن کە لە عەربەتەوە دەس پێ ئەکا تا بناری کێوەکانی هەورامان ناوەندی بەڕێوەبردنی ئێستای سەید صادقە. گەمیە ڕەنگ: وەکو کەشتی. شکست: شکان. نەهەنگ: حوت. ئەو ماسیە گەورانەی لە دەریا زلەکان دا ئەژین و توانای وەرگەڕاندنی کەشتیان هەیە. کورد کە لە خوا ئەپاڕێتەوە داوای لێ ئەکا: "لە شەڕی شەیتان و، بەڵای ناگەهان و، فیتنەی ئاخر زەمان" بیپارێزی.

10 - 3. کشت: کشتوکاڵ. تەنخوا: لەباتی. تەرزە کە بە سەر شینایی دا بباریێ، نیشانەی نەهاتە، چونکە گەڵا و گوڵ و بەری بە جۆرێ تەکوتێ ئەو ساڵە ئیتر یا بەروبومی نابێ، یا زۆر کەم ئەبێ.

10 - 4. چاپوک: گورجوگۆڵ. ڕەنگی بەد ڕیتن: ڕەنگی خراپ ڕشتن. بە زمانی ئەمڕۆ: "نانانی پلان بۆ خراپە". وەلێ: بەڵام. قیران (من قرن یقرن): نزیک کەوتنەوە لە یەکتری. بە پێی3ی تێگەیشتنی ئەستێرەواەکانی کۆن، ئەستێرە گەڕۆکەکانی ناو بۆشایی ئاسمان جاروبار دوانیان یا زیاتر لە یەک نزیک ئەبنەوە، یا لە یەک ئەدەن. پێی ئەڵێن: "قران کواکب". ئەم لێکدانە هەندێ جار ئەبێتە هۆی کارەسات و نەگبەت "نحس". تێپەڕینی قیران: بەسەرچونی دەورانی نەگبەتیی و ناخۆشیی.

10 - 5. صەید: ڕاو، نێچیر. صەییاد: ڕاوکەر. تیرقەد: بەژن و باڵای ڕێک هەڵچو وەکو تیر. تەرکیبی کەمان: چەماوە وەکو شێوەی کەوان.

10 - 6. زیعف: لاوازی. تالیع: بەخت. جازیب (بەهەڵە "جازب" نوسرابو): ڕاکێشەر. دەم: خوێن، یاخود زار. چیهرە: چارە، ڕوخسار. زەعفەران: گیایەکە بنجەکەی پیازە، لاسکەکەی پاش وشککردنەوە لە ئاوی گەرم دا ئەتوێنرێتەوە ڕەنگێکی زەردی لێ پەیدا ئەبێ ئەکرێتە خواردنەوە، بە تایبەتی سەر برنج، بۆ زەردکردنی ڕەنگەکەی.

10 - 7. نەوبەهار: کاتی گوڵکردنی داروبرەخت. خەزان: کاتی وەرینی گەڵای دار، گەڵاڕێزان. صوبح: بەیانی. تەمموز: مانگی حەوتەمی ساڵی زاینییە و، زۆر گەرمە. پرتەوی ماە: پرشنگی مانگ. چاک: لەتوپەت، یاخود باش. کەتان: گیایەکە لە لاسکەکەی قوماش و کاغەز و، لە تۆوەکەی ڕۆن و ڕەنگ دروست ئەکرێ. قوماشی لە کەتان دروستکراو زۆر بەرگە ناگرێ، زو ئەڕزێ و پارچە پارچە ئەبێ.

10 - 8. خەرمەنها: خەرمانەکان. خەرمانی دانەوێڵە بەرهەمی ڕەنجی ساڵێکی جوتیار وخێزانەکەیەتی، کە ئاگری تێ کەوت، بە ماڵوێرانیەکی گەورە دائەنرێ. شەمعی دەوڵەت: مۆمی بەخت و خۆشی و دەسەڵات. هەر تەرەف: لە هەمو لایەکەوە. خامۆش کران: کوژێنرانەوە.

10 - 9. حەلقە دەین: لە دەوری یەک کۆبینەوە. بلا: با. ئاشوفتە بەخت: بەخت شێواو. تیرەڕۆژ: ڕۆژ ڕەش. گێسوی دولبەران: ئەگریجەی نافرەتانی دڵڕفێن. نیشانەیەکە بۆ ڕەشیی، یان ئاڵۆزان و پەشێوانی قژی ئافرەت بە تایبەتی کە با لی ی ئەدا.

10 - 10. کەوکەبە: ئەستێرەی گەورە. نیهان: ئاوا بون. شاردرانەوە.

10 - 11. صاعیقە: هەورەتریشقە. بەرق: بروسکە. زوڵمەت: تاریکایی. شەرق و غەرب: خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

10 - 12. عیبرەت: پەند. وەزع: باروەزخ. هەلومەرج. دەهر: زەمانە. زومرە: تاقم.

10 - 13. مونعیم: نانبدە. لولە بو: پێچرایەوە. نوالە: خۆراک، تێشو. زەرف (بەهەڵە "ضرف" نوسرابو): قاپ و قاچاغی نان خواردن. خوان: سفرەی نان خواردن.

10 - 14. ئەهلی وەزایف (بەهەڵە "وضایف" نوسرابو): موچەخۆرانی داوودەزگا حکومەتیەکان. عوموەن: بە گشتی. حەک: کوژانەوە.

10 - 15. عەرصە: مەیدان، چەرخەو. باڵەبان: دو مەلی ڕاوکەرن لە تیرەی هەڵۆ. جەولانگاە: فڕینگا. بوم: کوندە پەپو. بەپێی تێگەیشتنی کۆن کوندەپەپو بە مەلێکی شوم دائەنرێ چونکە حەزی لە چۆڵەوانیە و هێلانە لە کەلاوەدا ئەکاو لە سەر هەر ماڵ و ئاواییەک

بخوێنی وێران ئەبێ. زاغ: قەلە ڕەش. بە مەلێکی سوک و گەندەخۆر دا ئەدرێ.
ئاشیانە: هێلانە.
سالم لێرەدا لە باتی "هێلانە" وشەی "لانە" ی بەکارهێناوە. لە زمانی فارسی دا ئەگونجێ "لانە" بۆ هێلانەی باڵداریش بەکار بهێنرێ. بەڵام لە کوردی دا ، لانە: بۆ شوێنی ئارامگرتنی درندەی کێوی وەکو شێر و پڵنگ... و هێلانە: بۆ شوێنی ئارامگرتنی مەلی کێویی وەکو هەڵۆ، کۆتر، چۆلەکە... و، کولانە: بۆ مەلی ماڵیی وەکو مریشک... بەکارئەهێنرێ.

10 - 16: میحنەت: مەینەت، ناخۆشیی. تاب: تاو، توانا. عەین: چاو، یاخود کانیی. مەردومان: خەڵک.

10 - 17. زەبان: زمان. کوکو: مەلێکی پچوکە بە ناوی دەنگەکەیەوە کە ئەڵێ کوکو ناونراوە، تاقتاقکەرە. خانەدان: خێزان، بنەماڵە. عەنکەبوت: جاڵجاڵۆکە. خواجانشین: دو سەکۆی پچوکە لای ڕاست و چەپی دەرگای حەوش لە دیوی دەرەوە لە دیوار ئەهێڵرێتەوە بۆ دانیشتن. جوفتە جوغد: جوتە کوندەپەپو. دیدەبان: ئەو کەسەی لە جێگایەکی بەرزەوە چاودێری دەوروپشتی شوێنەکە ئەکا، دیدەوان. خانوی جاران لە سەربانەکەی دا "هەورەبان" ی هەبوە بە پلیکانە بۆی سەرکەوتون لەوێوە سەیری دەوروبەریان کردوە.

10 - 18. موهر: مۆر. وا باوە کە سولەیمان پێغەمبەر مۆرێکی هەبوە هەر شتێکی داوا لێ کردوە بۆی جێ بەجێ کردوە، بەڵام دێوەکانی لێیان دزیوە. دون: نزم، سوک.

10 - 19. موشەخخەص: لێرەدا بە مەعنای بێگومان. دود: دوکەڵ. دوکەڵی گۆگرد زۆر بۆگەنە. عود: دارێکی باریکی بۆنخۆشە، بۆ خۆشکردنی بۆنی مەجلیس و ماڵ ئەسوتێنرێ. بۆ: بۆن، یاخود بۆ ئەو. نەغمەخوان: گۆرانیبێژ. مستۆ: کورتکراوەی مستەفایە. گۆرانیبێژێکی ناوداری ئەو سەردەمە بوە. مستەفا بەگی کوردی لە باسی گۆرانیبێژەکانی سلێمانی و مەقامەکانی گۆرانی دا ئەڵێ:

مستۆ ئیبراهیمی و، ئەورەحمان ئەوا و، فەتحی حەزین
مستەفا داریی و سێگا، یونس بڵێ: دەشتی و حیجاز

10 - 20. عەزل و نەصب: لابردن و دانان لەسەر کار. کەهیا: بە کوێخاکانی والیی بەغداد وتراوە. مەنصوب: دانراو. "ئەولا" بە"اوضا" نوسراوە. کاتێ خۆی مەلا و خوێندەوارەکانی کورد پیتی"ضاد" یان بەلامی قەڵەو خوێندۆتەوە. بۆ نمونە وەکو لە سورەتی فاتیحەدا"ولا الضالین.. ". ئەولا کوتکراوەی عەبدولایە.

10 - 21. تەقسیمی مەنصەب: دابەشکردنی پلەو پایە. موقابیل شەئنی شەخص: شایستە بەو کەسە. سەراوزی کەوم: سەرپەرشتی داهاتی خوێڵێن و مەملەحە.

10 - 22. عالیجاه: پایەبەرز. حەکیم باشی: سەرۆکی پزیشکەکان. لە باتی "زل" نوسراوە"ذل" دور نیە ئەمە نیشانە بێ بۆ ئەوەی کە زمانی محمود ئاغای حەمامچی "پسک" بوبێ. یاخود مەبەستی"زەلالەت" بێ. بابەجان: سەرۆکی حەکیمەکانی سلێمانی بوە لە سەردەمەکانی سلێمان پاشاو ئەحمەد پاشای بابان دا . سلێمان پاشا بەگوێرەی "حوکم" ێک کە لە 29 ی موحەڕەمی 1284 (1832) دا دەری کردوە، گوندی"هۆمەرە کوێر" ی لە نزیک سلێمانی بەخشیوە بە باباجان بۆ دابینکردنی گوزەران و پێویستیەکانی ژیانی.

10 - 23. کۆڵ: بار. دۆش: شان. خەرقە: پاڵتۆیەکی زبرو پینە کراو بوە دەروێشە هەژارەکان لە

بەریانکردوە. تاج: جۆرە کڵاوێک بوە دەروێشەکان وەکو نیشانەی دەسهەڵگرتن لە دنیا لە سەریان کردوە. کەشکۆڵ: دەفرێک بوە دەروێشەکان بە زریزە بە ملیان دا هەڵیانواسیوە سواڵیان تێ دا کۆکردۆتەوە. شاری خامۆشان: شاری بێدەنگەکان، مەبەست گۆڕستانی مردوەکانە. لەم بەیتەدا وشەی ناو کەوانەکە ساخ نەکرایەوە.

10 - 24. ئەسکەمل: کورسی. مەحوی دەڵێ:

فەلەک هەرگا کەسێکی هەڵبری وەعدەی هیلاکەتیە

کە مل بۆ گەینە پەت بێ، پێ لە کورسی و ئاسکەمل چی بکا؟

ئاغالەر: ئاغاکان. مەجلیسی شورا: ئەنجومەنی راوێژ و پرس. ئەمیستە: ئێستا. خاص: تایبەتی. ئەصناف (صنف): خاوەن پیشە و دوکاندارەکانی ناو بازاڕ.

10 - 25. تەدبیر: تەگبیر، دانانی ڕێوشوێن. هەستە: باج و سەرانە. دارۆغە: بەرپرسی پارێزگاری ئاسایش. حاجی ئەحان یا حاجی حان: گەڕەکێکی سلێمانی بوە.

10 - 26. مەئموری سەبتی نفوس: کار بەدەستی سەرژمێریی. شاغیلی باجی دوکان: کاربەدەستی کۆکردنەوەی باجی دوکانەکانی ناو شار.

10 - 27. مەصرەف: ناوی ئەو بنەماڵەیە بوە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی بابان دا کاربەدەستی کاروباری دارایی بوە. حاسیب: موحاسیب، ژمێریار. خاصەجات: موڵک و زەویوزار. مالوان: گوندە، هەروەها جۆگەیەکە لە شارەزور ئەڕژێتە چەمی تانجەرۆ.

10 - 28. خولمار: خورماڵ، ئێستا ناحیەیەکی قەزای هەڵەبجەیە. دەڵێن: جۆگەیەکە لە شارەزور لە چەمی زەڵم هەڵئەگیرێ. دومور: کاروبار. دۆم: هۆزێکی پیشەکار و دەسڕەنگین بون، بێژنگ و کەو و کڵاشیان دروست کردوە. پەندێکی باوی کوردی ئەڵێ: "دۆم بێ و کڵاش بۆ خۆی بکا". لەو سەردەمەدا پیشەکاری بە چاوی سوک سەیری کراوە.

10 - 29. مەشوەرتچو: خەریکی پرس و راوێژە. سەرکاتیب: سەرۆکی نوسەرەکانی، یان سرکاتب: نوسەری کاروباری نهێنی. چیا سەوز: گوندێکە لە ناوچەی ئاغجەلەر. شوان: ناوی عەشیرەت و ناوچەیەکە لە نزیک کەرکوک.

10 - 30. مشتە: پارچە ئاسنێکە سەری پان و دەسکەکەی پڕ بە دەستە تەختەی پەڕۆ و چەرمی بنی کڵاشی پێ ئەکوتنەوە. "مشتەی ناو هەمانەکە" پەندێکی باوی کوردیە. کشتەک: دەزویەکە بنی کڵاشی پێ قایم ئەکرێ. هەروەها تەزبیح و ملوانکەی پێ ئەهۆنرێتەوە. دەرزی: ئامرازی درونە. گورز: گوریسێکی ئەستورە سەرێکی بە خڕی گرێ دراوە. کەمەند: گوریسێکی قایمە لە شەڕدا بۆ گرتنی دوژمن گرتویانەتە مل و کەمەری. بۆ گرتنی وڵاخیش بە کارهێنراوە. سینان: رم.

مشتە، کشتەک، دەرزی: کەرەستەی دروستکردنی کڵاش بون.

گورز، کەمەند، سینان: کەرەستەی شەڕ بون.

10 - 31. گەزمەچی: حەسحەس، پاسەوانی شەو. کوبەکو: گەڕەک بە گەڕەک. تەشنە: تینو. جان: گیان. حسێنی کۆڵ: کۆڵ، ئەگونجێ مەبەستی ئەوەبێ دەستێکی سەقەت بوە، یان حسەینی کۆڵ: حسەین کە کوتاڵی بە کۆڵ گێڕاوە بۆ فرۆشتن. جاران ئەم پیشەیە هەبوە.

10 - 32. قەیچی: مقەست. زەرگ: شیشێکی ئاسنینی دوکتێژە. نیوگەز و زەرع: دو ئامرازی پێوانە

بون لە باتی مەتر و یاردە. زەرغ: بە ئەندازەی درێژیی باڵی زەلام بوە. پەندێکی باوی کوردی ئەڵێ: "گەزی چی و جاوی چی؟". ئەخ: دەزو. ئەسپەر: سوپەر. قەڵغان. جەوشەن: زرێ. سەربەرگێک بوە لە زریزەی ئاسن دروست کراوە کاتی شەڕ بۆ پاراستنی لەش لە تیر و شیری دوژمن لە بەرکراوە. بەن: ئەو داوەی لە خوری نەرم دروست ئەکرێ لە دەزو ئەستورترە. ئەردەوان: پەیژە.

قەیچی، دەرزی، نیوگەز، زەرغ، ئەخ، وتو، پەت و بەن: ئەمانە کەرەستەی کوتاڵ فرۆشتن و بەرگدرون بون.

شیر، تیر، زەرگ، ڕم، کەمەند، جەوشەن و ئەردەوان: ئەمانەی کەرەستەی شەڕ بون.

10 - 33. غەڵبە غەڵب: هەراوهوریای قەرەباڵخی. چوارباخ: گەڕەکێکی سلێمانیە. دەلاک: ئەوانەی لە حەمام دا زەلامیان شێلاوە. سەحەرگە: پێش بەیانی. سپیدەدەم.

10 - 34. سەتڵ: دەفرێکی قووڵە ئاوی تێ ئەکرێ. سەرج: زین. سینی: دەفرێکی پەلە شتی لە سەر دائەنرێ. تەپڵ: جۆرە تەپڵێکی پچوک بوە کراوە بە قەڵپوزی زینی ئەسپ دا لە کاتی شەڕدا بۆ هاندانی شەڕکەرەکان لێ دراوە. قاپقاپ: پێڵاوێکە ژێرەکەی تەختەیە لە گەرماو لە پێ کراوە. لۆنگ: پەشتەماڵ. گزلک: چەقۆی پچوک، قەڵەمبڕ. تۆپز: تێڵایەکی دار یا ئاسن بوە سەرەکەی تۆپێکی خڕی بزمار ڕێژی پێوەبوە. گازی هەڵکێشانی ددان.

سەرج، تەپڵ، ئەسپ، جەوشەن، شیرو تۆپز: ئەمانە کەرەستەی شەڕ بون.

10 - 35. موسەللەح: چەکدار. یەل: شێر. نازا. پاڵەوان. نەجار: دارتاش. کەمینگاە: جێگای بۆسەنانەوە. گوزەر: تێپەڕین. یاخود ئەو ریزە دوکانەی جۆرە پیشەیەکی تێ دا کۆبۆتەوە، بازاڕ چەند گوزەری تێ دابوە، وەکو: گوزەری ئاسنگەرەکان، گوزەری کەوشدرومکان. شێری بەندی: شێری گیراو.

10 - 36. ناخج: جۆرێکە لە نێزەی دوکتێژ. کەمان: کەوانی تیر هاویشتن. دەشنە: نێزەیەکی پچوکە سەرەکەی دوفاق بوە لە شەڕدا گرتویانەتە دوژمن. دەهرە: نێزەیەکە سەرەکەی وەکو داس چەماوەتەوە. ئەسکەنە: ئامرازێکە بۆ کونکردنی دار. تێشە: تەشوێ. مشار: ئامرازی بڕینەوەی دار و تەختە. لێسک: تیغێکی کەوانەییە ناو کەوچک و کاسەی پێ هەڵئەکۆڵرێ. مەنگەنە: ئامرازی لە قاڵبدانی تەختە بە تایبەتی دوای کەتیرە لێدان. کەوان: دارێکی کەوانەدارە چەرمێکی درێژی بەسەرەوەیە داری پێ کون ئەکرێ.

ناخج، تیر، کەمان، زەرگ، دەشنە و دەهرە: ئەمانە کەرەستەی شەڕ بون.

ئەسکەنە، تێشە، مشار، لێسک، مەنگەنە و کەوان: ئەمانە کەرەستەی دارتاشی بون.

10 - 37. پاس: پارێزگاری. بە زۆری بۆ سەگ بەکارئەهێنرێ. دەکە: سەکۆ.

سالم بە شیعرێکی درێژ هەجوی "میرزا سلێمانی زیندرو" ی کردوە. لە سەرەتاکەی دا ئەڵێ:

میرزا وەرە لێم لادە دەستی من و دامانت
ئەیمەن مەبە لێم نەک بێم یەک دەفعە بە مەیدانت
تۆ قازو ئەمن شاهێن، مەقرێنە بە دەورم دا،
نەک حەملە بەرم، گیر کەم چنگێ لە چیقەڵدانت!

بە هەجوەکەدا وا دەرئەکەوێ میرزا سلێمان شاعیر بوە.

10 - 38. هەمانە: لە پێستی مەڕی خۆشە کراو دروست کراوە. لە باتی جانتای ئێستا کەلوپەلی تێ

خـراوە. زوبـین: نێـزە. درەفـش: درەوش، سـوژنێکی نـوکتیژەی دەسـک دار بـوە بـۆ کونکردنی چەرم. پێشینان و تویانە: "مست لە درەوشـە نەگەڕێتـەوە". هەسـان: بـەردێکی ڕەق و لوسە تیغی پێ تیژ ئەکرێ.

10 - 39. مونیس: هاودەم. ئەدب ئاموز: مامۆستا. ئەدیب. بز: بزن. ئەدیم: هاودەم. تیمار و کچـان: دو گوندن لە ناوچەی قەرەداغ.

10 - 40. باش خەیات: سەرۆکی بەرگدروەکان. ئەلە: کـورتکراوەی عـەلی. کۆپـان: جلـی ئێسـتر و گوێدرێژ. دەرزیباشی: سەرۆکی بەرگدروەکان. قاتر: ئێستر. قاترچی: کاروانچی. خـەران: کەران.

10 - 41: ئێلی غەوارە: بەو هۆزانە وتراوە کە جـاف نـەبون و، خۆیـان هاویشـتۆتە پـەنای جـاف. کافرۆشی، چنگنی، چوچانی: 3 تیـرەن تـا ئێسـتاش لـە نزیـک سـلێمانی مـاون. تـەلان: گوندێکە لە ناوچەی سورداش.

10 - 42. عەزم: بڕیار. فەرزەن: گریمان. کاک ئەحمەد: حـاجی کـاک ئەحمـەدی شـێخ کـوڕی شـێخ مارفی نۆدێیە. زانایەکی گەورەی زانستە دینییەکان بوە. لە سەردەمی خۆی دا لای خـەڵک زۆر گـەورە و پایەبـەرز و پیـرۆز بـوە. تـا ئێسـتەش سـوێند بـە گۆڕەکـەی ئـەخۆن و "گوللەبەند" ەکەی بەناوبانگە. سـالم مەبەسـتی ئەوەیـە، ڕێگەوبانـەکان ئەوەنـدە نائـارام و نائەمینن، ئەگەر کاک ئەحمەدی شێخ بەو هەمو ڕێز و پیرۆزییەوە بەو ناوچەیەدا تێ پـەڕێ تا ئەگاتە گەڕەکی کانێسکانی ناو شاری سلێمانی 3 جار ڕوتی ئەکەنەوە. کانیی ئاسـکان: ئەوسا دەشتاییەکی تەخت و سەرچاوەیەکی ئاو بوە. ئێستا گەڕەکێکی سلێمانیە.

10 - 43. نـەجیبانی ولایـەت: خانەدانـەکانی وڵات. ئافـەت: وەبـا. نەخۆشـیی کوشـندە. نانـەجیب: ناڕەسەن. جامەی شەهری: کراسی شاری. صەحرانشین: دانیشتوانی لادێ.

10 - 44. سەبتی توغرا: لە سەر کاغەزی ڕەسمیی عوسمانی نوسراوە. ماوەت: ناحیەیەکـە لـە قـەزای شارباژێڕ. قەشان: گوندێکە لە ماوەت.

10 - 45. لوتف: لوتف، دەربڕینی خۆشەویستی. نیک و بەد: چاک و خراپ. نێری: سابرێن، تەگە. زابت: ئەفسەر. ڕێکخەر. نەهر: چەم. موان: گوند و جۆگەیەکە لە شارەزور.

10 - 46. تەسخیری مەمالیک: داگیرکردنی وڵاتان.

10 - 47. وەرنە: وە ئەگەر نا.

10 - 48. حەملە: هێرش. مودەعی: دوژمن. لەغزش: خزان، خلیسکان. ڕیکاب: ئاوزەنگی. عەنان: جڵەو.

10 - 49. بێشە: دارستانی چـڕ. شـوێنی ژیـانی شـێر. زاهیـر: ئاشـکرا. خـاتر: بیـر. دەسـتوبرد: چاپوکیی.

10 - 50. جەفاجو: ئەوەی بەدوی جەفادا ئەگەڕێ. قەدەم: هەنگاو. پەلە: پەلەپیتکەی تفـەنگ. بوسـی: ماچی کرد.

10 - 51. ئیختیراع: داهێنان. مەشق جو: ئەوی بە دوای مەشق کردن دا ئەگەڕێ. شـوغال: چەقـەڵ. یەکەتاز: سواری بێ هاوتا. دونبال: دوا، لـە دونبـالی: بـە دوایـەوە. شـێری ژیـان: شـێری توڕەی ڕقهەستاو.

10 - 52. بیم: ترس. جانفەرسا: گیانکێش. کەوباڕ: بەچکە کەو. جیهەت: لا.

10 - 53. شوعلە: بریسکە. ماهیچە (ڕاستەکەی: ماهچە): نیشانەیە بۆ خواریی دەمی تیـغ کـە وەکـو

مانگی یەکشەوە چەمیوەتەوە. تیغی بورەهنە: تیغی ڕوت. قوڵنگ: مەلێکی ڕەوەنـدە لـە تیرەی قاز، لە قاز گەورەتر و باڵابەرزترە، لە کەناری ناو دا ئەژی، مل و قـاچی درێـژە. بـە چرا بە شەوارە ئەکەوێ و ڕاوی ئەکەن. شەوارە یەکێکە لە شێوە کۆنەکانی ڕاوی کورد. بە شەو، بە تایبەتی شەوانی باران، چرایان هەڵگیرساندوە لە کەناری چـەم و نـاو شـەخەڵ و زەبەنگی چرپا. ئەو مەلانەی تەڕیی باران کەنەفتی کـردون و ئەیانـەوێ ئـارام بگـرن، کـە ڕوناکی چراکە لە چاوی دان، ئەکەونە باڵە فـرەو خۆیـان ئاشـکرا ئەکـەن. بـەڵام نـاتوانن خۆیان دەرباز بکەن، چونکە ڕوناکی چراکە بە شەوارەیان ئەخاو، ئەگیرێن.

10 - 54. تۆپی قایش: فوتبۆڵ. ناقار: ئاست. شللیک: دەسـرێژ، تەقانـدنی بـە کۆمـەڵی هـەمو ئـەو گوللانەی لە تۆپ و تفەنگ دایە. سینەکەمان: کەمانچە، ئامرازی مۆسیقایە.

10 - 55. غیماری مەعرەکە: گەرمەی پێکدادان. لە مەتنەکەدا "قماری معرکە" نوسراوە، ڕەنگە سالم لـە وشەی "قمار" مەبەستی "غمار" بێ و، بە هەڵە وەکو هەنـدێ وشـەی عـەرەبی نوسـیوە ئـەم وشە عەرەبیەشی نوسی بێ. فارسی ڕەمەکی زۆر قـاف بـە غـەین (تلفظ) ئەکـەن. جـەلای جەوهەر: بریقانەوەی جەوهەری تیغ. خوێنی موددەعی: خوێنی دوژمن. قان: خوێن.

10 - 56. شوری مەخفی: کۆبونەوەی نهێنی. نەی: قامیش، شمشاڵ. ڕاز: نهێنی.

10 - 57. نیسم: ناو. قابیز: گیانکێش، دەرهێنەری گیان. حەرب: شەڕ. چەپەر: تەتەر، ئەوەی نامە لە نێوان شوێنەکان دا ئەگوێزێتەوە. ئەجەل: مەرگ.

10 - 58. تا: توێ. پیرەهەن: کراس. مەمات: مردن. نیزام: ئەو سەربازانە بون کە لـە سـەر شـێوەی نوێ بۆ کاروباری جەنگیی ڕێکخرابون. ئەحمەد پاشا لە سلێمانی چوار تابوری لـەم هێـزە دروست کردوە. باڵەبان: جۆرە ئامرازێکی مۆسیقا بـوە لـە کـاتی ئامـادەکردنی لەشـکر و شەڕدا لێ دراوە.

10 - 59. تەحقیقە: بێگومانە. قەومی نوح: لە بەر گومڕایی خـوا غـەزەبی لـێ گـرتن و لـە تۆفـان دا خنکان و لە ناوچون. جەننەت: بەهەشت. شوبهە: گومان.

10 - 60. بەچەگورگ ئاسا: وەکو بەچکەی گورگ. کـۆز: شـوێنی ڕاگرتنـی کـارو بـەرخ. پێشـینان وتویانە: "کۆزی کارگەل ببینە، ئینجا قەپوچک دابگرە". گورگ دڕندەیەکە کە ئەکەوێتە ناو مەڕ جگە لەوەی ئەیخوا، چەندی بتوانێ ملی مەڕ ئەشکێنێ. ئەگەر بکەوێتە ناو کۆزی بـەرخ و کار هەمویان ئەکوژێ.

10 - 61. فەرق: تەوقی سەر. فەخر: شانازی. میرئالا: پلەیەکی سەربازیی ئـۆردوی عوسـمانی بـوە. میرلیوا. بەهرام: ناوی یەکێ لە بورجەکانی ئاسمانە. ئەسـەد: نـاوی یـەکێ لـە بورجـەکانی ئاسمانە. قەعر: ناخ، بن. چاهی غەم: چاڵی غەم، بیری غەم.

10 - 62. باز: دیسان. بازی تەوار: بازی مێ کە ناسـراوە بـە چـابوکیی و ئـازایی. نۆکـەران: لـەم سەردەمەدا نۆکەر بە موچەخۆر و چەکدارە ڕەسمییەکانی میرەکانی دەزگای بابـان وتـراوە، ئێستا بە مانای خزمەکار بە کار ئەهێنرێ. دەوران: گەماڕۆدان.

10 - 63. گورچکی گـا: مەبەسـتی ئەوەیـە پـێچ و پـەنا، یـا فروفێڵـی زۆری تیایـە. سـوس: چەنـد مەعنایەکی هەیە: مارمێلکە، بەرازی ئاوی، مۆرانە، لێرەدا ڕەنگە مەبەستی مۆرانە بێ. جوملە: هەمو. خودرو: هیچ تەربیەت و تەعلیمێکی دا نەدراوە.

10 - 64. ڕیکاب ئەندەر ڕیکاب: ناوزەنگی بە تەنیشت یا لە دوای ناوزەنگی. عەنان ئەندەر عـەنان:

جڵەو بە تەنیشت یا لە دوای جڵەو. لە کاتی هێرش دا کە سوارە شەڕکەرەکان ئاوزەنگی بە تەنیشت ئاوزەنگیەوە و، جڵەو لە ڕیزی جڵەوی یەکتری دا بۆ پێشەوە ئەڕۆن.

10 - 65. بەبر: بەور، بەوری بەیان. دڕندەیەکە لە تیرەی پڵنگ. غەزەنفەر (بە هەڵە "غظنفر" نوسرا بو): شێر. کوچە: کـۆڵان. سـوقاق: کـۆڵان. مەحەللـە: گـەڕەک، یـا شـوێن. جـان سـتان: گیانستێن.

10 - 66. صەحرای مەحشەر: ئەو دەشتاییەی لە ڕۆژی "قیامـەت" دا هـەمو خـەڵکی تـێ دا "حەشـر" و"نەشر" ئەکرێ. پیر مەسور: کورتکراوەی "پیرمەنصور"ە، گەڕەکێکی سـلێمانیە بـە نـاوی ئەم چاکەوە ناو نراوە.

10 - 67. پەیک: نامەبەر، تەقدیر: چارەنوس. سەقا: ئاوکێش. ڕاویە (مـن روی یـروی): مەشـکە یـا کوندەی پڕ لە ئاوی خواردنەوە کە ئەدرێ بە کۆڵ دا. دوش: شان، کـۆڵ. ئـاوی ئـەڵماس: کینایەیە بۆ تیژیی تیغی سەربڕین. تیز: تیژ، ڕیتە: ڕشتە. حەلق: گەرو.

10 - 68. غەیرەز: جگە لە، شەرەنگ: زەهر. شتی زۆرتاڵ، گوژاڵک، بێخـود: لـە خۆچـو. خەمۆشـی: کپی و بێدەنگی.

10 - 69. جارۆب: گەسک. پێکراو: ئەنگێوراو. پەهلەوان: پاڵەوان. پاڵەوان (پالوانە): مـەلی ئـەبابیل، مەلێکی بچوکی ڕەش و سپیە هەمیشە لە فڕین دایە قاچەکانی کورتە کە بکەوێتە سەر ئەرز ناتوانێ هەستێتەوە.

10 - 70. سەن سەن: تۆتۆ. گێل ئـولان: وەرە کـورە. ئەمانـە وشـەی تێخـوڕینی کـاتی شـەڕن بـە تورکی.

10 - 71. قەهرناک: دڵ پڕ لە قین. سەربورهنە: سەرڕوت. ناتەش نەفشان: ئـاگرپرژێن. حەملـەوەر: پەلاماردەر. جەنگجو: نازا، دلێر. هەرسو: لە هەمو لایەکەوە.

10 - 72. غەوا: گومڕا. مەبەستی گوللەی وێڵە. لە هەندێ ڕونوسی بڵاوکراوەدا لە باتی غەوا، دەعوا و تەقە نوسراوە.

10 - 73. مەحاق: ئاوابونی مانگ. جیلوەگەر: دەرکەوتو

10 - 74. لاغیر: لەڕ. حەسرەتا: بە داخەوە، مەخابن. ئەختەر: ئەستێرە. موزەففەر: سەرکەوتو.

10 - 75. ئەگونجێ لە باتی "ماڵ" "یاڵ" بخوێنرێتەوە کە بە مانای بەرازیی و گردە.

10 - 76. بلوک: یەکەیەکی سەربازیی ئۆردوی تورک بوە وەکـو "سـریە". سـونگی: نێـزە. دەوران: سوڕان، خولانەوە. سونگی دەوران: ئەبێ تاکتیکێکی جـەنگیی پـەلاماردان بـوبێ. فیرقـە: تیپی لەشکر.

10 - 77. چەرخی حەفتەمین: ئاسمانی حەوتەم. حین: کات، دەم. فوغان: گریان.

10 - 78. غەیری: جگە لە. لەب تەشنەگان: لێو تینوەکان. کوشتەگان: کوژراوەکان. شەهیدی کەربەلا: مەبەستی ئیمام حسێنی کوڕی ئیمام عەلی و یارەکانیتی کە لە دەشتی کەربەلادا کوژراون و، بە تینویەتی گیانیان دەرچوە.

10 - 79. نەفیر: هاوار. لامەکان: جیهانی ئولوهییەت. صەدا: دەنگدانەوە. ئەلئەمان: داوای "ئەمان".

10 - 80. بای موخالیف: بای پێچەوانە. قسەیەکی عەرەبی ئەڵێ: "تهب الریاح بما لا تشتهی السـفن" واتە: با بە ئارەزوی کەشتی ناوەزێ. دودەمان: خێزان، بنەماڵە، هۆز، نەژاد.

10 - 81. ڕۆژی قەتڵ: ئەو ڕۆژەی ئیمام حسێن و یارەکانی تێ دا کوژراوە. "واحسـێن": هاوارێکـە

شیعەکان لە عاشورادا ئەیڵێن. ئەدای قەزییە: جێبەجێ کردنی مەسـەلەکە. مەبەسـتی گێڕانـی شینی کوژراوەکانە. نیلگون: شین، ڕەنگی نیلی کە لە پرسەدا ئەپۆشرێ.

10 - 82. یادگاری حاکمان: مەبەستی کوڕ و نەوەی میرەکانی بابانە. جانشینی سیلسیلە: جێنشینی زنجیرەی بنەماڵەی بابان. نامورداد: بە ئامانج نەگەیشتو. نەوڕەس: تازەپێگەیشتو. مەقصەد نەدیو: بە هیوا نەگەیشتو.

10 - 83. کەیخوسرەو سێهەمین پادشای زنجیـرەی کـەیانی و، کـوڕی سـیاوەش. هێشـتا لـە سـکی دایکی دا بو کە ئەفراسیاب باوکی کوشـت. کەیخوسـرەو کـە لـە دایـک بـو، بـە فـەرمانی ئەفراسیاب بۆ ئەوەی ئاگـای لـە هـەواڵی باووبـاپیرانی نـەمێنێ دور خرایـەوە بـۆ کێـوە دورەکان و ئینجا بۆ قەڵایـەکی قـایم. گیـوی کـوڕی گـودەرز دۆزیـەوەوەو، ئـەو و دایکـی هێنایـەوە بـۆ ئێـران. کەیخوسـرەو فـەریبورز لـە سـەر جێنشـینی بـو بـە ناکۆکییـان. پاڵەوانەکانی ئێران وا پێکهاتن کە هەر کامێکیان قەڵای بەهمەن بگرێ، ئـەو بـە شایسـتەی پادشایی دابنرێ. کەیخوسرەو "فەڕی

کەیانیی" لە گەڵ بو قەڵاکەی گرت. بۆ وەرگرتنەوەی تۆڵەی خوێنی باوکی چوە سەر ئەفراسیاب و، کوشتی. ئەمە یەکێکە لە ئەفسانەکانی شانامە.

"خـوێنی سـیاوەش" بـۆ لـە بیرنەچونـەوەی خولیـای تۆڵەسـەندنەوە و، درێژەکێشـانی دوژمنایەتی و، ڕژانی خوێنی زۆر، لە زمـانی کـوردی دا بـوە بـە پەنـد. ڕۆسـتەمی سـانی: ڕۆستەمی دوهەم. مـوددەعیی تورانییـان: دوژمنـی تورانییـان. بـە گـوێرەی ئەفسـانەکانی شانامە دوژمنایەتییەکی خویناوی دورودرێژ لە نێوان ئێران و توران دا بوە.

10 - 84. قادری قودرەت ئەما: مەبەستی یەزدانە. قودرەت: توانـایی. قـادری ئێمـە: مەبەسـتی قـەدر بەگی کوڕی سلێمان پاشایە کە لـەو شـەڕەدا بـە دیـل گیـراوە. موسەلسـیل: مەبەسـتی بـە زنجیرکراوی.

10 - 85. وەرنە: وەگەرنا، ئەگینا. مەقهور: تێشکاو، خەمگین.

10 - 86. ئەهلی لەشکر: مەبەستی جەنگاوەرانی لەشکرەکەی عەزیز بەگە. پـای ڕیکـاب: پـێ ی نـاو ناوزەنگی. سوبوک دست: دەست سوک. بۆ ئەوەی وڵاخ تاو بـدرێ پـێ لـە نـاوزەنگی دا قورس و گیر ئەکرێ و، جڵەوی بۆ شل ئەکرێ.

10 - 87. کۆزیلک: کۆز. جێگای مۆڵ دانی کارژۆڵە و بەرخۆلە.

10 - 88. سێر: تێر. غەنی: دەوڵەمەند. قاتیـل: بکـوژ. ئـەو: مەبەسـتی سـەگە "لـە لاک تێـر" بـوە. ئەمیان: مەبەستی عەسکەرە "لە تـالانکردنی مـاڵ غـەنی" بـوە. ئـەم: مەبەسـتی لـە "دڵ" ی خۆیەتی "لە غەمی تیغی قاتلان دا هاتۆتە جۆش".

10 - 89. مەیل: ئارەزو. ئیقدام: دەس پێشکەری. بیدعەت: شتی تازەداهێنراو. گردی گـولان: گردێکـە لای ڕۆژهەڵاتی سلێمانی. ئێستا بە گردی مامەیارە بە ناوبانگە. پیرەمێردیش لەوێ نێژراوە.

10 - 90. گەر محەللی گریە بو: ئەگەرچی شوێنی گریان بو. پورە ماتان: ئەبێ ناوی یـەکێ لـە ژنـە ناسراوەکانی هۆزی دۆم بوبێ کە ئەحمەد ئاغای بە شێوەی دۆمەکان ڕزگار کردوە.

10 - 91. عەزیزی میصر و حاڵەتی کەنعانیان: ئیشارەتە بە چیرۆکی یوسفی کوڕی یـەعقوب کـە لـە قورئان دا بـاس کـراوە. کـەنعانییان: قەومەکـەی یـەعقوبی بـاوکی یوسـف بـون. میصـر وڵاتێکی دەوڵەمەند بوە. بەڵام حەوت ساڵ لـە سـەر یـەک بـاران نـەباری و کەنعانییـەکان

توشی قاتوقڕی هاتن. عەزیزی میصر، کە یوسف بو، فریایان کەوت لە برسێتی ڕزگاری کردن. سالم لێرەدا عەزیز بەگی بابان ئەشوبهێنێ بە عەزیزی میصر. خەرابە: وێرانە.

10 - 92. دامۆسکە: موی کلکی ولاخ. گرێ ی دامۆسک زو ئەکرێتەوە.

10 - 93. دیدە: چاو. نابینا: کوێر. یەعقوب: باوکی یوسف. عەزیز: یوسف. یەعقوب کە بیستی یوسفی کوڕی ئەماوە کوێرایی داهات. بەڵام کە کراسەکەیان بۆ برد و بۆنی یوسفی بە سەردا هات، بینایی گەڕایەوە چاوەکانی. صاحب مکان: خاوەنی جێگا. لامکان: جێگا دادیار، جیهانی ئولوهییەت.

10 - 94. چاە: بیر، چاڵ. شەعشەعە: پرشنگ، درەوشانەوە. مونەووەر: ڕوناک.

10 - 95. چنگاڵ: چنگ و نینۆکی باز. شاهباز: شاباز. باز: هی یەکەمیان، مەلێکی ڕاوکەری گۆشتخۆرە و، هی دوەمیان، دیسان. بازیان: ناوچەیەکە کەوتۆتە ڕۆژئاوای سلێمانی لە سەر ڕێگەی کەرکوک. فش هەڵات: کرکەوت. کەهیا: کوێخا. بەیزەی تەماع: هێلکەی تەماع. ماکیان: مریشک. سالم لەم بەیتە و بەیتی 62 دا باسی کابرایەک ئەکا بە ناوی کەهیا کە هاوکاری لە گەڵ داگیرکەر کردوە. لەو قەصیدەیەش دا کە بە بۆنەی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشاوە دایناوە لە بەیتەکانی 34، 35، 36 دا دیسان باسی ئەکا. ڕیچ لە گەشتەکەی دا بۆ سلێمانی دەربارەی کەهیا ئەڵێ: "ئەحمەد کەهیا کە دوای مردنی عەلی پاشای والی بەغداد هەڵات بو، هات بوە سلێمانی و بە هۆی زرنگیی خۆیەوە، ئەو ماوە زۆرە لە سلێمانی ماوەتەوە. ئێستە وەکو یەکێ لە ئاغا یان یەکێ لە خانەدانەکانی کوردە و، چەندان گوندی دەوڵەمەندیشی لە لایەن میری ئێستای سلێمانی و پێشوەوە دراوەتێ. لە بەر ئەوە ئێستە ئەگەر چاکترین پایە و پلەیشی بدەنێ، ئارەزوی بەغداد ناکات. وا دیارە ئەم حاڵەی ئێستای زۆر بە دڵ بێ". ڕەنگە سالم مەبەستی ئەم کەهیایە بێ، کە سەرەڕای ئەو هەمو چاکەیەی لە گەڵی کراوە، کەچی سپڵەیی و "بەدنمەکی" کردوە بەرامبەر میرەکانی بابان.

10 - 96. مەدار: هەڵسوڕاندن، گێڕان، خولگە. عوشرەت (عشرە): ئەگونجێ "عوشرەت" خۆش ڕابواردن بێ، یان "عەشرەت" بێ بە مەعنای عەشیرەت، هۆز. تەبع: تەبیعەتی مرۆڤ. کەید: فرووفێڵ. واتە بۆ هەڵسوڕاندنی نانی ڕابواردنی خۆی، یان بۆ هەڵسوڕاندنی نانی عەشیرەتەکەی، لە هیچ خولگەیەک دا نەئەمایەوە و ئەیگۆڕی. نیشانەیە بۆ هەڵپەرستی.

10 - 97. نمەک: خوێ. بەدنمەک: سپڵە و بێ وەفا. بەختی سوتێ: بەدبەخت و چارەڕەش بێ. "حەق" حەقی لێ وەرگرێ: "حەق" مەبەستی خوایە. خوا هەقی لێ بسێنێ و تۆڵەی لێ بکاتەوە. "بەدنمەک گیری نمەک بێ" یا "بەد نمەکگیری نمەک بێ": ئەمانە دوعای شەڕن.

11. دوار. "تاريخ العراق": 120.

12. د. کمال فوئاد، ئەم قەصیدەیەی دۆزیوەتەوە و، بۆ یەکەمین جار دوای ساغکردنەوە و لێکدانەوەی وشە گرانەکانی، لە گۆڤاری "چریەی کوردستان - لەندەن" دا بڵاوی کردۆتەوە. سەرناوی قەصیدەکە لە دەستنوسێکیان دا نوسراو: "در ذکر آمدن بندگان عبدالله پاشای بابان از دربار همیون بسوی عراق و روم و نظم سرحدات بین روم و ایران از گفتەی سالم" واتە: لە باسی هاتنەوەی بەندەگان عەبدوڵڵا پاشای بابان لە دەرباری هومایون بەرەو عێراق و ڕوم و ڕێکخستنەوەی سنورەکانی ڕۆم و ئێران لە وتەی سالم. لەوی کەیان دا نوسراوە: "تهنیەی مرخص شدن عبدالله پاشای بابان از قسطنطین و

امننش بعراق بغداد" واتە: پیرۆزبایی ڕێگە پێ درانی عەبدوڵلا پاشای بابان و گەڕانەوەی بۆ عێراقی بەغداد. وشە گرانەکانی شیعرەکە:

12 - 1. تیرومش: وەک تیر. نیمە گوزەشت: تێ نەپەڕم. عەهدی نیسان: دەمی بەهار و خۆشیی. بێ دڵ: دڵتەنگ، مات. ئەفغان: هاوار و شین و گریان. ڕەنگە: "بە ئەفغان هاتەوە" ڕاست بێ نەک "با فیغان هاتەوە".

12 - 2. سەختگیریی کرد: سەختی نواند. ئەفراسیاب: پاشای دەیەمی پێشدادیان (بە پێ ی شاهنامەی فیردەوسی). باد: با، هەوا. پور: کوڕ. دەستان: نازناوی زاڵ، باوکی ڕۆستەم. پوری دەستان: کوڕی زاڵ (ڕۆستەم).

12 - 3. خەندان: دەم بە پێکەنین. صەبا: هەوای خۆش.

12 - 4. پەژمودە: ژاکاو، سیس. ئەوقاتی حوت: دوا مانگی زستان(21 / 2 - 20 /3). ماە: مانگ. ئابان: مانگی هەشتەم بە پێ ی ساڵنامەی ئێرانی (22 / 10 - 21 /11". خەزان: پایز.

12 - 5. جنبش: جوڵە. قامەت: باڵا. سەروی سەهی: سەروی ڕاست و ڕێک. خیابان: ڕاستە ڕێگەی ناو باخ و گوڵزار. چەمەن: چیمەن.

12 - 6. سارە: بەرگی سەوزی خونچە. دڵدادە: عاشق. شکۆفە: خونچە. شاخسار: لق و پۆپی زۆر و چڕ. تەرەفی باغ: کەناری باخ. ڕەقاص: سەماکەر، بە هەڵپەڕکێ و سەماوە. سەرمەست: سەرخۆش. غەزەلخوان: غەزەل خوێن، گۆرانی چڕین.

12 - 7. تیفل وار: وەک مناڵ. یەکشەبە: یەکشەوە. شاخە: چڵی درەخت. ئیزەد: یەزدان، خوا.

12 - 8. موشتاق وار: بە پەرۆشەوە. دایە: دایەن. ئەبر: هەور. ئەشکرێزان: فرمێسک ڕێژ.

12 - 9. سۆنە و بۆرچین: دو جۆرە مراوین. سازوەش: وەک ساز. هەرسو: لە هەر لاوە.

12 - 10. ئوردی بەهەشت: مانگی دوەم بە پێی ساڵنامەی ئێرانی (21/ 4 - 20 / 5)، گەرمەی بەهار.

12 - 11. مەخمەڵ: قەیفە (قەدیفە: جۆرە کوتاڵێکە). لە هەر جا: لە هەرلاوە. صەحنی چەمەن: شوێنی چەمەن. دەماغ: لوت. عەهدی گوڵ ئەفسوردەگی: دەمی سیس بونی گوڵ.

12 - 12. سروش: فریشتەی هەواڵ هێنەر (جوبرائیل). چراغ: چرا.

12 - 13. هوەیدا: دیار، ئاشکرا. صوبح وار: وەک دەمی بەیان.

12 - 14. هودهود: پەپو سلێمانە. پەرواز: فڕین. موڵکی سەبا: دەوڵەتی سەبەء (سبا). سولەیمان: مەبەست لە سولەیمان پێغەمبەرە وەک لە قورئان دا باسی هاتوە.

12 - 15. بەرق وەش: وەک برووسکە. قوسگە نگین: ئەستەموڵ. صەدر: مەبەستی "صەدری ئەعزەم": سەرەک وەزیرانی عوسمانیە. سوڵتان: سوڵتانی عوسمانی.

12 - 16. ئاصەف: وەزیری دەستە ڕاستی پێغەمبەر سولەیمان (بە ڕاوێژکەری زیرەک و زانا ئەوترێ). مورەخخەص بو: بەرەڵلا بو: ڕێگە پێ دراو.

12 - 17. ئاقدنگز: دەریای سپی ناوەڕاست. جەیحون: ڕوبارێکە ئەکەوێتە ئاسیای ڕوسییەوە، بەشێکی سنوری ڕوسیا و ئەفغانستان پێک ئەهێنێ. پێشی ئەوترێت ئامو دەریا.

12 - 18. فیتنەخێز: بە ئاشوب، بە گوبەند. هەفتخوان: یەکێکە لە داستانەکانی شاهنامە کە بریتیە لە بەسەرهاتەکانی ڕۆستەم لە ڕێگەی مازندەران. کاتی چونی بۆ ڕزگار کردنی کەیکاوس لە بەندی. ڕۆستەم لە ڕێگە توشی حەوت شەڕ بوە کە بە سەر یەکەوە بە هەفتخوانی ڕۆستەم

ناسراوە. رۆیین تەن: لەش ئاسنین، بە یەکێک ئەوترێت کە شیر و تیر کاری تێ نەکات. نازناوی رۆستەمە.

12 - 19. بێ رەمەق: بێ تان. خیسسەت (خسە): نزمی. مونیب: بێ بار، پەشیمان. خەلائیق: خەڵکی. "منیب" ناوی یەکێ لە کاربەدەستانی ئەوسای عوسمانی بوە.

12 - 20. شەهد: شیرین. تەڵخ: تاڵ. لوتف و قەهر: نەرمی و توندی، میهرەبانی و تورەبون. نەحل ناسا: وەک هەنگ. نۆش و نیشان: نۆشین و پێوەدان.

12 - 21. خۆش نەما: وێنە جوان. هیلالی شامی عید: مانگی یەکشەوەی ئێوارەی جەژن. ماهی نەو: مانگی نوێ.

12 - 22. قیصاص: سزادان. قەبز و بە ست: گرتن و بەردان. گورد: دلێر، پاڵەوان.

12 - 23. تەرەددود: سەردان. دادروەش: وەک دادر. دوزە: دز.

12 - 24. بێن بە هەم: بێن بە یەک دا، تێکەڵاو بین. گریە: گریان. خەندە: پێکەنین.

12 - 25. شەب نشینانی خەفەت: ئەوانەی شەو بە خەفەتەوە رۆژ ئەکەنەوە. زەررە ئاسا: وەک زەررە، وەکو گەرد و تەپوتۆز. خورشیدی رەخشان: رۆژی روناک.

12 - 26. دیهقان: جوتیاری خاوەن زەوی.

12 - 27. کەفشدوز: کەوشدرو. مەرکەزشوناس: شارەزای کاروباری دەوڵەت. ئەهلی دیوان: شایەنی دانیشتن لە بارەگای دەوڵەتی دا، لێوەشاوەی ئەو شوێنە.

12 - 28. رەعییەت: دانیشتوانی میرنشینی بابان بە گشتی.

12 - 29. شەق وەشێن: جاران هەر بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار و خاوەن موڵک چەند کەسێکیان هەبوە بە ناوی شەق وەشێنەوە بۆ گرتن و لێدانی ئەوانەی سەرکێشییان کردوە. شورانشین: ئەوانەی لە ئەنجومەنی پرس و راوێژدا دانیشتون. صەدر: سەرۆک.

12 - 30. کەریم ئاغای ئەنێ، کاکەمین، مودیری پەت لە مل، کەهیای مازی و، کەسانی تر کە لە شیعرەکەدا ناویان هاتوە، ئەوانەن کە لە گەڵ هێزی داگیرکەران هاوکار بون.

12 - 31. سان: پیشان دان و نواندی سوپا (ئیستیعراز).

12 - 32. لیوا: ئاڵا. تەوق و فەرمان: تەوق و ئەڵقەی فەرمانڕەوایی کە لە لایەن دەوڵەتەوە، بە فەرمانی سوڵتان بەخشراوە و، کراوەتە مل.

12 - 33. خرس: ورچ.

12 - 34. زاغ: قەلەڕەش. سەرکاری کەهیا: وەکیلی کەهیا. شکار: راو. بازی تەرلان: جۆرە بازێکە لە راودا زۆر چاپوک و ئازایە.

12 - 35. عەزیزبەگ: عەزیز بەگی بابان. دەرع: زرێ، قەڵخان. خود: کڵاوی ئاسنین کە لە کاتی جەنگ دا لە سەر کراوە. خەفتان: جۆرە بەرگێکی تایبەتی بوە لە ژێر ئەسبابی جەنگەوە لە بەر کراوە.

12 - 36. کاران: لێدان و بە یەک دا هاتن، شەڕ و جەنگ. سەرحەد: سنور. موڵکی سنە: ولایەتی ئەردەڵان کە پایتەختەکەی سنە بوە.

12 - 37. کەڕ و فەڕ: لێدان و هەڵاتن، پەلامار و کشانەوە. چێش کەرۆ: چی بکەم. ئەم وشەیە هەورامییە بۆ گاڵتە پێ کردن بە کار هێنراو. نیشانەیە بۆ ئەوەی سەربازەکانی فەوجێکی هێزەکەی والی ی ئەردەڵان هەورامی بون.

12 - 38. تایری دەوڵەت: مەلی بەخت و ئیقبال. لە ئەفسانەی کۆن دا ئەڵێن "هوما" بە سەر هەر کەسێک دا فڕی بێ، بوە بە فەرمانڕەوای وڵات. یان "باز" بە سەر هەر کەسێکەوە نیشت بێتەوە، بوە بە شا. یازان: پایەداران، دەسەڵاتداران. تازان: بە تاو، بە پڕتاو.

12 - 39. کەفە: تای تەرازو. کەرەم: بەخشندەیی. خەرجی شەهرەزور: دەسکەوتی دەوڵەت لە خەرج و باجی شارەزور.

12 - 40. قاانان: خان، نازناوی پاشاکانی "مەغول" بوە.

12 - 41. یەقینت بێ: دڵنیا بە، گومانت نەبێ.

12 - 42. ئەهلی دانش: زاناکان. حاتەمی بەخشش: حاتەمی بەخشین.

13. دیوانی نالی: 174 - 197.

ئەم دو قەصیدەیە بە ناوبانگن و زۆرجار بڵاو کراونەتەوە.

- لە زۆر دیوانە دەسنوسەکانی هەردو شاعیردا نوسراون.
- بۆ یەکەمین جار پیرەمێرد لە گۆڤاری "ژین" ی ئەستەموڵ دا بڵاوی کردونەتەوە و، وەرگێڕاون بۆ تورکی.
- لە چاپی یەکەمی دیوانەکانیان دا هەیە.
- گۆڤاری "گەلاوێژ" یش بڵاوی کردونەتەوە.
- لە سەرەتای شەستەکان دا، غەفور ڕەشید دارا، هەردو قەصیدەی لە ژمارەکانی ساڵی دوەمی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" دا بڵاو کردەوە و، وشە گرانەکانی لێک دایەوە.
- عەلادین سەجادی لە "مێژوی ئەدەبی کوردی" دا نوسی بوی: نالی ئەم شیعرانەی ساڵی 1834 داناوە، کاتێ هێشتا ئەمارەتی بابان ما بو. چەند کەسێ لە نوسەرانی کورد ئەمەیان بە ڕاست نەزانی بو. سەجادی بۆ سەلماندنی بۆچونەکەی خۆی هەردو قەصیدەی دوای ساخکردنەوە و لێکدانەوەی وشە گرانەکانی، بە لێکۆڵینەوەیەکی تەرەوە، لە نامیلکەیەک دا بڵاو کردۆتەوە. بۆچونە کۆنەکانی خۆی دوبارە کردۆتەوە. سورە لە سەر ئەوەی ئەم شیعرانە هی دوای ڕوخانی ئەمارەتی بابانین. بەڵگەکانی لاوازن بایی سەلماندنی بۆچونەکانی نابن. فاتیحی مەلا کەریم لە پێشەکی "دیوانی نالی" دا ئەم هەڵە مێژوییی و ئەدەبییەی ڕاست کردۆتەوە و، بە شێوەیەکی زانستی سەلمانددویەتی کە شیعرەکان دوای تێکچونی داوودەزگای بابان نوسراون.

وشە گرانەکانی شیعرەکە:

13 - 1. مرور: تێپەڕین. خۆش مرور: خێرا.

13 - 2. خەفی: نهێنی. بەشارەت: مژدە. گۆشە: سوچ.

13 - 3. هەم میزاج: هاوسروشت.

13 - 4. گاهێ: جارێک. ڕەوح: فێنکیی. دەم - یەکەم -: دەمەی ئاسنگەر، موشەدەمە.

13 - 5. عاتر شەمیم: بۆن خۆش. شیمال: بای شەماڵ. جەنوب: بای گەرمی باشور. دەبور: ڕەشەبا.

13 - 6. ڕەواق: هەیوان. خانە: خانو.

13 - 7. هەم عەنان: هاو جڵەو. هەم ڕیکاب: هاورکێف، هاوزەنگی.

13 - 8. دەوان: ئەوەی بە ڕاکردن بڕوا. ڕەوان: جاری. شیوەسور: شیوێکە لە نزیک چەمچەماڵەوە.

13 - 9. کودورات: تۆز و خۆڵ. تاهیر: پاک. تەهور: پاک کەرەوە.

13 - 10. عەین: کانی.

13 - 11. چەشمێکە: کانییەکە. فەوران: هەڵقوڵان.

13 - 12. چەشمەسار: سەرچاوە. عاریف: خواناس. یەنبوع: کانی. کێوی تور: ئەو کێوەی خوا قسەی لە گەڵ حەزرەتی موسا تێ دا کرد و، نوری خۆی تێ دا پیشان دا.

13 - 13. سارا: صەحرا. دەشت. خاک و خۆڵ: گوندێک بوە لە نزیک چەمی تانجەرۆ. جێ ی لە دایک بونی نالییە.

13 - 14. ریاز (کۆی رەوزە): باخ، بەهەشت. موشکین: بۆن خۆش وەک کەسێ موشکی لە باخەڵ دا بێ. کاکۆڵ: قژی درێژی پشت سەر. غیلمان (کۆی غلام): کوڕی تازە پێگەیشتو.

13 - 15. میزاج: تێکەڵ، سروشت. جۆبار: جۆگە.

13 - 16. شام: ئێوارە. ئەهار: ڕۆژ. فصول (کۆی فەصل): وەرزەکانی ساڵ. بوخار: هەڵم.

13 - 17. دانش: زانین. نازم: هۆنەرەوە. عوقود (کۆی عقد): ملوانکە.

13 - 18. مەحەللە: گەڕەک. دەور: خول. پرسش: پرسیار.

13 - 19. سەرشەقام: گەڕەکێکی سلێمانیە، کاتی خۆی کاروانی بەغدایی تێ دا پەڕیوە.

13 - 20. بە بەرگ و بار: پۆشتە و پەرداخ. عەلەم دار: داری ئاڵا و پەڕۆ پیا هەڵواسراو، یا مرۆڤی ئاڵا هەڵگر. شێخ هەباس: ئارامگای پیاوچاکێ بوە، داری گەورەی لە سەر بوە، چەند جۆلانەی لە سەر هەڵخراوە. ئێستا گەڕەکێکی سلێمانیە.

13 - 21. کانی با: سەیرانگایەک بوە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی و، گڵکۆی پیاوچاکێکی لێ بوە خەڵک بۆ چاک بونەوە لە نەخۆشی باداری چونەتە سەری. شۆرش: هەرا و هوریا. نوشور: ڕۆژی قیامەت کە هەمو زیندوان ئەمرن.

13 - 22. سەیوان: گردێکە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی دا، ئێستا گۆڕستانە، کەیوان: ئەستێرەی زوحەل. ئەنجوم (کۆی نجم): ئەستێرە.

13 - 23. مەلعەبە: گاڵتەجاڕ.

13 - 24. شیوی ناودار: شیوێکە لە ڕۆژئاوای سەروی سلێمانی.

13 - 25. تانجەرۆ: چەمێکە بە خواروی سلێمانی دا ئەڕوا بۆ شارەزور لە دواوان ئەڕژێتە سیروانەوە.

13 - 26. خانەقا: مەبەستی ئەو مزگەوتەیە کە مەحمود پاشای بابان بۆ مەولانا خالیدی نەقشبەندی دروست کرد. ڕەبیع: بەهار، گژوگیای بەهار. ئاهو: ئاسک. چایر: بەهاربەند، تەویلە. ستور: چوارپێ.

13 - 27. زور: زبر.

13 - 28. قەلب: دڵ، دەرون، ناوەوە. مونەووەر: نورانی، ڕوناک. لەندەهور: چوارشانە و کەڵەگەت. مەبەست لە کەسانی وایە ئەوەندە زەبەللاح بن خەڵک لێیان بترسێ.

13 - 29. دەست بەند: دەستی یەک گرتن. دارەوەن: درەختێکی بەرز و گەورەی لق و پۆپ چڕی گەڵا وردە، لە حەوشی زور لە تەکیە و خانەقاکان دا هەیە بۆ سێبەر، بەری نیە. حەلقە: کۆبونەوەی سۆفییەکان بۆ یادی خوا و پیرانی تەریقەت و بیر کردنەوە لە مەرگ و قەبر و قیامەت، لە گەڵ بەکار هێنانی وردە بەردی گوێ چەم دا لە جیاتی تەزبیح. مەندەبور: بەدبەخت.

13 - 30. ئەوراق: (کۆی ورق): گەڵا. موقەدیمە: لای پێشەوە، سەرەتا.

13 - 31. نائیب: جێ نشین. سەیل: لافاو.
13 - 32. کەنار: قەراغ. باز و کەوشەک: وەرزشی بازدان، یەکباز و سێباز.
13 - 33. سیراب: تێراو، بەو چیمەنە ئەڵێن کە ناوی زۆری درا بێ بۆ ئەوەی هەمیشە گەش و تێراو بێ. دائیرە: بازنە، دەوروبەر. جیلوەگاه: جێگای دەرکەوتن و ورشەدانەوە.
13 - 34. دەشتی فەقێکان: ئەختاییەک بوە لە سەر کارێز فەقێکان یاریانتێ دا کردوە.
13 - 35. واصیل بکە: بیگەیەنە.
13 - 36. غار: ئەشکەوت. ئەغیار: بێگانە. مور: مێروولە.
13 - 37. زار: لاواز. هیلال: مانگی یەکشەوە. نەحیف: لەڕ. خەیاڵ: خەیاڵ کردنەوە. خوگور: تێپەڕین.
13 - 38. ڕوخصەت: ڕێگەدان. تەوەققوف: وەستان، چاوەڕوانی. یەوم: ڕۆژ. نەفخ: فوکردن. صور: شاخێکە لە ڕۆژی قیامەت دا ئیسرافیلی فریشتەی مراندن و ژیانندنەوە دو جار فوی پێ دا ئەکا. بە فوی یەکەم هەمو زیندوان ئەمرێنێ و، بە فوی دوهەم هەمو مردوان زیندو ئەکاتەوە.
13 - 39. خوفیە: نهێنی. سەنگ دڵ: دڵ ڕەق وەکو بەرد.

14. دیوانی نالی: 199 - 201.

وشە گرانەکانی شیعرەکە:

14 - 1. جانم فیدای: گیانم بە قوربانی. سروە: شنە بای فێنک. بادەکەی سەحەر: بای بەیانی. پەیکی موستەعید: نامەبەری ئامادە. ڕاهی پڕ خەتەر: ڕێگەی پڕ مەترسی.
14 - 2. میروەحە: باوەشێن. جەمالی مەه ئاسا: جوانیی وەکو مانگ. دولبەر: دڵڕفێن، یار. شانەزەن: شانەکەر. کاکۆڵ: قژی بەردراوەی پشتی سەر. سیم: زیو.
14 - 3. جاڕوکەش: گەسکدەر. مەنازیل (کۆی مەنزیل): ماڵ، شوێنی حەوانەوەی کاروان. جانان: گیانەکان. خۆشەویستەکان. خەڵوەت: شوێنی تەنیایی، گۆشەگیریی سۆفییەکان. فەڕڕاش: ڕاخەری فەرش، خزمەتچی.
14 - 4. مالش: مشتوماڵ. دەمی خوابی صوبحدەم: کاتی نوستنی بەیانیان. قیرگۆنە: ڕەنگی ڕەشی وەکو قیر. چیهرەی قەمەر: ڕوی مانگ.
14 - 5. بارێ: جارێک، کەڕەتێک. شنە: شنەی با. ئەنگەبینی گەز: هەنگوین یا دۆشاوی گەزۆ. جونبوش: جموجوڵ، جۆش و خرۆش. ئاغوش: باوەش. نەی شەکەر: جۆرێکە لە قامیش شەکری لێ دەرئەهێنرێ.
14 - 6. وەقت: کات. تەواف: گەڕان و خولانەوە بە دەوری شتێک دا. عاریز: ڕوخسار. شنۆ: شنە. لەغزش: لەرینەوە، خلیسکان. توڕڕە: ئیمزای سوڵتانەکان، لێرەدا مەبەستی لولی ئەگریجەیە. کەمەر: ناوقەد.
14 - 7. وەزیدەن: وزان، هەڵکردنی با. سەمەر: بەری درەخت.
14 - 8. ئیحیاکون: زیندوکەرەوە. جەمیع: هەمو، گشت. نەباتات (کۆی نەبات): ڕوەک، گژوگیا. ڕەعنا: جوانیی بەژن. گوشا: کرانەوە. تەربییەت: پەروەردەکردن. قامەت: بەژن و باڵا. شەجەر: درەخت. ئەم دیوە بەیتە ڕەنگە لە نوسینەوەدا تێک چوبێ و بەمجۆرە بوبێ: "ڕەعنا گوشا لە تەربییەتت، قامەتی شەجەر".

14 - 9. ئابی حەیات: ئاوی ژیان، ئەو ئاوەی خدری زیندە خواردویەتیـەوە و، تـا هەتایـە نـامرێ و، هەر کەس لێ ی بخواتەوە تا هەتایە ئەژی. ئاتەشی ئەفسوردە: ئاگری ئـاڵۆزاو، تـەحریک: بزواندن، هان دان.

14 - 10. هیممەت: توانا نواندن. ئیجرای مەتلەبم: جێبەجێ کردنی داواکەم. بەرید: پۆسـتە. تەتـەر: ئەوەی نامە لە بەینی شوێنێک و شوێنێکی کەدا ئەهێنێ و ئەبا.

14 - 11. موڵکی شام: وڵاتی سوریا کە ناوەندەکەی دیمەشقە، ئەو سـەردەمە ویلایـەتێکی عوسـمانی بوە. سوی ئالیە: بۆ لای ئالیە. وەزعی ویلایەت: هەلومـەرجی وڵات. خەبـەر: دەنگوبـاس و هەواڵ.

14 - 12. زاهیرەن: بە رواڵەت. جیهەت: لا. ئەهلی شەهر: خەڵکی شار. سەر بە سەر: یەک بە یەک.

14 - 13. جا: شوێن. مەگلەعی خورشید: دەرکەوتنی رۆژ. خورشیدە: وشک.

14 - 14. هەوا: ئارەزو. زەلیل: کەساس. بوریان: برژاو. نار: ئاگر. پارە: پارچە.

14 - 15. جـوز: جگـە لـە. گـاه گـاه: جـار جـار. ئـەییام (کـۆی یـوم): رۆژان، رۆژگـار. وا بیـێ: بکرێتەوە.

14 - 16. شەخص: کەس. گڵکۆی پیاوچاک. ستمدیدە: زۆر لێ کراو. قوبور: گۆڕ. نەزەر: تەماشا.

14 - 17. غافڵ: بێ ئاگا. موریدان: لایەنگرانی تەریقەت. باخەبەر: ئاگادار.

14 - 18. حەوز: ئەستێڵ، مەبەستی حەوزی ناوی خانەقایە. تەغییر: گۆڕان. کەدەر: خەم، نـاوی لێـڵ و قوڕاو.

14 - 19. جۆبار: جۆگەی ئاو. چەشمەسار: سەرچاوە. بەصەر: چاو، مەبەستی بینابیە.

14 - 20. یارانی حوجرە: دۆست و هاورێکان کە لە ژوری فەقێکان دا کۆ ئەبونـەوە. مـەقام: جێگـا. تەهی سەقەر: ناخی دۆزەخ.

14 - 21. ئەووەڵین: یەکەمین، سەرەتا. بەرگ: جل و بەرگی مرۆڤ، گەڵای درەخت.

14 - 22. ساڵخوردە: بە ساڵ دا چو. خەم: چەماوە، کۆماوە. مەشـغوڵ: خـەریک. هەمـە جـا: هـەمو جێیەک. پا: پێ.

14 - 23. قسن: ئەو کۆمەڵە بەردەی کە لە دەوری گڵکۆی پیاوچاکاندائەنرێ. شاخی دار (راسـتەکەی شاخەیە): لقی دار.

14 - 24. چاوی بـێ غـەمان: مەبەسـتی ئەوەیـە چونکـە خـەم و خەفـەتیان نیـە، چاویـان وشـکە و فرمێسکی لێ نایەت. موشکیل: گران، زەحمەت. چەشمە: سەرچاوە، کانی. قەترە: دڵۆپە.

14 - 25. نیمە شەب: نیوەشەو. بێ نیزام: ناڕێکوپێک، بێ سەر و بەر. خەرمەن: خـەرمان. مـونعیم: بەخشندە، دانبدە. شەرەر: پریشکی ئاگر.

14 - 26. شین: شیوەن و گریان. شور: ئاژاوە.

14 - 27. فەزا: بۆشایی، چۆڵیی. بازیگـەه: یاریگـە. غـەریب: پـەنهانی، نادیـار. ئەلحـەزەر: وریابـە، بترسە.

14 - 28. کەژدوم: دوپشک. صەحرا: بیابان، مەبەستی دەشتە.

14 - 29. سـامانی حوجرەکـەت: کەلوپـەلی نـاو ژورەکـەی نـالی لـە خانەقاکـەی م. خالیـدا. تـاری عەنکەبوت: تەونی جاڵجاڵۆکە. حیجابی بیرون و دەر: پـەردەی بـەینی دەرەوە و نـاوەوەی ژورەکە.

14 - 30. صەدا: دەنگدانەوە. زایەڵە. فوغانی جوغد: ناڵـەی کونـدە پـەپو. شـەقامی مـور: ڕێچکـەی مێروله.

14 - 31. حەزرەت: گەورەی بەڕێز. بەم نەوعە: بەم جۆرە. قەت: هەرگیز.

14 - 32. سالم صیفەت: وەکو سالم. هەدەر: فیڕۆ.

14 - 33. ئەم موڵکە: مەبەستی وڵاتی بابانە. ئەزم: ئاسایش و ڕێکوپێکی. زەبت: ڕاگرتن. واریـس: میراتگر. مەبەستی گەڕانەوەی دەسەڵاتی یەکێ لە ڕۆڵەکانی بنەماڵەی بابانە. قەصـد: نیـاز. ئەم تەرەفە: ئەم لایە، سلێمانی و موڵکی بابان.

# پاشکۆکان

# پاشکۆی یەکەم

## 1. ڕێککەوتننامە

### 1. 1. پێکهاتنی ڕوسی – عوسمانی (11 ی حوزەیرانی 1724)

**پێشەکی:**

لە بەر ئەوەی مەحمود ئەصفەهانی داگیر کردوە، شای هاویشتە زیندانەوە، گیروگرفتی گەورە لە ئێران ڕوی داوە، تورکیا ناچار بوە هێزێ بنێرێ بۆ دەس بە سەراگرتنی ئەو شارانەی گرتنیانی بە پێویست ئەزانێ. قەیسەر، دۆستی بابی عالی، دەربەند و باکی و چەند شارێکی گرتوە. ئەو مەسەلەی سپاردنی ئەم شارانە و ولایەتەکانی گەیلان و مازندەران و دوسترابادی بە پێی ڕێککەوتنێ لە گەڵ تەهماسب تەئمین کردوە. قەیسەر و پاپ ڕێوشوێنێکیان داناوە کە یارمەتی تەهماسب بدرێ، وە ئەو تا دڵنیا ئەبێ لە وەی کە تەهماسب، ئەو شارانەی تورکیا داوایان نەکا بەو دەوڵەتە ئەسپێرێ، لە تەقەلا باشەکانی خۆی دریخی ناکا.

مارکی دوبنناک لە لایەن ڕوسیا و تورکیاوە بۆ کاری ناوبژی هەڵبژێردراوە.

**مادەی یەکەم:**

سنوری روسیا و تورکیا ئەبێ لەو شوێنەوە دەس پێ بکا بە ماوەی 22 سەعات سوارەڕێ لە دەربەندەوە بۆ ناوەوەی وشکایی. سنورەکە ئەبێ لەو کێڵەوە کە لەم شوێنە دا دائەنرێ تا کێڵێکی تر کە ئەکەوێتە سێیەکی ڕێگەی شەماخی بۆ دەریای خەزەر درێژ ئەبێتەوە. لە شوێنی دوهەمەوە ئەبێ هێڵێکی ڕاست تا دواوانی ڕوبارەکانی کورا و ئاراس بکێشرێ. ڕوسیا و تورکیا، هەردوکیان لە نزیکایی ئەم شوێنەی دواییانەوە مافی دروستکردنی قەڵایان هەیە، بەڵام جێگەکانیان ئەبێ 3 مەنزڵ لە سنورەوە دور بێ. کار پێ سپێردراوانی هەردو لایەنی پەیمانکار، لە گەڵ کار پێ سپێردراوێکی کە ئیمپراتۆری فەرانسە دای ئەنێ ئەرکی

دیاری کردنی سنور هەڵ ئەگرن. هەردو لای پەیمانکار ئەتوانن لە ناوچەکانی خۆیان دا قایمکاری بکەن و بنکەی لێ دابمەزرێنن. بەڵام نابێ ئەم قایمکارییانە ماوەی 3 سەعات سوارەڕێ لە سنور نزیکتر بن.

**مادەی دوەم:**

شەماخی کە ئەبێ بارەگای خان یا حاکمێکی سەر بە شیروان بێ، بە هی تورکیا ئەناسرێ، بەڵام نابێ قایمکاری لێ بکرێ یا بنکەی تورکی لێ دابنرێ. لە کاتی ڕودانی ئاژاوەدا ئەشێ سپای تورکی بۆ بنێردرێ.

**مادەی سێیەم:**

سنوری تورکیا و ئێران ئەبێ لە شوێنی تەواو بونی سنوری ڕوسیا و تورکیا، واتە لە دواوانی ڕوبارەکانی کورا و ئاراسەوە دەس پێ بکا. ئەبێ لەم شوێنەوە هێڵێ تا شوێنێکیتر کە ماوەی 1 سەعات سوارەڕێ کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری ئەردەبیلەوە بکێشرێ. هەمو ئەو ئەرزانەی ئەکەونە ڕۆژئاوای ئەم هێڵەوە، ئەکەونە ژێر دەسەڵاتی تورکیاوە. لەم شوێنەوە کە دورایییەکەی تا ڕۆژئاوای ئەردەبیل1 سەعات سوارەڕێیە، ئەبێ هێڵێکی ڕاست بۆ هەمەدان و لەوێشەوە بۆ کرماشان بکێشرێ.

**مادەی چوارەم:**

قەیسەر بە پێی ئەو ڕێککەوتنەی لە گەڵ تەهماسب کردویەتی بەڵێن ئەدا تا دڵنیا ئەبێ لە سپاردنی هەمو شارەکانی، کە لە مادەی سێیەمدا ناوبراوە، بە بابی عالی، تەقەلای باش ئەدا. بەڵام ئەگەر تەهماسب ئەچوە ژێر باری جێبەجێ کردنی ئەو ڕێککەوتنەوە، ڕوسیا و تورکیا هەردو بە جوتە بۆ گرتنی هەمو ئەو ئەرزانەی کە هی ئەوانە پێکەوە هەنگاو ئەنێن. دو دەوڵەتی گۆرین، پاشماوەی ئێران دوای ئەوەی ئاسایشی تێ گەڕایەوە، بە کەسێکی ئێرانی ئەسپێرن، کە زۆرتر شایستەیی فەرمانڕەوایی هەبێ. ئەو کەسە خاوەنی سەڵتەنەتی تەواو ئەبێ و سەربەخۆ ئەبێ.

**مادەی پێنجەم:**

ئەگەر تەهماسب، لە ئەنجامی ناوبژی قەیسەردا، بە ئارەزوی خۆی ئەو شارانەی لە مادەی سێیەم دا ناو براون بە تورکیا بسپێرێ، تورکیاش ئەو بە شای ئێران ئەناسێ و، هەمو جۆرە یارمەتییەکی ئەکا. قەیسەر بە پێی ڕێککەوتنەکەی خۆی لە گەڵ تەهماسب، یاریدەی کاریگەری ئەکا و هەمو گفتەکانی خۆی بەرامبەر ئەو جێبەجێ ئەکات، تا ئەو بە عینوانی واریسی قانونی بتوانێ ئیمپراتۆریی ئێران و ئەصفەهان لە دەستی مەحمودی داگیرکەر ڕزگار بکا. ئەگەر مەحمود، لەم بارەدا، هێرش بباتە سەر تورکیا، ڕوسیاش ئەکەوێتە کار بۆ یارمەتی دانی تا ئەو لە ئێران دەر بکرێ. تورکیا و ڕوسیا بە پێی ئەم پێکهاتنە بۆ دانانی تەهماسب لە سەر تەختی ئێران پێکەوە هەنگاو ئەنێن.

**مادەی شەشەم:**

ئەگەر تەهماسب لە سپاردنی ئەو شارانەی تورکیا داوایان ئەکات خۆی بوارد، ئەو وڵاتە و ڕوسیا لە پێشەوە ئەکەونە گرتنی بەشەکانی خۆیان. وە کاتێ لەو وڵاتەدا ئارامی و ئاسایشیان دامەزران، فەرمانڕەواییەکەی بە کەسێکی ئێرانی ئەسپێرن، کە بە تەواوی سەربەخۆ بێ. ئەو کەسەیش لە لایەن دو دەوڵەتی ناوبراوەوە لە سەر تەخت دائەنرێ و. گوێ نادرێتە هیچ نوێنەرێکی مەحمود و. هیچ جۆرە

پێکهاتنێکی لە گەڵ ناکرێ. ئەبێ ئەم رێککەوتنە بە بێ هیچ لێ دەرچونێ پێـرەوی بکـرێ بـۆ ئـەوەی ئاشـتی هەمیشەیی دابین بکرێ و، بەم جۆرە ئەو شارانەی دراون بە تورکیا و روسیا بە یەکجاری تا هەتایە لە دەستی ئەوان دا بمێنێتەوە و، ئێرانی لە نوێ دامەزرێنراو، بەهێز بێ. سوڵتان ئەم پێکهاتنـە، پـاش ئـەوەی لـە لایـەن قەیسەرەوە پەسەند کرا، ئەویشپەسەندی ئەدا.

سەرچاوە: لگهارت، لارنس: "انقراض سلسله صفویه"، ترجمه: مصطفی قلی عمـاد، انتشـارات مرواریـد، (تهران 1364 ه ش)، 269 - 270.

## 1. 2. پەیماننامەی زەهاو

بسم الله الرحمن الرحیم

لا حول و لا قوة الا بالله

لە پاشان:

لە بەر ئەوەی بە مەشیئەتی جەنابی ذو العرش المجید و ئیرادەی حـەزرەتی فعـالی مایریـد، ئینتیزامـی ئەسبابی عالەم و رتق و فتقی ئوموری بەنی ئادەم، بەند و بەستراوە بە تەوافوق و ئولفەتی سـوڵتانەکانی روی زەمین و خاقانەکانی هیدایەت قەرینەوە، کە مەزهەری ئایەتی کەریمی "الذین جاهـدوا" و میصـداقی "والموفـون بعهدهم اذا عاهدوا" ن.

لە ژێر باڵی حیمایەتی ئەوان دا مەمالیکی ئیسلامیە لە شـەڕوشـۆڕ مـەئمون و مـەمالیکی مـوئمینین بـە کەمالی ئەمن و سەلامەت مەرهونـە. بـە تایبـەتی بـە مـەدلولی "انـا جعلنـاک خلیفـه فـی الارض" پلـەی بـەرزی سەڵتەنەتی کوبرا و پایەی بڵندی خەلافەتی علیای ئێمەی مونتەهالغایاتی هەمو تەبەقەکان فەرموە، بە خۆشـیی خزمەت کردنی حرمین الشریفین "شرفها الله تعالی" ذاتی قودسـی صـیفاتی ئێمـەی شـەرەف و عیـزەت و، بـە موتابەعەتی سوننەتی سوننیەی حەزرەتی رسول الثقلـین "صـلی اللـه تعـالی علیـه و سـلم" دایـرەی دەوڵـەت و سەڵتەنەتی ئێمەی فراوان و بەرین کردوە، دەرونـی صـەفا مەشـحونی ئێمـەی بـە ئـەنواری موحیبـەتی ئـال و ئەصحاب موحەللا و موصەفا پێڕەوی رێی پڕ تۆفیقی ئەوانی کردۆتە هۆی رزگاری رۆژی جەزا.

ئێمـەی بـە فـەحوای "فـاحکم بـین النـاس بالعـدل" مـالیکی مـەمالیکی عـەدل و داد و بـە ئـەمری لازمولئیمتیسالی "جاهدوا فی الله حق جهاده" سالیکی مەسالیکی غەزا و جیهاد فەرموە و، فەحوای شـەریفی "ان تنصرو الله ینصرکم" بەردەوام لە بیری ئێمەی دایە و بزوتن بە پێی لوتفی خوداوەندی هەمیشە کار و پیشەی ئێمە بوە. شمشێری زەفەرقەرینی ئێمەی بۆ دەفعی کافران و موشریکان کردۆتە دیـواری ئاسـنین و لـە دەوری سنوری مەمالیکی موسلیمین دا کردۆتە قەڵای پتەو. رۆژانی دەوڵـەتی روزنـەفزونی ئێمـەی سـەبات و دەوام و، سیلسیلەی سەڵتەنەتی هومایونی ئێمەی ئەبەدولدەهر ئیستیقرار و ئیستیحکام دا "جل مالا یعد نعمانـه، قـدمت ذاته و اسمائه"

پاش پێشکەش کردنی تەسـلیماتی وافیـات و ئـەتحافی دەعـەواتی صـافیات بـە حـزوری - موصـافات زوهوری عالی حەزرەت، مەعالی مەنقەبەت، سامی روتبەت، گیرامی مەنزیلـەت، مەسـنەد نشـینی ئیقلیمـی ئێـران، حامی فارس و مازندەران، فەرماندەی موڵکی عەجەم (شاه صـەفی) - دام منظـورا بعنایـت ربـه الـوفی، انهـاء مسالمت انتها - کە:

نامەی خلت ختامەی ئێوەی بە هۆی عەینولئەعیان موحەممەد قولی - رزقت سلامته - گەیشتە عەتەبـەی عەلییەی گەردون ویقار و سدەی سوننیەی عالەمەداری ئێمە، خولاصەی فەحوای بەلاغەت ئیحتیوای ئەو ئایەتی ئولفەت عینوان "وجعل بینکم موده" ی تەفسیر و بەیان کریمەی مەرامـەت نیشـانی "و القیـت علیـک محبـه" ی

تەقریر و عەیان کردوە، لە بەر ئەوەی بە سیراتی موستەقیمی موصافات موهتەدی و بە شیمەی کەریمەی قودەما موقتەدی و تالیبی صولح و صەلاح و راغیبی فەوز و فەلاح بوی، عومدەتولخەواص وەلموقەڕڕەبین صارو - زید رشدە

- تان وەکیلی خۆتان نارد بو لە گەڵ - دەستوری ئەکرەم، موشیری ئەفخەم، نیزامولعالیم، نازیمو مە نازیولنومە م - موستەفا پاشا - ادام اللە اجلالە - کەوەزیری ئەعزەمی جەلیلولمیقداری ئێمە و سەردار وسپاسالاری ڕۆژهەڵاتە، لە زەهاو یەکتریان بینی و، لە بارەی ڕێکخستنی کاروباری صولح و عهودی جێبەجێ کردنی کێشەکانی سنور دوان و، بڕیاریان دا:

لە سنوری لای بەغداد و ئازەربایجان دو شوێن بە ناوی جەصان و بەدرە هی ئێمە بن. قەصەبەی مەندەلی تا دەرەتەنگ، کە سەرمیل بە سنوری دیاری کراوە، لە گەڵ دەشتەکانی بۆ ئێمە بێ، شاخەکەی نزیکی بۆ ئەولا بێ، میلباشی بۆتە سنور، دەرەتەنگ و دەرنە هی ئێمەن.

هۆزەکانی زیادین و هارونی لە ئێلی جاف هی ئەعلا حەزرەتی هومایونی ئێمەن و، پیرە و زەردویی یش بۆ لاکەی تر ماوەتەوە.

قەڵای زنجیرە کە بە لوتکەی شاخەوەیە وێران بکرێ، ئەو گوندانەش کەوتونەتە ڕۆژئاوای قەڵای وێرانکراوی ناوبراو بۆ ئێمە ئەمێنێتەوە و ئەو گوندانەش ئەکەونە ڕۆژهەڵاتی بۆ ئەولا ئەبن.

لە نزیکی شارەزور ئەو کێوەی کەوتۆتە ئەولای زەڵم هەرشوێنێکی بڕوانێ بە سەر قەڵای ناوبراودا لە لایەنی هومایونی ئێمەوە زەوت کراوە. قەڵای هەورامان لە گەڵ گوندەکانی دەوروبەری بۆ لایەنەکەی تر. گەردنەی چەقان دانراوە بە سنوری شارەزور. قزڵجە و دەوروبەری هی ئێمەن و مەریوان و دەوروبەری هی لایەنەکەی تر.

هەردولا بڕیاریان داوە قەڵای قوتور و ماکۆ لە سەر سنوری وان و، قەڵای مغازبرد لە لای قارس کاول بکەن.

لەبەر ئەوەی لەو نامەیەدا ڕەزامەندی خۆتان بە قەول و قەراری باس کراو، بەو جۆرەی ڕون کراوەتەوە، ڕاگەیاند بو وە بەڵێنت دابو بە دواوە ئەم مەراسیمی موعاهدە و موصافاتە ڕیعایەت و مواسات و موالاتی لازم صیانەت بکەی و، بە ئیمانی خۆت وەفا ئەکەیت و لە کەسر و خەلەفی خۆت لا ئەدەیت. وە داوات کرد بو کە بەڵگەی مۆرکراوی گەیشتوی ئێوە، لە لایەنی هومایونی ئێمەوە قوبوڵ بکرێ. جا لە بەر ئەوەی "انجاز الوعد من دلائل المجد" لە پێناوی ئاسایشی خەلایەق و عیباد و ئارامی مەمالیک و بیلاددا، ئەم صولحی موقەڕەر و صەلاح شمولە قوبوڵ کرا بەو مەرجەی تائیفەی قزڵباش دەس هەڵبگرن لەو مەحاڵ و شوێن و دەشت و ئەرزانەی کە بەشێکی مەمالیک و بیلادێ ئەژمێردرێ کە لە ناو سنوری دیاریکراوی ئەعلا حەزرەتی ئێمە دان و لە ژێر سایەی عەدالەتی پایەبەرزی ئێمەدان. بە پێ ی "الشی اذا ثبت ثبت بلوازمە" ئەو ئەرزانە ئیتر چ ئاوەدان بن یا چۆڵەوانی لە گەڵ تەوابیع و لەواحیقی دا لە دەستی تەصەڕوفی موەککیلانی بارەگای بەرز و موتەعەهیدانی دەرگای بڵندی ئێمە دان.

سەرەڕای ئەوانەش کە ناوبران. ئەبێ ئەوان دەستدرێژی ئەکەنە سەر قیلاع و بیقاع ونەواحی و صەحاری و بەراری و تیلال و جیبالێ کە لە ناو سنوری ئاخسقە، قارس، وان، شارەزور، بەغداد، بەصرا دان.

بە پێی شەرتە موعتەبەرە صەریحەکانی ئەو پەیماننامانەی لە زەمانی سەعادەت ئێقتیرانی ئەجدادی عیزامی ئێمە دا - انار اللە تعالی براهینهم - بۆ ئەسلافی ئێوە نێردراوە، وە بە مەدلولی قسەی: "الدینە النصیحە" ئەسافیل و ئەدانی کە لە ژێر دەستی حکومەتی ئێوە دان ئەبێ ڕێگە ئەدرێن. دەمدرێژی بکەنە سەر شەیخەینی زولنورەین هاوسەری پاکیزەی رسول الثقلین و گشت ئەصحابی هەڵبژاردە و ئیمامە موجتەهیدەکان

- رضوان الله تعالی علیهم اجمعین - حاشا. نیسان حاشا. رێگەی دەمدرێژی نەدرێن و، لێیان قەدەغە بکرێ و، بە هیچ جۆرێ رێ نەدرێن بۆ ئەوەی ئەم صوڵحە موقەرەرە. الی انتهاء القرون. سابیت و بەرقەرار بمێنێ.

مادەم لە لایەن ئێوەوە پێچەوانەی عەهد و میساق جوڵانی ناشایستە رو نەدا، لە قەرینولشەرەفی پاشاهانەی ئێمەشەوە. بە شێوەی باسکراو. شروت و قیود بەو جۆرەی نوسراون پێرەوی ئەکرێ. پەلاماری رەعییەت و مەملەکەتی ئێوە نادرێ. لە بەرامبەر ئەو بەڵێننامەیەی ناردراوی ئێوەدا. ئەم نامە هومایونیە پڕ لە راستگۆییە نوسرا. کە دوژمنایەتی لە ناوا نەمێنێ و. لە جاران زیاتر ریعایەتی مەراسیمی ئولفەت موافقەت بکرێ.

سەفیری مەئموری شەرەفی ماچکردنی بیساتی عیزەت ئینبیساتی شاهانەی ئێمەی موفتەخیر بو. دوای ئەوەی ئادابی ریسالەتی - کما هو حقه - بە جێ هێنا. بە ئیجازەی شاهانەی ئێمە رێگە درا بگەرێتەوە لاتان. هاورێ لە گەڵ ئیفتیخارولئەماجید وەلئەکاریم موحەمەد. نامە مەجدوهو. کە لە خزمەتگوزارانی دەرگا و مەئموری تەبلیغی نامەی هومایونی ئێمەیە. رەوانە کران.

صەلاح ئەندێشانی دین و دەوڵەت هەردەم مەزهەری ئیحسانی ملکی

مەننان بن. برب العباد و بالنبی واله الاماجد.

لە سەرەتای مانگی شەوالی ساڵی هەزارو چل و نۆی هیجری (کانونی

دوەمی 1639) دا نوسرا.

سەرچاوە: مشیر الدوله. میرزا سید جعفر مهندس باشی: "رساله تحقیقات سرحدیه". بە اهتمام محمد مشیری. انتشارات بنیاد فرهنگ ایران. (تهران 1348 ش). 74 - 81.

### 1. 3. رێککەوتننامەی کردان

لە نێوان نادر شاە و سوڵتان مەحمود خانی یەکەم

بە هۆی:

وەکیلی ئێران حەسەن عەلی خان

رسپێردراوی عوسمانی والیی بەغداد ئەحمەد پاشا

لە مانگی شەعبانی 1159ک (1746ز) دا بەستراوە

پێشەکی: دیاریکردنی سنوری هەردو مەملەکەت.

فەسڵی یەکەم: دەربارەی حاجییان.

فەسڵی دوەم: دانانی نوێنەرانی هەردو دەوڵەت لە دەرباری یەکتریدا.

فەسڵی سێیەم: دیلەکانی هەردو دەوڵەت.

فەسڵی پاشکۆ: دەربارەی سنوری هەردو مەملەکەت و هەندێ مەرج لە بارەی دین. چەن مەرجێ دەربارەی زائیران و رەعیەتەکانی ئێران لە عوسمانی دا - دانەوەی هەڵاتوان.

بنچینە:

ئەو رێککەوتنەی لە سەردەمی سوڵتان موراداخانی چوارەم دا لە نێوان هەردو دەوڵەت دا کراوە پێرەوی ئەکرێ و. ئەو سنورانەی لە رێککەوتنی گۆرین دا دیاری کراون بێ هیچ دەسکاری و گۆرینێ وەکو خۆیان ئەمێنن.

مەرج:

لێرە بە دواوە ئەبێ فیتنە خەوتو بێت و تیغی دوژمنایەتی لە کێلاندا بێ. ئەوەی شایەنی شانی هەردولا و چاکە و خێری هەردو دەوڵەت بێ. لە هەمو بوارێک دا جێبەجێ بکرێ و، هەرولا خۆیان لەو کارانە بپوێرن کە ئەبنە هۆی ناخۆشی و، پێچەوانەی تەبایی و هۆگرین.

فەسڵی یەکەم:

حاجیانی ئێرانی کە لە ڕێی بەغداد و شامەوە ئەچن بۆ بیت الله الحرام، ئەو والی و حاکم و ئەمیرحەجانەی لە سەر ڕێگایان دان. ئەبێ ئەوانە بە ئەمینی و سەلامەتی لە شوێنێکەوە بگەیەننە شوێنێکی تر. صیانەتی حاڵ و ڕیعایەتی ئەحوالیان بە لازم بزانن.

فەسڵی دوەم:

بۆ بەهێز کردنی دۆستایەتی و زیاد کردنی یەکێتی لە نێوانی هەردو دەوڵەت دا، هەر سێ ساڵ ئەبێ یەکێک لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە لە عوسمانی و یەکێک لە لایەنی عوسمانیەوە لە ئێران بێ، مەسرەفی ئەوانەش لە سەر هەردولا بێ.

فەسڵی سێیەم:

دیلەکانی هەردولا بەربدرێن. کڕین و فرۆشتنیان ڕەوانیە، هەر کەسێکیان ویستی بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی ڕێگەی لێ نەگیرێ.

فەسڵی پاشکۆ:

ئەو سنورەی لە سەردەمی سوڵتان مورادخان دا دیاری کراوە جێبەجێ بکرێ.

دەسەڵاتدارانی سنورەکان کارێک نەکەن پێچەوانەی دۆستیی هەردولا بێ. سەرەڕای ئەمانە، لە بەر ئەوەی خەڵکی ئێران وازیان هێناوە لەو ئەحواڵە ناشایستەیەی، لە سەردەمی صەفەویەت دا، دایان هێنا بو. وە لە ئوصولی عەقائیدا چونەتە سەر ڕێگەی ئەهلی سوننەت، بۆیە خولەفای ڕاشیدین بە خەیری مەرزی ئەبێ یاد بکەن و، لێرە بە دواوە لە گەڵ خەڵکی ئێران کە هاتوچۆی کەعبەی موکەڕەمە و مەدینەی مونەوەرە و سەرانسەری وڵاتانی ئیسلام ئەکەن، ئەبێ هەمان ڕەفتاریان لە گەڵ بکرێ لە گەڵ حاجییان و زائیرانی ڕۆم و وڵاتانی ئیسلامی تر ئەکرێ، وە بە ناوی دوروەمە یا بە ناوێکی ترەوە کە خیلافی شەرع و قانون بێ هیچیان لێ نەسێنرێ.

هەروەها ئەو زائیرانەی ئەچن بۆ عەتەباتی عالیات، مادەم مالولیتجارەیان پێ ئەبێ حاکم و موباشیرانی بەغداد داوای باجیان لێ نەکەن و، هەر کەسێ مالولیتجارەی پێ بو بە پێی قاعیدە و عادەتی دێرینە گومرگ بدا و لەوە زیاتری لێ داوا نەکرێ. لەولاش لە گەڵ تاجیر و ئەهالی ڕۆم بە هەمان شێوە ڕەفتار بکرێ.

لە دوای تاریخی ئەم پەیماننامەیەوە ئەگەر لە خەڵکی ئێران بۆ ڕۆم و لە خەڵکی ڕۆم بۆ ئێران هەڵاتن دالدە نەدرێن و، ئەگەر داوا کرانەوە بدرێنەوە دەست وەکیلەکانی هەردولا.

سەرچاوە: نوائی، دکتر عبدالحسین: "نادر شاه و بازماندگانش"، انتشارات زرین، (تهران 1368 ش)، 373 - 383.

### 1. 4. عەهدنامەی یەکەمی ئەرزڕۆم

مەبەست لە نوسینی ئەم نامە ناوازەیە لەم چەند ساڵەدا بە هۆی ڕودانی هەندێ عەواریزەوە لە نێوان هەردو دەوڵەتی بەرزی ئیسلام دا

پێوەندییەکانی صولح و صەفوەت و زەوابیتی دۆستی و ئولفەتی دێرین گۆڕا بە نیقار و خصومەت و بو بە هۆی جەنگ و کدورەت. بە موقتەزای جیهەتی جامیعەی ئیسلام و ڕازی نەبونی هەردولا بە ڕژانی خوێن و ڕودانی ئەو جۆرە قەوماو و غەوغایە. هەردو دەوڵەتی گەورە نارەزو و موافەقەتیان دەربڕیوە بۆ گێڕانەوەی ئاشتی و مەوەدەت و نوێ کردنەوەی دۆستی و مەحەبەت.

بە پێی فەرمانی هومایونی "ئەعلاحەزرەت، کەیهان حیشمەت، موڵک

بەخش، موڵک گیر، ئارایشی تاج و سەریر، خـدێوی زەمـین و زەمـان. جـەمالی ئیسـلام و موسـلیمین، جەلالی دنیا و دین، غیاسی حەق و یەقین، قارەمانی ئـاو و گـڵ، سـێبەری خـوای ڕاکێشـراو بـە سـەر هـەردو ئەرزدا، حافزی حەوزەی موسڵمانی، باسیتی بیساتی جیهانبانی، داوەری جەمشید جـاه، سـولەیمـان دەسـتگاه، ئەنجوم سپا، ئیسلام پەنا، زینـەت بەخشـی تـەختی کـەیـان، مـەلیکی ملـوکی جیهـان، تـاج بەخشـی کامـەران، شاهنشاهی مەمالیکی ئێران، خاقان کوڕی خاقان، غازی: فەتحعـەلی شـا، خلـد اللـه ملکـه و اقبالـه، وە حـوکمی مەئموریەتنامەی رەفیعەی غورەی غەڕای دەوڵەت و شەهریاری، دەوحەی عولیای شەوکەت و جیهانداری، مـالیکی ڕیقاب، گەردون جەناب، کەیوان هیمەت، جەرجیس فیتنەت، مولک فەزای، مولک ستای، ڕوکنـی ڕەکـین جـەلال، غوصنی ڕەتیب ئیقبال، شازادەی ئازادە، وەلیعەهدی دەوڵەتی عەلیەی ئێران عەباس میرزا، عز نصره، ئەم عەبدە مەملوک و چاکیرە جان نیسارەی بە وەکالەتنامە موباهی و، مەخصوص کردوە.

لە لایەن دەوڵەتی بەرزی عوسمانییشەوە، نامە و فەرمانی، ئەعلا حەزرەت، کەیوان مەنزیلەت، خۆری فەلـەکی شەهریاری، مانگی ئاسۆی تاجداری، پاشاهی ئیسلام پەنا، سوڵتانی هەردو ئەرز و هەردو، خـاقیمی حەرەمـەینـی شەریفەین، خاوەن شەوکەت و شەهامەت، سوڵتانی کوڕی سوڵتان، غازی: مەحمود خان، ابد الله ملکه و اقباله، نامـە بە جەنابی "عیزەت نیصاب، نەبالەت ئینتیساب، جەلالەت ئیکتیساب، تەواوکەری ئومـوری جمهـور بـە بیـری تیـژ، تەختکـەری قەواعیـدی ئومـور بـە ڕەئـی ڕاسـت، صـەدری ئەسـبەقی ئـەکرەم، والـی ولایـەتی ئەرزەنـەی ڕۆم، سەرعەسکەری لای ڕۆژهەڵات: موحەممەد ئەمین ڕەئوف پاشا، دامە مەجدوهو، عەتا و عینایەت کراوە.

ئەم عەبدە مەملوکە لە شاری نـاوبراو لـە گـەڵ سەرعەسـکەری نـاوبراو، پـاش ئـاڵوگۆڕی وەکالەتنامـە پیرۆزەکانیان بۆ ئەنجومەنی گفتوگۆ پێک هاتن، موصالەحەی پیرۆز بەم ئاینە تەرتیب و تەعیین کرا.

بنچینە:

پەیمانی ئاشتی کە لە 1159 دا بەستراوە، دەربارەی سنورەکانی کۆن و، مەرجەکانی پێشـو سـەبارەت بە حاجیان و بازرگانان و گێڕانـەوەی ڕاکـردوان و بـەردانی دیلـەکان و دانیشـتنی کەسـێکی دیـاریکراو لـە دەربارەکانی هەردو دەوڵەت دا بە تەواوی هەموی وەکو خۆیان ماون و کاریگەر و نرخداران و بە هیچ کلۆجێ خەلەلی تێ نەکەوتوە و، لە نێوان هەردو دەوڵـەتی بلنـدا مەرجـەکانی دۆسـتایەتی و پێویسـتیەکانی تـەبایی و خۆشەویستی هەمیشە ئەبێ کاری پێ بکرێ.

مەرج: شمشێری ئاژاوە و دوژمنایەتی لە کێلان دا ئەبێ، لە نێوان هەردو دەوڵەتی بەرزدا کارێ کە ببێتە هۆی ناخۆشی و ساردی و، پێچەوانەی ئاشتی و ئاسایش بێ ڕو نـەدات و، ئـەو شـوێنانەی لـە نـاو سـنوری کۆنی دەوڵەتی عوسمانی دا بون و لە کاتی جەنگ و بەر لەوە، کەوتونەتە دەس دەوڵەتی مەزنی ئێـران، لەوانـە قەڵا و زەوی و قەزا و قەصەبە و گوند، لە ڕۆژی ئیمزا کردنی ئەم ڕێککەوتننامە خێرەوە تا شەست ڕۆژی تـر، بە تەواوی ئەدرێنەوە دەوڵەتی عوسمانی.

بۆ ڕێز لێنانی ئەم ڕێکەوتنە خێرە گیراوەکانی هەردو لا، بێ ونکردن و

شاردنەوە بەر بدرێن و، پێویستییەکانی ڕێگەیان وەکو خواردەمەنی و شـتی تـر بـۆ دابـین بکـرێ و، بگەیەندرێنەوە سەر سنورەکانی هەردو دەوڵەت.

ماددەی یەکەم:

هەردو دەوڵـەتی بـەرز نـەبێ دەس وەرنەدەنـە کاروبـاری نـاوخۆی یەکتریـیەوە. لێـرە بـە دواوە خـۆ تێهەڵقورتان لە لای بەغداد و کوردستانەوە نەشیاوە، لەوانە مەلبەندەکانی سەر بە سەنجەقەکانی کوردستان، بـە هیچ بەهانە و لە هیچ ڕویەکەوە دەوڵەتی بەرزی ئێران نابێ ڕێ بە خۆ تێهەڵقورتان و، دەسـدرێژی و، پـەلامار و، داڵدەی موتەصەرڕیفەکانی پێشو و لە مەودوایان بدات.

لەو شوێنانەدا ناوبراون. لە بابەت ڕەسمیی ئاسایی گەرمیان و کوێستان و، هەر دەوایەکی تر. بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ناخۆشی نێوان هەردو دەوڵەت. دەبێ لە لایەن ئەمیر و وەلیعەهدی دەوڵەتی ئێران و وەزیری بەغدادەوە بە لا دا بخرێ.

ماددەی دوەم:

لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە لە مەرجە دێرینەکانە کە ڕەفتار لە گەڵ ئەهالی ئێران، ئەوانەی هاتوچۆی کەعبەی موکەڕەمە و مەدینەی مونەوەرە و گشت وڵاتانی ئیسلامی ئەکەن وەکو حاجی و زائیر و گشت ئەهالی وڵاتانی ئیسلامی ڕەفتار بکرێ و، بە ناوی دوروەمە یا بە ناوێکی ترەوە کە خیلافی قانونی شەرعی بێ شتێ داوا نەکرێ. هەروەها لە زائیرانی عەتەباتی عالییات مادەم کەلوپەلی فرۆشتەنیان پێ نەبێ داوای باج نەکرێ و. ئەگەر شتی فرۆشتەنیان پێ بێ مافی گومرگی بە پێی قاعیدەی کارپێکراو وەربگیرێ وە شتی زیاتر داوا نەکرێ و. لە لایەن ئێرانیشەوە، هەمان ڕەفتار لە گەڵ بازرگانان و ئەهالی عوسمانی بکرێ.

لەبەر ئەوە لێرە بە دواوە لە لایەن وەزیرانی گەورە و، میری حاجی و میری میرانی بەڕێز و، هەمو زابتان و حاکمانی عوسمانی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەرجە کۆنە دەرهەقی حاجیان و بازرگانانی ئێران نوسراوە ئەبێ دیققەت و ڕیعایەت بکرێ لە شامی شەریفەوە تا حەرەمینی موحتەرەمەین و لەوێوە بۆ شامی شەریف.

لە لایەن ئەمین صورە (پریاسکەدار: بەرپرسی کاروباری دارایی) ی هومایونیەوە چاودێری بکرێ کە پێچەوانەی مەرجەکان هیچیان لێ وەرنەگیرێ و. پشتیوانی ناوبراوان بکرێ و، ئەگەر لە ناو ئەوانەدا ناکۆکی ڕوی دا لە ژێر چاودێری امین صرەی هومایون و ناوبژی باوەڕ پێکراوێکی ئەوان لێی بکۆڵێتەوە و. ژنانی حەرەمی شاهنشاە و حەرەمەکانی شازادە مەزنەکان و هەمو گەورەکانی دەوڵەتی ئێران کە ئەچن بۆ حەجی شەریف و عەتەباتی عالیات بە پێی مەرتەبەی خۆیان حورمەت و ڕێزیان لێ بگیرێ.

هەروەها دەربارەی مافی گومرگی بازرگانانی ئێران بە هەمان بڕیار ڕەفتار بکرێ کە لە گەڵ بازرگانەکانی ئیسلامی تەبەعەی عوسمانی ڕەفتار ئەکرێ و. لە کەلوپەلی بازرگانی ئەوانە تەنیا یەکجار 4 قرۆش لە 100 قرۆش گومرگ وەربگیرێ. بە پێچەوانەی وەسڵێ کە پێیان ئەدرێ و مادەم کەلوپەلی بازرگانی نەچوتە دەستێکی تر لە جێگەیەکی تر سەر لە نوێ حوقوقی گومرگی داوا نەکرێ و. بازرگانەکانی ئێران کە چوپوقی شیراز - جۆرێکە لە تەختە - بۆ دارولسەعادە - مەبەستی ئیسلامبو لە - ئەهێنن، کڕین و فرۆشتنی پاوان نەکرێ. بە هەر کەسێک کە بیانەوێ بیفرۆشن. وە لە گەڵ بازرگان و ئەهالی هەردو دەوڵەت کە بۆ مەملەکەتی یەکتری هاموشۆ ئەکەن. بە پێی پێویستیەکانی جامیعەی ئیسلامییە ڕەفتاری دۆستانە بکرێ و لە هەمو زەرەر و ئازارێ پارێزراو بن.

ماددەی سێیەم:

ئەوەی لە ئێلەکانی حەیدەرانلو و سیپکی کە هەردو دەوڵەت لە سەری ناکۆک بون، وە ئەمڕۆ لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی دا دانیشتون، مادەم لە لای ئەوانن. ئەگەر دەستدرێژییان کردە سەر وڵاتی ئێران زەرەریان دا، سنورداران ئەبێ لە ڕێ پێ ئەدان و تەمێ کردنیان دا دیققەت بکەن. وە ئەگەر دەستیان هەڵنەگرت لە دەستدرێژی و زیانیی و کاربەدەستانی سنور ڕێگەیان لێ نەگرتن. ئەبێ دەوڵەتی بەرزی عوسمانی واز لە داڵدەدانیان بهێنێ.

وە ئەگەر ئەوانە بە ئارەزو و ویستی خۆیان بگەڕێنەوە بۆ ئێران، دەوڵەتی عوسمانی داڵدەیان نەدا و ڕێگەیان لێ نەگرێ. پاش ئەوەی کە گەڕانەوە بۆ ناو دەوڵەتی بەهییەی ئێران و، دوایی بێنەوە بۆ ناو خاکی عوسمانی بە هیچ جۆر نابێ داڵدە بدرێن و، وەربگیرێن.

لە حاڵەتێک دا کە ئەوانە بگەڕێنەوە ناو ئێران و ئەو کاتە لە سنوری دەوڵەتی عوسمانی تەجاوەز بکەن، زیان بگەیەنن، سنوردارانی دەوڵەتی بەهییەی ئێران لە رێ گرتن و دەستدرێژییان دیققەت ئەنوێنن.

ماددەی چوارەم:

بە پێی مەرجەکانی دێرین، نابێ هەڵاتوانی یەکتری داڵدە بدرێن و لەوانە عەشایەر و ئێلات، هەر کەسێکیان دوای ئەمە، لە دەوڵەتی بەرزی عوسمانیەوە بۆ دەوڵەتی گەورەی ئێران و، لە دەوڵەتی بەهییەی ئێرانەوە بۆ دەوڵەتی بەرزی عوسمانی برۆن، ئەبێ ئەو تێپەڕیوانە داڵدە نەدرێن.

ماددەی پێنجەم:

ئەو کەلوپەلی بازرگانییانەی ئێران کە لە دارولسەلتەنە و گشت ولایەتەکانی دەوڵەتی بەرزی عوسمانی دا، بە ئاگاداری شەرع و دەفتەر، بە هەڵگیراوی گل دراوەتەوە، لە رۆژی ئەم بەڵگەیەوە تا ماوەی شەست رۆژ، لە هەر جێیەک بێ، بە پێی ئەو دەفتەرە نوسراوانە و، بە ئاگاداری شەرع و باوەڕپێکراوی دەوڵەتی ئێران، بە خاوەنەکانی بدرێتەوە، جگە لە کەلوپەلی هەڵگیراو، ئەوەی لە کاتێ روداني دوژمنایەتی دا لە حاجیان و بازرگانان و خەڵکی تری ئێران کە لە وڵاتی عوسمانی دا بون، لە لایەن هەندێ وەزیر و کاربەدەستەوە بە زۆر سەندراوە، پاش ئیفادە و ئیزهاری دەوڵەتی گەورەی ئێران و فەرمانی لە دەوڵەتی بەرزی عوسمانیەوە بە عۆدەی وەکیلی ئەوان لە هەر جێیەک، دەربچێ، پاش ئیسپاتی شەرعی، وەربگیرێتەوە و بدرێتەوە.

ماددەی شەشەم:

لە مەمالیکی دەوڵەتی بەرزی عوسمانی دا لە خەڵکی وڵاتانی هەردولا کە ئەمرن، ئەگەر واریس و وەصی شەرعییان نەبو، مەئمورانی بەیتولمال، بە ئاگاداری شەرع دەفتەری کەلوپەلی کابرای مردو بگیرێ و، لە سجللی شەرع دا تەسجیل بکرێ و، هەمو ئەو کەلوپەلە وەکو خۆی لە جێگەیەکی ئەمین، تا ماوەی ساڵێک هەڵ بگیرێ تا واریس و وەکیلی شەرعی مردوەکە دێ، بە پێی تەسجیلی سجلە شەرعییەکە کەلەپورەکانی بدرێتێ و، رسومی ئاسایی و کرێی شوێنی هەڵگرتنی ئەو شتانە، لە ماوەی باسکراودا سوتا یا لە ناو چو داوای نەکرێ.

ئەگەر لە ماوەی باسکراودا واریس و وەصی نەگەیشتن، مەئمورەکانی بەیتولمال کەلوپەلی هەڵگیراو بە ئاگاداری باوەڕپێکراوی دەوڵەتی بەرزی ئێران ئەفرۆشن، نرخەکەی هەڵئەگرێ.

ماددەی حەوتەم:

بە پێی مەرجەکانی پێشو، بۆ پشتیوانی لە دۆستایەتی و خۆشەویستی، هەر 3 ساڵ یەک کەس (هەریەکەی لە دەوڵەتێکەوە) لە هەردولای بەرز جێگیر ئەبێ، وە لە هاووڵاتیانی هەردو دەوڵەتەوە، کە لە کاتی جەنگ دا بۆ هەردولا چون، بەرامبەر بەوان، بۆ رێزلێنانی ئەم پێکهاتنە خێرە، سزا نەدرێ.

دوایی:

ئەوەی لە بنچینەو مەرجەکان و ماددەکانی سەرەوەدا باس کران، بەو پێیەی نوسراوە کە بە گفتوگۆ لە سەری پێک هاتون، لە هەردولاوە قوبوڵ کراوە، دەربارەی ئیدیعای کەلوپەلی تالانی و شتی فەوتاو و دابینکردنی خەرجی جەنگ هەردولا "ئەوەی رۆیی رۆیی: مضی ما مضی" یان لە سەر وتوە و چاوپۆشییان لێ کردوە.

وە لە لایەنی هەردو دەوڵەتەوە بە پێی عادەت تەصدیقنامەکانیان بگۆڕنەوە و بە هۆی سەفیری وەسەت لە رۆژی ئەم بەڵگەیەوە تا ماوەی شەست رۆژ لە سەر سنوری هەردو دەوڵەت یەکتری ئەبینن و، ئەنێردرێ بۆ ئاستانەی هەردولا.

بەم پێیە بەستن و نوێ کردنەوەی ئەم موصالەحە خەیرییە لە ڕۆژی بەستنیەوە پێڕەویکراو و کاریگەر ئەبێ و لە هەمو لایەکەوە ئاگری ناخۆشی و دوژمنایەتی نامێنێ. هیچ لایەکیان دۆخ و جوڵانێ بە شیاو نەزانن کە پێچەوانەی دۆستی و پێچەوانەی ئەم مەرج و بەڵێنانە بێ.

وە لە لایەن وەکیلی موشار ئیلەیهی سەبارەت بە ڕێپێدانی تەواوی لە لایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە لە ڕۆژی یەکشەمەی 19 هەمی مانگی زیلقەعیدەی شەریفەی ساڵی 1238 (28 ی تەموزی 1823ز) دا بەڵگەی ئەم موصالەحەیە مۆر و ئیمزا کرا.

لەم لایەنەشەوە ئەم عەبدی مەملوکی دەوڵەتی بەرزی ئێرانە بە پێی ڕێپێدانی تەواوی خۆی بنچینە و مەرج و ماددەکانی گۆرینێ وەکو باس کراوە قوبوڵ کرد و، ئەم بەڵگەیە نوسراو لە گەڵ وەکیلی دەسەڵاتداری مشار الیە دا ئاڵوگۆڕ کرا.

بالخیر والسعادە والیمن والبرکە والحمد لله اولا واخرا وظاھرا وباطنا.

سەرچاوە: مشیر الدولە، میرزا سید جعفر مهندس باشی: "رسالە تحقیقات سرحدیە". بە اھتمام محمد مشیری، انتشارات بنیاد فرھنگ ایران، (تهران 1348 ش)، 18 - 22.

## 1 . 5. موعاهەدەنامەی دوەمی ئەرزڕۆم

ماددەی یەکەم:

هەردو دەوڵەتی موسوڵمان بە پەسەندکردنی ئەم پێکهاتنە، چاوپۆشێ لە هەمو داوا مالیەکانی خۆیان ئەکەن کە لە یەکترییان هەبو، بەڵام ئەم ڕێککەوتنە، ئەو مەرجانەی لە ماددەی چوارەم دا بو بە لاداخستنی کێشەکان دیاریکراوە، ناگۆڕێ.

ماددەی دوەم:

دەوڵەتی ئێران بەڵێن ئەدا کە دەس لە هەمو ئەرزە دەشتاییەکانی ولایەتی زەهاو، واتە ئەرزەکانی لای ڕۆژئاوای بۆ دەوڵەتی عوسمانی هەڵ بگرێ. دەوڵەتی عوسمانیش بەڵێن ئەدا دەس لە لای ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی زەهاو، واتە هەمو ئەرزە شاخاویەکانی ئەوێ لە گەڵ دەرەی کرند بۆ دەوڵەتی عوسمانی هەڵ بگرێ.

دەوڵەتی ئێران بە توندی بەڵێن ئەدا کە واز لە هەمو خواستەکانی خۆی بەرامبەر شار و ویلایەتی سلێمانی بهێنێ و، هیچ کاتێ دەس وەرنەداتە مافی خاوەنێتی دەوڵەتی عوسمانی کە لە ویلایەتی ناوبراودا هەیەتی.

دەوڵەتی عوسمانیش، بە توندی بەڵێن ئەدا کە شار و بەندەری موحەمەرە و جزیرەی ئەلخزر و لەنگەرگا و ئەرزەکانی لێواری ڕۆژهەڵاتی، واتە لای چەپی شەتولعەرەب کە بە دەس ئێلە ناسراوەکانی ئێرانەوەیە، بە موڵکایەتی لە دەس دەوڵەتی ئێران دا بێ. سەرەڕای ئەوەش، مافی ئەوەی ئەبێ کەشتی ئێرانی بە ئازادی تەواو لەو شوێنەوە کە ئەڕژێتە دەریاوە تا شوێنی یەکانگیری سنوری هەردولا لە ڕوباری ناوبراودا هاتوچۆ بکا.

ماددەی سێیەم:

هەردولای پەیمان بەستو، بەڵێن ئەدەن کە بەم پێکهاتنەی ئێستا، هەمو خواستەکانی پێشویان لەو ئەرزانەی دەستیان لێ هەڵگرتون، بە بێ دواکەوتن لە هەردولاوە موهەندیس و مەئمور دیاری ئەکرێن. بۆ ئەوەی بە پێی ماددەی پێشو، سنوری نێوان هەردو دەوڵەت دیاری بکەن.

ماددەی چوارەم:

هەردولا موافقن لە سەر هەڵبژاردنی دەسبەجێی نوێنەرانی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوە و بە لاداخستنی عادلانەی ئەو زەرەرانەی کە هەریەک لەم دولایە، لە زەمانی قبوڵی پێشنیاری دۆستانەوە، کە لە ڕێگەی دو

هێزی زلی ناوبراوەوە، تۆمار کراون و لە مانگی جیمادی یەکەمی 1261 دا، ئاگادار کراون، هەروەها لێکۆڵینە و بە لاداخستنی هەمو ئەو کێشانەی پەیوەندییان بە دانی قەرزی لەوەرگای ئەو ساڵانەی دوا کەوتون.

ماددەی پێنجەم:

دەوڵەتی عوسمانی گفت ئەدا شازادە پەنابراوەکانی ئێران لە بورسە دابنیشن و، ڕێگەیان نەدا ئەو شارە بە جێ بهێڵن یا پەیوەندی نهێنی لە گەڵ ئێران ببەستن. هەردو دەوڵەتی مەزن بەڵێن ئەدەن بە یەکتری، بە پێی پێکهاتنی پێشوی ئەرزڕۆم، گشت پەنابەرەکانی تر بدەنەوە دەس یەکتری.

ماددەی شەشەم:

بازرگانانی ئێرانی ڕەسمی گومرگی کەلوپەلی بازرگانی خۆیان بە پێی نرخی (ڕۆژ) بە پارە یا بە شت بە جۆرێ کە لە مادەی شەشەمی پەیماننامەی ئەرزڕۆمی 1238 دا لە بارەی بازرگانیەوە نوسراوە، ئەدەن. لەوەی لە مادەی ناوبراودا دیاری کراوە نابێ زیاتریان داوا لێ بکرێ.

ماددەی حەوتەم:

دەوڵەتی عوسمانی گفت ئەدا، وەکو لە پەیماننامەی پێشودا لە سەری ڕێک کەوتون، ئیمتیازاتێک کە پێویست بێ بدا بە زائیرانی ئێرانی تا بتوانن بە هێمنی تەواوەوە بێ ئەوەی توشی هیچ جۆرە ئازارێ ببن زیارەتی پیرۆزگاکانی ناو قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی کە ئەیەوێ پەیوەندی دۆستانە و یەکێتی لە نێوان هەردو دەوڵەتی موسوڵمان و هاوولاتیەکانیان دا بەهێزو پتەو بێ. بەڵێن ئەدا باشترین ڕێوشوێن دابنێ بۆ ئەوەی زائیرانی ئێرانی لە هەمو ئیمتازاتێ کە لە ناو مەمالیکی عوسمانی دا هەیانە ئەوانیش بەهرەمەند بن و، ئەبێ بپارێزرێن لە هەمو جۆرە زوڵم و دەستدرێژی و سوکایەتیەک چ لە کاروباری بازرگانی و چ لە کاروباری تردا.

سەرەڕای ئەوانەش دەوڵەتی عوسمانی گفت ئەدا باڵیۆزی هەڵبژێردراوی دەوڵەتی ئێران لە شارەکانی قەڵەمڕەوی عوسمانی دا، جگە لە مەکەی موکەڕەمە و مەدینەی مونەورە، لەو شوێنانەدا کە بونی ئەوان پێویستە، هۆی قازانجی بازرگانی یا بۆ پاراستنی بازرگانان و هاوولاتیانی ئێران بە ڕەسمی بناسن و، هەمو ئەو ئیمتیازە شەخسیانەی بە کونسوڵی دەوڵەتانی دۆستی تر دراون، ئەبێ بەوانیش بدرێ.

دەوڵەتی ئێرانیش لە لای خۆیەوە بەڵێن ئەدا لە بەرامبەر ئەمەدا هەمان ڕەفتار بکا، لە بارەی ئەو کۆنسوڵانەوە کە دەوڵەتی عوسمانی، لەو شوێنانەی ئێران، بە هەڵسەنگاندنی ئێران پێویستن. هەروەها بەرامبەر بازرگانانی عوسمانی و گشت هاوولاتیانی - کە سەردانی ئێران ئەکەن.

ماددەی هەشتەم:

هەردو دەوڵەتی مەزنی موسوڵمان بەڵێن بە یەکتری ئەدەن، بۆ ڕێ گرتن لە دزی و پێشگیری لە جەردەیی کە لە لایەن هۆز و کەسانی دانیشتوانی سنورەکانەوە ئەکرێ، ڕێوشوێنی پێویست دابنێن و جێبەجێی بکەن، وە بۆ ئەم مەبەستە کەسانی نیزامی لە شوێنانی موناسیب دابنێن. سەرەڕای ئەوەش بەڵێن ئەدەن، بەرامبەر هەمو جۆرە کارێکی دەستدرێژیکەرانە وەکو تالان، چەپاو، کوشتن کە لە سنورەکانیان دا بقەومێ، ئیقداماتی جیدی بکەن.

سەبارەت بەو ئێلانەی کە جێگای ناکۆکیین و، دیار نیە لە ژێر دەسەلاتی کام دەوڵەت دان، هەردو دەوڵەتی مەزن یەک جار بۆ هەمیشە ئازادی تەواوی هەڵبژاردنی شوێنی دانیشتنیان بە خۆیان ئەدا، تا لێرە بە دواوە هەمیشە لەوێ دا بژین. ئەو ئێلانەی تابیعییەتیان دیار نیە، ناچار ئەکرێن کە بگەڕێنەوە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتەی کە سەر بەو بون.

ماددەی نۆیەم:

هەمو بەنـدەکانی پێکهاتنـەکانی پێشـو، بـە تایبـەتی پێکهـاتنی 1238 (1823) ی ئـەرزڕۆم کـە لـەم پێکهاتنەدا دەسکاری نەکـراوە، یـا هـەڵنەوەشـێنراوەتەوە لێـرەدا سـەرلەنوێ تـەواوی هێـزی جێبـەجێ کرانـی ناوەڕۆکەکەی دوبارە ئەکرێتەوە، وەکو ئەوەی وشە بە وشە لەم پێکهاتنەدا گونجێنرا بێ.

هەردو دەوڵەتی مەزن پێکهاتن لە سەر ئەوەی پـاش گۆڕینـەوەی ئـەم ڕێککەوتنـە، هـەردوکیان قبـوڵ و ئیمزای بکەن و، لە ماوەی دو مانگ دا یا کەمتر، بەڵگە پەسەندکراوەکانی بدەن بە یەکتری.

16 جیمادی یەکەمی 1263 (1 ی نیسانی 1847ز)

ئیمزا: ئەنوەر ئەفەندی                                   میرزا تەقی خان

سەرچاوە: مشیر الدولە، میرزا سید جعفر مهندس باشی: "رسالە تحقیقات سرحدیە". بـە اهتمـام محمـد مشیری، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، (تهران 1348 ش)، 43 - 47.

# پاشکۆی دوەم

## 2. بەیت و چیرۆک

### 2. 1. بەیتی: کاکەمیر و کاکەشێخ

کاکەمیر و کاکەشێخ ئاغای مەرگەییان بون. مەیتەریان بۆ وەلاغی خۆیان قەت نەدەگرت. دەبو ژنی رەعیەتان بێ تەویلەی بماڵێ، ئەسپان ئاو بدا، کا و جۆیان بداتێ. ئەگەر خەلاس دەبو بچێتەوە، دەیانگرت، دەرکەیان لێ دەگرت، دەیان دەیان گا و دەیان ناردەوە. ژن و کچیان هیچ نەیەشت.

هەیدەر گۆران پیاوێکی ڕەشید بو. خەڵقی دێیەکەی پاکی وەخڕ کردەوە، پاکی قورعانی خوارد. کوتیان: "دەبێ قسەمان یەک بێ. سبحەینێ دەبێ بانگ ئێشتنیان بکەین بۆ ماڵە هەیدەر گۆرانێ. فەسڵی ئەهارێ."

کاکە میر و کاکە شێخ، دوازدە برا بون. بانگ ئێشتنیان کرن. هەر برایەکیان دە نێوانی دو کرمانج دا، دانا. نانیان هێنا. دایان دا، کوتیان: "بیسمیللا". دەستێکیش کوتی: "یا ئەڵڵا". هەر کەس جیرانی خۆی گرت، سەری هەر دوازدان لە مەجلیسیان بڕین. خوێن بە سەر نانی دا ڕژا. ڕایان کێشا ماڵە کاکە میر و کاکە شێخان. کچی وانیان فەساد کرد. بە تۆڵەی خۆیان، عیوەزیان کردەوە. هەیدەر گۆران هەمو مەخلوقەکەی هەڵگرت. پاکی بردە سەر خەمێ، پاکی دە خمێ دا. پاکی دەقوڕێ نان. ڕۆیین بۆ ئەستەمبوڵێ بۆ شکایەتی سوڵتانێ.

یای ئەستێ دەڵێ بە یای بەغدانێ:
"خوشکێ دڵم بە غلورە. چەندی بە غلورە!
تەماشای ئێختەرخانەی کاکان بکە، دە بەر بور و برەوانم کەوتوە جل و هەوسار و تورە
لە دیوەخانی کاکان هەڵگیراوە هەژدە موتەکا و دوازدە مافورە

ئەو ڕۆژانە خوشکی کاکان سەر بە قوریان ئەگەر لە سەر ماڵی کاکی مەیان هەڵگرت کەوڵ و قاقوم و سەمبورە
ئەوێ ڕۆژێ مل بە کوێن بای، ئەگەر لە داری جەنگەی لەشکر، لە دوی کاکێ مە دەبو جەمبورە بە جەمبور
ئێستا بێ ساحێب بوم، حدودی بێ نیشانە، بێ سەڵا بون خانمی دە ڕو سورە
چەندم کوت: کاکە مەچۆ ماڵە هەیدرێ، پیاوێکی غەیان، لە دۆستایەتی بە دورە
خەڵقی مەرگە! ئەمن چبکەم چبکرێنم؟
بۆ خۆم دەعوایەک بکەم، یا بە سوڵتانی ڕابگەیێنم؟
ئەمن خوێنی دوازدە برای خۆم لە کێ بستێنم؟"
یای بەغدان دەڵێ:
"یای ئەستییە!
خوشکێ ئەو هەڵا و هەرایەت بۆ چیە؟
جارێ بچین، جەنازەیان بێنینەوە، لە ماڵە هەیدەر گورانێ، تەسلیمیان بکەین بە گڵییە
ئەو دەمێ مەسڵەحەتی لێ دەکەین بزانین تەگبیرمان چیە؟"
چەندی نۆکەر و پێشخزمەتە ڕاوەستاوە
ئەوی ڕەعییەت لە وڵاتی مەرگێ دا ئەماوە.
چونە ماڵە هەیدەر گورانێ، جەنازەی برایان هەڵدەگرت و، دەیان هێناوە
بانگ لە سەر بانگیان لێ داوە
دەڵێ: "هیچ کەس وای لێ نەقەوماوە!
لە دوازدە برا یەک نەماوە
پاکی کفن و دفن کراوە
پاکی چو دە خاکێ نراوە
مەخلوق بۆ ماڵێ گەڕایەوە.
یای ئەستێ دەڵێ:
"خوشکێ یای بەغدانێ!
خەبەرێکم دەبیست، یەکەم دە دینە
غولوێک لە دەرکی ماڵە بابێ مەیە، نازانم ئەو غولوە نە شاییە و نە شینە!
کێ بو لە کارەکەرێ گوار زێڕینە
لەو لایەڕا دەچو بە گوشادی و بە پێکەنینە
لەو لاڕا دەهاتەوە بە گریان و ڕو پچڕینە
دەڵێ: خاتونینە!
وەرن هەمو وێکڕا بگرینە!
ئەو غولوە لە دەرکێ ماڵە با بمان بو، لێیان بو بە شینە
لە دیوەخانی کاکانیان هەڵگرتن نافتاوە و مەسینە
لە ئێختەرخانی کاکی مەیان دەرهێنا جوانولەی دە ئەوزینە

خاتونیان پیل دەگرت و دەریان دەهێنا
سواری جوانولەیان دەکردن بە قەرەپۆشی دە شینە
بە مردن و تالانیش قایل نەبون ژنیان بە ئیخسیر بردینە
جا مە تەگبیرێ چلۆن بکەین. خەبەرێ بدەین بە سولتانی نەمینە؟"
بای بەغدان دەلێ:
"خوشکێ چەندم کوت: کاکە مەچۆ بەری مەرگێ بە میوانی!
مەچۆ ماڵە هەیدەری دەگەڵ گۆرانی
فێڵی وانم گەلێک زۆرترن لە فێڵ و فەرەجی شەیتانی
قەت بوە، لە کنە خۆت. پیاوەتی بکەی. بدەیەوە نانی
قەت واش دەبێ، بێ روحمی و ئیمانی
سەری دوازدە برایان ببڕی لە سەر سفرەی دە نانی!
خولا بکا مەرگەییان ببینم هەر وەهایان بە سەرێ
رسقێی وانم بچێتە سەر پشتی ماکەرێ
سەد باری رەحمەتان بێ لە کوڕی میری دەگەڵ میرە دسکەرێ
بە تۆڵەی ئاغای خۆی هەژدەی دانە بەر خەنجەرێ
هەژدەی دەبیشی داوێتنە بەرێ
لە زەبری دەستان و لە خۆێنی جگەرێ
ئەوا لکەی شل دەبو لە خەنجەرێ
ئەحلەت لە بابی ئەو وەستایە بێ لە پاش کوڕە میرە دسکەرێ
ئەگەر سێ بزماران ئەدا لە گۆی خەنجەرێ
ئەگەر خەنجەر بزماری بێ، لە دەسکی نایەتە دەرێ
هەی رۆ، براڵە رۆ!
ئەو جێ ی کاکە میرو کاکە شێخ لێیان دەکرد شەقێن و شەرە گۆ
ئێستا مەرگەیی گوخۆرباب دەیکەنە برنجار و پەمۆ
کەس نیە جوتەی دە ئاغایان. جوتەی ناسکە سواران. هەڵگرێ و بیانباتەوە
موقبرەی کن بابێ خۆ"
"رەحمان" خۆش بێ. "ساحێب" رەحمەت لە تۆ.
سەرچاوە: ئۆسکارمان: "تحفەی مظفریە". ساخکردنەوە و هێنانەوەی بۆ سەر رێنوسی کوردی: هـێمن. لە بلاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری
کورد. بەغداد 1971. ل 685 - 689.

## 2 .2. دو چیرۆکی لاوچاکی: ئەز خولامی چاوی دە کلۆلێم!

خانی قەیغان

نوسینی: تۆفیق وەهبی

چەند ڕۆژێ لەمەوپێش نوێنەری سلێمانی ئەحمەد ئاغای حەماغا بۆ دیدەنی هاتبوە لام، لە کاتی یەک دواندنا و تەمان هاتە سەر "قەڵای وێسو ئاسکە".

وێرانەی قەڵایەکی کۆن هەیە لە ناو دەربەندی پژدەرا لە بەری چەپی ڕوباری زێی خوارو، واتە لە بەری دێی "سەرسیان"، پێ ی ئەڵێن "قەڵای وێسو ئاسکە". من بە منالی چیرۆکی "وێسو ئاسکە"م بیست بو، لە ئاغام پرسی کە ئەم چیرۆکە ئەزانێ یا نە؟ دیار بو ئاغا شتێکی وای لێ نەئەزانی. بەڵام لە گەڵ ئەوەدا کە وتەی دامێ کە بۆم بپرسێ، خۆی چیرۆکێکی تری بۆ گێڕامەوە کە دراوەتە پاڵ حاکمێکی بەبە. ئەحمەد ئاغا گێڕایەوە:

"لەشکری حاکمی بەبە، پیر بوداغی قەیغان لە گەڵ لەشکری دوژمندا لێکیان ئەدا. پیر بوداغ لە دورەوە ئەبینێ کە نۆکەرێکی لاوچاکی زۆر مەردانە شەڕئەکا، هەر شمشێرە ئەیوەشێنێ و هەر کەلەی دوژمنەو ئەکەوێ. پیری بوداغ خۆینەگەیێنێت ئەلایەوە، ئەبیە کە هەرچەندە شیر دائەوەشێنێ، ئەچریکێنێ:

- ئەز خولامی چاوی دە کلۆلێم!

پیر بوداغ هیچ دەنگ ناکا. بەڵام نۆکەرەکە کە ئەختێ لا ئەکاتەوە، پیر بوداغ ئەبینێ، دائەچڵەکێ و، دەس بەجێ ئەچریکێنێ:

- ئەز خولامی خانی قەیغانم!

شیرەکەی لە دەس ئەکەوێتە خوارەوە.

خان پێی ئەڵێ:

- شیرەکەت هەڵگرەوە، ئەوا کلۆلم تەڵاق دا و دام بە تۆ.

شەڕەکە بە پیرۆزی ی پیر بوداغ ئەبڕێتەوە... ئەگەڕێنەوەماڵەوە. خان نۆکەرەکە بانگ ئەکا و پێی ئەڵێ:

- وەکو پێم وتی: کلۆلم داوە بە تۆ و بیبە. بەڵام ئیتر نابێ تۆ نۆکەری من بی. بۆ من شەرمەسارییە. ئەبێ ببیتە گاوان. وە ژنەکەت هەمو ئێوارەیەک بێتە بەر ماڵی ئێمە و، بانگ بکا:

- ماڵی خانێ، ماڵ ئاوا، نانی گاوانێ!

لاوچاک کلۆڵ ئەباتە ماڵی خۆی و، لە سەر فەرموەی خان ئەبێ بە گاوان.

کلۆڵ ژنێکی زۆر جوان بو. ناوبانگی جوانیی ئەو لە هەمو وڵاتی بەبان و سۆران و موکریان دا بڵاو بوبوەوە. گشت کەسێ سەر سوڕما کە چۆن پیر بوداغ دەس لە ژنێکی وا ناسک و نازدار هەڵ ئەگرێ. کەس بڕوای بەوە نەئەکرد کە پیر بوداغ هەتا سەر کلۆڵی لە بیر بچێتەوە و دڵی بڕوایی بدا کە هی کەسێکی تر بێ.

ئەم قەوماوە، هەر کەسە بە چەشنێکی لێک ئەدایەوە.

ڕۆژێ ئاگا ئەدەن بە گاوان کە خان خواستی کوشتنی ئەوی هەیە. لاوچاک لە ترسانا کلۆڵ هەڵ ئەگرێ و ئەچن لە "کۆی ڕەبەنان" دا خۆیان ئەشارنەوە. پیر بوداغ کە ئەبینێ دیار نین، پیاو ئەنێرێ لە شوێنیان بگەڕێن. ئەیان دۆزنەوە و ئەیان هێننەوە. پیر بوداغ لاوچاک بانگ ئەکا، پێی ئەڵێ:

- خواگرتو لەبەر چی ترسایت و هەڵ هاتی؟ من لە پاداشتی ئەو ئازاییەدا کە کردت، بە خۆشیی خۆم کلۆلم دایتێ، جارێکی تر چۆن لێت ئەسێنمەوە؟ دڵنیابە، کلۆڵ هەر بۆ تۆ. وەکو پێم وتی، گاوانی خۆت بکە و لە گەڵ کلۆڵا پێکەوە بژێن."

چیرۆکەکەی ئەحمەد ئاغا لێرەدا بڕایەوە. لە ئاغام پرسی کە "قەیفان" کێ بوە، وتی کە، "قەیفان" دایکی پیر بوداغ بوە" ئینجا چیرۆکە بە ناوبانگەکەی "فەقێ ئەحمەد و قەیفان" م هاتەوە بیر. ئەم چیرۆکـە میسـتەر ریچیش 123 ساڵ لەمەو پێش، لە 4 ی تشرینی یەکەمی 1820 دا لە سلێمانی لە پیاوێکی پیری دارشـمانەیی بیستوە و، لە نامە زۆر بە بەهاکەی دا کە ناوی "گێڕانەوەی دانیشتوێک لە کوردستاندا" یە نوسیویەتیەوە، مـن کە لە ئەحمەد ئاغا جوێ بومەوە، نامەکەی میستەر ریچم دوبارە خوێندەوە و ئارەزوی کەسـێتی "قـەیفان" دای گرتم.

ئەوانەی لەم شوێنەدا پەیم پێ بردون. وا بزانم کەڵکێکی بچوکیان هەیە بۆ دێریک.

بەڵام لە پێش ئەوەدا کە ئەو سەرنجانەتان بخەمە پێش چـاو، وای بـە بـاش ئـەزانم کـە چیرۆکەکـەی "فەقێ ئەحمەد و قەیفان" تان لە نامەکەی میستەر ریچەوە بۆ وەربگێرم. گێڕانەوەکەی میستەر ریچ لـە ئێسـکی ئەو گێڕیارەی ئەمڕۆ لە ناو ئێمەدا بڵاوە، بە بەهاترە، چونکە 123 ساڵ لەمـەوپێش لـە پیرێکـی دارشـمانەیی بیستوە.

میستەر ریچ لە سلێمانی، لە سەردەمی مەحمود پاشای ئەورەحمان پاشای بەبەدا، لە ناو قـەوماوی رۆژی 4 ی تشرینی یەکەمی 1820 دا، ئەمەی تۆمار کردوە:

"ئەمڕۆ پیاوێ لە دارشمانەوە گەیشتە ئێرە. هۆمەر ئاغا کە ئەزانێ من بـە پەرۆشـم بـۆ شـتی سـەمەرە (عەجایەب)، دەس بەجێ چو بۆ چاو پێ کەوتنی. لە گەڵ ئەوەدا کـە بـەڵێنی دا کـە سـبەینێ ئـەی هێنـێ بـۆم، ئەم... پەیوەنـدە بـە بنچینـەی خانـەوادەی بەبـەوە. مرۆڤـی ئێسـتای ئـەو دێیـە (دێی دارشـمانە) گشـتیان لەوخانەوادەیەن و، فیزێکی تایبەتی ئـەدەن بـە خۆیـان. هەنـدێ لـەوان جـار جـار سـەر لـە سـلێمانی ئـەدەن. ئەورەحمان پاشای گەورە ئامۆزا کوێستانیەکانی خۆی بەرێز ئەگرت و، هەرچەند ئەهاتن، بە هەندێ دیاریـەوە ئەی ناردنەوە کە شیاوی بار و پێویستیان بێ. ئەوان لە بەردەم ئەورەحمان پاشا دا سەربەستیەکی گەورە، تـا تەنانەت بەرزێتیشیان ئەنواند. بە بۆنەی ئـەوەوە کـە بـەڵێ گـەورەترن. یـەکێ لەوانـە کـە بـە هەچـە هەچـەی کەرێکەوە ئەهات بۆ سلێمانی، ڕاست ئەچو بۆ لای پاشا. لە بەر دەمیا دائەنیشت پێش ئـەوە کـە پـێی بڵـێن: دانیشە، قەندەیەکی کۆنی چڵکنی دەرئەهێنا، تێی ئەکرد دای ئەگیرساند. چەنـد قـومێکی لـێ ئەکێشا و روی ئەکردە پاشا:

"ئێ، ئامۆزا، چۆنی؟"

لێرەوە میستر ریچ وا لە سەری ئەڕوا:

"با بێ ینەوە سەر چیرۆکەکەی من:

دو برا بون لە دارەشمانە، فەقێ ئەحمەد و خدر. ئەمانە لە دوژمنایەتیی بڵباسەکان کە مرۆڤی هـەرە توانـای پژدەر بون، زۆر لە ئازاردا بون. فەقێ ئەحمەد کە پیاوێکی زۆر ئازا و خۆناز بو، دێیەکەی خۆی بە جـێ هێشـت و، سوێندی خوارد کە هەرگیز نەگەڕێتەوە ئەوێ تاکو لە دارێکا نەبێ کە بتوانێ تۆڵەی خۆی بسێنێ.

لێی دا، چو بۆ ئەستەموڵ و، لەوێ چوە کەڵکی تورکەوە. وا ڕێ کەوت کە سوڵتان لەو دەمەدا لە جەنگ دا بو لە گەڵ فەرەنگ دا (خزمەکە وتی، لە گەڵ ئینگلیزدا).

لەو رۆژانەدا شەڕ بە تاکە پاڵەوان ئەکرا. پاڵەوانێک لە لەشکری فەرەنگەوە هاتبوە پێشەوە و، پێنج رۆژ بو لە سەر یەک پاڵەوانی تورکی لە ناو ئەبرد. فەقێ ئەحمەد خوایشتی کرد کە خۆی بـۆ ئـەم دژمنـە ئـاودارە دەربچێ. لە سەر ئەمە سوڵتان ناردی بە شوێنیا، لە پاش ئەوە کە لـێی پرسـی کـە کێیـە و کوێندەریـە و لـە دیمەن و دیداری خوشنود بو، هێشتی کە خوایشتەکەی بهێنێتە جێ. لە پێش هەمو شتێکا ئەسپێکی باشی دایە و پڕ چەکی کرد. فەقێ ئەحمەد چوە مەیدانەوە بۆ فەرەنگە ئازاکە و، دای بە زەوی دا، خەریک بو سەری بڕێ،

بەڵام بە واق وڕیپەوە دی کە دژمنە بەزیوەکەی کەنیشکێکە کە لێی ئەپاڕێتەوە، سەری نەبڕی، ئەبێ بە ژنی. فەقێ ئەحمەد کەنیشکەکەی بە پیرۆزی هێنایەوە لەشکرگای تورکەکان. لە سەر ئەمە سوڵتان لێی پرسی کە چی پاداشتێکی ئەوێ، ئەو فەرمانێکی ویست بۆ ئەوەی ببێ بە "بەگ" و دێی دارەشمانە و زەویەکانی ئەوێی پێ ببەخشرێ بۆ پشتاوپشت. دەسبەجێ فەرمانەکەی بۆ نوسرا. لێرەدا فەقێ ئەحمەد شەرم. یان ئەزانیی کردوە، ئەگەر هەمو کوردستانی بویستایە، ئەی درایە. فەقێ ئەحمەد بەم دەسکەوتە زۆر خوشنود و، بە پیرۆزی گەڕایەوە وڵاتی خۆی لە گەڵ ژنە تازەکەی دا. لەم ژنە دو کوڕی بو، "سلێمان بەبە" و"بوداغ کەیفان". ناوی کەنیە ئینگلیزەکە "کەیفان" بو. فەقێ ئەحمەد ئیتر لە گەڵ بڵباسەکانا کەوتە شەڕوشۆڕەوە و، گەلێ بەیدەسی کردن. ڕۆژێ لە ڕۆژان کە خۆی لە ماڵ نەبو، چوار سەد پێنج سەد سوارێ لە بڵباسەکان دایان بە سەریانا بۆ تاڵان. کەیفان بە تەنیا لێیان ڕاپەڕی، گەلێکی لێ کوشتن و هەڵی بڕین. کەیفان لە پاش ئەوە ئینجا مرۆڤی دارشمانەی کۆکردەوە و، پێی وتن:

- ئەی مرۆڤی دارشمانە، فەقێ ئەحمەد گیانی منی بەخشی لە کاتێکا کە لە ژێر چنگیا بوم. من هەر ئەوەم ئەویست و چاوەڕوانی ئەوە بوم کە ئەو چاکیەی بدەمەوە. وا ئەمڕۆ دامەوە. ئێستا هەرچیەکتان چاو پێ کەوت، بۆ فەقێ ئەحمەدی بگێڕنەوە و، پێی بڵێن کەوا من ڕۆیشتم بۆ جێیە کە هەرگیز چاوی بە من ناکەوێتەوە و، پێیشی بڵێن کە نامەوێ شوێنم بکەوێ، چونکە بێ سود ئەبێ و، نازاریشی ئەدەم کە، خوا ئەی زانێ، بە خوایشتی خۆم نامەوێ ببمە هۆی ئەوە.

سەری ئەسپەکەی وەرگێڕا و، لە پاش چەند دەقیقەیەک لە چاو ون بو.

فەقێ ئەحمەد کە گەڕایەوە، لەم قەوماوە سەری سوڕما و، بە لە دەس چونی کەیفانی خۆشەویست زۆر خەفەتبار بو، خۆی پێ ڕانەگیرا، بڕیاری دا، شوێنی بکەوێ بە پێچەوانەی ئەهێشتنەکەی ئەو.

لە دۆڵی "خدران" دا کە لە پژدەرە (وەها) توشی بو و، تکای لێ کرد کە بگەڕێتەوە. کەیفان وتی:

- ناکرێ، تۆ موسوڵمانی، من فەرەنگم، ئەچمەوە وڵاتی باوکم، بە دروا! نزیکم مەکەوە، ئەگەنا نازارت ئەدەم.

فەقێ ئەحمەدی شەیدا دەسی هەڵ نەگرت لە پاڕانەوە، کەیفان نێزەکەی هەڵ بڕی و کردی بە ناو شانیا. فەقێ ئەحمەد کەوت و کەیفان دایە چوار ناڵە، بەڵام هێشتا دور نەکەوت بووەوە، بیری کردەوە کە پاداشتێکی بێ فەڕی دابوەوە بەرامبەر بەو بەخشینەی ئەو لە کاتێکا کە گیانی لە ژێر چنگیا بو، ئەو هەرچەندە موسوڵمانیش بو، لە گەڵ ئەمەشا باوکی منداڵەکانی بو. لە سەر ئەمە نەرم بووەوە و گەڕایەوە، دی کە هێشتا هەناسەی تیایە، مەرهەمێکی بە کاری دایە سەر برینەکەی بۆ ئەوە کە ترکزەی (خەتەر) لێ دور بخاتەوە هەتا فریای پێ ئەگا کە زۆر دور نەبو. ئینجا بە جێ ی هێشتەوە.

فەقێ ئەحمەدی دڵداری سوتاو و مێرد، کە هەر برینەکەی ساڕێژ بو، بێ ئەوە کە شەرمەسار بێ لەو کردەوە ڕەقە کە لە دەس ئەوی دی بو، لە سەر بڕیارەکەی خۆی ڕۆی، دیسانەوە شوێنی کەوتەوە، هەتا گەیشتە فەرەنگستان. لەوێ ڕۆژئاوایەک گەیشتە شارێکی گەورە، دەنگی شاییەکی بەر گوێ کەوت. مۆزیقەیان لێ ئەدا، شارەکە چراخان کرا بو و، هەمو پێویستیەکی شایی ڕێک خرا بو.

فەقێ ئەحمەد کە ئەی ئەزانی چی بکا، یان لە کوێ شەو ڕابوێرێ، بڕیاری دا کە خۆی بدا بە دەم هەڵکەوتەوە و، لە هەر کوێیە ئەسپەکەی بوەستێ، لەوێ بمێنێتەوە. بەم چەشنە جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کرد و، ئەسپەکەش لە بەر دەرگای ماڵی پیرێژنێکا وەستا. پیرێژن لە پێشا هەندێ دژواریی پیشان دا، بەڵام دوایی بەرەوایی دا بیکا بە میوانی. فەقێ ئەحمەد بۆنەی ئەم شایی و زەماوەندەی لە پیرێژن پرسی. پیرێژن تێی گەیاند کە کەنیێ قەراڵ چو بۆ شەڕی موسوڵمانەکان، ئەمە چەند ساڵێکە شوێنی نەبو، ئەوەتا ئێستا

گەڕاوەتەوە و، لە ئامۆزاکەی مارە ئەکەن. فەقێ ئەحمەد تکای کرد کە پیرێـژن کـارێکی وەهـا بکـا کـە خـۆی بتوانێ بچێتە ئەم شاییە بۆ سەیر کردن. پیرێژن دوایی بەرەوا بو. بـەڵام بـە گـرەوی کـە ئـەو بـەرگی ژنـان بپۆشێ. فەقێ ئەحمەد چو بۆ شاییەکە و، لەوێ خۆی کوتایـە جێیەکـەوە کـە ئامـادە بـێ لـە نوخشـە ژوانـی کەیفانی جوان و دەسگیرانەکەیدا. بانو هاتە بەرەوە. زاوای دڵڕەق لە پڕێکا شەپازلەیەکی کێشا بە بن گـوێی دا و پێی وت:

- تۆ دیل بوی لە ناو موسوڵمانەکانا. تـۆ ئـابڕوت تکێنـراوە. هێشـتا ئـەوێری لـە بـەردەم منـا خـۆت دەرخەی؟

بوکێ لە داخانا بە زمانی کوردی کە چاکی ئەزانی هاواری کرد:

- فەقێ ئەحمەد. خۆزگە لێرە بویتایە!

کەسەی هاوار بۆ براو دەسبەجێ پڕی دا بە ناوا. زاوای سەربڕی و بوکێی ڕفانـد بـۆ ئەسـتەموڵ. لـە ئەستەموڵ سوڵتان سەرباری ئەوەی پێشەوە هی تریشی پێ بەخشی.

فەقێ ئەحمەد و ژنە ئێستا خوایشـتکارەکەی پێکـەوە گەڕانـەوە پـژدەر. لـەوێ پێکـەوە هـەتا سـەر بەختیارانە ژیان. فەقێ ئەحمەد لە پێش مردنیا هەمو هەرێمی پژدەر و مەرگـە و مـاوەتی خسـت بـوە ژێـر دەس. لە پاش ئەو کوڕی گەورەی، سلێمان بەبە چوە جێی. سلێمان بەبـە کـە بـاپیرە گـەورەی میرەکـانی ئێستای سلێمانیە، ئەوپارچانەی تری کوردستانی داگیر کرد کـە لـە ژێـر دەسـیادایە. کـوڕی دوەم بـوداغ کەیفان بێ فرزەند مرد."

میستەر ریچ لە ژێر ئەم چیرۆکەدا وا ئەنوسێ:

"پاشا لەوە پێش هەندێ پارچەی ئەم چیرۆکەی بە تێکەڵ و پێکەڵی بۆ گێـڕا بومـەوە. وە بـە چونـەوە ئەسەر ئەوروپایەتی، لە کەیفانەوە. ئەی نازی. وە ئەی وت کە ئەشێ خزمی من بێ. بـەڵام قەوماوەکـەی ئەدایـە پاڵ باپیری سلێمان بەبە.

بانوەکانی خانەوادەش هەر ئەو چیرۆکەیان بۆ میسز ریچ گێڕاوەتەوە.

لەم چیرۆکەدا، کە هەمو وشەکانی چیرۆک بێژەکەم بە کـار هێنـاوە و، هـیچم لـێ پتـر نـەکردوەو نـەم گۆڕیوە، گەلێ گیانی لاوچاکی هەیە کە رۆژهەڵاتیەکان بـە تـەواوی بێگانـەن لـێی. هـیچ نـەبێ لـەم رۆژانـەدا. قەوماوەکان بە تەواوی بێگانەن بە شێواز و سروشتی هەڵ بـەسـتنیان و. وا دیـارە کـە لـە هەنـدێ قـەوماوی راستەقینەوە هەڵ گیرا بێ سەر بە سەردەمێک بێ زۆر کۆنتر لەو سەردەمەی چیرۆکبێژ نیشـانی کـرد. ئەشـێ کە ئەمە بچێتەوە سەر هەندێ چیرۆکی لاوچاکی سەردەمی مرۆڤی چەلیپا. دەمـی سـەلاحەدین کـە سـوڵتانێکی کورد بو و، لەوێوە گێڕیارەکە وەرگێڕانی لە لایەن چیرۆکبێژی ئەزانی کوردەوە کە بە سروشت نای داتـە پـاڵ هیچ سوڵتانێ بێجگە لە سوڵتانی ئەستەموڵ و ئەیەوێ بیکا بە چیرۆکێکی سەمەرە بۆ بـاپیرانی راسـتەوخۆی سلێمان بەبەی قارەمانی خۆشەویستیان کە ژیانەکەی چاک دیارە و، سازکارە بۆ وەرگرتنـی تـێ نـاخنراوێکی وەها. ئەتوانم لەم چەشنە گەلێ وێنەی تێکەڵ وپێکـەڵی دێریـک و سـەردەم پێشـان بـدەم کـە گێڕەرەوەکـانی رۆژهەڵات ئەی کەن."

*

گشت نەتەوەیەک ئەم چەشنە گێڕیارە لاوچاکیانە و جوامێریانەیان هەیە. پێیانەوە ئـەنازن. لـە بیریـان دەرناکەن. خستویانەتە سەر کاغەز. من ئەوا هۆی ژیانم دا بە چیرۆکەکەی "لاوچـاک و کڵـۆڵ" یـش. خسـتمە سەر کاغەز. بەڵام بە پێویستم زانی کە خاتری زانسـتیش بگـرم. وە ئەوەنـدەی لێـرەدا ئـەکرێ. بـە تـەرازوی دێریک و زانیار هەڵیان کێشم. ئەم دەس لێ دانەی من نابێ لە بەهای ئـەم چیرۆکانـە و هاوچەشـنەکانی کـەم

بکاتەوە. ئەمانە پێوە نازراوی نەتەوەییمانن. ئەبێ ئەم سەربوردانە قەوما بن، بەڵام وەکو میستەر ڕیچ ئەڵێ: ئێریک و سەردەمەکانیان تێکەڵ و پێکەڵ کرا بن.

*

تۆفیق وەهبی درێژە بە باسەکە ئەدا و، لە سەر بنچینەی لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانیی ناوەکانی "بوداق" و"قەیفان" ی ناو ئەم دو چیرۆکە، هەوڵی دۆزینەوەی سەردەمەکانیان ئەدا. لە بەر ئەوەی لە سنوری ئەم پاشکۆیە بە دەر بون، ئەم نوسیوە.

سەرچاوە: تۆفیق وەهبی: "ئەز خولامی چاوی ئە کلۆڵیم - خانی قەیفان"، دەنگی گێتی تازە، ساڵی 1، بەرگی 5، شوباتی 1944.

## 2 .3.چیرۆکی: دوانزە سوارەی مەریوان

نوسینی: پیرەمێرد

مناڵ بوم هەرچەندە بەیتی دوانزە سوارەیان بۆ ئەکردم، بەو مناڵیە خۆم بە پاڵەوانێک ئەزانی، کە ئاراغا ئەی گوت: "کورگەل فیدای هەڵمەتی شێرانەتان بم، ڕۆژێکەو ئەمڕۆ، ڕوی خاکەکەتان سپی کەن!" منیش بە خەیاڵ لنگم ئەدایێ. ئێجگار کە ئەیان خوێندەوە:

جوامێر ئاغای ڕەنگینە     پڵنگی چنگ بە خوێنە

من ئەوەندەی تر شەیدای ئەبوم. ئینجا زۆر ئاواتەخواز بوم کە بۆم هەڵکەوێ ئەم دوانزە سوارە بنوسمەوە، بەڵام هیچ بەڵگە و بناغەیەکم دەس نەکەوت، منیش ڕاست و ڕەوان باوکم چۆن لە باپیرمی بیستوە و، منیش چۆن لە باوکم بیستوە، وا نوسیمەوە. ئەمەش ڕاستیەکەیەتی..

ئۆف شاعیرەکانی پێشین!

پیرەمێرد

هونەری سەلیم بەگ لە دیوانی شاه غازی دا شاری قەڵاچوالانە. ئەحمەد پاشای گەورە کە مەشهورە بە: "شاهی غازی ئەحمەدی لەشکرشکێن" حوکمڕانە، دەور دەوری شێر و قەڵغانە، سوارەی بەبە بە ڕاستی مەردی مەردانە.

ئێواران لە کەنار چەمی قەڵاچوالان دیوان دەگێڕدرێ، پیاوماقوڵ و نۆکەر و ئاغالەر و چەکمەڕەق کۆمەڵ کۆمەڵ لەو گوێ ئاوە دائەنیشن، تێ ئەفکرن وا پیاوێکی بە شکۆ و سیما، ڕیشێکی تەنک و سپی، ڕوخسارێکی ئەسمەر، بە وێ دا دێ و لۆزمندەرێکی کەڵەگەتی چوارشانە لە پشتیەوە، تازە خەتی داوە، چاوی وەک ئەستێرەی سیوەیل ئەدرەوشێتەوە. کە دەگەنە داوێنی دیوان بە شەرمەوە ئەپرسن: "پاشا لە کوێیە؟ سەلیم بەگی مامی لە کوێیە؟" کە ئەحمەد پاشای پێشان ئەدەن، لە دورەوە کڕنوشێکی بەندەگی ئەکێشێ. ئەوسا ئەحمەد بەگ ئەپرسێ: "ئەوە کێ یە؟"

خۆی دێتە زوبان ئەڵێ: "شاهم من مەلا هەمزەی ئەورغانیم، ئەمەش بەندەزادەت: ئەکرەمە. سەودای دلاوەریی و جەنگجۆیی لە کەللەدایە، لە کابول و زابولەوە ناوبانگی زەبروزەنگی سەلیم بەگی بیستوە و، بەڵێنی بە دڵی خۆی داوە ئەگەر سەلیم بەگ بتوانێ شیرەکەی هەڵ سورێنێ و، دای وەشێنێ، وا نۆکەری سەلیم بەگ ئەکات"

ئەحمەد پاشا کە سەرنج ئەدا ئەم کورە ئەرە دێوێکە و شیرەکەشی دیوە مشاکێکە.. ئەڵێ: "پەنا بەخوا! دا بزانن سەلیم بەگی مامم لە کوێیە. بانگی بکەن، بڵێن میوانی هاتوە"

ئینجا ئەحمەد پاشا ڕو ئەکاتە مەلا هەمزە و، زۆری لێ ئەکا، ئەڵێ:

"دانیشە!". ئەویش بە زۆر بە چۆکا دێ و دادەنیشێ. بەڵام ئەکرەم بە پێوە رادەوەستێ. لە پاش ئەختێ سەلیم بەگ دێت. پاشا پێی ئەڵێ: "میوانت هاتوە!" ئەویش دەستی مەلا هەمزە ماچ ئەکا و، دەست ئەکاتە ملی ئەکرەم. لەم کاتەدا لە شیرەکەی ئەکرەم ورد ئەبێتەوە. زۆر جوانی دێتە پێش چاو، دەستور ئەخوازێ کە سەیری بکا. لە کالانی دەرئەکێشێ. ئەم شان و بەو شانا هەڵی ئەسورێنێ. لە پاشا هەڵی ئەدا بە ئاسمانا.

ئینجا کە ئەحمەد پاشا بینی کە ئەو شیرەی دلاوەرێکی ئەوغانی پێوەی دەنازێ و، ئەی وت کەس ناتوانێ شیری من راوەشێنێ. سەلیم بەگ هەر لە خۆیەوە لە قەدی هەڵ کێشا و وەک فرفرۆکە یاری پێ کرد. کە ئەحمەد پاشا ئەمەی دی وەک گوڵ گەشایەوە. ئەکرەمیش زۆر بە خۆشی و دڵخۆشییەوە، کە توشی ئاغای خۆی هاتوە، دەستی سەلیم بەگی ماچ کرد. سەلیم بەگیش روی کردە پاشا و وتی:

"ئەمانە ئیتر میوانی منن. بەڵکو ئەکرەم دەستە برای منە. ئەیان بەمە لای خۆم".

پاشا وتی: "زۆر باشە".

پاش ئەم هەیتوهوتە، کوێخای بە کراوا و، کوێخای خورماڵ کە گوڵەعنبەرە، دادیان لە زۆریی بەراز کرد کە هیچیان بۆ نەهێشتونەوە و، کشتوکاڵیان نەماوە و، هەمو ساڵێک پاشا خۆی بۆ راو تەشریفی هێناوەتە شارەزور، راوە بەرازی کردوە، بەوە بەرازمان لە کوڵ کەوتوە. بەڵام ئەمساڵ کە تەشریفی نەهاتوە، بەراز ئەمان خۆن! پاشاش فەرموی: "کوا شیروەشێنەکان؟ هونەر ئەمە نیە لە بەر دەمی ئێمەدا شیر هەڵ بسورێنن. هونەر ئەوەیە ئەو شیرە بۆ پارێزگاری دێهاتەکان بوەشێنرێ".

سەلیم بەگ دەسبەجێ تێ گەیشت کەوا پاشا لە گەڵ ئەوێتی، وتی: "توانج پیشەی پاشاهان نیە و، لە بەراز ترسانیش پیشەی ئێمە نیە!".

سەلیم بەگ رو ئەکاتە کوێخا و ئەڵێ: "ئامادە بە تۆ لە پێشەوە برۆ. سبەی ئێوارە خوا یار بێ لای تۆ میوانین"

بەو توندیەوە لە دیوان هەڵ دەستێ و ئەچێتە ماڵی خۆی و، ئەکرەمیش بە دوایەوە. خۆیان دو کەس و ئەنێرن: جوامێر ئاغای رەنگینە و، ئاغاڵ ئاغای سیوەیلی و، زەینەڵ بەگی مەسرەف و، مەحمود بەگی قەدیمی باش چاوەش و، داراغای میرەدێ و، فەرامورزی زەنگەنەو، سوار ئاغای بڵباس و، مەمەند ئاغای میراودەلی و، شاپور ئاغای بەختیاری و، زولاڵ ئاغای مەرگەیی و، میران بەگی وەلەد بەگی و، چەلەبی قەدیمی هەموەند کە چەلەبی باوکی شەریفی بە ناوەوە ناو نرا بو، ئەمانە هەمو کۆ ئەکاتەوە. هەمو ئەبنە دوازدە سوار و، پێیان ئەڵێ:

"بەیانی زو بە فێنکی سوار بین لێرەوە لە دۆڵی گەڵاڵەوە بە سەر ئاوی سوبحان ئاغا دا لە بنەی سەید صادقەوە راوی لێ دابەستین، ئەو سەرچاوەی قوماشە ئێجگار بەرازی زۆرە. لە وێوە دەس پێ دەکەین، بە سەر تەپەکەل و هوشیارا ئەیان رەوێنین بۆ خوار بەکراوا!".

لە سەر ئەمە هەمو بڕیار ئەدەن و، هەر کەسە رو ئەکاتە ماڵی خۆی، لێی دەنوێ.

راوە بەرازی دوانزە سوارە لە شارەزور

بەیانی پێش بانگ ئەکرەم کە لە دیوەخانی سەلیم بەگ دا نوست بو و، ئەو شەوە، لە خۆشی ئەمە کە لە تەک سەلیم بەگ دا دەچن بۆ راوە بەراز، خەوی لێ نەکەوتبو. دێتە دەرێ بۆ ئەوەی بزانێ شەو چ وەختە. ئەبینێ وا کۆ و تەرازو لە سەر گردی دار گوێژەکەوە گوێیان کێشاوە و، مەلایش خۆی لێ ئامادە کردوە سەڵا بکا.

ئەکرەم دێت دەرگا بکاتەوە کە بچێ بۆ مزگەوت، سەلیم بەگ خەبەری ئەبێتەوە، ئەپرسێ: "ئەوە کێ بو دەرگای کردەوە؟". ئەڵێن: "میوانەکە بو". ئیتر سەلیم بەگیش نانوێتەوە و، دێتە دەرێ، بانگی مەیتەر ئەکا

ئەڵێ: "ئەسپەکەی خۆمم بۆ زین بکەن و ئەسپە ڕێشانیش، کە زۆر هێمنە، بۆ ئەکرەمی ئامادە بکەن ئەوەکو زۆر سواریی نەکردبێ. با سواری ڕێشان بێ! ئەو پیاوە پیرەش هەتا من دێمەوە خزمەت و چاودێرییەکی باشی بکەن!"

سەلیم بەگ ئەچێ دەسنوێژ ئەشوا تا لە نوێژ دەبنەوە ئەکرەمیش دێتەوە و، دە سوارەکەی کەش بە سواری لە بەر دەرگا ئەوەستن. هەمو ناوی خوا لێ ئەهێنن و سوار ئەبن.

سەلیم بە هەر لایەک دا چوبێ تەپڵی تایبەتی خۆی بوە، بەڵام....

........................

لە سەر ئەو بڕیارە خۆیان گرد دەکەنەوە بۆ ڕەو.

ئەو بەیانیە ئەسپ بۆ شا زین ئەکەن کە بڕۆن ڕەوی بۆ بکەن. مەیتەر ئەسپ لە تەویلە دێنێتە دەرەوە. ئەسپ دەست ئەکا بە چەپۆکان و ئەرە ئەر. مەیتەر قینی هەڵ دەستێ لە بەر خۆیەوە دەڵێ: "شێرە شێری چیتە، وا دەزانی بۆ مەیدانداری سوارت ئەبێ؟ ئەم خەڵکانە ڕاو دەکەن".

ئەو دەمە ئەحمەد پاشا با ئەم توانجەی ئەدا بە گوێ دا. بانگ ئەکا مەیتەر ئەسپ بێنە ڕەو نیە! پێ ئەنێتە ئاوزەنگی، ڕو ئەکاتە سوپا و، بە دەنگی بەرز ئەڵێ: "مردن مردنە لنگ بزاوتن چیە؟ تا ئەم سەرە سەر بێ پشت ناکاتە دوشمن... یا عەلی دەی سوار بن مەریوانە، ڕۆژی مەیدانە!"

ئەعرەتەی دلاوەران ئاوزەنگی لێ ئەدا و، ڕو ئەکاتە باسکە دریژی قەیماسە، ئەبینێ وا دەستە سوارێک دیارن، سوار لە پێشەوە زرێ و کڵاوزرێ و دەستوقوچاغ و چوار ئاوێنەیان ئەدرەوشێتەوە.

مامەند میراودەلی و سوار ئاغای بڵباس لە پێشەوە، لاوکی شەڕی قایغانی دەڵێن و، سەلیم بەگ سیری حەمایل کردوە و، دەستی چەپی بە جڵەوەوە و، دەستی ڕاستی لە سەر کەمەربەندی قەبزەنوشتەیی بە تەهەورێکەوە چاوی بڕیوەتە تایدەر دەیەوێ بە زەهری چاو ئەو کێوە هەڵکەنێ و، بدا بە سەر دوشمنا. جوامێر ئاغای ڕەنگینە کە دەڵێن پڵنگی چنگ بە خوێنە، قلیانی تێ کردوە، دوکەڵی قەندەی وەک باقە سمێڵی لەم لاو ئەو لای سەریەوە با ئەیشەکێنێتەوە.

پاشا کە ئەمەی دەبینێ، ئەڵێ: "شەرت بێ مەیتەر خەڵات بکەم، ئەگەرنێستا من ڕام بکردایە، ئەمانە وا ڕویان کردۆتە لەشکری دوشمن و، گەڕانەوە، ئەبوایە من چیم بکردایە؟"

ئینجا ئەحمەد پاشا بە هێواشی ئەگەڕێتەوە دواوە و، بانگ ئەکا تەپڵی شادی لێ بدەن. ئەم عەزم و ڕەزمە لەم دەستە سوارەدا دەبینم، فەتح و سەرکەوتنە.

ئەقارەچی دەس ئەکەن بە گرم و هوری تەپڵ، ئاوازەی تەپڵی شادی بەو فێنکیی بەیانیە ئەیدا لە شاخی کەتو، دەنگی ئەدایەوە. کە سەلیم بەگ گوێی لە دەنگی ئەم تەپڵە ئەبێ و، ئەیناسێ تەپڵی ئەحمەد پاشایە و، نقامی فەتحە، ئەگەڕێتەوە بە خۆی و یازدە سوارەی هاوڕێیەوە لە سەر ڕێ دا ئەوەستن. کە دەبینێ بە ڕاست وا ئەحمەد پاشای برازایەتی سەری سوڕ ئەمێنێ، لە خۆشیانا هیچ قین و گرژیەکی نامێنێ. کە پاشا ئەگاتە ڕاستیان هەمو گەڕن کەچی بۆ ئەکەن. پاشا ئەڵێ: "هەر وەک پێشکەوتن یاخوا هەمیشە هەر پێشکەوتو بن. دە بڕۆن ئێوە پێشدارن! ئێمە خۆ خێمە و بارەگامان لە گەڵ نیە. هەمو سەڵتە سوارین و بۆ ئێوارە دەبێ یەک سەڵەف بگەینە مەریوان. شەو قەڵای میردانە. بڕۆن لە پەنای یەزدانا بن!"

سەلیم بەگ ئەم قومانەیە وەرئەگرێ، ئاوزەنگی پیا دێنێ، هەمو ئەیکەن بە تۆز و تێ ئەپەڕن.

دەمی ڕۆژئاوا، نزیک بە دۆردوی ئێران، لە ئەنیوێ بۆسە دەخۆن. نزیک بە بانگی شێوان سوپای بەروداوی پاشایی سەرەتایان دەرئەکەوێ. ئارامگا بۆ پاشا ڕێک ئەخەن، کە پاشا دائەبەزێ و، کەمێ ماندوی ئەحەسێتەوە، ئەفەرموێ: "بە سەلیم بڵێن ئەمشەو میوانی ئەوین، نان و ئالیکی دۆردو پەیدا کا!" سەلیم بەگیش

ئەڵێ: "بە چاوان، بەڵام ئێستا لە خاکی ئێرانین. راهورەسمی ئێرانیش ئەمەیە شەو سەعات سێ نـان ئـەخۆن. ئێمەش لە سەعات سێدا هەمو فەرمودەیەک بەجێ دەهێنین"

سەلیم بانگ ئەکاتە ئەکرەم و، ئەروانن ئەکرەم دیار نیە. خەبەر ئەزانن کە نیو سەعات لـەوە پـێش بـە پیادەیی رۆیوە تاکو هەندێ بەدگۆ بڵێن خۆی شاردۆتەوە.

سەلیم بەگ تێ دەگا کە بە تەنیا چوە کە چەند و چون و رێوشوێنی دوشمن تاقی بکاتەوە، سا چەنـد دەقیقەیەکی پێ دەچێ ئەکرەم ئەگەرێتەوە. سەلیم بەگ لێی ئەپرسێ: "لە کوێ بوی؟" ئەکرەم ئەڵێ: "خۆم چوم دەوران دەوری ئۆردوی ئێران گەڕام، هیچ بە خەیاڵیانا نایە کە دوشمن بوێرێ رویان تێ بکا، بێ باکانە هەمو لە ئاهەنگ و بەزمان"

ئینجا سەلیم بەگ ئەڵێ: "برادەر من و تۆ ئەوەڵ ئاوەڵیمانە، چی لەم لەشکرە دەڵـێی و، چـی بکـەین؟" ئەکرەم دەڵێ: "پاشا لە قەیماسە نوکتەیەکی فەرمو: شەو قەڵای مێردیـە، مـن وا بـە چـاک ئـەزانم تـا سـەر لـە ئێوارەیە و، شپرزەی نان و ئالیکن، شتێکیان پێ بکەین، کە کەوتنە نیوەشەو ئەکەونە ناگاداری، ئێمە دوازدە و ئەوان دوازدە هەزار بکەوینە روناکی و بمان بینن لێمان ناترسن، تا شەوە و ئێستە شپرزەن پـەنا بـەخوا بـا تێیان هەڵکەین!"

سەلیم بەگ ئەمە پەسەند ئەکا و، هـیچ راناوەسـتن ئـەنێرن لـە ئەقارەخانـە دوانـزە تـەپڵ ئـەهێنن، بـە قەڵپوزی زین دا دایئەبەستن و، سوار ئەبن و، رو ئەکەنە لەشـکری ئێـران. نـەختێ لـە ئارامگـای خۆیـان دور ئەکەونەوە، کانی و ئاوێکیان دێتە رێ، ئەکرەم ئەڵێ: "با دابەزین دەسنوێژێکی پاک بشـۆین و، نوێژێـک بـۆ خوا بکەین و بپارێینەوە" هەمو دائەبەزن و نوێژ ئەکەن و لە خوا ئەپارێنەوە و، سوارئەبنەوە، ئینجـا ئـەکرەم رو ئەکاتە سەلیم بەگ و ئەڵێ: "قوربان! لە شەڕدا پیشەی تۆ چۆنە؟ شیر لە چ جێگایـەکی دوشـمن ئـەدەیت؟" سەلیم بەگ ئەڵێ: "من تا ئێسـتە شـیرم لـە سـەری دوشـمن داوە، بـەڵام بـۆچی ئەپرسـیت؟" ئـەکرەم دەڵـێ: "ئەمەوێ کردار و کوشتارمان دیار بێ، کەوا بێ من لە سەر شـانی چـەپ ئـەدەم تـا کوشـتاری هـەردو لامـان دەرکەوێت"

دوای ئەمە دابەش ئەبن بە سەر دوانزە قۆڵا و لە دوانزە لاوە گرمەی تـەپڵ و نـەعرەی مـەردان بـانگی ئامان ئامان تێکەڵ ئەبێ.

شەڕ دەستی پێ کرد با جارێ ئەوان لەم هـەراو هوریایـەدا بهێڵینـەوە، خۆمـان بگەڕێینـەوە سـەر ئـەو سەردەمە کە ئەکرەم بە پارێز لە پێوشوێنی ئۆردوی ئێران گـەڕا بـو، ئەشـارەزای ئـەو مەڵبەنـدە بـو، لـە گـەڵ ئەوەشا کە نزیک بە قەڵای مەریوان کەوت بونەوە، جوامێر ئاغای رەنگینە بە سەلیم بەگی وت بـو: "ئێمـە کـە دەگەینە قەڵا، ئەبێ لە شوێنێکەوە برۆین وەک ئێمە، تا ئەوان ئەگەنە مەریوان پێمان ئەزانن، ئێمـەش ئـەبێ لـە نزیکەوە برۆین تا دەچینە بن دەستیان ئەمان بینن، جـارێ قەڵاکـە خـۆی سـەختە، بـەری لای ئێمـەش گـۆلی زرێبار گرتویەتی، ئەم گۆلە رێی ئێمەی بەستوە، ئەگەر بێـت و پشـت بـەخوا ئـەوان بشـکێن رێی راکردنـی ئەوانیشی تەنگ کردوە".

سەیری زات و ئازایەتی مەردان بکەن بە دوانزە کەسەوە چاویان لە شکاندنی دوشمن بوە. وتی:

"بۆ ئێمە یەک رێ پەنا هەیە ئەویش (گوڵان) ە، گوڵان رێگەیەکە وەکـو کـوڵانی(زێراب) ە تـا ئەگەیتـە بەر قەڵا نات بینن، کە گەیشتینە داوێنی زرێبار لە (پەنگیجە) وە بە سەر (سـێو) دا لـەو تونکـەی تونکـەی بـەر گوڵان دا بۆسە بخۆین، پشتی گوڵان شاخێکە هیچ باوەڕ مەکە کە ئەوان ئەیان گرت بێ، لەو کێـوە لەشـکریان دامەزراندبێ، زۆر ستەمە ئێمە بتوانین تێ پەڕین، ئەبێ هەمو لایەکمان و، پاشـایش کـە گەیشـتە بـەرەوە بـێ دەنگ و بێ سەنگ، کە هەستمان ئەکەن مۆڵە بخۆین تا شەو بە سەردا دێ، ئەوسا بەنـدە و ئـەکرەم و، چـوار

سواری تر یەک دو سەعات لە پێش شەبەیخون دا دەوری زرێبار بدەینەوە. یەکێکمان لە (دۆڵاش) و (تەی) ەوە، دوهەم لە (بەیزە) وە، سێهەم لە (موسەک) ەوە، چوارەم لە (داسێران) ەوە ئامادە بن تا من و ئەکرەم دەگەینە پشتی کێوەکە و پشتیان لێ نەگرین. ئەوسا کە دەنگی تەپڵی ئێمەتان بیست و، نەعرەی ئەکرەمتان هاتە گوێ، خۆت لە پێشەوە بە تاو بە ڕێی گوڵان دا لە ناوجەرگی دوشمنەوە هەر شەشتان هەڵمەت بەرن بدەن بە سەریانا. ئەو لەشکرە زۆربەیە کە دارنویانەتە سەر کێوەکە بڕ ئەبن، کە ئەم هەرایە ببینن دایەنە خوارەوە".

سەلیم بەگ ئەم ڕا و دەستورەی زۆر لا پەسەند بو. هێنجگار کە سەلیم بەگی بە مەرد دانا بو بۆ خەتەری هەڵبژارد بو. پێی خۆش بو.

ئەمە دەستوریان بوە. کە بەم ڕەنگە دامەزران و، ئەکرەم و جوامێر ئاغا گەیشتنە شوێنی نەبەرد، جوامێر ئاغا دەنگی زۆر خۆش بو، موناجاتێکی بە دەنگی بەرز خوێند. ئەکرەم جۆشی سەند و، ڕاست بوەوە سەر ئاوزەنگی، کە نەعرەیەکی کێشا بە جارێ دار و بەرد و شاخ و کێو دەنگی دایەوە. خوریە کەوتە دڵی ئۆردوەوە، ئێمە وەک ئێران دائێین: (زهرە شکاف شدند). بەڵام زۆر داچڵەکین و پەشۆکان و، هاتن بە یەک دا و، ئەو شوێنەی کە ئەکرەم و جوامێر ئاغا گەیشت بونێ لە سەلیم بەگەوە تیرهاوێژێ دور بون. سەلیم بەگ بە سەر سواریەوە ئامادە بو، گوێی بۆ ئەم نەعرەتە مەردانەیە گرت بو. کە دەنگی ئەکرەمی هاتە گوێ، هێنایە هیوا و هەڵمەت و، لە خۆشیانا ئەویش نەعرەتەیەکی لێ دا. هەردو سەدا بەرامبەر بە یەک دەنگیان دایەوە و مژدەی سەرکەوتنیان گەیاندە گوێی ئەحمەد پاشا.. ئینجا سەلیم بەگ دای لە تەپڵ و کردی بە گەرنش. هەرچەندە ئاوزەنگی بە ئەسپەرەشی سێ تەنگەدا ئەهێنا، کورەی ئەسپ و تەقەی ناڵی پۆلای، بەردی ئەو شاخە ئاگری لێ دەبوەوە، پاشاش کە ئەمەی بیست و بینی، دەسبەجێ بانگی کردە ئەقارەخانە و کەرەنا بێنە گرمە و، خۆشی سوار بو تا ڕوانی لە پێش دەمیەوە کەسی نەدی، بروسکەی چەخماخەی ناڵی وڵاخی سوارانی لە ناوجەرگی سوپای دوشمن دا دی، ڕوی کردە ئاسمان و پاڕایەوە، وتی: "خوایە! شەڕی لابەلایە و، ئەوان بە سەرمانا هاتون، دەسگیری ئاماوان تۆی". خەریک بو بە شوێنیانا بچێ، نایب و پیاوماقوڵەکان نەیان هێشت. هاتە سەر گردەکە گوێی گرت، هەر لە کانی سانانەوە بە دەوری ئۆردوی ئێرانا گرمەی تەپڵی ئەقارەخانەی خۆی و، نەعرەی دوانزە سوارەی دی. لاوکی شەڕی قایفانی دیسان هاتە گوێ، بانگی کردە سوجادەچی باشی، بەرماڵی بۆ هێنا، دابەزی، سەری دایە سوجدەوە تا قەندەکێشێکی چاک سەری هەڵ نەبڕی، کە سەری بەرز کردەوە بانگی کردە باش چاوەش و داراغا کە دەنگی لەشکر بدەن ڕێی ڕاکردنی ئۆردوی ئێران بگرن، شکان و خراپیش شکان، بە شێرزەیی دازانن ڕو بکەنە کوێ. باش چاوەش (سوپەهسالار) ی ئەو دەورە خالید بەگی میرەدێ بو، قەدارەی باش چاوەش لە گەڵ شمشێری سەلیم بەگ دا هاوشانی دەکرد و مەشهور بو، جارێک لای وارماوا یەکانەیەک بەلەسە دەبێ، خالید بەگ هەڵ ئەکوتێتە سەر یەکانە و قەدارەیەک ئەدا لە گازەرەی پشتی، لە ژێر زگیەوە دێتە دەرێ.

ئەو قەدارەیەی هەڵکێشا، کەوتە بەر لەشکر، بانگی کرد: "کورینە! شەوێکە و ئەمشەو، لەو ڕۆژەوە کە خوا ئەم خاکەی ئافەریدە کردوە تا ئیمرۆ شەڕێکی تری وای تیا نەکراوە، سەرەتای سروشتی کرد هێشتا ئازایەکی تری وا نەنوسراوە، صەلاحەددین بە ئۆردو سوپاوە ئینجا سەرکەوتنێکی وای بۆ ڕێ کەوتوە. ئێمە دوانزە سوارمان ئەم ئۆردوەی پێچایەوە. هەرچەندە تا ئەم قەندەکێشە بەشی ئێمەی تێ نەخستوە، بەڵام وا نۆرەی چاک کەوتە بەر ئێمە، فیدای دەست و شمشێر وشان و باهوی دلێرتان بم، بە خوا ئەزانم زۆر کفتی ڕێگەن و یەک سەڵەف و سەرەڕەو لە قەڵاچوالانەوە ئیمرۆ گەیشتونەتە ئێرە و ماندو و برسین، بەلام غیرەت ئەمانە لە بیر ئەباتەوە، شەیپورچی! دەی فیدای کەرەناکەت بم، پێشکەوە، پێشکەوە! کورگەل وا ڕۆیم دوام کەون!"

ئەمەی وت و ئاوزەنگی پیا هێنا، ئینجا غولغولەی تەپڵ و گورەی نەقارە تێکەڵ بە (سەر دەرکە و ماڵ بسیارە) بو، بە راستی سوارەی بەبە ئەو شەوە کارێکیان کرد ئێستاش بە داستان ئەیگێڕنەوە.

جەنگەی جەنگ جارێ لە باش چاوەش و سوپا گەڕیین، شوێن سەلیم بەگ و پێنج سوارەکەی رەفیقیان کەوین، یەکسەر لەبەینی گوڵان و کێوەکەوە ڕژانە ناو سوپای ئێرانەوە، هەرچی پیاوێ کار.. ئێران بو لەو تورەیەوە بو.

سەلیم بەگ وای زانی کە تێی هەڵکرین ورە بەرئەدەن و، ئەشکێن. بەڵام وا نەبو. جارێ ئەو راستە لەشکرە وەک قولا.. ماسی سەر یەک نیشت بو. بارەگا و قەرارگایان بە ئاسانی بە جێ نەئەهێشت، ئەیانزانی ئەگەر رابکەن خراپتریان بە سەرا دێ. راستی بە لێ بوردوانە شەڕێکی ئازانەیان کرد بەڵام... سەلیم بەگ لەوانە نەبو بگەڕێتەوە. ئاغای زەنگەنە کە نوکتەچی و بێ خەم بو، کردیە گاڵتە وتی:

"هەرایە، کورگەل تاریکەشەوە،

مەنجەڵی پلاوە وا لە پێشەوە!"

سەلیم بەگ بێ ئیختیار پێ کەنی و، وتی:

"هەرایە کورگەل، پاڵەوانینە!

رێ پاکەوەکەن، ئەوجەوانینە!

وا هەڵمەتیان برد، یاران بە دەستە،

شاخ و کێو لە ژێر پێیانا پەستە!"

لە گەڵ ئەمەش دا دوشمن سەغڵەتی کرد بون و، رێی لێ بەست بون. چاریان نەما کەوتنە رایەلە و بە شمشێر پاکۆیان ئەدا، سەلیم بەگ کە لە پێش دا بە بێ لێکدانەوە دوشمنی بە سوک زانی بو، بێ پەروا هەڵی کوتایە ناویان، لە سێ جێوە بریندار بوبو، سەرشانی چەپی و لاڕانی، برینەکانیان کەم بو، بەڵام قۆڵی راستی گۆپاڵێکی توهمەتەنی بەر کەوتبو، تا دەهات سارد ئەبوەوە، سا خواو راستان سوکە سواری وەک شەهێن کە بکەوێتە ناو قاز و قوڵنگەوە، لە بەرامبەریەوە دەرکەوت. بە دولادا سوار و پیادە تەرنینی لە خوێنی خۆی و، دوژمنا سور بوە، چریکەیەکی شەهێنیی کرد. برینداریی و ماندویەتی و خەفەتباری سەلیم بەگ نەما، تومەز ئەمە جوامێر ئاغای رەنگینە بو کە لە گەڵ ئەکرەما لەو سەرەوە دەست ئەکەن بە دڕ دانی و، تێ ئەفکرێت ئەکرەم هەر هەوڵی ئەوەیەتی لە جێ دا بکوژێ و، کوشتاری دیار بێ.

خۆ ئەم شەرەش شەڕی شڵەژاندن و لەشکر شکاندنە، وەستان کەلک ناگرێ، بانگ ئەکا: "ئەکرەم بەس بکوژە سەلیم بەگ لە تەهلوکەدایە!"

ئەکرەم گوێی ناداتێ. ناچار خۆی تیپی لەشکر ئەدرێ، ئەوە بو گەیە سەلیم بەگ، بەڵام ئەویش زۆر بریندار بو.

(ئەگێڕنەوە کە دوشمن شکا و، جوامێر ئاغا هات بە سواریەوە کەمێ بحەسێتەوە، قەندەیەکی بۆ تێ ئەکەن کە بە سەر سواریەوە بیکیشێ، نەفەس لە قەندەکە ئەدا و، دوکەڵ لە برینیەوە دێتە دەرێ) ئینجا کە جوامێر ئاغا تێپەڕی و ئەکرەم مایەوە، کەمێ هۆشی هاتەوە بەرخۆی، ئەویش دوا بەدوای جوامێر ئاغا تاوی دا. گەیشتە بەرەوە، زۆربەی سوپای ئێران و جەرگەی لەشکریان بە جارێ ورە بەر ئەدەن. ئەڵێن لە دواوە کەسمان نەماوە، کە ئەم سوارانە گەیشتنە یەک ناچار ئەوانیش رو دەکەنە قوتەکەی سەر کێوەکە و، خەیمە و خەرگا و، بارەگا و نان و خوانی پوخت و تەمیز بە جێ دێڵن.

جوامێر ئاغا بە سەلیم بەگ ئەڵێ:

"سەلیما من تۆم خستە ئەم دەریای لەشکرەوە. زۆر پەشیمانم. بەڵام بە کەسی ترما ڕانەدی هەتا بە خۆشما. تو خوا ڕاستم پێ بڵێ برینەکانت چۆنن؟ ئەترسم زۆر بریندار بی. ئاخ ئەوجوانی و ئازایەتی غرور دێنێ. تۆ ئەدەبوایە هێندە بێ پەروا بی و. دوشمن بە سوکی ببینی. سوێندم بە خوا مەردیی و دلاوەرییەکم لەم ئۆردوەدا دی خەنیمی هەر دوانزە سوارەکە بون. بەڵام ئەم شەبەیخونەیان بە بیرا نەهات بو. کەس ئەی بیستوە شەبەیخون سەر لە ئێوارە. ڕاستیەکەیشی ئەمەیە ئێمە لێ بوردو بوین. سوێندەکەی کە لە سەر دەستی میری سور خواردمان. ئێمەی شێت کرد بۆ سەر ئۆردوی ئێران دەچوین. خەیاڵەکەمان عەینی موبالەغەی ئێرانیان بو. تو خوا لێکی بدەنەوە: دوانزە سوار و دوانزە هەزار کەس؟ ئەمە شیعری شانامە نەبێ چیە؟

"پیاو کە نزیک بە مەرگ بوەوە دڵی پاک ئەبێ. لە خوا ئەپاڕێمەوە: سەلیم ئەکوژێ. جوامێری لە بەر گەڕێ. چونکە من تۆم لە تەهلوکەدا ئەدی و. ئەویش من هێنامە پێشی تۆ. سەلیم سێ تەنگەیەکی تر نابێتەوە. بەڵام جوامێر زۆرە.

"تو خوا سەلیم چی بە برازا... کەت بڵێم؟ ئەگەر ئەکەوتایەتە سەر سەوداى ڕەو و. بە ڕێکەوپێکی بهاتایەتە مەیدان. ئێمە بۆچ توشی ئەم تەهلوکەیە ئەهاتین و. بۆچی شێتانە خۆمان خستە ناو دەمی ئەهەنگەوە؟ ئەڵێن جەسارەت لە شێتەوە پەیدا ئەبێ. ئەمڕۆ ئەگەر پاشا بە سیاسەت ئیدارەی لە گەڵ ڕۆم و عەجەم دا بکردایە. بۆچی هەر ڕۆژە لە لایەکیانەوە لەشکرمان دەهاتە سەر؟

"هێشتا برینی شەڕی وەزیری بەغدامان ساڕێژ نەبوە. وا ئەمجارەش لەشم بوە بە بێژنگ. خوا بکا سەلیم سەلیم بێ!"

سەلیم بەگ ئەڵێ: "جوامێر! کاک جوامێر! هێزی ئەژنۆ وهاناوی جەرگم ئەوە تۆ نیت کە ئەوە بڵێی لە شەڕ دایێ. بوارەی ئەوەم نیە زۆر بدوێم. بەڵام تا دەمرم بەندەگی ئەحمەدی برازام دەکەم کە ئێمەی هێنایە سەر ئەو قینەی بە دوانزە سوار ڕومان کردە دوانزە هەزار کەس. ئەمە داستانێکە ناوی کوردستان زیندو ئەکاتەوە. ئەگەر ڕاستت ئەوێ ئێمە ئەمەمان بۆ ناموس و پارێزگاری خاکەکەمان کردوە. ئەگەر بشمرین لە دڵی میللەتا ئەژین"

"ئەم خاکە کە سروشتمان لەوە و. دایکی ئێمەیەو ئێشتمانمانە فیداکاریەکی بۆ ئەکەین. کەڵکی چیمان پێوەیە؟"

"جارێ با هەواڵێکی پاشا و لەشکر بزانین. ئایا باشچاوش بە خۆی و قەدارەیەوە ڕوی کردۆتە کوێ؟.. بۆنی پڵاوی سەدری دێتە لوت. تۆ بڵێی ئەیان ڕشت بێ. چونکە بەڵێنمان بە پاشا داوە لە سەر نان و خوانی ئێران میوانمان بێ"

"ئەگەر ڕاستت دەوێ من لە سەر ئەم برینداریە و ماندویەتیە دا. ئەگەر ئەو نان و چێشتەم لە دەس بچێ دەستم هیچ ناگرێ. دڵنیام کە پاشا ساغە و ئاگای لە شکستی لەشکری ئێران هەیە و. باشچاوشی بە لەشکرەوە خستۆتە شوێن شکستە. تو خوا با منیش سەرێ لە ئاشپەزخانە بدەم. دڵم ئۆقرە ناگرێ"

جوامێر ئاغا پێکەنی. وتی: "ئاحەقیان نیە ئەم خەڵکە پێت ئەڵێن چڵێسە. بەڵام بە بەختت...... بابە هەڵسە برۆ بە لای خۆت و ئەوسیتەوە. من ناتوانم. ئەچم بە پێ و شوێنێ پاشاوە. وەک تۆ دڵت بۆ سەدری ئاسرەوێ. من جەرگم بۆ سەدری کوردستان ئارام ناگرێ"

ئینجا لێک جیا بونەوە. سەلیم بەگ بۆ چێشخانە و. جوامێر ئاغا بۆ ڕەتی لەشکری پاشای. ئێمەش با دوی سەلیم بەگ بکەوین.

لە شوێنێکی پەنادا 3 خێوەتی گەورەی چوار ئەستونی هەڵ دراوە.

شکستی دوشمن و گەڕانەوە سەلیم بەگ کە زانی نان و خوان لە جێی خۆی ماوە و. نەڕژاوە، ئینجا خۆی لە ڕاستی خۆی تەریق بوەوە و. وتی: "یاران پاشا کەوا میوانە، دیار نیە، لەشکر تێک چراوە. جوامێر بە برینداری کەوتە پێوشوێنی لەشکر. من لە شوێنی نەوس بە کاسە و کەوچکەوە دەگەڕێم. دەستبەجێ گەڕایەوە و. هەر لە خۆیەوە دای لە تەپڵ. زۆری پێ نەچو ئەکرەم پەیدا بو. سەلیم بەگ پرسی: "ها ئەکرەم چیە؟"

"ئاغام! تەنگانەی چاک ئەم دەمەیە، هەرچەند لەشکر شکاوە و باش چاوەش سەر شکستە نیشتوە، بەلام ئەوانەی لە پێش باش چاوەش و لەشکری ئیکەوەن کە من هێشتا زۆربەی لەشکر لە (باسێران و ئەستێران) ماوەتەوە، ئەمانە ئەگەر بێت و بجولێن، سوارەی ئێمە دەکەونە ناوەڕاستی دو لەشکرەوە، کە بزانن کەمین و بمانگرنە ناوەوە، هەمو ڕەنجمان بێهودە ئەڕوا. ئێستا من شارەزا نیم و. تیپی خۆیشمان لێک براوین. ئەگەر سێ چوار سواری ترمان بدۆزبایەتەوە بە گوڕ و هەرای تەپڵ بەرمان لە دەستەی دوایی لەشکری ئێران کە لە کێو بونەوە و. دوا بە دوای شکستەی خۆیان ئەڕۆن بگرتایە و. بمان خستنایە ڕەتی ڕێی (موسەک)، ئەم ترسەمان ئەدەما. بەلام من و. تۆ چی بکەین؟"

سەلیم بەگ وتی: "ڕاست ئەکەی. با جارێ هەردوکمان لە تەپڵ بدەین و. ڕو بکەینە پێش شکستەی دوایی"

ئەکرەم هەرچەند ئەمەی بە شێتی زانی. بەلام ناچار سەرپێچی نەکرد. هێشتا دور نەڕۆیشت بون تیپە سوارێکی هەڵبژاردەی قوجاغ بێ دەنگ و بێ سەنگ لە دوایانەوە دەکشا. نزیک کەوتنەوە، سەلیم بەگ گەڕایەوە و تێی خوڕین، کە لێیان ورد بوەوە، ڕاوەستا تا پاشا گەیشتە بەرەوە. بانگی کرد: "مامە تۆی؟ ماوی؟"

سەلیم بەگ چاوی بە جارێ ڕون بوەوە و. وتی: "بەڵێ ساغم قوربان! جارێ شوێنم کەوە!"

پاشایش نەیپرسی بۆ کوێ. کە گەیشتنێ، ئیتر خوا بۆی ڕێک خستن. دوای لەشکری ئێرانیان لێک پچراند تا پشت موسەک. ئینجا لە سەریان ئەڕۆیین. گەڕانەوە شوێن لەشکرگا. لە ڕێگا زوڵاڵ ئاغا پەیدا بو. پاشا ناردی بە شوێن باش چاوەشا کە بگەڕێتەوە ئیتر لە سەریان نەڕوا و. فەرمویشی تەپڵی بازگەشت لێ دەن، خۆیشیان هاتنە ناو خەیمە و بارەگای بە جێ ماوەوە. دابەزین.

پاشا لە باتی ئەمەی ڕو خۆش و شادمان بێ. دڵتەنگ و مات و مەلول دانیشت بو. لە گەڵ سوارێ دەردەکەوت. دڵی ڕادەچەنی و هەواڵی جوامێر ئاغای دەپرسی. ڕوی کردە سەلیم بەگ و وتی: "مامە تۆ جوامێر ئاغات چۆن دی؟ دەترسم خوانەکردە جوامێرمان لە دەس بچێ؟ بە خوا سوێند ئەخۆم جوامێر بە هەمو لەشکر و کەسوکارمی ناگۆڕمەوە"

سەلیم بەگ بە گاڵتەوە وتی: "سا بە خوا پاشا شوکر برینەکانی لەوانیە کە نەژی، تۆ دەتەوێ ئەکوژرێین و. بە مەرگی خۆمان بمرین! بە خوا ئێمە ئەمانەوێ لەم ئەبەردەدا بمرین تا لە دڵی میللەت و تاریخا بژین"

کۆتایی

پیرەمێرد: "دوانزە سوارەی مەریوان". سلێمانی 1935. چاپی دوەم، سلێمانی 1959. بە داخەوە لاپەڕەیەکی چیرۆکەکە و. چەند وشەیەکی لاپەڕەیەکی تری لە کۆپیەکەدا دەرنەچو بو.

## لێرەدا هەندێ سەرنجی مێژویی

1. لۆنگریک ڕوداوی دوانزە سوارەی مەریوان ئەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی سلێمان بەبە کە تا ساڵی 1110 / 1698 حوکمڕانی کردوە. بەڵام پیرەمێرد لێرەدا ئەیگێڕێتەوە بۆ سەر دەمی ئەحمەد پاشای کوڕی خالید پاشا کە تا ساڵی 1192 / 1778 حوکمڕانی کردوە. دیارە ماوەیەکی درێژ لە نێوان ئەم دو میرەدا هەیە و، یەکەمیان باپیرە گەورەی هەمو میرەکانی بابانە.
2. سەلیم بەگ، کە لە چیروکەکەدا بە سەلیم سێ تەنگە ناوی هاتوە، کوڕی مەحمود پاشا بوە. مەحمود پاشای باوکی سەلیم و، ئەحمەد پاشا برا بون. بەم پێ یە سەلیم بەگ برازای ئەحمەد پاشا بوە نەک مامی.

   سەلیم بۆیە پێ یان وتوە سێ تەنگە، چونگە لە کاتی شەڕدا، بۆ ئەوەی نەگلێ، سێ تەنگەی لە ئەسپەکەی بەستوە.
3. سەلیم بەگ ساڵی 1221 / 1806 لە شەڕی زرێباردا کوژراوە، ئەورەحمان پاشای برای سەلیم بەگ سەرکردایەتی شەڕەکەی کردوە. لەشکری وەزیری بەغداد بە سەرکردایەتی سلێمان کەهیە شکا و، سلێمان بە دیل گیرا. مەولانا خالید "سوگواری" بۆ سەلیم بەگ نوسیوە.

### 2. 4. موناجات:

بەیتی خالید پاشا

فەرمودەی شێخ صادق

بسم الله الرحمن الرحیم

یا حەی بە نامت، یا حەی، کەرەم بێ پایان و پەی

ڕۆژیدەیی کوللی شەی، یا ڕەبی بدەی شیفای

ڕەببی جیهان ئافەرین، صاحیبی چەرخی بەرین

ڕەببی سەما و زەمین، یا ڕەبی بدەی شیفای

یا صەبور و، یا سەتتار، بە ئەنبیای دە نازدار

صەد و بیست و چوار هەزار، یا ڕەبی بدەی شیفای

بە دانیاری ئەکبەر، بە دانیاری ئەصغەر

بە زەکەریا پێغەمبەر، یا ڕەبی بدەی شیفای

بە یەعقوبی کەنعانی، بە یوسفی زیندانی

بە (سبعە المثانی)، یا ڕەبی بەی شیفای

بە خالیقی لە ژورە، بە ئاسمانی پڕ نورە

ئەیکوژی "پاشای سورە"، یا ڕەبی بدەی شیفای

بە کەعبەیی موعەزەم، بە یەحیای موکەڕەم

بەعیسای بنی مریەم، یا ڕەبی بدەی شیفای

یا ڕەئوف و، یا ڕەحیم، یا سەمیع و، یا عەلیم

یا قائیم و، یا دائیم، یا ڕەبی بدەی شیفای

یا ڕەفیعولدەرەجات، یا کافیولموهیمات

یا نافیعولبەلیات، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە حەقی شیت و، ئیدریس، بە نوح و سام و، جەرجیس
بە تولالابانی تەدریس، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە حەقی لەوح و قەلەم، بە حەقی نوری ئادەم
بە ئابی چاهی زەمزەم، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە ئیحسان و ئیبراهیم، بە حەقی موسای کەلیم
گوستاخی توری عەزیم، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە حەقی حەملەتولعەرش، بە لەوح و کورسی و فەرش
بە صائیقانی بێ غەش، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە ئیبراهیمی نازەر، بە ئیسماعیل پێغەمبەر
(قورەتولعەینی ناجەر، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە داوری نەغمەخوان، بە خاتەمی سولەیمان
حاکمی کوللی جیهان، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە ئەرز و سەماواتەت، بە عەرش و ئەنبیاتەت
هەم نیل و هەم فوراتەت، یاڕەبی بدەی شیفای
بە رەسولولسقەلەین، بە حەسەن و بە حوسەین
بە حەقی قابە قەوسەین، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە خزر وبە ئەلیاس، بە حەمزە و بە عەبباس
بە سوڵتان سەعدی وەقاص، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە صاحیبانی مەزهەب، بە رەجەبولمورەجەب
بە ئەو شای عالی نەسەب، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا سوبحان و یا سوڵتان، یا ڕەب ئەمان ئەلئەمان
بە شەعبان و ڕەمەزان، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە حەقی شەمس و قەمەر، بە خورشیدی مونەووەر
بە حەبیبانت یەکسەر، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە غازیی شێر بە کەف، لە حەربیان نەگرن صەف
بە ئاجەتی ئەصحابو لکەهف)، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە ئەحمەدی مەدەنی، بە خاصانی یەمەنی
هەم بە وەیسولقەرەنی، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە شێخی صائیمولدەهر، بە سەلسەبیل و کەوسەر
بە فەزلی خۆت یا داوەر، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە سولتان عەبدولقادر، بە زاهیدانی شاکیر
بە عابیدانی زاکیر، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە ئاجەتی هەر چوار کیتاب، دو عام بکەی موستەجاب
پادشای عالی جەناب، یا ڕەبی بدەی شیفای

یا صەبور و یا سوبحان، یا عەزیم و لامەکان
"خالید بنی سولەیمان"، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە شێخ شەقیقی بەڵخی، بە شێخ مەعروفی کەرخی
یا ڕەب، نەدەی چ تەڵخی، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە حەسەنی بەصرایی، بە مەردی دە غەزایی
قەبوڵ کەی یا ئیلاهی، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە شێخ ئەحمەدی جامی، بە بایەزیدی بوستانی
بە سیرڕی شێخ نیزامی، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە شێخ سەعدی شیرازی، بە یارانی حیجازی
بە شاە مەحمودی غازی، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا دائیم و، یا موبین، یا غیاسولمستەغیسین
پاشای ساحیب تەمکین، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا جەبار و یا جەلال، یا ئاگاهی کوللی حال
خالید پاشای پڕ کەمال، یا ڕەبی بدەی شیفای
بە ناڵەی دەروێشان، بە ئاهی یاهوکێشان
تو دڵ نەکەی پەرێشان، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا غەفار و، یا غەفور، بێ ناز نەکەی شارەزور
خالید پاشای صاحیب نور، یا ڕەبی بدەی شیفای
مەقصودم هەن لە دەرگات، قازی یی کوللی حاجات
ئەفەندیم بدەی نەجات، یا ڕەبی بدەی شیفای
شیفات بە دەست دەوانە، کارت بە دەست ئاسانە
مەوقوف نەکەی قوشخانە، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا کەریمی کارساز، یا خالیقی بێ نیاز
شازادان نەکەی بێ ناز، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا لەتیف و، یا خەبیر، بێ وەکیل و، بێ وەزیر
بێ ناز نەکەی قوڵە میر، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا خالیقی چارەگەر، بەشقی سەیدی سەروەر
بێ ناز نەکەی ئاغالەر، یا ڕەبی بدەی شیفای
یا ڕەب! بەشقی حەبیبان، بە ئەسراری نەجیبان
لە بۆ بابی غەریبان، یا ڕەبی بدەی شیفای
نۆکەر گرد بون تەمامە، دوعایان کرد بە عامە
خزمەت لە مە حەرامە، یا ڕەبی بدەی شیفای
نۆکەر گرد بون بە یەکجار، بۆ وان ئەفغان و هاوار
بۆ خالید پاشای نازدار، یا ڕەبی بدەی شیفای
پاشای گوفتاری کردیا، لە دیوانی نوربیا

صەلای تەلەب کردیا، لە دیوانی بۆ لەشکر، یا رەبی بدەی شیفای
مەلام بێننە سەرینێ، دەست بکا بە یاسینێ
من دەچمە ژێر زەمینێ، یا رەبی بدەی شیفای
یا ئەڵڵاە و، یا صەبور، یا پاشاهی غەفور
بێ ناز نەکەی شارەزور، یا رەبی بدەی شیفای
یا ئەڵڵاە و، یا سوبحان، یا سەخی بی و، یا دەییان
خالید بنی سولەیمان، یا رەبی بدەی شیفای
خالید پاشا بە حوکمات، ئەوی خۆش کرد بو وڵات
ئەنجار موهلەتی بدات، یا رەبی بدەی شیفای
شیفای بدەی یا جەلیل، تەعیین نەکەی عیزرائیل
پاشا نەبێتن زەلیل، یا رەبێ بدەی شیفای
یا خالیقی زولمینەن، چون ئەز هائیم لە وەتەن
دەستم برا لە مەسکەن، یا رەبی بدەی شیفای
چون ئەز کەوتمە موڵکی غەریب، شیفای بدەی عەن قەریب
بە تەختی پاشای نەجیب، یا رەبی بدەی شیفای
صاحیبی چەرخ و ئەفلاک، خالید پاشای خۆش ئیدراک
بکەی دڵی فەرەحناک، یا رەبی بدەی شیفای
"صادق" بەندەی کەمترین، یا ئەرحەمەلراحمین
یا رەبی بدەی شیفای
سەرچاوە: محەمەد عەلی قەرەداخی.
کەمال رەوف محەممەد لە بەر دەستنوسێکی تر چەند چوارینەی دوایی خستۆتە سەر.

### 2.5. بەیتی: ئەورەحمان پاشای بابان

دانانی: عەلی بەردەشانی

خالەق! هەر ئەتۆم قادری، رەببی! هەر ئەتۆم قادری، بێ خواردن و خۆف و فکری. تۆم ئەرز و ئاسمان راگری!

تۆم ئەرز و ئاسمان راگر. داتنا بەهەشت و ئاگر. چەند ئاسمان و چەند هەور، چەند باران چەند بەفر، چەند تیپ و سوپا و لەشکر. پاشای هەشت هەزار عالەم وەڵڵا بێ شک زیاتر. ئەمنیش یەکێک بوم لەوان. خۆم پێ لە هەموان کەمتر. سەجدەی شوکرێم لە سەر بو، نەتخوڵقاندم بە کافر. تۆی ئەووەڵ و تۆی ئاخر. هەرچی تۆ پێت بێ ئەمر، ئەش بێ تۆ دەیکەی حازر.

تاق و، تەنیا تەن: سوبحانی. تۆفیقدەری موستەعانی. خالق و حاکمی هەموانی، چاک و خراپ خۆت دەیزانی. ئەزم "عەلی بەردەشانی". لەنگم نەکەی لە زوبانی، بەیتی دەڵێم بە رەوانیی: مەتحی پاشای کوردستانی.

عامیان پاشا، کامیان باشە؟ شایەد "رۆمی" ن، "قزڵباش" ە؟ هەرچەند جارێ شیری کێشا، عالەم دەهاتنە تەماشا. مەردە عەبدورڕەحمان پاشا.

پاشای بەبان! جیهانگیری، ڕەنگ ڕۆستەمی زاڵ" ی پیری:

"ڕانابوێرم بە فەقیری، ناکەم خزمەتی وەزیری، نانی دەستێنم بە شیری

"بە شیر نەبێ قەت پێک نایە. سوێندم خواردوە بە وەڵلایە. ناچمە سەفەری لەحسایە. یاغی دەبم لە بەغدایە

"یاغی دەبم نیشانەڵڵا. تەوەکول و تەعالەڵڵا. نافەرین و بارەکەڵڵا. هەی کورە بەبەینە هەڵڵا!"

بەبە هاتن بە لێمشت. دەستیان لە بەغدایە شوشت. حەمەد بەگی کۆیان کوشت.

کوشتنی ویم بە چ قرار بو؟ سەدی وەک ویم خزمەتکاربو.

خزمەتکار دەیهاتنە کن. خۆشهاتی دەستەوگەردن. ساتێک دانیشە ساکین. ئەتۆش یەکێکی وەک مـن. کەونە کۆیی دین دوژمن!

دەگەڵ تۆمە کەونە کۆیی! حەزم کرد هاتی، نەڕۆیی.

حەزم کرد بە میری سۆران. بێ کەسی دوژمنی زۆران. دو زوبانی وەکو گۆران. دەخۆی جێگای موچەخۆران، بە ئەقڵ هاتوی بۆ تۆران. ئەوجار لێی دەن بە ساتۆران!

ساتۆر دەبان. ڕەنگ شمشێری. دەس و باهو و حەملەی شێری. یاڵڵا پاشا گویم رابدێرێ. وا دەڵێ شیعری شاعیری: "فورسەت هاتوە قەت نەیبوێری! مەرد هەر خۆی ڕە خودای دەسپێرێ"

هەرخودایە ساحێب سورە!

هەر ئەڵڵایە ساحێب سورە!

وە مستیان کەوت بە بێ جرە. پشتیان شکا. زکیان درا. لە هەردوک ئۆردوان بو بە چرە.

بو بە چرە و سەڵاوات. قولە قول و هاتە هات. هەی دەستی بێ دەستەڵات. هەر خێوەت بون بێ قەڵات. کۆیی گیران. کێ هەڵات؟

لە بەر کۆیی دە بەدبەخت. خەلاس ناکەن ڕۆحی سەخت. ئەسپ و ئێستر. ڕەشمە و ڕەخت. کەلەپور و ماڵی نەخت. پاکیان گرت. نەخت بە نەخت.

ئەو دەگەڕا بە سەرداردوە. بە ئەتباع و بە سوارەوە. بە قەتارو ئەهارەوە. بە کۆچ و کۆچبارەوە. پاشای بەخشین بە بارەوە

هەرچی دای پێی بو خەنی. پاشا سوار بو بۆ مەوتەنی. هات گەییە قەرەحەسەنی. مەتاڵ لە گوێی کەرگەدەنی. ئەسەح یاغییە. پێ دەکەنی!

لە پێکەنینی سەرداری. خەبەر درا هەر چوار کەناری. لە شارێک هەتا سەد شاری. هەڵگیرا ڕێی ڕێبواری. ڕۆژی روناک. شەوی تاری. خوێن لە زامی سوری باری

خوێن باری لە زامی سوری. هەر لە نێزیک هەتا دوری. ناکرێ بەحسی کەلەپوری!

کەلەپور و کەیف و زەوق. گەرمێنیم دین بە بێ شەوق. ماڵی زۆریان لێ بوە تەوق. ئەدەمان ساحێب مەترەق. جوان و پیر و چرچ و ڕەق. شەرابخۆرێ دە ئەحمەق

شەرابخۆری جوان و پیر. ونیان کردن ڕەمب و شیر. شاری خورماتو و بەشیر.

ئێلچی ڕۆیین بێ تەخسیر

ئێلچی ڕۆیین بەرەو خوارە. کوتیان: "وەزیرم هاوارە! وڵاتت لێ بوە قەهارە. ئەو بەردیان لە کن خەیارە"

وەزیر لەوێ بو قەهارە. بانگی کردن خزمەتکارە. هەرچی غەیان بێ هەر خوارە. ئەوجا لەپی دەس. موم قەدارە. هێواش دەبوەوە دوبارە

دوبارە بوە هێواش، با بێینە سەر قسەی دە خۆش، پیاو عەیامن بێنە پێش
بێنە پێشێ سەر بە تەل، سوارچاکی دە موشەککەل، ئەو مەشوەرەی بکەن حەل
هەڵ بێ ئالای ئەسرەتێ، یا خودای ئەووەل و ئاخیرەتێ، خالیند پاشان بۆ بخەڵـەتێ، دای دەنێـین بـە حاکمی دەوڵەتێ، ئەو لێی دەبینن فرسەتێ
فورسەت فورسەت بۆی وە دوسا، خالیند پاشا بە ناموسە، برۆ بیگرە لێی مەترسە، ئەمن بـێم یـان بـۆ خۆی بەسە؟
بۆ خۆی بڵێم زیاتر، نە بۆ خۆی بێ، نە لەشکر، خالیند پاشای موکابیر، ئـەورەحمان پاشـای نـادر، لـە بۆی دەگرم بە دەسگر.
"بە دەسگیر لە بۆی دەنێرم، لە چراغێی لە بۆ دەژمێرم، تا بەغدایـەی پـێ دەسـپێرم، لـە کـوڕی خـۆمی هەڵناوێرم، ئەوە کەوڵی بۆ دەنێرم، دادەی بزانم چ دەکا شێرم؟"
شێران پێ خۆش دەبو دڵ، موژدەی دەوڵەت بو حاسڵ، کۆیە و هەولێر و موسـڵ، دەزیـیم دیـن داخ لـە دڵ، سەلیم بەگ سەر قەرەوڵ.
حەیفە سەلیم بەگ بمرێ! پەڕ بە سەرن، مل بە زرێ، مەردچاکان مەتحیان دەکرێ، مـەردی فـەتحی قـەت نامرێ، تەواو بۆ کۆمەگ و گرێ، پاشا ئەبێ هیچ ناکرێ!
پاشای وای فەرمو بە راست، خەیاڵی کرد ئەزم و قەست، سوار بون، رمبیان دان بە دەست، سوارچاکان یاسەوڵیان بەست.
یاسەوڵیان بەست شێری نەڕ، ئەسپ حەودی گەردن تەڕ، رەشمە و رەخت و
زەنگوڵەو زەڕ، عەرز و عاسمان دەبو کەڕ، پاشا سوار بو بەرەو شەڕ
پاشا خودا دای ئەسرەت، ئەی بێ عەیبی پڕ سیفەت، رە تۆم ناکەوێ غـەیبـەت، کـەس وەک تـۆ نـەبوە، نابێ قەت، بەیداغداران حەفتێ و حەوت، روحی شیرین حازری مەوت، دنیـا بـو بـە قیـر و نـەوت، ئـەوها بـو چاومان پێ کەوت!
چاومان پێ کەوت و بەس، کە زاب گیران بێ حەبەس، لێی بە قڕ چو هەزار کەس
هەزار کەس لێی بو بە قڕ، لە زێیەی دابو بێ بڕ، نوقوم بون وەک کولەکەی خڕ
نوقوم بون، چون بە هیلاک، کیژ و کوڕ و باب و داک
باب و داک دە گەڵ منداڵی، بون بە حەشری عەمری خاڵی، شار بە جێ ما بە بـەتاڵی، هوجومیـان بـرد چونە باڵی، حەولی ئاڵتون و ریاڵی، وە خرپان کرد بە جواڵی، هەڵیان دەگرت بە حەمباڵی، وە خرپان کرد بـۆ سەد ساڵی، بەختی فەقیر و رەجاڵی
بەختی فەقیری دابوت، بەبان بە تورکیان دەکوت.
بە تورکیان دەدا خەبەر، ئەزنە و ئەزناف و مەیتـەر، کـێ لـە زافـەی چونـە دەر؟ بـو حەشـری ئەوبـەر ئەوبەر، جافان ملیان دابوە بەر، دنیا بۆ کەس ئەچوە سەر
باقی دنیا کەس ئەیبرد، ئەو ئەورەحمان پاشای کورد، بە خۆ و بە لەشکری خورد، پاشـا بـو، سـەهوی دەکرد، هەتا بەغدایەی ئەبرد!
بەغدا زەمین ئەو هـەردا، شکسـتەی هـات بـە سـەردا، زرێی داوێیـان لـە بـەردا، ئێمـەش دەبـەن بـەو دەردە.
وەزیر لە کنی ئەما زات، ئێمەش بەو دەردەی دەبات، بێ پاشای، سێ جار هەڵات، کە زانی پاشا نـەهات، لێ ی کردن قۆنگرە و قەڵات.

قۆنگرە دە گەڵ ڕوگەربان، هەوهەوەی فۆتە زەربان، مەیدانە! حەملەی مەربان
مەیدانە! حەملەی مەشور. ئاقیبەت گەیە حزور. تۆپیا ئاور دان لە دور. لەشکر دەشکا خوار و ژور. بە جێی هێشتن کەلەپور. ئینتیقامی پردی سور
ئینتیقامی شا و میران. وا نابێ فێڵی وەزیران. چەند کەسی کوشتن بە شیران
شیران ئەیکردن قوتار. پیاوی کۆم و پیر و خوار. سەری دانان بە قەتار
سەری دانا بون بە خشت. فەقیری هەمبان لە پشت. چەند کەشی ئوفتادەی کوشت
ئوفتادە و ڕوتی بێ خێر. ڕوت و ڕەجاڵ و ئاوێر. چەند کەسی کوشتن جوتێر
ئەو دەکوژێ ناوەجاغان. پاک هەڵاتن. چون بۆ شاخان. کوانێ ماخۆی قۆناغان؟ حەیف بۆ میر و ئاغان!
حەیف بۆ میری زەرمندە. ڕوی ویم چەندە تاڵ و توندە. مەربان مەعیێنی چەندە؟ ژوانمان ساڵی ئایندە!
ئەو ساڵەکەش ڕادەبرێ. ئەگەر ئەورەحمان پاشا نەمرێ. بە بێ شەڕ سەر ناگرێ. دەیگرد خانی کابرێ. بە شیری خۆی دای دەگرێ. تا ئەتباعی لێ وەردەگرێ
دای دەگرت ئەوساڵ زستانێ. سوێندی خواردوە بە قورئانێ. دامەزرێ خانەدانێ. خەیاڵە بچمە تارانێ. سوارچاکی دەدان لە سانێ
لە سانی دەدان مەردی قوچاغ. تەووەککول و قسەی ساغ. هەر دەڕۆم ناگر ئۆتراغ. هاژوای قۆناغ بە قۆناغ
دەیهاژوا بە شەو و ڕۆژ. بە تیز ڕۆیین. چون بە تیز. حیفزن بکەی با حافیز!
حیفزن بکەی هەمو جاران. پێغەمبەر و هەر چوار یاران. ئاگادار بن لەوان سواران
نیگادار بون لە شای. چ بو. چ ڕەنگ دەستی شای؟ دە گەڵ ئیکلامێ کێشای. ئیکلامی کێشا لە شای
شا بزورگە لە بونیات. دەیزاوت و. دەیناخافت. ئاورەحمان پاشا دەهات:
"پاشای بەبان بە خێر هات. ئێران خۆشترە یان وڵات؟"
ئەورەحمان پاشا. دە عەقڵ دا دەڵێی ژیرە. دە قسان دا زۆر موببیرە: "ئەگەر
ئەزم. ئەگەر میرە. بۆیەم مەوتەن بە بیرە. خەڵکی دوژمن دەڵێن: گیرە!"
کە شا وای زانی خەبەر. سوێندی خوارد بە پێغەمبەر: "برای خۆمی. ئەی
برادەر! ها ئەفغان و. ها قاجەر. ها قۆشەن و. ها عەسکەر. ئەو جێی دەڵێی
بیچوە سەر!
"بیچوە سەر دە گەڵ ئالایە"
شا دەڵێ: "پێم بکە بەقایە! پیاوی دەنێرمە ڕجایە. خزمەت وەزیری بەغدایە"
پیاو هاتەوە بە موتڵەق. گەیە کن شای دەقاو دەق: "شام! بۆت بکەم قسەی هەق. وەزیرە وەک بەردێ ڕەق. ئەو غەیانی موستەهەق. لە سەر زینی ئەکەی شەق. بەغدایەی پێ ئەکەی لەق. ڕجایەت ناگرێ بە هەق!"
ڕجای نەگرت. شا پێی زانی. لە دڵی دەبوە بارگرانی. شا هەستا بوە سەر چۆکانی. هەردوک دەستی دان لە ڕانی: "مەگەر پاک ببڕینەوە ئێرانی. پاشا دە گەڵ سەلیم خانی. دەنێرمەوە کوردستانی!
"لە کوردستان با بخێوێ. ئێران و توران نەشێوێ. لە بەغدایە سەر ببڕێوێ. لێوی دابنێ لە سەر لێوێ. ئەرمی دەکەم هەر وەک مێوێ. دەری داوێم لەوێ نێوێ

"دەری دەکەم بە عەجەمان، بە هەوشار و موقەددەمان" راهی دەبون. چ قسە نەمان، ئەورحمان پاشا خۆش بێ، مەکێشە خەمان!

راهی بو دە گەڵ یاوەران، دە گەڵ ئەففان و قەجەران، میری میران، قران قران. بون بە سەری سەرعەسکەران، سوێندی خوارد بە پێغەمبەران: "بۆ شای دەنێرمەوە سەران!"

سرکە سرکە بە زارەوە: پاشای سور هاتە خوارەوە. بە ئەتباع و بە سوارەوە. بە خۆ و بە چەند هەزارەوە.

هەزار هەزار بو شورەت. عەجەم هەروەک قاژو کەوت. پاشا فەرموی:

"عەشیرەت! هەر خۆمانین بە مننەت. ئێمە چاکترین: ئێک و سەت. حەیفە بیین بەر غەیبەت!

"غەیبەتمان خەڵک دەیزانی". هات گەییە کەڵکێ گاڕانی. عەزریوە دەگرێ دیوانی.

هەر لە وێ دیوان دەگرا. پاشای بەبان پڕ فکرە. بانگی کردن کوڕ و برا: "مردن لەو حاڵەی چاترە. خۆ دەربەندتان لە فکرە؟

"لێم مەکەن بە ڕۆژی دەربەندی، قونو لێ نابوم دە کەندی، بە سەرو هێنام روزمردی، زۆر هەلاتن بە نامەردی"

هەلاتن بە بێ تەخسیر. حازری وەختێن هەمو میر.

"ئەی رۆستەمی زاڵی پیر!

جەهەندەم بێ و، زەمهەریر، عەرز ئاگر و، ئاسمان تیر، خۆی تێ داوێن

دەستەوشیر. دەربەندمان ناچێ لە بیر! بە جارێ دەربەندن گۆڕە. هەرچی هەڵێ زوڵف

شۆڕە!

هەرچی هەڵێ زوڵفدار بێ. چارشێو لە سەر، پەرچەم دیار بێ. لە ریزی یار و نەیار دیار بێ. هەروەک کوندەی دارەودار بێ. قاسیدی هات و هاوار بێ!"

قاسیدێک هات بە هەڕەمە: "خالینگ پاشا نەت بێ غەمە! قوشەنێکی بێ زەمزەمە. پاک کرێکرتە و عەجەمە. هەزارایان بۆ یەکێ کەمە!"

دابەش کرا یەک بە هەزار. لە نێو رۆمییان بو بە هاوار.

بو بە هاوار و غولو. زاقەزاق و قوە قو. فارسە جڵفە و عەبدە هو. تەتەر وەک تەیران دەچو. حاکمی زەهاوێ ون بو. حەوت حاکمان شیریان دەسو. داغدارن لە سەری تو!

لێی داغدارن حەفت و هەشتن. لە دێگەڵەی پێ گەیشتن. شارەزوری رادەماشتن.

دە بەر دەچون شارەزوری. کەیا پاشا گوتیە میری: "دەستو بگاتە دەستی سوری، هیچ کەس لێ ی نەدا بە شیری، سەرو ئەتباعی لێ وەربگیری، بە دیاری بێ بۆ وەزیری!

وەزیر لازمیە، پێی دەوێ. خواردنی نیە دە گەڵ خەوێ. لە بۆی بەر دەدەین سەر ڕەوێ. دڵی غاوە، دەسمان ناکەوێ. خەیاڵ مەکەن بڕوا لەوێ. غەمزە ڕە مێردان ناکەوێ. کێوی گەردون نابن دەوێ. شێر لە بەر ئاسکان ناڕەوێ"

هەمو شێرن بەلەک رەش. تێکەڵ بون. جۆش و خرۆش. پاشا فەرموی: "دەچمە پێش.

"خۆم دەچمە پێش لە بەر لۆمان. قشلە و شاری هەروەک چۆمان. دور و نێزیک هەروەک دۆمان. دیارە عەجەم ناکا بۆمان. دەست و باسک و ڕمبی خۆمان!"

لە دەست ڕمبی سەرداری، پاشای گوتیە خەزنەداری: "لە بۆم هەردو دیار

نەدیاری. لە بۆ ڕۆژی تەنگ و تاری، جێگای تۆم بە سەد سواری، تۆم برای باڵوڵی

نازداری!"

برای باڵولّی نامدار. لەوێی دانا بۆ سەرداد. داینا بو لە دیار نەدیار. لەشکری وانم هاتە خوار. یـەقین پترە سەد هەزار. ئەوان خەڵەتن لە پار.

پار کرا شەڕە کاوڕ. بانگە بانگ و گورە گوڕ. ناپەسەند و چرەچڕ. لێک هاڵان وەک قرمقڕ.

لێک هاڵان هەروەک قرقران. موژدەی جواب هات، گەییە کوڕان. وە خۆکەوتن، قسە بڕان. با بیکێشـن تەنگی سم خڕان. خودا بە کێهەماندەکا قڕان؟ سەرمان دەبڕن لە لا خڕان؟

سەرمان دەبڕن بە دەیجون. تاریکستان، ڕۆژی ڕون. خودا ئێکە و لەشکر دون، هەردوک لایـان بـەرەو ڕون، داخوا چ دەکاتن گەردون؟

گەردان گەردونی لە سەر. ئایات و ئیبنولحەجەر. پاکیان دەخوێندن لە بەر. ئەڵڵا، ئەڵڵاهونەکبەر.

ئەڵڵا ئەڵڵا کەمالّی بو. تەوەکول و ئیقبالّی بو. هەردو قۆڵی هەڵمالّی بو. وەک ڕۆستەمی لە زالّی بو.

هەر ڕۆستەم بو مەپرسە! تیفە و، دەبانە و، قەوسە! چـی ڕوی تـێ بکـا حەپەسـا. مـەردچاکان هیمـەت کێشا. نامەردان قوڤڵە پسا. هەڵمەیە فارسە جڵفە!

فارس چاوت بێ کوێر. زەینی دابوە زاتی زۆر. هەڵێ نەکێشا ساتۆر. دە تەنیشـتی گـرت وەک قـالۆر. دۆڵکێشی کرد وەک بۆر بۆر.

دۆڵکێشی کرد بە خەبەرم. یارێکی بێ دەفتەرم. سەلیم بەگ بێ چاوی سەرم

سەلیم بەگ بو میری میران، پەسەندی شا و وەزیران. چەند کەسی کوشتن بە

شیران، ڕو وەرناگێڕێ لە تیران

ڕو وەناگێڕێ هەر قەت. چابوکسواری بە هیبەت. چ سوارێک و چ سـێ سـەت، هـەموی کـردن کـەت و لەت. هاتە گەییە هەوی ئاخرەت. جوابی بە پاشەوە هات: "ئەی هاوار! میرن ئەنگوت. پاشا سەرت سەلامەت!"

پاشا بۆی هەڵکێشا ئاخ. حەیف بۆ مەردی قوچاخ. پەڕەی کەوتن وەک بەیداخ. بێ نازی کردن چـراخ. چۆڵی کردن قەرەداخ. دۆست و دوژمن دەڵێن: ئاخ!

تورک و عەرەب و عەجەم، پاکیان بۆیان کێشا خەم

بوە غەم لە عامی هەندەران. وەک وەزیران لە بۆ قڕان. ئەی پشتی باب و پدەران. ئـەی خۆشەویسـتی قەجەران! هێرش لە هەمو سەنگەران. ئومێدی هەمو نۆکەران!

قەڵغان بو لە سەر دەکرا. ئێستا لە هەمو ڕاستان شەڕە.

وێستا شەڕە لە مەیدانێ. سلێمان پاشـا مـەردی یـەکانێ. وەک داود لـە سـەر سـندانێ. وا چابوکـە لـە لێدانێ.

چابوکە بە زەبری قینەوە. سوار بە زرێ و بە زینەوە. سەری دەبرد بە برینەوە.

هەروا لێی دا و، ڕۆیی و بردی. ماشاڵڵا لە دەستوبردی، موغابیر بوی وازو مردی؟

موغابیر بو لە بۆ تۆ، ئەو خالیندی برای تۆ، برینی هێنا بون دو، لە دوای شکستەی وە چو.

لە دوای چو، مەردی مەیدانی. هەردوکیان بەبەی جەنگرانێ.

جەنگرانینە بەبەی. چونە تەبەعەی پاشای هەی، لێن ڕازی بن یەک بە دەی.

لێن ڕازی بن کەیفی خۆش بێ. بن دەوەمینیان ڕویان ڕەش بێ.

ڕوڕەشان ڕامەگرن ئەو چەلە. قومتیان هەروەک ڕێوی شەلە. یانە کێخوا بن یا لەلە.

با لەلەی منداڵ لە بەر بێ. یان گەڕۆڵی کاروانی کەر بێ. با تۆزی ئاشێ لە سەر بێ. حەیفە بلّحـی وا نۆکەر بێ.

بڵحێ بڵحان لە مەعدەنێ. خۆشیرەوەن لە قۆشەنێ. وەک ڕێوی دەچنە دەوەنێ. حیزی وا نانی مەدەنێ.

نان قابیلە بە شێر ئەنگێوان. لە بەر حەملەی سەربزێوان. شەڕی پاڵەوان و دێوان. سواری کەرگەدەنێ بە نوێژی شێوان. ڕوح هات، گەییە سەر لێوان.

ڕوح گەیینە سەر ئەنگوستێ. سوار لە سواری ڕاناوەستێ. مۆڵەت نیە یەک بە بستێ. شەقەی وەک سەفۆڵ دەبەستێ. هەروەکو پوشو و بەردەستێ. لەو جورەی ئاور هەڵ دەستێ.

ئاگری کورەی وا بە تاوە. مەردی بە ئاوبانگ و ناوە. ماخۆی تەنبورە و قەتڵاوە. نە لوتیان دیار بو، نە چاوە. لێکیان دەدان لە ناکاوە. زرێی داودی دەبون جاوە. بە تیغی دە تازە ساوە.

تیغی دە جگەربڕ سێ: شام و، دەبان و، قەزوێن. حەملەی شێری شێرشکێن. تێکەڵی کرد مێشک و خوێن.

مێشک و خوێن دەبو تێکەڵی. سواری لە ڕەنگ ئیمام عەلی. ماخۆی سوری قۆچە تەلی.

غەنیمی ویم هەزار هەنگ. چەندی کوشتن وەک ئەرژەنگ. خەنیمان دەکا بێ دەنگ.

لێی کوشتن حەفت و هەشت. لە زاتی شێرانی چەشت. لێت موبارەک بێ سەردەشت.

موبارەک بێ میری تازە. بێ ئەحمەد پاشای برازا. هاتنی ویم بێ خۆف و لەرزە. هەروەک گیو و فەلامەرزە. ڕمبی دەبو سەوزە. دیواودەر دەبو دو گەزە.

دو گەز دەبو هاتە دەرێ. ئەگەر ئاوری بێتە دەرێ.

.. عەولا بەگ هەمو جاران. سوارێک زێدەتر لە سواران. مەگەر سوار بو لە بۆ بناران. میسلی وەسمان پاشای جاران. گەییە تیپی فۆتەباران. دوی فرێ دان، گەییە چواران. لێیان کردە ئاگرباران.

ئاور و دەرمان و باروت. دوازدە گوللەی پارچەم جوت. کەوتنە سەر باخەڵی ڕوت. زەخم نەبو بەڵا سوت. پاشا دیار بو میر دەبزوت. دە وێ دا ئەسپی ئەنگوت.

ئەسپی ئەنگوت. کەوتە هەردێ. چی پێ ئەما ڕۆ بوە بەردێ. بۆی هەڵکێشا ئاهی سەردێ. جوبرائیل بە تۆم ئەسپارد. قەت مەردان ئەکەی ڕوزەرد.

مەردی لە هەمو جێیان. مەرد شەڕی کرد بە پێیان. لە تیپی ساحێب زرێیان. دوی فرێ دان گەییە سێیان. شاهیدییان بۆ دا سێیان. شێر شەڕی کرد بە پێیان.

شەڕی شێرشکێنی ئەڕ، سوار چابوک و دەس تەڕ، بە پێیانی دەکرد شەر.

"تەواو"

هەندێ سەرنجی پێویست لەم بەیتە:

1. وەکو لە بەیتەکەدا وتراوە و، هەمو سەرچاوەکانیش پشتی ئەگرن، بێژەری "بەیتی ئەورەحمان پاشا"، عەلی بەردەشانیە. زۆر بەیتی تر و چیرۆک و قسەی ئەستەقی بە پاڵ ئەدرێ. بێگومان پیاوێکی هەڵکەوتو بوە. حاجی قادری کۆیی لە ستایشی دا ئەڵێ:

دو "عەلی" ن، شاعیرن وەکو حەسسان

"بەردەشان" و"حەریر" ە مەسکەنیان

بەردەشان گوندێکە لە بناری شاخی ئاسۆس. عەلی هاوزەمانی ئەورەحمان پاشا بوە. بەڵام شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ژیانی نازانرێ و، پێ ناچێ شیعر و بەیتەکانیشی لە سەردەمی خۆی دا نوسرا بێتەوە، بەڵکو لە بەر کراون و، دەماودەم لە دیوەخان و کۆڕی دانیشتن دا وتراون.

2. سێ مەتنی نوسراوەی ئەم بەیتە لە بەر دەس دایە: مەتنی نۆسکارمان لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە دەمی ڕەحمان بەکری سابڵاخی بیستوە، مەتنی حوزنی موکریانی لە سییەکان دا کە باسی ئەکردوە لە

کۆی وەرگرتوە، مەتنی محەمەد تۆفیق وردی کە لە سەرەتای شەستەکان دا لە دەمی حەمەد ئەمینی کوردی ئێرانی وەرگرتوە.

مەتنەکەی نۆسکارمان لە هەمویان کورتترە و، مەتنەکەی وردی لە هەمویان درێژتر و کۆکترە.

3. هەر 3 مەتنەکە ناتەواون. ڕوداوەکان بە پچڕپچڕی و، هەندێکیان بە شێواوی و، بێ "تسلسل" ی مێژویی ئەگێڕێتەوە. لە گێڕانەوەی دەماودەم دا لێی کەم و زیاد کراوە و، هەندێ لە ناو و ڕوداوەکانی بەر ئاڵوگۆڕ و، هەندێ لە وشەکانی بەر دەسکاری کەوتون.

4. هیچ کام لەو 3 کەسەی ئەم مەتنەیان کۆ کردۆتەوە، لێکۆڵینەوەی بەراوردیان لە گەڵ مەتنەکانی تر و، لێکۆڵینەوەی مێژویی و زمانەوانییان لە سەر نەکردوە. مەتنەکەیان بە سادەیی بە کەموکورییەکانیەوە نوسیوەتەوە.

5. کاک کەمال ڕەئوف هەر 3 مەتنی کۆ کردۆتەوە. وشە نائاشناکانی لێک داوەتەوە و، پەراوێزی مێژویی بۆ نوسیوە.

ئەم مەتنە بە دەسکارییەکی کەمی هەندێ وشەوە لەو وەرگێڕاوە.

نۆسکارمان: 760 - 767. حوزنی موکریانی: گۆڤاری "رووناکی"، ژ 8، ساڵی 1، 3 ی نیسانی 1931. محمد توفیق ووردی: "بەیتی ئەورەحمان پاشای بەبە". بەغداد 1961. ل11 - 56.

## 2. 6. چیرۆکی: مامە یارە

نوسینی: م ج

لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوە نزیک بە شار گردێکی قوتی ڕوت و لماوی هەیە کە بە تەنیا و نەختێ دور لە گردەکانی تر وەک پاڵەوانێکی بە فیز و هێز، لوتی بە چەشنێ بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمان کە هەر وەکو بیەوێت بەو نزمی خۆیەوە شان لە شانی کورەکازاو وپیرەمەگرون بدات.

ئەم گردە بەفیزە، گلەییەکی ئەگەر لە بەختی خۆی بوبێ ئەویش لە لایەن ناوەکەیەوەیە. هەتا نزیکی 37 ساڵ لەمەوپێش پێیان ئەگوت "گردی گولان" بەڵام لەو ساڵانەدا خوا بە ئاواتی خۆی گەیاند و، بە ناوێک شاد بو کە هەرچۆنێ پێوەی بنازێ بۆی ڕەوایە لەوساوە پێ ی ئەڵێن "گردی مامەیارە".

پیر مامە یارە ئێستا لە تەپڵەسەری ئەو گردەوە سەیری کردەوەکانمان ئەکا، بە لای زۆر لە لاوەکانی ئەمڕۆوە بۆتە کەسێکی دێرین، ڕەنگە هەندێکتان هەر باسیشتان نەبیستبێ چونکە ژیانی ئەمیش و هی هەمو گەورەیەکی کەمان ون بوە. بەڵام من بەختیارانە بە چاو پێ کەوتنی شاد بوم. پیاوێکی باریکەڵەی کەڵەگەت بو. دو چاوی تیژ و ڕویەکی چرچی هەبو. بە ڕیش چەرمگی و سمێڵی بەرقرتێنراویەوە دیمەنێکی سەیری هەبو. ڕوخۆش و ڕەند بو. لە جلوبەرگا نەنتیکەخانەیەکی گیاندار بو. لە چراخان و ڕۆژانی هەینی دا زرێ و کڵاوزەری ئەپۆشی. جوتێ قەرەبینای زلی بە پشتیا شۆڕ ئەکردەوە. دو دەمانچەی ئەکرد بە بەریا. شیرێکی ئەبەست بەپشتیەوە. ڕمێکی درێژی ئەگرت بە دەستیەوە و بەو چەشنە لە پێش موتەصەریف و کاربەدەستان و خەڵکەوە ئەڕۆیشت.

مامە یارە بە تایبەتی خۆشەویستی هەمو منداڵێک بو و، هەمو منداڵێکیش لای ئەو خۆشەویست بو. لە شەوی چراخان دا ئەو ئەهاتایەو دەمانچەیەکی نەتەقاندایە زەماوەن دەستی پێ نەئەکرد. لە بەر ئەوە منداڵان بە چوار چاو چاوەڕوانی هاتنی ئەبون و هەر پریشکی باروت لە لولەی دەمانچەی ئەوەوە ئیتر ئاگربازی دەست پێ ئەکرا. لە بیرم دێت هەر وەختێ ئێمە: منداڵان، کە پێی ئەگەیشتین بە چنگ شەکری بە سەرا دابەش ئەکردین و، هەمیشە هەردو گیرفانی پڕ بو لەم چەشنە شتانە. چاک لە بیرم دێ دەستیشی ئەهێنا بە سەرمانا

و ئەیوت: "منالینە! هیوام هەر بە ئێوەیە" ئەوساکە، لە سێرەی منالیمانا، ئێمە مامە یارەمان تەنیا لەبەر شانایەن و بەرگی ئەنتیکە و چەرەی خۆش. خۆش ئەویست بەلام کە گەورە بوین و تێ گەیشتین ئەم پیرە جوامێرەمان لە لا خۆشەویستتر و گەورەتر بو.

پیر مامە یارە ناوی یار ئەحمەد کوڕی خدر بەگی هۆمەر ئاغای خەڵکی دێی وەننەرێنە بو کە لای شارباژێرە. هۆمەرئاغای باپیری یەکێک بو لە دوانزە سوارەی مەریوان. زۆر خۆشەویست بو لای ئەوڕەحمان پاشای بەبە. ئەوەندە خۆشەویست بوە لە لای کە پاشا ئەو شیرەی لە تاران فەتح عەلی شا پێشکەشی کرد بو دابویە. وەکو

تێگەیشتوین یارئەحمەد لە ساڵی 1804 دا لە وەننەرێنە لە دایک بوە. کە پێ ئەگا لە سەر رێوشوێنی باووباپیری ئەبێ بە نۆکەری پاشای بەبە. لە ساڵی 1840 دا لە لەشکری بەبە دائەنرێ بە ئەفسەری تۆپچی و هەتا شەڕەکەی کۆیە لەم فەرمانەدا ئەمێنێتەوە.

لە 1847 دا میانی ئەحمەدپاشای بەبە و دەوڵەتی عوسمانی تێک ئەچێ.

دەوڵەتی عوسمانی لە ژێر فەرمانی سەردار نەجیب پاشادا لەشکرێک ئەڕازێنێتەوە و ئەینێرێ بۆ سەر ئەحمەد پاشا. ئەحمەد پاشایش لەشکری لە رۆژئاوای کۆیە بەرامبەر بە یەک ئەوەستن. کات مانگی گوڵان ئەبێ. بارەگای ئەحمەد پاشا لە لای گردی ریزەتو هەڵئەدا. لەشکری کورد ئەوەندە ورەیان بە هێز بوە کە لە شکانی تورکەکان هەمو دڵنیا بون.

بەڵام داخی بە جەرگم بەختی رەشی کورد لێرەشا ئەی هێنا بو. ئێوارەی پێنجشەمو کە دوایی مانگ ئەبێ سەرباز و موچەخۆر داوای موچە ئەکەن. یەکێ لە وەزیرەکان بە پاشا ئەڵێ: "تولە هەتا برسی بێت چاکتر راو ئەکا" پاشا ئەمەی بە گوێ دا ئەچێ و ئەو رۆژە موچە نادات. ئەم قسەیە بە گوێی لەشکرەکە ئەکەوێتەوە. لە سەرێکەوە وەرنەگرتنی موچە و لە سەرێکی ترەوە بڵاوبونەوەی قسەیەکی وا سوک و، جگە لە مانەیش چاوڕاوی هەندێ، کە گۆیا، شەڕکردن لە گەڵ لەشکری خەلیفە پێچەوانەی دین و بڕوایە، بون بە مایەی سەرپێچی لەشکر و، لە ئەنجاما هەمو قسە ئەکەن بە یەک کە ئەو شەوە بڵاوەی لێ بکەن و، تەقەی تفەنگێک ئەکەن بە نیشانەی بڵاوە کردن. بریندار ئاغای بێنباشی شەوێ بە مەی زانی. زو رایکرد بۆ چادری پاشا کە خەبەری بداتێ. هەر لەو کاتەدا تەقەی تفەنگێک دێت دەستبەجێ لەشکر دەست ئەکا بە بڵاوە کردن. ئەحمەد پاشای بەدبەخت کە ئەمە ئەبینێ سوار ئەبێ و لە گەڵ چەند نۆکەرێکا سەری خۆی هەڵئەگرێ. بەم رەنگە دوا حوکمداری بەبە لە وڵاتی ماد و داری دەرئەچێ.

لەشکری تورک لەم بڵاوەیە ئاگادار نابن. بۆ سبەینێ دێنە پێشەوە بۆ شەڕ.

بەڵام هیچ بەرامبەریەک نابینن و تێ ئەگەن کە کەسیان لە بەرامبەر نەماوە ئیتر بە سەربەستی پێش ئەکەون. بەڵام کوتوپڕ تۆپخانەی ئەحمەد پاشا دەس ئەکا بە گوللە باراندن بە سەریانا. ئەیان پەشۆکێنێ. سەرداری تورک تێ ئەگا کە لە هەندێ تۆپچی بەولاوە کەسی تر نەماوە فەرمان ئەدا کە بیان گرن. لەشکرەکە چواردەوری

یارئەحمەدی تۆپچی داو بە دیل گرتیان. نەجیب پاشا ئەم ئازاییە کە یارە نواند بوی زۆری پێ خۆش ئەبێت. بانگی ئەکاتە لای خۆی و ئەم گفتوگۆیەیان ئەبێ:

نەجیب پاشا: لەشکری پاشاکەتان هەمو بڵاوەی کرد تۆ بۆچی بە تەنیا بەرامبەریت کرد؟

یارە: من فەرمانبەرم تۆپخانە بە من سپێردراوە. فەرمانی شەڕم پێ درا بو.

کاری خۆم بە جێ هێنا.

نەجیب پاشا: فەرماندەرەکەت سەری خۆی هەڵگرت تۆ بۆچی دەستت لە شەڕ هەڵئەگرت؟

یارە: وەکو وتم فەرمانی شەڕم وەرگرتبو. بەڵام لە پاش ئەوە فەرمانی شەڕ نەکردنم وەرنەگرت.

لە سەر ئەم قسە لاوچاکانەیە نەجیب پاشا پتر مامە یارەی ئەچێ بە دڵا و ئەڵێ: بۆ ئەم لاوچاکیەت ئەمەوێ پاداشتێکت بدەمەوە چیت ئەوێ بڵێ؟

مامە یارە: خوا پاشای خۆم بهێڵێ هیچم ناوێ.

نەجیب پاشا: پاشای خۆت ئەما ڕۆیشت. ئیتر وڵاتەکەتان کەوتە ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانیەوە دڵویستت چیە بڵێ؟

مامە یارە: لە پاش ئەمە ژیانم ناوێ تا ماڵی دنیام بوێت.

نەجیب پاشا بە چاوێکی ئافەرینکاری و دۆستیەوە پیا ڕوانی و گوتی: باشە.

بەڵام هەر ئەو ڕۆژە نەجیب پاشا پێی زانی کە یارە دێیەکی بە بەرات بە دەستەوەیە. فەرمانی بەراتەکەی بۆ تازە کردەوە. دێیەکە ناوی کانی دڕکەی سەگان بو کە ئێستا بە دەست ئەحمەد ئاغای گوسالەی خزمێوەیەتی.

ئەوی ئێستا لەو گۆڕە تاریک و تەنیایەی گردی گوڵان دا ئەحەسێتەوە و گردەکە بە ناویەوە ناو نراوە. ئەم میللەتپەروەرە گەورەیە کە 37 ساڵە بە داخەوە چاوەڕوانی جەژنی کورد ئەکات.

1. ڕەند: قسە خۆش و گورجوگۆڵ
2. شارئاین: تتویج
3. وا بە ناوبانگە ئەم تفەنگە کەس نەیتەقانوە. ئەو شەوە ڕەشەبا بوە. تفەنگێک بە کۆڵەکەی خێوەتێکا هەڵ واسراوە. کەوتۆتە خوارەوە و تەقیوە ئەمیش دیسانەوە کولۆڵی کورد. چونکە ئەشیا کە پاشا بیزانیایە بتوانێ بەربەستی تەگبیرەکەیان بکردایە بەوە بە سەر دوژمان سەرکەوتنایە.

"دیاری لاوان"، بەغداد، 1932.

ڕەنگە نوسەرەکەی "مەحمودجاودەت" بێ.

# پاشکۆی سێیەم

## 3. لیستی بەڵگە

1. نامەی شا سوڵتان حسێنی صەفەوی بۆ سوڵتان مستەفا خانی عوسمانی
بابەت: دەستدرێژیی سلێمان بەبە بۆ سەر ناوچەکانی سنوری ئێران و. داوای سەرکوتکردنی
ساڵ: نەنوسراوە بە مەزەنتە 1109ک
سەرچاوە: نوائی، "اسناد و مکاتبات..". ص 127 - 130.
2. نامەی شا سوڵتان حسێنی صەفەوی بۆ سوڵتان مستەفا خانی عوسمانی
بابەت: سەرکوتکردنی سلێمان بەبە
ساڵ: 1111ک
سەرچاوە: نوائی، "اسناد ومکاتبات..". ص 122 - 126.
3. نامەی فەتح عەلی شا بۆ عەلی پاشای والی بەغداد
بابەت: دانانەوەی ئەورەحمان پاشا بە حاکمی بابان
ساڵ: 1220 / 1805
سەرچاوە: نصیری، 1 / 51.
4. نامەی فەتح عەلی شا بۆ والی بەغداد
بابەت: گێڕانەوەی ئەورەحمان پاشا بۆ حاکمێتی بابان
ساڵ: 1221 / 1806
سەرچاوە: نصیری، 1 / 55.

5. نامەی میرزا شەفیع، صەدری ئەعزەمی ئێران، بۆ صەدری ئەعزەمی عوسمانی
بابەت: شەڕی زرێبار و، دەستدرێژی لەشکری والی بەغداد بۆ سەر فەڵەمڕەوی ئێران
ساڵ: 1221 / 1806
سەرچاوە: نصیری، 1 / 57.

6. فەرمانی فەتح عەلی شا بۆ عەباس میرزا
بابەت: شەڕ ڕاگرتن و، ئازاد کردنی سلێمان کەهیە
ساڵ: 1221 / 1806
سەرچاوە: نصیری، 1 / 61.

7. نامەی محەمەد حسێن خان بۆ عەباس میرزا
بابەت: ئەورەحمان پاشا و، پەلاماردانی بەغداد بۆ لابردنی والی و، دانانی والی نوێ
ساڵ: 1225 / 1810
سەرچاوە: نصیری، 1 / 119.

8. نامەی محەمەد صادق خان بۆ میرزا محەمەد شەفیع، صەدری ئەعزەمی ئێران
بابەت: ڕەفتاری توندوتیژی ئەورەحمان پاشا لە گەڵ کاربەدەستانی بەغداد
ساڵ:1225 / 1810
سەرچاوە: نصیری، 1 / 214.

9. نامەی محەمەد عەلی میرزا بۆخورشید پاشا، صەدری ئەعزەمی عوسمانی
بابەت: جەلالەددین و، مەسەلەی بابان و مەحمود پاشا
ساڵ: 1228 / 1813
سەرچاوە: نصیری - 1 / 164 - 165.

10. نامەی محەمەد حسێن خان بۆ ئەحمەد چەلەبی
بابەت: تالانکردنی ئێرانییەکان و، باسی ئەورەحمان پاشای کۆچکردو
ساڵ: 1229 / 1814
سەرچاوە: نصیری، 1 / 185.

11. نامەی محەمەد عەلی میرزا بۆ سلێمان ئەفەندی، باڵیۆزی عوسمانی
بابەت: بارمتەی بابانی لای ئێران
ساڵ: 1235 / 1819
سەرچاوە: نصیری، 1 / 237.

12. نامەی محەمەد عەلی میرزا بۆ ئەحمەد پاشای والی موسڵ
بابەت: زەمی داود پاشا و، تاوانبار کردنی کوڕانی ئەورەحمان پاشا بە ئاژاوە گێڕان لە نێوان هەردو دەوڵەت دا
ساڵ: 1237 /1821
سەرچاوە: نصیری، 1 / 253.

13. نامەی عەباس میرزا بۆ لۆرد سترافۆرد کانینگ، ئێلچی ئینگلیز لای بابی عالی
بابەت: ڕونکردنەوەی هۆکانی ناکۆکی ئێران و عوسمانی دەربڕینی ئامادەیی بۆ ئاشتبونەوە.

ساڵ: 1238 / 1822

سەرچاوە: میرزا صالح، 1 / 246 - 247.

14. نامەی قائیم مەقام بۆ جۆرج ولک، ئێلچی ئینگلیز لای دەرباری قاجار

بابەت: مەرجەکانی ئێران بۆ پێکهاتن لە گەڵ عوسمانی

سەرچاوە: میرزا صالح، 1 / 248 - 251.

15. نامەی قائیم مەقام بۆ عەسکەری ئەرزڕۆم

بابەت: هۆی درێژە کێشانی جەنگی ئێران و عوسمانی و، ئامادەیی ئێران بۆ ئاشتی

ساڵ: 1238 / 1822

سەرچاوە: میرزا صالح - 1 / 252 - 254.

16. نامەی قائیم مەقام بۆ جۆرج ولک

بابەت: مەرجەکانی ئێران بۆ ئاشتی

ساڵ: 1238 / 1822

سەرچاوە: میرزا صالح، 1 / 261.

17. فەرمانی فەتح عەلی شا بۆ عەباس میرزا

بابەت: دەستکاری رێککەوتننامەی یەکەمی ئەرزڕۆم سەبارەت بە ئێلی بابان

ساڵ: 1239 / 1823

سەرچاوە: نصیری، 2 / 42: گزیدە اسناد سیاسی، 1 / 143.

18. نامەی عەباس میرزا بۆ محەممەد ئەمین رەئوف پاشا، والی ئەرزڕۆم

بابەت: داوای دەستکاری رێککەوتننامەی یەکەمی ئەرزڕۆم سەبارەت بە ئێلی بابان

ساڵ: 1239 / 1823

سەرچاوە: نصیری، 2 / 49.

19. نامەی عەباس میرزا بۆ محەممەد ئەمین رەئوف پاشا، والی ئەرزڕۆم

بابەت: داوای دەستکاری رێککەوتننامەی یەکەمی ئەرزڕۆم سەبارەت بە ئێلی بابان

ساڵ: 1239 /1823

سەرچاوە: نصیری، 2 / 51.

20. نامەی محەمەد حسێن خان سەرداری ئێرەوان بۆ محەمەد ئەمین رەئوف پاشا، والی ئەرزڕۆم

بابەت: داوای دەستکاری رێککەوتننامەی یەکەمی ئەرزڕۆم سەبارەت بە ئێلی بابان

ساڵ: 1239 / 1823

سەرچاوە: نصیری، 2 / 52.

21. نامەی محەمەد حسێن خان سەرداری ئێرەوان بۆ حسێن پاشا، موحافیزی قارس

بابەت: داوای دەستکاری رێککەوتننامەی یەکەمی ئەرزڕۆم سەبارەت بە ئێلی بابان

ساڵ: 1239 / 1823

سەرچاوە: نصیری، 2 / 54 - 55.

22. فەرمانی عەباس میرزا بۆ مەحمود پاشای بابان

بابەت: داوای سوارەی بابان بۆ بەشداری لە شەڕی روس دا

ساڵ: 1242 / 1826
سەرچاوە: نصیری، 2 / 86.

23. فەرمانی عەباس میرزا بۆ مەحمود پاشای بابان
بابەت: ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنی ئاشتی روسی - ئێرانی
ساڵ: 1243 / 1827
سەرچاوە: نصیری، 2 / 96.

24. نامەی میرزا ئاقاسی بۆ صەدری ئەعزەمی عوسمانی
بابەت: کاروباری سنور، عەشایەر، بازرگانی، شکات لە میری رەوانـدز، داوای لابـردن ئەحمـەد پاشـای بابان
ساڵ. 1257 / 1841
سەرچاوە: گزیدە اسناد سیاسی، 1 /265.

25. نامەی میرزا ئاقاسی بۆ صارم ئەفەندی سەفیری عوسمانی
بابەت: شکات لە میری ڕەواندز، کە دەستدرێژی کردۆتە سەر ئـەرزی ئێـران و، شـکات لـە عـەلی رەزا پاشای والیی بەغداد چونکە ڕێگای لێ ناگرێ
ساڵ: 1258 / 1841
سەرچاوە: نصیری، 2 / 197.

26. فەرمانی محەمەد شا بۆ میرزا تەقی خان (ئەمیر کەبیر)
بابەت: دەسەڵات دان بە میرزا تەقی خان بۆ گفتوگۆ، سلێمانی بە موڵکی خۆی ئەزانێ
ساڵ: 1262 / 1848
سەرچاوە: نصیری، 2 / 213.

27. نامەی وەزیری موختاری ئینگلیز بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران
بابەت: شەڕی والیی ئەردەڵان و قایمقامی سلێمانی
ساڵ: 1262 / 1846
سەرچاوە: گزیدە اسناد سیاسی، 1 /545.

28. نامەی ئەورەحمان پاشای بابان بۆ محەمەد عەلی میرزا
بابەت: ئاگاداری کردنی لە وەرگرتنی بیورلدی و خەلعەتی والیی ئەرزڕۆم و گلدانەوەی نێردراوەکە.
ساڵ: نەنوسراوە بە مەزەنە 1222ک / 1807
سەرچاوە: نصیری، 1 / 210.

29. نامەی مەحمود پاشای بابان بۆ سوڵتانی عوسمانی
بابەت: دەربڕینی سوپاس و ستایش سەبارەت بە ناردنی فەرمان و خەلعەت و بڕینەوەی بابان و کۆیە و هەریر
ساڵ: 1230 / 1814
سەرچاوە: نصیری، 2 / 203.

30. نامەی مەحمود پاشای بابان بۆ سەید مەحمود ئەفەندی، موفتیی کەرکوک
بابەت: گەیشتنی لەشکری ئێران

ساڵ: 1230 / 1815

سەرچاوە: نصیری، 2 / 205.

31. نامەی مەحمود پاشای بابان بۆ گەورەکانی کەرکوک

بابەت: دەرکردنی عەبدوڵلا پاشا لە کەرکوک

ساڵ: 1231 / 1815

سەرچاوە: نصیری، 2 /206.

32. نامەی مەحمود پاشا بۆ داود پاشا، والی بەغداد

بابەت: داوای لێبوردن

ساڵ: 1240 / 1824

سەرچاوە: نصیری، 2 / 66.

33. نامەی مەحمود پاشای بابان بۆ سەید مەحمود ئەفەندی، موفتی کەرکوک

بابەت: رێککەوتنی روس و ئێران

ساڵ: 1243 / 1827

سەرچاوە: نصیری، 2 / 98.

34. نامەی عەبدوڵا بەگی موتەصەریفی سلێمانی بۆ والی ئەرزرۆم

بابەت: هێرشی لەشکری ئەردەڵان بۆ سەر بابان و تێکشکاندنی

ساڵ: 1258 / 1843

سەرچاوە: نصیری، 2 / 184 - 186.

## بیبلیۆگرافی

به زمانی عەرەبی

امین زکی، محمد: "تاریخ السلیمانیه و انحائها"، ترجمه: محمد جمیل بندی الروژبیانی. شرکه الطباعه و النشر المحدوده، (بغداد 1951)

البصری، عثمان بن سند الوائلی: "مطالع السعود". تحقیق: الدکتور عماد عبد السلام رووف و سهیله عبدالمجید القیسی. (الموصل 1991).

- - -: "اصفی الموراد فی سلسال احوال الامام خالد". المطبعه العلمیه (مصر 1310 ه)

الخال، محمد: "الشیخ معروف النودهی البرزنجی"، (بغداد 1961)

- - -: "البیتوشی"، (بغداد 1958)

الراوی، د. جابر: "الحدود الدولیه ومشکله الحدود العراقیه الایرانیه". (بغداد 1973)

العزاوی، عباس: "تاریخ العراق بین احتلالین"، 8 جلد، (بغداد)، طبعه ثانیه، الشریف الرضی، (قم 1410)

العمری، یاسین: "غرائب الاثر فی حوادث ربع القرن الثالث عشر". نشره: محمد صدیق الجلیلی، (الموصل 1940)

فائق بک، سلیمان: "الممالک الکولەمەن فی بغداد". نقله من الترکیه: محمد نجیب ارمناوی، (بغداد 1961)

فریزر. جیمس بیلی: "رحله فریزر الی بغداد". (بغداد 1964)
القزلجی. محمد: "التعریف بمساجد السلیمانیه ومدارسها الدینیه". (بغداد 1938)
الکرکوکلی. الشیخ رسول: "دوحه الوزراء فی تاریخ وقائع بغداد الزوراء". نقله من ترکیه: موسی کاظم نورس، (بیروت بت)، طبعه ثانیه، منشورات الشریف الرضی، (قم 1413)
لونگریک، ستیفن همسلی: "اربعه قرون من تاریخ العراق الحدیث". ترجمه: جعفر الخیاط، (بغداد 1968)
المدرس. عبدالکریم محمد: "علماءنا فی خدمه العلم والدین". عنی بنشره: محمد علی القرهداغی، دار الحریه للطباعه و النشر، (بغداد 1983)
الموصل. سید فتح الله القادری: "ملحمه الموصل". تحقیق سعید الدیوهچی، (بغداد 1965)
الموکریانی، حسین حزنی: "موجز تاریخ امراء سوران"، ترجمه: محمد الملا عبدالکریم، (بغداد 1967)
نظمی زاده، مرتضی افندی: "گلشن خلفا". نقله من الترکیه: موسی کاظم نورس، (النجف الاشرف 1971)
نیبور: "رحله نیبور الی العراق". ترجمه: الدکتور محمود حسین الامین، (بغداد 1965)
نوار، الدکتور عبدالعزیز سلیمان: "داود باشا والی بغداد". (القاهره 1967)
- - -: "تاریخ العراق الحدیث". (القاهره 1968)

به زمانی فارسی

ادموندز. سیسیل جی: "کردها، ترک ها، عرب ها". ترجمه: ابراهیم یونسی، انتشارات روزبهان، (تهران 1367 ش)
ادیب الشعرا، میرزا رشید: "تاریخ افشار". باهتمام: محمود رامیان و پرویز شهریار افشار، (تبریز 1346 ش)
بابانی. عبدالقادر ابن رستم: "تاریخ و جغرافیای کردستان، موسوم به: سیر الاکراد". به اهتمام: محمد رئوف توکلی. (تهران 1366 ه ش)
بدلیسی، امیر شرفخان: "شرفنامه، تاریخ مفصل کردستان". به اهتمام: محمد عباسی، (تهران 1343 ه ش).
پارسا دوست، د. منوچهر: "ریشه‌های تاریخی اختلافات جنگ عراق و ایران"، شرکت سهامی انتشار، (1367 ه ش)
پورگشتال، هامر: "تاریخ امپراطوری عثمانی"، ترجمه: میرزا زکی علی آبادی، به اهتمام: جمشید کیان فر، 5 جلد، (تهران 1367 - 1369 ه ش)
دنبلی، عبدالرزاق: "ماثر سلطانیه". باهتمام: غلام حسین صدری افشار، (تهران 1392 ه ش)
فخر الکتاب، میرزا شکرالله سنندجی: "تحفه ناصری در تاریخ و جغرافیای کردستان". باهتمام د. حشمت الله طبیبی، انتشارات امیر کبیر، (تهران 1366 ه ش)
گلستانه، ابو الحسن بن محمد امین: "مجمل التواریخ"، بسعی و اهتمام مدرس رضوی، انتشارات دانشگاه تهران، چاپ سوم، (تهران 2536)
لگهارت، لارنس: "انقراض سلسله صفویه". ترجمه: مصطفی قلی عماد، انتشارات مروارید، (تهران 1364 ه ش)
مردوخ کردستانی، شیخ محمد: "تاریخ مردوخ"، چاپخانه ارتش، (تهران بت)

معتمدی، دکتر مهیندخت: "مولانا خالد نقشبندی و پیروان طریقت او". انتشارات پاژنگ، (تهران 1368)

محمد معین: "فرهنگ فارسی"

مستوره، ماه شرف خانم: "تاریخ اردلان". بە اهتمام: ناصر أزادپور، چاپخانەی بهرامی، سنندج 1343 ه ش.

مشیر الدوله، میرزا سید جعفر مهندس باشی: "رساله تحقیقات سرحدیه". بە اهتمام محمد مشیری، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، (تهران 1348 ش)

مهدوی، عبدالرضا هوشنگ: "تاریخ روابط خارجی ایران". انتشارات امیر کبیر، (تهران 1364 ه ش)

مهدی خان: "تاریخ جهانگشاهی نادری". (تهران 1311 ش)

میرزا صالح، غلامحسین: "اسناد رسمی در روابط سیاسی ایران و روسی و عثمانی". نشر تاریخ ایران، 2 جلد، (تهران 1365 ش)

نامی اصفهانی، میرزا محمد صادق موسوی: "تاریخ گیتی گشا در تاریخ زندیه". با مقدمەی: سعید نفیسی (تهران 1366 ه ش)

نفیسی، سعید، "تاریخ اجتماعی و سیاسی ایران در دوره معاصر". 2 جلد، انتشارات بنیاد، (تهران 1366 ش)

نصیری، د. محمد رضا: "اسناد سیاسی دورەی قاجاریه". 4 جلد، انتشارات کیهان، (تهران 1366 - 1368 ه ش)

نوانی، دکتر عبدالحسین: "اسناد مکاتبات سیاسی ایران از سال 1105 - 1135 هجری - قمری". موسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی، (تهران 1363ه ش)

- - -: "نادر شاه و بازماندگانش". انتشارات زرین، (تهران 1368 ش)

واحد نشر اسناد: "گزیده اسناد سیاسی ایران و عیمانی دوره قاجاریه". 6 جلد، دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی وابسته به وزارت امور خارجیه جمهوری اسلامی ایران، (تهران 1369 ش)

ورهرام، دکتر غلامرضا: "تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران در عصر زند" انتشارات معین، (تهران 1366 ه ش)

وقائع نگار کردستانی، علی اکبر: "حدیقەی ناصری در جغرافیا و تاریخ کردستان". بە اهتمام: محمد رئوف توکلی، (تهران 1364 ه ش)

بە زمانی کوردی

ابن الحاج، مەلا محەممەد حاجی حەسەن: "مەهدی نامە"، لێکۆڵینەوە و پێشکەش کردنی: محەممەد عەلی قەرەداخی، بەغداد، 1975.

نوسکارمان: "تحفەی مظفریە". هێنانەوەی بۆ سەر رێنوسی کوردی: هێمن موکریانی، چاپکردنەوەی سەیدیان.

امین زکی، محمد: "خولاصەیێکی تاریخی کوردو کوردستان". بەرگی 1 و 2 و 3 لە یەک بەرگ دا، چاپکردنەوەی سەیدیان

- - -: "تاریخی سلیمانی و ولاتی". (بغداد 1939)

ریچ، کلودیۆس جێمس: "گەشتی ریچ بۆ کوردستان 1820". وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە: محەممەد حەمە باقی، (تەوریز 1992)

خاڵ، شێخ محمدی: "فەرهەنگی خاڵ"
سجادی، علاء الدین: "مێژووی ئەدەبی کوردستان"، چاپخانەی مەعارف، (بەغداد 1952)
- - -: "دو چامەکەی نالی و سالم"، چاپخانەی مەعارف، (بەغداد 1973)
موکریانی، سید حسین حزنی: "تاریخی حکمدارانی بابان" چاپخانەی زاری کرمانجی، (رەواندز 1931)
سیوچی، مەلا محەممەد: "تذکرە العوام یا بەیتی ئەوەل و ئاخر"، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداخی، (سلێمانی 1979).
دیوانی شیعر
رەنجوری، مەلا عومەر: "دیوانی رەنجووریێ"، لێکۆڵینەوەی: محەمەد عەلی قەرەداخی، (بەغداد 1983)
سالم، ئەورەحمان بەگی صاحێبقران: "دیوانی سالم" بلاو کردنەوەی: گیوی موکریانی، چاپخانەی کوردستان، (هەولێر 1973)
کوردی، مستەفا بەگی صاحێبقران: "دیوانی کوردی"، بلاو کردنەوەی: گیوی موکریانی، چاپخانەی کوردستان، (هەولێر 1961)
نالی، مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی: "دیوانی نالی"، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، (بەغداد 1976)
گۆڤار و ڕۆژنامە
بەربەشانی، عەلی: "عەلی بەربەشانی: بەیت"، ژین، ژ 892 ی 6 /11؛ ژ 895 ی 27 11؛ ژ 879 ی کانونی 1 / 1947، سلێمانی.
پیرەمێرد: "یا ڕۆحی مەولانا خالید: بۆ ئیبراهیم پاشا"، ژین، ژ 842، 10/10 1946، سلێمانی.
- - -: "وتار - سەرزەنشت"، ژین، ژ 887، 9/18/ 1947، سلێمانی.
- - -: "وتار - دوایی حوکمدارانی بابان"، ژین، ژ 894، 1947/11/20، سلێمانی.
- - -: "وتار - ئەندازە"، ژین، ژ 936، 1947/9/23، سلێمانی.
الخال، محمد: "مخطوطات مکتبە الخال"، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب1، ژ2، 1973، بەغداد، ل 637 - 690.
خورشید، فواد حمە: "مدینە السلیمانیە: دراسە جغرافیتها التاریخیە"، کاروان، ژ 54، نیسانی 1987، هەولێر، ل 150 - 159.
رەسول، د. عزەدین مستەفا: "عەلی بەربەشانی - ژیان و بەرهەمەکانی"، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژ 16، زانستگای بەغداد، 1973.
ڕۆژبەیانی، جەمیل بەندی: ڕۆژی نوێ، س 1 ژ 4، مارتی 1960، سلێمانی.
هاوکاری، ژ 1208، 1988/11/28، بەغداد.
ڕۆژی نوێ: "تۆمار: پەرەکاغەزێ لە بارەی بابان و کۆچی ئەورەحمان پاشاوە"، ڕۆژی نوێ، س 2 ژ1، مارتی 1961.
السلفی، عبدالمجید: "الشیخ العلامە محمد بن حسن الالانی الکردی و منظومە المحاسن الغرر"، کاروان، ژ 36، ئەیلولی 1985، هەولێر، ل 150 - 151.
فوئاد، کەمال: "لە شیعرە بلاو نەکراوەکانی سالم"، چریکەی کوردستان، لەندەن.

فیضـی، امـین: "بابـان کوردلرنـدن قابلیـت حربیـه"، ژیـن، س1، ع 23، 335 رومـی / 1919ز، ئەستەمول.

- - -: "بابان کوردلرندن قابلیت صناعیه و علمیـەلری"، ژیـن، س1، ع 25، 335 رومـی / 1919ز، ئەستەمول.

قرەداخی، محمد عەلی: "الشیخ عبدالله الخرپانی من خلال مخطوطا ت مكتبته"، گۆڤاری كـۆڕی زانیـاری كورد، ب 2، ژ 2، 1974، بەغداد، ل 262 - 266.

کۆڕی زانیاری کورد: "پاراستنی پاشماوەی کۆنمان لە کاری کـۆڕدا"، گۆڤاری کـۆڕی زانیـاری کـورد، ب1، ژ1، 1973، بەغداد، ل 283 - 284.

م. ج. (مەحمود جەودەت): "مامە یارە"، دیاری لاوان، 1934، بەغداد، ل 26 - 73.

محمد، محمود احمد: "وثیقه تاریخیه نادره: حلقه مفقوده من تاریخ شـهرزور او مـذكرات علمـاء الـدین البلباسیین.."، کاروان، ژ 36، ئەیلولی 1985، هەولێر، ل 138 - 150.

- - -: "شاعر بابانی..."، کاروان، ژ 50، تشرینی دوەمی 1986، هەولێر، ل 150 - 159.

ملا کریم، محمد: "عود علی بدء فـی الرسـائل البابانیـه"، کـاروان، ژ 19، شـوباتی 1984، هـەولێر، ل 143 - 148.

- - -: "عەقیدەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی"، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب 8، 1981، بەغداد، ل 199 - 223.

وهبی، توفیق: "ئەز خولامی چـاوی دە كلـۆلێم - خـانی قـەیفـان"، دەنگـی گێتـیی تـازە، س 1، ب 5، شوباتی 1944، بەغداد، ل 3 - 8.

یاملکی، عبدالعزیز: "کرد تاریخندن بابان خانـدانی"، ژیـن، س1، ع 9 و 11، 13، 15، 16، 335 ی رومی / 1918 - 1919ز، ئەستەمول.

یوسف، عبدالرقیب: "بەشـێک لـە ژیـان و بەرهـەمی زانـا و شـاعیری کـورد مـەلا عومـەری رەنجـوری شالەبەگی"، رۆشنبیری نوێ، ژ 107، ئەیلولی 1985، بەغداد، ل 145 - 179.

# مێژووەکانی ئەردەڵان

**-1-**

هیچ کام لە میرایەتیەکانی کورد، ئەوەندەی میرایەتی ئەردەڵان، لە سەردەمی خۆیان و لە دوای خۆیان، لە سەری نەنوسراوە و روداوەکانیان وا بە رێکوپێکی تۆمار نەکراوە. ئەگەر مەلا محەمەد شەریف لە سەر داوای خوسرەو خان و محەمەد ئیبراهیمی ئەردەڵان لە سەر داوای ئەمانوڵڵا خان مێژووەکانیان نوسی بێ، ئەوا داهێنانی نەریتی نوسینەوەی مێژوی ئەردەڵان پێ ئەچێ لە سەردەمی خوسرەو خان(؟ - 1206) دا داهێنرا بێ و، دوای ئەویش ئەمانوڵڵاخانی کوڕی (؟ - 1240) دریژەی پێدابێ. ئەوان بۆ هەر مەبەستێ ئەمەیان کرد بێ، بێگومان چاکەیەکی گەورەیان لە گەڵ مێژوی کورد کردوە.

**-2-**

**"مذکرات"ی مەئمون بەگی کوڕی بێگە بەگ**

شەرەفخان لە باسی مەئمون بەگی کوڕی بێگە بەگ دا ئەڵێ (شەرەفنامە: 202): ئێستا کە ساڵی 1005 ە مەئمون بەگ سنجاقی حیللەی بە دەستەوەیە. ئەو مەئمون بەگە ماوەی 12 ساڵ و 10 مانگ لە قەڵای بەغدادا زیندانی بوە. ئەو سەردەمەی سنجەقی حیللەی بە دەستەوە بوە، (مذکرات: 36) یاداشتێکی بە زمانی تورکی، لە مانگی رەبیعی ئاخری ساڵی 985 دا، لە شێوەی سکاڵانامەدا، بۆ سوڵتان مورادی عوسمانی نوسیوە، ئەگونجێ ئەم "مذکرات" ە بە یەکەمین سەرچاوەی دۆزراوە بژمێردرێ لە سەر ئەم بنەماڵەیە.

ئەم نامەیە ئەگەرچی 20 ساڵ پێش تەواوکردنی شەرەفنامە نوسراوە، بەڵام نە شەرەفخان و نە هیچ کام لە مێژونوسەکانی ئەردەڵان کەڵکیان لەم سەرچاوەیە وەرنەگرتوە، چونکە بۆ ئەوان نەزانراو بوە و، لە حەفتاکانی ئەم چەرخەدا لە ئارشیفی عوسمانی دا دۆزراوەتەوە. بۆ یەکەم جار، لێکۆڵەرەوەی تورک عیصمەت بارماقسز ئۆغلو ئەم یادداشتەی لە ئارشیفی تورکیادا دۆزیوەتەوە و، ساڵی 1973 لە گۆڤاری "بولتن" دا

بڵاوی کردۆتەوە. جەمیل ڕۆژبەیانی و شوکر مستەفا لە تورکیەوە کردویانە بە عەرەبی و بە پەراوێز و لێدوانەوە، ساڵی 1980 لە بەغداد، بڵاویان کردۆتەوە.

مەئمون بەگ، ئەم یادداشتەی بە نیازی نوسینەوەی مێژووی بنەماڵەکەی نەنوسیوە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوە: ناڕەوایەتی حوکمی زۆراب بەگی مامی (سەر بە دەربـاری صـەفەوی) لـە قـەڵای مـەریوان و، ناڕەوایـەتی حوکمی محەمەد بەگی مامەکەی تری (سەر بە ئاستانەی عوسمانی) لـە قـەڵای سـرۆچک و، دڵسـۆزی خـۆی و باوکی خوالێخۆشبوی بۆ دەوڵەتی عوسمانی و، ڕەوایەتی حوکمی ناوچەی ئـەردەڵان بـۆ خـۆی، بـە سـوڵتانی عوسمانی، بسەلمێنێ.

ئەگەر چی ئەم "مذكرات" ە ئاگاداری و هەواڵی نەزانراو و بەنرخی تێدایـە دەربـارەی ڕوداوەکـانی ئەو سەردەمە، بە تایبەتی دەربارەی بێگە بەگ، زۆراب بەگ، محەمەد بەگ، مەئمون بەگ خۆی و، دەربارەی هێرشی سوڵتان سلێمانی قانونی بۆ سەر ئێران و بەغـداد و لەشکرکێشـیەکانی بـە نـاو کوردسـتان دا و، دەربارەی هەڵاتنی ئەلقاس میرزای برای شا طەهماسبی صەفەوی بۆ لای عوسمانی و، گەڕانـەوەی بـە نـاو کوردستان دا و گیران و بە دەستەوەدانی... بەڵام هەندێ بابەتی تریشـی تێدایـە کـە ئـەبێ ئیسـتیان لـە بەردەمدا بکرێ:

1. لەم سکاڵانامە درێژەدا، لە هیچ جێگەیەک دا ناوی ئەردەڵان، وەکو بنەماڵـەی حـوکمڕان و وەکـو نـاوی میرایەتی، نەهاتوە، بەڵکو نوسەر بۆ مەبەستێکی سیاسـی هـەم نـاوی بنەماڵەکـەیـانی گۆڕیـوە و، هـەم ڕێچەڵەکێکی دروستکراوی بۆ خۆی داتاشیوە.

   مەئمون بەگ، دەربارەی ناوی بنەماڵەکەیان، لە سەرەتای سـکاڵاکەی دا (مـذكرات:16) نوسـیویەتی: "لـە کاتێک دا ئـەم بەنـدەیـە: مـەئمونی کـوڕی بێگـە بـەگی عـادلانی..." هـەروەها دەربـارەی ڕێچـەڵـەکی بنەماڵەکەیان، (مذكرات:18-19) نوسیویەتی: "ڕێچەڵـەکی بـەنـدە بێگـە بـەگ دەگـەڕێتـەوە بـۆ ئـەبو عوبەیدەی جەڕاح لە عەشەرەی موبەشەرە و ئەمیری موئمینان عەباس. یەکێ لـە بـاپیرە مەزنـەکانی، بـە ناوی عادل، لە سەرەتای ڕۆژانی کوشتاری جەنگیزییە زۆردارەکـان دا والـی شـارەزل بـوە. ئـەوەکانی گوێڕایەڵی فەرمانی پاشاکانی هەردو عیراق بون، تا قەزاو قەدەری ئیلاهی ئیسماعیلی کوڕی حـەیـدەری هێنا..."

   ئەم گێڕانەوەیـە لـە هـیچ سـەرچاوەیـەکی کـەدا پشـتیوانی لـێ نـەکراوە. شـەرەفنامە و دوای ئـەویش مێژوەکانی ئەردەڵان، کە هەمویان بە ئاگـاداری میرانـی ئـەردەڵان و هەنـدێکیان بـە قـەڵـەمی میرانـی ئەردەڵان نوسراون، لەم بـارەیـەوە باسـی تـر دەگێڕنـەوە و، نـاوی تـر ئـەهێنن. لـە هـیچ کـامی ئـەو سەرچاوانەدا عادل ناو لە ناو باپیرانی ئەردەڵان دا نە بوە و، کەسێکیان لە باتی: "ئەردەڵانی" بەخۆیان نەوتوە: "عادڵانی".

2. مەئمون بەگ لە نامەکەی دا لە باسی ڕوداوەکانی سەردەمی باوکی زیاتر هەڵناکشـێ، تەنانـەت لـە هـیچ کوێیەکی کتێبەکەی دا ناوی باپیر و باپیرە گەورەی و بەرەوژورتری ناهێنێ و، بە هیچ جۆرێ تـوخنی ڕوداوەکانی سەردەمی ئەوان ناکەوێ. دیارە ئەمەیشی هەر بـۆ مەبەسـتی سیاسـی بـوە، ئـەگینا ناشـێ پیاوێکی وەها شارەزا ناوی باپیرانی خۆی نەزانی بـێ و، هـیچ ئاگادارییـەکی دەربـارەی ڕوداوەکـانی سەردەمی ئەوان نەبوبێ.

3. مەئمون بەگ ئەگەرچی ڕوداوەکان بە درێژی ئەگێڕێتەوە و ناوەڕۆکی چەندین نامە و فەرمانی سـوڵتان باس ئەکا، بەڵام ڕۆژ و مانگ و ساڵی هیچ کام لە ڕوداوەکانی نەنوسیوە و، تێکستی تەواوی هیچ کـام لەو فەرمان و نامانەی تۆمار نەکردوە.

4. ئەم یادداشتە، کە یەکەمین سەرچاوەی دۆزراوەیە دەربارەی بنەماڵەی ئەردەلان. هەندێ لە و گێڕانەوانە هەڵئەوەشێنێتەوە کە مێژو نوسانی ئەردەلان لە سەر بێگە بەگ و زۆرابی برای و ساڵانی حوکمڕانییان نوسیوە.
بە پێی گێڕانەوەی مەئمون بەگ (منکرات: 9) ئەبێ باوکی لە دوای کوژرانی ئەلقاس میرزا بە ساڵێک مردبێ. ئەلقاس ساڵی 956 کوژراوە. بۆیە ئەبێ بێگەیش لە (957) دا مردبێ و. بە پێ ی گێڕانـەوەی (شـەرەفنامە:) یش کە ئەگەر 42 ساڵ حوکمڕانی کردبێ ئەوا ئەبێ لە (915) دا کاروباری ئەردەلانی گرتبێتە دەس.
هەر بەم پێیە مەئمونی کوڕی مونزیر (باوکی بێگە بەگ) کە بە پێی گێڕانەوەی شـەرەفنامە 32 سـاڵ حوکمڕانی کردوە ئەبێ لە ساڵانی (883-915) کاربەدەست بوبێ.

5. لەم یادداشتەدا سەدان ناوی شوێن و کەس و تیرە هاتون. نـاوی کەسـەکان، هەنـدێکیان ئەناسـرێن و هەندێکیان ئێستا نەناسراو و نەبیستراون و. ناوی شوێنەکانیش:

- هەندێکیان وەکو خۆیان هەتا ئێستا بە کار ئەهێنرێن وەکو: کەرکوک، ئەربیل، داقوق، قەرەتەپە، سرۆچک، شەهرباژاڕ، قەرەطاغ، گاور، شاخی پشتە.
- هەندێکیان ئێستا نەزانراون، جا یـان ئـەو شـوێنانە کـوێر بونەتـەوە و شـوێنەواریان نـەماوە وەکو: مشعلە (ل58): قەڵایەک بوە لە هەورامان. بک باصان (ل56): دەربەندێک بوە لە شاخی سورێن. ئاقن توت (ل56): شوێنێک بوە لە شارەزور. تەخت گەڕا (ل33): دەربەندێک بوە لـە نێوان قەسری شیرین و کرماشان دا. ئاغجە قەلعە (ل28).
- یـان ناوەکانیـان بـە تێپـەڕینی زەمـان و گـۆڕانی دەسـەڵاتـداریتی ناوچەکـە، گـۆڕاوە، وەکـو: شەهرەزول (ل17): شـارەزور. مـەریوان: میهـرەوان. دەربەنـدی نیمانشـاه (ل26): دەربەنـدی بازیان. قەرەخان (ل22): جەلەولا. جەسان (ل50): جەصان. قەرەصو (ل23): جۆگەیەک بـوە لە سیروان. مەندەلیجین (ل29): مەندەلی. حورین (ل30): هۆرێن. بن کنورە(ل31): بنکـورە. چفان (ل56): چەقان. سگرتمە (ل56): سەگرمە. شمع ایران (ل79): شەمێران.

**—3—**

### "شەرەفنامە"ی ئەمیر شەرەف خانی بتلیسی

شەرەفخان بەشێکی شەرەفنامەی بۆ باسـی مێـژوی میرایـەتی ئـەردەڵان تـەرخان کـردوە. شـەرەفخان سەرەتای دەستپێکردنی دەسەڵاتی ئـەم بنەماڵـەیـە ئەباتـەوە سـەر پیـاوێ بـە نـاوی بابـە ئـەردەڵان و. بابـە ئەردەڵانیش. وەکو ئەو لە ئەتابێگانی لوڕستانی بیستوە. بە ڕێچەڵەک ئەچێتەوە سەر بنەماڵـەی مەروانیـەکانی حاکمی دیاربەکر.

نوسەرانی دواتری مێژوی ئەردڵان دریژەیان بەم چیرۆکە داوە و. قسە و باسی زیادیان خستۆتە سەر. بۆ ئەوەی کۆنی و خانەدانی و پیرۆزی ئەم بنەماڵەیە و. شایسـتەیـی بـۆ میرایـەتی و حـوکمڕانی بسـەلمێنن. تێکەڵیان کردوە بە ئەفسانە. هەڵسەنگاندنی ئەم گێڕانەوە جیاوازانە. ڕەنگە بۆ لێکۆڵینەوەی پێوەنـدی نێـوان مێتۆلۆجی و دەسەڵات بە کەڵک بێن. بەڵام بۆ لێکۆڵینەوەی مێژویی نرخێکی ئەوتۆیان نیە.

شەرەف خان زنجیرەی ئەم بنەماڵەیەی تا ساڵی تەواو کردنـی مێژوەکـەی (1005) بـەڕیـز نوسـیوە. بەڵام تەنیا قسە و باسی گشتی لـە سـەر کـردون. سـاڵی حـوکمڕانی و مـەڵبەنـدی دەسـەڵات و ڕوداوەکـانی سەردەمی ژیانی ئەوانی نەگێڕاوەتەوە تا ئەگاتە سەر مەئمونی کـوڕی مـونزیر. چونکـە، وەکـو خـۆی ئـەڵـێ. هەواڵی ڕاست و دروستی دەست نەکەوتوە (ل194-212).

## -4-

مێژونوسەکانی ئەردەڵان: قازی مەلا محەمەد شەریف، خوسرەو بەگی ئەردەڵان (ل9 - 40)، مەستورە (ل 12 - 41)، عەلی ئەکبەری وەقائیع نیگار (ل 111 - 128)، میرزا شوکروڵڵای فەخرەلکوتاب (ل 90 - 102)، کە "منکرات" هکەی بێگەیان نەبیوە، ئاگاداریەکانی شەرەف خانیان دوبارە کردۆتەوە و، ئەوانیش نەیانتوانیوە زانیاری نوێ و زیاتری بخەنە سەر. عەلی ئەکبەری نوسەری: "حدیقەی ناصری" هەندێ لە ساڵەکانی نوسیوە و، دوای ئەویش میرزا شوکروڵڵای نوسەری: "تحفەی ناصری". لە بەر مێژوەکەی ئەم، ئەو ساڵانەی دوبارە نوسیوەتەوە، بەڵام پێ ئەچێ ئەوانیش ساڵەکانیان بە "قەرینە" دیاری کردبێ نەک لەسەر بنچینەی بەڵگەی نوسراو.

بەرهەمەکانی: قازی مەلا محەمەد شەریف، محەمەدی ئیبراهیمی ئەردەڵانی، خوسرەو بەگی بەنی ئەردەڵان، مەستورە، نرخێکی تایبەتییان هەیە، چونکە لە سەردەمێک دا نوسراون، کە هێشتا ئەمارەتی ئەردەڵان مابو. لە بەر ئەوە لێرەدا بە کورتی لێیان ئەدوێم.

## -5-

### "زبدە التواریخ"ی مەلا محەمەد شەریف، قازی ئەردەڵان

لە دوای شەرەفنامە قازی مەلا محەمەد شەریف ساڵی 1214 "زبدە التواریخ، واتە کەرەتاوی مێژوەکان یان ڕاستتر، پوختەی مێژوەکان" ی داناوە. گەلێک مێژونوس بەم ناوەوە مێژویان نوسیوە، بۆ ئەوەی لەوانی تری جیا بکەنەوە پێ ی ئەڵێن: "زبدە التواریخی سنندجی".

من خۆم ئەم مێژوەم نەدیوە. (ئەنوەری سوڵتانی: 157- 165) باسی ئەکات. وەکو ئەو ئەڵێ: زبدە وەکو مێژوەکانی تری ئیسلام سەرگروشتەی مێژوی مرۆڤایەتی گێڕاوەتەوە و، لەم مێژوەدا فەسڵێکی بۆ مێژوی ئەردەڵان تەرخان کردوە.

قازی ئەبێ ئەم مێژوەی لەسەر داوای خەسرەو خان نوسی بێ. لە فەسڵی ئەردەڵان دا جگە لە وەی هەواڵەکانی شەرەفنامەی نوسیوەتەوە، درێژەی بە روداوەکانی، یان ڕاستتر بە باسی زنجیرەی حوکمڕانەکانی ئەردەڵان داوە تا گەیشتوەتە سەردەمی ئەمانوڵڵاخان.

## -6-

### "ذیل شرفنامە"ی محەمەد ئیبراهیم ئەردەڵانی

دوای قازی مەلا محەمەد شەریف، نوسەرێکی تر کە مێژوی ئەردەڵانی نوسیوە محەمەد ئیبراهیم ئەردەڵانیە.

پێ ناچێ نوسەری "ذیل شرفنامە" لە بنەماڵەی ئەردەڵان بێ، بەڵکو وەکو خۆی ئەڵێ روداونوس (وقائع نگار) ی ئەم بنەماڵەیە بوە. ئەردەڵانی بۆ تەواو کردنی شەرەفنامە باسەکانی نوسیوە، لە بەر ئەوە لەو کاتەوە دەس پێ ئەکا کە شەرەفنامە کۆتایی هاتوە تا سەردەمی خۆی (1005-1225) و، هەر بەو بۆنەیەوە ناوی ناوە: "ذیل شرفنامە" و خراوەتە سەر یەکێ لە دەستنوسەکانی شەرەفنامە کە هی مالکۆڵم بوە. پێ ئەچێ ئەمانوڵڵا خان بۆی نارد بێ.

ئەردەڵانی دەربارەی سەرچاوەکانی مێژوەکەی، وەک خۆی ئەڵێ، تاریخی "عالم آرای عباسی" و"جیهان گوشای نادری" هەمیشە بە دەستەوە بوە. یەکەمیان ئەسکەندەر بەگی تورکمان، روداونوسی تایبەتی شا عەباس و، دوەمیان میرزا مەهدی خانی کەوکەب، روداونوسی تایبەتی نادر شا، نوسیویانە. دو کتێبی گرنگ و

باوەرپێنکراوی مێژوی ئێرانن. جگە لەمانەیش دیارە "شەرەفنامە"، کە ئەم "ذیل" ی بۆ نوسیوە بە مێژویەکی باوەڕ پێکراو داناوە، بۆیە لەوێوە دەستی پێ کردوە. سەیر ئەوەیە هیچ نیشارەتێکی بە مێژوەکەی قازی مەلا شەریف نەکردوە. مێژوەکەی نەدیوە، یان بە ئەنقەست خۆی لە ناوهێنانی بواردوە، یان باوەڕی بە گێڕانەوەکانی نە کردوە و هەر هەموی فەرامۆش کردوە، ئەمە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە.

"ذیل شرفنامە" لە بەر ئەوەی لە سەر داوای ئەمانوڵڵا خان نوسراوە، بۆیە بێلایەن نیە و بە مێژویەکی رەسمی دائەنرێ. ئەگەر چی ڕوداوەکانی ماوەی 220 ساڵی میرانی ئەردەلان ئەگێڕێتەوە، بەڵام مێژویەکی زۆر کورتە و هەموی چەند لاپەڕەیەکە. پێ ئەچێ بە ئەنقەست خۆی لە گێڕانەوەی هەندێک لە ڕوداوەکان بوارد بێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەوەیش بزانین کە ئەمانوڵڵا خان پیاوێکی زۆر دڵرەق و بێ بەزەیی بوە، لە سزادان و کوشتن دا لە هیچ شتێک نەپونگاوەتەوە.

مێژوەکەی ئەردەلانی، سەرەڕای کورتیەکەی، هەواڵ و دەنگ و باس و ئاگاداری زۆری تێ دایە و نرخێکی گرانی هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەردەلان، تەنانەت بۆ هی بابانیش.

ئەردەلانی لە کۆتایی مێژوەکەی دا ستایشی "دادپەروەری" و"بەخشندەی" و"میهر و بەزەیی" ئەمانوڵڵا خان ئەکا، لە کاتێک دا هەواڵ و دەنگوباس و ڕوداوەکانی ناو مێژوەکانی ئەردەلان، پیشانی ئەدەن کردار و ڕەوشتی ئەمانوڵڵا خان بە تەواوی پێچەوانەی ئەم صیفەتانە بوە. جگە لەوەیش لە خوا ئەپارێتەوە تا ڕۆژی دەرکەوتنی "ئیمامی زەمان"، سێبەری ئەمانوڵڵا خان و کوڕ و نەوەکانی بە سەر ئەردەلانەوە بەردەوام بێ. ئەمەیش بێگومان بەشێکە لە باوەڕی شیعەی دوانزە ئیمامی، نوسەر ئەمەی لە بەر خاتری ئەمانوڵڵا خان و دەرباری قاجار نوسیوە، کە شیعە بون، یان خۆیشی بە مەزهەب شیعە بوە؟ لێکدانەوەی ئەو پارچەیەی لە سەر پەروەردەکردنی قزلباشانەی خان ئەحمەد خانی یەکەم نوسیوێتی، دەری ئەخەن کە شیعە نەبوبێ.

خانمی نسرین برنا، "ذیل شرفنامە" ی ساغ کردۆتەوە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نوسیوە و، ئەنوەری سوڵتانی وەری گێڕاوەتە سەر کوردی و تێکستی فارسی و، وەرگێڕاوە کوردیەکەی لە ژێر ناوی: "مێژوی ئەردەلان" ی محەمەد ئیبراهیمی ئەردەلانی دا ساڵی 1997 لە سوێد بڵاو کردۆتەوە.

–7–

## "لب تواریخ"ی خوسرەو بەگی بەنی ئەردەلان

خوسرەو بەگ خۆی لە بنەماڵەی میرانی ئەردەلانە. کوڕی محەمەد بەگی کوڕی مەنۆچەر بەگی کوڕی محەمەد بەگی نەوەی سلێمان خانی والی بوە. باوک و باپیری لە دەزگای بەڕێوبەرایەتی ئەردەلان دا بەشدار بون.

وەک خۆی ئەیگێڕێتەوە: کە خان ئەحمەدی خانی سێیەم لە دەس نادر شا هەڵدێ، ماوەیەک مەنۆچەر بەگی "نایب" باپیری ئەم کاروباری ئەردەلان بەڕێوە ئەبا (ل94). هەر ئەمیش ئەچێتە لای نادر شا بۆ بیانو هێنانەوە بۆ دابەشکردنی دانەوێڵەی عەمارەکانی شا. بەڵام ئەویش سەرەنجام لە تاو زوڵمی نادر شا هەڵاتوە و، لە عەبابەیلێ ی نزیک هەڵەبجە مردوە (ل96). دوای ئەویش، محەمەد بەگی باوکی، چوە بۆ گرتنی ئەو ماڵە جافانەی بە دزیەوە هات بونە سنوری ئەردەلانەوە و دوای ئەوەی ئەیانگرێ، خۆیان و مێگەل و کەلوپەلەکانیان بە سەر ئەعیانی سنەدا دابەش ئەکرێن و، ماڵی ئەمانیش 25 خێزانیان پێ ئەبڕێ (ل151).

خوسرەو بەگ لە ناو ئەم بنەماڵە ناسراوە دەسەڵاتدارە دا لە دایک بوە و گەورە بوە. بە عادەتی ئەو زەمانە منداڵی میر و مەزنەکان بۆ خوێندن ئەخراونەتە بەردەستی مەلای مزگەوتەکان، بەڵکو مامۆستای تایبەتی‌یان بۆگرتون. ئەبێ ئەمیش هەر بەو جۆرەی خوێند بێ. پێداچونەوەی مێژوەکەی دەری ئەخەن خوێندەوارێکی باش و شارەزای ئەدەبی فارسی و ئایەتەکانی قورئان بوە.

لە پێشەکیەکەی دا دوای ستایشی خوا و پێغەمبەر دێتە سەر "پێشەوای هەر دوانزە ئیمامەکە: عەلی کوڕی ئەبی طالب" (ل9)، بەم پێ یە ئەبێ خوسرەو بەگیش وەکو زۆری بنەماڵەی ئەردەڵان، بە مەزهەب شیعە بوبێ.

بەرهەمەکانی:

خوسرەو بەگ بە نوسینی مێژوی ئەردەڵان ناسراوە، کە ساڵی 1249 ە ق (1833ز) بە فارسی نوسیویتی. مەستورە لە مێژوەکەی خۆی دا ئەم کتێبە بە "تاریخ الاکراد، واتە مێژوی کوردەکان" ناو ئەبا و. د. ئیسماعیل ئەردەڵان بە ناوی: "لب التواریخ، واتە کاکڵەی مێژوەکان" لە میهر ماهی 2536 لە تاران و. واسیلیوا ساڵی 1984 لە مۆسکۆ بە ناوی "تاریخ خسرو بن محمد بنی اردلان، واتە مێژوی خوسرەوی کوڕی محەمەدی بەنی ئەردەڵان" بڵاوی کردۆتەوە. بەم جۆرە ناوێکی یەکگرتوی نیە، لەو دەسخەتەیش دا کە واسیلیوا بڵاوی کردۆتەوە، هیچ ئیشارەتێک بۆ ناوی کتێبەکە لەلایەن نوسەر خۆیەوە نەکراوە، هەر لە بەر ئەوە ئەمیش ئەو ناوەی بۆ داناوە، کە خۆی بە پەسەندی زانیوە.

واسیلیوا مێژوەکەی خوسرەو بەگی کردۆتە ڕوسی، پەراوێزی بۆ نوسیوە و پێڕستی بۆ ڕێک خستوە و، پێشەکیەکی ئینگلیزیشی بۆ نوسیوە و، لەگەڵ وێنەی دەسخەتێکی کۆنی دا بڵاوی کردۆتەوە.

چاپی تارانی مێژوەکەی خوسرەو بەگ گرنگیەکی تایبەتی هەیە، چونکە وەک د. ئیسماعیلی ئەردەڵان لە پێشەکیەکەی دا نوسیویتی لە بەر نوسخەیەک چاپ کراوە کە بە خەتی نوسەر خۆی نوسراوەتەوە و مۆری کتێبخانەکەی خوسرەو خانی ناکامی پێوە بوە، ناوەکەشی "لب تواریخ" بە حسابی ئەبجەد ئەکاتە 1249 ی هیجری کە ساڵی نوسینێتی. ئەم دو مەتنە لە هەندێ شوێن دا جیاوازن.

جگە لەم مێژوە، خوسرەو بەگ شیعریشی داناوە، میرزا عەبدوڵڵای مونشی (ڕەونەق) لە کتێبی: "تەذکەرەی حەدیقەی ئەمانوڵڵاهی" دا بەشێکی بۆ ئەم و شیعرەکانی تەرخان کردوە و، بە خوسرەو بەگی (مصنف، واتە دانەر) ناوی ئەباو، نازناوی شیعریشی "جەوهەری" بوە. دیوانی شیعری چاپ نەکراوە، ڕەنگە کۆیش نەکرابێتەوە.

هۆی نوسینەوەی مێژوەکەی، وەک خۆی ئەڵێ (ل10): نە کەس داوای لێ کردوە بینوسێ و، نە هیچ تەماعێکی پارە و پول پاڵی پێوە ناوە. بەڵکو لە بێکاری و دەسبەتاڵی دا خۆی بە نوسینی ئەم کتێبەوە مەشغوڵ کردوە.

سەرچاوەکانی، بریتی بون لە شەرەفنامە و ئەوەی لە دانیشمەندانی بیستوە، یان لە کتێبە موعتەبەرەکان دا دیوێتی (ل10). بەڵام لە ناو ئەو کتێبە موعتەبەرانەدا تەنیا ناوی تاریخی نادری ئەبات، کە مەبەستی جهانگوشای نادری میرزا مەهدی خانە.

یەکێ لە سەرچاوە گرنگەکانی گێڕانەوەی دەماودەمی ڕوداوەکان بوە. لە بەر ئەوەی خۆی لەم بنەماڵەیە بوە و لەم دەزگایەوە نزیک بوە. هەواڵ و دەنگوباسەکانی زانیون و گێڕانەوەی دەماودەمی ڕوداوەکانی بیستون. ئەم گێڕانەوانە سەرچاوەیەکی گرنگی مێژوەکەی خوسرەو بەگ بون. لێرەدا نمونەیەک ئەهێنمەوە کە خۆی نوسیویتی (138): "... لەم کاتەدا نوسەر چیرۆکێکی هاتەوە بیر، کە ئەم مەهدی خانە شاعیرە- مەبەستی مەهدی خانی شقاقیە کە یەکێ لە شەڕە سەر کەوتوەکانی خوسرەو خانی بە شیعر هۆنیوەتەوە- دێتە لای والی داوای هەندێ خەرجی لێ ئەکا. والی ئەڵێ: "هەرچەند بەرات بۆ خۆت ئەنوسی بیهێنە تا بۆت مۆر بکەم!" ئەویش لە پێش دا بەراتێکی 50 تومانی ئەنوسێ. لە بەر خۆیەوە ئەڵێ زۆرم نوسیوە تازە ئەنعامی ئەوم پێ گەیشتوە. بەراتێکی 40 تومانی ئەنوسێ. دیسان ئەڵێ زۆرە. بەراتێکی 20 تومانی ئەنوسێ. هەر 3 سێ بەرات ئەهێنێ پیشانی خوسرەو خانی ئەدا کە یەکێکیانی بۆ مۆر بکا. بەڵام ئەو هەر سێ بەراتی بۆ مۆر ئەکا و پارەکەی هەر لەوێ دا بە تەواوی وەرئەگرێ...".

پەندێکی بەنرخی ئەم مێژوە، باسی لێبوردنە. تۆڵە بەشێکە لە کەسایەتی کورد، هەر ئەمەش زۆر جار بۆتە هۆی ڕژانی خوێنی زۆر و کاولبونی ئاوایی گەورە و کوێربونەوەی هەندێ خێزان و بنەماڵە. خوسرەو بەگ باسی گیران و ئازار و سزادانی بارام بەگی جاف ئەکا، کە دێتە سەر باسی لێخۆشبونی لەلایەن والیەوە، ڕوداوەکە ئەکات بە بۆنەیەک بۆ ستایشی "سەرەتای لێبوردن" و، ئەنوسێ (ل193): "پاش ماوەیەکی کورت (والی) لە خەتاکانی خۆش بو... بە مەدلولی والکاظمین الغیض والعافین عن الناس حاڵی ئەویشی گرتەوە. لە لێبوردن دا لەزەتێک هەیە کە لە تۆڵەدا نیە. لە هەمو خەتاکانی بورد.

لێبوردنت هەبێ، لێبوردن لە لای بەخشندە،

لەزەتی لێبوردن لە هی تۆڵە خۆشترە!"

ئەم جۆرە لێکدانەوەیە نیشانەی تێگەیشتن و ژیری خوسرەو بەگە، کە لە کەم کەسی ئەو سەردەمەدا هەبوە.

مێژوەکەی خوسرەو بەگ هەواڵ و دەنگوباس و زانیاری زۆر و بە نرخی لە سەر میرەکانی ئەردەڵان تێدایە. لە چاو "ذیل شرفنامە" دا گێڕانەوەکانی ئەم درێژتر و تێر و تەسەلتر و، ئەم کتێبە یەکێک بوە لە سەرچاوە سەرەکیەکانی نوسینەوەی هەمو مێژوەکانی دوای خۆی. هەندێ هەڵە و کەموکوری تێدایە و لە بەر خزمایەتی نزیکی لە گەڵ والیەکانی ئەردەڵان لە باسەکانی دا بێلایەن نیە. بەڵام ئەوانە هیچی لە نرخی گەورەی ئەم مێژوە کەم ناکاتەوە.

**—8—**

### "تاریخ اردلان"ی ماهشەرەف خانم (مەستورە)

لە بەر ئەوەی باسێکی تایبەتیم بۆ تەرخان کردوە، لێرەدا لێ ی نادوێم.

**—9—**

### مێژوەکانی تری ئەردەڵان بریتین لە:

1. عبدالقادر ابن رستم بابانی:
"تاریخ و جغرافیای کردستان، موسوم بە: سیر الاکراد"
ساڵی 1286 ە ق بە فارسی نوسیویتی.
ساڵی 1366 ە ش لە تاران بە اهتمام "محمد رئوف توکلی" چاپکراوە.
ئەم کتێبە جگە لە مێژوی ئەردەڵان، بەشێکی بۆ مێژوی بابان و سۆران و موکریان تەرخان کردوە.
2. عەلی اکبر وقائع نگار کردستانی:
"حدیقەی ناصری در جغرافیا و تاریخ کردستان"
ساڵی 1309 ە ق (1891) بە فارسی نوسیویتی.
ساڵی 1364 ە ش لە تاران بە اهتمام "محمد رئوف توکلی" چاپکراە.
عەلی ئەکبەر لە ناو کتێبەکەی دا چەند جارێ باسی کتێبێکی تری خۆی ئەکات بە ناونیشانی "تاریخ الاکراد". تا ئێستا ئەم کتێبە چاپ نەکراوە.
عەلی ئەکبەر ئامۆزای مەستورە بوە.
3. میرزا شکرالله سنندجی (فخر الکتاب):
"تحفەی ناصری در تاریخ و جغرافیای کردستان"

ساڵی 1319 ه ق (1901ز) بە فارسی نوسیوێتی.
ساڵی 1366 ه ش لە تاران بە اهتمام "دکتر حشمت الله طبیبی" لە لایەن "انتشارات امیر کبیر" چاپ کراوە.

4. شێخ محمد مردوخ کردستانی:
"تاریخ مردوخ"

لە دو بەرگ دا لە چاپخانەی ئەرتەش لە تاران چاپ کراوە، ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە سەر نەنوسراوە. جارێکی تریش لە لایەن "کتابفروشی غریقی" لە سنە بڵاو کراوەتەوە. ئەمە تازەترینی هەمو مێژوەکانە.

ناصری ئازادپور کە "تاریخ اردلان" و محەمەد رەئوف تەوەکلی بانەیی کە "حدیقەی ناصریە" و"سیر الاکراد" و. د. ئیسماعیلی ئەردەلان و سیلیوا کە مێژوەکەی خوسرەو بەگیان چاپ و بڵاو کردۆتەوە، ئەگەر چی بەمە خزمەتێکی گەورەی مێژوی کوردیان کردوە، بەڵام جگە لە ساغکردنەوەی تێکستی مێژوەکان و، راست کردنەوەی هەڵەی زمان و رێنوسەکانی، پەراوێزێکی ئەوتۆیان بۆ باسی ناوەڕۆکی کتێبەکان نە نوسیوە و، لە گەڵ سەرچاوە مێژوییەکانی تردا بەراوردیان نە کردون. ئەم کارەیان بەجێهێشتوە بۆ خەڵکی کە. لە ناو ئەوانەدا کە ئەم مێژوانەیان چاپ و بڵاوکردۆتەوە تەنیا د. حشمت الله طبیبی کە "تحفەی ناصریە" ی ساغ کردۆتەوە، ئەم کارەی کردوە و تا ئەندازەیەکی باش لەگەڵ سەرچاوەکانی کەدا بەراوردی کردون.

## –10–

ئەم مێژوانە، هەمویان، لە چاو مێژوەکانی هاو چەرخی خۆیان دا، چەند کەموکوڕی گەورەیان تێدایە:

1. هیچ کام لەم مێژوانە هیچ یەکێ لەو هەمو فەرمانانەی، لە لایەن شاهەکانی ئێرانەوە، بۆ دانان و لابردنی والیەکانی ئەردەڵان دەرکراوە، تۆمار نەکردوە. ئەگەر ئەوانەی سەردەمی زو بە هۆی نائارامی هەلومەرجی وڵات و شەڕوشۆڕی بەردەوام و گوێزانەوەی بنکەی میرایەتی و تاڵان و سوتانەوە فەوتابن، ئەوا ئەیانتوانی فەرمانی دانان و لابردنی والیەکانی هاوچەرخی خۆیان بنوسیایە.

2. ناتەواوییەکی تر، کە لە هەمو مێژوەکانی ئەردەڵان دا بەدی ئەکرێ، ئەوەیە کە هیچ کام لەم نوسەرانە لە دور و نزیکەوە توخنی باسکردنی ئەو هەمو رێککەوتن و پەیماننامانە نەکەوتون، کە لە نێوان ئێران و عوسمانی دا بەستراون: رێککەوتنی ئاماسیە (1555/ رەجەبی 963)، رێککەوتنی ئەستەموڵ (1589/ صەفەری 999)، رێککەوتنی ئەستەموڵ (1613/ 1022)، رێککەوتنی سەراب (1207/1618)، رێککەوتنی زەهاو (1639/موحەرەمی 1049)، رێککەوتنی (1727/ موحەرەمی1136)، رێککەوتنی نادر شا، رێککەوتنی یەکەم و دوەمی ئەرزڕۆم.

ئەم رێککەوتننانە بێگومان کاری راستەوخۆیان کردۆتە سەر چارەنوسی هەمو ناوچەکە، لەوەیش کوردستان و ئەردەڵان، کە لە سەر سنوری ئەم دو دەوڵەتەدا بون و، هەندێ لە شەڕەکان لە سەر ئەرزی کوردستان روی داوە و، هەندێکیشی بۆ داگیرکردنی بوە. پێ ناچێ نوسەرانی مێژوی ئەردەڵان هیچ ئاگادارییەکیان دەربارەیان نەبوبێ، لە بەر ئەوە نەیانتوانیوە پێوەندی روداوەکانی کوردستان لە گەڵ روداوەکانی ناوچەکە و کاریگەریان بۆ سەر یەکتری، باس بکەن.

3. هیچ کام لەم مێژوانە باسی لایەنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، ژیانی رۆشنبیری و ئەدەبی ئەو سەردەمانەی تێدا نیە. لەو سەردەمانەدا بە دەیان زانا و نوسەر و شاعیری گەورە هەڵکەوتون و، بە سەدان کتێب لە زانستەکانی ئیسلام دا نوسراون و، بە دەیان چیرۆکی جۆراوجۆری دڵداری، دینی، جەنگی... هەڵبەستراون. بێگومان ئەمانە بەشێکی گرنگ، بەڵکو سەرەکی، مێژوی ئەردەڵانن. ئەم مێژوانە بۆ ئەم باسانە هیچ زانیاری و هەواڵ و دەنگوباسێکی ئەوتۆیان تێدا نیە، کەڵکێکی ئەوتۆیان لێ وەربگیرێ.

## -11-

بەهۆی ئەم مێژوانەوە، بەشێکی گرنگی ڕوداوەکانی ئەو سەردەمە نوسراونەتەوە و لە نـاو نـەچون. لـە باسی دەوری والیەکانی ئەردەڵان و ئەعیانەکانی و دانیشتوانی دا. لە ناو ڕوداوەکـانی ناوچەکـەدا بـە گشـتی، گیانی لە خۆ ڕازی بون و بە خۆنازین و هەستی سەروەرییان، تـێ دا ئەخوێنرێتـەوە. بـە شـانازیەوە باسـی سەربەخۆیی کاروباری ناو خۆیان و، ستایشی جوامێری و ئازایەتی و بەخشندەیی میر و مەزنەکانیان ئەکـەن و داستانی قارەمانێتی شەڕەکانیان ئەگێڕنەوە. جگە لەوەیش، تۆمار کردنی ڕوداوەکانی ئـەردەڵان بـە جیـا لـە ڕوداوەکانی ئێران و لە کتێبی سەر بەخۆدا و، باسکردنی ئـەردەڵان و کوردسـتان، زۆر جـار لـەم مێژوانـە دا، وەکو دو ناوی هاوواتا، جۆرێکە لە بەشداریی خوڵقاندنی هۆشی نەتەوەی کورد.

گیانیان شاد و یادیان زیندو بێ!

لەندەن، 1 ی تەمموزی 1998

6 ی ڕەبیعی یەکەمی 1419



پەیکەری مەستورە (1220-1264) نوسەری "تاریخ اردلان"

# مەستورە نوسەری "تاریخ اردلان":
# (1264-1220)

-1-

**بنەماڵەکەی**

باپیری مەستورە: محەمەد ئاغا، کە لەزۆری "فتوحات"ی خوسرەو خانی گەورەدا بەشداروو، خەزوری ئەمانوڵڵا خانی گەورەو یەکێ لەباوەڕپێکراوە نزیکەکانی بوە. بۆ کۆکردنەوەی باج سەرانەو، بۆ بەشداری لەشەڕو لەشکرکێشیەکانیدا. بۆ نوێنەرایەتی لەدەرباری قاجاردا.

باوکی مەستورە: ئەبولحەسەن بەگ کوڕی محەمەد ئاغا، ژنبرای ئەمانوڵڵا خانی گەورەو بریکاری حوسەینقولی خانی خوشکەزای بوە. ئەمیش باوەڕپێکراوێکی نزیکی ئەمانوڵڵاخانی گەورە بوە. سەرپەرشتی زەماوەندی گواستنەوەی کچی فەتحعەلی شای قاجار بۆ خوسرەو خانی ناکام ئەم کردویەتی.

مامەکانی مەستورە: ئیبراهیم ئاغاو ئیسماعیل ئاغا هەر یەکە پلەیەکی بەرزیان هەبوەو، میرزا عەبدوڵڵایش مونشی دیوان بوە. (حدیقە: ل321). میرزا عەبدوڵڵای مونشی (رەونەق) نوسەری: "تەنکەرەی حەدیقەی ئەمانوڵڵاهی" یە، کەژیاننامەی شاعیرە فارسی بێژەکانی ئەردەڵان ئەگێڕێتەوەو، نمونەی شیعرەکانیان ئەنوسێ‌و، عەلی ئەکبەری ئامۆزایشی نوسەری: "حەدیقەی ناصری" و"تاریخ الاکراد" ە.

دایکی مەستورە: لەبنەماڵەی میرزا عەبدوڵڵای وەزیر بوە.

بنەماڵەی باوکی مەستورە: "قادری"و، بنەماڵەی دایکی: "میرزا عەبدوڵڵای وەزیر"، هەردوکیان، لەبنەماڵە دەوڵەمەندو دەسرۆیشتوەکانی سنە بون. بەتایبەتی بنەماڵەی وەزیر هەمیشە دەورێکی کاریگەریان هەبوە لەژیانی سیاسی، دارایی و جەنگی.. داودەزگای حوکمڕانی ئەردەڵان دا.

## -2-

### لەدایکبونی

ماهشەرەف کچی ئەبولحەسەن بەگ، وەکو عەلی ئەکبەری ئامۆزای لە (حدیقە: ل321-322) دا نوسیویەتی لەتەمەنی 44 ساڵی دا لە 1264دا مردوە. بەم پێیە ئەبێ لە 1220دا، لەباوەشی ئەم خێزانە ئەجیبزادەیەدا لەدایک بوبێ. رەنگە هەواڵەکەی ئەم لەهی نوسەرانیتر دروستتر بێ.

## -3-

### پەروەردەو خوێندنی

مەستورە نۆبەرە واتە یەکەم منداڵی دایکو باوکی بوە، لەبەر ئەوە باوکی بایەخی بەخوێندنو پەروەردەکردنی داوە. خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێ: "پاش ئەوەی لەسای...خودای لەهەمو شتێ هەورازترو، لەپەنای بەزەیی و داوەری بێ هاوتا، لەزگی دایکمەوە کەوتمە باوەشی پەروەردەی باوکمەوە... لەفەرێ ئەخشی نێوچاوانی بەهرەو هێزی بینای بەخشندەگیو لەبەرەکەتی ئەو ئەختەری چڵەپۆپەی زانستو خۆری گەردونی ئاوەزە کەمەیلی سروشتیو شەوقی راستەقانیی پەروەردەکردنی منداڵو بەهێزکردنی جگەرگۆشاندا زۆر بو، بەتایبەت منی یەکەم گوڵی ئەو گوڵشەنەو نوخشە ئەمامی ئەو چەمەنە، کەدەستم خامەی ئاشنایی گرتو چاوم بەنامەی رۆشنایی هەڵێنا، ناو بەناو مەیلی سروشتیمو ئارەزوی زگماکم بەمتالای کتێبان دەبزوت..." (ل11).

## -4-

### شوکردنی

مەستورە داستانی شوکردنی خۆی بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

"بەڵام لەبەرایی فەرمانڕەوایی‌دا (مەبەستی فەرمانڕەوایی خوسرەو خانی ناکامە) لەبەر کەم ئەزمونی، توشی چەند هەڵەیێ هات: باپیرو باوکو مامەکانی نوسیاری ئەم کتێبەی بەبێ تاوان کۆتو زنجیر کردو زۆر بەبێ بەزەییانەو رەفتارێکی نزیوەوە سێ هەزار تمەنی بەناوی باجەوە لێ سەندن. سەرەنجام خودا کردی بەدنیهادیو دڵپیسی بەدکارانی بۆ ئاشکرا بو لەدوی داردنو بەخەڵاتی گرانباییو شایان سەربەرزی کردن." (ل198-199).

خوسرەو خان بەوە وازی لێ نەهێناون، بەدەوڵەمەنی زانیونو، لای وابوە جگە لەسامانەکەی خۆیان، سامانو دارایی حوسەینقولی خانی باوکبرایشی لەلای ئەمان حەشار دراوە، بۆ ئەوەی سامانەکەیان زەوت بکا، گێچەڵێکی تری پێ کردون. لەم بارەیەوە مەستورە نوسیویێتی:

"لە بەر ئەوەی حوسەینقولی خان زۆربەی سامانو ئەختینەکانی لەکن بنەماڵەکەی منی کەمینە دانا بو، نێوبراو سەبارەت بەوە کە لەباوکەوە پورزایشم بو، کاربەدەستانی والی بۆ باوکمیان تێ چاندبو لەداستانەکەیانەوە وەرداو لەو کارەکەوەیان گلاندو ئەوەیان کرد بەبیانو، ئەو سامانو ئەختینەیەش کەهەمان بو لێمان داگیرکەنو ئەویش بخەنە سەر گەنجینە. بەم مەبەستە حوسەینقولیخانیان فریوداو بەڵێنی فەرمانڕەوایی ئیسفەنددابادیان دایێو ئەمیش کەهێشتا ساردیو گەرمیو تاڵیو سوێری ژیانی بۆ کەس تا سەر ئەماوی ئەچێژتبو، بەتەماحی فەرمانڕەواییەوە پشتی لەمافی خاڵۆو خوارزایی هەڵکردو پاشان بەبیانوی بەسەرکردنەوەی یەکێ لەئامۆزاکانمان کەئەخۆش کەوت بو لەدوای باوکمی نارد، هەر کەباوکم گەیشتە ئەوێ، حوسەینقولیخان کۆڕێکی بەستو لەژی والی دەستیان بەوتوێژ کرد، بەڵام لەدەرەوە، چەند کەسێکی لەپشت پەردەوە لێ راگرت بون، گوێیان لەهەمو کەینو بەینەکە گرت بو. ئەو شەوە بۆ سبەینێ محەمەد بەگو مستەفا بەگ کورانی فەتح

عەلی بەگی وەکیلو ئەکبەر بەگ، کەبو بەمایەی ئەم هەنگاوەیەو سوڵتانی کوڕی ئەزەرعەلی بەگو ئەبولحەسەن بەگ باوکی ئەم کەمینەیەو مامو ئامۆزاکانی دیکەی سەرلەبەر فەرمانی کۆتو زنجیرکردنو زیندان کردنیان دراو هەمویان گیرانو بەکۆتو زنجیرکراوییەوە زیندان کران. پاش چەنانێ فەتحعەلی بەگو سوڵتانیان لەقەلای قەسلان‌دا کوشت. ئەکبەریش بەهەزار تەڵەکەو دەهۆ، دا هەرچۆنێ بو، سەری خۆی رزگارکرد. مامی ئەم کەمینەیەیش، چونکە هیچ تاوانێکی نەبو، ئازادکراو بەبەزەیی‌و دڵاوایەکی زۆرەوە خەلات کراو ئەوە بو بۆ پتەوکردنو چەسپاندنی نێوان تەبایی‌و نێوان کۆکی لەئەنجام دا بەندو بەندەواری هاوسەریم لەگەڵ خوسرەو خان‌دا سەروبەر دراو بەوپەڕی شانو شکۆوە پێم هاوێشتە حەرەمسەراوە." (ل201-202).

رەنگە لەو سەردەمەدا زۆر کچی سنەیی خەوی بەوەوە دی بی ببێتە هاوسەری گەورەترین دەسەڵاتداری ناوچەکە: والی کوردستان. کەهێشتا لەناوەڕاستی سییەکانی تەمەنی‌دابو. بەڵام ئەم شوکردنە جۆرێ بوە لەسەودای سیاسی‌و کۆمەڵایەتی لەنێوان والی زۆردارو بنەماڵەی قادریی زۆرلێکراودا. بنەماڵەی قادری کچەکەیان لەنرخی‌دا داوە.

ئەگەر لە 1220 دا لەدایک بوبێ، وەکو لە(تحفە:322) تێ ئەگەین، لە 1244دا شوی بەخوسرەوخان کردبێ، وەکو مەردۆخ ئەڵێ، ئەوا ئەبێ بە24 ساڵی بەبوکی بۆ حەرەمسەرا برا بێ.

خوسرەو خان لەژیانی تایبەتی خۆی‌دا پیاوێکی بێ بەندوبار بوە. لەم بارەیەوە (مەستورە:198) ئەڵێ: "زۆری حەز لەرابواردنو خۆش گوزەرانی دەکرد. دەنگی ئارەزوی رابواردنو خۆش گوزەراندنی ئەم پیاوە داستانی بازامی گۆڕی لەبیری خەڵک بردبوەوە.."

(بابانی:71) ئەڵێ: رۆژانی ژیانی بە"خواردنەوەی مەی‌و موعاشەرەتی ژنانی زیونەندام" بەسەر ئەبرد، ئەم رەفتارە کاری لەدانیشتوانی سنەیش کردوە. "بەمفاد الناس علی دین ملوکهم، هەمو ئەعیانی کوردستان بەخواردنەوەی پێکی دەمادەمو هاونشینیی روسپییانی سۆزانییەوە خەریک بون".

(تحفە:203) ئەڵێ: "ئارەزویەکی لەئەندازە بەدەری لەژیانو رابواردن هەبو، هەمو شەوێ چل گۆرانیبێژو مۆسیقاژەنی ژنو پیاو لەمەجلیسەکەی‌دا ئامادە ئەبون"..

خوسرەو خان، کاتی خۆی بەرابواردن لەگەڵ ژنانی جوانو، خواردنەوەی زۆری مەی بەسەر بردوە. لەئەنجامی ئەمەیش‌دا ئەخۆش کەوتوە، وەک (بابانی:72) ئەڵێ: "بەهۆی زیادەڕەوی لەخواردنەوەی مەی‌دا توشی ماخۆلان بو". یان وەک (مەستورە: 203)ی هاوسەری ئەڵێ: "توشی ئەخۆشی جەرگ بو". لەهەردو حاڵەتدا ئەلکهول ئەبێ هۆی سەرەکی ئەخۆشییەکەی‌و ئینجا مردنی بێ. لە2ی رەبیعی ئەوەلی 1250دا لەتەمەنی 29 ساڵی‌دا مردو، مەستورەیش بەگەنجی بێوەژن کەوت. (مەستورە:204).

مەستورە لەخوسرەو خان منداڵی ئەبوە، شوی تریشی ئەکردۆتەوە. بەڵام هەوێکەی، حوسنی جیهان، 3کوڕو 3کچی هەبوە. پێ ئەچێ تا شیرازەی ئەم خێزانە بەتەواوی هەڵوەشاوە، مەستورە لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا ژیابێ.

**–5–**

## کۆچی بۆ سلێمانی‌و مردنی

ساڵانی (1250-1264) کە بەبێوەژنی بەسەر بردوە، لەژیانی مەستورەدا ساڵانی کامڵ بونو برشتی زۆرو بەرهەمی گرانبەها بون. هەر لەو ماوەیەش‌دا بوە "تاریخ اردلان"ی تەواو کردوە.

دوای مردنی خوسرەو خان، ئەردەڵان لەناو گەردەلولی ناکۆکیی ناوخۆی ئەمیرەکانی ئەردەڵان‌دا ئاسایشی بیرو، ژیانو، سامانی تێ‌دا نەماوە. حوسنی جیهانو تودا خانمی بوکی، جوتە برا: رەزا قولیخانو

ئەمانوڵڵاخان، مامەکانیان: محەمەد صادق خان، عەباسقولی خـان... نـەک بـەزەییان بەدانیشـتوانی وڵاتەکـەدا نەئەهاتەوە، بەڵکو بەزەییـان بـەیـەکتریشدا نەئەهاتـەوە، لەسـەر دەسـەڵاتو پـارە خـەریک بـون یـەکترییان ئەهاڕی‌و، لەگەڵ خۆیان دەسەڵاتی دێرینەی بنەماڵەی ئەردەڵانیشیان بەرەو کوێربونەوە ئەبرد.

دوای ئەوەی رەزا قولیخان‌و ئەمانوڵڵاخانی برای چەند جارێ لـەلای دەربـاری قاجـار ملـی یـەکترییان شکاند، دەرباری قاجار بۆ ئەوەی ئاسایش‌و دەسـەڵات بگێڕێتـەوە بـۆ ناوچەکـە، کەوتـە سـەر بیـری دانـانی حاکمێک لەدەرەوەی بنەماڵەی ئەردەڵان. خوسرەو خانی گورجیـان دانـاو، بەگـەیشـتنی حـاکمی نـوێ هـەر لەڕێگاوە رەزا قولیخانی بەزنجیرکراوی رەوانەی تاران کرد. دەستوپێوەندەکانی هـەردو بـرا: رەزا قولیخـان‌و ئەمانوڵڵاخان، پەرەوازە بون. هەندێکیان بەکۆمەڵ رویان لەشارەزورو سلێمانی کـرد. مەسـتورە لـەم بـارەیـەو نوسیویتی:

"لەبەرەوەتر باسمان کرد، کاتێ کەخوسرەو خانی گورجی (ئەرمەنی) گەیشتە ناوچەی کوردسـتان‌و بـە بەڵێن‌و سوێندی فـراوان رەزا قولیخـانی هـەڵفریوانـدو بـەلای خـۆی دای راکێشـا، محەمـەد سـوڵتان خـان‌و سەرلەبەری پیاوماقوڵانی ولایەتی ئەردەڵان ماڵ‌و ژن‌و منـداڵی والـی‌و زوربـەی خـەڵکـی ئـەردەڵانیـان بـەرەو هەورامان کۆچاو لەو کاتەدا من. نوسیاری ئەم دێڕانە یەکێ لەو کۆچکردوانە بـوم. هـەر کەگـەیشـتنە شـوێنێ کەناوی هۆشبارانیە، حەسەن سوڵتانی هەورامی بەپیری کۆچکردوانەوە هـاتو بەشـێوەیـەک کەشـایانی پلـەو پایەیان بێ رێ‌و رەسمی پێشواز لێ کردنیانی بەجێ هێنا.

لەو دەمەدا خان ئەحمەد خان کە لەگەڵ والیدا دوری نێو یەک قـەپیلکـو ئەسـتێرەی یـەک بـورج بـون، فەرمانڕەوای مەریوان بو، سەبارەت بەوەی کە والی لەگەڵیدا نێوانیان خۆش نەبو، ئەمەی بەهەل زانی‌و بـەرەو ناوچەی هەورامان هاتو مرخی لەگرتنی کۆچکردوەکان خۆش کردبو، بەڵام هەر کـەدیتی خـەڵکەکـە بـەجارێ دەستیان لەگیانی خۆیان شوشتوەو هەروا بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە نادەن، لەو کارە کشایەوە.

ئەو شەوە کۆچکردوەکان کە لەهەزار کەس زیاتر بون، لەگوندی هۆشبارانیان بەسەربرد. بـۆ سـبەینـێ کەهێشتا رۆژ هەڵ نەهات بو بەفر باریان راداو لەڕێگەیەکی ناهـەموارو سـەختەوە، کەهـەڵـۆی بەسـەردا فڕییـا پەری دەوەری‌و مانگی پێ سوکی ئاسمانی لێوە تێپەری دا دەکەوتـە خـوارێ بـۆ نێـو کەنـدەڵان‌و هـەڵـدێری پەستی‌و هەپرون بەهەپرون دەبو، تێپەرین‌و بەگوندێ لەگوندەکانی شـارەزور گـەیشـتن، کـەنێوی سـەرگەتەو لەوێ لێی گیرسانەوە. ئینجا لەوێوە محەمەد سوڵتان‌و میرزا عەبـدوڵڵای مونشـی باشـی چـون بـۆ سـلێمانی‌و بەخزمەت عەبدوڵڵا پاشای بابان گەیشتن‌و رێ‌و رەسمی پێشواز لێ کردنیـانی بـەجێگـەیانـدو پیاومـاقوڵێکی لەتەکیاندا نارد بۆ ناوچەی شارەزور، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بەسەر گوندەکانی شارەزوردا بیەشرێنەوەو دابین بکرێن.

لەباسی خونچەی باخی خوسرەوانی، نوێباوەی بێستانی کامـەرانی، ئـەمانوڵڵاخانی سـانیدا لـەبیرمان کرد لەوە بدوێین کە لەو کاتانەدا دڵسۆزانی گیانفیدای ئەو زاتە هەر دەسـتەیـەکیان کەوتنـە وڵاتێکـەوەو هـەر برێکیان لەبنارێکدا گیرسانەوە. حوسەین قولیخانی مامی ئەمانوڵڵاخان کەپورزای من، نوسیاری ئەم کتێبـەش بو، روی لەسلێمانی کردو بەو پەری رێزەوە لەوێ پێشوازی لێ کـراو گیرسـایەوەو کـاتێکیش هـەواڵی کـۆچی ئێمەی بیستەوە خەڵکێکی زۆری بەئەسپـو هێسترەوە نارد، سەد کەسێ لەبنەماڵەی ئێمـە بگوێزنـەوەو لەلایـەن خۆیشیەوە جێگەی هێورین‌و گوزەرانی بۆ ئامادە کردین‌و هـەر یەکـەی بـەپێی پێداویسـتی خـۆی کۆمـەکـو یارمەتی دەداو لەخزمەتیدا کاتمان بەخۆشی بەسەر دەبرد. بـەڵام پـاش چـەنـێ، چارەنوسـی خـودا لـەخۆش گوزەرانی ئێمە رازی نەبو، ئەوەبو لەرۆژی 14ی مانگی زیلحیجـەی 1263 ک (1846/11/23ز)دا جـەنابی حوسەین قولی خان نەخۆشی بەسەریدا زاڵ بو، لەماوەی شەورۆژێکدا گیانی بـە بەهەشـتی بـەرین شـادبو

لەپرسەکەیدا هەزاران سینەی بۆ هەڵ دڕاو منی مەستورەی سەر لێ شێواو و دەربەدەریش لەدوری لێک دابڕانی ئەو گیانە ئازیزەم دوسێ ڕۆژێکە لەشو ڕۆحم بە بەڵای تای نەخۆشییەوە دەتلێتەوە. بزانین خودا چیمان بەسەر دێنێو ئارەزوی بەچیە..." (ل 236-238).

مەستورە بەو چەند دێرە کۆتایی بەمێژوەکەی هێناوە، چونکە ئەویش هەر لەو ڕۆژانەدا بەپێی (حديقه:121-321-322) لە 1264دا لەتەمەنی 44 ساڵیدا بەهەمان دەرد کۆچی دوایی کردوە.

**-6-**

**بەرهەمەکانی**

پێ ئەچێ ماهشەرەف خانم بەدانانی شیعر دەستی پێ کردبێ. لەدەرگای شیعرەوە چۆتە ناو دنیای نوسینەوەو. "مەستورە"ی هەڵبژاردوە بەنازناوی خۆی. "دیوان مستورە کردستانی" سێ جار چاپ کراوە:

جاری یەکەم، ساڵی 1304 هیجری شەمسی، لەسنە، لەلایەن حاجی یحیی معرفت کردستانییەوە چاپو بڵاوکراوەتەوە.

جاری دوەم، ساڵی 1362 هیجری شەمسی، لەتاران نشرما، لەلایەن دیوان احمد کرمییەوە.

جاری سێیەم، بەهاری 77، لەتاران انتشارات امیر بهادر، لەلایەن دکتر صدیق صفی زادە (بورەکەئی)یەوە.

شیعرەکانی ناو چاپی یەکەمو دوەمی دیوانەکەی فارسین. بەڵام چاپەکەی سەفی زادە جگە لەشیعرە فارسیەکانی 462 بەیتی کوردی تێدایە. زۆری شیعرە کوردیەکانی بەهەورامی هۆنیوەتەوەو، بەزۆری شیوەنی بەکوڵن بۆ مەرگی خوسرەو خانی ناکامی مێردی. هەندێ شیعری تریشی بەپاڵ دراوە. کە بەکرمانجی خوارو هۆنراونەتەوە، بەزمانەکەیو جۆری دارشتنیدا لەشیعری ئەو ناچن.

بەقسەی (صفی زادە: 16) دو کتێبی تریشی نوسیوە: "مجمع الادباء" کەبیۆگرافی شاعیرانی کوردەو، "رسالەی شرعیات" کەباسی بنچینەکانی عەقایدو ئەحکامی ئیسلام ئەکا.

(مجمع الادباء)ی جارێ لەبەردەستدا نیەو، کتێبەکەی تریشی لەژێر ناوی (عقائد) ساڵی 1998 لەستۆکهۆڵم (سوید) لەلایەن عەبدوڵڵای مەردۆخەوە بەپێشەکیو لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلەوە بڵاوکراوەتەوە.

لێرەدا من خۆم لەقەرەی شیعرەکانی نادەم، ئەوە بەجێ ئەهێڵم بۆ شارەزایانی مەیدانی ئەدەب براو کتێبەکەی تریشی بەجێی ئەهێڵم بۆ خەڵکی کە. ئەوەی من مەبەستمە کتێبە مێژوییەکەیەتی: "تاریخ اردلان".

"تاریخ اردلان"ی "مەستورە کردستانی"ی بەهیمەتی "ناصر ازادپور" ساڵی 1343 ه. ش، لە "چاپخانە بهرامی" لەسنە چاپ کراوە.

د. حسن جاف و شکور مصطفی، لەژێر ناوی، مەستورەی کوردستانی: "مێژوی ئەردەلان"دا کردویانە بەکوردی، ساڵی 1989 لەبەغداد، لەلایەن "دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی"ەوە بڵاوکراوەتەوە.

3 کەمایەسی لەم وەرگێڕانەدا هەیە:

1. زمانەکەی:

ئەگەرچی وەرگێڕەکانی: شکور مستەفا کەرکوکیو، د. حەسەن جاف گەرمیانیە، بەڵام لە نوسینەکەیاندا زمانە رەوانو باوەکەی کوردستانی عیراقیان بەکار نەهێناوە، بەڵکو زۆریان لەخۆیان کردوە بۆ ئەوەی لاسایی زمانەکەی "شەرەفنامە"ی هەژاری موکریانی بکەنەوە، لەم کارەدا سەرکەوتو نەبون، زمانەکەیان بۆ خوێندنەوە ناقوڵاو بۆ تێگەیشتن سەختە.

2. وەرگێڕانەکەی:

لەهەندێ شوێنیا بەوردی تەرجومە نەکراوەو، لەهەندێ جێگەیشیا رستەی گرنگی لێ قرتاوە ئاخۆ هۆی ئەم ناتەواویە نوسینەوەو چاپکردنێتی یان وەرگێڕەکان بەئەنقەست ئەو رستانەیان لێ دەرهێناوە دیار نیە.

3. چاپەکەی:

هەڵەی چاپی زۆری تێ کەوتوە، هەندێ لەساڵەکانیشی، کە لەئەسڵی فارسیەکەیدا بەراستی نوسراون، لێرەدا تێکچون. لاپەڕە 85 بەشی ناتەواوە چونکە بەهەڵە، لەکاتی چاپدا، لاپەڕەی 58ی خراوەتە جێگەی.

—7—

## سەرچاوەکانی

مەستورە خۆی دەربارەی هۆی دانانی "تاریخ اردلان"و جۆری سەرچاوەکانی ئەڵێ: ".. تا رۆژێکیان رێم کەوتە دیوانەکانی پێشینیانو تۆمارو بەیازی پاشینان مێژوویێکم لەکوردانو دەستاویژێکم لەنیشتمانەکەم بەرچاو کەوت. پاش متالاو دوای نامە گۆڕینەوە، تەماشام کردو خوێندیشمەوە کەشەرحێکیان لەمەڕ چۆنیەتی حاڵو باڵی فەرمانڕەوایانی کوردستان نوسیوە. بەڵام بەهۆی ئەوەی کە کورتەیێک لەمانەی ماتەوە دوری ئەسمراو بو. منی کەمینە کە کەمترین دارخورمای گوڵشەنی ئەم گوڵزارە وەک ئیرەم بنیات نراوە.. بەسروشتی بڵێسەدارو زەینی رەخنەگرانەوە بەدوی دریژەپێدانەوە چونم بەپێویست زانیو پەرژامە سەر نوسینی ئەم چەند دێرەو دەنگوباسی پاشەرۆژ بەخێروخۆشیو بەختەوەری گوزەرینی زنجیرەی پایەبڵێندی بەنی ئەردەلانم بە بەشێک کە لەمێژوم هەڵێنجاوەو لەپێشینانم بیستوەو بەرچاوی منی کەمینە کەوتوە، لەم نوسخەیەدا رون کردۆتەوەو لەخوێنەرەوە چاوەڕوانی نزای چاکەم." (ل 11-12).

بەم پێیە سەرچاوەکانی بریتی بون لەنوسراو و باسو بابەتی بیستراو و بینینەکانی خۆی:

### 1. نوسراوەکان

گرنگترینی سەرچاوە نوسراوەکانی مەستورە، مێژوەکەی مەلا محەمەد شەریفی قازی: "زبدە التواریخ"و، خوسرەوی کوڕی محەمەدی کوڕی مەنۆچەری ئەردەڵان: "لب التواریخ"ـە. مەستورە کتێبەکەی خوسرەو بەگ بە"تاریخ الاکراد" ناو ئەبا.

مەستورە لەکتێبەکەیدا لەلاپەڕەکانی: 26، 28، 29، 49، 58، 83، 93، 98، 106، پەنجەی بۆ کتێبەکانی قازی شەریفو خوسرەو بەگ راکێشاوە. هەندێ جار گێڕانەوەی هەواڵەکان، کە لەگەڵ یەکتری جیاوازن، بەیارمەتی ئەم دو سەرچاوەیە، لەگەڵ یەک بەراوردو تاوتوێ ئەکا، بەڵام ناوی "نیل شرفنامە" نابا، رەنگە هۆی ئەمەیش ئەوە بێ، کە لەبەردەستیدا نەبوبێ.

بێگومان "شەرەفنامە"، ئەگەرچی ئەو بەناو ناوی نەهێناوە، سەرچاوەیەکی گرنگی تری ئەم مێژوە بوە. هەروەها ئەبێ کەڵکی لەمێژوە باوەکانی ئێرانو، ئەو نامەو بەڵگانەیش وەرگرت بێ کە لەکتێبخانە ئاوەدانەکانی میرەکانی ئەردەڵاندا هەبون.

### 2. بیستنەکانی

بنەماڵەی مەستورە لەگەڵ میرەکانی ئەردەڵان تێکەڵاو بون. نەنکی هاوسەری خوسرەوخانو، خوشکێکی باوکی هاوسەری ئەمانوڵڵاخانو، خۆیشی هاوسەری خوسرەو خانی ناکام بوە. باوباپیریشی

بەشێ بوون لەناووەندگای بەڕێوەبەرایەتی ئەردەلانو. لەشەڕوشۆڕەکاندا بەشداربون. زۆر روداو و چیرۆکی ئەم بنەماڵەیە کەنەنوسراونەتەوە لەناو خۆیاندا دەماودەم گێڕاویانەتەوە. لەم بارەیەوە ئەو هەڵەی بۆ مەستورە هەڵکەوتوە، رەنگە بۆ مێژونوسەکانی تر هەڵ نەکەوتبێ.

مەستورە، بۆ سەلماندنی یەکێ لەبۆچونەکانی، ئەڵێ: "...بەڵام بەندەی کەمینە لەگەڵ رای یەکەم دام. چونکە نەنکم یەکێ بوە لەوانەی کە لەباوەشی ئەو بنەماڵە بەرزەدا پێ گەییوەو هاوسەری والی بڵیند نەژاد، خوسرەو خانی باوکی ئەمانوڵڵا خان بو، گوێیان پڕ لەنور. دەربارەی سەردەمی منداڵیی خۆی، بەتایبەت لەو سەروبەندەدا . کەبنەماڵەکەیان لەهەمەدان بو، زۆری سەرگوزەشتەی بۆ دەگێڕامەوە..."(ل107).

لەشوێنێکی تردا ئەڵێ: "هەرچەندە لەکتێبانذا بەرچاو نەکەوتوە، بەڵام وەک لەبەرینانم بیستوە.."(ل34.)

لەجێگەیەکی کەدا ئەڵێ: "... وێرای ئەوەی کەمێژو لەم بارەوە زۆری لەسەر نەڕۆیشتوە، بەڵام وەک لەپێشینانم بیستوە، دوای نیشان کردنی زەڕین کولاە، ئەو گەوهەرە گرانباییە ئەختەربڵیندە، بەهاوسەریی خان ئەحمەد خان قابیل نەبو.."(ل45).

ئەمانەیش چەند نمونەیەکی کەن:

"دەگێڕنەوە: ئەو دەسکەوتەی لە لەشکرەکەی ئیسماعیل خان وەگیر باپیرم کەوت بو زۆر لەخۆی بەزیاتر دیت، لەبەر ئەوە بردیە خزمەتی خوسرەو خان. بەڵام ئەو فەرمانڕەوا دانگەرە، بەو هیمەتە حاتەمی‌یەوەی کە هەی بو، تۆخنی هیچی نەکەوتو سەرلەبەری بەرەو روی خۆی کردەوە، تەنانەت ئاوێنەیێکی گرانبایی زۆر نایاب لەو دەسکەوتە تا ئێستا بەموفەڕک لەبنەماڵەی ئێمەدا هەر ماوەتەوە"(ل157).

"میرزا لوتفوڵڵای کوڕی میرزا عەبدوڵڵای وەزیر کەمامی راستەقینەی دایکی ئەم کەمینەیەیە، لەو شەڕەدا حەفدە کەسی لەسەر زینی ئەسپ گلاندو لەخوێنی خۆیانیدا گەوزاندنو بەم رەنگە ئازایەتیو مەردایەتیی خۆی ئیسپات کرد"(ل160).

"باپیرە گەورەم کەدەرامەتی عەباسقولیخانو والی شوشتەری پێ سپێردرابو، هەزار تمەنی وەگیر کەوت"(ل162).

"باپیری سەروەری ئەم کەمینە، لەو هەراوهوریایەدا لەگەڵ نارازییەکاندا هاودەست بو. لەبەر ئەوەی ئەمامی پەنا سێبەری پەروەردەی ئەو بنەماڵەیە بو، بێ نمەکی کردبو، دەستی لەگەڵ دوژمنانی تێکەڵ کردبو، چەند رۆژێ بۆ گوێ راکێشان، چاوی بەزەیی لێ پۆشیو پێنج هەزار تمەنی چاوترسێنانە لێ سەند، بەڵام پاش 18 رۆژ دوبارە پلەی چاودێری کردنی دارایی پێ بەخشیەوە.."(174).

".. عەبدولڕەحمان پاشا جێگەی خۆی گرتەوەو دەسەڵاتی پەیداکردەوە ئەمانوڵڵاخانیش بەسەرکەوتنەوە گەڕایەوە بۆ مەڵبەندی خۆیو کەهیەی بەغدای لەگەڵ دوسەد لە بەدیل گیراوانی رۆمیدا کەلەم شەڕەدا بەدیل گیرابون لەگەڵ محەمەد ئاغای باپیرەی ئەم کەمینەیەدا نارد بۆ خزمەت فەتح علی شا، بەڵام شا ناردنیەوە بەغدا."(ل179).

"..بەنیازی لابردنی والییەوە رویان کردە دەرباری تارانو هەر ئەو شەوە بۆ بەیانی کەئەم هەواڵە بەوالی گەیشت محەمەد ئاغای سەرکاری کەباپیری پایە بڵندی، نوسیاری ئەم مێژوەیە، بۆ رونکردنەوەی راستی کەینو بەینەکەو بەتاڵکردنەوەی نیازی پیسی نارەزایان، نارد بۆ دەرباری فەتح عەلی شا.."(ل183).

"ئەمانوڵڵاخان ئەم کردەوەیەی بۆ قوت نەچو... محەمەد ئاغا باپیری نوسیاری ئەم کتێبەی کردە سەرداری لەشکرێ لەئازاو شێردڵانی ئەردەلانو بۆ ناوچەی بانەی نارد.."(ل184).

"خەبەری سەرکەوتنیشی لەشەڕو هەراکەی بانەدا... پێگەیشت. محەمەد ئاغـای بـاپیری سـەروەری ئەم نوسیارە بەرانبەر ئەم خزمەتە گەورەیە بەجوبەیێکی تورمەو شیرێکی دەبان خەڵات کرد.."(ل187).

"شا لەم بارەیەوە تا بڵێی خەمبار بـو. تەنانـەت نـارەزایی‌و نـەفرینی خـۆی بەمحەمـەد ئاغـا، بـاپیرەی نوسـیاری ئـەم کتێبـە. کەئـەمانوڵڵاخان بـەناوی بـاڵیۆزەوەی نـاردبو بـۆ دەربـاری قاجـار بەئـەمانوڵڵاخان ڕاگەیاند."(ل188).

"..نزیکەی سەد هەزار تمەنێ بۆ سەروبەرنانی ئەم شاییو ژن هێنانە خەرج کرا. لـەم سـەد هـەزار تمەنـە، چل هەزار تمەنی بۆ ئاڵاو واڵاو بۆ زەکـو نۆزەکـو خشڵ و زێڕوزیوی بوکێ خەرج کرا. خوالێخۆشبو باوکم بـۆ خۆی سەرپەرشتی ئەم زەماوەندەی کردوەو هەر خەرجو پولو دراوێکی بۆ شیرینیو خواردەمـەنی خـەرج کـراوە ئەو سەرپەرشتی بوە. دەگێڕنەوە: لـەم شـاییەدا دە هـۆرِ نوقـڵ. لەگـەڵ چەنـد تێـر قەنـدو نـەباتی سـپیو چەنـد شیرینیەکی تر بەخەرج دراوە. ئیتر ئەو دواکەیشی هەر بەم پێودانە بوەو دەبێ هەروایش لەقەڵەم بدرێ"(ل189).

ئەم گێڕانەوانەی دەماودەم پشتاوپشت لەناو بنەماڵەکەیاندا هـاتون، سـەرچاوەیـەکی گرنـگ بـون بـۆ دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆکی باسەکانی.

### 3. بینینەکانی

مەستورە ئافرەتێکی زرنگـو وریا بوە. هەر لەمناڵیەوە خوێندویـەتـیو سـەودای خوێنـدنـەوەو نوسـین لەکەللەی داوە. لەناو بنەماڵەیەکی ناسراو و دەوڵەمەندو ڕۆشنبیردا پـێ گـەیشـتوە. بـەچاوێکی تیـژ سـەیـری ڕوداوەکانی دەورو پشتیو چاودێری هەلومەرجی وڵاتی کردوە. کەچۆتە ناو حەرەمسـەرای خوسـرەو خانـەوە ئەم بوارەی زیاتر بۆ فراوان بوە. بۆ ئەوەی لەنزیکەوە ئاگای لەهەواڵو دەنگوباسو ڕوداوەکـان بـێو. زیـاتر تێکەڵاو بێ لەگەڵ دەسەڵاتدارانی وڵات.

"..مـن ئـەم کەمینـەیـە، بـەچاوی خـۆم دیـتم بـاڵیۆزی ڕوسو ئینگلیـز لەسـەردەمی فـەرمانڕەوایی ئەمانوڵڵاخانی والیدا بەناوی دیتنی ئەم قەڵایەوە. بەسەر کوردستان (سنە)دا تـێدەپـەڕیـنو لەگـەڵ ئـەوەشدا کەقەڵاکە وێرانە بو. سەیرانی شوێنەوارو کەلاوەکەیان دەکرد.."(ل42).

"..لەساڵی 1138ی ک دا لەو جێگایەی کەئێستا باخێکەو نمونەی بەهەشتی بەرینەو نزیکـی کۆشـکـو تەلاری مەرکەزی میرنشینەو بەفیردەوس بەناوبانگە. قوتابخانەیەکی بنیات ناو لەمەودایێکی کـورتدا پاشـای بابان هەر کەموکورییەکی هەی بو. تەواوی کردو هێندەی دیکەی وەسەرناو منارەیەکی جوانی لێدروست کـرد. تا سەردەمی فەرمانڕەوایی پڕ شانازیی ئەمانوڵلاخانیش هەر مابو. من بۆ خۆشـم دیـتم. ئـەمانوڵڵاخان لەبـەر ئەوەی بونی ئەو منارەو ناسەوارەی بەمایەی سەرشۆڕیی ئەردەڵانەکان دەزانی وێـرانو خـاپوری کـردو داری بەسەر بەردیەوە نەهێشت."(ل90).

ئەم دو ڕوداوەی ئەیانگێڕێتەوە هی سەردەمێکن کەهێشـتا مەسـتورە شـوی بەخوسـرەوخان نـەکردوە. کەنیشانەی ئاگـاداریی زۆر و سـەرنجدانی وردە. بێگومـان دوای ئـەوەی چۆتـە نـاو کۆشـکی حوکمڕانیـەوە ئاسۆی دیتنەکانی. بەتایبەتی ئاگاداری لەڕوداوە سیاسیەکان. فراوانتر بوە.

—8—

### گێڕانەوەکانی

مەستورە لەگێڕانەوەی باسێکدا ئەنوسێ: "ئەقڵی بێخـەوش و چێـژو. سـەلیقەی ڕاسـت. ئـەم قسـەیـە ناسەلمێنێ چونکە..."(ل15) ئەم سەرنجە ئـەقڵیو ڕەخنەگرانـەیـە بـۆ مێژونـوس زۆر پێویسـتە بـۆ ئـەوەی

ئەفسانە و روداوی هەڵبەستراو تێکەڵاوی روداوە راستەکانی مێژو ئەکات. مەستورە وەکو یەکێ لەبنەماڵەی ئەردەڵان لەباسەکانی‌دا بەلای ئەواندا دائەشکێنێ. بەڵام راستگۆییەکی زۆر لەنوسینەکانی‌دا هەیە. ئەو هەواڵانەی بەتەواوی لێیان دڵنیا نەبوبێ، گومانی خۆی لەراستیی‌و ناراستییان، بەچەند رستەیەکی وەکو: "خودا هەر خۆی لەراستی هەمو شتێ ئاگادارە" (ل15)، "خودا بۆ خۆی دەزانێ" (ل30، 50، 66)، "زانست لای خودایە" (ل34)، دەربڕیوە.

**-9-**

## رێبازی نوسینەکەی

مێژونوسانی کۆن، لەنوسینی ئەم بابەتانەدا دو رێبازیان گرتوە: یەکێکیان، کەسەکانیان کردۆتە سەرباس لەژێر ناوی ئەوان‌دا روداوەکانیان گێڕاوەتەوە. یان، ساڵ بە ساڵ روداوەکانیان گێڕاوەتەوەو. ساڵەکەیان کردۆتە سەرباس‌و، باسی کەسایەتی‌و قارەمانی روداوەکانیان بەپێی ساڵەکانیان بەدوای یەکدا گێڕاوەتەوە. شەرەفخان لەنوسینی "شەرەفنامە"دا پێڕەوی رێبازی یەکەمی کردوە. هەمو مێژونوسەکانی ئەردەڵانیش، لەوانە مەستورە، لەرێبازی نوسین‌و گێڕانەوەی روداوەکانیان‌دا لاسایی شەرەفخانیان کردۆتەوەو. بەچاولێکەری ئەو دریژەیان بەمێژوی ئەردەڵان داوە. ئەگەر یەکێکیان یا زیاتر روداوەکانی ساڵانە بگێڕایەتەوە، بێگومان ئێستا کەرەستەیەکی زۆرتری لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەردەڵانمان لەبەر دەستدا ئەبو. بەراوردکردنی روداوەکان ئاسانتر ئەبو.

زمانی نوسینی "تاریخ اردلان"و جۆری داڕشتنی، هەر ئەوانە ئەتوانن هەڵی بسەنگێنن کەشارەزای پەخشانی فارسین، ئەگەرچی سەجع‌و وشەی هاوواتاو دریژەدانی زۆری تێدایە. بەڵام بۆ من رەوان‌و تێگەیشتنی ئاسانە. مەستورە جگە لەوەی شارەزای مێژو بوە، لەچەندین جێگای گونجاودا ئایەتی قورئان، پەندی عەرەبی، شیعری فارسی هی خۆی‌و هی شاعیری تری، تێکەڵاوی نوسینەکانی کردوە. ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە کەسەرچاوەی رۆشنبیریی مەستورە دەوڵەمەند بوە.

**-10-**

## هەڵسەنگاندنی

هەواڵەکانی "تاریخ اردلان" بەتایبەتی هەواڵەکانی پەنجا ساڵی دوایی دەربارەی: ناکۆکی ناوخۆی نێوان میرەکانی ئەردەڵان‌و، نێوان ئەردەڵان‌و بابان‌و، پەنابردن بۆ یەکتری‌و، هاندانی یەکتری بۆ شەڕ و پەلاماردانی یەکتری.

زوڵم‌و زۆری‌و والیەکانی ئەردەڵان، بەتایبەتی لەروی کۆکردنەوەی زۆرەملێی پارە، گرتن‌و ئەشکەنجەو کوشتنی ناڕەوا، دانان‌و لابردنی وەکیل‌و وەزیرەکان‌و، کۆچی بەکۆمەڵ بۆ دەرەوەی ئەردەڵان‌و، نەمانی سەلامەتی سەرو سامان.

بۆگەن بونی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی‌و، خەریک بونی میرەکانی بەشایی‌و رابواردنی ژن‌و، خواردنەوەو، راوشکارو، پێشکەش‌و بەرتیل.

گوێ نەدانە سکاڵاو گازندەی خەڵک، تەنانەت هی گەورەو دەسەڵاتدارەکان‌و، سەرکوتکردنی بێ بەزەییانەی هەمو جۆرە نارەزاییەک.

کارەساتی سروشتی قاتوقڕی‌و برسێتی، رێبەندانی بەفرو سەرما، رشانەوەو نەخۆشینی تر.

ناکۆکی ناوخۆی میرەکانی ئەردەڵان، کوڕەکانی ئەمانوڵلاخان: خوسرەوخان، محەمەد صادق خان، حوسەینقولی خان. دوای ئەوانیش ناکۆکی ناوخۆی کوڕەکانی خوسرەوخان: رەزا قولی خان‌و ئەمانوڵلاخانی دوەم.

دەسوەردانی ژنانی قاجار(حوسنی جیهانی کچی فەتح عەلی شا: هاوسەری خوسرەو خانو، توبا خانمی کچی عەباس میرزاو خوشکی محەمەد شا: هاوسەری رەزا قولی خان) لەململانێی دەسەڵاتدا لەنێوان میرەکانی ئەردەڵاندا.

لێکدانەوەی روداوەکان مەستورە ئەگەیەنێتە ئەنجامگیرییەکی زۆر گرنگ دەربارەی پاشەڕۆژی میرایەتی ئەردەڵانو پێشبینی تێکچونی ئەکاو ئەنوسێ: "... ئیدی ئیدیو ئەختە ئەختە ئەم سەربزێویو سەرسەختیو گوێ نەدانە بو بەهۆی ئەوە شا پشتیان تێکاو رویان لێ وەرگێڕیو گوێیان راکێشێ. تەنانەت ئەتوانین بڵێین. شا هاتە سەر ئەو بڕیارە کەبناغەی ئەم بنەماڵە تێکداو داری بەسەر بەریەوە نەهێڵێ."(ل231).

مەستورە، کە لەقۆناغی داروخانو هەرەسهێنانی ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری.. میرایەتیەکانی ئەردەڵانو باباندا. ژیاوەو، نزیکی داودەزگای حوکمرانی ئەردەڵان بوە، بەچاوی خۆی روداوەکانی بینیوەو، گێڕانەوە جیاوازەکانی بیستوەو، بەڵگەکانی خوێندۆتەوە، وەکو شایەتێکی ئاگادارو لێهاتوی سەردەمی خۆی، گێڕانەوەکانی لە"تاریخ اردلان"دا بۆ لێکدانەوەی مێژوی هەردو ئەمارەتی ئەردەڵانو بابان. نرخێکی گران و گرنگیەکی تایبەتییان هەیە.

**-11-**

## پلاری ژن

مەستورە لەناو روداوەکانی سەردەمی خان ئەحمەد خاندا، گفتوگۆی ژنە بڵباسێکو خان ئەگێڕێتەوە، دوبارەکردنەوەی لێرەدا بێ جێ نیە.

ئێلی بڵباس لەخان ئەحمەد خان یاخی ئەبن، خان لەشکریان ئەداتە سەرو پەلاماریان ئەدا. هەردولا بەشەڕ دێن. لەشکری ئەردەڵان لەشکری بڵباس ئەشکێنێ. بڵباس ئەکشێتەوە شوێنێکی سەختو عاسی. لەشکری ئەردەڵان لەدویان نابنەوە. (مەستورە:53-54) لەسەری ئەڕواو ئەنوسێ: "چەند رۆژێ گەمارۆیان دانو رێی هاتوچۆو کاروباریان لێ بەستن تا بەم شێوەیە داوێنی دان بەخۆدا گرتنو سەبریان لەدەست بدەنو واز لەلوتبەرزی بێننو ملکەچی قوبوڵ بکەن. ئەگەرچی دوایی، هێرشەکەیان راگرت بەڵام ئەو روداوە لەهەمو کاتگای دڵیانەوە نەبو. لەبەر ئەوەی رێگای بەوێ گەیشتنی یەکجار سەختو توش بو بواری شەڕوشۆڕیان نەبو. لەسەروبەرنانی ئەم کارەدا سەریان سوڕما لەو دەشتەدا سەرگەردان مانەوە.

سەرەنجام رۆژێکیان کەڵەژنێکی جوانی ژیرو زیرەکی ئەو تیرەیە ئارەزوی گەشتو سەیران دەکا. دەوروبەری سوپا بێ سەنگەرو سوپەر بو. بەرێکەوت توشی بو بەتوشی کاربەدەستی خانەوە، لێی پرسی: "هۆی لێرە هەوارگرتنتان لەبەر چیەو ئەم هەمو خۆ ئامادەکردنو خۆسازکردنە لەبەر کێیە؟" کاربەدەستەکە لەوەڵامدا گوتی: "هۆی هەوارگرتنمان لێرە ئەوەی رێگاوبان نیەو رێڕەوەکە زۆر تەنگەبەرەو بەئاسانی توانی لێوە دەربازبونمان نیە".

ئەو ئافرەتە شەنگە بەتانوتو پلارێکی نازو عیشوەئامێزەوە، بو بەباوەشێنی بڵێسەی ئاگری تورەییو رکی خان. هەر دەمودەست فەرمانی ئامادەبونی لەشکری سەرکەوتویداو چیرۆکی ئەم ژنە نیهانپاکەی لەنوکەوە بۆ سەردارانی سوپا گێڕایەوە. سەردارانی سوپایش دەسبەجێ دەستیان لەگیانی خۆیان شوشتو دەستیان بەقڵفی تونـدوتۆڵی فەزڵی خوداوەنـدی دو جیهانەوە گرتو لاوانی خەنجەر بەدەست بەتیخی داوبارەوە چاکی ئازایەتییان لێ هەڵکردو دەستیان دایە شیرو رمو بەیارمەتیی خودای بێ هاوتا رویان کردە سەر لوتکەی چیاکانو لەو دشێوانەوە بەرەو هەورازان هەڵکشێنو دەروی شەڕوشۆڕیان لەڕوی دوژمنان

هاوێشتە سەر گازی پشت. ئەم تیرە چارە بەدە ئەم هەنگامەیەیان دیت دەسبەجێ دەستیان بەشەڕکردو بەتەقەکردنو گابەرد گلۆر کردنەوەو تێهەڵچونو ئەو دڵێرە رۆستەم ئاکارانە بەتیخو تیرو تەورەوە خۆیان گەیاندە سەنگەرە بەسامەکانیانو دیرو مێیان لەتیخ کێشانو پاشماوەی ماڵو سامانیان بو بەدەسکەوتی ئەو سوپا سەرکەوتوەو لەشکری زاڵ بو بەدیلو یەخسیرێکی زۆرەوە، لەوە زێتر پێوە نەچو بەسەرکەوتنو زاڵ بونەوە گەڕایەوە."...

"ذیل شرفنامە" کە لە "تاریخ اردلان" کۆنترە ئەم باسەی تێدا نەنوسراوە. بەڵام پێش ئەم (لب:54-55) هەمان چیرۆکی گێڕاوەتەوە، پێ ئەچێ مەستورەیش لەوی وەرگرتبێ. دوای ئەویش هەم لە"حدیقە:131-132"و هەم لە"تحفە:113"دا بەکەمێ دەسکاریەوە دوبارە نوسراوەتەوەو. هەردوکیان شوێنەکەیان بەقەڵای رەواندز دیاری کردوە. ئەم چیرۆکە ئەگەر راستو رودا و بێ، یان خەیاڵو هەڵبەستراو. گێڕانەوەی لەلایەن مەستورەوە، بەو ئاشکراییو بێ پەردەییە، خۆی لەخۆیدا نیشانەی ئەوپەڕی ئازایەتی ئەدەبیە، بەتایبەتی بۆ ژنێکی چینی سەرەوەی کۆمەڵ، لەزەمانو زەمینی ئەوسای کوردستاندا. دورنیە نالی ئەم گێڕانەوەیەی مەستورەی خوێندبێتەوەو، هەر ئەمەش هانی دابێ پڕکێشی بکا شیعرە بەناوبانگەکەی لەسەر هەمان ڕێڕەوی تەنگ بهۆنێتەوە.

## -12-

### مەستورە لەبەر تیغی زماندا

دایکی رۆژگار نە پێش ئەو نە دوای ئەویش، ژنێکی هەڵکەوتوی وەکو مەستورەی بەمێژوی کورد نەبەخشیوە. بەڵام مەستورەش وەکو هەمو کەسایەتیەکی هەڵکەوتوی کۆمەڵ، لەسەردەمی خۆیدا، کەوتۆتە بەر تیغی زمانو نەشتەری قەڵەم. خوا ئەزانێ لەسەردەمی خۆیدا چییان پێ وتوە؟ بەڵام ئەوەی بەنوسراوی بەجێ ماوە. شیعرێکی درێژی نالی، گەورەترین شاعیری ئەو سەردەمەو، کورتە لێدوانێکی فخر الکتاب، گەورەترین مێژونوسی ئەو سەردەمەیە.

## -13-

### نەشتەرەکەی نالی

مەستورە شاعیرێکی خاوەن دیوان بوە. بەقسەی (حدیقە:321) نزیکەی 20 هەزار بەیتو، بەقسەی (تحفە:209)زیاد لە 10 هەزار بەیتی بەفارسی هۆنیوەتەوە. نالی لەباتی ئەوەی لەشیعرەکانی بکۆڵێتەوەو بەهرەی هونەریو شاعیرانەی هەڵبسەنگێنێو، بایەخو ئایەخی بەرهەمەکانی لەیەک جیا بکاتەوە. کەسایەتی خودی مەستورەی داوەتە بەر تیغی زمانو نەشتەری قەڵەم. نالی شیعرێکی 49 بەیتی هۆنیوەتەوە، بۆ جوانکردنو رازاندنەوەی وەستاییەکی یەکجار زۆری تێدا بە خەرج داوە. کێشو قافیەی هەر 98 دێرەکەی وەکو یەک داڕشتوە. لە شیعرەکەیدا خەو بەمەستورەوە ئەبینێو ئەکەوێتە گێڕانەوەی:

مەستورە کەحەسناو ئەدیبە بەحسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێکو عیتابێ؟
هاتوم، وتی، عوقدەم هەیە، قەت مومکینە وابێ؟
هی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بەجەوابێ؟

لێرە بەدواوە بەزمانی مەستورەوە 30 بەیت هەڵئەبەستێ. بۆ ئەوەی نالی تاو بکا و ئارەزوی جوتبونی لە لا بوروژێنێ، ستایشێکی جنسی کونوکەلەبەری ناولنگی خۆی ئەکاو، داوای لێ ئەکا لەگەڵی دروست بێ‌و.

دوا بەیتی ئەم تاوکردنە گەرمە، بەزمانی مەستورەوە، بەم پرسیارە ئەهێنێتەوە:

کێ بێ لەجیهاندا چ گەدا بێتو چ شا بێ
تەرکێکی وەها ناسکو پڕ لەززەتی (...) بێ؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەی مەستورەدا، نالی بەزمانی چوکی خۆیەوە 13 بەیت هەڵئەبەستێ، ئەڵێ:

دێوانە کەزانی کەدەبێ عوقدە گوشا بێ
هەستاو، گوتی: ئەشکی ڕەوانم بەفیدا بێ!

لەشوێنێکی تریدا ئەڵێ:

کێ بێ وەکو تۆ بەم شەوە ڕەحمی بەمنا بێ؟
مەجزوبە سیفەت، یەعنی سیلەی ڕەحمی تێدا بێ!
هەم جازیبەو قابیلەیی ئەخزو عەتا بێ
مەستورەو مەخفی، شەبەهی بادی سەبا بێ؟
مەستانە هەڵستێتو بەکوێریی ڕوقەبا بێ!
ئەم باب زەنە گەرمو تەڕیکا بەکەبابێ! (دیوانی نالی: 603-630)

نالی، بێگومان، لەم شیعرە مەبەستی ستایشو پەسنی مەستورە نیە، بەڵکو ئەم شیعرەی بۆ ئـابڕووبردنی مەستورەو ئەتککردنی هەڵبەستوە. ئەبێ چی پاڵی بەنالییەوە نابێ سوکایەتی بە مەستورە بکا؟

-ئارەزوی شێتانەی گەنجی و حەز لێکردنی سەرەرۆیانەی سەردەمی فەقێیەتی نالی بـوە لەسـنە، ئەگـەر وایە خۆ میرەکانی بابانیش لەسلێمانی هاوسەری جوان و کچـی جوانخاسـیان زۆر بـوە بـۆچی نـالی خـەوی بە کەسیانەوە نەدیوەو ناوی کەسیانی نەهێناوە؟

-یان ئەمیش "تێچێن"ێکە لەو ناکۆکیـە درێـژەی لـە نێـوان بنەماڵـەی ئـەردەڵانو بابـاندا هـەبوە، بـۆ شکاندنی یەکتری؟

-یان حەسودی بردن بەپایەی بڵندی ئەدەبیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی مەستورە؟

ڕەنگە هەر نالی خۆی بتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، نالیش نەماوە.

ئەگەرچی نالی لەو سەردەمەدا بەمەبەستی جنێو پێدان باسی "سێکسی بون"ی مەستورەی کردوە، بەڵام لەم سەردەمەدا گەورەترین ستایش بۆ ژنێکی ئینگلیز ئەوەیە پێی بڵێ: "سێکسیترینی ژنان".

## -14-

### توانجەکەی فخر الکتاب

مەستورە لەدوای شەرەفخان، مەلا محەمەد شـەریف، محەمـەد ئیبراهـی ئـەردەڵانـی و، خوسـرەو بـەگی ئەردەڵان، پێنجەمین کەسە مێژوی ئەردەڵانی نوسی بێتەوە. فخر الکتاب چەندین ساڵ دوای مردنی ئەو ئینجـا دەستی داوەتە نوسینی "تحفەی ناصری". بێگومـان یـەکێ لەسـەرچاوەکانی "تحفـە"، مێژوەکـەی مەسـتورە و سەرچاوەیەکی تریشی "حدیقەی ناصری" عـەلی ئەکبـەری ئـامۆزای بـوە. بـەراوردی "حدیقـە" و"تحفـە" دەری ئەخەن، فخر الکتاب زۆری ئاگاداریەکانی لەم دو سەرچاوەیە وەرگرتوە، تەنانەت هەندێ لەباسەکانی بـە کـەمێ دەسکاریەوە دەقاودەق لە"حدیقە"راگوێزراوە. کەچی فخـر الکتـاب لـەباتی ئـەوەی وەکـو مێژونـوس بکەوێتـە لێکۆڵینـەوەی نـاوەڕۆکـی مێژوەکـەی مەسـتورە و، ڕاسـتی و چـەوتی گێڕانـەوەکانی بخاتـە سـەر دەزگـای هەڵسەنگاندنو ڕەخنە، کەسایەتی خودی مەستورەی داوەتە بەر تیغی زمانو ئەشتەری قەڵەم.

فخر الکتاب (تحفه: 209) ئەڵێ "مستوره یکی از نسوان طائفەی قادری‌و قدر بدصورت بوده ولی در ضرائف معانی‌و ظرائف سخندانی‌و طرز غزل سرائی‌و قافیه ارائی اعجوبەی ان ایام‌و بخسرو خان ناکام عاشق بوده بوشاقت بیان‌و طلاقت زبان‌و غزلهای عاشقانه دلربائی از والی کرده‌و بهر شیوه‌و بهانه خودرا بحبالەی نکاح خسرو خان دراورده."...

لێرەدا چەند شتێ پێویستیان بەلێدوان هەیە:

1. بەپێی شیعرەکەی نالی ئەبێ مەستورە نەک "نەختێ بەدفەسال" نەبوبێ، بەڵکو ئەوەندە جوان‌و دڵرفێن بوە، پیاوی بەزەوقی وەکو نالی خەوی خۆشی پێوە بینیوە. نوسەر بۆ شکاندنی ئەم توانجەی تێ گرتوە. تەنانەت ئەگەرجوانیش نەبوبێ، نابێ لێی بەعەیب بگیرێ. هیچ کەس جوانی‌و ناشیرینی بەدەس خۆی نیە.
2. وەکو ئەم ئەڵێ مەستورە بەزۆر خۆی بەسەر خوسرەو خاندا ساغ کردۆتەوەو، بە شیعر و قسەی جوان خوسرەو خانی راکێشاوەتە ناو داوی عەشقی خۆی‌و وای لێ کردوە مارەی بکا و بیهێنێ.

ئەگەر ئەم قسەیەی فخرالکتاب راست بێ، شایەتیەکی زۆر گەورەیە بۆلێهاتویی و زیرەکی مەستورە و، کاریگەری ژن لە سەر پیاو. بەڵام مەخابن وەکو مەستورە خۆی ئەیگێڕێتەوە، ئەم وەکو قوربانیەکی دابو نەریتی دواکەوتوی کورد لەنرخی لێخۆشبونی باوکی‌و خزمەکانیدا دراوە بەخوسرەو خان، نەک لەئەنجامی عەشق و دڵداریدا.

میرزا شوکروڵڵا، کەپشتاوپشت میرزا بون لەداوودەزگای میرەکانی ئەردەڵاندا، ناشێ لەم کەینوبەینە ناگادار نەبوبێ، یا ئەی بیست بێ، یا هیچ نەبێ "تاریخ اردلان"ی مەستورەی نەخوێندبێتەوە کە بەئاشکرا باسەکەی گێڕاوەتەوە؟

3. ستایشی وەستایی مەستورە ئەکا لەشیعر و لەگفتوگۆدا کەچی هیچ ئیشارەتێ بەمێژوەکەی نادا.

فخر الکتاب لەنوسینەکەیدا مەبەستی شکاندنی مەستورە و سوکایەتی پێکردنێتی. ئەبێ چی پاڵی بە فخر الکتابەوە نابێ سوکایەتی بە مەستورە بکا:

- دوژمنایەتی بنەماڵەیی لەنێوان بنەماڵەی میرزا شوکروڵڵا و بنەماڵەی قادریدا؟
- یان حەسودی بردن بەپلەی بڵندی ئەدەبی، رۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی مەستورە؟

# سەرەتای میرایەتی ئەردەڵان

## -1-

سەری زنجیرەی حوکمڕانەکانی ئەردەڵان لە بابە ئەردەڵانەوە دەس پێ ئەکا.

لەدوای بابە ئەردەڵان، کوڕو نەوەکانی بەڕێز: کلۆلی کوڕی بابەئەردەڵان، خدری کوڕی کلۆل، ئەلیاسی کوڕی خدر، خدری دوەم کوڕی ئەلیاس، حەسەنی کوڕی خدری دوەم، باڵولی (بابلو) کوڕی حەسەن، مونزیری کوڕی باڵوڵ...

## -2-

**مەئمون بەگی کوڕی مونزیر بەگ (862-900)**

32 ساڵ حوکمڕانی کردوەو، یەکێ لەپیاوە هەڵکەوتوەکانی ئەم بنەماڵەیە بوە، بۆیە ئەم بنەماڵەیە بەناوی ئەوەوە ناوی نراوە: "مەئمونی"و کوردیش کردویوتی بە: "مامۆیی".

مەئمون، لەسەردەمی ژیانی خۆیدا قەڵەمڕەوەکەی بەسەر 3 لەکوڕەکانیدا دابەش کردون:

بێگە بەگ، کوڕی گەورەی، لەسەر زەڵم، گوڵعەنبەر، شەمیران، هاوار، دوران، دەوسو، داناوە.

سورخاب بەگ، کوڕی ناونجی، لەسەر نەوێ، مەریوان، تەنورە، هەورامان، کەولۆس، کلاش، نشکاش، داناوە.

محەمەد بەگ، کورە بچکۆلەکەیشی، لەسەر سرۆچک، قەرەداغ، ئالان، شارەزور، داناوە.

## -3-

**بێگە بەگ کوڕی مەئمون بەگ (915-957)**

مەئمون بەگ لەیادداشتەکەیدا ئەڵێ:

"کاتێ شا ئیسماعیلی سەفەوی کاروباری ئێرانی گرتە دەس و کەوتە پەلهاویشتن بەم لاو ئەولای ئێراندا بێگە بەگی کوڕی مەئمون بەگ حاکمی ئەردەڵان بو. بنکەی ئەمارەتی ئەردەڵان لەقەڵای زەڵمدا بو

قەڵەمڕەوەکەیشی بەزۆری لەجنوبی خۆرئاوای کوردستاندا بـو. ناوچـەکانی مـەریوان، هـەورامان، شـارباژێر، سرۆچک، قەرەداخ لەبەر دەس دا بو.

بێگە بەگ نەچوە ژێر باری فەرمانبەری شا ئیسماعیلەوە. شا هێزێکی گەورەی بەسـەرکردایەتی چاپـان سوڵتان ناردە سەری لەگەڵ دوانزە میری تردا کەهەمو نازناوی سوڵتانیان هەبو. ئەم هێزە گوندەکانی دەشـتی شارەزوریان تاڵانو وێرانو، 3 لە قەڵاکانیان کرد بەکەلاوە. بـەڵام قەڵایـەکیان کـە بەشـاخێکی سـەختەوە بـو (ئەبێ قەڵای زەڵم بوبێ) پێ نەگیرا دوای ئەوەی ساڵێک گەمارۆیان دا سەرەنجام دەستیان لێ هـەڵگرت، بـەڵام ناوبەناو هێرشیان ئەهێنایە سەر ناوچەکە.

لەسـەردەمی جـەنگی 20 سـاڵەی ڕۆمو عەجـەمدا کـەئۆردوی ڕۆم خـۆی سـازدا پـەلاماری ئێـران بـداو، بەرابیەکەی بەسەرکردایەتی ئیبراهیم پاشا گەیشتە حەلەب، بێگە بەگ کوێخا حەیـدەری بەنامەیەکـەوە نـاردە لای. ئەوان چونکە سوننەن هەمیشە لەژێر گوشاری قزڵباش دا بونو دڵسۆزی خۆی بۆ سەڵتەنەتی عوسمانی دەربڕی.

ئۆردوی ڕۆم بەرەو ئێران کشاو تەورێزی پایتەختی سەفەوی گرتـو سـوڵتان سـلێمانی قـانونی خـۆی سەرکردایەتی ئەم لەشکرکێشیەی ئەکرد. لەبەر سەرمای زستانو کـەمی خـۆراکو ئالیـک سـوڵتان بڕیـاری دا هێزەکەی بباتە ناوچە گەرمەکانی نزیک بەغداد. لەڕێگەی هەمەدانەوە بەناو کوردستان دا بەڕێ کەوتن. لـەڕێگا هەندێکی هێزەکەی لەناو بەفردا مردنو هەندێ لەوڵاخە باربەرەکانیشی تۆپین. بۆ ئەوەی تـۆپـو کەلوپەلـەکانی نەکەونە دەس قزڵباش فەرمانیدا هەندێ لەتۆپەکانیان لەژێر گڵ دا شاردەوەو هەندێکیان هاویشـتە روبـارەوە، بەقسەی مەئمون بەگ هەندێکیان لەپشتە شاخو هەندێکیان خستۆتە ناو چەمی قەرەسوەوە (ل 23).

کەسوڵتان گەیشتە بەغـدادو حەسـایەوە پرسـی نزیکتـرین دەسـەڵاتدارو وڵات بەشـوێنی شـاردنەوەی تۆپەکان کێیەو لەکوێیە؟ وتیان بێگە بەگـو وڵاتـی شـارەزورە، کەپێشـتر خـۆی نامـەی بەندایـەتی نـاردوە. سوڵتان فەرمانیدا کەنامەو نێردراوی بنێرنە لا بۆ ئەوەی خەریکی دۆزینەوەو هێنانەوەی تۆپـەکان بـێ. بێگـە بەگ بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵی فەرمانی سوڵتان سوهرابی برای بەنامەو دیاریەوە ناردو، داوای کرد کەسـانێکی بـۆ بنێـرن کـەبزانن تۆپـەکانیان لـەکوێ شـاردۆتەوە بـۆ ئـەوەی بیدۆزنـەوە. سـوڵتان بـۆ درێژەپێـدانی لەشکرکێشیەکانی بەناو کوردستان دا دیسانەوە بەرەو ئێران ئەچو. لەبەر ئەوە فەرمانیدا بێگە بەگ خـەریکی دۆزینەوەی تۆپەکان بێو بۆ ئەو مەبەستە شـارەزاو عەرەبانـەی بـۆ نـاردو، فەرمانیشـیدا بەسـوهرابی بـرای بگەڕێتەوە کوردستان خەریکی دابینکردنی خۆراکو ئالیکو پێویستیەکانی تری ئۆردوی عوسمانی بێ.

زۆراب لەگەڵ پێشەنگی ئۆردوەکەی ڕۆم دا بەڕێکەوتـو تا گەیشتنە مەراغە ئەرکی خـۆی لـەدابینکردنی پێویستیەکانیدا بەجێ هێناو، بێگەیش ئاسنگەرو دارتاشەکانی وڵاتـی بانـگ کـردو ژمارەیـەکی زۆر ئەسـپو ئێستری کۆ کردەوە. کەموکوڕی عەرەبانەکانیان چاک کردەوەو ئەو تۆپانەی دۆزرابونەوە لەزەنگاباد تەسلیمی کوێخاکەی میری میرانی بەغدادی کرد.

لەو ماوەیەدا سوڵتان سلێمان گەڕایەوە ئەستەموڵ. بێگە بەگ ئەبەشداری شەڕەکانی کردبو، ئەکەسیشی نارد بو بۆ نوێکردنەوەی دڵسـۆزیو بـۆ پیرۆزبـایی لـەو سـەرکەوتنانە. وەکـو مـەئمونی کـوڕی نوسـیوێتی ڕێوشوێنی ئەم بەندایەتیەی نەزانیوە. دوژمنەکانی بۆیان تێ چاند. سلێمان پاشای میـری میرانـی بەغـداد بـە لەشکرەوە چوە سەری. قەڵای هۆرینی لێ گرت. بێگە کەبەم لەشکرکێشیەی زانی کوێخاکەی بەنامەی پاڕانەوەو بەدیاریەوە ناردو دوای ئەوەیش بۆدڵنیاکردنی کلیلی قەڵاکانی بەمەئمون بەگی کوڕیدا نارد.(منکرات:32)

سەرداری لەشکر مەئمونی لای خۆی بەبارمتە گل دایەوەو. ئیبراهیم بەگی برای بێگەیشی بەنامەیەکـەوە ڕەوانەی ئاستانە کرد. ئەگەرچی لەسەرەتادا شارەزور درایەوە بەبێگە بەگ بەڵام دیسـان ناحـەزەکانی بۆیـان تێ چاند. مەئمونیان خستە زیندانی قەڵای بەغدادەوە.

کاربەدەستانی عوسمانی گومانیان لەدڵسۆزی بێگە بەگ هەبوە. محەمەد پاشای میـری میرانـی بەغـداد لەنامەیەک دا بۆ بێگە بەگی نوسی بو: "ئەگەر لەنۆکەرانی پادیشای ئەبێ راستگۆییو سەرڕاستی خـۆت بـەوە بسەلمێنی کەسەری پەڕێنراو و زمانی براوی قزلباشمان بنێری بۆ ئـەوەی منـیش مەسـەلەکەت بەپایـەی بـەرز رابگەیەنم. بەشکە بێتە هۆی بـەردانی کوڕەکـەت!" (مـنکرات:35) کوڕەکەی(مـەئمون بـەگ) 12 سـاڵو 10 مانگ لەزیندانی بەغدادا بەگیراوی مایەوە. دیارە بێگە بەگ نەیتوانیوە داواکەیان بەجێ بهێنێ.

**ئەلقاس میرزا**

ئەردەلان یەکگرتو نەبو، وەکو لەسەردەمی باوکیاندا بەسەر کوڕەکانیدا دابەش کرابـو. بێگـە لەقـەڵای زەڵمو، زۆراب لەقەڵای مـەریوانو، محەمـەد لەقـەڵای سـرۆچک بـو. هەریەکـەیان لەناوچەکـەی خـۆیدا جـۆرێ لەسەربەخۆیی هەبو، پێ ئەچێ گوێیان نەدابێتە یەکتری، بەتایبەتی کەناوچەکەیان بو بەمەیدانی ململانێی رۆمو عەجەم، ئەمانیش لەسەر دەسەڵات، لەناو خۆیان دا کەوتنە ململانێو، داشکاندن بەلای لایەکیان دا.

ئەلقاس لەترسی گیانی خۆی هەڵات روی کردە شارەزور. هێزی رۆم دوای کەوت بـون. ئـەلقاس داوای لەبێگە کرد لەشوێنێکی عاسی وڵاتەکەیدا داڵدەی بدا. بەڵام بێگە وەڵامی دایەوە: "بەهیچ جۆرێ رێگـەت نـادەم پێ بنێیتە شارەزورەوە تۆ بوی بەمایەی فیتنەو ئاژاوە!" بەڵام ئەلقاس چونکە تەنگاو بـو گـوێی نەدایـە ئـەم هەڕەشەیەو ویستی لەملەی چەقانی شاخی سورێن تێ بپەڕێ. بێگە فەرمانیدا بەعەلەمەدینی کوڕی رێگـەی پـێ بگرێ. شەڕێکی خوێناوییان بو بەڵام ئەلقاس دەرباز بو گەیشتە ناوچـەی مـەریوان. پـەنای بـۆ زۆراب بـرد. بێگە داوای لەزۆراب کرد ئەلقاس بدەنەوە بەکاربەدەستانی عوسمانی، لەهەمان کاتدا لەشکری قزڵباش گەیشت بوە ناوچەکەو داوای بەدەستەوەدانی ئەلقاسیان ئەکرد.

**بەربونی مەئمون بەگ**

کەهەواڵی بەدەستەوەدانی ئەلقاس میرزا گەیشتە بابیعالی سوڵتان فەرمانیدا مەئمون بەگ بـەر بـدرێو، سوڵتان حسێن بەگی میری بادینان هێزێک لەگەڵ خۆی بیات بۆ ئەوەی بەهاوکاری بێگە بـەگ سـزای زۆراب بەگ بدەن. لەم روەوە (مەئمون بەگ:60) خۆی وەهای ئەگێڕێتەوە:

"بەڵام لەم لایەوە خورەم چاوەشی سەرۆکی زیندانی بەغداد هاتو منی لەزیندان دەرهێنـاو نـاردمی بـۆ لای محەمەد پاشا لەکەرکوک. سوڵتان حسێن بەگیش لەگەڵ چاوەشی نێردراودا کەوتـە رێ بـۆ بینینـی بێگـە بەگ. گەیشتە شارەزورو بینی، بەزەییو دڵنەوایییەکانی سوڵتانی پێ ڕاگەیاند. بێگە بەگ سوێندی بـۆ خـوارد کە لەبەختکردنی سەرو ماڵ لەپێناوی دەرگای هومایونیی سوڵتاندا درێخی ناکاو، هەمیشە لـەخوا ئەپاڕێتـەوەو دەس بەدوعا ئەبێ بۆ دەوامی دەوڵەتی بەرز.

**سەردانی سوڵتان**

کاتێک ئەم بەندەیە(مەئمون بەگ مەبەستی خۆیەتی) نێردرا بۆ بابی عـالی دەوڵـەت، سـوڵتانی خـاوەن شکۆو بەختیاری، لەدیاربەکرەوە ئەگەڕایەوە بۆ بارەگای تەختی سەڵتەنەت، ئۆردوگای سەرکەوتو گەیشت بـوە لیوای رەهای سەر بەدیاربەکر. رۆژی دوەم بەزیارەتی رۆستەم پاشا لەناوچەی سروج، کەدو مـەنزڵی لـێ دورە، شەرەفاوی بو. لەرۆژی سێیەمدا کەژاوەی سوڵتانی گەیشـتە شـارۆچکەی بیرەجکـی سـەر بەولایـەتی حەلـەب. دوای ئەوە بەهەیبەتو شـکۆوە لـەڕوباری فـورات پەڕییـەوە. لەکـەناری رۆژئـاوایدا دو رۆژ بارگـەی خسـت. ئەنجومەنی بەرزی تێدا کۆکرایەوە. ئەم بەندەیەش بۆ ماچکردنی دەرگا بانگ کرا. پاش ئەوەی لێیان پرسـیم چی بەسەر ئەلقاس هاتو روداوەکـە چـۆن قـەومابو بـەدرێژی گێڕایـەوە. بـەزەیی سـوڵتانی خرۆشـا، لیـوای کەرکوکی بەموچەی 300 هەزار ئاقچە پێ بەخشیم، هەروەها شمشـێرێکـو قـەفتانێکـو ئەسـپێک کەزینەکـەی رازێنرابوەوە بایی 100 هەزار ئاقچە بو، لەگەڵ ئەسپێکی رەسەنی ترو هەندێ ئێستری دامێ، ئەمە سـەرەڕای

ئەوەی رۆستەم پاشایش دو ئەسپو دو قەفتانی دابومێ. هەروەکو کورەی وراسیو ناوچەکانی بەر دەستی، وەکو هەبو. دایەوە بەبێگە بەگ لەگەڵ خەلعەتی شەریفو پاداشتی سوڵتانیدا.

رۆژی دوایی کەژاوەی بەرزی سوڵتانی بزوت. بەندە وریایی کرد کەپەلە بکاتو پێش بکەویو لەئەسپەکەی دابەزێ بۆ ئەوەی ماوەیەک بەراکێشانی جڵەوی ئەسپی سوڵتانی شەرەفاوی ببێو، ئینجا ئاوزەنگیەکەی ماچ بکا. ئەوسا سوڵتان قسە گەوهەربارەکانی کردو وتی: "بەبێگە بەگی باوکت بڵێ، ئەو شیرەی هەڵم کێشاوە، کارێکە لەرێی خوادایەو، ئەو مەینەتییانەی بەسەرم دا هاتوە لەپێناوی یەزدانو غیرەتی ئیسلامیو دینی محەمەدا بوە، ئەبێ تۆیش تۆڵە لەزۆراب بکەیتەوە کەرێگەی بە ئەلقاس داوە بگەرێتەوە باوەشی شا. ئەگەر ئەوەی کرد، سوێند بێ بەگیانی باوباپیرم، بەر بەزەیی گەورەم ئەکەون..." منی کۆیلە پاش ستایشو نزا وەڵامم دایەوە: "بەندە بێگە بەگو ئەم بەندەیە دریخی لەسەرو ماڵ ناکەینو هەرزانو گرانی خۆمان بەخت ئەکەین لەپێناوی خزمەتی سوڵتان دا. هەمو هەوڵێک ئەدەین بۆ ئەوەی هیچ کەموکورییەک رو نەدا. هەمو شتێ بەفەزڵی بەزەیی سوڵتانو هیمەتی هێزایو بەختی دەوڵەتە کەریمەکەی جێبەجێ ئەبێ!" جارێکی تریش ئاوزەنگیی هومایونیی ماچ کردەوە. سوڵتان دەستیدا بەپشتم دا وتی: "ئادەی بتبینم!"

## سەردانی بێگە بەگ

لەو مەنزڵە گەرامەوە، چاوەش ئوروجم لەگەڵ بو کەراسپێردرابو سنجەقەکە بەبێگە بەگ بگەیەنێ، تا گەشتینە کەرکوک. ئەوسا چاوەش بەرێ کەوت سنجەقی شەریفو بەراتو خەڵات بدا بۆ بێگە بەگ. بێگە بەگ بەخۆشیو شادییەکی زۆرەوە پێشوازی کردو. بەسڵاوێکی زۆرو نزایەکی زۆری خێرەوە پەسنی خاوەن گەورەییو سەڵتەنەتیدا. منیش ئەو راسپاردنانەی سوڵتان فەرموبوی دەربارەی زۆرابم پێ راگەیاند. بێگە بەگ وتی: "بیستمانو گوێرایەڵی ئەکەین!" بۆ نیشاندانی ملکەچیو کەساسی دەستی خستە سەر سەریو، وتی: "فەرمانی سوڵتان گوێ لێ گیراوەو هەرچی سەرکێشی لەدەرگای بەرز بکا لەئێمە بەریەو ئێمەیش لەو بەرین"

## شەڕی بێگەو زۆراب

بەو هێزەوە کە لەگەڵی بو، هاورێ لەگەڵ ئوروج هەڵی کوتایە سەر زۆراب، ناوچەکەی وێرانو کاول کردو. خۆی گەمارۆی قەڵاکەیدا. ناردی بۆلای میری میرانی بەغداد تمر عەلی پاشا، داوای لێ کرد 100 کەسی ئینکیشاری بۆ بنێرێ، بۆ ئەوەی شایەتی حاڵو گەواهی راستیی قسەکان بن. ماوەی 3 مانگ گەمارۆی قەڵاکەیدا. خەریک بو دەستی بەسەردا بگرێ. بەهار نزیک بوبوەوە، ئەو بەفرە ئەستورەی لەسەر رێی نێوان شارەزورو وڵاتی عەجەم دا بو دەستی کرد بەتوانەوەو رێگەکان رەش بونەوە. شا هەزاران کەسی لەهێزەکانی خۆی بەسەرکردایەتی سوندگ بەگ نارد بۆ رزگارکردنی زۆراب لەگەمارۆکە. چەند سەرکردەیەکی بەدرەفتاری تریشی ناردە سەر شارەزور. کەجاسوس بێگە بەگیان لەهێرشی قزڵباش ئاگادار کرد، وازی لەگەمارۆدانی وڵاتەکەی زۆراب گەرایەوە بارەگاکەی خۆی لەقەڵای زەڵمو، لەبەردەمیدا سەنگەری لێ داو، وەڵامی نارد بۆ خەڵکی شارەزور کەئاگایان لەخۆیان بێو وریا بنو، لەشاخەکانی نزیکیاندا بڵاو بینەوەو بۆسەیان بۆ بنێنەوە. لەگەڵ ئاوابونی خۆردا لەشکری لێقەوماوی شا گەیشت، زۆرابیان لەگەمارۆ رزگارکرد. ئەو شەوە بێگە بەگ رۆیشتو دەمەو بەیانی گەیشتە دەربەندی زەڵم. بۆ ئەوەی گیانی ئازایەتیو هەڵمەت بکا بەئینکیشاریەکانی بەغداو پیادەکانی هێزەکەی خۆی، سواری ئێسترەکەی بو بۆ شەڕ روبەڕوی دوژمنانی دین راوەستا. هەردولا پێکا هەڵپژانو لێکیان دا. 300 کەس لەهەردولا لەو مەیدانەدا بەکوژراوی کەوتن. دیار بو لەنێوان محەمەد بەگی برای بێگە بەگو برایەکی تریدا زۆراب کەینوبەینێ هەبوبێ. کاتێ دوژمن لەلای چەپەوە هێرشی هێنا، محەمەد بەگ بەهەڵاتویی پشتی تێ کردن، لەشکری دوژمن پەلاماری بێگە بەگیانداو

شکاندنیان. 78 کەس لەهێزەکەی شەهید بون. بێگە بەگ خۆیشی لەدو لاوە سەری برینـدار بـو. مێکوتێکیـان لەپشتی سرەواند لەئێسترەکەی کەوتە خوارەوە. ئەم بەندەیە لەلای راست بـو. هـەڵی کوتایـە سـەر قزڵبـاش و هـاریی و بێگـە بـەگی لـەو چورتمـە کوشـتنەیە رزگـار کـردو چەکـدارەکانی قزڵباشـی ئاگربـاران کـرد زۆر لەپاسەوانەکانی کوشتن و، لەخوێن دا گەوزان. بێگە بەگی سواری ئێسترەکەی کردەوە. هێزی قزڵباش لـەدەنگی تەقینی گولله تۆقین و هەڵاتن. داوامان لەبێگە بەگ کرد بیگوێزینەوە ناو ئاوایی. بـەڵام قوبـوڵی نـەکرد. بـەڵکو پێی باشتربو خەریکی ناشتنی تەرمی کوژراوە شەهیدەکان و، برینی سەری دوژمنە کوژراوەکان بێ. واتیپەڕی تا شەو داهات ئەوسا گەڕایەوە ئاوایی".

شایەتێکی تری ئەم رودادە، حەسەن بەگی رۆملو، نوسەری "احسن التواريخ"ـە. حەسەن بەگ خۆی لـەم شەڕەدا بەشدار بوەو. لەناو روداوەکانی ساڵی 957دا بەمجۆرەی ئەگێڕێتەوە:

"شا تەهماسب، سوندگ بەگی قۆرچی باشی و حەسەن بەگی یوزباشـی نـاردە سـەر بێگـەی ئـەردەڵان: زۆرابی کوڕی ناردیە لای دەروازەی ئاینپەنا شاو ئاگاداری کرد کەبێگەی ئەردەڵانی والـیی شـارەزور لەگـەڵ تاقمێ رۆم پەلاماری قەڵاکەیان داوە. کەئەم هەواڵەیان دا بە شا، تورە بو. فەرمانی گوێ لێ گیراوی دەرکرد بـۆ سوندگ بەگی قۆرچی باشی و حەسەن بەگی یوزباشی و رۆستەم بەگی ئەفشار بە 5 هەزار سوارەوە بچـن بـۆ دەفعی شەڕی ئەم موفسیدە. میرەکان بەڕێ کەوتن و لەروباری تلوار، کەلـەو کاتـەدا هەسـتابو، پەڕینـەوە. 80 کەس لەقۆرچیەکان، لەکەناری بێستانەکانی شارەزوردا، توشی بێگە بون کە 7 سـەد سـواری لەگـەڵ بـو، هـەر یەکەیان بەرۆستەمی داستان دائەنران. شەڕێکی قورس رویدا و بێگەیان لەئەسپەکەی بەردایەوە. بەڵام لـەمردن رزگاری بو. 40 کەس لەنزیکەکانی کوژران. لەو رۆژەدا نوسەری ئەم پیتانە، حەسـەن رۆملـو، لەبەرزاییەکـەوە کەنەیروانی بەسەر قەڵای زەڵم دا، لەشەڕدا بوم لەگەڵ تاقمێ لەکوردەکان. قۆرچیەکان کەپەنجا کەسـێک ئـەبون لەبەردەم کوردەکان دا هەڵاتن. کوڕێ کەلەم شەڕەدا شادی بەگی زولقەدری کوشت بو، خەریک بو شـاهویردی بەگی کوڕی قنقرات سوڵتان بەدیل بگرێ. حسێنقولی خولەفا، کە لەگەڵ ئەم هەژارەدا بو، غیرەتـی ئەدایـە بـەر قۆرچیەکان و هانی ئەدان: "لاوەکان هەڵمەت بەرن! ئازا بن و وەکو ژن رامەکەن!" بەڵام ترسیان وەها لێ نیشت بو لەبەرزایی شاخەکانەوە هەڵاتن بۆ قوڵایی دۆڵەکە. بـەڵام ئـەم هـەژارە هەسـتی بەمەترسـیەکە کـردو لەگـەڵ حسێنقولی خولەفا هەڵیان کوتایە سەر کوردەکان و بڵاوەیان پێ کردن. شاهویردی بەگیان سواری ئەسـپەکەی کردەوە دریژەیان دا بەشەڕ لەگەڵ ئەو کوردانەی کە 40 کەسیان لەقۆرچیەکانیان بەدیل گرت بو.

سوندگ بەگ لەشارەزور هەڵی داو زۆراب لەقەڵا هاتە دەرو دایە پاڵی. غازیەکان پەلاماری شارەزوریان داو ئاڵای سەرکەوتنیان تێ چەقاند. سوندگ بەگ، رۆستەم بەگی ئەفشاری بەتاقمێ لەدلاوەرەکانەوە نـارد بـۆ تاڵانکردنی ولایەتەکە. وێرانیان کردو گەڕانـەوە ئۆردوگـا. پـاش 20 رۆژ راونـان سـوندگ بـەگ گەڕایـەوە قەزوین."

حسن روملو: "احسن التواريخ" بسعى و تصحيح جارلس نارمن سيدن. ج 1. استنساخ تهران. انتشارات كتابخانه شمس 1342ش. (ل345 - 346).

**تاڵانکردنی شارەزور**

(مەئمون بەگ:64) لەسەری ئەڕوا و ئەنوسێ:

"کە لەشکری قزڵباش گەڕایەوە کوڕانی زۆرابیان کرد بەپێشەنگی خۆیـان و نیشـتنە سـەر گونـدەکانی دەشتی شارەزورو وێرانیان کرد. لە هەر جێیەک ئاوەدانیەکیان بینـی کردیـان بەکـەلاوەو. هـەرچی چـوارپێ و ئاژەڵێکیان بەردەس کەوت تاڵانیان کردو. دەستیان گەیشتە هەر پەککەوتەو بەسەزمانێ کوشـتیان. زەرەریـان دا لەجوتیاران و هەژاران و. پـەلاماری شـوێنە قایمـەکانیان دا. کوردەکـان بـۆ بـەرگری و بەرهەڵسـتی لەمـەکۆو

حەشارگەکانیانەوە دەرپەڕین. نزیکەی 60 کەسیان لەقورچیەکان کوشتو سەلکەکانیان بۆ بێگە بەگ هێنا. لەشکری ئاغ لەدڵ پەلاماری زەردەکەمەریدا کەسەر بەبەغدادو هی تیرەی تیلەکۆی ئێلی کۆچەری قەرەڵولوسە. تالانیان کردو گەڕانەوە شارەزور. قایتمز بەگی برای بێگە بەگ لەدەمی قەڵای دەربەند گاوردا ڕێگەی پێ گرتن. ئاروق شاهقولی سەرۆکی کوشتنو ئالاکەی ئاگرتنو ژمارەیەک لەقوروچی ناسراوەکانی کوشتن. ئەو ئاژەڵو ولساتەی بەتالان برد بۆیان لێی سەندنەوەو دایەوە بەخاوەنەکانی، هەروەها دیلەکانیشی لێ سەندەوە.

دوای ئەم ڕوداوانە سوندگ بەگ، سەرداری لەشکری قزلباش، 50 ڕۆژ لەناوچەی شارەزوردا مایەوە تا دەغلودان زەرد بو. ئەوسا دەغلودانی ناوچەکەی هەمو سوتاندو گەڕایەوە بارەگاکەی خۆی. بێگە بەگ هێزێکی بەدودا ناردن توانییان دو قورچی ناودار بەدیل بگرن. دوای ئەو سەری بڕاو و زمانی دەرهێنراوی بەم بەندەیەدا نارد بۆ میری میرانی بەغداد عەلی پاشا. عەلی پاشا نێردراوی نارد بۆ دەروازەی بەرزی دەوڵەت لەهێرشی قزلباش ئاگادار بکا. بە کەتخوداکەیدا سەرە بڕاو و زمانە دەرهێنراوەکانی بۆ ئاستانەی بەرز نارد. کەنێردراوەکان گەیشتنو لەوانو لەقورچیەکان زانرا چی قەوماوەو دریژەی ڕوداوەکان بەئاستانەی بەرز گەیەنرا. عینایەتی سوڵتانی بە سەر بێگە بەگ دا خرۆشا، شیرێکی نەخشدارو قەفتانێکو زریزەیەکی زێڕو گۆو پەردەی زێڕینو ئەسپێکی زین نەخشکراوی بۆ ناردو. خەلاتی بەنرخیشی نارد بۆ ئەو خزمانەی کە لەو شەڕەدابون. دیاریەکان بە یەنی شەهرلی مستەفا چاوەش دا بۆ بێگە بەگ نێردراو فەرمانی شەریف دەرچو لەزەویوزاری سوننیو خەواسی هومایونی نزیکی 4 هەزار کیلەی بدرێتێ.

**زۆراب بەگ لەدەرباری شادا**

لەلاکەی ترەوە قورچی باشی زۆراب بەگی بردە لای شا. بەڵام زۆراب پێی وتن: "من دێم بۆ لای شا بەو مەرجەی بەڵێنم بدەنێ شا داوام لێ نەکا جنێو بەمەزەبەکەی خۆمو دژون بە سەحابەکانی پێغەمبەر بدەم!" قورچی باشی بەسوێندی گەورە تەئمینی کردو. لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای شا لەقەزوین. کە گەیشتە بارەگای شا، خەلاتی رەنگینو ماڵی، کەجیفەی دنیان، درایە. زۆراب لەڕێگەی باووباپیری لای دا. دوای ئەوەی ماوەیەک مایەوە گەڕایەوە بارەگای شەقاوەتەکەی... بەڵام بێگە بەگ مۆڵەتی نەدا. هەڵی کوتایە سەریو لەقەڵاکەیدا گەمارۆیدا. زۆراب هاواری بردەوە بەر شا. شا، ئیسماعیل میرزای کوڕی نارد بۆ یارمەتیدانی. ئیسماعیل پەلاماری قەڵای قزڵجەی سەر بەشارەزوریداو دو مانگ گەمارۆی دا. کەزستانی سەخت داهات ئیسماعیل گەڕایەوە بۆ قەزوینو باوکی بینیو ڕوداوەکانی بۆ گێڕایەوە.

**مردنی بێگە بەگ**

"لەو ماوەیەدا بێگە بەگ بە نەخۆشی لەجێگەدا کەوت. لەو کاتەدا ئەم بەندەیە لەلیوای کەرکوک بوم. نامەیەکم لەباوکمەوە پێ گەیشت نێردراوێ هێنا بوی. تێیدا نوسرابو: "خێرا بێرەوە بۆ لامو پشت گوێی مەخە. هەوڵ بدە بەزیندویەتی بمبینی!" ناوەرۆکی نامەکەی باوکم لەمیری میرانی بەغداد گەیاند داوام لێ کرد ڕێم بدا بچم بۆ شارەزور. باوکم بینیەوە هێشتا زیندوبو. سوپاس بۆ خوا. دوعا خێرەکانیم پێ برا. دوای چوار ڕۆژ مانەوەم مرد".

**مەئمون بەگ ئەبێ بەحاکمی شارەزور**

(منکرات: 66) زۆراب کەمردنی باوکمی بیست پەلاماری شارەزوریداو تالانی کرد. عەلی پاشام لەڕوداوە تازەکان ئاگادار کردو. لەگەڵ زۆراب کەوتینە شەڕەوە. کەنێردراوەکەمان گەیشتە بەغداد عەلی پاشا مەسەلەکەی بەهۆی نوروچی کەتخودایەوە بەئاستانەی بەرزگەیاند. ئەرکانی دەوڵەت زستانی ئەو ساڵەیان

لەئەدرنەی پارێزراو بەسەر ئەبرد. کەتخودا مەعروزاتەکەی لەوێ بەئاستانەی بەرز گەیاند. پاش ئاگادار بوونی عینایەتی خوسرەوانیو هیمەتی خاقانی خرۆشا. بەقەرە موراد پاشا کەچاوەش بو. بو بەمیری میرانی ئەرزرۆمو. مرد. شیرو خوفتانو بەراتی هومایونی. چون باوکم حاکمی ناوچەکە بو. بۆ ناردم. چاوەشی ناوبراو لەرۆژی حەڤدەهەم دا گەیشتو. دوعا بۆ دەوامی دەوڵەتی بەرزی سوڵتانی خوێنرایەوەو. خۆشیو کامەرانی هەمو لایەکی گرتەوە. منیش ئەم بەندەیە ئەو بەراتە شەریفەم بەسەرمایەی دەوڵەت دانا. پشتێنی خزمەتم لەو سنورانەدا بەستو سەرو ماڵم دانەدا.

جارێکی تریش مەتارەچی ئەسکەندەر چاوەش لەلایەن ئاستانەوە هات بۆلام. لەگەڵ نێردراوێک دا کەفەرمانی شەریفی سوڵتانی گوێ لێ گیراوی پێبو. ناوەرۆکەکەی بریتی بو لەوەی: "فەرمانی گوێڕایەڵی کراوم دا بەمیرەکانی کوردی سەر بەولایەتەکانی دیاربەکرو بەغداد. گەورەو بچوکیان. کەمن تۆم بەسەرۆکو سەرکردەی هەموویان داناوە. دامناون بە بەرفەرمانو یاریدەدەری تۆ. لەبەر ئەوە پێویستە پەلاماری زۆراب بدەیو بەڕاستیو ئازایەتی هەوڵی گرتنی بدەی. ئەگەر لەلایەن شاوە یارمەتیەکی بۆ هات لەتوانای تۆدا نەبو. فەرمانی گوێڕایەڵی کراوم داوە بەمیرانی عەرەبو کوردی ولایەتەکانی قەرەمانو سیواسو حەڵەبو مەرعەشو دیاربەکرو بەغداد. وێنەیەکی ئەم فەرمانەم بۆ هەر یەکێکیان ناردوە. تا ئەگەر پێویستیت پێیان بو بەپەلە فریات بکەونو بێن بۆ یارمەتیدانتو. هەموویان هەوڵ بدەن بۆ پارێزگاری سنور. بەپێی فەرمانی هومایونی گوێ لێ گیراو".

## شەڕی مەئمون بەگو زۆراب

سوڵتان حسێن بەگی حاکمی ئامێدی کەبەم فەرمانە گوێ لێ گیراوەی زانی دەربارەی دانانم بەسەرداری سەرۆکی گشتیو. هەستی بە بەزەیی سوڵتانی کرد بەرامبەرم. ئاگری حەسودی لەدڵی دا هەڵگیرسا. لەگەڵ مامم محەمەد بەگی میری سروچک ڕێک کەوتو کەوتنە پیلانگێڕانو فروفێڵی شەیتانیو. بەرۆستەم پاشایان وت: "ئەگەر ولایەتی شارەزور بدرێ بەمحەمەد بەگو مەئمون بەگ. بەهەر توهمەیەک بێ. بگیرێ. هەرچی کەلوپەلو قورساییو دیاری بەنرخو شتی ناوازەو ناوماڵو شتومەکی کە لەبێگە بەگ بەجێ ماوە ئەیدەن بەو و ڕێوشوێنی ئەوەش دائەنێن ناوبراو بگەیەننە لای ئەو". بەمجۆرە تەماعیان خستە بەردەم رۆستەم پاشاو. بەئارەزوی دڵی خۆیان فەرمانێکیان لێ وەرگرت. بەڵام بێ ئاگا بون لەناوەرۆکی حەدیسی شەریفی "الحريص محروم" و لەکاکڵی پەندی "العبد يدبر والله يكدر" ... ئەم بەندەیە لەو رۆژانەدا قوڵی کاری لێ هەڵ ماڵی بو. پشتێنی دڵسۆزی سوڵتانی هومایونی لێ بەست بو. بەسەرو ماڵ شەڕی دوژمنانی ئەکرد. بەفەڕی هیمەتی سوڵتانو بەلوتفی حەق عز وجل بو بەمەزهەری عینایەتی سوڵتانیو. جێبەجێکەری بیری راست. هەڵی کوتایە سەر قەڵاکەی زۆراب کە بەمشعلە ناسراوە. کاتی خۆی ئەلقاس خۆی تێدا مەڵاس دابو. داگیری کردو هەمو پارێزگارو پاسەوانەکانی بەدیل گرت.

زۆراب ئەوەندە تورەبو خەریک بو شێت بێ- خوا دوژمنانی دین کەساسو خۆشەویستانی دەوڵەت خۆشنود بکا- عەلی پاشا هەواڵی گرتنی قەڵاو. چونی شا تەهماسب لەولایەتی شیروانەوە بۆ شکی بیست. داوای لێ کرا 100 کەس لەمەمالیکی بەغداو 100 پیادەی ئینکیشاری. بەپێی فەرمانی گوێ لێ گیراوی سوڵتان بنێرێو. نامە بەچاوەشەکانی دا بۆ سوڵتان حسێن بەگو میرەکانی تر بنێرێ. بۆ ئەوەی لەشوێنێک دا کۆ ببنەوە بۆ قۆستنەوەی هەلی چۆڵیی سنورو ناوچەکە. بۆ پەلاماردانی زۆرابو داگیرکردنی قەڵاکانی. بەیارمەتی خواو. گرتنو راونانو دورخستنەوەی لەولایەتەکەی.

کەنامەو نێردراوەکەمان گەیشتن. پاشای ناوبراو 200 سوارو پیادەی بەغدادی ناردو. ئاگاداری کردین نامەی بەتەتەردا ناردوە سوڵتان حسێن بەگو میرەکانی تر پەلە بکەن لەناردنی یاریدەو فریاکەوتن دا.

## لێخران و گیرانی مەئمون بەگ

لەماوەی 10 ڕۆژدا، سوڵتان حسێن بەگو محەمەد بەگ پێکەوە هاتن، بەندە پێشوازیم لێ کردن. لە 5 مەیدانەکەدا کەقەڵای گوڵعەنبەری تێ دا دروست کراوە بارگەیان خست. بەتەمای ئەوە بوین بەیانیی ڕۆژی داهاتو لەزنجیرەی چەقانەوە هەڵکشێینو، دەربەندی یەک باسان بېرینو پەلاماری ناوچەی مەریوانی زۆراب بدەین. بەیانی هەمان ڕۆژ هێزەکانی خۆمم نارد بۆ جێگەی ناوبراو، خۆم چوم بۆ ئەوەی سوڵتان حسێن بەگ ئاگادار بکەم لەوەی کردومە. لەگەڵ هەندێ لەپیاوەکانم دا گەیشتمە خێوەتەکەی ئەو لەئەسپەکەم دابەزیم، چومە ناو خێوەتەکەیەو لەتەنیشتیەوە دانیشتم. سوڵتان حسێن بەگ دەسبەجێ فەرمانێکی ڕەسمیی دەرهێنا، ناوەڕۆکەکەی ئەمە بو: "ولایەتی شارەزور بەمحەمەد بەگ دراوەو فەرمانی گرتنی تۆیش دەرچوە" منیش وتم: "فەرمان فەرمانی سوڵتانە، بەڵام چەند کەسێ بنێرن بۆ قەڵا کەسوکارو کەلوپەلەکانم دەرباز بکەن، ئێوە خۆتان کاروباری قەڵاکە باشتر ئەزانن!" محەمەد بەگ قسەکانی منی وەرنەگرت، دەسبەجێ لەگەڵ هەندێ لەپیاوەکانی خۆی دا رویان کردە قەڵاکە.

## بێگە بەگ کوڕی مەئمون بەگ (915–957)

(مەئمون بەگ:16 دەربارەی سەردەمی باوکی نوسیویێتی:

لەکاتێک دا ئەم بەندەیە: مەئمونی کوڕی بێگە بەگی عادلانی...ڕۆژانی تەشریف هێنانی شاهنشاهی جیهان...مورادخانی سێیەم بۆ سەر تەختی سەڵتەنەت، ئەم بەندە سوکە هەلی لستنەوەی دەروازەی بەرزی بەدەرفەت زانی، خۆی پێ بەناسین بداو بڵێ: باوکی خوا لێ خۆشبوم بێگە بەگ لەکاتی پێشودا حاکمی شارەزور بو، لەڕۆژانی فەتحی بەغدادا بەهێزی شکێنەری سولەیمانیو مەهابەتی پاڵەوانانەی سوڵتانی ساڵی 941 هـ، دڵسۆزیو بەندایەتی خۆی بۆ سوڵتان دەربڕی، ئینجا کار گەیشتە ئەوەی ئەم بەندەیە لەئەنجامی دوژمنایی غازی خانی باغی دا خرایە زیندانی بەغدادەوە. هەروەها ئەم وتارە ئەو بەڵایانەی بەسەر ئەلقاس میرزا هات ئەگێڕێتەوە.

## قزڵباش لەشارەزور

ڕێچەڵەکی بەندە بێگە بەگ ئەگەڕێتەوە بۆ ئەبو عوبەیدەی جەڕاح لەعەشەرەی موبەشەرەو ئەمیری موئمینان عەباس. یەکێ لەباپیرە مەزنەکانی، بەناوی عادل، لەسەرەتای ڕۆژانی کوشتاری جەنگیزییە زۆربارەکان دا والی شارەزول بوە. نەوەکانی گوێڕایەڵی فەرمانی پاشاکانی هەردو عێراق بون، تا قەزاو قەدەری ئیلاهی ئیسماعیلی کوڕی حەیدەری هێنا. کەئیسماعیل زانی، بێگە بەگ ئامادە نیە گوێڕایەڵی دەسەڵاتی بێ‌و گوێ بەفەرمانەکانی نادا، یەکێ لەسەرکردەکانی: چایان سوڵتانی ڕاسپارد، کەدوانزە میر بەر فەرمانی بونو. پێیان ئەوتن سوڵتانو سەرکردایەتی هێزی زۆریان ئەکرد، بچێ بۆ داگیرکردنی وڵاتی بێگە بەگ. کەئەم هێزانە گەیشتنە خاکی شارەزور ئاواییەکانی ناو دەشتەکەیان وێرانو کاول کردو، سێ لەقەڵاکانیان کرد بەکەلاوە، بەڵام قەڵایەکی قایمیان پێ نەگیرا کە بەشاخێکی سەختەوە بو. ماوەی ساڵێک گەمارۆیان دا، تا لێی نائومێد بونو بەجێیان هێشت. شەڕی ڕوبەڕو لەنێوان هەردو لا نەئەقەوما جگە لەو شاڵاوانەی دوژمنان بەردەوام لەهەمو لایەکەوە ئەیانهێنایە سەر ناوچەکە.

## بەیعەت بەعوسمانی

زۆری پێ نەچو ناوچەی شارەزور، بەعینایەتی مەلیکی مەنان، کەوتە ناو پارێزراوەکانی سوڵتانیەوە. بەداگیرکرانی ولایەتەکانی دیاربەکرو موسڵ تا لای هەولێر، شارەزوریش چوە ناو مەمالیکی پارێزراوەوە. ئینجا کەوەزیری گەورە ئیبراهیم پاشا، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، بڕیاری دا بچێتە سەر وڵاتی عەجەم، بۆ زستان لەحەڵەبی پارێزراو ئارامی گرتو، بێگە بەگ هەواڵەکەی بیست نامەیەکی درێژی نوسی، تێیدا ڕونی

کردبوەوە کەئەوان لەباوباپیریانەوە ئەهلی سوننەتو جەماعەت بون. تا ئەو کاتە لەنێوان ئەوانو قزڵباش‌دا چەند جارێ شەڕو پێکدادان قەوماوە. نامەکەی بۆ گەیاندنی بەدەروازەی بەرز بەکوێخاکەی‌دا حەیدەر ناو رەوانە کرد. کوێخا نامەکەی گەیاندو ئاستانەی بەرزی ماچ کرد. کەسوڵتان سلێمانی قانونی لەوە ئاگادارپو کەبەندە بێگە بەگ توشی چی بوە، عینایەتی سوڵتانی سەرریژی کرد، نەحکامی شەریفی بۆ دەرکرنو باشترین چاودێری کراو، بەنامەی پڕ لەلوتفو بەزەیی سەربەرز کرا.

## سوڵتان سلێمان بە کوردستان دا تێ ئەپەڕێ

ئیبراهیم پاشای سامدارو سەنگین. لەبەهاری ئەو ساڵەدا بەرەو وڵاتی عەجەم چو. لەشکری لەئوجانی ئازەربایجانی نزیک تەوریز بەزاندو بەقەد ژمارەی ئەستێرە خێوەتی هەڵدا. کەژاوەی سوڵتان سولەیمان. خوا بەهەشت بکاتە مەئواو رەحمەتی خوای لێ بێو بیبەخشێ. ئوجان بەهاتنی شەرەفاوی‌و. لەشکری سەرکەوتویش بەلوتفی بوژایەوە. بەڵام زۆری ناخایاند زستانی سەخت هات. کەژاوەیش ناچاربو بەشاخەکانی قەرەخان‌دا بەسەر ولایەتەکانی هەمەدانو دینەوەردا بەرەو عیراقی عەرەبی بڕوا. لەکاتێکدا گەیشتنە ماهی دەشت توشی سەرمای سەختی زستانو کەمیی خۆراکو ئازوقە بون. پیادەیەکی زۆری لەشکرەکە مردن. هەروەکو باربەرەکانیشیان تۆپینو ئەسپو ئێسترەکانی عەرەبانەی تۆپەکانیان رائەکێشا وەستان. کێشەکە خرایە بەردەم سوڵتانی کامەرانو چارەی لێ پرسرا. فەرمانی‌دا تۆپەکان لەشاخی پشتەدا بشارنەوەو ئەگەر توانرا بیگەیەننە دەشتو بیهاونە ناو ئاوی قەرەسو. عەرەبانەکانیش بسوتێنن بۆ ئەوەی نەکەونە دەس دوژمن. سوڵتان هەر فەرمانێکی‌دا جێبەجێ کرا. ئینجا سوڵتان بەرەو بەغداد بزوت. کەهێزەکانی گەیشتنە زەنگابادی سەر بەولایەتی بەغداد بەکلیلی قەڵای بەغدادی پێشوازی کرا. خۆشی لەشکری سەرکەوتوی داگرت کە بەزوترین کات ئەچنە ناوی بۆ پەیداکردنی ئازوقە، لەروباری دیالە کە بەدۆڕێ ناسراوە نزیک کەوتەوە. هەر کەچونە ناو ئاوەکەوە وڵاخە شەکەتەکانیان نقوم بونو زۆریان خنکان.

## لەنێوان سوڵتان سلێمانو بێگە بەگ دا

کەسوڵتانی گەورە بەتەمای بەسەربردنی پاشماوەی وەرزی زستان گەیشتە بەغدادو. بەساموو شکۆوە لەوێ جێگیر بو. پرسی کەکێ خاوەنی نزیکترین ولایەتە لەشوێنی شاردنەوەی تۆپەکان. شارەزاکانی ناوچەکە وەڵامیان دایەوە: "ولایەتی شارەزور لەو شوێنەوە نزیکە. حاکمەکەیشی ناوی بێگە بەگە. کە لەئەهلی سوننەتو جەماعەتەو. لەشەڕو دوژمنایەتی‌دا بوە لەگەڵ قزڵباش. لەسەردەمی رابوردودا کەسانێکی ناردوە بۆ دەربڕینی بەندایەتی سوڵتان." سوڵتان فەرمانی‌دا چاوەش بەسوارەوە بنێرن پێی رابگەیەنن: "کاتی خۆی دڵسۆزیو گوێڕایەڵیتان بۆ ئاستانەی بەرز دەرکەوتوە، بەڵام مەرجی دڵسۆزیو گوێڕایەڵی ئەوەیە تۆپەکانی لەرێگە بەجێمان هێشتون بگەیەنیتە بەغداد. بەوەیش خزمەتەکانت بزر نابێو رەنجەکانت بەفیڕۆ ناڕواو. بەزەیی پاداشتی منیشت پێ ئەبڕێ..."

موسەلا چاوەش، رەحمەتی خوای لێ بێ، فەرمانی بەرزی گەیاندە بێگە بەگ. بەفەرمانی هومایونی خوشحاڵ بو. دەسبەجێ زۆرابی برای لەگەڵ چاوەش باشی بەدیاریەکی زۆرەوە نارد بۆ دەروازەی دەوڵەت. بۆ ئەوەی بەسوڵتان بڵێ: "بیستمانو گوێڕایەڵین. فەرمانی بەجێ ئەهێنین. با ئەو رێبەرانە بێن کەشوێنی شاردنەوەی تۆپەکان لەناو روباردا ئەزانن. بۆ ئەوەی بەگیانو سەر ئەو خزمەتە بکەین!" زۆرابی ناوبراو چو بۆ ماچکردنی ئاستانەی بەرزی سوڵتانیو راسپێرییەکانی پێ راگەیاند.

سوڵتان سوپاسی خوای کردو بەستایشەوە دوعای خێرو سەرکەوتنی بۆ بێگە بەگ کردو. دڵنەوایی زۆرابی سنجەقی میهرەوانی پێ بەخشی. فەرمانی داردنی ئەوانەی‌دا کەتۆپەکانیان لەناوەکەدا شاردبوەوە لەگەڵ تاقمێ سایەقی لێوەشاوەی عەرەبانە لەرێکابی میردا بەدیاری شایانەوە بۆ لای میر بێگە بەگ. کەنێردراوەکان

گەیشتن. بێگە بەگ فەرمانیدا ئاسنگەرو دارتاشەکانی وڵات کۆبکرێنەوە بۆ ئەوەی عەرەبانەکان چاک بکەنەوە. هەروەها فەرمانیدا ژمارەی پێویست ئەسپو ئێستر ئامادە بکرێن بۆ ڕاکێشانی عەرەبانەو تۆپەکان. لەکاتێکدا خەریکی ناردنی تۆپەکان بون چاوەش باشی گەیشتو فەرمانێکی پێ بو کە: "لەبەر ئەوەی من بەتەمای سەفەرم بۆ تەورێز. بەسەر شارەزوردا ئەبێ ئازوقەو ئالیک ئامادە بکرێو بایەخ بەناردنی تۆپەکان بدرێ بۆ بەغداد. لەسەر مەمالیکو خزمەتکارەکانیش پێویستە هاوڕێ لەگەڵ براکەت خەریکی ئامادە کردنی ئازوقەو پارێزگاری تۆپەکان بن تا بەهار!"

## سوڵتان سلێمان دیسانەوە بەکوردستاندا تێ ئەپەڕێ

سوڵتان بەغدادی بەڕێگای داقوقو کەرکوک دا بەجێ هێشت. بەناو دەربەندی ئیمانشادا تێپەڕیو گەیشتە دەشتی شارەزور. بەو ڕێگایەدا ڕانەبورد کەهەناوی دەسکەندەری زولقەرنەینی تێدا نێژراو بو. ڕۆژانی جەژنی قوربانی لەنزیک قەڵای قزڵجەدا بەسەر برد. خادیم سلێمان پاشا، کە لەولایەتی میسرەوە هات بو هەزاران مەمالیکی تایبەتی، خاوەن تاجی زێڕینو مەناتقی زیوینو جلوبەرگی ئاوریشمینو سەربازی پڕ چەک کە بەجوانترین جل ڕازابونەوە بەسواری ئەسپە عەرەبیەوە، لەگەڵ بو. لەو کاتەدا دیانە پاڵ لەشکرگای لەشکری سەرکەوتو لەشارەزور. زۆراب بەفەرمانی بێگە بەگ بەدیاریو کلیلی قەڵاکانەوە هاتو، مەنزڵ بەمەنزڵ ئازوقەو ئالیکی پێویستی لەشکری دابین ئەکردو. لەگەڵ پێشەنگی تیپەکانی سوڵتان دا بو تا گەیشتنە بازێڕی مەراغەی سەر بەئازەربایجان. ئەوسا هەمو جۆرە ڕعایەتو ئیعزازی لەسوڵتان پێ گەیشت. زۆراب بەفەرمانی سوڵتانیی گوێ لێ گیراوەوە بۆ بێگە بەگ دەربارەی گەیاندنی تۆپەکان بەبەغداد بەزوترین کات، کەفەرمانی گوێ لێ گیراو گەیشتە بێگە بەگ، لەو کاتەدا ئەو لە زەنگابادی سەر بەولایەتی بەغداد بو. کوێخا عوسمان پێشوازی لەتۆپەکان کرد. کەسلێمان پاشای میری میرانی بەغداد بۆ ئەم ئیشەی نارد بو. تۆپو کەلوپەل پێویستیەکانی تری لەبێگە بەگ وەرگرت بیگوێزێتەوە بۆ بەغداد، چەندین پیاوی کارامەی عەشیرەتەکانی خۆیشی لەگەڵ نارد بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بیگەیەننە بەغداد.

بێگە بەگ گەڕایەوە شارەزورو بەچاوی بێدارەوە چاودێریی هەواڵە نوێکانی سوڵتانی دەسەڵاتداری ئەکرد. لەجێی خۆیدا جێگیرو ئەوەندەی توانی بوی پیاوی کۆ کردبوەوەو، ئامادەبو بۆ بەجێهێنانی هەر کارێکی پێی بسپێردرایە. لەم کاتەدا زانی کەسوڵتانی بەتوانا بەشکۆو سامەوە لەتەورێزەوە گەڕاوەتەوە بۆ نزیک یانەی بەرزی سەڵتەنەت، بێگە بەگیش بەهەمو پتەویو پایەدارییەکەوە لەنیشتمانەکەی خۆیدا مایەوە لەخوای عەزەوەجەل ئەپاڕایەوەو. دایەتی ئەخوێندو نزای ئەکرد بۆ دەوامی سوڵتانو مانەوەی بەختیاریو. داو بەناویش دڵسۆزییو بەندایەتی خۆی نوێ ئەکردەوە.

ئەیویست نێردراو ڕەوانە بکا بۆ دەروازەی بەرز. جارێکیتر نیشاندانی بەندایەتی بۆ نوێ بکاتەوە، بەڵام نە ڕێوشوێنی نیشاندانی بەندایەتی ئەزانیو نەشارەزای چۆنیەتی دەربڕینی دەریتی ملکەچیو کەساسی بو. ناردی بۆلای حسێن بەگی داسنی والیی هەولێر لەم ڕووەوە یارمەتی بدا. حسێن بەگ، کەزەعامەتی دیاربەکری بەدەسەوە بو، کوێخا مەجنونی نارد. کەبەندە کوێخا مەجنون هات، بێگە بەگ ئیبراهیمی برای لەگەڵ نارد تا ئەوەندەی ئەتوانن دیاری لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن بۆ پێشکەش کردنی بەدەروازەی بەرز. کەنێردراوەکان گەیشتنە ئاغجە قەلعە، ئەوەی چاوەڕێی نە ئەکرا ڕویدا. غازی خان کەپێشتر لەخزمەتی چوقە سوڵتاندا بو. پەروەردەی ئەو لەبەردەسی ئەودا گەورە بوبو، بەڵام لایەنی شای بەربدابو و دابویە پاڵ دەروازەی بەرزی سوڵتانی، نیوەی ولایەتی بەغدادی بەپلەی میری میران درابویە. چوقە سوڵتانیش خۆی لەسەردەمی سەڵتەنەتی شا ئیسماعیلی سەفەویدا حاکمی مەندەلیجینو دینەوەری دراوسێی شارەزول بو. لەبەینی ئەمانو ئەوان دا. لەسۆنگەی غیرەتی قەومایەتیو دینییەوەو. بۆ پاراستنی هەژارانو بێنەوایان. شەڕو

شۆڕی زۆر قەوما بو. شوینەواری کینەو دوژمنایەتییان لەناودا مابو. غازی خان تاقمێ لەپیاوەکانی خۆی بەدوی نێردراوەکان دا: ئیبراهیمو کوێخا مەجنون، نارد لەناغجە قەلعە کتوپڕ هەڵیان کوتایە سەریان، کوێخاکەی بێگە بەگ حسێن ناو کوێخا مەجنونو چەند کەسێکی تریان لێ کوشتن. ئیبراهیم بەعینایەتی ملکی قەدیم لەم چورتمە رزگاری بو هەڵات بۆ هەولێر. پاش دو رۆژ رۆیشتن گەیشتە پێشگای حسێن بەگ، ئەوەی لێی قەومابو بەدرێژی بۆی گێڕایەوە.

لەکاتێک دا خەریکی ئەوە بون بێگە بەگ لەوە ئاگادار بکەن کەنێردراوەکان چییان لێ بەسەر هاتوە، غازی خانی ناوبراو کوێخاکەی ئەنێرێ بۆ بەر دەروازەی بەرز. بۆ ئەوەی بڵێ: "ولایەتی شارەزور شایستەی ئەوەیە ببێتە بارەگای میری میرانێ. ئەگەر هیمەت بکەیتو هێزێکی لەشکر بدرێ بە بەندە فەتحی ولایەت کارێکی ئاسانە.

بەمجۆرە نامەکەی غازی خان بو بەهۆی دەرچونی فەرمانی هومایونی شەریف بۆ لەشکرەکانی دیاربەکرو مەرعەشو شامو حەڵەب کەپشتیوانی سلێمان پاشای میری میرانی بەغداد بکەن بۆ پەلاماردانی شارەزول. سلێمان پاشا بۆ ئەوەی لەمەسەلەی لەشکرکێشی دا بۆ سەر شارەزول سەر لەبێگە بەگ بشێوێنێ، نامەیەکی بۆ نوسی کەوا ئەچێ بۆ سەر جەزائیر. بێگە بەگ وەڵامی دایەوە نامەکەی بەپیاوێکی خۆی دا بۆ نارد تێیدا نوسی بو: "ئەگەر فەرمان بدەن هێزێکتان بەسەرکردایەتی ئیبراهیمی برام دا بۆ ئەنێرم" سلێمان پاشا وەڵامی دایەوە پێویست ناکا کەس بنێری، خەریکی کۆکردنەوەی دەنگوباسی قزڵباش بە.

لەکاتێک دا بێگە بەگ لەدڵسۆزی دا پایەدارو بەدڵێکی پڕ لەدڵسۆزیەوە لەخوای عەزەوەجەل ئەپاڕایەوە، کە لەشکر بەزویی سەربکەوێ، هەندێ لەهەژارانی رەعییەتی هەواڵیان بۆ هێنا. لەشکرێ بەقەد ژمارەی ئەستێرە هاتونەتە ناو سنوری شارەزولو قەڵای حورینیان گرتوە. بێگە بەگ دەسبەجێ کوێخاکەی بەنامەیەکەوە ناردە لای سەرداری سوپای سەرکەوتو سلێمان پاشا: "چ خیانەتێ لەم بەندە دڵسۆزە دەرکەوتوە تا لەشکر بنێرن بۆ ئازاردانی؟ ئەگەر قەڵاکانتان ئەوێ ئەوا بەندەو هەرچیەکی هەیەتی هی گەورەمانە. من کەبەندایەتی خۆمم بۆ سوڵتان راگەیاندوە نرخی قەڵاکان چیە؟ ئەگەر سوڵتان بەندایەتی من قوبوڵ ناکاو قەڵاکانمی ئەوێ کلیلی قەڵاکانی بەبەندایەتی خۆمەوە پێشکەش بێ" پاشای ناوبراو سوێندی گەورەی بەخوا خوارد کەدەستی ئەو لەم هێرشەدا نەبوە. بەڵکو ئەمە ئەنجامی نامەی غازی خان بوە. ئەوە هیچ گومانێکی لەسەر راستیو راستگۆیی ئەم نیە." بۆ نیشاندانی دۆستایەتی بێگە بەگ کلیلی قەڵاکانیو دیاریەکی زۆری بەم بەندەیەدا بۆ پاشای ناوبراو نارد. کەکلیلو دیاریەکان گەیشتن پاشا لەسەر راستی دڵنیابو. فەرمانی بڵاوە پێ کردنی سەربازەکانی داو، ئەم بەندەیەی، سەرەڕای کەمی تەمەنی، لای خۆی بەبارمتە گل دایەوە.

## سەردەمی بەگەکان:
## سورخاب بەگ (945–975) و نەوەکانی

–1–

کەمەنمونی دوەم بەدیلی رەوانەی دیاری رۆم کرا. ولاتەکەی بێ سەرپەرشت مایەوە. سورخاب بەگی مامی، ئەم دەرفەتەی بەهەل زانی دەستی بەسەر ناوچەکانی ژێردەستی مەئمونی برازای داگرت، هەروەها ناوچەکانی ژێردەستی محەمەد بەگی برایشی داگیر کرد. محەمەد بەگ هەلاتو پەنای بۆ رۆم برد.

–2–

نزیککەوتنەوەی ئەردەلان لەدەرباری سەفەوی

ئەلقاس میرزای سەفەوی لەسەر دەسەلات لەشا تەهماسبی برای هەلگەرایەوە. پەنای بۆ سولتان سلێمانی قانونی برد (954). ئەو کاتە گەرمەی جەنگی 20 سالەی رۆمو عەجەم بو. لەلایەن عوسمانیەوە پێشوازیەکی گەرمی لێ کراو. لەشکرێکی گەورەیان بۆ سازدا. لەشکرکێشیەکە سەرکەوتو نەبو. ئەلقاس ترسا سولتان بیکوژێ هەلات بۆ شارەزورو، چوە لای سورخاب بەگ. شا تەهماسب کردیە سەر سورخاب، ئەلقاسی تەسلیم بکا. سورخاب بۆ ئەوەی ولاتەکەی نەکەوێتە بەر هێرشی قزلباش. ئەلقاسی تەسلیم کردن(956). تەهماسب ماوەیەک ئەلقاسی برای لەقەلای قەهقەهەدا زیندانی کرد. ئینجا فەرمانیدا لەسەر قەلاکەوە فرێیان دایە خوارەوەو مرد.

تەسلیم کردنی ئەلقاس بەتەهماسب. بوە هۆی نزیک کەوتنەوەی سورخاب لەدەرباری سەفەوی. تەهماسب لەپاداشتی ئەم چاکەیەدا موچەی سالانەی بۆ سورخاب بریەوەو ئیتر بەلای ئەواندا ساخ بوەوە. عوسمانیەکانیش لەتۆلەی ئەمەدا مەئمونیان لەبەند ئازاد کرد. بەلام لەباتی گێرانەوەی بۆ ئەردەلان حیلەیان پێ سپارد.

## -3-

بنکەی حوکمرانی میرەکانی ئەردەڵان لەقەڵای زەڵم بوە. قەڵای زەڵم بەقەد شاخی سورێنەوەیە. شوێنێکی عاسیو نژوارە. کەوتۆتە لایەکی چەپەکەوە. هیچ شارو ئاوایییەکی گەورەی لەنزیک نەبوەو هیچ رێگەو بانێکی گرنگیشی پێدا تێ نەپەریوە. ناوچەیەکی کەم دەرامەتو هەژار بوە.

مەئمونی دوەم، کەدوای باوکی کاروباری وڵاتی گرتە دەس (942)، نیتر نەیتوانی خۆی لەشەڕ دورەپەرێز بگرێ. سوڵتان حسێن بەگی میری بانیان، بە لەشکری عوسمانیەوە هاتە سەری. لەقەڵای زەڵمدا گەمارۆیدا. سەرەنجام ناچاربو خۆی بەدەستەوەدا. بەگیراوی رەوانەی لای کاربەدەستانی عوسمانی کراو خرایە زیندانەوە.

سورخاب بەگ، مامی مەئمون، رێی بۆ چۆڵ بو ناوچەکەی هێنایە ژێردەستی خۆیەوە. ئەمیش خۆی لەبەشداریی لەشکرکێشییەکانی جەنگی 20 ساڵەی ئێرانو عوسمانی دور راگرتوە. چەپەکیی ناوچەکەو، دابڕاویی لەمەیدانە سەرەکییەکانی جەنگەوە، یارمەتیدەری بون.

## -4-

### قەراردادی ئاماسیە

هەردو دەوڵەت: ئێرانو عوسمانی، لەئەنجامی کێشەی ناوخۆو هەرەشەی دەرەکیدا، ناچاربون شەڕ رابگرنو، پەیمانی ئاشتی ببەستن. دوای ئاڵوگۆڕی چەندین نامە لەنێوان گەورەکاربەدەستانو، شا تەهماسبی سەفەویو سوڵتان سلێمانی قانونیدا، ئێرانو عوسمانی لەرەجەبی 963 (مایسی 1555)دا گەیشتنە رێککەوتنێک، کە لەمێژودا بە"قەراردادی ئاماسیە" ناسراوە.

ئەم رێککەوتنە زۆرتر بەپێی سەرەتای "باری هەبو" رێک خرابو. هێزی هەر لایەک گەیشتبوە هەر جێگایەک لەوێدا مایەوە. بەم پێیە: ئازەربایجان هەموی بەر ئێرانو عیراقی عەرەبی هەموی بەر عوسمانی کەوتو. ئەرمەنستان، گورجستانو، کوردستان، بەشێکی کەوتە ژێر دەستی ئێرانو بەشێکی کەوتە ژێر دەستی عوسمانی. لەئەنجامی ئەمەیشدا قەڵەمرەوی ئەردەڵان بو بەدو بەشەوە: هەورامان، مەریوان، بانە، سەقز کەوتنە ناو سنوری عەجەمو، شارەزور، شاربازێر، قەرەداغ کەوتنە ناو سنوری رۆم.

(شەرەفنامە: 206 207)و بەدوی ئەویشدا مێژونوسەکانی ئەردەڵان (لب: 32-33)و (مەستورە: 33)و (حدیقە: 123-124)و (تحفە: 97-98) ئەڵێن: سورخاب بەگ ناوچەکەی محەمەد بەگی برای زەوت کرد. محەمەدیش بۆ ئەوەی ئەردەڵان بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە پەنای بۆ رۆم برد. هێزێکی گەورەیان دایە. چونە سەر قەڵای زەڵمو گەمارۆیاندا. گەمارۆدان دو ساڵ درێژەی کێشا. شا تەهماسب هێزی بەفریای گەمارۆدراوەکانەوە نارد. لەشکری عوسمانی دەوری قەڵایان بەرداو بڵاوەیان لێ کرد. گەمارۆدراوەکان، چونکە لەمێژبو لەناو قەڵاکەدا گیریان خواردبو، کەڵکیان لەو هەلە وەرگرتو خۆیان دەربازکردو هەر یەکەیان بەلایەکدا رای کرد. یەکێ لەسەرانی لەشکری عوسمانی چۆڵیی قەڵاکەی بەهەل زانیو. یەکسەر چوە ناویو گرتی. قەڵای کرد بەبنکەی خۆیو لەوێوە دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرت. "لەوساوە -969 - شارەزور وەسەر قەڵەمرەوی عوسمانی خرا." بنکەی میرایەتی ئەردەڵان نیتر لەقەڵای زەڵم هەڵکەنراو گوێزرایەوە قەڵای مەریوان.

ئەم شەڕە لەو ساڵەدا ئەگەر قەومابێ یا نە. ئەمە هیچ لەو راستیە ناگۆڕێ کە: شارەزور بەپێی قەراردادی ئاماسیە لە963وە خرابوە سەر قەڵەمرەوی عوسمانی. ئەگەر ئەم شەڕەیش بوبێ بۆ جێبەجێکردنی بوە.

-5-

**نەوەکانی سورخاب بەگ**

سورخاب بەگ بەقسەی هەندێ 60 ساڵو بەقسەی هەنـدێکی تـر 67 سـاڵ حـوکمڕانی کـردوەو 11 کوڕیشی هەبوە: حەسەن بەگ، ئەسکەندەر بەگ، ئەسلەمس(!) بەگ، شاسـوار بـەگ، سـارۆخان، قاسـم بـەگ، سوڵتان عەلی بەگ، یەعقوب بەگ، بارام بەگ، زولفەقار بەگ، بیسات بەگ.

-6-

**ڕەچەڵەکی میرانی سۆران**

مێژونوسەکانی ئەردەڵان، (لب: 34)و (مستورە: 34)و، (حدیقە: 125)و (تحفە: 115) هەمویان لەسـەر ئـەوە یەکن کە: بارام بەگی کوڕی سورخاب بـەگ کەنـەو زەمانـە بەفـەرمانی بـاوکی کـراوە بـەحاکمی ئامێـدیو ڕەوانـدز. باپیری زنجیرەی بنەماڵەی میرانی سۆرانەو. هەمویان سورن لەسەر ئەوەی کەمیر محەمەدی مـیری ڕەوانـدزو هـەریرو کۆیە، کە لەو سەردەمەدا یەکێ لەپیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە بوە، لەنەوەی بارامی کوڕی سورخابە.

ئاگاداریەکانی(شەرەفنامە: 484) کەکۆنترین سەرچاوەی مێژوییە باسی بنجوبناوانی هـەردو بنەماڵـەی ئەردەڵانو سۆرانی کردبێ، لەم ڕوەوە هیچ بەڵگەیەک بەدەستەوە نادا. کەبارام بـەگ بـاپیری میرانـی سـۆران بێ. جگە لەوەیش شەرەفخان کەباسی سورخاب بەگی کردوە، لەم بارەیـەوە هیچـی نـەوتوە. لـەناو زنجیـرەی میرانی سۆرانیشدا بارام بەگیان تێدا نیە. بۆیە ئەم قسەیە جێگەی گومانە.

-7-

**سوڵتان عەلی بەگ کوڕی سورخاب بەگ**

لەپاش ماوەیەکی کورتی حوکمڕانیی بەگەنجی مرد. دو کوڕی منداڵ: تەیمور خانو هەڵۆ خـانی لـەپاش بەجێ ما. دایکی ئەم دو کوڕە، کچی مونتەشا سـوڵتانی ئیسـتاجلو بـوە. کەیـەکێ بـوە لەگـەورەکانی قزلبـاش (شرفنامە: 208). ڕەنگە سورخاب دوای بەدەستەوەدانی ئـەلقاس میـرزا، لەکاربەدەسـتانی دەربـاری سـەفەوی نزیک بوبێتەوەو، ئەم ژنو ژنخوازیەیش بەرهەمی ئەوە بوبێ.

-8-

**بیسات بەگی کوڕی سورخاب بەگ (975-986)**

کوڕەکانی سوڵتانی عەلی بەگ منداڵ بون، لەبەر ئەوە مامیان بیسات بەگ کاروباری وڵاتی گرتـە دەس. کەتەیمورو هەڵۆ گەورە بون چونە دەرباری شا ئیسماعیلی دوەم (984-985) بۆ ئەوەی حوکمی وڵاتەکـەیان لەمامیان بۆ وەربگرنەوە، بەڵام بەهۆی پەشێوانی هەلومەرجی دەربارەوە سەرکەوتو نەبون.

تـەیمور کێشـەی زۆری بـۆ مـامی دروسـت نـەکرد. تـاڵانو ڕاوروتـی ئـەکردو ئـاژاوەی خسـت بـوە ناوچەکەوە بەڵام زەفەری بەمامی نەبرد تاخۆی بەدەردی خوا مرد (986).

-9-

**تەیمور خان کوڕی سوڵتان عەلی بەگ (986-998)**

بەمردنی مامی کاروباری گرتە دەس. تا سەردەمی تەیمورو هەڵۆ نازنـاوی هـەمو میرەکـانی ئـەردەڵان "بەگ" بوە، لەدوای ئەمانەوە ئیتر هەمو نازناوی "خان" یان هەڵگرتوە.

دوای مردنی شا تەهماسب (984) سەرانی قزلباش ئیسماعیلی دوەمیان لەزینـدان دەرهێنـاو، لـەجێی باوکی کردیان بەشای ئێران. ئیسماعیل زیاتر لە 19 ساڵ بەتەنیا لەزیندانی قەڵای قەهقەهەدا بو. کـەبو بەشـا کەوتە کوشتنی براو خزمەکانی‌و، سەرانی قزلباش. سەرانی قزلبـاش پیلانێکیـان لـێ گێـڕا کوشـتیان (985). سەرانی قزلباش دوای ململانێیەکی زۆر، تەنیا کوڕی زیندوی تەهماسب، محەمەدی خودابەنـدەیان، دانـا بەشـای ئێران. محەمەد (985-996) بودەڵەو بێکارەبو. سەرەڕای ئـەوەیش چـاو کتوکوێربـو. ئـەم بـەناو شـا بـو. دەسەڵاتداری راستەقینەی دەربار هاوسەرەکەی بو.

هەلومەرجی ناوخۆی ئێران پەشێواو نێوانی لەگەڵ عوسمانی تێک چوبو. سەرلەنوێ باروبۆخی جـەنگ زاڵ بوبو بەسەر پێوەندیەکانیاندا. بابیعالی نەیویست هەل لـەلاوازی دەربـارو پەشـێوانی هەلومـەرجی ئێـران بهێنێ‌و، لەچەند لاوە پەلاماری ئێرانیانداو، سـەرزەمینێکی فراوانیـان لـەرۆژئاواو سـەروی ئێـراندا، تەنانـەت تەورێزیشیان، داگیر کرد. هێزەکانی ئێران بەری ئەم هێرشانەیان پێ نەنەگیرا.

تەیمور خان، بەهۆی پشێوی ناوخۆی ئێران‌و کزی دەسەڵاتی دەرباری سەفەویەوە، نێوانی خۆی لەگـەڵ عوسمانی چاک کرد. وەکو (شەرەفنامە: 209) دەڵێ: ساڵی 986 پـەنای بـردە بـەر سـوڵتان مـرادی سـێیەم (982-1004). سوڵتان لەداهاتی زەوییە تایبەتیەکانی شارەزور موچەی ساڵانەی بـۆ بڕییـەوەو، هـەر چـوار کوڕیشی بەخەڵات سەربەرز کردن: سنە، حەسەناوا، قزڵجـە، زەڵـم، شـارەزور درا بەسـوڵتانعەلی. قـەرەداخ بـە بداغ. مەریوان بەمراد بەگ. شارباژێڕ بەمیر عەلەمەدین.

تەیمور خان لەهەوڵی فراوانخوازیدا بو. هەوڵی ئەدا ناوچەکانی دراوسێی لەکرماشان، هەمەدان، وڕمێ، داگیر بکا. لەگەڵ کەڵوڕو لوڕ توشی شەڕ هات. لـەکاتی گـەمارۆدانی قـەڵای زەرینکەمـەر (گـەڕوس)دا کـوژرا (998).

**پەراوێز:**

1. سنە ئەو کاتە هێشتا بنیات نەنرابو. 2. وەکو دەریش ئەکـەوێ قەڵـەمرەوی ئـەردەڵان لـەو کاتـەدا بەزۆری خاوروی کوردستان، بەتایبەتی بەشێکی سلێمانی ئێستای گرتۆتەوەو، سنورەکەی لەناو ئێراندا تەسک بوە.

# سەردەمی خانەکان:

## هەڵۆ خان (998–1026)

لەدوای کوژرانی تەیمور خان هەڵۆ خانی برای کاروباری ئەردەڵانی گرتە دەس سەردەمی هەڵۆخانیش ئێران هەر لەنائارامیدا بو. سەرانی قزلباش هەڵیان کوتایە سەر کۆشکی شاو، بەبەرچاوی ئەوەوە ژنە دەسەڵاتدارەکەیان کوشت. لەدوای زنجیرەیەک پیلانگێران. شا محەمەد کەنارەگیری کردو عەبباسی کوڕی لەسەر تەختی شایەتی دانرا (996-1039). لەو کاتەدا دەرباری ئێران لەوپەڕی بێ دەسەڵاتیو شپرزەییدا بو. خانەکانی قزلباش هەر یەکەیان لایەکی ئێرانی بۆ خۆی دابڕی بو. عوسمانی ناوچەیەکی فراوانی ئێرانیان لەژێر دەسدابو. سوپای ئێران لەچاو ئۆردوی عوسمانیدا نارێکوپێکو لاوازو بێ بەش بو لەچەکی گەرم. شا عەباس پێویستی بەکات هەبو، بۆ ئەوەی هەلومەرجی ناوخۆی ئێران چاک بکاتو، دەسەڵاتی دەربار بەهێزو، سوپای ئێران رێک بخاتەوە، ئەوەیشی لەباروزۆخی جەنگدا لەگەڵ عوسمانی بۆ نەئەکرا. لەبەر ئەوە لەسەرەتادا هەوڵیدا لەگەڵ بابی عالی ئاشتی بکا. شا عەباس. مەهدیقولی خانی چاوەشلوی حوکمڕانی ئەردەبێلی لەگەڵ برازایەکی بەدیاریەوە نارد بۆ ئەستەمولْ. سەفیری ئێرانی لەسەفەوی 999دا رێککەوتننێکی لەئەستەمولْ لەگەڵ بابی عالی ئیمزا کرد. بەپێی ئەم رێککەوتنە:

1. ولایەتەکانی ئەرمەنستانو شەکیو شیروان، گورجستانو قەراباغ. شاری تەوریزو بەشی رۆژئاوای ئازەربایجان، کوردستانو لوڕستانو قەڵای نەهاوەند بەدەوڵەتی عوسمانی درا.
2. هەردولا بەڵێنیان بەیەکتریدا دیلەکانی جەنگ بدەنەوە بەیەکتری.
3. هەردولا بەڵێنیاندا بەیەکتری داڵدەی راکردوانی یەکتری نەدەن.
4. دەوڵەتی ئێران بەڵێنیدا سوکایەتی بەهاوسەری پێغەمەرو خەلیفەکان نەکا.
5. بۆ دەستەبەرکرنی جێبەجێ کرننی ئەم پەیمانە ئێران حەیدەر میرزای برازای شا عەباسی بەبارمتە لەلای بابیعالی دانا. (پارسادوست: 35-36)

هەڵۆخان لەم هەلومەرجەدا کاروباری ئەردەڵانی گرتە دەس. قەڵاکانی زەڵم، پڵنگان، حەسەناوای ئاوەدان کردەوە، مزگەوتو خانو، بازاڕ، حەمامی تێدا دروست کردن. وڵات ئاوەدان بوەوە. هەڵۆخان بەهۆی قایمیی قەڵاکانیو، زۆریی سوپاکەیو، سامانو زەخیرەوە، "شا عەباسی بەهیچ نەئەزانی". (لب: 42) نێوانی لەگەڵ هەردو دەوڵەت ڕۆحو عەجەم باش کردبو. بەسەربەخۆیی کاروباری وڵاتی بەڕێوە ئەبرد.

شا عەباس هەروەکو دەسەڵاتی ناوەندیی بەسەر هەمو ئێراندا سەپاندەوە، ئەیویست کوردستانیش بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. شا عەباس چەند جارێ لەشکری کردە سەری، بەڵام بەسەرنەکەوتویی ئەگەڕانەوە.

هەلومەرجی کوردستان هەتاسەر بەم جۆرە نەمایەوە. لەسەردەمی هەڵۆخاندا ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی بەسەر جۆری بەڕێوەبەرایەتی ئەردەڵاندا هاتو. بناغەی 4 ئەریتی نوێ لەم میرایەتیەدا داڕێژرا.

**–2–**

### ناردنی بارمتە بۆ دەرباری ئێران

مێژونوسەکانی ئەردەڵان (لب: 44)، (مەستورە: 44-45)، (حدیقە: 130)، (تحفە: 105-106) بەکەمێ جیاوازیەوە چیرۆکی ناردنی یەکەم بارمتەی ئەردەڵانی ئەگێڕنەوە:

شا عەباس بەهێزێکی گەورەوە بۆ گرتنی کوردستان لەئەسفەهانەوە مەنزڵ بەمەنزڵ کەوتە ڕێ لەمەیهەمی ئەسفەندئاباد بارگەی خست. بۆ تەماشای چیاکانی کوردستانو ڕێگەوبانەکانی ئەچێتە سەر شاخێکی بەرز. ئالی (عەلی) بالی زەنگەنە، کەلەو کاتەدا جڵەوداری تایبەتی شا بو، لەگەڵی ئەبێ. شا عەباس هەواڵی کوردستانی لێ ئەپرسێ. ئەویش کەخۆی بەکورد دانەنێو ئەیەوێ چاکە بکا ئەڵێ: "کوردستان چیای گەورەو قەڵای قایمی وای تێدایە باڵداریش نایگاتێو، بەردەڵانی سەختو باریکەڕێی پڕ درەختی کەیەکانگیر ئەبن هیچ ملبەرزێ ناتوانێ بەسەریدا سەربکەوێ، سەرەڕای ئەوەیش شەرکەری شێرگلێنو ئازای لێیە کەهەر یەکێکیان لەگەڵ ڕۆستەمو ئەسفەندیار لافی بەرامبەرێو لەگەڵ ئەفراسیاوی تورک دەعوای هاوسەری ئەکەن چاک وایە حەزرەتی شا دەس لەمە هەڵ بگرێ ئەگەر خوانەخواستە لەکاتی پێکاداندا شکان بەسەر سوپای شادا بێ، ئەم ئەنگو شورەییە تاقیامەت لەناو بنەماڵەی سەفەویدا ئەمێنێ!" شا عەباس قسەکەی ئالی بالی ئەچێتە دڵو. واز لەو بیرە ئەهێنێ کە بەزۆر داگیری بکا.

شا عەباس دەرگای گفتوگۆو دۆستایەتی لەگەڵ هەڵۆخان کردەوە. بەنامەو خەڵاتو دیاری هێنایە ژێر باری فەرمانبەرێو گوێڕایەڵی. خان ئەحمەد خانی کوڕی وەکو نیشانەی گوێڕایەڵی بە بارمتە ڕەوانەی دەرباری شاهی کرد. لەو کاتەوە ئیتر ئەمە بو بەنەریتێکی پێڕەوی کراوی دەربار، هەمیشە یەکێ یا چەند کەسێ لەمیرەکانی ئەردەڵان لەدەربارەکانی سەفەوی، ئەفشار، زەند، قاجاردا بارمتە بن.

**–3–**

### تێکەڵاوی ژنو ژنخوازی

مێژونوسەکانی ئەردەڵان (لب: 45)، (حدیقە: 130)، (تحفە: 107) چیرۆکی ژنهێنانی خان ئەحمەدخان ئەگێڕنەوە، کەشا عەباس لەبەر لێهاتویی زەڕینکولاهی خوشکی لێ مارە کردوە. بەڵام (مستورە: 45-46) لەهەمویان زیاتر بایەخی بەم چیرۆکە داوەو. وەکو لەپێشینانی بیستوە. تێکەڵاوی ئەکا بەئەفسانەو خەیاڵی ژنانەو ئەنوسێ: "پاش ماوەیێ کەبەهرەو توانی خان ئەحمەد خان لەشا عەباس ڕون بوەوە. لەپایەو پلەی زیادکردو خوشکە گەوهەرە درەخشانەکەی نێو گەوهەردانی شاهێتیو ئەستێرە

پرشنگدارەکەی ناو بورجی سەڵتەنەتی، کەناوی زەرینکولاە بو. پێبەخشیو سەری بەزاواو خەزوریی شا بەرز بوەوە. وێڕای ئەوەی کەمێژو لەم بارەوە زۆری لەسەر نەڕۆیشتوە، بەڵام وەک لەپێشینانم بیستوە، دوای نیشانکردنی زەرینکولاە، ئەو گەوهەرە گرانباییە ئەختەربڵندە، بەهاوسەری خان ئەحمەد خان قایل نەبو.

حەزرەتی پاتشا کەلاوچاکیو ئازایەتی خان ئەحمەد خانی لێ رون بو دلێریو کەڵەمێردیی کەجێگەی شانازیی بنەماڵەی ئەردەڵان بو. لەئاوێنەی بیریدا رەنگی دابوەوەو سەردەرانەی تالاری بەبونی بەختەوەرانەیەوە رازاندبوەوەو بەفەرێ هێنابو. زەرینکولاهی بۆ ئەو جێگایە کەئاسمانی بو، لەسەر زەوی جێگیر بیو. لەتەنیشت خۆیەوە دانا. ئەنجا فەرمانیدا کە لەدەرگای حەوشەوە خان ئەحمەد خان بێنن‌و لەدەرگایەکی دیکەشەوە، ئەرەشێرێکیان. کەچەندین ساڵ بو لەکن شێرەوانەکانی شا لەزنجیر درابو، بەرەڵلاکەن. شێری تایەن لەو چەقی مەیدانەدا هەڵی کردە سەر خان ئەحمەد خان‌و پەلاماریدا. ئەو هۆژەبرە چاونەترسە نەسڵەمییەوە، یەکسەر شمشێری دلێری هەڵکێشاو بەهێزی بازوی شێرانەی‌و دەمی شمشێری دلێرانەی شێرەکەی کوشت‌و لەناوی برد. شای سەفەوی ئەگەرچی ئازایەتی‌و دلێریی خان ئەحمەد خانی لەبەر چاو زیاتر بو، بەڵام لەکوشتنی شێرەکەو بێباکی ئەو دلێرە، ناوبراوی سەرزەنشت کرد. خان ئەحمەد خان لەوەڵامدا فەرموی: "ئێمە دو شێری هاوتاو دلاوەر پەلاماری یەکتریمان دا. یەغباڵ هێنایو بەخت سواربو، من ئەوم بەزاند." شا فەرمایشتە جوانەکەی ئەو لاوچاکەی زۆر بەدڵەوە چو، زەرینکولاە بەهاوسەریی ئەو هومای کەشکەلانی بڵندیە شابو. دینجا بەرێو رەسمێکی شایانی شاریاران بێو بە بەزەکو دۆزەکو دەبدەبەو سەنسەنەیێکی لەشانی گەورەپیاوان بوەشێتەوە هەردو پرشنگدار جوت بون‌و بەیەک گەیشتن."

دیارە ئەم چیرۆکە ئەفسانەییە دروستکراوی خەیاڵی ژنانی بنەماڵەی ئەردەڵانە. بۆ ئەوەی ئازایەتیەکی نائاسایی بدەنە پاڵ کەسێ کە لەخەیاڵی ئەواندا پیاوێکی نائاساییو پاڵەوانێکی بێ وێنە بوەو، بەم چیرۆکە شان‌و شکۆی بەرز بکەنەوە.

هەروەکو ئەم چیرۆکە بەسەر زمانەوە بوەو، مەستورە لەپێشینانی خۆی بیستوەو لەمێژوەکەیدا تۆماری کردوە، چیرۆکێکی تریش هەر بەسەر زمانەوە بوە، ئەبێ ئەویشی بیست بێ. بەڵام بۆ رێز لێنان لەم بنەماڵەیە خۆی لەگێڕانەوەی بواردوە. لەپێش ئەمو لەدوای ئەمیش، جگە لەنوسەری (سییر الاکراد: 45) کە لەبنەماڵەی ئەردەڵان نەبوە. کەسێک لەمێژونوسەکانی ئەردەڵان باسیان نەکردوە.

دەماودەم ئەگێڕنەوە: خاتو کڵاوزەڕ حەز لەیوسف یاسکە ئەکا کەنۆکەرێکی قۆزی خۆیان بوەو دەستی لەگەڵ تێکەڵاو ئەکا. خان بەکەینوبەینی کڵاوزەڕو یوسف ئەزانێ. لەسەر ئەوە یوسف سزا ئەداو، فەرمان ئەدا لەچینی دیواردا بەزیندویەتی بینێژن. یوسف شاعیرێکی دەم پاراو بوە. لەگەڵ هەمو چینێکی دیوارەکەدا شیعرێک ئەڵێو، لەخان ئەپاڕێتەوە لێی ببورێ. ئەم هەمو پاڕانەوەیە کەڵکی نابێ چینەکانی دیوارەکە ئەگاتە راستی سەری. ئەوسا ئیتر نومێدی بەژیان‌و لێبوردن نامێنێ. بۆ دەربڕینی داخی دڵی ئەکەوێتە جنێودان، ئەڵێ: "ئەگەر ئەمکوژی(...)، ئەگەر نامکوژی(...)، خاتو کڵاوزەڕ کەوتە ژێرمەوە." وەستاکە بۆ ئەوەی بەیەکجاری یوسف بێدەنگ بکا تۆپەڵێک گەچ ئەماڵێ بەدەمیدا.

بەشی یەکەمی چیرۆکەکە هەموی لەهەڵبەستراو ئەچێ. شا عەباس خوشکێکی نەبوە ناوی زەرینکولاە بێو، هیچ سەرچاوەیەکی ئەو سەردەمەیش باسی ئەم ژنهێنان‌و شێرشکاندنە ناکات. رەنگە ئەم ژنەی دراوە بەخان ئەحمەد خان، وەکو نوسەری (نیل: 18) ئەڵێ: ".. یەکێ لەپەردەنشینانی حەرەمسەرای شاهی..." بوبێ، نەک خوشکی شا. شاهەکانی ئێران هەرگیز لەژن‌و پارە تێر نەئەبون. حەرەمسەراکانیان هەمیشە پڕ

بوە لەژن و کەنیزەک. جاروبار لێیان بەخشیون. بۆ نمونە: شا سولّتان حسێن، دوایین شای سەفەوی، 5 هەزار ژنی سیغە کردوە، لەوانە 2 هەزاریان کچ بون. فەتحعەلی شای قاجاریش نزیکەی هەزار ژن و کەنیزەک لەحەرەمسەراکەی‌دا بوە. جاروبار هەندێ لەم ژنانەیان، بەکاربەدەستو دەستوپێوەندەکانیان ئەبەخشی.

**—4—**

## گۆڕینی مەزەبی بنەماڵەی دەسەڵاتدار

میرەکانی ئەردەڵان تا هەڵۆخان هەمویان سوننە بون. لەخان ئەحمەد خانەوە کە لەدەرباری شا عەباس‌دا پەروەردە کراوە، ئیتر بون بەشیعە. لەم ڕووەوە نوسەری (نیل: 18) ئەڵێ: "شاه عەباسی بەهەشتی، خان ئەحمەد خانی کوڕی هەڵۆخانی چەند ساڵێک بەئەریتی قزلباشی پەروەردە کردو بەجلوبەرگو نازو نیعمەت، لەدابو شوێنی کوردیو عەشیرەیی دوری خستەوە. دوای ئەوەی خستیە سەر ڕەسمو ڕێگای قزلباشی، بەئەزەری شاهانە چاوی لێ‌کردو یەکێ لەپەردەنشینانی حەرەمسەرای شاهی.. شانازی پێ بەخشی."

**تێبینی:** دەربارەی ژنەکانی شاسولّتان حسێن، بڕوانە: (رستم التواریخ: 70-83)و، دەربارەی ژنەکانی فەتحعەلی شا، بڕوانە (تاریخ عضدی).

نوسەری (سیير: 44)یش چیرۆکێکی تری هەڵۆخان ئەگێڕێتەوە کەدیارە بیستویەتیو ئەڵێ: "لەسەر دینی ئیسلامو مەزهەبی ئەهلی سوننەتو جەماعەت بو. تەعەسوبێکی تەواوی لەگەڵ گروهی دوانزە ئیمامی هەبو. هەرگیز ڕێگەی ئەئەدان بێنە وڵاتەکەیەوە. کەبیستی خان ئەحمەد خان خوشکی شای هێناوەو تاقمێ قزلباشی لەگەڵ خۆی هێناوە، وتی: "انا لله وانا اليه راجعون. زۆر ناخایەنێ کەدەعوەتی رافیزی لەکوردستان‌دا بڵاو ئەبێتەوە!" نوسەری (تحفە: 109)یش، ئەگێڕێتەوە کە لەکۆڕێک‌دا هەڵۆخان بەتوڕەییەوە ڕوی کردۆتە خان ئەحمەدو نزای لێ کردوەو وتویەتی: "...ڕۆڵە جوانە مەرگ بی! وا کەپێی قزلباشت هێنایە ناو مەملەکەتی کوردستانەوە..."

ناکۆکی شیعە-سوننە لەو سەردەمەدا زۆر توندوتیژو، یەکێ لەگرنگترین بیانوەکانی شەڕوشۆڕی نێوان ڕۆمو عەجەم بوە. ئێران مانی خۆی لەپێڕەوی مەزهەبی شیعەو عوسمانی مانی خۆی لەپێڕەوی مەزهەبی سوننەدا دیوە. گۆڕینی مەزەب بەناوی میرەکانیشەوە دیارە: کەلبعەلی، عەلیقولی، عەباسقولی، حەسەنعەلی، ڕەزاقولی... کەهەمو ناوی شیعەن.

**—5—**

## گلدانەوەی میرە گومانلێکراو و سەرکێشەکانی ئەردەڵان لەپایتەختدا

مێژونوسەکانی ئەردەڵان (لب: 48-50)، (مستورە: 47-50)، (حديقە: 130)، (تحفە: 110-111)، دەربارەی ناردنی هەڵۆخان بەگیراوی بۆ دەرباری شا عەباس، بەکەمێ جیاوازیەوە هەمویان یەک چیرۆک ئەگێڕنەوە:

شا عەباس کەهاتە سەر تەخت، دەسەڵاتی ناوەندیی دەرباری سەفەوی لەوپەڕی لاوازی‌دا بو، بەڵام بەشێنەیی هێزی تێ گێڕایەوەو دەسەڵاتی بەسەر سەرانسەری ئەرزی ئێران‌دا پەیداکردەوەو، گەورەو دەسەڵاتدارە خۆجێییەکانی هێنایەوە ژێر باری فەرمانبەری. هەڵۆخان، یەکێ بو لەوانەی گوێی نەدابوە شا عەباسو، ئەچوبو بۆ لای‌و، لە شەڕو لەشکرکێشییەکانیشی‌دا بەشداری نەکردبو. دوای ناردنی خان ئەحمەد خانی کوڕیشی بەبارمتە، پێوەندییان هەر بەمجۆرە مابوەوە.

شا عەباس داوای لەخان ئەحمەد خان کرد بگەڕێتەوە کوردستان، خۆی کاروباری وڵات بگرێتە دەستو باوکی بۆ لای ئەم بنێرێ. خان ئەحمەد بەخەڵاتو بەراتەوە گەڕایەوە بۆ کوردستانو کەوتە دڵنەوایی‌و ڕاکێشانی خەڵک. هەڵۆخان بۆ ڕێز لێنانی کوڕەکەی کۆڕی میوانداری ڕێکخست. فەرمانیدا مێوژو گوێزێکی زۆریان هێناو بەسەر دانیشتوانی کۆڕەکەدا دابەشیان کرد. مشتێ مێوژو دو مشت گوێزو دو بەردیان لەبەردەم هەر یەکێکیاندا دانا. بەردەکان بۆ شکاندنی گوێزەکان بو.

خان ئەحمەد ئەم سفرەو خوانو ئەم میوانداریەی بەسوکایەتی ئەزانێ بۆ خۆی، بەتایبەتی کەئەم ماوەیەکی درێژی لەناو شارستانێتی قزلباشدا بەسەر بردبو، کەسانی بێگانەی بۆ ئەم سەفەرە لەگەڵ خۆی هێنابو. ناردی لەناو بارەکانی خۆیدا قوتوی ڕەنگینی پڕ لەحەلەویاتو شیرینی جۆراوجۆری هێنایە کۆڕەکەوە. هەڵۆخان لەمە زۆر توڕە ئەبێ بەخان ئەحمەد خان ئەڵێ: "بەم شیرینیە ژیانی منت تاڵ کردو کاروباری کوردستانت گەیاندە جێیەکی زۆر خراپ!" بەتوڕەییەوە لەکوڕەکە هەڵئەستێ‌و ئەچێتە ناو قەڵای حەسەناواوەو دەرگاکانی لەڕودا دائەخا.

خان ئەحمەد خان گەمارۆی قەڵاکەیدا، بەڵام نەیتوانی بیگرێ تادایکی پاسەوانەکانی قەڵای هەڵفریواندو، مەلا یەعقوبی ناردە لای خان ئەحمەدو شوێنێکی بۆ دیاری کرد کەنیوەشەو لەو شوێنەوە بێتە ناو قەڵاوە. هەڵۆخان پێ ئەزانێ‌و لەگەڕانەوەدا مەلا یەعقوب ئەگرێ‌و بڕیار ئەدا لەسەر ئەم خیانەتە کەرۆژ بوەوە بیکوژێ. هەمان شەو خان ئەحمەد دەرگای قەڵای بۆ ئەکرێتەوە ئەچێتە ناوی، هەڵۆخانی باوکی ئەگرێ‌و ڕەوانەی ئەسفەهانی ئەکا، مەلا یەعقوبیش ئازاد ئەکا.

مەلا یەعقوب، کە بەتەمای مردن بو، بەجۆرێکی چاوەڕێنەکراو بەر بو. لەو کاتەوە ئیتر کەیەکێ ئەکەوێتە بەر هەڕەشەی مەترسیی مردنەوە، هاوار ئەکا: "خوای مەلا یەعقوب ڕزگارم کە!" ئەمە بوە بەپەندو کەوتۆتە سەر زار.

**—6—**

ئەم ئەریتانە کەبنەماڵەی ئەردەڵانی بەشاهەکانی ئێرانەوە ئەبەستەوە، ئەگەرچی لەسەردەمی شا عەباسدا داهێنران، بەڵام دوای ئەمانی زنجیرەی سەفەویش، لەدەرباری ئەفشار، زەند، قاجاردا پێڕەوی کرا.

**—7—**

## سەرەنجامی هەڵۆخان

شا عەباس، لەهەڵۆخانی ئەردەڵان دڵدۆنگ بو، چونکە بۆ دەربڕینی دڵسۆزی‌و فەرمانبەری، هەرگیز ئەچوبوە لای‌و لە لەشکرکێشیەکانیدا بەشداریی ئەکردبو. بەبیانوی ئەوەی هەڵۆخان لەبەر پیری کەنەفت بوەو، لەناو عەشائیردا دەسەڵاتی ئەماوە، خان ئەحمەدخانی کوڕی، کەهەر لەمناڵیەوە لەدەرباری شادا پەروەردە کرابو، ناردەوە بۆ کوردستان، بۆ ئەوەی ئەم لەجێگەی باوکی ببێ بەوالی ئەردەڵان (1023). (عالم ارا: 867).

هەڵۆخان ئەمەی پێ خۆش ئەبو، بەخۆشیی نامادە نەبو کاروباری وڵاتی تەسلیم بکا. مێژونوسی سەفەوی ئەم لاملییەی هەڵۆخان بەجۆرێکو مێژونوسەکانی ئەردەڵانیش بەجۆرێکی تری لێک ئەدەنەوە. (عالم ارا: 926) ئەڵێ: بەپێی سروشتی مرۆڤ کە تا ئەمرێ ئامادە نیە دەس لەماڵو موڵکی دنیاو پلەو پایەو دەسەڵات هەڵبگرێ، کاروباری وڵاتی تەسلیمی خان ئەحمەدی کوڕی ئەکرد. مێژونوسەکانی ئەردەڵانیش ئەڵێن:

خان ئەحمەدخان رەفتاری کوردیو عەشیرەتی گۆڕیبو بەرەفتاری قزلباشو، هەڵۆخان ئەترسا سەربەخۆیی وڵاتەکەی بەهۆی ئەمەوە لەناو بچێ.

خان ئەحمەد ساڵی 1026 دوای ئەوەی بەشەڕوشۆڕ هەڵۆخانی باوکی شکاندو ناچاری کرد بکشێتەوە قەڵای حەسەناوا، بەیارمەتی دایکی بەفێڵ قەڵای حەسەناواو، لەناو قەڵاکەیشدا باوکی گرتو، بەگیراوی رەوانەی ئەسفەهانی کردو. خۆی کاروباری ئەردەڵانی گرتە دەس. (عالم ارا: 926)، (لب: 49-50)، (مستوره: 48-49)، (حديقه: 130-131)، (تحفه: (110-111).

هەڵۆخان لەو کاتەدا وەکو (عالم ارا: 927) ئەڵێ تەمەنی لەهەشتا تێپەڕی بو بەڵام بەحەفتا ساڵ ئەچو. شا بڕیاریدا پاشماوەی ژیانی لەسەڵتەنەتخانەی ئەسفەهان، بەسەر بەرێ.

بەقسەی مێژونوسەکانی ئەردەڵان شا عەباس رێزی زۆری لەهەڵۆخان گرتوە، قازی مەلا شەریف ئەڵێ هەتا مرد لەئەسفەهان گل درایەوە. بەڵام (خوسرەو بەگ: 50) ئەڵێ پاش ماوەیەک رێگە درا بگەڕێتەوە کوردستان بەو مەرجەی دەس نەخاتە ناو کاروباری ئەمارەتەکەوە. (مستوره: 49) هەردو قسەی گێڕاوەتەوە بێ ئەوەی رەئی خۆی بداو ئەڵێ خوا خۆی باشتری ئەزانێ. نوسەرانی (حديقه: 131)و (تحفه: 111) قسەکەی خوسرەو بەگیان وتۆتەوەو، ئەوەندەیان لێ زیاد کردوە کەدوای 6 مانگ بەرێزو سەربەرزیەوە رێگەی گەڕانەوەی دراوە. بەڵام (عالم ارای عباسی: 1070) مەسەلەکەی بەچاکی رون کردۆتەوەو. لە ناو روداوەکانی ساڵی 1036 دا نوسیوێتی: "هەڵۆخان، لەمیرەکانی زەمانی شا... بو، بەو جۆرەی کەپێشتر باس کرا مەملەکەتی میراتیی بەخان ئەحمەدخانی کوری سپارد، بەپێی فەرمان لەئەسفەهان دانیشت بو. تەمەنی لە90 تێپەڕی بو، لەم ساڵەدا بێ ئەوەی نەخۆش بکەوێ، کتوپڕ مرد".

لێرەدا چەند پرسیارێ دێتە پێشەوە: تۆ بڵێی مێژونوسەکانی ئەردەڵان "عالم ارای عباسی" یان نەخوێندبێتەوە، کەیەکێ لەبەناوبانگترینی مێژوەکانی ئەوسای ئێرانەو، نوسەرەکەیشی روداونوسی رەسمیی شا عەباسو هاوزەمانی روداوەکە بوە. یان خوێندویانەتەوە، بەڵام باوەڕیان بەگێڕانەوەکەی ئەو نەکردوە؟ یاخود بۆ مەبەستێکی سیاسی ئەبێ ئەم روداوەیان گۆڕی بێ؟

# خان ئەحمەد خانی یەکەم
# (1046–1025)

**–1–**

سەردەمی ژیانو حوکمرانی خان ئەحمەدخان، سەردەمێکی ناناراموو ئاڵۆزو پڕ شەڕوشۆڕ بوە. لەلایەکەوە شەڕوشۆڕی رۆمو عەجەمو لەشکرکێشی یەک لەدوای یەک، لەلایەکی ترەوە نائارامی هەلومەرجی ژیانی تایبەتی خۆی: خیانەتی خاتو کلاوزەڕی هاوسەری، بەشداری لەشکرکێشی بۆ سەر بەغداو کەرکوکو موسڵ، شێت بونی، کوێرکردنی کورەکەی، هەڵگەڕانەوەی لەدەرباری سەفەوی، پەنابردنی بۆ عوسمانی، شکانی لەدەشتی مەریوان... بێگومان، خان ئەحمەد خان یەکێ بوە لەخانە هەرە گەورەکانی ئەردەڵانو، دەورێکی گرنگی لەڕوداوەکانی ئەردەڵانو ناوچەکەدا گێڕاوە. مێژونوسەکانی ئەردەڵان، هەمویان بەرێزێکی زۆرەوە چەندین لاپەڕەی مێژوەکانیان بۆ باسی سەروەرییەکانی تەرخان کردوە. بەڵام زنجیرەی روداوەکانیان لێ تێکەڵاو بوە. دڕێژەیان بەهەندێ روداوی بچوکو بێ بایەخ داوەو، هەندێ روداوی گرنگو کاریگەریان فەرامۆش یان بەکورتی گێڕاوەتەوە. لێرەدا، بەیارمەتی ئەوانو هەندێ سەرچاوەی مێژویی تر، هەوڵ ئەدەم سەرلەنوێ روداوەکان دابڕێژمەوە.

**–2–**

شاعیرێکی ئەو سەردەمە روداوە گرنگەکانی ژیانی خان ئەحمەد خانی، بەحسابی ئەبجەد بەوردی بە5 وشە، لە 4بەیتی فارسیدا کورت کردۆتەو، ئەڵێ:

خان اکراد یعنی خان احمد

سال (بخت: 1002) امد از عدم بیرون

سال (کج بخت: 1025) یافت حکم جلوس

در (غلط: 1039) گشت ابله و مجنون

باز صحت بیافت اندر (غم: 1040)
یافت حکمی از پیشتر افزون
سال (غم ها: 1046) هزیمتش دادند
رفت بیرون از این زمانه دون
کوردییەکەی:
خانی کوردەکان، واتە: خان ئەحمەد،
ساڵی (بەخت) لەدەبون هاتە دەرێ
ساڵی (بەختی کەچ) فەرمانی حوکمڕانی وەرگرتو، لە (غەڵەت)دا گەوج و شێت بو
لەناو (غەم)دا چاک بوەوە، لەجاران زیاتر دەسەڵاتی پەیداکرد
ساڵی (غەمەکان) شکاندیانو، لەم زەمانە دونە دەرچوە دەرێ!

—3—

## پەلاماردانی موکریو بلْباس

پێ ئەچێ خان ئەحمەد خان سەرەتای فراوانخوازی قەڵەمڕەوەکەی بە لەشکرکێشی بۆ سەر موکریو بلْباس دەس پێکرد بێ. لەم هێرشەدا بێ بەزەییانە کەوتۆتە راونانو کوشتنو تاڵانکردنیان. ئێلەکانی موکریو بلْباس لەو ئێلانەبون، کە بەدرێژایی سەردەمی سەفەوی، لەگەڵ دەسەڵاتی قزلباشدا لەململانێدا بون. چەندین جار کەوتونەتە بەر هێرشی خویناوی قەتڵوعامو تاڵانی سەرو ماڵ. یەکێ لەو هێرشە خویناوییانە، لەساڵی 1019دا، شا عەباس خۆی سەرکردایەتی کردوە، کەمەلا جەلالی مونەجیم بەدرێژی گێڕاویەتیەوە. خان ئەحمەدخانیش کەپەروەردەی دەرباری شا عەباسو دڵسۆزی گوێڕایەڵی بێ چەنوچونی بوە، دورنیە هێرشەکانی ئەمیش درێژەکێشانی هێرشەکانی ئەو بوبێ. (بڕوانە: ملا جلال الدین منجم: "تاریخ عباسی، یا روزنامه ملا جلال"، به کوشش سیف الله وحیدنیا، تهران، 1366)

—4—

## داگیرکردنی بەغداد

بەکر، یەکێ لەئینکشاریەکانی بەغداد کەگەیشتبوە پلەی سوباشی، دەسەڵاتی زیادی کردبو چاوی بڕی بوە ئەوەی ببێتە پاشای بەغداد، لەپیلانێکی شێوە کودەتاییدا پاشای کوشتو، ناحەزەکانی تری لەناوبرد. داوای لەبابیعالی کرد خۆی بکەن بەپاشای بەغداد. بابیعالی کەسێکی تری دانا بەپاشاو تا گەیشتنی ئەویش کەسێکیان نارد کاروباری بەغداد وەربگرێ تا وەزیری تازە ئەگات، بەکر ئەمیشی کوشت. فەرمان درا بەحافز ئەحمەد پاشای والی دیاربەکر والی تازە بباتە سەر شوێنەکەی. ئەمیش هێزەکانی پاشاکانی دیاربەکر، موسڵ، مەرعەشو سیواسی کۆکردەوەو بەڕێگای موسڵو کەرکوکدا بەرەو بەغداد چو، لەسەروی شاردا، نزیک ئەعزەمیە، بارگەی خست.

دانوسەندنی نێوان بەکرو حافز بەئەنجام نەگەیشت، چونکە بەکر سوربو لەسەر ئەوەی فەرمانی پاشایەتی بەغدادی بۆ دەربچێ. چەند شەڕێ لەنێوان هێزەکانی بەکرو حافز دابو، بێ ئەوەی هێزەکانی حافز هیچ سەرکەوتنێ بەدەس بهێنن. بەکر کلیلی شاری بەغدادی بۆ شا عەباس ناردو داوای یارمەتی لێ کرد. شا عەباس ئەم هەلەی بەدەرفەت زانی، بۆ ئەوەی عیراقو پیرۆزگاکانی بگرێ. دەسبەجێ فەرمانی بۆ حاکمەکانی سەرسنور، لەوانە حاکمی ئەردەڵان، کە ئەوسا خان ئەحمەد خان بو، دەرکرد، بەسەرکردایەتی حاکمی هەمەدان کۆببنەوەو، بچن بۆ یارمەتیدانی بەکر سوباشی.

هێزێکی گەورەی ئێران بەسەرکردایەتی قەرچغای خان گەیشتە شارەبان. لەوێوە هەواڵیان بۆ سەرداری عوسمانی نارد: لەبەر ئەوەی بەغداد بۆتە شارێکی ئێرانیو، بۆ ئەوەی ئاشتی لەنێوان ئەم دو میللەتەدا دابین بێ، داوایان لێ کرد ئەو ناوچەیە چۆڵ بکات. لێشاوی هێزی ئێرانی بەرێگاوەبو. حافز پاشا، بەرەو دوا کشایەوە موسڵ. قەرچغای خان گەیشتە بن دیواری بەغدادو داوای خۆبەدەستەوەدانی لەبەکر کرد. بەکر ملی نەدا.

شا عەباس لەهاوینی 1033 (1623)دا گەیشتە بەغداد. گەمارۆدانی بەغداد پێی نایە مانگی سێیەمەوەو، پارێزەرانی قەڵاو دیوارەکان ورەیان بەردا. محەمەدی کوڕی بەکر بەنهێنی لەگەڵ شا پێکهات شاری بەدەستەوە بدا بەو مەرجەی ژیانی بپارێزێ. شەوی 28ی تشرینی دوەمی 1623 سەربازی ئێرانی چونە ناو بەغدادەوەو، لەبەیانیدا لەمنارەو سەربانی شوێنە بەرزەکانەوە شەیپوری سەرکەوتنی شای ئێران لێ دار. بەکر گیراو بە بەرچاوی محەمەدی کوریەوە بەئەشکەنجە کوژرا. هەمو سەربازەکانی عوسمانیو ژمارەیەکی زۆر سوننە گیرانو، دەوڵەمەندەکان خرانە ژێر ئەشکەنجەوە. شا ئەیویست هیچ سوننەیەک بەزیندویەتی نەمێنێ. گۆڕخانەکانی ئەبو حەنیفەو شێخ عەبدولقادری گەیلانی روخێنرانو، زۆری مزگەوتو قوتابخانەکان کرانە تەویلە. بەهەزاران ژنو منالّ بەدیلی نێردرانەوە ئێرانو فرۆشرانو، جارێکیکە وڵاتەکەی خۆیان نەبینیەوە.

شا عەباس دوای ئەوەی زیارەتی پیرۆزگاکانی کردو، سەفیقولی خانی بەحاکمی بەغداد دانا، خۆی گەڕایەوە ئێرانو، قەرچغای خان چوە سەر ولایەتەکانی موسڵو شارەزور، ئەوێشیان گرت. (لۆنگریک: 76-80).

هەندێ لەمێژونوسەکانی ئەردەڵان عاتیفە هەڵی گرتونو، ئەم سەرکەوتنە جەنگیە: گرتنی بەغدادو کەرکوکو موسڵیان، بەپاڵ خان ئەحمەد خان داوە. (لب: 60-61)، (مستورە: 57-58)، (حدیقە: 133)، (تحفە: 116-117) بێگومان خان ئەحمەد خان لە لەشکرکێشیەکانی ئێراندا بۆ سەر عیراق بەشداریەکی کاریگەری کردوەو، بەسوپای کوردستانەوە لەو لەشکرەدا کە بەسەرکردایەتی شا عەباس شاری بەغدادی گرتو، لەو لەشکرەدا کە بەسەرکردایەتی قەرچغای خان موسڵو کەرکوکی گرت. بەشدار بوە. (عالم ارا: 1002-1006) بەڵام ئەخان ئەحمەد بەتەنیا قارەمانی ئەم سەرکەوتنە بوەو ئەهێزەکەیشی هێزی سەرەکی شەڕەکان بوە، ئەمیش یەکێ بوە لەو سەدان میرو سەردارانەی کە لەسەرانسەری ئێرانەوە لەگەڵ شا عەباس هات بون بۆ گرتنی بەغداد، هێزەکەیشی جۆگەیەکی بچوکی دەریای ئەو لەشکرە گەورەیە بوە.

**-5-**

مێژونوسەکانی ئەردەڵان درێژە بە لەشکرکێشیەکانی خان ئەحمەد خان ئەدەنو ئەڵێن: چوە سەر رەواندز، حەریر، کۆیە، ئامێدیو، بۆ هەر یەکێ لەم شارانە حاکمێکی لەبنئامۆزاکانی: کوڕو نەوەکانی بارام بەگی کوڕی سورخاب بەگ، کە کەشمەکەشی رۆژگار بێدەسەڵاتی کردبون. دانا. هەروەها موسڵی گرتو چوە سەر یەزیدیەکان کوشتاری زۆری لێ کردنو تاڵانی کردن. ئەم سەفەرە وەکو (لب: 61) ئەڵێ: 7 ساڵو 3 مانگی خایاندوە.

هەرچەندە ئەم هەواڵانە زۆریان پێوە نراوە. بەڵام ئەبێ لەو ساڵانەدا بوبێ. کەبەغدادو موسڵو کەرکوک گیراوەو، دەسەڵاتی عوسمانی لەعیراقدا نەماوەو، عیراق بۆتە بەشێکی قەڵەمرەوی ئیمپراتوریەتی فراوانی سەفەوی. لەو ساڵانەدا خان ئەحمەد خان جگە لەوەی والی ئەردەڵان بوە. بەگلەربەگی شارەزوریش بوە. قەڵەمرەوی ئەردەڵان لەهیچ سەردەمێک دا، نە پێش ئەمو نە دوای ئەم. بەئەندازەی ئەم سەردەمەی خان ئەحمەد خان فراوان نەبوە.

## -6-

خان ئەحمەدخان ساڵانی 1039-1040 تووشی نەخۆشی ئەقڵیی بوە. نەخۆشینەکەی ئەوەندە سەخت بوە، گەورەپیاوانی ئەردەڵان ناچار بون لەژورێکی تەنیادا بەزنجیرکراوی زیندانیی بکەن. (عالم ارا)یش لەڕوداوەکانی ساڵی 1039 دا، لەم بارەیەوە ئەڵێ: "خان ئەحمەدخان، کە لەخاسانی حەریمی عیزەتو پەروەردەکراوەکانی ئەم دەوڵەتە بو... بەپێی فەرمانی شا، والیی کوێلێگیراوی تایەفەکانی ئەردەڵان بو.. لەم کاتەدا تووشی نەخۆشینێبو نەیئەتوانی کاروباری وڵات بەڕێوە بباتْ، لەبەر ئەوەی پشت بەمیر مەئمونی برای نەئەبەستراو، گومانی لێ ئەکرا بیکوژێ، کاربەدەستانی دەوڵەت بەچاکیان نەزانی لەوێ بمێنێتەوە، هێنایانە دەربار بۆ ئەوەی پزیشکەکانی شا تیماری بکەن".

نەخۆش کەوتنی خان ئەحمەدخان هاوزەمان بوە لەگەڵ چەند ڕوداوی گرنگدا: مردنی شا عەباس (1039) و هاتنی شا سەفی بۆ سەر تەختو، هێرشی گەورەو فراوانی خوسرەو پاشای سەرداری عوسمانی بۆ سەر موسڵو شارەزورو ئەردەڵانو هەمەدان.

## -7-

### داگیرکردنی ئەردەڵان

عێراقو پیرۆزگاکانی بۆ دەوڵەتی عوسمانی گرنگیەکی گەورەی هەبو، بەتایبەتی لەڕوی مەعنەویەوە. لەبەر ئەوە نەیئەتوانی وازی لێبهێنێ. چەند جارێ لەشکری ناردە سەری سەرکەوتو نەبو.

(لۆنگریک: 87-90) بەپارمەتی سەرچاوە عوسمانیەکان دەنگوباسیلەشکرکێشیەکی گەورەی عوسمانی بۆ سەر مەڵبەندی ئەردەڵان ئەگێڕێتەوە، کەخوسرەو بەگو مەستورە لێی بێدەنگ بونو، (حدیقە) و (تحفە)یش بردویانەتە سەردەمی حوکمڕانی سلێمان خانی کوڕی عەلەمەدین.

خوسرەو پاشا، لەئاپاری 1629 (1039)دا، بە لەشکرێکی گەورەوە بەرەو عێراق بۆ ئازادکردنی بەغداد کەوتە ڕێ. بەسەر قۆنیەو حەڵەبو دیاربەکردا گەیشتە موسڵ. ئەو وەرزەی ساڵ زۆر سەخت بو. لەهەندێ شوێن بەفری زۆرو لەناوەڕاستی عێراقدا بارانێکی زۆر باری. پیرەکانی وڵات بەدرێژایی تەمەنیان بارانی وا زۆریان لەموسڵ نەدی بو. ڕێگەوبانەکان هەموی بوبون بەقوڕو چڵپاو. لەبەر ئەوە پەلاماردانی بەغدادیان لەو هەلومەرجەدا بەباش نەزانی.

هێزەکە لەزێی گەورە پەڕییەوە بەنیازی ئەوەی پەلاماری خواروی عێراقو ڕۆژهەڵات بدا. لەنزیک هەولێر ئەنجومەنێکی جەنگییان بەست. حاکمە ئێرانیەکانی هەولێرو کەرکوک هەڵاتن بۆ بەغداد. هەمو سەرکردەکانی سوپاو سەرۆکی تیمارەکانو بەگەکانی کوردو شێخەکانی عەرەب، لەم ئەنجومەنەدا، بەشدار بون. دەرکەوت هێرش بەرەو خواروی عێراق، بەهۆی قوڕو چڵپاوی ڕێگەو مەترسی گوشاری دوژمنانەی ئەردەڵان لەپشتەوە، لەکردن نایەت. بڕیار درا یەکەمین هێرش بۆ سەر شارەزور بکرێ، بۆ پاککردنەوەی لەلایەنگرانی ئێران.

ئەو کاتە هێشتا خان ئەحمەدخان والی ئەردەڵانو بەندەی دڵسۆزی شا بو. بەڵام خۆی نەخۆشو لەناو خزمەکانیشیدا زۆری تێدا بو لایەنگری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی سوننە بون. کەئۆردوی ڕۆم لەکەرکوکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات کشا زۆر لەبەگەکانی ئەردەڵانو 20 خانی کورد بۆ دەسماچکردنی وەزیر ئامادە بون.

سوپای عوسمانی لەبەردەم تولەڕێی شاخەکانی هەورامانـدا لە گوڵەنبەر (خورماڵ) ڕاوەستاو. سەرکردەکانی ئەنجومەنێکی جەنگیی گرنگیان بەست. بڕیاریاندا ئەو قەڵا کۆنە ئاوا بکەنەوە، کەسوڵتان

سلێمانی قانونی کاتی خۆی لەسەر سنور دروستی کردبو. دوای ئەو شا عەباس روخاندبوی. پاش 7 حەفتە کاری سەخت قەڵاکەیان دروست کردەوە. ئینجا خوسرەو پاشا پێشەنگی هێزەکانی ناردە سەر وڵاتی ئەردەلان. یەکەم ئامانجیان قەڵای مەریوان بو. گرتیانو هێزێکی پارێزگارییان لێدانا. هێشتا هێزی سەرەکی عوسمانی لەشارەزور چاوەروان بو. زەینەڵ خانی شاملو، سەرکردەی گشتی هێزەکانی ئێران، لەهەمەدانەوە بەخێرایی جمی، بەتەمابو راستەوخۆ هەڵ بکوتێتە سەر شارەزور کەبنکەی ئۆردوی رۆمی لێبو. سوپای قزلباشو ئۆردوی رۆم لەدەشتی مەریوان بەرەنگای یەک بون. لەسوپای قزلباش چەند هەزار کەس کوژراو، زەینەڵ خان بەشکاوی گەرایەوە ئۆردوگای شا سەفی. شا لەسەر ئەم شکانە لەسەری زەینەڵ خانیداو، رۆستەم خانی لەجێگەی ئەو کردە سوپا سالار.

لۆنگریک نوسیوێتی کەخان ئەحمەدخان، لەم لەشکرکێشیەدا، لەگەڵ زەینەڵ خان بوە. ئەمە جێگەی گومانە، چونکە لەو کاتەدا باری تەندروستی خان ئەحمەد بەرادەیەک خراپ بوە تینو توانی بەشداری تێدا نەبوە. رەنگە ئەوەی بەشداربوە، سلێمان خانی کوڕی میر عەلەمەدین بوبێ، کەیەکێ لەنزیکەکانی شا سەفیو، دواتریش لەجێگەی خان ئەحمەدخان کراوە بەوالیی ئەردەلان. رەنگە هەر لەبەر ئەوەیش بێ نوسەرانی حدیقەو تحفە لەژیننامەی ئەودا گێراویانەتەوە.

دوای ئەم سەرکەوتنە خوسرەو پاشا چوە ناو خاکی ئەردەلانەوە. قەڵای حەسەناوای گرتو زۆری لێ کوشتنو تاڵانی کرد. لەحوزەیرانی 1630 (1040)دا گەیشتە هەمەدان. 6 رۆژ کوشتاریان تێدا کردو شارەکەیان تاڵانو وێران کردو گەیشتنە دەرگەزێنو ئەوێشیان وێران کرد.

لەئەنجومەنێکی جەنگیدا، سەرکردەکانی ئۆردوی عوسمانی بریاریاندا بەرەو بەغداد بگەرێنەوە، بەتایبەتی ئیتر کەهاوینیش داهات بو. ئەو وەرزەی عیراق لەباربو بۆ لەشکرکێشی. ئۆردوی رۆم روی بەرەو رۆژئاوا وەرگێرا. بەلورستاندا گەرایەوە دەشتی دیالەو، لەتشرینی دوەمدا دەوری بەغدادی دا. گەمارۆدانەکە سەرکەوتو نەبو. خوسرەو پاشا بریاری کشانەوەیدا لەرۆژانی یەکەمی 1631دا گەیشتە موسڵ.

—8—

ساڵی 1041 خان ئەحمەدخان لەنەخۆشینەکەی هەستایەوەو. هەر ئەو ساڵە بەهێزێکی ئێرانیەوە بەرەو شارەزور بەرێ کەوتو، هێزەکانی ئەردەلانیش دایانە پاڵی. هەمو ئەو شوێنو قەڵایانەی شارەزوری گرتەوە، کەساڵی پێشو لەشکری عوسمانی گرتبونی. ناوچەکە هاتەوە ژێردەستی خۆی. 5 لەو پاشایانەی لەم ناوچەیەدا دانرابونو، خان ئەحمەدخان لەم هێرشەدا راوی نابون. هەڵاتن بۆ موسڵ. لەسەر ئەم هەڵاتنە هەر پێنچیان کوشتن. (ذیل عالم ارا: 59)، (لۆنگریک: 90).

—9—

### سەرەنجامی خان ئەحمەدخان

سورخابی کوڕی خان ئەحمەدخان، کەوەکو (ذیل شرفنامە: 19) ئەڵێ: "کەبنەچەکەی دەگەرایەوە بۆ پەردەنشینانی حەرەمسەرای شاهی"، لەزەمانی شا عەباسەوە لەئەسفەهان لەدەرباری سەفەویدا بۆ پەروەردەکردن راگیرابو. شا سەفی دڵی لێ پیس کردو چاوی دەرهێنا. ئەم هەواڵە خان ئەحمەدخانی هەژاند. بەقسەی (ذیل عالم ارا: 189): ساڵی 1046 لەئێران هەڵگەرایەوەو پەنای بۆ دەوڵەتی عوسمانی برد.

لەو کاتەدا لەنێوان رۆمو عەجەمدا هێشتا بارودۆخی جەنگ بەردەوام بو. هێزێکیان بۆ یارمەتیدانێدا بەخان ئەحمەدخان. هێزێکی ئێرانی لەدەشتی مەریوان هاتە سەر ئەم هێزەی لەگەڵ خان ئەحمەدخان بو. شەڕ

بەقازانجی ئێران بەلادا کەوت. لەشکری ڕۆمو خان ئەحمەدخان شکان (1046). خان ئەحمەدخان بەشکاوی کشایەوەو چوە موسڵ. هەر لەو ساڵەدا لەتەمەنی 44 ساڵیدا بەئاوارەیی لەموسڵ جوانەمەرگو لەنەبی یونس بەخاک سپێردرا. (لب: 63-66).

بەم پێیە ئەو هەواڵەی (حدیقە: 134) و (تحفە:120) ئەیگێڕنەوە، کەگوایە: خان ئەحمەدخان، کرماشان، هەمەدان، ورمێی هێناوەتە ژێر دەستی خۆیو، حاکمەکانی قزلباشی لێ دەرکردنو هی خۆی لەجێگە داناونو، سوڵتانی عوسمانیش ولایەتەکانی موسڵو کەرکوکی پێ بەخشیوە. ماوەی 7 ساڵ بەسەربەخۆیی حوکمڕانی کردوەو. لەمینبەری مزگەوتەکاندا خوتبە بەناوی ئەمەوە خوێندراوەتەوەو سکەی پارەی بەناوی خۆیەوە لێ داوە... لەهیچ سەرچاوەیەکدا، تەنانەت لەمێژووەکانی خوسرەو بەگو مەستورەیشدا، پشتیوانی لەم چیرۆکانە نەکراوە، لەبەر ئەوە دور نیە هەڵبەستی خەیاڵی خۆیان بێ.

# محەمەدخان کوڕی خوسرەوخان
# (1113–1105)

–1–

ئەگەرچی خوسرەوخانی باوکی بەفەرمانی شا سلێمان کوژرابو. بەڵام خۆی لەدەزگای سەفەویدا لەئەسفەهان مابوەوە. شا سوڵتان حسێن، کەهاتە سەر تەخت، محەمەدخانی لەجێگەی خان ئەحمەدخان کرد بەوالیو ڕەوانەی کوردستانی کردەوە.

–2–

**ڕوزانەوەی میرایەتی بابان**

لەسەردەمی ئەمدا، میرایەتی بابان، سەرلەنوێ بوژایەوەو، وەکو هێزێکی کاریگەر لەڕوداوەکانی ناوچەکەدا هاتە مەیدانەوە. سلێمان بەبە، ناوچەکانی مەرگە، شاربازێڕ، قەرەداخی هێنابوە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو، هێزێکی گەورەو دەزگایەکی زلی پێکەوە نابو. لەو ماوەیەدا قاتوقڕیو برسێتیەکی کوشندە لەبەغداد بڵاوبوەوە. سلێمان بەبە لەگەڵ دلاوەری، موتەسەڕیفی شارەزوردا بو بەشەڕی، دلاوەر کوژراو، سلێمان بەبە کەرکوکی گرت، کەناوەندی ولایەتی شارەزور بو. والی بەغداد بەگفتو گەف ویستی بیهێنێتەوە ژێربارى فەرمانبەری، کەڵکی نەبو. هێزی ناردە سەری ئەویش چاری نەکرد.

–3–

لەهەوڵی فراوانخوازیدا. سلێمان پەلاماری قەڵەمڕەوی ئەردەڵانیدا. هەورامان، مەریوان، بانە، سەقزی گرت. محەمەدخان چاری هێرشی سلێمان بەبەی پێ نەکرا. شا سوڵتان حسێنی سەفەوی نامەی شکاتی بۆ سوڵتانی عوسمانی ناردو، لەهەمان کاتدا لەشکرێکی گەورەی بەسەرکردایەتی عەباسقولی خانی زیادئۆغڵی قاجار ناردە سەری. لەدەشتی مەریوان لێکیاندا. دوای شەڕێکی خوێناوی سەرداری قزلباش سەرکەوتو،

سلێمان بەبە بەتێشکاوی کشایەوە. (لب: 74) ئەم هێرشەی سلێمان بۆ بەهۆی هەڵتەکاندنی دەسەڵاتی محەمەدخانو. دورخستنەوەی میرەکانی ئەردەڵان. تا چەندین ساڵ، لەکاروباری کوردستان.

—4—

**ئەنجامەکانی شەڕی مەریوان (1111)**

میر سلێمان، میری بابان بەشێکی وڵاتی ئەردەڵانی گرت. لەو کاتەدا محەمەدخانی کوڕی خوسرەوخان والیی ئەردەڵان بو. والی خۆی بەرگەی ئەم هێرشەی نەگرت. شا سوڵتان حسێنی سەفەوی، لەلایەکەوە نامەی شکاتی بۆ سوڵتانی عوسمانی ناردو داوای سزادانی میری بابانی کردو، لەلایەکی ترەوە لەشکرێکی گەورەی بەسەرکردایەتی عەباسقولیخانی قاجار نارده سەری. لەدەشتی مەریوان شەڕێکی قورس لەنێوان لەشکری بابانو سەفەویدا قەوما. لەشکری بابان شکا. ئەم شەڕە دو ئەنجامی بەدوی خۆیدا هێنا:

یەکەمیان. ئێران قەتڵوعامی کوردەکانی ئەردەڵانو، عوسمانی قەتڵوعامی کوردەکانی بابانی کرد.

"قاسم سوڵتانی هەورامی بەعەباس خانی سەردار ڕاگەیەنێ کەمحەمەدخانی والیو ئەهالی کوردستان لەگەڵ سلێمان پاشای بەبە هەم بەیعەتو هەم داستان بون. سەردار حوکمی کوشتنی ئەهالی کوردستان دەرئەکا. منارەیەک لەکەللەی سەرەکانیان دروست ئەکەنو سەری قاسم سوڵتانیش لەسەرو هەمو سەرەکانەوە دائەنێن. من حفر بئرا لاخیه فقد وقع فیه" (لب: 76)، (مستورە: 76-77) و، بەقسەی (تحفە) و (حدیقە) لەسەر ئەم دوزمانیە، سەرداری لەشکری سەفەوی، 1 هەزارو 5 سەد کەسی لێ کوشتنو، منارەیەکی لەکەللەی سەریان دروست کرد.

بەڵام بەپێچەوانەی قسەکانی (لب: 76) کەئەڵێ: سلێمان بەبە (لەگەڵ تاقمێکی کەم هەڵاتو ڕەوانەی ئەستەموڵ کرا"، یان قسەکانی (مستورە: 77) کەئەڵێ: "سلێمان پاشای بابان کە لەهەردو دەوڵەت یاخی بیو پاش وتوێژ لەگەڵ والیی بەغدا چارەنوسی خۆی لەوەدا دیت، کەعوزر بۆ دەرباری عوسمانی بێنێتەوەو لێیان نزیک بکەوێتەوە." یان (لۆنگریک: 106) کەئەڵێ: "لەئەستەموڵ بەخۆشیەوە پێشوازی لێ کرا..". یان (زکی، تاریخ السلیمانیه: 63-64) کەئەڵێ: "کرا بەحاکمی ئەدرنە". بەڵکو وەکو (هامەر پورگشتال: 4/ 2883) نوسیویتی: "لەزەمانی حکومەتی حەسەن پاشادا... بەیارمەتی پاشاکانی حەڵەبو دیاربەکر شکێنراو، لەگەڵ 17 بەگی کوردا کە لەیارانو یاوەرانی ئەو بون، کوژرا...".

دوەمیان، لەهەردو ئەمارەتدا تا چەند ساڵێ دەسەڵات لەم لا لەدەست بنەماڵەی ئەردەڵانو لەولا لەدەس بنەماڵەی بابان دەرچو.

لەم ڕوداوانەدا محەمەدخانی ئەردەڵان لێخرا. ئاخۆ ئەویش کوژراوە یان دور خراوەتەوە، مێژوەکانی ئەردەڵان، جگە لە (لب: 77) کەئەڵێ تا ساڵی 1113 والی بوە، ئەوانیتر لەو بارەیەوە هیچ زانیاریەک بەدەستەوە نادەن. بەڵام دەرباری سەفەوی دوای ئەوە تا ماوەیەک ئیتر ڕاستەوخۆ حاکمی بۆ کوردستان داناوە. بەڕێز محەمەدخانی گورجی (1113-1116)، حەسەنعەلیخانی ئیعتیمادەل دەولە (1116-1118)، ئینجا حسەینعەلیخانی برای (1118-1119)، ئەنجا کەیخوسرەو بەگ (1119-1121) کراون بەحوکمڕانی کوردستان. (مستورە: 79)، (تحفە: 128-130).

لەو لایش میرایەتی بابان لەو پەڕی نائارامیدا دابەش بوبو، ماوەی چەند ساڵێ "موتەسەللیم"ی تورک ڕاستەوخۆ بەڕێوەیان ئەبرد، تا خانە پاشا، لەسییەکانی ئەو چەرخەدا، هاتەوە مەیدان. (العزاوی: 5/ 191)، (لۆنگریک: 157).

**تێبینی:** بۆ درێژەی ئەم شەڕە بڕوانە: (نیل: 22)، (لب: 74-76)، (مستورە: 75-77)، (تحفە: 127)، (حدیقە: 141)، (دوائی: 129-130)، (لۆنگریک: 105)، (امین زکی، تاریخ السلیمانیه: 62).

# بنیاتنانی شاری سنه

## سلێمان خان کوڕی عەلەمەدین (1046–1066)

–1–

کەخان ئەحمەدخان لەدەرباری سەفەوی هەڵگەڕایەوەو پەنای بۆ رۆم برد، شا سەفی (1039-1052)، سلێمان خانی کوڕی میر عەلەمەدینی لەجێکرد بەوالیی ئەردەڵان. میـر عەلەمـەدینی بـاوکی، لەسـەردەمی خـان ئەحمەدخان دا پەنای بۆ رۆم بردبو. بـەڵام بەنائومێـدی لـەوێ مردبـو، ئـەو کاتـە سـلێمان خـان لەگـەڵ خـان ئەحمەدخان دا بەشداری شەڕو لەشکرکێشیەکانی بو. سلێمان خان ئازاو لێوەشاوەبو. خان ئەحمـەدخان سـڵی لێئەکرد، ویستی لەناوی بەرێ. سلێمان لەخۆی ترساو هەڵات. پەنای بۆ دەربـاری شـا سـەفی بـرد. لـەپێشدا گوێی پێ نەدراو ژیانێکی ناخۆشی بەسەر ئەبرد. تا شا سەفی بەلەشکرەوە بۆ شەڕی عوسـمانی چـوە سـەر قەڵای ئێرەوان. سلێمان لەم شەڕەدا ئازایەتی نواند. ئەمە بو بەهۆی نزیککەوتنـەوەی لـەدەرگای سـەفەوی. کـە خان ئەحمەدخان لێخرا، شا سەفی ئەمی نارد بۆ کوردستان.

–2–

**بنیاتنانی سنه**

سـلێمان بـەڵێنی بـە شـا دابـو، "دارولمـولکی کوردسـتان" بگوێزێتـەوە. سـاڵی 1046 هـەمان سـاڵی دەسپێکردنی حوکمڕانی خۆیو. تێشکانی خان ئەحمەدخانو مردنـی. لەسـەر گردێـک لەجێگایـەکدا کـەناوی "سینە" بو قەڵایەکی قایمی دروست کرد. خانو و حەمامو مزگەوتو بازاڕی تێدا بنیات نا. چەنـد جۆگەیـەکی لەدەشتی سەرنوێی رۆژئاوای سنەوە راکێشاو، بە 3 حوشترگەرو ئاوەکەی بۆ ناو قەڵا سەرخست. قـەڵاکانی زەڵم، حەسەناوا، پڵنگانی روخاندو، "دارولحکومە"ی ئەردەڵانی گوێزایەوە قەڵای تـازە. کـە لـەناو خـەڵکدا بـە سنە ناوی دەرکرد. (لب 67-69)، (مستورە: 64-66)، (حدیقە: 136-137).

مێژونوسەکانی ئەردەلان ئەڵێن نیاز لەروخاندنی قەلاکانی زەڵم، حەسەناوا، پڵنگان، ئەوە بوە کەئیتر هیچکام لەمیرەکانی ئەردەلان نەتوانن لەکاتی سەرپێچیو یاخی بونیا لەشاکانی ئێران خۆیانی تێیا قایم بکەن. رەنگە ئەمە هۆیەک بێ، بەلام هۆی لەمە گرنگتر ئەوەبوە: میرەکانی ئەردەلان ویستویانە بنکەی ئەمارەتەکەیان لەسنوری دەسەلاتی دەولەتی عوسمانیو دەستدرێژیەکانی پاشەرۆژی دور بخەنەوە. بەتایبەتی دوای ئەوەی شارەزور، شارباژێر، قەرەداغ لەسنوری قەڵەمرەوی ئەمانیا نەماو، کەوتە سنوری دەولەتی عوسمانیەوە، ئیتر ئەم قەلایانە هەمو کەوتبونە سەر سنورو، بەئاسانی لەشکری دوژمن ئەگەیشتە سەریان.

گوێزانەوەی میرەکانی ئەردەلان لەقەلایەکەوە بۆ قەلایەکیتر، پێوەندی بەخۆشیو ناخۆشیی ناو هەواو، هەژارییو دەولەمەندیی ناوچەکەو، هاتوچۆی بازرگانیو، کاروباری رۆشنبیرییەوە نەبوە، بەڵکو هۆی بڕیاردەر لەپلەی یەکەم دا، هەمیشە ئاسایش بوە. دروستکردنی شاری سنەیش هەر لەبەر هۆی ستراتیجی-جەنگیی بوە.

سنە بەدرێژایی چەند قەرن، جگە لەوەی ناوەندی دەسەلاتی والیەکانی ئەردەلان بو، بو بەمەڵبەندێکی گرنگی شارستانی، خوێندەواری، رۆشنبیریو بازرگانی.

## —3—

### گرتنەوەی بەغدادو پەیمانی زەهاو

سوڵتان مرادی عوسمانی لەشکرێکی گەورەی سازداو خۆی لەگەڵی بەرێ کەوت بۆ گرتنەوەی بەغداد. شا سەفەوی کابرایەکی لاوازو زۆرتر خەریکی رابواردنو خۆشگوزەرانی بو، تا دەولەتداریو لەشکرکێشی. دوای گیرانی بەغداد گفتوگۆی لەگەڵ سولتانی عوسمانی دەس پێکرد. ئەم گفتوگۆیانە سالی 1049، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیە ئەرزی، دینی، سیاسیەکانیان، بە بەستنی"پەیمانی زەهاو" کۆتایی هات. کەگرنگترینی هەمو ئەو پەیمانو رێککەوتنانە بو، کە تا ئەو کاتە لەنێوان ئەم دو دەولەتەدا بەسترابون. بەپێی ئەم پەیمانە:

سنوری نێوان هەردو دەولەتی لەقافقاسەوە تا سەروی خەلیج: لەئاخسقە، قارس، وان، شارەزور، بەغداد، بەسرە، دیاری کرد. لەم دابەشکردنەدا: مەریوان، قەلای مەریوان، دەرەتەنگ، لەگەڵ هۆزەکانی پیرەو زەردویی بەر ئێران کەوت. بەدرە، جەسسان، مەندەلی، سەرمیل، درنە، قەلای زەڵم، قزڵجە، سەرچاوەی چەمی چەقان لەگەڵ هۆزەکانی زیادییو هارونی لەئێلی جاف بەر عوسمانی کەوتن.

ئێران بەڵێنیدا ئیتر لەمینبەری مزگەوتەکانەوە واز لەسوکایەتی بەخەلیفەکانی راشیدینو سەحابەکانی پێغەمبەر بهێنێو، عوسمانی بەڵێنیدا کەرەفتاری باش لەگەڵ زائیرانی پیرۆزگاکانی عیراقو، حاجییانی ئێرانی بکرێ.

هەردولا بەڵێنیان بەیەکتریدا کەدالدەی راکردوانی یەکتری نەدەن. (الراوی: 211-216) (پارسادوست: 45).

## —4—

### سەرەنجامی سلێمان خان

سلێمان خان هەتا سەر نەیتوانی لەو شارەدا بژی کەخۆی بنیاتی نابو. دوای ئەوەی سوڵتان مراد هێرشی کرد بۆ سەر بەغدادو گرتی. خوسرەو پاشا بەلەشکرێکی گەورەوە پەلاماری شارەزوریدا. شارەزور، قەرەداغ، قزڵجە، شارباژێری گرتو چوە مەریوانەوە. وەکو (مەستورە: 66) ئەڵێ: "... لەبەرئەوەی کەسنورەکانی بەدەست رۆمەوە بونو سلێمان خان توانستی ئەوەی نەبو بەرەنگاریان بێتەوە، شا سەفی لێی بەگومان کەوت، بۆ ئەسفەهانی بانگ کردو لەوێ هێشتەوەو نەی هێشت جارێکی دیکە بۆ کوردستان بگەرێتەوە، هەر لەوێ مایەوە تا فەرمانی خودای بەجێ هێنا".

## -5-

### کەلبعەلی خانی کوڕی سلێمان (1060)

سلێمان کە لەئەسفەهان مرد، مورید سوڵتانی کەڵوڕ سەرپەرشتیکەری کاروبارەکانی بو. پیاوێکی تێگەیشتوی زیرەکو، لەدەرباری شادا دەسرۆیشتو بو. لە لای شا تێکەوت موڵکەکانی بەسەر منداڵەکانیدا دابەش بکا. شا رازی بو:

کەلبعەلی خان لەسنەو، خوسرەو خان لەمەریوانو، زۆراب سوڵتانی کوڕی کەلبعەلی خان لەسیاکێو و، مورید سوڵتان لەپڵنگان. دانران. هەورامان بەیەکێ لەسانەکانی خۆیو. نێلی جافو جوانرۆیش بەیەکێ لەگەورەکانیان سپێردرا.

## -6-

### خان ئەحمەد خانی دوەم، کوڕی کەلبعەلی خان

کەباوکی مرد ئەم لەجێگەی بو بەفەرمانڕەوای ئەردەلان. بەپێچەوانەی باوکیەوە ئەم کابرایەکی دەسبڵاو بو. زۆرتر لەوەی خەریکی کاروباری وڵاتەکەی بێ، خەریکی خۆشگوزەرانیو رابواردنو راووشکار بو. لەبەر ئەوەی لەدەسبڵاویدا بێ حساب بو، ناویان نابو خانە زێڕینە.

خوسرەو خانی مامی، کەحاکمی مەریوان بو، لای شا سلێمان زمانی لێداو بۆی تێچاند. شا سلێمان، فەرمانی لێخستنی خان ئەحمەدو دانانی خوسرەو خانی بەوالیی ئەردەلان دەرکرد. خوسرەو خان لەمەریوانەوە بەخێرایی بەرێ کەوتو لەناکاو دای بەسەر خان ئەحمەدخان دا لەسنەو گرتی. بەزنجیرکراوی رەوانەی ئەسفەهانی کرد.

## -7-

### خوسرەو خانی یەکەم، کوڕی سلێمان خان (1089-1093)

(مستورە: 71) لەباسی خوسرەو خاندا دەڵێ: "کاتێ لەساڵی 1089دا خوسرەو خان چوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، بەئازارو ئەشکەنجەدانو ستەمکاری گیانی خەڵکی هێنایە کونەلوتیانو دەروی هەمو بژێو و گوزەرانو بەرێوەچونێکی لەهەژارو دەستەوسانان پێوە داو. بناغەی زوڵمو زۆری دامەزراندو چەسپاند. بانگی دەستدرێژیو ستەمکاریی بەگوێی ژێردەستیاندا راهێشتو سامانێکی. خان ئەحمەدخانی برازای لەسەروبەندی فەرمانڕەواییدا بەخەڵکی کوردستانی بەخشی بو. بەشەقو تێهەڵدانو ریسواکردنو هەزار چەرمەسەرێ لێی سەندنەوە. بەدئاکاریو بەدزمانیی بەئەندازەیێ گەیاند دڕندە بەدڕندەیی خۆی نەی گەیشتویەتێ. گەورەو پچوک گیانیان هاتە کونە لوتیان. ناچار سکاڵاو گلەو گازنیان بردە بەر دەرباری سەفەوی".

شا سلێمان لەئەسفەهان لەباتی ئەوەی دادیان بپرسێ، ئاشتی کردنەوەو رەوانەی کوردستانی کردنەوە. دوای گەڕانەوەی لەجاران خراپتر کەوتە ئازاردانو چەوساندنەوەی خەڵک. ئەمجارەیش بۆ دەربڕینی سکاڵا خەڵکی زۆرلێکراو رویان کردەوە دەرباری سەفەوی. لەکاتێکدا ئەمانە لەقوشخانەی شادا مانیان گرت بو. بۆ ئەوەی لەهەلێک دا شا ببینن و سکاڵای خۆیانی لەلا بکەن. خوسرەو خانو دەسوپێوەندەکانی هەڵیان کوتایە سەریانو هەندێکیان بریندار کردن. شا لەم دەستدرێژیە زۆر تورەبو. فەرمانیدا خوسرەو خانیان گرتو لەمەیدانی شاهیدا لەئەسفەهان کوشتیان (1093). (لب: 73)، (مستورە: 72)

## -8-

### تەیمورخانی ئاجورلو (1093–1099)

پێ ئەچێ شا لەم شکاتو شکاتکاریو ناڵوگۆڕە بێزار بوبێ. یەکێ لەباوەڕپێکراوانی خۆی دانا بەکاربەدەستی ئەردەڵان. 6 ساڵ مایەوە. مێژونوسەکانی ئەردەڵان بەچاکە باسی ئەکەنو، سەردەمی ئەم، بەپێچەوانەی خانەکانی ئەردەڵانەوە، سەردەمی ئاسایشی سەرو سامانو بوژانەوەی خەڵکی وڵاتەکە بوە.

## -9-

### خان ئەحمەدخان، بۆ جاری دوەم (1099–1105)

خان ئەحمەدخان کەخوسرەوخان کاتی خۆی بەگیراوی ڕەوانەی ئەسفەهانی کردبو، ئەبێ لەئەسفەهان مابێتەوەو، چوبێتە دەزگای سەفەویەوە. شا دوبارە ئەمی دانایەوە بەوالی. بەڵام خوورەوشتی پێشوی نەگۆڕیو، لەسەر کەیفو ڕابواردن بەردەوام بو. (مستورە: 74) لەباسی خان ئەحمەدخاندا ئەڵێ: "دوبارە ملی لەڕابواردنو کەمتەرخەمی نایەوەو زۆری گوێ بەکاروباری وڵات نەداو زۆربەی کاتی بەڕاووشکارو خانوبەرە دروست کردنی بێ سودو نامەحکەم بەسەر برد... دەگێڕنەوە: کە زیاد لەسێ سەد کەس لەپیاوماقوڵانو گەورەو مەزنانی ئەیالەتی کوردستانی کردبو بەبازەوانو خوسرەو بەگی. کەیەکێ بو لەو بنەماڵەیەو هەمیشە بریکاربو، کرد بەمیرشکارو بێ لێبڕان خەریکی ڕاووشکار بو، ناو بەناویش حەزی لەگوڵ چاندن دەکردو بەم کارەوە خۆی خەریک دەکرد...".

کە شا سوڵتان حسێن (1106-1135) هاتە سەر تەخت ئەمی لابرد.

# عەباسقولی خان
# (1136–1122)

–1–

### هەرای ئەفغان

ساڵی 1120-1121 میروەیسی ئەفغانی غەلەجایی پەلاماری قەندەهاریدا گرتیو حاکمەکەی کوشت. قەندەهار لەژێر دەسەڵاتی سەفەوی دەرچو. دەرباری سەفەوی نەیتوانی بیهێنێتەوە ژێر باری فەرمانبەری. میروەیس مرد (1127) عەبدولعەزیزی برای جێگەی گرتەوە. عەبدولعەزیز ویستی سەرلەنوێ بچنەوە ژێر باری فەرمانبەریو گوێڕایەڵی شای سەفەوی، بەڵام مەحمودی کوڕی میروەیس مامی کوشتو، خۆی بو بەڕێبەری غەلەجایی. دەرباری سەفەوی چەندی هەوڵیدا شۆڕشەکەیان بکوژێنێتەوە کەڵکی نەبو. مەحمود بەرەو خوراسان بەڕێ کەوتو کرمانی گرت (1133) ئینجا بەرەو ئەسفەهانی پایتەختی سەفەوی بەڕێ کەوت. پاش گەمارۆدانێکی سەختی شەش مانگە، کەنزیکەی 80 هەزار کەسی لەبرسا تیدا مرد، شا سوڵتان حسێنێ سەفەوی خۆیو شارەکەی بەدەستەوەدا (1135) و. مەحمودی ئەفغانی چوە ئەسفەهانەوە. مەحمود توشی نەخۆشیەکی ئەقڵیی کوشندە بو. ئەشرەفی ئامۆزای لێی هەڵگەڕایەوەو. زیندانیی کردو. خۆی لەجێگەی ئەو بو بە شا(1137).

لەشکری عوسمانی بەسەرکردایەتی ئەحمەد پاشای والیی بەغداو لەشکری ئەفغانی بەسەرکردایەتی ئەشرەفی ئەفغانی لەنزیک هەمەدان لێکیاندا (1139). سەرەڕای نابەرامبەری نێوان ئەم دو هێزە. لەشکری عوسمانی شکستێکی گەورەی وای لێ قەوما، بابی عالی ناچار بو پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەشرەف بەست. هەلومەرجی میرایەتی ئەردەڵانیش بەهۆی ئەم روداوانەوە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا ئەهات.

**-2-**

## میرەکانی ئەردەڵان دێنەوە سەر کار

عەباسقولیخانی کوری محەمەدخان، کەماوەیەک لەدەزگای بەرێوەبەرایەتی سەفەویدا کاری کردبو، لەلایەن شا سوڵتان حسەینی سەفەویەوە دانرا بەوالیی ئەردەڵانو گەرایەوە کوردستان (1122-1129).

نوسەری (تحفە: 131) ئەڵێ: "لەساڵی 1121ی کۆچی عەباسقولی خان نەبیرەی خان ئەحمەدخان بەهەڵبژاردنی ئەهالی مەملەکەت دەستی بەسەر مەسنەدی دیالەتداگرت. ماوەیەک خەریکی رێکخستنی کاروباری ولایەتو راپەراندنی ئەرکەکانو دڵنەوایی رەعییەت بو، تا لەساڵی 1128ی کۆچیدا شاە سوڵتان حسێن، عەباسقولی خانی لەگەڵ لەشکری کوردستان دەفعی فیتنەی ئەفغانی ئەبدالی راسپارد بۆ داروڵمولکی قەندەهار. خانی ناوبراو بە 8 هەزار سوارەوە لەکوردستانەوە بەرەو جێگەی مەبەست بزوت کەچونە تاران نیشانەی ئاشکرای تێکچونی سەڵتەنەتی سوڵتان حسێن بینرا. سوارەکانی کوردستان لەعەباسقولی هەڵگەرانەوەو بەرەو کوردستان گەرانەوە. عەباسقولی خان بەتەنیا لەگەڵ چەند کەسێ لەهاورێکانی چو بۆ دەرباری شا سوڵتان حسێن. باسی خۆیو سوپاییەکانی عەرزی شا کردو، تاوانی ئەم جوڵانەوە وەحشیانەیەی خستە ئەستۆی عەلیقولی بەگی نەبیرەی کەلبعەلی خانی بەنی ئەردەڵان. شاریاری ئێران عەباسقولی خانی عەزلو حەبس کردو. هەمان عەلیقولی بەگی ئەناسراوی تاوان بەپاڵ دراوی کرد بەحاکمی کوردستان...".

شا لەباتی ئەوەی سزای عەلیقولی بدا، پێی وابو مادەم ئەو لەعەباسقولی بەتواناترەو توانیویەتی لەشکری کوردستانی لێ هەڵبگێرێتەوە. ئەوی لەجێگەی ئەم کرد بەوالیی ئەردەڵان (1129-1132). (لب: 80)، (مستورە: 82).

**-3-**

## عەلیقولی خان

عەلیقولی خان، یەکێ لەمیرە گۆشەگیرەکانی ئەردەڵان بو، لەدێی شەخەڵەی سەر بەناوچەی خورخورە بەهەژاری ئەژیا. دەستی کورتو کوزەرانی سەختو پیاوێکی بێ تەماع بو. زۆر جار کەپێیان ئەوت: "بۆ ناچی تۆیش، وەکو میرەکانی تری ئەردەڵان، هەوڵێ بدەی شتێ بۆ خۆت پێکەوە بنێی؟" لە وەڵام دا ئەیوت: "ئەگەر خوا بیدا لەشەخەڵەیش ئەیدا!" دوای ئەم روداوە قسەکەی عەلیقولی بو بەپەندو کەوتە سەر زار.

شای ئێرانو داوودەزگای حوکمرانیی سەفەوی لەو کاتەدا کەوت بوە بەر مەترسی هەرەشەی روخێنەری شۆرشی ئەفغان. پێ ئەچێ ئەمیش ئەرکە قورسەکانی شای ئێرانی پێ هەڵنەسوراپێ، نەی توانی بێ داواکانی جێبەجێ بکا. لەبەر ئەوە ئەمیشیان لابردو دیسان عەباسقولی خان گەرایەوە سەر کار (1132-1136).

**-4-**

نوسەری (ذیل شرفنامە: 22-23) ئەڵێ:

"لەساڵی 1134 ی کۆچیدا کاتێ مەحمودی ئەفغان گەیشتە ئیسفەهان، ئاڵۆزیو پشێوییەکی زۆر کەوتە کاری شاە سوڵتان حسێنو ناوچەی عیراقی عەجەمەوە. عەباسقولی خانی والی هەمو ئەو هێزو سوپایەی هەیبو و لەشەش هەزار کەس تێپەری دەکرد، بەسەرۆکایەتی ئەمیرێک لەئەمیرانی خۆی، تەرخانی یارمەتی شاە سوڵتان حوسەین کردو بەرەو ئیسفەهانی ناردن.

کاتێ سوپای ئەردەڵان گەیشتە مەنزڵی "سیاە چاڵ" کە دو قۆناغ لەئیسفەهانەوە دورە، مەحمودی ئەفغان، هەواڵی پێ گەیشتو ئەشرەفی خزمی خۆی کەدوای ئەو بو بەجێنشینو ناوی ئەشرەف شاهی لێ نرا، بەحەوت هەشت هەزار سوارەی ئەفغانیەوە نارده شەڕی قشونی ئەردەڵان.

هەردو لەشکر لەمەنزڵی سیاە چاڵ بەگژیەکدا چونو هەر لەرۆژهەڵاتەوە تا نزیک ئێواری شەڕو گەڕیان درێژەی کێشا. شیرو نێزەو چەکی کوشندەی شەڕو لێدانیان بەنیازی گرتنی کوردستان لەبابانەوە جوڵاو، گەیشتە سنوری مەریوان. کەسێ بەرەنگاریو پێشگیری لێ نەکرد. ئەشراری مەریوانو هەورامانو دێهاتەکانی سەرەڕێ رویان لەحاکمی خۆیان وەرگێڕاو بونە هاوڕێو هاوداستانی لەشکرەکەی خانە پاشای بابان. خانە پاشا بەهێزبو بێباکانە تا پێنج فرسەخی سنە هات. ئەم هەواڵە بەعەلیقولی خان گەیشت لەم روداوە خزمو بێگانە هەراسو لەکاری خۆی سەری سوڕما بەم جۆرە توانای بەرهەڵستی لەخۆیدا نەدی ناچار بۆ ئەسفەهان هەڵات. گەورەو سەروەرەکانی سنە لەبینینی ئەم روداوانە بۆ پارێزگاری گیانو ماڵی خۆیان سەری گوێڕایەڵییان بۆ دانەواندو پێشوازییان کردو بەرێزەوە هێنایانە ناو شار. لەساڵی 1132ی کۆچیدا خانە پاشا بەبێ شەڕو کوشتار کوردستانی گرت لەسنوری کەرکوکەوە تا هەمەدانی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە..".

—5—

**سەرەنجامی عەباسقولی خان**

(مستورە: 88-89) ئەڵێ: "لەم سەروبەندەدا ئەفغانییەکان پترییان پێداگرتو دایانە سەرەڕۆییو بەجارێ ئێرانیان داگیرو شا سوڵتان حوسەینیان لەتیغی بێ دادی کێشاو کوشتیانو لەوڵاتی فارسو عیراقو خۆراساندا بون بەفەرمانڕەوا. سەرۆکەکانی سوپاو پاشا عوسمانیەکان کە لەسەر سنورەکانی ئێرانەوە نزیک بونو بەدەسەڵات بون، لەدەرباری عوسمانییان راگەیاند، کەئێران بەجارێ وێران بوەو بێشەو بێشەڵانی بوە بەلانەی ئوزبەکو ئەفغان. ئەگەر بێتو لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە رێ بدرێ ئەوانیش ئەو ناوچانەی لەخۆیانەوە نزیکن لەئێران داگیر دەکەن. سوڵتانی عوسمانی داخوازیەکەیانی پەسەندکردو دەی دان تا زوە داگیریان کەن. ئەوانیش یەکسەر بەلەشکرێکی زۆرەوە پەلاماری قەڵاو قەڵایچەکانی ئێرانیاندا و هەمویان داگیر کرد. سەرلەشکرێکی بەناوبانگی ناوچەی ئەرزروم قەڵایچەکانی یەریڤانو شیروانو موشو وانو هەمو ناوچەکانی ئازەربایجانی تا مەراغەو خەمسە داگیر کرد. پاشاکانی بابانو عیراقی عەرەب سودیان لەم هەلە وەگیرکەوت، ناوچەی ئەردەڵانو کرماشانو هەمەدانو بروجەردو نەهاوەندو گەروسیان لەماوەیەکی کورتدا داگیر کردو فەرمانڕەوای خۆیانیان لەسەر قوت کردنەوە. خانە محەمەد پاشای بابان لەساڵی 1136ی ک دا هەڵیکردە سەر ئەردەڵانو داگیری کردو بو بەفەرمانڕەوای.

عەباسقولیخانیش لەم شەڕوشۆڕانەدا کوژرا.

—6—

لێرەدا هەندێ روداو پێویستیان بەساخکردنەوەو، هەندێ هەواڵی پێویستیان بەراستکردنەوە هەیە.

1. بەپێی نوسینەکەی نیلو مەستورە لەکاتی هاتنی خانە پاشادا عەباسقولی خان والیئەردەڵان بوەو لەو شەڕوشۆڕانەدا کوژراوە، بەڵام بەپێی نوسینەکانی حدیقەو تحفە لەو کاتەدا عەلیقولی خان والی بوەو، دوای هاتنی خانە پاشا بەرەو ئەسفەهان هەڵاتوە.
2. خانە پاشا وەکو (حدیقە: 147) و (تحفە: 134) ئەڵێن: کوڕی محەمەد پاشاو لەئامۆزاکانی سلێمانی پاشا نەبوە. بەڵکو خۆی ناوی محەمەدو کوڕی سلێمان پاشا بوە. لەبەر نازناری پێیان وتوە خانە

محەمەد پاشا. مەستورەیش هەر بەخانە محەمەد پاشا ناوی بردوە. جگە لەوەیش لەو کاتەدا بنکەی ئەمارەتی پاشاکانی بابان لەقەڵاچوالان بوە. چونکە ئەوسا شاری سلێمانی هێشتا بنیات نەنرابو، شاری سلێمانی لە 1199دا ئاوا کراوەتەوە.

3. کەخانە پاشا بەڕێ ئەکەوێ بۆ گرتنی سنە وەکو نوسەرانی حدیقەو تحفە ئەڵێن: "ئەشراری!" مەریوان‌و هەورامان ناویانەتە پاڵی. بەڵام وەکو روداوەکان دەری ئەخەن ئەوانەی هاوکارییان کردوە هەر ئەشراری مەریوان‌و هەورامان نەبون، بەڵکو کەسانی ناوداری بنەماڵەی ئەردەڵانیشیان تیادا بوە لەوانە: سوبحان ویردی خان. ئەو کاتەی خانە پاشا حوکمڕانی سنە بوە، سوبحان ویردی کاربەدەستی ئەسفەند ئاباد‌و گەڕوس‌و خەمسە بوەو نازناوی پاشایشی دراوەتێ. (لب: 87)، (مستورە: 91) لەو شەڕە گەورەیەش دا کە لەنێوان لەشکری عوسمانی‌و لەشکری ئەفغانیدا رویدا (1139)، ئەم یەکێ بوە لەو 20 میرە کوردەی لەژێر سەرکردایەتی خانە پاشادا باڵی چەپی لەشکری عوسمانییان پێک هێناوە. (العزاوی: 5/ 219).

4. (حدیقە: 148) و (تحفە: 136) ئەڵێن: کەدەنگوباسی سەرکەوتنەکانی نادری سەرکردەی لەشکری شا تەهماسبی سەفەوی بەسەر ئەفغانیەکان بڵاو بوەوە. عەباسقولی خان لەگەڵ هەندێ لەدەسوپێوەندەکانی چوە لای شاو. نادر بەرەزامەندی شا، عەباسقولی خانی دانایەوە بەوالیی ئەردەڵان. عەباسقولی بەرەو کوردستان گەڕایەوە. عەلی خانی بابان بەبێ شەڕ سنەی بۆ بەجێهێشت. عەباسقولی هاتەوە سنە (1142) بەڵام عەباسقولی هەمان ساڵ مردو. سوبحان ویردی خانی کوڕی لەجێگەی دانرا.

ئەگەر عەباسقولیخان، وەکو مەستورە ئەڵێ، لە شەڕو شۆڕەکانی 1136دا کوژرا بێ. ئەم گێڕانەوەیەی حدیقەو تحفە هیچ بناغەیەکیان نامێنێ.

5. مێژونوسەکانی ئەردەڵان لەساڵی گرتنی ئەردەڵان‌و شاری سنەدا لەلایەن خانە پاشای بابانەوە یەک نین: (نیل: 23) ئەڵێ: 1134 و. (مستورە: 71) ئەڵێ: 1136 و. (حدیقە: 147) و (تحفە: 135) ئەڵێن: ساڵی 1132 بوە. هەمو مێژونوسەکانی عوسمانی کەدەربارەی روداوەکەیان نوسیوە، باسی ساڵی 1136 یان کردوە. (العزاوی: 5/206-207) لەبەر ئەوە دیاریکردنەکەی مەستورە لەناو ئەوانەدا راستە.

6. بە قسەی مێژونوسەکانی ئەردەڵان (حدیقە: 147-148) و (تحفە: 35-136) خانە پاشا 4 ساڵ حوکمڕانی ئەردەڵانی کردوە (1132-1136) و. ئەوسا حوکمڕانیی سنەی بۆ عەلی خانی کوڕی بەجێ هێشتوەو. خۆی گەڕاوەتەوە موڵکی بابان. گوایە عەلی خانیش 6 ساڵ حوکمڕانی سنە بوە (1136-1142). ئەگەر خانە پاشا 4 ساڵ حوکمڕانی سنە بوبێ (1136-1140) و ئیتر بۆ عەلی خانی کوڕی بەجێهێشت بێ، ئەوا عەلی خان تەنیا دو ساڵ حوکمڕانی کردوە، چونکە وەکو ئەوان ئەڵێن لە 1142 دا عەباسقولی خان هاتۆتەوە سنەو، عەلی خان بەبێ شەڕ ڕۆیشتوە.

7. ئەو ماوەیە هەلومەرجی ناوچەکە بەهۆی هێرشی گەورەی عوسمانیەوە بۆ سەر لوڕستان‌و کرماشان‌و هەمەدان‌و دواتر شەڕی لەشکری عوسمانی‌و ئەفغانی لەنزیک هەمەدان‌و شکانی لەشکری عوسمانی بەهۆی هەڵگەڕانەوەی خانە پاشاو لەشکرەکەیەوە لەعوسمانیەکان. ئەو ماوەیە خانە پاشا خەریکی بەشداری بوە لەم لەشکرکێشییانەدا. خانە پاشا بەقسەی رەنجوری ساڵی 1143 و بەقسەی سەرچاوە عوسمانیەکان لە ساڵی 1145دا کوژراوە.

# سوبحانویردی خان
## (1161–1143)

### –1–

تەهماسبی دوەم کە لەگەمارۆی ئەفغانیەکان لە ئەسفەهان دەرباز بو بو، خەریکی سازدانی هێزو پەیداکرنی پشتو پەنا بو. یەکێ لەو کەسانەی دابویانە پاڵی کابرایەکی ئەناسراوی ئێلی ئەفشار بو. لەماوەیەکی کورتدا ئەم پیاوە هەڵکەوتوە ناوی وەکو قارەمانی ئێران دەرکردو بو بەسەرداری هێزەکانی تەهماسبو، لەدو شەڕی چارەنوسسازدا ئەشرەفی ئەفغانی شکاند (1141-1142). ئەشرەف بەشکاوی ئەسفەهانی بەجێ هێشتو، بەرەو قەندەهار هەڵات. بەڵام لەڕێگە کوژرا. کوژرانی ئەشرەف کۆتایی هێنا بەحوکمی 7 ساڵەی ئەفغانی لەئێراندا.

(مستورە: 90-91) ئەڵێ: "چون دەوڵەتی نادرشا لەرۆژهەڵاتی ئێرانەوە ئەستێرەی پرشنگیداو شاتاماسبیش کە لەو سەروبەندەدا نێوی کەوت بوە نێو نێوانەوە، نادرقولی ئەمەی بەهەل زانیو کردی بەبیانو و دەسپێک بۆ خۆیو توانی ئێران لەچەنگاڵی بیانی رزگار کاو بە لەشکرێکەوە بەرەنگاری پاشا عوسمانیەکان کەکرماشانو سنەو هەمەدانو کوردستانیان داگیر کردبو. بۆوەو پاش شەڕوشۆڕی عوسمانیو بابان بەزینو هەڵاتنو لەشکری نادرشا سەرکەوت. زۆربەی پیاوماقوڵانی کوردستان لەو شەڕەدا کوژرانو لەناوچونو بەشێکیشیان لەکۆتو زنجیر دران. خوسرەو بەگی مونشیو مەلا عەبدولکەریمی قازی لەناو کوژراوەکاندا بونو هەروەها محەمەد عەلی (!) بەگی وەکیلیش لەناو لەکۆتو زنجیردراوەکاندا بو. لەساڵی 1132ی ک دا (ئەبێ ساڵی 1142 بێ) لەشکری پیرۆزی نادرشا هاتە ناو سنەوە. نادرشا محەمەدقولی بەگی وەکیلی، کە لەنێو بەندکراوەکاندا بو، بانگ کردو لێی پرسی: "کەسێ لەبنەماڵەی ئەردەڵان ماون شیاوی فەرمانڕەوایی بێ، تا پلەو پایەی فەرمانڕەوایی باوباپیرانی پێ بسپێرێ؟" محەمەدقولی بەگ، سوبحانویردی خانی (کوڕی محەمەد بەگی) دەس نیشان کرد. گوتی: "هەر ئەو دەتوانێ ئەم کاروبارە لەئەستۆی خۆی بگرێ." نادر شایش نێوبراوی کرد بەفەرمانڕەوای کوردستانو ئەیالەتەکەی پێ سپارد."

**-2-**

سەرلەمی سوبحان ویردی خانی کوڕی عەباسقولی خان زۆر نائارام بوە لەبەر ئەوە هەشت جار لانراوەو لابراوە (لب: 98). لەو شەڕەلا، کەشا تەهماسب لەگەڵ لەشکری عوسمانی کردو شکا، ڕۆژهەلاتی ئێران کەوتەوە لەس عوسمانی. خالید پاشای بابان بو بەحوکمڕانی ئەرلەلان (1144). سوبحانوێردی خۆی شارلەوەو، بەخاو خێزانەوە هەلات بۆ تاران، لو ساڵ لەوێ مایەوە، تا لیسان نالرشا عوسمانیەکانی لەرکرد، ئینجا ئەویش گەڕایەوە ئەرلەلان. (مستورە: 92).

**-3-**

نالر شا لەکاتی لەشکرکێشیلا بۆ سەر شیروان چوە سنە (1147). سوبحان ویردی خانو ئەعیانی سنە بەپیریەوە چونو، سوبحان ویردی لەکۆشکەکەی خۆیلا جێگەی حەسانەوەی بۆ نالر ئامالە کرلبو. نوسەری (تحفە: 137) ئەگێڕێتەوە:

"بۆ ڕێز لێ نانی-نالرشا-لەلەمی تەلارەکەلا بەپێوە ڕاوەستابو. لەبەر ئەوەی سوبحان ویردی خان پیاوێکی ڕیش سپیو کامڵ بوە، نالر شا لوای لەربڕینی مەکارمو میهرەبانی پێی ئەڵێ: "مامە! ئێمە نەهاتوین جێگەی تۆ زەوت بکەین. تەلارەکەتان ئەوەندە فراوانە جێگەی سەڵتەنەتی منو حکومەتی تۆی تێلا ئەبێتەوە- مسکن وسیع است ای عمو ما گوشەی تو گوشەی-وەرە سەرەوە" بەم شێوە جوانە ڕێگەی لانیشتنی ئەلاو پاشان ئەڵێ: "والی ئامانەوێ ببینە هۆی زەرەرو زەحمەتی ئێوەو ڕەعییەت. بەئەندازەی پێویست نانو ئۆیەکمان بەرێ!" سوبحان ویردی خان لەوەلاملا 14 هەزار مەن ڕۆن کەلەو ڕۆژانەلا بایی نزیکەی 5 هەزار تمەن بو لەگەڵ 10 هەزار تمەن زێڕی نەختینەی پێشکەش کرلو هەمو پێویستیەکانی تریشی جێبەجێ کرد..

ئەمە بو بەهۆی خۆشنولیو ڕەزایەتی نالر شا. لەکاتی نانی نیوەڕۆلا ڕێگە بەوالی ئەلا نانی لەگەڵ بخواو لەسەر سفرەکە نەختێ لەگەڵی ئەلوێ، فەرمویەتی: "بۆ فراوان کرلنی تیوڵو ئیدارەو پایەو ئیمتیاز هەر تەمەننایەکت هەیە بیڵێ!" سوبحان ویردی لەوەلاملا ئەڵێ: "جگە لەسەلامەتی حەزرەتی نالری لاوایەکی ترم نیە. بیستومە ترشیاتی عەنبە لەکارگەی پیرۆزلا لەس ئەکەوێو ترشیاتێکی خۆش مەزەو بەتامە. ئەگەر یەکلو گۆزە مەرحەمەت بکەی بۆ من لەهەمو شتێ چاکترە" نالر شا زەرلەخەنە ئەیگرێو فەرمانی لاوە چەند گۆزەیەک ترشیاتی عەنبە بنێرن بۆ ماڵی والی. مێژونوسەکانی ئەرلەلان ئەمە بەوە لەقەڵەم ئەلەن کەگوایە سوبحان ویردی "تەبیعەتی قانعو کەم تەماعو زۆر زاهیدو سالە لەوح بوە". بەلام نالر شا ئەم وەلامەی بەنیشانەی بولەڵەییو لێ نەهاتویی سوبحان ویردی خان لانەنێ. (تحفە: 137-138).

**-4-**

نالر شا لەیەکەمین هەڵلا ئەمی لابرلو مستەفا خانی برای لەجێگەی لانا (1149). بەلام مستەفا خەڵکی ئازار ئەلاو زوڵمو زۆرلاری ئەنواند، پاش چەند مانگێ خەڵک لێی هەڵگەڕانەوەو هاواریان بۆ نالر شا برد. نالر مستەفای لێ خستو بۆ جاری لوەم، سوبحان ویردی خانی لانایەوە (1149). (تحفە: 139).

نالرشا، لەسەریەک چەند جارێ سوبحانویردیخانی لاناوەو لابرلوە:

جاری یەکەم، مستەفا خانی برای لەجێگەی لانا (1149). بەلام مستەفا خەڵکی ئازار ئەلاو زوڵمو زۆرلاری لێ ئەکرلن، پاش چەند مانگێ خەڵک لێی هەڵگەڕانەوەو هاواریان بۆ نالرشا برد. نالر مستەفای لێ خستو بۆ جاری لوەم، سوبحان ویردی خانی لانایەوە (1149). (تحفە: 139).

دەربارەی هەلومەرجی ئەردەڵان لەو رۆژگارەدا (مستورە: 94) ئەنوسێ: "بەبۆنـەی نـاژاوەو ئاشـوبەوە وڵات وا وێران بیو، بەجارێ داری بەسەر بەردیەوە نەمابو. بوجەی دەوڵـەت بـەجارێ کـز بیـو بەشـی هیچـی نەدەکرد. بەم جۆرە وڵات بەجارێ وێران بیو.."

جاری دوەم، کە لەسەفەری هیندستان گەڕایەوە خان ئەحمەدخانی کوڕی لەجێگـەی دانـا (1153). لـەو کاتەدا ژنی سوبحانویردی بەبارمتـە لەئەسـفەهان بـو، داوای لەخوێشـی کـرد بچێتـە ئەسـفەهانو چـو. خـان ئەحمەدی لەجێگەی دانا. (مستورە: 95) بەڵام نـادر پێویسـتی بەلەشـکری ئـەردەڵانو خـان ئەحمـەد بـو بـۆ لەشکرکێشی بۆ سەر داغستان، بۆیە خان ئەحمەدی بانگ کردەوەو دیسان سـوبحانویردی بـۆ جـاری سـێیەم دانایەوە (1154).

جاری سێیەم، کە لەسەفەری داغستان گەڕایەوە نادر شا سـەرلەنوێ سـوبحانویردی خـانی لادا و، خـان ئەحمەدخانی کوڕی لەجێگەی دانا (1155). بەڵام خان ئەحمەدخان لەبەر ئەوەی عەماری دانەوێڵـەی نادرشـای شکاندبو، لەترسی سزای شا هەڵات بۆ ناو عوسمانی. نادر کە بەهەڵاتنی خان ئەحمەدی زانی، سـوبحانویردی دور خستەوە بۆ تاران (1156) و، کابرایـەکی بـەناوی حـاجی مـەولاویردی خـانی قاجـارەوە کـرد بـەوالی ئەردەڵان (1157). مەولاویردی شیعەیەکی توندڕەوبو. زوڵمی زۆری لەخـەڵک ئـەکرد. خـەڵک هاواریـان لـێ هەڵساو سکاڵایان بردە بەر نادر. نادر مەولاویردی لێخستو سوبحان ویردیخانی بۆ جاری چوارەم دانایەوە (1158).

## -5-

وەکو (مستورە: 99) نوسیوێتی: "خەڵکی ناوچەی ئەردەڵان کە لەترسی شۆڕشێکی لـەپاش ڕۆیشـتنی خان ئەحمەدخان کەوتبۆوەو وڵاتـی بـەجارێ گرتبـۆوەو لەدەسـت زۆرداریو سـتەمکاریی نادرشـا کەهەریەکـە بەلایەکدا بڵاوەی لێ کردبو لەوڵات هەڵات بون، هەمو گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان...".

نادرشا ئەمجارەیان هێزێکی چەند هەزار کەسی لەئەفغانیو خوراسـانی لەگـەڵ چەنـد کاربەدەسـتی باوەڕپێکراوی خۆی لەگەڵ نارد بۆ کوردستان. پاشتر نادرشا، میرزا تەقی خانی گولستانە، مامی نوسەری "مجمل التواریخ"یشی نارد. میرزا تەقی "مستەوفی" واتە بەرپرسی کاروبـاری کۆکردنـەوەی بـاجو سـەرانە بو.

ئەم هێزە تاکوژرانی نادرشا(1160) لەکوردستان بون. لەو ماوەیەدا زوڵمو زۆرێکی زۆریـان لەخـەڵک ئەکرد. لەترسی نادرشا، نە والی ئەوێرا بەرهەڵستییان بکاو نەکەسیتر. بەڵام کەهەواڵی کوژرانی نادر گەیشتە سوبحان ویردی، پێش ئەوەی هەواڵەکە لەناو خەڵکدا بڵاوبێتەوەو، ببێتە هۆی وروژانی خـەڵکو پـەلاماردانی هێزی بێگانە، سوبحان ویردی سەرکردەی هێزەکـە بانـگ ئـەکاو داوای لـێ ئـەکا تـا خـەڵک بەهەواڵەکـەیان نەزانیوە، بۆ ئەوەی توشی هیچ بەڵایەک نەبن، خۆیان دەربـاز بکـەن. هێزەکـە بەشـەو شـار بـەجێ ئـەهێڵنو ئەڕۆن. (تحفە: 143-144).

بەڵام (گلستانە: 137)، سـوبحانویردی، لەمـەدا بـەوە تاوانبـار ئـەکا، کـاتێ کـەمیرزا تـەقی گولسـتانە لەسنەوە بەڕێ ئەکەوێ بۆ کرماشان، ئەم بەنهێنی هـەواڵی بـۆ هەنـدێ لەسـەرانی ئێلـەکانی زەنـدی کەڵەشـێرە ناردبێ، ڕێگەی پێ بگـرن دەسـکەوت بـەنیوەیی ڕوتـی بکەنـەوەو بیکـوژن. لەڕێگـە ڕوت ئەکرێتـەوە، بـەڵام ناکوژرێ.

**-6-**

## سەرەنجامی سوبحانویردی خان

دوای ئەویش بۆ جاری چوارەم، کاتێ ئیبراهیم لەجێگەی نادر بانگی شایەتی دا، حەسەنعەلی خانی ئەردەڵان لەناو هێزەکەی ئەودا خزمەتی بەو کردبوو. ئیبراهیم لەپاداشتی ئەو خزمەتەدا حەسەنعەلی خانی لەجێگەی سوبحان ویردی خان کرد بەوالیی ئەردەڵان (1161). حەسەنعەلی گەیشتەوە کوردستان بەڵام هەندێ لەگەورەکانی ئەردەڵان بەتایبەتی جەعفەر سوڵتانو، محەمەد عەلی سوڵتانی بانە، والیەتی حەسەنعەلییان قوبوڵ نەکردو، سوبحان ویردیان دانایەوەو حەسەنعەلییان دەرکرد. بەڵام سەرەنجام حەسەنعەلی خان لەو ململانێیەدا سەرکەوت. (مستورە: 88) پێ ئەچێ حەسەنعەلی خان چاوی محەمەد عەلی سوڵتانی لەسەر ئەم هەڵگەڕانەوەیە دەرهێنابێ‌و، ئەویش لەسەر ئەم کارە سەلیم پاشای بابانی لەیەکەمین هەلدا بۆ تۆڵە لێ کردنەوە، هێنابێتە سەری. (گلستانە: 167).

سوبحان ویردی خان چوە هەمەدانو 5 ساڵی پاشماوەی ژیانی لەوێ بەسەربردو هەر لەوێ مرد (1167)و پاش شەش مانگ ئینجا تەرمەکەیان هێنایەوە کوردستان لەسەر کێوی شەیدا بەخاکیان سپارد. (مستورە:89). (تحفە: 144).

# خان ئەحمەدخانی سێیەم
# (1155–1153)

## –1–

### باجی خوێن

والیەکانی ئەردەڵان سەرەڕای ئەوەی ساڵانە باجێکی زۆریان ئەدا بەشاکانی ئێران، ئەبو "باجی خوێن" یش بدەنو لەهەمو لەشکرکێشیەکانیدا بەشدار بن. ئەمە کارێ بو کەوالی لەشا نزیک ئەخستەوە. لەشکری ئەردەڵان لە لەشکرکێشیەکانی نادر شادا بەشدار بون. سوبحانویردی، خان ئەحمەد خانی کوڕی بەلەشکری ئەردەڵانەوە نارد بۆ بەشداری لە لەشکرکێشیدا جارێک بۆ سەر هندستانو جارێکی تر بۆ سەر داغستان. هەردو جار خان ئەحمەد خان ئازایەتی زۆری نواندوەو، لەبەرامبەر ئەوەدا شا ئەمی لەجێگەی باوکی ئەکرد بەوالی.

لەو بارەیەوە (مستورە: 94) نوسیوێتی: "لەم سەردەمەدا خان ئەحمەدخانی کوڕیشی لەگەڵ بڕێ لەگەورەپیاوەکانی کوردستانی ئەردەڵان، وەک ئەڵلاویردی بەگو حەسەن بەگی میر ئەسکەندەریو پێنج سەد کەسی تر لەئازاو دلێرانی بەناوبانگی کوردستان لەنێو ئەو لەشکرەدا بون. کەنادر بۆ گرتنی هندستان بەڕێی کرد. لەساڵی 1152ک گەڕانەوە. چون خان ئەحمەدخان لەو سەفەربەرەدا پیاوەتیو مێرخاسی زۆری نواندبو شێرانە کوشتارێکی زۆری لەدوژمن کردبو خزمەتێکی زۆری کردبو، نادرشا کردی بەجێگری فەرمانڕەوای کوردستانو لەگەڵ شەریف خانو چەند میرێکی دیکەدا بۆ ئەردەڵانی ناردنەوە".

دەربارەی بەشداری لەشکری ئەردەڵان لە لەشکرکێشی نادردا بۆ سەر داغستان، (مستورە: 96) ئەڵێ: "لەکاتێکدا نادرشا لەساڵی 1154ی ک بۆ داغستان ئەچو سوبحانویردیخان داوای لێ کرد رێگەی بدا بۆ سنە بگەڕێتەوە. خان ئەحمەد خانی کوڕیشی لەگەڵ نادر شادا نارد بڕوا بۆ داغستان..".

## -2-

دوای لەشکرکێشی داغستان نادر شا سوبحانویردی لادایەوەو، خان ئەحمەدخانی کوڕی لەجێگەی دانایەوە. خان ئەحمەد کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری ئەردەڵان (مستورە:97) گوتەنی: ".. ئەیالەتی سنەی بەخێرو خۆشی ڕازاندەوەو خەڵکی وڵاتەکە هەمو دڵیان خۆش بو لەنارەحەتی ڕزگار بون. لەپێناوی وڵاتپارێزیو ژێردەست دڵدانەوەدا زۆر تێکۆشاو ڕەنجێکی فرەی بەخەرجدا. بۆ لەناوبردنی پیاو خراپو دزو دڕۆزن هەوڵو تەقەلایەکی زۆریدا. زۆری نەبرد قاتوقڕێکی قورسو گران لەوڵاتەکە کەوتەوە...".

(نیل: 25-26) لەم بارەیەوە نوسیویتی: "شا تەهماسب لەساڵی 1155 کۆچیدا، سوبحان ویردیخانی لەبەر پیریو کەنەفەتی لابردو ئەحمەدخانی کوڕە گەورەی لەسەر کورسی والیگەری ئەردەڵان داناو بەم خەڵاتە سەربەرزی کرد، ئینجا ناردیەوە بۆ خاکی ئەردەڵان.

لەم کاتەدا بەهۆی (زۆریی) پیتاکو سەرانەو (ڕادەی بەرزی) چەوساندنەوەی دیوەخان (ی شاه)و کەم بونەوەی داهاتی ناوچەی ئەردەڵانەوە ئاگری قاتوقڕی بەچەشنێک هەڵگیرسابو، لەدڵ(ی مرۆڤ) لەسوێی گەنم، وەک دەنکی گەنم قەڵشتی هێنابو باڵندەی گیان لەخەمی دەخڵودان لەداوی هیلاکەت دا ئەسیر مابو.

نادرشا دوازدە هەزار خەڵوار دانەوێڵەی لەناوچەی عێراقەوە نارد بوە ئەردەڵانو لەعەماردا بۆ مەسرەفی قشونی ڕاگرت بو. لەو ڕۆژانەدا بەهۆی بارینی بەفرێکی زۆرەوە، ڕێگاوبان بەستراو ڕێی هاتوچۆ گیرا.

خەڵکی ئەردەڵان داوێنی ئەحمەدخانی والیان گرتو (گوتیان) با ئەو پیتاکی سورساتە وەک یارمەتیەک وەرگرینو لەکاتی بەهاردا کەرێگەوبان کرایەوە، دانەوێڵەکە بخەینەوە عەمباری شاهی.

بەڵام لەوەرزی بەهارو لەدوای توانەوەی بەفردا، بەقودرەتی خوا، (نرخی) مەنێکی تەوریزیی گەنم لەئەردەڵانو ناوچەکانی دەوروبەری گەیشتە دو هەزارو دەستەواوی عەماری شاهیو پیتاکو باجو سورو ساتی نادر شاه گەیشتە ڕادەیەک کە لەتاقەتی ئەحمەد خانو خەڵکی ئەردەڵاندا نەماو، ناچار خان خۆیو 500 کەس لەگەورەپیاوانی خاوەن ڕێز لەساڵی 1055 (ئەبێ 1155 بێ)ی کۆچیدا هەڵاتنە خاکی ڕۆمو لەوێ چونە لای سوڵتان مەحمودی خونکار" (نیل: 25-26).

## -3-

هەندێ لەنوسەرانی ئەردەڵان درێژە بە باسەکە ئەدەنو هەندێ روداوی رونەداوی بەپاڵ ئەدەن. نوسەرانی (لب: 92-93) و (حدیقە: 151-152) و (تحفە: 141) ئەڵێن: لەگەڵ دو هەزار سوار لەدەسوپێوەندەکانی خۆی روی کردە شارەزور، زاهیر بەگی سەرۆکی جاف ڕێگەی پێ گرت بەڵام ئەم شکاندیو کوشتی. لەوێوە روی کردە سلێمانیو خالید پاشای بابان بەوپەڕی دۆستایەتیەوە پێشوازی کردو دوای چەند ڕۆژێ میوانداری کردو دیاری شایانی دایە، ئینجا روی کردوتە موسڵ. حاکمی موسڵ لەڕویدا ڕاوەستاوە، ئەمیش بەشەڕ شاری موسڵی گرتوەو حاکمەکەی بەدیل گرتوەو دوای چەند ڕۆژێ کوشتویەتیو محەمەد چەلەبی لەجێگەی ئەو کردوە بەحاکمی موسڵ. خۆیشی چوە بۆ دیاربەکرو حەلەبو دوای یەک مانگو چوار ڕۆژ گەیشتۆتە ئەستەمولو سوڵتان، سەدری ئەعزەمو شێخەل ئیسلامو هەندێ لەکاربەدەستانی گەورەی ناردوە بۆ پێشوازی.

(مستورە:99) درێژە بەباسەکە ئەداو ئەنوسێ: "دەربارى سوڵتانی عوسمانی لەشکرێکی گەورەی خستە تەک خان ئەحمەدخانو ئەرکی بەگژ ئێراندا چونی لەئەستۆ خرا. لەرێگای ئەرزرۆمەوە بەرەو ئێران بەڕێ کەوت. نادرشایش بۆ بەرەنگاربونی خان ئەحمەدخان خۆی تەیارو ئامادەکرد. پاش شەڕێکی گەورە خان ئەحمەدخانو لەشکرەکەی رۆمی شکاندو تا توانی ڕاوەدوینان. بەڵام خان ئەحمەدخان هەر وازی نەهێنا.

دوسێ جاری دیکە بەلەشکرێکی گەورەوە لەگەڵ سەرکردە دیارەکانی عوسمانیدا. لەرێی موسڵو بەغداوە بۆ داگیرکردنی سنە، هاتە داوچەکەوە. بەڵام هیچ سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەس نەهێنا، پاش شەڕو تێک گیرانێ، کە لەهەمویاندا شکستی دەهێنا، داوچەکەی بەجێ دەهێشتو دەگەڕایەوە بۆ داوچەی رۆم.

ئەم بارودۆخە هەر بەو رەنگە مایەوە، تا نادرشا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا رێک کەوتو بەم شێوەیە سوڵتان بۆ بەرژەوەندی هەردو دەوڵەت، هێنای کردی بەوالیی ئەدرنە، ئیتر بەم جۆرە خان ئەحمەدخان دەستی لەو داوچەیە پچڕاو خەڵکی داوچەکە بۆ خۆیان ئاسودەسەر بوونو ئەویش لەئەدرنە فەرمانی خودای بەجێ هێنا".

بەڵام (گلستانە: 168) چارەنوسی خان ئەحمەدخان بەجۆرێکی تر باس ئەکا: "خان ئەحمەدخان کوڕی سوبحانویردی خان کەهاوئاوزەنگی نادر شا بو، لەرۆژانی نادر شادا لە لەشکر هەڵات بو، پەنای بۆ ولایەتی رۆم بردبو. پاشاو ئەعیانی مەمالیکی رۆم دڵنەدانیان بەچاک نەزانی بو. لەسەر داوای نادر شایش داردنەوەیان بەدەنگی دوژمنی عوسمانی دانابو، لەبەر ئەوە بەدزییەوە دەرمانخواردیان کرد".

پێ ئەچێ ئەم چیرۆکانە هەڵبەستی میر یا مێژونوسەکانی ئەردەڵان خۆیان بێ بۆ زلکردنی ئەم ئەمیرە هەڵکەوتوە لێقەوماوە، چونکە هیچ کام لەسەرچاوە ئێرانیو عوسمانیەکانی ئەو سەردەمە باسی هیچکام لەم روداوانە ناکەن، ئەمە جگە لەوەی هەندێ هەڵەی مێژوییان تێکەڵاو بوە:

1. نادر لە 1145دا تەهماسبی لەسەر تەختی شایەتی داگرتو، زەماوەندی شایەتی بۆ عەباسی سێیەم گێڕا کەساوایەکی 8 مانگەی تەهماسب بو. لە 1148یش دا بەیەکجاری کۆتایی بەزنجیرەی سەفەوی هێناو، لەدەشتی موغان لەکۆبونەوەیەکی گەورەدا خۆی بو بەشای ئێران. لەبەر ئەوە نوسینەکەی "نیل" کە تەهماسب، خان ئەحمەدخانی دادابێ لەگەڵ روداوەکانی مێژودا یەک داگرێتەوە. لەو کاتەدا نادر، نەک تەهماسب، شای ئێران بوە. (مهدوی: 162-164).
2. لەو کاتەدا هێشتا سلێمانی بنیات نەدرابو. سلێمانی لە 1199دا بنیات دراوە. بنکەی میرایەتی بابان ئەوسا لەقەڵاچوالان بوە. خالید پاشایش بەهۆی هێرشی نادر شاوە بۆ سەر داوچەی بابان لەو کاتەدا بەخاووخێزانەوە هەڵات بو بۆ موسڵ، ئینجا لەوێوە بەنەخۆشی چوە بۆ ئورفاو لەوێ مردوە (1156). لەبەر ئەوە داگونجێ پێشوازی لەخانو میوانداری کردبێ.
3. عەجەم لە 1154دا هێرشیان کردە سەر مەندەلیو شارەزورو، بەڵام هێرشی گەورەیان بەسەرکردایەتی خودی نادر شا لە 1156دا دەس پێ کرد لەم هێرشەدا هەمو داوچەی بابانو کەرکوکو هەولێریان گرتو گەمارۆی موسڵو بەغدادیاندا. بەڵام هیچ کام لەو دو شارەی بۆ نەگیرا. حاکمی موسڵ لەو کاتەدا حسێن پاشای ئال جەلیلی بوە کەبەوپەڕی ئازایەتیەوە بەرەنگاری نادر شا بوەو نەیهێشتوە شارەکەی بگیرێ. نادرشا، دوای ئەوەی زیاتر لە 40 رۆژ گەمارۆی موسڵیداو داگربارانی کرد، لەسەرکەوتن دائومێدبو داوای ئاشتبونەوەو رێککەوتنی لەدەوڵەتی عوسمانی کردو. خۆیو لەشکرەکەیشی گەڕایەوە ئێران. جا ئەگەر نادرشا بە 170 هەزار کەسەوە نەیتوانی بێ موسڵ بگرێ، خان ئەحمەدی داماو و هەڵاتو (بە 5 سەد کەسەوە وەکو "نیل" ئەڵێو بە 2 هەزار کەسەوە وەکو "حدیقە" و"تحفە" ئەڵێن، ئەبێ چۆن موسڵی بۆ گیرابێو حاکمەکەی کوشت بێو محەمەد چەلەبی لەجێگە دانابێ؟ (عماد عبدالسلام: 102-115).
4. لەناو لیستی والیەکانی موسڵدا کەسێکی تێدا نیە بەناوی محەمەد چەلەبی. لەو رۆژگارەدا (1154-1159) حسێن پاشای ئال جەلیلی والی موسڵ بوە. (عماد عبدالسلام: 499-500)

**پەراوێز:** بۆ ئاگاداری زۆرتر لەسەر گەمارۆدانی موسڵ لەلایەن نادرشاوە بروانە: عماد عبدالسلام رووف، "الموصل فی العهد العثمانی-فترە الحکم المحلی 1139-1249 هـ 1726-1834م". النجف، 1975.

# حەسەنعەلی خانی ئەردەڵان
# (1164–1161)

حەسەنعەلی خانی کوڕی عەبباسقولی خانی ئەردەڵان کەساڵی 1161 لەئەسفەهان لەلایەن ئیبراهیم شای ئەفشار دانرا بەوالیی کوردستانو. لە 1163دا لەمەریوان لەلایەن سەلیم پاشای بابانەوە شکێنراو. لە 1164دا لەقەڵاچوالان کوژرا. جێگەیەکی تایبەتی هەیە لەناو مێژووی ئەردەڵاندا. چونکە لەسەردەمی میرایەتیی تەمەن کورتی ئەم والیەدا روداوی چارەنووسساز لەئێراندا‌و، شەڕوشۆڕی زۆر لەکوردستاندا قەومان. بەڵام لەناو مێژوەکانی ئەردەڵاندا بەکورتیو کەموکوڕی باسی کراوە. هەندێ لەمێژونوسەکان. روداوی رونەداویان بەپاڵ داوەو، هەندێکیشیان ساڵی حوکمڕانییان گەیاندۆتە ساڵی 1166 و، کوژرانەکەیشیان بردۆتە ساڵی 1167.

لێرەدا من هەوڵ ئەدەم روداوەکانی سەردەمی حەسەنعەلی خان سەرلەنوێ دابڕێژمەوەو، هەندێ لەو هەڵانەی مێژونوسەکانی ئەردەڵان تێی کەوتون راست بکەمەوە.

لەناو مێژوەکانی ئەردەڵاندا "زبدە التواریخ"و "ذیل شرفنامە" لەهەمویان کۆنترن.نوسەری (ذیل شرفنامە) دەربارەی حەسەنعەلی خان نوسیوێتی:

"لەساڵی 1160دا نادر شا کوژراو لەساڵی 1162ی کۆچیدا لەسەردەمی شاهێتی ئیبراهیم شادا حەسەنعەلی خانی کوڕی عەبباسقولی خانو برازای سوبحانویردی خان بەمەنسەبی والێتی ئەردەڵان سەرفرازکراو لەهەمان ساڵدا ئیبراهیم پاشا کوژراو ئاڵۆزی کەوتە وڵاتی ئێرانەوە: لەلایەک کەریم خانی زەندو لەلایەکی تر ئیمامقولی خانی زەنگەنە سەریان بەرزکردەوەو دەستی تاڵانو ئازاریان بۆ سەر دراوسێی دورو نزیک درێژ کرد.

کەریم خان بەهێزێکی زۆرەوە هەڵیکوتایە سەر میهر عەلی خانی تەکەللو، حاکمی هەمەدان. میهر عەلی خانیش بەسوپاو هێزی خۆیەوە بەرامبەر بەکەریم خان وەستاو لەمەلایەر بەگژیەکدا چون. میهر عەلی خان هەڵاتو هانای بردە بەر حەسەنعەلی خانی والیی ئەردەڵان بەنیازی ئەوەی تۆڵەی (میهر عەلی خان لەکەریم

خانی زەند) بسێنێتەوە. بەسوپاو شەرکەری خۆیەوە کەوتە رێو گەر لەشوێنی پەریە دەستی پێکرد. تێکشکانی زۆرو لەرادەبەدەر توشی ئۆردوی کەریم خانو هۆزی زەند هات. کۆمەڵێکی زۆریان بونە خۆراکی شمشێری پاڵەوانانی ئەردەڵانو حەسەنعەلی خان والی سەرلەنوێ میهر عەلی خانی لەهەمەدان دابین کردەوەو خۆی بەسەرکەوتوییو زاڵیو بەغەنیمەتێکی زۆرەوە گەڕایەوە شوێنی حکومەتی خۆی لەئەردەڵان.

بەساڵێک دوای ئەم کارەساتە ئیمامقولی خانی زەنگەنە کۆمەڵێکی زۆری دە پانزە هەزار کەسی عەشایری لەخۆی کۆکردەوەو ئاڵای یاخیبونی هەڵکردو کەوتە بیری ئەوەی بەگژ حەسەنعەلی خاندا بچێ. بۆ ئەمەش لەکرماشانەوە گەیشتە بیلاوەر.

حەسەنعەلی خانیش هەر بەو کۆمەڵە خەڵکەوە کە لەشاری سنەو دەوروبەری ئامادەبون، کەوتنە رێو هاتنە داکۆکی کردن. لەشوێنی بیلاوەری کرماشان هەردو تاقم دایان بەیەک داو شکستێکی یەکجاری کەوتە سوپای ئیمامقولی خانی زەنگەنەوەو زۆربەی قشونەکەی کەوتە بەر تیغی خوێنڕێژی (لەشکری ئەردەڵان). حەسەنعەلی والیش زاڵو سەرکەوتو، گەڕایەوە شوێنی خۆی.

لەکۆتایی ئەم ساڵەدا (1163)، سولەیمان پاشای بەبە لەدەست سەلیم پاشای ئامۆزای هەڵاتو پەنای هێنایە بەر حەسەنعەلی خانی والی ئەردەڵان. سەلیم پاشا لەسەردەمی نادرشادا، پاشای سەربەخۆی شارەزور بو، زۆر کاتیش بەخۆیو هەزار سواری بابانەوە لەخزمەت نادرشادا بو.

حەسەنعەلی خانی والی، بەنیازی رێکخستنی کاروباری سلێمان پاشاو تێکشکاندنی سەلیم پاشا، بەهێزێکی زۆرەوە لەئەردەڵان کەوتەرێ. سەلیم پاشا کەدەستوپێوەندی وەزیری بەغدابو، یارمەتی لێ خواست. محەمەد ئەفەندی کەهیای خۆی بەحەوت هەشت هەزار سوارەوە، لەگەڵ پاشایانی کۆیو حەریریو هتد.. ناردە یارمەتیدانی.

لەناوچەی مەریوان هەردولا روبەڕوی یەک بونەوەو پاش بگرەو بەردەی زۆرو بەکارهێنانی کەرەستەی جۆربەجۆری شەڕو گەڕ، حەسەنعەلی خان هەڵاتو سەلیم پاشا دەم لەسەرپشت، گەیشتە سنە" (ئیبراهیم ئەردەڵانی: 27-29).

"ذیل شرفنامە" ساڵی 1225 نوسراوە، مێژویەکی لەو کۆنتر: "مجمل التواریخ" کەساڵی 1196 ئەبولحەسەنی گولستانە نوسیویتی روداوەکان بەجۆرێکیتر ئەگێڕێتەوە. هەر 3 روداو: شکاندنی ئیمامقولی خانی زەنگەنە، پەلاماردانی زەند، تێشکانی لەبەردەم سەلیم پاشادا، بەدوای یەکدا لەیەک ساڵدا بوە.

ئەبولحەسەن خۆی شایەتی روداوەکان بوە. لەو کاتەدا میرزا محەمەد تەقی گولستانە، مامی نوسەر، لەسەردەمی نادر شادا مستەوفی بوە لەسنە. دوای کوژرانی چۆتە کرماشان. لەوێ بۆتە یەکێ لەپارێزەرانی قەڵای کرماشان. ئەبولحەسەنیش هەر لەگەڵ ئەو لەقەڵای کرماشانو ماوەیەک لەهاروناوا دانیشتوە. کەئیمامقولی خانی زەنگەنە گەمارۆیان ئەدا، هاوارنامەی بەهاناوە هاتن ئەنێرن بۆ حەسەنعەلی خانو. شەڕی بیلاوەر ئەقەومێ ئەم خۆی بەدیار روداوەکانەوە بوە. کاتێ کەریم خانی زەند دێتە کرماشانو، دوای 14 مانگ گەمارۆدان، لەسەر بەڵێنی کەریم خان قەڵای کرماشان ئەدەن بەدەستەوە. ئەبولحەسەن نوێنەری مامی بوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کەریم خان. کاتێ کەریم خان بەرەو سنە بەڕێ ئەکەوێ، ئەمیش لەگەڵ لەشکرەکەی کەریم خاندا ئەبێ، بەڵام لەرێگا بیانویەک ئەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆی بدزێتەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە ئەبێ هەواڵەکانی کە گولستانە لە "مجمل التواریخ"دا ئەیانگێڕێتەوە زیاتر جێگەی باوەڕ بن تا گێڕانەوەکانی نوسەرانی ئەردەڵان کەکۆنترینیان "زبدە التواریخ" 18 ساڵو، "ذیل شرفنامە" 30 ساڵو، "لب التواریخ" 55 ساڵو، "تاریخ اردلان" 67 ساڵ دوای ئەو، "حدیقەی ناصری"و "تحفە ناصری" ش کەزۆر درەنگتر دوای ئەوان نوسراون. ئەمە جگە لەداشکاندنی مێژونوسانی ئەردەڵان بەلای میرەکانیاندا.

### پەشێوانی هەلومەرجی ئێران

لەدوا ساڵەکانی حوکمڕانی خۆیدا نادر شا بەوپەڕی دڵڕەقییەوە لەگەڵ خەڵکو کاربەدەستەکانی ئەجولایەوە. لەسەر شتی بچوکو، زۆر جار بەخۆڕایی سزای توندی ئەدان. کاتێ نادر زانی عەلیقولیخانی برازای لەگەڵ هەندێ لەناحەزەکانی قسەیان کردوە بەیەک، دوری خستەوە بۆ سیستان. عەلیقولی بەئاشکرا لەنادر هەڵگەڕایەوە. نادر بەتەمابو لەشکر بنێرێتە سەری. (مهدوی: 175).

لەهەمان کاتدا خۆی بەرێ کەوت بو بچێتە سەر کوردەکانی خەبوشان کەڕەوەی شاهانەیان تالان کردبو. لەفەتحنابادی لای قوچان بارگەی خست بو. لەگەڵ سەردارە سونیەکانی سوپاکەیدا رێک کەوت بو، سەردارە شیعەکانی سوپاکەی بکوژێ. سەردارەکانی کەبەمەیان زانی ئەوان دەس پێشکەرییان کردو، بەشەو لەناو خێوەتەکەی خۆیدا کوشتیان (1747/1160).

بەکوژرانی نادر دەورانێکی نائارامو خویناوی لەئێراندا دەستی پێکرد نزیکەی 10 ساڵ درێژەی کێشا.

ئەحمەد خانی ئەبدالی، فەرماندەی ئەففانیەکانی ناو سوپاکەی پاش ئەوەی دەستی گرت بەسەر بەشێ لەگەنجینەی نادردا چوە قەندەهار. ناوی لەخۆی نا ئەحمەد شاهی دورانی.

عەلیقولی کە لەگەڵ بکوژانی نادردا هاودەنگ بو. بەپەلە خۆی گەیاندە مەشهەد. ناوی لەخۆی نا سوڵتان عەلی عادلشاو. لەڕاگەیاندنێکی ئاشکرادا ئۆباڵی کوشتنی نادری گرتە خۆی، چونکە "وازی لەمەزەبی شیعە هێنا بو"و. هەمو بنەماڵەی ئەفشار، کە لەکەلات بون جگە لەشاهروخی ئەوەی نادر. کوشتو. دەستی گرت بەسەر گەنجینەکەی نادردا. (مهدوی: 176).

سەڵتەنەتی عادلشا یەک ساڵ زیاتری نەخایاند. ئیبراهیم خانی برای کەفەرمانفەرمای ئازەربایجان بو ملی بۆ نەداو. لێی هەڵگەڕایەوە. عادلشا بەلەشکرەوە کەوتە رێ بۆ سەر ئیبراهیم لەئازەربایجان. هەردو برا لەسوڵتانیە دایان بەیەکدا. عادلشا شکاو گیراو بەفەرمانی براکەی چاویان دەرهێنا (1748/1161).

ئیبراهیم چوە مەشهەد. ناوی لەخۆی نا ئیبراهیم شا. بەڵام سەڵتەنەتی ئەمیش 6 مانگی نەخایاند. بەدەستی سەرانی سوپا گیراو، عەلیقولیو ئیبراهیم هەردو کوژران. شاهڕوخ، ئەوەی نادر، کەتەنیا زیندوی بنەماڵەی ئەفشار بو لەمەشهەد کرا بەشای ئێران (1748/1161).

هەندێ لەناڕازییەکانی مەشهەد، بەبیانوی ئەوەی شاهڕوخ ئەیەوێ وەکو باپیری بەرەو بەمەزەبی سوننە بداو شیعە لەناودا نەهێڵێ، لەشاهڕوخ هەڵگەڕانەوە. شاهڕوخیان گرتو هەردوچاویان دەرهێناو. لەجێگەی ئەو میر سەیید محەمەد، متەوەللی ئاستانی قودسی رەزەوییان، بەناوی شا سولەیمانی دوەمەوە، لەسەر تەخت دانا. (مهدوی: 177).

سەیید محەمەد تەنیا 40 رۆژ شایەتیکرد. هێزێکی سەر بەشاهڕوخ مەشهەدی گرتو، سەرانی شۆڕشەکە، لەوانە میر سەیید محەمەدیان، کوشت. شاهڕوخ لەسەر تەخت دانرایەوە. بەڵام سنوری دەسەڵاتی لەخۆراسان تێ نەئەپەڕی. چونکە لەو کاتەدا 4 لەگەورەپیاوەکانی ئێران: ئازاد خانی ئەففانی لەئازەربایجان، محەمەد حەسەن خانی قاجار لەئەستەرئابادو مازندەران، عەلی مەردان خانی بەختیاری لەئەسفەهانو خوزستان، کەریم خانی زەند لەلوڕستانو فارس هەر یەکە لەلای خۆیەوە ئەیویست دەس بەسەر تاجی بێ خاوەنی ئێراندا. یاهیچ نەبێ دەس بەسەر ناوچەکانی خۆیدا بگرێ. (مهدوی: 178-179)، (هدایت: 261-262).

### دەرکەوتنی کەریم خانی زەند

ئەو کاتەی ئێران لەژێر دەستی ئەففاندا بو. لەشکری عوسمانی هێرشیان کردە سەر رۆژئاوای ئێران، کرماشانو هەمەدانیان گرت. گەورەپیاوەکانی ناوچەکە لەبەرامبەر هێزی زۆری عوسمانیدا نەیانتوانی

بەرەنگاری بکەن. هەندێکیان سەریان دانەواندو هەندێکیان هەڵاتن بۆ ناوچە شاخاوییە سەختەکان. یەکێ لەوانە کابرایەکی زەند بو بەناوی مەهدی خان.

مەهدی خانو خزمەکانی 700 کەسێ لەسوارەو پیادە ئەبون. لەگوندەکانی پەریو کەمازان دائەنیشتن. ئەمانە بەردەوام شەبەیخونی ڕۆمیان ئەکرد. لێیان ئەکوشتن. وڵاخو کەلوپەلیان بەتاڵان ئەبردنو ڕایان ئەکردو ئەکشانەوە ناوچە شاخاوییە سەختەکان. هێزەکانی عوسمانییان نارەحەت کردبو.

کە نادر شا لەشکری بەرەو ڕۆژئاوای ئێران بەڕێ خستو هێزی عوسمانی ڕاو ناو. هێزی سازدا بەرەو بەغداد. ماوەیەک لەکرماشان مایەوە. مەهدی خان جەردەیی‌و ڕاوڕوتی کردبو بەپیشە. کاروانی بازرگانەکانی ڕوت ئەکردەوە. نادر شا یەکێ لەفەرماندەکانی خۆی: باباخان چاوەشلوی، ڕاسپارد کەمەهدی خانو داروەستەکەی بگرێ.

باباخان ناردی بەدوی مەهدی خاندا کەنادر شا ئەیەوێ پلەو پایەی پێ ببەخشێو خەڵاتی بکا. بەم فێڵە مەهدی خانی تەفرەداو، ڕاکێشایە ناو داو.

باباخان مەهدی گرتو 400 کەسی لەپیاوەکانی کوشت. دوای ئەوەی سامانو دارایی مەهدی خانی تاڵان کرد ئەویشی کوشتو. پاشماوەی بنەماڵەو ئێلەکەی دور خستەوە بۆ خۆراسان. لەو کاتەدا کەسێ کەخاوەن ناو و دەسەڵات بێ لەناو زەندا نەما بو. کەریم، شێخە، عەلی وەیس، ئەسکەندەر، نادر خان.. کەبرازای مەهدی خان بون هێشتا منداڵ بون. لەخۆراسان سەری خۆیان کز کردبو.

دوای کوژرانی نادر شا زۆری ئەو عەشیرەتانەی دور خرابونەوە ئەو هەلەیان بەدەرفەت زانی گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. کەریم خانو خزمو ئێلەکەیشیان گەڕانەوە پەریو کەمازان. وەکو جاران کەوتنەوە جەردەییو ڕاوڕوت. کەریم خان ناوی دەرکردبو بو بەدەسەڵاتداری کزازو تویسرکان.

میهر عەلی خانی تکەلو، حاکمی هەمەدان، 12 هەزار سواری هەبو. چاوێری هەواڵی جموجوڵی کەریم خانی زەندی ئەکرد. ویستی بەلای خۆیدا ڕایان بکێشێ. نامەی بۆ کەریم خانو گەورەکانی زەند نوسیو بەسوارێکدا بۆی ناردن.

میهر عەلی لەنامەکەیدا بۆ کەریم خانی نوسی بو: کەئەو لەسایەی خواوە بوە بەدەسەڵاتداری ناوچەکەو هەمو گەورەو سەردارەکانی ناوچەکە ملیان بۆ کەچ کردوە. داوای لەویش کردبو بچێتە لایو فەرمانبەرداری دەربڕێ.

کەریم خانو گەورەکانی زەند بۆ سوکایەتی بەفەرمانەکەی میهر عەلی، لوتو گوێی کابرایان بڕیو داردیانەوە.

میهر عەلی لەم کارە زۆر تورەبو. پێنج هەزار کەسی لەگەڵ یەکێ لەسەردارەکانی ناردە سەریان. فەرمانیدا کەریم خان بەزیندویەتی بگرنو بیهێنن بۆلای خۆی. بۆ ئەوەی خۆی سزای بدا.

زەند کەزانییان لەشکریان هاتۆتە سەر ئەوانیش خۆیان سازدا. لەناکاو کەریم خان بەدوسەد کەسەوە پەلاماری ناوجەرگەی لەشکرەکەیاندا و، تەفروتونای کردن. 3 تۆپو کەلوپەلێکی زۆریان دەس کەوت.

میهر عەلی بۆ تۆڵەی شکانی لەشکرەکەی، خۆی لەشکری کۆکردەوە چوە سەر کەریم خان. شەڕێکی قورس ڕویدا. کەریم خان سەرکەوتو میهر عەلی خان بەشکاوی کشایەوە. لەشکری زەند بۆ ڕاونانی کەوتنە دوی. میهر عەلی خۆی لەقەڵای ولاشجرد لەنزیک هەمەدان قایم کرد. لەشکری زەند گەمارۆی قەڵاکەیاندا. زۆری هێزەکانی میهر عەلی لەترسی زەند بڵاوەیان لێ کرد.

میهر عەلی، عەبدولغەفار خانی برای بەشەو لەقەڵا دەرباز کردو بەنامەیەکەوە ناردی بۆ لای حەسەن عەلی خانی ئەردەڵان.

حەسەنعەلی خان والیو بەگلەر بەگی ئەردەڵان بو. هێزەکەی کەپێک هات بو لەکوردو قزلباشو ئەفغان 20 هەزار کەس ئەبو.

عەبدولغەفار گەیشتە لای عەلی خان. 12 رۆژ لەلای مایەوە.

حەسەنعەلی خان رێزی زۆری لەغەفار گرتو بەڵێنی دایە بەدەنگ هاوارەکەیانەوە بچێ. بەڵام لەو کاتەدا نەیتوانی داواکەیان جێبەجێ بکا، چونکە خەریکی خۆسازدان بو بۆ لەشکرکێشییەکی تر. (گلستانە: 146-151).

## حەسەنعەلی خانی ئەردەڵانو ئیمامقولی خانی زەنگەنە

وەکو گلستانە ئەگێڕێتەوە:

ئیمامقولی خانی زەنگەنە (کوڕی محەمەد رەحیم بەگی زەنگەنە) کەدوای شکانی لەشکرەکەی ئیبراهیم پاشا هەڵات بو، لەگەڵ حەیدەر خانی زەنگەنە بە 3 سەد کەسەوە هات بوە بێستون لەنزیک کرماشان، ئەیویست سەرانی زەنگەنەو کەڵوڕو ئێلاتی ناوچەکە بکا بەهاودەنگی خۆی.

لەو کاتەدا مورتەزا قولی خانی زەنگەنە، عەبدولعەلی خانی خۆراسانیو میرزا محەمەد تەقی گولستانە، دەسەڵاتداری کرماشان بون. میرزا تەقی پارێزەری قەڵای کرماشان بو کەنادر شا چەکو تفاقی جەنگی تێدا هەڵگرت بو، بۆ لەشکرکێشی داهاتو بۆ سەر عوسمانی.

گەورەکانی کرماشان بۆ دەرکردنی ئیمامقولی بەخۆ کەوتن. مورتەزاقولی خانی زەنگەنەو نەجەفقولی خانی ئێلبەگی کەڵوڕ 6 هەزار کەس سوارو پیادەیان کۆکردەوە لەکرماشان دەرچون بۆ سەر ئیمامقولی. نەجەفقولی کوێربو، چونکە نادرشا چاوی دەرهێنا بو.

ئیمامقولی ئەو هێزە زلەی پێ چار نەئەکرا ویستی فێڵیان لێ بکا. نێردراوێکی ناردە لایان وتی: من خەیاڵی گەورەییم لەسەردانیە. هاتوم سەردانی خزمو سەرانی ئێلات ئەکەم. ئەگەر پێتان ناخۆشە ئەڕۆم بۆ لایەکی تر.

مورتەزا لەگەڵ سەردارەکانی لەشکرەکەی کۆبوەوە بۆ راوێژ. ئەمانیش ویستیان فێڵی لێ بکەن. وتیان ئەگەر دەری بکەین لەوانەیە بچێتە پاڵ داحەزو دوژمنەکانمان لەگەڵ ئەوان رێک ئەکەوێو بەهاوکاری ئەوان گێچەڵمان بۆ ئەنێتەوە، چاکتر وایە لەخۆمانی نزیک بخەینەوە، لەنزیک خۆمان بێ هەر کات سەربزێوی کرد، سەری پان ئەکەینەوە.

وەڵامی ئیمامقولییان دایەوە، کەئەوان بۆ پێشوازی هاتون نەک بۆ شەڕ. ئەگینا، ئیمامقولی بەو ژمارە کەمەوە لەگەڵ ئەوان چی پێ ئەکرێ. داوایان لێ کرد بچێتە لایان بۆ ئەوەی پێکەوە بچن بۆ ناو کرماشان.

نێردراوەکە گەڕایەوە، راسپاردەکانی بەئیمامقولی گەیاند.

ئیمامقولیو حەیدەر بیریان لەپیلانێک کردەوە. ئەمان کەم بونو ئەوان زۆر. بڕیاریاندا تەفرەیان بدەنو شەو شەبەیخونیان بکەن. بەکابرایەکی زمان لوسدا هەواڵیان بۆ ناردن کەسبەینێ بەیانی دێنە لایان.

هێزەکە شەو بەخەیاڵی ئاسودە پاڵی لێدایەوە. بەر لەوەی رۆژبێتەوە لە 3 لاوە شەبەیخونیان کردن. هێزەکەی کرماشان شکاو هەڵات. مورتەزاقولی خۆی هەڵات بۆ قەڵای کرماشانو، نەجەفقولی هەڵات بۆ ناو ئێلەکەی خۆی. ئیمامقولی بەسەرکەوتویی چوە ناو کرماشانەوە.

ئیمامقولی نامەی بۆ سەرانی زەنگەنەو ئێلەکانی تر نوسیو داوای لێ کردن بێنە سەردانی.

لەماوەی 10 رۆژدا نزیکەی 4 هەزار کەسی لێ کۆبوەوەو، لەماوەی 20 رۆژدا بون بە11 هەزار کەس. کەوتە گەمارۆدانی قەڵاکە. ولاٌخو داژەڵی تاڵان کردن.

دانیشتوانی قەڵا بەتەنگ هاتن. مورتەزاقولی و عەبدولعەلی و میرزا تەقی و گەورەکانی تری ناو قەڵای گەمارۆدراو بڕیاریاندا داوای یارمەتی لەحەسەنعەلی خانی ئەردەڵان بکەن. نامەیەکی بەکۆمەڵیان بۆ نوسی.لەنامەکەدا بەڵێنیان دایە لەو شەڕەدا هەرچی چەکێکی بەکار هێنا بۆی بیژێرن. نامەو نێردراو گەیشتە لای حەسەنعەلی خان.

حەسەنعەلی خان لەوەڵامدا بۆی نوسینەوە کە: داواکەی ئێوە رەوایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا شوێنی شا چۆڵە، ئەگەر ئەم شەڕە بکەین توشی دوژمنایەتی خێڵەکی ئەبین. چونکە ئێلاتی کوردستان و کرماشان دراوسێی یەکترین. لەهەرلایەک بکوژرێ، دوژمنایەتی لەپاش بەجێ ئەمێنێ. بەتایبەتی کەئیمامقولی‌یش زەنگەنەیە. داوای لێ کردن نامەیەکی تری بۆ بنوسن و بەکۆمەڵ مۆری بکەن. لەو نامەیەدا ئەوان دۆباڵی شەڕەکەو خوێنی کوژراوەکانی هەردولا بگرنە ئەستۆ. بۆ ئەوەی ئەمان لەدوارۆژدا توشی دوژمنایەتی و لێپرسینەوە نەبن. بەڵێنی دانێ دوای گەیشتنی نامەیەکی وەها هێزێکی گەورە ساز بداتو بچێتە سەر ئیمامقولی. ئەگینا خۆی لەو شەڕەوە ناگلێنێ.

دوای گەیشتنی ئەم وەڵامە مورتەزاقولی خانی زەنگەنە، عەبدولعەلی خانی خۆراسانی و میرزا تەقی خانی گولستانەو، هەمو سەرانی قەوم، کە لەقەڵادا گەمارۆ درابون، بەڵگەیەکیان نوسی و بەکۆمەڵ مۆریان کرد. دۆباڵی شەڕو کوژراوەکانیان گرتە ئەستۆی خۆیان.

حەسەنعەلی خان 25 هەزار سواری کۆکردەوە. بەو لەشکرەوە بەڕێ کەوت بۆ سەر کرماشان. لەبیلاوەر خێوەتگای دامەزراند. کەوتە خۆئامادە کردن بۆ شەڕی داهاتو.

ئیمامقولی لاوێکی سەرگەرمو هەڵەشە بو. بەنازایەتی خۆیەوە ئەنازی. کەهەواڵی هاتنی لەشکری ئەردەڵانی پێ گەیشت، هەزار کەسی لەهێزەکەی هەڵبژاردو بەرەو بیلاوەر کەوتە رێ.

پیاوە نزیکەکانی زۆری لەگەڵ خەریک بون بۆ ئەوەی بەهێزێکی واکەمەوە نەچێتە سەر لەشکری بەژمارە زۆری ئەردەڵان. بەڵام ئیمامقولی گوێی لێ نەگرتن. کەزانییان گوێیان لێ ناگرێ، زۆری لەگەڵ خەریک بون بۆ ئەوەی جارێ چاوەڕێ بکا تا لەشکری ئەردەڵان لەدەربەندەکە تێ ئەپەڕێ و دێتە دەشتاییەوە، ئەوسا پەلاماریان بدا. لەمەشدا بەقسەی نەکردن بەڵکو دانیە بەر توانجو تانەو بەترسنۆکی لەقەڵەم دان. لای وابو بەو هێزە پچوکە لەشکری ئەردەڵان ئەشکێنێ و تا سنە راویان ئەنێ.

حەسەنعەلی خان لەناو دەربەندەکەدا بۆیان دامەزرا.

تفەنگچییانی هەورامی لەکێوەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دەربەندەکەدا دامەزراند. چەمێک کە بەناو دەربەندەکەدا ئەڕۆیشت، ئەم بەبەردی زل بەری گرتو ئاوەکەی شکاندە سەر رێگاکە. بۆ ئەوەی گڵی رێگاکە ببێ بەقوڕ، زەلاحو وڵاخی تێدا بچەقێ.

دەمەو بەیان ئیمامقولی گەیشتە دەمی دەربەند. گەنج محەمەد بەگی زەنگەنەو سلێمان بەگی زەنگەنە، کەدو کەسی شارەزای شەڕ بون، هەریەکەی لەگەڵ 100 کەس کرد بەچەرخەچی. سەیدی سوڵتانی جەلیلوەندیشی بە 3 سەد سوارەوە نارد بەشاخەکەدا هەڵبگەڕێ. خۆیشی بە 500 سوارەوە خۆی ئامادەکرد بۆ هێرش بۆ ناو دەربەند.

چەرخەچییەکان بەخێرایی بەڕێ کەوتن. بەڵام هەمویان لەناو قوڕدا چەقین. چەندی تەکانیان ئەدا زیاتر ئەچەقین. چەرخەچییەکانی ئەردەڵان کە لەوشکاییدا بۆیان دامەزرا بون، دایان گرتنەوە زۆریان لێ کوشتن.

حەسەنعەلی خان 3 هەزار سواری لەشاخەوە نارد بەدیوی ئەودیودا شۆڕببنەوە، دەمی دەربەندەکەیان لێ دابخەن و، رێگەی کشانەوەیان لێ بگرن.

سەیدی کە بەشاخەکەدا هەڵگەڕا دی هێزەکەی خۆی کەمو دوژمن زۆر، بەخۆیدا رانەپەڕمو پەلاماریان بدا لەنشێوێکەوە ئاوابو بەرەو ناوچەکەی خۆی گەڕایەوە.

ئیمامقولی هێرشی کرد بۆ ناو دەربەند. ئەمانیش لەقوڕدا چەقین.

حەسەنعەلی خان فەرمانیدا دەوری ئیمامقولی بگرنو نەهێڵن کەسیان لێ دەربچێ.

ئیمامقولی بەزەحمەتێکی زۆر خۆی لەقوڕەکە دەرباز کردو لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەسوارەکانی گەڕایەوە دواوە. ویستی لەدەمی دەربەند تێ بپەڕێ دی گیراوە. بەناچاری بەغارو شەڕ خۆی کرد بەناویاندا دەرباز بو.

جگە لەئیمامقولیو چەند کەسێ لەسوارەکانیو سەیدی کە لەسەرەتاوە هەڵات بو، کەسی کەیان دەرنەچو. ئەوانی تریان هەندێکیان کوژرانو هەندێکیان بەدیل گیران.

هەواڵی شکانی ئیمامقولی لەپێش خۆیدا گەیشتە کرماشان. زۆری ئەوانەی لێی کۆبوبونەوە بڵاوەیان لێ کردو گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. ئیمامقولی هاتەوە کرماشان بۆ ئەوەی هێزەکەی رێک بخاتەوە. هێزی پێ کۆ نەکرایەوە. کرماشانی بەجێ هێشت روی کردە ناو ئێلاتی وەند کەهاوپەیمانی زەنگەنە بون.

وەند ئێلێکی گەورە بو پێک هات بو لەم تیرانە: ئەحمەد وەند، کاکە وەند، قولی عەلی وەند، جەلال وەند، جەلیل وەند، مافی وەند، بەهتلی وەند، قوریە وەند، خەلیل وەند، خواجا وەند، زوبێرە وەند، نانەکەلی وەند، بوجول وەند. (گلستانە: 151-158).

حەسەنعەلی خان هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بەگەمارۆدراوەکانی ناو قەڵاداو خۆیشی هاتە نزیکیان. سەرداروو گەورەکان بۆ پێشوازی لەقەڵا دابەزینو بۆ میوانداری بردیانە ناو قەڵاکە.

سەردانی قەڵاو جبەخانەکەی کرد. 5 تۆپی لێ وەرگرتنو رۆژی دوایی گەڕایەوە خێوەتگاکەی خۆی.

### ئەردەڵانو کەریم خان

لەمێژوی ئێراندا کەریم خانی زەند، کە خۆی بەوەکیلی دەوڵەتو وەکیلی رەعایا نەک بەشا داناوە، بەیەکێ لەدادپەروەرترین حوکمڕانەکانی ئێران ناسراوە. کەچی مێژونوسانی ئەردەڵان بەچاک باسی ناکەنو هەندێکیان هێرشیان بردۆتە سەری، بەتایبەتی نوسەری (لب التواریخ: 104-105). بەدوای ئەویشدا (تاریخ اردلان: 101)، (حدیقەی ناسری: 154)، (تحفەی ناسری: 145)، کەریم خان تاوانبار ئەکەن بەوێران کردنو تاڵان کردنو سوتاندنی سنە. کەسیان هۆی ئەم کارەیان رون نەکردۆتەوە.

هەواڵەکانی (حدیقەی ناسری: 154) گێڕاوێتیەوەو، (تحفەی ناسری: 145) دوبارەی کردۆتەوە سەبارەت بەهێرشی کەریم خان بۆ سەر کوردستانو گەمارۆدانی حەسەنعەلی خان لەقەڵای قەراتوردا (1164) و، دوای ئەوە هێرشی هاوبەشو بەجوتەی حەسەنعەلی خانو کەریم خان بۆ سەر عەلی مەردان خانی بەختیاری، راست نین. لەوساڵانەدا حەسەنعەلی خان نەک هەر والیی کوردستان نەبوە، بەڵکو لەژیانیشدا نەماوە.

گلستانە بەدرێژی هۆی دوژمنایەتی کەریم خانی لەگەڵ ئەردەڵان رون کردۆتەوە.

قەڵای کرماشان نزیکەی 14 مانگ لەگەمارۆی هێزەکانی زەندا بو. پارێزەرانی قەڵا ئامادە نەبون خۆیانو قەڵاکە بەدەستەوە بدەن. کەریم خان بۆ بەلادا خستنی ئەم کۆسپە بەهێزێکی گەورەوە روی کردە کرماشان. کێشەکەی بەگفتوگۆ بەلادا خست (بە مەزەنە ئەبێ ساڵی 1165 بوبێ). ئینجا روی کردە سنە.

خەڵکی ناوچە کە بەهاتنی کەریم خانیان زانی، خوسرەو خان، کە لەو کاتەدا والیی ئەردەڵان بو، لەگەڵ ئەعیانی سنە بەپیریەوە چونو، بەگەرمی پێشوازییان کردن. خوسرەو خان خۆی میوانداریی لەکەریم خان کرد.

حەسەنعەلی خان، والیی پێشوی کوردستان، لەسەر داوای میهر عەلی خان بۆ سەرکوتکردنی کەریم خانو لەشکری زەند چو بۆ هەمەدانو دوایی دویان کەوت بۆ پەریو کەمازان. مەڵبەندی ژیانی ئێلی زەند،

لەوێ مایەوە تا سەلیم پاشای بابان هێرشی کرد بۆ سەر ئەردەڵان. کەریم خانو سەرۆکەکانی ئەم ناخەیان لەدڵ دا بوو.

وەکو گلستانە ئەڵێ: کەریم خان لەبەر ئەو دوژمنایەتیە بڕیاریدا کوردستان وێران بکا. بەقسەی تاقمێ هەرچیو پەرچی، کە لەناو لەشکرەکەیدا بوونو کاری تەواویان تێ ئەکرد، کەوتە بێدادی.

کەریم خان لەسەرەتای دەوڵەتداریدا بوو، بەتەواوی دەستی بەسەر لەشکرەکەیدا نەئەڕۆیشت. هەرچیەکیان ئەکرد ڕێگەی لێ نەئەگرتن. لەو چەند ڕۆژەدا زیانێکی زۆریان بەسنەو ناوچەکانی دەوروبەری گەیاند. خەڵکەکەیشی بەهۆی نیفاقی ناوخۆیانەوە زەرەری جۆراوجۆریان لێ کەوت. (گلستانە: 179-180).

کەریم خان سنەی بەجێ هێشت بەرەو هەمەدان.

## حەسەنعەلی خانو شەڕی زەند

گولستانە ئەم شەڕە بەدرێژی ئەگێڕێتەوە:

حەسەنعەلی خان، دوای شکاندنی نیمامقولی، وەکو بەڵێنی دابوو لەشکرەکەی لەکرماشانەوە بەڕێ خست بچێ بۆ یارمەتیدانی میهر عەلی خان، کەهێشتا لەقەڵای ولاشجردا لەلایەن لەشکری زەندەوە گەمارۆ درابوو.

حەسەنعەلی خان بەرەو هەمەدان بەڕێ کەوت. لەشکری زەند کەبەمەیان زانی، دەوری قەڵاکەیان بەرداو کشانەوە پەریو کەمازان، مەڵبەندی خۆیان.

حەسەنعەلی خان لەزاغە لەنزیک هەمەدان خێوەتگای دامەزراند. میهر عەلی بۆ پێشوازی لەحەسەنعەلی خان لەقەڵا دابەزی. خۆی کەوتە کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی هێزە پەراگەندەکەیو، داوای لەحەسەنعەلی خان کرد بچێ بۆ سەرکوتکردنی کەریم خانی زەند.

حەسەنعەلی خان بەلەشکرەکەیەوە بەرەو پەریو کەمازان کشا. کەریم خان بەخۆیدا ڕانەپەرمو شەڕی ڕووبەڕوویان لەگەڵ بکا. ژنو منداڵەکانی ناردە جێگایەکی ئەمینو خۆیو هێزەکەی دەستیان کرد بەشەڕی پارتیزانی. هەمو شەو پەلاماری لەشکری ئەردەڵانیان ئەدا. خەڵکیان لێ ئەکوشتنو ولاخو کەلوپەلیان لێ ئەگرتن. حەسەنعەلی خان چەندی هەوڵیدا لەشوێنێکا بەگیریان بهێنێ نەیتوانی.

45 ڕۆژ بەو جۆرە مایەوە. لەو ماوەیەدا هەواڵی پێ گەیشت سەلیم پاشای بابان بەهاندانی گەورەو ڕیش سپیەکانی ناوچەکە، بەلەشکرێکی 18 هەزار کەسییەوە هاتۆتە ناوچەی ئەردەڵان، گەرەکێتی سنە بگرێ. حەسەنعەلی خان وازی لەڕاونانی زەند هێناو، بەپەلە بەرەو کوردستان گەڕایەوە.

ئەمجارە کەریم خان وازی لەحەسەنعەلی خان نەهێنا. بەدرێژایی ڕێگای گەڕانەوەیان لەدوایی هێزەکەیانی ئەدا لێی ئەکوشتنو، ولاخو کەلوپەلی لێ گل ئەدانەوە. لەنزیک تویسرکان لەدەربەندێکا کە ئەبو لەشکرەکەی حەسەنعەلی خانی پێدا تێ بپەڕێ، کەریم خان بەهێزێکی 70 کەسییەوە خۆی بۆ لەبۆسە نابون. لەناکاو هەڵی کوتایە ناوجەرگەی لەشکرەکەوە. هەندێکی لێ کوشتنو پشێویەکی زۆری تێ خستن. دەستی گرت بەسەر گەنجینەکەی حەسەنعەلی خاندا. 2 ئێستر کەبارەکانیان زێڕی سپیو 1 ئێستر کەبارەکەی ئەشرەفی بو لەگەڵ چەند بار کوتاڵو شتی گرانبەهاو چەند سەر ئەسپی بەتاڵان بردو بەسەلامەتی بۆی دەرچو. (گلستانە: 160).

سەرەڕای ئەوەش بنەماڵەی ئەردەڵان نەک هەر هیچ دۆستایەتیەکیان لەگەڵ کەریم خانو گەورەکانی زەند دانەمەزراندبو. بەڵکو لەگەڵ دوژمنەکانی کەریم خان هاوکار بون. سوبحانویردی خانو حەسەنعەلی خان لەلایەن شاهەکانی ئەفشارەوە دانرابونو، خوسرەو خانی ئەوەی سوبحانویردیش لەلایەن محەمەد حەسەن خانی قاجار، دوژمنی خوێنەخۆی کەریم خانەوە، دانرابو.

**سەرەنجامی ئیمامقولی خان**

میهر عەلی خان کەوتە کۆکردنەوەی سوپا. مورتەزاقولی خانی کۆسە ئەحمەدلوی ئەفشار بە 2 هەزار سوار لەسەر داوای شاهرۆخ گەیشتە هەمەدان. لەگەڵ میهر عەلی یەکیان گرتەوە. 13 هەزار سواریان کۆکردەوە بەرەو کرماشان بەڕێ کەوتن. لەپێشەوە سواریان نارد ئاگاداری دانیشتوانی قەڵای کرماشانیان کرد کەوا بەڕێگاوەن. گەیشتنە بێستون. کاربەدەستانی قەڵا چەند کەسێکیان نارد بۆ پێشوازیو بەخێر هێنانیانو بردنیان بۆ کرماشان. لەو کاتەدا ئیمامقولی خەریکی خڕکردنەوەی لەشکربو لەناو ئێلاتی وەندا.

دوای ئەوەی گەیشتنە کرماشان خانەکان لەقەڵا دابەزینو کەوتنە تەگبیر بۆ چارەسەرکردنی ئیمامقولی. هەندێکیان پێیان وابو یەکسەر پەلاماری بدەن. بەڵام هەندێکی تریان لایان وابو کەلەو ناوچە شاخاوییەدا توشی زەرەری گیانی زۆر ئەبن. چاکتر وایە بەقسەی خۆش بیخەنە ناو داو.

کابرایەکیان بەناوی حسێن چراخ کەباوەڕپێکراوی میهر عەلی بو. لەزمان لوسیو فێڵبازیدا بێ نمونە بو. هەڵبژارد بچێتە لای ئیمامقولی بۆ ئەوەی رازی بکا بیهێنێ بۆ لایان.

ئیمامقولی بەقسەکانی حسێن چراخ هەڵخەڵەتا. بێ ترسو بەدڵنیایی سواربو لەگەڵی بۆ بینینی خانەکان لەکرماشان.

ئیمامقولی کەگەیشتە لایان چاویان دەرهێناو بەگیراوی رەوانەی قەڵایان کرد. لەشکرەکانی هەمەدانو ئەفشار گەڕانەوە جێگەکانی خۆیان. (گلستانە: 161-165).

**شەڕی سەلیم پاشاو حەسەنعەلی خان**

نوسەری "نیل" ئەڵێ: سلێمان پاشای بەبە لەدەس سەلیم پاشای ئامۆزای هەڵاتو هانای بۆ حەسەنعەلی خان هێنا. گوایە حەسەنعەلی بۆ ئەوەی سلێمان بباتەوە سەر جێگای خۆی لەمەریوان توشی شەڕ بوە لەگەڵ سەلیم پاشاو، شکاوە.

بەڵام گلستانە کەهاوچەرخو ئاگاداری روداوەکە بوە بەجۆرێکی تری ئەگێڕێتەوە:

لەکاتێکدا حەسەنعەلی خان خەریکی راونانی کەریم خانی زەندو، لەشکرەکەی بو. هەواڵی بۆ هات کەسەلیم پاشای بابان بەهێزێکی گەورەوە بەهاندانی هەندێ لەگەورەو ریش سپییەکانی ئەردەڵان، لەشکری هێناوە بۆ گرتنی سنە. حەسەنعەلی خان دەس لەراونانی کەریم خان هەڵئەگرێو بەپەلە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەردەڵان. حەسەنعەلی خان دڵی زۆر کەسی لەگەورەکانی ئەردەڵان رەنجاند بو. ئەمانە سەلیم پاشایان هاندا بوبێت بۆ گرتنی سنە. لەڕێگاش هەندێ لەوانەی لەگەڵی بون، خۆیان ئەدزییەوەو ئەیاندایە پاڵ سەلیم پاشا.

حەسەنعەلی خان لەشوێنێکی نزیک سنە (دەشتی مەریوان) پەلاماری سەلیمیدا. سەلیم شەڕەکەی بردەوەو حەسەنعەلی خانی بەخراپی شکاند. حەسەنعەلی خان لەگەڵ چەند کەسێ لەهێزەکەی دەربازبونو بۆ خۆحەشاردان روی لەشاخ کرد. (گلستانە: 167).

1. زۆری بنەماڵەی ئەردەڵان، بۆ رازی کردنی دڵی شاکانی ئێران مەزهەبی رەسمیی دەوڵەتیان وەرگرت بو. ببون بەشیعە. حەسەنعەلی خان یەکێ بو لەوانە. لەکاتێکدا دانیشتوانی ئەردەڵان وەکو میرەکانی بنەماڵەی بابان هەمویان سوننە بون. لەو سەردەمەدا ناکۆکی شیعەو سوننە توندوتیژو، یەکتریان بەکافر دائەنا.
2. حەسەنعەلی خان رەفتاری لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەو گەورەپیاوەکانی توندوتیژ بو. هەر لەو ماوەیەدا چاوی محەمەد عەلی سوڵتانی دەرهێنابو، کەگەورەی بانەو هەورامان بو. لەتۆڵەی ئەمەدا ئەمیش دەستی هەبو لەهاندانی خەڵکی ناوچەکەدا دژی حەسەنعەلی خانو، هێنانی سەلیم پاشادا.

3. لەو ماوە کورتەدا هێزەکەی حەسەنعەلی خان توشی زنجیرەیەک شەڕی یەک لەدوای یەک بوبو: شەڕ لەگەڵ ئیمامقولی زەنگەنە لەنزیک کرماشان. شەڕ لەگەڵ زەند لەنزیک هەمەدانو مەلایەر. کە لەگەڵ لەشکرەکەی سەلیم پاشادا چون بەگژ یەکدا، هێزەکەی ئەم شەکەتو ماندو بو.
ڕەنجوری ئەڵێ: "شکست حەسەن ئەلی خان 1163"

## سەرەنجامی حەسەنعەلی خان

نوسەری (ذیل شرفنامە) ئەڵێ:

"حەسەنعەلی خان بەهیوای دەسگرۆیی‌و یاریدە وەرگرتن چوە لای، (ئازاد خانی ئەفغان) کەئەو کات لەناوچەی ئازەربایجان ئاڵای شاهێتیو سەربەخۆیی هەڵکردبو. سەلیم پاشا لەترسی یارمەتیدانی ئازاد خانو گەڕانەوەی حەسەنعەلی خان. بێ‌وچان کەوتە شوێنیو گەیشتە هۆردوی ئەفغان.

ئازاد خان کەباری حەسەنعەلی خانی لاواز هات بوە بەرچاو سەلیم پاشای لەوپەڕی هێزو دەسەڵاتدا دەدی، سەرشۆڕی بێ مروەتی بەخۆی ڕەوا دیتو بەتەماعی ماڵی دنیاو پارە زۆری سەلیم پاشا، کە لەگەڵ گەلێک خزمەتی دیکەدا بەڵێنی پێدا بو. حەسەنعەلی خانیدا بەدەستی سەلیم پاشاوە. بەڵام هەر لەو ڕۆژانەدا حەسەنعەلی خان بەمەرگی وەعدەکراو مردو. سەلیم پاشاش بەهۆی ئەو نزیکایەتیەوە. ڕوی ئیتاعەتی لەوەزیری بەغدا وەرگێڕا. سەری بۆ ئازاد خان دانەواند. ئیتر لەو سەردەمەدا هیچ گەورەپیاوێک لەبنەماڵەی مەزنی باوە ئەردەڵان نەمابو. مەزنایەتی خانەدانەکە مابوەوە بۆ خوسرەو خانی کوڕی ئەحمەد خان کەئەو کات لەتەمەنی 22 ساڵیدا بو". (ئیبراهیم ئەردەڵانی: 29).

ئازاد خان وەکو مێژونوسەکانی ئەردەڵان تاوانباری ئەکەن. بۆ تەماعی دنیاو بەرامبەر چەردەیەک دراو وەکو (وقائع نگار: 154)و (فخر الکتاب: 146) ئەڵێن: 4 هەزار تمەن. دا پیاوی کرد حەسەنعەلی خانی بەگیراویو زنجیرکراویدا بەدەس سەلیم پاشاوەو. ئەویش وەکو (ذیل شرفنامە: 29) ئەڵێ: هەر لەو ڕۆژانەدا بەمەرگی وعدەکراو مرد. یا وەکو (لب التواریخ: 104) ئەڵێ: کوشتی. یان وەکو (مستورە: 100) ئەڵێ: دوای گلدانەوەی 7 مانگ بەگیراوی ساڵی 1164 لەقەڵاچوالان کوشتی.

ئازاد خان لەو کاتەدا لەململانێی دەسەڵاتدا بو لەگەڵ کەریم خانی زەندو محەمەد حەسەن خانی قاجار. کە هەریەکەیان لەلایەکی ئێراندا خەریکی پەیداکردنی دەسەڵات بون. ئەو دو گەورە پیاوە هەردوکیان شیعە بون. لەکاتێکدا ئازاد خان سوننە بو. حەسەنعەلی خان شیعەو سەلیم پاشا سوننە بو. ئازاد پێویستی بەکەسێکی ناودارو دەسەڵاتداری وەکو سەلیم بو لەو ناوچەیەدا، لەو ململانێ سەختەدا ببێتە پشتیوانی.

پێ ئەچێ سەلیم پاشا ماوەیەکی زۆر لەسنەدا نەمابێتەوە. چونکە کە کەریم خان چوتە سنە (1166) خوسرەو خانی ئەردەڵان والی کوردستان بوە. وەکو هەندێ لەمێژونوسانی ئەردەڵان ئەڵێن: (فخر الکتاب: 147)، (مستورە: 101). لەسەر کوشتنی حەسەنعەلی خان خەڵکی سنە لەسەلیم پاشا ڕەنجاونو دەریان کردوە. ڕەنگە ئەمە هەندێ ڕاستی تێدا بێ. بەڵام لەو کاتەدا ململانێی دەسەڵات لەنێوان کەریم خانی زەند کەخوراسانو. محەمەد حەسەن خانی قاجار کەسەروی ئێرانو. ئازادخانی ئەفغانی کەئازەربایجانو. عەلی مەردان خانی بەختیاری کەلورستانی کردبو بەبنکەی لەشکرکێشیەکانی. گەیشت بوە بەرزترین لوتکەی توندوتیژی. میرەکانی بابانو ئەردەڵان بوبون بەبەشێ لەم ململانێیەو. بەگوێرەی گۆڕانی تەرازوی هێز لەنێوان ئەم سەرکردە ناکۆکانەدا. ئەوانیش ئەگۆڕان.

سەلیم پاشا چارەنوسی خۆی بەئازاد خانەوە بەست بو. بەڵام خوسرەو خانی ئەردەڵانو بنەماڵەکەیان هاوکاری نادر شاو جێنشینەکانیو. دوای ئەوانیش هاوکاری محەمەد حەسەن خانی قاجار بون.

پێ ئەچێ لەو کاتەدا کەکەریم خان روی کردۆتە کرماشان‌و، دوای ئەوێ ئەردەڵان، سەلیم پاشا سنەی بەجێ هێشت بێ‌و، دابێتیە پاڵ ئازاد خان لەورمێ. لەو شەڕەدا کە لەنزیک ورمێ لەنێوان هێزەکانی کەریم خان لەلایەکو، هێزەکانی ئازاد خان: فەتحعلی خانی ئەفشار، شاباز خانی دونبولی، سەلیم پاشای بابان، لەلایەکی ترەوە، قەوماو بەتێشکانی زەند تەواو بو، سەلیم پاشا دەورێکی کاریگەری لەبەلادا خستنی‌دا گێڕاوە.

سەلیم پاشا بە 10 هەزار سوارەوە هەڵی کوتاوەتە سەر "بونە" ی کەریم خان، لەکاتێکدا کەهێشتا هەندێکیان باریان نەخست بو، هەندێکیشیان پشتێنیان کردبوەوەو پاڵیان دابوەوە. هەندێ خێوەتیان هەڵدا بو، هەندێکیشیان هێشتا نەگەیشت بون. لەشکر کەوتە هەڵاتن. کەریم خان چەندی هەوڵی‌دا هێمنیان بکاتەوەو بەری راکردنیان بگرێ، کەڵکی نەبو. لەشکری زەند پەرەوازە بو. خانەکانی زەند گەڕانەوە پەری‌و کەمازان‌و، کەریم خان چو بۆ ئەسفەهان بۆ کۆکردنەوەی لەشکر. (گلستانە: 273).

ململانێی دەسەڵات کۆتایی نەهات تا عەلی مەردان خانی بەختیاری لە 1167دا‌و، محەمەد حەسەن خانی قاجار لە 1172دا کوژران. (هدایت: 263و 269). ئازاد خانیش پاش چەند سەرکەوتن‌و شکان، ماوەیەکی بەخۆشاردنەوە لەشارەزورو هەکاری‌و، بەپەنابەری لەبەغدا‌و گورجستان بەسەر برد. سەرەنجام سەری بۆ کەریم خان دانەواند.

**سەرەنجامی سەلیم پاشا**

نوسەری (ذیل شرفنامه) ئەڵێ:

"لەو دو سێ ساڵەی سەردەمی ئازاد خانی ئەفغان‌دا، بەهۆی دوژمنکاری سەلیم پاشای بەبە لەگەڵ بنەماڵەی ئەردەڵانەوە، ئیقبال روی نەکردە خوسرەو خان. بەڵام ئەو کاتەی دەنگی هاتهاتی محەمەد خانی قاجار لەئەستەرابادی مازندەرانەوە تا موغانی ئازەربایجان بەرز بوەوە. خوسرەو خانی مەرد‌و رەند، کە بەهۆی غیرەتی زگماکەوە هەمو کات گوێ قوڵاغی بیستنی هەواڵێکی وادبو. لەپایتەختی قەزوین هەڵات‌و لەگەڵ چەند کەسێکی هاودەمی خۆی‌دا لەموغان چوە خزمەتی محەمەد حەسەن خانی قاجار.

هەمو چەشنە مەرحەمەت‌و لاواندنەوەیەکی لەگەڵ‌دا کراو ئەم دڵنەوایی‌و میهرەبانیە رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر دەبو. بەڵێنی والیتی‌و حکومەتی ئەردەڵان‌و شارەزور، دڵگەرم‌و شادمانی دەکرد. تا کاتێ کەشەڕی محەمەد حەسەن خان‌و ئازاد خانی ئەفغانی نزیک بوەوە. پاش سێ چوار مانگێک، لەساڵی هەزارو شەست‌و نۆدا (1169)، شەڕی محەمەد حەسەن خانی قاجارو ئازاد خانی ئەفغانی لەناوچەی ورمێ روی دا. لەکاتێکدا سەلیم پاشای بەبەش لەگەڵ ئازاد خان دابو، شکستی گەورە بەسەر ئازاد خان‌و سەلیم پاشادا هات‌و ئەرکو خزمەتێکی زۆر لەخوسرەوخان وەشایەوە. ئازاد خان بەرەو هەکاری هەڵات‌و سەلیم پاشای بەبەش روەو سنوری بابان کشایەوە کەئەو کات سلێمان پاشای ئامۆزای لەلایەن والی بەغداوە بەڕێوەی دەبرد.

سلێمان پاشای بەبە، بە رقەبەرایەتی بنەماڵەی باوە ئەردەڵان، بەفێڵ لەگەڵی‌دا ئاشت بوەوەو هەردوکیان پێکەوە پێشکەشیەکی قورسیان بەچەند کەسی باوەڕپێکراوی خۆیان‌دا نارد بۆ دیوەخانی محەمەد حەسەن خانی قاجار، هەموشی بەو هیوایەی کەناوچەی ئەردەڵان بدرێت بەسەلیم پاشا. محەمەد حەسەن خان، بەهۆی گەورەیی رۆح‌و غیرەتی زگماکیەوە، پێشکەشیەکانی نەخستە بەرچاو داخوازییەکانی وەرنەگرت. لەوەڵامیش‌دا فەرموی. ئەگەر سەلیم پاشا خزمەتمان پێ بکات، ئەوا ناوچەیەکی تر لەمەملەکەتی ئێرانی دەدینێ. لەهەمان کاتیش‌دا، هەر بە بەرچاوی نوێنەرەکانی ئەوەوە خەڵاتی والیتی (ئەردەڵانی) بەئەسپ‌و زین‌و بەرگی ئاڵتون‌و میناو خەنجەری جەواهیرنیشانەوەدا بەخوسرەو خان‌و رەوانەی ئەردەڵانی کرد.

کاتێ خوسرەو خان گەیشتە ناوچەی بانەی سەر بەئەردەڵان. سەلیم پاشای بەبە، بەخۆی‌و بەهەزار سوارەوە بەتەماحی ئەوەی بتوانن شتێک بەشتێک بکەن، سەرەڕێیان پێ گرت. هەردو قشون لەمەحاڵی بانە

تێک ئاڵانو دوای کوشتوبڕێکی زۆر، شکستی گەورە بەسەر سەلیم پاشای بەبەدا هاتو سێ سەد چوار سەد کەسێک لەسوارەی دەوروبەری بونە خۆراکی شیری ئازایانی ئەردەڵان.

دوای هەڵاتن، سەلیم پاشا چارەی کاری لەوەدا دی بچێ بۆ بەغدا، وەک گوتویانە: "کاتێ ئەجەل نزیک دەبێتەوە، راو دەچێتە لای راوچی". ئەویش هەر ئەوەندە گەیشتە بەغدا، لەسەر شاهیدی شاهیدانو بەحوکمی وەزیر، لەگۆڕەپانی ئیمامی ئەعزەمدا کوژرا". (ئیبراهیم ئەردەڵانی: 29-31).

# خوسرەو خان (1168–1206)

## -1-

لەسالانی 1163-1168دا پێ ئەچێ هەلومەرجی ئەردەلان ئاناراو شێواو بوبێ‌و، دەسەلات لەسنەدا لەنێوان سەلیم پاشای بابان، کەریم خانی عەباسقولی خان‌و خوسرەو خانی خان ئەحمەد خاندا دەستاودەستی کردبێ.

سەلیم پاشای بابان دوای شکاندنی حەسەنعەلی خان (1163) دەستی بەسەر سنەدا گرت، بەلام وەکو هەندێ لەمێژونوسەکان ئەلێن، دوای کوشتنی حەسەنعەلی خان (1164) خەلکی سنە سەلیمیان دەرکردوەو، کەریم خانی برای حەسەنعەلییان کردوە بەحوکمرانی خۆیان. بەلام کەریم خان کابرایەکی بودەلەو بێ فەڕ بوە. شارەزای کاروباری حوکمرانی نەبوە، بەلکو زۆردار بوە. (لب: 106) نمونەیەک لەسەر جۆری حوکمڕانیی کەریم خان ئەگێڕێتەوە: "پیاوی ئەعیانێ بۆ دزی ئەچێتە سەر مالی یەکێ. خاوەن مال دزەکە ئەگرێ‌و ئەیباتەلای کەریم خان. کەریم خان دەسبەجێ دزەکە بەرئەداو گوێی خاوەن مالەکە ئەبڕێ". کەریم خان زۆر نەماوەتەوە. ئینجا خوسرەو خانی کوڕی خان ئەحمەد خان خۆی سەپاندوە. (مستورە: 101-103).

خوسرەو خان لەسەرەتادا نەیتوانیوە جێگیر بێ چونکە هەمیشە هەڕەشەی سەلیم پاشای لەسەر بوە، کە لەو کاتەدا یەکێ لەهاوکارە نزیکەکانی ئازاد خانی ئەفغانی بوەو، بنکەی دەسەلاتداری ئازاد خانیش لەورمێ بوە.

نوسەری (ئیلشرفنامە: 29)ئەلێ:

"لەو دو سێ سالەی سەردەمی ئازاد خانی ئەفغاندا، بەهۆی دوژمنکاری سەلیم پاشای بەبە لەگەل بنەمالەی ئەردەلانەوە، ئیقبال روی ئەکردە خوسرەو خان. بەلام ئەو کاتەی دەنگی هاتهاتی محەمەد خانی قاجار لەئەستەرابادی مازندەرانەوە تا موغانی ئازەربایجان بەرز بوەوە، خوسرەو خانی مەردو رەند، کە بەهۆی غیرەتی زگماکەوە هەمو کات گوێ قولاغی بیستنی هەوالێکی وادبو، لەپایتەختی قەزوین هەلاتو لەگەل

چەند کەسێکی هاوڕەمی خۆیدا لەموغان چوە خزمەتی محەمەد حەسەن خانی قاجار.

هەمو چەشنە مەرحەمەتو لاواندنەوەیەکی لەگەڵدا کراو ئەم دڵنەوایی و میهرەبانیە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دەبو. بە بەڵێنی والیێتی و حکومەتی ئەردەڵان و شارەزور، دڵگەرمو شادمانی دەکرد..".

مێژونوسەکانی ئەردەڵان ئەڵێن. سەلیم پاشا پەنای بۆ محەمەد حەسەن خانی قاجار بردوە، کە لەو کاتەدا دەستی بەسەر ناوچەکانی سەروی ئێراندا گرت بو، بۆ ئەوەی حوکمڕانی ئەردەڵانی پێ ببەخشێ. هەمویان ئەم چیرۆکە، بەکەمێ جیاوازییەوە، ئەگێڕنەوە: (لب التواریخ: 110، حديقة: 155-156)، (تحفة: 147).

سەلیم پاشا بەهیوای ئەوەی بکرێتە حاکمی کوردستان پەنا بۆ خانی قاجار ئەبا. خوسرەو خان کەبەم هەواڵە ئەزانێ، ئەویش بەهەڵەداوان خۆی ئەگەیەنێتە لای خانی قاجار. سکاڵای حاڵی خۆیو، باسی کوشتنی حەسەنعەلی خانی بۆ ئەکا. خانی قاجار ئەڵێ: "تۆ محەمەد حەسەن خانت خراپ ناسیوە، من ئەو کەسە نیم چاو لەئەنگی و عار بپۆشمو وڵات بەبێگانە بفرۆشم..".

بەگێڕانەوەیەکی تر گوایە وتویەتی: "خوسرەو خان تۆ سەرکەچەڵ محەمەد حەسەنت خراپ ناسیوە، قسەی من یەکێکە، کوردستان هی تۆیە، ئەم قسانەی پێ ناوێ، لەهەمو ڕویەکەوە دڵنیابە!".

بەقسەی (حديقة: 156)، (تحفة: 148) دوای ئەوەی خانی قاجار، خوسرەو خانی دادا بەوالیی ئەردەڵان، گەڕایەوە سنە (موحەڕڕەمی 1168). یاریدەدانی خوسرەو خان لەلایەن خانی قاجارەوە، ئەشێ ڕاست بێ، بەڵام پەنابردنی سەلیم پاشا بۆ خانی قاجار ڕێی تێ ناچێ، چونکە سەلیم پاشا یەکێ بوە لەهاوکارە نزیکەکانی ئازاد خانی ئەفغانی و، لەهەمو شەڕەکانیدا لەگەڵ کەریم خانی زەندو محەمەد حەسەن خانی قاجاردا هاوبەش بوە. لەم ڕوەوە نوسەری (نیل:31) ئەڵێ: ".. لەساڵی هەزارو سەدو شەستو نۆدا (1169)، شەڕی محەمەد حەسەن خانی قاجارو ئازاد خانی ئەفغان لەناوچەی ورمێ ڕویدا. لەکاتێکدا سەلیم پاشای بەبەش لەگەڵ ئازاد خاندا بو، شکستی گەورە بەسەر ئازاد خانو سەلیم پاشادا هاتو ئەرکو خزمەتێکی زۆر لەخوسرەو خان وەشایەوە. ئازاد خان بەرەو هەکاری هەڵاتو سەلیم پاشای بەبەش ڕوەو سنوری بابان کشایەوە کەئەو کات سلیمان پاشای ئامۆزای لەلایەن والیی بەغداوە بەڕێوەی دەبرد". خوسرەو خان ئەم ملۆزمەی لەکۆڵ ئەبوەوە تا لەبەغداد گیراو، کوشتیان (1170).

## -2-
## کوشتنی سەرانی جاف

ئێلی جاف یەکێکە لەئێلە گەورەکانی کورد. لەنێوان جەبەل حەمرین و کوێستانەکانی سنەدا گەرمیان و کوێستانیان کردوە. بەزاندنی سنورو زیان گەیان بەکشتوکاڵی دانیشتوانی دێهات، زۆر جار کێشەو شەڕی لێ پەیدا بوە. لەڕوی سیاسیەوە سەر بەمیرایەتی بابان بون و، لە لەشکرکێشیەکانی بابان‌دا بەشدار بون.

خوسرەو خان بۆ ئەوەی تەمێیان بکاتو سەریان پێ دابنەوێنێ ساڵی 1172، بەفێڵ میهر عەلی سوڵتان و خوسرەو بەگ، کە لەسەرۆکە دەسرۆیشتوەکانی جاف بون، بانگ ئەکا بۆ راو. بانگهێشتنەکەی قوبوڵ ئەکەن، بەڵام چونکە لێی دڵنیا نەبون، بۆ ئەوەی هەردوکیان پێکەوە نەکەونە داو، کەئەچن بۆ لای، یەکێکیان ئەچێتە ناو قەڵا بۆ لای و ئەوی کەیشیان لەدەرەوەی قەڵاکەدا لەگەڵ سوارەکانی تردا چاوەڕێ ئەبێ. هەروەها کەئەچن بۆ ڕاو، خوسرەو بەگ بەهانەیەک ئەدزێتەوە لەماڵ ئەمێنێتەوەو، میهر عەلی لەگەڵی ئەچێ.

دوای تەواوکردنی راوەکە، لەکاتێکدا خوسرەو خان بۆ نانی نیوەرۆ لانەدا، دەستەیەک لەپیاوەکانی ئەنێرێ خوسرەو بەگ بگرنو، لەوێش فەرمان ئەدا میهر عەلی بگرن.

میهر عەلی ئەگرنو کۆتو پێوەنگی ئەکەن. ئەوانەش کەئەچنە سەر خوسرەو بەگ، خوسرەو لەکاتی بەرگریدا ئەکوژنو، کەللەی سەری بەبڕاوی ئەبەنەوە بۆ خوسرەو خان. خان کەسەری بڕاوی ئەبینێ ئەڵێ: "میهر عەلی لەهەمو شتێکدا لەگەڵ خوسرەو بەگ شەریکو هاورێ بوە، ئینساف نیە خوسرەو بەگ بەتەنیا لەدیاری عەدەمدا بەجێ بهێڵێ، ئەویش بەخێرایی بنێرن بۆ دیاری عەدەمو بیگەیەنن بەخوسرەو بەگ!" دەسبەجێ ئەویش ئەکوژن. (تحفە: 150-151)، (لب: 113).

جاف چەندین جار کەوتۆتە بەر پەلاماری میرەکانی ئەردەڵان.

## -3-

## کەریم خانی زەندو خوسرەو خان

کەریم خان کەئەچێتە سنە خوسرەو خان پێشوازی لێ ئەکا. بەڵام لەشکری زەند سنە تاڵانو وێران ئەکا. ململانێی دەسەڵات هێشتا لەنێوان خانی زەندو مێملەکانیدا بەلادا نەکەوت بو. خوسرەو خان، بەلای خانی قاجاردا دائەشکێنێ. رەنگە یەکێ لەهۆکانیش ئەوە بوبێ کەرێچەڵەکی خانی زەندی پێ نزمتر بوبێ لەهی خۆی، بەتایبەتی کەخانی زەند لەبنەماڵەیەکی خێڵەکی نەناسراوی کوردی لەک بوە.

خوسرەو خان بەیارمەتی محەمەد حەسەن خانی قاجار کاروباری ئەردەڵانی گرتبوە دەس. کەخانی قاجار کوژرا خوسرەو خان پشتیوانەکەی لەدەس داو، ترسی لێ نیشت کەریم خان تۆڵەی لێ بکاتەوە. لەبەر ئەوە کەوتە قایمکردنی قەڵاو، سازدانی لەشکر. خانی زەند کەبەمەی زانی، بۆ ئەوەی ترسی خوسرەو خان برەوێنێتەوە، فەرمانی ولایەتو خەڵاتی بۆ نارد.

کاتێ کەریم خان لەتارانەوە گەیشتە سوڵتانیە، خوسرەو خان بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵیو فەرمانبەری، خان ئەحمەد خانی کوڕی بەدیارییەوە نارده لای. ئەویش رێزی لێ ناو، دڵنەوایی کردو، بەخەڵاتو بەراتەوە رەوانەی کوردستانی کردەوە. (حدیقە: 158)، (تحفە: 151-152).

## -4-

## سلێمان پاشای بابان لەسنە

نوسەری تحفە ئەڵێ:

"لەساڵی 1176دا سلێمان پاشای بابان بەنیازی داگیرکردنی کوردستان بەسوپایەکی فراوانەوە روەو مەریوان هات. خوسرەو خان کەبەوەی زانی بەو کۆمەڵەی کە لەبەردەستیدا بون چو بۆ بەرەنگاری سلێمان پاشا. لە مەریوان هەردولا دایان بەیەکدا. دوای کەششو کۆششێکی زۆر خوسرەو خان سەرکەوتو سلێمان شکا.

پاشای شکاو ئەم مەسەلەیەی بەنەنگو سوکی دانا بۆ خۆی. دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر چاکەی کاری خۆی لەوەدا دی کەبۆ تۆڵە سەندن بچێ بۆ دەرباری کەریم خان تەبەعیەتی ئێران قوبوڵ بکا. بەخۆئامادەکردنی پێویستەوە پەنای بۆ دەرگای کەریم خان برد. بەفێڵو فەرەجی زۆر خوسرەو خانی بەئێتیهامی سەیر تاوانبار کردو 3 هەزار تمەن زێری ئەختینەی پێشکەش بەکەریم خان کرد.

ئەم زمان لێدانەی سلێمان پاشا کینەی دێرینەی کەریم خانی وروژاند. خوسرەو خانی بانگ کرد بۆ شیراز. بەگەیشتنی دەستی لەکارکێشایەوەو، سلێمان پاشای کرد بەحاکمو رەوانەی سنەی کرد.

خوسرەو خان ماوەی یەک ساڵ لەشیراز نیشتەجێ بو. (تحفە: 152-153)

سلێمان پاشا لەسنە بەوپەڕی بەدخوییەوە حوکمڕانی ئەکرد. پاش یەک ساڵ لەجلی نوستندا بەدەستی فەقێ برایم ناوێک کوژرا. محەمەد پاشای برایشی بەفەرمانی کەریم خان بو بەحاکمی کوردستان. لەبەر ئەوەی محەمەد پاشا لەسلێمانی موتەسەڕیفو فەرمانگوزار بو لەلایەنی خۆیەوە عەلی خانی کوڕی ناردە سنە.

دو ساڵی تەواو لەم شتە تێپەڕی ناناڕامیەکی زۆر کەوتە کوردستانەوە. کاروباری شارو بلوکەکان لەهەمو ڕویەکەوە تێک چوبو. کەریم خانی وەکیل لەکردەی خۆی پەشیمانو دوبارە بەرامبەر خوسرەو خان دڵی نەرم بو. ئەوی کردەوە بەحاکمو ڕەوانەی کوردستانی کردەوە". (تحفە: 153). نوسەری (حدیقە: 158-159) هەمان هەواڵ ئەگێڕێتەوە، بەڵام ئەم لەباتی 3 هەزار نوسیوێتی 30 هەزار تمەنی داوە بەکەریم خانو، گەڕانەوەی خوسرەو خانی خستۆتە ساڵی (1179).

گێڕانەوەکانی مێژونوسانی ئەردەڵان پێویستیان بەتاوتوێ کردنو بەراورد هەیە لەگەڵ هەندێ سەرچاوەی تر.

1. سلێمان پاشا دو جار ڕوی کردۆتە ئێرانو هەردو جارەکە بەتێشکاوی چوە. جاری یەکەم، کەوالی بەغداد ئەمی لەسەر کار لابردو، سەلیم پاشای لەجێگە دانا (1164). سلێمان پاشا پەنای بۆ ئەردەڵان برد. بەڵام چەند مانگێ زیاتری نەخایاند کەوالی بەغداد سەلیمی لادایەوەو، دیسان سلێمانی دانایەوە بەحوکمڕانی بابان. جاری دوەم کە لەکۆشکی زەنگی لەبەردەم لەشکری والی بەغدادا شکاو، بارەگاو، کەلوپەلی هەموی دەس سوپای عوسمانی کەوت. پەنای بۆ کەریم خانی زەند برد (1176). بەڵام هەر لەو ماوەیەدا والی بەغداد، عەلی پاشا، کوژراو لەجێگەی ئەو یەکێکی تر، عومەر پاشا، بو بەوالیو سلێمانی گێڕایەوە سەر موڵکی بابان. هەمان ساڵ لەقەڵاچوالان، فەقێ برایم لەکاتی نوستندا بەخەنجەر کوشتی.
2. سلێمان یەکێ لەمیرە هەڵکەوتوەکانی بابان بوە. بایەخێکی زۆری داوە بەخوێندنو مزگەوتو مەدرەسەو کتێبخانە. هەروەها بایەخێکی زۆری بەپیشەو پیشەسازی داوە. یەکێ لەو پیشەسازییانەی سلێمان پاشا خەریکی دامەزراندنی بوە، دروستکردنی باروت بوە.

لەڕوی هەڵسوکەوتو خورەوشتەوە، هەندێ لەنوسەرانی هاوچەرخی بەستایشێکی زۆرەوە باسیان کردوە. نوسەری (دوحە: 135-136)، کەهاوزەمانی سلێمان پاشا بوە، نوسیوێتی: "... لەو پیاوە ساڵحانەبو کەتەقوای یەزدانیان کردبو بەشیعاری خۆیانو، لەو گوێڕایەڵانەبو کە ئەم ئایەتە کەریمەیان جێبەجێ کردبو "واطیعوا الله والرسول واولی الامر منکم". حاکمی ناوچەکانی بابانو کۆیەو هەریرو هەولێرو کۆپریو قەرەحەسەنو زەنگابادو جەسسان بو. ماوەی دوانزە ساڵ کاروبارەکانی بەجۆرێ بەڕێوە ئەبرد کەخواو پێغەمەرو دەوڵەتی بەرزی لێ ڕازی بون. لەو ماوەیەدا کەسێ نەبو شکاتی لێبکا یا بەربەرەکانی بکا یالێی یاخی بێ... بەڵام لەماوەی دواییدا کەوتە کۆکردنەوەی ڕەسمو باج لەو ناوچانەداو، وا ڕەفتاری ئەکرد کەوەکو موڵکی خۆی بن، بەمجۆرە سامانو داراییەکی زۆری کۆکردەوە، ئەوسا کەوتە بیری هەڵگەڕانەوە لەدەوڵەتو هەندێ کەسیشی لێ کۆبوەوە..".

ڕاستییەکەی ئەوەبو، گێچەڵی پارەیان پێ ئەکردو، ئەیان ئەویست ئەو کەمە سەربەخۆییەی دایمەزراندبو جێگیر بێ.

## -5-

## شکستی زرێبار (1191)

سادق خانی زەند پاش گەمارۆدانێکی چەند مانگە شاری بەسرای گرت. لەو کاتەدا نائارامیەکی زۆر لەبەغداد بو. والیەکانی دانەتران یاخۆیان دەسەڵاتیان زۆر نەمابو. لەناو خۆیاندا ناکۆکو لەسەر دەسەڵات پیلانیان لەیەکتری ئەگێڕا. لەبەر ئەوە نە لەکاتی گەمارۆدانی بەسرادا پەرژایان هێز بنێرن بۆ شکاندنی گەمارۆکەو، نەدوای گرتنی هێز بنێرن بۆ رزگارکردنی. کەعەبدولڵا کەهیە بو بەوالی بەغداد، یەکێ لەو ئەرکانەی بەو و بەحەسەن پاشای والی کەرکوک سپێردرا بو رزگارکردنی بەسرا بو لەداگیرکردنی ئێرانی. ئەمانە وا رێک کەوتن:

عەبدوڵلا پاشا هێزەکانی بەغدادو موسڵ بباتە سەر بەسراو، حەسەن پاشاش هێزەکانی کوردستان، بۆ خەریک کردن، بنێرێتە سەر کرماشانو ئەردەڵان. حەسەن پاشا، هێزەکانی کوردستانی سازدا، چەردەیەک پارەی بۆ تەرخان کردنو، هەندێک زیادەی دانێ. ئەحمەد پاشای بابانی نارد لەزەهاوەوە پەلاماری کرماشانو، محەمەد پاشای بابان لەقەڵاچوالانەوە پەلاماری سنە بدا.

ئەحمەد پاشا، لەحەسەن پاشا رەنجابو، هێزەکانی خۆی لەدەسکەرەی نزیک زەهاو مۆڵ داو، لەوە زیاتر پێشرەوی نەکردو هیچ جموجوڵێکی نەنواند. بەڵام محەمەد پاشا بەرەو مەریوان بەرێ کەوت. عەبدوڵلا پاشای والی بەغداد، کەئەبو پەلاماری بەسرا بدا، لەبەغداد نەجوڵا.

خوسرەو خان، لەزرێباری مەریوان، بەرەنگاری لەشکرەکەی محەمەد پاشای بابان وەستا. شەڕێکی سەخت قەوما. خوسرەو خان شکاو، نزیکەی هەزار کەسی لێ کوژراو، بەشێکی هێزەکەیشی بەدیل گیرا. لەبەر ئەوەی لەهیچ قوڵێکی ترەوە هێرش نەکرا. محەمەد پاشا لەمەریوان تێ نەپەڕی. دیلەکانی ئازاد کردو، گەڕایەوە قەڵاچوالان.

کەریم خان کەئەم هەواڵەی بیست، بۆ تێ هێنانەوەی ئەو شکستە هێزێکی گەورەتری ناردە سەر موڵکی بابان. محەمەد پاشا داوای یارمەتی لەوالی بەغداد کرد، یارمەتییان نەدا، لەبەر ئەوە کشایەوە کۆیە. لەشکری زەند بێ بەرگری هاتە ناو کوردستانەوە، کەوتە کوشتنو گرتنو تالانکردنو سوتاندن. ئەحمەد پاشای بابان لەم دەستدرێژیە تورە بو، غیرەتی بزوت. کەوتە پەلاماردانی لەشکری زەند. ناچاری گەڕانەوەی کردن. (دوحه الوزراء: 157-159)، (تحفه: 153).

رەنجوری ئەڵێ: "شکستی خوسرەو خان لەزرێبار ساڵی 1191".

## -6-

## مەرگی کەریم خان (؟-1193)

لەماوەی 22 ساڵ حوکمڕانیدا (1757-1779) کەریم خان جۆرێ لەئاسایشی ناوخۆی لەئێراندا چەسپاندبو. بەڵام بەمردنی ئەو سەرلەنوێ پشێوی کەوتەوە ناو ئێران. خزمو کەسوکارەکانی خانی زەند لەو کاتەوە کەمردبو لەسەر سەڵتەنەت لەناو خۆیاندا کردبویان بەشەڕ. ماوەی 3 رۆژ تەرمی کەریم خان کەوت بو، بەهۆی شەڕی ناوخۆیانەوە نەیانتوانی بو بەخاکی بسپێرن.

زەکی خان، دایکبرای کەریم خان 15 کەس لەگەورەکانی زەندی کوشتو، ئەبولفەتح خانی کوڕی کەریم خانی لەسەر تەختی سەڵتەنەت داناو، خۆی کاروبارەکانی گرتە دەست.

زەکی خان بەدەستی یەکێ لەسوپاییەکانی خۆی کوژراو، سادق خان لەبەسراوە بەهەڵەداون گەڕایەوە شیراز ئەبولفەتحی لێ خستو، خۆی کاروباری گرتە دەست. عەلیموراد خان، کەلەو کاتەدا حوکمڕانی

ئەسفەهان بو. سەڵتەنەتی بەشایانی خۆی ئەزانی. پەلاماری شیرازیدا بۆی نەگیرا. دوای ئەوە بەماوەیەک لەنزیک هەمەدان سادق خانی شکاندو بای دایەوە بۆ سەر شیراز. دوای گەمارۆدانێکی چەند مانگە شیرازی گرت. چاوی سادق خانو ئەبولفەتحو تاقمێ لەخزمەکانی خۆی دەرهێنا. لەئەسفەهان تاجگوزاری کرد (1782).

لەم قۆناغەدا گەورەترین مێملێ بنەماڵەی زەند، ئاقا محەمەد خانی قاجار بو. ئاقا محەمەد کوڕی محەمەد حەسەن خانی قاجار بو، کەسەردەمێ مێملێ کەریم خان بو. ئەیویست ببێ بەشای ئێرانو، لەو ململانێیەدا کوژرابو. ئاقا محەمەد خان، بەدرێژایی ماوەی حوکمڕانی کەریم خان لەشیراز بەدەسبەسەری وەکو بارمتە گل درابوەوە. (مهدوی: 188) دوای مردنی کەریم خان یەکسەر لەشیرازەوە هەڵات بۆ ئەستەرئاباد. سەرانی ئێلی قاجاری کۆکردەوەو، دەستی بەسەر ناوچەکانی سەروی ئێراندا گرتو، لە (1783/1197)دا ناوی لەخۆی نا شاو، تارانی کرد بەپایتەخت.

لەسەردەمی سەڵتەنەتی عەلیموراد خان کە 3 ساڵی خایاند (1782-1785) ئاقا محەمەد زاتی نەئەکرد پەلاماری قەڵەمڕەوی زەند بدا. بەڵام کەئەم لەموچەخورتی ئەسفەهان مرد (1785/1199) و، جەعفەر خانی کوڕی لەجێگەی ئەو لەسەر تەخت دانیشت. ئاقا محەمەد دیتر کەوتە پەلهاوێشتن جەعفەر خان 4 ساڵ سەڵتەنەتی کرد. لەو 4 ساڵەدا 2 جار لەگەڵ ئاقا محەمەد بەشەڕ هاتو، هەردو جار بەشکاوی کشایەوە ناو دیواری شیراز. دیوارەکەی شیراز لەگرتن نەئەهات.

جەعفەر خان دەرمانخوارد کراو مرد(1789/1204) لوتفعەلی خانی کوڕی کەهێشتا گەنجێکی تازە پێگەیشتوبو، سەرپەرشتی کاروباری بەندەرو کەنارەکانی خەلیجی ئەکرد. دەسبەجێ گەڕایەوە شیراز بکوژەکانی باوکی کوشتو، لەجێگەی ئەو دانیشت. ئاقا محەمەد چوە سەر شیراز ئەمجارەش بۆی نەگیراو گەڕایەوە تاران لەزنجیرەیەک پیلانو فێڵو هێرشو کشانەوەدا سەرەنجام لوتفعەلی شکاو گیراو کوژرا. زنجیرەی بنەماڵەی زەند پێچرایەوە. بنەماڵەی قاجار کاروباری ئێرانی گرتە دەست. (مهدوی: 190).

## –7–

## گۆڕینەوەی پەنابەر (1194)

محەمەد رەشید بەگی وەکیل، کەیەکێ لەگەورە دەسەڵاتدارەکانی ئەردەڵان بو، نێوانی لەگەڵ خوسرەو خان تێکچو. کەهزاد خانی کوڕی سوبحانویردی خانو تاقمێ لەگەورەکانی ئەردەڵانی لەگەڵ خۆی برد بۆ دەرباری عەلیموراد خان بۆ دەربڕینی سکاڵا لەدەس خوسرەو خان. خوسرەو لابراو، کەهزاد خان لەجێگەی دانرا. گەڕانەوە سنە. خوسرەو بەمە قایل نەبو. شەوێک لەناکاو دای بەسەریاندا. (تحفه: 155).

بەزۆر دەری کردنو هەتا گوندی سورەتو لەمەحاڵی پڵنگان راوی نان. کەهزادو محەمەد رەشید بەگو دەستوپێوەندەکانیان پەنایان برد بۆ مەحمود پاشای خالید پاشای بابان. لەو کاتەدا دو برای مەحمود پاشایش، محەمەد پاشاو عومەر بەگ، پەنایان برد بوە بەر خوسرەو خان. مەحمودو خوسرەو پێکهاتن سەودایەک بکەن بۆ گۆڕینەوەیان. مەحمود پاشا کەهزادو محەمەد رەشید بنێرێتەوە بۆ سنە، خوسرەویش محەمەدو عومەر بنێرێتەوە بۆ قەڵاچوالان.

رەنگە خوسرەو خان لەم سەودایەدا. تۆڵەی شکانەکەی زرێباری لەمحەمەد پاشا کردبێتەوە. ئەگینا ئەم جۆرە سەودایە لەکوردەواریدا بەکارێکی ناشیرین دائەنرێ. مەحمود پاشا، محەمەد پاشاو عومەر بەگی کوشت (1194 ک/ 1780ز). (تحفه: 156) (لب: 122).

رەنجوری ئەڵێ: "کوشتنی محەمەد پاشاو عومەر پاشا رەمەزانی ساڵی 1194"

## -8-

## خوسرەو خان لەشیراز

محەمەد رەشید لەرێگە هەڵاتو روی کردە بەغداد. ماوەیەک لەبەغداد مایەوە هیچی بەهیچ نەکرد لەبەر ئەوە گەڕایەوە ئێران. چوە لای جەعفەر خانی زەند. جەعفەر خان هێزێکی گەورەی سازدا لەگەڵ محەمەد رەشید بەڕێ کەوت بۆ سەر سنە. پێشتر رەزاقولی خانی برای خوسرەو خانی هەڵگێڕا بوەوەو کردبوی بەهاودەنگی خۆی. رەزاقولی دایە پاڵیان.

خوسرەو خان بەخۆیا رانەپەرمو بەرەنگارییان بکا. خاوخێزانی لەگەڵ خان ئەحمەد خانی کوڕیدا رەوانەی شارەزور کردو، خۆی چو بۆ شیراز بۆ لای عەلیموراد خان.

جەعفەر خان گەیشتە سنە. ئەمجارەیان رەزاقولی خانو محەمەد رەشید بەگ دوای راکردوەکانی ئەردەڵان کەوتن تا هەورامان. (تحفە: 157)

جەعفەر خان کەوتە زوڵمو زۆرداریو دڵی دانیشتوان، تەنانەت دڵی دەسکێشەکانی خۆیشی رەنجاند. هاوکارەکانی هەر یەکەیان هەڵاتن بۆ لایەک. رەزاقولی خان چو بۆ ورمێو. کەهزاد خانو لوتفعەلی خان بۆ کرماشان. محەمەد رەشیدیش جەعفەر خانی بەجێهێشتو چو بۆ کرماشان. لەو کاتەدا یەکێ لەوانەی بەتەمای شاهێتی بو، بەلەشکرەوە روی لەئەسفەهان کردبو. جەعفەر خان کەئەم هەواڵەی بیست سنەی بەجێ هێشتو بەپەلە بەرەو ئەسفەهان بەڕێ کەوت.

رەزاقولی خان کەزانی سنە چۆڵە لەورمێوە گەڕایەوە سنەو کاروباری گرتە دەس. پاش چەند رۆژێ کەهزادو لوتفعەلیو محەمەد رەشیدیش گەڕانەوە سنە. لەگەڵ رەزاقولیدا بو بەشەڕیان. رەزاقولی بەبریندداری هەڵات بۆ گەڕوسو دوای حەفتەیەک مرد. (تحفە: 158).

هەواڵی پەشێوانی هەلومەرجی ئەردەڵان بەعەلیموراد خان گەیشت. بۆ چارەسەرکردنی ئەو پشێوییە خوسرەو خانی بانگ کرد، سەرلەنوێ دایناییەوە بەوالیی ئەردەڵان. بەڵام خۆی لەوێ گل دایەوەو، لەباتی ئەو کاروباری ئەردەڵان سپێردرا بەخان ئەحمەد خانی کوڕی کەلەو کاتەدا لەشارەزوربو. خان ئەحمەد گەڕایەوە سنە. میرەکانی ئەردەڵان پێشوازییان لێ کردو سەریان بۆ دانەواند.

بەهۆی ئەم ئاڵوگۆڕانەوە هەندێ لەباجی ئەردەڵان دوا کەوت بو. عەلیموراد خان بۆ کۆکردنەوەی باجی کۆنەکراوە، جەعفەر خانی ناردە سنە. جەعفەر خان دیسانەوە دەستی کردەوە بەزوڵمو زۆرو ئازاردان. کەعەلیموراد بەجەورو ستەمی جەعفەرو پەرێشانی خەڵکی زانی. خوسرەو خانی رەوانەی کوردستان کردو. جەعفەر خانی کێشایەوە. دوای ئەمە بەچوار مانگ عەلیموراد خان مرد. (تحفە: 159).

## -9-

## شەڕی ئەڵڵاقولی خانی زەنگەنەو خوسرەو خان

دوای مردنی کەریم خان زۆر لەو ئێلانەی کەریم خان لەکرماشانەوە گوێزابونیەوە بۆ شیرازو ئەسفەهان گەڕانەوە کرماشان. لەدەوری گەورەی زەنگەنە، ئەڵڵاقولی خان، کۆبونەوە.

ئەڵڵاقولی خان بەهیوای دامەزراندنی سەڵتەنەت بو. محەمەد رەشید بەگ کە لەکرماشان بو، دایە پاڵ ئەڵڵاقولی خانو، هانیدا وەکو سەرەتای فراوانکردنی قەڵەمڕەوەکەی خاکی ئەردەڵان بگرێ. ئەڵڵاقولی خان هێزێکی گەورەی لەئێلەکانی کرماشان کۆکردەوە بەسەر سەحنە، کەنگاوەرو دینەوەردا بەرەو سنە بەڕێ کەوت. هەواڵ بەخوسرەو خان گەیشت. ئەمیش هێزەکانی خۆی کۆکردەوە. نوسەری حدیقەو تحفە ئەڵێن: هێزەکەی ئەردەڵان بەهەموی 740 کەس بوە.

سەردەمی فەتحعەلی شا هەولّی دا لە گەڵ ناپلیۆندا و دوای ئەویش لە گەڵ بەریتانیا و پێش جەنگی جیهانی یەکەم لە گەڵ ئەڵمانیا. رەزاشایش لە ناوەڕاستی سییەکانەوە خۆی لە ئەڵمانیا نزیک خستەوە.

ساڵی 1927 ئیمتیازی گوێزانەوەی پۆستی ئاسمانیی ئێران درا بە کۆمپانیای ئاسمانیی یونیکەرس.

ساڵی 1928 دروستکردنی بەشێ لە ڕێگای ئاسنینی شیمال درا بە قونتەراتچی ئاڵمانی.

ساڵی 1930 بەڕێوەبەرایەتی کاروباری "بانکی ملی ایران" بە شارەزایانی ئاڵمانی سپێردرا.

ساڵی 1939 هیتلەر پێشەوای نازییەکان کاروباری ئەڵمانیای گرتە دەست و رایخی سێیەمی دامەزراند. پێوەندی ئێرانی - ئاڵمانی چوە قۆناغێکی گرنگەوە. ئاڵمانییەکان پروپاگاندەیەکی فراوانیان دەربارەی "ئاریێتی" ی رەگەزی هەردو نەتەوەی ئێرانی و ئاڵمانی و ئامانجی هاوبەشی هەردوکیان دژی کۆمۆنیزم و ئیمپریالیزم دەست پێ کرد.

ساڵی 1935 د. شاخت وەزیری دابوری ئاڵمان سەری لە ئێران دا. دەربارەی پەرەپێدانی پێوەندی بازرگانی هەردو وڵات گفتوگۆی کرد. بە دوای ئەمەدا لە کانونی دوەمی 1935 دا رێککەوتنێکی ئابورییان ئیمزا کرد. ئاڵوگۆڕی بازرگانی بە ئەندازەیەک زیادی کرد لە ماوەی پێنج ساڵدا هەناردەی ئاڵمانی بۆ ئێران بو بە پێنج قات و ئەڵمان بو بە گەورەترین کڕیاری کەرەستەی خاوی ئێرانی.

ساڵی 1938 رێگای دەریایی یەکسەری خورەمشەهر - هامبورگ و، کۆمپانی لوفتهانزاش رێگای ئاسمانیی تاران - بەرلینی کردەوە.

سەدان ئەندازیار و شارەزای ئاڵمانی لە ئێران کاریان ئەکرد.(9)

## 2. هەڵگیرسانی دوەمین جەنگی جیهانی

کاتێ هیتلەر لە دوای مردنی هندنبورگ کاروباری ئەڵمانیای گرتە دەست، ئەڵمانیای بەرەو خۆ چەکدار کردن و خۆ بەهێز کردن برد و کەوتە سەرپێچی لەو رێوشوێنانەی دەوڵەتانی سەرکەوتوی یەکەم جەنگی جیهانیی سەپاندبویان بە سەر ئەڵمانیادا.

رۆژی 21 ی رەشەمەی 1316 هێزێکی ئاڵمانی چوە ناو خاکی نەمساوە بێ شەڕ خستییە سەر ئەڵمانیا.

لە رۆژانی هەوەڵی رەزبەری 1317 دا خاکی سودیتی ئاڵماننشینی چیکۆسلۆڤاکی بوهیم و مراوی دایە دەم ئەرزی ئەڵمانیا.

لە خەرمانانی 1318 دا هێزی زەمینی و دەریایی و ئاسمانیی ئاڵمانی هەڵیکوتایە سەر پۆلۆنیا بە بیانوی ئەوەی بە خۆشی ئامادە نەبوە داڵانی دانستیگی بداتێ. بەریتانیا و فەرەنسە نارەزایییان لەم هێرشە دەربڕی. هەڕەشەیان لە ئاڵمانیا کرد کە ئەگەر هێزەکانی بە خۆشی لە پۆلۆنیا نەکێشێتەوە ئەوان بە زۆر ناچاری کشانەوەی ئەکەن.

ئەڵمان گوێی نەدایە هەڕەشەکەیان.

رۆژی 13 ی خەرمانان فرۆکەکانی بەریتانیا پەلاماری میناکانی ئەڵمانیایان دا لە دەریای سەرودا و هێزی فەرەنسیش دەستی کرد بە پێشکەوتن بۆ ناو خاکی ئاڵمانیا. بەم جۆرە دوەمین جەنگی جیهانی هەڵگیرسا.

لە خاکەلێوەی 1319 دا هێزی ئاڵمانی پەلاماری دانیمارک و نەرویجی دا و لە بانەمەڕدا هێرشی کردە سەر هۆلندە و بەلچیک و لوکسەمبورگ و داگیری کردن.

لە20 ی جۆزەردانی 1319 دا ئیتالیاش جەنگی دژی فەرەنسا ڕاگەیاند.(10)

یەکێتی سۆڤێت ئەیویست لە شەڕەوە نەگلێ. پێی وا بو لە شەڕی ناو دەوڵەتانی سەرمایەداریدا نەبێ یەکێتی سۆڤێت وەکو تەماشاکەر ڕابوەستێ. ئەڵمانیاش لەسەرەتادا بۆ ئەوەی هێزەکانی ڕوسیای سۆڤێتی لە شەڕەکە دور ڕابگرن ڕێکەوتنێکیان لەگەڵ ئیمزاکردن دەربارەی دەستدرێژی نەکردن بۆ سەر یەکتری، بەڵکو ڕێکەوتن لەسەر دابەشکردنی هەندێ لەوڵاتانی ئەوروپی.

تا ئەو کاتە سۆڤێت لە شەڕ دور بو. ئێرانی لەگەڵ حکومەتی ئێرانیش ئاسایی بو. کە هێزەکانی بەریتانیا ڕێگەیان لە هەنارەکانی ئاڵمانی بۆ ئێران گرت، ئەڵمانیا کەلوپەلی بەناو خاکی ڕوسیادا ئەنارد بۆ ئێران.(11)

## 2. 1. ڕاگەیاندنی بێلایەنی ئێران

کە هەواڵی هێرشی ئەڵمانی بۆ سەر پۆڵۆنیا بڵاوبوەوە سەروەزیرانی ئێران بێلایەنی وڵاتەکەی بەم بەیانە ڕاگەیاند:

"لەم کاتەدا بەداخەوە ئاگری جەنگ لە ئەوروپا هەڵگیرساوە حکومەتی شاهنشاهی ئێران بە پێی ئەم بەیانە بڕیاری خۆی بە هەموان ڕائەگەیەنێ کە لەم شەڕەدا بێلایەنە و پارێزگاری بێلایەنی خۆی ئەکات.سەروەزیر مەحمود جەم"(12)

ئێران لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند بو. بەڵام لەبەر ئەوەی ئامادە ئەبو بە هێزی چەکدار پارێزگاری لەم بڕیارەی خۆی بکات، نە لە ساڵانی یەکەمین جەنگ و نە لە ساڵانی دوەمین جەنگی جیهانی دا هیچ کام لە لایەنەکانی جەنگ ڕێزی ئەم بێلایەنییەیان نەگرت. هەردوجار سەرزەمینی ئێران پێخوستی هێزەکانی بێگانە ئەبو. بە ئارەزوی خۆیان بێ هیچ بەرهەڵستییەک تەراتێنیان تێدا ئەکرد.

## 2. 2. ڕاگەیاندنی بێلایەنی ڕوس

یەکێتی سۆڤێت نەیئەویست تێکەڵاوی شەڕ بێ. پشتئەستور بو بە پەیمانی دەستدرێژی نەکردن بۆ سەر یەکتری کە لە گەڵ ئەڵمانیا ئیمزای کرد بو. کاتێ هێزەکانی ئینگلیز لە دەریادا ڕێگەیان بە کاروانی کەلوپەلی هەنارەی ئەڵمانی بۆ ئێران گرت، ڕوسیا ڕێگەی ترانزیتی بۆ گەیشتنی کەلوپەلی ئەڵمانی بە ناوخاکی خۆیدا بۆ ئێران کردەوە.

ساڵی 1941 لە ناکاو ئەڵمانیا هێرشێکی گەورەی بۆ سەر یەکێتی سۆڤێت دەس پێ کرد. لە ماوەیەکی کورتدا زەرەرێکی زۆری لە ڕوسیا دا و سەرزەمینێکی فراوانی لێ گرت. دوای تێوەگلانی ڕوس لە شەڕەوە، گرنگی ئێران بۆ یەکێتی سۆڤێت لە دو سەرەوە زیادی کرد: یەکێکیان، ژمارەیەکی زۆری شارەزا و ئەندازیار و کارگەری ئەڵمانی لە ئێران کاریان ئەکرد، ئەمانە ئەیانتوانی دژی ڕوسیا جموجوڵی کاریگەر بکەن. ئەوی تریان، لە هیچ ڕێگایەکەوە هاوپەیمانەکان نەیانئەتوانی بە ئاسانی یارمەتی بۆ ڕوسیا بنێرن لە ڕێگای ئێرانەوە نەبێ. بەشێکی گرنگی کارگەی ڕوسیا کەوتبونە ژێر دەستی هێزی ئەڵمانییەوە. ڕوسیا پێویستییەکانی هێزەکانی خۆی پێ دابین نەئەکرا، ئەبو هاوپەیمانەکانی بۆی بنێرن. بۆ چارەکردنی کێشەی لۆجستیکی نێوان ڕوسیا و هاوپەیمانەکانی 4 ڕێ هەبو، ڕێگاکانی مورمانسک و ولادیوستک چەندین مانگ بەفر ئەیگرتن. ڕێگای بوغازەکانی بۆسفۆر و دەردەنێل، تورک لە ڕوی هاتوچۆی هاوپەیمانەکاندا دایخستبون، ئەبو بە شەڕ پێیان بکەنەوە. هەر ڕێگای ئێران ئەمایەوە کە لەبار بێ بۆ گوێزانەوەی پێویستییەکان لە خەلیجەوە بۆ سەردەریای خەزەر و لە وێوە بۆ ڕوسیا.

حکومەتەکانی سۆڤێتی و بەریتانی دوچار داوایـان لـە ئێـران کـرد شـارەزاکانی ئـەڵمـان دەر بکـات. حکومەتی ئێران گوێی بەم داوایە نەدا. بەتایبەتی لەو کاتەدا هێزەکانی ئەڵمانیا لە زۆری مەیدانەکانی جەنگدا رو لە سەرکەوتن بون. هێزەکانی روسیا و بەریتانیا ئەوەیان کرد بە بەهانە. رێوشوێنی داگیرکردنی ئێرانیان دانا.

## 3. داگیرکردنی ئێران

نوسەری ئێرانی حسێن مەکی نوسیوێتی:

"لە سەعات چواری بەیانیی رۆژی دوشەممو سێیەمی شەهریوەر لە کاتێکدا دانیشـتونی پایتـەخت لـە خەودا بون. کاربەدەستانی وڵات لە سەرو ئەوانەوە شەخسـی یەکـەمی مەملەکـەتیش لـە پێخـەفی حەسـانەوەدا نوستبون. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە ئەمان سەرەڕای خەوتنی ئاسایی. لە خـەوی غەفڵـەت و بێخەبـەریدا، کـە لەمێژ بو باوەشی بۆ کردبونەوە، راکشابون.

لەو سەعاتەدا دو ئوتۆمۆبیل کە یەکێکیان ئاڵای چەکوش و داس و ئەوی تریان ئاڵای ئینگلسـتانی بـە سەرەوە بو لە بەردەمی ماڵی مەنسوری سەروەزیردا راوەستان. دوای ئەوەی زەنگی ماڵەکـە بـەردەوام لـێ درا، دوایی خزمەتکاری ماڵەکە هاتە پشت دەرگاکە و ناسنامەی هاتوەکانی پرسی.

وەڵام درایەوە سەفیرانی روس و ئینگلیز بێ ئەوەی کات بە فیرۆ بدەن هەر ئێستا دەیانـەوێ لـە گـەڵ سەروەزیر دابنیشن. دەستبەجێ مەنسور لـە خـەو هـەڵسـێنراو پێیـان وت کـە سـەفیرەکانی هـەردو دەوڵـەتی ئینگلستان و سۆڤێتی لەو دیو دەرگای ماڵەکە راوەستاون و گەرەکیانە ئێوە ببینن. مەنسور فەرمانی دا ئەوانـە بۆ ژوری میوان رێنوێنی بکەن تا جلەکانی بپۆشێ و بێتە ساڵۆن.

مەنسور لەم دیدەنییە چاوەڕواننەکراو و نابەجێیە سەخت کەوتە بیرکردنەوە ئـەبێ چـی روی دابـێ؟ لەبەرئەوە بە پەلە جلەکانی لەبەر کرد و چو بۆ ژوری میوان.

دوای چـاک وخۆشـییەکی کـورتی ئاسـایی سـەفیرانی دەوڵـەتانی ئینگلسـتان و سـۆڤێتی هەریەکـە یادداشتێکیان دا بە سەروەزیر تێیدا زۆر بەتوندی لە جموجوڵی هاووڵاتییانی ئەڵمان لە ناوئێراندا پەژارەیـان دەربڕی بو، بە قسەش رونیان کردەوە لەبەرئەوەی حکومـەتی ئێـران گـوێی نەداوەتـە یادداشـتەکانی 28 ی پوشپەڕ و 25 ی گەلاوێژ 1320 دەربارەی دەرکردنی هاووڵاتییانی ئـەڵمـانی لـە ئێـران و، بیرخسـتنەوەی هەردو دەوڵەتی بە نیازی پاک وەرنەگرتوە، ناچار هێزی زەمینی و دەریایی و ئاسمانیی ئێمە دێنە ناو خـاکی ئێرانەوە و ئەوان لە ئێران دەرئەکەن.

مەنسور کە دوای بیستنی ئەم هەواڵە - کە لەراستیدا وەکو راگەیاندنی جـەنگ وا بـو دژی حکومـەتی ئێران - توشی نارەحەتی و پەشۆکان بوبو. یادداشتەکانی وەرگرت. سەفیرانی دەوڵەتانی ناوبراو لـە شـوێنی خۆیان هەستان. خواحافیزییان کرد و رۆیشتن. ئەم دیتنە هەموی نزیکەی 25 دەقیقەی خایاند.

مەنسور لە پێش هەمو شتێکدا عامیری وەکیلی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئاگادار کرد خۆی ئامادە بکا تا پێکەوە برۆن بۆ سەعداباد..."(13)

### 3. 1. هێرشی روسی _ ئینگلیزی

شەوی 3 ی مانگی خەرمانانی ساڵی 1320 هێزی روسی لە لای سەروی ئێرانەوە لـە 3 لاوەو هێـزی بەریتانی لە لای رۆژئاوا و خواروی رۆژئاواوە لە چەند لاوە لەناکاو خۆیان کرد بە ناو خاکی ئێراندا.

نەخشەی --٥--

دابەشکردنی ١٩٤١-١٩٤٦ی ئێران لە نێوان سۆڤیێت و بەریتانیا




سەرچاوە: لینچۆوسکی، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کاروباری دنیادا (بە ئینگلیزی)، ١٩٧٠

ستادی ئەرتەشی شاهنشاهی ئێران بەم بۆنەیەوە ئەم بەیانەی دەرکرد:

"راگەیاندنی ژمارە 1

1. سەعات 4 ی رۆژی 3 ی شەهریوەر سپای سۆڤێتی لە لای سەرو و سپای ئینگلیزی لە لای رۆژئاوا و خواروی رۆژئاوا سنورەکانی دەوڵەتیان شکاندوە.
2. شارەکانی تەوریز، ئەردەبێل، رەزائیە، خۆی، اهر، میاندواو، ماکۆ، مەهاباد، بناب، رەشت، حەسەن کیادە، میانە، ئەهواز و بەندەر پەهلەوی بۆمبارانی ئاسمانی کراون. زەرەری کە لە خەڵک کەوتوە زۆر و هی نیزامییان، ئەگەرچی سەربازخانەکانیان بۆمباران کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا زەرەر تا ئەندازەیەک کەم بوە. فرۆکەیەکی پەلاماردەر لە مەڵبەندی تەوریز لە ئەنجامی تەقەی تۆپخانەی دژی ئاسمانی دا خراوەتە خوارێ.
3. هێزی مۆتۆرپیزە و میکانیزەی سۆڤێتی لە رێگای جولفا، مەرەند، پول دەشت، ماکۆ، قەرەزیائەدین و هێزی مۆتۆرپیزە و میکانیزەی سپای ئینگلیزی لە رێگای خانەقین، قەسری شرین، نەفتخانە، گیلان، ئابادان، بەندەر شاهپور و قەسری شێخ، کەوتونە هێرش کردن.
4. هێزی دەریایی سۆڤێتی لە کەنارەکانی دەریای خەزەر و هێزی دەریایی ئینگلیز لە بەندەر شاهپور و خورەمشەهر هێرشیان کردوە.
5. یەکەکانی ئەرتەشی شاهنشاهی کە غافڵگیر کراون بە پێی توانا بەرەورویان چون و لە شوێنی جیاجیا لە گەڵ ئەوان لێکیان داوە و دیفاعیان کردوە و ئەرابە زرێپۆشی پەلاماردەر لە ناوچەی رۆژئاوا ئەنگێوراوە و لە کار کەوتوە و پێشرەوی هێرشبەرەکانیان راوەستاندوە.
6. ورەی خەڵک لە هەمو شوێنەکانی سەرو و رۆژئاوا زۆر باشە. بەگشتی داوا ئەکەن لە ریزی ئەرتەشیدا وەربگیرێن و بۆ پارێزگاری لە نیشتمان رەوانەی جەبهە بکرێن."(14)

ناوەرۆکی راگەیاندنەکەی ستادی ئەرتەش هەندێکی ناراست و هەندێکی فیشاڵ و پێوەنانە. ئەمە یەکەمین و دوایین بەیان بو دەری کرد.

### 3 .2. مەبەست لە داگیرکردنی ئێران

ئێرانی‌یەکان خۆیان داگیرکردنی وڵاتەکەیان وەکو زۆر روداوی تر لە سەر بنچینەی "تیۆری پیلانگێران" لێک ئەدەنەوە. هەندێکیان وایان دائەنا کە بۆ روخاندنی رێژیمی رەزاشا و هەندێکی تر ئەیانوت بۆ داگیر و دابەشکردنی ئێرانە.

رەزاشای پەهلەوی خۆی داگیرکردنی ئێران و پێشکەوتنی هێزەکانی دەوڵەتانی هاوپەیمانی بەرەو تاران بەوە ئەزانی کە هەموی دژی ئەوە و بۆ ئەوەیە ئەو ناچار بکەن، واز لە "سەڵتەنەت" بهێنێ.(15) گوایا ئێران لە ژێر سایەی سەڵتەنەتی ئەودا زۆر بۆ پێشەوە چوە. بە لابردنی ئەو ئەیانەوێ رێی پێشکەوتنی لێ بگرن.

مەنسور، سەروەزیری ئەو کاتەی ئێران، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا لە ژێر سەرناوی "مەبەست لە پەلاماردانی ئێران چی بو؟" نوسیویتی: "مەبەستە بنەڕەتی‌یەکانی ئەوان بەمجۆرە دەرکەوت:

- هەڵوەشاندنی بنچینەی وڵات و توانای ناوەندی دەوڵەت.
- دەسبەسەراگرتن و چاودێری هەمو سەرچاوەکانی دارایی و هۆکانی پێوەندی..."(16)

رادیۆی لەندەن لە زمانی هەواڵنێری رۆژنامەی ئینگلیزی "تایمز"ەوە لە وتاری رۆژانەی 15 ی ئۆکتۆبەری 1942دا لەم بارەیەوە وتبوی:

"هاوپەیمانەکان لە گرتنی ئێران 3 مەبەستیان هەبو: یەکەم، ئەیانویست پێشگیری لە نفوزی ئـەڵمـانی بکەن. دوەم، بڕیاریان دابو پارێزگاری سەرچاوەکانی نەوتی ئێران و عێراق بکەن. سێیەم، مەبەستێکی تریان ئەوە بو کە مەسەلەی گوێزانەوەی کەلوپەلی پێویست بۆ ڕوسیا پەرە پێ بدەن..."(17)

دوایتریش چەرچڵ سەروەزیری ئەوسای بەریتانیا لە "یاداشـتەکانی دا" هـەر هـەمان بیـانوی دوبـارە کردەوە.

## 4. هەرەسی "ئەرتەشی شاهنشاهی ئێران"

ڕەزاشا هەوڵێکی زۆری دا بۆ دامەزراندن و بەهێز کردن و چەسپاندنی ئەرتەشی شاهنشاهی ئێـران. هەر بۆ ئەو مەبەستە دەستی ئەمیرەکانی لەشکری ئازاد کرد بو لە مەڵبەنـدە دورەکـانی ئێـران دا چـی ئەکـەن بیکەن بێ ئەوەی هیچ قانونێ بتوانێ لێیان بپێچێتەوە. ئازاردانی خەڵک و سوکایەتی پێ کـردن، زەوتکردنـی زەویوزار و تاڵانکردنی سـامانی دەوڵەمەنـدەکان، بـەرتیلخواردن، گـرتن و کوشـتن و دەرمـانخوارد کـردن و گومکردنی بێ لێپرسـینەوەی سـەرانی ئێـل و پیـاوە ناودارەکـانی ئێـران... بەشـێ بـون لـە شـێوەکارەکانی فەرماندەکانی هێزە چەکدارەکانی ئێران بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەندی حکومەت لە سەرانسەری ئێران دا.

ڕەزاشا و فەرمانـدەکانی تـا ئەنـدازەیـەکی زۆر بـە خۆیـان و ئەرتەشـەکەیانـەوە ئـەنازین. لـە پـێش ڕوداوەکانی خەرمانان‌دا ئەفسەرێکی ئێرانی بە ناوی ئازمین لە مـەهاباد لـە وتارێـکدا بـۆ خـەڵـک گوتبـوی:

"ئەمڕۆ ئەرتەشی ئێران لەگەڵ بەهێزترین ئەرتەشەکانی دنیا بەرامبەرە، زمانم لاڵ بێ، بەرزترە."(18)

ئەمە نمونەیەک بـو لـە بۆچـونی ئەفسـەرەکانی ئێـران بەرامبـەر خۆیـان و ئەرتەشـەکەیـان. تەنانـەت شاهنشاهیش هەر وای ئەزانی. یەکێ لە ئەفسەرە زلەکانی ئەرتەش ڕوداوێکی لەو بابەتە ئەگێڕێتەوە.

لەشکرەکانی 1 و 2 مناوەرەیەکیان لە خواروی ڕۆژهەڵاتی تاران ئەنجام دا. ئەمیرەکانی هەردو لەشکر، هەروەها شاگردەکانی "دانیشگاهی جەنگ" بەشدار بون. لە کاتێکدا ئەمانە هەمو لە کـەناری ئـاوی جـاجرود بەڕیز ڕاوەستابون بۆ سانی فەرماندەی گشتی هێزەکان. یەکێ لەوانەی بەشداری ئەم مناوەرەیە بون جەنـەراڵ ژانندار بو. ژانندار جەنەراڵێکی فەرەنسی شارەزا بو. هاوبەشی شەڕەکانی یەکەم جەنگی جیهانیی بوبو. ئەوسا لە ئێران سەرۆکی "دانیشگاهی جەنگ" بو. دوای ئەوەی فەرمانـدەی گشـتی سـەیـری هێزەکـانی دەکـا و بـە بەردەمی ڕیزی ئەمیرەکانی‌دا تێ ئەپەڕێ بەرامبەر جەنـەراڵ ژانـدار ڕائەوەسـتێ و لـێی ئەپرسـێ: "ئەرتەشـی ئێران بەرامبەر ئەرتەشی بێگانە ئەتوانێ تاچەند مقاومەت بکا؟" جەنـەراڵ ژانـدارماوەیـەک ڕائـەمێنێ ئینجـا ئەڵێ: "دو سەعات" فەرماندەی گشتی وەڵامەکەی بەدڵ نابێ و ئەڕوا. ئـەمیرەکانی ئەرتـەش بـە گلـەییـەوە بـە جەنەڕاڵ ژاندار ئەڵێن: "ئەمە چە وەڵامێ بو تۆ داتەوە؟" ئەویش بە ئەوپەڕی خوێن ساردییەوە ئـەڵـێ: "ئـەو دو سەعاتەشم بۆ دڵخۆش کردنی کابرا گوت ئەگینا وەڵامی ڕاستەقینەی پرسیارەکەی ئەبو بڵێم هیچ..."(19)

ڕوداوەکانی خەرمانانی 1320 و پێشـکەوتنی هێزەکـانی ڕوسـیا و بـەریتانیا بـەناو خـاکی ئێـران‌دا خۆهەڵکێشانەکەی ئازمین و هەڵسەنگاندنەکەی ژانداری خستە بەر تاقیکردنەوە.

کاتێ هێزەکانی بێگانە کەوتنە پێشڕەویی بۆ ناو خاکی ئێران، ئەرتەشی شاهنشاهی چەندین لەشـکری لەو مەڵبەندانەدا مۆڵ دابو، لەوانە:

لەشکری 1 ی تاران بە فەرماندەیی سەرلەشکر کەریم بوزەرجەمهەری

لەشکری 2 ی تاران بەفەرماندەیی سەرلەشکر عەلی ئەسفەر نەقدی

لەشکری 4 ی ڕەزائیە بە فەرماندەیی سەرلەشکر موعینی

لەشکری 3 ی تەورێز بە فەرماندەیی سەرلەشکر مەتبوعی
لەشکری 15 ی ئەردەبیل بە فەرماندەیی سەرتیپ قادری
لەشکری 11 ی گەیلان بەفەرماندەیی سەرتیپ قادر
لەشکری ی ئوستراباد بە فەرماندەیی سەرهەنگ موعتەزید
لەشکری 9 ی خوراسان بە فەرماندەیی سەرلەشکر موحتەشەم
لەشکری 5 ی کوردستان بە فەرماندەیی سەرلەشکر موقەدەم
لەشکری 2 ی کوردستان بە فەرماندەیی سەرتیپ پوریا
لەشکری 6 ی خوزستان بە فەرماندەیی سەرلەشکر شاهبوختی (20)

هێرشی لەناکاوی هێزەکانی سۆڤیێتی و بەریتانی ریزەکانی ئەرتەشی هەڵوەشان. زۆری ئەخایان ئەم لەشکرانە بڵاوەیان لێ کرد.

روداوەکانی ساڵی 1320 ی ئێران دەریخست:

هێزە چەکدارەکانی ئەم جۆرە وڵاتانە بۆ سەرکوتکردنی گەلەکانی خۆیان و بۆ پاریزگاری رێژیمە زۆردار و بۆگەنە دەسەڵاتدارەکانی وڵاتەکانی خۆیان نازان. ئەتوانن هەمو رۆژێ قەسابخانە بۆ میللەتەکانی خۆیان دابنێن بێ ئەوەی لە هیچ شتێ بسڵەمینەوە. بەلام لە بەرامبەر دوژمنی دەرەوەدا، لە بەرامبەر هێزە زلەکان دا، کەساس و کوڵەوارن. بە ئاسانی سەر شۆڕ ئەکەن و خۆیان بەدەستەوە ئەدەن.

پەیماننامە و رێککەوتنە ئیقلیمی‌یەکانی نێوان ئەم جۆرە دەوڵەتانە بۆ پشتیوانی کردنی یەکتری دژی راپەرینی ناوخۆی گەلەکانیان و بۆ پاراستنی حکومەتەکانی خۆیان لە مەترسی شۆڕش و نارەزایی میللەتەکانی خۆیان بەکەڵک دێن. بەلام لە بەرامبەر گوشاری هێزە زلەکانی دنیادا نەک هەر بەکەڵک نایەت، بەڵکو هەر زۆر زو بێهودەیی خۆی ئەسەلمێنێ و هەرەس ئەهێنێ.

کاتێ هێزەکانی بەریتانیا و روسیا چونە ناو ئەرزی ئێرانەوە نە ئەرتەشی شاهنشاهی بایی ئەوەندە بەرەنگاری کردن کە رەزاشا بتوانێ رێککەوتنێکی ئابرومەندانەیان لە گەڵ دیمزا بکا و نە هاوپەیمانەکانی سەعدابادی بەدەنگیەوە هاتن لە سەری بکەنەوە.

#### 4. 1. دەستوری تەرکی موقاوەمەت

سەربازەکانی لەشکرەکانی 1 و 2 ی تاران بە فەرمانی رەزاشا خۆی لە ترسی هەڵگەرانەوە و شۆڕش بڵاوەیان پێ کرا. بە پێ بە رێگاکانی دەوروبەری تاراندا بەرەو شار و ئاواییەکانی خۆیان گەرانەوە.

لەشکرەکانی 3 و 4 و 9 و 11 و 15 ی ئازەربایجان و خوراسان لە بەر هێرشی هێزەکانی روسیا و لەشکرەکانی 5 و 6 و 12 ی کوردستان و خوزستان لە بەر هێرشی هێزی بەریتانیادا خۆیان پێ نەگیرا، تەنانەت نەیانتوانی رێوشوێنی کشانەوەیەکی رێکوپێک دابنێن. بەڵکو تەفروتونابون.(21)

هێزی دەوڵەتانی هاوپەیمان دریژەیان دا بە هێرش و بۆ پێشەوە چون. شا بۆ ئەوەی نیازی پاکی خۆی بۆ هاوپەیمانەکان دەرببڕێ و هێرشەکەیان رابگرێ "دەستوری تەرکی موقاوەمەت" واتە فەرمانی بەرهەڵستی نەکردنی هێزی داگیرکەر بێ هیچ مەرجێکی پێشەکی دەرکرد. عەلی سوهەیلی وەزیری کاروباری دەرەوەی کابینەی نوێی محەمەد عەلی فروغی کە راستەوخۆ دوابەدوای هێرشی هاوپەیمانەکان دامەزرا لە رۆژی 6 ی خەرماناندا ئەم نامەیەی بۆ سیر ریدەر بولارد سەفیری بەریتانیا و. سمیرنوف سەفیری یەکێتی سۆڤیێت سەبارەت بە بریاری حکومەتی ئێران دەربارەی "تەرکی موقاوەمەت" نوسی:

"بیری ئەو جەنابە ئاگادارە کە دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران بە پێڕەوی سیاسەتی بێلایەنی بەردەوام هەوڵی داوە پێوەندی دۆستانەی خۆی، بەتایبەتی لە گەڵ دەوڵەتانی دراوسێی، پارێزگاری بکا. لەم کاتەشدا کە هێزە جەنگییەکانی یەکێتی سۆڤێت و ئینگلیز هاتونەتە ناو خاکی ئێرانەوە، حکومەتی ئێران بۆ دەرخستنی ئەوپەڕی نیاز پاکی و پاراستنی پێوەندی دراوسێیەتی، شەڕی نەکردوە. لە گەڵ ئەوەش دا هێزەکانی ئەو دەوڵەتە کەوتونەتە کاری جەنگی و بۆمبارانی شارەکان و هێزی پادگانی ئێران لە شارستانەکاندا دیارە لە بەرامبەر هێرشێ کە کراوەتە سەریان بەناچاری دیفاعیان لە خۆیان و موقاوەمەتیان کردوە.

وە بە بیری بەرزی ڕادەگەیەنێ کە دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران بۆ سەلماندنی نیازی ئاشتیخوازانەی خۆی فەرمانی داوە هێزی دەوڵەتی بەتەواوی دەست لە موقاوەمەت هەڵبگرن و خۆیان لە هەمو جۆرە بەرەنگارییەک لابدەن. چاوەڕێیە هێزەکانی ئەو دەوڵەتەش پێشڕەویی خۆی ڕابگرێ و کاری جەنگی ڕابوەستێنێ. نوێنەرانی دەوڵەتەکانی تریش لەم بڕیارەی حکومەت ئاگادار ئەکرێنەوە."(22)

دەستوری تەرکی موقاوەمەت بە هەمو هێزەکانی ئەرتەش ڕاگەیەنرا. بەڵام لە ڕاستیدا نە هیچ لەشکرێ بە پێوە مابو تا "موقاوەمەت" بکا و نەهیچ موقاوەمەتێ هەبو تا "تەرک" بکرێ.

نوێنەرانی سۆڤێتی و بەریتانی وەڵامی حکومەتی ئێرانیان دایەوە. چەند داوایەکیان لێ کردبون لەوانە:

"... ئەبێ حکومەتی ئێران هێزەکانی خۆی لە خواروی خەتێکەوە کە لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات بەم شوێنانەی خوارێ دا ڕادەبورێ بکێشێتەوە دواوە: باژێری شنۆ (لە خواروی ڕۆژئاوای دەریاچەی ڕەزائیە)، حەیدەرئاباد و میاندواو (لە خواروی دەریاچەی ڕەزائیە)، زەنجان و قەزوین و خورەمئاباد (لێواری خواروی دەریای خەزەر)، بابل و زیراب و سەمنان و شاهرود لە ڕۆژهەڵاتی عەلی ئاباد. ئەو شوێنانەی ئەکەونە ژوروی ئەم خەتەوە ئەبێ بە مۆقەت لە ژێردەستی هێزی سۆڤێتی دا بن.

حکومەتی ئێران ئەبێ فەرمان بە هێزەکانی خۆی بدات کە لە ژورو و ڕۆژهەڵاتی خەتێک کە بەم شوێنانەی خوارێدا ڕادەبورێ بکێشێتەوە دواوە: خانەقین و کرمانشاه و خورەمئاباد و مەسجید سولەیمان و هەفتکل و گەچساران و ڕامهورمز و بەندەر دەیلەم. ئەو شوێنانەی ئەکەونە ژێرو و ڕۆژئاوای ئەم خەتەوە بە مۆقەت هێزەکانی ئینگلیز داگیری ئەکەن."(23)

هەمو ئەم شوێنانە بە کردەوە لە ژێردەستی هێزەکانی ڕوسی و بەریتانیدا بو. مابو حکومەتی نوێی ئێران بە ڕەسمی بۆیان بسەلمێنێ و گیروگرفتیان بۆ دروست نەکا.

## 4. 2. لێخرانی ڕەزاشای پەهلەوی

شا بە هەمو نرخێ ئەیویست تاج و تەختەکەی بپارێزێ. ئامادە بو هەمو مەرجەکانی هاوپەیمانەکان قوبوڵ بکا. پێی وابو بە گۆڕینی حکومەت و دانانی وەزارەتێکی تازە و تەرکی موقاوەمەت و قوبوڵ کردنی مەرجەکانی تری هاوپەیمانەکان وازی لێ ئەهێنن.

شا وەزارەتەکەی عەلی مەنسور (مەنسورولمولک) و هاوکارەکانی لێ خست. محەمەد عەلی فروغی (زەکائولمولک) ی کرد بە سەروەزیری ئێران و وەزارەتێکی نوێیان پێک هێنا. دەستوری تەرکی موقاوەمەتی دا. خێزانەکەی نارد بۆ ئەسفەهان. هێزی هاوپەیمانەکان بەردەوام لە پێشکەوتن دا بون. تاران کەوتبوە ژێر مەترسی گیرانەوە.

وەزارەتەکەی فروغی چەند کارێکی گرنگی ئەنجام دا، ڕەزاشا دەستی لە تاج و تەختی ئێران هەڵگرت بۆ محەمەد ڕەزای کوڕی. ڕازی بو خۆی لە ئێران دور بخرێتەوە بۆ خواروی ئەفریقا. ئێران لە باری بێلایەنی

دەرچو. جەنگی دژی ئەڵمانیا و دەوڵەتانی میحوەر ڕاگەیاند. پەیمانێکی 3 قۆڵی لە گەڵ بەریتانیا و ڕوسیا بەست. بەمجۆرە سەرلەنوێ پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ڕێکخستنەوە.

### 4. 3. پەیمانی ئیتیحاد

عەلی سوهەیلی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران و. سێر ریدەر بولارد سەفیری بەریتانیا و. سمیرنوف سەفیری یەکێتی سۆڤێت. لە تاران لە ڕۆژی 9 ی ڕێبەندانی 1320 دا بەرامبەر بە 29 ی کانونی دوەمی 1942 لە کۆشکی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران کۆبونەوە. پەیمانی 3 قۆڵی: ئێران. بەریتانی. سۆڤێتی "ئیتیحاد" یان ئیمزا کرد.

پەیمانی ئیتیحاد پێک هات بو لە 9 مادە.

لە مادەی 1 هەمی دا هەمویان بەڵێنیان دابو ڕێزی یەکێتیی ئەرز و حاکمییەت و سەربەخۆیی ئێران بگرن.

لە مادەی 2 هەمی دا ئێران ئامادەیی دەربڕی بو بۆ ئیتیحاد لەگەڵ دەوڵەتانی یەککگرتو دژی ئەڵمانیا و میحوەر.

لە مادەی 6 هەمی دا بەڵێنیان بە یەکتری دا بو کە دەوڵەتانی هاوپەیمان کاری نەکەن یا پەیمانێ نەبەستن زەرەری یەکێتی ئەرز و حاکمییەت و سەربەخۆیی سیاسی ئێرانی تێدا بێ و ئێرانیش کارێ نەکا یا پەیمانێ نەبەستێ پێچەوانەی ئەم پەیمانە بێ.

لە مادەی 7 هەمی دا بەڵێنیان بە ئێران دابو یارمەتی بدەن بۆ چارەسەر کردنی دژوارییە ئابورییەکانی.

لە مادەی 8 هەمی دا ئەبو هەمو ئەو بەڵێنانەی بە یەکتری درا بون. هەمو لاکان وەکو یەک بە جێی بهێنن.

لە مادەی 9 هەمی دا ماوەی کارپێ کردنی پەیمانەکە دیاری کرا بو.

مادەکانی 3 و 4 و 5 ی پەیمانەکە گرنگییەکی تایبەتییان هەبو کاری لە پاشەڕۆژی دەوڵەتی ئێران و گەلەکانی ئەکرد.

مادەی 3 هەمی ئەڵێ:

1. دەوڵەتانی یەککگرتو پێکەوە و هەریەکەیان بەتەنیا بەڵێن ئەدەن کە بە هەمو ڕێگەیەکی لە بەردەستیان دایە ئێران لە هەر دەستدرێژییەکی ئەڵمان و هەمو دەوڵەتێکی تر بپارێزن.
2. خاوەن شکۆی هومایون شاهنشاهی ئێران بەڵێن ئەدەن کە:

أ. بە هەمو وەسیلەیەکی کە لە دەستیان دایە و بە هەر شێوەیەکی بۆیان بلوێ هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتانی یەککگرتو بکەن بۆ ئەنجامدانی بەڵێنی سەرو. بەڵام پشتیوانی هێزەکانی ئێران سنوردار ئەبێ بە پاراستنی ئاسایشی ناخۆی خاکی ئێران.

ب. بۆ تێپەڕینی لەشکرییان و تفاق لە یەکێ لە دەوڵەتانی یەککگرتوەوە بۆ یەکێکی تر لە دەوڵەتانی یەککگرتو یا بۆ مەبەستی لەو بابەتە مافی بێ سنور بدەن بە دەوڵەتانی یەککگرتو کە ئەوان هەمو هۆکانی پێوەندی لە خاکی ئێراندا بەکاربهێنن و چاودێری بکەن و بپارێزن و لە حاڵەتێکدا پێویستی جەنگی ئیجاب بکا بەهەر جۆرێ کە بە چاکی بزانن بیگرنە دەست. ئەم برگەیە ڕێگەی ئاسنین و ڕێگەی ڕوبار و فرۆکەخانە و مینا و لولەی نەوت و دامەزراوی تەلەفۆن و تەلەگراف و بێتەل ئەگرێتەوە.

ج. هەمو جۆرە یارمەتی و کارناسانییەکی لە توانـادا بـێ بنـوێنن بـۆ چاوێدێری و بـاش کردنـی هۆکانی پێوەندی ناوبراو لە برگەی (ب) دا، ئامەزراو و کرێکار ئامادە بکەن.

د. بە ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتانی یەکگرتو هەرجۆرە سانسۆرێ لە سەر هۆکانی پێوەنـدی نـابراو لە برگەی (ب) دا بە پێویست بزانن دابنێن و بیهێڵنەوە.

3. ڕون و دیارەکە لە جێبەجێ کردنی برگەکانی (ب، ج، د) ی بەندی دوەمی ئەم مادەیە دەوڵەتانی یەکگرتو پێویستییەکانی ئێران بەتەواوی لە بەرچاو ئەگرن.

مادەی 4 هەمی ئەڵێ:

1. دەوڵەتانی یەکگرتو ئـەتوانن لـە خـاکی ئێـراندا هێـزی زەمینـی و دەریـایی و ئاسـمانی بـەو ئەندازەیەی بە پێویست ئەزانن بهێڵنەوە و تا جێیەکی پێویستییەکانی ستراتیجی ڕێگا بـدەن ئەو شوێنانەی ئەم هێزانەی تێدا ئەهێڵرێتەوە بە موافەقەتی دەوڵـەتی ئێـران دیـاری ئـەکرێن. هەمو کاروبارەکانی پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەتانی یەکگرتو و ئیداراتی دەوڵەتی ئێران هەتا بتوانرێ بە هاوکاری ئیداراتی ئێران بە لادا ئەخرێن، بە جـۆرێ کـە ئاسایشـی هێـزی گـۆرین بپارێزرێ. بێگومانە کە هەبونی ئـەم هێزانـە لـە خـاکی ئێـراندا داگیرکردنـی سـپایی نـابێ و بەرامبەر بە بەڕێوەبەرایەتی و هێزەکانی ئاسایشی ئێران و ژیـانی ئـابوری وڵات و هـاتوچۆی ئاسایی دانیشتوان و جێبـەجێ کردنـی قـانون و بڕیارەکـانی ئێـران ئەوەنـدەی بکـرێ کـەمتر خۆیانی تێ هەڵئەقورتێنن.

2. ئەوەندەی بتوانرێ زو لە پاش جێبەجێ کردنی ئەم پەیمانە یـەکێ یـا چەنـد ڕێکـەوتنێ دەربـارەی بەڵێن دانی دارایی کە دەوڵەتانی یەکگرتو بە هۆی بڕیارەکانی ئەم مادەیە و برگەکانی (ب، ج، د) ی بەندی دوەمی مادەی سێیەم دەگرنە ئەستۆ لە کاروباری وەکـو کڕینـی نـاوخۆ و کـرێی خـانو و ئامەزراوی پیشەسازی و بەکرێ گرتنی کرێکـار و خـەرجی هـەڵگرتن و گواسـتنەوەی شـتی لـەو بابەتانە لە نێواندا ئەبەسترێ. ڕێکـەوتنێکی تایبـەتی لـە نێـوان دەوڵـەتانی یـەکگرتو و دەوڵـەتی شاهنشاهی ئێراندا ئەبەسترێ ئەوە دیـاری ئـەکا کـە پـاش جـەنگ خـانو و ئیسـلاحاتی تـر کـە دەوڵەتانی یەکگرتو لە خاکی ئێران دا کردویانە بـە چ مـەرجێ ئـەیـدەن بـە دەوڵـەتی شاهنشـاهی ئێران. لەو ڕێکەوتنانەدا کە باس کران ئەو پارێزگارییانەش بڕیار ئەدرێن کە هێزەکانی دەوڵەتانی یەکگرتو لە ئێران دا ئەیان بێ.

مادەی 5 هەمی ئەڵێ:

دوای ئـەوەی هـەمو دوژمنایەتییـەکانی نێـوان دەوڵـەتانی یـەکگرتو لـە گـەڵ دەوڵـەتی ئاڵمـان و هاوبەشەکانی دا بە پێی یەک یا چەند ڕێکەوتنێکی ئاگربڕی جەنگ ڕاگیرا دەوڵەتانی یەکگرتو لە ماوەیەکدا کە لە شەش مانگ تێ ناپەڕێ هێزەکانی خۆیان لە ئێران ئەبەنە دەرەوە. ئەگەر پەیمـانی ئاشـتییان لـە پـێش شـەش مـانگی دوای ئـاگربڕدا لـە نێـوان دا بەسـترا ڕاسـتەوخۆ هێزەکانیـان ئەبەنـە دەرەوە. مەبەسـت لـە هاوبەشەکانی ئاڵمان هەمو دەوڵەتێکی ترە کە ئێستە یا لە پاشەڕۆژدا دوژمنایەتی یەکێ لە دەوڵەتانی یەکگرتوی کرد بێ یا بیکا."(24)

پەیمانی ئیتیحاد سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ دیپلۆماسی ئێرانی چونکە بێ شەڕ و بەرهەڵستی:

(1) دەوڵەتانی گەورە سەرلەنوێ یەکپارچەیی خاک و سەربەخۆیی حکومەتی ئێرانیان سەلماندەوە،

(2) حاڵەتی دوژمنایەتی و داگیرکراوی ئێرانیان گۆڕی بە حاڵەتی دۆستایەتی و هاوپەیمانێتی.

(3) دەوڵەتانی داگیرکەر گفتیان دا دوای برانەوەی جەنگ ئێران بە جێ بهێڵن.

## 5. کورد و ڕوداوەکانی شەهریوەر

### 5. 1. هەڵوێستی کورد

بە پێچەوانەی نوسینی ڕەسمیی ئێرانەوە زۆرایەتی کورد بە خۆشییەکی بێ وێنەوە هەواڵی هاتنی هێزەکانی ڕوسی - ئینگلیزییان وەرگرت. "حیزبی ئازادیخوازانی کوردستان" بەم بۆنەیەوە بەیانێکی دەرکرد بۆ بەخێرهاتنی ئۆردوی سور.

"هێمن" ی شاعیر بیرەوەرییەکانی خۆی ئەگێڕێتەوە:

"... لە مانگی خەرمانانی 1320 - 1941 ڕۆژێکی چوبومە سەر خەرمانان کرێکارەکانمان خەریکی مالۆسک زرینگاندنەوە و باڵەکەو بون و منیش لە کنیان دانیشتبوم و ئەسپەکەم وەسەر کوێزەر کرد بو ئەو دەمی فڕۆکە و ماشین زۆر کەم بون و خەڵک پێی سەیر بون. لەپڕ دو فڕۆکەی ڕەشی زەلام پەیدا بون. ئێمە تا وێستا فڕۆکەی ئەوەندە زلمان بە ئاسمانەوە نەدی بو. هەمو دەستیان لە کارهەڵگرت و تەماشای فڕۆکەکانیان دەکرد. دیمان فڕۆکەکان نێزیک بونەوە و ئەوی بون و کاغەزیان بەردانەوە. هەمویان ڕایانکرد بزانن چییە؟ ژنێک لەپێش هەموانا گەڕاوە و کاغەزێکی دامێ و گوتی ها بە قوربانت دەبم بیخوێنەوە بزانە چییە و چی تێدا نوسراوە؟

بڕوا بکەن وەختا بو لەخۆشیان باڵ بگرم. ئەو کاغەزە بەیاننامێک بو کە بەزمانی کوردی نوسرا بو. چۆن ئەوە خەونە یا ڕاستییە؟ دەوڵەتێکی گەورەی وەک یەکێتی سۆڤیەتی بە زمانی کوردی بەیاننامە بڵاو بکاتەوە؟ بۆ من هەروا کەم نەبو.. ئەو بەیاننامە بۆنی شەڕی لێ دەهات... هەرچەندە دڵخۆشی خەڵکیان دابوەوە و... بەیانی دو فڕۆکە هاتن و چەند نارنجۆکی بچوکیان بە شاردا دا. ئەرتەشی شاهەنشاهی وەک تۆوی هەرزن بڵاوبو..."

ئەو "چەند نارنجۆکە بچوکە" لە ناو خەڵکی موکریان دا بە سەرەتای شادی و ڕزگاری دائەنرا پێیان ئەگوت "بۆمبی ڕەحمەت". شاعیرەکانی کورد بە ستایشێکی بێ ئەندازەوە لە هاتنی "فریشتەی ئازادی" و"مژدەهێنەری ئازادی" ئەدوان. هەژار بە بۆنەی ئەو بەیاننامەیەوە وتویەتی:

بە بڵاوبونی دو پەڕ ئاگاهی بو بڵاو، ئەرتەشی شەهەنشاهی

### 5. 2. ژیانی کورد لە سایەی ڕیژێمی پەهلەویدا

بۆ تێگەیشتن لە مەلامەتی شادمانی کورد بە هاتنی هێزی ڕوسی - ئینگلیزی بۆ ناو کوردستانی ئێران ئەبێ سەرنجی هەلومەرجی ژیانی گەلی کورد لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ڕیژێمی ڕەزاشادا بدرێ. بۆ زانینی باری ژیانی کورد و خواستەکانی لەو سەردەمەدا. چاکتر وایە هەندێ لە وتارەکانی ڕۆژنامەی کوردستان. وەکو خۆی رابگوێزین.

ڕۆژنامەی "کوردستان" لە ژێر سەردێری "لە بەر چی کورد قیامی کرد؟" نوسیویتی:

"کورد تەنها میللەتێکە کە ڕسوم و ئادابی باستان و شەعائیری میللی و خەسایسی زاتی خۆی لە دەست نەداوە و بێگانەکان قەت نەیانتوانیوە دەستی تەعەدا بۆ سەر زەمینی کوردان درێژ بکەن. فیتنەی جەنگیز و حاییسەی مەغۆل، ئەو دو ئاورە خانمان سوتێنانە نەیانتوانی چکۆلەترین تەئسیرێکی لە ڕوحیەی کوردان بکەن ئەو میللەتە قەدیمەی بێننە ژێر باری نفوزی خۆیان. تاریخی ئێران و عالەم، تاریخی ئیسلامی فیداکاری ئەو شێرمەردانەی لەبیرە. وێستاش واقیعەی گزنفۆن و تەلەف بونی ئەکسەری لەشکرییانی بە دەست کوردانی کوێستان نشین لە بەر چاوە.

خولاسە دەتوانم بڵێم کە لە تەواوی ئەدواری درەخشانی ئێراندا غاشیەی شەوکەت و عەزەمەتی ئێران لەسەر شانی موبارێزانی بێنەزیری کوردی بوە وەلێ حەقیقەتێک کە لە ئیفشای وی ناتوانم خودداری بکەم ئەوەیە: کوردی بێچارە وەکو سایری برادەرانی ئێرانی نە لە دەورەی سەراسەر زوڵمەتی دیکتاتۆری و نە لە دەورەی دیمۆکراسی موشەعشەع لە حقوق و مەزایای ئینسانیەت بەرخوردار نەبوە و ئەغلەب یوغی بەندەگی و بوردەگی حکومەتانی دیکتاتۆری لە مل دا بو. هیچ وەختێ ڕۆژی عەدالەت و دیمۆکراسی نەهاتۆتە سۆراخی ئەو تودە ڕەنجبەرەی کە ڕەگی ئەعزەمی دیقتیسادی ئێرانی تەشکیل داوە. قەت باسکی مەعدەلەت و ئازادیخواهی پەنجەی زۆر و قولدوری لەسەر گەروی ئەو میللەتە لا نەبردوە و دەستی ڕەددی لە سینگی ئەربابانی وی نەداوە.

ئەگەرچی گاە گاهێک لە ئەتراف و سەرحەداتی ئەو مەملەکەتە ئیقداماتیک لە لایەن بەعزێک لەو میللەتە نەجیبەی واقیع بوە و مونجەڕ بە خونریزی تەرەفەین بوە لەو ئیقداماتە ئەزەرێکی موناقی ئیستیقلالی ئێرانیان نەبوە بەڵکو وەختێک لیباسی عەمەلیان لەبەر... ئیقداماتی خۆیان کردوە کە شەرەف و ناموس و غیرەتی میللی خۆیان لە مەعرەزی ئەغرازی دوچە و دیکتاتۆران دیوە و شەهامەتی فیترییان ئیجازەی نەداوە حقوقی میللی خۆیان فیدای مەتامیع وحیرس و وەلەعی چەند نەفەر سپاهی و کیشوەریی ئێران ناشوناس بکەن وە بۆ ئاوری ئیحساساتی میللییان هەڵگیرساوە و خائینین و غاسیبینی حقوقیان لە خۆیان دور خستۆتەوە ئەو دیفاع لە حقوقانەیە کە بە قەولی ئەوانەی دەیانەوێ میللەتی کورد بە خوێنخوار و چەپاولگەر موعەڕەفی کەن، سەرکەشی! و توغیانی ئێوە.

لەو بیست و چەند ساڵەی ئەخیردا وکەلا و وزەرای دەوڵەتی عەریز و تەویلی شاهنشاهی! لەباتی وەی حاسڵی دەسترەنجی مە سەرفی خوێندەوار کردن و تەربیەتی مە بکەن و لە ئیستیعدادی زاتی و هۆشی سەرشاری مە ئیستیفادە بکەن و چەرخی سنعەت و کیشاوەرزی مەملەکەت وەکارخەن لەباتی ئەو کارانە، کە زامنی وەحدەتی میللی و ئارامشی سیاسی مەملەکەتە، ئاغایانی وزەرا و وکەلای سەلاحیەتدار حاسڵی عەرەقی جەبینی و کەددی یەمینی مەیان بە سورەتی ماشینی لوکس و ئاپارتمان و غەیریهی دەرێنا. ئازادیخواهانی کوردی یەک لە پاش یەک حەپس و تەبعید و دەرماندراو کران.

نزیک بو بە کوللی میللەتی کورد، کە لە ژێر مەنگەنەی زوڵم و زۆری ڕەزاخان دەیناڵاند، مەحو و نابود بێ. خۆشبەختانە لە شەهریوەرمانگی ساڵی 1320 بایەکی شەماڵ وەزی و بەفری زوڵم و شەقاوەتی دیکتاتۆری تواندەوە. ئەو هەمو حەبس و تیرۆر و زەجرو شکەنجە و بێحقوقی و کوشت و کوشتارە بو ئیحساساتی میللی کوردی وە جۆش هێنا. ئینعیکاسی ئەعمالی شەنیعەی ڕەزاخان و ئەترافیانی بو میللەتی کوردی ئازادی و خودموختاری وەگیر کەوت. هیچ قوە و قودرەتێک ناتوانێ لە دنیای دیمۆکراسی فیعلیدا ئێمە بێنێتەوە ژێر یوغی ئەسارەت و بەندەگی چون ئەو حەقە ئەوڕۆ ئێمە بە دەستمان هێناوە روحی مەنشوری ئەتلانتیک و موعاهەداتی موتەفیقینە."(25)

لە سەروتارێکی تری دا لە ژێر سەردێڕی "ئێمە دەڵێین چی؟" بە قەڵەمی ح قزڵجی نوسیوێتی:

"ئێمە دەڵێین: لە دەوری بلەوەزی و دیکتاتۆریی بیست ساڵەدا زوڵم و زۆرێکی یەکجار زۆر و زەوەندمان لێ کراوە. بەروبوی کوردستان کە بە ڕەنجی باسک و ئارەقی نێوچاوانی کوردان دەهات بە فیڕۆئی دەبرا. بەندیخانە و زیندانی شاران لە برا کوردەکانی ئێمە پڕ دەکران لە هەمو شوێنێکەوە هەر کورد بو دەماندی بۆ وڵاتانی دور دەردەکران. زمانی زگماکمان یاساغ بو. نەیان دەهێشت جلوبەرگی خۆمان لەبەر کەین. بە زمانی خۆمان بخوێنین و بنوسین. دەرگای مزگەوتەکانیان لێ دەبەستین تا عیبادەت و خواپەرستنمان بۆ نەکرێ، مەوقوفەکانیان گرت بوە دەست خۆیان و مەلا و فەقێکانیان پەرەوازە کردن.

بەتایبەتی ئەمنیبە گوزەرانیان لە لانیبیە هەژارەکان وا تاڵ کرد بو مەرگی خۆیان بە ئاوات دەخواست وەکو سەیفولقوزات، ڕەحمەتی خودای لێ بێ، لەو دەمیدا گوتویە:

لا هەڵدراو و جگەربڕاو و فڕێ دراو

ڕامان دەدەن بە جارێ لە هەوراز بۆ نشێو

حاسڵی ئێمە هەرچی بومان: توتن، گەنم، پەمبۆ، خوری، شتی لێرەوار، هەموی نینحیسار بو بە نرخێکی زۆر کەم لێیان دەسەندین و دەیان برد بەشی خۆشمان بۆ نەدەماوە. کوتاڵ و وردەواڵەی خۆشیان نەدەداینێ. ماڵیات و عەواریزی بەلەیە و شێروخورشیدی سوریان لە ئێمە دەسەند و لە تاران کۆشک و باڵەخانەیان پێ دروست دەکرد و بە خەرجی مۆدی ژن و فۆرمی جلی ئەوان دەچو قامکی مادموزیلی... ئێمەش لە شاخ و داخ هەناسە سارد و ڕەشوروت بە دەست مەئموورە غەدارەکانەوە دەلەرزین. بیسان شاعیری ناوبراو گتویەتی:

بۆ وانە هەرچی جوانە لە جێ، دێ، لە ژن، لە ماڵ

هەر شاخ و داخە بۆ مە، کوری ڕەش، کچی دزێو

هەرگیز لە بیرم ناچێ جارێک کابرایەکی بەقاڵ لە مەلایەکی دەپرسی: چۆنم لەو مشکوزمەیبە نەجات دەبێ؟ گوێزم لە کابرایەکی لێرەواری کڕی، کابرا گوتی تا ولاغەکانم تاقەت دەکەم جەواڵەکانم بۆ بەتاڵ کە، برێکی پێ چو کابرا هاتەوە پڕی دا جەواڵەکانی و هەڵات ئەوەندی بانگم کرد وەرە حەقەکەت بەدەمێ ئاوڕی نەداوە و ڕۆیی. دوای چەند دەقیقە پیاوێکی مالیە هات و لە کابرای پرسی، کە ورد بومەوە دوقاتی قیمەتی گوێزەکەی ماڵیات داوا لێ کرد بو بۆیە کابرای بەدبەخت هەقی گوێزەکەشی نەویست و هەڵات.

ئەمە تنۆکێکە لە دەریایەک و کایەکە لە کێوێکی ئەزیەت و نازاری ئەودەم. هیچ کەس نیە ئێستاش نەناڵێنێ و ئاگای لەو کارەساتە نەبێ هێندەش لەمێژ نیە شایەد و بەڵگەی بوێ. ئەو چوار ساڵە تەواوی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی تاران لەم بابەتەوە دەدوێن هێشتا لە عۆدەی نەهاتون.

ئێمە دەڵێین: ئێستاش بەشی گەورەی کوردستان بەو دەردەوە دەناڵێنن. لە سەقز و بانە و سەردەشت خەڵکی حاڵێکیان نیە، دەیانگرن، لێیان دەدەن، شتیان لێ دەستێنن، لەبەر سوغرە و بێگار لە کار و کاسبی بون. بە زۆر کاغەز و تەلگرافی ڕەزامەندیان پێ دەنوسن. هاتوچۆیان بڕیوە. خەڵکی لای ئێمە بچنە ئەوێ دەیانگرن. لەو ڕۆژانەدا سەرهەنگێک خەڵکی سەقزی کۆ کردۆتەوە و نوتقێکی بۆ کردون گوتویەتی ئەو تۆپانەی لە سەر داری قەڵا دابەستوە بۆ گیانی ئەوانەیە بوی مەرامی دیمۆکراسیان دەسەردا بێ!

دو نەفەر ئەفسەری سنەیی کە موتەهەم بون بە گوناحی گەورەی ئازادیخوازی!! باڵیان بەستون و بردویانن بۆ سنە. قەدەغە کراوە لە بازاڕ و کوچە و شەقام و قاوەخانە لە دو کەس پتر پێکەوە ڕانەوەستن. شەوانە هاتوچۆی خەڵک بۆ ماڵی یەکدی سەخت یاساغە. خۆ نوسینی زمان و خوێندنەوەی مەتبوعاتی کوردیش ئەوە هیچ کە باسی سەروماڵە لە هەورامان و مەریوان و جوانڕۆ و کرماشان و سنە و تیلەکۆ و گەروسیش گوزەرانی خەڵک هەروایە.

بە ڕاستی پێیان وایە ئەم شەڕە گەورەی دونیا بۆ دەستورکردنی ملی بەچکە دیکتاتۆران کراوە وا خۆیان هەڵمساندوە و سمێڵیان گیف کردۆتەوە، دەنا ئێستا کە لە حەبەشە و زەنگەباریش گوڕەی ئازادی گوێی ئامانی پڕ و کەڕ کردوە بۆ دەبێ لە کوردستان جەنابی زوحاک و نارژمی () فیرعەون لە گۆڕێ دا بێ؟ بۆ دەبێ حکومەتی ئیرتیجاعی دە هەزار تۆن توتنی کوردستان بکڕێ؟ لە بری دراو درۆ و فڕوفیشاڵ بدەدەست خاوەنی توتن نێ و، قاقا بە ژن و منداڵی سەرمابردو و ریشی بەفراوی وەرزێری کورد پێ بکەنێ؟

ئێمە دەڵێین: قانونی خۆرسکاو (تەبیعەت) هەر وەکو لە حەیوان و گیا و شتی وادا دەسەڵاتی هەیە، لە کۆمەڵ و پۆل و بیر و فیکر و عەقڵ و شعور و هونەر و سنعاتیش دا حوکمی هەیە. منداڵ کە دەبێ پلەگۆشتێک پتر نیە کەچی پاش ساڵێک بەخۆدا دێ و برێک زل دەبێ، ورده ورده پێوە دەچێ تا دەبێتە ئینسانێکی تەواو و خۆی دەناسێ. کاروباری خۆی بۆ خۆی پێ رادەگا. دیارە کەمیش رەگەڵ زۆر و هێندێش رەگەڵ هەمو (جوزئ رەگەڵ کول) دەکەوێ.

لە دەوری شارستانیەتی و زانستی ئەمڕۆکەدا کە دەنگوباسی ئەمپەر و ئەوپەری دونیا هەمو رۆژێ هەمو کەس بە گوێی خۆی دەبیسێ و ئینسان وەک مەل و باڵندە بۆ هەمو جێگایەک بە باڵ دەفرێ و دونیا هێندە لێک نزیک بۆتەوە بە راستی وەک خێزان زۆری لێ هاتوە.

دیارە کوردستانیش برێکە لە دنیا و کوردیش کۆمەڵێکن لە نەوعی ئینسان بە ئەندازەی خۆیان لە گەڵ دنیا و رەگەزی بەشەر سەرکەوتون و بیر و شعوریان لە ئاسۆگی جاران بەرز بۆتەوە، تێ گەیشتون ئەم جۆرە حکومەت و رژێمە وەکو گیرەی هۆمەرەکوێر وایە هەر بۆیە کە دەستەیەک خوێنمژ و خۆهەڵمسێن بە نێوی (هەیئەتی حاکیمە) ئەقیزەیان تێوەژێنن و مەبەست و ئارەزوی خۆیانیان پێ گێرە کەن. کابرایەکی ئازەربایجانی لە سەر فارس یا فارس لە سەر ئازەربایجانی یا ئازەربایجانی و فارس لە سەر کورد دەکەنە ملۆزم تا ئەم نەتەوانە لەگەڵ یەک بینە دوژمن و قین لە یەک هەڵگرن و قەت دەس ئەدەنە دەستی یەکدی نەکو مەقامی فیرعەونیی ئەوان لەق بێ وەکو کوردستان و ئازەربایجانی ئێستای لێ نەیە، کە ئەو هەمو دوژمنایەتی و بەربەرەکانیێەی داروەستەی دیکتاتۆری دەبەینی خست بون بە جارێک فرێیان داوە و بونە برایەکی بە راستی و قازانج و زەرەری یەکتری بە هی خۆیان دەزانن.

چەندە سەیرە کە ئێستاش خەیاڵی خۆهەڵمساندنی نەتەوایەتی لە سەردا ماوە!

تێ گەیشتون ژیانی ئەو هەمو عالەمە تۆپی فوتباڵ نیە چەند کەس بە شەق بۆ یەکتری بهاوێژن.

ئێمە دەڵێین: سەعادەت و خۆشبەختی خۆمان و تەواوی میللەتانمان دەوێ و مانیعی کاری کەس نین بەڵام ئەوانەی بەرهەڵستی ئەو خۆشبەختیێەن بە دوژمنیان دەزانین.

ئەو ئیسلاحاتەی بیوەلە دیکتاتۆرەکان دەیڵێن و سەری ئەو سەری دەگاتە ئاڵوگۆری مەئموران بە لایەلایە و چاوبەستنی دەزانین. ئەوە بۆ فریودانی خەڵکی هەزار ساڵ لەوە پێش دەبێ. دەنا تازە لەم عەسرەدا گوێی ئێمەی پێ ئاناخندرێ و چاوی مەی پێ نانوسێ.

ئێمە پێمان وایە دەبێ ریژێمێکی موناسیبی دونیای ئەمڕۆ بۆ ئێمە بێتە رو، سیستەم چەشنێکی دیمۆکراتیک حاکم بێ لەبەر ئەمە لە کوردستاندا لە ژێر باڵی پیرۆزی لایەنگرانی ئازادی بەشەر بەرێکخستنی حیزبی دیمۆکرات و شارەزایی کردنی جەنابی قازی محەمەد پێشەوای کوردستان کاروباری خۆمان دەدەست گرتوە و چاوەنۆڕیشین برا کوردەکانی کەش لەگەڵ ئێمە لە سفرەی ئازادی کوردستان کۆبینەوە."(26)

### 5. 3. بۆشایی دەسەڵات

هەرەسی ئەرتەش بۆشاییەکی گەورەی لە دەسەڵاتی حوکمرانی دا بەجێ هێشت بو. دەزگای بەڕێوەبەرایەتی ئێران، تەنانەت هێزەکانی ژاندارم، بە پشتیوانی ئەرتەش دەستی بە سەر کاروباری ناوچەکاندا ئەڕۆیشت. ئەمانی دەسەڵاتی ئەوان ڕێگەی تەخت کرد بۆ پیاوە دەسڕۆیشتوەکانی کورد خۆیان لە ناوچەکانی خۆیاندا حوکمرانی بکەن. زۆر لەوانەی لە سەردەمی دیکتاتۆری رەزاشا گیرا بون و دور خرا بونەوە بۆ دەرەوەی کوردستان، لە دوای روخانی رەزاشا ئازادکران و گەڕانەوە کوردستان. سەرانی کورد لەزۆری ناوچەکاندا کەوتنە جموجوڵ. بە ئازادی هاتوچۆیان ئەکرد. لە زۆر جێگەی مەڵبەندەکانی شیمال و

جنوبی کوردستان کاروباری ناوچەکانی خۆیان گرتە دەست و پەلاماری ئەو پاسگایانەیان ئەدا کە نیشانەی زوڵموزۆری سەختی سالأنی دوروبریژی دیکتاتۆریتی رەزاشا و دەزگای بۆگەنی بەرێوەبەرایەتی ئێرانی بو. چەکیان لێ ئەسەندن و دەریان ئەکردن.

## 5. 3. 1. سەرانی کورد و سەردانی باکۆ

د قاسملو نوسیوێتی:

"پاش ئەوەی لە 3 ی خەرمانانی 1320 (25 ی ئوتی 1941) دا رژێمی رەزاشا روخا و لەشکری سور هاتە ئێران و لە بەشی شیمالی کوردستانی ئێران دا جێگیر بو. کاربەدەستانی سۆڤیەتی راستەوخۆ لە گەڵ مەسەلەی کورد روبەرو بون. هێندێک جولأنەوەی وەک بزوتنەوەی ورمێ لە بەهاری سالی 1321 دا سەرنجی دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ ئەو راستیە راکێشا کە لە کوردستان دا هەستێکی بەهێزی نەتەوایەتی هەیە و کوردستان بیلقوە ناوچەیەکی شۆرشگێرە. هەر بۆیە هێندێک لە کومیسێرە سیاسییەکان و ئەفسەرە سۆڤیەتییەکان کە لە تەورێز و ورمێ کاربەدەست بون، بەرەبەرە تێ گەیشتن کە پێویستی بەوە هەیە کە یەکێتی سۆڤیەتی لە گەڵ گەلی کورد پێوەندی پتەوتر دابمەزرێنێ. بەلأم لە بەر نەبونی رێکخراوێکی سیاسی و هەروەها لە بەر ئەوەی سەرۆک عەشیرەتەکان و ئاغا و شێخەکان لە نێو خۆیان دا رێک نەدەکەوتن تا نوێنەرێک هەڵبژێرن و یا چەند کەسێک وەک نوێنەری خۆیان دیاری بکەن. یەکێتی سۆڤێت لەم بارەیەوە توشی سەر لێ شێواوی بو نەی دەزانی دەگەڵ کێ دەبێ پێوەندی بگرێ و وتوویژ بکا و کێ دەتوانێ نوێنەری راستەقینەی گەلی کورد بێ.

لە وەزعی سیاسی و ئابوری و کۆمەلأیەتی ئەو کاتەدا و بە لە بەر چاو گرتنی پلەی پێگەیشتن و تەرکیبی چینایەتی کۆمەڵی کوردەواری، بەرە بەرە نوێنەرانی سۆڤیەتی تێ گەیشتن کە واقیعبینانەتر و باشتر ئەوەیە لە گەڵ کەسانێک پێوەندی بگرن کە چ لە باری عەشیرەتی و ئایینی و چ لە باری روناکبیرییەوە لە کوردستان دا خاوەن نفوزن، ئەوە بو کە یەکێتی سۆڤیەتی لە مانگی سەرماوەرزی 1320 دا پاش ئەوەی ئەفسەر و کۆمیسێرە سیاسییەکان چەندین جار هاتوچۆی مەهابادیان کرد، هەیئەتێکی 30 کەسیان لە پیاوە ناسراوەکانی کوردستان بۆ باکۆ بانگ هێشتن کرد. تەرکیبی هەیئەتەکە بریتی بو لە سەرۆک عەشیرەتەکان و هێندێک شێخ و ئاغا و هەروەها نوێنەری چین و توێژە نێوەنجییەکانی شاری مەهاباد. ئەندامانی ئەم هەیئەتە کە لە لایەن نوێنەرانی سۆڤیەتییەوە هەڵبژێردرا بون لە سەرەوەی هەموان قازی محەمەد بو کە ئەو وەختە هەم بە شەخسییەتی ئایینی و سیاسی و هەم بە روناکبیرێکی بە نفوز ناسرا بو. ئەوانە بە رەسمی نە نوێنەری حیزبێکی سیاسی بون نە نوێنەری جولأنەوە. تەنانەت بیروباوەریشیان بە تەواوی پێکەوە رێک نەدەکەوت.

لە راستیدا ئەم سەفەرە زیاتر باری یەکترناسینی هەبو. یانی مەبەست ئەوە بو کە هەم سۆڤیەتییەکان نوێنەرانی کوردەکان بناسن و هەم سەرۆکە کوردەکان کۆمەڵی سۆڤیەتی لە نزیکەوە بە چاوی خۆیان ببینن و بیناسن. هەرچەند لە بنەرەتەوە ئەم سەفەرە، سەفەرێکی سیاسی بو. بەلأم بە رەسمی وەک سەفەرێکی فەرهەنگی ناویان برد."(27)

جگە لە قازی محەمەد، ئەوانەی بۆ ئەم سەفەرە بانگ کرا بون: حاجی بابە شێخ، عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەدی دێبوکری، عومەر عەلیاری دێبوکری، رەشید بەگی هەرکی، زێرۆ بەگی هەرکی، تەها هەرکی، سەید محەمەد سدیق، محەمەد ئەمین شکاک، حەسەن هەنارەی شکاک، حەسەن تیلو شکاک، حاجی قەرەنی ئاغای مامەش، کاک هەمزەی نەلۆسی مامەش، مەجید خانی میاندواو، نوری بەگی بەگزادە، نورکۆ بەگزادە، ئەحمەد بەگی فەیزوڵابەگی، بایزئاغای گەورک، محەمەد حسێن سەیفی قازی.(28)

## نەخشەی ژمارە -٦-
## ناوچە کوردنشینەکانی ئێران




سەرچاوە: امیر حسنپور، نەتەوایەتیو زمان لەکوردستاندا، سانفرانسیسکۆ، ١٩٢٢

لەو کاتەدا سیاسەتی سۆڤیەتی وابو: کورد هێمن و ئارام بێ. لە هیچ کام لەو وڵاتانەی تیا بون گیروگرفت دروست نەکەن. ئەویش هەمان سیاسەتی بەریتانی هەبو. ئەی ویست تا شەڕ کۆتایی دێت، بۆ ئەوەی کۆریدۆری ئێرانی بۆ گوێزانەوەی پێویستییەکانی خۆی ئارام بێ. لە ئێران و تورکیا و عێراق هیچ پشێوییەک ڕو نەدات. بۆ ئەم سەفەرە کاربەدەستانی سۆڤیەتی هەر کوردە ناسراوەکانی موکریان، واتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بانگ کرد بو. لە کوردەکانی سنە و، کرماشان و، ئیلام... هیچ کەسێکیان بانگ نەکرد بو.

لەم سەفەرەدا کاربەدەستانی سۆڤیەتی سەرانی بانگکراوی کوردیان هان نەدا بو هیچ چالاکییەکی سیاسی یا ڕۆشنبیری. تەنانەت کە بەریتانییەکان پەژارەی خۆیان بەرامبەر بەم دیدەنییە دەربڕی، وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی مۆلۆتۆڤ، سەفیری بەریتانی سێر ریدەر بولاردی دڵنیا کرد لەوەی لەم دیدەنییەدا "هیچ جۆرە گفتوگۆیەکی سیاسی نەکراوە."(29)

گۆڤاری "نیشتمان" زمانی "کۆمەڵەی ژ. ک" بە گاڵتە پێ کردن و ڕەخنە لێ گرتنەوە باسی ئەم سەردانەی ئاغاکانی کورد بۆ باکۆ لە گۆشەی "دەمەتەقەیەکی دوکەسی"دا بەم شیعرانەی لای خوارو ئەگێڕێتەوە:

بایز: ئەرێ مام باپیرکتێبە پەڕیوت
باپیر: سندان، دەڵێی چی، دیسان بایزە ڕوت
بایز: پرسینم هەیە، جوابم دە زوبە
ئاغا تەشریفی، بۆ چوە....
باپیر: ڕەنیسێک ناردی، لە شوێنی و بردی
نامەی ڕزگاری بدا بە کوردی
بایز: زۆرباشیان بەخێرهێنا بو؟.
باپیر: ئەی چۆن،
دەی فەرمو بە پێی فێڵان قەیسی و ڕۆن
بایز: وای هەرنەگوتوە، پێم ئیفتەرایە
باپیر: بۆ لای تۆ ئاغا ئیبنو سینایە؟
وەڵا وای دەگوت لە خۆم بیستوە
بایز: کەوابێ ئاغا... بوە
باپیر: بەڵێ هەمو کەس پێی ماخۆلیایە
بایز: ئەفام چی وەختی جەفەنگە و کایە
پێم بڵێ چی کرد چلۆن هاتەوە
باپیر: بەتۆن و نیوێک خورافاتە
بایز: ئاخر شەرحی دە مەی ڕێسە ئەفام
نازانیی عەیبە ڕستن بێ مەرام
باپیر: ئاخر هی ئاغاش وەک هی من وایە
چوبو لای ئەوەی... شایە
گوتبوی: بە مەردی لێوت بیزێوی

ڕزگاریت بوێ دەبی بە خێوی
ئاغا فەرمو بوی: ئازادی چیە؟
فەرمایشتی من لەسەر قەندیە
ئەگەر دەم دەنێ قەند و زین باشە
وە ئیللا هێجگار کارم لە پاشە
بۆ موغالەتە زینی هێنا بو
لە سایەی وانیش تێر قەند و چا بو
بایز: دەک ئەژی باپیر، ئەمەش خەبەر بو
دەخوێنی سالی جارێک، ئەمیش...(30)

دیارە ئەم شیعرانە ماوەیەک لە دوای سەردانەکەی باکۆ نوسراون چونکە ئەوکاتەی ئاغاکانی کورد بانگ کرابون بۆ باکۆ هێشتا کۆمەڵەی ژ. ک دانەمەزرا بو.

### 5. 3. 2. ڕوداوەکانی بانە

جموجوڵی سەرانی کورد لە دو مەڵبەندی کوردستان دا گەیشتە ئەوپەڕی توندوتیژی و فراوانی: یەکێکیان لە مەڵبەندی بانە - سەقزدا و، ئەوی تریان لە مەڵبەندی ورمێ. بێ ئەوەی هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ یەک هەبێ. حەسەن ئەرفەع، سەرۆکی ئەوسای ستادی ئەرتەشی شاهنشاهی ئێران، سەبارەت بە ڕوداوەکانی بانە و، سەقز لە ژێر سەرناوی "یەکەمین شۆڕشی کوردەکانی ئێران لە ماوەی دوەمین جەنگی جیهانییدا" نوسیویەتی:

"پەلاماردانی ئێران لە لایەن هێزەکانی سۆڤێت و بەریتانیاوە و، داگیرکردنی نوستانەکانی ژورو و ڕۆژئاوای ئێران بو بە هۆی هەڵوەشانی ئەرتەشی ئێران لە ناوچە داگیرکراوەکاندا و، کزبونی کۆنترۆڵی حکومەتی ناوەندی لەوێ. بە هۆی فەرمانێکی ناڕاستەوە کە جەنەراڵ ئەحمەد ئەخچەوان وەزیری جەنگ دەری کرد بو سەربازانی وەزیفە بڵاوەیان لێ کرد، ئەگەرچی ئەم فەرمانە لە ماوەیەکی کورت دا ڕاست کرایەوە، بەڵام زۆر دژوار بو ئەوانە بهێنرێنەوە بۆ خزمەت، بە تایبەتی لە ناوچە خێڵەکییەکانی وەکو کوردستان. کوردەکانی ناوچە سنورییەکان، بە یارمەتی ئەوانەی لە عێراقەوە هات بون، دەوری پۆست و پادگانە پچوکە دابڕاوەکانی سنوریان دا و، چەکیان کردن. بەمجۆرە چەکێکی زۆریان کەوتە دەست.

هێزەکانی سۆڤێتی پادگانی بانەیان گرت. سەربازەکانیان بەردا بچنەوە ماڵی خۆیان و ئەفسەرەکانیان بە گیراوی ڕەوانەی سەرو کردن. هەروەها شاری سنەیان چەند سەعاتێ داگیر کرد بەڵام بە هۆی ڕێککەوتنی سۆڤێتی - ئینگلیزییەوە دەربارەی دابەش کردنی ناوچە داگیرکراوەکان، ئەوێ ناوچەی بەریتانیا بو. بۆیە ئەوان بەجێیان هێشت بەرەو سەقز کشانەوە. هێزێکی ئینگلیزی کە پێک هات بو لە تیپێکی مۆتۆڕیزەی هندی شارەکەیان داگیر کرد.

هەر کە ئۆردوی سور لە بانە ڕۆیشتن و ئەفسەرە ئێرانییەکانیان لە گەڵ خۆیان برد، حەمە ڕەشید، سەرکردەیەکی کوردی ئێلەکانی بانە کە لە گوندی وێنە لە دیوی عێراقیی سنوردا ئەژیا، بە چوار سەد سوارەوە پەلاماری ئێرانی دا پاش دو ڕۆژ شەڕ لە گەڵ تاقمێ سەربازی ئێرانی کە پادگانی بانەیان ئەپاراست، بانەی گرت. لە هەمان کات دا ئێلەکانی مەڵبەندی مەریوان کە لە لایەن کوردەکانی عێراقەوە لە لای پێنجوێنەوە یارمەتی درا بون، پەلاماری پۆستی سنوریی باشماخیان داو گرتیان. پادگانەکانی مەریوان و سنە پێشتر لە ئەنجامی هێرشی ڕوس و ئینگلیز دا هەڵوەشا بون کوردەکان چونە ناو مەریوانەوە. بەڵام ئەیان توانی بچنە

ناو سنەوە چونکە لە ژێردەستی هێزەکانی ئینگلیزدا بو. لەم کاتەدا، جەنەراڵی لێهاتو، مەحمود ئەمین، بە حاکمی عەسکەری سنە دانرا.

فەرماندەی گشتی هێزەکانی رۆژئاوا جەنەراڵ موقەدەم، هێزێک کە پێک هات بو لە 3 گوردانی پیادە (300 کەس) و 6 ئۆتۆمۆبیلی زرێپۆش بە فەرماندەیی براکەی من، کۆلۆنێل ئیبراهیم ئەرفەع، بۆ گرتنەوەی سەقز و بانە نارد. ئەم هێزە لە دوای گرتنی سەقز بەرەو بانە بەرێ کەوت. لە رێگا لە لایەن دوهەزار کەس لە هێزی ئێلەکان بە سەرکردایەتی حەمە رەشید خان گەمارۆ درا کە لە لایەن ئێلەکانی بانە و خورخورەوە یارمەتی درا بو. 5 ماشینی زرێپۆش بە هۆی سوتاندنی پردی تەختەی سەر رێگاکە لە دەس چو. هێزەکەش ناچار بو بگەڕێتەوە سەقز. کوردەکان بەشێکی هێزە پیادەکەیان بەدیل گرت. بەڵام براکەی من بە ژمارەیەکی کەمەوە پاش دو رۆژ بە پێ رۆشتن خۆیان گەیاندە میراندشاه. ئینجا لەوێوە گەڕانەوە دیواندەرە. لەوێش لە لایەن چوارهەزار کەسی هێزی حەمە رەشیدەوە گەمارۆ دران. وەکیلیەکان، ئەردەڵانەکان، رەسوڵ ئاغا و عەلی ئاغای جەوانمەردی گەورک و، سەرشیو و، سلێمان جاف بەشدار بون. ئەگەر چی براکەی من تەنیا 170 کەسی لە بەر دەستا بو، لە گەڵ ئەوەشا توانی کوردەکان بگێڕێتەوە دواوە، کە لەم پێکدادانەدا دو کەس لە سەرانی کورد کوژران و رەسوڵ ئاغا بریندار بو، ورەیان بەردا و کشانەوە سەقز. لە رێگا تیلەکۆییەکانی عەلی خانی حەبیبی، کە لە هۆبەتوەوە لە رێگای میراندشاوە بۆ یارمەتی دانی هێزەکانی حکومەت هاتبو، هەڵی کوتایە سەریان و تەفروتونای کردن.

پاش ئەم روداوە براکەی من چو بۆ کرماشان دانرا بە سەرکردەی لەشکری 12 و چو بۆ شەڕی ئێلە یاخییەکانی لور. جەنەراڵ ئەمین کرا بە فەرماندەی هێزەکانی کوردستان.

کوردەکانی ژێر فەرمانی محەمەد رەزا مەریوانی، مەحمود کانی سانانی، محەمەد رەشید ئەلەمانە، محەمەد عەلی مرادی گەڵباخی، عەلی ولەژیری، فەرەج کۆماسی، جەلال گەمباری، مەحمود لهۆنی، بەرەو سنە چون، جەنەراڵ ئەمین، کە تازە گەیشت بوە سنە بۆ گفتوگۆ و رێککەوتن چو بۆ لایان. کوردەکان گرتیان، بەڵام لە ماوەی 24 سەعات دا بەریان دا. ئەمەش لە سەر داوای ئەفسەرانی ئینگلیزی نیشتەجێی سنە بو. لە هەمان کاتدا کوردەکان داوایان کرد بو دان بەسەربەخۆیی کوردستان دا بنێن. پاش 10 رۆژ سەرکردایەتی ئینگلیز لە سنە وەڵامیان دانەوە، کە ئەو ناتوانێ کێشەکە چارەسەر بکا بەڵکو ئەبێ بخرێتە بەردەم سەرکردایەتی بەرز لە بەغداد. کۆبونەوەی هێزەکانی ئێران لە سنە بو بە هۆی رێ گرتن لە هێرشی کوردەکان بۆ سەر ئەو شارە. دوای ماوەیەک بڵاوەیان لێ کرد، هێزە خێڵەکییەکان نە تاقەتی چاوەڕوانیی و نە هیچ هۆیەکی لۆجستیکیی مانەوەیەکی درێژخایانیشیان هەبو.

لە مانگی نۆڤەمبەرا جەنەراڵ ئەمین هێزێکی ساز دا و بەرەو دیواندەرە جوڵا. دوای پێکدادانێ لە گوندی زاغە کوردەکانی حەمە رەشید شکان و گەیشتە دیواندەرە و کەوتە پێشکەوتن بەرەو سەقز. ئەم شارەش کەوتە دەست هێزەکانی حکومەت، بەڵام چەند دەستەیەک کورد کە پێشتر لە ناو ماڵەکان دا خۆیان حەشار دا بو، پەلاماری ئەرتەشیان دا هاوزەمان لەگەڵ ئەو هێزانەی لە دەری شارەوە هێرشی پێچەوانەیان دەس پێ کرد بو. جەنەراڵ ئەمین کوژرا و هێزەکەش بەشێکی بڵاوەی کرد و بەشێکی گیرا. 300 کەس لە ئێلی تیلەکۆی کورد بە سەرکردایەتی سەرۆکەکەیان، عەلی خانی حەبیبی، کە بۆ هاوکاری لە گەڵ هێزەکانی حکومەت هات بون، ئەوانیش تەفروتونا بون. حەبیبی، لە لایەن حەمەرەشیدەوە کوژرا.

لە دوای مەرگی جەنەراڵ ئەمین، کۆلۆنێل ئیبراهیم ئەرفەع لە جێگەی ئەو بو بە فەرماندەی لەشکری کوردستان. هێزەکانی رێک خستەوە و دوبارە لە سنەوە بەرەو سەقز جوڵا. محەمەد خانی حەبیبی، برای عەلی خان، و کوردەکانی تیلەکۆ، کە ئەیان ویست تۆڵەی کوژرانی سەرۆکەکەیان بسێننەوە، بەشداری ئەم هێزە

بون. هەروەها حەبیبوڵا خانی مەندمی. کوردەکانی مەریوانیش، کە هەوڵەکانیان بۆ گرتنی سنە بە هۆی ئینگلیزەکانەوە سەری نەگرت بو، ئیتر دەمیان لە سەربەخۆیی کوردستانەوە نەئەدا، تەنانەت نوێنەریان نارد بوە لای براکەی من پێشنیاریان کرد بو هاوکاری لە گەڵ بکەن دژی حەمە ڕەشید.

لەم کاتەدا منیش لە تارانەوە نێردرامە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ئەوێ، دوای گەیشتنم بە سنە لە گەڵ ئەو نوێنەرە چوین بۆ سەقز. لە ڕێگا دڵنیای کردم لە دڵسۆزی هۆزەکەی بۆ شا و بۆ ئێران، وای دەر ئەخست کە جموجوڵەکانیان بە هاندانی بێگانە بوە و، ئەوان ئامادەن یارمەتی ئێمە بدەن بۆ شکاندن و سزادانی حەمە ڕەشید، ئەگەر ئێمە چەک و تەقەمەنییان بدەینێ... من گەیشتمە میراندا لە کاتێکدا هێزەکانی حکومەت لە هێرش دا بون بۆ سەر ئاوایی سونتەتە، پاش 5 سەعات پێڕۆیی بە ناو بەفرێکی ئەستوردا. منیش لەم شەڕەدا بەشدار بوم. کوردەکانی حەمە ڕەشید بە سەختی شکان و خێڵەکییەکانی تیلەکۆ ڕژانە ناو ئاوایی و کەوتنە تاڵان کردنی دوژمنەکانیان هەر لە جل و سەرپۆشی ژنانەوە تا سەماوەر و قۆری.

لە مایسی 1942 دا کۆلۆنێل ئەرفەع بە 2 هەزار کەس و 14 تانکی سوک و شەڕکەرانی ئێلی تیلەکۆ چوە سەر سەقز، حەمە ڕەشیدی شکان و بەرەو بانە کەوتە پێشکەوتن. بە ڕێگاوە بو، لە سەرکردە تازەکەیەوە، جەنەراڵ شاهبوختی، فەرمانی پێ گەیشت، کە ئیتر بۆ پێشەوە نەچێ، بەڵکو خەریکی ڕێککەوتن بێ لە گەڵ حەمە ڕەشید. مێجەر فلیتچەر، ئەفسەرێکی سیاسی بەریتانی لە کرماشانەوە بۆ سەقز هات بۆ ئەوەی لەم گفتوگۆیەدا بەشدار بێ. حەمە ڕەشید بە ناوی تارانەوە دانرا بە فەرمانداری بانە و، ڕێگەی پێ درا چەکەکانی پێ بمێنێ، لە کاتێکدا ئەبو هێزەکانی ئەرتەش و پۆلیسی ئێران مەڵبەندەکانی بانە - سەردەشت بە جێ بهێڵن.

پاش ماوەیەک کۆلۆنێل ئەرفەع، کەلەم کاتەدا گەیشت بوە پلەی جەنەراڵ، بو بە فەرماندەی لەشکری 2 ی تاران و، جەنەراڵ هۆشمەند ئەفشار لە جێگەی ئەو بو بە فەرماندەی لەشکری کوردستان. هاوینی 1942 بانە دوبارە لە لایەن هێزەکانی حکومەتەوە گیرایەوە..."(31)

جەنەراڵ هۆشمەند ئەفشار وەکو ئەفسەرەکانی پێش خۆی ڕەفتاری کرد. لە ئازار دان و، گرتن و ڕاونان و کوشتن و، تاڵان و زەوت کردنی ماڵ و دارایی خەڵک و، بەرتیلخۆری درێخی نەئەکرد. هاووڵاتییەکی کورد چیرۆکی خۆی لە زیندانی هۆشمەند ئەفشاردا بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"... خەریکی کارو کاسبی بوم و سەفەرێکم بۆ سەردەشتێ کرد سەرتیپ هۆشمەند ئەفشاری خوێنخۆر کە هەمیشە عادەتی وی خوێنمژتنە خسوسەن دەگەڵ کوردان فەورەن ئەمری بە گرتنی من دا و هەمو مالولتیجارەی کە لە ئەسەری زەحمەت کێشانی چەند ساڵەدا کۆم کرد بوەوە لێیان ئەستاندم و حەبسیان کردم و حەواڵەی حەبسی تاریکی خەفەکونی لەشکری 4 ی کوردستانیان کردم. موددەتی 16 مانگان بە بێ قسور دەو حەبسخانەی دا کە زۆر مردنم پێ خۆشتر بو ڕایان گرتم و هەمو ڕۆژێ ئەزێتیان دەدام و بۆ ئەوەی کە ئەمرم ڕۆژی نانێکی ویشکیان دەدامێ هەرچەندە هاوارم دەکرد لە بەر چی ئەمنو گرتوە؟ کەس ئەبو جوابم داتەوە و ڕۆژبەڕۆژ زەحمەتیان زیاتر دەکردم ئەگەر بێتو هەمو ئەزیەتەکانی خۆم بنوسم شانامەیەک زیاتر دەبێ..."(32)

سەرتیپ ئەفشار بەو پەڕی دڵڕەقییەوە سەرکردایەتی هێزەکانی ئێرانی کرد بۆ دامەزراندنەوەی حکومەتی ناوەندی لە هەورامان، مەریوان، بانە. زیاتر لە 1500 تفەنگی لە خەڵکی ناوچەکە سەند. مەحمود خانی کانی سانان و حەسەن خانی ڕەزاو تەسلیمی عێراق بون. مەحمود خانی دزڵی لەو ماوەیەدا لە سەر سنور مرد. لە نۆڤەمبەری 1944 دا حەمە ڕەشید خان لە ژێر گوشاری هێزەکانی ئێران دا هیچی تر خۆی پێ نەگیرا هەڵاتە ناو ئەرزی عێراق و تەسلیمی کاربەدەستانی عێراق بو. حەمە ڕەشید خان دەسبەسەر لە کەرکوک دانرا. زۆر لەوێ نەمایەوە دیسان لە ڕێگای پێنجوێنەوە هەڵات و چوە مەهاباد.(33)

ڕۆژنامەی کوردستان هەواڵی لابردنی هۆشمەند ئەفشاری لە لاپەڕەی یەکەمی دا بە خۆشییەوە بڵاو کردۆتەوە:

"پاش برادەرکوژی کوردستان و ئاوارە کردنی دەهەزار ماڵ هەورامی و مەریوانی، پاش زەرەرداێنێکی زۆر لە دەوڵەت و لە کوردستان هۆشمەند ئەفشار دەستی ڕاستی ئەرفەع لە کار دەرکرا. دیارە دەرکردن کافی نیە و کوردستان چاوەنواڕی موحاکەمە و موجازاتی ئەو خائینەیە."(34)

## 5. 3. 3. ڕوداوەکانی ورمێ

سەرلەشکر ئەحمەد زەنگەنە، یەکێ لە ئەفسەرانی لەشکری 4 ی ڕەزائیە لە ژێر سەردێڕی "دەربارەی هەلومەرجی ڕەزائیە لە ساڵی 1321 دا" نوسیویێتی:

"دوای هەڵوەشانی لەشکر لە شەهریوەری 1320 دا لە ڕەزائیەش وەکو هەمو شوێنەکانی تری وڵات ئارام و ئاسایشی بیست ساڵە گۆڕا بە نائەمینی و شێوان. هەندێ لە سەرانی کوردی ئاژاوەخوازی دەوری ڕەزائیە وەکو: عومەر شەریفی شکاک لە ناوچەی سۆمای برادۆست لە مەڵبەندی سەروی ڕەزائیە. ڕەشید بەگی جیهانگیری لە ناوچەی تەرگەوەڕ، دەشت، مەرگەوەڕ لە مەڵبەندی ڕۆژئاوای ڕەزائیە. زێرۆ بەگی بەهادوری لە ناوچەی بالانوش و مەڵبەندی خواروی ڕەزائیە. تەها هەرکی لە مەڵبەندی دۆڵی خواروی بالانوش. کەوت بونە ژێر نفوز و هاندانی بێگانە و پروپاگەندەی ئەفسەرانی سۆڤیێتی. دەستیان کرد بە بەدڕەفتاری و شەرارەت و و ڕاووڕوت و، پەلاماردان و تالان کردنی ئاواییەکانی دەوری شاری ڕەزائیە و تا ئەهات سنوری جەردەییان فراوانتر ئەبو. لە بەر ئەوەی لە ناو ڕەزائیەدا هێزی ئەرتەشی لێ نەبو بۆیە بێ هیچ کۆسپ و ڕێگرێک هەرجێیەکی ویستیان تاڵان و هەر تاوانێکی ویستیان کردیان. درێژەکێشانی ڕاووڕوت و ڕێ لێ نەگرتنیان ئەشراری جەردەی ئازاتر کرد، بەجۆرێ سنوری ڕاووڕوتیان فراوان کرد تا گەیشتە شاری ڕەزائیە و شاریان گەمارۆ دا. لەبەر ئەوەی ڕەزائیە لەلایەن سۆڤیێتەوە داگیر کرا بو کوردەکان بەئازادی هەمو تاوانێکیان ئەکرد.

دانیشتوانی دێهات کە کەوت بونە بەر پەلامار و تاڵان پەنایان بۆ شار هێنا مزگەوت و کۆڵانەکان پڕ بون لە ژن و منداڵی دێهاتیی ئاوارە. ئەهالی شاری ڕەزائیە سەرەڕای ترسیان لە پەیدا کردنی دەسەڵاتی کورد، لە مەترسی کەمی ئازوقە و خواردەمەنی و بڵاوبونەوەی نەخۆشی ساری دا بون. کورد بە جۆرێ چاویان قایم بو بو شەوانە هێرشیان ئەکردە سەر پاسگای ژاندارمری دەروازەی شاپور. ژاندارمەکانی پاسەوانی پاسگاکەیان کوشت. لە ناوشاریش کەلانتەری 3 ی خیابانی داریوش لە لایەن کوردەوە پەلامار درا. لە بەر ئەوەی هێزی ئەرتەش لە ڕەزائیە نەبو بە هیچ جۆرێ نەئەتوانرا ڕێ لەم کارەسات و کوشتن و تاڵانە بگیرێ."(35)

کۆنسوڵی گشتی بەریتانیا لە تەورێز، بەجۆرێکی جیاواز لەمان. هۆی نائارامی لە ڕەزائیە شی کردۆتەوە، لەڕاپۆرتەکەی دا نوسیویێتی:

"لە گەڵ سەردانی سەرهەنگ هاشمی بۆ ڕەزائیە ڕوداوەکان دەستیان پێ کرد. فەرمانێکی دەرکرد بۆ کوردەکان لە ناو شاردا نابێ چەک هەڵ بگرن و داوای لە ژاندارمەکانی کرد بو فەرمانەکەی بە زۆر جێبەجێ بکەن. سەرهەنگ هاشمی ژاندارمەکانی لە ناو شیعەکانی دانیشتوی ئەوێ دا هەڵئەبژارد و چەکداری ئەکردن بۆ ئەوەی هێزێکی گەورە پێکەوە بنێ، ئەم پیاوە بێ دیسیپلینانە بە کوشتنی یەکەمین کوردێکی کە ویستیان چەکی بکەن دەستیان پێ کرد. زنجیرەیەک ڕوداو بە دوای یەک دا وایان لە کورد کرد بو کە وا بزانن ئەفسەرانی فارس هەوڵی گێڕانەوەی دەسەڵاتی زۆرداڕانە ئەدەن بۆ ناوچەکە. کوڕێکی شێخ تەها، لە ناو ڕەزائیەدا بەسواری عەرەبانەیەکەوە تفەنگێکی پێ بو، دایان بەزاند بو لێیان دابو. کوردێ مێزەری لە سەردا

بوە دابویانە بەر زللە. دو کوڕ و سێ نۆکەری حاجی ئاغا کە لە ناو شار یا لە نزیکیەوە تفەنگیان پێ ئەبێ لـە لایەن ژاندارمەوە پەلامار ئەدرێن و لە ناو ئەبرێن..."(36)

بە پێی ڕاپۆرتێکی تری کۆنسوڵ، لە مایسی 1942 دا لە ڕەزائیـە، کۆبونـەوەیـەک کـراوە، سـەرۆکی شارەبانی ورمێ، کۆنسوڵی گشتی سۆڤێتی لە تەورێز، چەند ئەفسەرێکی ئۆردوی سور و 12 کەس لەسـەرانی کورد، لەم کۆبونەوەیەدا بەشدار بون. سەرانی کورد وەکو مەرجی پێشەکی بۆ گەڕانەوەی ئاشـتی و ئاسـایش بۆ ناوچەکە داوایان کرد بو:

1. پۆستی ژاندارم لە ناوچە کوردنشینەکانی نێوان خوی و مەهاباددا نەمێنێ.
2. ڕێ بە کورد بدرێ چەک هەڵ بگرن.
3. ئەو 1200 تفەنگەی دەستی بە سەردا گیراوە بەسەر لادێیەکانی مەڵبەندی ڕەزائیەدا دابەش بکرێ.
4. لە هەمو دائیرەکانی حکومەت دا لە ڕەزائیە نوێنەرێکی کوردی تێ دا بێ.
5. کورد لە کاروباری نەتەوەیی خۆیان دا ئازادیان هەبێ.
6. حکومەتی فارس قوتابخانە بە زمانی کوردی لە کوردستان دا بکاتەوە.
7. ئەو ئەرزانەی داگیر کراون بدرێنەوە بە خاوەنە ئەسڵیە کوردەکانی.
8. ئەو 20 کوردەی گیراون بەر بدرێن."(37)

کاربەدەستانی ئێرانی گوێی خۆیان لە ئاستی ئەم خواستانەدا کەڕ کرد. جموجوڵـەکانی ئـەوێیان بـە جەردەیی و شەرارەت و، بە هاندان و فیتی بێگانە دائـەنا. حسـێن ئەفشـار، نوێنـەری ڕەزائیـە لـە مەجلیسـی شورای میللی دا، لە دانیشتنی ڕۆژی 13 ی بانەمەڕی 1321 دا، ڕوی قسەی کردە سەرۆوەزیران وتی:

".. بە پێی تەلگراف و ڕاپۆرتەکان 8 ڕۆژە ئەو ئەشرارەی لە کۆتایی جەنگی جیهانی ڕابـردودا بونـە هۆی تێکدان و کوشتن و تالانی مەڵبەندی خۆشی ورمـێ و، دوای ئـەو شـەڕە ئـەم شـوێنەیـان کـردە گـردی خۆڵەمێش ئەوەتا دەستیان داوەتە دەستی یەک و 8 ڕۆژە کەوتونەتـەوە کوشـتن و تـالان و ئـەتکی ناموسـی ئەهالی 300 پارچە دێهاتی ئەفشارنشینی ڕەزائیە...

تا ئێستا هەر ئەمنیە فیداکارەکانن کە بەو ژمارە زۆرکەمەوە لە بەرامبەر هێزێکی چەند جار لە خۆیـان زۆرتر بە ئازایەتییەکی شایانی ڕێزەوە بەرهەڵستی ئەکـەن ئێسـتاش کـە ئاغـای سـەرۆوەزیر تەشـریفیان لـە مەجلیسن ئەمەوێ بپرسم کە بۆ ڕەفعی ئـەم غائیلـەیـە و پاراسـتنی گیـانی ئـەهالی ڕەزائیـە و دەوروبـەری چ کارێکیان کردوە و ئەکەن؟"

عەلی سوهەیلی، سەر وەزیری ئەوسای ئێران لە وەڵامی نوێنەری ڕەزائیەدا، بێ ئاگایی خۆی پیشـان دا لە هۆی نا ئارامی ناوچەکە و هێرشی کوردەکان بـۆ سـەر شـاری ورمـێ، بـەڵام ڕایگـەیانـد کـەوا لـە ڕێگـای سیاسییەوە هەوڵی دۆزینەوەی چارە ئەدەن.(38) مەبەستی لە ڕێگای سیاسی گفتوگۆ بو لەگەڵ کاربەدەستانی ڕوسی بۆ وەرگرتنی موافەقەتی ناردنی ئەرتەش.

سەرۆوەزیر، سەرلەشکر ئەمانوڵا جیهانبانی وەزیری جەنگی نارد بـۆ ورمـێ بـۆ لێکۆڵینـەوەی لـە هـۆی نائارامی هەلومەرجی ئەوێ و، دانانی ڕێگاوشوێنی پێویست. وەزیری جەنگ دوای سـەردانی ورمـێ و دیتنـی کاربەدەستەکانی، کەوتە گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی سـۆڤیەتی بـۆ وەرگرتنـی موافەقـەتی نـاردنی هێزێکـی ئەرتەش بۆ ئەوێ، بۆ ئەوەی پارێزگاری ئاسایشی ناوچەکە بکات. دوای گەڕانەوەشی بۆ تاران درێژەیـان بـە گفتوگۆ دا تا کاربەدەستانی سۆڤێتی موافەقەتیان کرد.

ڕۆژی 26 ی بانەمەڕی 1321 هێزێکی لەشکری 1 ی مەرکەز بە فەرماندەیـی سـەرهەنگی تۆپخانـەی مهین چو بۆ ڕەزائیە...."(39)

هاتنەوەی ئەرتەش بۆ ناوچەکە و دامەزراندنەوەی پادگانەکانی هەرگیز نەیتوانی ئاسایش بگێڕێتەوە بۆ ناوچەکە. هۆکانی نائارامی ناوچەکە هەر مابون، لەبەر ئەوە نائارامییش درێژەی کێشا. پێکدادانی چەکدارەکانی ئێلە کوردەکانی هەرکی و شکاک لەگەڵ هێزەکانی ئەرتەش و ژاندارم بەردەوام بو تا لە سەرماوەرزی 1324 دا ورمێ بەیەکجاری کەوتە دەست هێزەکانی دیمۆکرات. واتە دوژمنانی رژێمی پەهلەوی. ئەوانەی سەرلەشکر زەنگەنە لە "خاترات" ەکەی دا بە "ئەشرار" ناوی برد بون، لە ئازادکردنی ورمێ و مەڵبەندەکانی دەوروپشتی دا، دەورێکی دیارو کاریگەریان گێڕا و، لە حکومەتی کوردستان دا هەمو پلەی سیاسی و پێشمەرگەیی بەرزیان پێ درا.

## 5. 4. بۆشایی سیاسی

ناوچەی بانە و سەقز مەڵبەندی نفوزی هێزەکانی بەریتانیا و، ناوچەی ورمێ مەڵبەندی نفوزی هێزەکانی سۆڤێت بو. هەر دولا نەیان ویست ئێران ئارام بێ. نە کورد و نە هیچ تاقمێکی تر ئاڵۆزی و پشێوی و نائارامی دروست نەکەن.

سۆڤیەتی‌یەکان لایان وابو: روداوەکانی بانە بە فیتی ئینگلیزەکان قەوماوە و، بەریتانی‌یەکانیش پێیان وابو: روداوەکانی ورمێ بە هاندانی روسەکان بوە. هەر دولا لە یەکتری دوڕدۆنگ بون و، بە چاوی گومانەوە سەیری ئەو کوردانەیان ئەکرد کە لەم روداوانەدا بەشدار ئەبون.

روداوەکانی ورمێ و دەوروبەری پێوەندی‌یان لە گەڵ روداوەکانی بانە و سەقز دا نەبو. بە واتەیەکی تر لەژێر سەرکردایەتی‌یەکی یەکگرتو و، بە هاوکاری و ئاگاداری یەکتری نەبو. هێشتا ئەوسا لە کوردستانی ئێران دا نە رێکخراوێکی سیاسی دامەزرا بو ئەم جوڵانەوە نارێکوپێک و لە یەک دابڕاوە خێڵەکی‌یانە رێک بخا و پێکەوە گرێیان بدا و رەنگی سیاسی - نەتەوەیی‌یان لێ بدا و، نە هێشتا سەرکردەیەکی ناسراوی دەسەڵاتداری وا لە ناو کوردا پێ گەیشت بو، نفوزی لە هەمو ناوچەکان و لە ناو هەمو گەورەپیاوەکانی کوردا هەبێ. هەوڵ دانی کوردەکانی دەوری ورمێ لە گەڵ سەید عەبدوڵای گەیلانی (شەمزینی)، کە ئەوسا بە ناوبانگترین گەورەپیاوی کورد بو، بۆ ئەوەی ببێتە سەرکردە و دەمڕاستییان سەری نەگرت.(40) کوردستان بۆشایی‌یەکی سیاسی تێ دا دروست بو بو، ئەبو بە رێکخراوێکی سیاسی پڕ بکرێتەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

1. عبدالرضا هوشنگ مهدوی، تاریخ روابط خارجی ایران از ابتدای دوران صفویه تا پایان جنگ دوم جهانی، انتشارت امیر کبیر، چاپ سوم، تهران، 1364، ص 390. لێرە بە دواوە ئەنوسین: مەهدەوی.
هەروەها: حسین مکی، تاریخ بیست سالەی ایران، نشر ناشر، تهران، 1362، ج 6، ص 144. لێرە بە دواوە ئەنوسین: مەکی.
2. توفیق السویدی، منکراتی: نصف قرن من تاریخ العراق و القضیه العربیه، دار الکاتب العربی، 1969، بیروت، ص 232.
3. عبدالرزاق الحسنی، تاریخ العراق السیاسی الحدیث، ط 6، مطبعه دارالکتب، بیروت، 1983، ص 347-395، مەکی، 6/ 350- 362.
4. مەکی، س ن، ل 367.
5. مەهدەوی، س ن، ل 391.
6. مەکی، س ن، ج 6، 324.
7. بۆ تێکستی پەیمانی سەعداباد بڕوانە: مەکی، س ن، ج 6، ص 347-350.
8. حاج مخبر السلطنه هدایت، خاطرات و خطرات، چ 4، زوار، تهران 1363، ص 412.
9. مەهدەوی، س ن، 397- 398.
هەروەها: لینچوفسکی، تاریخ خاورمیانه، ترجمه: دکتر هادی جزایری، انتشارات اقبال، تهران، ص 181- 182.
10. مەکی، س ن، ج 6، ل 440 - 446.
11. مەهدەوی، س ن، ل 399.
12. مەکی، س ن، ج 6، ل 443.
13. مەکی، س ن، ج 7، ل 113- 114.
14. مەکی، س ن، ج 7، ل 265.
15. مەکی، س ن، ج 7، ل 336.
16. مەکی، س ن، ج 7، ل 127.
17. مەکی، س ن، ج 7، ل 132.
18. گ ڕۆژی نوێ، ژ10، سلێمانی، 1/ 1961/1، ل 5.
19. مەکی، س ن، ج 7، ل 459.
20. مەکی، س ن، ج 7، ل 437.
21. دەربارەی چارەنوسی هێزەکانی ئەرتەشی ئێران دوای پەلاماری روسی - بەریتانی بڕوانە:
سرلشکر احمد زنگنه، خاطراتی از مأموریتهای من در آذربایجان (از شهریورماه 1320 تا دی ماه 1325)، انتشارات شرق، تهران، بلا، ص 61. لێرە بە دواوە ئەنوسین: زەنگەنە. هەروەها بڕوانە:
مەکی، س ن، ج 7، ل 436 - 486.
داود امینی، از سوم تا بیست و پنجم شهریور.
سپهبد کمال، گوشەای از خاطرات.
22. مەکی، س ن، ج 7، ل 314.

23. مەکی. س ن، ج 7، ل 188.
24. مەکی. س ن، ج 8، ل 246 -250.
25. ر کوردستان. ژ 3، 24/ 10/ 24 بەرامبەر 15/ 1/ 1946.
26. ر کوردستان. ژ 6، 1/ 11/ 24: 21/ 1/ 46.
27. قاسملو. ل 60 -62.
28. Eaglton,William,Jr. The Kurdish Republic of 1946, London,1963. p. 133.
لێرە بە دواوە ئەنوسین: ئیگلتن.
Hassan Arafa,The Kurds,London,1966,P. 70- 71.
لێرە بە دواوە ئەنوسین: ئەرفەع.
29. فریدە کوهی - کمالی دیهکوردی. کۆماری کوردستان: دامەزران و روخانی. نامەیەک بـۆ بەدەسـتهێنانی پلەی ماستەر بە ئینگلیزی دراوە بە زانستگای ئۆکسفۆرد. 1986. ل 23.
بۆ ئاگاداری زۆرتر لە سەر سەرچاوەکەی باکۆ بڕوانە:
مەحمود عیزەت. کۆماری میللی مەهاباد: لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی. 1984، ل 89-90.
هەروەها: ئیگلتن. س ن، ل 23.
30. گ نیشمان. ژ 3 و 4، سەرماوەز- ڕێبەندانی 1322، ل 12-13. ئەو شوێنانەی نوقتەی لـێ دانـراوە لە بنەڕەتدا خۆی وەها نوسراوە.
31. ئەرفەع. س ن، ل 67- 70.
32. ر کوردستان. ژ 18، 4/ 12/ 1324: 23/ 2/ 1946.
33. بەڵگەنامەی بریتانی: FO/391/67352
34. ر کوردستان. 27/ 4/ 1325.
35. زەنگەنە، ل 36.
هەروەها: علی دهقان. سرزمین زردشت. انتشارات ابن سینا، تهران. 1348. ل 669.
36. بەڵگەنامەی بریتانی: FO/ 371/31426/May 1942
37. بەڵگەنامەی بریتانی: FO/ 371/31414/May 1942
38. دهقان. س ن، ل 671.
39. زەنگەنە. س ن، ل 35- 37.
40. ر کوردستان. ژ 21، 11/ 12/ 1324.

# 2. ڕێکخراوە کوردییەکانی ئێران

## 1. پێشینەی مێژویی

نەریتی پێکهێنانی ڕێکخراوی سیاسی یا ڕۆشنبیریی کوردی لە کوردستانی ئێراندا تا درەنگانێ نەبوە.

لە پێش یەکەمین جەنگی جیهانیدا "کۆمەڵەی جیهاندانی" بە دەسپێشکەری عەبدوڕەزاق بەگی بەدرخان و بە هاوکاری سمکۆ و هەندێ لە گەورەپیاوەکانی تری کورد، لە خوی و ماکۆ دامەزراوە، بەڵام ئەم کۆمەڵە نەتەنییەوە بۆ شارەکانی تری کوردستان و زۆر زوش پوکایەوە. هیچ شوێنەوارێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، لە کوردستانی ئێراندا بە جێ نەهێشت.

دوای ئەویش لە دوا ساڵی جەنگ دا کە کۆمەڵەی "ئیستیخلاسی کوردستان" لە لایەن سەید تەهای شەمزینییەوە بە هاوکاری سمکۆ و هەندێ لە گەورەپیاوەکانی تری کورد لە ناوچەی ورمێ دامەزرا ئەویش زو شوێنەواری نەما.

چەسپینی دیکتاتۆرێتی ڕەزا شا لەئێراندا و، چەسپینی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی لە کوردستاندا ماوەی هەمو جۆرە چالاکییەکی بڕی. یاخیبونە خێڵەکییە چەکدارەکانی مەحمود خانی دزڵی و مەحمود خانی کانی سانان لە ناوچەی مەریوان و هی جافرسان لە هەورامان و، هی مەلا خەلیل لە سەردەشت. بە تێشکان کۆتاییان هات. زۆری سەرۆکی عەشیرەتەکان و پیاوە ناسراوەکانی کورد بەگیراوی لە کوردستان دورخرانەوە، لە تاران و شوێنە دورەکان یا خرانە زیندانەوە یا دەسبەسەر گل درانەوە. لە کوردستان دەسەڵاتێکی پۆلیسیی زۆردار و ترسێنەر جێگیر بو بو. ئەم دۆخە تا ڕوخانی ڕەزاشا درێژەی کێشا. لە گەڵ ڕوخانی ڕەزاشادا بو، گەلەکانی ئێران لەوانە کورد هەناسەیەکی ئازادیان هەڵکێشا.

کۆمەڵەی "خۆیبون" دوای دامەزرانی لە لوبنان (1927) و پەلهاویشتنی بۆ ناو کوردە هەڵاتوەکانی تورکیا لە سوریا و، دواییتر پەرەسەندنی بۆ ناو کوردستانی تورکیا بۆ دانانی ڕێوشوێنی شۆڕشی سەرتاسەری لەوێ، توانی پێوەندی لە گەڵ هەندێ لە کوردەکانی ئێران بە تایبەتی هەندێ لە پیاوە

ناسراوەکانی بنەماڵەی قازی‌یەکان دامەزرێنی. تەنانەت یەکێ لە ڕۆشنبیرانی ئەم بنەماڵەیە کە لە تورکیا بو بۆ هەمان مەبەست گەڕایەوە سابلاخ. ئەم پێوەندی‌یە لە سنورێکی تەسکی دیاری کراودا بو، چەند کەسێ زیاتری نەگرتەوە و نەبوە ڕێکخراو.

وەکو هەندێ سەرچاوە ئەگێڕنەوە لە سەرەتای چلەکاندا "حیزبی ئازادیخوای کوردستان" دامەزراوە. تەنیا چالاکی‌یەکی ئەم حیزبە توانیویەتی دەرکردنی بەیانێکی تایبەتی بوە دەربارەی "بەخێرهاتنی لەشکری سوری سۆڤیێتی بۆ ئێران". هیچ ئاگاداری‌یەکی تر یا هیچ بەڵگەیەکی زانراوی لە دوا بە جێ نەماوە.(1)

## 2. کۆمەڵەی ژ. ک

### 2. 1. چوارچێوەی گشتی

#### 2. 1. 1. زەمینەی دامەزرانی

د. قاسملو دەربارەی خۆشبونی زەمینەی دامەزرانی کۆمەڵەی ژ. ک نوسیویێتی:

"کە شەڕی دوەمی جیهانی دەستی پێ کرد، ڕەزاشا بەرەبەرە خۆی لە ئەڵمانی نازی نزیک کردەوە و وەزعێکی ئەوتۆ پێک هات کە ئێران بو بە مەیدانی هات و چۆ و نفوزی جاسوس و پیاوەکانی ئاڵمانی هیتلەر، پاش ئەوە کە ئاڵمان لە هاوینی ساڵی 1941 ی زایینی دا هێرشی کردە سەر یەکێتی سۆڤیێتی، بە کردەوە جەبهەیەکی گەورە لە دەوڵەتە گەورەکان لە یەکێتی سۆڤیێتی و ئەمریکا و ئینگلستان دژی ئاڵمان و ئیتالیا و ژاپۆن کە وڵاتانی میحوەر بون پێک هات، پاش وتوویژ ئەم 3 دەوڵەتە ئێرانیان بۆ ئەوە هەڵبژارد کە هەم نفوزی ئەڵمانی نازی لەم وڵاتە خاشەبڕ بکەن و هەم لە وێ ڕا بتوانن یارمەتی و بە تایبەتی چەک و تەقەمەنی بۆ یەکێتی سۆڤیێتی بنێرن. بۆ ئەوە بڕیاریان دا لە ڕۆژی 3 ی خەرمانانی 1320 (25 ی ئوتی 1941 دا) لەشکری سور لە شیمالەوە و لەشکری ئەمریکا و ئینگلیس لە جنوبەوە ئێران داگیر بکەن. ڕێژیمی دیکتاتۆری ڕەزاشا نەیتوانی چوکترین بەربەرەکانی بەرانبەر بە هاتنی لەشکری هاوپەیمانەکان بکا و تێک ڕوخا، کۆنتڕۆڵی جنوبی وڵات کەوتە دەست ئینگلیس و ئەمریکا و کۆنتڕۆڵی شیمال کەوتە دەست یەکێتی سۆڤیێتی، بە تێکچونی دیکتاتۆری ڕەزاشا هێندێک ئازادی دیمۆکراتی لە ئێران دا پەیدا بو و حیزب و ڕێخراوە سیاسیەکان بوژانەوە و پەرەیان گرت، پاش بیست ساڵ دیکتاتۆری ئێران ڕوی ئازادی بە خۆیەوە دی.

لە کاتێک دا کە بەشی جنوبی کوردستانی ئێران لە لایەن لەشکری ئەمریکا و ئینگلیسەوە داگیر کرا بو، لە بەشی شیمالی تا شاری ورمێ لەشکری سور جێگیر ببو.

ناوچەی مەهاباد لەو وەزعە دور بو، واتە نە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لەشکریان تێدا جێگیر کرد بو و نە لەشکری سور، بەم شێوەیە وەزعێکی تایبەتی لە ناوچەی مەهاباد خوڵقا بو، لە لایەکی دیکەوە مەهاباد و دەوروبەری ڕابردویەکی دورودرێژیان لە جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردا هەبو. ئەوەبو کە یەکەم ڕێکخراوی بە هێزی سیاسی کوردی بە ناوی کۆمەڵەی ژ. ک یان کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد لە ناوچەی مەهاباد پێک هات."(2)

#### 2. 1. 2. دامەزرێنەرەکانی

لە گێڕانەوەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەدا هەندێ لەیەکنەچون هەیە. زەبیحی کە سکرتێری کۆمەڵەکە بوە، هەروەها د. قاسملو کە پیاوێکی شارەزای ڕوداوەکانی کوردستانی ئێرانە بەم جۆرە ناویان ئەبەن:

حسێنی فروهەر، عەبدوڕەحمانی زەبیحی، عەبدوڕەحمانی ئیمامی، عەبدولقادر مودەڕیسی، ئەجمەدینی تەوحیدی، محەمەدی نانەوازادە، عەلی مەحمودی، محەمەدی ئەسحابی، عەبدوڕەحمانی کەیانی، سدیقی حەیدەری، قاسمی قادری.(3)

مەلا قادری مودەڕیسی، کە خۆی یەکێ لە دامەزرێنەرانی ژ. ک بوە، لە گفتوگۆیەکی تایبەتی دا دەڵێ:

"بناغەدانەرەکانی ئەوانە بون:

محەمەدی نانەوازادە، ڕەحمانی زەبیحی، حسێنی فروهەر، عەبدوڕەحمانی ئیمامی، قاسمی قادری، مەلا عەبدوڵا داودی، محەمەدی یاهو، عەبدولقادری مودەڕیسی، سدیقی حەیدەری، عەبدوڕەحمانی کەیانی، میرحاج".

بە قسەی مەلا قادر ماوەی دوساڵ حسێنی فروهەر (حسێنی زێڕینگەران) سەرۆکی کۆمەڵە بوە.(4)

ئیگلتن، ناوی هەندێ لەمانە نادا، بەڵام لە باتی ئەوان ناوی هەندێ کەسی تر ئەبا. ئەویش بەم جۆرەیان باس ئەکات:

ڕەحمانی حەلەوی، محەمەد ئەمین شەرەفی، محەمەد نانەوازادە، ڕەحمانی زەبیحی، حسێنی فروهەر (زەڕگەری)، عەبدوڕەحمانی ئیمامی، قاسمی قادری، مەلا عەبدولای داودی، قادری مودەڕیسی، ئەحمەدی عیلمی، عەزیزی زەندی، محەمەدی یاهو، میرحاج لە عێراق.(5)

ڕەنگە هەندێ لەمانە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە نەبن، بەڵام ئەبێ هەمویان لە گەشەپێدان و بەهێزکردنی دا بەشدار بوبن.

## 2. 1. 3. ئەندامەتی

به قسەی مەلا قادری مودەڕیسی:

"کەسێک کە دەبوە ئەندامانی ژێ. کاف هەوەڵی دەچوە حەمامێ وە لە ڕوانگەی ئاینیەوە خۆی خاوێن دەکردەوە، ئەوجار دەهاتە لای سێ کەس، وە لە لای وان حەوت جاری بە قورئان سوێند، بۆ وەبەرچاو گرتنی ئەو شەش مەبەستانە، دەخوارد:

1. خەیانەت بە نەتەوەی کورد نەکات.
2. کۆشش بۆ خودموختاری کوردان بکات.
3. هیچ ڕازیکی ڕێکخراوە، نە بە زمان، نە بە قەڵەم، نە بە ئیشارە، ئاشکرا نەکات.
4. هەتا ئاخری عومری هەر ئەندام بێت.
5. تەواوی پیاوانی کورد بە برای خۆی و تەواوی ژنانی کورد بە خوشکی خۆی بزانێ.
6. بە بێ ئیزنی کۆمەڵەی ژێ. کاف نەبێتە ئەندامی هیچ ڕێکخراو و دەستەیەکی تر.

وە غەیری ئەو سێ کەسەش کەسێکی دیکەی نەدەناسی."(6)

کۆمەڵە پێڕەوی ڕێکخستنی نهێنی شانەی پچوکی ئەکرد.

کۆمەڵەی ژ. ک وەکو ڕێکخراوێکی سیاسی بە نهێنی کەوتە چالاکی ڕێکخراوەیی و سیاسی. زۆری نەخایاند سەدان کەسی لە موکریان ڕێک خست و پەلوپۆی بە زۆر لای کوردستانی ئێران دا هاویشت.

## 2. 1. 4. ئامانجەکانی

کۆمەڵەی ژ. ک ڕێکخراوێکی نهێنی بو پرۆگرامێکی نوسراوی لەبەر دەس دا نیە ئامانجەکانی بە ڕونی دیاری بکا. بۆ خوێندنەوەی بیری کۆمەڵەی ژ. ک ئەبێ لە دو تویێ یاداشتەکانی دا بۆ حکومەتی ئێران و،

وتارەکانی ناو 9 ژمارەکەی گۆڤاری "نیشتمان" ی "بڵاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ. ک" و، لەوانەش ڕونتر لەو نامە تایبەتی‌یەی دا کە بۆ مەلا مستەفای بارزانی نوسیوە، بگەڕێین.

لە یەکەمین ژمارەی "نیشتمان" ی "بڵاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ. ک" دا لە ژێر سەردێڕی "ئامانجی ئێمە" دا نوسیویتی:

"ئەی برای کوردی خۆشەویست!

کۆمەڵەی ژ. ک بە پێچەوانەی هەمو بەرهەڵست و قۆرت و چەڵمەیەکی وەکو دوژمنایەتی خۆبەخۆ، دوبەرەکی و خۆخۆری، پولپەرستی و بێگانەدۆستی، کە لە ڕێگای پێشکەوتن و سەرکەوتنی کوردا هەیە بە هەمو هێز و توانای خۆی تێ ئەکۆشێت تا زنجیر و کەڵەمەی دیلی و ژێردەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد داماڵێ وە لەم کوردستانە لەت و کوتەی ئێستا کوردستانێکی گەورە و ڕێکوپێک بێنێتە بەرهەم کە هەمو کوردێک بە سەربەستی تیا بژێت.

زۆر کەس وا لێک ئەدەنەوە کە ئەبێ نەتەوەی کورد بە زۆر و نیروی چەک لە دیلی ڕزگار بکرێت بەڵام ئەوانە هەمو بە هەڵە چون و ڕێگای ڕاستیان لێ ون بوە چونکو چەک و تفاقی شەڕ کە لە چەنگ کوردایە لە بەرانبەر چەک و تفاقی شەڕی ئەمانەی بونە بەرهەڵستی سەربەستی ئێمە کار ناکات ئەبێ کورد بزانێت ئیمڕۆ تفەنگ لە چاو گوللەڕێژین و تۆپ و تانک و فڕۆکەو ... توقتوقەیەک زیاتر نیە تەنیا ڕێگایەکی ئەبێ کورد بەرەو سەربەستی پێیا بڕوا شەقامی شارستانێتی‌یە، ئەم ڕێگایە ڕاست و ڕەوان ئەچێتە ناو مێرگی ئازادی و سەربەستی.

کۆمەڵەی ژ. ک بڕیاری داوە بۆ ڕوناک کردنەوەی بیری نەتەوی کورد و دۆزینەوەی هۆی چارەڕەشی و دواکەوتنی ئەم میللەتە بەستەزمان و بێدەسەڵاتە لە هیچ فیداکاری‌یەکی ڕو وەرنەگێڕێت ئەوا لە سەر بڕیاری هەیئەتی ناوەندی ئەم گۆڤارە دەرئەچێت تا بەرەبەرە هەر چەوتی و ناڕەوایی‌یەکی لە ژیانی کوردا هەیە پیشانی بدا و ببێتە شارەزای نەتەوەی کورد لە ڕێگای سەربەستی و سەربەخۆیی‌دا."(7)

لە ژمارەی پێنجەمی دا نوسیویتی:

"بۆ وەڵامی هێندێک لە نەفام و تێ نەگەیشتوەکان بەندێکی مەرامنامەی کۆمەڵە دەنوسین:

کۆمەڵەی ژ. ک لە سەر چوار کۆڵەکەی ئیسلامەتی، کوردایەتی، مەدەنییەت، سولح و ئاشتیخوازی دانراوە و هەمو قانون و نیزامنامەکانی لە گەڵ شەریعەتی موقەدەسی ئیسلام تەتبیق ئەکرێ و ئینجا ئەخرێتە کار." (8)

لە ژمارەی شەشەمی دا نوسیویتی:

"چەند بەندێک لە مەرامنامەی کۆمەڵە

7. بۆنەی موتەدەین بونی بەشی زۆری نەتەوەی کورد بە دینی ئیسلام کۆمەڵە لە کوردستان تەنیا دینی موقەدەسی ئیسلام بە ڕەسمی دەناسێ و بۆ تەرویجی شەریعەتی خاوێنی ئیسلام و بەجێ گەیشتنی هەمو ڕێوشوێنێکی ئیسلامەتی تێ دەکۆشێ و لە گەڵ مونافیقان بەربەرەکانی‌یەکی بە شیدەت ئەکا.

8. مەسلەکی کۆمەڵە دیموکراتی‌یە و لەم پێناوەدا بۆ خۆشی ژیانی بەشەرییەت کۆششت ئەکرێت.

11. کۆمەڵە هەمو قەبیلە و عەشیرەتەکانی کورد بە چاوێک تەماشا دەکا و بۆ برایەتی هەموان کۆششت ئەکا. ڕەخنەگری و ئینتیقاداتی کۆمەڵە لە ئاکاری ئەوان تەنیا لە ڕوی دڵسۆزی کوردایەتی‌یەوەیە کە حەز بە لەناوچونی ئاکارە و ڕەفتاری ناشیرین لە ناو کوردەواری دا دەکا."(9)

بە پێی گێڕانەوەی گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" بەرنامەی کۆمەڵەی ژ. ک ئەبێ بەمجۆرە بوبێ:

"لە ساڵی 1944 دا کە شەڕی جیهانگیری بەرەو بڕانەوە ئەچو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی ژ. ک کۆبونەوەیەکی کرد بۆ ڕێوشوێن دانان بۆ دوارۆژی کورد، لەو کۆبونەوەیەدا سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی

راپۆرتێکی بە نرخی پێشکەش کرد، وە لە ئەنجامی لێدوان و لێکۆڵینەوەیەکی وردا کۆمیتەی ناوەندی ئەم بڕیارە مێژوویی‌یانەی دا:

1. هەر کە شەڕ کۆتایی هات دەوڵەتی کوردستان ئیعلان ئەکرێ.
2. خاکی ئەم دەوڵەتە لە ناوچەی ژووری عێراقەوە دەس پێ ئەکا بە بانەدا ئینجا سەقز و هەمو ناوچەکانی لای سنوری رۆژهەڵاتی عێراق تا شاخەکانی دالانپەڕ لە سەر سنوری تورکیا، وە خواروی ئەم سنورە وە لە رۆژئاوای ماکۆ وە بە کەناری رۆژئاوای گۆمی ورمێ دا بەرەو خوارو بۆ ناوچەی ئەفشار.
3. رژێمی ئەم دەوڵەتە کۆماری ئەبێ.
4. بۆ پارستنی دەوڵەت کۆمەڵەی ژ. ک لەشکرێکی بەرگری پێک دێنێت کە پێی ئەوترێ "میلیشیا".
5. پێویستە لە سەر کۆمەڵە کە بەشەکانی تری کوردستان رزگار بکا.

وە ئەو ناوچانەی کە لە سەر کۆمەڵە بو هەوڵی رزگارکردنی بدا، هەموی دیاری کرابو وە بڕیاریان لەسەر دابو."(10)

هەر بە پێی گێڕانەوەی گۆڤاری "رۆژی نوێ" ئەبێ کۆمەڵەی ژ. ک یادداشتێکی دابێ بە حکومەتی ئێران بەمجۆرەی خوارێ:

"... حکومەتی تاران، خەلیل فەهیمی "فەهیمولمولک" ی نارد کە وەزیری راوێژ بو، بۆ کوردستان، کاتێ کە ئەم وەزیرە گەیشتە مەهاباد "کۆمەڵەی ژ. ک" یادداشتێکی پێشکەش کرد کە ئەمە کورت کراوەی ئەو یادداشتەیە لە خوارەوە ئەینوسین:

1. لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە زمانی کوردی بە "رەسمی" دابنرێ بۆ هەمو ناوچەکانی کوردستان کە ژمارەی دانیشتوانی 3 ملیۆن پترە.
2. زمانی کوردی ببێت بە زمانی خوێندن و بەرێوەبەرێتی و دادگەری لە کوردستاندا.
3. فەرمانبەران لە هەمو کوردستاندا کورد بن.
4. ئەو باجەی "زەریبە" لە کوردستاندا کۆ ئەکرێتەوە ئەبێ بۆ کوردستانیش بە کار بهێنرێتەوە، بۆ دروستکردنی خەستەخانە و قوتابخانە و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، نەک بۆ رازاندنەوەی تاران.
5. ئەبێ ئەم داخوازی‌یانە لە پەرلەماندا باس بکرێن وە قانونێک دەربارەیان دابنرێت تا کورد دڵنیا بێ.
6. ئەمانە داخوازی ئێستامانن بەڵام کۆمەڵەکەمان ژ. ک بڕوای تەواوی هەیە بەوەی کە "هەقی دوارۆژ دانان - حق تقرير المصير" مافێکی ئاسایی و سروشتی‌یە بۆ هەمو نەتەوەیەک، لە بەر ئەوە پێویستە دوای کۆتایی شەڕی جیهانگیری دوەم لەم لایەنەوە گفتوگۆ بکرێ، وە هیچ گومانی تیا نیە کە کورد خۆی دوا رۆژی خۆی دائەنێ.
7. کۆمەڵە ئەم یاداشتە بڵاو ئەکاتەوە، وە نەتەوەی کورد کە "چارەنوسی خۆی - حق تقرير المصير" دانا حکومەتی ئێران ئەوسا بە دراوسێ‌یەکی باش و بێ وەزەن دا ئەنێ"(11)

## 2. 2. چالاکی رۆشنبیریی ژ. ک

چەرخی رابوردو تا پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم چەندین شاعیری گەورەی وەکو وەفایی، ئەدەب (1859- 1912)، حەریق (1851- 1907) لە کوردستانی ئێران بە تایبەتی لە موکریان هەڵ کەوتن، کە بە پیرەوی لە قوتابخانەی بابان شیعریان ئەهۆنییەوە و، لەو مەیدانەدا شانیان لەشانی شاعیرەکانی کوردستانی جنوبی ئەدا. هاتنی رەزاشا بۆ سەرکار، هەروەکو کارەساتێکی سیاسی و ئابوری بو بۆ

کوردستان. هەروەها کارەساتێکی گەورەش بـو بـۆ زمـان و ئـەدەب و ڕۆشـنبیریی کـوردی. لـە بیسـتەکان و سییەکانی سەدەی بیستەم دا کوردی توشی سەرکوت کردن بو.

لە کاتێکدا لە کوردستانی عێراق لە 1919ەوە بێ پسانەوە ڕۆژنامـە و گۆڤـار و بڵاوکـراوەی کـوردی بەردەوام بو: بانگی کورد، تێگەیشـتنی ڕاسـتی. پێشـکەوتن، بـانگی کوردسـتان، ڕۆژی کوردسـتان، نومێـدی ئیستیقلال، بانگی حەق، ژیانەوە، ژیان، زبان، ژین، دیاری کوردستان، زاری کرمانجی، ڕونـاکی، دیـاری لاوان، یادگاری لاوان، پەیژە، گەلاوێژ... بـە دوای یـەک دا لـە بەغـداد، سـلێمانی، ڕەوانـدوز، هـەولێر، دەرنـەچون و گەشەیان بە زمان، ئەدەب، ڕۆشنبیریی، مێژوی کورد ئەدا. لـە کوردسـتانی ئێـران بـە دوای ئـەو چەنـد ژمـارە کەمەی ڕۆژنامەی "کورد" ی سمکۆ ئیتر هـیچ ڕۆژنامـە، گۆڤـار، بڵاوکراوەیـەکی کـوردی دەرنـەچوە. تـرس و تۆقاندنی ڕەزاشا کارێکی کرد بو باسی ئەدەبی کـوردی لـە هـیچ بوارێـکدا نەیەتـە پێشـەوە. کاربەدەسـتانی ئێرانی ڕیوشوێنیان دائەنا بۆ تواندنەوەی کورد لە ناو بۆتەی نەتەوەی ئێران دا.

لە بیستەکان و سییەکاندا شاعیر یا نوسەری دیاری ئەوتۆ پەیـدا نـەبون جێگـەی پەنجـەیان بـە زمـان و ئەدەبی کوردییەوە دیار بێ. ئەبولحەسەنی سـەیفولقوزات (1255- 1323)، مـەلا مـەعروفی کۆکـەیی (1254- 1324)، عەلی بەگی حەیدەری "سالار سەعید" (1251- 1335) ئەمانە ئەگەر بەرهەمی ئەدەبیشـیان بـوبێ و، شیعری کوردییان هـۆنی بێتـەوە، ئـەوا لـە بـەر نـەبونی ئـازادی نوسـین و چاپەمـەنی کـوردی، بەرهەمـەکانیان بەدەسنوسی ماوەتەوە. خۆ ئەگەر بڵاویش بوبێتەوە لە سنورێکی زۆر تەسک و تەنگ تەترازاون.

هاتنی هێزی هاوپەیمانـەکان بـۆ نـاو ئێـران و، ڕوخـانی دەزگـای دیکتـاتۆری ڕەزاشـا، دەرفـەتی بـۆ دانیشتوانی ئێران ڕەخسـاند هەناسـەیەکی ئـازاد بـدەن. ئـازادی نوسـین و چـاپ و چالاکی ڕۆشـنبیریی و سیاسی تا ئەندازەیەک پەیدا بو. بەشێکی موکریان کە لە نێوان دەسەڵاتی ڕوسـی - ئینگلیـزی دا بـە بۆشـی مابوەوە و، بوە مەڵبەندی دامەزران و پەرە سەندنی کۆمەڵەی ژ. ک و، لەئەنجامی ئەوەش دا مەڵبەندی چـالاکی سیاسی و ڕۆشنبیریی و ئەدەبیی کورد.

دامەزراندنی ژ. ک دابراو نەبو لە ڕوداوەکانی دوەم جەنگی جیهانی. ئینگلیز و هاوپەیمانەکانی نـەیان ویست کورد کە گەورەترین نەتەوەی چەوساوەی "بێدەوڵەت" ی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بو لە سەردەمی شەڕدا ئارام و ژێر بێ، ئاژاوە نەنێتەوە و گێچەڵ دروست نەکا.

لـە کوردسـتانی عێـراق سـەرەڕای ئـەوەی هەمیشـە وەزیـری کـورد لـە وەزارەتدا هـەبون، لـە پارلـەمانی عێراقیشدا نائیبی کورد هەبون، بوارێکی ڕۆشنبیری دیاری کراویشی دا بو. لە مێژ بـو لـە سـلێمانی حەفتەنامـەی "ژین" ی پیرەمێردی شاعیری بەناوبانگی کورد دەرئەچو. مانگنامەی "گـەلاوێژ" لـە کۆتـایی 1939 واتـە لەگـەڵ هەڵگیرسانی جەنگ دا کەوتە دەرچونێکی ڕیکوپێک، دوای ئەویش "دەنگـی گێتـی تـازە" بـۆ بـڵاو کردنـەوەی هەواڵەکانی جەنگ و پروپاگاندە بو هاوپەیمانەکان لەلایەن سەفارەتی بریتانیی‌یەوە لە بەغدا کەوتە دەرچون.

لە سوریا و لوبنان هاوزەمان لە گەڵ کوردستانی عێراق ئەوەکانی بەدرخان کەوتنـە چالاکیـیەکی زۆر. هاوار، ڕوژا نو، ستێر. بە یارمەتی فەرەنسییەکان لە بەیروت و دیمەشق دەرچون.

لە کوردستانی ئێران ڕەزاشا زو ڕوخا. بەڵام ڕەزاشا فەرهەنگی کـوردی وەهـا ڕوخانـد بـو ماوەیـەکی ئەویست، لەوێش چالاکیی ڕۆشنبیری وەکو بەغدا، سلێمانی، شـام، بـەیروت دەس پـێ بکـا. لـە تـاران، سنە، کرماشان، ورمێ، هەمان دەرفەت بۆ ڕۆشنبیرانی کورد پەیدا بو. بەڵام ڕەزاشا پرزەی لێ بری بون بـە جـۆرێ کە هەندێ ڕۆشنبیری بەتوانا نەیان ئەوێرا کارێ بکەن.

لەو سەردەمەدا هەمو بڵاوکراوەکانی کوردستانی عێراق، هەروەها بڵاو کراوەکانی شام و بەیروتیش، بـە پۆستەو بە ڕێگەی کاروانچی ئەگەیشتە دەست خەڵک.

لە کوردستانی ئێران چەندین نوسەر و شاعیر پەیدا بو بون. نوسینەکانی خۆیان ڕەوانەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستانی عێراق ئەکرد. لەوانە سەید تاهیری هاشمی، سدیقی حیدەری، ئیبراهیم نادری، دلشادی ڕەسوڵی، هەژار، هێمن، نوسین و شیعرەکانیان بڵاو ئەکرانەوە کەسیشیان نە ئەکەوتنە بەر ئەشکەنجە و سزادان. ڕاستی ئەوە بو هێشتا لە کوردستانی ئێران زەمینەی چاپکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی ئامادە نەبو. نە کەسانێکی ئەوتۆ هات بونە پێشەوە ئەو ئەرکە بگرنە ئەستۆ، نە لە کوردستانیش چاپخانە هەبو.

## 2. 2. 1. گۆڤاری "نیشتمان"

لە مانگی بانەمەڕی 1322 (ئاوریلی 1943) نزیکەی 100 کەس لەئەندامانی کۆمەڵە لە باخی خوداپەرست کۆبونەوە. کۆبونەوەکە شێوەی کۆنگرەی بەخۆیەوە گرت. هەم سەرکردایەتی کۆمەڵەی هەڵبژاردەوە، هەم بڕیاری دا گۆڤارێک بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی خۆی بڵاو بکاتەوە. ئەوە بو لەو ماوەیەدا دەستی کرد بە چاپکردنی گۆڤاری "نیشتمان".(12) دەرکردنی گۆڤاری "نیشتمان"، ئەگەرچی بێ ئیجازەی دەوڵەت و بە نهێنی بو، هەلێکی لەباری هەڵخست بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردنی دەستەیەکی باش لە شاعیر و نوسەر. ئەمە یەکەمین تەجروبەی کوردەکانی ئێران بو. یەکەمین جار بو گۆڤارێکی تایبەتی خۆیان هەبێ شیعر و نوسینەکانی خۆیانی تێ دا بڵاو بکەنەوە.

بابەتەکانی "نیشتمان" لە لایەن نوسەر و شاعیرەکانەوە بەدەستی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا ئەنێردرا بو دەستەی نوسەران. دەستەی نوسەران پاش ئامادەکردنی ئەی نارد بۆ تەورێز لە چاپخانەی "خەلیفەگەری ئەرامینەی ئازەربایجان" لەشەقامی "شەهناز" بە نهێنی چاپ ئەکرا و دیسان ئەهێنرایەوە مەهاباد و لەوێوە بە هەمو کوردستان دا بڵاو ئەکرایەوە.

نیشتمان لە نوسین و شیعرەکانی دا هەستی نەتەوەیی کوردانی ئەبزواند. هانی ئەدان بۆ یەکێتی و یەکگرتن، بۆ خەبات بۆ دەرچون لە دیلی، بۆ هەوڵدانی گەیشتن بە ئازادی. عەبدوڕەحمانی زەبیحی "ع بێژەن" سکرتێری کۆمەڵە، لەگەڵ دلشادی ڕەسوڵی "م نادری". جوتە شاعیری نەتەوەیی: عەبدوڕەحمانی شەرەفکەندی "هەژار" و محەمەد ئەمینی شێخولئیسلامی "هێمن". زۆری بابەتەکانی نیشتمانیان ئەنوسی و ئامادە ئەکرد بۆ چاپ "نیشتمان" بە سەریەکەوە 9 ژمارەی لێ دەرچوە.

ژمارەی یەکەمی ساڵی یەکەمی لە پوشپەڕی 1322 بەرامبەر جولای 1943 دەرچوە.

لە سەرەوەی لاپەڕەکەدا نوسراوە: بژی سەرۆک و کورد و کوردستان و هیوا. لە سەرەوەی ناوی نیشتمان بە پیتی لاتینی لە ناو خۆرێکی خڕدا نوسراوە K .Ĵ.و بەدەوری خۆرەکەدا ئایەتی: (کم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بأذن الله). لە ژێری دا نوسراوە "بڵاوکراوەی بیری کۆمەڵەی ژ. ک" لەژێر ئەویش دا نوسراوە "گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، خوێندەواری و مانگی کوردیە"

بابەتەکانی ژ 1 بریتیە لە: ل 1 تا 2، ئامانجی ئێمە. 3 تا 4. تەماع. ل 4 تا 5. دەردی دەرون: دەمەتەقەێکی دوکەسی. ل 5 تا 6. ڕێک کەون تا سەرکەون. ع. بێژەن. ل 6 تا 7. مێجەر سۆن دەرحەق بە کورد چی ئەڵێ. ل 8. سەرکەوتن بە زۆر و کەمی نیە. ل 9 تا 10. (شیعر). م م هۆشەنگ. 11 تا 12. (شیعر). مەولەوی. 12 تا 13. (شیعر). زێوەر. ل 13 تا 14. شاعیری بەناوبانگ وەفایی. ع بێژەن. ل 14 تا 15. بەشی تیبی: جیگارە چۆن ئەکێشرێت. ل 16. بۆ گەنم کرد. ل 17 تا 19. کورد و عیسەبەتولئومەم. ل 19 تا 21 (شیعر). ل 21 تا 22. کوردستان ماڵی کوردە. ع سامان. ل 22 تا 23. پەلامارەکەی ئەوساڵی ئەڵەمان لە ڕوسیا. م فەروخ. ل 24. دەستیاوی بۆ چاپ

بژی سەروك و كورد و كوردستان و هیوا!




# نیشتمـــــــــان

گوواریكی كومەڵایەتی! ئەدەبی: خوێندەواری و مێشكی كوردیە

---

ژمارەی ـ١  سالی یەكەم  پوش پەری ١٣٢٢  جولای ١٩٤٣

---

## آمانجی ایمە

ئەی برای كوردی خوشەویست:

كومەڵەی ژ.ك بە پێچەوانەی هەموو پەر هەڵستێ و قورت و چەڵەمەییكی وەكو دوز منایەتی خوبەخو! دوبەرەكی و خوخوری: پول پەرستی و بیگانە دوستی كەلەریگای پێش كەوتن و سەركەوتنی كوردا هەیە بەهەموو هێزو توانای خوی تی ئەكوشێت

ژ 2 ی س 1 ی لە خەزەلوەری 1322 دا بڵاو کراوەتەوە.

لە سەر دروشمەکەی ژ. ک ئایەتی: (ومن یتوکل علی الله فهو حسبه) نوسراوە.

بابەتەکانی ژ 2 بریتیە لە: ل 1، بۆ خوێنەرە خۆشەویستەکانمان. ل 2 تا 3، لە ناو کۆمەڵەدا چەباسە؟ ل 4 تا 8، مایەی رزگار نەبونی ئێمە لە زنجیرو کەڵەمەی دوژمن چیە و کێ یە؟ بۆچی پێش ناکەوین. ل 8 تا 9، ئێمەو مەردم. بیژەن. ل 9 تا 10، دەردی دەرون: دەمەتەقەیێکی دوکەسی. ل 11، خۆت بناسە، م ش هێمن. ل 12، مەحکەمەی مەنحوسی ئیستیقلال. ل 13 تا 20، گەنجینەی ئەدەبیات (شیعر): مەحکەمەی ئیستیقلال، م ش هێمن. حور بزێ، فانی. نامە بە فەلەک، گیوی موکریانی. منالێکی بوێژ. کوردمو... م ش هێمن. ئیمرۆ مەوقیعی ئازادیە، م حەریق. ل 21 تا 22، زایەەیێکی گەورە (بۆکۆچی دوایی مەلا محەمەدی کۆیی). ل 22 تا 23، ئەی لاوی کورد، م ئاریا. ل 24، ئینقیلابی گەورەی ئۆکتۆبەر، م فەروخ. ل 24 تا 25، دەمی راپەرین (شیعر). لە ئیستگای رادیۆی کوردستان. لەم ژمارەیەدا وێنەیەکی شێخ عەبدولقادری شەمزینی و، وێنەیەکی مەلا محەمەدی کۆیی چاپ کراوە.

ژ 3 و 4 ی س 1 پێکەوە لە سەرماوەرز - رێبەندانی 1322 دا دەرچوە.

لە سەر دروشمەکەی ژ. ک ئایەتی: (نصر من الله وفتح قریب وبشر المؤمنین) نوسراوە.

بابەتەکانی ژ 3 و 4 بریتیە لە: ل 1 تا 4، بەهەشتی بەختیاری، م ئادری. ل 3، ئیستگەی رادیوی کوردستان. ل 5 تا 9، کوردی دەبێ چۆن بنوسرێ، برای راست. ل 9 تا 10، لە ناو کۆمەڵەدا. ل 11، شیعار بۆ هەمو کوردێک. ل 12 تا 13، دەمەتەقەیەکی دوکەسی. ل 13 تا 15، بەشی تیبی: ئالکول. ل 15 تا 24، گەنجینەی ئەدەبیات (شیعر): پایزی نیشتمان، قانع. دەڵێم بیڵێم و ناوێرم، فانی. کۆمەڵی هیوا و حەرفی ژ. ک، شاعیرێکی بەناوبانگ. مەرامی کۆمەڵەکەم دینگە، هەژار. ئاخافتنی خوشک و برایان، م ش هێمن. ل 24 تا 26، بۆچی نەگریم؟ع بیژەن. ل 26 تا 27، ئەستێرەیەکی تازە لە ئاسمانی چاپەکانی کوردی دا. ل 27 تا 28، وتارێکی فەلسەفی: هێزی بیر لە رەوانی میللەتان دا. م بەیان. ل 29 تا 30، ژنێکی بوێژی کورد، م لاو. ل 30 تا 33، تاران - ئەنکارا. ل 34، کوردستان. ل 35 تا 36، ئینقیلابی گەورەی ئۆکتۆبەر، م فەروخ.

ژ 5 ی لە رێبەندانی 1322 دا دەرچوە.

لە سەر دروشمەکەی ژ. ک ئایەتی: (وتعاونوا علی البر والتقوی) نوسراوە.

بابەتەکانی ژ 5 بریتیە لە: ل 1 تا 4، کورد لە حەیات ئینسیکلۆپیدیاسی دا، ع بیژەن. ل 5 تا 8، پیاوی چاک بەو مەی خوێنەوە، م نادری. ل 8 تا 9، دەردی دەرون: دەمەتەقەیەکی دوکەسی. ل 10، لە ناو کۆمەڵەدا. ل 11، قسەی دەستەق، م نادری. ل 12 تا 13، رۆژی کارە، م ش هێمن. ل 14 تا 15، فەلسەفەی ژیان، ع بیژەن. ل 16 تا 22، گەنجینەی ئەدەبیات(شیعر): قەڵای نیشتمان، م ش هێمن. ناڵەیی دڵ، مەلاحەسەنی قازی. چوار، قانع. بیکەن بە جمهوری، شاعیرێکی بە ناوبەنگ. جوجەڵەی نیشتمان، هەژار. ئەمن دەیڵێم و بێ باکم، م ش هێمن. ل 23 تا 24، بەغدا. ل 24، ئینقیلابی گەورەی ئۆکتۆبەر، م فەروخ.

ژ 6 ی س 1 ی لە رەشەمەی 1322 دا بڵاو کراوەتەوە.

لە سەر دروشمەکەی ژ.ک ئایەتی: (ان الله یأمر بالعدل والاحسان) نوسراوە.

بابەتەکانی ژ 6 بریتیە لە: ل 1 تا 4، بۆچی گەورەکانی قورەیش موسلمان نەدەبون، ع بیژەن. ل 5 تا 6، سکاڵایەک لە گەڵ نیشتمان، م ش هێمن. ل 7 تا 9، خۆشبەختی چیە؟ م ش أزەر. ل 9 تا 10، دەردی دەرون: دەمەتەقەیەکی دوکەسی. ل 11 تا 12، تکا لە کوردە ناودارەکانی ئێستا، پشتیوان. ل 13 تا 14، کوردستان (وەرگێڕان)، م نادری. ل 15، عەشایری کورد، ع راد. ل 16، لە ناو کۆمەڵەدا. ل 17، گەنجینەی

ئەدەبیات (شیعر): ئەگەر مردم، قانع. ناڵەیی دڵ. دڵی دایک، هەژار. کەمی ماوە، بوێژێکی ناودار. خەوی غەفڵەت بەسە، ع هونەر. ل 22، بەشی تیبی: تیفوس، م ئیرەج.

لەم ژمارەیەدا وێنەیەکی لینین چاپ کراوە. لە ژێری دا نوسراوە:

باقیە ناووت ئەتو، گەرچی دەمێکە مردووی

دا، لەنین! ماوی هەتا ڕۆژی قیامەت زیندووی.

ژ 7 و 8 و 9 ی س 1 ی پێکەوە لە بەرگێک دا لە خاکە لێوە، بانەمەڕ، جۆزەردانی 1323 دا بڵاو کراوەتەوە.

لەسەر دروشمەکەی ژ. ک دایەتی: (کل حزب بما لدیهم فرحون) نوسراوە.

بابەتەکانی ژ 7 و 8 و 9 بریتییە لە: ل 1 تا 2، کوردستان قوت نادرێت، ع بێژەن. ل 2، گۆڤاری نیشتمان، م نادری. ل 2، ڕاسپێری شەماڵ بۆ کورد (شیعر) داواڵ. ل 4، ونارێکی شێخ سەعید پێشەوای ئینقیلابی میللی کورد. ل 5 تا 6، مۆسکۆا - واشنگتون - لۆندۆن، ع مرو. ل 6 تا 7، شێخ یوسف شەمسەدین بورهانی، م ش هێمن. ل 7، قەومی کورد لایەقی ژیانە دارییا. ل 8، هاوار، م ش ازهر. ل 10، دوکچە کورد لە تورکیەدا لە داری سیاسەت دران. ل 12، ئاشتی، رژدی. ل 13، برون برون برون، م فەرروخ. ل 14، دەردی دەرون: دەمەتەقەیێکی دوکەسی. ل 15 تا 8، سەربەستی یامردن. م نادری. ل 18 تا 19، سەربەستی نادری دەستێنەدری، بێستون. ل20 تا 26، گەنجینەی ئەدەبیات (شیعر): خەوی غەفڵەت بەسە، ع هونەر. کوردە گیان و خەونم دێت، م ش هێمن. وەتەن، م م عشقی. دەمەتەقەی دوباز پێکەوە، ع هەژار. ل 27 تا 29، خۆشبەختی، م نادری. ل 29 تا 30، کورد چی دەوێ، هێمن. ل 31، مەلا عەلی ئەشنوی - شێخانی، گرشاسب. ل 32، بەشی پزیشکی: تیفوس. ئیرەج.

لەسەر بەرگی زۆری ژمارەکانی نیشتمان وێنەی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی چاپ کراوە. نیشتمان، بەم ژمارەیە ئیتر لە دەرچون وستاوە. بەڵام زەمینەی دەرچونی چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی تری خۆش کرد.

## 2. 2. 2. ڕۆژژمێری کوردی

کۆمەڵەی ژ. ک دوساڵ لەسەر یەک: 1322 و 1323 ی کۆچی ڕۆژی بەرامبەر 1943 و 1944 ی زاینی دو ڕۆژژمێری کوردی چاپ و بڵاو کردەوە.

لەسەرەتای ڕۆژژمێری ساڵی 1322 دا لەژێر سەرناوی "پەیامێکی کۆمەڵە بۆ دایکی نیشتمان" نوسیویێتی:

"ئەی دایکی نیشتمانی کورد دڵنیابە

ئەندامەکانی کۆمەڵەی ژ. ک ناڵەی دەرونی و سکاڵای تایبەتی تۆ بە هەمو ناوچەکانی کوردستان دا بڵاو ئەکەنەوە و لاوەکان بۆ خزمەتی تۆ هان ئەدەن.

بە هەمو کوردێکی نیشتمان پەروەر ڕائەگەیەنین کە دونیای ئیمڕۆ دونیای شارستانێتی و تەمەددونە.

ئەوەندەی لە توانایان دا بێت بە دروسکەی زانست و خوێندەواری سەرەڕۆی پێشکەوتنی کورد ڕوناک ئەکەنەوە. پەیامی تۆ کە ئەڵێی سەرکەوتن لە ڕێککەوتنایە بە گوێی هەمو دانیشتوکانی کوردستان ڕائەگەیەنن"

لە ڕۆژژمێری ساڵی 1323 یشدا لە ژێر سەرناوی "پەیامی کۆمەڵە بۆ دایکی نیشتمان" نوسیویێتی:

"ئەی دایکی نیشتمان!

ئێمە لە نەورۆزی ڕابوردودا وەعدەمان پێ دای کە بۆ ڕزگار کردنی تۆ لە هیچ تاڵی و ناخۆشی‌یەکی ژین نەپرینگێینەوە بە یارمەتی یەزدان و ناردراوی خۆشەویستی ئەم پەیمانەشمان بە جێ گەیاند بۆ گەیشتن بە ئامانجی پاکی خۆمان کۆششتێکی زۆرمان کرد ڕۆڵە ناخەلەف و پارەپەرستەکانت گەلێ قۆرت و تەگەرەی زلیان هێنایە پێش بەڵام یەزدان لانی حەقی بەرنەدا ئەم نەیروە نەگریسەمان بەرەو دوا کشاندەوە ئەوا دیسان هاتونە پێش نازانن کۆمەڵی ئێمە پەنجەی شێری ژیانی بێشەڵانی کوردستانە گاڵتەی پێ ناکرێت.

ئەی دایکی نیشتمان!

وا لە سەرەتای ئەم ساڵەش دا پەیمانت لەگەڵ ئەبەستین کە زۆر لە پار بە تین و تاوتر کۆششت بکەین تا بە یارمەتی یەزدان و ناردراوی گەورەی ئیسلام حەزرەتی محەمەد (صلی الله علیه وسلم) لە هەمو شوێنێکی نیشتمان ڕەگوڕیشەی نیفاق و دوبەرەکی دەربهێنین.

ئەی دایکی نیشتمان!

دڵنیابە کۆمەڵەی ژ. ک هەرچی دەبێ ببێ لە پێناو ڕزگاری تۆ بە هەمو هێزێکی یەزدان داوێتێ کۆششت ئەکا هەرکەسیش بەربەرەکانی بکا بێگومان بزانێ ڕیسوای شار و بازێڕی کوردستان ئەکرێ و تەپڵی بەدناوی بۆ دەکوترێت.

ئیتر پەنا بە یەزدانی بەرز".

ڕۆژژمێرەکە، هەمان ڕۆژژمێری "هیجری شەمسیی" بو کە ئێرانی‌یەکان بە کاریان ئەهێنا.

ناوی فارسی مانگەکان کرا بون بە کوردی.

هەمو سەری ساڵێکی تازە لە ڕۆژی 21 ی مارت بەرامبەر 1 ی خاکەلێوە. واتە لە ڕۆژی نەورۆزەوە دەستی پێ ئەکرد.

6 مانگی نیوەی یەکەمی ساڵ هەموی یەکی 31 ڕۆژ و 6 مانگی نیوەی دوەمی ساڵ یەکی 30 ڕۆژ بون.

ئەمە یەکەمین جار بو بەرێکوپێکی ناوی کوردیی مانگەکانی ساڵ بنوسرێ وەکو لای خوارو:

| | |
|---|---|
| مانگی 1 فەروەردین (حەمەل) | خاکەلێوەمارت - نیسان |
| مانگی 2 ئوردیبەهەشت (سەور) | بانەمەڕ نیسان - مایس |
| مانگی 3 خورداد (جەوزا) | سجۆزەردانمایس - حوزەیران |
| مانگی 4 تیر (سەرەتان) | پوشپەڕحوزیوران - تەموز |
| مانگی 5 مورداد (ئەسەد) | گەلاوێژ تەموز - ئاب |
| مانگی 6 شەهریوەر(سونبول) خەرمانان | ئاب - ئەیلول |
| مانگی 7 میهر (میزان) | ڕەزبەر ئەیلول - تشرین1 |
| مانگی 8 ئابان (عەقرەب) | خەزەلوەرتشرین1 - تشرین2 |
| مانگی 9 ئازەر (قەوس) | سەرماوەزتشرین2 - کانون1 |
| مانگی 10 دەی (جەدی) | بەفرانبار کانون 1 - کانون2 |
| مانگی 11 بەهمەن (دەلو) | ڕێبەندانکانون2 - شوبات |
| مانگی 12 ئەسفەند (حوت) | ڕەشەمە شوبات - مارت |

ئەم ڕۆژژمێرانەی بە شیعری نەتەوەیی و دینیی ڕازاند بوەوە. هەندێ لە بیرەوەرییە گرنگەکانی تێ دا نوسی بو وەکو:

25 ی گەلاوێژ جێژنی سەرساڵی کۆمەڵەی ژ. ک.
30 ی پوشپەڕ سەرساڵی گۆڤاری نیشتمان.
16 ی ڕەشەمە ڕۆژی بنیادی چاپخانەی ژ. ک.
کۆمەڵە بەهۆی ئەم ڕۆژژمێرانەوە ئەچوە زۆر ماڵی کوردەوە.

### 2. 2. 3. دیاری کۆمەڵەی ژ. ک

کۆمەڵە لە ساڵی 1322 (1943) دا چەند کۆمەڵە شیعرێکی لە نامیلکەی سەربەخۆدا لە ژێر ناوی: "دیاری کۆمەڵەی ژ. ک بۆ لاوەکانی کورد" و"دیاری مەلا محەمەدی کۆیی" و"گوڵبژێرێک لە دیوانی حاجی قادری کۆیی بلبلی نیشتمان" و"دەستە گوڵێکی جوان و بۆنخۆش لە باغی نیشتمان پەروەری" بڵاو کردەوە.

لە سەرەوەی بەرگی دیاری نوسراوە: "بژی سەرۆک و کورد و کوردستان و هیوا" و لە دەوری دروشمەکەی ژ. ک "لا اله الا الله محمد رسول الله" ئینجا "بە پارەی کۆمەڵەی ژ. ک بۆ هەڵساندنی ئاغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد لە خەوی نەفامی چاپ کرا"

لە سەر بەرگی گوڵبژێرێک نوسراوە: "بە پارەی کۆمەڵەی ژ. ک بۆ وشیاری ئاغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد لە چاپ درا"

لە سەر بەرگی دەستە گوڵێک نوسراوە: "بە پارەی کۆمەڵەی ژ. ک بۆ بەهێز کردنی هەستی نیشتمان پەرستی لە ناو ئاغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد لە چاپ درا"

### 2. 3. حیزبی هیوا و کۆمەڵەی ژ. ک

ساڵی 1942 حیزبی هیوا کە ئەوسا بە هێزترین ڕێکخراوی سیاسی بو لە کوردستانی عێراق دا دو کەس لە ئەندامە شارەزاکانی خۆی، میرحاج ئەحمەد و مستەفا خۆشناو، کە هەردوکیان ئەفسەر بون بۆ دروستکردنی پێوەندی هاوکاری و هاوخەباتی لە گەڵ کوردەکانی ئێران ناردە کوردستانی ئێران. دوای پێوەندی کردن لە گەڵ چەندین کەس لە ڕۆژی 25 ی شەهریوەر (خەرمانان) ی 1321 (16 ی ئەیلولی 1942) دەستەیەک لاوی سابلاخی لە باخی حاجی داود لە نزیک چۆمی سابلاخ بە ئامادە بونی نوێنەرانی حیزبی هیوا: میرحاج ئەحمەد و مستەفاخۆشناو، کۆبونەوە بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی سیاسی بە ناوی کۆمەڵەی ژ. ک.(13)

پێوەندی نێوان ژ. ک و هیوا بە پتەوی مایەوە، تەنانەت کۆمەڵەی ژ. ک دو ڕۆژژمێری ساڵانەی بڵاو کردەوە، هەردوکی بە ناوی خۆی و هیواوە چاپ کرد بو. لە سەر دێڕی "ڕۆژنەژمێری تایبەتی کۆمەڵەی ژ. ک بۆ ساڵی 1322" دا نوسراوە "بژی سەرۆک و کورد و کوردستان و هیوا" و لە هی ساڵی 1322 نوسراوە "ڕۆژنەژمێری تایبەتی کۆمەڵەی ژ. ک بۆ وەرزی 1323 ڕۆژیی 64 - 1363 ی هیجریی و 45 - 1944 ی میلادی. ئەم ساڵی تازەیە لە هەمو ئەندامەکانی ژ. ک و هیوا و هەمو کوردێکی کە لە پێناوی سەربەستی نەتەوەی کورد تێ ئەکۆشێ پیرۆز بێت".

نوێنەرانی هەردو ڕێکخراو دیدەنی یەکتریان ئەکرد و ئاڵوگۆڕی بیرو رایان ئەکرد. لە ئازاری 1944 دا محەمەد ئەمین شەرەفی بە نوێنەرایەتی ژ. ک بۆ دانانی ڕێوشوێنی هاوکاری سەردانی کوردستانی عێراقی کرد. لەوکاتەدا حیزبی هیوا لە تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵی ڕێکخراوەیی و سیاسی دا بو. یونس عەبدولقادر لە جێگەی ڕەفیق حلیمی کاروباری حیزبی هیوای گرت بوە دەست. کۆمەڵەی ژ. ک لقی خۆی لە عێراق دامەزراند

بو. لەم سەردانەدا ژمارەیەک لە بەرپرسەکانی هیوای بینی لەوانە: عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، سەید عەزیزی شەمزینی، ئەمین ڕاوەندوزی و شێخ قادر. هەر لە هەمان ساڵ دا لقی عێراقی ژ. ک ئیسماعیل شاوەیس و عوسمان دانشی بە نوێنەرایەتی خۆی ناردە مەهاباد. دواییتریش چەند کەسی تر وەکو حەمزە عەبدوڵا و محەمەد تۆفیق ووردی خۆیان چونە مەهاباد.

بە ئیمزای "شاعیرێکی بە ناوبانگ" لە یەکێ لە ژمارەکانی نیشتمان دا. شیعرێکی درێژ، بە ناونیشانی "کۆمەڵەی هیوا و حەرفی ژ. ک" بڵاو کراوەتەوە. ئەڵێ:

ئەی خودایا بۆم بنێری قاسیدێکی سینە ساف
بچتە خزمەتی کۆمەڵی هیوا و حەرفی ژێ و کاف
گیر ئەبێ بڕوا لە قەولی من بچێ پێیان بڵێ
ئەی مودیری ئیتیحاد و ئەی مەداری ئیئتیلاف
هیمەتو ئەوڕۆکە بێ، ئەوڕۆ کە ڕۆژی غیرەتە
دەس بدەینە دەستی یەک ڕو بکەینە مەیدانی مەساف
ڕەفعی زوڵم و حیفزی ناموس و حقوقی میللەتێ
چاکترە سەد مەرتەبە لە زیارەتی بەیت و تەواف
یا بە ئازادی و بە شادی دەچنە نێو حەلقەی میلەل
یا لە سەر کورسی سەرومل دەچتە نێو حەلقەی تەناف"(14(

## 2. 4. قازی محەمەد دێتە کۆمەڵەوە

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە پەرەیان سەند ژمارەیەکی زۆر ئاغا، مەلا، شێخ، دوکاندار، بازرگان و سەرۆکی عەشیرەتەکان چونەڕیزی کۆمەڵەوە لەوانە ئاغا و گەورەکانی دێبوکری، مامەش، زەرزا، مەنگوڕ، هەرکی، شکاک، جەلالی، ساداتی نەهری. تەنانەت پەلوپۆی هاویشت بۆ پارچەکانی تری کوردستان و لە گەڵ زۆر لە پیاوە ناسراوەکانی کوردستانی عێراق و تورکیا و سوریا پێوەندی دامەزراند. لە کوردستانی عێرق، دوای هەڵوەشانی حیزبی هیوا، لقێکی دامەزراند ڕۆشنبیری ناسراوی کورد ئیبراهیم ئەحمەد، خاوەنی گۆڤاری گەلاوێژ، بەرپرسی بو. کەسانی وەکو فایەق بێکەس، ئیسماعیل حەقی شاوەیس، سدیق شاوەیس، محەمەد عەلی مەدهۆش، عەتا تاڵەبانی، سالح ڕوشدی، ئەندامی بون.

بنەماڵەی قازییەکان لە سابڵاخی ئەو سەردەمەدا خاوەنی پایەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسی و ئابوری بون. خاوەنی زەویوزارێکی فراوان بون و پێوەندی بەهێزیان لە گەڵ ئێلەکانی موکریان و سەرۆک و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانیان هەبوە. دەسەڵاتی قەزاوەت بە ڕەسمی، پشت لە دوای پشت، لە دەست یەکێ لە مەلا ناسراوەکانی بنەماڵەی ئەوان دا بوە. چەندین مەلا و خوێندەواری ناسراویان تێ دا هەڵکەوتوە، کە قوتابی و شاگرد لە بەردەستیان دا خوێندویانە و پێ گەیشتون.

لە بزوتنەوەی مەشروتەدا بەشدار بون. هاودەنگ و هاوکار لە گەڵ ئازادیخوازانی ئێران دا بۆ گۆڕینی شاهێتی موتڵەق بە شاهێتی مەشروتە (دەستوری). لە گەڵ شێخ محەمەدی خیابانی، سەرکردەی ئازادیخوازی ئازەربایجان، هاودەنگ و هاودەرد بون. قازی عەلی لە گەڵ سمکۆ لە کاتی ئازادکردنی مەهاباد دا هاوکاربو. ڕێکخراوی خۆیبون پێوەندی لە گەڵ دروست کرد بون و، ئەمانیش پشتیوانییان لە شۆڕشگێڕانی ئارارات کرد.

بنەماڵەی قازییەکان بە خۆشییەوە هاتنی هێزدوی سوری سۆڤێتی و ڕوخانی دەسەڵاتی ڕەزاشایان وەرگرتوە. سەیفولقوزات بەو بۆنەیەوە شیعری هۆنیوەتەوە.

قازی محەمەد (1901 - 1947) کوڕی قازی عەلی کوڕی قازی ئەبولقاسمە. لە مەهاباد لە دایک بوە. هەر لەوێ خوێندنی دینیی تەواو کردوە و، ئیجازەی عیلمیی وەرگرتوە. مامۆستای تایبەتی هەبوە بۆ فێربونی زمانە ئەوروپاییەکان. جگە لە فارسی و عەرەبی و تورکی هەندێ ڕوسی و فەرەنسی زانیوە.
ماوەیەک سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە و فێرکردنی مەهاباد بو. دوایی بو بە "قازی" مەهاباد.(15)

لە سەرماوەزی1320 دا ڕوسەکان 30 کەسیان لە گەورەپیاوەکانی کورد بانگ کرد بۆ باکو. یەکێکیان قازی محەمەد بو. قازی لە حکومەتی ئێران قاچاخ و ڕاکردو نەبو. بەڵکو فەرمانبەری حکومەت و، لە لای کاربەدەستانی تاران بەڕێز و قسە لێ وەرگیراو بو. لە کاتی پشێوییەکانی ورمێ دا ئێرانییەکان هەوڵیان دا بە هۆی قازییەوە هەلومەرجی گرژی ئەوێ ئاسایی بکەنەوە.
هەر لە ئەنجامی ئەو ڕێزە تایبەتییەدا کە بنەماڵەی قازییەکان لە موکریان هەیان بو، ئەبولقاسم سەدری قازی برای قازی محەمەد بۆ خولی 14 هەمی مەجلیسی شورای میللی هەڵبژێردرا.
کۆمەڵەی ژ. ک تا ئەهات پەرەی ئەسەند و لە ناو خەڵک دا خۆشەویست ئەبو. هەستی کوردایەتی بوژانەوە. ڕوناوەکان ڕویان لەوە بو کورد هەلی بۆ بێتە پێشەوە هەندێ دەسکەوتی نەتەوەیی بە دەس بهێنێ. لەو هەلومەرجەدا کۆمەڵە پێویستی بە سەرکردەیەکی ناسراو بو ڕابەرایەتی جوڵانەوەکە بکات. کۆمەڵە لە سەرەتای دامەزراندنی دا بڕیاری دا بو سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد نەداتە دەس هیچ ئاغا یا شێخ یا دەرەبەگێ.(16) بەڵام پێ ئەچێ تەوژمی گوشاری ڕوناوەکان لە ویست و ئارەزوی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بەهێزتر بوبێ. کاتێ مەسەلەی وەرگرتنی قازی محەمەد بە ئەندامی کۆمەڵە هاتە پێشێ، سەرکردایەتی کۆمەڵە دو بۆچونی جیاوازیان هەبو: هەندێکیان پێیان وا بو کە نەبێ قازی وەربگیرێ، چونکە ئەبێتە هۆی بەهێز بونی کۆمەڵە. بە پێچەوانەی ئەمە هەندێکی تریان لایان وا بو، قازی پیاوێکی بە توانای دەسەڵاتداری ناسراوە، زو دەسەڵات لە ناو کۆمەڵەدا ئەگرێتە دەست و ئەوەش ئەبێتە هۆی گەڕانەوەی سەرلەنوێی دەسەڵاتی دەرەبەگیی بۆ سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد. سەرەنجام قازی محەمەد لە ماڵی ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی، بە ئامادە بونی چەند ئەندامێکی تر سوێندی ئەندامەتی خوارد و بە ناوی نهێنی "بینایی" بو بە ئەندام. ئەندامەتی قازی محەمەد لە کۆمەڵەدا کۆمەڵەی بەهێزتر کرد. بەڵام زۆری نەخایان بە کردەوە قازی بو بە سەرکردەی کۆمەڵە و خاوەنی بڕیار.

## 2 .5. ژ. ک و سۆڤێت

کاربەدەستانی سۆڤێتی دوابەدوای هاتنی لەشکری سور بۆ ناو ئێران، لە سەرماوەزی 1320 دا 30 کەسیان لە سەرانی ئێل و پیاوە ناسراوەکانی موکریان بانگ کرد بۆ باکۆ.(17) لەم سەردانەدا کاربەدەستانی ڕوسی شتێکی ئەوتۆیان دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد لە گەڵ میوانە کوردەکانیان باس نەکرد. نە هانیان دان بۆ دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتییەکی کوردی و، نە هانیان دان بۆ دامەزراندنی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی، تەنانەت هانیشیان نەدان بۆ دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی کوردی. بەڵکو مەبەستیان دامەزراندنی پێوەندی دۆستایەتی و ئاشنایی بو لە گەڵ پیاوە دەسڕۆیشتوەکانی کورد. ئەو کاتە یەکێتی سۆڤێتیش وەکو بەریتانیا سیاسەتی وابو لە سەردەمی شەڕدا ناوچەکە بە ئارامی بمێنێتەوە و، کورد هیچ پشێوی و ناخۆشییەک بۆ ئێران و عێراق و تورکیا دروست ناکا.
لە هەلومەرجی دواکەوتوی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی و فەرهەنگی کۆمەڵی کوردەواری ئەو سەردەمەدا کە هێشتا سەرانی عەشیرەت و، ئاغا و مەلا و شێخ نفوزی گەورەیان هەبو، هێشتا زەمینەی

پێکهێنانی ڕێکخراوی کۆمۆنیستی یا سۆسیالیستی نامادە نەبو. ژ. ک ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی یا تەنانەت مارکسییش نەبو. بەڵکو وەکو خۆی نوسی بوی لە سەر 4 کۆڵەکەی: ئیسلامەتی. کوردایەتی. مەدەنییەت. سولح و ئاشتیخوازی دامەزرا بو. کاتێ هەندێ لە ناحەز و دوژمنەکانی تاوانی کۆمۆنیستی‌یان بەپاڵ دان. دەسبەجێ سکرتێری کۆمەڵە ع بیژەن بە جواب هات. بیژەن لە ژێر سەردێری "ئێمە و مەردم" دا نوسیوێتی:

"تۆز و غوباری تەبلیغات و پروپاغاندای ژەهراوی فاشیستەکان ڕوی مینای بێ گەردی کوردستانیشی وەکو زۆر وڵاتانی گێتی وەها تاریک داهێنابو ئێستاش پاشماوەی دوایی نەهاتوە.

لە کاتێک دا کە موبەلیغەکانی نازی لە عێراق و ئێرانا خەریکی لێڵاو و شلوێ کردنی ناوی هێمنی سیاسەتی ئەم وڵاتانە بون گەورەترین پروپاغانددیان خراپ پیشاندانی کۆمۆنیزم و کۆمۆنیست بو بە ناوی شیوعی ئەیان دا بە گوێی مەردما. وایان برد بوە مێشکی خەڵکەوە کە شیوعی‌یەکان زۆر دوڕندە و وەحشین و پیاوکوشتن لە لایان زۆر ڕەواجی هەیە ئەم مەوزوعە وەها چو بوە مێشکی دانیشتوانی ئەم وڵاتانە کە بە بیستنی ناوی شیوعی (بولشەویک) تورە دەبون و نێوچاوانیان تێک ئەدا. دوای هاتنی ئۆردوی سور (جیش الاحمر) بۆ کوردستان ڕەفتار و ئاکاری وا باشیان پیشان دا کە ئەم هەمو ڕەنجی موبەلیغەکانی هیتلەر بەبا چو بەڵام هێشتا هێندێک مێشکی وا هەن دەسخەرۆی ئانتریکات و درۆو دەلەسەی فاشیستەکانن.

چەند کەسێک لەم بێ مێشکانە کە کتێبی دیاری و ژمارەی یەکەمی نیشتمانیان خوێند بوەوە لە لایەنگری و تەمایولی ئێمەیان بەلای حکومەتی سۆڤێتی دا دێ بو گوت بویان ئارمانی کۆمەڵەی ژ. ک بڵاو کردنەوەی مەسلەک و باوەڕی کۆمۆنیزمە. ئەم قسەیە بێ شک لە سەرچاوەی تەبلیغاتی فاشیستەکان ناو ئەخواتەوە دەنا ئێمە کۆمۆنیست نین ئەگەر کۆمۆنیستیش بین جێگای هیچ ئیعتیرازێک بۆ خەڵک نیە. لەم مەوزوعەدا هەیئەتی مەرکەزی کۆمەڵ بەیاننامەی ڕەسمی دەر ئەکات."(18)

هەیئەتی ناوەندی کۆمەڵەیش بەیاننامەیەکی بەم بۆنەیەوە لە ژمارەی 3 و 4 ی نیشتمان دا بڵاو کردۆتەوە. نیشتمان. لە چەند وتارێکی کورت دا. بە ستایشێکی زۆرەوە لە سەر شۆڕشی ئۆکتۆبەری نوسیوە و. وێنەی لینینی بڵاو کردۆتەوە. بەڵام نیشتمان بە ستایشێکی زۆرەوە لە "جوامێری و مەردوم دۆستی بەریتانیای گەورە" ش ئەدوێ. بە خۆشی‌یەکی زۆرەوە هەواڵی دامەزراندنی "ئیستگای ڕادیۆی کوردستان" ی لە یافا و. بڵاو کردنەوەی "دەنگی گێتی‌ی تازە" ی لە بەغداد بڵاو کردۆتەوە. بەو بۆنەیەوە نوسیوێتی:

"کورد ماوەیەکی زۆر لەمێژە هەستی بە نەجابەت و مرو خۆشەویستی بەریتانیا کردوە ئەم حکومەتە گەورەیە بە درێژایی مێژوی ئیمپراتورێتی خوی هەمیشە پارێزگاری ئازادی و سەربەخۆیی و پەروەرێنەر و پێ گەهێنەری نەتەوە پچوکەکانی گێتی بوە زۆر جاران وەکو ئەم جارەی ئێستا لە سەر حەقی نەتەوەیەکی پچوک بەرەنگاری نەتەوەیەکی زل و بێدادگەر و ستەمکار بوە ئاسایشی نەتەوەی خۆی لە پێناوی ئاسودەیی مەردوم داوە بە تایبەتی تیشکی ئەم هەتاوە داویە لە کوردی بێچارە و چارەڕەش و ستەمدیتو.."(19)

بە درێژایی ساڵانی جەنگ کاربەدەستان و ئەفسەرانی سۆڤێتی لە ناوچەکەدا ئەسورانەوە و. پێوەندیان لەگەڵ خەڵک ئەکرد. بێ‌ئەوەی هانیان بدەن بۆ جوڵان و کارکردن دژی دەسەڵاتی تاران. پێشتر کۆمەڵەی ژ. ک یان پشت گوێ خست بو. هیچ هەوڵێکیان نەئەدا بۆ ناسین و دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵی و. هیچ پشتیوانی‌یەکیان لە خەبات و چالاکی‌یە سیاسی‌یەکانی نەئەکرد چونکە: ژ. ک لەگەڵ حیزبی هیوا و سەرۆکەکەی ڕەفیق حیلمی پێوەندی پتەویان هەبو. ڕوسەکان حیزبی هیوا و سەرۆکەکەیان بەگومانلێکراو. یان ڕونتر بە نۆکەری ئینگلیز. لە قەڵەم ئەدا ژ. ک یشیان بە ڕێکخراوێکی نەتەوەیی دائەنا.

دوای تەواو بونی شەڕ بەپێی مادەی پێنجەمی "پەیمانی 3 قۆڵی ئیتیحاد" یەکێتی سۆڤێت نەبو

هێزکانی خۆی لە ئێران بباتە دەرێ، بەڵام سەرکردایەتی سۆڤیتی نەی ویست هێزەکانی هەروا بە خۆڕایی و بە ئاسانی بکێشێتەوە. بە تایبەتی جەنگی ساردی نێوان هەردو ئۆردوگای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا خەریکی گەرم بون بو. ڕوسیا خەریکی پەل هاویشتن بو لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتت و لە بەلقان.

دوای تەواو بونی شەڕ کە ئیتر باسی پێویستی کشانەوەی هێزەکانیان هاتە کایەوە. پێوەندییان لە گەڵ پیاوە ناودارەکانی ئازەربایجان و کوردستان کرد. کاربەدەستانی سۆڤێتی هەندێ لە پیاوە ناسراوەکانی کورد لەوانە: قازی محەمەد، سەیفی قازی، مەنافی کەریمی، عەلی رەیحانی و قاسمی حاجی بایزئاغای ئێلخانی زادە، عەبدوڵا قادری مامەش، کاک هەمزەی نەڵۆسی مامەش، نوری بەگی بەگزادەیان بانگ کرد بۆ باکۆ. لەوێ جەعفەر باقیرۆف بینینی. کاربەدەستانی سۆڤیتی باسی گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی ژ. ک و شێوەی کارکردنیان لەگەڵ کردن.(20) داوایان لە قازی و هاوڕێکانی کرد: لە باتی ژ. ک، ڕێکخراوێکی جەماوەری نوێ بە ناوی حیزبی دیمۆکراتەوە دابمەزرێنن و. زۆری سەرانی ئێلە کوردەکان لەم حیزبەدا کۆبکەنەوەو، لەباتی کاری ژێرزەمینی. کاری سیاسی و کۆمەڵاتیەتی و ڕۆشنبیری ئاشکرا بکا و، گۆڤارو ڕۆژنامە بڵاو بکاتەوە.

### 2. 6. گیرانی زەبیحی و هەندێ لە هاوڕێکانی

سەرلەشکر زەنگەنە نوسیویتی:

"سەرەتای خەزەڵوەری 1324 ئاگاداریەک گەیشتە تیپی رەزائیە و هەنگی ژاندارمری کە تاقمێ لە لایەن کۆمەڵە و قازی محەمەدەوە بە ڕێگاوەن بۆ رەزائیە. پێوەندی لەگەڵ سەرانی عەشایەری بیەستن و نەیانەوێ لەگوندی کوکیا لە خانوی زیروێ بەهادوری کۆبینەوە. ژاندارم لەسەر ڕێگای مەهاباد بۆسەیەکیان دانا. پاش تەقوتۆقێکی کەم عەبدورەحمان زەبیحی و دڵشادی رەسولی و قاسم قادری" وەکو ئەو ئەڵێ "بە 8 نامەوە گیران"(21)

نامەکان، وەکو زەنگەنە ئەڵێ، قازی محەمەد بۆ جەعفەر باقیرۆف و کاربەدەستانی تری سۆڤیتی نوسی بو. ناوەرۆکی نامەکان بریتی بون لە باسی سەردان و دیدەنی خۆی لە باقیرۆف و کاربەدەستانی سۆڤیتی و ئەو بەڵێنانەی پێی درا بون و، گلەیی لەوەی کە هیچیان جێبەجێ نەکراون. هەروەها داوای یارمەتی چەک، دەزگای ڕادیۆ، کاغەز و چاپخانە. نامەکان و گیراوەکان بە پەلە ئەنێرن بۆ ستادی ئەرتەش. وەک ئەم ئەڵێ ئێران کەڵکی لەم نامانە وەرگرتوە بۆ شکات لە لای ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان.(22)

### 2. 7. ژ. ک و بارزانی‌یەکان

#### 2. 7. 1. هەڵوێستی ژ. ک لە شۆڕشی 1945 ی بارزانی‌یان

حیزبی هیوا لە سەرەتادا پشتیوانی‌یەکی کاریگەری لە شۆڕشی 1943 - 1945 ی بارزانی‌یان کرد. تەنانەت چەند کەس لە ئەندامە ئەفسەرەکانی خۆی نارد بەشداری کارەکانی شۆڕشەکە بکەن و خواستەکانی لە قاڵبی نەتەوەییدا دابڕێژن. کۆمەڵەی ژ. ک یش بە گەرمی پشتیوانی لەم شۆڕشە کرد. لە ژمارەی دوەمی نیشتمان دا بە خەتێکی درشت نوسیویتی "ئەم جەنگەی سەرۆکی گەورەی کورد مەلا مستەفای بارزانی هەڵیایسانەوە ئیختیلالێکی میللی کوردە". هەر لەو ماوەیەدا نامەیەکیشی بۆ مەلامستەفا سەرکردەی شۆڕشەکە نوسیوە. لەبەر گرنگی مێژویی ناوەرۆکی نامەکە لێرەدا هەموی وەکو خۆی ئەنوسینەوە:

"بۆ جەنابی زەعیمی ئازادی مەلا مستەفای بارزان

بە ناوی هەیئەتی کۆمەڵەی ژ. ک... لە پاشی زانینی دەنگوباسی شۆڕشی ئازادی موقەددەسی ئێوە ئەم موخابەرە... هیوامان وایە بە تەفسیل وەڵامان بدەنەوە:

1. لە پێش هەمو شتێک تەبریکی زەعیم و لەشکری ئازادی کوردستان دەکەین کە زاڵ بوە بەسەر دوژمن دا.

2. بۆ ئەوەی کە ئێمە ئەو عاتیفە جوانەی کە بەرامبەر ئێوەمان هەیە و شعوری برایەتی، کوردایەتی، یەکێتی، یارمەتی‌یەکی عەمەلی و فیعلی بێ ولیە ئەم مەعلوماتەی خوارەوە بزانی، چونکە خۆمان تەقدیری مەوقیفی ئەمە دەکەین بەرامبەر بە مەسئولییەتی سیاسەتی دوەل.
3. بەراعیسی سەورەی ئێوە چیە ئایا ئیدیعای ئازادی کوردستانی عێراق دەکەن وە یاخود هەمو کوردستانی گێتی وە زیمنەن کوردستانی تورکیا.
4. مەوقیفی ئێوە بەرامبەر سیاسەتی ئەجنەبی لە عێراق دا چیە و ئەگەر هاتو لە تەرەف ئەم سیاسەتە تەهدید وە یاخود ئیقناع کران سەورە ڕانەوەستێنن و یاخود دەوام دەکەن.
5. ڕەئی ئێمە ئەوەیە کە سەورەی موقەددەسی ئێوە ناوێکی عومومی وەربگرێ یەعنی ئیدیعای ئازاد کردنی هەمو کوردستان بکەن وە بۆ ئەمە دەبێ هەمو کوردێکی گێتی بە مەشورەت تەعاونتان لە گەڵ بکا و ژێر قیادەی ئێوە لەشکرێکی کوردی لە هەمو کوردی گێتی بۆ ئەوەش دەبێ ئامادە... مونتەمەرێک لە حاڵی حازر لە ئێوە و هەیئەتی ئیستیشارەی ئێوە و هەیئەتی ئیستیشارەی ئێمە تەنزیم بکرێ و جێگا و زەمان تەعیین بکرێ... ئەم مونتەمەرە چی لە ئەرزی عێراق چی لە ئەرزی کوردستانی ئێران لەم مونتەمەرە هەمو... کورد بە شکلی پەیمانێکی میللی تەعیین دەکرێ... هەموان ئیمزا دەکرێ وە لەم مونتەمەرەدا نیزامی عەسکەری کورد تەعین دەکرێ و واجیباتی هەمو لایەک لە سەورەی میللی تەعیین دەکرێ.
6. پێویستە مەوقیفی حەربی خۆتان لە گەڵ مەوقیفی حەربی دوژمن بۆمان موفەسەللەن و بە دیققەت تەعیین بفەرمون لە گەڵ مەوقیفی عەشائیری کوردی عێراق بەرامبەر ئێوە.
7. بۆ ئازاد بونی کوردستان دەبێ سیاسەتی یەک لە دوەلی موعەزەمە لە گەڵمان بێ بە ڕەئی ئێمە ئەم دەوڵەتە دەوڵەتی شورەوییە، ڕای ئێوە بەم خوسەسە چیە چونکو نابێ عەلەلحیاد بین لە گەڵ هەمو دەوڵەتان.
8. لە هەموی موهیمتر پێویستە بە سورەتێکی موستەعجەل ئیجتیهادی خۆتان بەیان بکەن بە خسوسی ڕای ئینگلیس بەرامبەر سەورەی ئێوە و گفتوگۆیان لە گەڵ ئێوە چیە چونکی ئێمە دەزانین بە... نابێ ئینگلیس لەم سەورەیەدا بێ دەخل بێ.
9. ئێوە زەعیمێکی ئازادیپەرستن هیچ نەبێ موکافەحەی زوڵم ئەکەن بۆ عەشرەتی خۆتان وە کوردی ئێران بە ڕوحی برایەتی کوردایەتی زۆر ئیشتیاقی هەیە بۆ موەفەق بونی ئێوە بە هەرچی ئەوعێک بێ.

وە ئامادەیە بۆ یارمەتی ئێوە بە گوێرەی موسامەحەی زروفی سیاسی مەملەکەتمان وە کە ئەم سونالانە ئەکەین مەقسودمان ئەوەیە کە تەئمینی یارمەتی‌یەکی زۆر گەورە بۆ ئێوە بکەین و حەرەکەتی موبارەکی ئێوە بکەینە حەرەکەتی میللی عمومی تاکو لە تاریخ دا ئەم فەخرە بۆ ئێوە تەسجیل بکرێ.

لە لایەن هەیئەتی شورای شاری أ - خ

ئەم نامەیە هەڵنەگری ئێستێکی لە ئاستا بکرێ، نەک بۆ گومان لێ کردنی بەڵکو بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی:

(1) ئەم نامەیە لە ئارشیفی بریتانی دا دۆزراوەتەوە، ئەبێ بۆچی گەیشتبێتە ئەوێ؟
(2) نامەکە بە زمان و دارشتنێ نوسراوە لە گەڵ زاراوی موکریان و سەرکردەکانی کۆمەڵەی ژ. ک و نوسینەکانی گۆڤاری نیشتمان جیاوازی هەیە زۆرتر لە زاراوەی کوردی عێراق نزیکە، جا نوسەر بەوجۆرەی دارشتوە بۆ ئەوەی لە زمانی کوردی عێراقەوە نزیک بێ، ئەوە باسێکی ترە.
(3) ناوەرۆکی نامەکە، پرسیارەکانی و بۆچونەکانی و پێشنیارەکانی پتر لە هەمو نوسینەکانی تری ژ. ک

ستراتیجی نەتەوەیی کۆمەڵە دەر ئەخا و. لە هەندێ مەسەلەی سەرەکی دا لە گەڵ بۆچونە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵە دا ناسازێن.

## 2. 7. 2. کشانەوەی بارزانی‌یەکان بۆ ئێران

دوای ئەوەی گفتوگۆی سەرکردایەتی شۆڕشی بارزان و حکومەتی عێراق بە تێشکان تەواو بو. حکومەتی پاچەچی بڕیاری لەشکرکێشی دا بۆ سەر بارزان. یەکەمین تێکهەڵچون لە 25 ی ئابی 1945 دا دەستی پێ کرد. جەیشی عێراق زۆرایەتی هێزەکانی خۆی بۆ ئەم هێرشە ساز دابو. هێزی ئاسمانیی بەریتانیاش پشتیوانی هێزی زەمینیی عێراقی ئەکرد. هێزەکانی شۆڕش پاش چەند شەڕ و پێکادان بڕیاریان دا بکشێنەوە بۆ کوردستانی ئێران. لە کۆتایی ئەیلول دا بارزانی‌یەکان و خێزانەکانیان لە کانی ڕەش کۆبونەوە بە ڕێگای کێلەشین دا بە ڕێ کەوتن. لە 11 ی 10 ی 1945 دا گەیشتنە ناو ئەرزی کوردستانی ئێران. مەلا مستەفا خۆی چو بۆ دیتنی بەرپرسی هێزی سۆڤیێتی بۆ نیشتەجێ کردنی خێزانەکانیان. خێزانی بەرزانی‌یەکان لە مەرگەوەڕ، تەرگەوەڕ، شنۆ، نەغەدە، مەهاباد، دامەزرێنران.(23)

کشانەوەی بارزانی‌یەکان بۆ کوردستانی ئێران هاوزەمان بو لە گەڵ خۆشبونی زەمینەی دامەزرانی حیزبی دیمۆکرات و حکومەتی کوردستان.

سۆڤیێتی‌یەکان داوایان لە مەلا مستەفا کرد ماوەیەک خۆی لەبەر چاوان بزر بکا. بارزانی چوە گوندی میراوای سەردەشت تا کۆتایی 1945 لەوێ مایەوە. دوای ئەوە چوە شنۆ. هەندێ سەرچاوە ئەڵێن بەهۆی دەربڕینی نارەزایی و گوشاری بریتانی و عێراقی‌یەوە بوە.(24) بەڵام هەندێ سەرچاوەی تر ئەڵێن لەبەر ئەوە بو ڕوسەکان لە بەرزانی دودڵ بون، گومانیان هەبوە لە گەڵ ئینگلیز پێوەندی هەبێ. قازی محەمەد و سەرانی تری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان کشانەوەی بارزانی‌یەکان و چونی کوردی عێراقیان بۆ ئەوێ پێ خۆش نەبو.

# 3. حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

هێشتا کۆمەڵەی ژ. ک نەگۆڕا بو بە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بە هاندانی قازی محەمەد و چەند کەسێکی تر لە هاوکار و هاوبیرەکانی تۆمارێکی چەند گەزی لە قوماش ئامادەکراویان لە ناو خەڵک دا گێڕا بۆ کۆ کردنەوەی ئیمزا بۆ پشتیوانی لە دامەزراندنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان. هەزاران کەس ئەو تۆمارەیان ئیمزا کرد.

## 3. 1. ڕاگەیاندنی دامەزرانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

ح د ک دامەزرانی خۆی بە بەیاننامەیەکی کوردی - فارسی ڕاگەیاند. بەیاننامەکە زیاتر لە حەفتا کوردی ناسراو ئیمزایان کرد بو. خواستەکانی گەلی کوردی بە دیاریکراوی تێدا ڕون کرا بوەوە. تێکستی بەیانەکە وەکو لای خوارو بو:

بسم الله الرحمن الرحیم

بەیاننامەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

هاونیشتمانان، برایان!

ئاگری شەڕی جیهانگیری کە بە هۆی دوژمنانی ئازادی و لەژێرپێنەرانی دیموکراسی هەڵگیرسا بو. بە باسکی بەهێزی سەربازانی ئازای هاوپەیمانی گەورەی ئێمە کوژایەوە. دنیای دیموکراسی سەرکەوت و دنیای

فاشیستی کە هەوڵی دەدا گەلان و نەتەوەکانی جیهان لە ژێردەستی چەند نەفەر ملهوڕ و سەرەڕۆدا یەخسیر بکا بە شێوەیەکی قەتعی تێک شکا و لێک بڵاوبو و هەروەها کە چاوەڕوان دەکرا بۆ ئازادی گەلان و نەتەوەکانی جیهان ڕێگا خۆش کرا. ئەمڕۆ گەلانی دنیا لە گەورە و چوک دەیانهەوێ لەو ڕێگایەی کە بەرەو ئازادی خۆش کراوە کەڵک وەرگرن و لەو بەڵێنییانەی کە بە هۆی مەنشوری مێژویی ئەتلانتیکەوە دراوە سود بینن و هەڵسوڕاندنی کاروباری خۆیان بەدەستەوە بگرن و چارەنوسی خۆیان بە مەیل و ویستی خۆیان دیاری بکەن.

ئێمەی کورد کە لە ئێران دەژین ساڵەها و بەڵکو چەندین سەدساڵە کە لە پێناوی ماف و دەسەڵاتی نەتەوەیی و مەحەللی خەباتمان کردوە و قوربانیمان داوە. بە داخەوە کاربەدەستانی سەرەڕۆی ئێران بە هیچ جۆرێک حازر نەبون قسەی حسێبیی ئێمە قبوڵ بکەن و تەنانەت نەیان هێشتوە ئێمە لەو مافەش کەڵک وەربگرین کە قانونی ئەساسی بۆ ئەیالەتەکان و ولایەتەکانی ئێران دای ناوە و بەردەوام وەڵامی ئێمە گوللە و بۆمب و تۆپ و زیندان و تەبعید و یەخسیری بوە. بە تایبەتی لە سەردەمی بیست ساڵەی ڕەزاخاندا تەنانەت لە لەبەرکردنی جلوبەرگیشدا ئازاد نەبوین. بە زۆری سەرنێزە بە هۆی ئەفسەرانی دز و خائین و تاڵانکەرەوە هەمو دارایی و ژیانی ئێمەیان تەفروتونا کردوە و چاویان لە ناموس و شەرەفی ئێمەوە بوە و بۆ لە نێو بردن و خاشەبڕ کردنی نەسلی ئێمە لە هیچ نزمی و دڕەندییەک خۆیان نەپاراستوە. ئاخر ئێمەش ئینسانین، ئێمەش مێژو، زمان و شوێنەواری خۆمان هەیە کە لامان خۆشەویستن. بۆچی دەبێ مافی ئێمە لە ژێر پێ بنرێ؟ بۆچی ناتوانین لە نێوماڵی خۆماندا ئازاد و موختار بین؟ بۆچی ڕێگا نادرێ منداڵانی خۆمان بە زمانی کوردی پەروەردە بکەین؟ بۆچی نایەڵن کوردستان ولایەتێکی خودمختار بێ و لە لایەن ئەنجومەنی ولایەتییەوە ئیدارە بکرێ کە قانونی ئەساسی دیاری کردوە؟

هاونیشتمانانی بەڕێز! دەبێ بزانن حەق نادرێ، حەق وەردەگیرێ. ئێمە دەبێ بۆ وەرگرتنی ماف و دەسەڵاتی نەتەوەیی و مەحەللی خۆمان خەبات بکەین. ئەم خەباتە یەکێتی و یەکڕەنگی پێویستە، ڕێکخراو و پێشەنگی پێویستە، بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەیە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان دامەزراوە و دەستی بەکار کردوە. ئێوە هاونیشتمانانی خۆشەویست، دەبێ چاو و گوێی خۆتان بکەنەوە و لە دەوری حیزبی نەتەوەی خۆتان کۆببنەوە و لە پێناوی وەرگرتنی مافی ڕەوای نەتەوەیی خۆتان فیداکاری بکەن.

حیزبی دیمۆکراتی کوردستان ڕێبەر و ڕێنوێنی ئێوەیە. تەنیا لە ژێر ئاڵای ئەوە کە نەتەوەی کورد لە مەترسی تەفروتونا بون ڕزگار دەبێ و هەبون و ناموس و شەرەفی نەتەوەیی خۆی دەپارێزێ و دەتوانێ لە نێو سنوری دەوڵەتی ئێران دا خودموختاری نەتەوەیی خۆی وە دەست بێنێ.

هاونیشتمانان! ئێمە بێجگە لە مافی ڕەوا و ئینسانی خۆمان هیچمان ناوێ دروشمەکانی ئێمە لە بەندەکانی خوارەوەدا خولاسە کراون. بیان خوێننەوە و هەمو گەلی کورد فەرد فەرد فەریان تێ بگەیەنن. ئەوە دروشمەکانی ئێمەن:

1. نەتەوەی کورد لە نێوخۆی ئێران دا بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری مەحەللی خۆی سەربەخۆ و ئازاد بێ و لەسنوری دەوڵەتی ئێراندا خودموختاری خۆی وە دەست بێنێ.
2. مافی خوێندنی بە زمانی زگماکی خۆی هەبێ و تەواوی کاروباری ئیدارەکان بە هۆی زمانی کوردییەوە بەڕێوە بچێ.
3. لەسەر بناخەی قانونی ئەساسی، ئەنجومەنی ولایەتی کوردستان بە زویی هەڵبژێردرێ و بە هەمو کاروباری کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی ڕابگا و چاودێرییان بە سەردا بکا.
4. کاربەدەستانی دەوڵەت دەبێ بە بێ قسە لە خەڵکی ناوچەکان بن.

5. دەبێ لەسەر ئەساسی قانونێکی گشتی لە نێوان لادییی و خاوەن موڵک دا ڕێککەوتنێک پێک بهێنرێ و دوارۆژی هەردولا دابین بکرێ.
6. حیزبی دیموکراتی کوردستان تێ دەکۆشێ کە لە خەبات دا بە تایبەتی لە گەڵ نەتەوەی ئازەربایجان و کەمایەتییەکانی تر کە لە ئازەربایجان دەژین، ئاسورییەکان و ئەرمەنییەکان و هی دیکە، یەکێتی و برایەتییەکی تەواو پێک بهێنێ.
7. حیزبی دیموکرات بە ئامانجی بەرەو پێش بردنی کشتوکاڵ و بازرگانی و پەرەپێدانی فەرهەنگ و لەشساخی و باشترکردنی ژیانی ئابوری و مەعنەوی گەلی کورد دەست دەکا بە سود وەرگرتن لە سامانەکانی سروشتی و کانگاکانی کوردستان و لەم ڕێگایەدا تێ دەکۆشێ.
8. ئێمە دەمانەوێ تەواوی گەلەکانی ئێران هەلی تێکۆشانی بە ئازادییان بدرێتێ بۆ بەختەوەری و پێشخستنی نیشتمانی خۆیان.(25)

### 3. 2. هەوەڵ کۆنگرەی حیزبی دیموکرات

"کوردستان" گۆڤاری "بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان" لە ژمارەی یەکەمی ساڵی یەکەمی دا کە لە 15 ی سەرماوەزی 1324 بەرامبەر 6 ی دیسەمبەری 1945 لە ژێر ناونیشانی "حیزبی دیموکراتی کوردستان" نوسیویتی:

"لە دوای ئەوە لە هەوەڵی مانگی خەزەلوەر (ابان) ی 1324 حیزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد دامەزرا و بەیاننامەی خۆی بڵاو کردەوە لە رۆژی 2 ی 8 ی 1324 دا هەوەڵ کۆنگرەی خۆی کە تێکەڵ بو لە سەران و نوێنەرانی کوردان بە تەرتیبی ژێرو.

1. ماکۆ و ئارارات:

ئاغای عومەر خانی جەلالی، ئاغای شێخ حەسەن، ئاغای شێخ کی، ئاغای حەسەن ئاغای دلایی، ئاغای عەبدوڵا ئاغای ملان. ئاغای فەخری.

2. سۆما، برادۆست، دەشت، مەرگەوەر:

ئاغای عومەرخان شەریفی، ئاغای تاهیرخانی سمکۆ، ئاغای عەباس ئاغای فەنەک، ئاغای قۆیتاس ئاغا مەمەدی، ئاغای حاجی وەتمان، ئاغای شیرۆ، ئاغای عەبدی، ئاغای حەسەن تێلۆ، ئاغای تەمەرخان، ئاغای مراد، ئاغای نورکۆ، ئاغای زبید، ئاغای عەزۆ، ئاغای حەسەن هەنارە، جەنابی ئاغای حاجی سەید عەبدوڵا ئەفەندی.

3. شنۆ:

ئاغای موسا خانی زەرزا، ئاغای قەرەنی ئاغای زەرزا، ئاغای میرزا سەعید، ئاغای قازی محەمەد، ئاغای کاک حەمزە.

4. سندوس

ئاغای ئەحمەدی کاخزر، ئاغای قاسم ئاغای پیرۆتی، ئاغای محەمەد ئەمین ئاغای پیرۆتی.

5. لاهیجان

ئاغای عەبدوڵا ئاغای قادری، ئاغای کاک مامەند قادری، ئاغای کاک حسێن محەمەدی، ئاغای پیرۆت ئاغای ئەمیر عەشایر، ئاغای محەمەد ئەمین ئاغای پیرۆتی.

6. پیران

ئاغای محەمەد ئەمین ئاغا، ئاغای قەرەنی ئاغا.

7. میاندواو:

ئاغای محەمەد حسێن خان سەیفی قازی.

8. بۆکان:

ئاغای عەبدورەحمان شەرەفکەندی، ئاغای رەشید عەلیزادە.

9. مەنگور:

ئاغای ئیبراهیم ئاغای ئەحمەد، ئاغای مام حەسەن، ئاغای کاک سلێمان، ئاغای کاک حەمزە، ئاغای مین ئاغا.

وە باقی برایانی کورد تەشکیل دا و لە لایەن سەران و رەوشنفیکرانی حیزبەوە نوتقی زۆر چاک دایر بە دیمۆکراتی و یەکەتی ئیراد کرا. لەم کۆنگرەدا هەمو لکەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان تەسویب کرا و نوێنەری تایبەتیان بۆ داندرا. هەریەک لە جێی خۆیان دامەزران و دەستیان بەکار کرد.

هەژار هۆنەری جەوانی کوردستان ئەم شیعرانەی خوارەوەی کە باسی دیمۆکرات دەکا خوێندەوە:

دیمۆکراتمان دەوێ

حەوت سالّی ئاگری شەڕی دونیایە دایسا
دیزەی شەڕی تیا دەکوڵی گۆشتی پیر و جەوان
میلیۆنها جەوان تەڕو تازە ئەونەمام
ملیۆنها بە عیلم و هونەر نابیغەی زەمان
ئێسکیان کرا بە خواردەمەنی کرم و موورومار
سەریان کرا بە گۆ لە مەیدان فڕێ دران
سەد هەزار شار و دێهات تێکدران بە بۆم
پیستر لە وەزعی مەملەکەتی کوردی بارزان
بۆچی هەڵایسا؟ لەبەر ئاسایشی بەشەر
ریشەی فەساد و زوڵمێ ببەتڵێ لە روی جیهان
میللەت پچوک و گەورە حەقی وە دەس کەوێ
مەئمور و شا لە خۆی بێ چە جای خەت و زمان
کوردیش ئەخو بە شەر بو کەچی هەر دەیان کوژن
وردە و ئەسیرە دی لە عێراق و لە کوردسان(۱)
وا دیارە هی ئەوانە لەبەر نەفعی شەخسییە
کێ راستە؟ قەولی سابیتە بێجگە لە روسەکان؟
ئەو لەشکری کە فەتح و زەفەری یاوەری وییە
بەیداغی سوری داس و ستارە و چەکوچ نیشان
ئەو لەشکرەی بە ئەمری ستالینی پێشەوا
بەیداغی فەتح و مەردی لە سەر بیرلەنی چەقان
ئەو لەشکرەی کە مستی گرێ کردوە و دەڵێ
زاڵم لە کوێیە تێکی شکێنم دەم و ددان
وا ئەو بەزەیی بە حاڵی مەدا هاتوە کە بۆ

کورد بێ کەسن لە گێتی و بێ جێن و بێ نەوان
بۆچی نەبێ لە ڕیزی بەشەر کوردی چارەرەش
نانی نەبێ زمانی نەبێ تام نەکا ژیان
پێویستە قەومی کورد وەکو سایری بەشەر
بەهرەی ببێ لە حەقی ژیان بێتە نێو ئەمان
ئێمەش لە سایەی ئەو لوتفی قیمەتی
دەستمان لە دەستی یەک دەگرین زۆر بە ڕوح و گیان
حیزبێکی ساز دەکەین و دیموکراتمان دەوێ
فارس چلۆنە کورد دەیەوێ بێ وەکو ئەوان
مەئمور لە خۆم بێ هەرچی گوتی چاکە تێی دەکەم
خوێندن زمانی خۆم بێ گەلێک زوی دەکەم ڕەوان
گەر حاسلم لە خۆمی خارج کەم چە زو دەبێ
دانێم مەتەب لە شاری و مەکتەب لە دێیەکان
ئەو قەومە پاکی فێری سەواد و عیلم دەبێ
بێگانە چیدی پێم نەڵی کورد وەحشییەو نەزان
ئەی گەورەکانی کورد موبارەک بێ کۆمەڵو
تەوفیقو بێ لە لایەنی خەللاقی بێ مەکان
یا ڕەب بژی بە فەتح و زەفەر لەشکری قزل
هەر چەرخ و خول بە مەیلی ستالین بدا زەمان(26)

چەند کەسی تر لەم کۆبونەوانەدا شیعرو وتاریان خوێندەوە لەوانە خاڵەمین شیعرێکی خوێندۆتەوە کە لە هەمان ژمارەدا بڵاو کراوەتەوە.

لەم کۆنگرەیەدا قازی محەمەد بە سەرۆک و پێشەوای حیزب و چەند کەس بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵ بژێردران. ناوی ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندی لە هەمو سەرچاوەکان دا وەکو یەک نین. بەڵکو هەندێ جیاوازییان تێ دایە. نیگلتن بەمجۆرە ناوی بردون:

حاجی بابەشێخی سیادەت، محەمەد حسێن سەیفی قازی، مەنافی کەریمی، سەید محەمەدی ئەیوبیان، عەبدورەحمانی ئێلخانی زادە، ئیسماعیلی ئێلخانی زادە، ئەحمەدی ئیلاهی، خەلیلی خوسرەوی، کەریمی ئەحمەدین، حاجی مستەفا داودی، محەمەد ئەمین موعینی، مەحمود وەلی زادە، محەمەد ڕەسولی دڵشاد، محەمەد ئەمین شەرەفی، عەبدورەحمانی زبیحی(27)

لەو لیستانەی بڵاوکراونەتەوە هەندێ ناویان تێدا نیە، کەچی لە بەڵگە بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمەدا ناویان براوە، وەکو:

سید محەمەد تەهازادە کە لە هەمو بۆنە سیاسییەکان دا بە ناوی "معاونی حیزب" واتە پلەیەکی وەکو سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی دراوە و، سەید عەبدوڵای گەیلانی و، عومەر خانی شکاک و، زێرۆ بەگی هەرکی و، ڕەشید بەگی جیهانگیری، کە هەر چواریان وەکو لە پێشەکی مەتنی "پەیمانی یەکێتیی و برایەتیی کوردی - ئازەری" دا نوسراوە بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزب ناو براون.

ئەگەرچی یەکەمین بەیاننامەی خۆناساندنی حیزب بە خەڵک و، دانانی یەکەمین مەرامنامەی و، هەوەڵ کۆنگرەی لە سەرەتای مانگی خەزەلوەردا بوە، کەچی حیزب هەمو ساڵێ بۆ یادی دامەزراندنی خۆی لە ڕۆژی

25 ی گەلاوێژدا ئاهەنگ ئەگێڕێ هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ح د ک خۆی بـە درێـژەی کۆمەڵـەی ژ. ک دا ئەنێ و، ژ. ک یش وەکو خۆی لە ڕۆژژمێرەکانی دا نوسیویێتی لە 25 ی گەلاوێژدا دامەزرا بو.

ڕۆژنامەی کوردستان، لەم بارەیەوە، بە ناونیشانی "جێژن و چراخانی" نوسیویێتی:

"ڕۆژی 25 ی گەلاوێژ بە بۆنەی ڕۆژی پێنجەمین ساڵی دامەزراندنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لـە بەر هەیوان و حەساری عەمارەتی پێشەوا جێژنێک گیرا بو. لەم جیژنەدا تەواوی ئـەهالی شـیرکەتیان کـرد و شیرینیات و چـا و میوەجاتیـان مەسـرەف کـرد. جێـژن لـە سـەعاتی 1 ی پـاش نیـوەڕۆ دەسـت پـێ کـرا. دەوروبەری عەمارەتی پێشەوا بە ئاڵای سێرەنگی کوردستان و وێنەی پێشەوای موعەزەم ڕازا بوەوە و شـەوێ سەعات 7 بەرنامەی جێژن دەست پێ کرا و بە بۆنەی ئەم جێژنە لە لایەن ئاغایانی: عـەلی خوسـرەوی، سـەید محەمـەد تـەهازادە، دڵشـاد ڕەسـولی، سـەید محەمـەدی حەمیـدی، جەعفـەر کـەریمی، وورێی، سـدیقی، سـەید عوبەیدوڵای تەهازادە، عوسمان دانش، محەمەد ئەمین قادری، کاک ئەمین شەرەفی.. نوتق و مەقالات و ئەشـعار خوێندرایەوەو دەنێوان نوتقەکاندا بێوچان مۆزیکی میللی کوردستان دڵی حازرانی فێنک دەکـرد و جێـژن لـە سەعاتی 12 زۆر بە خۆشی دوایی هات."(28)

هەر لـە هـەمان ژمـارەدا سـەید محەمـەدی حەمیـدی وتـارێکی بـە ناونیشـانی "موبـارەزەی ئـازادی و دیموکراسی ئێمە پێی دە پێنجەمین ساڵی خۆی نا" هەمان بابەتی دوبارە کردۆتەوە.

### 3. 3. مەرامنامەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

ح د ک هەر لەو ماوەیەدا مەرامنامەی خۆی داڕشت و لە مانگی سەرماوەزی 1324 دا بـڵاوی کـردەوە. تێکستی تەواوی بەمجۆرە بو:

فەسڵی یەکەم

1. ناوی حیزب: حیزبی دیمۆکراتی کوردستانە.
2. حیزب لە سەر ئەم بناغانە دامەزراوە: حەقیقـەت، عەدالـەت، تەمـەددون. هـەمو نیزامنامـە و قانونـەکانی حیزب پاش پەسند کرانی لە لایەن کۆنگرەوە جێبەجێ ئەکرێن.
3. قەڵەم و گوڵە گەنم بۆ عەلامەتی حیزب قوبوڵ کراوە.

فەسڵی دوەم

4. لە قۆناغی ئێستادا گەورەترین ئامانجی حیزب بریتی‌یە لەوەی کە لە ناو سنورەکانی دەوڵەتی ئێران دا، پارێزگاری مافەکانی کورد بکا و بۆ جێگیر کردنـی ڕێگـەی خودموختـاری هـەڵبژێرێ. لـە هـەمو ئـەو ئەیالات و ولایاتانەدا کە بە درێژایی مێژو کوردیـان تـێدا ژیـاوە و زەحمـەتی کێشـاوە. هـەروەها لـە کوردستان ئەبێ لە سەر بنچینەی دیموکراسی، قازانجەکانی کۆمەڵانی خەڵک ڕەچاو بکـرێ، ئـەبێ بـێ گوێدانە جیاوازی میللی و مەزهەبی، بۆ هـەڵبژاردنی نوێنـەر بـۆ مەجلیسـی شـورای میللـی مـافی وەکـو یەکیان هەبێ.
5. ئامانجی حیزب بریتی‌یە لە پەرەپێدانی دیموکراسی، لە سەر ئـەو بنچینەیـە تـێ ئەکۆشـێ بـۆ خۆشـی مرۆڤایەتی.
6. حیزب هیچ دوژمنایەتی و ناکۆکی‌یەکی لەگەڵ حکومەتی ناوەندی نیە، بەڵام ئەیەوێ بە ڕێگـای هێمنانـە تێ بکۆشێ بۆ گەشەپێدانی فەرهەنگ و لەشساخی و کشتوکاڵی گەلی کورد، کە لە ئـەنجامی دەسـەڵاتی چەوسێنەران دا، بە دواکەوتویی ماوەتەوە، بۆ ئەمەش داواکاری مافی خودموختاری میللی‌یە.

فەسڵی سێیەم

7. هەمو ماڵیات و عەواریز بە شێوەی زەروری کۆنەکرێتەوە. لەسەر بنچینەی بودجە ڕێک ئەخرێ و دابەش ئەکرێ.
8. یەکەمین هەنگاوی میللی ئەوەیە دەس ئەکا بە ئاواکردنەوەی وڵات و پەرەپێدانی ڕێکخراوەی ئابوری و سیاسی. لە بەر ئەوە زیاتر لە 30% ی ماڵیاتی کۆکراوە بە حکومەتی مەرکەزی بدات.
9. ئەبێ هەمو مەئمورانی کیشوەری و سیاسی و دائیرەکانی کشتوکاڵ کورد بن. حکومەتی میللی هەر کاتێ بە پێویستی زانی ڕاوێژکارانی بێگانە بانگ ئەکا. هەمو کارەکانی کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی و دادگوستەری ئەبێ بە زمانی کوردی بنوسرێن و بەڕێوە ببرێن.
10. حیزب تێ ئەکۆشێ بۆگەشەپێدانی کشتوکاڵ ماشین بکڕێ و. هەوڵ ئەدا ئەو بەروبومەی جوتیاران بەرهەمی ئەهێنن بە باشی بفرۆشرێ.
11. حیزب تێ ئەکۆشێ بۆ ئاوەدانی و پاراستنی لە شساخی دێهات و. بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپانەی لەڕێی هاتوچۆدایە لە دێیەکەوە بۆ دێیەکی تر.
12. حیزب بە بێ جیاوازی نەتەوایەتی و قەومی و مەزهەبی حیمایەت لە ژیانی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و لەشساخی هەمو زەحمەتکێشان ئەکا کە لە کوردستان ئەژین.
13. بە مەبەستی پەرەپێدانی زانست و شارستانێتی لە ناو خەڵکی کوردستان دا، خوێندنی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی ئەکرێتە ئیجباری و لە هەمو قوتابخانەکاندا ئەبێ بە زمانی کوردی دەرس بخوێنرێ.
14. بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانین و ژیان و شارستانێتی خەڵک. ژمارەیەکی زۆر ناوەندی زانستیی، کتێبخانە، قەرائەتخانە، کلوب، تیاتر و مەیدانی وەرزش، دائەمەزرێنێ.
15. هەمو مەئمورانی کوردی کە لە ئەیالات و ولایاتی تردا لە ئیدارە و ئەرتەش دا کارئەکەن ئەبێ بگەڕێنەوە کوردستان.
16. حکومەتی میللی بە لە بەر چاو گرتنی قازانجەکانی خۆی پێوەندی فەرهەنگی و ئابوری لە گەڵ دەوڵەتانی تر. لە پلەی یەکەم دا لە گەڵ دەوڵەتی گەورەی یەکێتی سۆڤێتی، دائەمەزرێنێ.
17. حکومەتی ناوچەیی کوردستان لە هەمو کۆنفرانسە جیهانیەکان دا کە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی ئەبەسترێن. بە پێی ژمارەی خۆی، داوای بەشدار بون ئەکات.
18. حکومەتی خودموختاری کوردستان ئەبێ دەسەڵاتی هەبێ کە ئیمتیازی دەرهێنانی کانە دەرهێنرا و و دەرنەهێنراوەکانی کوردستان بدات بە هەرکەسێ کە بیەوێ.

فەسلی چوارەم

19. حکومەتی میللی بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی خەڵکی کوردستان بە ڕێگای هەرزان و ڕەحەت بە توندی دژی سەلەم و گرانفرۆشی و موحتەکیران ڕائەوەستێ.
20. حکومەتی میللی پەرە بە ئابوری کوردستان ئەدا و لە هەمو شارەکاندا کارگە دائەمەزرێنێ. ئەبێ دەستی گڵاوی ئیستیعمار لە سامانی سروشتی ئێمە ببڕێ. ئەبێ بۆ خۆمان سود لەم سامانە وەربگرین و لە هەمان کات دا سود بە مرۆڤایەتییش بگەیەنین.
21. ئەبێ لە هەمو کاروباری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی دا ژنان وەکو پیاوان مافی وەکو یەکیان هەبێ.
22. ئەبێ مافی کەمە نەتەوەییەکانی کە لە کوردستان ئەژین وەکو ئازەربایجانی، ئەرمەنی و ئاسوری، بە تەواوی دابین بکرێ.

حیزبی دیمۆکراتی کوردستان سەرماوەزی 1324(29(

لێکۆڵینەوەی بەرنامەکەی ح د ک دەری ئەخات کە زۆری پێویستی‌یەکانی گەشەکردنی ژیـانی کۆمـەڵی کوردەواری ئەوسای گرتۆتە خۆی:

چارەسەر کردنی کێشەی نەتەوەیی کـورد لـە چوارچێـوەی دەوڵـەتی ئێـران دا لـە سـەر بنچینـەی "خودموختـاری میللـی" و، نەهێشـتنی چەوسـانەوەی نەتـەوەیی، دینـی، مـەزەبی، لـە نێـوان کـورد و کەمایەتی‌یەکانی وەکو ئازەری و ئاسوری و ئەرمەنی و، لە نێوان ژن و پیاودا، لە ژێـر سـایەی دەسـەڵاتی حکومەتی کوردستاندا... گرنگتـرین لایـەنی سیاسـی و؛ گەشـەپێدانی کشـتوکاڵ و ماکینـەدار کردنـی و، دابینکردنی بازاڕی ساخکردنەوەی بەروبومەکانی و، دەرهێنانی سامانی ژێرزەمین و، دامەزراندنی کارگەی پیشەسـازی و، کردنـەوەی ڕێگاوبـان و، دابەشـکردنی دەرامـەتی بـاج لـە نێـوان دەسـەڵاتی ناوچـەیی و ناوەندی‌دا بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی خەرجی گەشەپێدانی ڕۆشنبیری، ئابوری، کۆمەڵایەتی، گرنگترین لایەنی ئابوری و؛ بە کوردی کردنی زمان و بەرنامەی خوێندن و، بە ئیجبـاری کردنـی خوێنـدنی قۆنـاغی سەرەتایی و ناونجی بۆ کچ و کوڕ و، دانانی ڕێوشوێنی گەشەپێدانی ژیانی ڕۆشـنبیری و کۆمەڵایـەتی... گرنگترین لایەنی بەرنامەکە بون.

ئەم بەرنامەیـە لـە لایـەن دانیشـتوانی کوردسـتانەوە پشـتیوانی‌یەکی زۆر و قـوڵی لـێ کـرا، ڕەخنـەی هەرەگەورە کە لە بەرنامەکە گیراوە: باس نەکردنی هیچ جۆرە چارەیەک بو بۆ گیروگرفتـی دژواری پێوەنـدی زەویدارەکان و جوتیارانی بێ زەوی.

لە ڕوانگەی کاربەدەستانی ئێرانەوە، ئەم مەرامنامەیە لە گەڵ "قانونی ئەساسی" ناکۆک و نەگونجاو بـو چونکە کوردستانی ئەکرد بە "دەوڵەتێکی تەواو جیـاواز" لـە ئێـران. بـۆ سـەلماندنی ئـەم قسـەیەش: جـۆری دابەشکردنی باج و داهاتی ناوچەکە لە نێوان حکومەتی خودموختار و دەسـەڵاتی ناوەنـدی دا و، یەکخسـتنی ناوچە کوردنشینەکان و، هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ئەیالەتی و ولایەتی کوردستان ئەکاتە بیانو.(30)

## 3. 4. هەڵکردنی ئاڵای کوردستان

مانگی سەرماوەزی ساڵی 1324 سەرانسەری ئازەربایجان هات بوە جـۆش و خـرۆش. فیداییـەکانی فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان پەلاماری ناوەندەکانی دەسەڵاتی حکومەتیان ئەدا. تەوریز و شارەکانی تریان یـەک لـە دوای یـەک گـرت. فیداییـەکانی دیمـۆکرات و خـەڵک دەوری ناوەنـدەکانی ئەرتـەش و ژانـدارمی ڕەزائیەیان دابو.

کوردەکانی دەوری ورمێ لە مەدا بەشدار بون. هەواڵەکانی ئـەم بزوتنـەوە جەماوەرییـە گەیشـت بـوە کوردستانیش. ڕۆژی 26 ی سەرماوەز خـەڵک، بـە هانـدانی هەنـدێ لـە سـەرکردەکانی حیزبـی دیمـۆکراتی کوردستان، هەڵیان کوتایە سەر "شارەبانی مەهاباد" کە دوایین نیشانەی ڕواڵەتی دەسەڵاتی تـاران بـو. پـاش تەقوتۆقێکی کەم گرتیان. ئاڵای حکومەتی ئێران داگیرایە خـوار و، ئـاڵای کوردسـتان لـە جێگـەی هـەڵ کـرا. خەڵک ئەیان ویست لە باتی زەبیحی و هاوڕێ گیراوەکانی ژاندارم و فەرمانبەرە گیراوەکانی ئێران بە بارمتـە لە لای خۆیان گل بدەنەوە، تا کاربەدەستانی تـاران ئـەوان ئـازاد ئەکـەن. ئـەمانیش ئـەوان بەرنـەدەن. قـازی محەمەد ئەم کارەی بە لاوە پەسند نەبو. ئەوانە بەر دران.

کوردستان هات بوە جۆش. بە دوای مەهاباددا لە شارەکانی نەغەدە و بۆکان و، لـە زۆر شـوێنی تـر ئاڵای کوردستان هەڵ کرا. هەڵکردنی ئاڵای کوردستان ڕوداوێکی مێژویی بو لـە ژیـانی سیاسـی خـەڵکی کوردستان دا. لێرەدا بۆ نمونە ئاهەنگی هەڵکردنی ئاڵا لە 3 شار وەکو بڵاوکراوەکانی ئەوسا نوسـیویانە، ئەگێڕینەوە:

### 3. 4. 1. هەڵکردنی ئاڵای لە مەهاباد

گۆڤاری "کوردستان" لە ژمارەی سێهەمی دا لە ژێر سەردێڕی "هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردوستان لە مەهاباد" نوسیوێتی:

"هەروەکو لە پێش دەرهاتی کوردستاندا عەرز کرا ڕۆژی 26 ی سەرماوەز تەواوی نوێنەرەکانی ئەهالی کوردستان لە شاری مەهاباد کۆبونەوە. لە سەعات 10 ی بەیانی لە کانگای حیزب ئالای کورد بە حوزوری دەهەزار نەفەر هەڵگیرا و لە کاتێک دا دەستەی موزیک مارشی میللی لێ دەدا و لە سەرتاسەری شەقامی وەفایی دا سەفی نیزام کە لولەی تفەنگ و موسەلسەل و سەرنێزەیان دەدرەوشا. دەستەی لاوان و قوتابییەکانی مەکتەب، کچ و کور، لە لای ڕاستی ئاڵا لە حەرەکەتدا بون. گەورە و چوکی مەهاباد هەیئەت و نوێنەرانی حیزبی دیمۆکرات لە پشت سەری ئاڵا سەری تەعزیمیان بۆ دانەواند بو و. بۆ ئیحتیرام چەپڵەیان لێ دەدا و هوڕایان دەکێشا و. پێشەوای موعەزەمی کوردستان جەنابی قازی محەمەد وتارێکی بەتینی لە بابەت ئاڵای موقەدەسی کوردستان ئیراد فەرمو.

ئەوجار لە پاش نوتق و خیتابە و تیر هاویشتنێکی زۆر و بەجێهێنانی مەراسیم و نەسبی ئاڵا لەسەر عەمارەتی هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان جێژنە دوایی هات."(31)

### 3. 4. 2. هەڵکردنی ئاڵا لە نەغەدە

گۆڤاری "کوردستان" لە ژمارەی دوهەمی دا لە ژێر سەردێڕی "هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردوستان لە نەغەدە" نوسیوێتی:

"بە پێی دەستوری هەیئەتی ئاوەندی حیزبی دیمۆکراتی کوردوستان برایانی خۆشەویست: ئاغای حسێنی فروهەر، عەلی خوسرەوی ڕۆژی 26 ی 9 ی 24 مەئمور کران کە ئالای موقەدەسی کوردوستان لە نەغەدە هەڵکەن. دەسبەجێ ئەو نوێنەرانە وەسائیلی حەرەکتیان ساز کرد. بۆ جێی ئەمرکراو حەرەکەتیان کرد و ڕۆژی 27 ی 9 ی 24 گەیشتنە نەغەدە و بە بێ ئەوەی مەعتەل بن دەستوری چەقاندنی سائر کراو جۆشوخرۆشێکی بێ غایەت لە دانیشتوانی نەغەدە و دەوروپشتی پەیدا بو لە پاش 3 سەعات لە ئاخرین نوقتەی ئەتراف ئاغایان و دێهاتی و ژن و منداڵ لە حیزبی دیمۆکرات کۆبونەوە و فیداییانی موسەللەح سوارە و پیادە نزیکی700 نەفەرێکیان تەشکیل دابو و. وەسائیلی ئەو جێژنە لە هەمو قیسمەتەوە بە هەیئەتی ئەو نوێنەرانە و ئاغایانی ئەحمەدی قادری رەئیسی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لکی نەغەدە. کاک محەمەد قادری، ئاغای غولام رەزاخان خوسرەوی، ئاغایان ئەحمەدی عوزیری و ئیبراهیم ئیرەجمەندی موکری و... و قاسم ئاغای پیرۆتی و کاک بایز و میرزا ئیبراهیم رەئیسی شارەبانی حازر کرا.

ڕۆژی چوارشەممو سەعات 9 ی بەیانی جێژنە دەست پێ کرا و قوتابیانی کورد و ئەرمەنی و ئاسوری بە سرود خوێندنەوە لە مەحەلی جێژندا ئامادە بون. برایانی خۆشەویست ئاغای فروهەر و خوسرەوی ئاڵای موقەدەسیان بۆ بەشی سواران کە لە شەقام ئامادە بون برد. وەختێکی ئاڵاکە وە دەرکەوت هەزار تیر بە ئیفتیخاری دیتنی ئاڵا هاوێژرا. سوارەکان ئاڵایان وەرگرت و بۆ کانگای حیزبی دیمۆکرات چون وە تا گەیشتنە بینای حیزب هەرچەند قەدەم گاوگەردون دەکرا. خەڵکی لێکدا لێکدا چەپڵەیان لێ دەداو هوڕایان دەکێشا لەو وەختەدا بە جارێک هەزار نەفەر بۆ زیارەتی ئاڵای موقەدەس هێرشیان برد و. لە پاش زیارەتی عموم ئاڵای موقودەس هەڵکراو سلاوی ئاڵا خوێندراوە و. سەدویەک نەفەر فیدایی موسەللەح هەر یەک سێ تیریان بەتاڵ کرد لە پاش ئاغای ئیبراهیم ئیرەجمەندی نوسەری حیزبی دیمۆکراتی لکی نەغەدە نوتقێکی راجیع بە ئازادی بە عەزمەتی ئاڵای موقەدەس ئیراد کرد کە بە چەپڵەلێدانێکی زۆر دوایی هات. لە پاش وی سرودی میللی لە لایەن...

ئینجا برای خۆشەویست ئاغای خوسرەوی بە دەنگێکی بەرز و شیرانە گوزاریشی خۆی ناو لە بابەت ئاڵای کوردستان و شەهیدانی ڕێگای ئازادی و حکومەتی کوردستانەوە نوتقیکی زۆری ئیراد کرد کە تەئسیرێکی زۆری لە ناو خەڵکی کرد و بە هوڕا و چەپڵە لێدانێکی زۆر تەواو بو.

سرودی "ئەی ڕەقیب" لە لایەن لاوانەوە خوێندراوە.

برای بەرز حسێنی فروهەر لە وەسفی ئاڵای موقەدەس چەند وتەیەکی ئیراد کرد کە جێگای تەقدیر بو. لە دوایی دا کوڕی ئاغای تەقی خان لە تەرەف ئەهالیەوە جێژنە پیرۆزی لە حیزبی کرد و عیدیەیەکی زۆر لە برایان لە وەسفی ئاڵای کوردستان هەریەک بە جۆرێک چەند وتەیەکیان فەرمو.

ئینجا برای خۆشەویست ئاغای خوسرەوی لاوی خوێن گەرم دوایی بە نمایش هێنا و خەڵکی، بە دڵێکی شادەوە، دەم بە دوعاوە بۆ ئاڵای موقەدەسی کوردوستان و میللەتانی ئازادی خوا، بڵاوەیان لێ کرد..."(32)

لە ئاهەنگی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە دەغەدە، کوردەکانی عێراق بەشدار بون. وەکو ڕۆژنامەی کوردستان دوایێتر بڵاوی کردۆتەوە، محەمەد مەحمود لەو ڕۆژەدا ئەم وتارەی خوێندۆتەوە:

"گەورەکانم! ئەی گەلی بەشەرەف! خۆشەویستان و ڕاوەستاوان!

ئەی کرێکار و فەلاح و سەپان و پاڵەی کوردی بە نرخ!

ڕۆژەها بەسەر شۆڕشی میللی پیرۆزی کوردا هەڵات و تیری دوژمن کاڵە و سینگی بەچکەشێرانی کوردی پێکا و خاکی کوردستان لاشەی جەوانانی گرتە باوەش. چیاو دۆڵ و دەشتەکانی کوردستان پڕە لە گۆڕستانی دلێران و نەبەزانی کورد کە لە پێناوی ڕێگای ئازادیدا، لە پێناوی هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردا گیانی پاکیان لە لاشەیان جیاواز بوەوە.

ئەی برای کورد! شۆڕشەکانی دیاربەکر، دەرسیم، سلێمانی، ئامێدی، بارزان، هەمو نیشانەی ئەو جەوانمەردیەیە کە بۆ ئازادی کراوە. ئەمڕۆ، ئەمڕۆ کە گەورەترین و پیرۆزترین ڕۆژە بۆ کورد، ئەبینن هەڵۆی بە هێزی کورد بە چنگی ئاسنینی خۆی ئەو ئاڵا پیرۆزە هەڵدەکا. بەڵێ ئەو ئاڵایە هەڵ ئەکات کە لە سەرەتای مێژوەوە کورد خۆی بۆ بەخت کردوە.

برایان! پیرۆزبایی خۆم پێشکەشی هەمو کوردێک و هەمو میللەتێکی ئازادیخواە دەکەم.

ئەی برای کورد! ئەزانی ئاڵای خۆشەویست چە ئامۆژگاریەکت دەکا؟ ئەڵی بۆ کۆبونەوەیەکی بێ جیاوازی گەورە و پچوک، ئاغا و کرێکار، قوتابی و شوان و فەلاح و ژن و پیاو، منداڵ و کچ، هەمو پێکەوە بە یەکدڵ بۆ یەک ئامانج تێ ئەکۆشن، هەوڵ ئەدەن. دیسان دەڵێ:

ڕەنگی سورم نیشانەی جەنگاوەری و نەبەزی گەلی کوردە.

ڕەنگی سپیم دەڵێ میللەتی کوردی نەجیب گیانێکی پاک و ڕاستی هەیە.

ڕەنگی سەوزم هاوار دەکا خاکی کوردستان پڕە لە دەغڵ و دان، کانگای زێڕ و زیو. ئەی کورد هەمو بە گیانێکی خاوێنەوە و، بیرەوەرییەکی پاک و ڕاستەوە، هەمو پێکەوە کەڵک لە کوردستانەکەتان وەر گرن.

دیسان دەڵێ:

ئەی فەلاح، ئەی کرێکار و پاڵەی کورد، دڵت لە خۆت نەمێنێ لە سەر نیشانەی پاکی و ڕاستی نیشانەی تەقەلا و هەوڵی دەسی تو ئەو دو گوڵە گەنم و جۆیە هەمیشە بە پێش چاوتەوەیە پێت ئەڵێت هەوڵ بدە، ئیش بکە و وڵاتت بڵێند بکەرەوە.

ئەی کورد دیسان ئاڵاکەت ئەڵێ و ئەمرت پێ ئەکات سەرکەوتنت و گەورەییت لە خوێندنایە، ژن و پیاو، کوڕ و کچ بە جارێ بخوێنن چونکی خوێندن هەمو میوەیەکی خۆشی و ژیندەگانی پێوەیە. کرنگاریش تیشکی ڕۆژی خۆی بەسەر هەمو سیفاتی جوانی ئینسانی دا بڵاو ئەکاتەوە و جوانتری ئەکا.

ئەی کورد ئێمەش بەرامبەر بە ئامۆژگاریەکانی ئەڵێین:
ئەی ئاڵا پەیمانت ئەدەینێ، هەمو پێکەوە بە یەکدڵ بە تەنیکی ئاسنینەوە هەوڵ بـدەین ببینـە سـپەرت. ڕاست بین. ئیش بکەین. بخوێنین.
ئەی کورد ئاڵا ڕەمزمانە لە دوای هەڵکردنی نرخی هێنانە خـوارەوەی قوربـانی کردنـی هـەمو میللـەتی کوردە.
ئیتر بژی کورد و کوردستان
بژی پێشەوای یەکێتی جەماهیری شورەوی سۆسیالیستی مارشاڵ ستالینی مەزن.
بژی هەمو میللەتێکی ئازادیخواه." (33)

### 3. 4. 3. هەڵکردنی ئاڵا لە بۆکان

ڕۆژنامەی "کوردستان" لە ژمارەی یەکەمی دا لە ژێر سەردێڕی "هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردوستان لە شاری بۆکان" نوسیوێتی:

"بە پێی دەستوری هەیئەتی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و ئەمری جـەنابی قـازی محەمـەد، سەدری ئەعزەم و پێشـەوای کوردسـتان. قـەرار درا ئـاڵای موقـەدەس و سـێرەنگی کوردسـتان لـە بۆکـانیش هەڵکرێ ئاغایان میرزا مستەفا سوڵتانیان، عەبـدولقادر مودەڕیسـی، حسـێنی فروهـەر، میـرزا محەمـەد ئـەمین شەرەفی، عەلی خوسرەوی، مەحمود وەلی زادە، میرزا ڕەحیم لەشکری و، ئەعزای هەیئـەتی حیزبـی دیمـۆکراتی کوردستان و، ئاغای شێخولئیسلامی هێمن شاعیری میللـی و نوماینـدەی هەیئـەتی ڕەئیسـەی میللـی و، ئاغـای محەمەد ئانەوازادە فەرماندەی ئۆردوی میللی بە فەرماندەری گاردی ئیحتیرام و، دەستەی موزیک لە گەڵ ئاغـای قاسم ئاغای ئێلخانی زادە نوماینەدەی کۆمیتەی محەللی حیزبی دیمۆکرات لکی بۆکان، بـە مـەئموری هـەڵگرتنی ئاڵای موقەدەس مەعلوم کران.

سەعات 1 ی پاش نیوەڕۆیە ڕۆژی چوارشەمو 5 ی 10 ی 24 بە ئیفتیخاری وە ڕێکـەوتنی هەیئـەتی هەڵگری ئاڵا لە حەساری کانگای حیزب مارشی میللی کوردستان خوێندراوە و موزیک لێ درا.

لەو کاتەدا ئوتۆمۆبیلی مەخسوس لە نێـوانی هـەزاران نەفـەر خوشـک و برایـانی سـابڵاغی گەیشـتنە بـەردەرکی کانگـای حیزبـی دیمـۆکراتی کوردسـتان ڕاوەسـتا هەیئـەتی هـەڵگری ئـاڵا، لـە نێـوان شـریخەی چەپلەڕێزانا و ئەعرەتەی توند و بڵێندی هـوراو بـژی کـورد و کوردسـتانی بەرێکەرەکانـەوە، کـە لـە بڵێکـی گەرموگوڕەوە بە کوڵەوە دەهات وە ڕێ کەوت.

سەعات دوونیوی پاش نیوەڕۆ هەیئەت گەیشتە میاندواو و لەوێ پێشوازی هاتوەکـانی ئاغایـان: قـازی قزڵجی، حەسەن خانی بوداقی، برایم ئاغای ئێلخانی زادە، حەمەد ئەمین ئاغای ئێلخانی زادە، ئەبوبـەکر ئاغـای ئێلخانی زادە و دو نەفەر شاعیری میللی: هەژار و حەقیقی، لە گەڵ سەد نەفەر پتر لە ئەعزای کۆمیتـەی محـەللی بۆکان گەیشتنی و مەراسیمی ئیحتیرامیان بەجێ هێنا. مارش و موزیک خوێنـدرا ولێـدرا. ئـەم جـار قـەتاری ئوتمۆبیلی هەڵگری هەیئەت و پێشوازی هاتوەکان کەوتنە ڕۆین تا گەیشتنە (تەقی ئاباد).

لەوێ برا دیمۆکراتە ئەرمەنیەکان بە فەرمانـدەی عیشـقی خـان لـە لای ڕاسـتەوەی ڕێگـاوە. خوشـکە ئەرمەنیەکانیش لە لای چەپەوە ڕاوێستا بون. ئیحتیرامی نیزامی و هـورا و چەپڵـەڕێزانیان کـرد و. عیشـقی خان لە تەرەف هەموانەوە تەبریکی هەڵکردنی ئاڵای کوردستانی کـرد. قاسـم ئاغـای ئێلخـانی زادە لـە لایـەن هەیئـەت و تـەواوی برایـانی کـوردەوە ئیزهـاری مەمنونیـەت و سپاسـی بـە خوشـک و بـرا ئەرمەنیـە هاوئامانجەکان کرد (حیزبی دیمۆکراتی کوردوستان سوپاسیان دەکاو قەدری عیشقی خان دەزانێ) هەیئەت لـە

نێو هوریا و چەپڵەرێزانی برا ئەرمەنییەکان وە رێ کەوت تا گەیشتە قەرەموسالیان (یانی ئەو دێیە کە مانگی رەشەمەی پارەکە - سەروان خاکسار و سەربازەکانی - خەیاڵی خاوی دیکتاتۆر بای باڵی دان و بە رێبواری هات بونە ئەوێ و مزگەوتیان هەڵوەشاند و نیر و ئامۆریان سوتاند بو و خەڵکی ئەوێیان پەرشوبڵاو کرد بوەبوە) لەوێ میرزا مستەفا موقتەدیری و مەحمود خان و یونس خان و عەبدوڵا خان ئەمیری ئەعزای لکی محەللی دیمۆکراتی ئەوێ لەگەڵ تەواوی خەڵکی دێ و چەند دێی دەوروبەریش ریزیان گرت بو میرزا مستەفا لە جیاتی هەموان تەبریکی ئیزهار کرد و سێ دەسرێژ کراو هوریا و چەپڵەیەکی زۆر لێ درا و گاوگەردونیان کرد.

هەینەت وەرێ کەوت و سەعات چوارونیوی پاش نیوەڕۆ گەیشتە (عەلی ئاباد) سی کیلۆمەتری بۆکان لەوێ گاردی ئیحتیرام بە فەرماندەری سەلیم ئاغای ئێلخانی زادە و عیدەی سوار لە ژێر دەستوری جەعفەر ئاغا و مارف ئاغای ئێلخانی زادە و قوتابییەکانی قوتابخانەی بۆکان و ئاغایانی ئەحمەد بەگی فەیزوڵابەگی و فەیزوڵا خان و عەلی خانی قازلیان و ئەحمەد ئاغا و عومەرئاغا و کەریم ئاغای عەباسی و هەباس ئاغا و خالید ئاغای حیسامی و چوارپێنج هەزار ئەفەر خەڵکی بۆکان و دەوروبەر بە پێشوازەوە هات بون. لەوێ هەینەتی هەڵگری ئاڵا پیادە بون و ئاڵای موقەدەس وەک رۆژ لە پشت هەور بێتە دەرێ لەیف دەرکەوت و کوردستانی گرتە ژێر شاباڵی پیرۆزی خۆی و مزگێنی و سەعادەت و خۆشبەختی بە نەتەوەی کورد دا.

مارشی میللی خوێندرایەوەو موزیک دەستی کرد بە لێدان و لە تەرەف گاردی ئیحتیرامی مەهاباد و بۆکان و سواران 3 شیلینگ کرا. گاوگەردون کراو ئاڵا لە سەر شانی جەوانی رەشید ئەبوبەکر ئاغای ئێلخانی زادە لە نێو چەپڵەرێزان و هوریا و بژی کورد و کوردستان تا گەیشتە کێلەشین دیسان گاوگەردون کراو بە خۆشی و بەشارەت و شایییەوە ئاڵا گەییە سەر حەوزی بۆکان. تەواوی کۆمەڵی خەڵکی لە دەوری حەوز و مەیدانی ئەوێ کۆبونەوە و، قازی محەمەد سادق قزڵجی وتار و شیعری بە تینی خۆی لە ژێر ئاڵادا خوێندەوە و پاش وی حەقیقی و هەژار شاعیری میللی هەر کام دەستە شیعرێکی زۆر چاکیان خوێندەوە و هەینەتی هەڵگری ئاڵا چونە عەمارەتی قەڵا کە لە پێش دا بۆ بەخێر هێنانی ئەوان ساز کرا بو.

.........

سەعات 12 ی بەیانی ئەوێ رۆژێ جەنابی حاجی بابەشێخ رەئیسی میللی کوردستان، لە گەڵ ئەحمەد ئاغای ئێلخانی زادە واریدی بۆکان بون و سڵاوی سەربازی و تەپڵ و موزیک بە جێ هات و ئەوێ رۆژیش لە بەر وەی کە تەواوی ئەهالی ئەتراف لە نیعمەتی ئەو جێژنە میللییە بەهرەوەر بن و بگەنە شارێ ئاڵا هەڵ نەکرا.

رۆژی هەینو 7 ی 10 ی 24 لە سەعات 8 ی بەیانییەوە دەست بە تەشریفات کرا.

1. لە سەر بانی عەمارەتی قەڵای بۆکان بۆ هەڵکردنی ئاڵا لە تەرەفی راستی ئاڵاوە جەنابی حاجی بابەشێخ و لە لای چەپەوە جەنابی حاجی بایز ئاغا راوەستان و لە هەردولاوە دو موسەلسەل دانرا.
2. قوتابییەکانی قوتابخانەی بۆکان و مامۆستاکان و خەڵکێکی یەکجار زۆر لەسەر سەکۆی قەڵا - دەستەی موزیک و گاردی ئیحتیرامی مەهاباد و بۆکان بە فەرماندەری ئاغای محەمەدی ئانەوازادە فەرماندەری ئۆردوی میللی مەهاباد و سەلیم ئاغای ئێلخانی زادە فەرماندەری بۆکان لە هەیوانی نێوەڕاستی قەڵا ئامادە بون - تەواوی ئاغایانی ناوبراوی سەرەوە و جەمعییەتێکی کەش لە ئاغایان مین جوملە حسێن ئاغای عەلی یار و براکانی لە سەربانی قەڵا بەریز لە ملاولای ئاڵاوە بە چەند سەف راوێستان. خەڵکێکی بێ ژماریش لە مەیدانی خوارەوە و دەوروبەری حەوزی گەورەی بۆکان راوەستان.

3. قاسم ئاغای ئێلخانی زادە پرۆگرامی خوێندەوە و، جەنابی حاجی بابەشێخ نوتقێکی زۆر گەرمی فەرمو مزگێنی خۆشبەختی نەتەوەی کوردی دا و ئاڵای موبارەکی بە دەستی خۆی هەڵ کرد.

حەسەن قزڵجی لە باتی رەحمان ئاغای ئێلخانی زادە وتاری پیرۆزبایی دا. قازی محەمەد سابقی قزڵجی، عەلی خوسرەوی سەرەکی دائیرەی چاپ و بڵاوکردنەوەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، ئەحمەد ئاغای ئێلخانی زادە، رەحمان مودەریسی، حەمەئەمین ئاغای ئێلخانی زادە، مارف ئاغای ئێلخانی زادە، جەعفەر ئاغای ئێلخانی زادە، حاجی بایز ئاغای ئێلخانی زادە، هەریەکە وتارێکی بۆ پیرۆزبایی لە هەڵکردنی ئاڵا دا و، هەژار، حەقیقی، خالید ئاغای حیسامی، بەم بۆنەیەوە سەرو شیعریان خوێندەوە.

لە خاتیمەدا قاسم ئاغای ئێلخانی زادە نوتقێکی زۆر بەتینی لە بابەت خۆشی و ئازادی کوردەوە بەیان کرد و سەعات 1 ی دوای نیوەڕۆ بە خوێندنەوەی مارشی میللی و لێدانی موزیک جێژن تەواو بو.

برا مەهابادییەکان سەعات چواری پاش نیوەڕۆ بە هوریا و چەپڵەڕێزان و ئەعرەتەی بژی کوردو کوردستان بەڕێ کران.'(34)

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

1. علاءالدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق. بەغداد. چاپخانەی مەعارف، 1959، ل 276. لێرە بە دواوە ئەنوسین: سجادی.
2. د قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی: کورتەیەک لە مێژووی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران. بەرگی یەکەم، چ 2، 1988: 1367، ل 26 - 27. لێرە بە دواوە ئەنوسین: قاسملو.
3. جلال الطالبانی، کردستان والحرکە القومیە الکردیە، دار الطلیعە، بیروت، 1970، ص 124.

هەروەها: الدکتور عبدالستار طاهر شریف، الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیە فی نصف قرن 1908- 1958، بغداد 1989، ص 216.

هەروەها: قاسملو، س ن، ل 28.

4. سەید موحەممەد سەمەدی، ژێ. کاف چبوو؟ چی دەویست؟ وە چی لێ بەسەرهات؟، مەهاباد، 1360: 1981، ل 15.
5. Eaglton,William,Jr. The Kurdish Republic of 1946, London,1963. p. 133.

لێرە بە دواوە ئەنوسین: ئیگلتن.

6. سەمەدی، س ن، ل4، قاسملو، س ن، ل29، ئیگلتن، س ن، ل24.
7. گ نیشتمان، ژ 1، س 1، پوشپەڕی 1322 بەرامبەر جولای 1943، ل 1-2.
8. گ نیشتمان، ژ 5، ڕێبەندانی 1322، ل 10.
9. گ نیشتمان، ژ 6، ڕەشەمێ 1322، ل 16.
10. گ ڕۆژی نوێ، ژ 10، سلێمانی، 1961/1/1، ل 13.
11. گ ڕۆژی نوێ، ژ 10، سلێمانی، 1961/1/1، ل 47.
12. قاسملو، س ن، ل 29.
13. دکتور عزیز شمزینی، الحرکە القومیە التحرریە للشعب الکردی، مطبعە الشهید ابراهیم عزو، نیسان 1986، ص 131. سجادی، س ن، ل 275.
14. گ نیشتمان، ژ 3 و 4، سەماوەز و ڕێبەندانی 1322، ل 20- 21.
15. دەربارەی ژیانی قازی محەمەد بڕوانە:

ر کوردستان، ژ 25، 26/ 12/ 1324.

گ ڕۆژی نوێ، ژ10، سلێمانی، 1961/1/1، ل 16.

16. سەمەدی، س ن، ل 13.
17. قاسملو، س ن، ل 61.
18. گ نیشتمان، ژ 2، خەزەلوەری 1322، ل 8-9.
19. گ نیشتمان، ژ 3 و 4، سەماوەز و ڕێبەندانی 1322، ل 27- 28.
20. بۆ ئاگاداری زۆرتر لە سەر ئەم سەردانە بڕوانە:

علاءالدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، بەغداد، چاپخانەی مەعارف، 1959، ل 278.

مەحمود عیزەت، کۆماری میللی مەهاباد: لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، 1984، ل 92 تا 96.

نیگلتن، س ن، ل 43-133.

قاسملو، س ن، ل61.

21. سرلشكر احمد زنگنه، خاطراتی از ماموريتهای من در آذربايجان (از شهريور 1320 تا دی ماه 1325)، انتشارات شرق، تهران، بلا، ص 61.
22. زنگنه، س ن، ل 62.
23. مسعود البارزانی، البارزانی و الحركه التحرريه الكرديه: ثوره بارزان 1943 - 1945.
24. مسعود البارزانی، البارزانی و الحركه التحرريه الكرديه: ثوره بارزان 1945 - 1958. ل 13.
25. ئەم بەیانە لە بنەڕەت دا بە دو زمانی فارسی - کوردی بڵاو کراوەتەوە. تێکستە کوردییەکەی تا ئێستا لە بەردەست دا نیە. ئەوی هەیە وەرگێڕانی تێکستە فارسییەکەیەتی.

بۆ تێکستی فارسی بڕوانە: ویلیام ایگلتون جونیر، کۆماری کورد لە ساڵی 1946 ی زایینی، وەرگێڕانی سید محمد صمدی، بەرگی 2، ل 91 - 92.

بۆ تێکستی کوردی بڕوانە:

عەبدوڕەحمان قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، بەرگی یەکەم، چاپی دوهەم، 1988: 1367، ل 35-38.

مەحمود عیزەت، کۆماری میللی مەهاباد: لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، 1984، ل 75-77.

بۆ تێکستی عەرەبی بڕوانە: عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكرديه فی نصف قرن 1908- 1958، ل 241-243.

بۆ تێکستی ئینگلیزی بڕوانە: فریده کوهی - کمالی دیهکوردی، ل 51-54. ئەویش لە دۆکۆمێنتەکانی بەریتانیا دەری هێناوە:

FO/371/45436-Nov 8,1945

26. گ کوردستان، ژ1، س 1، 15/ 9/ 1324 بەرامبەر 1945/12/6، ل 11-12.
27. ئیگلتن، س ن، ل 134.
28. ر کوردستان، 1325/5/29
29. ئەم مەرامنامەیە لە بنەڕەت دا بە کوردی نوسراوە. لە لایەن "سازمان انقلابی حزب توده ایران در خارج از کشور" کراوەتە فارسی و لە ژمارەی 19 ی ئۆرگانەکەی دا بەناوی "توده" کە لە ئەوروپا دەرئەچو بڵاو کراوەتەوە. لە بەرئەوەی تێکستی ئەسڵی لە بەر دەس دا نەبو سەر لەنوێ کرایەوە بە کوردی.

د شەریف لە ئارشیفی نیشتمانی عیراق دا وێنەیەکی ئەسڵی ئەم "مەرامنامە" یەی دۆزیوەتەوە کە لە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپ کراوە. دەقەکەی کردۆتە عەرەبی و، کۆپییەکی لە پاشکۆی کتێبەکەی دا بڵاو کردۆتەوە، بەڵام لە بەر ڕەشیی کۆپییەکە بە باشی ناخوێنرێتەوە. بڕوانە: الدكتور عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكرديه فی نصف قرن 1908- 1958، بغداد 1989، ل 341-346.

بۆ بەراوردی زمانی ئەسڵی مەرامنامەکە لە گەل وەرگێڕانەکەی دا، چەند مادەیەکی ئەنوسینەوە:

فەسڵی ئەوەڵ

مادە 1. حیزب ناو دەبرێ بە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان.

مادە 2. حیزب لە خوارەوە ئەساسی لە سەر ئەو پایانە دانراوە: حەقیقەت، عەدالەت، تەمەدون. تەواوی نیزامنامەی حیزب و قانونی لە کۆنگرەدا تەسدیق دەکرێ و لە پاشان ئیجرا دەبێ.

مادە 3. وێنەی حیزب قەڵەم و گوڵەگەنم قبوڵ کراوە.

فەسڵی دوەم

مادە 4. عومدە ئامانجی حیزب لە کوردوستاندا لە سنوری دەوڵەتی ئێران بە پەرە پێ دانی حقوقێکی مەخسوس بۆ خۆی بە واسیتەی ئوسول و ئەرکانی ئیدارەکانی خودموختاریەت تەشکیل دانە ئەو ئەیالەت و ولایەتێکی میلەتی کورد کە قەرنەها لەوە پێش لەوێدا زەحمەت کێش بون بە پێی قانونی دیموکراتی. هەروەها لە مەنتیقەی کوردستان دا دەبێ تەواوی مەنفەعەتی ئەهالی کە لەوێدا دەژین لە ئەزەر بگیرێ. (میلیەت، قەومیەت، مەزهەب) بە بێ تەفاوت بە میقدارێکی تەواو نمایندە بۆ مەجلیسی شورا هەڵبژێررێ.

......

30. ئەرفەع، س ن، ل80.
31. گ کوردستان، ژ 3، س 1، مانگی خاکەلێوە بەرامبەر مارسی 1946
32. گ کوردستان، ژ 2، س 1، 9/30/ 1324 بەرامبەر 1945/12/21.
33. ر کوردستان، ژ 5، 29/ 10/ 1324 بەرامبەر 1946/1/20.
34. ر کوردستان، ژ 1، 20/ 10/ 1324 بەرامبەر 1946/1/11.

# کوردوســـتان

بلاو کەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی
کوردستان
حزبگوواژیکی ئەدەبی کومەلایەتی سیاسیە
هەر پازدە روژ جاریك بلاو دەکریتەوە

ژمارە ١ سالی یەکەم ١٥ سەرماوەز ١٣٢٤ ٦ دسامبر ١٩٤٥

فهرست



مهاباد چاپخانەی کوردستان

# 3. ئاهەنگەکانی ڕێبەندان

## 1. کۆبونەوەی مەهاباد و دامەزراندنی حکومەتی کوردستان

ڕۆژنامەی "کوردستان" لە ژێر سەردێڕی "جێژنی سەربەخۆیی و ئیستیقلالی کوردستان، یا دەرەوشینی ئەستێرەی خۆشبەختی کوردان، بژی سەرۆک و کورد و کوردستان" ریپۆرتاجێکی درێژی دەربارەی ئاهەنگەکانی ڕێبەندان بە قەڵەمی سەرنوسەری ڕۆژنامەکە، سەید محەمەدی حەمیدی، بڵاو کردۆتەوە. لە بەر نرخی مێژویی ئەم ڕێپۆرتاجە، لێرەدا بەشە گرنگەکانی دەنوسینەوە:(1)

"ڕۆژی 28 ی بەفرانبار (دەیماه) ی 1324 ی شەمسی هەینەتانی مودیرەی هەمو لکەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و نوێنەرانی قەبایل و عەشایر و تەواوی تەبەقات لە مالیک و غەیرە مالیک هەر یەک لە چەند سەد فرسەنگ ڕێگاوە بو کانونی ئیحساساتی میللی و قیبلەی ئارەزو و ڕوناکیدەری ئەفکاری هەموانی خۆیان: شاری پڕ لە ئیفتیخاری میللی مەهاباد، وەکو بلبل بۆ لای گوڵ و وەکو پەپولە بۆ دەوری چرا هاتن و کۆبونەوە. لەم ویشکە سەرمای چلەی زستان بە نێو بەفر و دنوی زۆردا چەن هەزار برایانی ئێمە بێ ئیختیار تەنیا بە حوکمی ویجدان وەکو عاشق بۆ لای مەعشوق یا چاتر بڵێم وەکو ئاسن بۆ لای ئاسنڕفێن (أهن ربا) بە توندی لینگیان دا و. هاتن هەستی سەرما و مەینەت و ماندوێتی ڕێگایان نەکرد هەمو بە ڕوخۆشی و پێکەنین دەگەڵ چەپڵەڕێزانی بێوچان لە کاتێک دا کە وەکو ڕەعد دەنگی هوڕا کێشانیان بۆ ئاسمان دەچو... بون.

بۆچی؟

چونکو عەشق: عەشقی نیشتمان، عەشقی ئازادی و سەربەخۆیی، عەشقی پێشەوای خۆشەویست وە ڕەهبەری بزورگەواریان، ئەوانی وە ڕێ خست بو. چونکو فریشتەی بەخت و ئیقبال و پەری سەعادەت و خۆشبەختی لە لاسەروی فەزای گیان فێنکەرەوەی مەهاباد ئەوانی بە دەنگی دڵ لاوێنەوە و گیان پەروەردەی خۆی بۆ بەشدار بون لە دیتنی ئەستێرەی خۆشبەختی و پیت (فەیز) وەرگرتن لە مەواهیبی هەرە گەورەی عالەمی سەرەوە بانگ کرد بو.

دڵان هەمو پێکەوە وە لە یەک سەرچاوەوە پڕ لە میهر و وەفا بون. گیانان هەمو دەگەڵ یەک جوت و لە یەک مەنشەئەوە شین و سەوز ببون: حیزبی دیمۆکراتی کوردستان ئەو دڵانەی پێکەوە ڕاگرت بـو و هەسـتی میللی‌یەت ئەو ئەرواحەی بە یەکەوە بەست بو.

ئەمانە هەمو لە کێ ڕا بون؟

هەمو لە هێزی دەستی بەیزا و ئیعجازی وێنە مەسیحایی بێ وێنەی کورد و تاقە کـوڕی بـا شـەهامەتی کوردستان مامۆستا و ڕەهبەری مەزنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان جەنابی قازی محەمەد. کە دەگـەڵ جیـد و جەهدی خەلەل ناپەزیر و باوەڕی ڕاسیخ و شەجاعەت و مەتانەتی بێژمار. ڕێگای ڕەهنومایی قـەومی خـۆی وە پێش گرت و. تەواوی خەتەراتی زۆر سامناک و بەرهەڵستی زلی ملۆزمان و دوژمنانی بە نەبو دانـا و بـە بـێ شک و تەردید و خەیاڵات هەوڵ بە لابردنی هەمو بەرهەڵسـتەکان خـەریک بـو. پاشـان بـە فەراهـەم کردنـی زەمینە و ئیجاد و ئیستیعدادی کۆمەڵ لە ڕێی دانانی فیرقەی دیمۆکرات ئیقدامی فەرمو.

ئەی کوردستانی مەزن! ئەی دایکی نیشتمانی 9 ملیۆن کـوڕانی ڕەشـیدی کـورد. سـەرت لـە دۆشـەکی بیماری و دیلی هەڵێنە و نیقابی سپی بەفر لە ڕوی خۆت هەڵگرە بۆ کفن بۆ کوڕەکانتی واگـوزار کـە. ئـەوەتا ئەرشەدی کوڕانی تۆ ئیعجازی کرد و ئاخر رایەڵە و پۆی فێـڵ و تەڵەکـەی نابـەکارانی لەبـەر یـەک دەرێنـا و ژیان و خۆشبەختی بە یەکجاری تۆ و کوڕانتی سازو قایم کرد.

ئەی نیشتمانی ماد و ئەشکانی‌یان. ئەی لانکەی سەلاحەدین و نورەدین. دەیسەم. مزگێنیت لێ بێ ئاخر میکرۆبی ئەنواعی نەخۆشی‌یان لەم خاکە ماڵدراوە و. کوڕانی تۆ وەک دانەی بەرموری گەوهەر هۆندراونەوە و لە حـزوری پێشـەوای بزورگـەواری خۆیـان دا بـە سـان دەڕون و بـە دەنگـی فێنکاییـدەری: "بـژی کـورد و کوردستان" دڵی گڵاوی دوژمنان وەلەرزین دێنن. ئەی جێگای باوک و باپیرمان شاد و خوڕەم بە کە زسـتانت بە تازە بەهار و بەفر و ڕنوت بە گوڵستان گۆڕدراوە. ئەوەتا ڕۆژی دوەمـی ڕێبەنـدان (بەهمـەن مـاه) 1324 ساتی 8 ی بەیانی خۆشتر و ڕوناکتر ڕۆژانی مێژوی شەش هەزار ساڵەی تـۆ گەیشـتوە. لـە سـێڕێی قـازی، هێزی بە هێزی دیمۆکرات بە ساز و بەرگ و ئەسلەحەوە لە لایەکـەوە قوتابی‌یـەکانی کچـان و کـوڕانی هـەمو قوتابخانەکان و لەلایەکی دی بیست هەزار نەفەر لە تەواوی تەبەقاتی نەتەوەی بەرزی کورد هەر یەک لە جـێی خۆی تەرتیب ڕێزیان بەستوە و ئاڵای سێرەنگی کوردستان لە هەمو لایەکی میتینگەکەوە و لە ڕاست و چـەپی جێگای تایبەتی پێشەوای گەورەی. کە لە قەلبی میتینگ دا قەراری گرتوە. دەلارێتەوە.

حوزار هەمو چاویان بڕیوەتە ڕێی پێشەوا. ئاسمانی مەهاباد ڕوی خۆی ساف و ڕوناک کـردوە. ڕۆژ پەردەی هەوری لە ڕوی هەڵایساوی خۆی هەڵگرتوە و هەمو چاوەنۆڕی مـەوکیبی موبـارەکی پێشـەوان. بـەڵێ چاوەنۆڕن و دەبێ چاوەنۆڕیش بن چونکـە عەشـق. عەلاقـە. خۆشویسـتن. ئیحساسـات. میللی‌یـەت. هومێـدی سەربەستی. لە ڕەگ و شاڕەگی وان دا دەگـەڕێ و ئوختـەی یـەکێتی ئیتیسـالی هـەموان وجـودی مەسـعودی ڕەهبەری گەورەیە.

لەم کاتەدا بزۆکی پێشەوای خۆشەویست لە نێو سەلامی نیزامی و چەپڵەڕێزان و هوڕا و ئیحساسات و شەوق وشەعەفی فەوقولعادەی کۆمەڵ دا وە دەرکەوت و پێشەوای بەرز لە کاتێک دا کە ئەندامـەکانی کۆمیتـەی مەرکەزی لە پشت سەری دەهاتن و ئاڵای سێرەنگی کوردستان لە ڕاست و چەپی تریبـون لـە ئیهتیـزاز دا بـو ئەستۆی بەرزی بۆ ئاسمان هەڵێنا بو نزولی ئیجلالی فەرمو. موتابیقی بەرنامەیەک کە لە پێشدا سـاز کـرا بـو بە تەواوی حوزار ڕۆژباشی فەرمو پاشان تەشریفی لـە تریبـون هاتـە خـوارێ و بـەپێش تـەواوی گـوردان و گروهان و دەسـتەی سـەربازان و پێشـمەرگەکانی کوردسـتان دا هـات و هـەموی تەماشـا کـردن و بەهـەموان ڕۆژباشی فەرمو. لەم کاتەدا بە دەستوری معاونی فەرماندەی هەمو هێـز لەلایـەن سـەربازان و پێشـمەرگەکان و

تۆپخانەی کوردستان بە دەقیقە بێوچان بە ئیفتیخاری سەربەستی کوردستان و ناساندنی رەئیس جمهوری کوردستان شیلینگ کرا.

پاشان لە کاتێکدا کە دەنگی هورا دەچو بۆ ئاسمان و لە قەلبی میتینگ دا موزیک و سرودی میللی کوردستان لێ دەدرا و دەخوێنرایەوە برای خۆشەویست غەنی خوسرەوی شەهرداری مەهاباد بە پێی دەستور هاتە پێشەوە و بە تەرتیبی ژێرەوە میتینگی ئیفتیتاح کرد و وتی:

"ئەمن غەنی خوسرەوی شەهرداری مەهاباد ئەو موەفەقیەتە گەورەیەی کە میللەتی کورد لە پاش هەزاران قوربانی دان ئەورۆ لە نەتیجەی فەعالییەت و کارزانی و میللەتپەروەری فەوقولعادەی پێشەوای موعەزەمی کوردستان جەنابی قازی محەمەد نسیبی بو وە پیرۆزی و موبارەکبادی بە مەقامی گەورەی پێشەوای مەزن و میللەتی رەشیدی کورد عەرز دەکەم وە میتینگ و جەلەسەی ئەورۆ بە نێوی شاری مەهاباد ئیفتیتاح دەکەم و بە دڵێکی خاوێن و پاکەوە دەڵێم بژی پێشەوای موعەزەمی کوردستان."

لە دوایە ئاغای خوسرەوی بەرنامەی میتنگی بەتەرتیبی ژێرەوە بە ئیتیلاعی حازران گەیاند:

1. دوعای جەنابی مەلا حسێن مەجدی
2. نوتقی جەنبی پێشەوا و رەئیس جمهوری کوردستان
3. نوتقی جەنابی حاجی بابە شێخ
4. نوتقی ئاغای محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی
5. ئەشعاری ئاغای هەژار شاعیری میللی
6. ئەشعاری ئاغای هێمن شاعیری میللی
7. خیتابەی ئاغای سەید محەمەد تەها زادە
8. نوتقی ئاغای شێخ حەسەنی شەمسەدینی
9. نوتقی ئاغای عومەر خان
10. نوتقی ئاغای زێرۆ بەگ
11. نوتقی ئاغای محەمەد ئەمین موعینی
12. نوتقی ئاغای سەید عەبدولعەزیز
13. نوتقی ئاغای ئیبراهیم ئەدەم
14. نوتقی ئاغای محەمەد فەیزوڵابەگی
15. خیتابەی ئاغای ئانەوازادە
16. سرودی مەدرەسەی کوردستان
17. سرودی مەدرەسەی پەروانە (کچان)
18. خیتابەی پای ویلمەی سیادیان
19. خیتابەی پای خەدیجەی حەیدەری
20. سرودی مەدرەسەی گەلاوێژ
21. سرودی مەدرەسەی سەعادەت
22. خیتابەی ئاغای ئەحمەدی ئیلخانی زادە
23. خیتابەی ئاغای محەمەد قادری(2)

## 1. 1. دوعای مەلا حسێنی مجدی

ئاغایان، حازران! ئەوەڵەن لەخودای بەرز دەخوازین کە پێشەوای مەزنی ئێمە لە عەدالەتی عومەری کوری خەتاب و ئەمانەتی ئەبو عوبێدە و شەجاعەتی خالیدی کوری وەلید و عیلمی عەلی کوری ئەبوتالیب (خودایان لێ ڕازی بێ) بەهرەوەر بێ. ئامین. پاشان ئەی ئاغایان وحازرینی نەتەوەی کوردی غەیور حەق تەعالا لە قورئانی مەجیددا دەفەرموێ: (ان المتقین فی جنات و عیون فادخلوها بسلام امنین) کە پەرهێزگاران لە باغاتی بەهەشت و کانیان دا دادەنیشن و مەلائیکە بەوان دەڵێن: وەرن بە سەلامەت و لە هەمو نارەحەتی‌یەک ئەمین بن دەرد و بەڵای دنیا لاچو. پاشان خودا دەلیلی ئەم سەلامەتی‌یە و وارید بونی ئەم دەشخاسە دەفەرموێ: (ونزعنا ما فی صدورهم من غل اخوانا علی سرر متقابلین) یانی ئێمە لەبەر سەعی و کۆششی خۆمان حەسەد و کینە و بوغزمان لەوان دور کرد و وەکو برایانێ کە لەیەک ڕەنگ بوبن لەسەر تەختان دادەنیشن و بە ئەدەب ڕو لەیەکدی دەکەن. چونکو پشت لە یەکدی کردن نیشانەی نارەزایەتی‌یەو ئەم نەتەوانەی جورجوری کە لە بەهەشت دا ئیتیفاقیان هەیە لە ئەسەری تەرکی حەسەد و کینە و لە ئەسەری نیشان دانی تەعاون و کومەگی بوە کە لە دنیادا پێکیان کردوە. ئەگەر وابو ئەمە تەرکی کینە و بوغز و نیفاق بکەین و بە مەقامی ئەشخاسی سزاوار حەسەد نەبەین. ئەمن حەدیسێک لە کتێبی(مسلم) ئەویش لە ئەبوسەعدی خدری نەقڵ دەکا کە پێغەمبەر (ص) بە ڕوخۆشی فەرموی ئەبوسەعید بانگدەرێک لە کاتی چونی بەهەشت بانگ دەکا: کە لە بەهەشت دا بژی بێ مەرگ و لەشساغ دەبێ. بێ نەخۆشی و هەمیشە جوان دەبێ. پیر نابی لە نیعمەتی خوا بەشدار دەبی بێ نارەحەتی و ناهومێدی.

ئەمەش نەتەوەی کورد ئینشئەڵا لە ژیانی سەربەستی بە یەکجاری و. لە لەشساغی بێ نەخۆشی و. لە ئەمامی ئازادی بە بێ سیس بون و. لە نیعمەتی ئازادی بێ زەواڵ. بەهرەمەند دەبین.

خوداوەندا ئەم ئاڵایە کە بە خوێنی لاوان چەقاندومانە قایم و یەکجاری کەی. ئامین.

یانی دەرەجەی بەرزو سەربڵیند بیت و سوفەرای دەوڵەتی ئێمە لە هەندەران گەورە و قسە لێ قبوڵکراو بن. ئامین.

وە دەوڵەتی جیرانی ئێمە: "ئیتیحادی جەماهیری شورەوی" هەمیشە لە عیزەت و شەوکەتی زیاد بێ و لە سەر دوژمنی موزەفەر بێ. ئامین

وە ئەو زاتانە کە لە ڕێی سەربەستی گیان و بەدەن و ماڵی خۆیان بەتاڵاند موریدی ڕەحمەتی خودا و لە دەرەجەی شوهەدا بن.

وە ئاخر کەلیمەی ئێمە جوملەیەکە کە ئەهلی بەهەشت لە ورودی ئەوەڵی دا دەڵێن: حەمد بۆ خودایەکە کە چرای هیدایەتی هەڵکرد و ئەگەر چرای ڕوناک نەکردایە بەو نیعمەتە بێ پایانە نەدەگەیشتین و دو ئەفەر شازادەی بەنی هاشم و سیراجەدین کە لێرە حازرن لە خودا دەخوازین کە لەسەر خزمەت بە نەتەوەی کورد بە دڵ هیمەت بکەن و موەفەق بن.(3)

## 1. 2. نوتقی جەنابی پێشەوا و ڕەئیس جمهوری بەرزی کوردستان

"کوردستان مەوقیعیەتی جوغرافیائیەکی مەخسوسی هەیە کە بێ پسانەوەو بێ ئەوەی نەتەوەو میللەتێکی کە لە نێویان دا فاسیل و لێکیان بپچڕێتەوە کورد بەسەریەکەوە و پێکەوە سکونەتیان تێی دا هەیە و دارای مالکیەتی میللین دەوێ دا. بەسەرهات و سەوابیقی تاریخیان یەکە و عومەن تێی دا شەریکن. خاوەنی ئاداب و عادات و ڕسومی میللی‌یەکی وان کە هیچ جۆرە سەدمە و حەوادیسێک نەی توانیوە سستی‌یەک لە بناغەی میللیەتی ئەوان دا پەیدا بکا.

کورد لە قەدیم ڕا هەزاران پادشا و حوکمدار و تەشکیلاتیان بوە. هەر لەم کوردستانی ئازادی ئێستادا بنەماڵەی ئومەرای موکری کە سەر سیلسیلەی ئەوان ئەمیر سەیفەدین بوە تا 1020 ی ه بەلیستیقلال یەک لە دوی یەک: ئەمیر سەیفەدین، سارم بەگ، شێخ حەیدەر، ئەمیر بەگ، ئەمیر پاشا تا دەگاتە قوباد خان بە دەسەڵات و قودرەتەوە حکومەتیان کردوە.

میللەتی ڕەشید و بە غیرەتی کورد لە هەمو دەور و زەمانێک دا هەر کەس خەیاڵی ئیستیلای نیشتمانی ئەوانی بو بێ بەرهەنگاری بون بەربەرەکانییان کردوە و لە هیچ فیداکارییەک دەستیان دانەنەوانەوە. لە پاش لە دەست چونی سەڵتەنەت و حوکمدارییشیان بو وەگیرخستنەوەی ئیستیقلال و ئازادی بە ملیۆن قوربانییان داوەو لە بەر ئەوەی کە هەمیشە لە موبارەزە و ملە دا بون هیچ جۆرە ئەزییەت و ئازارێک نەماوە نەی چێژن و نەی بینن.

لەگەڵ ئەوەش هەمو کوێرەوەری و کوشتن و برینێکیان تەحەمول کردوە و قەت لە ئامانج و ئارەزوی خۆیان شل نەبونەوە و لە ڕێی وە دەست خستنەوەی ئازادی دا وچانیان نەداوە. بە دڵێکی ئەوەندە بە هێزو عەزمێکی هێندە سابیتەوە تێکۆشاون تا ئێستا هێزێکی وا پەیدا نەبوە بتوانێ تێکڕا خەفەیان بکا. میرەکوێرەیان کوشتوە بابان سەریان هەڵداوە، بابانیان بێدەنگ کردوە ئەردەڵان بڵیند بون. ئەوانیان لە عەرزی داوە بتلیسی بەرز بونەوەو هەزاری دیکەی وەک ئەوان.

تا لەو دواییانەدا لە پاش شەڕی بەینەلمیلەلی پێشوەوە کە دیکتاتۆری ئێران و تورکیا هاتنە سەرکار و زمان و عادات و مەزهەب و خسوسیاتی میللی کوردیان بە جارێک لاواز و کز و کەنەفت کرد. لە هیچ وەحشییەت و دڕندەییەک ڕانەوەستان، خوێندن و نوسینی زمانی کوردی مەمنوع و پۆشینی لیباسمان قەدەغە بو.

ئەیان دەهێشت لە هیچ جۆرە مەزایا و حقوقێکی بەشەرییەت بەشمان ببێ. ڕێگای فێربونی عیلم و سنعەتیان لێ بڕی بوینەوە، هەر ڕۆژە بە بەهانەیەک و هەردەمێ بە تەشقەڵەیەک دەستە دەستە و پۆل پۆل کوردی هەژار و بەدبەختیان حەبس و تەبعید دەکرد و دەیان کوشتن و لە بەینیان دەبردن. حاسل و دەسرەنجی ئەو میللەتە بێچارەیان دەبرد بۆ خۆیان و ئەوانیشیان برسی و تینو و ڕوتوقوت دەهێشتەوە.

تا لە شەهریوەری 1320 دا فریشتەی ئازادی دەستگای دیکتاتۆری و فاشیستی ڕەزاخانی تێکشکاند. کورد سەری لەو هەمو فشار و ئەزیَتە کەمێ فاریغ بو فەوری ئیحساسی کرد. چۆن دەبێ لە فرسەت ئیستیفادە بکات و. ڕێگای سەلاح و وەدەست خستنی ئازادی ئەو میللەتە چیە و چبکا؟ پیاوانێکی بە بیرو هۆش و بە شەرەف کە زۆر لە مێژ بو خوێناوی دڵی خۆیان دەخواردەوە و بۆ زەلیلی ئەو میللەتە دوکەڵ لە دەرونیان دەهاتە دەرێ زۆر زو تەشخیسیان دا کە وەختی کارە و لەو فرسەتە دەبێ بەهرە وەربگیرێ و ئەوە تەواو ئەو ڕۆژەیە کە پشتاوپشتمان چاوەڕوانی بون. یەکجار و خێرا، بێوچان و ڕاوەستان، دەستیان بە کار کرد حیزبی دیمۆکراتی کوردستانیان تەشکیل دا و بە دەستوبرد خەریکی کاروباری میللی بون و بە چاوێکی ورد و بە دیقەت ئیحتیاج و پێداویستی کوردیان تەشخیس داو بەدی کرد.

لە پێش هەمو شتێک دا ئیختیلاف و دوبەرەکانی عەشایەری کە بە دەسیسە و حیلەبازی ئیستیعمارچی و دیکتاتۆران بۆ ئیستیسمار و خواردن و کروشاندنەوەی ئەو میللەتە بە قەولی خۆیان: "تەفرەقە بیەنداز و حکومەت کون" دە بەینی خست بون و تا ئەندازەیەک ئەو ئاورە بڵێسەی ساند بو برای دایکوبابی لە یەک بەزاند بو یەکەتی لە گوڕێ هەڵگیرا.

چەند مەدرەسەی کچان و کوڕانمان کردەوە. مەدرەسەی شەوانەمان دایر کرد و کتێب بە زمانی کوردی تەرجەمە کران... کوڕ و کچ و پیاوی گەورە لە مەداریسی شەوانە و ڕۆژانە بە زمانی کوردی دەخوێنن لە جیاتی ئەوەی شەش حەوت ساڵ خەریکی خوێندن و فێربونی زمانی فارسی بن لە مانگێک و دومانگ دا دەبنە خوێندەوار و هەمو شتێک دەخوێننەوەو دەنوسن.

بۆ ناساندنی لیاقەتی میللی و دەرخستنی حەیاتی ئەدەبی و فەرهەنگی کورد و بۆ ڕاگەیاندنی هاواری خۆمان بە گوێی دنیای بەشەریەت و عەدالەت موحتاجی وەسیلەی چاپ و بڵاوکردنەوە بووین. چاپخانەی زۆر چاک تەئسیس کرا و دائرا لە شاری خۆمان دا بە زمانی خۆمان بە چاپخانەی خۆمان گۆڤار و ڕۆژنامە دەردەچێ و بیر و فیکر و داخوازی ئێمە لە دنیادا بڵاو دەکاتەوە.

حاسل و بەروبوی ئێمە کە میقداریکی زۆرو زەوەند و بە قیمەت بو بە فیرۆیی لە دەستیان دەرهێنان و دەستی ئیستیعمار سەددیکی لە پێش ئێمە و بازاڕی دنیا دروست کرد بو ڕێگای حەلمان دیدەوەو تیجارەت و ئیقتیسادی کوردستان زۆر باش تەئمین کرا.

لە زەمانی دیکتاتۆری دا کە هەمو عەواریزێکیان لێ دەستاندین کەموزۆر وەسیلەی لەشساغی و موعالەجە، نە حەکیم، نە دەرمان، نە مەریزخانە. بۆیان سازنەکردین ئێمە بۆ خۆمان مەریزخانەی زۆر باش بەو زوانە دایر دەکەین و لەشساغی وڵاتمان تەئمین دەبێ.

هێزێکی میللیمان تەشکیل داوە کە بە شەجاعەتێکی تەواو حازرە دیفاع لە نیشتمان بکا.

دیارە موەففەقییەتی ئێمە سەراسەر لە عەینی مەرامی دیمۆکراسی و لە نەتیجەی فەعالییەتی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و بە پشتیوانی عالەمی دیمۆکراتە لەبەرئەوە... دەڵێین بژی موئەسیسینی دیمۆکرات.

میللەتی کورد هەزاران سەد و بەرهەڵستی سەخت و سەهەندەی لە ڕێ دا بو دەستەوبایرەی دیکتاتۆری بێوچان کارشکێنی ئێمەیان دەکرد و لە هیچ نامەردییەک ڕانەدەوەستان. ئیختیلافاتی عەشایەر بۆ داخلیش ئیشکالێکی گەورە بو بۆ ئێمە. ئەمما ئەوانە هیچکامێکیان نەیان توانی پێش بە ئێمە بگرن بە دڵێکی بەهێز پایەداریمان کرد و ئیدامەمان بە فەعالیەتی خۆمان دا تا ئیستیقلال و ئازادی نەتەوەی کوردمان بە دەست هێنا.

دیارە بەقایایەکی ئەو خەتەراتەش کە ماوە چە لە داخل دا و چە لە خاریجا میللەتی کورد موبارەزەی خۆی لە گەڵیان ئیدامە پێ دەدا بە پشتیوانی خودا موزەففەر و مەنسور دەبێ.

ئەوڕۆ لە نوماینەدەکانی تەواوی نەواحی و نوقاتی کوردستان بێ ڕیعایەتی تەبەقات ئەعەم لە ئاغاو ڕەعییەت و، گەورە و چوک، کۆبونەوە و یەکدڵ و یەکزمان هاواری دیمۆکراسی دەکەن بە ڕوی دیمۆکرات دا دەرون قودرەت و قوەتی دیمۆکرات نیشان دەدا."(4)

### 1. 3. نوتقی فەرماندەکانی پێشمەرگە

### 1. 3. 1. محەمەد حسێن خان کومەک فەرماندەی هەمو هێزی کوردستان

ئەمن بە نوێنەری لە لایەن هێزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانەوە پیرۆزەی خۆم دەگەڵ گیانی سەربازی و پێشمەرگەیی بە پێشگای ئەقدەسی جەنابی قازی محەمەد ڕەئیسی خۆشەویستی جمهوری کوردستان و بە هەمو نەتەوەی کورد ڕادەگەیەنم و، شانازی ئەوەم هەیە کە بڵێم یەکەیەکەی سەربازانی کە بە تەواوی ساز و بەرگ و ئەسلەحەوە لە کن حەزەراتی گەورە ڕاوەستاون و منیش یەکێکی چکۆلەم لەوان وەکو شێری ڕق هەڵستاو لەشی ڕوت و گیانی بێ بەهای خۆمان بۆ دیفاع لەو ئاو و خاکی کوردستانە تا ڕژاندنی دوایی تنۆکی خوێن لە سەر دەسمانە.

.... برایانی هاوخوێن بە پشتیوانی یەکەتی و دڵپاکی کە لە کوردستانی ئەوڕۆ و لە نێو ئێمەدا، لە ژن و پیاو و، چکۆلەو گەورەدا. هەیە لە سەر ئەو مێزە ڕاوەستاوم و دەڵێم و داوا دەکەم: کە ئێمە بۆ هێزپێدان و سەرکەوتنی جمهوری کوردستان لە هەڵاویشتنی گیان و دە پێناو دانانی دریغ ناکەین و دریغمان نیە، بە پێی ئەم پایەش پێویست دەزانم کە خائین و خائیم، ڕاست ودرۆزن بە ئەنگۆ و براکانی تر بناسێنم."

سەیفی قازی ئینجا ناوی چەند کەسێ لەوانەی هاوکاری لە گەڵ دوژمن ئەکەن. ئەهێنێ لەوانە: عەلی عەلی یار،

رەحیمی وەستا عەزیز، غەفوری مەحمودیان، حەمزەی عەلی قاوەچی، مەلا رەحمانی سرنجناغی، محەمەدی عەباسی، عەلی نەوزەری، عەبدوڵا بایزئاغا، بایز ئاغا و کاکەڵا ئاغای گەورک، قارەنی ئاغای مامەش، محەمەد فاروقی.(5)

### 1. 3. 2. خیتابەی ئاغای ئانەوازادە

فەرماندەی هێزی مەرکەزی حزبی دیمۆکراتی کوردستان

ئەی قارەمانان و جەنگاوەران!

ئەی رەشیدان و دلێرانی خاکی پاکی کوردستان!

تاریخی ئەورۆکەو هیچ وەخت لە بیر نەچێ. ئەورۆ رۆژێکە لە ئایندەی نیشتمان و میللەتی کورد ئەسەراتێکی زۆر و بێ سابیقەی هەیە. خۆم ئیعتیراف دەکەم لە عوهدەی ستایشی ئەورۆژە نایەمە دەر و باوەڕیش ناکەم کەسیش بێتە دەرێ. چون تەقدیری خودای لایەزال ئەو رۆژەی گەورە و سەربەرز کردوە. ئەورۆ مەنشەئی تەحەولێکی گەورەیە بۆ ئەژادی کورد. بۆچی؟ نیشتمان و تەبیعەت ئەورۆکانێ چاکترین هەدیەی خۆیان پێشکەشی میللەت کردوە یەگانە نابیغە و پێشەوای کوردیمان وە دەرخست تا بە یێکەسی و دەربەدەری و دەرد و زیللەتی کوردەواری خاتیمە بدا و کوردان بو هەزاران موەفەقیەت و سەربەرزی ئامادە بکا.

ئەی خالیقی لایەزال! پێشەوا و رەئیسی جمهوری کوردان موەفەق و پایەدار بکەی، کوردستان جێگای دلێران و لە گیان رابردوانە. کورد بە رەشیدی و بێباکی شوهرەی دونیا بون و رابردوی زۆر رەوشەنی ژیانی ئەو میللەتە قەدیمە وەکو ئەستێرە روناکی چاوی هەموانە.

ئەی لاوان و پێشمەرگانی کورد! ئەنگۆ کوڕی ئەشخاسێکن کە بە مروری زەمان دەنگی شەهامەت و گورەی وان عالەمگیر بوە و یادگاری زۆر روناک لە شەهامەت و عیزەتی نەفس و رەشادەتی وان باقی ماوە. نۆبەی ئەنگۆیە، سینگ وە پێش خەن و بە ئیمانێکی قایم داخلی خزمەتی سەربازی و پێشمەرگەیی بن. بۆچی؟ ئیفتیخاراتی سەربازی لە هەمو ئیفتیخاراتێک مەزنترە. چون سەرفرۆشتن لە رێگای نیشتمان گەورەترین فیداکارییە. بۆیە گەورەگەوران فەرمویانە: قشون روحی مەملەکەتە. مەملەکەت دەبێ ساحێب هێز و قوەت بێ تاکو ئیفتیخاراتی میللی خۆی راگرێ. دەلیلێکی زۆر قایم و نیزیک هۆردوی سورە کە بە هێز و قوەتی خۆی بە دنیای نواند کە هۆردوی سور بە ئیفتیخارترین ئەرتەشی دنیایە. ئەو ئیفتیخارە گەورەیە کە خودا نسیبی مەی کردوە بە جەبونی و کەم دلی لە دەستی نەدەین.

ئەمن فەرد فەردی لاوانی بە جەرگ و هەناوی کورد بۆ مەیدانی رەشادەت و شەجاعەت و ئیفتیخار دەعوەت دەکەم کە لە رێگای نیشتمان و پێشەوای موعەزەم ئیفتیخاری جانبازیمان هەبێ.

لە ئاخری دا بە دڵێکی خاوێن و ئیمانێکی قایم بە میللەتی خۆم پایەدار بونی دەوڵەتی کوردی لە خودای بەرز و بێ هاوتا دەخوازم و بە دەنگێکی بڵیند دەڵێم:

بە سەلامەتی رەئیس جمهوری و پێشەوای مەحبوب هورا!

بۆ بەرزێتی خاکی پاکی نیشتمان هورا!(6)

### 1. 4. سەرانی ئێلەکان

### 1. 4. 1. عومەر خانی شکاک (7)

### 1. 4. 2. زێرۆ بەگی هەرکی

"ئەمن بە نوێنەری لە لایەن هەمو قەبایلی شکاک و هەرکی موبارەکبادی ئەم جێژنە خۆشەویست و مەزنە بە هەمو برا کوردێک بە تایبەتی بە حزوری جەنابی پێشەوا و ئەندامەکانی کومیتەی مەرکەزی و کارگەرانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان عەرز دەکەم و بەڵێنێ دەدەم کە تەواوی نەتەوەی شکاک و هەرکی

ئامادەن بە وێنەی باب و باپیری خۆیان سەروماڵیان لە ڕێی ڕاگرتنی سەربەخۆیی کوردستان بەخت بکەن.

قسێکی دی کە بۆ ڕون بونەوەی بیری هەمو کەس زۆر بە پێویستی دەزانم عـەرز دەکـەم ئەوەیـە: کـە ئاغای حاجی سەید عەبدوڵا ئەفەندی لە پاش شەهریوەری 1320 کـە کـورد دەسـتیان بـە ملـە و موبـارەزەی میللی کرد و ویستیان حەقی مەشروعی خۆیان بستێنن. عیدەیەکی زۆر لەبەر چاوەنۆڕی کە لە ویان هەبو وە دوی کەوتن و دەیان ویست بە پێشـەوایی و پشـتیوانی ئـەو ئاغایـە ڕەهنمـایی بکـرێن. بـەڵا ئـەو زاتـە بـە پێچەوانەی ئینتیزارات و چاوەنۆڕی هەمو کەس لە ساڵی 1321 هەڵستا چوە تاران و بە زدی کوردان دەگەڵ کاربەدەستانی تارانی بە تایبەتی دەگەڵ ستادی ئەرتەشی ئێران خەریکی گفتوگۆ بو وە خەیانەتی بـە کـوردان دەکرد و سەد دەر سەد کاری کوردانی وەپاش خست..."(8)

### 1. 4. 3. ئیبراهیم ئاغای ئەدهەم مەنگوڕ

پاش ئەوەی تەبریکی جێژنی سەربەخۆیی کوردستانی بە حزوری پێشەوای موعەزەم و هـەمو حـازران گەیاند گوتی:

"تەواوی ئێلی مەنگوڕ بە تایبەتی بابوباپیری من بۆ دەفعی دیکتاتۆران و دەرهێنانی نیشتمانی کوردسـتان لە ژێر چەنگی وان هەمیشە دەکێشە و ملە و هەرادا بون. حەمزە ئاغای گەورەی باپیرم کە زۆر بە ئێوبانگـە چـەن جار دەگەڵ بلەوەزەکانی ئێران بە شەڕ هاتوە و مەراکیزی لێ چۆڵ و وێران کردون و بە دەسیسەی ئێرانی‌یان لـە ئاستەنبول 12 ساڵ گیرا پاش بەربون دیسان چەن جار لـە گـەڵ ئێرانی‌یـە موسـتەبیدەکان بـە شـەڕ هـاتوە تـا چارەیان نەما بە فێڵ و فریو حەمزە ئاغایان دەگەڵ کاکە سواری برایم ئاغا گرت و سەریان بڕین.

حەمزە ئاغای براشم دەگەڵ حەسەن ئاغای بایز ئاغا چەن وەختێک بەند کران و سلێمانی ڕەسول ئاغا و عەبدوڵای فەتاحی ئەوانیش بە ئۆرەی خۆیان حەبسی زاڵمەکانیان زۆر دیوە.."

ئیشارەی بە شەڕی مەلا خەلیل کرد. ئەمانەی هەر بۆیە بو کە ئیسپات بکا کە ئێلی مەنگوڕ هەمیشە بۆ ئەجات دانی وەتەنی خۆی لە ژێر دەستی زاڵمان سەعی‌یان کردوە و قوربانی‌یان داوە. پاشان گوتی:

"ئەمەش کە ئەوەی ئەو شێرمەردانەین ئامادەین وە دوای ڕابردوانی خۆمان کەوین و بە خوی چـاک و ڕێوشوێنی چاک دا لە ڕێی نیشتمان دا بمرین."(9)

### 1. 4. 4. محەمەدی فەیزوڵابەگی (10)

### 1. 4. 5. ئەحمەد ئاغای ئێلخانی زادە

"برایانی خۆشەویست!

من یەک ئەفەرم دەتوانم سابیت ڕەوشەنی بکەم کە لـە دەوری دیکتـاتۆری ئێـران دا لـە مـن بێنـەوا و پەرێشانتر کەس نەبو. چونکو ویجدان و میللیەتم ئیجازەی ئەدەدا کە بچـم و بـە وان تەمـەلوق و فروتـەنی بکەم. و گەلێ جار بە خـۆم دەگـوت: خۆزگـا ئـەدەمردم و بـە چـاوی خـۆم دەمـدیت جـارێکی دی تفـەنگ و فیشەکدانم هەڵدەگرت و بە ئەسلەحە دەرازامەوە. و وجودی ئەمنییـەم ئـەدەدیت. ئێسـتا دەبیـنم لـە مـەراحیمی ئیلاهی لە داتی بێگانان برایانی بەهێزی کورد پێ بە عەرزی دا دەدەن و دەرجا لـێ دەدەن و دەنگـی چەکمـەی ئەو لاوە ڕەشیدانەی کورد و برایـانی کـوردی خـۆم مونعـەکیس بـوە و بەتـەواوی دوژمنـانی بەشـەرییەت و دیکتاتۆران دەڵێ: کە لەمەوپاش بە ئەندازەی بەرەی خۆتان پێ ڕاکێشـن و. بـۆ حقـوقی خـەڵکی دەسـدرێژی مەکەن دەنا بەم چەکمانە سەرتان پان دەکەینەوە.

ئێستاش. کە لە حەمدی خوداوە لە سایەی ئازادی. ئەملاک و دارایم زیاد بوە. ئـەوا سـێ دانگـی دێی "عیش ئاوا" ی موڵکی خۆم کە پێم وایە لە ژیانی ماڵ و منـداڵم زیـادە. بـە دەوڵـەتی سـەربەرزی کوردسـتانم

پێشکەش کرد، چونکو لە پێش چاوم گەلی چەتونە کە برایانی خۆم بێ سەواد و نەسیابی خوێندنیان تا مورەتەب بێت و من لە عەیشی کامەرانی دام، نیسان گیانی خۆم وەقفی دەوڵەتی سەربەزی کوردستان کرد کە لە ڕێی نیشتمانی خۆشەویست دا گیانی خۆم بەخت و هەمو هێزی سەرف کەم و بە یارمەتی خودا و هومێدی رەسولی ئەکرەم خوێنی دوژمنانی کوردستان دەگەل مێشکی سەریان بڕێژم و بە نوێنەریی برایانی ئەفسەران ئەوانەو عەرز دەکەم: مەبادا دوژمنانی کوردستان خەیاڵی یەک زەرە تەجاوەز بۆ خاکی کوردستان بکەن دەنا بە یارمەتی خودا لە سنوری خۆیان دا مەحو و نابودیان دەکەین.

بژی کوردستان!

بژی رەئیسی جمهوری کوردستان جەنابی قازی محەمەد!

### 1. 4. 6. محەمەدی قادری مامەش

"ئەی ئاغایانی مەزن

ئەی برا سەپان و تیجار و کاسبە باشەرافەتەکان!

پێویستە ئێوە بزانن وەزعیەتی کوردستانی ئێمە ئیمڕۆ لە هەمو کاتێکی رابردو ئەهمییەتی زیاترە چونکە لە لایەکەوە حکومەتی زاڵمی ئێرانی کەوتۆتە پەلە و دەستەپاچە بوە بە هەر وەسیلەیەکی کە لە دەستی دایە هەوڵ دەدا کە یەکێک لە برایانی ئێمە فریو بدات و بیان خاتە ژێر پەنجەی دێوی ئیستیبدادەوە لە لایەکی تر چەند کەسێ لە پیاوە تێنەگەیشتو و مێشک رزیوەکانی وەکو قەرەنی ئاغای پەسوێ و عەلی ئاغا لەم قەڕنی بیستەمی تەمەددونەدا تەماع و تەکەبور چاوی بەستون و شەرافەت و میللییەتی لە دەست داون. سەهلە لە بۆ ئازادی کورد تێ ناکۆشن بەڵکو چاوەنۆڕی دەرفەتیش دەکەن کە ئێمە دوبارە ئەسیر کەنەوە. ئەنجا ئەی برا کاسبکارەکانی باشەرافەت! ئەی شێربەچانی مێشەی کوردستان! ئیمڕۆ بۆ ئێمە دو شت زۆر لازم و پێویستن: ئەوەڵ فیداکاری و گیانبازی هەموان بۆ کوردستان. دوەم فیداکاری پێشەوای بەرز بۆ هەمو کورد. فیداکاری ئێمە بۆ کوردستان ئەمەیە کە گیان و ماڵی خۆمان بە تەواوی دە ئیختیاری پێشەوای مەزن بنێین بۆ پێداویستی وڵات بەختی بفەرمون و فیداکاری پێشەوای مەزن..."(11)

### 1. 5. بنەماڵە دینییەکان

### 1. 5. 1. حاجی بابە شێخ (12)

### 1. 5. 2. شێخ حەسەنی شەمسی بورهان

"برایانی خۆشەویست، ئاغایانی موحتەرەم!

ئەورۆ رۆژێکی زۆر بەنرخ و قیمەتە. ئەورۆ رۆژێکی یەکجار گەورە و بە حورمەتە. ئەورۆ جێژنێکی پیرۆز و موبارەکە. ئەورۆ ئەو رۆژەیە کە گەلی کورد لەمێژ بو چاوەڕێی هاتنی بو و لەمێژ بو هەوڵی بۆ دەدا و هەزاران پیاوی ناودار و لاوی نازداری خۆی لە سەر بە کوشت دا. سوپاس بۆ خوا کە پاش گەلێک کوێرەوەری و دەربەدەری و ئەسیری و فەقیری و زیللەت و مەینەت بەو ئاواتە پیرۆزە گەیشتین و ئێستا جێژنی ئازادی و سەربەخۆیی دەگرین.

شنەبای ڕەحمەت هات و تەپوتۆمانی نەگبەتی لە سەر ڕەواندین و هەتاوی خۆشبەختی هەڵات و زوقم و سیخواری چارەرشی لە کوردەواری دا تواندەوە. ئەو ڕێبەندانە بۆ ئێمە بەهاری ئازادیە.

براکان! چاو هەڵێنن و ئاڵای موقەدەس و سێرەنگی کوردستان ببینن و چاو و دڵتان رون بێتەوە و رەئیسی جمهوری خۆشەویست ببینن و شوکرانەی خودا بە جێ بهێنن. لە ئەنجام دا جێژنە پیرۆزەتان لێ دەکەم و دەڵێم خۆشەویستەکانم بۆ پاراستنی ئەو ئاڵا موقەدەسەو، بۆ خزمەتی ئەو پێشەوا مەحبوبە بکۆشن."(13)

### 1. 5. 3. سەید عەبدولعەزیز سەید عەبدوڵا گەیلانی

"براکانم گەورە و ئاغایانی کورد!

خانەوادەی نەهری بە گەورە و پچوک و. ژن و پیاو و. کچ و کوریانەوە زۆر بە ئیفتیخارەوە تەبریکی ئەم جێژنە موبارەکە و موقەدەسە ئەوەڵەن تەقدیمی مەقامی عالی ڕەئیس جمهوری موحتەرەم دەکەن کە لە ڕێی ئەم ئازادی‌یەدا هیچ جۆرە قسورێکی نەکردوەو بە هیمەت و عەزم و ڕوحبەرزی و حیکمەت و تەوانای خۆی توانی موکافەحە بکا و ئەم ئازادی‌یەمان بۆ وەگیر بخات.

وە دوەم جێژنە پیرۆزە لە هەمو برا کوردێک دەکەن کە ئەوانیش لە ڕێی ئەم ئازادی‌یەدا نەبەزیون و موقابیل بەو سەدەمات و نەکەباتەی زەمان کە بە نیسبەت کورد هەمیشە عەکسی بوە و هەمیشە هێز و پەنجەی ئیستیعمار و جەهالەت لە کوردستان دا سەرکەوتو بوە بە عەزم و سەبات وەکو پۆڵا ڕاوەستاون و هەر نەبەزیون و هەر وەکو تاریخ بۆمان ئیسپات دەکا کە کورد لە هەموو فرسەتێک دا محاوەلەی ئازادی وەرگرتنیان کردوە بەڵام لەبەر ئەوەی پەنجەی ئیستیعمار هەمیشە لەسەر کورد غالب بوە و بە ئەنواعی وەسائیلی وەحشی‌یانەو بە ناوی دین و دنیا حەرەکاتی ئازادی‌یان کوژاندۆتەوە کە کورد نەیتوانیوە ئازادی خۆی بستێنێ. بەڵام لە نەتیجەی ئەو هەمو کیفاح و سەعی و هەوڵدانەی کورد دەوڵەتی شورەوی کە پشتیوانی میللەتانی بێ کەسە لەسەر حەقی میللەتی بێچارەی کورد بە جواب هات و مەجالی نەدا ئەمجارەش ئیستیعمار سەری پان کاتەوە ئازادی پێ بەخشین و دەبێ بشزانین کە ئەوەش لە نەتیجەی سەعی و هەوڵدانی ڕەهبەری موحتەرەم ڕەئیس جمهور حەزرەتی قازی محەمەد بو کە شەو و ڕۆژی خۆی لەو ڕێیەدا سەرف دەکرد و مەعنای ئیسراحەتی نەدەزانی کە توانی بە هۆی سەعی و محاوەلات و نەبەزینی خۆی میللەتی کورد بە دەوڵەتی شورەوی بناسێ و داوای ئازاد بونی کورد بکا.

ئەی برا کوردەکانم بزانن شوهەدای خانەوادەی نەهری کە لە ڕێی ئەم ئازادی‌یەدا خوێنی خۆیان ڕشتوە و شەهید کراون و سەفحەی تاریخی خۆیان بە ئاوی زێڕین نوسیوە ئێستەکە لە ئێمە مانان شادترو مەسرورترن و ئێستەکە جێژنی ئەوانە. بەڵێ جێژنی ئەوانە چونکە زانی‌یان کە خوێنی ئەوان بە خۆڕایی نەڕۆیوە و نەتەوەی ئەوان بەو ئازادی‌یە موقەدەسە شاد بون ئەوەش بزانن کە ئێستاکە ڕوحی پاکی ئەو شەهیدانە لێرەدا حازرن و بە یەکدەنگ جێژنە پیرۆزە لە هەمو برا کوردێک دەکەن و تەواوی ئەفرادی خانەوادەی نەهری بە گەورە و بچوکیانەوە بە ڕویەکی زۆر سپی و موفتەخیرانەوە ڕجا و تکا لە هەمو کوردێک دەکەن کە بۆ خاتری خودای: مازی و عەنعەناتی کۆن و ئاکاری سەخیفانەی ئیقتاعی و ئیستیعماری لە بیر بکەن. تەوائیفولملوکی و دوژمنایەتی و مەنافیعی مادی و مەعنەوی شەخسی تازە مەکەنەوە. گەورەیی و بچوکیی و ئاغایی و گەدایی لە ناو خۆتان هەڵگرن. هەر وەکو برا دەست دەنە دەست یەک و بخوێنن و موتەحیدو یەکدڵ و جانفیدا بن بۆ ئەوەی ئەو ئازادی‌یەی کە لە پاش سەعی و کیفاحی هەزاران ساڵ بە دەستمان کەوتوە لە دەستی نەدەین و بەرقەرار و بەهێزتری بکەین.

براکانم دەزانن کە زۆر برای دیمان هەن ئێستاکەش لە ژێر زنجیری ئیستیعمار و ئیستبداد و ئەسارەت دەناڵێنن و بە چاوێکی زۆر برسی‌یەوە چاوەڕێی هیمەت و پیاوەتی ئێوە دەکەن؟ لە بەر ئەوە نابێ هیچ کوردێکی بە شەرەف بەم ئازادی‌یە کەمە ڕازی بێ بەڵکو فەرزە و پێویستیشە لەسەر هەمو کوردێک مازی و ڕابوردوی ڕەشی لە بیر کا و بە هۆی عەزم و برایەتی و هێزو هیمەتی خۆیان لە ژێر ڕیاسەت و سەرپەرشتی ڕەئیسی جمهورمان قازی محەمەد ئامادە بین ئەو برا کوردە ئەسیرانەی دیمان کە حاڵی حازر ژێر زنجیری ئیستیعمار و ئەسارەت دا دەناڵێنن دەربێنین و خوێنی خۆمان لەو ڕێگایەدا بڕێژین و بە خۆمان نەڵێین ئازادین تاوەکو کوردستانی گەورە بە تیشکی ئازادی ڕوناک دەکەینەوە.

ئێمەش هەر فەرێک لە خانەوادەی نەهری حازر و ئامادەین بە ڕوح و گیان و سەرو ماڵمان و بە ڕوحێکی زۆر پڕ ئیخلاسەوە لەو ڕێیەدا خزمەت و فیداکاری بکەین.

لە دوایەدا لە خوای عەزەوەجەل دەپارێینەوە کە خوا بە گەورەیی و عەزەمەتی خۆی عومری رەهبەرو رەئیس جمهورمان قازی محەمەد درێژو پایەدار کا کە بتوانێ ئەو ریسالە موقەدەسە گەورەیە کە دەستی پێ کردوە تەواو و بەرقەرار کا و کوردستانی گەورە ئازاد کا. وە بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکەین و دەڵێین:

هەر بژی رەهبەرمان رەئیس جمهوری کورد قازی محەمەدو

هەر بژی کورد و کوردستانی گەورەو

هەر بژی جەنرالیسموس ستالین رەهبەرو پێشەوای ئازادی گێتی!"(14)

## 1. 6. وتاری حیزبی‌یەکان

### 1. 6. 1. سەید محەمەد تەهازادە

"بسم الله الرحمن الرحيم

ئاغایانی موحتەرەم برایانی خۆشەویست

ئەورۆکە رۆژێکی زۆر موبارەکە. رۆژێکی تاریخی‌یە. تا ئەورۆکە دایکی نیشتمانی کوردستان وای بە خۆیەوە نەدیوە کە کورەکورەکانی بە شادی و کەیف خۆشی لە دەورو بەری دا کۆبونەوە و لە هاتوچۆدان بە قاە قاە پێ دەکەنین داوەتیانە و هەوری نەگبەت و چارەرەشی بەدوکی قەڵەمی روناک فیکران بە زۆری باسکی لاوە بەغیرەتەکان زنجیری دیلی و بەدبەختی‌یان لە ئەستۆی دارنیوە و چاوی بە فرمێسکی بە دەسرەی خۆشەویستی دەسترنەوە رۆڵە دەنگ خۆشەکانی وردەبرینی خوێ پێ وەرکراوی دەرمان دەکەن... قیمەت و بەرز بیندراو. دەبێ قەدری بزانین و بۆ بەرقەراری راوەستانی دەستەو دوعا رو بە قیبلە راوەستین و بە دەنگێکی بەرز لە خودای بێ هاوتا تەمەنا بکەین ئەو رۆژەمان لێ پیرۆز کا و تا زەمان بەروبو درێژ بۆمان راوەستاو و بەرقەرار بکا - ئامین.

... بیکیش دەمەوێ موختەسەرێک لە زەمانی چارەرەشی و بەدبەختی دایکی نیشتمان کە کوردستانە کە بە سەر گەنجە ئازا و خوێنگەرمەکانی هاتوە بەیان بکەم.

ساڵەهای ساڵە پەنجەی ئیستیبداد و دیکتاتۆری گەروی دایک و بابی ئێمەی رێک دەگوشی. روچنە روناکی ئێمەی بە پەردەی زوڵم داپۆشی، دەستی مەرداەگی و ئیتیحادی ئێمەی بە زنجیر دەبەست و رێگای جادەی سەرکەوتنی ئێمەیان بەو دەرنە دەبرد چاڵاوی دوبەرەکی و نیفاقیان لەسەر ئێمە هەڵ دەقەند. چاوی تیژبینی ئێمەیان رەشایی پەردەی زوڵمەتی نادانی دایان دەپۆشی رێگای نەجات و تەرەقی‌یان لێ ون دەکردین و توشی هەزار ئەشکەوتی تاریک و چاڵاوی بێ بن و مەوجی دەریای بەدبەختی و چارەرەشی‌یان دەکردین هەرچی حەول دەدرا رێگای نەجات غەیرە مومکین بو وەکو عەرزو دەکەم بەو هەمو دەردی سەری و بەدبەختی دوبارە خوێنی گەرم و چاک لە رەگی کوردەواری دا بە جوشبوش دەهات کەمەری مەرداەگی‌یان دەبەست و رۆڵە رەشیدەکانی میللەت دە تەقەلا دەکەوتن و دەستیان دەکرد ئەهزەت زۆر بەهێز و تا دوامین هەناسەی ژیانیان پایەداری‌یان دەکرد.

وەکو ئەهزەتی شێخ عوبەیدوڵا کە لاپەڕە بەرزەکانی مێژو شاهیدی فیداکاری و جانبازی وین کە تا ئاخر هەناسەی ژیانی عومری خۆی بە هەمەر رانەبوارد شوهەدای کوردی شیمال بە خوێنی خۆیان خاکی کوردەواری‌یان رەنگاندوە قیامی شێخ سەعید کە لە رێی ئازادی میللەت و خاک و خۆڵی کوردستان دا گەردنی خۆی تەسلیمی تەنافی کەمالی بێ کەمال کرد. یا خیر شێخ عەبدولقادری شەمزینی تا ئاخر نەفەسی پایەداری کرد و تا دەرەجەیەکی حازر بە فیدای رێ بو وەکو حەزرەتی ئیبراهیم بە ئەمری خودای تەعالا کوری خۆی حەزرەتی ئیسماعیلی حازر کرد بۆ قوربانی لە رێی خودای خۆی دا ئەویش لە پێش هەمو کەس دا رەوشی ئەو زاتە موقەدەسەی کردە سەرمەشق بۆ میللەتی بە شەهامەتی کورد. حازر بو لە رێی ئازادی و سەربەستی میللەت دا کوری خۆی سەید محەمەد ئەفەندی

کرد بە قوربانی و بە ڕشتەی تەنافی بێ مروەتی کەمالی بێ کەمال لە تەناف درا. وەکو ئێلی جەلالی تەواوی پیاوە گەورەکانی خۆیان فیدای میللەت کرد و منداڵە چوکەکان و بێ دەسەڵاتەکانیان دەربەدەر و تەفرەقە بون بۆ وڵاتی بێگانە. ئیسماعیل ئاغای سمکۆ قەهرەمانی ڕەشید و بە ناوبانگی میللەتی کورد بە فێڵ و فریو بە دەستی دەوڵەتی ئیستیبدادی ئێران لە بەین چو. دەستە گوڵی 6 ی ئەیلول کە لەو ڕۆژەدا چەند منداڵ و لاوی بێ گوناه دەوڵەتی موستەبیدی عێراق وەبەر موسەلسەل و دەستڕێژی تفەنگ دران.

هەزارەها وێنەی خوێنڕێژ و زوڵم و زۆر و تەفرەقە و بڵاوکردنەوەی میللەتی کورد هەیە کە زمان لە گوتن و قەڵەم لە نوسینی قاسرە کە شەرحی بدەم وەلێ لە بەرابەری ئەو هەمو زوڵم و دەربەسەری و بەدبەختی و چارەڕەشییە دا خودای بێ هاوتا ڕەحمی کرد ئەستێرەی ئیقبالی میللەتی کورد لە گۆشەی ئاسمانی کوردستان دا تلوعی کرد تەپڵی بەشارەت ئاوازەی بڵند کردوە و مزگێنی ئازادی بە گوێی تەواوی کورد و کوردەواری دەدا.

شتێکی دی هەیە کە دەبێ بۆ هەوەڵ جار بە خەتی زێڕین لە سەفحەی مێژودا بنوسرێ کە مەرامی ڕەهبەر و کارگەرەکانی حیزبی دیمۆکرات ئەوە بو کە ئازادی بە بێ خوێنڕێژی نسیبی میللەتی کورد بێ و دۆست یا بەرهەڵستەکانی حیزب بە چاوی برایەتی و یەکەتی تەماشا کراوە."(15)

### 1. 6. 2. شیعری هەژار

سەد بەهار نۆکەری ئەو زستانە
نیشتمان ئەوڕۆ کوڕانت جێژنی ئازادی دەکەن
بونەوە خێوی وەڵات تالانکراو ڕوت و ڕەبەن
شیرنی خۆی گرتە نێو ئامێز و باوەش کوهکەن
ڕوتەنی کوێستانی کوردان بوە بژوێن و زەمەن
گەرچی ڕێبەندانە ئێستێ پڕ گوڵ و بونە چەمەن
بۆتە جەنناتی عەدەن. چاو و بەدەن. دار و دەوەن
سەد بەهار نۆکەری ئەو زستانە
جێژنی ئازادی کوردستانە
خوێنی کوردانی شیمال و ئەشکی چاوی دایکەکان
شینی خوشکانی وەتەن بۆ لاوەکانی ئەوجەوان
چونە داد بۆ لای خودا. دەریای تەرەحوم هاتە جۆش
لاگریکی بۆ مە مەعلوم کرد ئەبەرد و قارەمان
یوسف ئەستالین کە ئەوڕۆ.....
نێوی هۆردوی سور بڵێن دەرژێ زراوی زاڵمان
تۆ لە لات وایە چیە هۆردوی سور
سوری چی؟ کاکە بڵێن کۆگای نور
.... گەلی لاواز لە گێتی نێو برا
تا ڕێگای کوردستانی دیت و لێی هەڵکرد چرا
مستی خۆی کردە گرێ خوێنمژانی مورتەجیع
حەق وە سەر ناحەق کەوت لەو نێوە حەقی کورد درا

جێژنی ئیستقلالتان پیرۆز بێ ئەی لاوانی پاک
دوژمنو یاخوا لە خوێنی خۆی بگەوزێنێ کەلاک
زو هەمو کوردان لە ژێر زنجیری دیلی بێننە دەر
پێکەوە هەوڵێ بدەن بۆ ئاوەدانی ئاو و خاک
من "هەژار"ێکم لە دەستم دا نیە غەیری دوعا
ئەی رەئیسی جمهوری کوردان هەر بژی بۆ کاری چاک
تا هەیە چەرخ و خولی تۆپی زەمین
بژی هۆردوی قزل و ئیستالین(16)

**1. 6. 3. شیعری هێمن**

نەوجەوانانی ژیر و وریای کورد
پیرەپیاوانی پیاوو ئازای کورد
بێچوە شێرانی چابک و بێباک
تازە لاوانی میللی و خوێنپاک
نەونەمامانی باغچەی ئاوات
کاربەدەستانی حیزبی دیمۆکرات
ئەی ئەوانەی کە چاو بەگریان بون
دڵ و داماو کز و پەرێشان بون
بۆ وەتەن رۆژ و شەو دەگریان زار
دیتو لەو رێیەدا هەزار ئازار
بەشبراو بون لە خۆشی و شادی
دەرکراو بون لە باغی ئازادی
موژدە بێ لێو کە پاش گەلێک زەحمەت
پاشی زۆر رەنج و تاڵی و مەینەت
پاشی تالان و جەنگ و دەربەدەری
پاشی کوشتار و شین و قورەوسەری
پاشی وەی سەد مەزن، هەزار سەردار
لەسەر ئازادی رۆیینە سەردار
پاشی وەی سەد هەزار کوری لاوچاک
دەستی دوژمنان: لە خوێن و خاک
گەوز بو دایکی بۆی لە سینگی دا
بەزەیی هات بە حاڵی ئێمە خودا
یاریدەی داین و کردیە مەنمور
بۆ نەجاتدانی کوردی هۆردوی سور
میللەتی کوردی پێکەسی رزگار

کرد، لە ژێر چەنگی دوژمنی زۆردار
کوردەواری بە جارێ ئازاد بو
کوردی غەمگین بە کەیف و شاد بو
ئاشکرا هەڵکراوە بەیرەقی کورد
هاتە دەستی لاوی کورد حەقی کورد
تێ پەڕی ڕۆژی ڕەش نەما دەمی خەم
ڕۆژی کورد هاتەدەر لە ژێر مژو تەم
بۆ مە ئەو ساڵە کە چلەی زستان
خۆشترە زۆر لە مانگی جۆزەردان
گەرچی ئێستا نەماوە گوڵ لە چەمەن
وەک گوڵە ڕومەتی کورانی وەتەن
ئێستەکانە تەواوی میللەتی کورد
کچ و کوڕ پیاو و ژن درشت و ورد
بێ خەم و لێو بەخەندە و شادن
بۆچی چونکو ئەوێستە ئازادن
ئەی برایانی میللی و دڵسۆز
ڕۆژتان باش و جێژنەتان پیرۆز
ئەوی ئاواتی ئێوە بو دیتو
نیشتمان سەربەخۆ و ئازاد بو
بەیرەقی جوانی ئێمەیە ئێستا
دەیشەکێنێ لە هەر بڵێندییەک با
کاری خۆمان بە دەستی خۆمانە
ئێستە با کوێر بێ چاوی بێگانە
تا هەزار سالی دیکە ئیستالین
هەر بژی یا ڕەبی: بڵێن ئامین
چونکە دەربەست حەقی زەعیفانە
لاگری دیل و بێنەوایانە
بۆ ئەوەی بێ کەسان بکا مەسرور
پایەدار بێ و بمێنێ هوردوی سور
پێشەوامان بژی لە بۆ خزمەت
کردنی، دین و مەزهەب و میللەت
ڕەبی هەر کەس کە دوژمنی کورد بێ
هەردو چاوی دەرێ و ملی ورد بێ
بمرە "هێمن" کە تۆ لە سەر زیادی
مایەوە، چونکو دیتت ئازادی(17)

**1. 6. 4. محەمەد ئەمینی موعینی**

"بە ئیفتیخار و سەربڵیندی دەزانم دەو رۆژە موبارەکەدا کە جێژنی سەربەخۆیی کوردستانەو بە پشتیوانی خودا و پێشەوای کوردستان دوژمنانی داخلی کە هەتا ئەورۆ شەریکی دز و رەفیقی قافلە بون بۆتان بەیان کەم:

یەکێک لەوانە قەرەنی ئاغای مامەشە. دەوڵەتی ئێران هەرچەند جار تەلگرافی دەکرد بە لەقەبی شەریفی ئێو دەبرد و ئەو ئێوەش مەعنای وابوە کە ئەتۆ دەبێ وەتەن و میللەتی خۆت کە کوردە مەحوی کەیەوەو بیفرۆشی. ئەو شەخسە شەریفە خائینە کە بە زمانی دەوڵەتی ئێرانی بو بە حکومەتی دەوڵەتی ئێرانی لە مەهاباد دەست بە عەمەلیاتی وەتەنفرۆشی و میللەتفرۆشی کرد هەروەها دەگەڵ کە بو بە حکومەت لە مەهاباد رونیشت ئەوەڵ کارێکی کە کردی 30 نەفەری سوار ناردە ماڵە رەسولی یاهوی پولێکی زۆری بە ناحەق لێ ئەستاندو بۆ خۆشی حەبسی بو جیا لەوە چەند نەفەر ئازادیخواە بون کە بە ئەمری تەورێز و دەستوری رەزائیەی کە پێی گەیی بو خەیاڵو عەزمی خۆی جەزم کرد بو کە ئەو ئازادیخواهانە بگرێ و تەحویل بە دەوڵەتی دیکتاتۆری ئێرانی بدا. ئەوانە محەمەدی مەولودی و سەید محەمەدی سەیدی و چەند نەفەری دیکە بون. بۆ بەجێهێنانی ئەو کارە 100 نەفەری وە کوچە و خیابانان خست. ئەمما چونکە خودای تەعالا ئەی ویست کورد زەلیلی دەستی ئەو دیکتاتۆرانە بێ دەستێکی غەیبی دە نێوی دا بو بە لەمپەری قەرەنی ئاغای مامەش لەقەب شەریف ئەلحەمدولیلا بە ئاواتی خۆی نەگەیشت و بە تایبەتی مام عەزیزی ئەمیرعەشایەری کوڕی قەرەنی ئاغای مامەش دەو ئاکارانەدا چی وا لە بابی کەمتر نەبو. هاورێیەکانی ئەو نیشتمانفرۆشانە کە لەوانە یەکیان عەلی خانی ئەوزەری، دوەم بایزی عەزیز ئاغای گەورک، سێیەمی عەبدوڵا ئاغای مەنگوڕ.

یەکێکی دیکە لە خائینە گەورەکان عەلی یارە کە ئەمیر ئەسعەدی پێ دەڵێن سەهلە ئەو خائینە کە کورد وێستا نیوێکی وایان ئەبو کە خائینەتی دەکرد ئەلعانیش کە حکومەتی کوردی ئەلحەمدولیلابەرقەرارە و زۆر ساحیب قودرەتیشە ئەو خائینە حالی حازر لە تارانی دەگەڵ ستادی لەشکر کە سەرتیپ ئەرفەعە لە تێکدانی بناغەی حکومەتی کورد ڕاناوەستێ. ئەو ئاغایە سی ساڵ لەوەی پێش کە بو بە فەرمانداری مەهابادی ئەمری کرد ئەهلی مەهابادی هەموی ژنە ژنیش نابێ ئەسلەحەی پێ بێ. لە سایەی خودای بێ هاوتا بناغە و دامەزراندنی حکومەتی کوردی دیمۆکرات مەهابادی دانرا. پێویستە ئەو خائینە بی خۆی دە تەویلەی ئەو مەهابادییانە کە پێی دەگوتن ژنن بهاوێژێ، ئەو وەختە ئەوان بۆ خۆیان دەزانن عەفوی دەکەن یان ناو خۆ دە تەویلە هاویشتنی ئەو خاینە حەتمییە و یەکێ لە هاودەستانی عەلی یار، ئاغای رەحمەتی شافیعییە کە لە کۆمەک و یاریدەی ئەو خائینە ڕانەوەستاوە. یەکی دیش لەوانە کاکەڵا ئاغای گەورک سەهلە لە سەقزی و مەهاباد ڕانەدەوەستا حەملەی دەبرد بۆ رەزائیە و تەورێز و سنە و کرماشان.

ئەمن لەو تاریخەوە لەلایەن حیزبی حکومەتی دیمۆکراتی کوردستان بۆ ئامۆژگاری و ئاگاداربونی ئەوخائینانە هەتا 15 ڕۆژی دیکە ئیبلاغ دەکەم خۆیان بە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بناسێنن بەڵکو لە سوچ و تاوانی ئەوان چاو بپۆشن.

زیاتر لەوە دەڵێم: بژی کورد و کوردستان!

بژی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان!"(18)

## 1. 7. ئافرەتان

### 1. 7. 1. یای ویلمەی سەیادیان

مودیرەی مەدرەسەی پەروانەی کچانی مەهاباد

"لە دنیای موتەمەدین و زانست دا. هەر میللەت و نەتەوەیەک، هەر تایفە و قەوم و تیرە و بەرەیەک، بە زمانی خۆی کە دایک لەسەر پشتی لانک حەرفێک و دو حەرف خستویەتیە لێویان و دەگەڵ شیر دە زاری کردون خوێندویانە و دەخوێنن، نوسیویانە و دەنوسن. لە چوار سنور و وڵاتانی خۆیان دا بە ئازادی ژیاون و دەژین. بەڵام داخەکەم میللەتی کورد، ئەو میللەتەی کە تاریخ ئیفتیخار و شانازی شەش هەزارساڵی ڕانی لە بیرە و لەبەر ئەهمییەت و گەورەی لەسەر دڵی کتیبانی داناوە، ئەو میللەتەی لەگەڵ هەمو بەرهەڵستێک، لەگەڵ هەر کەسێک کە پەلاماری نیشتمانی وانی دابێ بەربەرەکانیيان کردوە بست بە بست بە خوێنی خۆیان ڕایان گرتوە، مودەیەکی زۆر گرفتاری چنگاڵی ڕەش و برش و پیسی ئیستیبداد دیکتاتۆری بون. زمان و عادات و ئادابی میللی ئێمە قەدەغە کرابو. لە ترسی ئەوەی مەقامی دیکتاتۆری و قازانجی ئیستیعماری خۆیان نەکەوێتە قولە، ئێمەیان لە تەرەقی و زانست و سەرکەوتن دەگێڕاوە و نەیان دەهێشت دنیا لە ئیستیعداد و لیاقەتی ئێمە: میللەتی کورد حاڵی بێن. تا لەم شەڕە گەورەیەدا کە پەری عەدالەت و ئازادی بە سەر مۆتە و دێوی فاشیست و دیکتاتۆری غالب بو. بە فەرمانی یەکە پیاوی مەیدانی عەدالەت و بەشەر دۆستی ژەنەرالیسموس ستالین ئێمەش لە زیندانی دیلی هاتینە دەرێ و ڕیگامان بۆ کراوە. لە ژێر ئامۆژگاری حەکیمانە و شارەزایی کردنی پیاوانەی پێشەوای موعەزەمی کوردستان جەنابی قازی محەمەد دا زمان و دین و عەدالەت و ئادابی میللی ئێمە ئازاد بو. ئیستیعدادی میللی و لیاقەتی حەقی ژیانی خۆمان بە موستەقیللی و سەربەخۆیی بە دنیا نیشان دا. دەستی بە هێزی ئەو پێشەوا مەزن و گەورەیە ئەوەتا باسکی ئێمە. میللەتی کوردی کە تا چوار ساڵ لەوە پێش دیل و بەخسیر بوین، گرتوە و زۆرخێرا لە هەمو کەندو کولۆ و هەورازێک وە سەری خستوین و ئەوا لە ژێر باڵی پیرۆزی وی بە شاهیدی سەعادەت و خۆشبەختیمان دە باوەش گرتوە. ئێمە مامۆستا و قوتابییەکانی مەدرەسەی کچان موبارەکبادی ئەو موەفەقیەتە گەورە بە دەرماڵی پێشەوا موعەزەم عەرز دەکەین و تەمەننای قبوڵمان هەیە و هەمومان وێکڕا بە دڵێک و زارێک دەڵێین:

بژی پێشەوای مەزنی کوردستانی گەورە!"(19)

### 1. 7. 2. یای خەدیجەی حەیدەری

"... مەشغولی فەعالیەت بون و خودای تەبارەک و تەعالا موەفەقی کردن و دڵی ئەشکاندن. ئەلئان ئەی خوشکە خۆشەویستەکان با ئێمەش چاو لە برا خۆشەویستەکانمان بکەین دەستی ئیتیحاد بۆ یەکتری درێژ بکەین. چون دەبینم دایکی نیشتمان چاوەڕێی کچەکانی خۆیەتی کە دەس بە فەعالیەت و خوێندن بکەین بەڵکو تا ئێمە بگەینە برا خۆشەویستەکانی خۆمان لە بەر ئەوەی دنیای ئەوڕۆ موحتاجی کچ و کورە کە بە خوشکو برایەتی دەست بدەینە دەستی یەک بۆ ڕزگار کردنی دایکی نیشتمان.

ئەمن لە تەرەف تەواوی کچ و خوشکەکانی کوردستانی مەزن پیرۆزی ئەو ڕۆژە موقەدەسە تەقدیمی هەیئەتی دەوڵەت دەکەم. وە لە ئاخری دا تەمەننا دەکەم ئێوەش لە گەڵ من هەمسەدا بن و بڵێن: بژی پێشەوای بەرزی کوردستان جەنابی قازی محەمەد!

بژی قارەمانانی کورد! "(20)

## 1. 8. قسەکان و قسەکەرەکان

وەکو لە ناوی قسەکەرەکان دا دەرئەکەوێ پێکهاتنی خێڵەکی سیاسی - کۆمەڵایەتی کۆمەڵی کوردەواری تا ئەندازەیەکی زۆر لێک دراوەتەوە. نفوزی مەلا و شێخەکان و. کار و دەسەڵاتی سەرانی ئێلەکان و. ناوبانگی بنەماڵە ناسراوەکانی مەهاباد لە بەر چاو گیراوە.

مەلا حسێنی مەجدی، حاجی بابەشێخی سیادەت، شێخ حەسەنی شەمسی بورهان، سەید عەبدولعەزیزی سەید عەبدوڵای گەیلانی (شەمزینی) و. سەید محەمەدی تەهازادە، وەکو کەسانی ناوداری دینیی و بنەماڵە دینی‌یە ناسراو و دەسەڵاتدارەکانی موکریان.

عومەر خانی شکاک، زێرۆ بەگی هەرکی، ئیبراهیم ئەدهەم ئاغای مەنگوڕ، محەمەد فەیزوڵابەگی، محەمەدی قادری مامەش، ئەحمەد ئاغای ئێلخانی زادەی دێبوکری و. محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی، وەکو گەورەپیاوی ئێلە گەورە ناسراوەکانی مەڵبەندی حکومەتی کوردستان.

هێمن و هەژار وەکو دو ڕوی ئەدەبی و ڕۆشنبیری ناسراوی کوردستانی ئێران.

محەمەد ئەمین موعینی، محەمەدی نانەوازادە و. غەنی خوسرەوی، وەکو کوڕانی بنەماڵە ناسراوەکانی مەهاباد.

یای ویلمە و یای خەدیجە وەکو ڕوی خوێندەواری ئافرەتی کورد.

وتاردانی ئەمانە لە سەر سەکۆی ڕاگەیاندنی حکومەتی کوردستان لە مەیدانی چوارچرای مەهابادا لە ئاهەنگەکانی 2 ی ڕێبەندان دا، هەر بۆ دەربڕینی خۆشی نەبو، بەڵکو مەعنای تایبەتی خۆیان هەبوە.

ناوەڕۆکی وتارەکان لە دەوری چەند بابەتێکی دیاری کراو ئەخولانەوە: باسی سەروەری‌یەکانی ڕابوردوی گەلی کورد و. هێرش کردن بۆ سەر ڕیژێمی دیکتاتۆری ڕەزاخان و. ستایشی سەردەمی ئازادی و. پێشەوا و. دەربڕینی دڵسۆزیی و گوێڕایەڵی. ستایشی ستالین و ئۆردوی سور و یەکێتی سۆڤیەت و. دوعای سەرکەوتنی. ئەمانە باسە سەرەکی‌یەکانی هەمو "نوتق" و"خیتابەکان" بەڵکو هی شیعرەکانی هەژار و هێمنیش بون.

لە کۆبونەوەکانی 2 ی ڕێبەندان دا، چەند کەسێ لە قسەکەرەکان لەوانە: محەمەد حسێن خان، وەزیری هێزی دیمۆکرات. محەمەد ئەمین موعینی، وەزیری کیشوەر. محەمەدی قادری مامەش. لە بەردەمی دەیان هەزار کەسی بەشداری خۆپیشاندانەکەدا، بە توندی هێرشیان کردە سەرچەند کەسێکی ناسراوی کورد سەبارەت بەوەی هاوکاری‌یان لە گەڵ حیزبی دیمۆکرات و. حکومەتە تازەکەی نەکرد بو. لە مانەش سەیرتر ئەوەبو، زێرۆ بەگی هەرکی لە قسەکانی دا هێرشی کردە سەر سەید عەبدوڵا گەیلانی (شەمزینی) لە کاتێک دا خۆی لەو کۆبونەوانەدا، لەگەڵ قازی محەمەد بەشداری ئاهەنگی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان و. ماوەیەک لەوە پێش بەشداری هەوەڵ کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبی دیمۆکرات بو. سەرەڕای ئەوەش سەید عەزیزی کوڕی، ئەفسەری پێشوی ناو جەیشی عێراق. یەکێ بو لە ئەندامە ناسراوەکانی کۆمەڵەی هیوا و. یەکێ بو لە هاوکارەکانی مەلا مستەفای بارزانی. قسەکانی زێرۆ بەگ لەو کات و ڕۆژەدا لەوانە بو کۆبونەوەکان بشێوێنێ. سەید عەزیز لە سەر باوکی هەڵی دایە. قازی محەمەدیش لە سەر سەید عەبدوڵای کردوە. گرژی ناو خۆپیشاندانەکە خاوبوەوە.(21) پاش ماوەیەک هەمان وتار لە ڕۆژنامەی کوردستان دا بڵاوکرایەوە. دیارە ئەمە بە "ئەنقەست" و. بە هەڵوێستی سیاسی ئەژمێردرا بۆ کەم کردنەوە لە پایەی سەید عەبدوڵا، چونکە وەکو ئەڵێن، ئەو یەکێ بو لەوانەی ئەیان توانی لە گەڵ قازی محەمەد ململانێی نفوز و دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی بکا.

## نەخشەی ٧: کوردەکانی ئێران

(3) The Kurds in Iran

Tribes
International boundaries
Main motor roads
0 20 40 60 80
Miles

U. S. S. R.
TURKEY
IRAQ
Qarajadagh Azeri Tribe
Shahsevan Azeri Tribe
Moqaddam Azeri Tribe
Shaqaqi Tribe
Afshar Azeri Tribe
KHAMSEH
KORDESTAN
HAMADAN
KERMANSHAH

سەرچاوە: حسن ارفع سەرچاوەی ناوبراو

نەخشەی ٨: کوردەکانی تورکیا




سەرچاوە: حسن ارفع سەرچاوەی ئاوێزراو

## نەخشەی ٩: کوردەکانی عێراق




(4) The Kurds in Iraq

سەرچاوە: حسن ارفع، سەرچاوەی ناوبراو

## 2. بڕیاری کۆبونەوەی 2 ی ڕێبەندان

کۆبونەوەی 2 ی ڕێبەندان هەر بۆ شایی کرنن و، نەربرینی خۆشیی و، خوێندنەوەی سرودی میللی و، شیعری نەتەوەیی دڵرفێن و، وتاری سیاسی بزوێنەری هەستی نەرون... نەبو، بەڵکو بۆ ڕاگەیاندنی بڕیارێکی مێژویی بو، کە پێشتر سەرکردایەتی حیزبی دیمۆکرات و پێشەواکەی، پاش ڕاوێژ و پرس کردن بە کاربەدەستانی سۆڤیەتی و، ژمارەیەکی زۆر لە گەورەپیاوەکانی کورد، دابویان ئەویش: دامەزراندنی حکومەتی کوردستان بو.

ڕۆژنامەی کوردستان، لە ڕیپۆرتاجێکی تایبەتی دا، باسی کۆبونەوەکە و بڕیارەکانی بەمجۆرە بڵاوکردۆتەوە:

"قەرارێک کە لە 2 ی ڕێبەندانی ساڵی 1324 دا لە لایەن 20 هەزار نەفەر نومایندانی تەواوی تەبەقاتی ئەهالی کوردستانی شیمال لە میتینگی شاری مەهابادی دا قوبوڵ کراوە

ئە ڕابردوی نەتەوەی کوردیش دا وەک سایری نەتەوەکانی دیکەی دونیایە پادشایی و حاکمییەت و ئوسول و ئیدارە و مەدەنییەت و عادات بوە، بەڵام لە بەر فێڵ و تەڵەکەی دەوڵەتانی مورتەجیع لەت لەت بوە و کراوەتە عەبد و دیل. وە نەبێ هەر لە حاکمێتی بەڵکو لە تەواوی ئیختیاراتی میللی بێ بەش کرا بون.

چەند عەسرە کە کورد گرانایی و ئەزییەتی غەیرە قابیلی تەسەوری ئەسارەتیان لەسەر خۆیان درک کردوە بە تایبەتی لە پاش هاتنە سەرتەختی ڕەزاشای خوێنخۆری مورتەجیع کوردەکان بە گرانایی ئەسارەتی زیاتر دوچار بون و ئەو موستەبیدە لە لایەن هیتلەری مەخبەتەوە کوردی لە هەمو حقوقی میللی خۆی مەحروم کرد و هێندێک لە عەشایەری کوردی بە تەواوی لە ڕیشە دەرهێنا و لە نیشتمانی خۆیانی وە دورخستن و فارسانی مورتەجیع بە خانمان و دین و منداڵانی کورد جنێوی غەیرە قابیلی شەرحیان دەدا و، کوردان نەک هەر خوێندن بەڵکو قسەکردن و دوانیش بە زمانی دایکی خۆیان قەدەغە کرا بو.

کوردەکانی تورکییەش خسوسەن پاش هاتنە سەکاری مستەفا کەمال پاشای هەروا بون ئەو درندەیە بۆ بێدەنگ کردنی هەرای ئازادیخواهی شێخ سەعید یەک ملیون و نیوی لە کوردان کوشت.

کوردەکانی عێراقیش دەردی ئەسارەتیان کەم نەکێشاوە. لە لایەن کەسانێک کە دە فکری سەعادەتی بەشەری دا نین بۆ عەبدایەتی دران بە عەرەبان.

دە گەڵ ئەو هەمو تیرۆر و تەعقیب و کوشت و کوشتار و تەلەفاتەش کورد هەرگیز دە موقابیل زاڵمان دا سەری دانەنەواندوە و دە ڕێی ئیستیقلال و ئازادی دا موبارەزەی خۆی دەوام پێ دا و ئیرادەی پۆڵایی فەناناپەزیرە هەر بوە و هەر دەمێنێ. دەو ساڵانەی دوایەدا فرسەت و ماوەیەکی چاک هەبو کە بە ئازادییەکی کە ئەمە ئارەزومان بو پێی بگەین و لە مێژ بو وە دەستمان دەکەوت بزوتباینەوە وەک بزوتنەوەی قارەمانان و مەردانی پێشومان.

بەدبەختی ئەوەیە کە ئێستا دەنێو کوردان دا کەسانێک هەن وە نەبێ هەر خزمەت بەو فارسانە، کە چەن عەسرێکە ئەمەیان دە ژێر زوڵمی خۆیاندا ڕاگرتوە، بکەن، بەڵکو بە ئاشکرا میللەتی کوردی دەفرۆشن.

سەوبای عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد دەگەڵ ستادی ئەرتەشی ئێرانی کە هەمو کوردی فرۆشتون لە هەمومان مەعلومە. لە خەڵکی مەعلومە، مەلا عەبدوڕەحمانی سرنجداغی و محەمەدی فاروقی و حەمزە قاوەچی و غەیریهی جاسوسن و میللەت فرۆشن. قەرەنی ئاغای مامەش و محەمەدی عەباسی و عەلی خانی مەنگوڕ و عەبدوڵا ئاغای مەنگوڕ و چەن کەسی دی بە ئاشکرا بۆ ئیختیلاف و پارچە پارچە کردنی کوردان سەعی دەکەن.

عەیبەی بزانن ئەی مەلعونینە!

وە خەبەر بێن تا زۆر درەنگ نەبوە!

تەماشای دوژمنانی کەچ فیکر نەکەین دەزانین کوڕە پێشوی کورد هەرگیز میللەتی خۆیان و هومێد و ئارەزوی وانیان لەبیرنەکردوە.

لاوچاکانی مە وەک ڕابردوان بێ موزایەقە قوەی سەرف دەکەن کە کورد خۆشبەخت و ئازاد بێ. ئەوان زانیان موەفەقییەت وەختێک وە دەست دەکەوێ زۆر توند پاڵ وێک دا یەک... بێ و دە گەڵ برایانی ئازەربایجانی پێکەوە بزوتنەوە و پێ گەیشتن ئەو حیزبە کە حیزبی دیموکرات بو بە کۆمەگ و یاری خەڵکی کوردستان دانـدرا لە مودەتێکی کەمدا بە موەفەقییەتی زۆر گەورە گەیشتوە. زدیبەتێکی دە نێو عەشائێران دا بو هەڵی گرت و یەکێتی‌یەکی قایمی دە نێو وان دا پەیدا کرد و هەینەتی میللی هەڵبژارد و چاپخانەی تەئسیس کرد و ئەوە لە تاریخی کوردی ئێران دا هەوەڵ جارە بە تەوری عوموم بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە دەس پێ کراوە مەدرەسەی میللی تەشکیل کردوە کە دە وێ دا منداڵانی کورد بە زمانی دایکی خۆیان دەخوێنن و مەسئەلەی خوێندنی ئیجباری و عمومی حەل دەکات و شارەوانی و عەدلییەی داناوە و هێزی موسەللەحی میللی و... ساز کردوە.

بژی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان!

بژی موئەسیس و ڕەهبەری وی جەنابی قازی محەمەد!

ئەمە دەزانین و باوەڕیمان هەیە کە ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان ئەو کارە موقەدەسەی خۆیان بە موەفەقییەت دەبەنە سەرێ.

ئەمە نومایندانی تەواوی تەبەقات و کوردانی شیمالی کوردستانی لە میتینگێک کە لە شاری مەهاباد سازمان کردوە و ژمارەمان 20 هەزار نەفەرە ئەوڕۆ ئارەزوی عمومی خۆمان ئیزهار دەکەین و لە کۆمیتەی حیزبی دیمۆکرات و ئەنجومەنی خۆمان خواهیش دەکەین ئیختیاری دەدەینێ:

1. لەو جێگایانەدا کە ئێستا کوردی تێدا دەژین بە ئیستیقلالی تەواو بگا.
2. ئینتیخاباتی مەجلیسی شورا دەس پێ بکەن.
3. حکومەتی میللی کوردستان وەزیران ئیدارەکانی سازبکەن.
4. هێزی موسەللەحی میللی کورد تەشکیل بدەن.
5. لە گەڵ دەوڵەتانی هەمسایە ڕابیتەی تیجارەتی و ئیقتیسادی بەرقەرار بکەن.
6. لەگەڵ برا ئازەربایجانی‌یەکان هەمکاری و دۆستایەتی مەحکەم بکەن.

پایەدار بێ کوردستانی ئازاد!

بژی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان!

بژی ڕەهبەری خەڵکی کوردستان جەنابی قازی محەمەد!" (22)

## 3. ئاینی سوێند خواردن

ڕۆژنامەی کوردستان لە درێژەی ڕیپۆرتاجەکەی دا نوسیویەتی:

"... لە هەوەڵ و ئاخر و نێوان وتارەکان دا و لە هەر کاتێک دا نێوی: ڕیاسەتی جمهور قازی محەمەد. بە سەر زمان دا دەهات بێوچان موزیکی میللی لێ دەدرا و چەپڵەڕێزان دەکرا و بەیناوبەینیش قوتابی‌یەکانی مەداریسی کوڕ و کچ سرودی میللی‌یان دەخوێندەوە. لەم کاتەدا ڕەئیسی جمهوری بەرز بە ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی ئەمر فەرمو کە قورئانی موقەدەس و نەقشە و ئاڵای کوردستان حازر بکرێت. بێوچان هەیئەت کۆبونەوە و دوبەدو لە پشت سەری یەک کەوتنە ڕێ و چون لە کانگای حیزبی دیمۆکراتی کوردستان قورئانی موقەدەسیان دەگەڵ ئاڵا و نەقشەی کوردستان. دە گەڵ ئیحترامێکی فەوقولعادە. لە سەر دەستی مەلا

حسێنی شکاک دانا و، هەینەت بە تەرتیبی هەوەڵ لە پشت سەری وی گەڕانەوە تا گەیشتنەوە حزوری پێشەوا.

پێشەوا بە دەستی خۆی سەرپۆشی لە سەر قورئانی موقەدەس و نەقشە و ئاڵای بەرزی کوردستان لابرد و مەراسیمی سوێندی:

"ئەمن بە خودا، بە کەلامی عەزیمیخودا، بە نیشتمان، بە شەرافەتی میللی کورد، بە ئاڵای موقەدەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخر هەناسەی ژیانم و ڕژاندنی ئاخر تنۆکی خوێنم بە گیان و بە ماڵ لە ڕێی ڕاگرتنی سەربەخۆیی و بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان دا تێ کۆشم و نیسبەت بە ڕەئیسیی جمهوری کوردستان و یەکەتی کورد و ئازەربایجان موتیع و وەفادار بم."

خوێندەوە و، هەمو پێشمەرگەکان و نوێنەران و حازران بەو سوێندە سوێندیان خوارد و قەولی وەفاداریان دا.

پاش 5 دەقیقە برای خۆشەویست غەنی خوسرەوی تەواو بونی میتینگی ئیعلام کرد. لە پێش دا پێشمەرگەکان مەرەخەس بون و جەنابی ریاسەتی جمهور تەشریفی چو بۆ کانگای حیزبی دیموکرات و لە ساڵۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی دا قەراری گرت و دەستە دەستە نوێنەرانی تەوایف و قەبایل و لکەکانی حیزبی دیموکرات و خەڵکی شارو دێهات دەچونە حزوری پێشەوا و ئاینی بەیعەتیان بە جێ دەهێنا. قەولی فیداکاری و وەفاداریان دەدا. پاش خواردنەوەی شەربەت و چای لە خزمەت مەرەخەس دەبون.

دەنگی: بژی کورد و کوردستانی گەورە، بژی ڕەئیسی جمهوری موعەزەمی کوردستان، بژی یەکەتی کورد و ئازەربایجان. ئینسان و حەیوان، دار و دیواری وە سەما خست بو. دڵان وەها پڕ لە شادی بو کە هێندی مەستی مەی ئازادی و برێک لەبەر شیددەتی سرور دەگریان و هێندێک لە مەرحەلەی گریان دەرچوبو و بێدەنگ دانیشت بو ڕوحی لە عالەمی مەلەکوت دا دەفڕی و خۆی دەعالەمی سەرەوەدا دەدیت و بێوچانیش لە شەقام و کوچەدا دەنگی موسەلسەل و تفەنگ و دەمانچە هەرد و چیای دەلەرزاند. ئەمانە هەموی بە شانازی سەربەخۆیی و ناساندنی ڕەئیس جمهوری کوردستان دەکرا و میتینگ تا ساتی 12 ی پاش نیوەڕۆ دەوامی بو لەم وەختەدا ریاسەتی جمهور بۆ مەنزڵ گەڕاوە و حازرینیش لە کاتێک دا کە هەمو غەرقی سرور و مەستی سەربەستی بون بۆ مەنزڵی خۆیان چونەوە.(23)

## 4. ئاینی بەیعەتی پێشەوا

یا: "جەژنەکانی سەربەخۆیی و ناساندنی سەرۆک جمهوری کوردستان"

بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵی و دڵسۆزی بۆ پێشەوا و سەرۆکی کۆماری کوردستان و، ناسینی بە ڕەسمی. هێزەکانی پێشمەرگە، بەرپرسەکانی هۆکانی ڕاگەیاندن، بازرگانەکان، سەرانی ئێل و هۆزەکان، هەروەها "کۆمەڵی یەهودی" جەژنیان کردوە و ئاهەنگیان گێڕاوە و، بە خوێندنەوەی وتار و شیعر و سرود و شایی و کۆبونەوە و دانیشتنی بە کۆمەڵ خۆشی و دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ پێشەوای کوردستان دەربڕیوە.

### 4. 1. بەیعەتی پێشمەرگە بە پێشەوا

ڕۆژنامەی کوردستان لە ڕیپۆرتاجێکی تایبەتی دا نوسیویتی:

"لە کانگای پێشمەرگە لە مەهاباد

"بەیانی ڕۆژی 3 ی 11 ی 24 هەمو سەریان لە خەوی مەستی هەڵێنا و گشت خومـاری شـەرابی سەربەخۆیی بون کە ڕۆژی پێشو ئەرخواردیان درابو. ئەوەش پێویستی شکانەوە بو. لە ناکـاو سـاتی 8 ی بەیانی دەنگی"شەیپور حازربە" لە کانگای پێشمەرگەکان بڵیند بـو. لە مـاوەی چەنـد دەقیقەیـەک دا تـەواوی پێشمەرگەکانی کورد، لیزگە، قوڵ، دەستە، چڵ، لک، پۆل، خولاسـە تـەواوی هێـزی کوردسـتان لـە کاتێکـدا بـە تەجهیزاتی جەنگی ڕازابونەوە. سوارە و پیادە بە جوێ و بەشی موسەلسـەل و تۆپخانـە بـە تـەنێ، نیهایـەتی شادمانی و ڕوخۆشی کە لە خۆشییان ڕومەتیان وەک گوڵی گەش وا بو وە لەبەر کەیف و سـرور دە پێسـتی خۆیان دا نەدەحجمین لە کانگای کۆبونەوە و. هەمو فەرماندەکان لە قوڵ یەکەوە بگرە تا سـەرقوڵ یـەک و لـە سەردەستەوە تا سەرکردە و، لە ناودار یەکەوە تا سەرلک و، لە سەرپۆلەوە تا سەرهێز هەریەک لە جـێی خـۆی دامەزرا. فەرمانی فەرماندەهان دڵی دوژمنانیان ڕادەوەشان و زراوی خائینـانی دەتوانـدەوە، بێوچـان فـەرمانی حەرەکەت درا. هەمو پێشمەرگەکان قوڵ قوڵ و دەستە دەستە سێ کەس سێ کەس حەرەکەتیان کرد و هاتن تا واریدی شەقامی وەفایی بون و فەرمانی ڕاوەستان درا لەم سەر و ئەو سەری شەقامدا هـەمو هەریـەک لـەجێی خۆی ڕاوەستان و لە سان دران.

ئەمە لەبەر چی و بۆچیە؟

هەستی نیشتیمان پەرستی، ڕوحـی پێشـمەرگەیی و لـەخۆ بـوردن، هەسـتی تۆڵـە کردنـەوە، ئـارەزوی مولحەق بون بە شوهەدای ئازادی، چێشتنی لەزەتی سەربەخۆیی، بەرز کردنەوەی ئاڵای موقەدەس، دەنگی دیلی و زەلیلی دایکی نیشتمان، ئەم لاوە ئازادارانەی وەجونبوش و جۆش و خرۆش هێنابون و ئێسـتا چـاوەنوڕی ڕەئیسی جمهور و فەرماندەی خۆیان دەکەن کە بەیعەتی دەگەڵ بکەن بەڵێنی بـدەنێ کـە تـام لـە خۆبوردوانـە ئامادەن تا ئاخر تنۆکی خوێنیان دەس لە فیداکاری هەڵ نەگرن. لەم کاتەدا ڕەئیس جمهوری بەرزی کوردستان دیاری کرد و لەسەر شەقامی وەفایی دابەزی و ڕۆژباشی لە هەموان فەرمو و لە لایەن پێشـمەرگەکان بـە"زیـاتر فیداکارم" جوابی عەرز کراوە.

ئەمجا ڕیاسەتی جمهور یەکە یەکە نێو چـاوانی مـاچ دەکـردن و ئـەوانیش بەیعـەتیان دەکـرد و قـەولی فیداکارییان تازە دەکردەوە. لە نێوجەرگەی سوپادا نۆبە گەیشتە سەید باوەجان کە سەیدێکی پەنجا سـاڵەیەو ڕدێن دارە. بێ وچان دەستی فەرماندەی خۆشەویستی ماچ کرد و وتی "حازرم ئەم ڕدێنەم لـە ڕێی دیفـاع لـە نیشتمان لە خوێن دا شەتڵ کەم" و فەرماندەی خۆشەویست فەورەن ڕدێنی ماچ کرد و ئافەرینی لـێ کـرد. لـەم کاتەدا ئاغای سدیقی حەیدەرییان لە سەر دەستان هەڵ گرت بو. ئەویش بە دەنگێکی بڵینـد دەیگـوت: "بـژی کورد و کوردستانی گەورە". "بژی ڕەئیس جمهوری بەرزی کوردستان". دڵی خەڵکی وە جۆش هێنا بو. پـاش تەواوبونی مەراسیمی بەیعەت ماوەی 20 دەقیقـە شـلینگی تفـەنگ و موسەلسـەل کـراو لـە گۆشـە و کـەناری شاریش دا شانازی پێشمەرگەکان هەر تەقە دەهات...(24)

لە ڕیپۆرتاجێکی تردا لەسەر "جەژنی سەربەخۆیی و ناساندنی سەرۆک جەمهوری بەرزی کوردستان لـە پێشمەرگەخانەی هێزی دیمۆکراتی کوردستان" نوسیویتی:

"شەوی 4 ی 11 ی 24 شەوێکی سەراسـەر خۆشـبەختی بـو. تـەواوی ئەفسـەران و پێشـمەرگەکانی هێزی مەرکەزی دیمۆکراتی کوردستان بو چون لەو شەوەدا پێشمەرگەخانە غەرقی نـوری شـادی بـو. تـەواوی وەتاغەکانی بە جۆرێکی موجەلەل ڕازابونەوە. 20 نەفەر کیشکچی تەشریفاتی کە هەمو ئەفسەر بون لـە پـێش دەرکی پێشمەرگەخانە و تەشریف هێنانی حەزرەتی سەرۆک جـەمهور دامـەزرا بـو. هـەمو جـۆرە شـیرینی و شەربەت بۆ پەزیرائی میهمانانی خۆشەویست لە سەر مێز داندرا بو. دەستەی موزیک لە حاڵی تەرەنوم دا بو. دەهۆڵ و زوڕنا لە پێش دەرکی پێشمەرگەخانە لێ دەدرا و هەزاران برای بە ئیحساسـات لـە پـێش دەرکـی لـە

شادی و هەڵپەڕین دا بون. بە پێی کارتی ڕەسمی کە بۆ میهمانان ناردرا بو میهمانانی خۆشەویست دەستە دەستە دەهاتن و 6 وەتاغی تایبەتی پڕ لە میهمان بون. لەو ئانەدا ئوتۆمبیلی حەزرەتی سەرۆک جمهور دیاری دا و لە لایەنی فەرماندەی هێزی دیمۆکراتی کوردستان فەرمانی ئیحتیرام درا. موزیک و کێشکی تەشریفاتی ئیحتیرامیان بەجێ هێنا. حەزرەتی سەرۆکی جمهوری نیسبەت بـە کێشـکی تەشـریفاتی دیـرازی مەرحەمـەتی فەرمو. هوڕا و چەپڵەڕێزان ساتێک دیدامەی هـەبو. پاشـان لـە لایـەن محەمـەد نانـەوازادە فەرمانـدەی هێـزی مەرکەزی دیمۆکراتی کوردستان لە عموم مەراسیمی بە خێرهاتن بە عەمەل هات."

ئەوانەی لەم جەژنەدا قسەیان کرد: محەمەد نانەوازادە، قاسم ئاغـای ئێلخـانی زادە، ئەحمـەدی ئێلخـانی زادە، عەبدوڕەحمان ئێلخانی زادە، ئیسماعیل ئێلخـانی زادە، ئیبراهیمـی ئێلخـانی زادە، محەمـەد ئـەمین ئاغـای ئێلخانی زادە. قاسم ئاغای ئێخانی زادە لە باتی حاجی بایز ئاغا و مەحمود ئاغای ئێلخانی زادە، قـادر ئاغـای قارەمانی، مەعروفی، ئیفتیخاری چواردولی، برایم قارەمانی، سولتان ئاغای وەتەمیشی، محەمەد ئـەمین مـوعینی، ڕەحمەتی شافیعی، ئیسماعیل شێخ ئاغایی، حەسەن ئاغا و عەبدوڵا ئاغای داربەسەر، حەسەن خانی بوداغی.

هێمن بەم بۆنەیەوە شیعری لای خوارێی خوێندەوە:

ڕۆژی جێژن و شادیە تێپەڕی ڕۆژی دەرد و خەم

هات شنەبایێکی ڕەحمەت ڕایڕفاند و بردی تەم

دێ لە هەر لایێکی قاقای پێکەنینی لاوەکان

دێ لە هەر لایێک سەدای ساز و تار و زیل و بەم

گەرچی زستانە بە بەفر داخندراوە پاک وڵات

ئەوڕۆ خەملیوە وڵاتی ئێمە وەک باخی ئیرەم

جێژنی ئیستیقلالی کوردستانە، ڕۆژی شادیە

جێژنە پیرۆزە لە هاوخوێنی خوێنگەرمم دەکەم

ئەوجەوانانی وەتەن ڕوحم فیداو بێ هەوڵ دەن

بۆ تەرەقی کوردو بۆ پاراستنی خاک و عەلەم

بۆ نەجاتی نیشتمانی خۆشەویستو کاربکەن

زو دەری بێنن لە چەنگی عارەب و ترک و عەجەم

هەر کەسێ بۆ لای سنور و نیشتمانی ئێوە بێ

هەڵدرن ورگی ئەو و بینێرنە موڵکی عەدەم

لاوەکان! پێشمەرگەکان! ئازایەکان! بێباکەکان!

دەس دەنە شیر ئێوە، ئێمەش تیژ دەکەین نوکی قەڵەم

خوا مەدەد کاربێ لە دەس بێگانەکان دێنینە دەر

خاکی پاکی کوردەواری دایەڵێن بۆ کورد ئەلەم

جێژنە پیرۆزە دەکەم لێت و دەڵێم یا خوا بژی

ئەی ڕەئیس جمهوری کوردو پێشەوای موحتەرەم

گەورەکەم: کورد ئێستاکە موحتاجی کارەو دابێ تۆ

تەک بدەی ساتێک و دانیشی دەمێکی کەمتەرخەم

تۆم بە خوا ئەسپارد و ئەسپاردم بە تۆ ئەی پێشەوا

میللەتە ئازایەکەم، ئازیزەکەم، خوێن پاکەکەم
"لە دوایە حەزرەتی سەرۆکی جمهوری کوردستان لە پشت مێزی خیتابەوە ڕاوەستا لە هەوەڵدا لە ئیحساساتی ئەو برایانە تەقدیری فەرمو و لە خسوسی بە ئارەزو گەیشتنی میللەتی کورد لە دەرگای خودای بێ هاوتا شوکری بەجێ هێنا و بۆ یەکەتی و پێشکەوتنی میللەت ئەسائحێکی زۆری فەرمو و مەرحەمەتێکی زۆری نیسبەت بە فەرماندەی هێزی نواند.
پاشان لەنێو هوڕا و چەپڵەڕێزان تا ساتی 5 ی شەوێ حەرەکەتی فەرمو لە نێو گاردی ئیحتیرام ڕابرد و مەجلیسی شادمانی لە ساتی 8 ی شەوێ تەواو بو."(25)

## 4. 2. بەرپرسەکانی ڕاگەیاندن

کوردستان لە ڕیپۆرتاجێکی تردا نوسیویەتی:
"ڕۆژی 5 ی 11 ی 1324 بە موناسەبەتی سەربەخۆیی و ناساندنی سەرۆک جمهوری بەرزی کوردستان جێژنێکی موجەلل گیرا"... "لە ساتی دیاری دا بانگکراوەکان کە عیبارەت بون لە ئەعزای کۆمیتەی مەرکەزی و هەیئەتی ڕەئیسەی میللی و کارگەرانی حیزبی دیمۆکرات و نوێنەرەکانی قەبایل و تەوایف و لکەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و عولەما و ڕوحانیان و موحتەرەمینی شاری مەهاباد تەشریفیان حازر بون و هەرکەس لە جێی خۆی دانیشت و جەنابی سەرۆک جمهوریش لە ساتی 5 لە کاتێک دا کە گاردی تایبەتی مەراسیمی ئیحتیرامیان بە جێ دینا و سرود و موزیکی میللی کوردستان دەخوێندراوە و لێ دەدرا، تەشریفی وارید بو لە سەر جێگای خۆی نزولی ئیجلالی فەرمو و یەک دەورە شەربەت و چای بە میوانەکان پێشکەش کرا."
ئاغای عەلی خوسرەوی مودیری داخلی چاپخانە جێژنی ئیفتیتاح کرد. ئاغای قادری مودەڕیسی مدیری چاپخانەی کوردستان و، سەید محەمەدی حەمیدی مدیر و سەرنەبیری ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردستان، هاشم خەلیل زادە ئەندامی هەیئەتی تەحریریەی ڕۆژنامەی کوردستان و، محەمەد شاپەسەندی بە ناوی کارگەرانی چاپخانەی کوردستانەوە وتاریان خوێندەوە. هەژار و هێمن هەر یەکە شیعرێکیان بەو بۆنەیەوە خوێندەوە.(26)

## 4. 3. بازرگانەکان

کوردستان لە ڕیپۆرتاجێکی تردا نوسیویەتی:
"جێژنی شیرکەتی تەرەقی کوردستان
لە لایەن بەزازان بە بۆنەی سەربەخۆیی و ناساندنی پێشەوای کوردستان
بە بۆنەی جێژنێکی کە لەلایەن ئەعزای شیرکەتی تەرەقی کوردستان و تەبەقەی بەزازانی مەهابادی بە بۆنەی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان کرا بو ساتی 3 ی پاش نیوەڕۆ مەجلیسی جێژن دایر بو و حەزرەتی پێشەوا و جەنابی حاجی سەید عەبدوڵای شەمزینی و جەنابی حاجی باباشێخی سیادەت و حاجی بایزئاغا و مەحمودئاغای ئێلخانی زادە و تەبەقاتی عولەما و ئاغایانی عەشایەر و تیجار و موحتەرەمینی شار تەشریفیان بو.
عەلی خوسرەوی کۆبونەوەکەی کردەوە. لەم کۆبونەوەیەدا ئاغایان: هەژار و هێمن و قادری مەحمودزادە، یەکی شیعرێکیان خوێندەوە. حسێن داودی دەربارەی پێکهێنانی شیرکەتەکە و هەلومەرجی ئابوری دوا. قاسم ئاغای ئێلخانی زادە، ئەحمەد ئاغای ئێلخانی زادە، پیرۆت ئاغای ئەمیرعەشایەری، حاجی بابە شێخ و، مەلا حسێنی مەجدی، لەم جەژنەدا دوان.

پێشەوا وتارێکی دا لە قسەکانیدا وتی: "یەگانە حەملەیی دوژمنـان حەملـەی نیقتیسـادیە و هەمیشـە خـەریک دەبن کە لەو رێگایەوە ئینقیلاب دەخەنـە نێـو میلـەتێ مەسـەلەن مەسـئەلەی تـوتن کـە دەوڵـەتی ئێـران خـەریک بـو وەسائیلی نیفاق و دوبەرەکی لە نێو کوردان دا پێک بێنێ. لازمە کە ئەمە رێگایەکی نیقتیسادی بـۆ خۆمـان بکەینـەوە. شیرکەتی تەرەقی دەبێ تەوسیعەی پێ بدرێ و رەوابیتی تیجارەتی لە هەمو کوردسـتان دا بەرقـەراربکرێ. حکومـەتی کوردستان ئیحتیاجاتی زۆرە دەبێ وەزعـی خـۆی وەکـو دنیـای ئـەورۆ تـەغییر بـدا مەسـەلەن فەرهـەنگ، فەلاحـەت، کارخانەجات کە دەبێ دە تەوسیعە و تەرەقی ئەوانەدا سەعی و جیییەت بکرێ."(27)

### 4. 4. سەرانی ئێلەکان

رۆژی 6 ی ڕێبەندان ئاغایان شێرزاد و محەمـەد حسـێن خـان ئـەمیری جـەژنیان کـرد. لـەم جێژنـەدا ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی و نوێنەران و سەرانی کورد ئامادە بون. پێشەواش بەشداری کرد.

بەم بۆنەیەوە چەند کەسێ وتاریان داو هێمن شیعرێکی خوێندەوە.(28)

رۆژی 9 ی ڕێبەندان عەبدوڵا ئاغای قادری لە گوندی جەلدیان جـەژنی گـرت و "مەراسـیمی شـەربـەت خۆری بەجێ هێنا" و"لە شادی ئەم جێژنەدا چەند سەر رەشە وڵاخی کوشتوەتەوە و عیدەیەکی زۆر لـە ئاغـا و فلەخوی دەوروبەر تێدا حازر بون".

بەم بۆنەیەوە مەلا سالح و چەند کەسی دی وتاریان خوێندەوە.(29)

هەر لەم رۆژەدا حاجی سەید عەبدوڵا ئەفەنـدی، گـەورەی بنەماڵـەی شـێخانی شـەمزینان "بـە شـانازی پێشەوای کوردستانەوە" جێژنی گێرا.

بەم بۆنەیەوە چەند کەس وتاریان دا لەوانە سەید عەبدولعەزیزی کوڕی سەید عەبدوڵا.(30)

رۆژی 12 ی ڕێبەندان جەعفەری کەریمی "بە ئیفتیخاری ئازادی و سەربەخۆیی و ناساندنی پێشـەوای کوردستان" لە سالۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی جەژنی گێرا. لەم جەژنەدا حـاجی سـەید بابـا شـێخی سـیادەت، شـێخ محەمـەد مەعسـوم زیـائی و. "ژماریـەکی زۆر لـە عولـەمای عیـزام و ئاغایـانی عەشـایەر و تیجـار و موحتەرەمین" ئامادە بون. جەعفەری کەریمی و چەند کەسێکی تر وتار و شیعریان خوێندەوە.(31)

رۆژی 16 ی ڕێبەندان سەید عەبدوسەلام لە گردیگلان جێژنی کـرد. سـەید حسـێن و سـەید محەمـەد نورانی زەنبیل و چەند کەسێ کە بەشدار بون. سـەید عەبدوسـەلام و سـەید کامیـل و مـەلا عەبـدوڵا و شـێخ ئەحمەد، وتاریان خوێندەوە و شیلینگی تفەنگ کرا.

رۆژی 19 ی ڕێبەندان محەمەد رەشید خان، ئەحمەد بەگی سـەلیمی، حـاجی گەنجعـەلی بـەگی سـەلیمی لەگەڵ خزمەکانیان و بنەماڵەی شێربەگ و دانخواە و. ئاغایان ئیبراهیم بەگی سەلاح و سەلیم بەگی بـەگزادە و محەمەد حسێن خانی ئەمیری و فەیزوڵا خـانی حـەریقی و محەمـەد کـەریم بـەگی مەجیـدی و محەمـەد بـەگی ئیبراهیم بەگی فەیزوڵابەگی و ئەحمەد خـانی کەیخوسـرەوی ئاغایـانی ئەحمـەد بـەگی فەیزوڵابـەگی تـەواوی ئاغایانی بەگزادە لە یەکشەوە کۆبونەوە. هاشم حەمزەیی سەرۆکی ستادی بۆکان، حەسـەن خـانی بـداقی، بـۆ سەر ئەو جێژنە بانگ کرابـون "لەسـەعات 9 ی بـەیانی دا 150 نەفـەر پێشـمەرگە و غـەیرە تـاقمێکی 300 نەفەری ئاغا و رەعییەت و نۆکەر بە ناوی گاردی ئیحتیرامی ئاڵا لە مەیدانی پێش کۆمیتەدا سەفیان بەست، لەو وەختەدا پێشمەرگە سەلیمی فەیزوڵابەگی هەڵگری تایبەتی ئاڵا. ئـاڵای موقەدەسـی لـە غایـەتی ئیحتیرامـا دایـە سەرشانی و فەرماندەی لک لە شانی راستی ئاڵاوە و فەرماندەی بەشی سوار لـە شـانی چەپـەوە بـە جـەلال و شەوکەتێکی زۆر جوان هێنایانە مەیدانی پێش کۆمیتە لە قوەی کەس نایەت شەرحی بدا کە لەو سـەعاتەدا چـە خۆشی و شادییەک لە ناو ئەو جەماعەتەدا پەیدا بو.

لە حدودی هەزار کەس زیاتر لە دێهاتی بەگزادەوە بۆ سەیر و پێشوازی ئاڵا هات بونە یەکشەوە لە پاش چەپڵەڕێزان و هورایەکی زۆر فەرماندەی لک ئاغای شێرزاد خیتابەیەکی زۆر شیرین و جوانی خوێندەوە... لە دوای ئەوە ئاغای محەمەد شکارچی قەراردادی 2 ی ڕێبەندانی بە دەنگێکی بەرز خوێندەوە. ئاغایانی حسامی دادخواە، پێشمەرگە مستەفا فەیزوڵابەگی و، ئەسەدی دادخواە و، میرزا محەمەد ئەمینی تاهیری، هەر یەک بە نۆبەی خۆیان نوتقێکی زۆر بەتین و تەوژمیان کرد". ئاغای عەبدوڵا نیرومەند نوسەری حیزبی یەکشەوە شیعرێکی خوێندەوە.

"لە پاش بەجێهێنانی مەراسیمی ئیحتیرامی نیزامی چەپڵەڕێزان و هوراکیشان وە گوتنی بژی پێشەوای کوردستان تاقمی پێشمەرگە لە ژێر فەرمانی حسێن شێرزاد دەسڕێژێکی زۆریان کرد لە دوای ئەوانە ئاغای ڕەئیسی ستادی بۆکان نوتقێکی بێ ئەندازە بەتینی کرد لەو نوتقەدا تەواوی حازرینی بەلوتف و مەرحەمەتی پێشەوای موعەزەمی کوردستان ئومێدەوار کرد. ئەوجار بە کەمالی ئیحتیرامەوە ئاڵای موقەدەسیان لە سەربانی کۆمیتەی حیزب ئەسب کرد. سەلامەتی پێشەوای کوردستان بە تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا، شەربەتخۆرییان کرد و خاتیمە بە جێژن درا."(32)

ڕۆژی 23 ی ڕێبەندان "ئەهالی دەوروبەری کولیجە کە بۆ جێژن بانگێشت کرابون "لە دیوەخانی شێخ حسێن کۆبونەوە" لە پاش سەرفی شەربەت و چایی حەسانەوە بە دەستی گەل هاتنە دەرێ. ماوەی 3 سەعات بە دەف و بلوێر لاوک گوتن و شایی و زەماوەند ڕایان بوارد." بەم بۆنەیەوە مەلا محەمەد ئەیوبی، مەلا قادری بورهانی، سەید برایمی نورانی، شێخ عەبدوڕەحمان، مەلا عەبدوڵا قەمتەرەیی وتاریان خوێندەوە. 3 کەڕەت شیلینگی تفەنگ کراو "تەواوی خەڵکی بە ڕاهنومایی مەلا محەمەد بە خودا و قورئان و ئاڵای موقەدەسیان سوێندخوارد کە بۆ سەرکەوتنی کوردستان کۆتایی نەکەن."(33)

ڕۆژی 26 ی ڕێبەندان زیرو بەگی هەرکی لە گوندی بالانیش جەژنی گێرا. "لەم جێژنەدا گەلێک لە ئاغایانی دەوروبەری بالانیش و ورمێ تێدا بەشدار بون چەند هەزار کەس لە جوتێر و فلەخوی حازر بون شایی و هەڵپەڕکێ و خوێندنەوەی گۆرانی میللی کوردستان و موزیک دەهۆڵ و زوڕنا هەمو کەسی سەرخۆش کرد بو."(34)

### 4. 5. کۆمەڵی یەهودی مەهاباد

"ڕۆژی 6 ی 11 ی 1324 لە لایەن کۆمەڵی یەهودی مەهاباد بە شادی سەربەخۆیی کوردستان و ناساندنی پێشەوای کوردستان جێژنێکی زۆر جوان گیرا چەند موغازە لە خیابانی قازی بە ئەنواعی پارچە ڕازابونەوە و بەپێی بانگهێشتنێک کە لە ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی و کاربەدەستان و نوێنەرانی حیزبی دیمۆکرات و سەرانی تەواوی قەبایل کرابو دەستە دەستە و پۆل پۆل بانگکراوەکان گرد دەبون پاش چارەکێ دانیشتن و خواردنەوەی شەربەت و چای هەڵ دەستان دەستەیەکی دی دەهاتن بەوجۆرە ئەم جێژنە 48 سەعات دەوامی کرد..."(35)

## 5. دامەزراندنی دەزگاکانی حکومەت

حکومەتی کوردستان، حکومەتێکی "دی فاکتو" بو، حاڵەتێکی قانونی دیاری کراوی نەبو. نە لە قانونی ئەساسی ئێران دا دەزگا و دەسەڵاتەکانی باس کرا بو. وە نە خۆیشی دەستور یا قانونێکی ئەساسی نوێی بۆ خۆی دانا بو. لە بەر ئەوە جۆرێ لە پاشاگەردانی وشەی سیاسی و قانونی و بەڕێوەبەرایەتی لە ناو داوودەزگاکانی حکومەتی کوردستان و دەسەڵاتەکانی دا هەبو.

ڕیژیمی ناوەندی سەڵتەنەتی بو کەچی ئەم جمهوری بو. بە ناو بە خۆی ئەگوت "جمهوری خودموختار" بەڵام ڕاستی یەکەی ئەو دەسەڵاتانەی بە خۆی ڕەوا دی بو لە هی فیدراڵی زۆرتر بو.

لە دوای "ڕەئیسی جمهور" کە پێشەوای حیزبی دیموکراتی کوردستان، قازی محەمەد، بو، بەرزترین دەزگا "هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کوردستان" بو. پێکهێنانی ئەم هەیئەتە کارێکی ناچاری بو. لە مێژ بو مەهاباد دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی تێدا نەمابو. لە دوای 26 ی سەرماوەزیشەوە کە شارەبانی مەهاباد چەک کرا، ئیتر بۆشایی یەکی گەورە لە کاروباری بەڕێوەبەرایەتی دا دروست بو بو، ئەبو پڕبکرێتەوە. کۆمیتەی مەرکەزی حیزب بڕیاری پێکهێنانی "هەیئەتی ڕەئیسەی میللی" دا، ئەم هەیئەتە پێک هات بو لە:

| | |
|---|---|
| ڕەئیسی هەیئەت | حاجی بابەشێخ |
| وەزیری جەنگ | محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی |
| وەزیری کیشوەر | محەمەد ئەمین موعینی |
| وەزیری ئیقتیساد | ئەحمەدی ئیلاهی |
| وەزیری پۆست و تەلەگراف کەریمی | ئەحمەدین |
| وەزیری فەرهەنگ | مەنافی کەریمی |
| وەزیری تەبلیغات | سدیقی حەیدەری |
| وەزیری کار | خەلیلی خوسرەوی |
| وەزیری تیجارەت | حاجی مستەفای داودی |
| وەزیری کیشاوەرزی | مەحمودی وەلی زادە |
| وەزیری ڕێگاوبان | ئیسماعیلی ئێلخانیزادە |
| وەزیری بیهداری | سەید محەمەدی ئەیوبیان |
| وەزیری موشاویر | عەبدوڕەحمانی ئێلخانیزادە |
| ڕەئیسی عەدلیە | مەلا حسێنی مەجدی(36) |

ئەم دەزگایە لە باتی کابینە، یاخود ئەنجومەنی وەزیران بو. کارەکانی ئەویشی ئەنجام ئەدا. ناو لێنانی بەم جۆرە: یەکەمیان، چاو لێکەری حکومەتی ئازەربایجان بو، چونکە ئەوانیش هەمان ناویان لە دەزگای وەزارەتەکەیان نابو. دوەمیان، بۆ ڕەواندنەوەی ترسی دوژمنەکان بو. بۆ ئەوەی بە جیابونەوەخوازی و پێکهێنانی دەوڵەتی سەر بەخۆ تاوانبار نەکرێن.

جگە لە وەزارەتی کاروباری پێشمەرگایەتی کە هەندێ جار بە "وەزارەتی جەنگ" و هەندێ جاری تر بە "وەزارەتی هێزی دیمۆکراتی کوردستان" و محەمەد حسێن خان بە "وەزیر" ناو ئەبران، بە وەزارەتەکانی تر جاروبار ئەوترا "ئیدارە" و بە وەزیرەکان "ڕەئیسی ئیدارە" هەر بۆیە دەزگاکەش ناو نرا بو "هەیئەتی ڕەئیسە". لە ڕۆژنامەی کوردستان دا "سەرۆکی کیشاوەرزی کوردستان" و"سەرۆکی فەرهەنگی کوردستان" و"سەرۆکی ئیدارەی عەدلیەی کوردستان" نوسراوە. هەروەها "وەزیری تەبلیغات" و"وەزیری پۆست و تەلگراف". جگە لەوانەی ئەندامی هەیئەتی ڕەئیسە بون چەند کەسێکی تر لە پیاوە ناسراوەکانی موکریان لە پایەی "مشاویر" دانران. هەروەها چەند ئیدارەیەکی تریش دامەزرێنرا لەوانە: ئیدارەی دارایی کوردستان بە سەرۆکایەتی عیلمی، ئیدارەی کوللی ئەوقافی کوردستان بە سەرۆکایەتی محەمەد لاهیجان. ئیدارەکان کەوتنە ئەنجامدانی کارەکانیان. حوکمی داوودەزگا ڕەسمی یەکانی حکومەتی کوردستان دەستی پێ کرد.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

1. ئەم ڕیپۆرتاجە لەبەر درێژی بەزنجیرە لە ڕ کوردستان، ژ 10 تا 15، 11/15 - 1324/11/27 بڵاوکراوەتەوە. دەربارەی 2 ی ڕێبەندان هەروەها بڕوانە:
مەحمود عیزەت، کۆماری میللی مەهاباد: لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، 1984. ل 98-102.
جعفر مهدی نیا، زندگی سیاسی قەوام السلطنه، چ 2، تهران، تابستان 1299. لێرە بە دواوە ئەنوسین: مەهدی نیا. ل 501-504.
Eaglton ،William ،Jr. The Kurdish Republic of 1946 ،London ،1963. p.64-62 .
لێرە بە دواوە ئەنوسین: ئیگلتن.
2. ڕ کوردستان، ژ 10، 1324/11/15 بەرامبەر1946/2/4.
3. ڕ کوردستان، ژ 10، 1324/11/15 بەرامبەر1946/2/4.
4. ڕ کوردستان، ژ 10-11، 15-1324/11/17. ئەو شوێنانەی نوقتە دانراوە نەخوێنرانەوە.
5. ڕ کوردستان، ژ 11، 24/11/17.
6. ڕ کوردستان، ژ 12، 24/11/20.
7. لەو ژمارانەی لە بەر دەس دان نوتقی عومەرخانی تێدا نیە.
8. ڕ کوردستان، ژ21، 1324/12/11. وتارەکەی زێرۆبەگ دوجار بڵاو کراوەتەوە. جاری یەکەم لە ژ 15 ی ڕۆژی 24/11/27 تەنیا بەشی یەکەمی بێ ئەوەی باسی سەید عەبدوڵای تێ دا نوسرا بێ. بەڵام جاری دوەم بەو جۆرە بڵاو کراوەتەوە.
9. ڕ کوردستان، ژ 15، 1324/11/27 بەرامبەر46/2/16.
10. لەو ژمارانەی لەبەر دەس دان وتاری محەمەد فەیزوڵابەگی تێ دا نیە.
11. ڕ کوردستان، ژ 13، 1324/11/22 بەرامبەر 46/2/11.
12. لەو ژمارانەی لەبەر دەس دان وتارەکەی حاجی بابەشێخیان تێ دا نیە.
13. ڕ کوردستان، ژ 15، 1324/11/27 بەرامبەر46/2/16.
14. ڕ کوردستان، ژ 13، 1324/11/22 بەرامبەر46/2/11.
15. ڕ کوردستان، ژ 12، 24/11/20. ئەو شوێنانەی نوقتەیان لێ دانراوە نەخوێندرانەوە.
16. ڕ کوردستان، ژ 11، 24/11/17. ئەو شوێنانەی نوقتەیان لێ دانراوە نەخوێندرانەوە.
17. ڕ کوردستان، ژ 12، 24/11/20.
18. ڕ کوردستان، ژ 18، 1324/12/4 بەرامبەر 46/2/23.
19. ڕ کوردستان، ژ 13، 1324/11/22 بەرامبەر 46/2/11.
20. ڕ کوردستان، هەمان ژمارە. ئەو شوێنانەی نوقتەیان لێ دانراوە نەخوێندرانەوە.
21. ئیگلتن، س ن، ل 19. مەهدی نیا، ل 503.
22. ڕ کوردستان، ژ 8، 1324/11/8 بەرامبەر 1946/1/28.
23. ڕ کوردستان، ژ 14، 24/11/24.
24. ڕ کوردستان، ژ 14، 1324/11/24.
25. ڕ کوردستان، ژ 15 - 17، 11/27 - 1/ 12/ 1324.

26. ر کوردستان، ژ 17- 21. 1- 1324./12/11
27. ر کوردستان، ژ 23. 12/15/ .1324
28. ر کوردستان، ژ25. 12/26/ 24.
29. ر کوردستان، ژ 25. 24./12/26
30. ر کوردستان، ژ 25. 24./12/26
31. ر کوردستان، ژ 30. 1325./1/12
32. ر کوردستان، ژ 24. 1324./12/22
33. ر کوردستان، ژ 21. 11/ 24./12
34. ر کوردستان، ژ23. 24./12/15
35. ر کوردستان، ژ 22. 12/13/ .1324
36. علاءالدین سجادی، شۆرشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، بەغداد، چاپخانەی مەعارف، 1959، ل

گ رۆژی نوێ، ژ 10، کانونی دوەی 1961، ل 40.

محمودعزەت، س ن، ل 102- 103.

دکتور عزیز شمزینی، الحرکه القومیه التحرریه للشعب الکردی، مطبعه الشهید ابراهیم عزو، نیسان 1986، ل 162.

نەرفەع، ل 85.

Hassan Arafa. The Kurds. London. 1966. P. 85.

نیگلتن، س ن، ل 134.

# 4. گەشانەوەی ڕۆشنبیریی

حیزبی دیموکراتی کوردستان بایەخێکی تایبەتی بەکاروباری ڕۆشنبیری و خوێندەواری دا. مەنافی کەریمی بە وەزیری فەرهەنگ و سدیقی حەیدەری بە وەزیری تەبلیغات لە هەیئەتی ڕەئیسەی میللی‌دا دانا. هەردو وەزارەت لەو ماوە کورتەی تەمەنیان دا کاری گرنگ و نرخداریان ئەنجام دا.

## 1. بە کوردی کردنی زمانی ڕەسمی

لەوەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد دەستی پێ کردوە، بە کارهێنانی زمانی کوردی و پاککردنەوەی لە وشەی بێگانە و پاراستنی لە شێوان و لە ناوچون بوّتە یەکێ لە ئەمانجەکانی.

لە تورکیا دوای ئینقیلابی عوسمانی یەکێ لە خواستە سەرەکی‌یەکانی ڕێکخراوە کوردی‌یەکانی ئەستەموڵ ناسینی ڕەسمی زمانی کوردی بو لە ناوچە کوردنشینەکان دا وەکو زمانی: دادگا و، قوتابخانە و، نوسینی گۆڤار و ڕۆژنامە. هەر بەو مەبەستەش حەفتەنامەی تورکی - کوردی "کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی" و گۆڤارەکانی "کوردستان" و"ڕۆژی کورد" و"هەتاوی کورد" و"ژین" یان دەرکرد و. لە گەڕەکی چەمبەرلی تاش قوتابخانەیەکی سەرەتایی‌یان بۆ دەرس دانی زمانی کوردی بە منداڵانی کورد دامەزراند. کاربەدەستانی "ئیتیحاد و تەرەقی" و، دوایی تر کەمالی‌یەکان بونی کوردیان ئینکار و بەکارهێنانی زمانی کوردی‌یان لە هەمو بوارەکانی ژیانی ڕەسمی و ناڕەسمی‌دا لە تورکیا قەدەغە کرد.

لە عێراق ئەو هەوڵەی لە دوای برانەوەی جەنگی جیهانی یەکەمەوە بۆ کورد ڕەخسا، بۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی لە بڵاو کردنەوەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و لە خوێندنی قوتابخانەکان و، لە قسەکردنی ناو دائیرەکانی دەوڵەت دا بە تایبەتی دادگاکان، جێگیر بو. بەڵکو چوە قاڵبی قانونی‌یەوە چونکە پارلەمانی عێرق لە 1931 دا "قانون اللغات المحلية" ی دەرکرد و زمانی کوردی بە ڕەسمی ناسی. بە دەیان کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی پێ بڵاو کرایەوە.

لە ئێران جگە لەو تاقە حەفتەنامەیەی کە سمکۆ لە ورمێ بۆ ماوەیەکی کورت بێ ڕێگە پێدانی قانونی حکومەتی تاران دەری کرد بو، ئیتر ماوەی دەرچونی هیچ گۆڤار و ڕۆژنامەیەک، یا چاپ کردنی هیچ کتێبێکی کوردی نەدراوە. بەکارهێنانی زمانی کوردی بۆ قسەکردنیش لە دائیرەکانی دەوڵەت و لە قوتابخانەکان دا قەدەغە بو.

کاربەدەستانی ڕیژێمی پەهلەوی بونی کوردیان ئینکار نەئەکرد، وەکو کەمالی یەکان لە تورکیا ئەیان کرد، بەڵام دانیان بەوەدا نەئەنا کە کورد نەتەوەیەکی سەربەخۆ و جیاوازە لە فارس. وایان بڵاو ئەکردەوە: کورد یەکێکە لە قەبیلە ڕەسەنە خوێنپاکەکانی ئێران و، زمانی کوردی یەکێکە لە زاراوە پاکەکانی زمانی فارسی. چەندین مامۆستای زانستگای تاران و، زانای ئێرانی لە لایەن کاربەدەستانەوە ڕاسپێردران بۆ ئیسپات کردنی ئەو بۆچونە لێکۆڵینەوە و باسی مێژویی و جوگرافی و زمانەوانی و سۆسیۆلۆجی بنوسن.

کاربەدەستانی ئێران و تورکیا ئەیان وت کوردی زمان نیە. لەوەدا هەندێ عەرەبیش ئەبونە هاوئاوازیان. ئەمە یەکێک بو لەو هۆیانەی هەمیشە وای لە کورد ئەکرد کە زمانەکەی بە ڕەمزی خۆناسین و سەلماندنی نەتەوایەتی خۆی دابنێ. ڕۆشنبیرەکانی هەوڵی دارشتنی ڕێزمان و ڕێنوسی تایبەتی و، ڕاگرتنی داخاوتنی زمانەکە بە پاکی و بژار کردنی لە وشەی بێگانەی عەرەبی و، تورکی و، فارسی و، نوسینی فەرهەنگ بدەن. یەکێ لە خواستە سەرەکی یەکانی هەمو ڕێکخراوە سیاسی و ڕۆشنبیری یە کوردی یەکانی سەرانسەری کوردستان، تەنانەت هی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیشی ناسینی ڕەسمی زمانی کوردی بوە لە ناوچە کوردنشینەکان دا.

یەکێ لە ئامانجەکانی کۆمەڵەی ژ. ک و، دوایێتر حیزبی دیمۆکراتی کوردستان هەمان مەسەلە بو. حیزبی دیمۆکرات دوقتەی 2 ی خواستەکانی لە حکومەتی ناوەندی لە ناو یەکەمین ڕاگەیاندنی دامەزراندنی خۆی و، مادەی 13 ی فەسڵی 3 ی مەرامنامەکەی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کرد بو.

کوردەکانی ئێران لە ژێر سایەی ڕیژێمی پەهلەوی دا هەرگیز ئەم ئاواتەیان نەهاتە دی. بەڵام یەکێ لە کارە گرنگەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان دوای ئەوەی کاروباری موکریانی گرتە دەست ئەوە بو: زمانی کوردی کردە زمانی ڕەسمی خوێندن و نوسین و قوتابخانە و دائیرەکان. قازی محەمەد لە وتارەکەی ڕۆژی 2 ی ڕێبەنداني دا بەشانازی یەوە ئەڵێ:

"... چەند مەدرەسەی کچان و کوڕانمان کردەوە، مەدرەسەی شەوانەمان دایر کرد و کتێب بە زمانی کوردی تەرجەمە کران... کوڕ وکچ و پیاوی گەورە لە مەدرەسەی شەوانە و ڕۆژانە بە زمانی کوردی دەخوێنن لە جیاتی ئەوەی شەش حەوت ساڵ خەریکی خوێندن و فێربونی فارسی بن لە مانگێک و دو مانگ دا دەبنە خوێندەوار و هەمو شتێک دەخوێننەوە و دەنوسن. بۆ ناساندنی لیاقەتی میللی و دەرخستنی حەیاتی ئەدەبی و فەرهەنگی کورد و بۆ ڕاگەیاندنی هاواری خۆمان بە گوێی دنیای بەشەرییەت و عەدالەت موحتاجی وەسیلەی چاپ و بڵاوکردنەوە بوین چاپخانەی زۆر چاک تەئسیس کراو دانرا لەشاری خۆماندا بە زمانی خۆمان بە چاپخانەی خۆمان گۆڤار و ڕۆژنامە دەردەچێ و بیر و فیکر و داخوازی ئێمە لە دنیادا بڵاو دەکاتەوە."

## 1 . 1 . مزگەوت

مزگەوت لە کوردەواری دا گرنگی یەکی زۆری هەبوە. جگە لەوەی شوێنی نوێژ و خواپەرستی بوە. ماوەیەکی درێژ تەنیا جێگای فێر بونی خوێندەواری و زانست بوە. زۆری شاعیر و نوسەر و ئەدیبەکانی کورد تا کۆتایی چلەکان لە مزگەوتەکان دا پێ گەیشتون. سەرەڕای ئەوەش شوێنی کۆبونەوەی خەڵک و،

پرسە و بەلادا خستنی ناکۆکی بوە. مەلاکان لە دوانگەی مزگەوتەکانەوە ئەیان توانی کار لە بیـروڕای خـەڵک بکەن. لە هەمو شار و ئاواییە گەورەکان دا ڕۆژانی هەینی نـوێژی بـە کۆمـەڵی موسـوڵمانانی لـەوێ ئـەکرێ. نوێژی هەینی گرنگی‌یەکی تایبەتی هەیە چونکە لەو ڕۆژەدا ئیمـامی جومعـە وتـارێکی درێـژ ئەخوێنێتـەوە و، ژمارەی بەشدارانی نوێژی جومعەش لە نوێژی جەماعەتی ڕۆژانی تر زۆرترە.

مزگـەوت بـۆ ح د ک و بـۆ حکومـەتی کوردسـتانیش گرنـگ بـو. قـازی محەمـەد زۆری کۆبونـەوە گرنگەکانی لە مزگەوت دا ئەکرد و، لەوێ دا لە گەڵ پێشەوا دینیی و دەمڕاست و ئاغاکانی کورد کۆ ئـەبوەوەو ڕاوێژی ئەکرد.

هەمو دینێ بۆ ئەوەی باوەڕ و سەرەتاکانی خۆی بە خەڵک بگەیەنێ ئـەبێ بـە زمـانی خۆیـان بـدوێ. کورد لەم مافەش بێ بەش بو. لە مزگەتی گەورەی شارەکان دا خەتیبی جومعە ئەبو بە زمانی عەرەبی یـان بـە زمانی ڕەسمی دەوڵەت خوتبەی جومعە بخوێنێتەوە. حاجی قادری کۆیی مشتومڕێکی توندوتیژی خۆی لە گەڵ کابرایەک دا ئەگێڕێتەوە، لە سەر ئەوەی کابرا ڕەخنەی لە کاک ئەحمـەدی شـێخ گرتـوە، چونکـە قورئـانی بـە کوردی لێک داوەتەوە.

ح د ک بڕیاری دا کـە ئیتـر خوتبـەی جومعـە بـە کـوردی بخوێنرێتـەوە. بـەو بۆنەیەوەلـە ڕۆژنامـەی کوردستان دا ئەم هەواڵە بڵاو کراوەتەوە:

"هەوەڵ جارە کە خوتبەی جومعە بە کوردی دەخوێنرێتەوە

وەکو برایان هەمو دەزانن ساڵێکی تەواوە کە لە لایەن حیزبەوە دەستور بە ئیمامی جومعە درا بـو کـە خوتبەی جومعە بە کوردی بخوێنرێتەوە و، ئیمـام لـە پـێش دا خوتبـەی بـە کـوردی دەخوێنـدەوە پاشـان بـە عەرەبی. بەڵا دوێنێ 12 ی 11 ی 1324 ئیمام پاش بەسمەلە.... خوتبەی بە کوردی خوێندەوە دڵی هەمو...

بە ئەمری پێشەوا و ڕەئیس جمهوری بەرزی کوردستان لە لایەن حیزبـەوە بـە جـەنابی مـەلا حسـێنی مەجدی ئیمام جومعە و سەید محەمەد حەمیدی ئەمر دراوە کە خوتبەی جومعە لە سەر دەستوری ژێـرو تـەنزیم بکرێ:

موبارەزە دەگەڵ خورافات و، ئیحتیرامـی قـانون و دیـن. بیهـداری و ئیجـادی بیمارسـتان. تەئسـیری ئەمنییەت لە سەرکەوتنی نیشتمان دا. تەمەدونی کوردستانی قەدیم. ئیعتیماد بە نـەفس و ئەهمیـەتی سـەربازی وەزیفە... تەهیەی کودەکستان. چلۆن دەبێ پێش بە تەراخوم بگیرێ. ڕوحی سیلەحشـۆڕی. وەحـدەتی میللـی. عەواقیبی تەبەهکاری، سوخەن چینی و دوزبانی. وە دەستور دراوە جـەنابی ئیمـام جومعـەش ئەمانـە ڕەچـاو بکرێ و خوتەبای دیهاتیش لەم دەستورە پشتیوانی بکەن."(1)

## 1. 2. خوێندن

قوتابخانەی حکومەتی لە کوردستان دا یەکجار کەم بو. بەشی هەرە زۆری خـەڵک نەخوێنـدەوار بـون. ئەوەش وەنەبێ ڕوداوێکی بە ڕێکەوت بوبێ. بەڵکو ئەمە سیاسەتێکی نەخشەکێشراوی ڕیژێمی پەهلـەوی بـو. یەکەمین سەفیری عێراقی بۆ دەرباری پەهلەوی گفتوگۆی خۆی لە گەڵ سەفیری بەریتانی لـە تـاران دەربـارەی کێشەی کورد بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"ئینجا چوینە سەرباسی سیاسەتی ئێران بەرامبەر کێشەی کوردەکان.

وتم: لەوەتی گەیشتومەتە تـاران تـا ئـەمڕۆ، بەرپرسـە ئێرانی‌یـەکان چەنـدین کـەڕەت باسـی کێشـەی کوردیان لە گەڵ کردومەتەوە. وا تێگەیشتم ئێران گرنگی‌یەکی زۆر بە کێشەی کوردەکان ئەدا، عێـراق هـەرچی کارناسانی‌یەک بۆ ئاواتی کورد بکا ئەمان بە جەزرەبەیەکی دائەنێن بۆ سیاسـەتی ئێـران و بـە مەترسـی‌یەکی

دائەنێن لە دەرەوە دێتە سەریان. هەروەها وا حاڵی بوم کە سیاسەتی ئێرانی پشت ئەبەستێ بەو تەنمیناتەی دراویێتی دەربارەی یارمەتی نەدانی کورد بۆ وەرگرتنی لەوە زیاتر کە بەدەستیان هێناوە.

وتی: زۆر جار گفتوگۆمان بوە لە گەڵ تەیمورتاش دەربارەی کورد. ئەتوانم پێت بڵێم هەندێ جار دەمەقاڵەشمان بوە لەسەری. ئەوەی ئەیزانم سیاسەتی تورک بەرامبەر کوردەکانی دانیشتوی ئەو وڵاتە، سیاسەتی توندوتیژی و نەهێشتنیانە بە هەمو ڕێگایەک، ئینجا بە تورک کردنیان. بەڵام سیاسەتی ئێرانی بەرامبەر کورد بریتیە لە سیاسەتی پشت گوێ خستن. واتە فەرامۆش کردنی ڕەگەزی کورد و یارمەتی نەدانی لە ڕوی پەروەردە و تەندروستی و ئیسلاحات و شتی ترەوە تا ڕۆژێ دێ ئەوەندە لاواز بێ ئەتوانێ خۆی ڕابگرێ و، ناچار بێ لە ناو ڕەگەزی ئێرانیدا بتوێتەوە و نەمێنێ."(2)

حکومەتی کوردستان بۆ پڕ کردنەوەی دەلاقەی پشت گوێ خرانی دەیان ساڵ چەند هەنگاوێکی گرنگی هاویشت. مەنافی کەریمی لە "هەیئەتی ڕەئیسەی میللی" دا دانرا بە "وەزیری فەرهەنگ" و لە پاڵ ئەوەدا "هەیئەتی فەرهەنگی" یش دامەزرێنرا.

"هەیئەتی فەرهەنگی کوردستان" لە یەکێ لە کۆبونەوەکانی دا چەند بڕیارێکی گرنگی بەمجۆرە دا:

"ڕۆژی چوار شەممویە 12 ی 10 ی 24 جەلەسەی هەیئەتی فەرهەنگی کوردستان ساتی دو پێش نیوەڕۆ گیرا لە بابەت مەکتەب و دانانی دو نەفەر پشکنێر بۆ مەکتەبەکان گفتوگۆی لازم کرا. ئاغایانی عەلی خوسرەوی و ڕەحیم لەشکری بۆ پشکنێر هەڵبژێردران و حوکمیان سادر کرا.

قەرار درا ئەو منداڵانەی بێ کەسن وە بە سواڵ مەشغوڵن کۆ بکرێنەوە لە ناو میللەت دا بەش بکرێن و ڕۆژانە لە مەکتەبی گەلاوێژ بخوێنن و بۆ خڕ کردنەوەی ئەم هەژار و بێ کەسانە بە شارەوانی ئەمر درا کە خریان کاتەوە و بیان داتە دەست ئاغایانی حسێن فروهەر و مەنافی کەریمی و ئەوانیش بە نێو میللەت دا بەشیان کەن.

2. بە ئەکسەریەتی ئارا پەسەند کرا ئاغایانی فروهەر و کەریمی خەڵکی بێ سەواد حازر کەن کە شەوانە لە مەکتەب دا بە زمانی کوردی بخوێنن.
3. پەسەند کرا هەمو نیشانەی "تابلۆ" ئیدارات و مەکتەب و تیجارەتخانان و عەمارەتان بگۆڕن و بە کوردی بنوسرێ.
4. پەسەند کرا ئەو منداڵانەی کۆ دەکرێنەوە تەمەنیان لە 6 تا 14 ساڵان زیاتر نەبێ.
5. لە ئاخری جەلەسەدا پەسەند کرا کە جەلەسەی دیکە جۆری لیباسی شاگردی مەکتەب مەعلوم کرێ."(3)

یەکێکی تر لە کارەگرنگەکانی "هەیئەتی فەرهەنگی" ماوەندانی شێواندنی زمانی کوردی بو بە ناوی داهێنانی وشەی تازەکورە و دروستکراوەوە. کوردستان لەو بارەیەوە ئەم "ئاگاداری" یەی بڵاو کردۆتەوە:

"بە تەواوی زانایانی بەرزی کورد ڕادەگەیەندرێت:

بۆ وە کارهێنانی وشەی کوردی کە تا ئەوڕۆ وە کارنەهێندراوە دەبێ لە پێش دا بە هەیئەتی فەرهەنگی پێشنیهاد بکرێ و لەوێ دا تەسویب و ئیجازەی وە کارهێنانی بدرێ وە کەس حەقی نیە وشە ڕۆنێ و دەکاری بێنێ."(4)

ناوە فارسی و ناقۆڵاکانی مەکتەب و شوێنە گشتیەکان کران بە ناوی کوردی و خۆش. بۆ نمونە ئەم "ئاگاداری" یە لە کوردستان دا بڵاو کراوەتەوە:

"بە پێ ی دەستوری پێشەوا و ڕەئیسی جمهوری کوردستان لە 20 ی 10 ی 24 دا هەیئەتێک لە ئاغایانی فەرهەنگی لە ئیدارەی فەرهەنگ کۆببونەوە پەسەند کرا کە مەدرەسەی پەهلەوی بە نێوی مەکتەبی کرمانجی کوردستان نێودار بێ. خواهیش دەکەین لەو تاریخەوە بە نێوێکی کە پەسەند کراوە: (مەکتەبی کرمانجی) بناسن" (5)

قوتابخانەکان بە ناوی "کوردستان" و"گەلاوێژ" و"پێشەوا"... ناونران. وە نەبێ هەرناوی قوتابخانەکان گۆڕا بن. بەڵکو زمانی خوێندن و. جۆری خوێنـدن و. بەرنامـەکانی بـە گـوێرەی هەلومـەرجی سیاسـی نـوێ گۆڕان. کوردستان بە ئیمزای "معاونی حیزب - تەهازادە" بە نـاوی "کۆمیتـەی مەرکـەزی حیزبـی دیمـۆکراتی کوردستان" ئەم ئاگاداریەیەی بڵاو کردەوە:

"بە تەواوی ئەهالی خۆشەویستی سابلاغ رادەگەیەندرێت:

لە سەر ئەمری پێشەوای موعەزەم و قەراری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لەوێ بـەولاوە پێویسـتە بـۆ پەرەپێدان و رەواجی زمانی کوردی خوێندن لە مەدرەسەکان دا بە کوردییە. لەو تاریخەوە تا 10 رۆژی دیکـە هەر کەسێک کوڕ و کچی هەبێ کە عومری ئیقتیزای خوێندن بکا دەبێ بنێرێتە مەدرەسە. ئەڵبـەت هـەر کـەس لەو ئەمرە رو وەرگێڕێ بە توندترین موجازات تەنبێ دەکرێ. "(6)

لەم بڕیار و فەرمانەدا دو مەسەلەی گرنگی تێ دا باس کراوە:

(1) بە کوردی کردنی خوێندن لە قوتابخانەکان دا.

(2) تەعلیمی ئیلزامی منداڵان بۆ کوڕ و کچ.

هەنـدێ قوتابخانـەی نـوێ لـە سـابلاخ و بۆکـان و شـنۆ کرانـەوە. لەوانـە قوتابخانەیـەکی کچـان لـە شنۆ.(7)

چەند مامۆستایەکی کوردی عێراق لە وانە: محەمەد تۆفیق وردی، عەبدولقادر ئەحمەد، عوسمان دانیش، جەمیل بەهادین، لە رەوتی گەشەپێدانی خوێندن و پەروەردەدا بەشدار بون. دیارەی فەرهەنگی کوردستان بـۆ پێزانینی ئەم چاکەیە لە زمانی: "سدیقی - لە لایەن رەئیسی فەرهەنگی مـەهاباد" لـە رۆژنامـەی کوردسـتان دا سوپاسی بۆ نوسیون.(8)

چەند هەیئەتێک دانرا بون بۆ "پێ راگەیشتن بە کارەکانی فەرهـەنگ، ئـەوقاف، دانـانی دانیشـکەدەی مەعقول و مەنقول و..."(9) بەڵام تێکچونی حکومەتی کوردستان بو بە هـۆی سـەرنەگرتنی دامەزرانـدنی ئـەم دانیشکەدەیە.

حکومـەتی کوردسـتان رێـزی مـافی فەرهـەنگی و دینیـی کەمینـە دینیـەکانی گرتـوە. رێگـەی بـە "کلیمی" یەکان، واتە بە جوەکان، داوە قوتابخانەی تایبەتی خۆیان بکەنـەوە. لـە روژنامـەی کوردسـتان دا لـەو بارەیەوە ئەم "ئاگاداری" ە بڵاو کراوەتەوە:

"بە عومی میللەتی کلیمییانی دانیشتوی مەهاباد رادەگەیەنم کە لە ژێر حیمایـەتی حـەزرەتی پێشـەوای موعەزەم و مەحبوبی کوردستان و ئەزارەتی ئیدارەی موحتەرەمی فەرهـەنگ بـە ئیجـازە لـە مـەقاماتی بـەرزی کوردستان مەدرەسەیەک بە نێوی تێکەڵی کوردی وعیبری دەکەینەوە. پێویستە لە بـرواری ئـەو ئاگاداریـەوە منداڵانی خۆتان چە کوڕ و چە کچ بە دەفتەری ئەو مەدرەسە کە روبەڕوی عەمارەتی داودزادەیە بـە موعـەرەفی و بە سەبتی بگەیەنێ. لە غەیری ئەو سورەتەدا مـەجبورەن بـە وەسـیلەی شـارەوانی حـازر دەکـرێن. مـدیر و سەرپەرشتی مەدرەسەی عیبری - داودزادە"(10) رێگە دان بـە تـاقمی جـوی خـەڵکی مـەهاباد بـۆ کردنـەوەی قوتابخانەی تایبەتی خۆیان گرنگییەکی تایبەتی هەبو چونکە:

(1) زۆر لە مێژ نەبو جو لە ئەڵمانیا و قەڵەمڕەوی ژێردەستی ئەڵمانی دا کەوت بونـە بـەر هێرشـی لـە ناوبردنی بە کۆمەڵ. لە سەرانسەری دنیادا بە کەمایەتییەکی دینیی زۆرلێکراوی بێ دەسەڵات ئەژمێردران.

(2) فراوانی ئاسۆی بیرکردنەوەی سەرانی حکومەتی دیمۆکراتی کوردستانی دەرئەخست سەبارەت بـە رێزگرتنی مافی دینیـی و رۆشـنبیری کەمایەتیـیەکی پچـوکی دینـی. لـە وڵاتێـک دا کـە بـە درێژایـی زەمـان چەوساندنەوەی دینیی، مەزەبی، نەتەوەیی، تێ دا بوبو بە جۆرێ لە نەریتی حوکمڕانی.

## 1 .3 . زمانی حوکمرانی

زمانی هیچ نەتەوەیەک بێ هەبونی دەسەلاتی سیاسی نـاتوانێ وەکـو پێویسـت لـە بوارەکـانی قـانون، سیاسەت، ئابوری، دیپلۆماسی... دا گەشە بکات و دەولەمەن بـێ. کـوردیش لـەم قانونـە بـەدەر نیـە. چونکـە دەولەتی تایبەتی خۆی نەبوە، زمانەکەشی نەی توانیوە پێویستی‌یە زۆرەکانی مەیدانە جیاوازەکـانی ژیـان بـە ئاسانی بەدەستەوە بدات. حکومەتی کوردستان لە مەهاباد لە دوای تەجروبەی حکومـەتی کوردسـتانی جنـوبی بە سەرکردایەتی شێخ مەحمودی حەفید دوەمین تەجروبەی حوکمرانی کورد بو. هەردوکیان تازە بون. ئەبو لە نوێ خەریکی دانانی بناغەی زمانی دەولەت بن.

حکومەتی کوردستان، لە کاروباری رۆژانەی خۆی دا وازی لە زمانی فارسی هێنا و، هـەر لـە سـەرەتاوە هەنگاوێکی ئازایانەی هاویشت بۆ دانانی بناغەی ئەو زمانە پێویسـتە. کۆمیتـەی مەرکـەزی، کـە بـە کـردەوە، ئەرکی دانانی قانون و هەیئەتی رەئیسـەی میللی و، وەزارەتـەکانیش یـاخود وەکـو خۆیـان ناویـان بـردون: ئیدارەکان کـە ئـەرکی بـەرێوەبردنی کاروبـاری رۆژانـە و جێبـەجێ کردنـی بریارەکـان ئـەبینێ بـە کـوردی کارەکانیان ئەنجام دا. لەوەش دا سەرکەوتو بون و بە شێنەیی خـەریک بـو زمـانی کـوردی ئـەبو بـە زمـانی دەولەت و حوکمرانی. لێرە دا وەکو نمونە بۆ زمانی حکومەتیی: قانونی و ئابوری و بازرگانی چەند بریـار و ئاگاداری‌یەک ئەنوسینەوە:

### 1 .3 .1 . زمانی شەرعی

لە 24 ی ریبەندانی 1324 دا "رەئیسی هەیئەتی میللی کوردستان حاجی سەید بابا شێخ" دو بریـاری دەربارەی دو مەسەلەی کۆمەلایەتی گرنگ بلاو کردۆتەوە: رەدوکەوتن و، پرسەی مردو.

"رەدوکەوتنی کچان و ژنان قەدەغەیە

لە سەر قەراردادی هەیئەتی میللی کوردستان هەر پیاوێک بە زۆر ژنی بـە مێـرد، گوێزرابێتـەوە یـا نـە گوێزرابێتەوە، راکێشێ دەبێ بکوژرێ، بە زۆر ئەگەر کچێکیش راکێشـرێ دەبـێ ئـەو پیـاوە بکـوژرێ. ئـەمما کچێ خوازبێنی بکا مانیعی شەرعیش نەبێ، بە مێرد نەبێ و کچەکە رەزای بێ جـەزای نیـە وە گەرنـە لـە 3 مانگەوە تا 3 سال حەبس دەکرێ"

"لە تەرەف هەیئەتی میللی کوردستانەوە قەرار درا کە لێرە بەولاوە سەرەخۆشی کردن دەبێ بـە ئـەمری شەرعی ئیسلام بێ.

مردودار حەقی نیە بە هیچ جۆرێک زەحمەت و مەخاریج بکێشـێ. مەجلیسـی سەرەخۆشـی بـۆ پیـاوان دەبێ لە نزیکتر مزگەوتێ دابنرێ و نابێ پەزیرائی لە سەرەخۆشـیکەران بکـرێ. هـەروەکو شـەرع دەفـەرموێ مەجلیسی سەرەخۆشی رەسمەن رۆژێکە.

ئەم قەراردادە بۆ هەمو شار و دێهاتی کوردستان حوکمێکی هەیە."(11)

### 1 .3 .2 . زمانی قانونی

نمونەی 1 "ئاگاداری

بە هۆی ئەو نوسراوە لە سەر قەراری کۆمیتەی مەرکـەزی حیزبـی دیمـۆکراتی کوردسـتان بـە تـەواوی مەئمورینی حکومەتی کوردستان و میللەت رادەگەیەندرێت هەرکەس لە هەر مەمەرێکەوە بە هەر نێوێک تمەنێک تا چەند تمەن بۆ هەلسوراندنی کارێکی (چـە قـانونی شـەرعی و غـەیریهی) بـەرتیل و ریشـوە بـدات وە یـا

وەربگرێ لە پاش مەعلوم بون بە خاینی میللەت و مەملەکەت دەناسرێ و قەراری موجازاتی ئەو کەسانەش لە دە ساڵ حەبسی هەتا کوشتن (ئیعدام) تەسویب و موقەرەر کراوە.

کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان."(12)

نمونەی 2 "تەسویبی قانونی موجازات

بەرابەر بە ئەمرییەی ژمارە 1607 - 25/2/1 ی کۆمیتەی مەرکەزی حیزب، دیوانی حەربی هێزی دیمۆکرات تەشکیل و قانونی موجازاتیش وەک لە خوارەوە نوسراوە تەسویب بو:

قانون

مادە 1 جاسوسی کە بە یەقین گەیشت جەزای ئەو ئیعدامە. ئەمما ئەگەر دەلیلی تەخفیف لە کاردا بـبن تەواوی دارائی ئەو کەسە دەبێتە هی دەوڵەت، یان زیندانی بەکار لە شەش مانگەوە تا مردن.

مادە 2 مەستی و هەرزەیی لە دە ڕۆژەوە تا یەک مانگ زیندانی لە گەڵ کار و لە پەنجا تـا دوسەد قەمچی هەر نۆبەی لە پەنجا قەمچی زیاتر نەبێ.

مادە 3 دزین یان لە نێو بردنی ماڵی دەوڵەت لە چاو ئەو گوناحە کە کرویە ئیعدام یـا هەڵگرتنی دارایی ئەو کەسە بۆ دەوڵەت و یان زیندانی بەکار لە دو مانگەوە تا مردن و لە هەمو حـاڵ دا دەرکردنـی لە سەر خزمەت. کەسانێک کە بـە تفەنگ و یـان ئەسلەحەیەکی شەڕ جەردەیی و ڕێگری و یـان دزی بکەن ئەوانیش جەزایان هەروایە.

مادە 4 زۆرهێنان بۆ هاوسەر یان بۆ کەسانی دی یەکساڵ زیندانی بەکار و لێ ئەستاندنەوەی ئـەوەی کە سەندویە.

مادە 5 تریاک کێشان بێ بەش بون لە تەواوی حقوقی مەدەنی ئەوانەش کە لەسەر خزمەتن ئەگـەر لە دوایەدا فێری تریاک بن لە دوای یەکساڵ زیندانی بەکار لە سەر خزمەت دەردەکرێن.

مادە 6 هەڵاتن لە شەڕدا و ئەسلەحە بە دوژمن دان جەزای ئیعدامە.

مادە 7 خەیانەت بە میللەت یان دەوڵەت یان نیشتمان ئیعدامە ئەمما ئەگەر دەلیلی تەخفیف لـە بـەین دا بێ وەک لە مادەی 1 دا نوسراوە ڕەفتار دەکرێ.

مادە 8 دەسدرێژی بە ناموسی خەڵک جەزای هەر بـەو جۆرەیـە کـە لـە هەیئـەتی ڕەئیسـەی میللـی دا گوزەراوە.

مادە 9 بەرتیل وەرگرتنیش هەروەها.

تێبینی 1: تەواوی گرتوان (دوکتۆر، لیسانس، دیپلومە و ناقیس نەبێ) لـە ڕۆژی گیرانـەوە بـە ئـەمری ئەو مەقاماتەی کە سەلاحیەتیان هەیە مومکینە کاریان پێ بکرێ ئەمما ڕۆژی لە 6 سەعات زیاتر نـا و ڕۆژانـی تەعتیلیش هەرنا.

تێبینی 2: ئەفسەران و ئەفەراتی هێزی دیمۆکراتی کوردستان و جاسوسانی خاریج ئەگەر یـەکێک لـەو گوناحانەیان لێ ڕو بدا هەر لە دیوانی حەرب پێی ڕادەگەن خەڵکی خـاریج لـە هێـزەوەش بـە پـێی فـەرمانی ریاسەتی موعەزەمی جمهور ئەم دیوانە حوکمیان دەکات.

ئەوا بۆ ئاگاداری تەواوی دیمۆکراتی کوردستان ئەم قانونە چوارجار لە دوی یەک لە ڕۆژنامەدا چاپ و بڵاو دەکرێتەوە خودا بکات هیچ کەس یەکێ لەو گوناحانەی لێ ڕونەدا حەتمەن بەو موجازاتـەی کـە نوسـراوە گرفتار دەبێ.

سەرۆکی دیوانی حەربی هێزی دیمۆکراتی کوردستان          ئیبراهیم سەلاح "(13)

### 1. 3. 3. زمانی بازرگانی

"ئاگاداری

لە نەتیجەی جەلەسەی ڕۆژی جومعەی 19 ی ڕێبەنـدانی 24 وا قـەرار درا سـەرمایەی ئەسـڵی شیرکەت بە یەک ملیون تمەن دانراوە کە سولسێکی نەغدە دو سولسی دیکە قەبزی سپەردەی دوخانیە لە کەسانێکی پولی نەغدیان نەبێ قبوڵ دەکرێ بەڵام قازانجیان بۆ حساب ناکرێ هەتا وسولی پولی ئەو قەبزانە و شیرکەتی تەرەقی موجاز کرا سەرمایەی خـۆی بـە دو موقابیـل مەبلـەغی ئەسـلی زیـاد بکـا کەسانێکی تا وێستاکە سەهمیان نەکڕیوە ئەوانیش دەتوانن بە قـەبزی سـپەردەی دوخانیـە هەرچەنـد سەهمێک مایل بن بکڕن هەر سەهمی شیرکەت عیبارەتە لە یەک هەزار تمەن لە برواری نـەو نوسـراوە قەبزی سپەردەی دوخانیە قبوڵ دەکرێ هەتا ئـاخر مـانگی ڕەشـەمەی 1324 هەرکـەس مایلـە قـەبزی خۆیان بە نێوی شیرکەتی تەرەقی کوردستان ئینتیقال بدەن. مـودیری شـیرکەتی تـەرەقی کوردسـتان محەمەد ئەمین موعینی"(14)

### 1. 3. 4. زمانی پێشمەرگایەتی

کاربەدەستانی وەزارەتی هێز تەقەللایەکی زۆریان داوە بـۆ دانـانی نـاو و وشـەی کـوردی لـە جێگـای زاراوەی بێگانە. "سەرۆکی ستادی هێزی مەرکەزی دیمۆکراتی کوردستان مرادی" لە نامەیـەکی ڕەسـمی دا بـۆ ڕۆژنامەی کوردستان نوسیویێتی:

"بەرگەیەک لە ئـەلقابی قـەدیم کـە بـە تـازەگی لـە دانیشـتوی ئەفسـەران دا تەسـویب کـراوە لـە گـەڵ دەنێردرێت پێویستە لە ڕۆژنامەی دا دەستور بە چاپ کردنی دەفەرمون:

| ئیستیلاحاتی قەدیم | ئیستیلاحاتی تازە |
|---|---|
| سەرباز | پێش مەرگە |
| جوگە | لێزگە |
| گروە | قۆڵ |
| دەستە | دەستە |
| گروهان | چڵ |
| گوردان | لک |
| هەنگ | پۆل |
| تیپ | تیپ |
| لەشکر | لەشکر |
| سپا | هێز" (15) |

لـە ژمـارەی 17 ەوە بـە ئیمـزای "فەرمانـدەی هێـزی مەرکـەزی دیمـۆکراتی کوردسـتان ئانـەوازادە" لیستەیەکی تری "لوغاتی مەربوت بە پێش مەرگەی کە کراوە بە کوردی...." بڵاو کراوەتەوە.

## 2. دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان

چاپخانە یەکێکە لە نیشانەکانی پێشکەوتنی وڵات و، بۆ پێشەوە چونی لە مەیدانی شارستانیتی دا. هەر وەکو حکومەتانی داگیرکەری کوردستان نەیان هێشتوە نوسینی کوردی لە چاپخانە گەورەکانی پایتەخت و شارە گەورەکان دا چاپ بکرێ، مۆڵەتیشیان نەداوە لە کوردستان چاپخانە دابمەزرێ و گەشە بکات. لە کوردستانی عێراق کۆنترین چاپخانە ئەوەبو مێجەر سۆن دوای تێکدانی حوکمداریتی شێخ مەحمود (1919) لە گەڵ خۆی بۆ چاپکردنی رۆژنامەی پێشکەوتن هێنایە سلێمانی. ئەم چاپخانەیە بو بە هی حکومەت. هەمو رۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحمود و دوای ئەو بەمە چاپ کران. دوایێتر پیرەمێردیش چاپخانەیەکی کڕی و حەفتەنامەکانی "ژیان" و"ژین" ی پێ چاپ ئەکرد. جگە لە چاپخانەی "بەلەدیە" یاخود "حکومەت"و چاپخانەی "ژین" تەنیا چاپخانە ئەوە بو کە حسێن حوزنی موکریانی لە رواندز دای مەزراند بۆ چاپی گۆڤاری "زاری کرمانجی" و هەندێ نوسراوی تری کوردی. هەمویان کۆن بون و بە دەست بەکار ئەخران.

لە کوردستانی ئێران کۆنترین چاپخانە ئەوانی ورمێ بون، ئەوانەش هەندێکیان موڵکی میسیۆنێرە بێگانەکان بون و دوای سییەکان چاپخانەش دامەزرابێ هەم بچوک بون و، هەم بەرهەمی کوردییان پێ چاپ نەکراوە. لەبەرئەوە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد و چاپخانەی بۆکان بە رووداوێکی گرنگ دائەنرێ لە مێژوی رۆشنبیری و سیاسی کوردستانی ئێران. بەگەر خستنی چاپخانەکە و چاپکردنی رۆژنامەی کوردستان بە لای تێکۆشەرانی حیزب و گەورە پیاوانی کوردەوە بە رووداوێکی ئەوەندە گەورە دائەنرا، ئەو رۆژە جێژنیان بۆ کرد. کوردستان خۆی لەو بابەتەوە رێپۆرتاجێکی نوسیوە:

"جێژنی کردنەوە ئیدارەی رۆژنامەی کوردستان

رۆژی 20 ی 10 ی 24 ساتی 5 ی پاش نیوەرۆ لە ئیدارەی رۆژنامە و گۆڤاری (کوردستان) بە موناسەبەتی کردنەوەی ئیدارە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و ژمارەی رۆژنامەی کوردستان جێژنێکی بە شەوکەت گیرا. عولەمای ئەعلام و ئەعزای حیزبی دیمۆکرات و نوێنەرانی نوقاتی کوردستان و توجار و موحتەرەمینی مەهاباد و زۆر لە ئاغایانی ئەتراف لەم جێژنەدا حزوریان بو.

لە پێش دا جەنابی حاجی باباشێخ بە نوتقێکی کورت جەلەسەی ئیفتیتاح فەرمو و، لە زیمن دا لە جەنابی قازی محەمەد رەئیسی حیزبی دیمۆکرات و پێشەوای میللی و دینیی کوردستان زۆر تەمجید و تەحسینی کرد و فەرموی: "وجودی وی بو مە غەنیمەتە و هەر ئەو دەتوانێ کەشتی کوردستان لە نێو شەپۆلی سیاسەت دا بگەیەنێتە ساحیل."

سەید محەمەدی تەهازادە معاونی حیزب لە لایەن پێشەواوە: قادری مودەریسی بە سەرۆکی بنگاهی چاپخانە، عەلی خوسرەوی بە مدیری داخلی چاپخانە، سەید محەمەدی حەمیدی بە مدیر و سەرنەبیری رۆژنامە و گۆڤاری کوردستان ناساند."

لەم کۆڕەدا سەید محەمەدی حەمیدی، ئیبراهیم ئاغای ئەدهەم، قاسم ئاغای ئێلخانی زادە، سدیقی حەیدەری، وتاریان خوێندەوە. شاگردانی مەدرەسە سرودی میللییان پێشکەش کرد. بە قسەی رۆژنامەکە "لەم ئانەدا کە حوزار لە نێو شادی و چەپڵەرێزان دا غەرقی شادی بون چرابەرق هەڵ بو و چاپخانە دەستی کرد بە کار و حوزار بو دیتنی چاپخانە بانگ کران. دەستە دەستە ئاغایان دەستگای چاپخانەیان دیدەن کرد و جێژن ساتی 7 ی پاش نیوەرۆ تەواو بو"(16)

وەکو لە رۆژنامەکەدا دەرئەکەوێ سەعید رزگەیی و محەمەدی شاپەسەندی لە چاپخانەکەدا کاریان کردوە. هەندێ جار شیعر و وتاریشیان بڵاوکردۆتەوە.

لە ڕۆژانی داهاتوودا قازی محەمەد و زۆری تر لە پیاوە ناسراوەکانی کورد چوون بۆ دیـدەنی چاپخانـەی کوردستان و داربوویان پێ کردوون. چاپخانەی کوردستان لە چـاو کـورتی تەمـەنی دا بەرهـەمێکی زۆری چـاپ کردووە.

## 2. 1. گۆڤاری کوردستان

ژمارەی یەکەمی ساڵی یەکەمی گۆڤاری "کوردستان" لە 15 ی سـەرماوەرزی 1324. دا بەرامبـەر 6 ی دیسەمبەری 1945 لە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپ و بـڵاو بوتـەوە. گۆڤـاری "کوردسـتان" لـە ژێـر ناوەکەی دا نوسراوە: "بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان" و"گۆڤـارێکی ئـەدەبی، کۆمەڵایـەتی، سیاسییە، هەر پازدە ڕۆژ جارێک بڵاودەکرێتەوە".

سەید محەمەدی حەمیدی سەرنوسەری گۆڤارەکە بوە.

گۆڤارەکـە خـۆی بـە ناونیشـانی "خوێنـدەوارانی بـەڕێز" ئامانجـەکانی خـۆی بـەم جـۆرە ڕوون کردۆتەوە:

"خۆمان گەلێک بە بەختیار دەزانین کە بە یارمەتی خودا یەکـەم ژمـارەی "کوردسـتان" تـان پێشـکەش دەکەین و هیوامان هەیە بە دڵێکی خۆش لێمان وەرگرن و لە حدودی دەسەڵاتی خۆتان دا بـۆ بڵاوکردنـەوە و ژیاندن و پێش خستنی ئەو گۆڤارە یارمەتیمان بدەن تا ئەی گەیەنینـە ڕیـزەی گۆڤـارە هەرەچاکـەکانی گێتـی چونکە ئەو هۆش و لێکدانەوە و گەرمییەی کە ئێمەی خستۆتە سەر دەرهێنانی ئەم گۆڤارە لـە دڵـی گـەرمتر و بەتینترە.

نە کەس لە پڕێ دەبێ بە کوڕێ و نە ئێمەش بە گەورەیی و پۆشتەیی و خوێندەواری لـە دایـک بـووین. هەمو شتێ سەرەتایەکی هەیە و هەمو شتێ لە سەرەتادا کەموزۆر ناتـەواوی و کـەم و کـورتی تێدا دەبێ کوتوپڕ نابێ لێی زویـر بـن و فـڕێی دەنـە لاوە. "کوردسـتان" وەکـو گۆڤارەکـانی گێتـی ڕەنگاوڕەنگ و پڕ وێنە و ڕێکوپێکی نابینن چونکو کاڵا لە قـەد باڵایـە و دیـاری شـوان ئاڵەکۆکـە و چـاکی و خراپـی و دوا کـەوتن و پێشـکەوتنی هـەمو گۆڤارێـک بـە پـێی کـەموزۆری و دڵسـۆزی و کەمتەرخەمی خوێندەوارەکانێتی.

کوردستان گۆڤارێکی ئەدەبی. تاریخی. کۆمەڵایەتی (اجتماعی) مانگیی کوردییـە یەکـەمین ئارمـانی بژار و ژیانەوەی زمان و ئەدەبیاتی کوردییە و زیندوکردنەوەی کورد و کوردستانە بە پێی شارسـتانێتی ئەمڕۆ و بۆ ژیانەوەی نێو و ئاساری زانایـانی کـورد تەقـەلا دەدا لـە بـەر ئـەوە تکـا لـە خوێنـدەوارانی خۆشەویست دەکەین هەر کەس بەیت و حیکایات و سەرگوزەشتەی پیـاوێکی مـەزن وە یـا عەشـیرەتێکی کوردی لە کن بێ و یان نوسراوێکی لەلا بـێ یـا لەبـەر بـێ: کـوردی، فارسـی، عـەرەبی... ماداﻣێـک هـی زانایانی کورد بێ و لە چاپ نەدرابێ بۆمان بنێرن کە بە یارمەتی خودا لە چاپی بدەین کـە بـە سـەرهاتی ڕۆژگار لە نێوی نەدا."

بابەتەکانی ژمارەی یەکەمی بریتییە لە: ل 2 تا 4 شەرحی حاڵی ستالین. ل 5 تا 8 پەیامی من بە میللەتی کورد. ل 9 تا 10 بۆ پەیدا نەبونی جەنگی سێیەم. ل 11 تا 16 کردەوەی حیزبی دیمـۆکرات. ل 18 تا 20 دیموکراسی چیە. هەروەها دو شیعری هەژار و شیعرێکی خاڵـەمین کە لـە هـەوەڵ کـۆنگرەی حیزب دا خوێندویانەتەوە و. شیعرێکی م م عەشقی و. شیعرێکی کۆکەیی سانی. گرنگترین بابـەتی ئـەم ژمارەیە ئەو ڕیپۆرتاجەیە کە لە سەر بەستنی یەکـەمین کـۆنگرەی حیزبـی دیمـۆکراتی کوردسـتان بـڵاوی کردۆتەوە.

ژمارەی دوەمی لە 30 ی سەرماوەزی 1324 بەرامبەر 21 ی دیسەمبەری 1945 دەرچوە. بابەتەکانی بریتییەلە: ل 1 تا 6 زبان و ئەدەبیاتی کوردی (لێکۆڵینەوەیەکی فارسی) م حەمیدی. ل 6 شیوەنم بۆ وەتەنە (شیعر) خ شێواو. ل 7 تا 9 بڕی دیمۆکرات (شیعر) م هێمن. ل 9 تا 10 نەی دایکی نیشتمان (پەخشان) ع خوسرەوی. ل 10 تا 11 دەورە دەورەی هونەر و کار دەبێ (شیعر) م عەشقی. ل 11 تا 14 نامەی کچێکی دیل (وەرگێڕان) م هێمن. ل 14 فرمێسکی هەتیو (شیعر) ع هەژار. ل 14 تا 17 دیموکراسی چیە م نژادی. ل 17 تا 18 هەڵ دەکەم (شیعر) م هێمن. ل 18 تا 20 ژەنرالیسموس ستالین م حەمیدی. گرنگترین بابەتی ئەم ژمارەیە ڕێپۆرتاجێکە لە سەر "هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردستان لە نەغەدە".

دەرچونی گۆڤاری "کوردستان" هاوزەمان بو لەگەڵ هەڵچونی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا لە ئێراندا. لەو ماوەیەدا روداوی مێژوساز قەومان. دەست کرا بە دەرکردنی ڕۆژنامەی ڕۆژەنارۆژەی "کوردستان" لە هەمان چاپخانە بە هەمان نوسەر و کرێکار لە بەر ئەوە ژمارەی سێیەمی گۆڤاری کوردستان دواکەوتوە تا خاکەلێوە.

ژمارەی سێیەمی لە مانگی خاکەلێوەی 1325 بەرامبەر مارسی 1946 دەرچوە بابەتەکانی بریتییە لە: عەکسی پێشەوای موعەزەمی کوردستان. ئیبن خەلەکان سەید محەمەد حەمیدی. سۆسیالیستی چیە (وەرگێڕان) ب شیرین. فێلد مارشاڵ کوتوزوف (وەرگێڕان) محەمەدی شاپەسندی. سەرگوزەشتی من (پەخشان) دڵشاد رەسولی. ئەشعاری مەرحوم سەیفولقوزات. یا وەتەن یا مردنم (شیعر) محەمەد گلۆلانی عەتری. سوزەی دەرون (شیعر) محەمەد گلۆلانی عەتری. گرنگترین بابەتی ئەم ژمارەیە ڕێپۆرتاجێکە لە سەر "هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردستان لە مەهاباد".

گۆڤاری کوردستان لە گەڵ روخانی حکومەتی کوردستان دا لە دەرکەوتن کەوت.

### 2 .2. ڕۆژنامەی کوردستان

یەکەمین ژمارەی لە ڕۆژی پێنجشەممو 20 ی 10 ی 1324 بەرامبەر 11 ی کانونی دوەمی 1946 دەرچوە لە سەر ناوی ڕۆژنامەکە نوسرا بو: "بە ناوی خودای بەرز و بێ هاوتا" و لە ژێریشی دا: "بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان".

دەرچونی "کوردستان" تەجروبەیەکی تازە بو لە ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری نەتەوەی کوردا. بۆ کوردستانی ئێران بایەخێکی زۆری هەبو. دوای تەقەللا تەمەن کورتەکەی سمکۆ، یەکەمین جار بو لە شارێکی ئازادی کوردستان دا بە زمانی کوردی بڵاوکراوەیەکی ڕێکوپێکی بەردەوام دەربچێ.

سەید محەمەد حەمیدی سەرنوسەری ڕۆژنامەکە لە ژێر سەر دێڕی "ئامانجی ئێمە" دا لە یەکەمین ژمارەی دا نوسیویتی:

"لەم کاتەدا کە خاکی کوردستان لە هەمو وەختێک زیاتر پێویستی بە فیداکاری کوڕەکانێتی.

لەو ئانەدا کە هەمو نەتەوەکانی گێتی بۆ ڕاگرتن، بۆ وە دەستهێنانی سەربەستی و ئازادی خۆیان وە بۆ وە دەس خستنی وەسائیلی پێشکەوتنی هاونیشتمانەکانیان دە تەقەلادان.

لەو وەختەدا کە هەمو نەتەوەکانی عالەم غەیرنەز سەربەستی و گەورەیی نیشتمانەکەیان ئامانجێکیان نیەو بە شەو و بە ڕۆژ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هەوڵ دەدەن. ئێمە خەریکی چین و ئامانجمان چیە؟

پاش چەندین ساڵ دەربەدەری و سەرکزی و بەند و تێهەڵدانی بێ ژمار و قوڕبەسەری و هەژاری، لە پاش ئەوەی بە ئیشارەتی دوژمنان بە ناوی مەنگوڕ و مامەش و زەرزا و دیبوکری و گەورک و گەڵباغی و..

کەوت بوینە گیان و ماڵی یەکتر و خوێنی یەکترمان دەمژی و دەڕشت و بۆ قازانجی شەخسی خۆمان هیچ شتێکمان نەدەهاتە بەر چاو و هەر خەریک بوین دوبەرەکی و تەفرەقە بخەینە نێو یەکتر. بە کورتی پاش ئەوەی هیچ وەختێک لە بیری هاونیشتمانی خۆمان دا نەبوین و لە تەپوتۆزی زەمانەدا بە غەیری نەفعی خۆمان بیرێکمان نەبو و دوژمنەکانمان نەیان دەهێشت بە زمانی خۆمان بخوێنین و لە تیشکەی زانستی دەورەی بیستەم بێ بەش کرا بوین بیری سەربەستی لە لامان خەیاڵی پوچ بو و، ئەوانەش کە بیرێکیان هەبو کەم بون بە تایبەتی غولی دیستیبدادی ڕەزاخان بە جارێک پشتی ئێمەی شکاند بو. پیاوە نیشتمانپەروەرەکانی کوردستان یا کوژران یا لە شیراز و تاران و خۆراسان دا بەند کران. لەو کاتەدا کە زیللەت و دەربەدەری بە نوقتەی ئاخر گەیشت خودای بەرز هاتە سەر ڕەحم و بەزەیی بە ئێمەدا هات. شەهریوەری 1320 هاتە پێش. ئێمە لە زنجیری دیلی ڕزگاریمان بو، وە دەستی بەستراومان کراوە، چاوی دوستومان وە خەبەر هات. کۆمەڵێک لە لاوان و گەنجانی کوردستان کۆبونەوە دەستی برایەتی و یەکێتی‌یان دا دەس یەک، بێوچان سەعی‌یان بە خەرج دا تا حیزبی دیمۆکراتیان بە وجود هێنا و هەر بەرهەڵست و خائینێک کە لە ناو کوردستان دا هەبو لە نێویان هەڵگرت. حیزبی دیمۆکرات لە مەودایەکی کەم دا توانی لکی خۆی لە تەواوی شارەکانی کوردستانی ئێران بکاتەوە. ئێستا لە کوردستان دا نێوی مەنگوڕ و مامەش و زەرزا و دیبوکری و... و هەر پیتێ کە بۆنی جودایی لێ بێ ناکوترێ. هەمو بە یەکدەنگ دەڵێن: ئێمە کوردین کوردمان دەوێ. ئیمڕۆ سەرکزیمان بە سەربڵیندی و هەژاریمان بە دەوڵەمەندی و دوبەرەکیمان بە یەکێتی گۆڕیوەتەوە.

... بۆ میللەت کار دەکەین و بە زمانی شیرینی کوردی دەخوێنین، ئەخلاقی خەراپمان گۆڕیوەتەوە بە ئەخلاقی چاک. ئێمە کە بە دڵمان دا ئەدەهات خاوەنی چاپخانە و ئینتیشارات بین، ئەوا بە یارمەتی خودا نامەی کوردستان داندرا و هەوەڵ ژمارەی بڵاوکراوە، ئەم نامەیە کە لە لایەن حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بڵاو دەبێتەوە دەیەوێ قەڵایەکی ئاسنین لە ئیتیحاد و برایەتی بێنێتە بەرهەم کە بناغەکەی بە زانست و هونەر و لەشساخی داندرا بێ و بتوانێ دە گەڵ سێڵاوی دوبەرەکی و بێدینی و هەمو جۆرە ڕەوشتێک کە بۆ سەربەستی زەرەر بێت بەربەرەکانی بکا.

هیوامان وایە کە ئەم قەڵایە کە خەریکین قایمی بکەین: وەها قایم و بەهێز بێت کە هیچ هێزێک نەتوانێ بەربەرەکانی لە گەڵا بکا."

هەر لە لاپەڕەی یەکەمی ژمارەی یەکەم دا وتار بۆ "ژەنراڵیسموس ستالین بە بۆنەی 66 هەمین ساڵی لە دایک بونی" تەرخان کراوە. جگە لەمانە "گفتوگۆی جەنابی قازی محەمەد: پێشەوای بەرزی کوردستان دەگەڵ خاوەنانی ڕۆژنامەی تاران" و ڕیپۆرتاجێ لە سەر "هەڵکردنی ئاڵای موقەدەسی کوردستان لە شاری بۆکان" لە گەڵ چەند هەواڵ و ئاگاداری‌یەکی کورت.

کوردستان ژمارەیەکی زۆر بابەتی سیاسی، کۆمەڵایەتی، دینیی، ئەدەبی، بڵاو کردۆتەوە. لەو سەردەمەدا شیعری سیاسی بە جۆرێکی دیار گەشاوەتەوە.

سەید محەمەدی حەمیدی چالاکترین نوسەری ڕۆژنامەکە بو. جگە لە چەندین سەروتار و لێدوانی سیاسی لە سەر بابەتەکانی ڕۆژ، بە زنجیرە: ڕیپۆرتاجێکی درێژی لە سەر "جێژنی سەربەخۆیی و ئیستیقلالی کوردستان" و، وەرگێڕاوی فارسی "کوردان از بدو تاریخ تا ساڵ 1920" ی لەسەر مێژوی کۆنی کورد و، وەرگێڕاوی کوردیی "بەسەرهاتی ئارارات" ی "ڕۆژنامەی کوهستان" ی تارانی و، "زانایانی کورد" ی بڵاو کردۆتەوە. "بەسەرهاتی ئارارات" ئاگاداری زۆر و زانیاری بە نرخی لە سەر شۆڕشی ئاگری تێ دایە.

حەسەن قزڵجی، هێمن، هەژار، هاشم خەلیل زادە، رەسول مکائیلی، دڵشاد رەسولی، ئیبراهیم نادری، لە نوسەرە دیارەکانی رۆژنامەکەن. جگە لەوان چەندین کەسی تر وتار و بابەتی جۆراوجۆریان بڵاو کردۆتەوە لەوانە: قادر مودەریسی، محەمەد مەجدی، مەلا محەمەد ئەیوبی، عەلی خوسرەوی، عەزیز مەولەوی، عەبدورەحمان ئیمامی، محەمەد شاپەسەندی، سەید محەمەد تەهازادە، عەبدورەحمان زەبیحی، ئەحمەد ئیلاهی، عەبدورەحمان سالار، سەید عەبدولقادر سیادەت، قاسم نوتەمیشی، عەبدولقادر دەباغی، محەمەد یاهو، محەمەد قادری.

جگە لە هەژار و هێمن کە بە بۆنەی جیاوازەوە ژمارەیەکی زۆر شیعری سیاسی‌یان لە کوردستان دا چاپ کردوە، چەند شاعیری تریش یەک شیعر یا زیاتریان بڵاو کردۆتەوە لەوانە: خاڵەمین، حەقیقی، خالید حیسامی (شێواو)، عەلی حەیدەری، سەید کامیل، سەعید زرگەیی.

لە کوردستان دا ئافرەت بێ بەش نەبون. سەرەڕای دواکەوتنی هەلومەرجی ئەوسای وڵات و، زۆری نەخوێندەوار لە ناو پیاوان دا چ جای ژنان، چەند ئافرەتێکیش کە یان لە بۆنە سیاسی‌یەکان دا "خیتابە" یان داوە و لە کوردستان دا بڵاو کراوەتەوە وەکو: ویلمەی سەیادیان، خەدیجەی حەیدەری، سەڵتەنەت داودزادە، عوشرەت عەزیمی، فەریدە زەندی، ئیرانی بلوری، یا وتاریان نوسیوە وەکو: کوبرا عەزیمی، حەلەب سمایلی فەرەجی، شاە سوڵتان خانم فەتاحی قازی.

چەند نوسەری کوردی عێراقی بە نوسین و شیعر بەشداری "کوردستان" بون. لەوانە: محەمەد مەحمود (شەهید محەمەد قودسی)، محەمەد تۆفیق وردی، عەبدولقادر ئەحمەد، یەحیا چروستانی، ئەنوەر دڵسۆز، شوان، میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری، قانع.

رۆژنامەی کوردستان نرخێکی مێژویی گەورەی هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی روداوەکانی ئەوسای کوردستان چونکە: بەشێکی زۆری نوتقەکانی قازی محەمەد و کاربەدەستەکانی تر و هەواڵە سیاسی و کۆمەڵایەتی و پێشمەرگەیی و فەرهەنگی‌یەکانی حکومەتی کوردستانی تێدا بڵاو کراوەتەوە.

نە حکومەتی کوردستان "ئاژانسی دەنگوباسی" تایبەتی خۆی و نە هیچ ئاژانسێکی بێگانە بنکەی لە کوردستان هەبوە، لە بەر ئەوە سەرچاوەی هەواڵەکانی کوردستان هەر رادیۆکانی بێگانە و رۆژنامەکانی دەرەوە بون.

لە گەڵ تێکچونی حکومەتی کوردستان رۆژنامەی "کوردستان" یش لە بڵاوبونەوە کەوت. وەکو دەڵێن: بە هەموی 112 یاخود 114 ژمارەی لێ دەرچوە.

رۆژنامەی کوردستان ئەهێنێ سەرلەنوێ چاپ بکرێتەوە. لێکۆڵینەوەی تایبەتی لە سەر ناوەرۆک و بابەتەکانی و نوسەرەکانی بنوسرێ.

### 2. 3. هاواری نیشتمان

یەکەمین ژمارەی لە 1 ی خاکەلێوەی 1325 دا بەرامبەر 21 ی مارسی 1946 لە مەهاباد لە چاپخانەی کوردستان دەرچوە. هاواری نیشتمان "بڵاوکەرەوەی بیری یەکەتی جەوانانی دیمۆکرات" و"گۆڤارێکی: ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتی" بوە.

مودیری مەسئولی سدیقی ئەنجیری ئاژەر بوە.

### 2. 4. گۆڤاری گروگاڵی منداڵان

### 2. 5. گۆڤاری هەڵاڵە

## 3. ڕادیۆی: "کوردستان قسان دەکا"

دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی لەو وڵاتانەدا کە کوردیان بەسەردا دابەش کراوە بەشێ بوە لە دەزگاکانی حکومەت. کوردیش کە نە خۆی حکومەتی هەبوە و، نەبەشی لەو حکومەتانەدا هەبوە، هەمیشە لەو دەزگایانەدا بەشی نەبوە. تەنانەت مافی ئەوەشی نەبوە بە زمانەکەی خۆی لەو دەزگایانەوە گۆرانی بڵێ. بەریتانیا و فەرەنسە لە جەنگی جیهانی دوەم دا وەکو بەشێ لەو هێرشە پروپاگەندەییە فراوانەی لە ساڵانی جەنگ دا دژی ئەڵمانیا و دەوڵەتانی میحوەر دەستیان پێ کرد، هەندێ کاری پروپاگەندەییان، چ بە چاپ و چ بە ڕادیۆ، بە زمانی کوردی کرد.

ساڵی 1939 ئیستگای ڕادیۆی بەغداد 15 دەقیقەی بۆ بەرنامەی کوردی تەرخان کرد. ساڵی 1943 بەریتانیاش 3 کەس لە ئەدیب و هونەرمەندانی کورد: گۆران، رەفیق چالاک، ڕەمزی قەزازی بانگ کرد بۆ شاری یافا لە فەلەستین بۆ ڕێکخستنی بەشی کوردی ڕادیۆی عەرەبیی "ڕۆژهەڵاتی نزیک". هەرچەندە ئەم ڕادیۆیە تەرخان کرابو بۆ بڵاو کردنەوەی هەواڵەکانی جەنگ و پروپاگەندە بۆ بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی، بەڵام سرودی نەتەوەیی و گۆرانی و بەرنامەی کوردی خۆشی پێشکەش ئەکرد. گۆڤاری "گەلاوێژ" لە کوردستانی عێراق و گۆڤاری "نیشتمان" لە کوردستانی ئێران بە خۆشییەکی زۆرەوە هەواڵی دامەزراندنی ئەم ڕادیۆیەیان بڵاوکردۆتەوە.

ڕادیۆ ئەتوانێ دەورێکی کاریگەر لە یەکخستنی زمان و گەشەپێدانی هەست و هۆشی هاوبەشی نەتەوەیی و لە سازدانی بیروڕای گشتی خەڵک دا بگێڕێ. کاربەدەستانی حکومەتی کوردستان گرنگی ڕادیۆیان ئەزانی. یەکەمین ئیستگای ڕادیۆیان دامەزراند. لە چلەکان دا بەهۆی دواکەوتنی هەلومەرجی ئابوری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دانیشتوان و، بڵاویی هەژاری و نەخوێندەواری لە کوردستان تاکوتوک ڕادیۆ هەبو. لە گەڵ ئەوەش ئەم ڕادیۆیە بایەخی سیاسی گەورەی هەبو. ڕۆژنامەی کوردستان ڕیپۆرتاجێکی لە ژێر سەردێڕی "کوردستان قسان دەکا" بڵاو کردۆتەوە. لەبەر نرخی مێژویی ڕوداوەکە، وا لە خوارێ ئەی نوسینەوە:

"ڕۆژی سێ شەممو 10 ی بانەمەڕی 1325 ئیستاسیۆنی ڕادیۆی مەهاباد پایتەختی حکومەتی میللی کوردستان دەگەڵ 5 دەستگا بڵێندگۆ کە (1. لە حەوشی کانگای حیزبی دیمۆکرات 2. لە پێشمەرگەخانە 3. ڕوبەڕوی شارەوانی 4. ڕوبەڕوی خانوی حەزرەتی پێشەوا 5. ڕوبەڕوی مزگەوتی عەباس ئاغا نەسب کران) دانرا و ڕەسمەن کرایەوە و جێژنێکی جوان گیرا بو. لەم جێژنەدا جەنابی حاجی سەید بابا شێخ ڕەئیسی هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کوردستان و ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی و کاربەدەستانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و ژمارەیەکی زۆرلە ئاغایانی دەرەوە و ڕیجال و موحتەرەمینی شاری مەهاباد حزوریان بو.

لە ساتی چواری پاش نیوەڕۆ ئاغای سەید محەمەد تەهازادە معاونی حیزبی دیمۆکرات جەلەسەی دەست پێ کرد و لە تەرەقیات و پێشکەوتنی... لە دیتیحادی جەماهیری شورەوی دا بەیاناتێکی چاکی کرد.

پاش ئەو جەنابی سەید بابا شێخ لە لایەن هەیئەتی ڕەئیسەی میللی، ئاغای محەمەد ئەفەندی لە لایەن ژەنەراڵ مەلا مستەفای بارزانی، جەنابی قازی محەمەد لە لایەن کۆمیتەی لکی بۆکان، ئاغای سەلاح لە لایەن هێزی کوردستان، ئاغای عەلی خوسرەوی لە لایەن ئیتیحادیەی جەوانان، ئاغای دڵشادی ڕەسوڵی لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی، ئاغای ئەحمەدی ئیلاهی لە لایەن زەحمەتکێشان و جوتیارانی کوردستان، ئاغای کوڕی کورد لە لایەن مەدرەسەی کوڕان، ئاغای حەسەن داودی لە لایەن بازرگانان، ئاغای مایور عەلی زادە هێنەری چتەکان لە لایەن دەوڵەتی دا شەهامەتی ئیتیحادی شورەوی، دیەزەن ئاغای دڵشادی ڕەسوڵی لە لایەن

وەزارەتی فەرهەنگ لە بەرانبەر میکرۆفۆن وتاری زۆر بە تینیان خوێندەوە و مەراتیبی سوپاسگوزاری خۆیان نیسبەت بە ئیتیحادی جەماهیری شورەوی کە ئیستاسیۆنی رادیۆی دەگەڵ پێداویستییەکانی و دەگەڵ یەک دەستگا ماشینی سینەمایی سەیاریان بە نێوی ئەنجومەنی رەوابیتی فەرهەنگی بە کوردستان بەخشیوە، بە جێ هێنا.

پاشان ئاغای سەید محەمەد تەهازادە دەستگاکانی لە ئاغای مایور عەلی زادە تەحویل وەرگرت و دیسان مەراتیبی سوپاسگوزاری لەلایەن میللەتی کوردستانەوە نیسبەت بە ئیتیحادی جەماهیری شورەوی نواند و بە تایبەتی لە زەحمەتی ئاغای مایور عەلی زادە کە زەحمەتی هێنانی ئەو چتانەی قبوڵ کرد بو، زۆری تەشەکور کرد و هەردوکیان دەستیان لە نێو دەستی یەکتر ناو، میهری موتەقابیلیان دەرحەق بە یەکتر ئیزهار کرد و، جێژن لە ساتی 6 ی پاش نیوەرۆ دوایی هات."(17)

بەم بونەوەیە قازی محەمەد لە سەعات 6 ی رۆژی 12 ی 2 ی 1325 دا "نوتقی ژێروی بە هۆی رادیۆ بە گوێی دانیشتوانی کوردستان گەیاند و بە بڵێندگۆ بڵاوکرایەوە:

برایانی خۆشەویست!

لە دامەزراندنی دەستگای رادیۆ و ئەم موەفەقیەتەی کە دەستتان خستوە تەبریکتان لێ دەکەم چونکو لە وەختی کردنەوەی دەستگای رادیۆ لێرە نەبوم ئێستا ئیحساساتی خۆم نیسبەت بە پێشکەوتنی ئێوە ئیزهار دەکەم. ئومێدەوارم کە لێرە بە دوا رۆژ بە رۆژ بتوانین لە مەسایلی مەدەنی دا پتر تەرەقی بکەین.

لە هەمو شتێ چاتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە بتوانین قسەی خۆمان بە گوێی دنیا بگەیەنین و تەسدیقی دەفەرمون کە هەمو شتێک وردە وردە تەرەقی پێ دەدرێ. دیسان دەتوانین بە هۆی ئەم دەستگایە دەرسی ئەخلاقی و، فەلاحەتی و... بە برایانی خۆشەویست بڵێین و لە ئایندەش دا بەرنامەیەکی باش بۆ رادیۆکەمان دیاری دەکەین."(18)

لەسەرەتای مانگی جۆزەردان دا عەلی خوسرەوی دانرا بە "موعاوینی وەزارەتی تەبلیغات" و"مودیری ئیستاسیۆن".(19)

مەودای رادیۆی کوردستان ئەوەندە برى نەئەکرد بگاتە شارەکانی تری کوردستان. وەکو دەنگێکی ناوچەیی بۆ ناو شاری مەهاباد مایەوە تا دەرتەشی ئێران وڵاتی داگیرکردەوە. ئەوسا ئەویش لە "قسان" خرا.

## 4. دامەزراندنی کتێبخانی میللی

رۆژنامەی کوردستان نوسیویتی:

"لەبەر ئەوەی پێداویستییەکی زۆر بە بونی کتێبخانەیەکی میللی لە شاری مەهاباد هەست دەکرێ حەزرەتی پێشەوای کوردستان دەستوری فەرمو کە بە زویەکی زو دەست بە کۆکردنەوەی کتێبەکانی قەرائەتخانەی عیسازادە و فەرهەنگ بکرێ و یەکجێ لە سالۆنی تەنیشتی چاپخانەی کوردستان دابنرێن و کتێبخانەیەکی میللی و عومومی ساز کرێ..."(20)

دیارە دامەزراندنی کتێبخانەی میللی گرنگییەکی زۆری هەیە لە ژیانی هەمو گەلێک دا. هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی نرا. هەندێ کتێب کۆکرایەوە و هەندێ کەس کتێبیان پێ بەخشی. ئەویش لەگەڵ گیرانەوەی مەهابادا هەڵوەشایەوە.

## 5. سینەمای کوردستان

یەکێ لە هەوڵەکانی حکومەتی کوردستان بۆ دامەزراندنی سینەما بوە. دیارە سینەما وەکو هۆیەکی ڕاگەیاندنی بینراو هەم بۆ گەشەپێدانی هۆشی سیاسی و کۆمەڵایەتی خەڵک، بە تایبەتی نەخوێندەواران و، هەم وەکو هۆیەکی بەسەربردنی کات بایەخێکی زۆری هەبوە. لە پێش دا وەکو پرۆژەیەکی تایبەتی جەعفەری کەریمی ئیجازەی لە حکومەتی کوردستان وەرگرتوە بۆ دامەزراندنی سینەمایەک. پێ ئەچێ ئەم پرۆژەیە سەری نەگرت بێ.

لەگەڵ هێنانی دەستگای ڕادیۆ لە لایەن کاربەدەستانی سۆڤیتیەوە، دەزگای سینەمایەکی گەڕۆکیشیان بە دیاری داوە بە حکومەتی کوردستان.

لە ژمارەی 62 دا هەواڵێک دەربارەی سینەما بەم جۆرە بڵاوکراوەتەوە:

"سەحنەی سینەمای کوردستان کە چەندێ لەوەی پێش لە لایەن وەزارەتی بەرزی تەبلیغاتەوە دەست بە سازکردنی کرا بو دوایی هات و فیلمی نوێی زۆر ئەعلای ئەخلاقی کە ئەندازەی لە خۆبوردن و نیشتمانی پەرستی قارەمانی جەماهیری شورەوی نیشان دەدا و دەنوێنێ کە ئەم میللەتە ئازایە بۆ پاراستنی نیشتمانی خۆشەویستیان چە فیداکاریەکیان بە خەرج داوە واریدی کراوە و دەستی بەکار کردوە. پێویستە برایانی نیشتەجێی مەهاباد و دەوروبەر ئیستیفادەی لێ بکەن و بە تایبەتی لەلایەن وەزارەتی تەبلیغاتەوە ڕاگەیەندراوە کە لەکاتی چون بۆ سینەما و لە وەختی واریدبون و دانیشتن دا موراعاتی ئینزیبات بفەرمون."(21)

ڕۆژنامەوانی ٧. گۆڤاری "هەڵاڵە" لە بۆکان دەرچووە


هەڵاڵە

ژمارە ١

سالی یەکەم

ڕەشەمەی ١٣٢٤

چاپخانەی بوکان

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

1. ر. کوردستان. ژ 1. 24/11/15 بەرامبەر 46/2/4. ئەو شوێنانەی نوقتە دانراوە کۆپییەکەی خراپ بو نەخوێنرایەوە.
2. توفیق السویدی، مذکراتی: نصف قرن من تاریخ العراق و القضیة العربیة. دار الکتاب العربی، تموز 1969، بیروت. ص 208-.209
3. ر کوردستان. ژ 10. 24./10/20
4. ر کوردستان. ژ 15. 1324/11/27 بەرامبەر 1946./2/16
5. ر کوردستان. ژ 10. 24/11/15 بەرامبەر 1946./2/16
6. ر کوردستان. ژ 1. 24/10/20 بەرامبەر 46./1/11
7. ر کوردستان. ژ 24. 24/12/22 بەرامبەر 46./3/13
8. ر کوردستان. 1325./4/30
9. ر کوردستان. ژ 11. 24/11/17 بەرامبەر 46./2/6
10. ر کوردستان. 1325./5/20
11. ر کوردستان. ژ 17. 1324./12/1
12. ر کوردستان. ژ 18. 1324./12/4
13. ر کوردستان. ژ 41. 25./2/9
14. ر کوردستان. ژ 16. 24./11/29
15. ر کوردستان. ژ 12. 24./11/20
16. ر کوردستان. ژ 3. 24./10/24
17. ر کوردستان. ژ 43. 1325/2/14 بەرامبەر 46./5/4
18. ر کوردستان. ژ 44. 1325/2/16 بەرامبەر 1946./5/6
19. ر کوردستان. ژ 54. 25./3/15
20. ر کوردستان. ژ 25. 24/12/26 بەرامبەر 46./3/17
21. ر کوردستان. ژ 62. 1325/4/5.

# 5. دامەزراوی پێشمەرگایەتی

## 1. ستراتیجی سیاسی - پێشمەرگەیی حکومەتی کوردستان

چەککردنی عەشایەر یەکێ لە کۆڵەکە سەرەکی‌یەکانی سیاسەتی رەزاشا بو بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی دیکتاتۆری خۆی لە ناو عەشایەر و ناوچە دێهاتی‌یەکانی سەرانسەری ئێران دا. ئەرتەشی ئێران بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە لە چەندین شوێن توشی پێکادان و شەڕی خوێناوی درێژخایان بو. بەڵام سەرەنجام دەستی بە سەر هەمو ناوچەکان دا گرت و چەکی لە ناو دانیشتوان دا نەهێشت. هەرەسی ئەرتەش، بە دوای هاتنی هێزی روسی - بەریتانی دا بۆ ناو خاکی ئێران، سەرلەنوێ هەلی بۆ خەڵک هەڵخست خۆیان چەکدار بکەنەوە. کوردستان لەو بارەیەوە هەلی زۆرتری بۆ هەڵ کەوت. لە ناوچە دێهاتی‌یەکانی موکریان دا، تەنانەت لە ناوچە دێهاتی‌یەکانی ئوستانەکانی کوردستان و کرماشان دا بە هەزاران کەس خۆیان چەکدار کردبو. پاسگاکانی ئێرانیان چەک کرد بو. سەربازەکان چەکەکانیان ئەفراند و بە نرخی هەرزان ئەیان فرۆشت. یا خەڵک لێیان ئەسەندن لە پێش 2 ی رێبەندانی 1324 دا کەسانێکی زۆری سەر بە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان چەکداربون. سەرکردایەتی حیزب هەندێکی رێک خست بون. لە ئاهەنگەکانی 2 ی رێبەندان دا بە قسەی رۆژنامەی کوردستان "... هێزی بەهێزی دیمۆکرات بە ساز و بەرگ و ئەسلەحەوە لە لایەکەوە و قوتابی‌یەکانی کچان و کورانی هەمو قوتابخانەکان لە لایەکی دی..."(1) بەشدار بون. هەر لە ئاهەنگەکانی هەمان رۆژدا محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی "کۆمەگی فەرماندەی هەمو هێزی کوردستان" "بە نوێنەری لە لایەن هێزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانەوە." و محەمەدی نانەوازادە "فەرماندەی هێزی مەرکەزی حیزبی دیمۆکرات" هەر یەکە وتارێکیان خوێندەوە.

ستراتیجی سیاسی و پێشمەرگەیی حکومەتی کوردستان هەمان ستراتیجی سیاسی - پێشمەرگەیی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بو. ح د ک هیواکانی خۆی لە سەر بەڵێنەکانی هاوپەیمانەکان بە تایبەتی دۆستایەتی یەکێتی سۆڤێت و راگەیاندنی ئەتلانتیک هەڵچنی بو. ح د ک ئەی ویست لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێران دا

خودموختاری یا خود ڕاستتر مافی هەڵبژاردنی گشتی بۆ ئەنجومەنی ئەیالەتی و ولایەتی بۆ مەڵبەندە کوردنشینەکانی ئێران دابین بکا. بۆ ئەو مەبەستەش زۆرتر باوەڕی بە خەباتی سیاسی و گفتوگۆی سیاسی و گوشار دروست کردن و ڕێی هێمنانەی بەلاداخستنی ناکۆکیەکان هەبو. نەک بە لەشکرکێشی و هێرشی چەکدار بۆ ڕزگارکردنی شارەکانی کوردستان. قازی لە وتارەکانی دا، چ ئەوی لە بەردەم خەڵک دا بە ئاشکرا و ڕاشکاوی گوتویەتی و، چ لە قسەکانی ناو کۆبونەوە داخراوەکان دا کردویەتی، ئەمەی نە شاردۆتەوە.

مەسەلەی ڕزگاکردنی کوردستانی گەورە و، مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی جیاواز لە ئێران ئەگەر لە شیعر و نوسینی هەندێ کەسی کاربەدەستی ناو حکومەتی کوردستان دا ڕەنگی دابێتەوە، ئەوا لای پێشەوا ئەوانە قابیلی جێبەجێ کردن نەبون. لە قسەکانی دا لە گەڵ ڕۆژنامە نوسەکان دا بە ئاشکرا لەوانە دواوە.

لە گفتوگۆیەک دا لەگەڵ ڕۆژنامەوانەکانی "ایران ما" و"فرمان" و"رهبر" ی تارانی، کە ڕۆژنامەی کوردستان لە یەکەمین ژمارەی دا نوسیویتییەوە، بێ پێچوپەنا ئەم مەسەلەیە ڕون ئەکاتەوە:

"پرسیار: لە تاران دەڵێن کوردان بە ڕەهبەری جەنابت جوێ بونەوە و ئیستیقلالی کوردستانیان دەوێ ئایا ڕاستە؟

وەڵام: خەیر ڕاست نیە لە بەر ئەوەی ئێمە لە دەوڵەتی ئێران ئیجرای قانونی ئەساسی‌مان دەوێ و دەمانەوێ بە خودموختاری لەژێر بەیداغی ئێران دا بژین، وە خودموختاریشمان وە گیرکەوتوە."

هەر بۆیە لە سەرەتای دامەزراندن تا هەرەسی حکومەتی کوردستان دو بۆچونی جیاواز لە ناو کاربەدەستەکانی کوردستان دا بو:

یەکێکیان کە پێشەوا نوێنەرایەتی ئەکرد. لای وابو بە ڕێگەی گفتوگۆی سیاسی هەوڵی سازین و ڕێکەوتن بدرێ لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی لە تاران، لە ئەنجامی ئەمەش دا ڕێگەی بە هیچ جۆرە پێشڕەوییەکی بە پێشمەرگەکانی کوردستان نەئەدا. بەڵکو ئەبو لە حاڵەتی دیفاع و چاوەڕوانی و ڕاوەستان دا لە سەنگەرەکانی خۆیان دا بمێننەوە.

ئەولای تریان هەندێ لە سەرکردە لاوەکانی دیمۆکرات و ئەفسەرە کوردەکانی عێراق و بارزانیەکان، تەنات کەسانی وەکو حاجی بابەشێخی سەرۆکی هەیئەتی ڕەئیسە و محەمەد ڕەشید خان، پێیان وا بو کە ئەبێ هێزەکانی کوردستان ساز بدرێن بۆ ئازاد کردنی شارە کوردنشینەکانی ئێران یەک لە دوای یەک.

سەرانی کۆمار تا ئەو کاتەی حکومەتەکەیان هەرەسی هێنا لە ناو خۆیان دا لە سەر ئەو مەسەلەیە ساغ نەبونەوە. لەوەش دا چەند فاکتەر دەوری هەبو: تەرازوی هاوسەنگی هێزەکانی کورد و ئێران. هەروەها فاکتەری سیاسی، هەڵوێستی ڕوسی، ئینگلیزی، ئەمریکی، لە ڕوداوێکی وەها.

مەترسی هێرشی ئەرتەشی ئێران بۆ سەر کوردستان و گرتنەوەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردستان تا ئەهات زیادی ئەکرد. بە تایبەتی لەگەڵ نزیک کەوتنەوەی کاتی کشانەوەی هێزی ڕوسی. هێزەکانی ئێران لە سنە مۆڵیان ئەخوارد.

پادگانی سەقز بە هێز ئەکرا. لەم ڕووەوە سەقز گرنگییەکی تایبەتی هەبو. لە وێوە ئێران ئەیویست پادگاکانی بانە و سەردەشت بە هێز بکات و ڕێی پێشکەوتنی هێزی پێشمەرگەی دیمۆکرات ببڕێ بەرەو سنەو کرماشان و لە دوارۆژیش دا ڕێگەی گەڕانەوەی خۆی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردستان تەئمین بکا.

حکومەتی کوردستان ئەبو هێزەکانی خۆی بۆ پاراستنی خۆی و سنورەکانی لە دەستدرێژی ئێران ساز بدات.

## 2. ڕێکخستنی پێشمەرگە

### 2. 1. وەزارەتی هێزی دیمۆکراتی کوردستان

لە پێش ئاهەنگەکانی ڕێبەندان دا سەرکردایەتی حیزب پێشمەرگەکانی لە: لیزگە، قۆڵ، دەستە، چڵ، لک، پۆل، هێز... دا ڕێک خست بو. بۆ "بەیعەتی پێشەوا" بەیانی ڕۆژی 3 ی 11 ی 24 لە "کانگای پێشمەرگە" ئامادە بون. لە مەراسیمێکی پێشمەرگەیی - سیاسی دا بەیعەتیان بە پێشەوا کرد و، ئامادەیی خۆیان بۆ خۆبەختکردن لە پێناوی پارستنی حکومەتی کوردستان دا دەربڕی.(2)

ح د ک کاتێ دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی ڕاگەیاند هێزێکی چەکداری هەبو. بۆ سەرپەرشتی ئەم هێزە لە "هەیئەتی رەئیسە" دا محەمەد حسێن خانی بە وەزیری جەنگ دانا و وەزارەتی جەنگی دامەزراند. لە ئەنجامی سیاسەتی رەزاشادا کوردستان بە دواکەوتویی مابوەوە. لە بەر ئەوە بەشی کوردستان، لە کادری پێگەیشتو و کارامەی کیشوەری و لەشکری دا، نەبو یا ئەگەر هەبوبێ زۆر کەم بو. حکومەتی کوردستان کادری جەنگیی دەرچوی زانستگا جەنگییەکانی ئێرانی نەبو. هەر لە سەرتاوە ناچار بو پلەی سپایی و پێشمەرگەیی بە کادرە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی خۆی و سەرۆکەکانی عەشایەر بدات.

محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی بە پلەی جەنەراڵ بو بە وەزیری جەنگ. جەعفەری کەریمی بە پلەی مایور (میجەر) بە معاونی حەربی وەزیر و، محەمەد نانەوازادە بە پلەی پات کۆلۆنێک بە فەرماندەی هێزی مەرکەزی و دواییتر بە معاونی سیاسی وەزیر و، ئیبراهیم سەلاح بە پلەی مایور بە سەرۆکی ستادی گشتی و، محەمەد ئەمین شەرەفی بە پلەی مایور بە سەرۆکی تەخشابی هێز و، عەزیزی سیقی بە پلەی کاپیتان بە بازرەسی هێز... تاد.

جگە لە سەیفی قازی پلەی جەنەراڵی بەخشی بە 3 لە گەورە پیاوانی کورد: عومەر خانی شەریفی سەرداری ئێلی شکاک، محەمەد رەشید خانی مەزنی بەگزادەکانی بانە و، مەلا مستەفا سەرکردەی داوداری ئێلی بارزانی. هەمو ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندی حیزب پلەی "مایور" یان پێ درا. کەسانی تریش پلەی جیاواز وەکو کاپیتان. ئەمانە هیچ کامیان هیچ زانستگایەکی جەنگییان لە ئێران یان لە دەرەوەی ئێران نەدی بو. لە پێدانی پلەی پێشمەرگەیی دا، شارەزایی زانستەکانی جەنگ رەچاو نەئەکرا، ئەوەی رەچاو ئەکرا دڵسۆزیی ئەو کەسە بو بۆ حکومەتی کوردستان و، رادەی نفوزی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە ناو ئێل و مەڵبەندەکەی خۆی دا. پلەی ئەفسەرەکان و جلوبەرگیشیان هی لەشکری روسی بو. ئەفسەرانی کوردی عێراقی، کە هەندێکیان لە گەڵ بارزانی و هەندێکی تریشیان دوای ئەو، چوبونە کوردستانی ئێران، ئەوانیش پلەی نوێیان درایە.

ئەفسەرانی کوردی عێراق لە زانستگای جەنگی عێراق دەرچو بون. هەندێکیان زانستگاکانی ئەوروپاشیان دی بو. ئەمانە ئەیان توانی دەورێکی کاریگەر بگێرن بۆ پێکهێنانی سپای کوردستان و پێگەیاندن و مەشق پێ کردنی. هەروەها بۆ دامەزراندنی هەندێ فێرگاو زانستگای جەنگی نوێ. سەرانی حکومەتی کوردستان، وەکو چەند جارێ ئاگاداری سەرکردەکانی ڕێکخروەکانی کوردستانی عێراقیان کرد بو، پێیان وابو جگە لە پزیشک و برینپێچ پێویستییان بە هیچ کادرێکی تر نیە. لەبەرئەوە هانی هیچ کوردێکی عێراقیان نەئەدا بچێتە ئەوێ.

ناوی وەزارەتەکە بە ناوی جیا جیاوە لە ڕۆژنامەی کوردستان و، لە نامە رەسمییەکان دا ئەهات، وەکو: وەزیر و وەزارەتی جەنگ، وەزارەتی هێزی میللی کوردستان، وەزارەتی هێزی دیموکراتی کوردستان.

وەزارەتی هێز دەستی کرد بە ڕێکخستنی نوێ و هاوچەرخی هێزەکانی و، دانانی ڕێوشوێنی ڕاهێنان و مەشق پێ کردنی. هێشتا بڕیاری "سەربازگیری" نەدا بو. پێشمەرگایەتی کارێکی ئارەزومەندانە بو.

کوردستان لە ژێر سەردێڕی "تەعلیماتی پێشمەرگەیی" دا نوسیوێتی:

"بە پێی دەستورێ کە لە لایەن کۆمیتەی مەرکەزییەوە درا بـو ڕۆژی 14 ی 4 ی 1325 تـەواوی ڕوئەسا و کاربەدەستانی ئیدارات و ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکـەزی سـەعات 7 ی بـەیانی لـە پێشـمەرگەخانە حازر بون.

لە پێش دا لە لایەن ئاغایـان حـاجی ڕەحمـان ئاغـای ئێلخـانی زادە، کاپیتـان میزانـی (سـەرکردەیەکی ئازەربایجانی)، عیزەت عەبدولعەزیز، محەمەد مـەحمود، ئیبراهیمـی نـادری، محەمـەد ئـەمین قـادری، جەعفـەری کەریمی معاونی وەزارەتی هێز، سـدیقی حەیـدەری، ئیبـراهیم سـەلاح فەرمانـدەی هێـزی ناوەنـدی لـە بابـەت فێربونی تەعلیماتی پێشمەرگەیی و، خۆشەویستی و پارێزگاری لە نیشتمان و فـەریزەی فـەردی و ئیجتیمـاعی هەر کەسێک نوتق کرا.

پاشان حازرین ڕیزیان بەست و تەعلیمات دەستی پێ کرا و تا سەعات 11 ئیدامەی هەبو."(3)

## 2. 2. هێزەکانی ئێلاتی کورد

سەعاتی 2 تا 6 ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی 20 ی 4 ی 1325 "پێشمەرگەکانی هێـزی ناوەنـدی کوردستان بۆ عەمەلیاتی سەحرایی چوبونە دەری شاری" مەهاباد. لـە گەڕانـەوەیان دا "وەزیـری هێـز" نـوتقی ژێروی بۆ دان:

"برایان! پێشمەرگەکان، سەرکردان، ئەهالی موحتەرەم!

شوکری خودا تەواو ئاکـەم کـە شـانازی و ئیفتیخـاری ئـازادی کـورد وە چـەنگ مـەهاباد و میللـەتی تێکەیشتوی ئەم شارە کەوت. ئێوە هەرچەندە لە مادییات دا زۆرتان زیان کێشاوە بەڵام لە مەعنـەوییات دا زۆر وە پێش کەوتون.

برایان ئێوە جێگای هومێد و چرا و ئاڵا هەڵگری هەمو کورد و ئازادی کوردستانی مەزنن.

ئێوە دەبێ ڕۆژبەڕۆژ هێزی کارکردنتان زیاتر و ئینزیبات و دیسیپلینتان قایمتر بێت.

برایان مزگێنیتان دەدەمێ بە کوێرایی چاوی دوژمنـانی ئـازادی، کـورد ئـازادی دەسـت کـەوتوە. هـەر ئازادیش دەبێ و هیچ هێزێک ناتوانێ هەستی ئازادیخوایی ئێمە بکوژێنێتەوە و ئازادیخوازانی دنیـاش هـەمو پشتیوانی ئێمەن و بـە هـەر دیسـم و ڕەسـمێک بێـت کـورد ئـازادە و ئـازادی خـۆی وە گیـر هێنـاوە بـەڵام گەورەترین وەزیفەیەک کە ئەوڕۆ لە سەر ئێوە ئەنجامی پێویستە فیداکارییە لە ڕێگای ڕاگرتنی ئازادی دا.

ئەوڕۆ نزیکەی ملیۆنێک کورد لە ژێر ئاڵای موقەدەسی کوردستانی ئـازاددا زۆر بـە خۆشـی دەژیـن و دڵیان پڕ لە هەستی نیشتمان پەرستییە.

ئەوڕۆ چل و پێـنج هـەزار فیـدایی کـورد لـە ژێـر ئیختیـاری مـن دایـە گشـت ئامـادەن بـە چکۆلـەتر ئیشارەیەک خوێنی پاکی خۆیان لە ڕێگای پاراستنی نیشتمانی موقەدەس دا بڕێژن.

ئاغایان ئەوا ڕەسمەن بە هەمو کەس ڕادەگەیەنم لەمەودوا هەرکەس بێتو کارێک بە پێچەوانـەی ئـازادی کورد بکا وە یا زەرەیەک لە دەستورات لا بدا مەحو و نابودی دەکەم و حکومـەتی میللـی و هەیئـەتی دەوڵـەت دەسەڵاتی هەیە دوژمنانی ئازادی کورد بە موجازاتی سەخت بگەیەنێ. لەوە پتر زەحمەتو نادەم و بـە خـودا و دەسپێرم."(4)

لە ڕاستی دا هێزی سەرەکی حکومەتی کوردسـتان، هێـزی ئێلـەکان بـو بـە سـەرکردایەتی گـەورەکانی خۆیان. هەرچەندە سەیفی قازی باسـی چـل و پێـنج هـەزار فیـدایی کـورد ئـەکات، بـەڵام زۆر لـە سـەرچاوە ئاگادارەکان ژمارەی هێزەکان بە جۆرێکی تر باس ئەکەن. لەوانە ئیگلـتن لـە کـاتی سـازدانی هێزەکـان دا لـە جەبهەی سەقز بەمجۆرەی لای خوارێ سەرژمێریان ئەکات:

| | |
|---|---|
| بارزانی بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا | 1200 پیادە |
| بارزانی بە سەرکردایەتی شێخ ئەحمەد (لە جەبهە نەبون) | 900 پیادە |
| جەلالی و میلانی | 400 سوار |
| شوکاک بە سەرکردایەتی عومەر خان | 800 سوار |
| شوکاک بە سەرکردایەتی تاهیرخانی سمکۆ | 500 سوار |
| هەرکی بە سەرکردایەتی رەشید بەگ و بەگزادە | |
| بە سەرکردایەتی نوری بەگ | 1000 سوار |
| هەرکی بە سەرکردایەتی زێرۆ بەگ | 700 پیادە |
| تاقمی بنەماڵەی سەیدعەبدوڵای گەیلانی | |
| بە سەرکردایەتی سەید فەهیم | 200 سوار |
| زەرزا بە سەرکردایەتی موسا خان | 300 سوار |
| قەرەپاپاخ (تورک) بە سەرکردایەتی پاشاخان و | |
| خوسرەوی خان | 500 سوار |
| مامەشی تیرەی کاک عەبدوڵا قادری | 400 سوار |
| مامەش بە سەرکردایەتی کاک هەمزە | |
| نەڵۆسی ئەمیر عشائیری | 500 سوار |
| پیران بە سەرکردایەتی محەمەد ئەمین ئاغا و | |
| قەرەنی ئاغا | 300 سوار |
| مەنگوڕ بە سەرکردایەتی عەبدوڵای بایەزید | 300 سوار |
| مەنگوڕ بە سەرکردایەتی سەلیم ئاغای نۆجاغ | 200 سوار |
| مەنگوڕ بە سەرکردایەتی عەلی خان و | |
| ئیبراهیم سالاری | 400 سوار |
| گەورکی سەردەشت بە سەرکردایەتی کاکەڵڵا | 200 سوار |
| گەورکی مەهاباد بە سەرکردایەتی بایزی عەزیز ئاغا | 300 سوار |
| گەورکی سەقز بە سەرکردایەتی عەلی جەوانمەردی و | |
| محەمەد ئاغا و حاجی ئیبراهیم ئاغا | 400 سوار |
| تێکەڵاوی خێڵەکانی سەردەشت | 500 سوار |
| تیرەی سوێسنی | 100 سوار |
| دیبوکری مەهاباد بە سەرکردایەتی جەعفەر کەریمی | 400 سوار |
| دیبوکری بۆکان بە سەرکردایەتی ئاغاکانی ئیلخانیزادە | 500 سوار |
| فەیزوڵا بەگی بۆکان و سەقز | 800 سوار |
| بنەماڵەی بداغی سەقز | 200 سوار |
| تێکەڵاوی تیرەکانی مەهاباد و شاهیندژ | 300 سوار |
| تاقمی حەمە رەشید خانی بانە | 300 سوار |
| پێشمەرگەی جوانرۆ و هەورامان | 150 سوار |
| کۆی هەمویان | 12 750 (5) |

## 3. بارزانییەکان

### 3. 1 پێشوازی ڕەسمیی مەلا مستەفا

لە سەرەتا دا مەلا مستەفا و بارزانییەکان بە جۆرێ پشت گوێ خرا بون. بیریان لەوە ئەکردەوە بگەڕێنەوە تەسلیمی حکومەتی عێراق بینەوە. نەخۆشی تیفوس و هەژاری و نەبونی تەنگی پێ هەڵچنی بون. لە لایەک مەترسی هێرشی ئەرتەشی ئێران بۆ سەر کوردستان و، لە لایەکی ترەوە مەزبەتەیەکی کە تێکۆشەرانی کوردستانی عێراق، بە یارمەتی شێخ لەتیفی حەفید و هەندێ لە سەرانی ئێلە کوردەکانی عێراق، ڕێکیان خست بو بۆ ناساندنی مەلا مستەفا وەکو نوێنەری هەمو کوردی عێراق و ڕێزلێنانی، ناردبویان بۆ قازی محەمەد. وایان لە قازی و سەرانی حکومەتی کوردستان کرد ئاوڕ لە بارزانی و کوردەکانی عێراق بدەنەوە.

لە مانگی ڕەشەمەدا قازی محەمەد، مەلا مستەفای بانگ کرد بۆ مەهاباد. ئەمجارەیان بە ڕەسمی پێشوازی لێ کرا. کوردستان هەواڵی هاتنی لە "ئەخباری نێوخۆمان" دا بەمجۆرە نوسیوە:

"جەنابی مەلا مستەفا قائیدی کوردی بارزان ڕۆژی 9 ی 12 ی 1324 ساتی 5 ی پاش نیوەڕۆ واریدی مەهاباد بو.

وەختێ گەیشتە نێوباغان ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی پێشوازییان لێ کرد. وەختێ مەلا مستەفا لە چۆمی پەڕییەوە بە ئیحتیرامی ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی دابەزی لەم کاتەدا کۆمیتەی مەرکەزی هەنگاویان توندتر کردو لە قەراخ چۆمی پێک گەیشتن. برای خۆشەویست سدیق حەیدەری مەراسیمی بە خێرهاتنی بە جێ هێناو هەمو ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی بە مەلا مستەفا ناساندو ئەویش دەستی لە ناو دەستی هەموان ناو لە نیهایەتی خۆشی دا بۆ کانگای حیزبی دیمۆکرات هاتن و لە ساڵۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی دانیشتن.

لە ساتی 6 حەزرەتی پێشەوای کوردستان بە پێی (القائم یزار) تەشریفی بۆ کانگا هات و مولاقاتی دەگەڵ مەلا مستەفا فەرمو. لەو وەختەدا محەمەد ئەفەندی خیتاب بە حەزرەتی پێشەوا، خیتابێک کە وێنەی ئیحساساتی قەلبی مەلا مستەفا بو لە خسوس خودەپێناونانی کوردی بارزان و دەربەدەری ئەم قەومە نەجیبە لە ڕێی سەربەستی کوردستان دا خوێندەوە و جەنابی پێشەواش وەڵامی دانەوەو ئەوانی بێ ئەندازە بە حکومەتی کوردستان و حیزبی دیمۆکرات ئومێدەوار کرد.

پاشان حەزرەتی پێشەوا تەشریفی بردە ساڵۆنی تایبەتی خۆی ئەنجا مەلا مستەفا بە حزوری شەرەفیاب بو و، ماوەی دوسات خەریکی گفتوگۆ بون.

مەلا مستەفا پیاوێکی سیاسی و زەعیمی کوردی بەرزانە لە ڕێی سەربەستی کوردستان دا زۆری مەینەت کێشاوە. دوژمنانی کوردستان ئەو و تەواوی ئێل و عەشیرەتی ویان بە گوناهی ئازادیخواهی دەربەدەر و لە نیشتمانی خۆشەویستیان وە دەرناوە. زاتی ناو براو بێجگە لەوەی قائیدێکی بەرزە، پیاوێکی زانا و تێگەیشتوە موتومەدین و نیشتمانپەرستە و تەمەنی لە حدودی چلوپێنج ساڵ دایە."(6)

### 3. 2 نوتقی محەمەد مەحمود

محەمەد مەحمود، خەڵکی سلێمانی و دەرچوی زانستگای جەنگی عێراق بو. لە ناوەڕاستی سییەکان دا ئەندامی "کۆمەڵی برایەتی" و، دوایی یەکێ لە ئەندامە چالاک و شۆڕشگێڕکانی "حیزبی هیوا" بو. نوسەر و خەتیب بو. چەندین وتاری سیاسی لە بڵاوکراوە نهێنیەکانی حیزبی "هیوا" و گۆڤاری "گەلاوێژ" و لە ڕۆژنامەی "کوردستان" دا نوسیوە. بەشداری شۆڕشی بارزان بو. یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی "هەیئەتی ئازادی"

بو. لە گەڵ بارزانی چوە کوردستانی ئێران و یەکێ لە هاوکارە نزیکەکانی بو. لەوێ وەکیلی مەلا مستەفا بـو. لە زۆری بۆنە سیاسی‌یەکان دا محەمەد مەحمود بەناوی مەلا مستەفاوە قسەی ئەکرد. لێرەش دا ئەم وتارەی بـە ناوی بارزانی‌یەوە خوێندەوە:

"پێشەوای موعەزەم! گەورە بەڕێزەکانم!

بە ناوی کوردی وریا بوەوە لە ژێـر مـاوەی پـەیڕەوی کـۆنی زەبـر بەدەسـتی، بـە نـاوی سـەرکردەی شۆڕشی گەل لە بارزان، شۆڕشی بەرهەڵستی سەرگەردانی، شۆڕشی نەهێشتنی زوڵـم و دیسـتیبداد، ڕۆژبـاش پێشکەشی دانیشتوانی ئەم کۆبونەوەیە دەکەم، کە ئاڵای پیرۆزیـان لـە سـێ یـەکی نیشـتمانی گـەورەدا بڵێنـد کردەوە، بە ناوی خوێنی پاکی گەلێ کۆششکەرانەوە کە لە مەیدانی ئازادی دا پێشکەشـیان کـردوە، هاوارتـان دەکەینێ کە ئەم بەرە پیرۆزە - ئازادی و سەربەخۆیی پێ بگەیەنن. بە ناوی فرمێسکی چاوی بێوەژنان و ئاه و ناڵینی هەتیوانەوە هاوارتان دەکـەینێ کـە پـەیمانی حقـوقی گـەل بـدەن. دیقتیسـادیاتی بپارێزیـت، پشـتی فەرهەنگ بگرن بە پەروەردە کردنێکی گیانی دیمۆکراتیەوە. پارێزگـاری لـە دیمـۆکراتی بفـەرمون کـە ڕێگـەی پێشخستنی گەل و سەربەخۆیی نیشتمان و ڕۆیشتنە بـەری وەیـە لـە گـەڵ کـاروانی گـەلانی ئـازادی بـەرەو تەواوەتی.

بێگومان لەبیر ناکرێت کە حکومەتی ئازاد هێشتا لە یەکەم قۆناغیایەتی وە کۆششی ئێوەی پێ دەوێـت، بۆ سەرکەوتنی کوردستانی مەزن و ڕزگار بونی. یارمەتی گەلیشی پێویستە. ئەو بەشانەی نیشتمانی مـەزنمان کە لە ژێر دەستی بێگانەدان. گەلی کوردستانی مەزن چـاوی بڕیوەتـە یارمـەتی ئـەو ئاڵایـە کـە لـە سـەر ئـەم حکومەتە دەشەکێتەوە. دەیەوێت ژێر سێبەریەوە. لە پیاوەکانی حکومەت دەخوازان کە براکانیان لـەو پێوەنـدی ئاسنینە ڕزگاربکەین کە تێدا دەناڵێنن.

پێشەوای موعەزەم! گەورەکانم!

ئەو سیاسەتە حەکیمە جوانەی کە پـارتی دیمـۆکراتی کوردسـتان لـە سـەری ڕۆیشـت و سـەربەخۆیی نیشتمان و ئازادی کوردی وەرگرت، ئامادەیە کە بچێت بە هاواری نیشتمانی گەورەوە و، گەلی کـورد سـەرتاپا ڕزگار بکا.

لەم کاتەدا، لە هەمو کانی دڵمانەوە و یاریدەی ڕاستیمانەوە بەرەو گەورەترین شەخسـیەتی کـورد، ئـەو شەخسیەتەی کە گەلی کوردی بە بیری بەهێزی و سەرکردەیەکی حەکیمانەوە بە ڕێگـای دیمـۆکراتی دا بـرد و گەیاندیە سفرەی ئـازادی، بـە کۆششـێکی عەبقـەری و عـەزمێکی قـایم وە سـەرکردەی دیمـۆکرات، پێشـەوای موعەزەمی کوردستان جەنابی قازی محەمەد. خۆمان پێشکەش دەکەین.

با هەمو پێکەوە هاوار کەین بژی سەرکردەی موخلیسی کوردستان. بژی گەلی کـورد پشـت بەسـت بـە دیمۆکراتی، بژی پارتی ئازادی کوردستان و پارتی گەل. بژی پارتی دیمۆکرات. بـژی نیشـتمانی مـەزنمان بـە سەربەخۆ و ئازادی. بژی یەکێتی سۆڤیاتی مەزن هەتا بێ گەلانی خۆش بەختی ئازادی و سەربەخۆ بێ.(7)

بارزانی و، کوردەکانی تری عێراق ئەیان توانی لەوێ وەکو پەنابەر بە گۆشەگیری دابنیشن. خۆیان لـە هیچ کاروبارێ نەگەیەنن. بەڵام ئەوان بۆ ئەوە نەچو بون پـاڵی لـێ بدەنـەوە. چوبـون بـۆ ئـەوەی بـە هـەمو تواناوە بەشداری بکەن لە پاراستن و سەرخستنی ئەو تەجروبە تازەیەدا. خوێندنەوەی ئـەم وتـارە بـە نـاوی بارزانی‌یەوە، لەو کاتەدا، چەند مەبەستی ئەگەیاند. یەکێکیان، دەربڕینی دڵسۆزی بـۆ حکومـەتی کوردسـتان و پێشەواکەی و، پیشاندانی ئامادەیی خۆ لە پێناونـانی بـە هـەمو توانایەکـەوە. دوەمیـان، بـە درۆ خسـتنەوەی واتەواتی ململانێی پێشەوا - بارزانی و، قوبوڵ کردنی سەرۆکایەتی قازی محەمـەد. سـێیەمیان، پێـداگرتن لـە سەر یەکێتی چارەنوسی کورد و هەوڵدان بۆ ئازادکردنی ناوچەکانی تری کوردستان.

### 3. 3. بەرنامەی گەڕانی بارزانی

کوردستان لە ژ 26 - 27 دا بەرنامەی گەڕانی مەلا مستەفای بەدرێژی بەم جۆرە نوسیوە:

ڕۆژی جومعە 10 ی 12 ی 1324

ئەندامانی حیزب و ئەشراف و ئەعیانی شاری مەهاباد و ڕوئەسای عەشایەر یەک بەدوا یەک دا چونە خۆپێناسینی میوانی خۆیان. هەر کە کاتی نوێژی جومعە هات زەعیم مەلا مستەفا لە گەڵ ئەندامێکی هەیئەتی مەرکەزی حیزب تەشریفی بردە مزگەوتی جامیعە و فەریزەنی خودای مەزنی لەگەڵ هەمو موسوڵمانانی شاری مەهاباد دا لە سەرخۆ لابردو دوایی لە ناو قەلەباڵغیەکی زۆردا گەڕایەوە یانەی فەرهەنگی مەرکەزی حیزب.

ڕۆژی شەممو 11 ی 12 ی 1324

بەیانی 11 ی 12 ی 1324 زەعیم مەلا مستەفا و ئەفسەرانی و یەکێک لە ئەندامانی هەیئەتی مەرکەزی ئاغای ئەحمەدی ئیلاهی تەشریفیان چوە هێزی کوردستان و هەر کە گەیشتنە ئەوێ لە لایەن قەرەوڵی تایبەتیەوە ڕەسمی تەعزیمی بۆ کراو سەرکردانی هێز بە سەرکردەی فەرماندەی هێزی مەرکەزی محەمەد نانەوازادە پێشوازی کراو یەکە یەکە سەرکردەکانی پێ ناسرا نزیکەی نیو سەعاتێک لە گەڵ سەرکردەکاندا ڕای بواردو لە دواییدا یەکە یەکە چوە لای سەرکردەکان لە جێگای خۆیان دا وە پیرۆزبایی خۆی پێشکەش کردن و داوای لێ کردن کە هەمو بە گیانێکی پاکی نیشتمانپەروەرانەوە بینە سپەری نیشتمان و پێشخزمەتی پێشەوای موعەزەم کانگای هێزی بەجێ هێشتەوە و بە بە بزۆکی حەزرەتی پێشەوا ڕوی کردە دەبیرستان لەوێ قوتابیەکان هەمو کۆبیونەوە لە دوای زیارەتی مامۆستاکان و ڕەئیسی هەیئەتی فەرهەنگ ئاغای ڕەشید ئاغای هەمزە ئاغا تەشریفی بردە لای شاگردەکان وە لێرەدا ئەفسەر عەبدورەحمان تەیب موفتی چەند ئامۆژگاری و پیرۆزباییەکی بەناوی زەعیم مەلا مستەفاوە پێشکەش کردن لە دواییدا زەعیم مەلا مستەفا ڕوی کردە ئیدارەی شارەوانی.

... هەروەها تەشریفی بردە ئیدارەی دژوانی لە دوای ئەوە ڕوی کردە مەدرەسەی گەلاوێژ و بە هۆی ئاغای ئەحمەد ئیلاهیەوە مامۆستایانی ناسین و یەکە یەکە بە پۆلەکان دا گەڕاو لە هەر پۆلێک ئەفسەر محەمەد مەحمود بە ناوی زەعیم مەلا مستەفاوە ئیزهاری خۆش وەختی و ئامۆژگاری بۆ شاگردەکان دەکرد. لە دواییدا تەشریفی بردە مەدرەسەی کوردستان دیسان لەگەڵ مامۆستایان خۆناسینیان کردو بە ناو پۆلەکان دا گەڕا و لەهەر پۆلێک دا سرودێک دەخوێندرایەوە.

ئینجا زەعیم مەلا مستەفا گەڕایەوە مەرکەزی حیزب.

شەوی یەکشەممو 12 ی 12 ی 1324

زەعیم مەلا مستەفا تەشریفی بردە چاپخانەی کوردستان وە لە لایەن مودیری چاپخانە ئاغای قادری مودەریسی بە هۆی ئاغای ئەحمەد ئیلاهیەوە خۆناسینیان کردو لە دواییدا لە لایەن محەمەد مەحمودەوە چەن ئامۆژگاریەک بە کارگەرانی چاپ کرا و سپاسی مودیری چاپخانەی بە ناوی زەعیم مەلا مستەفاوە کرد.

ڕۆژی یەکشەممو 12 ی 12 ی 1324

بەیانی لەگەڵ ئەفسەران و ئاغای ئەحمەدی ئیلاهی تەشریفی بردە لای ڕەئیسی هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کوردستان جەنابی سەید حاجی بابە شێخ لە دوای سەعاتێک گفتوگۆی گیانی بە گیانی بە خۆشیەوە زەعیم ئەوێی بەجێ هێشت و گەڕایەوە مەرکەزی حیزب.

ڕۆژی دوشەممو 13 ی 12 ی 1324

بەیانی دیسان زەعیم مەلا مستەفا و ئەفسەرانی لە گەڵ ئاغای کەریمی ئەحمەدین تەشریفی بردە ئیدارەی شەهرباری لە لایەن میرزا غەنی خوسرەوی... پێشوازی لێ کرا.

سەعات 10 ی ئێوارە نیسان خۆی و ئەفسەرانی محەمەد مەحمود و عەبدورەحمان تەیب موفتی تەشریفیان بردەخزمەت پێشەوای موعەزەم لە یانەی فەرهەنگی... نزیکەی نیو سەعات گفتوگۆی تایبەتی‌یان کرد و گەڕایەوە جێگەی خۆی"(8)

## 3. 4. ڕێکخستنی هێزی بارزانییان

تاقمێکی باش ئەفسەری کورد لە دەرچوانی زانستگای جەنگی عێراق کە لە هاوکارانی بارزانی بون و هەندێکیان لەگەڵ ئەو چوبونە کوردستانی ئێران و هەندێکیشیان دوایتر لەوانە: عیزەت عەبدولعەزیز، سەید عەزیزی شەمزینی، مستەفا خۆشناو، میرحاج ئەحمەد، محەمەد مەحمود قودسی، عەبدورەحمان موفتی، بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، خەیروڵا عەبدولکەریم، نوری ئەحمەد تەها، جەلال ئەمین بەگ، محەمەد سالح و نائب زابت ئەحمەد ئەفەندی کویی و، شەوکەت ئەفەندی.

قازی محەمەد داوای لە مەلا مستەفا کرد بارزانی‌یەکانیش وەکو هێزێکی ڕێکوپێک لە ڕیزی هێزی دیمۆکرات دا ڕێک بخرێن و کاروباریان پێ بسپێردرێ. لە سەرەتای نیسان دا لە سەر داوای مەلا مستەفا زیاتر لە هەزار بارزانی بۆ پێشمەرگایەتی بانگ کران. لە 4 لک دا ڕێک خران. چەکی نوێیان درایە. پاش مەشق پێ کردنێکی کورت نێردرانە جەبهەی سەقز بۆ پاراستنی سنوری حکومەتی کوردستان لە هێرشی چاوەڕوانکراوی ئەرتەشی ئێران. ئەفسەرە کوردە عێراقی‌یەکان، ئەگەرچی کەسیان بارزانی نەبون، دانران بە سەرکردەی لکەکانی هێزی بارزانییان. میر حاج ئەحمەد، بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، مستەفا خۆشناو، نوری ئەحمەد تەها کە 4 ئەفسەری دەرچوی زانستگا جەنگی‌یەکانی عێراق بون، هەر یەکەیان بو بە سەرکردەی یەکێ لەم 4 لکە. ئەفسەرەکانی تر هەندێکیان لە گەڵ مەلا مستەفا خۆی وەکو "هەیئەتی ئەرکانی هێزی بارزانییان" مانەوە و، هەندێکیشیان لە "ستادی کول" بۆ کاروباری مەشق کەڵکیان لێ وەرگرتن. لە گەڵ ئەمانیش چەند کەسێ لە تێکۆشەرە نازاکانی بارزانی‌یەکان پلەی پێشمەرگەیی‌یان درایە و کران بە فەرماندەی چڵەکانی ئەم 4 لکە وەکو: محەمەد ئەمین میرخان، مامەند مەسیح، فارس کانی بۆتی، سەعید وەلی بەگ، خۆشەوی خەلیل، مستەفا جانگیر، سالح کانیالەنجی، حەیدەر بەگ عارف بەگ، وەهاب محەمەد عەلی ئاغای ڕەواندزی.(9)

## 6. 3. 5. پێکهێنانی پارتی دیمۆکراتی کورد

جیاوازی بیروبۆچونی ئەندامەکانی حیزبی هیوا سەبارەت بە هەڵوێستی سیاسی لە شۆڕشی بارزان و، لە هەردو دەوڵەتی سۆڤیەتی و بەریتانی، بو بە هۆی تێکچونی ڕیزەکانی و، سەرەنجام پارچە پارچە بونی. ساڵی 1945 چەندین ڕێکخراوی سیاسی جیاواز لە کوردستانی عێراق دا دروست بوبو. لە ناو ئەو ڕێکخراوانەدا حیزبی شیوعی کوردستان "شۆڕش" و، حیزبی ڕزگاری کورد و، لقی عێراقی کۆمەڵەی ژ. ک لە هەمویان گرنگتر بون. ئەفسەرە کوردەکانی چوبونە ناو شۆڕشی بارزانەوە، ئەوانیش ڕێکخراوێکیان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی بەناوی "هەیئەتی ئازادی" دوە دامەزراند بو. بەڵام لە گەڵ کشانەوەیان دا بۆ کوردستانی ئێران ئیتر چالاکی‌یان نەمابو. لە پاڵ ئەم ڕێکخراوانە دا لقی کوردی حیزبی شیوعی عێراق و، چەند وردە ڕێکخراوێکی تر هەبون. بەم جۆرە پەراگەندەیی سیاسی باڵی کێشا بو بە سەر بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردستانی عێراق دا حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، وەکو حیزبێکی ئێرانی، نەی ئەویست و نەی ئەتوانی ببێتە ڕێخەر و پێشرەوی کوردستانی عێراق و، نوێنەوەرەی ئامانج و ئاواتە سیاسی‌یەکانیان. لەو سەردەمەدا بیری کۆکردنەوەی ڕیکخراوە سیاسی‌یەکانی کوردستانی عێراق لە حیزبێکی یەکگرتو دا لای

بارزانی و هاورێکانی گەڵاڵە بو. نوری ئەحمەد تەها بو ئەم مەبەستە بە نهێنی سەری کوردستانی عێراقی دایەوە. بارزانی بە هاوکاری میرحاج ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها، عیزەت عەبدولعەزیز، سەید عەزیزی شەمزینی، خەیروڵا عەبدولکەریم، محەمەد مەحمود و چەند کەسێکی تر "پارتی دیمۆکراتی کورد" یان دامەزراند و بەرنامەکەیان نوسی. بارزانی لە ناو خەڵکی کوردستانی عێراق دا و، لە لای تێکۆشەرەکانی، پایەیەکی تایبەتی هەبو. هەمزە عەبدوڵای بە نوێنەری خۆی ناردەوە بۆ کوردستانی عێراق بۆ پەیوەندی و گفتوگۆ لەگەڵ سەرانی هەمو ڕێکخراوەکان و، ئامادەکردنی ڕێوشوێنی یەکگرتنی هەموویان لەناو ئەو حیزبە نوێیە دا. بیری دامەزراندنی تەنیا حیزبێکی یەکگرتو بۆ سەرکردایەتی خەباتی کورد لە کوردستانی عێراق دا، جۆرێ بو لە چاو لێکردنی کوردەکانی ئێران.

هەمزە لە کارەکەی دا سەرکەوتو بو. لە 16 ی ئابی 1946 دا یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی "پارتی دیمۆکراتی کورد" لە بەغداد لە ماڵی عەلی حەمدی بەسترا. مەلا مستەفای بارزانی‌یان بە سەرۆکی حیزب هەڵبژارد و بەرنامەکەیان پەسەند کرد.

## 4. گفتوگۆ لە تاران و شەڕ لە سەقز

### 4. 1. شەڕی سالح ئاوا: یەکەمین پێکدادانی پێشمەرگە و ئەرتەش

ڕۆژی 3 ی 2 ی 25 نوێنەرانی هەردو حکومەتی کوردستان و ئازەربایجان لە تەوریز "پەیمانی یەکێتی و برایەتی" یان ئیمزا کرد.

ڕۆژی 8 ی 2 ی 25 دەستەی نوێنەرایەتی تێکەڵاوی ئازەربایجان و کوردستان بە سەرۆکایەتی پێشەوەری چو بۆ گفتوگۆ بۆ تاران. محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی، وەزیری جەنگی حکومەتی کوردستان و، ئەبولقاسمی سەدری قازی، نوێنەری مەهاباد لە خولی 14 هەمی مەجلیسی شورادا، ئەندامی هەیئەتەکە بون.

لەو کاتەدا کە نوێنەرانی حکومەتەکانی ئازەربایجان و کوردستان لە تاران سەرقاڵی گفتوگۆ بون هێزەکانی ئێران لە سەقز خەریکی بەهێزکردنی بنکە و سەربازگەکانی خۆیان بون. ڕۆژێک دوای چونی هەیئەتەکە بۆ تاران، هێشتا قازی محەمەد لە تەوریز بو، هێزەکانی ئێران لە قوڵی سەقزەوە هێرشێکیان کرد.

جەنەراڵ مایور محەمەد ڕەشید خان قادر خان زادە "فەرماندەی هێزی بۆکان و مەنتیقە" کە سەرکردەی جەبهەی سەقز بو لە دو نامە دا کە ڕۆژی 12 ی 2 ی 1325 بۆ "پێشەوای بەرزی جمهوریەتی کوردستانی موعەزەم" ی نوسیوە، هەم باسی شەڕەکەی گێڕاوەتەوە و، هەم پێشنیارەکەی خۆی بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمن نوسیوە.

سەعات 11 و 15 دەقیقەی ڕۆژی 9 ی 2 ی 325 هێزێکی ئێرانی کە پێک هات بو لە 700 کەس بە تۆپ و ڕەشاش و نارنجۆک بە پشتیوانی 2 فڕۆکەی جەنگیی لە ناکاو لە چەند لایەکەوە هێرشی کردە سەر پۆستەکانی هێزی دیمۆکرات:

لە مەلقەرەنی لە شاخی بێژنگ بەسەر کە لە ژێر سەرپەرشتی بەکر ئاغای حەوێزی و، لە کەلی سەرا کە لە ژێر سەرپەرشتی میرحاج و، لە کێوی بالومان کە لە ژێر سەرپەرشتی مستەفا خۆشناو دا بو.

لەم شەڕە دا زیاتر لە 100 کەس لە هێزی ئێرانی کوژرا و 39 کەسیان لێ بەدیل گیرا و هەندێ چەک و تفاقی جەنگی‌یان دەس کەوت.

شەڕ 7 سەعاتی خایاند. لە کۆتایی‌دا هێزی ئێرانی شکا.

بە قسەی خان: "لەو وەختەی کە دوژمن لە هەمو لایەکەوە خەریکی تەقەدوم و ناگرباران بو پێشمەرگەکانی هێزی بارزانی یەک بە یەک نیهایەتی حەماسەت و نەشئەژان گوێیان لە ئەوامیری فەرمانـدە و قیادەی خۆیان ڕاگرت بە وێنەی نیزامیی مونەزەبی دەوڵەتیی و. حەرفێن تەتبیقی ئەو پرۆغرامەیان ئەکرد کە لە تەرەف قیادە و سەرکردە و ئەفسەران پێیان ئەبێژرا. بە ئەندازەیەک لە ئیقدام و فنونی جەنگ و نیشان گرتن و هەڵمەت بردن شارەزا بون کە قەڵەم لە تەعریفی عاجزە."

بەو بۆنەیەوە کە: میرحاج، بەکر حەوێزی، مستەفا خۆشناو، وەهاب ئاغا و یارمەتیدەرەکانیان: محەمەد ئەمین میرخان، مامەند مەسیح، ساکو، خۆشەوی خەلیل لەو شەڕەدا قارەمانەتییان نواندوە، حەمە ڕەشید خان تکای لە پێشەوا کردوە کە 4 ئەفسەرە گەنجەکە بە "تەقدیری عەمەلیات" و"موکافات" و یارمەتیدەرەکانیان بە "دەرەجاتی لائیق مەسرور و تەشجیع بفەرمون."(10)

دڵشاد رەسولی لە سەروتاری رۆژنامەی کوردستان دا لە ژێر سەردێڕی "رۆژی نەنگ و ریسوایی دەوڵەتی فارس" سەبارەت بەم شەڕانە نوسیوێتی:

"... بۆ هەوەڵ جار لە تاریخی 10 ی 2 ی 25 لە جەبهەی سەقز - سالح ئاوا هەوەڵ مادەیان بە ئیمتیحان گەیشت و لە سەر ئەو هەمو ئەسلەحە گەورانەی کە ئەوان هەیان بو عیدەیەکی 1500 نەفەری ئەوان لە بەرامبەر 200 نفوسی ئێمە بەو ئەوعە نەنگ و ریسواییە شکاو پەرتوبڵاو کراو هەر لە ماوەی 2 سەعات دا 110 نەفەریان لێ کوژرا و 28 ئەسیریان لێ گیرا جودا لە 300 قەبزە تفەنگ و 3 موسەلسەلی قورس و 3 موسەلسەلی سوک.

لە رۆژێکی وادا دەبو ئەو سەرلەشکرە لوت بڵیندانەی فارسان ئەو مارشاڵە فیرارییانەی پڕ غروری ئەرتەشی رەزا خانی لە شەرمەساری واقیعەی 3 ی شەهریوەری 1320 سەری خەجاڵەتی بەردەنەوە و خۆیان بکوژن. بەرعەکس دەبینین وەک رێوییان لێ هاتوە بۆ خۆیان بە تەنها جێگایان نابێتەوە هەژگێکیش لە دوای خۆیان رادەکێشن. ئیستیقلالی فارسان بە تەواوی لە ژێر نفوزی بێگانان مەحو بوتەوە تازە ئەو مارشاڵانە خەریکی ناگیر کردنی کوردستانن..."(11)

### 4 .2. هاتنی پێشمەرگە و لە خۆبوردوان

ئۆردوی سور لەسەر کشانەوەی یەکجاری بون. ئێران هێزی کۆ ئەکردەوە و سازی ئەدان. پەلی ئەهاویشت بۆ بەرزاییەکانی دەوروپشتی سەربازگەکانی. هێزی زیادی لە دەری ناوچەکەوە ئەهێنا بۆ بەهێز کردنی پادگانەکانی. مەترسی پەلاماردان لە قوڵی سەقزەوە زیادی ئەکرد. ئەو هێزانەی پێشمەرگە کە لەوێ بون بەشی پارێزگاری سنوری حکومەتی کوردستانی نەئەکرد لە هێرشی ئەرتەشی ئێران. وەزارەتی هێزی دیمۆکرات بەشێ لە هێزەکانی شیمالی سازدا. پێشمەرگەکانی شکاک و هەرکی و بەگزادەی لەگەڵ سەردارە بە نفوز و ناودارەکانی وەکو: عومەرخانی شەریفی شکاک، تاهیرخانی سمکۆ، نوری بەگی عەباسی، زێرۆ بەگی هەرکی، هێنایە ناوچەکانی سەردەشت، بانە، سەقز. بەرامبەر هێزەکانی ئەرتەش دای مەزراندن.

رۆژنامەی کوردستان لەو بارەیەوە نوسیویەتی:

"ئەم رۆژانە پێشمەرگە و لە خۆبوردوانی کوردستان بێوچان وارید دەبن و بۆ پارێزگاری بۆ سنوری کوردستان دەرۆن.

ئالا بە پیرەوە بردن: رۆژی 16 ی 2 ی 25 ساتی 6 ی ئێوارە کە پێشمەرگە و لەخۆبوردوانی ئێلی قارەمانی هەرکی گەیشتنە قەراخ شاری ئالای موقەدەسی کوردستانیان بە پیرەوە بردن و لە نێو هەست نواندنێکی لە ئەندازە بەدەر واریدی کران. هەر کە گەیشتنە پێش کانگای حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

ئاغایانی زێرۆبەگ و تەها ئاغای هەرکی دەستگای ئیستاسیۆنی رادیۆیان دیدەن کرد و یەکی سەد تمەنیان باربوی دەستگای ئیستاسیۆن کرد و ئاغای زێرۆبەگ نوتقێکی بەتینی خوێندەوە لە زیمن دا گوتی: ئێمە تا ئاخر تنۆکی خوێنی خۆمان لە کوردستان قارەمانانە پارێزگاری دەکەین و لە باتی ئەو ئالایە کە بە ئێمەتان پێشکەش کردوە ئێمەش ئامادەین بە کۆمەکی خودا شارێکی گەورەی کوردستان بۆ ئێوە بگرین و بە تەواوی چەک و موهیماتەوە پێشکەش بە حکومەتی کوردستانی بکەین.

لە خۆبەخوداوانی ئێلی قەرەپاپاق: ڕۆژی 16 ی 2 ی 1325 ساتی 360 ئێوارە لە خۆبەخوداوان (فیدائی‌یان) ی ئێلی غەیوری قەرەپاپاخ بۆ پارێزگاری کوردستان لە نێو هەست و نوانـدنێکی لە ئەندازە بەدەری خەڵکی شاری دا وارید و لە لایەن حیزبەوە پەزیراییان لێ کرا."(12)

### 4. 3. هێزەکانی ئێران لە سەقز

بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی فەرماندەی جەبهەکە لە حەفتەی یەکەمی بانەمەڕی 1325 دا هێزەکانی ئێران لە جەبهەکەدا بەمجۆرە بو:

3000 نەفەری عەجەم لە ناو سەقزدا

500 نەفەر عەجەم لە دۆڵی میرەدێ و تەموتە و کەلیخان

1500 نەفەر لە ناو بانەدا

1000 نەفەر لە سەر دەشت(13)

بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی ئادەوازانە، لە حەفتەی یەکەمی پوشپەڕی 1325 دا، دەبێ هێزەکانی ئێران لە سەقز و دەوروبەری بەمجۆرە بوبن:

1800 سەرباز و ئەفسەر لە ناو سەربازگا.

406 کەس لە ناو بورجەکان دا.

2206 کەس کۆی هەمویان

2 تانکی گەورە و 2 تانکی بچوک و 2 زرێپۆش

7 فڕۆکەی 2 کەسی (فڕۆکەوان و دیدەبان) یەکێکیان شکا بو

15 ئۆتومبیلی نیزامی (14).

### 4. 4. ڕاوەستان یا پێشڕەوی

لەو کاتەدا هێزی دیمۆکرات ڕێگاکانی نێوان پاێگانەکانی بانە و سەردەشتی لە ژێر دەست دا بو. حەمەرەشیدخان لەنامەیەکی دا نوسیویەتی:

"... بۆ ئەوەی کە جارێکی تر دوژمن نەتوانێ ئەم ئیرادەی تەجاوزە بکاتەوە، ئەبەزەن هێزی ئێمە حاکم بێ بەسەر خەتی مواسەلات و هاتوچۆ و ئیتیسالاتی دوژمنان کێوانی ئاڵتون و مل قەرەنی و مەرخوز و سەیداوامان خستۆتە ژێر سەیتەرەی خۆمانەوە. حاڵی حازر هێزی ئێمە لە دو جیهەتەوە تەقریبەن موحاسەرەی مواسەلاتی لە سەقزا کردوە. تا حاڵ ئەو جێگایانەی کە بە قوەتی سیلاح لە دوژمن وەرگیراوە ڕەدمان نەکردۆتەوە.

... هەروەکو بە عەرزی بارەگای بەرزتانم گەیاند هێزی ئێمە لە دو جیهەتەوە قەتعی خەتی مواسەلاتی دوژمنی کردوە و سەقزی خستۆتە شکلێکی خەتەرەوە. بەڵام دوژمنیش بۆ ئەوەی ئەو ئیستیحکاماتانەمان لێ

وەربگرێتەوە هەروەها خەریکی تەرتیبات و تەنزیماتی عەسکەری و پروپاگاندەی عەشائیری ئـەو ناوەیـە. جا بۆ ئەوەی کە دوژمن مەیدانی ئەوەی نـەبێ ئیتیسـال لەگـەڵ هێـزی بانـە و سەردەشـت و سـەقز و ئاغایـانی ئەترافیا پەیدا بکات و نەتوانێ کە زەفەر بە هەدەفی ئەساسی پێشەوا و خیتەی بەرزی کوردسـتان بـەرێ زۆر بە زەروری ئەزانم کە ئیرادە بفەرموی بە تەرتیباتی حەرەکات بۆ سەر دوژمن..."(15)

ئەفسەرەکانی هێزی بارزانی لە جەبهەی سەقز: میرحاج، مسـتەفا خۆشـناو، وەهـاب ئاغـا، بـە وردی لـە ناوچەکەیان دوری بو. پلانی پاککردنەوەیان دارشت بو. هەریەکە لە لای خۆیەوە پلانەکەی خـۆی خسـت بـوە بەردەستی فەرماندەی جەبهە بۆ ئەوەی بریاری لێ بدات.(16) بەڵام بریار دان لە سەر مەسـەلەیەکی وا گرنـگ و ژیانیی نە لە دەس حەمە رەشید خان دا بو، نە لە دەس مەلا مستەفای بارزانیدا. تەنیا کەس کە دوابریـاری بە دەس بو قازی محەمەد بو. قازی لە وەڵام دا بۆی نوسین:

"جەنابی ئاغای محەمەد رەشید خان

لەو دیفاعەی کردوتە تەبریک دەکەم. هەر نەوعە ئیحتیاجێکو هەیە فەوری بۆم بنوسن کـە خـەریک بـم رەفعی بکەم. چونکە نومایندانی مە لە تاران خەریکی گوفتوگۆیەن بە هیچ وەجە نابێ بچنە سەر دوژمنی. لەو جێ هەن راوەستن و خۆتان مەحکەم کەن.

محەمەد قازی 12 / 2 / 25"

رۆژی 23 ی 2 ی 25 وەفدی هاوبەشی کورد و ئازەری بەسەر نەکەوتویی لە تاران گەرایەوە. سەیفی قازی بەو بۆنەیەوە لە مەهاباد دوتقیکی دریژی دا. هەر بەو بۆنەیەوە قازی محەمەدیش وتاریکی دا. سـەرەرای تێشکانی گفتوگـۆ "نەچونـە سـەر دوژمـن" و"راوەسـتان لـەو جـێی هـەبون" بـو بـە سـتراتیجی سیاسـی - پێشمەرگەیی حکومەتی کوردستان.

## 4. 5. بەردەوامی وردە شەڕ

لە نێوان هێزەکانی دیمۆکرات و هێزەکانی ئێران دا ئیتر وردە شەڕ بەردوام بـو. ئێـران نـەی ویسـت پێشمەرگەکانی کوردستان ماندو بکا.

رۆژنامەی کوردستان لە ژمـارەی رۆژی 4 ی 3 ی 25 دا لـە ژێـر سـەردێری "هێرشـی ئیرتیجـاع" دا نوسیویتی:

"بەرانبـەر راپـۆرتێکی رۆژی 28 ی 2 ی 1325 گەیشـتوە لـە بەشـی سەردەشـت هـۆزدوی فارسـە مورتەجیعەکان عیدەیەک بانەیی‌یان دەگەڵ بون هێرشیان بۆ عیدەی حەسەن ئاغـای هـەنارە و زیـرۆ بـەگ و گەورکەکان هێناوە لە نەتیجەی دیفاع دا مورتەجیعـەکان زۆر خـراپ شـکاون و تەلـەفاتێکی زۆریـان داوە 30 کەس لە بانەیی‌یان بە دیل گیراون و دو ئاغا و دو نۆکەریان کوژراوە 14 قەبزە تفەنگ 4 قـەبزە دەبانچـە و یەک دوربین و 6 ئەسپ بە غەنیمەت گیراوە و بە شپرزەیی گەرانەوە دواوە."(17)

لە ژمارەی رۆژی 6 ی 3 ی 25 دا لە ژێر سەردێری "دەنگوباس لە جەبهەی سەردەشت" دا نوسیویتی:

"خەبەر گەیشتوە کە شەوی چوارشەممو پێشمەرگەکانی ئیرتیجاع بە هەورارەی (!) نێزیکی سەردەشت کە پۆستی کوردستانی لێ دەبێ پەلاماری دەبـەن و پۆسـتەکە دەورە دەدەن و... پـەلاماری ئێلـی گـەورک کـە کاکەڵا ئاغا فەرماندەیان دەبێ دەبەن لە پاش شەڕێکی زۆر هێزی ئیرتیجاع و کورانی بـەزۆر هـاتوی ئێرانـی 44 کەسیان لێ دەکوژرێ و نێزیکی 40 کەسیان بریندار بـوە زۆر بـە شـپرزەیی دەشـکێن و هەڵـدێن و لـە هێزی کوردستان 5 کەس برینـدارە و سـەعید بـەگ پیـاوی حەمـەدی وسـێن ئاغـا بـە دەرەجـەی شـەهادەت گەیشت.."(18)

لە ژمارەی ڕۆژی 15 ی 13 ی 25 دا نوسیویتی:

"لە کێوی نەسراباد پشتی سەقز لە ڕۆژی 8 ی 3 ی 25 کە هێزی کوردستان لە ژێر فەرمانی محەمەد حسێن هەرکی دامەنیشن لەو ڕۆژەدا هێزی ئێرانی دەوریان دەدەن کە عیدەی کوردستان ئەسیر بکەن وەلێ پاش زەدوخوردێکی زۆر 4 سەرباز بریندار و سەربازێکی ئێرانی دەکوژرێ و 2 ئەسپ و تفەنگیان لێ بەجێ ماوە. هەر لەو ڕۆژەدا 6 ئەمنیە و 1 کوردی عێلی تیلەکۆ لە لایەن هێزەکانی دورکۆ کوژراون."(19)

# 5. گفتوگۆ یا خلافاندن

## 5. 1. کۆبونەوەی سەقز

لە خاکەلێوەی 1325 دا سەرلەشکر عەلی ڕەزمئارا، سەرۆکی ستادی ئەرتەش، خۆی هاتە ناوچەی سەقز بۆ دانانی نەخشە. لە پێشەوە کەوتە کات بەسەربردن بە ناوی گفتوگۆوە. خەتی تەموینی پادگانەکانی سەقز و بانە و سەردەشت لە ژێر دەستی پێشمەرگەدا بون. ئەیان ئەهێشت خواردەمەنی و تەقەمەنییان پێ بگات. لەو کاتەدا نە هێزەکانی ئەرتەشی هێشتا توانای هێرشی گشتییان پەیدا کردبو، وە نە هەلومەرجی سیاسیش هێشتا بۆ کارێکی وەها لە بار بو. ڕەزمئارا ئەی ویست بێ شەڕ ئەم دابلوقەیە بشکێنێ.

ڕەزمئارا لە سەقز لە گەڵ نوێنەرانی پێشمەرگەی کوردستان دانیشت. ئیبراهیم سەلاح، یەکێ لە ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتی کوردستان لە ژێر سەردێڕی "نوێنەرەکانی کوردستان و تاران لە سەقز" ڕاپۆرتێکی دەربارەی ئەم کۆبونەوەیە بۆ ڕۆژنامەی کوردستان نوسیوە. وا لە خوارێ وەکو خۆی ئەی نوسینەوە:

"ڕۆژی یەکشەممو 5 ی 3 ی 25 هەیئەتی نومایندەگی حکومەتی کوردستان گەیینە سەقز لای ڕۆژئاوا سەرلەشکر ڕەزمئاراش لە گەڵ 3 نەفەر نومایندەگانی ئازەربایجان:

1. ئاغای جەودەت وەزیری کار 2. ئاغای عەلی زادە موفەتیشی مەخسوسی جەنابی پیشەوەری. 3. ئاغای ئازەربادگان فەرمانداری مەراغە لە تارانەوە واریدی سەقز بون سەعاتێک لە شەو چو بو جەلەسە لە مەنزلی سەرتیپ هومایونی تەشکیل بو. موزاکەرە تا سێ سەعات و نیو تولی کێشا:

1. سەرهەنگ 2 عیزەت عەبدولعەزیز بۆ کردنەوەی جەلەسە بە زمانی کوردی بەیاناتێکی زۆر باشی کرد کە جوملە بە جوملە بە زمانی فارسی تەرجومە دەکرا بینای ئەو بەیاناتە لەسەر ئەوە بو کە زۆرجێی خۆشوەختییە لە گەڵ برایانی ئازەربایجانی دۆستییەکی مەحکەم و برایەتییەکی تەواومان بۆ حاسڵ بوە و لەم جەلەسەش دا وا دیارە کە برایانی فارس مەیلیان لە سەرحوسنی تەفاهومە کە تەقازایان کردوە ئەمە بێینە سەقز و ئاغای سەرلەشکریش بۆ موزاکەرات لە تارانەوە هاتۆتە ئێرە تا ئێستا کە دو برای ئازەربایجانی و کورد دەستیان پێک دابو هەوییان هەیە کە لە گەڵ برایانی فارسیش دا لە سەر ئەسلی برایەتی موافەقەت حاسل بێ و بینە 3 برا.
2. ئاغای سەرلەشکر ڕەزمئارا لە پاش بەیاناتی برای خۆشەویست سەرهەنگ 2 کاک عیزەت مەنزوری جەلەسەی بەیان کرد کە:

چونکو بەمزوانە دوبارە موزاکەراتی بەینی دەوڵەتی مەرکەزی تاران و نومایندەگانی ئازەربایجان و کوردستان دەست پێ دەکرێتەوە لەبەر ئەوە کە موزاکەرە لە سەر ئەسلی حوسنی تەفاهوم قەرار بگرێ وا بە چاک زانرا کە ئەم مەجلیسە لێرە تەشکیل بێ و کارێکی وا بکەین لە تەواوی جەبهەدا تا دوایی موزاکەرە ئارامی بەرقەرار بێت.

3. سەرهەنگ 2 کاک عیزەت جوابی داوە کە ئەسڵی هاتنی ئێمە لە سەر ئیعتیبارنامەیەکە بە ئەمە دراوە و، ئەوەیە کە سابیت بکرێ شەڕی قارەوا برواری 9 ی بانەمەڕ هەوەڵ جار حەملە لە تـەرەف کێـوە بـوە؟ جا لەسەر ئەم ئەسڵە چەندین دەلیلی بەیان کرد لەوانە یەکێک ئەوە بو: بـە هـەمو قاعیدەیـەکی حـەربی هەمیشە تەلەفات لە عیدەی موهاجیم زیاتر دەبێ چون لە عیدەی نیزامیی ئێران لەو شەڕەدا تەلـەفاتێکی زۆر بوەو لە عیدەی ئەمە یەکێک خوێن لە قامکی نەهاتوە ئەوە خۆی دەلیلە کە عیـدەی نیزامیـی ئێـران حەملەی کردوە بۆیە لێیان تەلەف بوە ئەمما هی ئێمە چون لـە سـەنگەری خۆیـان دا بـون گوللـە نـەی گرتون. دەلیلێکی دی ئەوەیە لە ئەسیرانی خۆتان کە لە مەهاباد و تەورێزن بپرسـن تـا لێیـان مـەعلوم بێت کە نیزامیی ئێران حەملەی کردوە.
سەرتیپ هومایونی گوتی: من عیدەیەکم بۆ شیمالی سەقز نارد بو ئەمانە چو بونـە خـاکی مـەهابادەوە لەو سورەتەدا ئەوە بە حەملە مەحسوب نیە.
سەرهەنگ 2 کاک عیزەت لە جوابی دا وتی: سـەقز و مـەهاباد لـە یـەک جـوێ نـین هـەردوک خـاکی کوردستانن هەر کوێ کوردی لێیە ئێمە بە هی کوردی دەزانین.
لەو بەینەدا برای خۆشەویست کاپیتان سەعیدزادە لەسەر دوسێ مەتلەبی دی لە قەبیل فڕینـی تـەیارە و هێندێ شتی دی پیلەی بە سەرتیپ هومایونی گرت. چون سەرتیپ هومایونی دەلیلی حەقی بە دەسـتەوە نەبو ناچار لە مەجلیس وەدەرکەوت ئیدی نەهاتەوە لە ئاخردا ئاغای سرلشکر رەزمئـارا ئیقـراری کـرد کە لەوەدا عیدەیەک لە سەقزەوە نێردراوە بۆ سەر عیدەی کوردستان هیچ قسەی تـێ دا نیـە. مـەوزوعی حەملە بەو جۆرە لە جەلەسەی ڕەسمی دا مەعلوم بو کە خەتای ئەیروی ئێران بوە.
4. مەوزوعی بەرقەراری ئارامی لە جەبهەدا لە پاش گفتوگۆیەکی و موتالەعەی ئەخشەجاتی نیزامیـی ئێـران بە ئیتیفاقی ئارا قەرار کرا تا تەواو بونی موزاکەرە هیچ لایەک حەقیان نیە بچنـە پێشـەوە دەبـێ هـەر کەس لە هەر جێیەک هەیە ڕابوەستێ و هیچ لاش حەقیان نیە تەقە بکەن. زیمنەن سەرلەشکر رەزمئـارا تەقازای کرد کە هێزی کوردسـتان چوارهـەزار گـەز لـە دەرەوەی سـەقز دورەوە کـەون و سـێ هـەزار گەزیش لەسەر جادەی بەینی بانە و سەقز بکشێنەوە و بۆ لای خۆراوا تا نیزامییانی ئێران بتوانن بـە ئازادی بۆ عیدەی بانە و میرەدێ ئازوخە بە ڕێ بکەن و لە موقابیل دا ئیمزایان دا کە تەیاراتی ئـەوان هەر بە سەر جادەدا حەقی حەرەکەتی بێ و عەلاوە 3 نەفەر نوماینەدەی خۆمان هەمیشە لە سەقز و بانە و سەردەشت دا هەبێ و ناززی کاری ئەوان بن کە عیـدە و موهیمـات بـۆ ئـەو 3 نوختـە لـە تـەرەف دەوڵەتی ئێرانەوە بەڕێ ئەکرێ ئەمما ئەگەر عیدەیان بۆ عەوەز کردنی ئەفەراتێک کە وادەی خزمـەتیان تەواو بوە بێت مانیع نەبو. ئەم مەوزوعە بە مەقاماتی بەرزی مەرکەزی خۆمان عـەرز کـرا لـە جـواب دا فەرمویان کە لە سەر ئەسلی ئیحتیرامی دو تەرەفی ئێمە هەرچەند بکشێینەوە دواوە نیزامیانی ئێرانیش هەر بەو قەرارە دەبێ بکشێنە دواوە تەنیا غەیرەمومکینە و هەر جێیەک کە ئیشغالمان کـردوە هـەر لـە دەست ئێمەدا دەبێ و جادەش بە جـێ نـاهێڵین هـەر بـەو جـۆرە لـە جەلەسـەی ڕسـمی دا بـە ئاغـای سەرلەشکر رەزمئارا جواب دراوە.
5. لە مودەتی 38 سەعات دا کە ئێمە لە سەقز بوین فەرمانەدەی نیزامی‌یانی ئێران چەند جـار هـاواری بـۆ ئێمە نارد کە: ئەوا لە میرەدێ شەڕە وەرن مەهێڵن. ئەوا جادەی بەینی سەقز و سنە هێـزی کوردسـتان داگیری کرد بچن بیان گێڕنەوە. تا وابو بۆ وەی نەهێڵن تەقە بکرێ نوێنەرەکانی کوردستان لە ماشین دا کە بەیـداغی شـەهامەتی کوردسـتانی لەسـەر دەلـەراوە لـە سـەقزەوە بەسـەر جـادەی بانـەدا هاتینـە حەرەکەت و لە پشت سەر ئەوانـەوە ماشـینی نیزامی‌یـانی ئێـران کـە یـەکێک لـە نوماینـدەکانی و دو

سەرهەنگی ئێرانی تێدا بو لە ژێر پەناه و حیمایەتی بەیداغی ئەرزی کوردستان دا هێواش هێواش بە دوای ئێمە دا دەهات لە ئایچی، لە تەموغە، لە بەلەجەر و لە ئەغلەبی کێو بە چاوی خۆیان عیددەی موئەزەمی پێشمەرگان و سەرکردانی کوردیان دەدی کە چون لە کەمالی شەهامەت و بێباکی دا ئەو جێیانەیان داگیر کردوە و موئەزیرن بە مەحزی سادر بونی فەرمان قەلبی دوژمن هەڵدڕن. یەکێک لە نوێنەرەکان ئیبراهیم سەلاح"(20)

ئەم کۆبونەوانە زۆر تر لایەنی سیاییان هەبو نەک لایەنی سیاسی. وەکو دەرئەکەوێ زۆرتر بۆ ڕاگرتنی شەڕ و ڕێنەدانی پێکادان و پاراستنی هێمنی ڕێگەوبانەکان و دابینکردنی ناردنی پێداویستەکانی پادگانەکانی ئێران بوە، نەک بۆ گفتوگۆی سیاسی لەسەر پێوەندی حکومەتی کوردستان و حکومەتی ناوەندی و پاشەڕۆژی ناوچەکە.

حەسەن ئەرفەع لەم بارەیەوە نوسیویتی: "هەم هێزەکانی حکومەتی ناوەندی و هەم کوردەکان ئەیان ویست کەڵک لەم بەڵگەیە وەربگرن بۆ کات بەسەربردن بۆ ئەوەی هێزەکانیان کۆبکەنەوە. ئێران ئەی ویست پاش کۆکردنەوەی هێزی تەواوی هێرشی گشتی خۆی دەست پێ بکا، کوردەکانیش بە تەما بون لە دوای گرتنی شارەکانی بانە، سەقز، سەردەشت، بەرەو دوستانی کوردستان پێشڕەوی بکەن. بۆ ئەو مەبەستەش لە هەمو شوێنە شاخاوییەکانی دەوروبەر بۆ ڕێگرتن لە بەهێزکردنی پادگانەکانی ئێران پەلاماری هێزە نێردراوەکانیان ئەدا..."(21)

## 2.5 بۆ چونی کۆمیتەی مەرکەزی

پێ ئەچێ کاربەدەست و بەرپرسەکانی کورد باوەڕیان بە کاربەدەستانی ئێران و گفتوگۆ و بەڵێنەکانیان نەبوبێ ڕۆژی 6 ی 3 واتە ڕۆژی دوای کۆبونەوەکانی ڕەزمئارا و نوێنەرانی کورد لە سەقز کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان نامەیەکی ئاراستەی نوێنەرەکانی خۆی کردوە بۆ وەڵامدانەوەی خواستەکانی نوێنەرانی ئێران. لێرە دا تێکستی نامەکە وەک خۆی ئەنوسینەوە:

"حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

کۆمیتەی مەرکەزی

نوێنەرانی بەرزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

1. عیددەی مە لەو مودەیەی سەر خود هیچ جۆرە تەجاوز و عەمەلیاتێکی نەکردوە تا لە تەرەف عیددەی حکومەتی مەرکەزییەوە تەجاوز و حەملەیەک بۆسەر عیددەی مە نەکرابێ پاش تەجاوز و حەملەش عیددەی مە مەجبور بوە بۆ وەی کە نەیەڵێ عیددەی تەجاوزکار دەفعەیەکی دیکە ئەو جێگایەی بە دەستییەوە بوە نەیکاتە مەبدەئی حەملەی سانەوی ئەوەی دەگیر خۆیان بخەن.
2. قیسمەتێکی موهیم لە عیددەی مە عەشایرن. وەکو ئەفرادی نیزامی دیسیپلینە دین هیچ مومکین نیە کە لە دوای وەی عەسەبانی کرا لە ئیتاعەتی خاریج دەبن چۆن دەبێ مەئمورینی حکومەتی مەرکەزی فکری وەی ئەکەن کە تەیارە بچێتە سەر ئەوان بە موسەلسەلان دایان گرێ، لێیان بکوژێ، دیسان ئەوان بە ئومێدی واهی موزاکەراتی سولحێ دەجەرەیان دایە حەملەی موتەقابیلە نەکەن. ئەوە شتێکی غەیرە مومکینە.
3. چۆن دەبێ ئەوانە خەجاڵەتی ئەیان گرێ دەو وەختی دا کە دونیا پێی زانیوە کە موزاکەراتی سولحێ دە مابەین دایە و دەو وەختی دا کە نومایندەی مە چۆتە بەر دەرکە و ئاستانی وان ئەوان شەرمی ئەکەن لە جەبهەی سەقز - سەردەشتی تەواوی عیددەی مە و ژن و منداڵی دێهاتییان کە هیچ جۆرە زنێکی هەوایان نیە بە موسەلسەلان دایان گرن و تەلەفاتیان پێ بدەن.

4. نازانین مەئمورینی حکومەتی مەرکەزی تا کەنگێ دەست لە دەسیسی و نەیرەنگی خۆیان هەڵ ناگرن کە ئەلعانەکە بە جەبر و زۆر نەیان توانیوە ئێمە بکشێنەوە دواوە بە حیلە و تەزویر خەریکن. ئەگەر... مەقسودیان ئەوە نیە کە ئەو جێگایانە دوبارە تەسەڕوف بکەنەوە حازرین هەرچەندی ئەوان... ئەمەش بکشێینەوە. بە ساعەت دەڵێن، بە فرسەخ دەڵێن، بە مەنزڵ دەڵێن، کە ئەوە قاعیدەیەکی بەینەلمیلەلیـیە. ئیدی کەس ئەی بیستوە لایەک بە تەنێ بکشێتەوە.
5. فێڵێکی دی ئەوەیە کە بە بەهانەی خواروبار خەریکن ڕێگایان بە مە چۆڵ دەکەن کە دە سورەتێکی لەو مەنتیقانەی کە دە دەستیان دایە خۆراکیان هەیە و چاترین شاهید ئەو سەربازانەن کە لەوان گیراون و فیراریان کردوە و ئەلعان حازرن.
6. ئێمە نازانین ئەو بەهانەو بەهانەتراشیە چیە؟ ئەو کشانەوە و مۆڵەت و ئیمروزوفەردا بۆچی ئەگەر حکومەتی مەرکەزی ڕاست دەکا و سولح دەکا لە دومانگ موزاکەرە زیاتر؟ فەرمون بیکەن ئەو سولحەی کە فەوری برایەتی دەنێو میللەتانی ئێرانێ بەرقەرار بێت.

1325/3/6 کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان(22)

### 5 . 3. بۆچونی فەرماندەی جەبهە

جەنەراڵ محەمەد ڕەشید خان فەرماندەی جەبهەی سەقزیش لەو ڕوەوە نامەیەکی بۆ پێشەوا نوسیوە. تێکستی نامەکە:

بۆ حەزرەتی پێشەوای بەرزی جمهوریەتی کوردستان

مەوزوع: حیلەی دوژمن، و عەدەم موافەقەت بۆ ئینسیحابی هێزەکانمان

1. گوزارشاتی ڕۆژی 5 / 3/ 325 م موفەسسەلەن عەرزی وەزارەتی حەربی هێز کردوە بە نوسراوی ژمارە 338 - 5 / 3/ 325 بەڵام لە بەر ئەوەی کە ئاغای کەریمی ئەگەڕێتەوە بۆ خزمەتتان و نەتیجەی موزاکەراتی خۆیانت بە عەرز ئەگەیەنێ. مەجبور مام کە منیش نەزەریەی حەتمی خۆمتان عەرزبکەم. هیچ ئومێد ناکرێ کە دوژمن لەم تەلەبەی دا مەقسەدێکی ڕاستی و دۆستایەتی و ڕێک کەوتنی بێ لە غەیرەز وەقت و فرسەت زائیع کردنی ئێمە نەبێ. ئەگەر دوژمن بەهانەی تەئمینی زەخیرە و وەسیلەی مەعیشەتی هێزی بانە و میرەدێ و سەقزیەتی، تەئمینتان دەکەم لە هەمو جیهەتێکەوە وەسیلەی مەعیشەتیان تەواوە. ئەتوانن هەتا مودەیەکی زۆر بە ڕەفاهیەت بە زەخائیری حازرەیان ئیدارە بکەن. وە ئەگەر مەتلەبیش بەهانەیەکە کە سەیتەرەتی هێزی ئێمە سەر مەنتیقەی نفوزی خۆیان دور بخەنەوە. بە سورەتی قەتعی ئیمکانمان نابێ کە یەک بست بکشێینە دواوە. ئەو جێگایانەیان بۆ چۆڵ بکەین کە بە قوەتی سیلاح لێمان گرتون. بەڵام ئەگەر دەوڵەتی عەجەم مەتلەبی ئاشتی و ڕێک کەوتنە من زانمم کە هەتا نیهایەتی موزاکەرە تەقەدوم و تەجاوزات لە تەرەف هێزی دیمۆکراتەوە واقیع نەبێ. جا بەو موناسەبەتەوە بە واجیبم زانی کە نەزەریەی نیداری و عەسکەری خۆمتان عەرز بکەم گەڕانەوەمان بۆ پاشەوە زۆر موشکیلە. ئیتر ئیجابی متەوەقیفی ئەمرتانە.

فەرماندەی هێزی بۆکان و مەنتیقەی لە سەرا"(23)

### 5 . 4. بۆچونی قازی محەمەد

پێشەوا لە وەڵامی محەمەد ڕەشید خان دا نوسیویتی:

حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

کۆمیتەی مەرکەزی 13/ 3/ 25
ئاغای فەرماندەی هێزی بۆکان و مەنتیقەی سەرا
وە جواب نامەی ژمارە 371 ی 10/ 3/ 25

هەر کارێکی جوزئی ئەلئان نەبێ لە گەڵ ئەوزاعی بەینەلمیلەلی تەتبیق بکرێ چە جای کاری مە کە کوللیە لەبەر ئەوەی ئەمە مەجبورین لەرێی سولحەوە تا مومکین بێ ناتوانین بە ڕێی دی دا بڕۆین ئەو تـاخیرە هـی وەیە دەنا ئەمن لە تۆ بە پەلەترم. لە هاتنی عائیلە لە لایەک خۆشحاڵم کە بە سەلامەتی نەجاتیان بوە لە لایـەک غەمگینم کە تا کەنگێ کورد دەبێ مالیکی جێگای خۆی نەبێ خودا ڕەحمێکی بکا. محەمەد قازی"(24)

بۆچونی پێشەوا لەگەڵ فەرماندە و بەرپرسەکانی جەبهەی سەقز، تەنانەت لەگەڵ هەندێ لـە کاربەدەسـت و بەرپرسەکانی حکومەتی کوردستان لەوانە حاجی بابە شێخ، سەرۆکی هەیئەتی ڕەئیسەی میللـی و، کۆمیتـەی مەرکەزی جیاواز بو، نامەکەی کۆمیتەی ناوەندی بۆ نوێنەرەکانیان لە سەقز لەگەڵ وەڵامەکەی پێشەوا بۆ حەمـە ڕەشید خان جیاوازە.

هەر لەو ماوەیەدا نوێنەرانی کورد سەرلەنوێ چونەوە بۆ سەقز. ڕۆژنامەی کوردستان هەواڵەکەی لـەژێر سەردێڕی"نوێنەری کوردستان بـۆ سـەقز" نوسـیویەتی: "ڕۆژی 8 ی 3 ی 1325 سـاتی 4 ی پـاش نیـوەڕۆ جەنابی حاجی سەید بابا شێخ ڕەئیسی هەیئەتی ڕەئیسەی میللـی کوردسـتان و ئاغایـانی مـەنافی کـەریمی و ئەحمەدی ئیلاهی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرەکانی تاران بۆ حەللی هێندێ جودایی لە نێـوان هـەر دو حکومەتـدا چون بۆ سەقز هومێدمان وایە نوێنەرەکانی کوردستان بە موەفەقیـەت بگەڕێنـەوە."(25) مانـەوەی هێزەکـانی کورد لە سەنگەری پارێزگاریدا بێ ئەوەی توانای دابینکردنی پێویستیە سـەرەکیەکانیان هـەبێ، هێزەکـەی توشی زۆر کێشەی نالەبار کردبو. ئەفسەرەکانی هێزی بارزانییـان و حەمەڕەشـیدخان و... پێیـان وابـو کـە ئەبێ پەلاماری شارەکانی سەقز و سەردەشت و بانە بدەن ڕزگاریان بکەن لـە ژێـر دەسـەڵاتی تـاران و، دوای ئەوەش بەرەو سنە بکشێن. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی شارەزاکانی کاروباری پێشمەرگە ئەمە لـە توانـادا بـو پێشەوا ڕێگەی ئەدا ئەم کارە بکرێ. تەنانەت خۆی لەو نوتقەدا کـە بـە بۆنـەی شـەڕی مامەشـاوە داویەتـی بـە ڕاشـکاوی باسـی ئـەکا کـە ئـەو ڕێگـەی نـەداوە پـەلاماری سـەقز بـدەن. "... ئـەم ئێلـە ئازایـە - مەبەسـتی بارزانیەکانە - تەنیا داخێ کە هەیانە ئەوە بو خەیاڵیان بو پەلاماری سەقز بەرن و داگیری بکەن بەڵام ئەمن مەنعم کردن..."(26)

هۆی موافەقەت نەکردنی قازی محەمەد ئەوە نەبو کە پێشمەرگە لـە هێرشـەکەیان دا بشـکێن لـەو کاتـەدا ژمارەی پێشمەرگە و لە خۆبوردوانی کورد کە لە بەرامبەر هێزەکانی ئەرتەش دا ڕاوەسـتا بـون و، چـاوەڕوانی فەرمانی هێرش بون، لە هێزەکانی ئەرتەش بە ژمارە زۆرتر و، بە مەعنەویات باشتر بون. ئەوەی وای لێ کـرد موافەقەت نەکا کاربەدەستانی سۆڤێتی بون، بە تایبەتی کۆنسوڵی ڕوسی لە ورمێ، هاشموف.(27)

## 6. ئاگربڕی تا سەر

### 6. 1. شەڕی مامەشا: دوایین پێکادانی پێشمەرگە و ئەرتەش

ڕۆژی 12 ی 3 هەیئەتی نوێنەرایـەتی حکومـەتی ئێـران بـە سـەرۆکایەتی موزەفـەر فـەیروز گەیشـتە تەورێز بۆ درێژە پێدانی گفتوگۆ.

هەر وەکو لە کاتی خـولی یەکـەمی گفتوگۆکـانی تـاران لـە 8 - 23 ی 2 هێزەکـانی ئێـران لـە قـوڵی سەقزەوە ڕۆژی 9 ی 2 هێرشیان هێنایە سەر هێزەکانی پێشمەرگە، ئەمجارەش لە کاتی دەسـتپێکردنی خـولی

دوهەمی گفتوگۆکانی تەوریز لە 21 - 23 ی 3 هێزەکـانی ئێـران لـە قـولی سـەقزەوە ڕۆژی 25 ی 3 سـەر لەنوێ هێرشیان هینایەوە سەر پێشمەرگەکانی کوردستان.

هەر دو جارەکە قازی محەمەد لە تەورێز لە پەیجوری گفتوگۆ دا بو.

ئەمە کارێکی رێکەوت یا خود تەگبیر کراو بو؟ پرسیارێکە هێشتا وەڵامی نەدراوەتەوە.

لە دوای ڕوданی شەڕ قازی لە تەورێزەوە گەڕایەوە مەهاباد لە وتارێکا کە بەم بۆنەیەوە دای وتی:

"... کە سونی تەفاهوم ببوە هۆی ڕودانی ئەم جەنگە چونکو من دەستوری تەلگرافیم دابـو کـە ریگـای بۆ میرەدێ و بانە و سەردەشت بکەنەوە کە خواردەمەنی بۆ سەربازەکانی ئێران کە لەو مەڵبەندانە هەن ببرێت نازانم تەلگرافەکە درەنگ گەیشت بو یا ئیجرا نەکرا بو.

سەرتیپ رەزمئاراش کە ئێسـتا لـە سـەقزە تـەلگرافی بـۆ ئاغـای قـەوام سـەڵتەنە نـارد بـو مـەوزوعی ڕێگاکردنەوەی وەڵام دا بو و قەوام سەڵتەنەش دەستوری دا بو بـە هێـزی خۆیـان ڕێگـا ناوەڵـە بکەنـەوە لـە نەتیجە دا لە حدودی 3 هەزار کەس سەرباز کە بە 8 تۆپ و 2 تەیارە و 2 تانـک پیشـتیوانییان لـێ کـراوە پەلامار بۆ گردی مامە شا دێنن و فەرمانـدەی پۆسـتی ئێمـەش لـەوێ پـەیام بـۆ سـەرکردەی خـۆی مسـتەفا خۆشناو دەنێرێ کە ئەوا هێزی ئیرتیجاع پەلاماری هێناوە چارە چیە؟ ئـەویش دەسـتور دەدا تـا دەیەنـە نێـو سەنگەری نێوە دەست مەکەنەوە ئەوانیش جەمعەن بە کۆمەکێکەوە کە لە لایـەن سـەرکردەی خۆیانـەوە پێیـان دەگا دەبنە 39 کـەس دەنـگ ناکـەن تـا دوژمـن دەگاتـە نێـو سـەنگەرەکـەیان ئـەمجار لێیـان دەردەپـەڕن و عیدەیەکیان لێ دەکوژن و پەنجا هەزار فیشەکیان لێ دەگرن و دوژمن دەشکێ.

دوای کەمێک دیسان دوژمن پەلامار دێنێ ئەمجار لە حـدودی 30 کـەس لـە پـۆلی سـەرکردە میرحـاج ئەحمەد کۆمەک بۆ کوردەکان دێت و شەڕێکی ڕۆستەمانە و قورسیان دەگەڵ دەکـەن و گورهانێکیـان لـێ دیـل دەکەن بەڵام چونکو پێشمەرگەکانی کوردستان گەرمی شەڕ دەبن و ژمارەیان لە 70 کەس پتـر نابێـت کـەس نابێ ئەم دیلانە لێ خورێ. ئـەمجاریش دوای لـێ گرتنـی چەنـد تفـەنگ و کـوژراوێکی زۆر دوژمـن دەشـکێ دیسان جاری سێیەم پەلاماری دێنن عیدەی مە کە وەسیلەی هەڵگرتنی بریندارەکانیان نەبو ناچار بـۆ خۆیـان بریندارەکانیان هەڵدەگرن و دەکشێنەوە و گردی مامەشا بە جێ دێڵن و لە سەربازەکان 500 کەسیان کوژراو و 250 کەسیان بریندارە 2 تانک و 2 تەیارەیان سوتاو و شکاوە.

حەزرەتی پێشەوا فەرموی:

موقارینی ئەم پەلامارە لەوبەر چۆمیش ڕا لە دێی خەیدرەوە و لە پۆستی میـرەدێش ڕا پـەلاماریان بـۆ هێزی کوردستان بـرد بـو هەرچەنـد لـە جەبهـەی خەیـدر پێشـمەرگەکانی ئێمـە لـە بـەر کـەمی لـە هەوەڵـەوە پاشەکشێیان کردوە بەڵام سوارانی ئاغای ئەحمەدخانی فاروقی بە هیمدادیانەوە هاتوە بیلنەتیجـە لـە هـەر دو جەبهە دوژمن برێک تفەنگ و فیشەکی بە جێ هێشتوە و عیدەیـەکی کـوژراو داوە و هـەڵاتون و لـە جەبهـەی میرەدێ محەمەد ئاغا... شەربەتی شەهادەتی نۆشیوە."(28)

ڕۆژنامەی کوردستان لە ڕاپۆرتێکی درێژدا بـە قەڵـەمی عەبـدوڕەحمان عـەلی شـەڕی مامەشـا بـەمجۆرە دەگێڕێتەوە:

"شەڕی مامەشا: 3 هەزار سەرباز. 8 تۆپ، 2 تەیارە، 2 تانک بەرامبەر بە 39 بارزانی"

لە ڕۆژی 25 ی مانگی جۆزەردان ساڵی 1325 پادگانی سەقز بە سەرکردەیی سەرلەشکر حاجی عەلی رەزمئارا دو ساعەت شەوی مابو دەستی کرد بە ئاگربارانی هێزی ئێمە کە لە دەوری شار بون بەو هیوایـە کـە ئەو پۆستانەی ئێمە دامان مەزراندون لە سەری ڕێی سەقز و بانە بگێڕنـەوە دواوە و خوارووبـار بگەیـەنن بـە قشونیان لە میرەدێ، بانە و سەردەشت.

ئەم شەڕە دوازدە سەعات دەوامی کرد. هەرچی لە توانایان بـو بـەکاریان هێنـا 2 هـەزار سـەرباز، هەشـت تۆپ، دو تەیارە و دو تانک بێوچان شەڕیان دەکرد. شەڕی دەکرد لەگەڵ هێزێک وەکی خۆی ئامادە و پڕ چـەک؟ نە! پۆستێکی ئێمە کە عیبارەت بو لـە 39 تفـەنگچی بـارزانی بـە سـەرکردەی پـوت پۆلکونیـک ئاغـای مسـتەفا خۆشناو دلێرانە خۆیان بۆ لە سەنگەری خست بو وە بە تەنها سینگی بەرامبەر بەو ئاگرە زۆرە ڕاگرت بو.

هێزی ئێمە لە بەر ئەوەی کە دەستوری شەڕی پێ نەدرا بو ئامادە نەبو بـۆ شـەڕ. لـە پـاش سـەعاتێک فیشەکی تەواو بو. بەڵام سەربازەکانی پۆست سندوقی سەرمۆری فیشەکیان بەجێ هێشت بو لە سەنگەرەکانی پێشەوەیان. ئەو فیشەکانە وە دەست هێزی ئێمە کەوتن ئـەوجار هـەر دەبینـی سـەربازە و بـە گوللـەی خـۆی دەکوژرێت.

شەڕ قایم بو: تانکێ ڕوی کردە سەنگەری بارزانی‌یان و بـە تونـدی ئـاگری دەهاویشـت. تۆپـەکانیان چاوی ئەئەتروکان (لەو شەڕانەدا نزیکی پێنج هەزار گوللە تۆپی هاویشت). تەیارە لە خول خواردن نەدەکەوت. موسەلسەل(!)بۆمبای ئەدەویست و بۆمبارانی خۆی دەکرد و هێزی پیادەش بێوچان هێرشی ئەهێنا بەڵام خێرا ڕایان دەکرد و بە پەلەپڕوزێ خۆیان گەیاندەوە سەنگەر ئەویش پەرێشان و بریندار بە چەند لاوە.

لەو ئاگربارانەدا بارزانی‌یان مێشیان میوان نەبو. ئاغای مستەفا خۆشناو هـاواری دەکـرد: کوردایـەتی خۆتان بنوێنن، میللەتی کورد ڕوسور کەن. دو تانک بە گوللەی تانکشکێن شـکێندران. یـەکێ لـە شـۆفێرەکان کوژران. ئەوی دی هەڵات. ئاغای مستەفا خۆشناو لە تەقریرەکـەی دا دەڵێـت: هـەر بـۆ خـۆم بیسـت گوللـەی تانکشکێنم بە تانکەکانەوە نا. یەکێ لە بارزانی‌یان بـە تـەنها هێرشـی بـردە سـەر تانکـەکان تـا گەیشـتێ 5 سەربازی کوشت. سەربازێکی دەی ویست لە پشتەوە بەیدەستی بارزانی بکا. بارزانی نیشتە سەری و گرتـی. قەمەی سەربازەکەی دەرکێشاو لە ورگی دا. عیددەی سەقز تەلـەفاتێکی زۆری بـو. مانـدویتی زۆری بـۆ هێنـان ئینجا شەڕ دەستی کرد بە کز بون. بەرە بەرە تۆپەکانیان لە ئاگردان کەوتن و هاڕەی تەیارە بڕا. تانکەکانیان ئارەزوی هێرش هێنانیان نەما وەختێ کە دیان دوانیان بەو دەردە چو کە چو. پوت پولکونیک ئاغای مسـتەفا خۆشناو باسی زەرەر و زیانی هێرش هێنەرەکان ئەکا و دەڵێت: وەکو بە چاوی خۆمان دیتومانە 500 نەفـەر سەرباز کوژراوە. خوێن وەکو جۆگە فرکەی دەکرد. دو تانکمان شکاندوە و شۆفێرێک کوژرا. نزیکـەی 250 نەفەر ئەسیر بون. بەڵام مەعەلئەسەف لە بەرئەوەی کە ئەفەراتمان زۆر کەم بو لەم شەڕەدا نەمان توانی کۆیـان بکەینەوە... دواوەیان بکەین. تفەنگ بێ حەدو حیساب لە گەڵ موسەلسەلی گەورە و پچوک کەوت بو. بەڵام لە بەر ئەوەی ئەمرم کرد بو کە مەمنوعە دەست درێژ کردن بۆ هیچ چەک و سیلاحێک و لە بەر ئەوەی لە ئاخردا شیددەتی ئاگر زۆر زیاد بو ئەمان توانی چەک و سیلاح کۆ بکەینەوە لە کیسمان چو.

لەم شەڕەدا لە بارزانی‌یان یازدە کەس بریندار بون. کوژراویان نەبو. با بپرسین و لێی بکۆڵینـەوە چ سرێکە ئەو لەشکرە زۆرە پڕ چەکەی سەقز ئەو هەمو زیانەی لێ کەوت و کشایەوە دواوە، بەرامبەر بـەو هێـزە کەمەی بارزانی‌یان؟

بێگومان ئەو ئاگری نیشتمانپەروەرییە کە ئاگری تۆپ و تەیارە و تانک و موسەلسەل، هەرچەندە زۆر بەتین بێت، کەم توانا و بێ کەڵکە و هەروەکو پشکۆ ئاگری ئاوی بە سەردا کەی دەبێتە ڕێژو سارد نەبێتەوە.

نشوستی نەهێنی هێزی حکومەتی میللی کوردستان

سەربەرز بی هێزی بارزانی‌یان"(29)

یەکێ لەو پێشمەرگانەی لـەم شـەڕەدا بـە سـەختی بریـندار بـو خۆشـەوی خـەلیل مـزوری (1928 - 1946) بو. خۆشەوی کوڕی خەلیل خۆشەوی بو کـە دوای کشـانەوەی بارزانی‌یـەکان بـۆ تورکیـا لـە سـاڵی 1931 دا ئەو لە چیاکانی سەرسنور مابوەوە تا لە 1937 دا کوژرا.

خۆشەوی بەشداری شۆرشی بارزانییان بو بو. لە گەڵ ئەوان کشا بوەوە کوردستانی ئێران. لە کاتی ڕێکخستنی هێزی بارزانییەکان ئەم بە فەرمانـدەی چڵی 2 ی لکی 1 ی هێـزی بارزانییـان دانـرا بـو. بـە برینداری بۆ تەداوی نێردرایە تەورێز. بەڵام لەوێ دوای 4 ڕۆژ لە نەخۆشخانە مرد. بە مەراسیمێکی پڕ شکۆ لە مەهاباد بە خاک سپێردرا. محەمەد مەحمود لە ڕۆژنامەی کوردستان دا ژیننامەی "قارەمان خۆشـەوی خـەلیل مزوری" نوسیوە و هێمن شعرێکی بە ناونیشانی "خونچەی خوێنین" بۆ شیوەنی هۆنیوەتیەوە.(30)

لە پێش مامەشا دا چەند جارێ شەڕ و پێکادان لە نێوان پێشمەرگە و ئەرتەش دا ڕوی دا بو. ئەرتـەش پتەوی دیواری دیفاعی پێشمەرگە، بە تایبەتی هێزی بارزانییانی تاقی کرد بوەوە.

### 6. 2. ڕێککەوتنی سپایی قازی - ڕەزمئارا

لە کاتی ڕودانی شەڕی مامەشا دا قازی محەمەد لە تەورێز بـو. نوێنەرایـەتی تـارانیش لـە تـەورێز بـو. خەریکی گفتوگۆ بون. قازی ڕۆژی 26 ی 3 ی 1325 بە پەلە لە تەورێزەوە چو بـۆ گونـدی سـەرا. گونـدی سەرا بارەگای سەرکردایەتی جەبهەی سەقزی لێ بو.

ڕۆژنامەی کوردستان بەمجۆرە هەواڵی "چونی بۆ سەرا" ی بڵاوکردۆتەوە:

"رادیۆی کوردستان وەڵامی دا حەزرەتی پێشەوای کوردستان لە تەورێزەوە چۆتە دێی سەرا و دەگـەڵ سەرتیپ رەزمئارا گفتوگۆیان بوە ئێستاکە خەریکە بە جەبهەکان رابگـا و دەسـتوراتی پێویسـتیان بـۆ سـادر دەفەرموێ."(31)

گفتوگۆکانی سەرا لە نێوان قازی و ڕەزمئارا دا لایەنی سپاییان هەبو. هـەردولا ڕێککـەوتن لـە سـەر ڕونەدانی شەڕ و، لابردنی مەرجداری گـەمارۆدانی ئەرتـەش و، دانـانی چەنـد نوێنـەرێکی کـورد لـە ناوچـەی گەمارۆدراوەکان دا. خاڵە سەرکییەکانی پێکهاتنەکە بریتی بون لە:

1. ڕێگەدان بە هێزەکانی ئێران لە سەقزەوە خواردەمەنی و جلوبەرگ، لە دوای پشکنینی، بنێـرن بـۆ ئـەو هێزانەی کە لە میرەدێ و بانە و سەردەشت لە لایەن هێزەکانی کوردستانەوە ئابڵوقە درابون.
2. نەناردنی چەک و شتومەکی جەنگ بۆ ئـەو شـوێنانە و، نـەگۆڕینی ئەفسـەر و سـەربازەکانی شـوێنە ئابڵوقەدراوەکان، جگە لەوانەی نەخۆش و بریندارن.
3. هەر کاروانێک ئازوخە و جلوبەرگ کە لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە، پاش پشکنینی، ئەنێردرا بۆ هێـزە ئابڵوقەدراوەکان ئەبو نوێنەری حکومەتی کوردستانی لەگەڵ بێ.
4. ئەگەر ئەرتەشی ئێران بە پێچەوانەی ئەم بەندانە بزوتەوە ئەیروی کورد حەقی ئەوەی هەبو بەربەسـتی بکا و نەهێڵێ شتومەک بچێ بۆ ئەو شوێنانە.(32)

### 6. 3. دانانی نوێنەرانی کورد

بۆ جێبەجێ کردنی بەندەکانی ڕێککەوتنەکە نوێنەری حکومەتی کوردستان لە شـارەکانی سـەقز، بانـە، سەردەشت، دانرا. سەرانی حکومەتی کوردسـتان جێبـەجێ کردنـی وردی ئـەم ڕێکەوتنـەیان ئەوەنـدە بـەلاوە گرنگ بو چەند کەسێ لە بەرپرسە پایە بەرزە باوەڕ پێ کراوەکانی خۆیان بـۆ دانـا. "وەزیـری هێـزی میللی کوردسـتان ژەنـەراڵ سـەیفی قـازی"بـە نامەیـەکی ڕەسـمی لـە 18 ی 4 ی 25 دا "پـات پالکوینـک محەمـەد نانەوازادە معاونی سیاسی وەزارەتی هێزی کوردستان"بۆ ئەم کارە داناوە:

"هەروەکو حوکمی بازڕەسی تەواوی هێزی میللی کوردستان بـە تـۆ دراوە ئـەلعان کـە مەئموریـەتت لـە سەقز پێویستە دە غیابی مندا بە چاکی موتەوەجیە بی هەر وەختێ حیست کرد کە نوختەیەک لـە پۆسـتەکانی

قیوای دیمۆکرات عەمەلێک بەر خیلافی ڕوحی موسالەمەت ڕوی دا فەوری شەخسەن بۆ ڕەفیعی ئەو عەمەلە بچی و لەو مەوزوعە ئیختیاراتی تەواوت هەیە بەو جۆرە ئیختیاراتی تـۆ بـە فەرمانـدەهانی جەبهـە ڕاگەیانـدرا کـە مەسئولیەتی ئەو مەوزوعە متەوەجیە بە تۆیە."(33)

جگە لە نانەوازادە چەندین نوێنەری تر لە شارەکانی سەقز، بانە، سەردەشت، دانران. ئاڵوگۆری نامە و هاتوچۆ لەنێوان نوێنەرانی حکومەتی کوردستان و ئەفسەرانی ئەرتەش دا دەستی پێ کرد.

ڕۆژی 14 ی 4 ی 25 سەیفی قازی و مستەفا بارزانی پێکەوە چون بۆ سەردانی جەبهە.(34)

## 6. 4. بەربونەوەی نانەوازادە

نانەوازادە لەلایەن وەزارەتی هێزەوە ڕاسپێردرا بو لە سەقزەوە سەرپەرشتی گوێزانەوەی ئەو ئازوقەیـە بکات کە بۆ سەربازگەکانی بانـە و سەردەشـت نـەنێردران. بـەپێی ڕۆژی 25 ی 4 ی 25 لـە بانـە سـواری فڕۆکە ئەبێ بچێ بۆ سەقز لە نزیک کەلیخان فڕۆکەکەیان ئەکەوێتە خوارێ. فڕۆکەوانەکە بـە چـەتری نـەجات خۆی ڕزگار ئەبێ. بەڵام نانەوازادە لە فڕۆکەکەدا ئەسوتێ.(35)

محەمەدی نانەوازادە کوڕی میرزا عەبدوڵا. لە بنەماڵەی نانەوا، یەکێ لە بنەماڵـە کۆنـەکانی مـەهاباد بـو. باوکی نانەوازادە بازرگان بو. ساڵانی 1298 - 1310 لە قوتابخانەکانی مەهاباد خوێند بوی. چەنـد سـاڵێ فەرمانبەری "ئیدارەی فەرهەنگ" بـو. سـاڵی 1316 چوبـو بـۆ سـەربازی "مەدرەسـەی گروهیتـی" بـڕی بـو. ماوەیەک لە "ئیدارەی مالیەی مەهاباد" سەرۆکی "ماڵیاتی غەیرە موستەقیم" بـو. سـاڵی 1323 وازی لـە کـاری حکومەتی هێنا بو خەریکی بازرگانی بو.

نانەوازادە ساڵی 1320 چوە بۆ ناو "حیزبی ئازادی کوردستان" و، یەکێ لە دامەزرێنەرە چالاکـەکانی کۆمەڵی ژ. ک بو. لە ڕێبەندانی 1324 دا بو بە فەرماندەی هێـزی مەرکـەزی و، موعـاوینی سیاسـی وەزیـری هێزی دیمۆکراتی کوردستان بو.

نانەوازادە یەکێ لە بەرپرسە پایە بەرزەکانی حکومـەتی کوردسـتان و، جێگـەی ڕێـز و بـاوەڕی قـازی محەمەد بو. لە ڕۆژنامەی کوردستان دا زۆر بەڕێز و داخەوە لە سـەریان نوسـی و شـیوەنیان بـۆ کـرد. قـانع شعرێکی بە سۆزی بۆ شینی هۆنیوەتەوە.

## 6. 5. دۆخی جەبهە و ژیانی پێشمەرگەکانی

بارەگای سەرەکی سەرکردایەتی جەبهەی سەقز لە گوندی سەرا بو. جەنەراڵ مایور محەمەد ڕەشـیدخان فەرماندەی گشتی جەبهەکە لەوێ بو. بارەگا و شوێنی هێزەکان لە نـاو ئاواییـەکانی دەوری سـەقز و، بانـە و، سەردەشت داو لە ناو ماڵی دانیشتوان دا بو. هێشتا هێـزی کوردسـتان، وەکـو هـەر هێزێکـی ڕێـک و پێکـی سپایی، فێر نەکرا بون سەربازگە بـۆ خۆیـان لـە دەرەوەی ئـاوایی دروسـت بکـەن. ئەمـەش دەبـو بـە هـۆی تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵک و لە ئەنجام دا دروست بونی گەلێ کێشە و گیروگرفتی ڕۆژانە.

هێزەکـان خێڵـەکی بـون. ڕێکخسـتنی کەرتـەکانی پێشـمەرگەی ئێلـەکان لـە یەکـەی دیـاری کـراودا و دیـاریکردنی پلـەی پێشـمەرگەیی فەرمانـدە و سـەرکردەکانیان نـەی تـوانی بـو دیسـیپلینی سـپاییان تێـدا بچەسپێنێ. زۆر جار گوێیان ئەئەدایە سەرۆکەکانیان. شوێنەکانی خۆیان بەر ئـەدا. دەسـتدرێژیان ئـەکردە سەر مافی دانیشتوانی بێ دەسەڵات. لێپرسینەوەش بەهۆی هەلومەرجی ئەو کاتەوە کەم بو.

حکومەتی کوردستان ئەی توانی بو وەکو پێویست ئازوقە و خواردەمەنی و، جلوبەرگ و، داوودەرمان، چەک و تەقەمەنی، بۆ هێزەکانی دابین بکات. لەبەرئەوە ئەرکێکی قورس کەوت بوە سـەر دانیشـتوان. هەنـدێ جار پێشمەرگە بە زۆر شتیان لە خەڵک ئەسەند و بێگاریان پێ ئەکردن.

سەرەرای هەمو ئەم کەم و کوری و ناتەواویانە خەلک پێشمەرگەیان بە هێزی خویان ئەزانی، هێزەکانی ئێران زۆریان لێ نەترسان و پێشمەرگەکانی کوردستان لەبەردەمی هێرشەکانی ئەرتەشی ئێران دا، راوەستان و هێرشەکانیان تێک نەشکاندن. شوێنەکانی خۆیان چۆڵ نەکرد تا ئەو رۆژەی حکومەتی کوردستان فەرمانی پاشەکشێ ی پێ کردن.

## 7. رێکەوتنی سپایی کوردستان و ئازەربایجان

مەترسی هێرشی ئێران بۆ سەر قەڵەمڕەوی ئازەربایجان و کوردستان سەرانی هەر دو حکومەتی ناچار کرد بیر لە دانانی رێوشوێنی هاوبەش بکەنەوە بۆ رێکخستنی هێزەکانی خۆیان و پاریزگاری سنورەکانیان لە هەڕەشە و دەستدرێژی.

لە 16 ی تشرینی یەکەمی 1946 دا سەرانی هەر دو حکومەت رێکەوتنیان ئیمزا کرد. "کۆمیسیۆنی دیفاعی موشتەرەک" یان پێک هێنا. خاڵە سەرەکی‌یەکانی رێکەوتنەکە بریتی بون لە:

1. پێکهێنانی لەشکرێکی کوردی - ئازەری هاوبەش. ناوەندەکەیان لە تەورێز بێ.
2. ناردنی هێزی نیزامی ئازەربایجان بۆ بە هێزکردنی جەبهەی سەقز لە کوردستان و. ناردنی هێزی نانیزامی کوردستان بۆ ئازەربایجان ئەگەر پێویستی کرد.
3. جەنەراڵ عەزیمی سەرکردەی گشتی هێزەکان بێ لە سەقز و سەردەشت و هەوشار.
4. جەنەراڵ بارزانی سەرکردەی گشتی هێزی هاوبەشی کورد و ئازەری جەبهەی سەقز بێ.
5. جەنەراڵ سەیفی قازی سەرپەرشتی ناوچەی هەوشار بکا.
6. قازی محەمەد فەرماندەی هەرە بەرزی هەمو هێزەکانی کورد و ئازەری بێ لە کوردستان.
7. پیشەوەری فەرماندەی هەرەبەرزی هەمو هێزەکانی ئازەری و کورد بێ لە ئازەربایجان.(36)

بە پێی ئەم رێکەوتنە حکومەتی ئازەربایجان چەند ئەفسەرێک و چەند تۆپێکیان بۆ بەهێزکردنی خەتی دیفاعی سنوری کوردستان ناردە جەبهەی سەقز.

ئەم رێککەوتنەش، وەکو هەمو پلانەکانی تری ئازەربایجان و کوردستان، لەگەڵ بریاردانی بەرەنگاری نەکردنی ئەرتەش دا هەڵوەشایەوە.

نەخشەی ١٠: سنووری دەسەڵاتی حکومەتی کوردستان،
شوێنی شەڕەکانی پێشمەرگەو ئەرتەش، ڕێگای چوونی بارزانییان بۆ سۆڤیەت




سەرچاوە: ئیگلتن، سەرچاوەی ناوبراو

## پەراویزەکانی بەشی پێنجەم

1. ر کوردستان، ژ 10. 24/11/15 بەرامبەر 46./2/4
2. ر کوردستان، ژ 14. 24./11/24
3. ر کوردستان، 1325./4/18
4. ر کوردستان، 25./4/27
5. ئیگلتن، س ن، ل 91-92.

Eaglton, William, Jr. The Kurdish Republic of 1946, London,1963. p. 92-91.

لێرە بە دواوە ئەنوسین: ئیگلتن.

6. ر کوردستان، ژ 21. 1324./12/11
7. ر کوردستان، ژ 23. 1324./12/15
8. ر کوردستان، ژ 26 و 27. 27 /24/12 - 25./1/5
9. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە:

مەحمود مەلا عیزەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان: نامە و دۆکومێنت. ب 1، سوید، ئازاری 1992.

لێرە بە دواوە ئەنوسین: عزەت.

مسعود البارزانی، البارزانی والحرکە التحرریە الکردیە: ثورە بارزان 1945-1958، کردستان 1987. ل 15-.16

10. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، نامەی ژمارە 22 و 24.
11. ر کوردستان، 25./2/16
12. ر کوردستان، ژ 45. 25./2/18
13. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، دۆک 11، ل 37.
14. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، دو 180، ل 251.
15. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، دو 22، ل 25-.53
16. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، لاپەڕەکانی 78، 94-101، ل 106-.111
17. ر کوردستان، ژ 49. 25./3/4
18. ر کوردستان، ژ 50. 25./3/6
19. ر کوردستان، ژ 54. 25./3/15
20. ر کوردستان، ژ 53. 25./3/13
21. ئەرفەع، ل 91.

Hassan Arafa, The Kurds, London, 1966, P. 91.

لێرە بە دواوە ئەنوسین: ئەرفەع.

22. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، دوک 97، ل 155.
23. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، دوک 131، ل 193.
24. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، ل 194.
25. ر کوردستان، ژ 52. 25./3/11
26. ر کوردستان، ژ 62. 25./4/5

27. د قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی: کورتەیەک لە مێژووی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران. بەرگی یەکەم، چ 2، 1988. ل 102.
نێگلتن، س. ن، ل 97.
28. ر کوردستان، ژ 62، 25/4/5
29. ر کوردستان، 1325/4/18
30. ر کوردستان، ژ 62، 25/4/5
31. ر کوردستان، ژ60، 25/3/29.
هەروەها بڕوانە: ئەرفەع، س. ن، ل 94.
32. علاءالدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، بەغداد، چاپخانەی مەعارف، 1959. ل 290. لێرە بە دواوە ئەنوسین: سجادی.
مەحمود عیزەت، کۆماری میللی مەهاباد: لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، 1984. ل 172.
ئەرفەع، س. ن، ل 91.
33. عیزەت، دەوڵەتی... ب 1، دو 193، ل 267.
34. ر کوردستان، 1325./4/18
35. ر کوردستان، 1325./4/30
36. سجادی، س. ن، ل 308-309.

# 6. کورد لە نێوان دۆست و دوژمنەکانیدا

## 1. ڕاگەیاندنی ئەتلانتیک و هیواکانی کورد

لەو کۆبونەوەیەدا کە سەرکۆماری ئەمریکا ڕۆزفێلت و سەرۆوەزیری بەریتانیا چەرچڵ لە ئابی 1941 دا لە ناو ئەتلانتیکدا کردیان، ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان بڵاو کردەوە ئەو سەرەتایانەیان تیا باس کرد بو کە ئەبو ئەم دو وڵاتە پێڕەوی بکەن لە تەقەلاکانیاندا بۆ دامەزراندنی ئاشتی‌یەکی ڕەوا و دنیایەکی ئارام دوای ڕوخاندنی ڕژێمی نازی. سەرەتاکان بریتی بون لە: (1) چوار ئازادییەکە: ئازادی لە ترس و برسێتی. ئازادی دوان و دین، (2) جێبەجێکردنی سەرەتای ئازادی خۆبڕیاردان لە هەمو گۆڕانە ئەرزی‌یەکاندا، (3) مافی هەمو گەلان بۆ هەڵبژاردنی جۆری ئەو حکومەتانەی بۆ ژیانی خۆیان ئەیانەوێ، (4) چونی وەکو یەک بۆ بازرگانی و کەرەستەی خاوی بنەڕەتی خۆشیی و هاوکاری ئابوری لە ناو هەمو نەتەوەکاندا، (5) ئاشتی و ئاسایش بۆ هەمو دەوڵەتەکان، (6) ئازادی دەریاکان، و (7) وازهێنان لە بەکارهێنانی چەک و دامەزراندنی سیستەمێکی ئاسایشی گشتی تاسەر و چەککردنی هەمو ئەو نەتەوانەی هەڕەشە لە ئاشتی ئەکەن.

ئەمانە خاڵە سەرەکی‌یەکانی ڕاگەیاندنی ئەتلانتیک بون. ئەمیش وەکو 14 سەرەتاکەی ویلسۆن، کە لە یەکەم جەنگی جیهانیدا بڵاوی کردنەوە، لایەنی پڕوپاگەندەی سیاسی هەبو. بۆ دڵخۆشکردنی گەلانی زۆرلێکراوی دنیا و، بە دەستهێنانی لایەنگیری و پشتیوانی‌یان بو دژی ئەڵمانیا و هاوباوەڕەکانی. هیچ هێزێکی لە پشت نەبو جێبەجێیان بکا.

لە ساڵانی دوەم جەنگی جیهانیدا سەرکردەکانی کورد، وەکو ساڵانی یەکەم جەنگی جیهانی هیواکانی خۆیان لە سەر بەڵێن و گفتە بڵاوکراوەکانی هاوپەیمانەکان هەڵچنی بو. هیچ دەوڵەتێک، بەڵێنێکی دیاریکراوی دەربارەی چارەنوسی سیاسی کورد، بە ئاشکرا یا بە نهێنی، بە گەلی کورد یا بە سەرکردەکانی نەدا بو. قازی محەمەد و سەرانی تری کورد باوەڕێکی زۆریان بە یەکێتی سۆڤێت و هیوایەکی زۆریان بە "ڕاگەیاندنی

ئەتلانتیک" ھەبو. لایان وابو، ئاوەڕۆکی ئەو ڕاگەیاندنە سەبارەت بە نابین کرینی ئازادی گەلان بۆ دیاریکرینی چارەنوسی خۆیان، کوردیش ئەگرێتەوە.

گۆڤاری "نیشتیمان" زمانی کۆمەڵەی ژ. ک لە دوایین ژمارەیدا لە ژێر سەردێڕی "مۆسکۆ، واشینگتۆن، لوندۆن" دا بە قەڵەمی "ع مرۆ" نوسیویەتی:

"ئەوە ھاواری ھەمو کوردانە بۆ ئەو سێ دەوڵەتە گەورانە کە بۆ ڕزگاری و خۆشبەختی گێتی بە شەڕ دێن، کوڕ و باب و برای خۆیان بە کوشت (دەدەن) تا کوڕ و باب و برای نەتەوە بچوکەکان پێک شادو شکور بن، زەویوزاری کێڵدراو و پرحاسڵی خۆیان بە سوتان دەدەن و دەیکەنە پێشێل و، ماڵ و منداڵی خۆیان برسی دەکەن تا دەشت و کێوی بەیار و ڕەقوتەقی ئەوان بێتە کێڵگە و پێخوست ئەبو کورِوکاڵیان تێر و تەسەل بن، ئەو ھەمو کارخانە گەورە و کۆشک و باڵەخانە ڕازەوە و ئاوەدانانەی خۆیان دەکەنە نیشانگەی بۆمب و تۆپ و ئاور، وە بە تێکدان و وێرانبونی دەدەن، بە کەم بەرگی و بێ خانویی میللەتی خۆیان ڕازی دەبن تا دەزگای جۆلایی و خەرەک و ئاشی ئەوان بە ئارامی بگەرێ و جاو و، بوزو و، ئاردی ورد، بۆ بەرگ و خواردەمەنی ئەوان ساز بکا و بە کۆک و پۆشتەیی و دڵخۆشی دەکوخ و خانوە ئەوی و پچوکەکەی خۆیان دا بژێن!

ئەو ڕەوشتە لای ژوروی پیاوەتی و ئینسانییەت و بەشەرییەتە و دەبێ ببێتە سەرمەشقی ھەمو دەسترۆیونێک.

خشڵ و خۆڕازاندنەوەی پیاوان، ئاکاری چاکە، نەک بگرەوبەردە و زێڕ و زێوەری دیمەنی چاک و دڵ و دەرونی پیس و خراپ. ئەو سێ دەوڵەتە گەورانە بڕیاریان داوە ھەر بە چاوێک تەماشای گشت نەتەوەکان بکەن و نەھێڵن زۆردار بێزۆر بخوا، ھێزدار بێھێز قوت بدا و، ئازادی و سەربەخۆیی بە تەواوی نەتەوەکان ببەخشن.

کوردیش کە یەکێک لە گەلانی بەشخوراو و زۆرلێکراوە لەسەر ئەو بڕیارە لە ئازادی و سەربەستی و ڕزگاری خۆی دڵنیایە وە ھێندی ھەمو دنیا بەم بڕیارە دڵخۆشە و شانازی پێوە دەکا، چونکو ھیچ میللەتێ وا ژێرچەپۆکە و سوک و چروک و بەشخوراو نەبوە.

دراوسێکانی ئێمە: تورک، عەرەب و فارس ئێمەیان لە ناوخۆیاندا بەش کردوە و بە چاوی دیلی و یەخسیری تەماشامان دەکەن و ھیچ چاکەیەکمان پێ ڕەوا نابینن و لە ھیچ خراپەیەک دەربارەمان خۆناپارێزن.

بۆ ئەوەی وردەوردە لە ناو خۆیاندا بمان توێننەوە نایەڵن بە زمانی خۆمان بخوێنین و بنوسین، تەنانەت لە قوتابخانەکاندا دەبێ ئاخاوتنیشمان بە زمانی وان بێ نایەڵن خۆبەخۆ ڕێک بکەوین، ئەگەر دو کەس پێکەوە کۆبینەوە بە ناوی سیاسەت دەمان گرن و دەمان کوژن.

خەریکن لە لای ئێوە کە بڕیاری ژیانی سەربەخۆتان بۆ ھەمو نەتەوەیەکی پچوک داوە ڕەگەزمان بەرنەوە سەر خۆیان، بە تورک، عەرەب و فارس مان بناسێنن تا ھاوارمان ئەگاتە پێشگای عەدالەتی ئێوە.

خۆ ئێوەش دەزانن، مێژوش گەوایی دەدا کە کورد نەتەوەیەکی جیاواز و بنەماڵەیەکی سەربەخۆ و پاکە، نە عەرەب، نە تورک و نە فارسە، نە دەش بینە یەک لەوانە.

کورد بە ھیچ بارێک لەو نەتەوانەی کە دەژێر سایەی ئێوەدا ئازاد و موستەقیل دەژین کەمتر نین. تکامان وایە ئێمەش لە قەومانی تر ھەل ناوێرن وە زیاد لەو ھەمو نەتەوە گەورە و بچوکانە، کوردان دڵشکاو و جەرگبڕاو نەکەن و ئاھونزولەی ئەو ھەمو ژن و منداڵە بێکەس و ھەژارانە مەھێننە سەر خۆتان. ئەوەندەش بزانن عەرەب و تورک و فارسەکانیش تێ بگەھێنن کە کورد چاویان کراوەتەوەو دەزانن: زەمانی یەخسیری و بەندەیی نەماوە، ئەو ھەمو شەڕ و کوشتارە لە پێناوی وشەی پیرۆزی "ڕزگاری - ئازادی" یە و تازە

ناچنەوە ژێر باری ئاغا و نۆکەری هیچ کەس. هەرکەس بەتەمای داگیرکردنی کوردستان بێ لازمە سەر و لەشی سەربازانی خۆی و کوردان بکاتە پردەباز و کەشتی تا لە زەریای خوێنی خۆی و کوردان بپەڕێتەوە بەری کوردستانی گەورە.

کورد گەلێکی گەورە، دارای وڵاتێکی پڕ خێر و بەرەکەت، کە بە خوێن کڕاوە و پارێزراوە.

ڕستەیەکی کوردی هەیە کە هەمو کورد باوەڕیان پێی هەیەو دەڵێن: "ژین وەک لێیان کردۆتە هەرا وا خۆش نیە، مردنیش وەک لێیان کردۆتە هەرا واناخۆش نیە". پێداویستە عەرەب، تورک و فارسەکان چاک بیر لە داوای میللی ئێمە (کوردان) بکەنەوە و چی دیکە خۆمان لێ گێل نەکەن و لێمان نەبنە: وشتری ناو پەمو. دەستی ئێمەو دامێنی ئێوە، نەی حکومەتە گەورە و دابپەروەرەکانی گێتی!"(1)

حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لە ئێران، لە یەکەمین ڕاگەیاندنی خۆیدا نوسیوێتی:

"ئەمڕۆ گەلانی دونیا لە گەورە و بچوک دەیانهەوێ لەو ڕێگایەی کە بەرەو ئازادی خۆش کراوە کەڵک وەرگرن و لەو بەڵێنییانەی کە بە هۆی مەنشوری مێژویی ئاتلانتیکەوە دراوە سود ببینن و هەڵسوڕاندنی کاروباری خۆیان بەدەستەوە بگرن و چارەنوسی خۆیان بەویست و مەیلی خۆیان دیاری بکەن."

حیزبی ڕزگاری کورد، لە عێراق، هەر لەو سەردەمەدا لەو یادداشتەدا کە داوێتی بە کۆنفرەسی وەزیرانی دەرەوەی دەوڵەتە گەورەکان لە مۆسکۆ نوسیوێتی:

"مرۆڤایەتی بەخۆشییەوە برانەوەی جەنگ و سەرکەوتنی هێزە دیمۆکراتییەکان و تێکشکانی پیسترین شێوەی ئیستیعمار (فاشیزم) لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا وەرگرت. گەلی کوردی دابەشکراوی مافخوراو لە مێژە لەژێر باری زوڵم و چەوسانەوەدا دەناڵێنێ و، لە هەمو مافە مرۆڤایەتی و نەتەوایەتییەکانی بێبەش کراوە. ئەوەش لە ئەنجامی پلان و قازانجەکانی ئیستیعماری بەریتانی و حکومەتە کۆنەپەرستە فاشیستەکانی ئێران و تورکیا و عێراق دا بوە.

بە بۆنەی برانەوەی جەنگ و سەرکەوتنی هاوپەیمانەکانەوە گەلی کورد تکا ئەکا بە چاوی عەدالەت سەیری مەسەلەکەی بکرێ و، بێ بەش نەکرێ لەو بەڵێن و پەیمانانەی هاوپەیمانەکان دابویان بە گەلانی بچوک، سەبارەت بە ڕزگاری و مافی چارەنوسی خۆیان. ئێستاش کە وەزیرانی دەرەوەی 3 دەوڵەتە زلەکە لە مۆسکۆ کۆئەبنەوە هیواداریین بە ویژدانەوە سەیری مەسەلەی گەلان و نەتەوەکان بکەن.

حیزبی ڕزگاری بە خۆشییەوە ئەم نوقتانەتان ئەخاتە بەرچاو کە پەیوەندییەکی پتەویان هەیە بە کێشەی گەلی کورد و ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە:

1. ئێمە پشتیوانی لە خەباتی برا کوردەکانمان لە ئێران لە گەڵ برا ئازەربایجانییەکاندا ئەکەین لە پێناوی خودموختاری و حوکمی دیمۆکراتی و خەبات دژی حکومەتی کۆنەپەرست و لایەنگرەکانیان.
2. بە گرنگییەوە سەیری دۆخی گەلی کورد لە تورکیا بکرێ، حکومەتی تورکیای فاشیست بە شێوەیەکی درندانە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکات بۆ ئەوەی بە تەواوی لەناویان ببات بە زۆر بیانکا بە تورک.
3. دۆخی گەلی کورد لە عێراقدا تا ڕادەیەکی زۆر خراپ بوە، لە هەمو مافە دەستورییەکانی بێبەش کراوە بە هۆی بونی ئیستیعماری بەریتانی و حکومەتی کۆنەپەرستی ئێستا و ئوسلوبە فاشیستییەکانیەوە. سوتاندنی دێهاتی بارزانییەکان و ناوچە نزیکەکانی و، پەرەوازەکردنی هاوڵاتییان و گرتنیان، وەکو مەلا مستەفا و لایەنگرەکانی، بەڵگەی عەمەلین لەسەر ئەوە. لەبەرئەوە داوا ئەکەین خواستە نیشتیمانییەکانی کورد لە عێراق دا جێبەجێ بکرێن، هەرچەندە ئێمە باوەڕمان وایە ئەوەش هەر بە لەناو بردنی ئیستیعمار و حکومەتی کۆنەپەرستی ئێستا و گۆڕینی بە حکومەتێکی دیمۆکراتی ڕاستەقینە ئەبێ مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لە عێراقدا دابین بکا.

ئێمە وا سەرنجمان ڕاکێشان بو ئەم ڕاستیيانە. هیوادارین بە گیانی مرۆڤپەروەری چارەی بکەن. چارەسەرکردنی بە شێوەیەکی واقیعی ڕاستەقینە ئەبێتە هۆی گەشانەوەی شارستانێتی و ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. کۆمیتەی بەڕێوەبەری حیزبی ڕزگاری کورد".(2)

ئێگلتن لە زمانی قازی محەمەدەوە چیرۆکێ ئەگێرێتەوە، کە لە یەکێ لەو دانیشتنانەدا کردویەتی، کە لە گەڵ باقیرۆف بویەتی:

"ئاغایەک تانجیيەک بە گوندیيەک ئەبەخشێ. بۆ ڕۆژی دوەم گوندیيەکە دێتەوە لای ئاغاکە و سوپاسێکی لە ڕادە بەدەری ئەکات. بە جۆرێ ئاغاکە چاوەڕوانی ئەو هەمو ستایشە ناکات. سەری سوڕ ئەمێنێ و ئەڵێ: پێم ناڵێی خەڵاتێکی وا بچوک ئەم هەمو سپاسە ئەهێنێ؟

گوندیيەکە لە وەڵام دا ئەڵێ: لەبەرئەوەیە تانجیيەکت پێ بەخشیوم ئەوەش مەعنای وایە بۆ تەواوکردنی کەرەسەی ڕاو و ڕاوی نێچیر ئەسپێکیشم ئەدەیتێ، ئەسپیش بێ خواردن ناژێ، مانای خواردنی ئەسپەکەشم ئەدەیتێ. ئەسپ و خاوەنە تازەکەی بێ لانەش ناژین، بۆیە خانویەکیشم ئەدەیتێ. جا من ئەو هەمو شتانەم ئەدرێتێ چۆن کەیفخۆش و لە هەمو کەس زیاتر خۆشحاڵ نابم؟"

ئەم جۆرە بیرکردنەوە و چاوەڕوانیيە، لە ڕاستیدا، نمونەیەکە بۆ جۆری بیرکردنەوەی هەمو سەرانی کورد، لەو سەردەمەدا، سەبارەت بەو چاوەنۆڕیيە زۆرەی لە هێزە زلەکانی دنیایان هەبو.

ڕۆژنامەی کوردستان لە سەروتاری ڕۆژی 24 ی 10 دا نوسیویتی:

"... هیچ قومت و قودرەتێک ناتوانێ لە دنیای دیمۆکراسی فیعلیدا ئێمە بێنێتەوە ژێر یوغی ئەسارەت و بەندەگی چون ئەو حەقە ئەوڕۆ ئێمە بەدەستمان هێناوە ڕوحی مەنشوری ئەتلانتیک و موعاهەداتی موتەفیقینە."

محەمەد مەحمود لە ژێر سەردێڕی "کورد و پەیمانی ئەتلانتیک" نوسیویتی:

"لە لایەن هەموەوە ئاشکرایە کە پەیمانی ئەتلانتیک کەی دانرا.

ئەو پەیمانە مێژوییە کە لە بەینی سەرەکوەزیری پێشوی ئینگلیز میستەر چەرچیل و سەرەک جمهورەیتی ئەمریکا میستەر فرانکلین ڕوزفێلت. ئەو پەیمانەی کە هەمو میللەتانی بچوک و گەورەی سەرزەمینی دڵ خۆش کرد و هەر بەو بۆنەیەوە هەمو میللەتانی سەرزەمین بە مەبدەئی خۆیان کە ئازادیيە و مژدەیەکی خۆش بو لە لایەن ئەم پەیمانەوە باوەڕیان هێنا و پشت ئەستور بون.

ئەگەر تەماشایەکی ئەم پەیمانە بکەین کە لە لایەن دو گەورەی سیاسی عالەمەوە ئیمزا کراو بڵاوکرایەوە ئەو دەمەمان دێتە پێش چاو کە هێزی دیکتاتۆر و فاشیستان گەیشت بونە پۆپەی سەرکەوتنیان لە هەمو ئەوروپا و زۆری ئەفریقا و بەشی ئۆکراین و بەرەو قەفقازیش دەهاتن. هەر لەم کاتە دا بو ئەم مژگێنیيە درایە هەمو میللەتان کە لە چێشتنی تاڵی و ناخۆشی زوڵم و ئیستیعمار دا بون.

ئێستا بێینەوە سەر ئەو کاتەی کە چەرخ وەرگەڕاو بە هۆی هێزی سور و هێزانی سوێندخۆرانەوە شەڕ کۆتایی هات و هەمو میللەتان لە... دیکتاتۆری ڕزگاریان بو.

هەروەها کۆبونەوەی دەوڵەتانی موتەفیقین لە سانفرانسیسکۆ و کۆبونەوەی وەزەرای دەرەوەی ڕوس و ئینگلیز و ئامریکا و چین و فرانسە ئەمانە هەموی بۆ دامەزراندنەوەی دونیای دوای شەڕ بوە لەسەر ئەو پەیمانە پیرۆزە بەنرخە کە پەیمانی ئەتلانتیکە.

بەڵێ هەمو میللەت و دەوڵەتێک چاوەڕوانی ئەوەیە پەیمانی ئەتلانتیک بێتە جێ. چونکو بە تایبەتی میللەتانی بچوک ئەم دوایی شەڕە وەک دوایی شەڕی پێشو تەماشا ناکەن. میللەتی کوردیش، کە یەکێکە لەو میللەتانە کە ئاوارەی دەستی ئیستیعمار بوە، بە هەمو هێزێکەوە تێ دەکۆشێ بۆ هێنانەجێی پەیمانی ئەتلانتیک کە ڕێگای بۆ هەمو میللەتێک کردۆتەوە چە گەورە چە بچوک بەرەو ڕێگای ئازادی بڕوات.

میللەتی کورد خاوەنی جێگای خۆیەتی لەو بەشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە دەستی ئیستیعماری شەڕی پێشو وای بەسەر هێناو، کردییە سێ بەشەوە. بەڵام کوردیش ئەمڕۆ زۆر باش ئاگاداری ئەو سیاسەتانەیە کە لەناو دەوڵەتان دا دەگەڕێت و، ئەمینە لەوەی کە پەیمانی ئەتلانتیک تەنها نوسین نیە لە سەر کاغەز، بەڵکو پەیمانێکە کە بەرامبەر هەمو میللەتێک دێتە کارەوە و، ئەم هاتنە کارەش دەگاتە میللەتی کوردی خاوەنی مێژو و ئەرز و زبان و ئەدەبیات و عەنعەناتی میللی.

کورد لە هەمو دەمێک دا بۆ تەئمینی ئاسایشی دنیای دوای شەڕ خۆی بە بەشدار دادەنێت بە تایبەتی ئەساسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئازادی و سەربەخۆیی خۆیدا دەبینێ و ئەنجا لەو دەورەدا خۆی هەواڵی هەمو دەوڵەتێکی دراوسێ و هەمو میللەتێکی عادلپەروەری سەرزەمین دەزانێت."(4)

سەرکردەکانی کورد لە وتەکانیاندا و، نوسەرەکانی ڕۆژنامەی کوردستان لە وتارەکانیاندا زۆر جار ڕاگەیاندنی ئەتلانتیکیان ئەکردە بنچینەی بیانوی سیاسی و قانونی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان. بەڵام ئەم بەڵگەیە هیچ هێزێکی قانونی نەبو دەوڵەتان ناچار بکا پێڕەوی بکەن و هیچ هێزێکی چەکداریش بۆ جێبەجێ کردنی تەرخان نەکرا بو. بۆ حکومەتی کوردستانی هاپەیمانی یەکێتی سۆڤێت، کە ستایشێکی بێ ئەندازەی هۆردوی سور و ستالینی ئەکرد و لەگەڵ حکومەتی ئازەربایجانی لایەنگری کۆمۆنیزم و حیزبی تودەی ئێران پەیمانی هاوکاری ستراتیجی بەست بو، چاوەڕوانی و هیواداری بە ڕاگەیاندنێک کە لە لایەن ئەمریکا و ئینگلیزەوە بڵاو کرابوەوە، دور بو لە واقیعبینی سیاسییەوە.

هەروەها دامەزراندنی حکومەتی کوردستان بە پشتیوانی سۆڤێتی و خۆ ساغ کردنەوەی یەک لایەنەی سیاسی و خۆبەستنەوە بە هوروژی سوری سۆڤێتییەوە، لە کاتێک دا بە پێی ڕێکەوتنی "یالتا" دیار بو ئێران و هەمو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دابەشکردنی جیهانیی ناوچەکاندا، ئەکەوتنە ناو مەڵبەندی دەسەڵاتی ڕۆژئاواییەوە و ئەبو یەکێتی سۆڤێت بەجێی بهێڵێ، هەڵەیەکی کوشندە بو، سەرکردەکانی حیزب و حکومەتی دیموکراتی کوردستان توشی بون.

## 2. ترسی کورد: پەژارەی هاوبەش

جمهوریەتی کوردستان لە مەهاباد دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبو. نەخۆی بە جیاواز و سەربەخۆ دائەنا لە ئێران، نە هیچ دەوڵەتێکیش بە سەربەخۆی ئەناسی. حکومەتێکی "دی فاکتۆ" بو لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی ئێران دا. لەبەرئەوە پێوەندییەکانی دەرەوەی سنوردار بو لەگەڵ چەند شوێنێکی دیاری کراودا. بە واتایەکی تر دنیای دەرەوەی حکومەتی کوردستان، دنیایەکی زۆر تەنگ بو.

هەلومەرجی جیۆپۆلیتیکی کوردستانی ئێران لە هی بەشەکانی تر باشتر نەبو. لایەکی دەسەڵاتی ئێران و لایەکی تورکیا و لایەکی عێراق و لای سەروی سۆڤێت بو. واتە لە 3 لاوە دوژمن دەوری دابو. دەوڵەتانی هاوسنوری، جگە لە یەکێتی سۆڤێت، هەمویان بە توندی دژی حکومەتی کوردستان بون. بە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە و ترسناکیان دائەنا بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتەکانیان.

ئەمریکا و بەریتانیا لە دو سەرەوە دژی حکومەتەکانی ئازەربایجان و کوردستان بون: لە سەرێکەوە، لەبەرئەوەی ئەوان دژی هەمو شتێکی یەکێتی سۆڤێت بون و ئەم دو حکومەتەشیان بە دەستکردی ڕوسی دائەنا و لە سەرێکی ترەوە ئەوان ئەمەیان بە هۆی پارچە پارچە کردنی زەمینی ئێران و تێکدانی ئاسایشی تورکیا و عێراق و سوریا دائەنا، کە ڕاستەوخۆ پێچەوانەی قازانجە ستراتیجییەکانیان بو. نوری سەعید بە پەلە سەردانی تورکیای کرد بۆ ئەوەی ڕێوشوێنی هاوبەش دژی کێشەی کورد دابنێن.

عەبدوڕەحمان زەبیحی لە ژمارەی 12 ی ڕەشەمەی ڕۆژنامەی "ایران ما" ی چاپی تارانەوە وتارێکی لەسەر "چونی نوری سەعید بۆ تورکیە" کردۆتە کوردی، لەبەر نرخی سیاسی وتارەکە لێرەدا دوبارە ئەی نوسینەوە:

"چەندێک لەمەوبەر هێندێک لە ڕۆژنامەنیگارەکانی مەرکەز ئاگایی چونی نوری سەعید سەرەک وەزیری ئێستای عێراق و ئەندامی بەکاری یەکێتیی عەرەبیان بە ڕێگای سوریادا بۆ تورکیا بڵاوکردەوە: ئەو دەمێ نوری سەعید لە کابینەی عێراقدا ئەندامەتی نەبو لە کاتێکدا لەگەڵ کاربەدەستانی سوریا خەریکی هاوپرسەکی و گفتوگۆ بو. کابینەی عێراق بە سەرۆکایەتی حەمدی پاچەچی کەوت و، نوری سەعید لە لایەن نایبوسەڵتەنەی عێراقەوە بۆ دامەزراندنی کابینەی تازە بانگ کراوە بەغدا.

ئەو وەختێ هێندێک مەحافیلی سیاسی وایان دەزانی کە سیاسەتی ئیمپریالیزم پێی باش نیە نوری سەعید بچێتە تورکیا، بەڵام چەند شەو پێش. ڕادیۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خەبەری دا کە هەیئەتێکی ڕەسمی بە سەرۆکێتی نوری سەعید دەچێ بۆ تورکیا، لە بەغداش بۆ بێدەنگ کردنی پەیامنێرانی بێگانە بەرنامەی ئەم هەیئەتەیان لە پێنج بەنددا بە هۆی ئیعلامیەیەکی ڕەسمی بڵاو کردەوە.

لە یەکەم سەفەری نوری سەعید بۆ سوریا گەلێک لە پەیامنێرە بێگانەکان چاویان پێ کەوت و گفتوگۆیان دەگەڵ کرد لە جوابی پرسیارەکانی ئەم پەیامنێرانەدا دەیگوت: "ئەم سەفەرەی من هیچ جەنبەیەکی سیاسی نیە" باسی ئێرانیشی کرد بو گوتبوی: "ئەوزاعی ئێران گەلێک تێکەڵوپێکەڵە پێم چاک نەبو لە گەڵ کاربەدەستانی ئەوێ بدوێم" لەم وتەیەدا دەردەکەوێ کە نوری سەعید خەیاڵی بوە گفتوگۆیەک دەگەڵ کاربەدەستانی ئێران بکاو نەتیجەکەی بە حکومەتی تورکیا خەبەر بدا بەڵام چونکو ئەوزاعی ئێران تێکەڵوپێکەڵ بوە، وازی لەم گفتوگۆیە هێناوە.

ئێمە بۆ ئەوەی ماکەی ئەم سەفەرەی نوری سەعید بدۆزینەوە دەبێ چاوێک بە ڕۆژنامەکانی بێگانەدا بخشێنین و بزانین کە پەیامنێرەکانی ئەم ڕۆژنامانە وەزعیەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان چۆن لێک داوەتەوەو لەم بابەتەوە چی دەنگوباسێکیان بڵاو کردۆتەوە.

مەسەلەن ڕۆژنامەی "کومبا" چاپی پاریس لە ژمارەی 28 ی نۆڤەمبەری خۆیدا دەنوسێ: "نوری سەعید لە بەیتەلمەقدیس پەیدا بونی ئەهزەتێکی تازەی کورد لە ئێران بەیان دەکا، بە ڕاستی نابێ وا بزانن کە تیرەیەک بە تەنهایی لە ئێراندا شۆڕشیان کردوە بەڵکو لە ناو کۆمەڵێکی نۆ ملیۆنیی کورد کە لە نێوان 3 وڵاتی تورکیا، عێراق و ئێراندا دابەش کراون هەر لە ئەرزڕۆمەوە تا ئارارات و لە موسڵ تا لوڕستان دەست پێکرانی شۆڕشێکی گەورە دێتە بەرچاو" هەر ئەم پەیامنێرە لە جێگایەکی دیکە دەنوسێ: "کوردانی تورکیا لە ژێر زوڵموزۆرێکی بێ مانەندا دەژین، لە عێراق بە یارمەتی هێزەکانی ژەنەراڵ (ڕەنتون) ی ئینگلیسی قەتلوعام دەکرێن". ڕۆژنامەکانی دیکەش هەر وەکو ڕۆژنامەی کومبا لە بارەی کوردەکان و کارەساتی تورکیا و عێراق بۆ دامرکاندنی قیامی کوردەکان نەخبارێکیان بڵاو کردۆتەوە کە نیگەرانی زۆری کاربەدەستانی ئەو وڵاتانە لە جوڵانەوەی ئازادی خوازی کوردان نیشان دەدا.

خوێنەرەکانی ڕۆژنامەی "ایران" ناگایان لێیە کە نیگەرانی کاربەدەستانی تورکیا لە کوردان شتێکی تازە نیە بەڵکو ساڵەهایە کە تورکەکان بۆ بەربەست کردنی هەستی ئازادی خوازی لە کوردستانی تورکیا بە هەمو هێزی خۆیانەوە تێ کۆشاون حەتا ڕادیۆی پاریس چەند مانگێک لەمەوپێش خەبەری دا: "حکومەتی تورکیا بۆ پێش گیری لەپەرەسەندنی بیرانی ئازادی خوازی لە ناو تورکیا بە تایبەتی کوردەکان هێزێکی گەورەی ڕەوانەی سنورەکانی ئێران و عێراق و سوریا کردوە."

تورکەکان وایان دەزانی بەمجۆرە دەتوانن بینە بەرهەڵستی شۆڕشی ئیحتیمالی کوردانی تورکیا و قەومێکی چەندین ساڵە بەبێ ڕوحمی و زوڵموزۆر لە ژێر بەند و دیلی خۆیان دا ڕایان گرتوون ڕامیان بکەن، ئیتر بیریان نەکردەوە هەستی تۆڵە سەندنەوەی کوردان کە لەپێناوی ئازادیدا هەزاران قوربانییان داوە موحتاجی بزواندنەوە و تەحریک نیە و لە کاتی خۆیدا بەرانبەر زوڵم و بێدادی تورکەکان ڕادەبن و خۆیان لە دیلی و ژێر دەستیی ڕزگار دەکەن.

کاتێک کە کاربەدەستانی تورکیا هەستیان کرد داخستنی دەرگای وڵات (سنور) نامانجی تورکەکان پێک ناهێنێ، کەوتنە سەروکاری دامرکاندنی ئەم نەهزەت و شۆڕشە. ئەوەش پێک نەدەهات مەگەر دەگەڵ کاربەدەستانی سوریا و عێراق ڕێک کەون و بیان هێننە ژێر نفوزی سیاسی خۆیانەوە و کوردەکانی ئەم دو ناوچەیان پێ بێ دەنگ بکەن، ئەوەش لە وەختێک دا بو کە نایبوسەڵتەنەی عێراق، عەبدولئیلاه، لە لەندەن ڕا بە تورکیا دا دەگەڕاوە بۆ عێراق.

کاربەدەستانی تورکیە بە فرسەتیان زانی پێیان گوت: ئەگەر حکومەتی عێراق ڕێی ئازادی کوردەکانی خۆی بگرێ ئەوان حازرن لە داوای خۆیان دەربارەی ناوچەی موسڵ کە لە جەنگی ڕابوردودا تا ئێستا ماوەتەوە و حەل نەکراوە وازدەهێنن.

هەروەها خەبەر درا کە نایبوسەڵتەنەی عێراق کچی سەرکۆمار (ڕەئیسی جمهوری) تورکیا مارە دەکا. موسەفارەتی سەرۆک کۆماری تورکیا یا وەزیری دەرەوەی ئەم وڵاتەش بۆ عێراق لەنێو ئەم دەنگوباسانەدا هەبو کە هێشتاش هەر دەیڵێنەوە بەڵام ڕەسمی ئەم بابەتەوە هیچ شتێک نەبێژراوە.

وا هەڵ کەوت کاتێ نایبوسەڵتەنەی عێراق گەیشتەوە بەغدا شۆڕشی مەلا مستەفای بارزانی هاتە پێش، بە تەحریکی حکومەتی تورکیا و ئیقتیزای سیاسەتی ئینگلیسەکان حکومەتی عێراق لەشکری بردە سەر ئەو ڕۆڵە ئازا و ئازدیخوازەی کورد لە نەتیجەدا توشی زەرەروزیانێکی زۆر بو. عیدەیەک لە ئەفسەرە کوردەکان بۆ لای برا ئازا و دلێرەکانیان هەڵاتن و لە پێناو پاراستنی ئازادی نەتەوەکەیان دا ئەوەندەی پێیان کرا جەنگین.

ڕەکێش کردن و هێنانە بەرباری حکومەتە تازە بنیادەکەی سوریاش زۆر سەمەرە و سەیر بو. لە کاتێک دا کە هەینەتی تورکیا لە لەندەن ڕا بە سوریادا ئەگەڕانەوە چەند ڕۆژێک ڕەسمەن دەگەڵ کاربەدەستانی ئەم وڵاتە گفتوگۆیان کرد.

حکومەتی تورکیا بە دو شەرت: یەکێک ئازادی کوردانی سوریا ئەوەندەی مومکین بێ بەربەست بکرێت. ئەوی دیکە سوریا ئیتر داوای وەرگرتنەوەی ناوچەکانی ئەسکەندەرونە و ئەنتاکیە کە لە سەرەتای جەنگ دا حکومەتانی ئینگلیس و فەرەنسە بە بەرتیل دابویان بە تورکیا، نەکاتەوە.

ئەگەر خوێنەرەکانمان بە چاکی ورد بینەوە دەزانن کاربەدەستانی تورکیا مودەتێکە هەستیان بە ناڵەباری وەزعی ئێستای خۆیان کردوە بۆیە جارێک لە یەکێتی عەرەبەکان... و جارێکیش هەوای تازە کردنەوەی پەیمانی فشەگاڵتەی سەعدئابادیان دەکەوێتە مێشک.. وە بەمجۆرە بۆ خنکاندنی ڕوحی ئازادی لە ناو کوردەکان دا تێ دەکۆشن و خەریکن لەم پەیمانە شوم و نەگبەتەی خۆیان دا چەند حکومەتی دیکەش بکەنە بەشدار.

ڕەنگە بە شوێن ئەو گفتوگۆیەدا کە ئێستا لە نێوان تورکیاو عێراق دا هەیە تورکیا لە ئێرانیش بگێڕێتەوە بەڵام حکومەتی ئێران دەبێ بزانێ هاوکاری و یەکڕەنگی دەگەڵ هەر ئەنجومەنێک کە بۆ بێدەنگ کردنی کوردەکان تەشکیل دەدرێ بۆ ئێران زیانی زۆرترە لە قازانج..."(5)

تورکیاو عێراق لە 29 ی 3 ی 46 دا پەیمانی "دۆستایەتی و دراوسێیەتی باش" یان ئیمزا کرد.

## 3. کورد و ئازەر

### 3. 1. پاشماوەی ناکۆکییەکانی ڕابردوو

عەلی خوسرەوی، یەکێ لە نوسەرەکانی ئەوکاتە، لە ژێر ناونیشانی "کورد و ئازەربایجان" دا لە ڕۆژنامەی کوردستان دا نوسیویتی:

"تا چەند ساڵ لەوەوپێش کە ویستا شەپوری ئازادی لێ نەدرا بو هێزی ئەهریمەنی فاشیستی ئەدونیادا موسەللەت بون کورد و ئازەربایجانی لە گەڵ یەک زۆر ناکۆک بون. دەستی ئیستیعمار بۆ ئیستیفادەی خۆی شەووڕۆژ خەریکی ئیختیلاف لە نێو ئەو دو نەتەوە... دا بون تا بە بۆنەی ئەوە بتوانێ لە مەنفەعەتی مادی ئەو نەتەوانە بەهرەوەر بێ و لە مەنافیعی وان کۆشک و باڵەخانەی چەند نهۆمیان ساز دەکرد و لە تێک بەربانی ئەوان بۆ خۆیان لە کۆشکەکانی تارانی دادەنیشتن و قاقا بە ڕیشی میللەتی مەزڵوم کە هەڵ فریوا بون پێ دەکەنین.

وەلێ بە یارمەتی خودای بێ هاواڵ ڕۆژی ڕەشمان ڕوناک بو. زنجیری ئەسارەت لە دنیادا پساو ئاخرین ئەفەر لە دەستپەروەرەدەکانی هیتلەر یەک لە دوای یەک بە جەهەننەم موشەڕەف بون.

چاومان هەڵێنا دیمان کە دەستوپێوەندی گۆبلزی لەعنەتی تا ویستا لە دوبەرەکی ئێمە ئیستیفادەیان کردوە و بۆ مەنزور و مەرامی خۆیان کورد و ئازەربایجانیان پێک وەر کردوە.

بەڵێ وەخەبەر هاتین دیمان کە نەتەوەی ئازەربایجانی بۆ شەجاعەت و سەخاوەت و ئینسانییەت لە دنیادا مەشهورن و لە ڕێی ئازادی و دیمۆکراسی دا کوژراویان زۆر داوە و ئەوانیش هەر وەکو ئێمە بەش خوراون.

بەڵێ بیلئەخەرە بە هیمەتی برایانی بەرزی کوردی و ئازەربایجانی ئیتیحادی مەحکەم لە بەینمان دا بەسترا و دەستی ئیتیحادمان دا دەستی یەک و سوێندمان خوارد تا ئەفەرێک لە ماوەی فاشیستەکان بمێنێ دادانیشین و دەبێ لە بەینی بەرین. دوژمنانی مە دەبێ بزانن ئەگەر قەدەمێک لە نیشتمانی ئێمە بێنە پێش بە زۆری داسکی کوڕانی ئازادیخواهی کوردی و ئازەربایجانی مەحو دەبنەوە. ئومێدەوارم کە ئەو ئیتیحاد و برایەتی لە بەینی ئەو دو نەتەوە بەشخوراوە ڕۆژبەڕۆژ بە کوێرایی چاوی دوژمنانی دیمۆکراسی مەحکەمتر و بە دەوامتر بێ.

بەرقەرار و پایەدار بێ برایەتی کورد و ئازەربایجانی."(6)

ناکۆکییەکانی کورد و ئازەر لەوە قوڵتر بون، وا بە سادەیی باس و، وا بە ئاسانی چارەسەر بکرێن. دوایيتر ڕوداوەکان دەریان خست کە چەندین کۆبونەوەی هاوبەش و داوبڕی ڕوسەکانیش کەڵکی نەبو. جگە لەو ناکۆکییانەی کە لە ماوەی چەند قەڕنی ڕابردودا بە میرات مابونەوە و کەڵەکە بو بون چەند ناکۆکی نوێ قوت بوبونەوە.

ناکۆکی نێوان هەر دولا چەند لایەنێکی هەبو: سروشتی هەر دو حکومەت و حیزب جیاواز بو لە یەکتری حکومەتی ئازەربایجان و فیرقەی دیمۆکرات ڕەنگی کۆمۆنیستی هەبو، حکومەتی کوردستان و حیزبی دیمۆکرات ڕەنگی دیمۆکراتی و نەتەوەیی. ئازەرییەکان ئەیان ویست کوردستان بەشێ بێ لەوان، حکومەتی کوردستانیش ئەی ویست ئەویش وەکو ئەوان خودموختار بێ و ڕاستەوخۆ سەر بە حکومەتی ناوەندی بێ. لەمانەش هەموی گرنگتر ناکۆکی ئەرزیی بو لە سەر سنوری دەسەڵاتی هەر دو حکومەت. کورد شار و ناوچەکانی دەوری گۆمی ورمێ: میاندواو، ورمێ، سەڵماس، خوی، ماکۆی، بە بەشێکی سەرزەمینی کوردستان دادەنا، بەڵام ئازەرییەکان بە پارچەیەکی ئەرزی ئازەربایجانیان لەقەڵەم ئەدا و ئامادە نەبون بخرێتە سەر حکومەتی مەهاباد.

ئازەرییەکان بەهانەیان ئەوە بو زۆرایەتی دانیشتوانی ئەم شارانە ئازەرین. کوردەکانیش بەهانەیان ئەوە بو کە دانیشتوانی دەوروپشتی ئەم شارانە کوردن. ناوچەکەش بە درێژایی مێژو هی کورد بوە ئەگەرچی لەروی ئیدارییەوە سەر بە ولایەتی ئازەربایجان بون. ئەم ناکۆکییە لە چەند شوێنێ دەوری میاندواو و ورمێ بو بە هۆی پێکادان و پێشمەرگەکانی کورد فیداییەکانی ئازەریان دەرنەکرد.(7)

بۆ بە لادا خستنی ئەم شەڕ و کێشانە چەند جارێ لە حکومەتی مەهابادەوە نوێنەر چونە ئەوێ. هەروەها نوێنەری سۆڤیێتی دەخالەت و ناوبژییان ئەکرد. لە بەهاری 1325 دا لە کۆنسوڵگای یەکێتی سۆڤیەت لە ورمێ نوێنەرانی هەر دو حکومەتی کوردستان و ئازەربایجان بۆ گفتوگۆ بە تایبەتی بەلاداخستنی چارەنوسی ورمێ دانیشتن. کۆبونەوەکان بە ئەنجام نەگەیشتن چونکە هەر دو لایان لە سەر هەڵوێستی خۆیان سور بون.(8) پێشەواش بۆ هەمان مەبەست جارێک چوە ورمێ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ نوێنەرانی تەورێز بێ ئەوەی ئەنجامێکی هەبێ. هەندێ لە زەویدارە گەورە ئازەرییەکانی ورمێ ئەیان ویست بخرێنە سەر کوردستان، چونکە لە ئازەربایجان زەویوزاری مالیکەکان دابەش کرابو بەڵام لە کوردستان دەستی لێ نەدرا بو.(9)

### 3. 2. پەیمانی یەکێتی و برایەتی

سەرەڕای ئەم ناکۆکیانە مەترسی کشانەوەی سپای روسی و هاتنەوەی ئەرتەشی ئێران هەر دو حکومەتی ناچار کرد لە 3 ی بانەمەڕی 1325 (2 ی ئاپرلی 1946) دا "پەیمانی یەکێتی و برایەتی" ببەستن. لە بەر گرنگی ئەم پەیمانە وا لە خوارێ وەکو خۆی لە "کوردستان" رائەگوێزین:

"مەتنی پەیمانی یەکەتی و برایەتی

حکومەتی میللی کوردستان و ئازەربایجان

چونکو میللەتی ئازەربایجان و کوردستان هەمو کاتێک لە قازانج و زیان دا پێکەوە شەریک بون و لە عەینی حاڵیش دا تا وێستا بەدەست ئیستیعمار و ئیستیلاجویانەوە بۆ ئەو دو میللەتە بە یەک ئەندازە فشار و لەتمە وارید کراوە.

میللەتی ئازەربایجان بۆ رزگاری تەواوی دانیشتوانی ئێران لە ژێر ئیستیبداد و دیکتاتۆری هەوڵی داوە. هەروەها میللەتی کوردیش لە رێگای ئازادی دا فیداکارییەکی زۆری کردوە و قوربانییەکی بێ ئەژماریشی داوە. بەڵام فیتنە و دەسیسەی دەڵاڵەکانی سیاسی و ئیستیعمار بۆتە سەبەب و بەرهەڵستی نەگەیشتنی ئەم دو میللەتە بە ئاواتی خۆیان.

هەتاکو ئەو شەڕی ئاخری دنیایە دەست پێ کرا و بە هێزی بە قوەتی دەوڵەتی عەلەمداری ئازادی دەسگای فاشیستی کە ئالەتی دەوڵەتی ئیستیعمارچییان بو تێکوپێک چو و بۆ ئەو دو میللەتە ئازادیخواهانەش هەل هەڵ کەوت لە نێو خۆیان دا بۆ لە بەین بردن و مەحو کردنەوەی فاشیستی و دیکتاتۆری قەدی پیاوەتییان بەرزکردەوە و شان بەشانی یەک بەربەرەکانییان دەست پێ کرد و ئاڵای بە راستی دیمۆکراسی و ئازادییان بڵند کرد و لە بەر ئەوەی ئەو دو میللەتە برایانە نەک هەر بۆ جێکردنەوەی ئازادی خۆیان بەڵکو بۆ دامەزراندنی ئازادی لە سەرتاسەری ئێران بۆ هەمو وەختێکی دەستیان داوەتە دەستی یەکدی.

جا لەبەر ئەوە لە رۆژی سێ شەممو 3 ی بانەمەڕی 1325 ساتی 5 ی ئێوارێ لە شاری تەورێز لە عەمارەتی میللی ئازەربایجان بە حزوری سەرانی حکومەتی میللی کوردستان:

رەئیسی حکومەتی میللی کوردستان جەنابی ئاغای قازی محەمەد. ئاغای سەید عەبدوڵای گەیلانی عزوی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان. ئاغای عومەر خانی شەریفی عزوی کۆمیتەی مەرکەزی

حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و ڕەئیسی عێلی شکاک. ئاغای محەمەد حسێنی سەیفی قازی وەزیری هێزی حکومەتی میللی کوردستان. ئاغای ڕەشید بەگی جیهانگیری عزوی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و ڕەئیسی عێلی هەرکی. ئاغای زێرۆبەگی بەهادوری عزوی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، نوێنەری کوردی شنۆ ئاغای قازی محەمەد خزری.

وە بە حزوری سەرانی حکومەتی میللی ئازەربایجان:

ڕەئیسی مەجلیسی میللی ئازەربایجان جەنابی ئاغای حاجی میرزا عەلی شەبوستەری، سەرۆک وەزیری حکومەتی میللی ئازەربایجان جەنابی ئاغای سەید جەعفەر پیشەوەری، معاونی سەدری فیرقەی مەرکەزی حیزبی دیمۆکراتی ئازەربایجان ئاغای پادگان، وەزیری داخلەی ئازەربایجان دکتۆر سەلامولای جاوید، وەزیری فەرهەنگی ئازەربایجان ئاغای محەمەد بیریا.

بۆ قایم و مەحکەم کردنی دۆستایەتی کە لە بەینی ئازەربایجان و میللەتی کوردستان دا بوە بۆ پایەداری سەمیمیەت و دۆستایەتی زیاتر لە بەینی ئەو دو میللەتەدا ئەو قەرارانەی خوارەوەیان قبوڵ کرد هەردوکیان لەوەدوا لە گەڵ ژیانی خۆیان تەتبیقی دەکەن:

1. لەو جێگایانەی پێویست بزانرێ هەردوک حکومەتی میللی نوێنەر دەگۆڕنەوە.
2. لە ئازەربایجان دا ئەو جێگایانەی کە دانیشتوانی کورد بن کاری ئیداراتی دەوڵەتی بە کوردان دەبێ هەروەها لە کوردستانیش لەو جێگایانەی کە بەشی زۆری دانیشتوانی ئازەربایجانی بن لە تەرەف مەئمورانی حکومەتی میللی ئازەربایجانەوە ئیدارە دەکرێ.
3. بۆ حەل بونی مەوزوعی ئیقتیسادی لە بەینی هەردوک میللەتان کۆمسیۆنێکی تێکەڵاو دادەمەزرێ و قەراری ئەو کۆمیسیۆنە بە کۆششتی سەرانی ئەو دو حکومەتە ئیجرا دەکرێ.
4. لە کاتی پێویست دا لە بەینی حکومەتی میللی ئازەربایجان و کوردستان هاوکاری پێشمەرگەیی دەکرێ و دەبێ ئەوەی لازم بێ بۆ کۆمەگی یەکتری ئەنجام بدرێ.
5. هەر کاتێک پێویست بێ لە گەڵ حکومەتی تاران قسە بکرێ دەبێ موافیقی نەزەری حکومەتی میللی ئازەربایجان و کوردستان بێت.
6. حکومەتی میللی ئازەربایجان بۆ ئەو کوردانەی کە لە خاکی ئازەربایجان دا دەژین تا ئەو ئەندازەی کە بتوانێ بۆ پێشکەوتنی زمان و تەرەقی پێدانی فەرهەنگی میللی وان هەوڵ دەدا.
   هەروەها حکومەتی میللی کوردیش بۆ ئەو ئازەربایجانیيانەی کە لە خاکی کوردستان دا دەژین بۆ پێشکەوتنی زمان و تەرەقی پێدانی فەرهەنگی میللی وان ئەو ئەندازەی کە بتوانێ هەوڵ بدا.
7. هەر کەس بۆ تێکدانی دۆستایەتی تاریخی نەتەوەی ئازەربایجان و کورد و لە بەین بردنی برایەتی وە دیمۆکراتی میللی وە یا لەکەدار کردنی یەکەتی وان هەوڵ بدا هەردولا بە یەکدەست ئەو مورتەکیبانە بە جەزای خۆیان دەگەیەنێ.(10)

سەرکردەکانی کورد و نوسەرەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان بە گرنگیەکی زۆرەوە پێشوازیيان لە ڕێکەوتنی کورد و ئازەر کرد. لەم بارەیەوە سەید محەمەدی حەمیدی، حەسەن قزڵجی، هەژار، هێمن... چەندین وتاری سیاسی و لێکدانەوە و تەنانەت شیعریشیان پیا هەڵ دا.

ڕاستیيەکەشی ئەوە بو. ئەگەرچی ئەم ڕێکەوتنە هەندێ لە ناکۆکیە بنەڕەتیيەکانی بە چارەسەر نەکراوی بەجێ هێشت. بەڵام بەسەر کەوتنێکی گەورە دائەنرا بۆهەر دو نەتەوەی کورد و ئازەری چونکە دوای چەندین ساڵ ناکۆکی و ناتەبایی نوێنەرەکانیان پەیمانیان بە یەکتری دا لە مەیدانی سیاسی و سپایی دا چارەنوسێکی هاوبەش بۆ خۆیان دیاری بکەن.

حکومەتی تاران و، ناحەزەکانی حکومەتەکانی ئازەربایجـان و کوردسـتان، لـەم رێککەوتنـە زۆر تـورە بون. پێیان وابو ئەوانـە وەکـو دو حکومـەتی جیـاواز رەفتاریـان کـردوە و بـۆ دابەشـکردنی ئێـران هـەوڵ ئەدەن.(11)

## 3. 3. گفتوگۆی هاوبەش

### 3. 3. 1. خولی یەکەمی گفتوگۆ لەتاران

بە دوای ئیمزا کردنی "پەیمانی یەکێتی کوردستان و ئازەربایجان" دا دەستەیەکی تێکەڵاو لە نوێنەرانی هەر دو حکومەتی ئازەربایجان و کوردستان بە سەرۆکایەتی جەعفەر پیشەوەری چون بۆ تاران. نوێنـەرەکانی کورد لەم هەیئەتەدا وەکو قـازی محەمـەد لـە نـوتقی رۆژی 12 ی 2 ی 25 دا بـە هـۆی رادیـۆ رای گەیانـد: محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی و ئەبولقاسم سەدری قازی بون.(12) یەکەمیان وەزیری هێـزی دیمـۆکراتی کوردستان و، دوەمیان نوێنەری مەهاباد لە خولی 14 هەمی مەجلیسی شورای میللی ئێران دا.

رۆژی 26 ی 2 ی 1325 سەیفی قازی نوێنەری حکومەتی کوردستان لە تاران گەڕایەوە.(13)

وەکـو رۆژنامــەی کوردســتان نوسـیویتی، سـەیفی قـازی لـە میتینگـی رۆژی 31 ی 2 ی 1325دا گوزارشی ژێروی دەربارەی گفتوگۆکانی خۆیان لە تاران بە ئیتیلاعی عوموم گەیاند:

"هاونیشتمان برایانی خۆشەویست!

ئەمن بە ئەمری پێشـەوای موعـەزەم و بـە دڵگـەرمی و پشـتیوانی برایـانی خۆشەویسـت مـەئمور بـە ئیفتیخاری نوماینەدگی بۆ حکومەتی تاران بوم. بە پێویست دەزانم کە شەرحی مەئمورییەتی خـۆم ئیجمالـەن بە عەرز بگەیەنم.

رۆژی یەکشەممو 8 ی بانەمەڕ سەعاتی 9 و 20 دەقیقە لە ئیستگای تەوریزەوە دەگـەڵ نوماینـدەگانی ئازەربایجان کە عیبارەت بو لە: ئاغای پیشەوەری سەرۆکی حکومەتی میللی ئازەربایجان و رەئیسـی هەیئـەتی نوماینەدگی و، ئاغای سادق پادگان و، ئاغای دکتۆر جیهان شاهلو و، ئاغـای ئیبراهیمـی و، ئاغـای دیلمقـانی و 14 نەفەر فیدایی بە ریاسەتی 1 نەفـەر کاپیتـان حەرەکـەتمان کـرد و لـە سـاتی 11 و 20 دەقیقـە واریـدی ئیستگای میهراباد بوین لە لایەن ئازادیخواهان و ئەهالی ئازەربایجان ساکنی تاران - دا ئینکە کە سـەعاتێک پێش وارید بونی مە بە وەسیلەی مەئمورینی دەستگای دیکتاتۆری عیبـارەت بـو لـە ئـەفرادی ژانـدارمری بـێ شەرمانە مومانەعەتێکی موسەلەحانەی بـۆ پێشـوازی نـەکردن لـە ئێمـە بـە عەمـەل هـات بـو و دو نەفـەر لـەو ئازادیخواهانە کوژرا بون چەند نەفەریشیان بریندار کرابون - دیسان جەمعیەتێکی یەکجار زۆر کە خۆیان لە چنگی موستەحفیزینی ژاندرم خەلاس کرد بو بە دەسکەگوڵەوە خۆیان گەیاند بوە مەیدانی تەیارەی. شـور و شەعەف و ئیحساساتێکی وایان بە خـەرج دا کـە روحـی مـەیان وە لـەرەزە خسـت و بـە دەنگێکـی بڵینـد چەپڵەیان لێ دەدا و هاواریان دەکرد: ئەنگۆ ئەمەو ئەجات دا. ئەنگۆ خـەڵکی ئیرانـێو لـە ئەسـارەت خـەلاس کرد. ئەمما وشیار بن ئیشتیباهێ نەکەن ئازادی ئێمە بـە حـەرەکاتی راسـت و بـێ خـەتای ئێـوە پێوەنـدە. و هوراپان دەکێشا و لێکرا دەیان گوت: بژی خەڵکی ئازەربایجان. بژی مەشعەلداری ئازادی ئێمە ئازادیخواهانی کوردستان.

دە واقیع دا ئەو ئیحساساتەی وان ببوە باعیسـی سـەر بڵینـدی ئـەهالی کوردسـتان و ئازەربایجـان و ئەوەیان بە تەواوی مەعلوم دەکرد و دەیان گەیانـد کـە مەعلومـە کوردسـتان و ئازەربایجـان خۆیـان خـەلاس کردوە بەڵکو لیاقەتی ئەوەیان هەیە کە ئازادی تەواوی خەڵکی ئێران وەدەست بێنن و سـابیتی بکـەن. ئاغـای موزەفەر فەیروز معاونی سیاسی نوخست وەزیـری ئێـران و سـەرتیپ سـەفاری رەئیسـی تەشـکیلاتی کـوللی

شارەوانی لە تەرەف دەوڵەتێوە بۆ ئیستیقبال حازربون و بە شارەزایی وان بۆ قەسری جوانیە کە لە دوازدە کیلۆمەتری تارانی‌یەو لە پێش دا بۆ پەزیرایی حازر کرا بو حەرەکەتمان کرد. وەسایلی پەزیرایی مە لە تەرەف وەزارەتی نوموری خاریجەوە بە عەمەل دەهات.

لە ڕۆژی دوشەممویەوە موزاکەرە دەستی پێ کرا. نومایندانی دەوڵەتی تارانی عیبارەت بون لە ئاغایان: موستەشارودەولە محەمەد وەلی میرزا، فەرمافەرمانیان، لەنگەرانی، ئیپکچیان، و ئاغای مونەریخودەولە سپەهر وزیری پیشە و هونەر و، موزەفەر فەیروز معاونی سیاسی و پارلەمانی نوخست وەزیر..."(14)

نوێنەرانی ئازەربایجان ئەیان ویست بە حکومەتی ناوەندی بسەلمێنن:

1. کە ئەنجومەنی میللی ئازەربایجان لە باتی ئەنجومەنی ئەیالەتی بە ڕەسمی بناسێ.
2. ئەنجومەنی ئەیالەتی ئوستاندار و، سەرۆکی دائیرەکان لەوانە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی دارایی دابنێ.
3. زمانی تورکی ئازەری ببێتە زمانی ڕەسمی خوێندن و دادگا و دائیرەکانی دەوڵەت و ئەرتەش.
4. ئەو هێزەی پێکیان هێنا بـو وەکـو بەشـێکی ئەرتەشـی ئێـران وەربگیـرێن و، هـەمو ئـەو پلـەو پایـە سپایی‌یانەی دابویان بە ئەفسەرانی هێزەکەیان حکومەتی ئێران دانی پێ‌دا بنێ.

نوێنەرایەتی حکومەتی ناوەندی ئەی ئەویست هیچ کام لەم خواستانە بسەلمێنێ.

داوایان ئەکرد هێزە چەکدارەکانی ئازەربایجـان هـەڵ بوەشـێتەوە، حکومـەتی ناوەنـدی ئوسـتاندار و، سـەرۆکەکانی دەزگاکـانی دەوڵـەت دابنـێ و، زمـانی ڕەسـمی هـەروەکو جـاران فارسـی بـێ و، ئەنجومـەنی ئەیالەتی‌یش هەڵ بگیرێ بۆ دوای هەڵبژاردنی خولی 15 هەمی مەجلیسی شـورای میللـی و دانـانی قـانونێکی تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە.

مەسەلەی مانەوە یا هەڵوەشانەوەی هێزە چەکدارەکانی ئازەربایجان بو بـوە گرێکـوێرەی گفتوگۆکـان. حکومەتی قەوام و سەرۆکی ستاد و، شەخسی محەمەد ڕەزاشا بە هیچ جۆرێ ئامـادە نـەبون مـانی ئـەم هێـزە بسـەلمێنن. نوێنـەرانی ئازەربایجـانیش ئامـادە نـەبون هـەڵی بوەشـێننەوە. نوێنەرایـەتی ئازەربایجـان بـۆ گونجاندنی هێزەکەیان لە گەڵ ئەرتەشی ئێران پرۆژەیـەکی 14 مادەیـان دا بـە حکومـەت. حکومـەتی قـەوام موافەقەتی لە سەر نەکرد. بەڵام لە باتی هەمو پـرۆژە و خواسـتەکانی نوێنـەرانی ئازەربایجـان پرۆژەیـەکی 7 مادەییان بەمجۆرەی لای ژێرو دا بە دەستەی گفتوگۆکەر.

1. سەرۆکەکانی کشـتوکاڵ، بازرگـانی، پیشـەو هونـەر(کار)، گوێزانـەوە، فەرهـەنگ، تەندروسـتی، دادگـا، چاودێریکـەرانی دارایـی ناوچـەیی، لـە ڕێی ئەنجومـەنی ئەیالەتی‌یـەوە هەڵئـەبژێردرێن و، بڕیـاری دامەزراندنی ڕەسمی‌یان لە لایەن حکومەتەوە لە تاران دەرئەچێ.
2. ئوستاندار لە لایەن حکومەتی ناوەندی‌یەوە بە لەبـەرچاوگرتنی ڕەئـی ئەنجومـەنی ولایـەت دائـەنرێت. فەرماندەکانی ئەرتەشی و ژاندارمری لە لایەن حکومەتی ناوەندی‌یەوە دائەنرێن.
3. زمانی ڕەسمی ئازەربایجان وەکو هـەمو شـوێنەکانی تـری مەملەکـەت فارسـی ئـەبێ. هـەمو ئـەحکامی ڕەسمی و بەڕێوەبەرایەتی و دادگایی بە زمانی فارسی و ئازەربایجـانی (تـورکی) ئـەبێ. خوێنـدن تـا پۆلی پێنجەم بە زمانی ئازەربایجانی ئەبێ.
4. لە کاتی دانانی بودجە و دەرامەتی ماڵیات دا، حکومەت پێویسـتی‌یەکانی ئازەربایجـان بـۆ چـاکردن و ئاواکردنەوەی شارەکان و، باشکردنی کاری فەرهەنگی و تەندروسـتی و شـتی تـری ئازەربایجـان لـە بەرچاو ئەگرێ.
5. چالاکی ڕێکخراوە دیمۆکراتی‌یەکانی ئازەربایجان و یەکێتی‌یەکان و هـی تـر وەکـو شـوێنەکانی تـری مەملەکەت ئازاد ئەبێ.

6. بەرامبەر ئەهالی و بەشدارانی فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان و یەکێتی کرێکاران هیچ کارێ ناکرێ.
7. ژمارەی نوێنەرانی ئازەربایجان بە گوێرەی ژمارەی راستەقینەی دانیشتوانی ئەو ئەیالەتە زیـاد بکـرێ، بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتای کردنەوەی خولی 15 هـەمی مـەجلیس تا پێشـنیاری پێویسـت لـەم رووەوە ئەخرێتە بەردەمی مەجلیس و پاش پەسند کردنی بۆ پڕکردنەوەی ژمارە کەمەکەی ئەم خولە هـەڵبژاردن ئەکرێ. (15)

سەیفی قازی لە درێژەی گوزارشەکەی دا ئەڵێ:

"پـاش گفتوگۆیـەکی زۆر لـە ئـەتراف ئـەحزەتی دیمۆکراسـی کوردسـتان و ئازەربایجـان داوخـواز و ئەقازای 5 ملیۆن کورد و ئازەربایجانی، کە بە خوێنی هەزاران لاو و پیر و جەوانی میللەتی قارەمانی کـورد و ئازەربایجانی، کە ساڵەهای ساڵ لەو رێیەدا لە ملـە و موبـارەزادا بـون و بـە دەسـتیان هێنـاوەو دە موقـابیلی ئیبلاغییەی پوچ و بێ مەعنای حەوتگانەی دەوڵەتی تاران، لە بەر ئەوەی کە دونیا بزانێ کـە میللـەتی قارەمـانی کورد و ئازەربایجان حازر بە خوێنڕشتن و براکوژی نین و، بۆ لە دەم دانـی ئیرتیجـاع و خـوێمنژە زاڵـم و گەورەکانی دنیایە کە دەو رێیەدا هەزاران ئیفتیرا و بوختانیان بۆ ساز کرد بوین، بە 33 مادان بـە دەوڵـەتی تاران پێشنیهاد کرا کە ئەوە بۆ ئاگاداری ئێوە عەرز دەکرێن.

پاش گفتوگۆ کێشە کێشێکی زۆر و چەند رۆژ موزاکەرە بە ئیسـتیناد‌ی درۆ و قسـەی پـوچی قـانونی ئەساسی و بەو ئەوعەی کە ئەمن لە نیزیکەوە دیومەو لێم مەعلوم بوە قانونی ئەساسـی بـە تـەعبیری دەوڵـەتی تاران، عیبارەتە لە پاماڵ کردنی حقوقی میللەت و دەست و پـێ بەسـتنی وان وە بـەرەڵا کـردن وتـێ بـەردانی عیدەیەکی مەحدود، بە عینوانی جوێ جوێ، مەئمورینی لەشکری و کیشوەری و ژاندارم کـە لـە پامـاڵ کردنـی حەق و عەدالەت، کە مەزامینی قانونی ئەساسی حەقیقی، بە تـەواوی نەتـەوانی ئێرانـی قایـل بـوە و، دانـدراوە درێغیان نەکردوە. هەروەکو بۆ خۆتان دیوتانە لە تەعەروز بە گیان و ماڵ و حەیسـیەت و ناموسـی نەتـەوانی ئێرانی مەخسوسەن میللەتی کوردی... دەکەمالی بێ شەرمی و بێ حەیایی دا لە موددەتی 20 ساڵەی دیکتاتۆری رەزاخان دا موزایەقەیان نەکردوە. ئەوان ئێرانێ فەقەت بە تاران دەزانن و، بە غەیری ئیسـتیفادەی شەخسـی و خۆشگوزەرانی و راگرتنی مەقام و جاوجەلالی خۆیان هیچ فیکری دیکەیان نیە. تارانیش چە تاران مەرکـەز و بناغەی فەساد، لائوبالی و بێ عەلاقەیی و بێ خەبـەری و دە حەقیقـەت دا مەرکـەزێکی زۆر زۆر کەسـیف و قەسرو قسوری زۆر عالی و موجەلەل کە بە خوێن و زەحمەت و رەنـج و نـارەقی نێوچـاوانی هـەزاران هـەزار بەدبەخت و بێچارەی نەتەوانی زەحمەتکێشی ئێرانی بناغـەی دانـدراوەو رازاندراوەتـەوە، بـە هـیچ نـەوعێکی شوعلەی روناکایی و ئومێدی رزگاری دەو عەسری تەمەدون و ئەتۆم دا بۆ میللەت و نەتەوانی ئێرانـی وە بـەر چاو نایەو، هەتاکو ئەو سەفەرە وە دیتنی ئەو دەزگایە، مەعنای کەلیمەی حکومەتانی پوشـالیم نـەدەزانی. بـەڵام لەو موسافەرەتەی تارانێ دا کە بەچاوی خۆم دەستگای هەڵسوڕی خوێنمژ و پوچەڵی حکومەتی تارانم دی لـێم حالی بو کە حکومەتی پوشالی ئەوەیە کە ئەلعان لە تاران بەرقـەرارە. ئـەمما ئەوەنـدە هەیـە ئەورۆکـە ئـەوەی جەنبەی مەیدانی سیاسەتی بەینەلمیلەلی پەیدا کردوەو دەستگای ئیرتیجاعی دونیایە بە وەسـیلەی کاسەلێسـانی خۆیان، بۆ مەنفەعەت بردنی و قازانجی دائیمەن خەریکی دەسیسەو ئانتریک و هەو و جەنجاڵن. ئەمە دوبـارە لەبەر ئەوەی کە دونیا بزانێ غەیری حەقی حسابی خۆمان و خوێندن و نوسین بە زمانی دایکی و پەرەپێدانی فەرهەنگ و لەشساغی و هاتنە دەر لە غار و ئەشکەوتی بەدبـەختی و خۆگەیانـدن بـە عەسـری تەمـەدون هـیچ مەنزور و دەسایسێکی خاریجی نیە بۆ گوزەشـتێکی زۆر لـەو حەقـەی کـە وە دەسـتمان هێنـاوە حـازربوین، هەرچەند بە سورەتی زاهیر شەخسی ئاغای قەوام سـەڵتەنە موسـاعید و تـا دەرەجەیـەکی حـازر بـوە کـە دە موزاکەراتی دوائی دا کە دەست پێ کرابا موافەقەت، پێشنیهادی خۆیان دە تەحتی 14 مـادەدا تـا ئەندازەیـەک

موافەقەت حاسل بو. بەڵام چەند نەفەر لە وەزیـران کـەوا مـەعلوم نەشـەیان گـولی کـرد بـو بـە ئیسـتیناد بـە فەرمایشی ئاغای پیشەوەری لە ئەوپەڕی قانونی مەنعی تریاک لە ئازەربایجانێ دا عەسەبانی ببون. ئەیانهێشت کە دەولەتی ئاغای قەوام سەڵتەنە لەو مەوقیعە ئیستیفادە بکا و، ئەو مەسئەلە بە خۆشی تەواو بێ.

لەبەرئەوە ناچار بوین بە بێ ئەخزی ئەتیجەی ڕۆژی دوشـەممو 23 ی بانەمـەڕ هەیئـەتی نوماینـدەگی کوردستان و ئازەربایجان سەعاتی 7 و 5 دەقیقە لە تاران گەڕاینەوە و لە پاش گەڕانەوەی مە دەولـەتی قـەوام سەڵتەنە ئیعلامیەیەکی لە تاریخی 23 ی 2 ی 25 دا ئینتیشار دا. ئەوا عەرز دەکرێ. هەروەکو لـە تـەوریز لـە تەرەف هەیئەتی نوماینەدگیەوە بە وەسیلەی ئاغای پیشـەوەری رەئیسـی هەیئـەت جـوابی دراوەتـەوە ئـەمن نامەوێ دەو مەوزوعەی چی دی بدوێم.

برایانی خۆشەویست! حوسنی تەدبیر و، ئیرادەی پێشەوای بەرز یەکەتی و برایـەتی کوردسـتان و ئازەربایجـان و، غیـرەت و شـەهامەت و جانبـازی پێشـمەرگانی کوردسـتان و فیـدائیيانی ئازەربایجـان، دەستگای زوڵم و ئیرتیجاعی موتەزەلزیل کرد و لێیان مـەعلوم بـوە کـە ئـەو ئەهزەتـە کـە بـە پشـتیوانی تەواوی تەبەقاتی میللەتی قارەمان و ڕەشیدی کورد و ئازەربایجان بە وجود هاتوە شۆخی پێ ناکرێ و، بە فشە و گاڵتە ناژمێردرێ و ئەو دو میللەتە برا و ڕەشیدە دە مەیدانی موبارەزە دا خۆیان پـێ ناسـاندون و ئەو حەقەی کە ئەستاندویانە رای دەگرن و، لـە لیاقـەتی ئیـدارەکانی خۆیـان بـە دونیـای ئـەورو سـابیت کرد."(16)

هەر بە هـەمان بۆنـەوە "ڕۆژی 31 ی 2 ی 1325 لـە میتینگـی ئـەو ڕۆژە دا کـە تـەواوی سـەران و سەرکردان و ژەنەراڵان و مەزنانی کوردستان و چەند هەزار کەس پیاو و ژن و فلەخوی و جوتیـار حزوریـان بو" قازی محەمەد "ئەم نوتقەی ژێروی خیتاب بە حازران ئیراد فەرمو:

"برا خۆشەویستەکان!

مەعلوم تەسدیقی دە فەرمون کە دەگەڵ ئەو هەمو ئیختیلاف و دوبەرەکیە کە دە نێـو کـوردانـدا هـەبو کە نێوان ناخۆشی وای لێ هات بو تەنسیری دەخانەوادانیش کردبو نێوانی برایانیش تێک چو بـو و حـەتتا باب و کوڕیش پێکەوە یەک نەبون پێشرەفتی کار و دانانی تەشکیلات چەند موشـکیل بـو وەلـێ چونکـو لـە مەردان کار عاسی نابێ و میر بە سەر هەمو چەوت و چەڵەمەیەک دا فایەق دەبـێ بـە هـۆی ڕەنـج و زەحمـەت حەوڵ دانی چەند کەسی ساحیب ئیمان و ڕاست تەشکیلاتیش سازکرا و نەزم و تەرتیبیش دە نێـو مەملەکـەت دا بەرقەرار کرا و دەموەتێکی کەم دا ئیختیلافات و ناتەبایيش دوایـی پـێ درا تـو خوداکـەی چـە شـاهید و دەلیلێک لەوەی گەورەترە هەر ئەوەندە کە خەبەری خەتەرێک لە جەبهەی سـەقزی و سەردەشـتی و تـەجاوەزی دوژمن بە خاکی کوردستانی ئازاد بە کوردان خۆیان گەیشت هـەمو پێکـەوە و لـە دورتـرین نوقـات کـوردان خۆیان گەیاندە حدودی و هەرگاە لە تەرەف حکومەتی میللی کوردستانەوە ئیجازەیـان بـا وەک شـێری ژیـان دەیەک ساعەت دا تەواوی دوژمنیان ونجڕ ونجڕ دەکرد و تا شاری کرماشانی وەک هەژدیهای دەمـان هـەرچی هاتبا پێشیان هەڵیان دەلوشی.

وە ئەگەر ئەو دوبەرەکیەی جاران مابا چلۆن لەبەر یەکتری دەیان وێـرا ماڵـە خۆیـان بـەجێ بـێڵن و بیست مەنزڵ لە ماڵە خۆیان دور کەونەوە دەوجا دوژمنان تا کەنگێ دەبێ چاوی خۆیان بقوچێنن و تا کەنگێ لەسەر نەفامی برۆن و نەزانێ کە تا ئێستا کورد هەر زیللەت و بەدبەختیەکی بە سـەریان دا هـات بـێ لەبـەر ناڕێکی و ناتەبایی بوە دەنا ئەگەر کورد ڕێک کەوێ و تەبا بێ کێ پێی دەوێرێ پێم وایە دوژمنانی خـارجی دەوەی گەیشتون بۆیە وا وە جولەجول کەوتون و ملیان لە دورەوە دەرێناوە بەڵا دەزگـای دیکتـاتۆری تـارانی هێندەیان خوێن خواردوە کە بێهۆشیەکی وا دای گرتون ئەمانیش نازانن دنیا چە باسە. هێندێکیشـیان بـە

ئەشئەی تریاک سەرخۆشن و عیددەیەکیش مەستی عارەق و شەراب لەگەڵ دلبەرانی مەهوەش خەریکی عەیش و نۆشن و دەڵێن:

مارا بجهان خوشتر از این یکدم نیست

کز نیک و بد اندیشه‌و از کس غم نیست

بەوان چی غەیری تارانی مەرکەزی فەساد و شەرارەت و جندەبازی ئەوی دی هەموی خراپ بێ هێشتا لەبەر ئەو شتانە کە عەزرم کردن متەوەجیهی کاری کوردان بە چاکی نەبون دەنا لە پاش ئەوەی کە ئەمە ئیستیقلالی تام و تەمامی خۆشمان بەدەست هێنا بۆ وەی لە حکومەتی مەرکەزی مەعلوم بکەین و بە دنیایەش نیشان بدەین کە ئەمە ئەو کارانەمان کردوە لەبەر موخالەفەت لەگەڵ دەستگای دیکتاتۆریە نەئینکی کورد لە برایەتی فارسان حاشا بکا یا بە ئێرانیەتی خۆی ئیفتیخاری نەکا بەڵا ئەو دەردەی کە دەستگای حکومەتی تاران چە لە پێش رەزاخان دا و چە لە زەمانی رەزاخانی دا و چە لە پاش رەزاخانی داویە بە کوردان جەنگیز و مەغۆلیش لە گەڵ کەسی نەکردوە.

کێ ئەی بیست بێ کە بە چی فێڵ و نامەردیەک دە زەمانی قەجاران دا جەعفەر ئاغای شکاک لە تەوریز کوژرا. کوشتنی حەمزە ئاغای مەنگوڕ و هەزاران ئەمسالی وایان ئەبیست بێ؟ کێ بێ ئەیبیست بێ کە بە چی ناجەوانمەردی‌یەکی قشونی رەزاخانی پەهلەوی چۆن دەوەختێک دا کە ئاراراتی گەرمی شەڕی لەگەڵ تورکان بون و چە ناپیاوانە و ناجەوانمەردانە وە نێو ژن و منداڵی کوردان کەوتن (نەعوزوبیللا) چی‌یان بەسەر هێنان چی‌یان لێ کردن جەلالی چۆن هەمو بارکران و دەگەڵ هەزاران ماڵی کورد و لاوی وان هەریەکە بۆ نوقتەیەکی ئێرانی بران ئەلئانیش بەشی زۆریان کەس ئەیزانی چی لێ هات و چۆن تەلەف بون و، ئەو دەردی دایان بە گەلباغی‌یان کە بە زستانێ باریان کردن سەدها منداڵیان دە بەفری دا قربون و پیاوان دەست و پێ‌یان سەرما بردی و گەیەندرانە شارانی هەرەدوری ئێرانی و بە ئەشەدی عەزاب بەشی زۆریان تەلەف بو. هەتکی ناموسی و بێ عیفەتی‌یەکی کە دەو هەمو کارانە دا بەسەر کوردان هات شەرمێ دەکەم شەرحی بدەم و تا ئەورۆ بەشەر ئەی کردوە. کاری ئەمنییان چی لێ بڵێم سەرتاسەری ئێرانی دۆست و دوژمن شاهیدی فەجایع و جینایات و هەتکی ناموسی وانە حەتتا تەعەروزیان بە پیاوان دەکرد. شەهرەبانی و ئەزمیەیان سەد لە ئەمنیە خراپتر. عەدلیە مەرکەزی تاڵان و برۆ و روتانەوەی خەڵکی بون لە پاڵەوان پەنبانی فیراری شەهریوەر مانگی کە دەشانی وان دا هاتوە:

همه سر به سر پشت بدوشمن دهیم

از ان به که خودرا به کوشتن دهیم

هێندە هەوای تەکەبور و عەزەمەت و گەورەییان لەسەر ئێمە لێ دەدا بە دەرەجەی خوداوەندیش رازی نەبون و کەسری شانیان دەزانی دەنا ئیدیعای ئولوهیەتیان دەکرد و ئەوەی سەرتیپ هۆشمەند بە سەر بانە و هەورامان و مەریوانی هێنا دنیا بیستویە.

لەبەرئەوە چاوترساو بوین حازر بوین هەمو خۆمان بە کوشتن بدەین و ئیتاعەت و فەرمانداری ئەو دەزگایە نەکەین دەنا ئەگەر بێتو ئازادی لە ئێران دا بەرقەرار بێ چە مانعێک هەیە ئەوی لە ئێرانێ دا دەژین تێکڕا دەستی برایەتی بدەن بە یەکتری. بزانن شورەوی چل پەنجا دەوڵەت و میللەتن عەبالەت کردونیە برا، ئەمریکا چل و چەند جمهورین. سویس دوسێیەکن یەک روح و گیان پێکەوە دەژین. بۆ وەی کە ئەمە نیشان بدەین دە وادەی خۆمان دا راستگۆین با وەسفی وەی کە لەگەڵ نەتەوانی دیی ئازەربایجانی هیچ شتێکمان یەک ئەبوە چونکە ئەوانیش بونە ئازادیخواز و دیمۆکرات هەردو بوینە یەک بە یەکێتی‌یەک کە ژیان و مردنمان پێکەوەیە (جە وێنەی بادام دو مەغز و یەک پۆست) و بۆ وەی کە لە سایری نەتەوانی دیکەی

ئێرانیش مەعلوم بکەین کە برایەتیمان لەگەڵ وانیش تێک نەداوە دو نەفەر نوماینەدەمان مەعلوم کرد لە بەرەرک و ئاستانەی وان حازر بێ و بڵێ خۆتان دەگۆڕن و تەشکیلاتو دەکەنە دیمۆکراسی چون ئەنگۆ دەڵێن برایەتیو دەکەین هەرگا خۆتان نەگۆڕن و تەشکیلاتیشتان نەکەنە دیمۆکراسی دیسان ئەمە زدیەتێکمان لەگەڵ ئەنگۆ نیە و برایەتیمان برایەتی کیسەمان جودایەتی. ئەمەش ساڵهای ساڵە بۆ ئازادی هەوڵێ دەدەین پیاوی چابن چی دیکە بە تانک و تۆپ و تەیارە لێمان تێک مەدەن ئەمەش بەشەرین حەقێکمان دە بە شەریەت دا هەیە چە میللەتێک غەیری مە دە ئەسارەت دا ماوە؟ چی دیکەمان قیڵ بە چاویەوە مەنێن و لۆکەمان دەگوێی مە داخنن. ئەوانەی ئەو هەمو کارخانەی ساحیب عەزەمەتانەیان دروست کردوە و ئەو هەمو شتە عەجایب عەجابیانە وە دەر دەخەن. دەمێکی وەک تەیری بە حەوای دا دەفڕن هەر ئەوەندە چاو لێک دەی لە مەشریق دەچن بۆ مەغریب. جارێک وەک ماسی هەر ئەوەندە بڵێی یەک و دو بە بن دەریا دا ئەو سەر و ئەو سەری دنیا دەکەن. کێوانیان هەمو بە تونێلان پەرە پەرە کردو بە ڕێی ئاسندا سەدها وەتاق کە شارێکی هەڵدەگرن پیاندا لەو دیوەودیو دەکەن. ئۆتۆمۆبیلی بیینن و تانکی تەماشا کەن و سەرنج بدەنە ڕادیۆ و لە تەلگراف و تەلەفۆن خورد بینەوە کە لە هەزاران مەنزڵ ڕێوە قسە بە یەکتری دەگەیەنن و چرابەرقی چاو لێ کەن چۆن شەوی کردۆتە ڕۆژ.

خولاسە هەر لە ئەلئان ڕا تا ساڵێکی یەک یەک ئیختیراعاتی ئەو شتانە کە لە سایەی خوێندن و سنعەت بە دەست هاتوە شەرحی بدەم تەواو نابێ. بەڵێ ئەوانە ئەو عەجایبانەیان هێناوەتە سەر دنیایە ئەوانیش وەک مە بەشەرن بەڵا چونکو کاری خۆیان بە دەست خۆیانە و غەمی خۆیان بۆ خۆیان دەخۆن ئەوەی دەی خوێنن تێی دەگەن و ئەوەش پێش کەوتون لێمان گەڕێن با ئەمەش تەکانێکی بە خۆمان بدەین وە دوای خوێندن و سنعەت کەوین و فەلاحەت و کشتوکاڵی خۆمان وەک خەڵکی لێ بکەین میللەتمانی پێ دەوڵەمەند بکەین و کارخانە بێنین و ئەو هەمو کانگا و مەعدەنانەمان هەیە با وە دەری خەین و بە مەنفەعەتی وانە وڵاتی خۆمانی پێ برازێنینەوە.

ئاغای محەمەد حسێن خان نوماینەدەی مە نیشانی دا کە کورد هێندە لە براکوژی و ئیختیلافی خۆی دەپارێزێ کورد کە دە ئێرانێ دا ئەکسەریەتی هەیە بە ئەقەلیەتێکی ئازەربایجانی وەک ئەرمەنی و ئاسوری دانەران دەنگی نەکرد.

دیسان حکومەتی تارانێ هێندە لە دیتنی مەنزەرەی کە دایک بۆ کوڕی کوژراویان قورسە وە سەر دەکەن کەیف دەبەن و، بە بیستنی ڕۆڕۆی هەتیو و باب کوژراوان وە دەماغ دەکەون و، بە بە چاوکەوتنی خانوی وێران و گرگر ئایساو شاد دەبن و، بە ناڵەناڵی بریندراران وە نەشئە دێن و دە خوێن تلانەوەی دەوجەوانان خۆشحاڵیان دەکا. کە بە هەمو گوزەشتەی کوردانی ئەهمیەت نەدا. نوماینەدەی مەی بە مەئیوسی ناردەوە.

ئێستا تەکلیف چیە و میللەتی کورد چلۆنی پێ مەسڵەحەتە؟ بڵێن بزانم حەقمان نیە بڵێین نەی تاران ئەو هەمو قەسروقسورەت کە بەماڵی مە دروست کردوە بەست بێ با ئەمەش فکرێکی بۆ خانولە گڵینەکانمان کە وە غارانی دەورەی سەنگی دەچن بکەین و ئەو هەمو خیابانی ئەسفالت و کوچەی رازاوەت کافیە ئەمەش دە کوچانێک دا لەبەر تۆزی بە وشکانی و لەبەر قوڕ بە تەڕوتوشی ناتوانین پێدا بڕۆین با ئیسلاحاتێکی بکەین ئەو هەمو تەجەمولە دە هەرخانویەکی تارانیت دا وە خرکردو خەرجو قیمەتی هەمو وڵاتی کوردانە چە ئیستیفادێکت لێ کردوە کە ئی دیت دەوێ؟ سنگ و بەرۆکی خانمانو هێندە زێڕو تێ کردوە کە دو ئێرانی دیشی پێ ئاوەن دەبێ. ئیدی چیت دەوێ لە کوردی ڕوتاوە؟

دیسان دەڵێم: بڵێن سەرانی کورد. بڵێن سەرداران. بڵێن برا جوتێرەکان و زەحمەتکێشەکان. بڵێن چە بکەین و تەکلیف چیە؟

دوای ئەوەی بەیاناتی حەزرەتی پێشەوا لە کاتێکدا تەواوی حازرین پەنجەرەی دڵیان بۆ حاڵی بوون ئاواڵە کرد بو گوێیان لەو فەرمایشانە ڕاگرت بو لە نێو چەپڵەڕێزان و هوڕاکێشان و بژی کورد و کوردستان تەواو بو و تەواوی گەورە و چکۆلەی حازران یەکدەنگ و یەکئاواز هاتنە جواب لە وەڵامی حەزرەتی پێشەوای مەحبوب دا کوتیان:

ئاوری نیشتمانپەرستی و ئازادیخوازی ئێمە کوژاندنەوەی بۆ نیە ئێمە مەرامی موقەدەسی (یا مەرگ یا ئازادی) مان وە پێش گرتوە و ئازادی خۆشمان وە چەنگ هێناوە ئێستاش هاسانە ئازادی خۆمان زۆر مەردانە و پیاوانە دەپارێزین و ڕای دەگرین و ئامادەین ئازادی گشت ئەتەوەکانی دانیشتوی ئێرانی تەئمین و پایەدار کەین و ئەوان لە ژێر زۆری دیکتاتۆرانی خوێنمژ و خوێنڕێژ دەربێنین و وەک خۆمان لە ئازادی بەشداریان کەین.

بژی کورد و کوردستان

بژی ئازادی و دیمۆکراسی بەڕاستی."(17)

## 3. 3. 2. خولی دووەمی گفتوگۆ لە تەورێز

بەیانی ڕۆژی 21 ی 3 ی 25 هەیئەتێکی حکومەتی ناوەندی لە تارانەوە بە سەرۆکایەتی موزەفەر فەیروز بۆ گفتوگۆ گەیشتە تەورێز. ئەندامانی هەیئەت بریتی بون لە: سەرتیپ محەمەد عەلەوی موقەدەم، موسا زادە، موهەندیس خوسرەو هیدایەت و، چەند کەسێکی تر. لەلایەن ئوستانداری تەورێز سەلامولا جاوید بەگەرمی پێشوازی لێ کرا.

پرۆژە 7 مادەییەکەی حکومەتی ناوەندی بنچینەی گفتوگۆکان بون. هەندێ ئاڵوگۆڕیان تێ دا کرد. پاش گفتوگۆ هەردولا گەیشتنە ئەم ڕێکەوتنەی لای خوارو:

"لە ئەنجامی گفتوگۆی حکومەت و نوێنەرانی ئازەربایجان بە لەبەرچاو گرتنی مەوادی حەوتگانەی ڕاگەیاندنی 2 ی بانەمەڕی 1325 ی حکومەت، کە جێگەی سەیرکردنی نوماینەدەگانی ناو براو بو، لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی بیروڕا ڕێکەوتن کە مادەکانی لای خوارو بۆ ڕون کردنەوە و تەواو کردنی ڕێک بخرێ و جێبەجێ بکرێ:

1. سەبارەت بە مادەی 1 ی ڕاگەیاندنەکەی حکومەت، سەرۆکی دارایی بە پێشنیاری ئەنجومەنی ئەیالەتی و پەسەند کردنی حکومەتی ناوەندی دادەنرێ.
2. ئەنجومەنی ئەیالەتی چەند کەسێ بۆ ئوستانداری داوێر دەکات و وەزارەتی کیشوەر یەکێکیان لێ هەڵدەبژێرێ.
3. حکومەت مەجلیسی میللی ئازەربایجان وەکو ئەنجومەنی ئەیالەتی ئەناسێ. دوای دامەزراندنی مەجلیسی پانزەهەم و دانانی قانونی تازەی ئەنجومەنی ئەیالەتی و ولایەتی کە لە لایەن حکومەتەوە پێشنیار ئەکرێ، ئەوسا ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان بە گوێرەی ئەو قانونە هەڵدەبژێردرێ.
4. هێزەکانی ئازەربایجان بە بەشێ لە ئەرتەشی ئێران دادەنرێن. کۆمیسیونێکی تێکەڵاو لە نوێنەرانی حکومەتی ناوەندی و ئەنجومەنی ئەیالەتی پێک ئەهێنرێ بۆ جێبەجێ کردنی.
5. لە 75% ی دەرامەتی ئازەربایجان بۆ خەرجی ناوچەیی و 25% ی ئەنێردرێ بۆ ناوەند بۆ خەرجی گشتی ئێران.

تێبینی 1: دەرامەتی پۆست و تەلگراف و گومرگ و ڕێگای ئاسنین و کەشتیرانی لە دەریاچەی ورمێ دا هەموی بە حکومەتی ناوەندی ئەدرێ.

تێبینی 2: دروستکردن و چاکردنی شەقامەرێکان لە ئەستۆی ناوەند و ڕێگا لاوەکی و ناوچەییەکان لە ئەستۆی ئەنجومەنی ئەیالەتی دا ئەبێ.

تێبینی 3: 25% ی دەرامەتی گومرگی ئازەربایجان بۆ دانیشگاهی ئازەربایجان تەرخان ئەکرێ.

6. حکومەت هەوڵ ئەدا ڕێگای ئاسنینی میانە - تەوریز بە زوترین کات دەس پێ بکا و تەواوی بکا.
7. هێزەکانی فیدائی ئەبن بە ژاندارمری کۆمیسیۆنێکی تێکەڵاو لە نوێنەرانی حکومەتی ناوەندی و ئەنجومەنی ئەیالەتی پێک ئەهێنرێ بۆ جێبەجێ کردنی.
8. ئەو ئەرزانەی دابەش کراون ئەوی هی دەوڵەتە مانیعی لەسەر نیە ئەوی هی زەویدارەکانە ئەبێ بۆیان بژێردرێ و. بۆ ئەو مەبەستە کۆمیسیۆنێکی تێکەڵاو لە نوێنەرانی حکومەتی ناوەندی و ئەنجومەنی ئەیالەتی پێک ئەهێنرێ بۆ جێبەجێ کردنی.
9. حکومەت موافەقەت ئەکا دوای کردنەوەی مەجلیسی پانزەهەم پرۆژەی قانونی هەڵبژاردن لە سەر بنچینەی ئازادی و دیمۆکراسی. هەڵبژاردنی ئازادی نهێنی ڕاستەوخۆی ژن و پیاو دابنێ. ئازەربایجان بە گوێرەی زیادبونی ژمارەی دانیشتوانی ژمارەی نوێنەرەکانی زیاد بکرێ.
10. ئەیالەتی ئازەربایجان ئوستانەکانی 3 و 4 ئەگرێتەوە.
11. حکومەت موافەقەت ئەکا بۆ دابینکردنی باش بەڕێوەچونی کاروباری ئازەربایجان شورای بەڕێوەبەرایەتی لە ئوستاندار و سەرۆکی دائیرەکان و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ئەیالەتی پێک بێ.
12. لە قوتابخانەی ناوەنجی و بەرز خوێندن بە دو زمانی فارسی و ئازەربایجانی ئەبێ بە پێی بەرنامەی وەزارەتی فەرهەنگ.
13. حکومەت موافەقەت ئەکا کوردەکانی ئازەربایجان لە (مەزایای) ئەم ڕێکەوتنە کەڵک وەربگرن. تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی خۆیان بخوێنن. کەمایەتییەکانی دانیشتوی ئازەربایجان وەکو ئاسوری و ئەرمەنی مافیان ئەبێ تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی خۆیان بخوێنن.
14. لەبەر ئەوەی حکومەت بە تەمایە قانونێکی تازە بۆ هەڵبژاردنی شارداری بۆ هەمو ئێران لە سەر بنچینەکانی دیمۆکراسی. واتە دەنگدانی گشتی. نهێنی. ڕاستەوخۆی وەکویەک پێشنیار بکا بۆ مەجلیسی پانزەهەم. پاش پەسەندکردنی ئەو قانونە هەڵبژاردنی نوێ بۆ ئەنجومەنەکانی شارداری لە هەمو ئێران دا دەس پێ ئەکات. تا ئەو کاتە ئەنجومەنەکانی شارداری ئێستای ئازەربایجان کارەکانی خۆیان ئەنجام ئەدەن.
15. ئەم ڕێککەوتنامەیە بە دورونوس ئامادەکراو گۆڕدرایەوە. پاش پەسەند کردنی لە لایەن حکومەت و ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجانەوە جێبەجێ ئەکرێ.

23 ی خوردادی 1325 موزەفەر فەیروز - پیشەوەری (18)

لە کاتی سەردانەکەی نوێنەرانی حکومەتی تاران دا بۆ گفتوگۆ بۆ تەوریز ڕۆژنامەی کوردستان دو وتاری گرنگی بڵاوکردۆتەوە: یەکێکیان لە ژێر سەردێڕی: "قابل توجه نمایندگان حکومت تهران بازربایجان: ما أكراد چه میخواهیم؟" بە زمانی فارسی بە قەڵەمی ئیبراهیم نادری و. ئەوی تریان لە ژێر سەردێڕی: "چی مان لە تاران دەوێ؟" بە زمانی کوردی بە قەڵەمی ئەنوەر دڵسۆز.(19)

مەسەلەی هێزە چەکدارەکانی ئازەربایجان یەکێ لە کۆسپەکانی ڕێگای پێکهاتن بو. سەرانی ئازەری ئەیان ویست ئەفسەرەکانیان چ ئەوانەی دەرچوی زانستگاکانی ئێران بون و دابویانە پاڵ ئەمان و. چ ئەوانەی خۆیان پلەو پایەیان پێ بەخشی بون. لە ڕیزی ئەرتەش دا بە هەمان پلەی هەیان بو وەربگیرێنەوە. ستادی ئەرتەش و. شا ئەمەیان قبوڵ نەکرد. بەڵکو نەیان هێشت ڕێکەوتنەکە هیچی جێبەجێ بکرێ.

## 3. 4. کێشەی کورد لە سەبەتەی مەسەلەی ئازەربایجان دا

بە بۆنەی خولی دوهەمی گفتوگۆکانی نوێنەرایەتی ئێران و ئازەربایجانەوە، رۆژنامەی کوردستان لە ژێر سەرێڕی "دەنگوباسی حەفتە" دا نوسیویتی:

"ئەحوالی سیاسی لەم حەفتەیەدا وا دەردەکەوێ... مەسئەلەی ئازەربایجان دو حەفتە بـو لـە بێـدەنگی دا بو، رۆژنامە و رادیۆکانی دنیا لەم مەسئەلەیە نەدەدوان. چەند رۆژە ئەم مەسئەلەیە دوبارە کەوتۆتە سەر زبـان. هاتنی ئاغای موزەفەر فەیروز معاوینی نوخست وەزیری حکومەتی تاران بۆ تەوریز لە مەحافیلی سیاسی دنیـا دا شتێکی نوێی نیشان نەداوە لە ئانی برانی موباحەساتی تاران لە بەینی ئاغای پیشـەوەری و ئاغـای قـەوام سەڵتەنە لە لایەن هەردو تەرەفەوە ئیعلامیە درا کە نەگەیشتنە نەتیجەیەک و تەفاهوم حاسڵ نەبو. وە لە هـەردو لاوە بڵاوکراوەکە نییەتی دوبـارە کۆبونـەوەیان هەیـە لەبـەر ئـەوە مەسـئەلەی موباحەسـاتی تـەوریز شـتێکی کوتوپڕی نەبو.

موباحەساتی تەوریز هەر وەکو بۆمان دەرکەوت ئاغای موزەفەر فەیروز هەمیشە لـە گـەڵ ئاغـای قـەوام سەڵتەنە لە ئیتیسال دا بوە، موباحەسات پێش ئەوە لە تەورێزەوە ئیعلان بکرێت لە رادیۆکانی بێگانـە ئـیعلان کرا و رۆژنامەی (رەهبەر) ی تـاران چەنـد رۆژە ئینتیهـای موباحەسـات و تـەفاهومی هـەر دولای بـە ئـەهالی گەیاندوە. موخبیرانی رۆژنامەی بێگانان لەم چەند رۆژەدا ئەم خەبەرەیان وەرگرتوە. ئینتیهای موباحەسـات و تەفاهومی هەر دو تەرەف لە لایەن ئاغای پیشەوەری و ئاغای موزەفەر فەیروز هەر دو سەرۆکی نوماینـدەکانی تەوریز و تاران ئیعلان کران.

گۆیا حکومەتی تاران لە خودموختاریەتی ئازەربایجان موافیقە و ئەنجومـەنی ئەیالـەتی و ولایـەتی بـە ئینتیخاب و لە تەرەف میللەتی ئازەربایجان تەشکیل دەدرێت و ئازەربایجان مەجلیسی میللی خۆی دەبێ وە بۆ خۆی سەرۆکی خۆی تەعین دەکات وە بە گوێرەی ئـەم ئیتیفاقیەیـە حکومـەتی خـود موختـاری ئازەربایجـان لەشکری میللی خۆی دەبێ بەڵام بە ناوی ئەمنیە بۆ موحافەزەی داخلی دەناسرێت.

### مەسئەلەی کورد

بێینە سەروکاری مەسئەلەی کورد، خوێندەوارە خۆشەویستەکان هەر وەکـو دەزانـن مەسـئەلەی کـوردی بەرامبەرسیاسەتی دنیا شتێکی بە ترسە پێشەوای موعەزەممان لە بەر ئـەم نوقتەیـە بـە سیاسـەتی حەکیمانـەی خۆی مەسئەلەی کوردستانی ئێرانی بە مەسـئەلەی ئازەربایجـان بەسـتوە وە لـەوەش دا ماعـەدای قـازانج هـیچ زەرەرێکمان نەکردوە، چونکە میللەتی ئازەربایجان هەر وەکو میللـەتی کـورد لـە ژێـر چـەنگاڵی ئیسـتیعمار و چـەپۆکی دیکتـاتۆری رەزاخـان دەنـاڵێ لـە هـەرچی ناحیەیـەک نوقسـانیان بـوبێ میللـەتی ئازەربایجـانیش نوقسانیان هەبو، لەبەرئەوە رەهبەری دانامان پێشەوای خۆشەویست هیچ مانعێکی نـەدیوە بـەڵکو بـە زەروری زانیوە ئەمرۆ مەسئەلەی کورد رەبتی مەسئەلەی ئازەربایجـان بکرێـت دەلیلیشـم هـەر وەکـو دەبیـنن لـە رۆژی ئەوەڵی ئازەربایجان هەرچی شتێک بۆ میللـەتی ئازەربایجـان کرابـێ بـۆ میللـەتی کـوردیش کـراوە لـە هـەر قیسمەتێک دەست بە پڕکردنەوەی نوقسانیان کراوە.

ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە حکومەتی تاران تەتبیقی قـانونی ئەساسـی ئێرانـی دەرعوهـدەی خـۆی وەرگرتوە، جا ئەمەش وا نیە تەنیا لە ئازەربایجان بێ بەڵکو لە هەمو ئێران سەراپا. جا ئەگەر بەم چەشمە کـە تەماشای مەسەلەی هەمو کوردستانی ئێران بکەین زۆر بە ئاسانی بۆمان دەر دەکەوێ کە کوێرەوەری ئەمەنـدە ساڵانەمان بە خەسار نەچوە وە گەیشتینە مەرام و ئامانجی خۆمان.

نەگبەتی ئێمە تاکو وێستا هەر هەندە بوە ئێمە بە زوبانی خۆمان نەدەخوێنـد. بێگانـە دەهـاتن دەبونـە حاکمی ئێمە. ئەمیش لە تەتبیق نەکردنی قانونی ئەساسی بو دەگەڵ ئوسوڵی دیمۆکراسی، جا ئەگـەر لـە هـەمو

ئێران قانونی ئەساسی بە ئەمینی تەتبیق بکرێت مەعنای ئەوەیە کە لە کرماشانیش و لە سنەش بە کوردی دەخوێندرێت و ئەنجومەنانی ئەیالەتی و ولایەتی لە تەرەف میللەتەوە بە سورەتێکی دیمۆکراسی ڕاست ئینتیخاب دەکرێت و سەرۆکی خۆیان خۆیان تەعینی دەکەن.

ئەگەر ئەمەش زیاتر تەفسیر بکەم وا دەردەکەوێ: شارەکانی کوردستان چونکە هەموی بە زبانێک گفتوگۆ دەکات تابیعی یەک مەرکەز دەبن یەعنی پاش ئەوەی لە تەرەف ئەهالی ئەم شارانە ئەنجومەنانی ولایەتی ئینتیخاب دەکرێت لە تەرەف ئەم ئەنجومەنانە ئەنجومەنێکی ئەیالەتی لە یەک مەرکەز ئینتیخاب دەکرێت وە لە تەرەف ئەنجومەنانی ئەیالەتی یەک نەفەر یا چەند نەفەرێک بە سەرۆکی ئینتیخاب دەکرێت.

هەر وەکو عەرزم کردن: ئیتیفاقیەی ئازەربایجان و تاران تەنیا مەشمولی میللەتی ئازەربایجان ناکات بەڵکو کوردیش حەتتا ئەرمەنی و ئاسوری لەمەدا بەشدارن. دەبێ هەمو کوردێک ئەم ڕۆژانەی ڕۆژی شادی و بەم خەبەرە بەختیار بێ. بۆ تەمامکردنی مەسەلەی کورد کۆسپەیەکمان لەبەر دەم دەمێنێ ئەو کۆسپەش ئەوەیە کە ئەنجومەنانی ولایەتی کوردستان تەماشای یەک ئەنجومەنی ئەیالەتی بکەن بۆ بڕینی ئەم مەسئەلەیەش زۆر ئیحتیمال دەبینم بە ئاسانی تەفاهوم بکەن چونکە بۆ ئاسایشی ئێران ئەگەر ئەمەندە زەحمەتانە ئاسان بکرێت وە حکومەتی مەرکەزی تاران هەمو مەتالیبمان بدات دەبێ ئەمەشمان دروست بکرێت وە ئیللا هەر وەکو شتێک نەبونی وایە چونکە هەمو کوردستانی ئێران تەماشای سابلاغ دەکات وە چرای سابلاغ ڕێگایان بۆ ڕوناک دەکات وە هەمو کوردێک ئیمڕۆ دەبەوێ لە ژێر سێبەری پێشەوای ڕەهبەرمان بەرقەرار بێ."(20)

ناوەرۆکی ئەم وتارە و، ئاگاداریەکانی و، خۆشبینیەکانی لە گەڵ ڕێککەوتنەکەی فەیروز - پیشەوەری دا یەک ناگرنەوە.

هەر لەو کاتەوە کە دەستەی نوێنەرایەتی کورد بانگ کرابون بۆ باکۆ گفتوگۆ لە سەر پاشەڕۆژی سیاسی کوردستان. باقیرۆف و کاربەدەستەکانی تری جمهوریەتی ئازەربایجانی سۆڤێتی ئەیان ویست مەسەلەی کورد لە ئێران دا بخەنە ناو مەسەلەی ئازەربایجانەوە. باقیرۆف، بۆ سەلماندنی قسەکانی، پێوەندی نێوان جمهوریەتەکانی یەکێتی سۆڤێت و نەتەوە بچوکەکانی ئەوێ‌ی بە نمونە بۆ هێنا بونەوە. بیانوەکانی باقیرۆف نوێنەرایەتی کوردی پێ قانع نەکرا بو. کوردەکان سور بون لەسەر ئەوەی کە هەم حیزب و هەم حکومەتی تایبەتی خۆیان هەبێ.

جۆری بیرکردنەوەی باقیرۆف، دوانەوەی جۆری بیرکردنەوەی سەرانی حکومەتی میللی ئازەربایجان و فیرقەی دیمۆکرات و نۆڕینی ئەوان بو بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی کورد. لە مانگەکانی دواییتریش دا هەر هەمان بۆچون زاڵ بو بەسەر جۆری بیرکردنەوەیان دا. قازی محەمەد لە کۆبونەوەیەک دا ڕۆژی 12 ی 11 ی 24 ئەڵێ: "دو دەفعە لە لایەن ئازەربایجانەوە بۆ تەوریزیان بانگ کردم کە لە ئازەربایجان دا کرێمان (!) هەبێ ئەمن پێشنیهادی ئەوانم قبوڵ نەکرد چون میللەتی کورد چوار ساڵە کە خودموختارە داوای ئیستیقلال و تێکخستنەوەی تەواوی خاکی کوردستان دەکا زۆرم پێ گران بو کە لەو حەقەی دەست هەڵ بگرێ و ئیحساساتی ئێوە مانیعی ئەوەی بو کە ئێمە بە خودموختاری ڕازی بین چونکو لە موددەی ئەو چەند ڕۆژەی کە جێژن گیراوە ئیحساساتێکی ئێوە دوانەوتانە وێنەیەکی حەساس و کامیلە و دەبێ دنیا بزانێ کە کورد لیاقەتی ئیستیقلال و سەربەخۆیی هەیە."(21)

لە بۆچونی ئازەریەکان دا ڕەنگە دو شت کاری کردبێ، یەکێکیان لە بەر ئەوەی کورد بەسەر 4 دەوڵەتی جیاوازی ئێرانی، تورکی، عەرەبی دا دابەش بوبون مەسەلەکەی دوراییەکی سیاسی ڕۆژهەڵات - ناوەراستیی هەبو. پشتیوانیی مەسەلەی نەتەوایەتی کورد لە ئێران دا، تورکیا و عێراق و سوریای لە یەکێتیی سۆڤێت ئەوروژاند. ئەوەش بۆ سیاسەتی یەکێتیی سۆڤێت باش نەبو. ئەوی تریان گیانی خۆبەزلزانینی

نەتەوەیی سەرانی ئازەربایجانی کە خۆیان لە کورد بە زلتر و. پێشکەوتوتر و. کوردیان لە خۆیان بە بچوکتر و. دواکەوتوتر دانەنا.

ئەوکاتەی ئەنجومەنی ئازەربایجان دامەزرا قازی محەمەد لە سەر داوای سۆڤێتی 5 کەسی لە خەڵکی مەهاباد: سەیفی قازی، حاجی مستەفای داودی، مەنافی کەریمی، کەریمی ئەحمەدین، وەهابی بلوریان، بۆ بەشداری لەو ئەنجومەنەدا ناردە تەورێز.(22) ئەم نوێنەرانە هیچ جیاوازی‌یەکیان نەبو لە گەڵ نوێنەرانی شارەکانی تری ئازەربایجان. بە نوێنەری گەلی کورد. یا تەنانەت بە نوێنەری حکومەتی کوردستانیش. حساب نەئەکران.

خولی دوەمی گفتوگۆکانی ئازەری - ئێرانی مەسەلەی کوردی بردەوە بۆ دواوە و خستیە ناو سەبەتەی ئازەربایجانەوە. یەکەم، لەم گفتوگۆیانەدا نوێنەری کورد بەشدار نەکران. نوێنەرانی ئازەربایجان لە باتی هەر دو نەتەوە قسەیان لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی ناوەندی ئەکرد. دوەم، مەسەلەی کورد لە ئێران دا وەکو مەسەلەی تایبەتی نەتەوەیەکی سەربەخۆ کە ئەویش وەکو گەلی ئازەری قەوارەیەکی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی جیاوازی خۆی هەبێ کە خۆی ئەتوانێ لە مافی پێکهێنانی ئەنجومەنەکانی ئەیالەتی و ولایەتی دا خرابوە پشت گوێ. کوردیش وەکو کەمایەتی‌یەکانی تری دانیشتوی ئازەربایجان: ئاسوری و ئەرمەنی باس کرابو. قازی لە نوتقەکەی ڕۆژی 31 ی 2 ی 25 دا دان بەمەدا ئەنێ. سێیەم، باسی کوردەکانی دەرەوەی ئازەربایجان، وەکو ئوستانەکانی کوردستان، کرماشان، ئیلام، کە زۆرایەتی کوردی ئێرانی بون بە تەواوەتی لە بیر کرابون. ئەگەر کوردەکانی ئازەربایجان لە "مەزایا" ی ڕێککەوتنی پیشەوەری - فەیروز شتێ کەڵکیان وەربگرتایە: بۆ نمونە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بیان توانیایە بە زمانی خۆیان بخوێنن، ئەوا کوردی شوێنەکانی تر ئەوەشیان پێ نەئەبڕا.

## 4. کورد و تاران

### 4. 1. بۆچونی کاربەدەستانی ئێرانی بۆ چارەسەری کێشەی کورد

لە ساڵانی دوەم جەنگی جیهانی دا مەسەلەی نەتەوایەتی کورد لە ئێران دا دوراییەکی سیاسی بە خۆیەوە گرت بو. جوڵانەوە پچڕ پچڕ و لە یەک دابڕاوەکانی کوردستان، لە هەر دو ناوچەی نفوزی ڕوسی و بەریتانی دا، ئەگەرچی زۆرتر یاخیبونی خێڵەکی و دەربڕینی ناڕەزایی ڕێک نەخراوی ئێڵ و هۆزەکانی کورد بو. بەڵام گرنگی شاردراوەی کێشەی نەتەوایەتی کوردی پیشان ئەدا. کۆمەڵەی ژ. ک چالاکی‌یەکی ڕێکخراوەیی، سیاسی، ڕۆشنبیری، بەربڵاوی دەس پێ کرد بو. گۆڤاری "نیشتیمان" و بڵاوکراوە کوردی‌یەکانی لە عێراق و لوبنان و سوریا دەرئەچون بە سەرانسەری کوردستان دا بڵاو ئەبونەوە. هەواڵی جموجوڵی سیاسی کوردەکانی عێراق و. شۆڕشی بارزان ئەگەیشتە گوێی خەڵکی کورد. ئێرانیش کە چەند ملیون کوردی تێ دا ئەژیا ئەی توانی هەتا سەر گوێی خۆی بخەوێنێ. ئەترسا کێشەی کورد لەوێش بتەقێتەوە.

لە 16 ی ئۆکتۆبەری 1944 دا حکومەتی ئێران چەند کەسێکی لە پیاوە ناسراوەکانی بۆ گفتوگۆ لە سەر هەلومەرجی ئەوسای کوردستان بانگ کرد بۆ تاران لە وانە: قازی محەمەد، قەرەنی ئاغای مامەش، عەبدوڵا بایەزیدی مەنگوڕ، بایزی عەزیز ئاغای گەورک، عەلی ئاغای دیبۆکری. قازی بە هیوا بو حکومەتی ئێران هەندێ کاری باش لە کوردستان دا بکا وەکو: کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی کوردی، نەخۆشخانە و ڕێگاوبان.(23)

سەردانەکەی قازی و هاوسەفەرەکانی هیچ ئەنجامێکی دیار و بە کەڵکی نەبو. لەم سەفەرەدا قازی چەند کەسێکی لە کاربەدەست و بەر پرسەکانی حکومەتی ناوەندی بینی. لەوانە حەسەن ئەرفەع سەرۆکی ستادی ئەرتەش. ئەرفەع خۆی باسی گفتوگۆکانی لە گەڵ قازی ئەگێڕێتەوە و، نوسیویتی:

"هەر لەو کاتانەدا بو کە قازی محەمەد و سەیفی قازی هاتنە تاران. رۆژێکیان براکەی قازی، کە لە مەجلیسی شورای میللی یش دا نوێنەر بو، بە تەلەفۆن داوای لێ کردم خۆی و براکەی ببینم.

ئەوانە هاتنە ستادی ئەرتەش، بە دورودرێژی گفتوگۆمان کرد. سەدر و سەیف تا ئەندازەیەک محافەزەکارانە و نەرم ئەدوان. وایان دەر ئەخست کە ئومێدەوارن حکومەتی ئێران لە کۆتایی دا خسوسیاتی تایبەتی‌یان دەرک بکا و مافە نەتەوەیی‌یەکانیان بسەلمێنێ و ئەوانیش بۆ پێشکەوتنی هەمو میللەتی ئێران لە گەڵ حکومەت هاوکاری بکەن. قازی محەمەد کە سەریحتر بو، سەرەتا گلەیی لە نارەحەتی‌یەکانی ڕابردو ئەکرد، باسی فەساد و بێ لیاقەتی دەزگا ئیداری‌یەکانی شوێنە کوردنشینەکانی کرد و لەوە دوا بۆچی لەم شوێنانەدا کەڵک لە کوردەکان خۆیان وەرناگرن بۆ کاروباری بەڕێوەبەرایەتی.

من وەڵامم دایەوە، کە ئەعلا حەزرەت هومایون شاهنشاە هەمان هەستی بەرامبەر کوردەکان هەیە کە بەرامبەر هەمو کەمە نەتەوەیی‌یەکان هەیەتی. دوای ئەوە بە بیرم هێنایەوە کە زۆر کورد لە ڕابردودا لەم وڵاتەدا گەیشتونەتە پلەی بەرز و تەنانەت یەکێکیان ئەندامی کابینەش بوە. هەڵبەت پێم لێ دا کە هەندێ فەساد و بێ لیاقەتی لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی دا هەبوە و هەیە. بەڵام ئێمە ئەبێ هاوکاری باش پێشان بدەین و بە ڕێبەری ئەعلاحەزرەتی هومایونی ئەم کەموکوری‌یانە چاک بکەین. شەخسی ئەعلاحەزرەت شاهنشاە ئیمپراتۆرێکە و هی میللەتێکی تایبەتی نیە. بەڵکو هی هەمو کەمینەکانی وەکو فارس، تورک، بلوچ، کورد، تورکمان، عەرەب و هی ترە، کە هەر کام لەوانە داب و رسومی دێرینەی خۆی زیندو پاراستوە و، شانازی ئەکەن بەوەی بەشێکن لە میللەتی ئێران. لە گەڵ هەمو ئەم درێژەپێدانەدا سەیرم کرد کە قازی محەمەد بییەک نیە بەم دایانە بلەرزێ و، بێگومان لە پاشەڕۆژا ئەبێتە هۆی تەنگ پێ هەڵچنینمان."(24)

بیرکردنەوەی ئەرفەع نمونەیەک بو لە جۆری بیرکردنەوەی هەمو کاربەدەستانی ئێرانی بەرامبەر ڕێگای چارەسەر کردنی کێشەی نەتەوەیی کورد ئەوانە لایان وابو. یان ڕاستتر، ئەیان ویست وای دەربخەن لە ئێران دا شتێک نیە ناوی مەسەلەی نەتەوایەتی بێ.

### 4. 2. گفتوگۆی کوردی – ئێرانی

قازی محەمەد لە گفتوگۆیەک دا لە 1 ی مانگی حوزەیرانی 1946 دا، لە گەڵ پەیامنێری ئاژانسی "فرانس پرێس" کردی، لە وەڵامی پرسیارێک دا ئەڵێ:

"کورد ڕازی ئەبێ ئەگەر حکومەتی ناوەندی بڕیار بدا قانونی دیموکراتی لە هەمو ئێران دا جێبەجێ بکرێ و، دان بنێ بەو قانونانەدا کە ئێستا لە کوردستان دا سەبارەت بە خوێندنی کوردی و ئۆتۆنۆمی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەیی و لە شکر کاریان پێ ئەکرێ."

لە وەڵامی پرسیارێکی تردا ئەڵێ:

"هەلومەرجی کوردستان زۆر جیاوازە لە هی ئازەربایجان. وڵاتەکەی ئێمە هەرگیز لە لایەن هێزەکانی سۆڤێتەوە داگیر نەکراوە و، لەو کاتەوە ڕەزاشا وازی لە شاهێتی هێناوە، نە ژاندارم و نە هیچ هێزێکی تری ئێران نەهاتۆتە ناو کوردستانەوە. لە بەر ئەوە ئێمە لەو ساوە بە کردەوە بە سەربەخۆیی ژیاوین. ئێمە هەرگیز چاوپۆشی ناکەین لە هیچ جۆرە دەستێوەردانێکی بێگانە لە هەر کوێوە بێ. کێشەی کوردستان بە تەواوی مەسەلەیەکی ناوخۆیی‌یە ئەبێ لە نێوان کورد خۆی و حکومەتی ناوەندی دا یەکلا بکرێ.

ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ پێ دادەگرین لەسەر داوای ئۆتۆنۆمییەکی جوزئی بۆ وڵاتەکەمان، گوناحی حکومەتی ناوەندییە کە هیچی نەکردوە بۆ باشکردنی وەزعی ئێمە. ئێمە بە ڕاستی حەز ئەکەین ڕێگای پێشکەوتن بگرین. ئێمە حەز ناکەین لاسایی ئەمریکا یا ڕوسیا بکەینەوە، بەڵام ئەوەش ڕەت ئەکەینەوە کە وەکو ئاژەڵی وڵاتانی شارستانی بژین."(25)

حکومەتی کوردستان ئیدیعای جیابونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆی نەئەکرد. بەڵکو ئەیویست وەکو حکومەتێکی "دی فاکتۆ" دانپیانانی قانونی حکومەتی تاران بە دەست بهێنێ و، ببێتە حکومەتێکی "دی ژور" لە چوارچێوەی "قانونی ئەساسی ئێران" دا. بۆ ئەوەش ئەبو لەگەڵ حکومەتی تاران گفتوگۆ بکات و، هەوڵی سازین و ڕێک کەوتن بدات.

جمهوریەتی مەهاباد خەریک ئەبو جێگیر ئەبو. ئەنجومەنی وەزیران کاروباری خۆی رائەپەراند. هێزی چەکداری جمهوریەت خەریک بو ئەبوە هێزێکی نیزامی ڕێکوپێک بە تایبەتی دوای ڕێکخستنی بارزانییەکان و پۆلەکانی هێزی ناوەندی لە چەند فەوجی نیزامی دا. جمهوریەتی مەهاباد پەیمانێکی لەگەڵ جمهوریەتی ئازەربایجان دا بەست. ئەرتەشی ئێرانی لە جەبهەی سەقز لە بەرامبەر هێزی پێشمەرگە دا چەند کەرەتێ شکا. گفتوگۆکانی حکومەتی ئازەربایجان لەگەڵ تاران سەری نەگرت. حکومەتی قەوام سەڵتەنە قازی محەمەدی بانگ کرد بۆ تاران بۆ گفتوگۆ لەسەر ڕێکخستنەوەی جۆری پەیوەندی دەوڵەتی مەرکەزی و حکومەتی کوردستان.

کوردستان لە ژمارەی 67 ی 23 ی 4 ی 1325 نوسیویێتی:

"دەنگوباسی هەرە موهیمی داخیلی هەفتەی ڕابردو، تەشریف بردنی پێشەوای مەحبوبمان بۆ تاران بو. پێشەوا ڕۆژی دوەمی ئەو ڕۆژەی کە لێرە موسافەرەتی فەرمو لە تەورێزەوە بە تەیارە بۆ تاران موسافەرەتی فەرمو. لە ماوەی دو سەعات و نیو دا گەیشتە فرودگای تاران. لە فرودگا لە لایەن نوماینەدەی ئاغای قەوام سەڵتەنە نوخست وەزیر و عیدەیەکی زۆر لە کوردانی نیشتەجێی تاران و ئاسیاوان لە پێشەوا پێشوازی کراوە.

لە میوانخانەی دەربەند لە تەرەفی دەوڵەتەوە میوانی دەکرێ. پێشەوای موعەزەم لە ئەوەڵی ڕۆژی گەیشتنە تارانی لە لایەن نوخست وەزیر ئاغای قەوام سەڵتەنە دەعوەت کراوە. تاکو ئێستا شتێکی ڕەسمی لە موباحەساتی پێشەوا و حکومەتی تاران نەزانراوە. بەڵام هەر وەکو بۆمان دەردەکەوێ، بێ دڵگیری لە ژێر ئاسمانێکی دۆستایەتی و تەفاهوم بۆ نەتیجە دەڕۆن."

لە ژمارەی ڕۆژی 30 ی 4 ی 25 دا نوسیویێتی:

"پێشەوای مەزنی کوردستان،

کورد و کوردستانی بە دیداری موبارەکی شاد کرد و ژیاندەوە

حەزرەتی پێشەوا کە لە سەفەری تاران گەڕاوە چەند ڕۆژێک تەشریفی لە تەورێز ماوە و ڕۆژی 26 ی 4 ی 25 کە خەبەری هاتنەوەی بە مەهاباد گەیشت هەیئەتی کۆمیتەی مەرکەزی و سەرانی حکومەتی میللی و سەرکردانی ئەرشەدی کوردستان و موحتەرەمین تا میاندواو و خانمان و شاگردانی مەداریس و هێزی ناوەندی و نزیکەی دە هەزار نەفەر پیاو و ژن گەورە و بچوک لە هەمو تەبەقەیەک تا یەک فرسەخی مەهاباد بە پێشوازی پێشەوای خۆشەویستی خۆیانەوە چون و سەعات 6 ی نیوەڕۆ ڕۆژی 27 ی 4 ی 25 لە نێو چەپڵەڕێزان و گوڵباران تەشریفی گەیشتەوە مەهاباد. کورد و کوردستانی بە دیداری موبارەکی شاد کرد و ژیاندەوە و لەگەڵ هەموان بە تایبەتی شاگردانی مەداریس و یەکەتی جەوانان ئەحواڵپرسی و ئیزهاری لوتفی فەرمو."(26)

قازی محەمەد دەربارەی گفتوگۆکانی لەگەڵ کاربەدەستانی تاران لەگەڵ ڕۆژنامەی "رەهبەر" ئورگانی حیزبی تودە، گفتوگۆیەکی کرد بو، حەسەن قزلجی کردویەتی بە کوردی و لە ڕۆژنامەی کوردستان دا دوبارەکراوەتەوە. ئەمەش تێکستەکەیەتی:

"موساحەبەی نوێنەری ڕۆژنامەی رەهبەر لەگەڵ پێشەوای مەزنی کوردستان.

ڕۆژنامەی رەهبەر دەنوسێ:

پێرەکە سەعات 6 ی دوای نیوەڕۆ ئاغای قرشی ئەندامی هەیئەتی نوسەرانی رەهبەر لە ڤێللای ژمارە 5 واقیع لە دەربەند لەگەڵ جەنابی قازی محەمەد رەهبەری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان کە دە ڕۆژ پترە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزی هاتوتە تاران موساحەبەی کردوە. شەرحی ئەو موساحەبەیە لە خوارەوە بە نەزەری خوێندەواران دەگا:

جەنابی قازی محەمەد کوت و شەلوارێکی ساکاری لە بەر دابو و زۆر مەحبوب و بە ویقار و بە هەیبەت دەبیندرا. چەند نەفەر لە موتەنەفیز و گەورەگەورانی کورد کە لەو مەجلیسە دا حازربون ئیحترامێکی زۆر نیسبەت بە رەهبەری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان قایل بون. جەنابی قازی دوای ئەوەی لە تەقازای ئێمە راجیع بە موساحەبە لە تەرەف (رەهبەر) ەوە ئاگادار بون زۆر بە مەیل و ئیشتیا حازر بون جوابی پرسیارەکانمان بدەنەوە. جوابەکانیان کورت و موختەسەر وسەریح و لە ڕوی ئیمان و قوەتی قەلبەوە بو:

پرسیار: مەڵبەند و قەڵەمڕەوی ئێستای نەهزەتی دیمۆکراتی کوردستان تا کوێ دەڕوا؟

وەڵام: مەڵبەندی نفوزی حیزبێکی کە بە ناو کۆمەڵێکی زۆروزەوەندا بڵاو بوبێتەوە زەحمەتە مەعلوم بکرێ. بەڵام نەهزەتی ئێمە ڕاستەوخۆ کوردی دەوروبەری ماکۆ، شاپور، خوی، رەزائیە، شنۆ، سندوس، سەقز و سەردەشت، کە نزیکەی حەوت سەد هەشت سەد هەزار کەسە شارەزایی و رەهبەری دەکا.

پرسیار: هێندێ لە سابیقە و ڕابردوی تاریخی نەهزەتی خۆتان شەرح دە؟

وەڵام: حیزبی دیمۆکراتی کوردستان سەرەتای لە مەزلومی و نا رەزایەتی قەدیم و کۆنەوەیە هەرچەندە سابیقەی زۆرە بەڵام لە نۆ مانگە بەم لاوە دەستی بە فەعالیەتی عەمەلی کردوە (کۆمیتەی مەرکەزی حیزب لە مەهابادە) دەستپێکردنەوەی حیزبی ئێمە بە فەعالیەت عەکسولعەمەلی زۆر بۆ هێنانی دەوڵەتانی مورتەجیعە کە لە پێش دەوڵەتی ئێستادا لە سەر کار بون و دەیانەویست دەگەڵ هەمو نەهزەتێکی لاگیری ئازادی و ئیستیقلالی ئێران بەربەرەکانی بکەن.

پرسیار: چ ئیقداماتێک تا ئێستا لەو ناحیە مەنتیقەدا کراوە؟

وەڵام: کارێکی هەرە گەورە کە نەهزەتی ئێمە لە مەڵبەندی دەسەڵاتی خۆی کردویە ئیجادی گیانێکی سەمیمییەت و یەکەتی‌یەکی بێ نەزیرە لە نێوان چەند سەد هەزار نەفەر برایانی ئێرانی ئێوەدا. ئەمنییەت و ئارامی‌یەکی کە لەو مەڵبەندەدا هەیە قەت نەبوە و میللەتی ئێمە لە خۆڕا لە ئیجاد و ئیبداع و دەست کردنەوەیەکی بە شەرەفانە لە حەیسیەتی میللەتی ئێران زۆر شاکاریان کردوە. دەگەڵ ئەو وەختە کەمە و نەبونی وەسائیل، چاکردنی ڕێگایان، دامەزراندنی مەدرەسان، دامەزراندنی چاپخانە و بڵاوبونەوەی ڕۆژنامەو گۆڤار و... سیاسی و نیزامی کۆمەڵێکی زۆر لە کوردانی هاونیشتمانی ئێوە بەرەو تەرەقی ڕۆیشتوە.

پرسیار: ئاگات لە حاڵی کوردانی جنوبی کە ڕێ و ڕاست لە ژێر نفوزی مەعنەوی نەهزەتی ئێوەدا نین، هەیە؟

وەڵام: لەو جێگایانە لە هەمو جۆرە بزوتنەوەیەکی دیمۆکراتیک پێش گیری کراوە بەڵام ئێمە دەزانین لە هەمو جێگایەک هەمو کوردێکی زۆرلێکراو و عاشقی ئازادی لاگیری نەهزەتی بەرەو تەرەقی ئێمەیە.

پرسیار: وەزعی ئێستای کوردانی دنیا بۆ ئێمە شەرح بدە؟

وەڵام: بێجگە لە کوردانی ساکینی ئێران نزیکەی دو ملیۆن و نیو کورد لە تورکیادا رای دەبوێرن. لە تەرزی بزوتنەوە و رەفتاری ئێستای دەوڵەتی تورکیە نیسبەت بە کوردانی ساکینی ئەوێ خەبەرێکم نیە بەڵام لەوە پێش کوشتار و عەزیەت و نازاریان دەکردن. وە ئەمەش کە دەوڵەتی تورکیە ئیدیعای دەکا کە: "مەسئەلەی کوردی لەو مەملەکەتەدا حەل کردوە" لە لای من قابیلی قبوڵ نیە. مەگەر پێمان وابێ کە ئەو حەل کردنە بە باری هەڵگوشین (!) و دامرکاندنی ئارەزوی میللی ئەوان دا بوبێ... بێجگە لەوەش نزیکەی ملیۆنێک و دوسەدهەزار کوردی دیکەش لە عێراق دا دەژین. ئاکار و بزوتنەوەی حکومەتی عێراقیش دەگەڵ ئەوان لە فیرار و هەڵاتنی بە پۆل و کۆمەڵی کوردانی عێراق بۆ مەنتیقە و مەڵبەندی نفوزی ئەهزەتی دیمۆکراتیکی ئێمە روناک دەبێتەوەو وە دەر دەکەوێ. بەڵام دەبێ بڵێم کە دەوڵەتی فرانسە دەگەڵ حەوت سەد هەزار کوردی کە لە سوریەدا دەژین باش بوە.

پرسیار: چ رابیتەیەکی مەعنەوی لە نێوان ئەهزەتی کوردستان و ئازەربایجان دا هەیە؟

وەڵام: هەردک لامان بۆ ئامانجێک کە ئازادی و سەربەخۆیی حەقیقی و بە راستی ئێرانە کار دەکەین.

پرسیار: دەکرێ لە گفتوگۆی تاران. یا کوللیاتی ئەوە ئاگادارمان بکەی؟

وەڵام: ئەمن چەند جەلەسە دەگەڵ ئاغای موزەفەر فەیروز معاونی سیاسی ئاغای قەوام سەڵتەنە سەرۆک وەزیر و ئاغای سەرلەشکر رەزمئارا وە دوجار دەگەڵ جەنابی سەرۆک وەزیر مولاقاتم کردوە، نەزەری ئاغای سەرۆک وەزیرم زۆر تێکەڵ بە حوسنی زەن و چاک نیەتی دیوە. داخەکەم بەرهەڵستێکی کە گفتوگۆی ئێمەی وەدواخست نەخۆشی جەنابی ئاغای قەوام سەڵتەنە بو. لە خودام تەڵەبە زوتر چا بێتەوە تا موزاکەرە بە خێرو خۆشی و نەفع و قازانجی ئازادی دوایی بێت.

پرسیار: ئایا لەو ئاوەدا چلوچۆیی مورتەجیع پاشەکشەکان قابیلی تەوەجوە و لێ وریا بون نیە؟

وەڵام: وەختێکی ئیرادەی میللەت و دەوڵەتێک لە کارێکی سەحیح و چاک دا رێک کەوێ. هیچ شتێ ناتوانێ پێشی لێ بگرێ. من ئاتیەیەکی زۆر چاک تێبینی دەکەم و هیوادارم دەوڵەتی مەرکەزی بتوانێ دیمۆکراسی بە هەمو ئێران دا بڵاو بکاتەوە.

پرسیار: ئەهزەتی دیمۆکراتیکی کوردستان تا چ ئەندازەیەک یارمەتی دیمۆکراسی ئاتیەی ئێران دەدا؟

وەڵام: ئەهزەتی ئێمە لە ئازادیخوازانی تارانەوە ئیلهامی گیر کەوت. ئێمە شاعیرێکی میللی بە ناوبانگمان هەیە بە ناوی هەژار کە قەسیدەیەکیشی لە رۆژنامەی رەهبەردا چاپ کرابو. لەم قەسیدەیەدا گوتویە: "ئێمە بە شمشێر ئەوان بە قەڵەم" ئەمن ئەو قسەیە وا بەیان دەکەم کە قەڵەمی ئێوە لە تاران کاری سەد شمشێری ئێمەی لە مەنتیقەی خۆمان کرد و میللەتی ئێمە زۆریان دڵ بە ئەهزەتی ئازادیخوازی ئێرانەوەیە. رۆژنامە ئازادیخوازەکانی تاران بە ئیشتیا دەخوێننەوە وەتف و لەعنەت لە رۆژنامەی ئیرتیجاعی و پاشەکشە دەکەن.

پرسیار: لەو مانگانەی دوایی دا لە نێوان دەوڵەتی مەرکەزی و ئەهزەتی کوردستان دا بەرهەڵستێکی وابو کە نەیەڵێ هەردک لا لێک نزیک بینەوە و رێک کەون یان نە؟

وەڵام: پێش دەوڵەتی جەنابی قەوام سەڵتەنە ئەم جۆرە بەرهەڵستانە زۆر بون بەڵام دوای ئەوە کە ئەو دەوڵەتە هاتە سەرکار، دەوڵەتی مەرکەزی هەوڵ و تەقەللای دا بو رێک کەوتن و سازان.

پرسیار: بۆچی فەرانسەوی راجیع بە مەسەلەی کورد زۆر عەلاقە دەنوێنن و ئایا ئەو خەبەرەی موخبیری فەرانسەوی بە زمانی تۆوە گوتویە: "ئێمە هەر وەختێک کە کەیفمان لێ بێ کرماشان دە دەست دەگرین"، راستە یا نا؟

وەڵام: من پێم وایە فەرانسەوی دەگەڵ کوردان نەزەرێکی خراپیان نیە لە سوریە ئەوەندەی لە دەستیان هاتبێ کۆمەکیان بە کوردان کردوە. ڕاجیع بە خەبەرێکی موخبیری فرانسە لە زەمانی منەوە گوتویە: هەوەڵ ئەوەیە کە ئەم قسەیە بە ئێستا، کە ئێمە لاگیری ئەوەین مەسئەلە بە موسالەمەت حەل بێ، مەربوت نیە. دوەمیش ئەمەیە کە مەنزور دە دەستگرتنێکی غاسیبانە و ئیمپریالیستی نەبوە بەڵکو مەقسود ئازادکردنی بەشێک لە هاونیشتمانان و کۆمەکێکی پتری بە ئازادی تەواوی ئێران بوە و دیسانیش دەڵێمەوە کە دەوڵەتی ئێستا ئەو جۆرە نەزەریاتە کە هی زەمانی حکومەتە ئیرتیجاعی‌یەکانی پێشوە لە ناو دەبا."(27)

قازی لە نوتقی ڕۆژی 4 ی 5 ی 25 دا گۆشەیەکی تری گفتوگۆکانی خۆی لە گەڵ قەوام باس کردو، وتی:

"... بۆ خۆتان دەزانن کە ئەمن بۆ وەرگرتنی حقوقی کورد شەووڕۆژ وچانم نەداوە و ئەو زەحمەتەش بە فەخر دەزانم تا یەک ڕۆژم لە دنیا ما بێ دەست لە فیداکاری هەڵ ناگرم و بە هەمو کەسێکی دەسەلمێنم کە کورد شایانی ژیانە.

دیسان بۆ خۆتان دەزانن کە لە پێش دا ئێمە بە هیچ جۆرێک داوای تەجزیەی ئێرانمان نەکردوەو تەنیا مەبەستمان ئازادی خۆمان و پاراستنی دیمۆکراتی بو. بەڵام لە پێش دا کاربەدەستانی ئێران بێجگە لەوەی جوابیان نەدایەوە شۆخی‌یشیان بە داوای ئێمە کرد و ناچار بوین حکومەتی میللیمان دامەزراندو هێزی خۆمان لە بەرامبەر ئەوان تاقی کردەوە. ئەوان کە ویستیان لەمە بێنە پێش ئێمەش لەوان چوینە پێش ئێستاش ئەوان حازر بون پاشەکشێ بکەن ئێمەش ئامادە بوین بکشێینەوە..

لە سەفەری تارانم دا دەگەڵ ئاغای قەوام سەڵتەنە زۆرم گفتوگۆ کرد. ئاغای قەوام نەزەرێکی موساعیدی دەگەڵ کوردان هەیە. ڕۆژێک ئاغای قەوام پێی گوتم: ئەوا ئێمەش بوینە دیمۆکرات و حیزبی دیمۆکراتی ئێرانمان دامەزراندوەو وا بەباش دەزانم کە ناوی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بگۆڕن و ناوی بنێن حیزبی دیمۆکراتی ئێران. منیش وەڵامم داوە: کە ئەمن بە بێ تەسویبی کۆمیتەی مەرکەزی هیچ کارێکی ناکەم چونکە دیمۆکراتی مەعنای ئەوەیە کە شەخس ناتوانێ مەسڵەحەتی میللەتێ بێ مشاوەرە بگرێتە دەستی خۆی. ئاغای قەوام دانی بەوەدا هێنا کە کوردستان شایانی تەقدیرە و میللەتی کورد ئامادەی هەمو جۆرە فیداکاری‌یەکە بۆ گەیشتن بە ئازادی و دیمۆکراتی و گوتی: نەهزەتی دیمۆکراتی کوردستان بە پشتیوانێکی گەورەی خۆمان دەزانین و ئومێدمان ئەوەیە کە بە هۆی ئێوەوە دیمۆکراتی لە تەواوی ئێران دا بڵاو بێتەوە..."(28)

قازی لە سەردانەکەی تارانی دا وەکو خۆی ئەڵێ: دوجار قەوام و، چەند جارێ موزەفەرفەیروز و ڕەزمئارای دیوە. لەو بارەیەوە وتویەتی کە "ئاغای قەوام نەزەرێکی موساعیدی دەگەڵ کوردان هەیە" و"نەزەری ئاغای سەرۆک وەزیرم زۆر تێکەڵ بە حوسنی زەن و چاک نیەتی دیوە". بەڵام بە ڕەسمی شتێک دەربارەی ناوەرۆکی گفتوگۆکانی بڵاو نەکراوەتەوە.

هەمو ئەوانەی لە سەر ئەم ڕوداوەیان نوسیوە، بێ ئەوەی ناوی سەرچاوەیەکی ڕەسمی بێەن، لەوەدا یەک ئەگرنەوە کەوا: سەرۆوەزیری ئەوسای ئێران، قەوام سەڵتەنە، پێشنیاری کردوە بۆ قازی محەمەد هەمو ناوچە کوردنشینەکانی ئێران لە سنوری سۆڤێتیەوە تا کامیاران، لە نێوانی هەردو ئوستانی کرماشان و سنەدا، بکرێتە یەک ئوستان و، قازی محەمەد ببێتە یەکەمین ئوستانداری ئەم مەڵبەندە یەکگرتوە.(29)

کرماشان نەخراوەتە ناو سنوری ئوستانی پێشنیار کراو. یەکەمیان، چونکە کرماشان نەوتی تێ دا بوە. کۆمپانیە بەریتانی‌یەکان نەوتی ئەوێیان دەرئەهێنا دیارە ئەوان بە هیچ جۆرێ قبوڵیان نەئەکرد بخرێتە ناو ئوستانێکەوە کورد بەڕیوەی بەرێت. دوەمیان، کرماشان لە دابەشکردنی سەرزەمینی ئێران دا بەشی بەریتانی بو. بەریتانیاش ڕازی نەئەبو بەوە.

یـەکێ لـە خواسـتە سـەرەکی‌یەکانی کـورد، چ لـە ئێـران و چ لـە عێـراق، یەکخسـتنی هـەمو ناوچـە کوردنشینەکان بوە لە یەکێتی‌یەکی بەڕێوەبەرایەتی دا. بۆیە ئەمە بە دەسـتکەوتێکی گـەورە دانـەنرا بـۆ گـەلی کورد. لە بەرامبـەر ئـەم دەسـتکەوتەدا قـەوام داوای لـە کـورد نـەکرد دەسـت لـە دۆسـتایەتی و هاوپـەیمانێتی ئازەربایجان هەڵ بگرێ.(30)

قازی، بە لەبەرچاوگرتنی تەجروبەکانی ڕابردوی کورد لە گەڵ کاربەدەستانی ئێـران، تـا چـە رادەیـەک ئەی توانی باوەڕ بە گفت و بەڵێنەکانیان بکا. هەرچۆنێ بێ ئەگەر کابرایەکی ماکیافیللی بوایە ئەم "عـەرز" ەی قوبوڵ ئەکرد. بەڵام قازی پیاوی "بیروباوەڕ" بو. لە بەرئەوە داواکەی قـەوام لـە قـازی، لـە فـەرزێک دا ئەگـەر ڕاستیش بوبێ، قابیلی قوبوڵ نەبو، چونکە ئەمە سەرەڕای ئەوەی بە پەیمانشکێنی و بێبەڵێنی دائەنرا بۆ قازی محەمەد، گەلی کورد و حکومەتی کوردستانی: هەم لە دۆستایەتی ئازەربایجان بێ بەش ئەکرد، کە قازی بە بـرا و پشت و پەنای دائەنان و، هەم لە دۆستایەتی یـەکێتی سـۆڤێتی دائـەبڕی، کـە بـە تـەنیا پشـتیوانی خۆیـان ئەزانی. یەکێتی سۆڤێتی هەرگیز سەودایەکی وەهای لە نێوان کورد و تاران دا لە سـەر حسـابی ئازەربایجـان پەسەند نەئەکرد. شارەزایەکی ئێرانی دەربارەی قەوام نوسیویتی:

"... قەوام سەڵتەنە بۆ بەدەستهێنانی دڵنیایی ڕوسەکان و دەستە چەپی‌یـەکان، تـەمایلی زۆری بـە فیرقـە (مەبەستی حیزبی دیمۆکراتی ئازەربایجانە) نیشان ئەدا، لە هەمان کاتا هەوڵی ئەدا ئەگـەر بتـوانێ پیشـەوەری بە دەستی قازی محەمەد یا هەردوکیان بە هۆی حیزبی تودەوە سەرکوت بکا، یا بە پێچەوانەوە بە یارمەتی ئەو دو کەسە کە دو کەسـایەتی سـەرناس و قـودرەت تەڵـەب بـون، حیزبـی تـودە لـە نـاوا نـەهێڵێ یـا کەساسـی بکا..."(31) قەوام سیاسی‌یەکی ئێرانی زیرەک بـو، ئەیویسـت کوردسـتان لـە ئازەربایجـان دابـڕێ و، ئـەو پەیمانەی بەست بویان هەڵ بوەشێنێتەوە، بە تایبەتی ئەیزانی سەرکردایەتی جمهوریەتی کوردستان کۆمۆنیسـت نین وەکو سەرکردایەتی ئازەربایجان. بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان و ئازەربایجان، هـەوڵی ئـەدا لـە پێش دا ئەمانە بێ بەش بکا لە پشتیوانی یەکێتی سۆڤێتی و، سۆڤێت ناچار بکا هێزە چەکدارەکانی لـە ئێـران بکێشێتەوەو ئەوسا ئەرتەشی ئێران دەس بگرێتەوە بە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ئازەربایجان و کوردستان دا. گفتوگۆکانی تاران بێ ئەوەی بە ئەنجامێکی باش بگا کۆتایی‌یان هات. قـازی بـە نائومێـدی گەڕایەوەکوردستان.

## 5. کورد و ڕوس

### 5. 1. سیاسەتی کوردیی یەکێتی سۆڤێت

یەکێتی سۆڤێت، وەکو دەوڵەتێکی گەورەی کۆمۆنیسـتی دوژمنـی ڕیژێمـی سـەرمایەداری، سـتراتیجێکی دنیایی هەبو. کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێکی ئەم ستراتیجە بو. یەکێتی سۆڤێت لـە چەنـد سـەرەوە پەیوەنـدی بـەم مەڵبەنـدەوە هـەبو. لـە گـەڵ دو دەوڵـەتی ناوچەکـە هاوسـنور بـو. دانیشـتوانی هەنـدێ لـە جمهوریەتەکانی ئاسیای هاودین و هاوڕەگەز و هاوزمان بون لە گەڵ هەندێ لە گەلەکانی ئێران و تورکیا. ئاوی گەرمی خەلیج و، پەترۆڵی ناوچەکەش دو هۆی گرنگی. یەکێکی کۆن و یەکێکی تازەی، ڕاکێشەری بـون. دوای ئەوە لە شەڕی ئەڵمانیاوە گلا، گرنگیی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ستراتیجی سیاسی - سپایی سـۆڤێتی دا، لە چاو جاران دا، چەند جارێ زیادی کرد.

کورد جگە لەو کەمایەتی‌یە بڵاو و ڕاگوێزراوەی کە لە ناو یەکێتی سـۆڤێتی دا نـەژیان، لـە 4 دەوڵـەتی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش دا هـەبون وەکـو بەشـێکی گرنگـی دانیشـتوان، بـەڵکو وەکـو نەتەوەیـەکی

سەرەکی، بەڵام بێ بەش لە مافی نەتەوەیی و، لە بەشداریی دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتەکان و، لە بڕیاردانی دوارۆژی سیاسی ناوچەکە. کورد لە ستراتیجی سۆڤێتی دا جێگە یا گرنگیەکی تایبەتی نەبو. ئەگەر بایەخی بە مەسەلەی کورد بدایە لەو ڕوانگەیەوە بو: هەمو کاتێ ئەیان توانی، لەم دەوڵەتانەدا، نائارامیەکی سەرەنجام نادیار بخوڵقێنن، ئاسایشی هەمو ناوچەکە بشێوێنن. یەکێتی سۆڤێت ئەی ویست، ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سنورە سیاسیەکانی بێ گۆڕان وەکو خۆی بمێنێ، ئەو نەتەوانەی لەم وڵاتانەدا ئەژین لە چوارچێوەی دەوڵەتەکانی خۆیان دا گەشە بکەن.

ئێران هاوسنور و دراوسێی لای خواروی بو. شارێی گوێزانەوەی کەلوپەل و تفاقەکانی دەوڵەتانی هاوپەیمان بو لە خەلیجەوە. پاش لێخرانی ڕەزاشا و هەڵتەکاندنی نفوزی ئەڵمانی لای سەروی کەوت بوە ژێر دەسەڵاتی ڕوسی و، لای خواروی ڕۆژئاوای کەوت بوە ژێر دەسەڵاتی بەریتانی و ئەمەریکی. هەمو جۆرە جموجوڵ و نائارامیەک کە ئاسایشی ئەم شارێیەی، کە دوایی ناویان نا پردی سەرکەوتن. تێک بدایە لە گەڵ ستراتیجی سیاسی - سپایی سۆڤێتی دا نەئەگونجاو، هیچ جۆرە قازانجێکی ئەوی تێ دا نەبو. کاربەدەستانی ڕوسی چەند جارێ پشتیوانییان لە دەسەڵاتی ناوەندی تاران کرد دژی نائارامی و جموجوڵی سەرانی کورد. جارێکیان لە بانەمەڕی 1321 دا کە ڕێگایان دا بە ئەرتەشی ئێران لە تارانەوە هێز بنێرێت پادگانەکانی ورمێ و دەوروبەری ئاوەدان بکاتەوە و دەست بگرێتەوە بە سەر مەڵبەندەکەدا.(32) جارێکی تریش لە ڕەزبەری 1323 دا، کاتێ کە داوای وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتیان لە حکومەتی ئێران ئەکرد.(33) تا بڕانەوەی جەنگ ناوریان لە جموجوڵی کۆمەڵەی ژ. ک و، بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و، گەورەپیاوەکانی کورد نەدایەوە.

تورکیاش دەوڵەتێکی تری هاوسنور و دراوسێی لای خواروی ڕوسیا بو. لە جەنگ دا بێلایەن ڕاوەستا بو. ئەمەش بۆ یەکێتی سۆڤێت گرنگ بو. سنورێکی دورودرێژی زەمینی و دەریایی گرنگی کە بە درێژایی چەند قەرن لە حاڵەتی دوژمنایەتی دا بو لە گەڵی، لە مەترسی هاوکاری ئەڵمانی دور کەوت بوەوە. کاتێ کاربەدەستانی تورک پەژارە و ترسی خۆیان لە جموجوڵی کوردەکانی ناو ئەرزی ئێرانی ژێر دەسەڵاتی ئەوان دەبڕی، یەکێتی سۆڤێتی پەژارەکەی ڕەواندنەوە. یەکێتی سۆڤێتی هیچ قازانجێکی لە نائارامیەکی کوردی دا نەبو لە ناو ئەرزی ئەم دراوسێ بێلایەنەی دا و، هیچ قازانجێکی لەوەش دا نەبو تورک لە بەر خاتری کورد بترسێنێ یا بڕەنجێنێ. بزوتنەوەی کوردیش لە تورکیا لە کۆتایی سییەکانەوە وەها بە توندی سەرکوت کرا بو بەو نزیکانە چاوەڕوانی بوژانەوە و بەهێزبونی لێ نەئەکرا.

عێراق لە ژێردەستی بەریتانیا دا بو. بەریتانیاش هاوپەیمانێکی جەنگی کاریگەری سۆڤێت بو. ئەگەرچی بزوتنەوەی کورد لە عێراق دا هەرگیز نەکوژابوەوە، بەڵام لە ساڵانی جەنگ دا بەهێزتر و ڕێکوپێکتر کەوت بوە چالاکی. لە ڕوی سیاسیەوە، کۆمەڵی هیوا، هێزێکی سیاسی کاریگەری پێک هێنابو. لە ڕوی چەکداریشەوە شۆڕشی بارزان هەڵگیرسابو. شۆڕشی بارزان لە ناکۆکی دا بو لە گەڵ بەریتانیا، هەوڵی ئەدا دۆستایەتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت ببەستێ. کەچی کاربەدەستانی سۆڤێتی هەم لە کۆمەڵەی هیوا و هەم لە سەرکردەکانی شۆڕشی بارزان بەدگومان بون، چونکە نەیان ئەویست نائارامی هەبێ. بە چاوی گومانەوە سەیری هەمو نائارامی و پشێوی و ڕاپەڕین و جموجوڵێکی شۆڕشگێڕانەیان ئەکرد.

سوریا لە ژێر دەستی فەرەنسەدا بو. کاتێک حکومەتی پاریس سەری بۆ ئەڵمانیا دانەواند، هێزەکانی فەرەنسە لەسەروی ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرپێچییان کردو، حکومەتی ئازادی فەرەنسایان دامەزراند. فەرەنسای ئازاد هاوپەیمانی جەنگیی یەکێتی سۆڤێت بو. کوردەکانی سوریا بە ژمارە کەم بون، ئەگەر چالاکییەکیان هەبوایە زۆرتر کاری ئەکردە سەر کوردستانی تورکیا. لەبەر ئەوە بۆ

یەکێتی سۆڤێت باش نەبو لە ناو کوردەکانی سوریاش تا هیچ جموجوڵێک هەبێ بۆ ئەوەی نە تورکیا بترسێ و، نە فەرانساش خەریک بێ. بەدرێژایی ساڵانی جەنگ یەکێتی سۆڤێتی قازانجی لەوەدا بو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نارام بێ. سیاسەتیشی بەرامبەر بە کورد ئەوە بو: هیچ جموجوڵێ نەکا. بەڵام دوای برانەوەی جەنگ و، پێویستی کێشانەوەی هێزەکانی لە ئێران و، دەرکەوتنی ئەمریکا وەکو زلهێزێکی نوێ و، هەڵگیرسانی "جەنگی سارد"، کوردی ئێران لە سیاسەتی ئێرانیی سۆڤێتی دا جۆرێ لە بایەخی پەیدا کرد.

## 5. 2. بانگهێشتنی سەرانی کورد بۆ باکۆ

د قاسملو نوسیویێتی:

"پاش پێکهاتنی ح د ک، لە سەرەتای خەرمانانی ساڵی 1324 دا قازی محەمەد بە سەردان چوە تەورێز و لە جێژنی پێکهاتنی فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان لە 12 ی خەرمانانی 1324 (3 ی سیپتامبری 1945) دا بەشدار بو. هەر پاش ئەم جێژنە لە گەڵ چەند کەسی دیکە بۆ جاری دوهەم بۆ باکۆ بانگهێشتن کرا. دیارە سەفەری ئەم جارە سەفەرێکی بە تەواوی سیاسی بو، چونکە قازی محەمەد وەک سەرۆکی ح د ک و ئەندامانی دیکەی هەیئەتیش وەک بەرێوەبەرانی ح د ک چونە باکۆ. هەر بۆیەش ئەم جارە داخوازەکانیان فۆرمولە کرا بون. داوایان لە یەکێتی سۆڤێتی ئەوە بو کە پشتیوانی لە حکومەتی کوردستان بکا کە خەریکی پێکهێنانی بون، یارمەتی مالی بەم حکومەتە بکا و چەک و تەقەمەنیشی بۆ بنێرێ، بۆ ئەوەی حکومەتی کوردستان بتوانێ سوپای میللی و هێزی چەکداری خۆی دابمەزرێنێ.

ئەم جارەش هەیئەتەکە هەر لە گەڵ باقیرۆف قسەی کرد. هەڵوێستی باقیرۆف لە جاری پێشتر زۆر باشتر بو. لە لایەنی یەکێتی سۆڤێتییەوە بەڵێنی دا:

1. چەکی سوک و قورس بدەن بە حکومەتی کوردستان.
2. یارمەتی مالی بدەن.
3. بۆ پێگەیاندنی هەندێ کادری جەنگی لاوانی کورد لە فێرگەکانی خۆیان وەربگرن.
4. چاپخانە لە مەهاباد دابمەزرێنن.(34)

نوێنەرایەتی کورد بۆ باکۆ ئەمجارەیان بریتی بون لە: قازی محەمەد، سەیفی قازی، مەنافی کەریمی، عەلی رەیحانی، قاسمی ئێلخانی زادەی دیبوکری، عەبدوڵا قادری مامەش، کاک هەمزەی نەلۆسی مامەش، نوری بەگی بەگزادە.(35)

سەردانی سەرانی کورد لە باکۆ و، گفتوگۆکانیان بۆ پشتیوانی لێ کردنی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان، لە کاتێک دا بو کە جەنگی جیهانیی برابوەوە. یەکێتی سۆڤێت بە گوێرەی ئەو بەڵێنەی لە کاتی ئیمزاکردنی پەیمانی 3 قۆڵی دا ساڵی 1321 دابوی، ئەبو ئیتر ڕێوشوێنی کێشانەوەی ئۆردوی سور و، بە جێ هێشتنی ئێران دابنێ. ئەی بۆچی بە درێژایی ساڵانی سەردەمی جەنگ کوردی پشت گوێ خست بو. کەچی لەم کاتەدا کەوتە هاندانی سەرکردەکانی ئازەربایجان و کوردستان حکومەتی ناوچەیی خۆیان دابمەزرێنن؟ یا بۆچی سەرانی کورد لە دوای برانەوەی شەڕ هەوڵی بە دەستهێنانی پشتیوانی روسیان دا بۆ دامەزراندنی حکومەتی کوردستان و، لە سەردەمی شەڕدا ئەم هەوڵەیان نەدا؟ تۆ بڵێی سەرانی کورد نەیان زانی بێ یا نەیان بیست بێ ساڵی 1321 پەیمانێکی 3 قۆڵی لە نێوان ئێران لە لایەک و، روسیا و بەریتانیا لە لاکەی ترەوە بەسترا بو، یەکێ لە مادەکانی گفتی چۆڵ کردنی ئێران بو دوای شەڕ بە شەش مانگ. خۆ ئەگەر ئەمەیان ئەزانی چۆن هیوایان لە سەر مانەوەی ئۆردوی سوری سۆڤێتی هەڵچنی بو؟

سۆڤێتییەکان هەندێ لەو گفتانەیان بەجێ هێنا کە دابویان بە نوێنەرایەتی کوردو، هەندێکێشیان بە جێ نەهێنا: 10 هەزار تفەنگی برنەویان دانێ، بەڵام چەکی قورسیان پێ نەدان. پارەتی ماڵیشیان نەدان، مەگەر ئەو سەودایەی لە سەر کڕینی توتنی کوردستان کرا. 60 لاوی کوردیش نێردرانە سۆڤێت بۆ پەروەردە کردنی سپایی. لە مەهابادیش چاپخانەیەک دامەزرا.(36)

## 5. 3. سۆڤێت: ئامۆژگاریکەرێکی خراپ

لە دوای دامەزراندنی حکومەتی کوردستان بۆ ڕێکخستنەوەی پێوەندییەکانی خۆی لە گەڵ حکومەتی ناوەندی دو ڕێگەی لە بەردەم دا بو:

یەکەمیان، ئازادکردنی ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەڵاتی ئێران.

دوەمیان، سازین لە گەڵ حکومەتی ئێران.

کاتێ کە گفتوگۆکانی 8 - 23 ی 2 ی دەستەی تێکەڵاوی نوێنەرایەتی کورد و ئازەر لە گەڵ حکومەتی ئێران بە ئێشکان تەواو بو، وە هێزەکانی ئەرتەش لە قوڵی سەقزەوە کەوت بونە شەڕفرۆشتن بە هێزەکانی پێشمەرگەی دیمۆکرات. حکومەتی کوردستان هێزەکانی خۆی لە قوڵی سەقز کۆکردەوە. هەمو ئەو هێزانە بە گەرمی ئامادە بون پەلاماری سەقز، بانە، سەردەشت، سنە... بدەن. لەوکاتەدا هێزەکانی ئێران چەند جارێ هات بونە پێش، شەڕیان بە پێشمەرگە فرۆشت بو. هەر دولا یەکترییان لە مەیدانی شەڕدا تاقی کردبوەوە. ئەرتەش ورەیان ڕوخاو و پێشمەرگەکان ورەیان بەرز بو. سەربازگاکانی میرەدێ، بانە، سەردەشت و تەنانەت هێزەکانی سەقز لە لایەن پێشمەرگەوە گەمارۆ درا بون. نەیان ئەهێشت خواردەمەنی و پێویستییەکانی تریان پێ بگات.

ئەمە هاوزەمان بو لە گەڵ کۆبونەوەکانی پیشەوەری - فەیروز لە تەوریز و، شەڕی مامەشا. هاشموف، کۆنسوڵی ڕوسی لە ڕەزائیە، لەو کاتەدا گەیشتە بنکەی سەرکردایەتی هێزی دیمۆکرات لە سەرا. لەوێ چاوی بە قازی محەمەد، مەلا مستەفا، عومەر خانی شکاک و سەرکردەکانی تری کورد کەوت و پێی وتن:

واز لە هێرشەکەیان بهێنن، ئەگینا لەوانەیە توشی ڕوبەڕو بونەوە بین لە گەڵ هێزی بەریتانی، چونکە بەریتانیا قازانجی ژیانیی لە نەوتی کرماشان دا هەیە، وە ئەگەر توشی ڕوبەڕو بونەوە بین لە گەڵ هێزی بەریتانی، ئەوا ناتوانن حساب لە سەر پشتیوانی ڕوسی بکەن و، ناشتوانێ ڕێگا لە ئەرتەشی ئێرانی بگرێ ئەگەر لە قوڵێکی ترەوە پەلاماری حکومەتی کوردستان بدات.(37)

قسەکانی هاشموف جێگەی خۆی گرت. سەرکردەکانی کورد وازیان لە بیری هێرش هێنا. پێشتر مەنافی کەریمییان نارد بو فەرمان بە هێزەکانی پێشمەرگە بدات پەلاماری سەردەشت بدەن. هێشتا بە ڕێگاوە بو فەرمانێکی پێچەوانەی ئەوەی یەکەمی پێ گەیشت: فەرمانی پێ درا کە پێیان بڵێ ڕاوەستن و چاوەڕێ بن.

لە باتی هێرش کردن گفتوگۆی سپایی لە جەبهەی شەڕ دەستی پێ کرد بو جۆرێ لە ڕێککەوتنی ئاگربڕ لە نێوان ئەرتەش و پێشمەرگەدا، کە قازی خۆی لە گەڵ ڕەزمئارا نیمزاو، سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی کرد.

دیارە بۆ یەکێتی سۆڤێت گرنگ نەبو، حکومەتی کوردستان ناوچە کوردنشینەکانی تریش بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. یا کارەکانی خۆی بۆ پێشەوە ببات. بۆ یەکێتی سۆڤێت لەو کاتەدا ئەوە گرنگ بو ڕێککەوتنەکەی پیشەوەری - فەیروز سەربگرێ و، حکومەتی قەوام لە سەر کار بمێنێ بۆ ئەوەی وەکو بەڵێنی دابو: ئیمتیازی نەوتی شیمال بە ڕوسیا بدات.

بەمجۆرە هێزەکانی کورد لەو سنورە تەسکەدا بە قەتیس ماوی لە سەنگەرەکانی خۆیان دا مانەوە تا ئەو ڕۆژەی هێرشی گەورە و دوایی ئەرتەشی ئێران بۆ داگیرکردنەوەی کوردستان و ئازەربایجان دەستی پێ کرد.

کاربەدەستانی سۆڤیێتی هەر وەکو نەیان هێشت کورد بە شەڕ کێشەکەی خۆی بە لادا بخات، پێشیان خۆش نەبو بە سازین و ڕێککەوتن لە گەڵ دەسەڵاتی ناوەندی چارەسەری بکات. لەو کاتەدا کە قازی محەمەد لە تاران خەریکی گفتوگۆ بو لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانی و، قەوام پێشنیاری کرد ناوچە کوردنشینەکان بکرێنە یەک ئوستان و، بەڕێوەبردنی بە کورد خۆی بسپێرن. دیسانەوە کاربەدەستانی سۆڤیێتی بە توندی دژی ئەم پرۆژەیە ڕاوەستان و. نەیان ویست کورد بە ئاشتی کێشەکەی خۆی بە لادا بخات. چونکە لە لایەک ئازەربایجانی پێ لاواز نەبو، لە لایەکی ترەوە کارتی کوردیان لە دەس نەدا. یەکێتی سۆڤیێت وەکو ئامۆژگاریکەرێکی خراپ، هەم هەلی شەڕ و هەم هەلی ئاشتی لە کیس سەرانی حکومەتی کوردستان دا و، سەرانی کوردیش بە قسەیان کردن.

## پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

1. گ نیشتمان، ژ 7 و 8 و 9، خاکەلێوە، بانەمەڕ، جۆزەردانی 1323، ل 5-6.
2. احمد فوزي، قاسم والاكراد: خناجر و جبال، بيروت، 1961، ل 103-104.
3. نیگلتن: ل 45.

Eaglton,William,Jr. The Kurdish Republic of 1946, London,1963. p. 45.

لێرە بە دواوە ئەنوسین: نیگلتن.

4. ر کوردستان، ژ 28، 25/1/7 بەرامبەر 1946/3/27.
5. ر کوردستان، ژ 24، 24/12/22.
6. ر کوردستان، ژ 9، س 1، شەممو 13 ی ڕێبەندانی 2/1324 ی فیوریەی 1946.
7. د قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی: کورتەیەک لە مێژوی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران. بەرگی یەکەم، چ 2، 1988، ل 90.
8. قاسملو، س ن، ل 91.
9. ه س، ل 92.
10. ر کوردستان، ژ 45، 25/2/18.
11. سرلشكر احمد زنگنه، خاطراتی از ماموریتهای من در آذربایجان (از شهریور 1320 تا دی ماه 1325)، انتشارات شرق، تهران، بلا، ل 8. لێرە بە دواوە ئەنوسین: زەنگەنە.

هەروەها: جعفر مهدی نیا، زندگی سیاسی قوام السلطنه، چ 2، تهران، تابستان 1366، ل 509. لێرە بە دواوە ئەنوسین: مەهدی نیا.

نیگلتن، س ن، ل 82.

12. ر کوردستان، ژ 44، 1325/2/16 بەرامبەر 1946/5/6.
13. ر کوردستان، ژ 49، 1325/3/4 بەرامبەر 1946/5/23.
14. ر کوردستان، ژ 50، 1325/3/6 بەرامبەر 1946/5/27.
15. مەهدی نیا، س ن، ل 331.

هەروەها: حاج مخبر السلطنه هدایت، خاطرات و خطرات، چ 4، زوار، تهران 1363، ل 447.

16. ر کوردستان، ژ 50، 1325/3/6 بەرامبەر 1946/5/27.
17. ر کوردستان، ژ 50، 1325/3/6 بەرامبەر 27 ی مەی 1946. ئەسڵی شیعرەکە بە فارسی بەمجۆرەیە:

همه سر بسر تن بکشتن دهیم

ازان به که کشور بدشمن دهیم

18. مەهدی نیا، س ن، ل 335-339. هدایت، س ن، ل 448.
19. ر کوردستان، 25/3/22.
20. ر کوردستان، ژ 60، 25/3/29.
21. ر کوردستان، ژ 30، 25/1/12.
22. ئیگلتن، س ن، ل 60.
23. دكتور عزيز شمزيني، الحركه القوميه التحرريه للشعب الكردي، مطبعه الشهيد ابراهيم عزو، نيسان 1986، ل 159.

هەروەها: فریدە کوهی - کمالی دیهکوردی، کۆمـاری کوردسـتان: دامـەزران و ڕوخـانی، نامەیـەک بـۆ بەدەستهێنانی پلەی ماستەر بە ئینگلیزی دراوە بە زانستگای ئۆکسفۆرد، 1986. ل 45-46. ئـەویش لە ئارشیفی بەریتانی دەرهێناوە.

24. ئەرفە ع. س ن. ل..؟

Hassan Arafa,The Kurds,London,1966,P.....

25. هاوێل. ل 188.

HOWELL ,Jr. ,WILSON N. ,The soviet Union And The kurds: A study Of National Minority ,1965 ,P. 188.

26. ر کوردستان، ژ
27. ر کوردستان، ژ
28. ر کوردستان، ژ
29. قاسملو، س ن، 9. ئیگلتن، س ن، ل 106. مەهدی نیا، س ن، ل 518 - 519.

علاءالدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، بەغداد، چاپخانەی مـەعارف، 1959. ل 299. لێرە بە دواوە ئەنوسین: سجادی.

هەروەها: مەحمود عیزەت، کۆماری میللی مەهاباد: لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، 1984. ل 177.

30. سجادی، س ن، ل 299.
31. مەهدی نیا، س ن، ل 330.
32. زەنگەنە، س ن، ل 37.
33. دیهکوردی، س ن، ل 41.
34. قاسملو، س ن، ل 66.

هەروەها بڕوانە: عیزەت، کۆماری میللی.... ل 93. ئیگلتن، س ن، ل 43.

35. ئیگلتن س ن، ...
36. قاسملو، س ن، ل 66.
37. ئیگلتن س ن، ل 97. قاسملو. س ن، ل 102.

# 7. کوردستان لە ژێر هەرەسی سەرماوەزدا

## 1. کابینەی قەوام سەڵتەنە

### 1. 1. نائارامی سیاسی

لەو کاتەوە کە رەزاشا لێخرا تا ئەو کاتەی کاروباری وەزارەت بە ئەحمەد قەوام سەڵتەنە سپێردرا ئێران لە نائارامی یەکی سیاسی بەردەوام دا بو. وەزارەت دائەنراو پاش ماوەیەک لێ ئەخرا، بێ ئەوەی توانیبێتی هیچ یەکێ لە گیروگرفتە ئاڵوزەکانی وڵات چارەسەربکا. بێکاری، کەمی خواردەمەنی و کەلوپەلی پێویستی ژیان، پەنمینی دراو، گرانی، هەلومەرجی ژیانی خەڵکیان تاڵ کرد بو.

مەحمود جەم، مەتین دەفتەری، عەلی مەنسور (مەنسورولمولک)، محەمەد عەلی فروغی (زەکائولمولک)، عەلی سوهەیلی، ئەحمەد قەوام سەڵتەنە، دوبارە عەلی سوهەیلی، محەمەد ساعید مەراغەیی (ساعیدولوزارە)، مورتەزا قولی بەیات (سوهامولسولتان)، ئیبراهیم حەکیمی (حەکیمولمولک)، موحسین سەدر (سەدرولئەشراف)، دوبارە حەکیمولمولک، ئینجا قەوام سەڵتەنە، بە ریز بە دوی یەک دا ئەهاتن و ئەرۆیشتن. هەندێکیان لە چەند حەفتەیەک زیاتر نەیان ئەتوانی لەسەر کار بمیننەوە.(1)

لە کاتێک دا هێزەکانی دیمۆکرات پادگانەکانی تەورێزیان گەمارۆ دابو، حکومەتی ناوەندی ویستی لە تارانەوە هێزی ئەرتەش بۆ یارمەتی یان بنێرێ. ئەوردوی سور لە نزیک قەزوین رێگەیان پێ گرت و گێڕایانەوە دواوە. سەروەزیری ئێران ئیبراهیم حەکیمی، لەم بارەیەوە، پەیامێکی بۆ سەرانی 3 دەوڵەتە گەورەکە نارد. لەو ماوەیە دا دوەمین دانیشتنی کۆنفرەنسی وەزیرانی دەوڵەتانی سەرکەوتو لە مۆسکۆ ئەبەسترا. حەکیمی ویستی بچێتە پایتەختی سۆڤێتی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ وەزیرانی دەرەوە. کرملین گوێی نەدایە ئەم ویستە. لە کۆبونەوەکەش دا، نوێنەرانی سۆڤیتی ئەو پێشنیارەیان وەرنەگرت. کە نوێنەرانی لەندەن و واشینتۆن کرد بویان، بۆ لێکۆڵینەوەی روداوەکە و دۆزینەوەی چارە. لە بەر ئەوە حەکیمی گازاندەی ئێرانی دژی یەکێتیی سۆڤیت پێشکەش کرد بە "ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتوەکان". دوای ئەوە

ڕاستەوخۆ لە 1 ی ڕێبەندانی 1324 دا وازی لە سەروەزیری هێنا.(2) حەکیمی بە لایەنگیری سیاسەتی ئینگلیز ناسرا بو.

### 1. 2. پێکهێنانی کابینەی قوام

لە کۆبونەوەی ڕۆژی 6 ی ڕێبەندانی 1324 ی مەجلیسی شورای میللی دا 104 نوێنەر ئامادە بون. لە ئەنجامی دەنگدان دا بۆ بەخشینی باوەڕ بە سەروەزیر، ئەحمەد قەوام سەڵتەنە 51 دەنگ و مـوئتەمەنولمولک 50 دەنگی بە دەس هێنا. قەوام بو بە سەروەزیری ئێران. قەوام زەوی‌وزارێکی فراوانی لە ناوچەکانی ژێر دەستی روسی دا لە سەروی ئێران هەبو. خۆی وای دەرنەخست کە لە گەڵ سیاسەتی سۆڤێتی دا ڕێکە.

ئەنجومەنی ئاسایش لە کۆبونەوەی 30 ی 1 ی 46 دا لە دوای مشتومڕێکی توند لە نێوان نوێنەرانی ئێران و سۆڤێت دا، بڕیارنامەیەکی پەسەند کرد، کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ئیرنست بوین، پێشنیاری کرد بو. بڕیارنامەکە ئێران و روسیای ڕانەسپارد بۆ بەلاداخستنی کێشەکانیان گفتوگۆی ڕاستەوخۆ بکەن.(3)

قەوام ڕۆژی 18 ی ڕێبەندان لە کاتی ناساندنی کابینەکەی دا بە مەجلیس وتی:

"لەم کاتەدا کە بە پێی ئارەزوی زۆرایەتی مەجلیس و فەرمانی ئەعلا حەزرەتی همایونی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بە ئۆدەی من سپێردراوە... قوبوڵکردنی مەسئولیەتێکی وا قورس لە لایەنی منەوە لە باری شێواوی ئێستای وڵات و لە گەڵ دژواریی بەینەلمیلەلی‌دا کە مێژو وێنەی کەمتر دیوە بە تەنیا بۆ خزمەتی نیشتمانی پیرۆز و ڕزگاری هاونیشتمانانە لە تۆفانی مەترسی گیروگرفت." قەوام ئەندامانی کابینەکەی خۆی بەمجۆرە بە مەجلیس ناساند:

سەر وەزیر و، وەزارەتی کاروباری دەرەوە و.

| | |
|---|---|
| وەزارەتی کیشوەر | ئەحمەد قەوام سەڵتەنە |
| معاونی سیاسی و پارلەمانی | موزەفەر فەیروز |
| وەزارەتی دارایی | بەیات |
| وەزارەتی ڕێگا | سەرلەشکر فەیروز |
| وەزارەتی دادگوستەری | ئەنوشیروان سوپەهوبدی |
| وەزارەتی پیشە و هونەر (کار) | ئەحمەد عەلی سوپهەر |
| وەزارەتی بیهداری | دکتۆرر ئیقبال |
| وەزارەتی پۆست و تەلەگراف و تەلەفۆن سوهامەدین غەفاری | |
| وەزارەتی فەرهەنگ | مەلیکوشوعەرا بەهار |
| جێگری وەزارەتی کشتوکاڵ | شەمسەدین ئەمیر عەلائی |
| وەزارەتی جەنگ | سوپەهبود ئەمیر ئەحمەدی |

هەر لەم کۆڕەدا قەوام ڕای گەیاند. بۆ بەهێز کردنی پایەکانی دۆستایەتی لە گەڵ یەکێتی سۆڤێت لە سەر بنچینەی ڕێزگرتنی یەکتری، سەردانی مۆسکۆ ئەکا.

### 1. 3. سەردانی مۆسکۆ

قەوام ڕۆژی 29 ی ڕێبەندان لە گەڵ دەستەیەکی نوێنەرایەتی کە پێک هات بو لە: جوادی عامیری، حەمید سەیاح، دکتور شەفەق، عەبدولحسێن نیکپور، سەلمان ئەسەدی، دەری، عەمید نوری، جیهانگیر تەفەزولی،

قاسم مەسعودی، حەمید رەزەوی، پیرنەزەر، چو بۆ دیتنی ستالین و کاربەدەستانی تری سۆڤێتی لە مۆسکۆ. لە سەرەتای رەشەمەدا هەواڵنێری سۆڤێتی لە مۆسکۆ رایگەیاند: رۆژی 25 ی شوبات لەو کۆبونەوەیەدا کە لە گەڵ ئاغای قەوام سەڵتەنە کرا، بڕیاری حکومەتی سۆڤێتی پێ ڕاگەیانرا کە لە رۆژی 2 هەمی مارتەوە بەشێ لە هێزەکانی سۆڤێتی لە خوراسان، شاهرود، سمنان لە رۆژهەڵاتی ئێران، کە ئارامییەکی نیسبی تێدایە، ئەکشێنەوە. بەڵام هێزی سۆڤێتی لە شوێنەکانی تری ئێران دا ئەمێنێتەوە تا وەزع رون ئەبێتەوە.

سەردانی قەوام بۆ سەرانی کورد مایەی پەژارە بو. یەکێ لە نوسەرەکانی کوردستان لە وتارێک دا بە ناوی "شورەوی و ئێران" بەم بۆنەیەوە نوسیویێتی:

"ئێستاش کە قەرارە هەیئەتێک نوێنەر بە سەرۆکیی ئاغای قەوام سەڵتەنە بچنە مۆسکۆ بۆ ئەوەی کە حەق بکەن بە ناحەق و مەرامی شومی هیتلەری نازی زیندو کەنەوەو ئەهێڵن ئیستعیمار لە بەین بروات... ئێمە بە ناوی مەدەنییەت دەڵێین و دەنوسین سێ دەوڵەتی روس و ئینگلیس و ئەمریکا کە بە یەکەوە مەنشوری ئەتلانتیکیان بەست بۆیە بو... داروەدەستەکانی مەحو و نابوت کەن و نەتەوەکانی کە هەتا ئەورۆ لە ژێر چنگورکی ئیستیبدادو ئیستیعماردا دیل و یەخسیر و ناڵاندویانە رزگاریان بێت و سەربەست بژین: ئەگەر بێت و خودای نەکەردە وەفا بە عەهدی خۆیان نەکەن بە زویەکی زو ئاوری چارەرەشی نەتەوە چوکەکان هەڵ دایسێنن و قسەی تیا نیە داوینگیری وانیش دەبێت. جا کەوابو هیوامان وایە دەوڵەتی دیمۆکراسیە ڕاستەکان چاوەنۆڕیی نەتەوە چوکەکانی دونیا بە ناهومێدی نەگۆڕنەوە و گوێش بە گوتەی نوێنەرانی دیکتاتۆری ئێرانی‌یەکان، کە بۆ دەسڕێک قەیسەرییەکی ئاور تێ بەر دەدەن، نەدەنەوە."(4)

### 1. 4. قەوام دەستی ستالین ئەبڕێ

قەوام ماوەیەکی درێژ لە مۆسکۆ مایەوە. لەوێ بەڵێنی بە سەرانی سۆڤێتی دابو: ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی شیمال بدا بە روس و. "تودەیی" یەکانیش لە کابینەکەی خۆی دا بەشدار بکات. کاتێ گەڕایەوە تاران خولی 14 هەمی مەجلیس تەنیا چەند رۆژێکی تەمەنی مابو. سەروەزیران دەربارەی گفتوگۆکانی ڕاگەیاندنی خواروی بڵاو کردەوە:

"گفوگۆیەکی کە لە لایەن سەروەزیرانی ئێرانەوە لە مۆسکۆ لە گەڵ کاربەدەستانی حکومەتی یەکێتی سۆڤێتی دەستی پێ کراو لە تاران پاش هاتنی سەفیری سۆڤێتی درێژەی پێ درا لە 15 ی خاکەلێوەی 1325 دا بەرامبەری 4 هەمی نیسانی 1946 بە ئەنجامی ژێرو گەیشت و. لە سەرەمو مەسەلەکان بە تەواوی پێک هاتن.

1. هێزەکانی لەشکری سور لە تاریخی 24 ی مارتی 1946 ەوە واتە یەکشەممو 4 هەمی خاکەلێوە لە ماوەی مانگ و نیوێکدا هەمو خاکی ئێران چۆڵ ئەکەن.
2. رێککەوتننامەی دامەزراندنی کۆمپانی تێکەڵاوی نەوتی ئێران و سۆڤێتی و مەرجەکانی لە 14 ی مارتەوە تا 7 مانگی تر بۆ پەسند کردن بۆ مەجلیسی شورای میللی پێشنیار ئەکرێ.
3. لەبەرئەوەی ئازەربایجان مەسەلەیەکی ناوخۆی ئێرانە، رێوشوێنێکی هێمنانە بۆ ئیسلاحات بە پێی قانونەکانی ئێستاو بە گیانی خێرخوازی بەرامبەر خەڵکی ئازەربایجان لە نێوان حکومەت و خەڵکی ئازەربایجان دائەنرێ."(5)

### 1. 4. 1. رێککەوتنی نەوتی ئێرانی – روسی

لە ساڵەکانی جەنگ دا هەم کۆمپانیەکانی ئەمریکاو، هەم یەکێتی سۆڤێت ئەیان ویست ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی سەروی ئێران وەربگرن. بڵاوبونەوەی هەواڵی گفتوگۆی ژێربەژێری حکومەتی ئێران و

کۆمپانی نەوتی ئەمریکی "ستاندارد ئۆیل" بۆ دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئێران دا، کرملینی وروژان. لە ئەیلولی 1944 دا نوێنەری ڕوسی بە ڕەسمیی ئەم داوایەی لە ئێران کرد. مەجلیسی شورای میللی ئەوسا لە سەر پێشنیاری د. محەمەد موسەدەق قانونێکی دانا کە تا ئەو زەمانەی هێزی بێگانە لە ئێران دا بێ، مەجلیس بۆی نیە باسی دانی ئیمتیازی هیچ سامانێکی ژێرزەمینی بە دەوڵەتانی بێگانە بکا.(6)

قەوام لە 15 ی 1 ی 25 دا نامەیەکی ڕەسمیی بۆ سەفیری سۆڤێتی لە تاران نوسی:

"جەنابی ئاغای سادچیکۆف سەفیری مەزنی یەکێتی کۆمارە سۆڤێتیە سۆسیالیستەکان

بە دوای گفتوگۆی دەمیی کە لە نێوانمان دا بوە بەڕێزەوە بە حزووری ئەو جەنابەی ئەگەیەنێ، حکومەتی ئێران موافەقەت ئەکا کە حکومەتەکانی ئێران و سۆڤێتی کۆمپانییەکی تێکەڵاوی ئێرانی سۆڤێتی نەوت بۆ گەڕان و کەڵک وەرگرتن لە ئەرزە نەوتاوییەکانی ژوروی ئێران بەم مەرجە سەرەکییانەی لای خوارو دابمەزرێنێ:

1. لە ماوەی 25 ساڵی کاری یەکەمی کۆمپانی لە 49% بەشەکانی هی ئێران و لە 51% هی سۆڤێت ئەبێ و لە ماوەی 25 ساڵی دوەمی دا 50% بەشەکانی هی ئێران و 50% تری هی سۆڤێت ئەبێ.
2. قازانجەکانی کۆمپانی بە پێی ڕادەی بەشەکان لە نێوان هەر دولادا بەش ئەکرێن.
3. سنوری ئەرزەکانی یەکەم کە بۆ گەڕان تەرخان کراون ئەوەیە کە جەنابعالی لە میانەی گفتوگۆکانی 24 ی مارت دا بەم لایەنەی سپارد بو، بێجگە لە خاکی ئازەربایجانی غەربی کە لە ڕۆژئاوای خەتێکەوە لە نوقتەی لێکدانی سنورەکانی سۆڤێتی و تورکیا و ئێرانەوە دەس پێ ئەکا و بە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی ڕەزائیەدا ڕادەبورێ تا ئەگاتە شاری میاندواو. بەوجۆرەی ڕۆژی 4 ی نیسانی 1946 خراوەتە سەری و دیاری کراوە. حکومەتی ئێران بەڵێن ئەدا ئەو خاکەی کەوتۆتە لای خۆرئاوای خەتی داسکراو بە ئیمتیازی کۆمپانیە بێگانەکان بسپێرێ.
4. سەرمایەی لایەنی ئێرانی بریتی ئەبێ لە ئەرزە نەوتاوییەکانی مادەی سێیەم کە دوای کاری فەنی ئەبێتە خاوەنی بیری نەوت و بەرهەمەکەی قابیلی کەڵک لێ وەرگرتنی کۆمپانی ئەبێ. سەرمایەی لایەنی سۆڤێتیش بریتی ئەبێ لە هەمو جۆرە خەرج و ئالات و ئەدەوات و موچەی شارەزا و کرێکارەکان کە بۆ دەرهێنانی نەوت و پاڵاوتنی پێویست ئەبن.
5. کارەکانی کۆمپانی پەنجا ساڵە.
6. پاش بەسەرچونی ماوەی کاری کۆمپانی حکومەتی ئێرانی مافی هەیە بەشەکانی سۆڤێتی لە کۆمپانی بکڕێتەوە. یا ماوەی کۆمپانی درێژ بکاتەوە.
7. پاراستنی ئەو ئەرزانەی جێگەی گەڕان و بیری نەوت و هەمو دامەزراوەکانی کۆمپانی بە تەنیا بە هۆی هێزی ئاسایشی ئێرانەوە ئەبێ."(7)

### 1. 4. 2. "تودەیی" ئەبن بە وەزیر

لە سەرەتای گەلاوێژی 1325 دا حیزبی تودە گوشارێکی زۆری بۆ قەوام سەڵتەنە برد کە:

1. حیزبی دیمۆکرات (حیزبەکەی قەوام خۆی) و، حیزبی تودە و، حیزبی ئێران و، فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان و، حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بەرەیەکی یەکگرتو پێک بهێنن.
2. کابینەکەی ئێستا هەڵ بوەشێنرێتەوەو کابینەیەکی ئیئتیلافی تر بە بەشدار بونی ئەو حیزبانە بە سەرۆکایەتی قەوام دابمەزرێنرێ.
3. "شورای موتەحیدەی مەرکەزی" وەکو یەکێتی ڕەسمی کرێکاران بناسرێ.(8)

قەوام نەچوە ژێر باری خواستەکانی حیزبی تودە. حیزبی تودەش ئەوەندە سور نەبو لە سەری. پاش گفتوگۆیەکی درێژ تەنیا ئەوەی لێ قبوڵ کردن کە 3 کەس لە سەرانی حیزبی تودە لە وەزارەتەکەی دا جێ بکاتەوە.

رۆژی 9 گەلاوێژ بە فەرمانی قەوام وەزیرەکانی کابینەی پێشو وازیان هێناو لە جێگەی ئەوان 3 وەزیری تودەیی: دکتۆر یەزدی، ئیرەجی ئەسکەندەری، دکتۆر کیشاوەرزی، دانا.(9)

قەوام بەم کارە زیرەکانەیە دو نیشانی بە جارێ ئەنگاوت. لەو کاتەدا تودەیی‌یەکان نفوزیان لە تاران و هەندێ شاری تردا زۆر زیادی کرد بو ئەیان توانی گیروگرفتی زۆر دروست بکەن. بەمە دەمکوتی کردن. ئەوی دریان زیاتر باوەڕ و دڵنیایی کاربەدەستانی سۆڤێتی بە دەس هێنا.

تودەیی‌یەکان ئەو کاتەی لە وەزارەت دا بون، وایان پێشنیار نەکرد قەوام بەرەیەکی یەکگرتو پێک بهێنێ و، کورسی‌یەکانی پەرلەمان لە نێوان حیزبەکەی قەوام و حیزبی تودە و چەند حیزبێکی تری چەپ و هەر دو دیمۆکراتی ئازەربایجان و کوردستان دابەش بکەن و، پێکەوە بچنە هەڵبژاردنی گشتی خولی پانزەهەمی مەجلیسەوە.

قازی محەمەدیش، وەکو رۆژنامەی کوردستان نوسیویتی، بۆ پشتیوانی لە پێکهێنانی بەرەی یەکگرتوی پێشنیار کراو ئەم بروسکەیەی بۆ قەوام ناردوە:

"تەلگرافێک بە مەزمونی ژێرەوە لەلایەن جەنابی ئاغای قازی محەمەد پێشەوا و رەهبەری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان موخابەرە کراوە:

تاران: جەنابی ئەشرەف ئاغای قەوام رەهبەری حیزبی دیمۆکراتی ئێران

رونوس: جەنابی ئاغای دکتۆر کیشاوەرزی رەهبەری حیزبی تودەی ئێران

رونوس: جەنابی ئاغای سالح رەهبەری حیزبی ئێران

رونوس: تەبرێز، جەنابی ئاغای پیشەوەری رەهبەری فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان

رونوس: تاران، ئاغای پادگان معاونی سەدری فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان

بە ئیحتیرامەوە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان ئامادەیی خۆی بۆ ئیئتیلاف دەگەڵ ئەحزابی ئازادیخواز (دیمۆکراتی ئێران، تودەی ئێران، دیمۆکراتی ئازەربایجان، حیزبی ئێران) رادەگەیەنێ و ئەم ئیئتیلافە موجیبی سەعادەت و عەزەمەتی میللەتی ئێران دەزانم و بەم وەسیلە جەنابی ئاغای سەدری قازی لە لایەن حیزبی دیمۆکراتی کوردستانەوە بۆ گفتوگۆی پێویست و ئیمزای ئیئتیلافنامە بە نوماینەدەیی موعەڕەفی دەکەم.

رەهبەری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان - محەمەد قازی" (10)

## 2. گەڕانەوەی ئەرتەش

### 2. 1. کشانەوەی روس

بە پێی مادەی 5 ی پەیمانی 3 قۆڵی: ئێران، روسی، بەریتانی 9 ی 11 ی 1320، ئەبو لە دوای برانەوەی جەنگ تا ماوەی 6 مانگ، هاوپەیمانەکان هێزەکانی خۆیان لە ئێران ببەنە دەرەوە.

لە 20 ی گەلاوێژی 1324 دا دوەمین جەنگی جیهانیی بە رەسمی، دوای خۆبەدەستەوەدانی بێ مەرجی ژاپۆن، کۆتایی هات.

سەرانی دەوڵەتانی هاوپەیمان کە لە پۆتسدام بۆ رێکخستنەوەی دنیای دوای جەنگ کۆبونەوە، ئەو بەڵێنەی خۆیان سەبارەت بە چۆڵکردنی ئێران دوای برانەوەی جەنگ دابویان، دوبارە کردەوە.

لە 21 ی خەرمانانی 1324 دا حکومەتی ئێران 3 یادداشتی دا بە سەفارەتەکانی 3 دەوڵەتە زلەکە: یەکێتی سۆڤێت، بەریتانیا و ئەمریکا لە تاران. گفتەکانی خۆیانی لە بارەی بە جێ هێشتنی ئێرانەوە بە بیر هێنا بونەوە.

هێزەکانی ئەمریکا لە نیوەی یەکەمی ساڵی 1324 داو، هێزەکانی بەریتانیاش تا کۆتایی هەمان ساڵ هەمو هێزەکانی خۆیان لە ئێران کێشایەوە. یەکێتی سۆڤێت مابو گفتەکانی خۆی بەجێ بهێنێ و ئەویش هێزەکانی لە ئێران باتە دەرەوە. بەڵام یەکێتی سۆڤێت ئەی ویست لە نرخی چۆڵکردنی ئێران دا ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی سەروی ئێران وەربگرێ.

قەوام سیاسی‌یەکی زیرەک و فێڵباز بو. ستالین و کاربەدەستانی تری ڕوسی قانیع کرد کە ئیمتیازی نەوتی شیمالی ئێران ئەدا بەوان. بەڵام تا لەشکری بێگانە لە خاکی ئێران دا بێ "مەجلیسی شورای میللی" هەقی نیە هیچ پەیمان و ڕێککەوتنی لە گەڵ بێگانە پەسند بکا. بۆیە پەسندکردنی قانونی دانی ئیمتیازی نەوتی شیمال بە ڕوس لە لایەن مەجلیسی شورای میللی‌یەوە ئەبێ بکەوێتە دوای کشانەوەی هێزەکانی سور لە خاکی ئێران.

نوێنەری سۆڤێتی بەم نامەیە سەروەزیرانی ئێرانی لە بڕیاری ڕوسی ئاگادار کرد:

"جەنابی ئاغای قەوام سەڵتەنە سەروەزیرانی ئێران

بە دوای دەربڕینە دەمییەکانی کە ئەم لایەنە بە پێی فەرمانی حکومەتی سۆڤێت لە 12 ی مانگی ئەم ساڵ دا دوپاتی ئەکاتەوە کە ڕۆشتنی هێزی سۆڤێتی لە ئێران بە پێی نەخشەی چۆڵکردنی ستادی ناوچەی نیزامی قافقاز لە کۆتایی مانگی مارت دا بڵاو کراوەتەوە 9 هەمی مانگی مایس بە تەواوی جێبەجێ ئەکرێ... سادچیکۆف"(11)

حکومەتی قەوام بە ڕواڵەت بڕیاری دا ئیمتیازی نەوتی شیمال بە ڕوس بدات. ڕوسیش بڕیاری دا خاکی ئێران چۆڵ بکات، بە واتەیەکی تر ئەبو ئازەربایجان بە جێ بهێڵێ و بەوەش هەر دو کۆماری ئازەربایجان و کوردستانی بێ پشتیوان بەجێ ئەهێشت. ئەرتەشی ئێران ئیتر بێ هیچ بەرهەڵستی‌یەک ئەیتوانی بە ناوی گێڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی و دابینکردنی ئازادی هەڵبژاردنی گشتی‌یەوە بۆ خولی پانزەهەمی مەجلیسی شورای میللی، کە ئەبو ڕێککەوتنی ڕوسی - ئێرانی دەربارەی نەوت پەسند بکات، بچێتەوە ئازەربایجان.

لە 27 ی تشرینی دوەم دا سەفیری ئەمریکا لە ئێران جۆرج وی ئالن بە ئاشکرا ڕایگەیاند، ئەوەی ئێران وتویەتی: "... حکومەتی ئێران ناچارە بۆ دابینکردنی ئاسایش، هێزی نیزامی بۆ هەمو شوێنەکانی ئێران بنێرێ..." شتێکی بە تەواوی بەجێ و دروستە.(12)

## 2. 2. کورد و ڕۆینی ئۆردوی سور

لە مانگی سەرماوەزدا دەستەیەکی نوێنەرایەتی کورد چون بۆ ورمێ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ کۆنسوڵی سۆڤێتی، هاشمۆف، دەربارەی کشانەوەی ئۆردوی سور لە ئێران و پاشەڕۆژی سیاسی کوردستان. هاشمۆف بەوانی وت: ئێران هێزێکی پچوک بۆ پارێزگاری ئاسایش ئەنێرێتە کوردستان تا چاودێری هەڵبژاردن بکا، دوای تەواوبونی هەڵبژاردن لە ناوچەکە ئەکشێتەوە. لە بانەمەڕی 1325 دا ئۆردوی سور ئێرانی بەجێ هێشت. شەوی 12 ی 2 لە تەورێز بەم بۆنەیەوە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەیان بەست. لەو کۆڕەدا هێمن ئەم شیعرەی بە ناونیشانی "ناونگی سور" خوێندەوە:

دوێنێکە کاتێ کازیەوەی بەیان

لە خەو هەڵستام ڕۆیم بۆ گەڕان
گەڕام زۆر کێو و چیاو بەندەنان
گوڵزار و باخ و دەشت و چەمەنان
دیتم دیارە دەدرەوشێ لە دور
لە سەر گوڵێک ئاونگێکی سور
پرسیم لە یەکیان: "ئەرێ ئەتۆ چی،
بۆچی لە ڕەنگی ئاونگی دی نی؟
ئەمن ئاونگی سورم نەدیوە،
کەنگێ ئاونگی وەک تۆ باریوە؟"
ئاونگ: "ئەمن ئاونگی ئاسمانی نیم
من: "ئیدی ئەتۆ چی؟"
ئەو: "دەزانی من چیم؟
فرمێسکی سوری کوردی داماوم،
کە لە سویێ ئۆردوی قزل ڕژاوم"
ئەنجام و دوائی چاکە ئەوەیە
ئۆردوی میهرەبان دۆستی وای هەیە
لە پاش ڕۆیشتن لە دوی دەکەن شین
لە چاویان دەتکێ فرمێسکی خوێنین
ئەی لەشکری سور، ئەی ئۆردوی زەفەر
ئێستا کە دەڕۆی لێرە دەچییە دەر
خوبات دەگەڵ بێ و ئەوەی بزانە
جێی تۆ هەمیشە دڵی کوردانە
ئەی ئەو فریشتەی کوردت کرد ئازاد
لە ژێر پەنجەیی دێوی ئیستیبداد
لەوەی بەدواوەش قەت مەیکە لە بیر
حەیفە بە تەنها کورد بێ یەخسیر(13)

کشانەوەی ئۆردوی سور هاوزەمان بو لە گەڵ چەن ڕوداوێکی گرنگ. تازە بە تازە "پەیمانی یەکێتی و برایەتی کورد و ئازەر" بەسترا بو. گفتوگۆی سیاسی نوێنەرایەتی هاوبەشی کوردستان و ئازەربایجان لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی ئێران لە تاران دەستی پێ کرد بو. هەر لەو ماوەیەش دا بو ئەرتەش بنکەکانی خۆی لە سنە و، سەقز و، بانە و، سەردەشت بەهێز کردبو. کەوتە شەڕ فرۆشتن بە پۆستەکانی پێشمەرگەی کوردستان.

دیارە کشانەوەی "ئۆردوی سوری سۆڤیێتی" لە کاتێکی وەها ناسکدا بۆ خەڵکی کوردستان شتێکی خۆش نەبو. لە گەڵ ئەوەشدا خەڵک ورەیان بەر نەدا. هەر کە بەرپرسەکانی حکومەتی کوردستان داوایان لە هێزەکانی ئێلات کرد بچن بۆ جەبهەی سەقز بۆ پاراستنی سنوری کوردستان لە هێرشی چاوەڕوانکراوی دوژمن، یا بە قسەیەکی تر، بۆ پێشڕەوی بۆ ئازادکردنی سەقز و سنە، بە هەزاران پێشمەرگە و لەخۆبوردو لە شوێنە دورەکانی کوردستانەوە کۆبونەوە.

قازی محەمەد بەو بۆنەیەوە، لە کۆبونەوەیەک دا لە ڕۆژی 15 ی 2 ی 25 لەگەڵ هەندێ لە "سەرانی عەشائیری مەنگوڕ، مامەش، زەرزا، گەورک، دێبوکری، قەرەپاپاق و، ئەفسەرانی بێباکی هێزی دیمۆکرات" نوتقێکی داوە. لە قسەکانیدا وتویەتی:

"لە کاتێکدا ئۆردوی سور لە نێوماندا بو، دوژمنانی ئێمە هەمیشە وایان بڵاو دەکردەوە کە داوا و ئیدیعای کوردان هەموی بە هۆی سیاسەتێکی خاریجیە، کە مەقسودیان ئۆردوی سور بو، بەڵام ئەوڕۆ بە ئاشکرای لە هەمو کەسێک مەعلوم بوە، کە کورد ئازادی دەوێ و دەست لەو مەرامە هەڵناگرێ و، وجودی ئەو عەشائیرانە لەوڕۆدا کە بە گیان و ماڵ ئامادەن ئاخرین دڵۆپی خوێنی خۆیان بۆ ئەو مەرامە بڕژێنن شاهیدێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەوەی کورد ئازادی دەوێ و دەستی لێ هەڵناگرێ و بۆ وەچنگ هێنانی ئازادی ئیعتیمادی هەر بە خۆیە.

ئەمن زۆر سوپاسی برا مەنگوڕەکان دەکەم هەر بە بیستنی ئەوەی کە زانیویانە ئۆردوی سور وڵاتی تەخلیە کردوە و ڕۆژی کارە، گەورە و بچوکیان، بۆ پاراستنی وڵات ئامادەی خزمەت بون.

برایانی مامەش هەر کە زانیویانە کە ڕۆژی ئەوەیە دەبێ وڵاتی کوردەواری نفوزی بێگانەی تێ دا نەمێنێ و دەستی ئیستیعماری لە سەر لابرێ هەموی بە گیان و دڵ حازر بون.

هەروەها برایانی گەورک و دێبوکری و زەرزا و ئاغایانی قەرەپاپاق، هەمو ئەوڕۆ وەک کورد لە مەیدانێدا ڕاوەستاون و چاوەنۆڕی فەرمانن کە هەموی شاهیدێکی گەورەیە لەو ڕۆژەدا کە ئۆردوی سور وڵاتی تەخلیە کردوە ئەوان واجیبی موقەدەسی خۆیان بە جێ دێنن و بەڵگەیەکی زۆر زلە بۆ ئەوەی هەستی نیشتمان پەرستی و ئازادی لە دڵی هەمو کوردێک دا جێگیر بوە و دەست لێ هەڵگرتنی نیە.

برایانی خۆشەویستی بارزانی کە لە ڕێگای وەدەست خستنەوەی ئازادی کوردستانی مەزن وڵات و ماڵ و منداڵیان لە بەر چاو نیە و هەمویان لە پێناو ئەو مەتلەبە داوە. مەردانە لە کۆشش دان جێگای شانازیە و ئازادیخواهی میللەتی کوردەواری نمایش دەدەن و شارەزایی وان لە عەمەلیاتی جەنگی و ئازادی و ڕەشیدیەیان، کە سیفاتی مومەیزەی کوردانە، لە شەڕی سالح ئاوایەدا مەعلوم بو کە عیدەیەکی 700 نەفەری ئۆردوی فارسەکان دەیویست بۆ لای سەرایە بێت ئەوان 170 نەفەر پێشیان لێ گرتن و تەلەفاتێکی زۆریان لێدان بێ ئەوەی یەک نەفەر خوێن لە کەپوی بێ.

جەنابی حەمە ڕەشید خان کە چەند وەختە لەو ڕێگایەدا ئیمتیحانی خۆی داوە. هەروەها ئەوانە بەڵگەیەکی زۆر گەورەن کە جونبوشی ئازادیخواهی کوردستان بە هۆی سیاسەتی خاریجی نەبوە بەڵکو هێزێکە لە دڵی هەمو کوردێکدا مەوجودە و لە سایەی خودا ئەو هێزەش ئەوەندە بە قوەتە کە دەتوانێ دەستی زاڵم ببڕێ.

بەڵام میللەتی کوردی زۆر خاوەنی ئینساف و ڕوحمە دیسان لەسەر ئەو حاڵەشەوە کە هێزی مە زۆر کافیە بۆ ئەستاندنەوەی وڵاتی خۆمان و تۆڵە ستاندنەوەمان لەسەر ئەوەشەوە ئەوا خەریکین کەوا بە ڕێگایەکی سولح و موسالەمەت حەقوقی خۆمان وەرگرینەوە.

ئەگەر هاتو هەر بە موسالەمەت لەگەڵمان نەهاتن و ئیدیعای ئێمەیان قبوڵ نەکرد کە نوماینەدەی کوردستانی ئازاد بۆ ئەو جامیعە لە تاران مەشغولی موزاکەرەن. ئەو وەختی بە هومێدی خودای، بە گشتی عالەم بە تایبەتی بە دەوڵەتە زاڵمەکانی کە وڵاتەکەمان لێ داگیر دەکەن، نیشان دەدەین کە کورد چەندە بەهێزە و لێیان مەعلوم دەکەین کە تۆڵە سەندنەوە چۆن دەبێ."(14)

هەروەها ڕۆژی 20 ی 2 ی 25 لە وتارێکی ترا وتویەتی:

"دوژمنانی کورد وایان شۆرەت دەدا کە دەوڵەتی کوردستان ئەساسێکی نیە و بە ڕۆینی هێزی سور تێک دەچێ. درۆ بونی ئەو ئیدیعایە و گۆیە پوچانە زو هاتە جێ و کورد ئیمتیحانی خۆی دا لەو چەند

ڕۆژانە دا کە ئۆردوی سور خاکی ئێرانی چۆڵ کرد سەد هێندی جاران کورد وە جۆشش کەوتوە و هەزارەها کەس لە خۆبوردوان لە سنوری کورد ئامادەن تا ئاخرین تنۆکی خوێنیان لەرێی کوردستان دا برێژن.

دەبێ ئەوجار ئەو دوژمنانە بڵێن چی؟

دەبێ لێیان مەعلوم: بێ ئەگەر زو حەقی کوردی نەدەن بە زوری ئەسلەحە دەینەستێنین فەقەت راوەستانی ئێمە لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوەیە کە حەقی مە بە بێ شەڕ و بە موسالەمەت بدرێ و، پێمان خۆش نیە دوبارە لە دنیادا ئاوری شەڕ هەڵگەینەوە. ئەورۆ کورد سەهلە دەتوانێ حەقی خۆی لە ئێران بستێنێ بەڵکو دەتوانێ حەقی خۆی لە دنیا بستێنێ."(15)

قسەکانی قازی محەمەد بۆ چاوبەستن و بەرزکردنەوەی وورەی خەڵک نەبو. بەڵکو قسەکانی ڕاست و دروست بون. کورد بە لە خۆبڕانێکی ڕاستەقینەوە ئەی ویست ئەو ئازادیە بپارێزێت کە دەستی کەوت بو و، نەیئەویست جارێکی تر بە هیچ جۆرێ بچێتەوە ژێردەستی حکومەتی تاران.

### 2. 3. فەرمانی شاه

ڕۆژی 24 ی خاکەلێوە هێزەکانی سۆڤێت قەزوینیان چۆڵ کرد.

ستادی ئەرتەش هێزەکانی ئامادە کرد لە تارانەوە بچن شوێنە چۆڵکراوەکانی ئۆردوی سور بگرن. بەڵام بە هۆی ئەو گفتوگۆیەوە کە لەگەڵ نوێنەرانی ئازەربایجان هەبو حکومەتی ئێران جوڵاندنی هێزەکانی خۆی تا سەرەتای سەرماوەز دواخست. سەرلەشکر حەسەن ئەرفەع لە سەرۆکایەتی ستاد لابرا بو، لە جێگەی ئەو سەرلەشکر عەلی رەزمئارا دانرا بو. لەو ماوەیە دا ستادی ئەرتەش کەوتە خۆی بۆ سازدان و رێکخستنەوەی هێزەکانی و، لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی ئازەربایجان و کوردستان و، دانانی پلانی گرتنەوەی. سەرۆکی ستادی ئەرتەش، سەرلەشکری رەزمئارا، فەرمانی دا بە لەشکری 1 ی مەرکەز و لەشکری 3 ی قەزوین بۆ ئامادەکردنی هێزەکانیان.

ڕۆژی 3 ی سەرماوەز ناوچەی سەرجەم لەسەر رێگای زەنجان بۆ میانە لە لایەن ئەرتەشەوە گیرا.

ڕۆژی 15 ی سەرماوەز شای ئێران، محەمەد رەزا پەهلەوی، بە فرۆکە گەیشتە زەنجان بۆ سەردانی هێزەکانی ئەرتەش. هەر لەوێ فەرمانێکی بۆ "ئەفسەران و دەرەجەدارانی ئەرتەش" نوسی. لەم فەرمانە دا هات بو:

"ئێوە کە ئەمرۆ لە کوردستان و زەنجان و مەڵبەندەکانی گەیلان بۆ ئازاد کردنی نیشتیمانی هێژا و خۆشەویست کۆبونەتەوە گوێ بە فەرمان چاوەروانی زانینی کاتی دەسپێکردنن ئەبێ بزانن ئێرانی خۆشەویست بە درێژایی چەندین قەرن بە گەورەیی و سەربەرزی لە دنیای کۆن و نوێ دا ناسراوە، لەگەڵ ئەوەی زۆر گەل و وڵات لەو ماوەیەدا بەهۆی رەوتی روداوەکانی جیهانەوە لەناوچون و ناویان لە مێژودا سڕاوەتەوە، بەڵام ناوی ئێرانی نیشتیمانی خۆشەویستمان کە کۆنترین وڵاتی دنیایە هەمیشە جێگیر و هەمیشە بە توانا و گرنگییەوە ماوەتەوە.

لاتان وا نەبێ ئەم وڵاتە توشی هێرش و دەستدرێژی نەبوە. سەرانسەری مێژوی پڕ شانازی ئێمە چیرۆکی دەستدرێژی گەلانی بێگانە یا کەسانی لە ژێر کارتێکرانی فریوی دەرەوە بۆ تێکدانی سەربەخۆیی ئەو کارەیان کردوە ئەگێڕێتەوە. بەڵام لام وایە بە درێژای مێژو هیچ کاتێ روداوێکی وەها شومی وەکو ئەوەی کە لە 21 ی سەرماوەزی 1324 دا بەسەر وڵاتە خۆشەویستەکەمان دا هاتوە نەقەوماوە کە مشتێ سەرەڕۆی بێ نیشتیمان ناوچەی گرنگ و سەرسەوزی ئازەربایجان واتە گیانی ئێران لە نیشتیمان جیا بکەنەوە.

لەبەرئەوە بڕیارمان دا هێزەکانی ئاسایش بەرەو ئازەربایجانی خۆشەویست بکشێن و هەمو جۆرە بەرەنگاری و بەرهەڵستیەک بە تەواوی وردوخاش بکەن. هاونیشتیمانانی عەزیزمان لە ژێر باری ئیستیبداد دەربهێنن و سەرەڕۆکان تەفروتونا بکەن و، ئاڵای شێر و خورشید لە هەمو شوێنەکانی ئەم سەرزەمینە دا بخەنە شەکانەوە و.."(16)

### 2. 4. پلانی گشتی ستادی ئەرتەش

ستادی گشتی پلانی گرتنەوەی دانا بو. عەمەلیاتی گرتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان ئەبو لە 3 قۆڵەوە بە هاوکاری عەمەلیاتی عەشایەر جێبەجێ بکرێ:

قۆڵی یەکەم، کە گرنگترینیان بو، لە میحوەری زەنجان - تەوریزەوە بجوڵێ بۆ گرتنەوەی شارەکانی ئازەربایجان و دانانی پادگان لە شارە گرنگەکانی: تەوریز، مەراغە، رەزائیە، میانە و هی تر.

قۆڵی دوەم، ئەبو لە کوردستان (سنە) وە بە میحوەری تیکاب - شاهینژ - میاندواودا بجوڵێ بۆ دابڕینی کوردستان لە ئازەربایجان تا هێزی بارزانیەکان نەتوانن یارمەتی "موتەجاسیرین" بدەن.

قۆڵی سێیەم، ئەبو لە رەشتەوە بەرەو ئاستارا - ئەردەبیل بجوڵێ بۆ ئەوەی ڕێگای یارمەتی دەرەکی لە سنورەکانی لای سەروی موتەجاسیرین ببڕێ.

سەرەڕای ئەمانەش ئەبو بەهۆی عەشایەرەوە گیروگرفت بۆ هێزەکانی دیمۆکرات دروست بکرێ.(17)

## 3. هەڵوەشانی حکومەتی کوردستان

### 3. 1. کۆبونەوەی مزگەوتی هەباس ئاغا

ستادی ئەرتەش پلانی هێرشی گشتی بۆ سەر ئازەربایجان و کوردستان دارشت بو. بۆ ئەو مەبەستە هێزەکانی خۆی لە زەنجان و کوردستان مۆڵ ئەدا. ڕۆژی 14 ی سەرماوەز سازدانی هێزی پێویستی ئەنجامدانی هێرشەکە تەواو بو. ئەو هێزانەی بۆ لەشکرکێشی کۆکرابونەوە بریتی بون لە:

22 گوردانی تەواوی پیادە، 4 هەنگ سوار، 2 ئاتەشباری تۆپخانەی 57 ملیمی کوهستانی، 2 ئاتەشباری تۆپخانەی 105 ملیمی بڵند، 1 ئاتەشباری دژی ئاسمانی، 1 گروهان موسەلسەلی دژی ئاسمانی، 4 گروهان خومپارە ئەندازە، 3 گروهان ارابە جەنگی، نزیکەی 2 گروهان موهەندیسی بە کەرەستەی پێویستەوە، 4 گروهان تۆپی 37 ملیمی. هەمو دەزگا پێویستەکانی سەررشتەداری، باربەری، بیهداری، دامپزیشکی، تەداروکات، موهیماتی تۆپخانە و پیادە.

هەمو کەس ئەی زانی هێرشێکی گەورە بە ڕێگاوەیە.

ڕۆژی 14 ی سەرماوەزی 1325 بەرامبەر 5 ی دیسەمبەری 1946 قازی محەمەد تاقمێکی 10 کەسیی لەوانە: سەیفی قازی و سەدری قازی، بۆ ڕاوێژ دەربارەی پێکهێنانی "شورای جەنگ" بۆ کۆبونەوە بانگ کرد. لەم کۆبونەوەیە دا بڕیار درا هێزەکانی عەشایەر و جمهوری ساز بدرێن بۆ بەرهەڵستی هێزەکانی ئێران. بەڵام دوابڕیاریان بە جێ هێشت بۆ کۆبونەوەی ڕۆژی دوایی کە ئەبو لە مزگەوتی هەباس ئاغا بکرێ.

ڕۆژی 15 ی سەرماوەز سەرۆکەکانی عەشایەر و، ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی و، گەورە پیاوەکانی ئەوێ، بانگ کران بۆ مزگەوتی هەباس ئاغا بۆ ڕاوێژ بۆ بڕیاردانی دوا هەڵوێست بەرامبەر هاتنەوەی ئەرتەش و دەسەڵاتی ئێرانی.

پێشەوا و سەدری قازی رەئیان وابو ئەبێ پێشگیری لە ئەرتەش بکرێ. تەنانەت سەدری قازی وتی: "دەوڵەتی مەرکەزی توانای ئەوەی نیە لە دو جەبهەی ئازەربایجان و کوردستان دا شەڕ بکا. من نیزیکەی 3 ساڵ لە تاران بوم و لە ورەی سەربازان و دەرەجەداران و ئەفسەران ئاگادارم. دەوڵەت لە سەقز و سەردەشت و تکاو هێزێکی نیە و ئێمە بە یارمەتی فیداییە دیمۆکراتەکان بە چاکی دەتوانین هێزی دەوڵەتی مەرکەزی تەفروتونا بکەین. لە رابردودا دەستەیەک لە عەشیرەت دەیان توانی ماوەیەکی زۆر بەرامبەر بە هێزی دەوڵەتی رابوەستن و خۆ راگرن، ئێستا ئێوە لە وان کەمتر نین، نابێ بترسین، دەبێ خەبات بکەین."(18)

لە بەرامبەر ئەم رەئیەدا، لە ناو خەڵکی شاردا هەندێ کەس وەک مەلا عەبدوڵای مودەڕیسی و مەلا حسێنی مەجدی رەئیان وابو: بەربەرکانی کردنی هێزەکانی دەوڵەت کارێکی بێ سودە، بەوەش بیری ئاشبەتاڵیان لە نێوخەڵک دا بڵاو کردەوە.(19)

رۆژی 18 ی سەرماوەز لەشکرکێشی بە پەلاماردانی بەرزاییەکانی قافلانکو لە سەر رێی زەنجان - میانە دەستی پێ کرد. رێگای تاران بۆ تەورێز بەم بەرزاییانە دا تێ دەپەڕێ. فەرماندەی هێزەکانی ئازەربایجان کە دیفاعی لە قافلانکو ئەکرد جەنەراڵ غولام یەحیا دانشیان بو. هێزی ئازەری بەرگرییەکی ئەوتۆی نەکرد و زۆر زو شکا. پاش نیوەڕۆی 20 ی سەرماوەز ئەرتەش گەیشتە ناو شاری میانە.

دوای داگیرکردنی میانە سەرکردەکانی ئەرتەش بۆ ئەوەی ماوەی خۆرێکخستنەوەی هێزی دیمۆکرات نەدەن و سەرکەوتنەکە بقۆزنەوە هێزەکانیان خستەوە جوڵان:

قۆڵی سەرەکی، بە شەقامەرێ ی میانە - تەورێز دا روی کردە شاری تەورێزی ناوەندی ئازەربایجان.

قۆڵێکی تر لە میانەوە بەرەو مەراغە.

قۆڵێکی تر لە میانەوە بەرەو بوستانئاباد و، لەوێوە بۆ سەراب و ئەردەبێل.

قۆڵێکی تر لە رەشتەوە بۆ ئاستارا.

قۆڵێکی تر لە کوردستانەوە بۆ شاهیندژ و تیکاب.

دیمۆکرات لە هیچ کوێیەک بەرهەنگارییەکی ئەوتۆیان نەئەکرد. خەریکی خۆدەربازکردن و هەڵاتن بون. ئەرتەش بە ئاسانی ئەگەیشتە ئامانجە دیاری کراوەکانی.

رۆژی 20 ی سەرماوەز لە تەورێز "شورای جەنگ" پێک هات بو. بەڵام توشی رارایی و سەر لێ شێوان بو بون. لە سەر بڕیارێکی رون ساخ نەبو بونەوە. وا بڵاو بوەوە کە سەلاموڵای جاوید تەلگرافی خۆبەدەستەوەدانی بۆ تاران ناردوە و، سەران و بەرپرسەکانی حکومەت و فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان بەرەو سۆڤێت هەڵدێن.

سەرەنجام سەرانی حکومەتی ئازەربایجان بڕیاری بەرەنگاری نەکردن و خۆبەدەستەوەدانیان دا. چەند هەزارێ سەربازی تورکی ئازەری کە بۆ بەهێزکردنی جەبهە لەوێ بون بەرەو تەورێز کشانەوە.

رۆژی 21 ی سەرماوەز فەرمان درا بە هێزەکانی پێشمەرگە لە جەبهەکانی سەقز، بانە، سەردەشت، بکشێنەوە و، رێ بۆ ئەرتەش چۆڵ بکەن.

پێشمەرگە بارزانییەکان کە چەند مانگ بو پارێزگاری سنوری حکومەتی کوردستانیان پێ سپێردرا بو لە جەبهەی سەقز، ئەوانیش لە رێگەی میاندواوەوە کشانەوە بۆ بۆکان و لە وێوە بە لارێ دا بۆ مەهاباد. هەمان رۆژ سەرهەنگ غەفاری گەیشتە بۆکان. هێزی ئێلە کوردەکان دایانە پاڵی. رۆژی 22 ی سەرماوەز ئەرتەشی ئێران گەیشتە ناو تەورێز. هەمان رۆژ لەوێوە هێزەکانی ئەرتەش بە رێ کەوتن بۆ سەر مەرەند، جولفا، ماکۆ، خوی.

هێمن بیرەوەرییەکانی ئەو رۆژانەی خۆی بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

"ماوەیەک بۆ ئەوەی کارەکانی حیزب باشتر ڕاپەڕن پاش ئەوەی شەوانە پێشەوا کە زۆر شەو تا درەنگ لە دەفتەری حیزب دا دەماوە دەچوە ماڵی خۆی، کادرێکی حیزبی لە دەفتەری حیزب دا دەماوە بۆ ئەوەی ڕاپۆرتی خوارەوە ئەگەر پێویست بو بە پێشەوا ڕابگەیەنێ و دەستوراتی پێشەوا بۆ خوارەوە بنێرێ. ئەوێ شەوێ نۆرەی منی تازە زاوا بو. لە دەفتەری حیزب دانیشتبوم و خەریکی نوسینی مەقالەیەک بوم بۆ "کوردستان" ئەفسەرێکی پچوک هاتە ژور. دەستی بۆ ڕادیۆکەی سەرمێزەکە برد. لە پڕ شتێکی وامان گوێ لێ بو کە وەختا بو پێمان بە عەرزەوە وشک بێ. ڕادیۆی تاران تەلگرافی پیرۆزبایی دوکتور جاوید وەزیری ناخۆی ئازەربایجانی دەخوێندەوە کە بە بۆنەی گەڕانەوەی ئەرتەشی شاهەنشاهی بۆ تارانی نارد بو. دوایە خەبەری ڕاگرتنی "موتەجاسیرین" ی ڕاگەیاند... دەسبەجێ بە تەلیفون ئەو خەبەرەم بە پێشەوا ڕاگەیاند.

ئازەربایجان وا تەیارو پڕچەک بە لەشکری سازو پەرداخ و فەرماندە لێزانەکانیەوە بۆ وا زو تەسلیم بو؟ پێشەوەری کارامە و شۆڕشگێڕ و کۆنەپیاو و ئازا و ڕابەرەکانی تری ئازەربایجان بۆ وا بە پەلە ڕایان کرد؟ پرسیارێکە کەس بە تەواوی جوابی نەداوەتەوە و منیش جوابم بۆ نادرێتەوە."(20)

"دەسبەجێ بە تیلیفون ئەو خەبەرەم بە پێشەوا ڕاگەیاند گوتی بۆ خۆت وەرە ئێرە و بە ئەوانی تریش ڕابگەیەنە بێنە ئێرە. بە دوای ئەوانم دا نارد بۆ خۆم چوم بۆ ماڵی پێشەوا. سەدری قازی برای پێشەوا کە نوێنەری مەجلیس بو لە تاران و بە ڕواڵەت نەدەبو لەو واقیعە بترسێ، لە هەمو کەس پتر شڵەژا بو. ئەو دەسبەجێ گەڕاوە بۆ تاران و لەوێ گرتیان و هێنایانەوە مەهاباد...

بەڵێ کوتوپڕ تەوریز گیراوە و کوردستانیش لە هەمو لاوە گەمارۆ درا. پاش ئەوەی سەدری قازی نازانم بۆچی بەرەو تاران گەڕاوە ڕابەرانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لە ماڵی پێشەوا کۆبونەوە و. ئەو شەوێ ڕوحیەی هەمو کەس دەتوانم بڵێم باش بو. شورای جەنگ بە سەرۆکایەتی حاجی بابە شێخ پێک هات و سورەت جەلەسەی یەکەم ئیمزا کرا و قەراری بەربەرەکانی درا. بەڵام هێشتا مەرەکەبی بڕیارنامەکە وشک نەبوەوە کە خەبەرێ هات یەکێک لە ئەندامانی ئەو شورایە ڕای کردوە.

بۆ بەیانی وەزع گۆڕاو بڕیاری بەربەرەکانی هەڵوەشایەوە و بە پێشمەرگە دەستور درا بێ دەستکردنەوە پاشەکشە بکا و ڕێگا بۆ ئەرتەش بەتاڵ بکا و خەڵک دەستێکی کەوتە ئەولای و یەکێکی کەوتە ئەملای.

پێشمەرگە لە جەبهەی سەقز و سەردەشتەوە بە ڕێکوپێکی پاشەکشەی کرد. بەڵام فیداییەکان کە فەرماندەکانیان ڕایان کرد بو وەک مەڕی بێ شوان بڵاو بون.

فەرماندەی ئەرتەش بێ هیچ زەحمەت گەیشتە گوندی حەمامیان و پێشەوا لەوێ دیتی. لەو ماوەدا من هەمیشە لە گەڵ پێشەوادا بوم. دیارە لە گەڵی نەچومە حەمامیان. بەڵام لە شاری بەجێم نەهێشت. دەمدیت پەشۆکا بو. بەڵام نەک لە ترسان، بەڵکە لە داخان و لەبەر ناهومێدی.

ڕۆژی 26 ی سەرماوەز 1325- 1946 ئەرتەشی شرو شێریوی شاهەنشاهی، تەواو ساڵە وەختێک پاش هەڵکردنی ئاڵای کوردستان، شاری مەهابادی گرتەوە."(21)

### 3. 2. خۆبەدەستەوەدانی سەرانی حکومەت

خۆبەدەستەوەدانی ئازەربایجان بێ شەڕ و بەرەنگاری و، هەڵاتنی سەرکردەکانی کارێکی گەورەی لەوەی سەرکردەکانی کوردستانیش کرد.

ڕۆژی 23 ی سەرماوەز میرزا رەحمەتی شافیعی، شێخ حەسەنی شەمسی بورهانی، عەلی ئاغای ئەمیر عەشائیری و چەند کەسێکی ناسراوی تر چون بۆ میاندواو بۆ پێشوازی سەرتیپ هومایونی کە لە گەڵ هێزەکەی دا لە ڕێگەی سەقزەوە هات بون.

ئێوارێی 23 ی سەرماوەز تاقمێ لە پێشمەرگە و بەرپرسەکانیان کۆبونەوە چونە لای قازی بۆ ئەوەی باسی پەنا بردن بۆ سۆڤێت یا عێراقی لەگەڵ بکەن. داوایان لەویش کرد لە گەڵیان بڕوا. قازی ڕێی لێ نەگرتن بڕۆن پێی وتن چیان پێویستە لەگەڵ خۆیان ببەن بەڵام وتی: "من لە گەڵ خەڵکی مەهاباد ئەمێنمەوە. چونکە سوێندم خواردوە کە لە گەڵیان بم و چاوم لێیان بێ. حکومەتی ناوەندی بە ڕق و تورەییەوە دێتەوە. ئەگەر من بگرێ داخی خۆی بە من ئەڕێژێ و واز لە خەڵک ئەهێنێ. جا بۆ ئەوەی خەڵکی شار توشی زەرەر و زیان نەبن ناچارم بمێنمەوە."(22)

ڕۆژی 24 ی سەرماوەز ئەسەدوف نوێنەری بازرگانی روس مەهابادی بەجێ هێشت و گەڕایەوە کۆنسوڵگەی سۆڤێتی لە ورمێ.

ڕۆژی 24 ی سەرماوەز هێزەکەی سەرهەنگ غەفاری و ئێلەکانی هاوپەیمانی گەیشتنە نزیک مەهاباد.

ڕۆژی 25 ی سەرماوەز قازی بە تەلەفۆن قسەی لە گەڵ سەرتیپ هومایونی کرد. ئینجا خۆی و سەیف و حاجی بابە شێخ و چەند کەسێکی تر بە ئوتۆمۆبیل چون بۆ حەمامیان تەسلیمی سەرتیپ هومایونی بون. سەرتیپ همایونی فەرماندەی لەشکری 4 ی کوردستان و. سەرکردەی ئەو هێزە بو کە ئەبو لە قوڵی سەقزەوە بەرەو مەهاباد بجوڵێ. هومایونی، وەکو خۆی گێڕاویەتەوە. بەر لەوەی قازی محەمەد و سەرانی تری حکومەتی کوردستان بچن بۆ لای گفتی "تەئمینی جانی" پێ دابون.(23)

هەمان ڕۆژ مەلا مستەفا بە پەلە خۆی گەیاندە مەهاباد بۆ دیتنی قازی. ئەمە دوایین جار بو بارزانی قازی ببینێ. داوای لێ کرد خۆی بە دەستەوە نەدا و لە گەڵ ئەو بچێ. بەڵام قازی بڕیاری دابو بمێنێتەوە.(24)

ڕۆژی 24 مەرەند و ڕۆژانی 25 و 26 شارەکانی ماکۆ، خوی، مەراغە و. ڕەزائیە گیرانەوە.(25)

### 3. 3. ئەرتەش دێتە مەهابادەوە

ڕۆژی 26 ی سەرماوەز (17 ی دیسەمبەر) قازی و سەرکردەکانی تر لە جادەی شیمالشەرقی سێزدە کیلۆمەتر بە لای گوندی گۆکتەپە چون بۆ ئەوەی بە ڕەسمی پێشوازی هاتنەوەی هێزی نیزامیی ئێران بۆ مەهاباد بکەن. ئینجا ئەرتەشی ئێران لە لای شیمال و هێزەکەی غەفاری لە گەڵ عەشایەر لەلای شەرقەوە "دروست یەک ساڵ دوای چەک کردنی شارەبانی مەهاباد"(26) هاتنە ناو مەهاباد.

بە گەیشتنی هێزەکانی ئەرتەش و خۆبەدەستەوەدانی قازی و سەرکردەکانی تری، حکومەتی کوردستان بە تەواوی هەرەسی هێنا. ئەگەرچی ئەرتەش بە ئاسانی گەیشتە بۆکان و مەهابادی پایتەختی جمهوریەت، بەڵام هێشتا هەندێ لە سەرانی ئێلەکان و چەکدارەکانیان مابون ئەیان توانی گیروگرفت دروست دەکەن. مەلا مستەفا و بارزانییەکان لە دەوری نەغەدە و. ڕەشید بەگی جیهانگیری هەرکی و. زێرۆ بەگی هەرکی لە دەوری ورمێ بون. هێزەکانی ئەرتەش کەوتە دانانی پلانی چەک کردنیان. لە ناو ئەوانەدا بارزانییەکان جێگای مەترسی بون و هێزەکانی ئەرتەش حسابێکی زۆریان بۆ ئەکردن. ڕەشیدبەگ دوای چەند پێکا هەڵپژانێ خۆی دا بە دەست هێزەکانی ئێرانەوە. ناردیانە ورمێ و بەر لێبوردنی گشتی کەوت. زێرۆبوگیش دوای چەند پێکادانێ لە گەڵ ئەرتەش کشایەوە دیوی عێراق و خۆی دا بە دەست کاربەدەستانی عێراقەوە.(27)

قازی محەمەد، ئەی توانی سەرکردایەتی جەنگی بەرگری بکات: بە شێوەی "شەڕی جەبهەیی" وەکو چەند مانگی ڕابردو لە جەبهەی سەقز کردبویان. یان بە شێوەی "شەڕی پارتیزانی" وەکو لە ساڵانی دوەم جەنگی جیهانییدا بوبو بە نەریتی خەباتی زۆر لە گەلانی ئەوروپاو ئاسیا دژی داگیرکەرانی نازی و فاشیستی و ژاپۆن. یاخود ئەی توانی وەکو سەرکردەکانی ئازەربایجان ڕێگای هەڵاتن بگرێ. هەمو ئەو ڕێگایانەی لە بەردەم دا کراوە بون. بەڵام لەناو هەمویان دا ڕێگای خۆبەدەستەوەدانی هەڵبژارد.

### 3. 4. گیران و موحاکەمەی قازیەکان

لە کاتێکدا قازی محەمەد لە لای سەرتیپ هومایونی ئەبێ، ڕادیۆی تاران هەواڵی گیرانی قازی لە لایەن هومایونیەوە بڵاو ئەکاتەوە.(28) وەکو ئەگێڕنەوە لەو کاتەدا قازی و هومایونی لە ماڵی مەحمود ئاغای ئێلخانی زادە ئەبن. هومایونی، بۆ هێمنکردنەوەی قازی، هەستاوە شەقێکی لە ڕادیۆکە هەڵداوە و، لە بەر خۆیەوە هەندێ جنێویشی بە قسەکەرەکە دا بو. وت بوی: ئەوان ئاگادار نین لە خۆیانەوە قسە ئەکەن، نێوە ئازادن بۆ کوێ ئەچن بڕۆن.

لەو کاتەوە کە قازی چو بو بۆ پێشوازی هومایونی و ئەرتەشی ئێران، نە هومایونی خۆی و نە هیچ کام لە فەرماندەکانی تری ئەرتەش کارێکیان نەکرد بو قازی یا هاوڕێکانی دوڕدۆنگ بن یا بسڵەمنەوە. هومایونی هەوڵی ئەدا هیچ شتێ ڕونەدات و بە هێمنی دەست بەسەر کاروباردا بگرێ.

ڕۆژی 30 ی سەرماوەز هومایونی، سەرەڕای ئەوەی بەڵێنی "تەئمینی جانی" بە قازی محەمەد و هاوڕێکانی دابو، 28 کەس لە سەرکردەکانی حکومەتی کوردستان لەوانە: پێشەوا، سەیفی قازی گرت.(29) سەدری قازی گەڕا بوەوە بۆ تاران، بە قسە و بەڵێنەکانی قەوام پشت ئەستوربو، بەڵام ئەوانە هیچیان کەڵکی نەگرت. سەدر لە تاران گیرا. بە حەپسی هێنایانەوە مەهاباد. سەرانی ئەرتەش پێیان لە سەر ئەوە داگرت بو، کە هەم موحاکەمەی قازیەکان و هەم ئیعدام کردنیان لە مەهاباد بێ. لەوەش وەکو ئەڵێن مەبەستیان ئەوە بوە هیچ کەسێکی دەسەڵاتدار نەتوانێ بۆ ڕزگارکردنیان تێ بکەوێ. بەڵام ڕەنگە هۆی ڕاستەقینەی موحاکەمە و ئیعدامی قازیەکان لە مەهاباد، چاوترساندن و تەمێکردنی داواکارانی مافی نەتەوەیی کورد بوبێ لە هەمان شوێندا کە بانگی ئازادی کوردیان تێ دا دابو.

دادگا یاخود وەکو ناوی لێ نرا بو: "مەحکەمەی بەدەوی سەحرایی" بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ پارسی تەبار لە چەند ئەفسەرێکی ئەرتەش پێک هات بو. سەرهەنگ فەیوزی دادستان بو.

تاوانەکانی بە پاڵ قازی و سەرانی حکومەت ئەدرا بریتی بون لە: پۆشینی بەرگی جەنەراڵ، سەرۆکایەتی جمهوریەتی کوردستان، گۆڕینی ڕەنگی ئاڵای ئێران، لابردنی نیشانەی شێر و خورشید، چون بۆ باکۆ و، کۆبونەوە لە گەڵ جەنەراڵەکانی بێگانە، کوشتنی ئەفسەر و سەربازی ئێرانی، بەڵێندانی بەخشینی ئیمتیازی نەوت بە بێگانە.

هەروەها نامەی دەسخەت و ڕونوسی نوتقەکانی ناو کۆبونەوە گشتیەکان.

لە بەفرانباری 1325 دا هەر 3 قازی بە ئیعدام حوکم دران.(30)

حوکمی ئیعدامی قازیەکان لەو کاتەدا بە بڵاونەکراوەیی هێڵرایەوە. قازیەکان داوایان کرد مەسەلەکەیان بخرێتە بەردەم "دادگاهی تەجدیدنەزەر" بۆ چاو پیاگێڕانەوەی. لەو ماوەیەدا هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی موحاکەمەکە ببرێتە تاران. بەڵام "ستادی ئەرتەش" سور بو لە سەر ئەوەی هەر لە مەهاباد بکرێتەوە.

ڕۆژی 7 ی بەفرانباری 1326 ئەندامانی "دادگاهی تەجدیدنەزەر" گەیشتنە مەهاباد. ئەمجارەیان دادگا بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ عەتائی و و دادستانی سەرهەنگ نیکوزاد بو.

دادگا دو پارێزەری بۆ قازیەکان دانا بو: سەروان سولح جو و سەروان نەبەوی.

ئەو تاوانانەی لە "دادگای بەدەوی سەحرایی" دا بە پاڵ قازی محەمەد درا بون و لە سەری بە ئیعدام حوکم درا بو، بریتی بون لە: ڕاپەڕینی چەکدار دژی حکومەتی ناوەندی، بەستنی ڕێککەوتنی نەوت لە گەڵ بێگانە، سوکایەتی کردن بە ئەرتەش و حکومەتی مەرکەزی، فەرمانی کوشتن و سوتاندنی ماڵی فەرمانبەرانی حکومەت..

ئەو تاوانانەی بە پاڵ سەیف و سەدریش درابون، شتێکیان کەمتر نەبو. لەوانەی بە پاڵ قازی درا بون.

هەیئەتی دادگا لە گەڵ ستادی ئەرتەش بەردەوام بە بێتەل پێوەندی تەلگرافی هەبو. پرسی پێ ئەکرد و فەرمانی لێ وەرئەگرت. ئەمیش حوکمی ئیعدامی: محەمەد قازی، محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی، سەدری

قازی دایەوە. کاتێ کە ستادی ئەرتەش ئاگادار کرا لەوەی دادگا حوکمی ئیعدامی داون. ستادی ئەرتەش فەرمانی دا بە فەرمانداری نیزامیی مەهاباد لە ماوەی 24 سەعاتدا حوکمەکە جێبەجێ بکات.(31)

رووداوەکانی ناو دادگا لە گۆڤار و رۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی تاران دا بە یەک شێوە و زمان بڵاو کراونەتەوە. پێ ئەچێ کاربەدەستانی ئەرتەش، بەو جۆرەی خۆیان ویستویانە، راپۆرتەکەیان بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە ئامادە کرد بێ. بە تایبەتی بۆ شکاندنی شەخسییەتی قازییەکان کە بوبون بە رەمزی خەباتی رزگاریخوازی کورد.

## 3. 5. چارەنوسی قازی‌یەکان و بەرپرسەکانی حکومەتی کوردستان

هەر وەکو حکومەتی کوردستان هەرەسی هێنا، داودەزگای حیزبی دیمۆکراتیش هەڵوەشا. شا "عەفوی عومومی" دەرکرد. بەڵام عەفوی عومومی هەمو کەسێکی نەگرتەوە.

لە 31 ی مارتی 1947 دا:

قازی محەمەد

محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی

ئەبولقاسمی سەدری قازی

لەمەهاباد لە سەیدارە دران.

لە 7 ی نیسانی 1947 دا:

حەمید مازوچی

رەسول نەغەدەیی

عەبدولا رەوشەنفیکر

محەمەد نازمی

لە مەهاباد هەڵواسران.

هەر لەو ماوەیەدا:

عەلی بەگی شێرزاد

لەسەر حەوزی بۆکان و

ئەحمەد خانی فاروقی (سالار)

عەبدولا خانی مەتین (برای سالار)

محەمەد خانی دانشوەر (برای سالار)

عەلی خانی فاتیح

محەمەد بەگی فەیزولا بەگی

حەسەن خانی فەیزولا بەگی

ئەحمەد خانی شەجیعی

شێخ ئەمین ئەسعەدی کەسنەزانی

شێخ سدیق ئەسعەدی یازیبلاغی

عەلی ئاغای جەوانمەردی

رەسول ئاغای مەحمودی (برای عەلی ئاغا)

لە سەقز هەڵوسران (32)

قازی محەمەد لە ناو کوردا پایەیەکی زۆر بەرزی هەبو. هەمو شاعیرەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی ئێران وەکو: مەلا مەعروفی کۆکەیی، هەژار، هێمن، خاڵەمین، حەقیقی، سەید کامیل، عەلی بەگی حەیدەری، شێواو... شیعریان لە ستایشیدا هۆنیوەتەوە. لە سەردەمی ژیانی خۆیدا شاعیر و نوسەر و سیاسی و سەرانی ئێل و مەلا و گەورەپیاوەکانی کورد هەمیشە بەرێز و ستایشەوە ناویان ئەبرد. قازی بوبو بە ڕەمزی ئازادی و سەربەستی کورد. لە سێدارەدانی ویژدانی هەمو خەڵکی هەژاند. دو کەس لە ئەدیبە هەرەبەرزەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی عێراق: پیرەمێرد و ئیبراهیم ئەحمەد، هەریەکەیان بەم بۆنەیەوە شیعرێکیان داناوە لە ڕیزی شاکارەکانی ئەدەبی سیاسی کوردا دائەنرێن.

پیرەمێرد شیعرەکەی خۆی بە ناوی "وەلی دێوانە" لە ژێر سەردێڕی "نائومێدی" دا و ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەوسا هەم خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری "گەلاوێژ" و، هەم بەر پرسی لقی عێراقی کۆمەڵەی ژ. ک بو، شیعرەکەی لە ژێر سەردێڕی "یاران" دا. هەردو شیعر لە گۆڤاری "گەلاوێژ" دا بڵاوکراونەتەوە.

## 4. بارزانی‌یەکان و حکومەتی ئێران

بارزانی‌یەکان ئێرانی نەبون. هێزێکی چەکداری ئازا و ڕێکوپێک بون. ڕوخانی حکومەتی کوردستان نەی توانی بو ڕیزەکانی ئەوان تێک بدا و هەڵبوەشێنێ. کاربەدەستانی ئەرتەش حسابێکی زۆریان بۆ ئەکردن. ئەترسان ببن بە پێشەنگی بەرەنگاری چەکدار و نائەوەی شۆڕش. بارزانی‌یەکان نەیان ئەویست تەسلیمی ئێران ببن. کاتیان بەسەر ئەبرد. هەوڵیان ئەدا حکومەتی عێراق "لێبوردنی گشتی" یان بۆ دەربکا و بگەڕێنەوە بۆ خاکی باووباپیرانیان. ئەیان ویست زستان تێ بپەڕێ و بە فری چیاکانی ناوچەی 3 سنور بتوێتەوە.

ماوەیەکیان بە گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی لە تاران و ماوەیەکیان بە شەڕ لە گەڵ ئەرتەش بەسەر برد. سەرەنجام گەڕانەوە کوردستانی عێراق. دوای ئەوەی نائومێد بون لەوەی حکومەتی عێراق "لێبوردنی گشتی" یان بۆ دەربکا بون بە دو بەش. بەشێکیان، کە زۆریان ژن و منداڵ بون، لە گەڵ شێخ ئەحمەد خۆیان دا بە دەست کاربەدەستانی عێراقەوە. بەشەکەی تریشیان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا پاش چەندین شەڕ و پێکادان بە پێ گەیشتنە سنوری سۆڤێتی و لەوێ بون بە پەنابەر.

## پەراوێزەکانی بەشی حەوتەم

1. حاج مخبر السلطنه هدایت، خاطرات و خطرات، چ 4، زوار، تهران، 1363، ل 439.
هەروەها: مصطفی الموتی، ایران در عصر پهلوی: پهلوی دوم در فراز و نشیب، چ 4، لندن، 1989، ل 183-184.
2. اندره فونتن، تاریخ جنگ سرد، ترجمە: عبدالرضا هوشنگ مهدوی، چ 1، نشر نـو، تهـران، 1364، ل 360-361.
3. فونتن، س ن، ل 361.
4. خلیل زادە، ر کوردستان، ژ 13، 24/11/22. نوسەر لێرەدا بـە هەڵـە چـوە. "مەنشـوری ئـەتلانتیک" ڕاگەیاندنی بو ڕۆزفێلت، سەرکۆماری ئەمریکا و، چەرچڵ، سـەرۆوەزیری بـەریتانیا ئیمزایـان کـرد بـو. ڕوسیا لەم "مەنشورە" دا لایەن نەبو.
5. جعفر مهدی نیا، زندگی سیاسی قوام السلطنه، چ 2، تهران، تابستان 1366، ل 299. لێـرە بـە دواوە ئەنوسین: مەهدی نیا.
6. فونتن، س ن، ل 359.
7. مەهدی نیا، س ن، ل 300 - 301.
8. هس، ل 320.
9. هس، ل 321.
10. ر کوردستان، 1325/6/11.
11. مەهدی نیا، س ن، ل 302.
12. هس، ل 520
13. ر کوردستان، ژ 44.
14. ر کوردستان، ژ 46، 25/2/21.
15. ر کوردستان، ژ 47، 25/2/25.
16. علی دهقان، سرزمین زردشت، انتشارات ابن سینا، تهران، اسفند 1348، ل 782-784.
17. هس، ل 785.
18. مەهدی نیا، س ن، ل 521، قاسملـو، س ن، ل 112، ئەویش وەری گرتوە لـە: ن. پیسـیان، از مهابـاد خونین ... ل 173.
19. قاسملـو، س ن، ل 113.
20. هیمن، تاریک و رون، ل 26-27.
21. هس، ل 27-28.
22. مەهدی نیا، ل 522-523.
23. الموتی، س ن، ل 487 و ل 488.
24. مەهدی نیا، س ن، ل 525.
25. دهقان، س ن، ل 785-788.
26. قاسملـو، س ن، ل 117.
27. دهقان، س ن، ل 796.

28. الموتی، ل .488
29. قاسملو، ل .177
30. مەهدی نیا، س ن، ل .543
31. مەهدی نیا، س ن، ل 547-.555
32. علاءالدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، بەغداد، چاپخانەی مەعارف، 1959. ل .317

هەروەها: گ ڕۆژی نوێ، ژ 10، سلێمانی، 1961/1/1، ل 85. نامەیەکی تایبەتی کاک عەبدولقادری دەباغی.